K21
کوردستان سەدەی 21

خودانی دەرکردن : زیلان حەیدەری
سەرنووسەر : مومتاز حەیدەری

گۆڤارێکی کلتووری ـ زانستی ـ مێژوویی ـ بەڵگەنامەیی ـ نەتەوەیی ـ وەرزیی ئازادە

# لە 22 نیساندا
# پرۆسەی خەباتی هاوچەرخانەی کوردایەتی سەری هەڵدا


میقداد بەدرخان


مێجەرسۆن


پیرەمێرد


حوزنی موکریانی


پێشەوا قازی


م . برایم ئەحمەد


مامۆستا سەجادی


ساڵح حەیدەری


مەلا شەریف رەنگەرێژانی


شەهید عەبدولخالق مەعروف


شەهید ساڵح یوسفی


مامۆستا سەعید ناکام

جووت وەرز : جووت ژمارە ( 10 - 11 )
2711 - 2011/4/22

# هەندێ لە خاوەن قەڵەمە نەمرەکان


مستەفا پاشای یامولکی


شێخ نوری شێخ سالح


رەفیق حیلمی


جەمالەدین بابان


مستەفا شەوقی


نافیع یونس


کامەران بەدرخان


سمکۆی شکاک


ئەمین رەواندزی


گیو موکریانی


ئەحمەدین کەرکووکی


جەمال حەیدەری


هەمزە عەبدوڵلا


شێت مستەفا


پەروین مستەفا ئەحمەد


عزەدین فەیزی


محەمەد مەولود مەم


محەرەم محەمەد ئەمین


ئەنوەر مائی


شاکر فەتاح


[illegible]


دارا توفیق


جەبار جەباری


کاردۆ گەلالی


سامی شۆرش

# کۆستێکی گەورەی نەتەوەیی

**کۆچی دوایی لەناکاوی تێکۆشەر و شۆڕشگێڕی ناسراوی کوردستان، کاك جەوهـەر نـامق سالم، کۆستێکی گەورەی نەتـەوەیی سەرتاسـەریی کوردسـتان بـوو، بۆیەکـە مێـژووی شکۆداری کوردایەتیی دوێنێ و ئەمڕۆ و بەیانی نـاوی بـە زینـدوویی دێنـێ... بـەڵێ : بە پـەروەردیی پـاکی گونـد ژیـا ، بـە پـەروەردەیی خـەباتی رەسـەنی کوردایـەتی ، بەڕاستگۆیی گەڕایەوە باوەشی گوند.. "گوند"یش یەکەم لانکی نیشتمانی نەتەوەییە.**

*** درودو سڵاو بۆ گیان و هەڵوێستی پاکی کاك جەوهەر نامق.**

*** هەر پاکی و راستگۆیی سەرمایەی نەمریی مرۆڤە.**

**مومتاز حەیدەری**






خـــــودانی دەرکـــــــردن : زیـــــلان حەیـــــدەری

ســـــــەرنووســـــــــەر : مومتـــــــاز حەیـــــدەری

E-mail: k21.haidary@yahoo.com - www.kurdistan21.net

سەرنووسەر : 0750 4481268 - 0770 2109855

گۆڤارێکی کلتوری – زانستی – مێژوویی – بەڵگەنامەیی – نەتەوەیی – وەرزیی ئازادە


## بە یادی شکۆداری جەژنی را پەڕینی قەڵەمی کورد، جەژنی وەرچەرخانی عەقڵی سیاسیی کوردایەتییەوە

**دەڵێم :**

پەیامی رۆژنامەنووسی، رق و کینەی سیاسی و بەزاندنی بەهای رەوشتی پیشەیی و کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو بە گشتی پەیامی پیرۆزی کەناڵەکانی راگەیاندن، ئامانجی خەباتی شارستانییە، نەتەوەییە، بەهای مرۆڤپەروەرییە و...هتد، نەك ئەوەی لە هەندێ کەناڵەکانی راگەیاندن بڵاو دەکرێتەوە، سەرتاپای رق و کینەی سیاسییە، بگرە شەرمەزارییە و...هتد.

ئێمە بە زمانی بولبول و قەڵەمی گەڵای گوڵ و لکە زەیتوون، گرەوی دروستکردنی بنەمای شارستانی و عەقڵی دیموکراتی دەبەینەوە. ئا لێرەوە، بەرەو لوتکەی سەرفرازیی نەتەوەیی دەڕۆین.

**یادی ۱۱۳ساڵەی جەژنی وشە و قەڵەمی کوردان، شکۆدار و سەرفراز بێت.**

**سەرنووسەر**

4/4/2011


دەستەی کۆمپیوتەر و هەڵەچن و نەخشەسازی: ( خالید عەبدولسەلام ، بۆتان مەعروف ، گوڵچین رەشید ، هیوا عەباس – مومتاز حەیدەری )

ژمارە ( ۱۰ ) ۲۰۱۱ – ۲۷۱۱ ئادرێس : هەولێر – کوردستان – جووت سایدی راستی – شەقامی پیرباڵ مەحمود

# پێرست

# فرانس ڤان ئانرات (بازرگانی مەرگ)






## هۆڵەندییەکان چی دەڵێن لە سەر دادگایی فرانس ڤان ئانرات ؟

## ئەو بەڵگەنامانەی باری ئانراتیان زۆر قورستر کرد، تاکە بەڵگەنامەی کورد پێشکەش بە دادگای کرد .

چاوپێکەوتن لە گەڵ هۆڵەندییەکان وەك بەشێك لە پەرتووکی بازرگانی مەرگ

**کۆکردنەوەو نووسین و ئامادە کردنی: عەلی مەحموود محەمەد**








# فرانس ڤان ئانرات کێیە ؟

فرانس ڤان ئانرات ناوی تەواوی فرانسیسکۆس کۆرنەلیس ئەدریانۆس ڤان ئانراتە لە ٩ی ئۆگستی ١٩٤٢ لە شاری دەنهەلدەری هۆڵەندا لە دایك بووە، لە ساڵی ١٩٧٣ چۆتە ژنێڤی سویسرا، ژنێکی پۆڵۆنی هێناوەو کوڕێکی ٣٥ ساڵی لێ هەیە .

لە حەفتاکان بۆ یەکەمجار سەردانی بەغدای کردووە، بۆ ماوەی ٣ ساڵ بۆ نووسینگەیەکی ئەندازیاری سویسری - ئیتاڵی بە ناوی Ingeco کاری کردووە، لە سەرەتای دەستپێکی شەڕی ئێران- عێراق ئەو نووسینگەیە کارەکانی ڕاگرتووە .

ئانرات بازرگانێکی هۆڵەندییە تاوانبارە بەوەی کەرەستەی بەرهەمهێنانی چەکی کیمیاوی فرۆشتووە بە ڕژێمی پێشووی عێراقی، ئەو زانیوییەتی ئەو کەرەساتنە بەکاردەهێنرێن بۆ درووستکردنی چەکی کیمیاوی، ئەم چەکانە بەکارهێنراون دژ بە ئێران لە جەنگی ئێران-عێراق و کوردەکان لە کوردستان .

لە ڕێکەوتی ٢٣-١٢-٢٠٠٥ بڕیاردرا ١٥ ساڵ زیندانی بکرێت بە تاوانی هاوبەشیکردن لە ئەنجامدانی تاوانی جەنگ، وەلێ بڕیاری ئەوە درا دەستی نەبووە لە ئەنجامدانی جینۆساید .

دادگای پێداچونەوە بۆ هەردوولایەنی قەزییەکەی ئیستئناف کردەوە " ئانرات و وزارەت "، وزارەت داوای ئەوەی کرد کە ئانرات پشکدارە لە ئەنجامدانی ژینۆساید .

پرسی ژینۆساید پێویستی بەوەبوو وزارەت لە ئاستێکی بەرزتر لە ڕوی یاساییەوە لێکۆڵینەوەیەکی یاساییان لە سەر بکردایە، پێش ئەوەی حوکم بدرێت بە بەشداری لە ژینۆساید .

## بۆچی لە دەنهاخ دادگاییکرا

هەموو ئەو کەسانەی تاوان دەکەن لە دەرەوەی هۆڵەندا، بەمەرجێك کەسی تاوانبار لە هۆڵەندا بژێت، ئەوا بە پێی ئارتکلی ١٥ لە یاسای تاوانی نێودەوڵەتی دەتوانرێت لە هۆڵەندا تاوانبار دادگایی بکرێت .

هەموو کەسێك کە گومانی ئەوەی لێبکرێت بەشداری تاوانی نێونەتەوەیی کردبێت و پێی بنێتە سەر خاکی ئەم وڵاتە، بۆی هەیە دوای بکەون و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێت .

هۆڵەندا بۆتە شوێنی خۆشاردنەوەی کەسانی لەم چەشنە (مەبەست تەنها هۆڵەندا نییە)، تا ئێستا ٣ ئەفغانی دادگاییکراون، ٢ لە بەردەستدان، یەکیش لە ڕواندا وە .

جگە لەمانەش دوو کەسی دیکە هەن هۆڵەندین "Van A"، " Guus K " بەشدارن لە تاوانی ناردنی چاك بۆ لیبریا لە نێوان ساڵەکانی (٢٠٠٠-٢٠٠٣) .

هەوڵدرا ئانرات بە بەشداری لە ئەنجامدانی تاوانی جینۆساید بەرامبەر بە گەلی کورد سزا بدرێت، مخابن سەری نەگرت،تەنها بە ئەنجامدانی بەشداری لە تاوانی جەنگ سزا درا، لێرەدا دەتوانرا لە پێناسی بەشداری ئانراتەوە لە پرۆسەی جینۆساید، جینۆسایدی کورد بە فەرمی لە دادگایەکی ئەوروپی بناسرێت، لەوێوە بڕیارەکە دەبووە بڕیاری هەموو وڵاتانی ئەوروپی .

## ئەو پیاوەی هەموو قەرزارین

**داواکاری گشتی دۆزی دادگاییکردنی فرانس ڤان ئانرات و پەرلەمانتاری ئێستای هۆڵەندی لەسەر لیستی پارتی VVD فرێد تەیفن .**

**عەلی مەحموود محەمەد .**

***ئەم چاوپێکەوتنە بە هاوکاری کاک یونس گۆران ئەنجامدراوە . " تایبەت بە ئاوێنە "***

***سەرەتا دەبێت ئەوە باس بکەم، ئێمە وەك کورد، بە تایبەت وەك ناوەندی چاك (سەنتەری هەڵەبجە)، هیچ کات ناتوانین ئەو دڵسۆزییەی بەڕێزت نواندت بۆ کورد، لە پرۆسەی دادگاییکردنی فرانس ڤان ئانرات لە یادی بکەین، بۆیە ئێستا لەبەردەم کەسێکی زۆر دڵسۆزداین و [illegible] وەفاداریت بۆ دەبەم .***

***" ئەو ڕۆژەی داواکاری گشتی داوای خۆی خوێندەوە، داوای ١٥ ساڵ زیندانی بۆ ئانرات کرد بە تاوانی هاوبەشیکردن لە ئەنجامدانی ژینۆساید، ناوەندی چاك " پێشنیاری خۆم بوو " نامەیەکی کراوەی نووسی، تیایدا وەك وەفادارییەك بۆ ئەو پیاوە داوایکرد، شەقامێك لە شاری هەڵەبجە بە ناوییەوە ناو بنرێت، بەڕێز نوێنەری حکومەتی کوردستان لەوکات مامۆستا شاهۆ ڕەزامەندی لەسەر دەربڕی، وەلێ بەداخەوە کەسێك نەبوو بە جدی دوای بکەوێت و داواکارییەکە بگەیەنێت بە ئەنجام " ، وەلێ هێشتا درەنگ نییە بۆ دانەوەی ئەو وەفادارییە .***

**پرسیار: بەڕێزت وەک داواکاری گشتی دۆزی فرانس ڤان ئانرات، زۆر بە پەرۆش بوویت، بۆ ساغکردنەوەی ئەو تاوانانەی سەپێنرابوو بەسەر ئانراتدا، ئەو پەرۆشیەت لە کوێوە سەرچاوەی گرتبوو ؟، ئایا لەوەوە بوو کە پێت قەبوڵ ناکرا هاووڵاتیەکی هۆڵەندی لە دووری زیاتر لە ٤٠٠٠ کم تاوان بەرامبەر بە گەلێکی بێ دەوڵەتی وەک کورد بکات، یان هەستێکی مرۆڤ دۆستانەی گشتی بوو!.**

وەڵام : بەڵێ، لە ٦-١١-٢٠٠٤ کاتێك ئانرات لە بەرنامەی نێت ڤێرك چاوپێکەوتنی لەگەڵدا کرا .

**پ : پێش ئەو مێژووە سکاڵای لێکرابوو ؟**

وەڵام : لە ٦-١١-٢٠٠٤ دەست بە سکاڵا کردن کرا، پێش ئەو مێژووە ڕۆژنامەنووسان لەسەریان نووسی، دەیان وت بازرگانی بە چەکی کیمیاوییەوە کردووە، وەلێ لە ٦-١١ ئێمە وەك پۆلیس کردمان بە قەزییە پاش ئەو بەرنامەیەی لە تەلەفزیۆن نیشان درا، لێکۆڵینەوەمان دەست پێکرد، خۆم چووم بۆ کوردستان، ئەو هەموو بریندارەی چەکی کیمیاویم بینی کە لە نەخۆشخانەکان بوون، ئەو هەموو ئازارەی گەلی کورد هەیبوو، لە ساڵی ١٩٨٥-١٩٨٦ ئەو یەکەم کەس بوو چەکی کیمیاوی داوە بە عێراق .

**پرسیار : تا لە تەلەفزیۆن چاوپێکەوتنەکەی پەخش نەکرا، نەبوو بە قەزییە ؟ هەرچەندە لەسەریان نووسیبوو ؟.**

وەڵام : نا هیچ قەزییەیەك بوونی نەبوو، جگە لەوەی ئەمەریکا کە گرتی، لە ئیتاڵیا هەڵات چوو بۆ عێراق، بەڵێ لەوێوە دەستی پێکرد و گرترا .

**پ: تاوانباری دیکە زۆرن، لە کۆمپانیاکان، لە تاوانبارانی کوردستان، سەدان کەسی تاوانکارتر هەیە لە ئانرات، کەس لێیان ناپرسێتەوە، بەمە چی دەڵێن ؟.**



وەڵام : مێژوییەك هەیە پێویستە باش ئاگاداری بین، ئەویش ئەوەیە تاکو ئۆکتۆبەری ١٩٨٥مەوادی کیمیاوی یاساغ نەبووە فرۆشتنی بە عێراق،چونکە عێراق دەیووت لە پیشەسازی نەوت بەکاری دەهێنم، دوای ئەو مێژووە،بە بڕیاری نەتەوەیەکگرتووەکان بڕیاردرا ئەو مادانە هیچکە نەدرێت بە عێراق، چونکە لە شەڕدا بەکار دەهێنرا .
کۆمپانیای عەرەبی و ئەڵمانی هەن لە دوای ئەو مێژووە چەکیان داوە بە عێراق، ئێمە وەك هۆڵەندی ناتوانین محاسەبەیان بکەین، دەبێت وڵاتەکان خۆیان محاسەبەیان بکەن .

**پرسیار : تەنها ئەو کۆمپانیانە نا، بەڵکە ئەی ئەو چەکدارانەی بەشداری ئۆپەراسیۆنەکانیان کرد، خۆت لە دادگا باسی کوندی تۆپخانەت کرد ؟.**

وەڵام :یەکەم شت دەمەوێت ئەوە بڵێم، ئەوە کێشەیەکی ناوخۆییە، دەبوو کورد خۆی ئەوە بکات، لە بەر ئەوەی حکوومەتە کوردییە ناوخۆییەکە جیاوازی بیرکردنەوەی تێدایە، ئێستا ئەو قەزیەیە بوروژێنرێت کێشە دێنێتە پێشەوە، بەڵام وەکو بیروڕای من ئەوەی بەشداریکردووە لە ئەنفال دەبێت دادگایی بکرێت، بەڵام ئایا دەتوانین پاش ٢٠ ساڵ ئێستا سزای ئەوانە بدەین ؟.

**پرسیار : وەکو خۆت وتت لە دادگا ژینۆساید کۆن نابێت.**

وەڵام : بە پێکەنینەوە، بەڵێ وایە .

**پ: ئەو خۆپیشاندانانەی لەبەردەم هۆڵی دادگا لە لایەن کوردەکانەوە دەکرا، ڕۆڵی چی هەبوو لە سەر پرۆسەی دادگاییەکە ؟.**

وەڵام : باوەڕ ناکەم کاریگەری لە دادوەر کردبێت، بۆ ئەوەی بڕیاری دیکە بدات، وەلێ کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر میدیای هۆڵەندی، کاریگەری لەسەر وێنەی کورد دانا، ناڕاستەوخۆ کاریگەری کردە سەر دادوەر بۆ ئەوەی بڕیاری خۆی بدات .

**پ: کە داواکاری گشتی بوویت، دەتەویست بیسەلمێنیت ئانرات هاوبەشی کەرە لە پرۆسەی ژینۆسایدکردنی گەلی کورد، ئێستا تۆ پەرلەمانتاری، لە پارتێکی سیاسیدا کە خاوەند نفوزێکی گەورەی ئابووری سیاسییە لەم وڵاتە گرنگە کە ناوی هۆڵەندایە، ئامادەییت هەیە، ئێستاش لە پەرلەماندا شەڕی بە بە فەرمی ناسینی جینۆسایدی کورد بکەیت، واتا بە ژینۆساید ناسینی کورد ببەیتە ناو پەرلەمانەوە، چۆن پارتەکەت ئێستا ئەو شەڕە بۆ ئەرمەنەکان دەکات، با بۆ کوردی پێ دۆست و بێکەسیشی بکات ؟ .**

وەڵام : کورد لە ناو حکوومەتی عێراقدا پێگەیەکی بەهێزی هەیە، گەورەترین بەڵگەش ئەوەیە سەرۆك کۆماری عێراق کوردە " سەرۆك جەلال تاڵەبانی "، ئێمە پشتگیری کورد دەکەین لە پرۆسەی دیموکراتی ناوخۆیی خۆیان، پشتگیری ئەو بزووتنەوەیە دەکەین لە ئێران هەیە، هەروەها ئەوەی لە کوردستانی سوریا هەیە، بەڵام پشتگیری ئەو شێوازە ناکەین پەکەکە دەیکات لە تورکیا، ئێمە باوەڕمان وایە دەبێت بە شێوازێکی دیکە بێت تێکۆشان، وەلێ پشتگیری ئەوە دەکەین کورد لە تورکیا ئۆتۆنۆمی هەبێت، وەك پارچەکانی دیکە، بەڵام دەبێت بە شێوازێکی دیکە هەوڵی بۆ بدەن .
ئەوەی شتێکی گرنگە ئەوەیە، ئەو جێگەیەی کورد لە کوردستانی عێراق گرتویەتی، ئەبێت یەك و پەك بیسەلمێنن بۆ جیهانی دەرەوە کە جارێکی دیکە شەڕ ناکەنەوە و ئاسایش و ئارامی دەپارێزن، دەتوانن پێکەوە حکوومەت دابمەزرێنن و بەڕێوەی بەرن، تاکو ئێمەش لە ئەورووپا و ئەمەریکا زیاتر پشتگیری کێشەی کورد بکەین .

**پرسیار : لە بیرت نەچێت پەکەکە لە تورکیا دەیەوێت چەك دابنێت، وەلێ حکوومەتی تورکیا لێی قەبوڵ ناکات .**

وەڵام : باسی ئەوە ناکەم .

**پرسیار : پێت وایە ئەنفال ژینۆسایدە ؟**

وەڵام :بەڵی من بە ژینۆسایدی دەژمێرم، لەسەر ئەو

بنچینەیەش فرانس ڤان ئانرات سزا درا بە هاوبەشیکردن لە ژینۆسساید، ئێمە داوای ئەوەمان کردووە، وەلێ کێشەکە هێشتا بڕیاری کۆتایی لەسەر نەدراوە، من بەشێوەی یاسایی بە ژینۆسسایدی دەبینم .

**پ: ئەگەر وایا، ئایا ئامادەییت هەیە نامەیەک بۆ دادگای باڵای تاوانەکان لە عێراق بنووسیت، تیایدا داوا بکەیت ئەنفال بە ژینۆساید بناسرێت ؟**

وەڵام : ئەمە پەیوەندی بە کاتەوە هەیە، لە مانگی یۆنی بڕیاری کۆتایی لەسەر دۆزەکە دەدرێت، ئێمە وەك وەزارەت بە ژینۆسسایدی دەناسین، وەلێ لە مانگی یۆنی بڕیاری کۆتایی لەسەر دەدرێت، کە وەزارەتێکی هۆڵەندی – ئەورووپی بڕیاری لەسەردا کە ژینۆسسایدە، قەت باوەڕ ناکەم وڵاتێکی وەك عێراق بە ژینۆسسایدی نەناسێت، ئەمە باشترین پشتگیرییە بۆ ئێوە .

**پ : ئەمە هەڵوێستی پارتەکەشتە ؟**

وەڵام : سروشتی ئەمە هەڵوێستی پارتەکەشمە (ڤەی ڤەی دی)، هەر پارتەکەی ئێمە بوو، داوایکرد ئەو گرووپەی ئەو جۆرە لێکۆڵینەوانە دەکات لەسەر ئەو هۆڵەندییانەی یارمەتی ئەو جۆرە دەوڵەتانە دەدەن بۆ ئەوەی پارەیان دەست بکەوێت، ژمارەیان لە ٢٠ کەسەوە بکرێت بە ٣٠ کەس، واتا گرووپەکە گەورە بکەنەوە .

**پ: ئایا لەو بڕوادا هەیت ڕۆژێک بێت لەم وڵاتە، لەوەی ژینۆساید کردنی کورد پەتبکاتەوە سزا بدرێت ؟**

وەڵام : تاکید وایە، ئەگەر وەزارەتی هۆڵەندی ئەوەی بە ژینۆسساید ناسی، ئەمە مانای ئەوەش نییە تەنها لە هۆڵەندە وا دەبێت، بەڵکە لەناو هەموو یەکێتی ئەورووپا بە ژینۆسساید دەژمێردرێت .

**پ : بۆ ئەرمەن زۆرتان پێیە،کەچی هەر لە تورکیا، زیاتر لە ٢٠ ملیۆن کورد لە مافی هاووڵاتی بوون بێبەرین، چیتان پێیە بۆ سەقامگیری ئاشتی لەو پارچەیەی کوردستان، هەروەها بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ و ستەمی نەتەوایەتی پەیامتان چییە ؟**

وەڵام : ئەمە پرسیارێکی زۆر سیاسییە، نامەوێت زۆر تیایدا قوول ببمەوە، لەبەر ئەوەی شتی دیکەی زۆر لە دوایە، ئێمە لەگەڵ ئەوەدا نین کورد لە تورکیا جیاببێتەوە، لەبەر ئەوەی لەساڵی ١٩٩٠ سەربازەکان بڕیاری ئەوەیان داوە، ئێمە چارەسەری کێشەی کورد لەوەدا دەبینینەوە، ناوچەی کوردەکان ببێتە ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی، نەك جیا ببێتەوە، باوەڕمان وایە کێشەی کورد لە تورکیا بەشێوەی دیموکراسی لە چوارچێوەی سنووری تورکیا چارەسەر بکرێت، ئێستا کێشەیە باسی کوردستانی گەورە بکرێت، بۆیە باشترە باس نەکرێت .

**پرسیار : ئەوان ئەمڕۆ داوای ئۆتۆنۆمیش ناکەن، بەڵکە تەنها دەیانەوێت بە کوردی قسە بکەن و کولتووری خۆیان بپارێزن و جل و بەرگی نەتەوایەتی بپۆشن .**

وەڵام :کورد لە تورکیا جیایە، کورد لە هەموو جێگەیەك هەیە لە ناو حکوومەتی تورکیا، زۆر کورد هەیە نایانەوێت کورد لە تورکیا جیاببێتەوە، کورد لە هەموو دەزگایەکدا هەن لە تورکیا .

**پرسیار : ئەوانە وەک کورد بوونیان نییە لەو جێگایانە، بەڵکە ناتوانن بە کوردی قسەش بکەن .**

وەڵام : من لەگەڵ ئەوەدام مافی کورد هەبێت لە تورکیا وەك پۆشینی جل و بەرگ و زمان، وەلێ بە ڕوونی دەڵێم لەگەڵ ئەوەدا نیم کورد جیاببێتەوە لە تورکیا، ئەگەر کورد جیاببێتەوە ئەوا دەبێت نەخشەی سیاسی ناوچەکە هەمووی بگۆڕدرێت، وەکو دوای جەنگی جیهانی دووەم .

**پرسیار : بێینەوە سەر ئانرات،ئایا لە بەرواری ٦-١٢ ئانرات لەسەر چ بنچینەیەک گیرا .**

وەڵام : لەبەر ئەوەی تەلەفۆنەکەی کۆنترۆڵ کرابوو و گوێمان لێی دەگرت، لە ژێر چاودێریدا بوو، زانیمان ئاگادارە لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە .

**پرسیار : کێ ئەو لێکۆڵینەوەیەی کردبوو .**



# " هیچ کەس و لایەنێك لە پشت بەدادگاییگەیاندنیەوە نەبوون جگە لەکەناڵی تەلەفزیۆنی نێت ڤێرك و وەزارەتی دادی هۆڵەندی "

*سازدانی عەلی مەحمود محەمەد بە هاوکاری عەدنان جەباری*

ئێمەی کورد تاکو مانگی سێپتەمبەری ساڵی ۲۰۰۲ بە دگمەن نەبێت، دەنا فرانس ڤان ئانراتمان نەناسیووە و گوێبیستی ناوەکەی نەبوینە، نەشمانزانیووە ئانرات تاوانی لەم چەشنەی بەرامبەرمان ئەنجامداوە، بەو چەکانەی ئەو دابینی کردووە بۆ ڕژێمی گۆڕبەگۆڕ، خۆشەویستانمان بە درندانەترین شێوە بەرچاومانەوە کۆمەڵکوژی کراون، لێ ئەوە دەزانین سەدان ئانراتی دیکە هەیە لەم جیهانە پان و بەرینە ، هەموو تاوانبارن بە هاوبەشیکردنی کوشتنی کەس و کاری ئێمە، گرنگ ئەوەیە وەزارەتی دادی هۆڵەندی یەکەم هەنگاوی نا بۆ دادگاییکردنی تاوانکارێك بەرامبەر ئەنجامدانی تاوان بەرامبەر بە گەلەکەمان و گەیشتن بە دادپەروەری، لەمەدا هەموو کورد قەرزارباری ئەوانە . یەکێك لەوانەی کە قەرزارباریانین ئەم دوو خۆشەویستەمانە کە ئەوکارە گەورەیەی ئەوان کردویانە بۆمان خۆمان نەمانکردووە .

سەبارەت بە پرسی دادگایی فرانس ڤان ئانرات، بۆ ڕونکردنەوەی هەندێك ڕاستی و بۆ هەمووان، چاوپێکەوتنێکمان ئەنجامداوە لەگەڵ بەڕێزان "بەڕێز mr.S.A.Minks داواکاری گشتی دۆزی ئەنرات لە قۆناغی پێداچونەوە، کە داوا بەرز دەکاتەوە بۆ دادگا بۆ سزادان .خاتوو Thea .M. Tjeerdema وتە بێژی بەشی ڕاگەیاندن لە بەشی سزادانی وەزارەت " .



Gunau Mahud، an Iraqi Kurd girl، protests outside the court in The Hague، Netherlands، holding

وەڵام : ئێمە وەك وەزارەت، بە نیاز بوو هەڵێت بۆ بۆسنە و مەنتگیرنۆ، بۆیە یەکسەر گیرا .

**پرسیار : گرتنەکەی پەیوەندی بە وەزارەتەوە هەبوو، یان بە سکاڵاکەرانەوە .**

وەڵام : بەڵێ لەو کاتەی ئێمە خەریکی کێشەکە بووین، بە دوایدا زۆر سکاڵای لێکرا، لە لایەن هاووڵاتیانی عێراقی و ئێرانی، کوردی ئێران و کوردی عێراق، لە دانیشتووانی هەڵەبجە، سەردەشت، گۆپتەپە، فەرجینی. لەو کاتە گوێمان لێی بوو دەیەویست ڕابکات، ویستمان نەهێڵین ڕابکات، وەك چۆن ۱۳ ساڵ ڕایکرد و لە عێراق خۆی شاردەوە، بۆیە وای لێمان کرد بیگرین، لەو کاتەی داندرابوو .

**پرسیار : باشە ئەگەر تەلەفزیۆن چاوپێکەوتنی لەگەڵدا نەکردبا، ئایا نابوونەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەن ؟.**

وەڵام : حکوومەتی هۆڵەندی بەڕاستی ئاگای لەم کەسە نەبوو تا نەهاتە سەر تەلەفزیۆن، کە بینیم وتم ئەمە چییە وا دەڵێت، یەکێك بووم لەوانەی وتم با دەستی پێبکەین .

ئانرات لە ئەنجامی چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنییەوە دۆسیەی بۆ کرایەوەو چارەنووسی گەیشتە زیندان

**پ ا: چۆن فرانس ڤان ئانراتتان دەستنیشان کرد بۆ دادگاییکردن، ڕوونتر بڵێین کەی و بۆ و چۆن دۆسیەتان بۆی کردەوە ؟. لە سەر چ بنچینەیەک ئانرات تۆمەت بار کرا، ئەو بەڵگانە چیبوون بە دەستتەوە ؟.**

وەڵام : هێشتا دادگاییکردنەکە کۆتایی نەهاتووە، هێشتا شێوەی یاساییەکە کۆتایی نەهاتووە، ئێمە داومانە بە دادگای باڵا، هێشتا دادگای باڵا بڕیاری کۆتاییان نەداوە .ئێستا دۆسیەکە لە دادگای باڵایە، تا ئێستا مەوزوعەکە کۆتایی پێ نەهاتووە،بڕیارەکان لەسەر ڕاستییەکان بڕاونەتەوە، بڕیارەکانی دادگای باڵا لە سەر ئەساسی واقیعەکان نییە، بەڵکە لە سەر بەشی یاساییەکەیە . لەسەر جۆری تاوانەکە بڕاونەتەوە، بەسەر حوکمەکەدا دەچنەوە .قانونیەن تەواو نەبووە، گریمانە هەیە ئەو دادگایە ڕەخنەبگرن لەوەی باش نەبردراوەتە پێشەوە ئەوجا بیگەڕێننەوە بۆ لای ئێمە .لەوانەیە لە دادگای باڵا دەستکاری حوکمەکەی بکەن .

دەمەوێت ئەوە باس بکەم ئەم قەزیەیە لە لایەن پارێزەرەکانەوە نێردراوە بۆ دادگای باڵا، لەوێ لە ڕوی سزاوە لێی دەکۆڵنەوە نەك لە بواری بەشداریکردنی لە تاوانەکە، لە هەقیقەتی بەشداری لە تاوانەکە ناکۆڵنەوە ئەوە تەواو بوو، تەنها لە بواری سزاکە دەکۆڵنەوە .

ئانرات یەکەمجار چاوپێکەوتنی کرد لەگەڵ کەناڵی تەلەفزیۆنی نێت ڤێرك ئەنجامدا ئەوجا وزارەت دوای کەوت، بنچینەی مەسەلەکە چاوپێکەوتنەکەی ئەم کەناڵە تەلەفزیۆنییەیە .

**پ .پێشتر ئانرات لە ئیتاڵیا گیرابوو، ئایا پرۆسەی دادگایکردنەکەی ئەمجارەی، پەیوەست نەبوو بە گرتنی یەکەمجارییەوە لە ئیتاڵیا لە لایەن ئەمەریکییەکانەوە ؟.**

وەڵام : ئەمەریکا لێکۆڵینەوەی کرد لەسەر مەلەفەکانی عێراق لە بواری چەکەوە، لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانە ناوی ئانرات دەرکەوتوو هاتۆتە پێشەوە . ئەمەریکا داوای لە ئیتاڵیا کرد و گرتی، کاتێك ئازادکرا، کەسانێك هەبوون نارازی بوون و پێیان ناخۆش بوو بەردراوە، پارێزەرەکەی داوای لێکرد وڵات بەجێبهێڵێت و بڕوات بۆ عێراق .

ئەمەریکا داوایکرد، بینێرن بۆ ئامەریکا، وەلێ دادگای ئیتاڵی ئەم داوایەی ئەمەریکیەکانیان ڕەتکردەوە، هەرچەندە یەکێك لە ئەندامانی دادگا داوای کرد تەسلیم بکرێت بە ئەمەریکییەکان، بۆیە پارێزەرەکەی ڕێنوێنی کرد و پێی وت ڕابکە نەوەك بتدەنە ئامەریکا .

**پ . لە دادگا باستان لەوە کرد کە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی لە تەلەفزیۆنی نێت ڤێرک لە ڕێکەوتی ٦-١٢-٢٠٠٣ بووە هۆی ئەوەی دۆسیە لەسەر ئانرات بکرێتەوە، لێرەدا پرسیار ئەوەیە ئایا دەوڵەتی هۆڵەندا لە پشت ئەو بەرنامەیەوە نەبوو ؟، لە خولی یەکەمی دادگا ئامادەکاری ئەو بەرنامەیە هێنرایە دادگا، ئەگەر ورد سەرنجت بدایەتە لێپرسینەوەکەی دەردەکەوت لێڵییەک پڕ تەمومژاوی لە ئارادایە ؟، ئامادەکار نایتوانی بە ڕونی وەڵام ئەو پرسیارانە بداتەوە کە بەرەوڕوی دەکرانەوە، لایەنی تەم و مژاوی بە ئامادەکردنی ئەو بەرنامەیەوە دیار بوو، ئێوە بۆ هەموو ئەمانە چی دەڵێن ؟.**

وەڵام : نازانم !، وەلێ کە لە دۆسیەی ئانراتم کۆڵییەوە شتی وام بەرچاو نەکەوت ئەوە دەربخات حکوومەتی هۆڵەندا دەستی لەو چاوپێکەوتنەدا هەبوبێت، لێرە ڕۆژنامەنووسان بێلایەنن بەلام بە جدیش نازانم، ڕۆژنامەنووسان بە ڕێنوێنی دەوڵەت کارناکەن .

ئەو ڕۆژنامەنووسەی بانگکرا بۆ دادگا بۆ ڕۆژنامەی هاخ کرانت چاوپێکەوتنی لەگەڵدا کردبوو، چاوپێکەوتنەکەی ئەو پێش نێت ڤێرك بوو، ئەو چاوپێکەوتنە بووە بنچینەی چاوپێکەوتنەکەی نێت ڤێرك .

**پ : ئانرات لە بەرواری ٦-١٢-٢٠٠٤ گیرا، هۆی گرتنەکەی لەم مێژووە چی بوو ؟، بۆ پاش زیاتر لە ساڵ و نیوێک لە هاتنەوەی بۆ هۆڵەندا ئەوجا گیرا ؟ .**





وەڵام : دەمەوێت ئەوەت پێبڵێم کە وزارەتەکەمان لە چەندین بەش پێك دێت، ئەو بەشانە ئەرکیان ئەوەیە بەدوای قەزییەکان دەگەڕێن و بۆ دادگا ئامادەیان دەکەن، پاشان قەزییەکان بە کۆمەڵێك قۆناغدا تێدەپەڕێت بە تایبەت ئەو کاتانەی پێداچونەوە دەست پێدەکات ئەوجا ئێمە دێینە ناو قەزیەکەوە .

**پ : ویستی ڕابکات، بۆیە گیرا ".**

وەڵام : یەکەمجار لە لایەن پۆلیسەوە گیرا " پۆلیسی تەحقیقی نیشتمانی "، لە سەر داواکاری ئۆ ئێم " وزارەت " دراوەتە دادگا و بە ١٥ ساڵ زیندانی سزا دراوە .پاشان هیچ کاملا بە بڕیارەکە ڕازی نەبوون ئێمە و ئەویش ئەوجا هاتۆتە دادگای ئیستئناف، ئێستاش دۆسییەکە لە دادگای باڵایە .

**پ : هاوکاری کوردەکان بۆ ئەم دادگایە، حکوومەت، حیزب، ڕێکخراو، کەسەکان چۆن بووە ؟، چ هاوکارییەکی گرنگیان بە دادگاکەتان کرد ؟، ئەی هیچ پارتێکی هۆڵەندی لە پشت ئەم دادگاییەوە نەبوو ؟.**

وەڵام : بەڵێ کوردەکان ڕۆڵێکی باشیان بینی، ڕۆڵێکی جدیان بینیوە .

بیرمان کردەوە عەلی کیمیاوی بهێنین بۆ هۆڵەندا، ئەم بیورمانە " مەبەستی عەلییە " ژمارەی تەلەفۆنی سەرۆکی دادگای عێراقی داپێم و بە تەلەفۆنەکەی خۆی قسەیکرد لەگەڵیدا . هەموو ئەو کوردانەی تێکەڵاو بوون لەگەڵ ئەو کەیسە ڕۆڵێکی باشیان بینی لە یارمەتیدانی دادگا، یەکێك لەوانە خۆتیت، نموونەی کۆنکریتیشت بدەمێ کاتێك ویستمان عەلی کیمیاوی بهێنین بۆ شایەدیدان، خۆی تەلەفۆنی کرد بۆ سەرۆکی داگای عێراقی، پەیوەندیمان پێیانەوە بەست و زانیاریمان وەرگرت، خەڵکانێك زۆر لە کوردەکان زانیاریمان لێیان وەرگرت ئەوانەش ڕۆڵێکی باشیان بینی .

**پ : حکوومەتی کوردستان ڕۆڵی چی بوو ؟.**

وەڵام : هیچم لە یاد نییە، لەوانەیە ئێوە باشتر بزانن، من لەگەڵ زۆر کوردی ئێرە پێکەوە کارمانکرد لەگەڵ دادگای عێراقی، ئەمەریکیەکان، تەعاملمان کرد بۆ هێنانی عەلی کیمیاوی بۆ هۆڵەندا، پاشان گەیشتین بەوەی پێویست ناکات عەلی کیمیاوی بهێنین بۆ ئێرە .سیامەند بەنا باڵوێزی عێراقی زۆر یارمەتیدەر بووە بۆ کەیسەکە، پێم وایە کۆنتاکتی کردووە لەگەڵ حکوومەتی کوردستان . گرنگ ئەوەیە شتی هێناوە وەلێ نازانم بە تەئکید لە کوێوە هێناویەتی .

**پ :لە خولی پێداچونەوە سزای سەر نانرات زیادی کرد، لە بەرامبەردا پاشە کشە بە قەرەبوو و هاوبەشی لە ژینۆساید کرا، دەتوانن لەو بارەیەوە ڕونکردنەوە بدەن ؟، لە کاتێکدا کورد پێویستی بە دووانەکەی دوایی هەیە نەک یەکەم . ناىا ىێوە پىتان واىە تاوانى نەنفال ژىنفساىدە؟.**

وەڵام : ئێمە وەك وزارەت باوەڕمان وایەو داوامان کردووە لەسەر بەشداری لە جینۆساید سزا بدرێت و قەرەبووی خەڵکەکەش بکرێتەوە، وەلێ دادگا باوەڕی وابوو زۆر ئاماژە بۆ ئەوە هەیە ئەوەی لە کوردستان ئەنجامدراوە ژینۆسایدە، بەلام زانیارییەکان بەس نەبوون بۆ سەلماندنی .کۆمەڵێك پرسیار پێویستیان بە رونکردنەوەیە، باشیش بوو ئەم پرسیارەت کرد، سەرەتا باوەڕی ئێمە وەك وزارەتت پێدەڵێم .ئێمە پێداچونەوەمان کرد بۆ ئەوەی ئەم کەیسە وەك ژینۆساید بناسرێت، هەروەها قەرەبووی قوربانیانیش بکرێتەوە .

دادگای پێداچونەوە پێیان وایە زیادەڕەوییە بە ژینۆساید بناسرێت، ئەوان تەرددیان هەیە، لێ پێیان وایە ئامارژەی زۆر بۆ ئەنجامدانی ژینۆساید هەبێت، بەلام ئێستا پێیان وایە زۆر ڕۆیشتوون بڵێن ژینۆسایدە.

دادگا پێیان وایە ئاماژە زۆر هەیە بۆ ئەنجامدانی ژینۆساید، بەلام ئەم ئاماژانە بەس نین بۆ ئەوەی دادگا

بڕیـار بـدات ژینۆسـاید ڕویـداوە، ئەلەمێنتـەکان بـەس نین،بەڵام وەك وزارەت باوەڕمان وایە ژینۆساید ڕویداوە . دادگا ئێستا لەسەر ڕاستییەکان بڕیار نادات، بەڵکە لەسەر سزا یاساییەکان بڕیار دەدات .

**پرسیار : شانس هەیە بە ژینۆساید بناسرێت ؟.**

وەڵام :نـاتوانم ئێـستا وەڵامـت بدەمـەوە، ئێمـە دڵمـان خۆش نییە بە بڕیارەکە و ڕەخنەشمان گرتووە بۆ ئەوەی بـە ژینۆسـاید بناسـرێت، بـە هـەمان شـێوە قوربانییەکانیش قەرەبووبکرێنەوە .

ئەگەر دادگای باڵا بگاتە ئەو بڕوایەی بگەڕێتەوە دادگای پێداچونەوە، ئەوجا شانسێك دەبێت، هەندێك جار لە هۆڵەندا ئەمە ڕویداوە، دۆسییەیەك هێنراوەتەوە دادگای پێداچونەوە .ئێستا ئەوان ئیستئنافیان کردووە.

ڕاستی لەبەردەستدایە ئانرات تاکو عەمانی ئەردەن مادەی کیمیاوی گەیاندووە، بەڵام دەبێت ئەوەش بسەلێنین لە عەمانەوە بردوێتییە عێراق .هەروەها دەبێت ئەوەش بسەلمێنین کەرەستەکانی ئانرات لە درووستکردنی ئەو چەکە بەکارهێنرابێت لە هەڵەبجەی پێدراوە .دیارە خەڵکی دیکە زۆرن چەکیان داوە بە عێراق، ئەوەی گرنگە بیسەلمێنین بەو مادەیەی ئانرات ئەو چەکە درووستکراوە لە هەڵەبجەی پێدراوە .

**پ : ئایا بە پێی دادگا کۆمپانیا هۆڵەندیەکان کە گازی کیمیاویان بەرهەم هێناوە و داوە بە عێراق تاوانبار نین ؟ ئایا وازهێنان لە قەرەبووکردنەوە پەیوەندی نەبوو بەم حاڵەوە .**

وەڵام : ئەوەی لە لام ڕون بێت و لە یادم بێت ٢ کۆمپانیای هۆڵەندی لە دۆسییەکە ناویان هەیە . بەڵام پاش ئەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان بڕیاری قەدەغەکردنی فرۆشتنی چەکی کیمیاویدا بە عێراق، ئەو ٢ کۆمپانیایە هیچکە چەکیان نەفرۆشتەوە بە عێراق . پۆلیسی هۆڵەندی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ یەکێك لەو کۆمپانیانە کرد لە شاری ئارنهێم، ئەوەی پێش بڕیارەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئانرات بوو .ئەوەی ئێمە بزانین ئەوان دوای ئەو مێژووە ڕاوەستاون لە ناردنی چەکی کیمیاوی بۆ عێراق .دوای ئاگادار کردنەوەیان هیچ زانیارییەکمان لەبەردەستدا نییە کەرەسەی کیمیاویان ناردبێت بۆ عێراق .

**پرسیار : یانی ناتوانرێت دۆزیان لەسەر بکرێتەوە ؟.**

وەڵام : لێکۆڵینەوەی پۆلیس لەگەڵ ئەوان هیچ پەیوەندییەکی بەم کەیسەوە نەبووە، ئەوان سەرپێچی دیکەیان هەبووە، ئەوەش پێش ساڵی ١٩٨٥ بووە . لە دوای ئەوەی ناردنی چەکی کیمیاوی قەدەغەکراوە بنێردرێ بۆ عێراق نەیان ناردووە، زانیاریمان نییە ناردبێتیان، ئەوان پەیوەندیان بە کەیسی ئانراتەوە نییە.

**پ : ئەم دادگاییە مەسروفاتێکی زۆری بۆکرا، دەتوانرێت لەو ژمارەیەمان پێ بووترێت، چونکە چەندە ئەو ژمارەیە بەرز بێت ئەوە دەلالەت دەکات لە بە تەنگەوە هاتنی حکومەتی هۆڵەندی لە جێبەجێکردنی عەدالەت .**

وەڵام : زۆر زۆر زۆر .ئەم کەیسە بۆ هۆڵەندا گرنگ بووە، سنوورێك دانەنراوە بۆ خەرجی، چونکە دادگاکە گرنگ بوو، بایەخی زۆری پێدرا .

**پ : ئایا بودجەی پارێزەری قوربانیان کێ دابینی کرد؟.**

وەڵام : نازانم، وەلێ لە هۆڵەندا سستەمێك هەیە، ئەوەی داهاتی کەمبێت دەوڵەت پارەی پارێزەری بۆ دەدات، من تەسەور دەکەم و بۆی دەچم لەو بارەیەوە دەوڵەت یارمەتی دابێت .

**پ : کوردەکان کەی و چۆن دەتوانن کەڵك لە ئەرشیفی دادگایی ئانرات وەربگرن بۆ بە دادگایی گەیاندنی ئەو کۆمپانیایانەی مەرکیان بەرهەم هێناوە بۆیان ؟، یانی بە نیاز نین ئەم ئارشیفە بخەنە خزمەت دەزگا کوردییەکانەوە ؟ . کەی دەتوانن ناوەڕۆکی دەکۆمێنتەکان ببینن؟.**



وەڵام : ئەو دۆسییەیە کراوە نییە بۆ کەس، دەشێت لە هەندێك کاتدا ئەوانەی قوربانین دەستیان بگاتە بەشێك لەم دۆسیەیە لە ڕێگای پارێزەرەکانیانەوە، ئەوەش گرانە و کارێکی سانا نییە .
بەشێك لە دۆسیەکە کراوە بوو لە کاتی پرۆسەی دادگاییەکە، هەندێك بەش لە دۆسییەکە کراوە نییە، بەشی سزادانەکە کراوە نییە بۆ خەڵك، دۆسییەی سزا کراوە نییە .

**پ : ناوی ئەو کۆمپانیایانەتان لایە کە بەجۆرێ لە جۆرەکان لە بازرگانی مادە و مەتریالی پەیوەستدا بە ژاری کیمیاوی پشکداریان هەبووە؟ ئەگەر نا، بۆ ئاشکرایان ناکەن؟ .**

وەڵام :ئەتوانم شتی گشتی بڵێم کە لە دۆسیەکەدا هەبێت، تەنها ئەگەری بوونی یەك کۆمپانیای ئینگلیزی دەکرێت، ئەویش بەڵگە لە سەری نییە، بە نیسبەت کۆمپانیا ئینگلیزییەکەوە ئەویش هیچم نییە لەسەری کە دەستی هەبێت، ئانرات تاکە کەس نەبووە ئەم بازرگانیەی کردووە .

**پ : ئەگەر کەسانێک هەبن ڕەگەزیان بیانی بێت ئێستا لە هۆڵەندا بژین، بەشداربن لە ئەنجامدانی تاوان بەرامبەر بە مرۆڤایەتی وەکو فرانس ڤان ئانرات، ئامادەن دادگاییان بکەن بە هەمان شێوەی ئانرات ؟.**

وەڵام : پێویستە بە جوانی گوێبگرین و بە وردی سەرنج بدەین، ئەم مەوزوعە زۆر لایەنی هەیە پێویستە لێکی جیابکەینەوە .
یەکەمجار پێویستە ئەو کەسەی دەمانەوێت دادگاییبکرێت دەبێت گومانلێکراو بێت، پێویستە دەسەڵاتی دادوەریمان هەبێت لەو بارەیەوە هەنگاو بنێین . ناکرێت کەسێك لە ڕواندا کارێکی کردبێت لێرە بیگرین، وەلێ دەتوانین ئەگەر ئەوکەسە دەسەڵاتی دادوەریمان لەسەری هەبێت بۆ تەداخولکردن یاخود ئەم کارە پەیوەست بێت بە بەرژەوەندی هۆڵەنداوە، نموونە کەسێك لە ڕواندا بەشداری ئەنجامدانی ژینۆسایدی کردبێت و لێرە بژێت، لەبەر ئەوەی لەگەڵ ڕواندایا پەیماننامەمان نییە لەو بارەیەوە ناتوانین دادگایی بکەین، نموونە هەفتەی ڕابردوو کەسێکی ڕواندی لەسەر تاوانی جەنگ و جینۆساید دادگاییکرا، نەمانتوانی لەسەر جینۆسایدەکە دادگایی بکەین، چونکە ئێمە پەیماننامەیەکمان نییە لەگەڵ ڕواندا لەو بارەیەوە . ڕاستە ئەو کەسە لێرە دەژێت، دەتوانین لەسەر تاوانی جەنگ دادگایی بکەین، بەڵام لەسەر تاوانی جینۆساید ناتوانین، چونکە ئەو کارە پێویستی بە پەیماننامە هەیە لە نێوان هەردوو وڵات، ئێمەش نیمانە لە گەڵ ڕواندایا، ئەمەش زۆر قانونییە .دوو ژەنەراڵی ئەفغانیمان بە ٩ ساڵ و ١٢ ساڵ زیندانی سزا داوە، کە لە هەشتاکان خەڵکیان ئەشکەنجە داوە لە وڵاتەکەی خۆیان، لێرەیا قوەتی قەزائیمان هەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەمکارە .

**پ : ئایا دەزانن کۆماری ئیسلامی ئێران، لە تاوانی هەڵەبجە ٧٢ کوردی ڕۆژهەڵاتی سەر بە کۆمەڵەی کوشت و چەند کەسێکی دیکەشی بە دیلی ئیعدام کرد، ئایا ئەمە ئەوە دەرناخات کۆماری ئیسلامی ئێران هاوبەشە لە تاوانی هەڵەبجە ؟.**

وەڵام : حەزەکەم لەناو دۆسیەکەی خۆمان بمێنینەوە و دەرنەچینە دەرەوە .

**پ : ئامادە بوونی چالاکی کۆماری ئیسلامی ئێران لە دادگا، کە بۆخۆی بەهەمان شێوەی بەعس تاوانی بەرامبەر بە کورد ئەنجانداوە، نارەحەتی بۆ کوردەکان درووست دەکرد ؟.**

وەڵام : ئێران لایەنێك نەبوو لە پرۆسەی دادگاییەکە. ئێران و عێراق ئامادە بوون لە پرۆسەکە بەڵام لایەن نەبوون، هیچ کاریگەرییەکیان نەبووە لەسەر پرۆسەی دادگاییەکە . ئەوانەی لەو پرۆسەیە بەشداربوون بریتی بوون لە " قوربانیان، پارێزەرەکان، وزارەت " ئێمە

دادگایەکی بێلایەنین کەس ڕۆڵی نییە بەسەرمانەوە .

**پ : حکوومەتی عێراقی دانیان نا بەوەی ئەنفال ژینۆسایدە، ئایا دەتوانین کەڵک لەم بڕیارە وەربگرین بۆ ناساندنی ئەم تاوانە لە جیهاندا ؟.**

وەڵام : ئەوان لێکدانەوەی خۆیان هەیە، هاوکات زانیاری خۆیان هەیە، وەلێ ئێمە بەو زانیاری و مەتریالانەی لەبەر دەستمان هەیە .

دادگای ئێرە هیچ کاریگەری سیاسی لەسەر نەبووە، تەنها لە ڕوی یاساییەوە لێکدراوەتەوە کە ئانرات بەشدار نییە لە جینۆساید، دارفۆر جینۆسایدە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەرژەوەنی سیاسی لە پشتیەوەیە، ناهێڵێت بە جینۆساید بناسرێت وەلێ بۆ خۆی جینۆسایدە .

## عوزرایلەکەی فرانس ڤان ئانرات

***سازدانی عەلی مەحمود و گەزیزە بەممەنی ڕاوێژکاری یاسایی ڕێکخراوی چاودێری کوردۆساید لە هۆڵەندا***

فرێد تەیفن داواکاری گشتی دۆسیەی فرانس ڤان ئانراتە و ئێستا لەسەر کورسی پارلەمان دانیشتتوە" نوێنەری پارتی VVD ی ڕاستڕەوە"،هەوڵی بێ پایانی دا بۆ سزادانی فرانس ڤان ئانرات و بە جینۆساید ناساندنی ئەنفال و هەڵەبجە،لە دوایدا داواکاری گشتی مینکس هەنگاوەکانی ئەوی بەرەو تەواو بوون برد،دیارە ئەگەر ئەنفال وەك سەرەتا بە جینۆساید ناسێنرا بەهەوڵی ئەم پیاوە هۆڵەندییە،بڕیارەکە وەك خۆی بمایایەتەوە ئەوا دەتوانرا بکرێت بە بڕیاری هەموو وڵاتانی ئەندامی یەکێتی ئەورووپا.لێرەدا چاوپێکەتنێکمان لەگەڵ بەڕێز فرێد تەیفن ئەنجامداوە،هیوادارین



کەڵکی بۆ پرسی جینۆسایدی گەلی کورد هەبێت.

**پرسیار:بەڕێز فرێد تەیفن١٧ مانگی جەنیوەری ساڵی٢٠١٠،دوا بڕیار لەسەر دۆسیەی کیمیابارانکردنی شاری هەڵەبجە درا، لە دادگا تاوانەکان وەک تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی ناسێنرا،بەڵام خەڵکی هەڵەبجە لەم بڕیارە نیگەرانن و داوا دەکەن بە جینۆساید بناسرێت،بەڕێزت پەیامت چییە بۆ خەڵکی هەڵەبجە و ڕێنوێنیت چییە بۆ پارێزەرانی دۆسیەکە ؟.**

وەڵام :بەڵی ئاگاداری بڕیارەکە هەم،ئەوە بڕیاری دادگای باڵای ئێراقە،من هیچ لەسەر بڕیارەکە ناڵێم،بەڵام من بۆ خۆم پێم وایە ئەو تاوانە جینۆسایدە.

لە بارەی قانوونیەوە زۆر گرنگ نیە بۆ خەڵکی هەڵەبجە جینۆساید بێت یان تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی،گرنگ ئەوەیە لە ناوخۆو دەرەوە کۆمەك بکرێن،کەڵك وەربگرن لە بڕیارەکان بۆ بوژانەوەی ناوچەکەیان و چارەسەرکردنی برینداراەکانیان و قەرەبووکردنەوەی زەرەر و زیانی خەڵکەکە.

**پ٢رسیار: لە ئۆکتۆبەری پار ساڵ بەڕێز Hirsch Ballin پرۆژەیەکی دا بە پارلەمان بۆ دادگاییکردنی هەموو ئەوانەی تاوانی جەنگ و تاوانی جینۆسایدیان ئەنجامداوە لە دەرەوەی هۆڵەندا لە ساڵی١٩٦٦ەوە، ئێستا لە هۆڵەندا دەژین دادگای هۆڵەندا دادگاییان بکات، ئایا ئەم پرۆژەیە بە**








**کوێ گەیشت؟،ئایا تاوانکارانی کورده گرتەوه ئەگەر لە هۆڵەندا بژین؟.**

وەڵام: بەڵێ پێشنیارێکی وا هەیە و قەراریشە جێ بەجێی بکەن، هەر کەسێك ناسنامەی هەرچیەك بێت تاوانیان ئەنجام دابێت بە پێی ئەو یاسایە دادگایی دەکرێت ئەگەر کوردێکی وا هەبێت دەیگرێتەوە،من نەم بیستووە کوردی وا لە هۆڵەندا هەبێت،وەلێ لە باری تیۆرییەوە ئیمکانی هەیە کوردیش بێت و دادگایی بکرێن،بەڵام ئەفغانی و زائیری و .. هەیە،هەر کەسێك لەو ماوەیە تاوانی کردبێت،ئەگەر بڕیارەکە پەسەند بکرێت ئەوا دەیگرێتەوە.

**پرسیار٣:لە دادگا وتت فرانس ڤان ئانرات لە گەڵ کاناڵی نێت ڤێرک چاوپێکەوتنی کرد پاش ئەوە دۆسیەم لە سەری کردەوە،یانی ئەو تاوانبارە ئەگەر ئەو چاوپێکەوتنەی نەکردایە بەو تاوانبارییەشیەوە دادگایی ناکرا؟.**

وەڵام: دۆسیەکە لەسەر ئەساسی ئەو چاوپێکەوتنە کرایەوە،بەڵام سەختە بۆ من بڵێم ئەو چاوپێکەوتنە نەبوایە دادگایی ناکرا،شایەد ببوایە یان نەبوایە .

**پرسیار: ڕۆژنامەنووسێک بە ناوی ئارنۆڵد کە زۆر لەسەر کەیسی ئانرات کاری کردووەو هاوکاریشتی کردووە لە دۆسیەکە، لە نووسینێکدا دەڵێت: لەبەر ئەوەی فریس بۆلکستاین وەزیری ئابووری بووە لە کاتی فرۆشتنی چەکی کیمیاوی لە لایەن کۆمپانیا هۆڵەندییەکانەوە بە عێراق،ناوبراو سەر بە پارتەکەی خۆتە بۆیە کۆمپانیا هۆڵەندییەکانت نەداوە بە دادگا؟،ئایا سیاسەت ڕۆڵی هەبووە لە بە دادگایی نەکەیاندنی کۆمپانیا هۆڵەندییەکان؟.**

وەڵام: ئەو شتە وا نییە کە وا دەڵێن،لە ساڵی ١٩٨٠ بۆ ١٩٨٤ بۆلکستاین کە وەزیری ئابووری بووە،فرۆشتنی چەکی کیمیاوی لە بەرواری١٥-١٠-١٩٨٤ قەدەغەکراوە تا بەرواری ١٤-١٠-١٩٨٤ ناتوانرێت لێپێچینەوەی یاسایی لەو کۆمپانیایانە بکرێت،ئەو کۆمپانیایانە پێشتر ئەو چەکانەیان فرۆشتووە،ناوبراو پێش ئەو مێژووە وەزیر بووە نەك دواتر،من دەلیلی قانوونیم پێ نییە بۆ تاوانبارکردنی ئەو کۆمپانیایانە،دەلیلی سیاسی و ئینسانی ڕۆڵ نابینێت،لە ڕوی یاساییەوە ناکرێت ئەو کارە بکرێت.پێش ئەو مێژووە١٥-١٠-١٩٨٤ ناتوانین بەرامبەر بەو کۆمپانیایانە هیچ بکەین.چونکە لە پێش ئەو مێژووەوە هیچ کارێکی نایاسایی نەکراوە.

منیش وەك ئەوانەی تۆمەتبارم دەکەن لە باری ئینسانیەوە پێم وایە ئەوەی ئەو کۆمپانیایانە کردوویانە قێزەونە،ئەوانە خراپ لەمن تێگەیشتوونە،منیش لە ڕوی مرۆڤایەتییەوە وەك ئەوان بیر دەکەمەوە بێز دەکەم لەو کۆمپانیایانە و کارەکەیانم زۆر پێ نارەوایە،وەلێ لە ڕوی قانوونییەوە ئیمکانی نییە ئەو کۆمپانیایانە تاوانبار بکەیت و بیاندەیتە دادگا و سەرکەوتوو بیت،وەك قانون لەوکاتە پێشێلی یاسا نەکراوە چونکە هەناردەکردنی ئەو مادانە بۆ ئێراق یاساغ نەبووە،وەلێ لە بواری ئینسانییەوە هەڵەی کوشندەیان کردووە.

**پرسیار : کورد هەوڵێستی تۆی پێ بەرزە لەو دۆسیەیە.**

وەڵام:مـن قـەت ئـەو كـارەم بـۆ بۆلكـستاین نـەكردووەو دەمـەوێت ئەمـە لـە خـۆم دوور بخەمەوە.

**پرسیار:ئایا لە هۆڵەندا شانسێک هەیە بۆ بە دادگـــایی گەیانـــدنی کۆمپانیـــا هۆڵەندییەکان،بـە هـۆی فرۆشـتنی چـەکی کیمیاوی بە ئێراق؟.**

وەڵام:لە بواری قانوونییەوە ئیمکانی سکاڵا تۆمـــار کـــردن هەیە،بـــەڵام ســـەرکەوتنی نەستەمە،چونکە هیچ پەیوەندیـەك نییە لـە نێوان كۆمپانیاكان و دادگایی ئانرات،لە ڕوی یاساییەوە تەنها كۆمپانیای مەڵخەم كە تاكە كۆمپانیـای هۆڵەندییـە دوای ئـەو بـەرواره ١٥-١٠-١٩٨٤بڕێك بچووك چەكی كیمیاوی فرۆشتووە بە ئێراق ئەویش دادگایی كرا كاتی خۆی بە پێشێلكاری یاسای هـەنارده تۆمـەتبار كـراو سـزا درا.ئـەو ماوەیـەی دوای قەدەغەكردنی هەناردەی چەكی كیمیاوی كرا كەم بوو لە ناوەڕاستی ئۆكتۆبەری ١٩٨٤ەوە بۆ ١٩٨٥،من نەمتوانی بیسەلمێنم ئەو مادانە لەو چەكانە بەكار هاتووە كوردی پێ كیمیاباران كراوە.

**پرسیار: کۆمپانیای الکۆلاک زۆر ناوی لە دادگای فرانس ڤان ئانرات هاتە پێشەوەو پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە دۆسیەی فرانس ڤان ئانراتەوە هەبوو،ئێستا کوردەکان لە ئامەریکا سکاڵایان لەسەر کۆمـەڵێک کۆمپانیا تۆمـار کـردووە یەکیان ئـەم کۆمپانیایەیە،پرسیار ئەوەیـە ئایـا شانـسی سەرکەوتنی ئەم سکاڵایە هەیە؟.**

وەڵام:بـەڵێ ئیمكـانی هەیـە،بارەگای ئـەو كۆمپانیایـە لـە شـاری بۆسـتنی ئامەریكایـە،كوردەكان دەبێـت لـەوێ سكاڵای خۆیان تۆمار بكەن،من ناتوانم هیچ بڵێم چونكە ئاگاداری قانوونی ئەمەریكا نیم.

**پرسیار:ئایا حکوومەتی هۆڵەندا خۆی ئـانراتی دادگـایی کـرد،یان لە ژێر پاڵەپەستۆدا ئەوی کرد؟.**




وەڵام:بەڵێ هاری ڤان بۆمڵ و خاتوو كریستا لە پارتی ئێس پەی فشاری زۆریان هێناو زۆر ئیلحاحیان كرد بۆ بە دادگایی گەیاندنی فرانس ڤان ئانرات،من زۆر ڕێزم بۆیان هەیە و كۆڵیان نەدا،بەڵام دەتوانم ١٠٠٪بڵێم ئەو كـارەی كـردم لـە بـەر خـاتری ئـەوان نەبوو،تـەنها ئـەو چاوپێكەوتنە بوو لە نێت ڤێرك بڵاو بووەوە هۆكارەكەی بوو.

**پرسـیار:ئایـا دادگـای هۆڵەنـدا بڕیـاری دا ئـەنفال جینۆسایدە؟"سەرەتا لە ٢٣-١٢-٢٠٠٦،بڕیاری ئەوە درا ئەنفال جینۆسایدە و تاوانی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە تـاوانی جەنگـە،وەلێ دواجـار لـە ٣٠-٦-٢٠٠٩ لـەوەی ئـەنفالیش پاشگەزبوونەوە".**

وەڵام:لە یەكەم بڕیاری دادگا وترا جنۆسایدە،بەڵام لە دوا بڕیاردا بە تاوانی جەنگ و تـاوانی دژ بە مرۆڤایەتی ناسێنرا،بە داخەوە پاشەكشەی پێكرا.

بۆ زانیـاری زیـاتر لەسـەر ناسـاندنی تـاوانی هەڵەبجەو ئەنفال سەردانی ئەم لینكەی خوارەوەبكەن:

http://www.rechtspraak.nl/Gerechten/HogcRaad/Actualiteiten/Conviction+Van+A.+for+supplying+raw+materials+for+mustard+gas+to+the+Hussein+regime.htm



# پارتی سۆسیالست دەیەوێت هەموو ئەوانەی لەگەڵ ئانرات تاوانبار بوونە بداتە دادگا

***چاوپێکەوتن : عەلی مەحموود محەمەد، بە هاوکاری کاک یونس گۆران***

کریستا ژنە پەرلەمانتار لە زۆر بۆنە و خۆپیشاندانی کوردەکان ئامادەیە، تاکو ئەو باسی ئانراتی لە پارلەمانی هۆڵەندا نەهێنایە پۆژەڤەوە، ئەم پیاوە تاوانبارەمان نەناسیبوو، منیش لە ڕێگەی ئەمەوە ناوی ئەو پیاوەم بیست، یەکەم کەس بوو لە مینبەری پارلەمانەوە داوای دادگایی ئانراتی کرد، لێرەوە لە هەواڵی کریستاوە لە پارلەمان ڕاگەیاندنی کوردی باسی ئانراتی هێنایە ناو ڕۆژنامەکانەوە، کە ڕۆژنامەنووس کامەران ئەحمەد سلێمان ڕاپۆرتەکەی کردە کوردی . ئانراتیش لە ڕێگەی چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنیەکانییەوە خۆی خستە داوی دادگاوە و بەڵگەی تاوانباری دا بە دەستەوە .

"پرۆفایل : لە ١٥-٩-١٩٧٤ لە فریزلاند لە دایك بووە، زانستی سروشتی خوێندووە، ٥ ساڵ یاریدەدەری پەرلەمان بوو، ٥ ساڵیشە ئەندام پەرلەمانە لەسەر لیستی پارتی سۆسیالست . بەرپرسی لیژنەی بەرگرییە لە پارلەمانی هۆڵەندا، هەروەها داد و لە بەشی بیناسازیشە " .

**پ : سەبارەت بە دانی چەکی کیمیاوی لە لایەن هەندێک کارخانەی هۆڵەندییەوە، قسە و باسەکان لەمڕۆژانە کەوتن، ئایا لە پارلەمان لێکۆڵینەوە کراوە لەسەر ئەو دۆزە؟**

وەڵام :نەخێر لێکۆڵینەوە نەکراوە لە پارلەمان، فرانس ڤان ئانرات یەك تاکە کەس بوو دادگایی کرا، پارتی سۆسیالست " ئێس پەی " دەیەوێت ئەوانەی دیکەش بدرێنە دادگا، کەوا بەشدار بوونە لەو تاوانە .

ئەو کاتەی ئانرات دەژیا و کاری دەکرد و کیمیاوی دەدا بە عێراق، کابینەی حکوومەت ئیجرائاتی لە دژی نەکردووە، لە ساڵی ١٩٨٣ەوە زانیویانە کەچی فرۆشتنی چەکی کیمیاویان بە عێراق قەدەغە نەکردووە. لە ساڵانی ١٩٨٢ و ١٩٨٣ وەزیرێکی سەر بە پارتی VVD وەزیری دەرەوەی هۆڵەندا بوو، ئاشکرا بوو عێراق دژ بە ئێران چەکی کیمیاوی بەکار دەهێنێت، کەچی نەیویست قەدەغەی بکات، کە وەك پارتی سۆسیالست ئێستا داوا دەکەین، ئەو پارتانە ناهێڵن ئەو شەخسانە بدەینە دادگا . لەم داوایەدا پارتی چەپی سەوز لەگەڵمانە، وەلێ پارتی کار نایەوێت .

لەو کاتە باڵوێزی هۆڵەندا لە عێراق وتی : ئەم چەکانە دژ بە گەلی عێراقی بەکار دەهێنرێت، بۆ زانین لە ساڵی ١٩٨٢فریس بۆلکستاین وەزیری دەرەوەی هۆڵەندا بوو. کە سەر بە پارتی VVD یە . ئەم پیاوە چووە لای سەدام و تەوقەی لەگەڵدا کرد .

لە ناو عێراقەوە هەواڵ دەهات کە ئەم چەکانە دژ بە گەل و ئێران بەکار دەهێنرێت، کەچی وەزیری ناوبراو سەفقاتی دەکرد بۆ کۆمپانیاکان، ڕاستە هۆڵەندا زیرەکە لە بازرگانی، وەلێ جار جارە لە پێناو قازانج چاو دەنوقێنن . لە ئەبریلی ١٩٨٤ حکوومەتی هۆڵەندا بڕیار دەدات قەدەغەی ناردنی چەند مادەیەك بکرێت بۆ عێراق . فرانس ڤان ئانرات بۆیە حوکمدرا چونکە دوای ئەو بڕیارە مادەی ناردبوو بۆ عێراق، چونکە پێشتر بڕیاری وا لە ئارادا نەبوو کە ناردنی چەکی کیمیاوی بۆ عێراق قەدەغە بکات .

پێش ٣ هەفتە فایلێك ئاشکرا بوو، ناوی کۆمپانیا هۆڵەندییەکانی تێدا هاتووە بە دانپێنانی خودی سەدام حوسێن، کە مادەی کیمیاویان داوە بە عێراق . سەدام یارییەکی ژیرانەی دەکرد، وای نیشان دەدا کە دەیووت : ئێوە من تاوانبار دەکەن بە شتێك کە خۆتان داوتانە پێم، ئەو لیستە لەوانەی هەڵەی تێدا هەبێت، وەلێ دانپێنانی خودی سەدامە .

**پ : خودی سەدام، یان دەزگایەکی سەر بە دەستەکەی؟**

وەڵام : نازانم، لەوەیا تەئکید نیم . با بێینەوە سەر هۆڵەندا و نەچینە سەر نێونەتەوەیی، مەڵخەمی تاوانبارکرا بە ناردنی برێکی بچووک دوای ئەو بڕیارە .

**پ : چۆن زانرا برەکە بچووک بوو ؟ .**

وەڵام : دوای ساڵی ١٩٨٤ یەك وەجبەی دیکەیان ناردووە، وەجبەی تریان نەناردووە، کەی بی ئێس هیچی نەناردووە، بۆیە حوکم نەدرا، ئێستا دەمەوێت باسی شتێکی دیکە بکەم و پێویستیم بە هاوکارییە، ئەویش بەڵگەنامە لەسەر ئەم کۆمپانیایانەی چەکی کیمیاویان ناردووە بۆ عێراق .

**پ : پارەمەتی چیت دەوێت ؟.**

وەڵام : لە عێراق دادگایی دەکرێت، ئەوانەی تۆمەتبارن بە دانی چەك قەول وایە بانگ بکرێن بۆ دادگا، .

**پ : کێ بانگیان دەکات ؟.**

وەڵام : دادگا .

ئەوەی من دەمەوێت لە ئەرشیف فاکس و وەرەقە هەیە، پێویستە دادگای ئێراقی زانیاریمان بدەنێ هەرچییەکیان لایە .

**پ : ئەوان مامەڵە لەگەڵ دەزگای فەرمیدا دەکەن، وزارەت بە نموونە .**

وەڵام : با بیان دەنێ، باشە . من لێرە لە ڕێگەی ئەم ڕۆژنامەیەی ئێوەوە داوا لە هەموو لایەك دەکەم کە چی لە ئارشیفیانە، هەر شتێك هەیە تایبەتە بە کۆمپانیا هۆڵەندیەکان بۆمان بنێرن، تاکو ئێمە بتوانین ئەو کۆمپانیایانە حوکم بدەین . ئەو کەسانەی پەیوەندییان بەو کۆنتراکتەکانەوە هەبووە لەو کاتە با بیان دۆزینەوە، کەڵك لە زانیارییەکانیان دەبینین، ئەوانەی ئەو زانیاریانە دەبەخشن حوکم نادرێن .

**پ : ئایا پێت وا نییە ئەم کارە پێویستی بە هاوکاری هەموو کورد دەبێت لە هۆڵەندا ؟.**

وەڵام : بەڵێ پێویستیم بە هەموو هاوکارییەك هەیە . بەڵام لە ئانرات کە خۆی دانینابوو بە تاوانەکەیدا، ئاسایی بوو بە ئاشکرا کار بکرێت، وەلێ لێرە وا نییە، ناتوانرێت بەو شێوەیە کار بکرێت .

**پ : چۆن بیستت ئانرات کەیشتۆتە هۆڵەندا ؟.**

وەڵام : لە ڕێگەی تەلەفزیۆنەوە، کەناڵی ئەین فەنداخ .

**پ : کە زانیت چیت کرد ؟.**

وەڵام :پێشتر ناویم بیستبوو، ناوی دەهاتە پێشەوە، کە بینیم هاتە سەر تەلەفزیۆن، یەکسەر دەستمان بە ئیجرائات کرد .

**پ : ئەو ئیجراااتانە چی بوون ؟.**

وەڵام : دوای ئەوە یەکسەر هاتم لە پەرلەمان داوام کرد کە ئەم مرۆڤە پێویستە دادگایی بکرێت .

**پ : نازانیت بەروارەکەی کەی بوو ؟.**

وەڵام : نەخێر نازانم لە یادم نەماوە .

**پ : کێ داوای لێت کرد، ئەم هەنگاوە بنێیت ؟.**

وەڵام : کەس داوای لێم نەکرد، بۆخۆم کردم . ئەو تاوانبار بوو بە ناردنی چەکی کیمیاوی بۆ عێراق، بەس تێناگەیشتین بۆ مخابەراتی هۆڵەندی دەیان پاراست، هەر ئەمەش بوو وایکرد حکوومەت تاوانبار بکەین . کابینێتی ئەوات نایە ویست هیچ بکات، چونکە دەیووت دۆزەکە کۆن بووە، دۆنەر وەزیر داد بوو لە پارتی سی دی ئای . وەزیری داد دەیووت : کۆن بووە، بەرژەوەندی ئابوورییە، منیش وتم : نابێت ئەوە شتێکی مرۆڤانەیە، خەڵکی کوشتووە، پارمەتی سەدامی داوە، هەموو کات لەسەر ئەوە قسەم دەکرد .

**پ : وەك لە دادگا هەموو کوێبیستی بووین بە بەرپرسیاریەتی، کە چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی ئانرات لەگەڵ کەناڵی تەلەفزیۆنی " نێت ڤێرك " بووە سەرچاوەی بە دادگایی کەیاندنی ئانرات، کە فرێد تەیفن بەو کارە هەڵسا ؟.**

وەڵام : فرێد تەیفن بەرپرسیارێتی لە ئەستۆ بوو، بەڵگەنامە کۆ بکاتەوە، ئەو لەناو دادگا بوو، داواکاری گشتی بوو . تا لە پارلەمانەوە گڵۆپی سەوز هەڵنەکرایا بۆ دادگاییکردنی ئەو نایتوانی هیچ بکات . دەزانین ئەو کاری زۆری کرد، هەردووکمان ڕۆڵمان هەبوو، ئەمە ڕاستە .

**پ : دەتوانین بڵێین حکوومەتی هۆڵەندا خۆی ئانراتی دایە**





دادگا؟.

وەلام : حکوومەتی هۆڵەندا دوای ئەوە قایل بوو، کە پارتی سۆسیالست پاڵەپەستۆی زۆری کرد بۆ بە دادگایی گەیاندنی، کەچی ئێستا هۆڵەندا دەڵێت سەیرکەن ئێمە چەندە مرۆڤایەتین هاووڵاتی خۆمانمان دادگاییکرد .

**پ : ئایا ئێوە پەی لە بۆچوونێکی مرۆڤایەتییەوە ئەمەیکرد، یان کەسێک، لایەنێک کاریگەرییان لەسەر دانا بۆ ئەوەی ئەم هەنگاوە بنێت ؟.**

وەلام : ئەم هەموو پەیوەندییە باشەی هەمان بوو لە گەڵ کورددا، ئەو هەموو ئازارەی بە کورد گەیشتبوو، وایکرد ئەمکارە بکەین . ئەگەر من وەك پەرلەمانتارێك بزانم ئەم تاوانە کراوە چۆن ئەبێت بێدەنگ بم بەرامبەری، ئەمە باشترین کار بوو بیکەم بۆ کورد، خۆم دەبوایە بمکردایە، بە قسەی کەس و هیچ لایەنێك نەمکردووە . ئێمە وەك پارتێك هەست بەوە ناکەین بۆ پارت کارێك بە قازانجە و باشە ئەوسا بیکەین، بەڵکە ئێمە بۆ مرۆڤایەتی ئەمکارەمان ئەنجامداوە . دەبوایە هەر بمانکردایە، ئەمە باوەڕمانە .

سەیرکەن مۆگابی دژ بە گەلەکەی کیمیاوی لە وڵاتەکەی بەکار هێناوە، ئەمە وا دەکات ئیجرائات وەربگرم لە دژی، مەسەلەکە کورد نییە، مەسەلە لێرە مرۆڤایەتییە، ئێستا بیر لەوە دەکەمەوە و پرسیاری ئەوە دەکەم، ئایا کێ کیمیاوی داوە بە مۆگابی ؟، جارێکی دیکە بەڵگە هەیە کە دەلالی هۆڵەندی داوییەتی، بۆیە بە قسەی هیچ کەس و لایەنێك ئەو کارەم نەکردووە، ئەو کارە لە باوەڕو ویژدانەوە بووە .

**پ : ئەی بەرامبەر تاوانبارانی دی، ئەوانەی راستەوخۆ دەستیان لە تاواندا هەبووە ؟.**

وەلام : لێرە سیستەمی ئیف یەك هەیە، بزانن ئەوەی تاوانی کردووە، ئەوە لێکۆڵینەوەی تایبەتی بۆ دەکەن، بە پێی ئەو یاسایە ئەوەی خۆی تاوانبار بێت، ئەوا وەچەکانیشی لە ماف بوون بە هۆڵەندی بێبەری دەبن، ئەمە خراپە، منداڵ نابێت باجی باوکی بدات . لە جەنگی جیهانی دووەم زۆر هۆڵەندی بەشدارییان کرد لە تاوانەکانی هیتلەر، کە باوکەکان حوکمدران ئەوەندە بۆ منداڵەکان بەس بوو ە باوکیان سزا دراوە، ئێستا پێویستە وا بێت، منداڵەکان بۆ دەبێت لە گەڵ باوکیان سزا بدرێن .

لە کۆتاییدا ئێوە دەتوانن زۆر هاوکاریمان بکەن، وەك چۆن لە دادگای ئانرات ئەو فاکسەی هێناتان لەسەر ئەو، کاریگەری زۆری لەسەر حوکمدانەکەی هەبوو، سزاکەی قورستر کرد، ئێستاش پەیداکرنی بەڵگەنامە گرنگە بۆ کارەکان .

## پۆلیسی هۆڵەندی هەوڵی زۆری دا ئەنفال و کیمیابارانکردنی هاووڵاتیانی کوردستان بە جینۆساید بناسرێت .

***سازدانی عەلی مەحمود محەمەد، بە هاوکاری ئەندازیار و نووسەر و چالاکڤان نیهاد قازی کە سەدان کم ڕێگای بڕی بۆ ئەنجامدانی ئەم چاوپێکەوتنە***

فرانس ڤان ئانرات یەکەم تاوانکار بوو لە بەرامبەر هاوبەشیکردنی لە ئەنجامدانی تاوانی مەزن بەرامبەر بە گەلی کورد دادگایی کراو بە شانزە ساڵ و نیو زیندانی سزا درا، بە تاوانی ئەنجامدانی تاوانی جەنگ .

لەم چاوپێکەوتنەدا گفتوگۆ لە گەڵ دووان لەو بەرێزانەی پشکنینی جدیان لەسەر ئەو دۆسیەیە دوور لە چاوی کامیراکان و بڵاو کردنەوەی ناو وێنەیان ئەنجامدا ((کە لەم چاوپێکەتنەشدا نەمان توانی وێنەیان بڵاو بکەینەوە)).

**پرسیار: پۆلیس لە کوێوە بەشداری پرۆسەی دادگاییکردنی فرانس ڤان ئانراتی کرد، نیعازی لە کوێوە بۆ هات ؟.**

وەلام :پاش ئەوەی چاوپێکەتنی لە گەڵ تەلەفزیۆنی نێت ڤێرك لە ساڵی٢٠٠٣ دا ئەنجام دا،باسی لەوە کرد پارمەتی سەدامی داوە بۆ بە دەست خستنی چەکی کیمیاوی،لە

سەر ئەو بنچینەیە دەستمان کرد بە ئەنجامدانی پشکنین لەسەر وتەکانی،دوایی رون بوەوە لە چەندین رۆژنامە و گۆڤاری دیکەش باسی کردووە و چاوپێکەوتنی ئەنجام داوە. ئەمە هۆکاری دادگاییەکە بوو .راگەیاندنی ئەمەریکیش پێشتر باسی کردبوو،بە پێی راگەیاندنی ئەمەریکی لە کۆتایی هەشتاکان،فرانس ڤان ئانرات مادەی کیمیاوی ناردووە بۆ ئێراق،لو بارەیەوە گومرگی ئەمەریکی زانیاری وردی بەخشی پێمان .

گومرگی ئەمەریکی دەستی کرد بە پشکنین لە خانوو کۆمپانیاکان ئانرات، لە دوای ئەم چاوپێکەوتنە زانیاری تەواو وەرگرترا لە سەر هەناردە کردنی مادەی کیمیاوی لە لایەن فرانس ڤان ئانراتەوە بۆ ئێراق . پۆلیسی هۆڵەندی زانیاری وردی لەسەر هەناردە کردنی مادەی کیمیاوی لە لایەن ڤان ئانراتەوە بۆ ئێراق لە ئامەریکا وەرگرت . تەنها ناردنی مادەی کیمیاوی نەك شتی دی، لەو چوار چێوەیە دۆسیەیەکی گەورە لە هەزاران بەڵگەنامە ئامادە کرا، موتابەعەی سەرجەم مەلەفەکە، کاغەز بە کاغەز، خاڵ بە خاڵ، بەڵگە نامە بە بەڵگە نامە بە وردی کرا . لە گەڵ پۆلیسی گومرگی هۆڵەندی گفتوگۆی چڕ ئەنجامدرا،لە سەر ئەو زانیاریانە،ئاشکرا بوو کە فرانس ڤان ئانرات لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکانەوە تاکو کۆتایی دەیەی هەشتاکان مەوادی ئەوەلی چەکی کیمیاوی هەناردە کردووە بۆ ئێراق . داوای ئەو مادە کیمیاویانەی کردووە دوو بەکار هێنەر بوونە، لە پیشەسازی سڤیل و درووست کردنی چەکی کیمیاوی بەکار هاتوونە . کۆی گشتی تەنها مادەی (T D G) ١٤٠٠ تەنی بۆ عێراق پەیدا کردووە . بەم ئەنداوە زۆرە لە مادەکان زانرا ئەو مادانە بۆ کاری دیکە بەکار هاتووە نەك بۆ پیشەسازی سڤیل، واتا بۆ کاروباری سەربازی .

پسپۆرەکان لەو بوارەدا چاودێری مادەکانیان کرد، پشکنینیان لەسەر کردن بزانن ئەو مادانە چین و چۆن بەکار هاتوون وە بۆچی بەکار دێن ؟.

لە ژاپۆن و ئەمەریکا زۆربەیان کرابوون، بە ئیتاڵیایا رەوان کرابوون بۆ بەندەری عەقەبە لە ئوردن لەوێشەوە بە ترێلە نێردراون بۆ عێراق و شاری بەغدا.

لێکۆڵینەوە لەسەر پرۆسەی چۆنیەتی ناردنی ئەو مادانە بۆ عێراق ئەنجام درا .لە ناوەراستی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٨٤ یاسایەك دەرکرا،بازرگانیکردن بەم مادانەوە قەدەغە کرا. پۆلیسی هۆڵەندی پەیوەندیکرد بە نەتەوە یەکگرتووەکان (یونسکۆم) ەوە، بۆ ئەوەی بزانین چییان زانیوە لە سەر فرانس ڤان ئانرات و بازرگانیکردنی بە مادەی کیمیاوییەوە، ئاشکرایان کرد کە ١٤٠٠ تەن کەرەستەی خاوی مادەی کیمیاوی TDG هەناردە کردووە بۆ ئێراق،کەرەستەی خاوی دیکەشی ناردبوو بۆ دروستکردنی چەکی کیمیاوی ((سارین _ تابون))، بە قەبارەیەکی زۆر زۆر .هاوکات لە گومرگی هۆڵەنداش زانیاری تەواو پەیدا کرا، کە دەیسەلمێنێت ئەو زانیاریانە راستن.

FFCD و TNO دۆسیەیان ئامادە کرد، لەسەر کات و بڕی ناردەی کەرەستەکان،لە راپۆرتەکانیاندا هەموو زانیارییەکانی بە وردی تێدایە . لەو ئامارانەوە دەرکەوت کە فرانس ڤان ئانرات و کۆمپانیاکانی چەندە کەرەستەی خاوی درووستکردنی چەکی کیمیاوی هانارده کردووە بۆ عێراق . لەو دۆسییەوە زانرا کە عێراق چی و چەند جۆر مادەی کیمیاوی هاوردە کردووە و وەری گرتووە و هەیبووە .

دەرکەوت برەکەش بە ئەندازەیەك زۆر بوو،رون و ئاشکرایە بۆ درووست کردنی چەکی کیمیاوی و لە کاروباری سەربازی بەکار دەهێنرێت .

بۆیە ئاشکرابوو پرۆسەکە بەم شێوەیە چۆتە پێشەوە، یەکەم جار ئامادە کردن دوایی بەکار هێنانی، هەموو ئەو پرۆسەیە بە دورو درێژی بە وردی لە دۆسیەکەدا هەیە.

لە دوای ئەوەی مەلەفاتی پێویست بە دەست خرا، دەستمان کرد بە هێنان و پەیدا کردنی شایەد حاڵ و خەڵك . ئەو شایەدانە سەلماندیان گازی خەردەل لە لایەن ئێراقەوە بەکار هاتووە،کە ئەوانە بۆ خۆیان لە داورودەستەی





سەدام بوون و کاریان لە گەڵیان کردبوو و نزیک بوون لە گەیشتن بە زانیارییە هەستیارەکان . شایەدەکان زانیاری هەستیاریان بەخشی لە نێوان ساڵانی سەرەتاو کۆتایی هەشتاکان،لە سەر پەیدا کردن و درووست کردن و بەکار هێنانی چەکی کیمیاوی، گواستنەوەو گەیاندنی لە ئێراقدا

دوای ئەوە لێکۆڵینەوەمان کرد کەی بەکار هاتووە،مێژووی بە کار هێنانی، لە ڕێکخراوی ستیختینگی چاك و کۆمیتەی هەڵەبجە زانیاریمان وەرگرت، لە سەر قوربانییەکان و جۆری ئازاریان، زۆربەی قوربانییەکان کە چاومان پێیان کەوت و مامەڵەمان لە گەڵیان کرد بە گازی خەردەل بریندار ببوون .ئەوەش خراپترین جۆری مادەی کیمیاوییە کە کاریگەری لەسەر مرۆڤی زامدار دادەنێت تا قۆناغی مردن .
یەکێك لە قوربانیەکان باسی ئەوەی کردووە کە خەردەل لێت بدات،کە گازی ژەهراوی لێت بدات چەندە ئازاری زۆرە، تا مردن پێوەی دەناڵیت و رزگارت نابێت لە دەستی

ئێمە بەردەوام بووین لە پشکنین،حکوومەتی هۆڵەندی یارمەتی یاسایی قوربانیانی کرد بۆ سکاڵا تۆمار کردن .هاوکات ئێمە پشتوان و پشتگیری گەلی کورد دەکەین لەم کێشەیە،بە خەڵکمان ڕاگەیاند ئەم میلەتە چەوساوەتەوە،بە گازی کیمیاوی لێی دراوەو بە کۆمەڵ کوژراوە .
پشتگیری گەلی کورد دەکەین بەو ئیسپاتاتەی کە هەمانە بە ئەنجامدانی دادگایەکی جدی و دادپەروەرانە بەرامبەر بەم تاوانبارە .
لێکۆڵینەوەمان کرد لە سەر تاوانەکانی هەڵەبجە، گۆپتەپە، زێوە، فرجینی، ڕۆیشتین بۆ شاری سەردەشت، لەسەر داواتی حکوومەتی ئێران وە پشتیوانی حکوومەتی ئێرانی چووین بۆ شاری سەردەشت بۆ ئەوەی پشکنین و لێکۆڵینەوەی خۆمان بکەین،چاومان بە قوربانییەکان کەوت و دیدارمان لە گەڵیان ئەنجام دا .
ئاشکرا بوو بۆمان لە کاتی شەڕی عێراق- ئێراندا چەکی کیمیاوی لە لایەن عێراقەوە بەکار هاتووە دژ بە ئێرانییەکان،لێکۆڵینەوەمان کرد لە شاری محەمەرە، پشکنینی زەوییەکەی نەك خەڵکەکەی،چووینە ناوچەی عەبادان، بە وردی گوێمان لە شایەدەکان گرت، جێگاکانی بە کار هێنانی چەکی کیمیاویمان لێی بینی، دەرکەوت چەکی کیمیاوی لەو ناوچەیە بەکار هاتووە .
پاشان دۆکۆمێنتی زیاترمان پەیدا کرد، راپۆرت و نووسراو لەسەر ئەنفال نووسرابوون، بەکار هێنانی چەکی کیمیاوی، ڕۆڵی عەلی حەسەن مەجید، ڕاپۆرتی حوسێن کامل، فەرمانی بەکار هێنانی چەکی کیمیاوی، ڕاپۆرتی هیومان رایت وچ، دەنگی عەلی حەسەن مەجید لەو کاتانەی داوای کوشتنی کوردەکان دەکات، گەورەترین پشکنین لەم کەیسە پۆلیس و وزارەتی داد ئەنجامیان دا .
ئەوەی زۆر دڵمان پێی خۆش بوو و هیوامان لەسەر بنیات نا ئەوە بوو دادگا یەکەمجار بڕیاری دا ئەوەی لە ئەنفال و کیمیابارانـدا بەسەر کورددا هاتووە کردەی جینۆسایدە،وەلێ دواتر لە پرۆسەی پێداچوونەوە ئەم بڕیارەی بەتاڵ کردەوە و دانی نەنا بەوەی ئەم پرۆسانە جینۆساید بن، پۆلیس پێی خۆش بوو یەکەمجار ئەو بڕیارە درا،بەڵام زۆر پێی ناخۆش بوو دادگا بڕیاری خۆی لەسەر هەقیقەتی تاوانەکە لە جینۆسایدەوە گۆڕی.
**پرسیار : چۆن فرانس ڤان ئانرات گیرا ؟.**
وەڵام : لە دوای ئەوەی تۆمەتباری لەسەر فرانس ڤان ئانرات ساغ بوەوە، خرایە ژێر چاودێرییەوە،بۆ ئەوەی بزانین لە گەڵ کێ پەیوەندی دەبەستێت، گفتوگۆ دەکات، بۆ کوێ دەچێت، چی دەکات و دەیەوێت چی بکات ؟، واتا خرایە ژێر چاودێری وردەوە، لە بەرواری ٦-١٢-٢٠٠٤ کە زانرا دەیەوێت هۆڵەندا بەجێ بهێڵێت، لە ماڵەکەی خۆی بە جانتاکانیەوە گیرا .
**پرسیار : دەتوانین بڵێین نەگەر ڕاگەیاندن ئەو چاوپێکەوتنەیان لە گەڵ نەکردایە، ناگیرا؟.**
وەڵام :نا ناتوانین وا بڵێین، چونکە هەموو قەزیەیەك بە شێوازێك دیاریکراو جیا دوای دەکەوین، ڕاستە لێرەدا میدیا هۆکاری سەرەکی دادگایەکە و گرتنی و حوکم دانی بوو .

**پرسیار: ئایا کاریگەری هیچ لایەنێک نەبوو لە سەر ئێوەو وزارەت بۆ دادگایی کردنی؟، حیزب، ڕێکخراو، پارلەمان؟.**

وەڵام :ئیتلاقەن وا نییە و نەبووە، ئێمە جیاوازین لەوان،بڕیارەکە لە خۆمانەوە بوو وە پاش چاوپێکەوتنەکە لە گەڵ تەلەفزیۆنی نێت ڤێرك وەك ئاماژەی پێ درا دۆسیەی بۆ کرایەوەو دادگایی کرا .

**پرسیار : لە حالەتێکدا ئەگەر فرانس ڤان ئانرات هۆڵەندی ڕەسەن نەبوایا، هەر دادگایی دەکراو سزا دەدرا ؟.**

وەڵام : بەڵێ سێ خاڵ گرنگە بۆ دادگایی کردن :

١- هۆڵەندی بێت((ناسنامەی هۆڵەندی هەبێت)) .

٢- ئەگەر تاوان بەرامبەر بە هۆڵەندی ئەنجام بدات .

٣- ئەگەر لە ناو هۆڵەندا تاوانەکە ئەنجام بدات.

تاوان پەیوەستە بە مێژووی ئەنجام دانی تاوانەکەوە، بۆ تاوانی جینۆساید دەگەڕێنەوە بۆ ١٩٧٠ .لەم ٣ حالەتەدا تۆمەتبار دادگایی دەکرێت و سزا دەدرێت

**پرسیار : ئەگەر فرانس ڤان ئانرات سزای سەپاو بەسەریدا تەواو کرد، ئایا ژیانی ئاسایی خۆی دەست پێ دەکاتەوە؟.**

وەڵام :هەر تاوانکارێك یەکجار لەسەر تاوانەکەی سزا دەدرێت،لای ئێمە زانراوە چی کردووە، دواى سزاکەی ژیانی ئاسایی خۆی دەست پێ دەکاتەوەو دەگەڕێتەوە ناو کۆمەڵگا .

جرائم حرب: يرجى إبلاغنا عنها!

لقد هربتم من بلد قد يكون يمر بحالة حرب، فإن ما شهدتموه في بلدكم الأصل من تجارب ان تعود لنا بالفائدة والتي يمكنكم التعرف من خلالها على مجرمي حرب متواجدين حالياً في هولندا.





جرائم حرب:
يرجى إبلاغنا عنها!

فريق الجرائم الدولية



تەنیا تورکن. بێگومان جگە لە کورد نەتەوەی دیکەشی لێ بوون. لە ساڵی ١٩١٥دا، ئەرمەنیش لە تورکیا هەبوون و کەوتنە بەر شاڵاوی کۆکوژی بزووتنەوەی (ئیتحاد وتەرەقی)یەوە، هەروەها لازیشی لێ بوون، ئەگەرچی ناوچەی دیاریکراوییان نەبوو. هەروەها چەرکەسەکانیش لە ئەنادۆڵ و کوردستان بڵاوببوونەوە. بەڵام بێگومان کورد لە هەموو نەتەوەکانی دیکەی ناو تورکیادا ژمارەیان زۆرتر بوو. وێرای ئەوەی کە لە ناوچەیەکی دیاری کراو (کوردستان) لە وار و وڵاتی تایبەتی خۆیاندا دەژین .......تەواوکەری ئەو ناچەیە لە ئێران و عێراق و سوریاشدا هەر کوردستانە.

لەم بارەدا، ئێمە لە بەردەم راستییەکی سوسیۆلۆژی داین کە بوونی کوردە وەك نەتەوە، بۆ چارەسەرکردنی ئەو پرسە، ئەتاتورك لە بری رێگای دیموکراسی، رێگای دوژمنکاری و چەوساندنەوە و تاکرەوی گرتە بەر. بەڵام بۆ بەرتەسك کردنەوەی ئەو جۆرە کارانە بیردۆزە تایبەتییەکەی خۆی دارشت، راستییەکەی ناکرێت باس لە رێگای دیموکراسی ئەو بۆچوونانە بکرێت کە کوردستانی بەهاوکاری ئیمپریالیزمی رۆژئاواوە پێ پارچە پارچە دەکەن وسیاسەتی پاڕپاژکردنی نەتەوەی کوردی پێ پەیرەو دەکرێت. بۆ یەکەمین جار لە یاسای ساڵی ١٩٢٤دا هەوڵی چارەسەرکردنی دۆزی کورد بە شێوازی ئایدیۆلۆژیاوە، دەبینین، ئینجا دەبوا ئەو چارەسەرییە ئایدیۆلۆژییایە بە ئامرازە سەربازییەکانەوە بسەپێنرابایە. بە بیروبۆچوونی ئەو یاسایە، هەرچی لە ناو سنووری دەوڵەتی تورکیا، دەژیت، ئەوا تورکە و ئاسوودە و کامەرانیشە، چونکە تورکە. ئەو بیرە ئەو بەرەنجامەی لێ دەکەوێتەوە کە دەڵێت:

"ئەو دەوڵەتە بەخاك و گەلەکەیەوە لێك دانابڕێن".

ئیدی بەو رێگایە هەوڵدەدرێت چارەسەری پرسی سوسیۆلۆژی و سیاسیی لە رێی پێك گرتنی بە ماددەکانی یاسای ناوبراودا بکرێت، ئامانجیش گۆڕینی باری بابەتی شتەکانە. واتە گۆڕینی ژیان خۆی بەهۆی یاساکانەوە. لە رێی ئەو یاسایانەوە ئەرکێکی زۆر بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجە خەرج دەکرا، لەبەر ئەوەی بەپێی یاسا، هەموو کەسێك لە تورکیا تورکە، بۆیە دەبوا کوردیش تورك بن، لە روانگەی ئەو یاساییە خۆی، ئەوا پرسەکە بۆ تاهەتایی یەکلا بۆتەوە.

دیارە لەمەشدا، وا پێویست دەکات، کورد لە سینگی خۆی بدات و هاوار بکات ئەز تورکم، من دڵخۆشم، ئای بوونە تورك چەند خۆشە.

لەو بارەدا ئەوانەی دەڵێن ئێمە کوردین و ئەوانەی داوای ماف نەتەوەییەکانی کورد دەکەن لەبەردەم یاسا تاوانبارن، خائینی نیشتمانن. هەروەها یاسا دەڵێت ئەو جۆرە کەسانە پێویستە لەناوببرێن و بەبێ بەزەیی پاکۆ بکرێن. ئەو کارانەی لە ئاکامی کردەوەی ئەوان دەکەوێتەوە، پێویستە لە رێی کۆکوژی و لەداردان و دوورخستنەوە سەرکوت بکرێن. هەموو رەوشێکی خێرا بۆ تواندنەوەیان پەیرەو بکرێت. وەك دەبینین هەموو ئەوانە ئەنجامی ئەو کارە بنەرەتییانەن کە لەیاسای ناوبراودا هاتووە.

دوابەدوای ساڵی ١٩٢٣، کارو کۆششێکی زۆر کرا تاکو بارودۆخی گشتی بگەێننە ئەو ئاستەی یاساکە بۆی دارشتبوو، نکوڵی لە بوونی نەتەوەی کورد کرا. هەرچی ئەوانەش بوون کە لە کوردستانی و نەتەوەی کورد بوون، نەپرینگانەوەو ئەوا دووچاری تەنگ پێهەڵچنینی زۆر بوونەوە.

بە زۆریش پەنا دەبرایە بەر دوورخستنەوە، کۆمەڵ کۆمەڵ کوردیان دووردەخستەوە، گوند و شارییان بە تەواوی چۆڵ کردن، سەرلەبەری هۆزیان دوورخستەوە، ناوچەی داخراویان دروست کرد، مەبەست لەوەش تواندنەوەی کورد بوو لەبۆتەی نەتەوەی تورك و کولتووری تورکی و کوێرکردنەوەی خەسڵەتە نەتەوایەتییەکانی نەتەوەی کورد بوو. وە ك شوێنی





-ووزخستنەوەش، دەریای ئیجە و دەریای ناوەڕاست و ناوەڕاستی ئەنادۆڵ و تورکیایان بەکاردەهێنا.
لە هەمان کاتدا ئەرکێکی زۆریان بۆ نیشتەجێ کردنی ئەو تورکانەی کە لەیۆگسلافیا و ڕۆمانیا و یۆنان و هەنگاریا و یەکێتی سۆڤێتەوە هاتبوون لە کوردستان وەگەڕخست، لەو کاتەی کە دەوڵەتی تورکیا لە ژێر سەرکردایەتی ئەتاتورک سەرگەرمی ئەو کارە بوون، ئەوا ئینگلیزیش هەمان سیاسەتییان لەباشووری کوردستان و فەرەنساییەکانیش لە باشووری ڕۆژئاوای کوردستان و لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش هەمان سیاسەت و هەمان کار بەڕێوە دەچوو. هەگەرچی ئەو شێوازانەی پەیڕەو دەکران، سەختێ جیاوازییان هەبوو، بەڵام لەناوەڕۆکدا وەك یەك بوون. لێرەدا پێویستە بە بوونی ئاماژە بە یەکێك لەو تایبەتمەندییە بنەڕەتییانەی دەوڵەتی تورکیا و ئایدۆلۆژیای ڕەسمی تورك بکەین، کە نکۆڵینی کردنی کوردە.
ئەنجامی بنەڕەتی نەهێشتنی ناوی کوردستان و کورد بوو لەبیروئاوەزی خەڵك و لە مێژوو و نەهێشتنی هەرچی جۆرایەتی کوردە، ئەوەبوو بوونی کۆمەڵی کوردەواری لەسەر ئەوە دیاری دەکرا. لە پێناو گەیشتن بەو ئامانجەش، زۆر بە مکوڕی بانگەشەیان بۆ ئەو دروشمە دەکرد کە دەڵێت "دەوڵەت یەکە و گەل و خاکەکەی پارچە ناکرێن"، تایبەتیی دووەمی دەوڵەتی

تورکیا، دەوڵەتێکی دژە کۆمۆنیستییە، بێگومان تایبەتمەندی دیکەشی وەك بیروڕا هەن و پەسندی کردوون، کە وەك بیروڕای عیلمانی بۆتە خاوەنیان، بەڵام ئەو بیروڕایانە بەندیواریان بە دوو ڕووکاری سەرەکی سەردەستەوە هەیە، هەروەك پێشتر ئاماژەی پێ کرا، ئێمە پتر لە ئاست کرۆکی دژە کوردی ئەو دەوڵەتە دەوەستین. بە وردیش لەئاست ناوەڕۆکی ڕەگەزپەرستی کۆلۆنیالیزمی هەڵوەستە دەکەین، لەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە یەکێك لە پێگە ڕۆنراوە بنەڕەتییەکان لەکاتی داڕشتنی ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی تورك بە بوونی نەتەوەی کوردەوە پەیوستە. ئەو ئایدیۆلۆژە پەرە دەسێنێت، بێ گوێدانە باروودۆخە ڕاستەقینەکە و بنەماکەش درۆیە. لەو جۆرە ڕوانگەیەوە



دەبێژین ئەو ئایدیۆلۆژیایە کە لەسەر ساختەیی بنیات نراوە، چونکە پشت بە درۆ وەك پێکهاتەیەکی بنەڕەتی دەبەستێت، بەدواشیدا کارەکانی لەسەر ساختەیی ڕۆنراوە و هەر لە دەوری ئەو ساختەیەشدا بەرگری کردنەکەی دەخولێتەوە، لە واقیعی ڕاستەقینە و واقیعی مایەکی و واقیعی زیندوو، هەوڵ دەدات واقیعە ئایدۆلۆژیاکە بخاتەڕوو، دواتریش باڵ بەهەر یەکێکەوە بنێت، کە ئەو واقیعە ئایدیۆلۆژیایە لەبەرچاو بگرێت واقیعی ڕاستەقینە و واقیعی مایەکی و واقیعی زیندوو ببەزێنێت.







وا چـۆنیەتی بەنـدیواری ئایـدیۆلۆژیای ژەهـراوی تورکیتـان بـە درۆ و دەلەسـەوە بـۆ وێنـا دەکـەین، بـۆ نموونە یەکێك بە فیل دەڵێت ئەوە درەختە، فیلی وەك درەخت وەرگرتووە، ئاخۆ قسەی ئەو ئادەمیزادە لـە بـارەی فیلـەوە چـەند راسـت بێـت؟ تـا چ ئەندازەیـەك دەتوانین بەو داوەرییەی ئادەمیزاد لەبارەی فیلەوە قایل بین، دوای ئەوەی خۆی بۆچوونێکی خراپی لەبارەیەوە هەیـە. بێگومـان لـەو تێگەیشتنەدا شتێکی نادروست هەیە، چونکە وێناکردنی فیل لە شێوەیەکی خراپ وەك درەخت. کە ئێمە قایل بووین فیل بکەینە درەخت، ئەوا هەموو داوەرییەکمان بەندیواری بە درەختەکەوە دەبێت و هیچ سەروکارێکی بە فیلەوە نابێت. دەبا پلەی راست و دروستی ئایدیۆلۆژیای تورکی ئاوێتەی زانیاری درۆ کە دەڵێت کورد تورکە، هەروەك لەسەرەوەش ئاماژەمان بۆ کرد، کە ئێمە قایل بووین کورد تورك بێت، ئەوا بێگومان داوەرییەکەمان بە دەوری تورکدا دەخولێتەوە. دەڵێن: راستییەکەی ئەتاتورك نەتەوە پەرستە، بەڵام هەرچی توخمە نەتەوەییەکانی ئەو هیچ سیفەتێکی رەگەزپەرستی تێدا نییە، بەلای ئەوەوە ئەوەی لە تورکیادا بژیت ئەوە تورکە و خۆشی دان بەوەدا بنێت ئاماژە بە قسەکەی دەکەن: "ئای چەند بەختەوەرە، ئەوەی دەڵێت تورکم".

هەروەك تێبینی دەکەین، کەمالیزم هەموو ئەوانەی لە تورکیا دەژین بە تورکیان پۆلێن دەکات، خۆشی دان بەوەدا بنێت تورکە. بەڵام بەر لەوە بەشەکانی باکووری کوردستان کەوتبووە بن دەستی تورك و سیاسەتێکی شۆڤێنی و کۆڵۆنیالیزمی لێ پیادە دەکرا، هەوڵیش دەدرا پرسەکە وەك کێشەیەکی ئایدیۆلۆژی چارەبکرێت. خاکی کورد بووە نیشتمانی تورك. پاش ئەوەش هەر کەسەی بەتورك بوون قایل بێت دەبووە تورك. لێرەدا پێویستە ئەوە بپرسین ئایا دەکرێت راستییە سوسیۆلۆژییەکان بە بەندەکانی یاسا و بڕیارەکانی دادگا نەهێڵین؟ ئینجا ئەگەر ئەوە بکرێت، ئەی بۆچی دەوڵەتی تورکیا لە قوبرس جێبەجێی بکات؟ واتە سەرلەبەری قوبرس داگیر بکات. لەدوای ئەوەش یاسایەك دابڕێژرێت کە رەوشی سیاسی سەبارەت بە "هەر کەسێ لە قوبرس بژیت ئەوە تورکە یان دەوڵەتی قوبرسی بە گەل و خاکەکەی یەکن. بەو رێگەیە یۆنانییەکان دەبنە تورك". ئەو زەوییەی لەسەریشی دەژین هەر دەبێتە تورك. هەرکەسێ داکۆکی لە مافە نەتەوەیی و دیموکراسییەکانی یۆنان بکات بە "خوازیارانی پارچە پارچە کردن" و "جیا خوازان" ناوزەد دەکران، یان ئەوانەی بەرەڤانی لە بەتورك بوون دەکەن بە خائینی نیشتمانی ناوبرێن، بەو دوژمنانەی ناوەوە و دەرەوە گەرەکیانە قوبرس دابەش بکەن کە بە گەل وخاکەوە یەکپارچەیە و پارچە پارچە ناکرێت. ئەو کەسانەش کە مل بۆ بەندەکانی ئەو یاسا پیرۆزە و بەرگریکەرانی مافە نەتەوەیی و دیموکراسی یۆنانییەکان کەچ ناکەن بدرێنە دادگا و بخرێنە زیندانەوە.

هەڵبەت ئەو گریمانانە بیردۆزەیین و جێبەجێ کردنیان کردەنی نییە، چونکە گەلی یۆنانی نەچەوساوە، نەژێر دەستەیە وەك گەلی کورد، ئەلێرەدا نەخشی رێکخراوە جیهانییەکان وەك نەتەوە یەکگرتووەکان بەدەر دەکەوێت. رێکخراوە جیهانییەکان لە ئەوروپا و لە جیهاندا زۆر بە چاکی ئاگایان لە کردەوەکانی دەوڵەتی تورکیایە بەرانبەر بەو یۆنانیانەی کە لەبن دەستی داگیرکاری تورك دان، بۆیە تورکیا نەیدەوێرا بوونی نەتەوەی یۆنانی پشتگوێ بخات یان دانی پێدا نەنێت، کە بە ماددەی یاسایی و بڕیاری دادگا و فەرمانی سەرکردایەتییەکان رووبەڕوویان ببێتەوە. بەڵام دەوڵەتی فەرمانڕەوای تورکیا باش دەزانێت نەتەوەی کورد نەتەوەیەکی چەوساوەیە دوابەدوای شەڕی یەکەمی جیهان تاکو ساڵی ١٩٢١، نەتەوەی کورد پارە پارە و



ـێت هەڵوەشێنراوەتەوە و بەرەوە پێگەی -کۆڵۆنیالی ـیونەوڵەتی- برد. ئەو سیاسەتی پارچە پارچەکردنەی ـیمپریالیزم وکۆڵۆنیالیزم، پەیکەری کوردستانی تێك و ـێت شێلا و مێشکی پەرت و بڵاو کرد. سیاسەتی ـەگەزپەرستانەی کۆڵۆنیالیزمانەی پەیڕەو کراو بزاڤی ـیشتمانی کوردی لە کاری شۆڕشگێڕانە و ـیموکراسیانەی جیهانی دابڕی بوو، بە مەبەستی ـیەش کردنی لە ـەموو پاڵپشتێکی ـەتەوەیی یان واتایی، ـرڤی نیشتمانی ـیموکراسیی کورد ـەر بەردەوامە، ـیچ گومان نییە ـەو راستییەی کە ـەو وڵاتانەی ـەشتی یەکدی ـەداگیرکردنی کوردستان دەگرن- کۆڵۆنیا- ـەوڵدەدەن ئەو توانا شاراوانە نەهێڵن و بەرەو ئاقاری ـڕوستی هەڵدەن وبەرەو هەڵدێری ببەن.

ـەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (٥٥) ساڵە سیاسەتەکە پەیڕەو ـەکرێت و بزاڤی کوردیش هێشتا بەردەوامە، بۆ نموونە ـە ساڵانی ١٩٢٣-١٩٢٨، ئیمپریالیزمی ئینگلیز لە ـشووری کوردستان بە زۆری هێزی ئاسمانی پاشایەتی ـەریتانیای لە دژی بزاڤی نەتەوایەتی کورد بەکار دەبرد. جۆرەها کۆسپ وتەگەرەی لە بەردەم کرداری پێکهاتنی ـەتەوەیی کورد و دروستبونی دەوڵەتی کورد دروست ـەکرد، سەرکردایەتی کەمالیزمیش لە باکووری کوردستان، رۆژ لە دوای رۆژ سیاسەتی رەگەزپەرستانە و کردارە کۆڵۆنیالیزمەکانی توندتر دەکرد و هەوڵی زۆری دەدا بۆ لەناوبردنی نەتەوەی کورد لە رێی لەناوبردنی بە کۆمەڵ، بە راگواستنی ناوخۆ و تواندنەوەشەوە، ئەوەش بە شێوازێکی خێرا و دڕندانە بەڕێوە دەچوو.



ئیمپریالیزمی فەرەنساش لە سوریا و رژێمی پاشایەتی رەزاشاش لە ئێران لەسەر سیاسەتی رەگەزپەرستانە و کۆڵۆنیالیزمانە بەهەمان شێواز درێژەی هەبوو. دەوڵەتی شۆڤێنی تورکیا باش دەیزانی نەتەوەی کورد نەتەوەیەکی چەوساوەیە، هەروەها دەشیزانی لە هەموو پشتگیرییەکی نێونەتەوەیی بێبەشە، هەروەها دەیزانی دوژمنەکانی زۆر و دۆستەکانیشی کەمن تا ئەو ئەندازەی دەتوانین بڵێین کە بێ دۆست بوون، بۆیە دڕندەترین شێوازی سیاسی رەگەزپەرستانە و داگیرکاریانەی لە کوردستان جێبەجێ دەکرد، دەیزانی کەس نییە نارەزاییەك دەربڕێت و کارەکە ناخرێتە بەردەم رێکخراوە جیا جیاکانی جیهان و هیچ سکاڵایەکیش لە دژی ناکرێت.

لە ئاکامدا نەتەوە یەکگرتووەکان و یۆنسکۆ و پەرلەمانی ئەوروپا لا لە سیاسەتی رەگەزپەرستانەی پەیڕەوکراوی دەوڵەتی تورکیا لەدەرهەق نەتەوەی کورد نەدەکردەوە. سەرەنجام ئەو رێکخراوانە کە لە کێشەکانی ماڤی مرۆڤ و ماڤی نەتەوەکان لە دیاریکردنی چارەنووسییان هەرا و زەنایان دەنایەوە، نە لە خەباتی







نەتەوایەتی کورد دەگەیشتن، نە گوێشییان لێ دەبوو. لەلای دیکەشەوە ڕۆژنامەوانیی تورکیش دانەیەکی هاوشێوەی ڕەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمی بوو، نووسەرە تورکەکانیش هەڵبەت هیچ بەشدارییەکیان نەبوو. ئەو مامۆستایانەی زانکۆ و پرۆفیسۆر و نووسەرانەی کە بایەخ بە ئازادی و مافی مرۆڤ و دیموکراسی و یەکسانی دەدەن، بێ دەنگ دەبن و خۆیان بە ڕەگەزپەرستایەتی و کۆلۆنیالیزمی سەرقاڵ ناکەن. تەنانەت بزووتنەوەی سوسیالیستی تورکیش بۆ نیشاندانی ڕواڵەتی نێونەتەوەیی خۆی، وشەگەلی ئاگرین بەکار دەبات، هەوڵدەدات خۆی لە ڕەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزم بدزێتەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەش بەردەوام دروشمی کەمالیزم دووبارە دەکاتەوە، کە مەبەستی دژایەتی کردنی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم و لایەنگیری چەوساوانە.

کوردیش سەرقاڵی خەباتی نیشتمانی ڕزگاریخوازی خۆیانن لە نێو دوژمنان و پێویستە بەربەرەکانی ئەو ناخۆشییانە بکەن کە دوژمنەکانیان بۆیان دروست دەکەن، ڕەنگە هیچ دۆستییان نەبێت، هۆی ئەمەش دابەشبوونی کوردستانە. ئەو وڵاتانەی کوردستانیان دابڕیووە، هاوکاری یەکتری دەکەن و بە دڕندەترین شێوە کورد سەرکوت دەکەن. هەماهەنگی لە نێوان یەکدی دەکەن. ئەو کوردانەی کە لە هەر یەك لەو وڵاتانەی لە پێناو ئازادی و سەربەخۆی دەخەبتن، لە هیچ شوێنێك کەس نییە بیانپارێزێت. تەواو پێچەوانەیە، سنوور داخراوە، لەسەر سنوور خەباتگێڕانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد دەگیرێن و دەدرێنەوە ئەو وڵاتانەی کە داوایان دەکەن و سێدارەیان بۆ دادەمەزرێنن. کورد ناتوانن لە هیچ پشتگیرییەکی ئابووری یان سیاسی بەرخوردار بن. ناتوانن وا بە ئاسانی لەو کۆتانە ڕزگاریان بێت کە ئەو حکومەتە ڕەگەزپەرستانەی کوردستانیان بن دەست کردووە، دایاننناوە. هەرگیز ناکرێت کورد لەلایەنی ئەو ئاسانکارییانەی کە هەن -لەگەڵ خەباتگێڕە فەلەستینییەکان بەراورد بکرێن.

دەوڵەتی ڕەگەزپەرستی تورکیا لەسەرەخۆ و بەهێمنی لە دەستدرێژییەکانی بەردەوامە، چونکە باش ئاگاداری ڕەوشی کوردستانە، دەزانێت بەو سیاسەتە کۆلۆنیالیزمیانە و ڕەگەزپەرستانەی هەستی کەس ناوروژێنێت و کەس دەنگی لێوە نایەت. ئیدی بەو ئاوایە باس لە مافی مرۆڤ و ئازادای و دیموکراسی لەلایەك دەکرێت و لەولای دیکەشەوە زۆر لەسەرەخۆ و بەهێمنی، دانانی کۆسپی کۆلۆنیالیزمی و ڕەگەزپەرستی بەهێز لە هەق نەتەوەی کورد پەیڕەو دەکرێت. لەو بارەدا ڕێکخراوەکانی وەك نەتەوە یەکگرتووەکان و یونسکۆ هەقە بەبایەخەوە بەسەر گیروگرفتەکانی نەتەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بسەنگرێنەوە، ئەوە ئەگەر بەراستی بنەما بەرزەکانی وەك مافی مرۆڤ و مافی نەتەوەکان لە بڕیاردانی چارەنووس و یەکسانی هەر قسە نەبێت، بەڵکو لە ژیاندا بێنەدی و پێویستە هەر تەواو لەسەر ئەو شێوازە ڕەفتار بکرێت. چونکە هەر بە تەنیا بەو ئاوایە دەکرێت یەکسانی لە نێوان نەتەوەکاندا بێتە دی و ئاشتی بەرقەرار بێت و بنەما سەرەکییەکان بپارێزێت و پەرەی پێ بدرێت.

## دیموکراتیەتی تورکیا و دۆزی کورد

لەسەرلەبەری مێژووی کۆماردا، بە گەرم وگوڕییەکی بێ وێنەوە بانگەشە بۆ بالۆرەی (کورد تورکن) کراوە و جەخت لەسەر ئەو -بالۆرەیە- دەکرایەوە، کەوا تیۆرانینێکی زانستییە، تەنانەت تیۆرانینێکی هەرە زانستییە کە ناکرێت هیچ گومانێك لە بارەیەوە بورژێنێت و نابێت نە ڕەخنەی لێ بگیرێت و نە بشکۆڕێت. لەبەر ئەوەی ئەو تیۆرانینە دژی بەڵگە



ـستەقینەکان، ئەوا دژی بوونی نەتەوەی کوردە. زۆر ـەنگاییی و پێداگرتنەوە داکۆکی لێ کراوەتەوە، لە ڕێی ـەمای دەوڵەت و یاسای سزاوەش ئەو داکۆکییە زامن کراوە.

هەروەها ئەو کارانەی لە دژی ئەو تێڕوانینەدا کراون ـووچاری کاری تۆڵەسەندنەوە بوونە. هەر هەموو ـوەندە ڕەسمییەکانیش کاریان دەکرد بۆ مل ـیکەچکردنی کۆمەڵ لەڕێی پاڵەپەستۆ و گرتووخانەوە ـەو تێڕوانینە بە ورد و درشتییەوە لە یاسای ساڵی ۱۹٦ وە جەختی لەسەر کراوەتەوە، کە دەڵێت ـەوڵەتی تورکیا بە گەل و خاکەکەوە پارچە ناکرێت)، ـەیاسای بڕیارلێدراوی ساڵی ۱۹٦٦، یاسای پارتە سیاسییەکانی تورکیا کە لە (٦٤٨) لاپەڕە دایە، زۆر بە ـوونی جەختی لەسەر کراوەتەوە. لە بڕگەی (۸۹)ی ـاساکەدا و لە پرسی ڕێگرتن لە پارتە سیاسییەکاندا ـەڵێت:

ـابێت پارتە سیاسییەکان هیچ پروپاگەندەیەك بکەن ـەو مانایەی کە لە کۆماری تورکیادا کەمینە هەن، کە جیاوازی ئایینی یان زەمانەوانی یان کولتوورییان هەیە، ـابێت پارتەکان خزمەت بە ئامانجی پارچە پارچەکردنی ـەڵکی کۆمار بکەن لە ڕێی پاراستن و پەرەپێدانی کولتوور وزمانی غەیرە تورك".

ـەوەی لە خوێندنەوەی ئەو بڕگانەدا دێتەدەست ئەمەیە کە لەناو سنووری کۆماری تورکیادا زمانێکی دیکەش هەیەن، بەڵام زمانی تورکی نییە و لەسەر زەمینەی واقعدا هەیە، کولتوورێکیش هەیە، کولتووری تورك نییە، بەڵام نابێت جاربدەی کە شتی وا هەیە.

هەروەها پاراستن و پەرەپێدانی ئەو زمان و کولتوورانە و تێکۆشان بۆ پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی کاری ڕێ پێ نەدراوە، هەروەك دەبینن لە ڕێی یاساکان نکوڵی لە ڕاستییەکی کۆمەڵایەتی و واقیعێکی بابەتی دەکرێت. جەختیش لەسەر ئەوە دەکرێت کە نەتەوەی تورك و نەتەوەی کورد لە یەکێتییەکن، کە پارچە پارچەبوونی بۆ نییە، ئەویش نەتەوەی تورکە. لە ڕێی یاسای سزاکان، کۆسپ دەخرێتە بەردەمی ئەوانەی دەڵێن نەتەوەی کورد هەیە، دیارە لە کەموکورتی گەیشتنی ئەو یاسایە ئەوەندە گران نییە، بۆ ئەوەی چارەسەری زانستییانەی کێشەکانی کۆمەڵ و پێکهاتەی سیاسیی پارتە سیاسییەکانی تورکیا. لێرەدا تێکەڵی لەنێوان زاراوەی نەتەوایەتی "ئیمتیازاتی هاونیشتمانییەتی تورکیا"دا و لە نێوان ڕاستی و دروستی کۆمەڵایەتی وەك –بوونی ڕاستی نەتەوەی کورد– دروست دەبێت و ئەرکی تایبەتی بە خەرج دەدرێت بۆ تێکەڵ کردنی بە ئەنقەست لە نێوان ئەو دوو چەمکەدا بۆ نموونە لە یاسای ۱۹۲٤ و یاسای ۱۹٦۱دا، هاتووە:

(ئەوەی دەڵێت من تورکم ئەوە تورکە بەبێ گوێدانە جۆری خوێنەکەی، ئەوەی بە دڵسۆزییەوە بڵێت تورکم ئەوە تورکە، هەر ئەوەندە بەسە کە بە دڵ و مێشکەوە هەست بە خۆشی و کامەرانی بکات کە تورکە".

بەو وشانە مەبەستییانە بسەلمێنن کە نەتەوەی ئەتاتورك و بە واتایەکی دیکەش نەتەوەی تورك ڕەگەزپەرست نییە، هەرکەسێ بە دڵسۆزییەوە ڕازی بێت کە تورکە، ئەوە تورکە، جەختیش لە سەر ئەوە دەکرێتەوە، ئەو ڕەوشە بە هیچ یاسایەکی سەرکوتکەرانەوە پەیوەست نییە: واش ڕادەگەیێنن کەوا دۆزەکە لە کەش و هەوایەکی هێدی و ئارامو سەقامگیر چارە دەکرێت. ئەگەرچی کێشەکەش هەروا بەو سادە و سانایییە نییە کە بەویاسایە یان دوو یاسا چارەسەر بکرێت. بە واتایەکی دیکە، کێشەکە لە بنجدا کێشەیەکی کۆمەڵایەتییە، هەر بە یاساکانی ماف چارەی ناکرێت.

لێرەدا ڕەوشەکە وای گەرەکە بپرسین، ئاخۆ چارەنووسی ئەوانە چ دەبێت کە بە تورکایەتی ڕازی نابن، ئەوانەی دەخوازن هەر بە کوردی بمێننەوە و





ئەوانەی کۆمەڵی کوردەواری دەپارێزن؟ یاساکان لەوبارەیەوە دەڵێن: "هەرکەسێ بە دڵسۆزییەوە رازی بێت بە تورك بوون ئەوە ئیدی تورکە".

کاکڵی کێشەکە ئا ئەلێرەدایە، لە راستیدا ئەوە جۆری رەفتارکردن لەگەڵ ئەوانە دێنێتە ئاراوە، کە کوردبوونی خۆیان راشکاوانە دەردەخەن. ئەوەش لەسەر زەمینەی واقیعی زیندوودا لە ژیان گوزراندن دان بۆیە تاکە شت لە چاوەڕوانی ئەو خەڵکانەدا بێت دەستدرێژی کردنە سەر ستەملێکردن و گرتنە.

چونکە لە چوارچێوەی کۆماری تورکیادا لە تورکی بترازێ نابێت ناوی زمانێکی دیکە بێنی و پێداگرتنیش لەسەر ئەوە بە تاوان دادەنرێت. یاسای دەوڵەت و یاسای سزادان، رێو رەسم لە دژی ئەو (تاوانە) دادەنێت، ئینجا لەبەر ئەوەی رەوشەکە ئاوایە، بۆیە نابێت لە هیچ دەستەبەرێکی نەتەوەیی یان هەر ناوەڕۆکێکی دیموکراتی لەو یاسایەدا بگەڕێین کە دەڵێت: "هەرکەسێ بە دڵسۆزییەوە رازی بێت ببێتە تورك ئەوە تورکە". ئیدی لەو جۆرە یاسایانە. ئەوە لە نێو کرۆکی تۆقاندنی حکومەتە لە کوردستاندا، چونکە لە هەمووان دەخوازێت ببنە تورك. پێ لەسەر ئەوەش دادەگرێت کە ئەگەر رایەنەگەیەنێت "کەوا ئەو کەسە بەختەوەرە کە تورکە" ئەوا لە هیچ خێر و بێرێکی دەوڵەت بەرخوردار نابێت، بۆ ئەوانەش کە رەتی دەکەنەوە ببنە تورك و پێ لەسەر کوردبوونیان دادەگرن، ئەوانەی گەرەکیانە کۆمەڵی کوردەواری بپارێزن، کۆششی زۆریش بۆ گەڕاندنەوەی ئەوانە بۆ نێو ریزی تورك دەکرێت، ئەگەر هەر مکوڕیش بوون لە رەتدانەوەی بە تورك بوون ئەوا هەینێکە ماڤی لەناوبردنیان هەیە، دیارە بە کردەوەش هەر ئەوە دەکرێت.

ئەمڕۆکە کوردستان کۆڵۆنییەکی نێودەوڵەتییە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، تەنانەت بارودۆخی نەتەوەی کورد زۆر لە بارودۆخی کۆڵۆنییەکان بەرەژێر ترە، بۆ نموونە تەنانەت تورکیا دان بە بوونی کورد دانانێت.

هەموو کۆششێك بۆ چەوساندنەوە و پەرش و بڵاوکردنەوە و لەناوبردنی کورد و کوردستان دەکات، مەرجە رەسمییەکانی یەکسانی نێوان کورد و تورك ئەوەیە، کورد رازی بن خۆیان بکەنە تورك، هەر ئەوەش رەگەزپەرستی و کۆڵۆنیالیزمییە و لە هیچ ناوچەیەکی دیکەی ئەم جیهانەدا بەدی ناکرێت، چونکە جۆرایەتی نەتەوایەتی هەر نەتەوەیەك بە نەبوو دانانی ناسرێتەوە. سەرەڕای هەموو ئەوەش، دەوڵەت خۆی وەك دەوڵەتێکی دیموکراتی خۆی نیشان دەدات کە رێز لەمافەکانی مرۆڤ دەگرێت.

لەسەروکاری ئەمەوە، دەوڵەتی تورکیش بەرەسمی لەو دەوڵەتە کامانەیە کە رێزی ماڤ مرۆڤ دەگرن لەجیهاندا. لە لایەك دەوڵەتێکە سیاسەتی رەگەزپەرستانە و کۆڵۆنیالیانە لە کوردستان پیادە دەکات، لەلای دیکەشەوە یەکێکە لەو دەوڵەتە کەمانەی جیهان کە رێز لە مافی مرۆڤ دەگرێت و هەوڵیش دەدات کۆمەڵی کوردەواری قڕ بکات و بیخنکێت و پارچە پارچەی دەکات و لەگەڵ ئەوەش "دەوڵەتێکی دیموکراتییە" کوردی بە کۆیلە کردووە و بە زیجیر کۆتییان دەکات و لە هەمان کاتدا "لایەنگیری لەنەتەوە چەوساوەکان دەکات" ئەو کردارانەش هەمووی تیز و فیزن (متناقض) کار وکردەوەی دژ بە یەکن و بە ئەنقەست هەماهەنگییان بۆ بەرێوە دەچێت.

لە هەمان کاتدا ئەوانە هۆکاری سەرەکین کە رۆڵی گرنگ لە گەڵاڵە بوون و پەرەسەندنی ئایدیۆلۆژیای رەسمی تورکی دەگێڕن. ئەوەش لە بنچینەدا تایبەتمەندی زۆر بایەخدارن بۆ ئایدیۆلۆژیای رەسمی باو.

سەرکردەکانی کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی دادوەری و پەیمانگا پەروەردەییە جۆرا و جۆرەکان و سەندیکا و ئەنجوومەن پارتە سیاسیەکان و پەیوەندییەکان هەر



هەموویان ناچار کراون ئەو ئایدیۆلۆژیا رەسمییە لەسەر درۆ رۆنراوە، پەیڕەو بکەن. لە واقیعدا ئەو ئایدیۆلۆژیایەی لەسەر درۆ رۆنراوە پەسندکراوە، بەبێ ئەوەی هیچ پەلپی لێ بگیرێت، هەر بە تەنیا ئەو راستە، هەر تەنیا ئەو دروستە، ئەوەی گرنگە و بەڵکو پێویستە ــە کاریگەریی ئایدیۆلۆژیای رەسمی تورک لەسەر ـــازی بیرکردنەوەی تورک بتۆژینەوە. هزری تورک لە ــو ئاستدا پەردەسێنێت. لە رووداوەکانیشدا لە دوو ـــتی جیاوازدا و لە زۆر ئاستدا کوحکاتەوە، هۆکاری سەرەکی ئەو هەسەنگاندنە ئالۆز و دوو لایەنییە، ــزی کوردە، بە وەرگرتنی دۆزی کورد ــو کێشانە دەگەین. کۆشش دەکەین بەو ــوونانەی خوارەوە روونیان بکەینەوە:
ــت لەگەڵ بیروبۆچوونی تورک و هەروەك ــە یاسای ساڵی ١٨٣٩ راگەیەندراوە، ــویستە دەوڵەتی عوسمانی و کۆماری ــرکیای دوومانی، یەکسانی لە نێوان هەمووان، بە چاوپۆشی لەهەموو ــیبەتمەندییەکی ئایینی یان زمانەوانیی ــان فەرهەنگی بۆ سەلماندنی فەرامۆشکردنی جیاوازی زمانەوانیی ــاژە بە ئەوە دەکات، ئەوا هەرگیز دەوڵەتی عوسمانی خۆی لە مەسەلەی ئایین و خواپەرستی ئەو مەسیحی و جووانەی کە لە ژێر دەسەلاتیدا بوون، هەڵنەقورتاندووە، بەڵکو ئازادی ئایین و خواپەرستی بۆ فەراهەم کردوون و ــاچاری نەکردوون ببنە موسڵمان.
سیاسەتی دەوڵەتی تورکیاش هەر ئاوایە و هیچ مەسیحی و جوولەکەیەکی بە زۆر ناچار نەکردووە ببنە موسڵمان. لە بنەڕەتیشەوە هیچ چەشنە نیازێکی ئاوایی نییە. ئینجا ئەگەر ئەو بانگەشەیەی سەرەوە لە واقیعدا لەگەڵ رووداو و ئەنجامەکانیان جووت بێتەوە، ئەواشتەکە تەواو لەجێگای خۆیەتی، بەڵام ئەگەر راگەیاندنەکە هاوجووت یان پێچەوانەی راستی بێت، ئەوەیان پرسێکی دیکەیە. بەڵام دەستەواژەی فەرامۆش کردنی جیاوازی رەگەزی و زمانەوانیی ئەوا هیچ لێکدانەوەیەکی لەو جۆرەی بۆ نادۆزرێتەوە.
هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی شێوە دیموکراتی بەخۆوە هەڵناگرێت و دەبوا لە ئاکامی ئەو کارە لۆژیکییەدا نەتەوە ناتورکەکانیش لە ئازادی پاڕێزگاریکردنی تایبەتمەندییە نەتەوایەتییەکانیادا بەرخوردار بان، هەروەك چۆن دان بە ماف مەسیحی و جووەکان نراوە، کە هەر لە سەر ئایینی مەسیحی و جوولەکەیی بمێننەوە و هەر بەو جۆرەش وا پێویست بوو، دان بە تایبەتمەندییە جۆرییەکانی نەتەوەی کورد و کۆمەڵگای کوردەواریدا بنرێت، بەڵام کاکڵەی دۆزەکە لەوە گیری خواردوە کە ماف نەتەوە ناتورکەکان و بەتایبەتیش کورد دانی پێدا نانرێت، کە لە کۆمەڵگای کوردەواری خۆیاندا بژین. بۆیە ئەو بانگەشەیەی فەرامۆش کردنی جیاوازی رەگەزایەتی و زمانەوانیی تەنیا مەبەست لێی بە تورك کردنە، هەر تەنیا ئەو دەمە لەگەڵ تورکەکاندا یەکسان دەبن، کە کورد وەك ئەمری واقیع خۆیان بکەنە تورك. ئەو یەکسانییە مەرجە بۆ ئەوەی کە کورد پەسندی دەکات، ئەوا خۆ لە نەتەوەکەی دەتۆرێنێ، سەرەنجامی ئەمەش کارێکی نا دیموکراسییە، ئەوەش لەگەڵ کەرامەتی ئادەمیزاد لە بووندا و لەگەڵ مرۆڤ بەخۆی و لەگەڵ تێگەیشتنی زانستییانەی بوونی ئینساندا ناکۆکە.
هەروەها لەگەڵ سەروەری سەردەمەکەشدا ناکۆکە، هەر





کاتێ مرۆڤێك لە رەگەزی نەتەوایەتی خۆی دادەشۆرێت، واتە کاتێ لەخۆی دەشۆرێت، ئەوا لە کاکڵەی بوونی خۆی شۆراوە، بەمەش خۆی دەبێتە کۆیلە. ئەو مرۆڤەی لە رەگەزی نەتەوایەتی تایبەتی خۆی دەشۆرێت، رەگەزی خەڵکی دیکە پەسەند دەکات، مرۆڤێکە لەناخەوە نقوومی نێو کۆیلەتی و ملکەچی بووە، ئەمەش هیچ لە کرۆکی پرسەکە ناگۆڕێت، کە ئەو کوردەی دەستبەرداری رەگەزی نەتەوایەتی خۆی بووبێت و رەگەزنامەی تورکیان پەسند کردبێت، با لە دەیان ئاسانکاریش بەرخوردار بێت، چونکە ئەو گاڤە، چ بۆ ئەو مرۆڤە دەمێنێتەوە کە لە بوونی تایبەتی داشۆراوە؟ یا ئەو مرۆڤە ببێتە سەرکردە یان نوێنەر لە پەرلەمان یان وەزیر یان بەرێوەبەری گشتی یان پرۆفیسۆر، ئەو هەرگیز ناتوانێت قەرەبووی ئەو ئازار و ئێشە گەورەیە بکاتەوە کە بەخۆی گەیاندووە.

هەڵسوکەوتی دووفاقی لەگەڵ دیاردەکان تایبەتمەندی بنەرەتی رێبازی بیرکردنەوەی تورکە. بیریارانی تورك بە پەرۆشەوە پشتگیری بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوایەتی دەکەن لە سەرتاسەری جیهاندا و زۆر بە گەرمییەوە چەپڵەی بۆ لێدەدەن بەبێ گوێدانە شوێن و کات و پەسنی سەرکەوتنەکانیشی دەدەن و پەژارەی خۆشیان بۆ سەرنەگرتنی نیشان دەدەن. بەڵام هەر ئەوانە و دام و دەزگا جۆرا و جۆرەی رەسمییەکانی تورك بە ئاشکرا دوژمنایەتی هەر بزاڤێکی نیشتمانی رزگاریخوازی دەکەن کە لە هەر پارچێك لە پارچەکانی کوردستاندا سەرهەڵبدات. بەمە لە بایەخی کەم دەکەنەوە، دەڵێن: ئیمپریالیزمی لە پشتییەوە یە، زانکۆ تورکییەکان و رۆژنامەڤانی و ئامۆژگاکانی پەروەردە و فێرکردن و دام و دەزگاکانی دادوەری ...هتد هەموویان نەفرەت لە پەیمانی سیڤەر دەکەن ، و وەك پرۆژەی لەت لەت کردنی کۆماری تورکیا نیشانی دەدەن، کەچی وەك سەرکەوتوو لە پەیمانی لۆزان دەدوێن. ئەوەبوو تەواو لە لۆزان بوو سیاسەتی پەرتکە و زاڵ بەیان لە هەق نەتەوەی کورد دەست پێ کرد، بە پێی ئەو پەیماننامەیە بوو نیشتمانی واری کوردیان پارە پارە کرد و هەوڵ درا ناوی کوردستان لە زمانەکانی جیهان و لە مێژوودا بسرنەوە. بە مانای وشە پەیمانی لۆزان پەیمانێکی کۆلۆنیالیستی و دزیکەرانە بوو.

بەڵام هزر و بیری تورك خۆ لە بوونی نەتەوەی کورد دەبوێرێ و ئەو جۆرە دابەشکردنەی نەتەوەی کوردی بە شۆرش لە قەڵەم دەدات، کەچی روودا و رێرەوی ژیانی راستەقانی بەڵگە و نیشانەکان دەریان خست کە پەیمانی سیڤەر هەر لە رۆژی یەکەمی مۆرکردنییەوە راستگۆیی لە دەست دابوو و بەتەواوی پووچەڵ کرابۆوەو هیچ هێزێکیش نەبوو کار بۆ جێبەجێ کردنی بکات. پەیمانی سیڤەر سەرزەمینێکی زۆر و زەوەندی لە ناوەراستی ئەنادۆڵ بۆ تورکەکان دابری.

مەبەستیش لە دابەشکردنی کوردستان و جێبەجێ کردنی سیاسەتی پارچە پارچەکردن لەهەق نەتەوەی کورد، لەناوبردنی تەواوی خەسڵەتەکانی نەتەوەی کورد بوو.

بیریارانی تورك چییان دەوێت، سەبارەت بە رووداوی پارچە پارچەکردنی کوردستان دەنووسن:

"ئامانجی پەیمانی سیڤەر پارچەپارچەکردنی نیشتمانی تورك بوو، ئەوپرۆژە ئیمپریالیزمییەی لەناو برد، بە سەرکەوتنیشمان لە خەباتی رزگاریخوازی لە دژی ئیمپریالیزم، توانیمان دەوڵەتێکی نوێی تورکیا دابمەزرێنین......هتد".

بەڵام کە قسە و باس دێتە سەر کوردستان ئەوا رووناکبیرانی تورك گوێی پێ نادەن و وەك ئەوەی کە هیچییان نەبیستبێت یان دەقیژێنن و دەڵێن "گەلێك نییە بەناوی گەلی کورد" و خۆیان لەهەر قسە و باسێك بە دوور دەگرن کە سەربۆ لای ئەو بابەتەدا ببات یاخود راپۆرتت بۆ دام و دەزگای ئەمنی حکومەت لە دژ





دەنووسن و بەوە تاوانبارت دەکەن کە پیلان بۆ پارچە پارچەکردنی دەوڵەتی تورك دەگێڕێت. دووفاقی هزر و بیری دەوڵەتی تورکی داگرتووە و لەو بارەوە دەتوانین لەهەر شوێنێکدا چەندین نموونە لە ڕۆژگاری جیاجیادا بێنینەوە، بەو جۆرە بۆ نموونە لە ئەورووپا بە تایبەتیش لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوادا ژمارەیەکی یەکجار زۆر کرێکاری تورك هەن و حکومەتی تورکیا بایەخ بە هەموو گیروگرفتەکانی ئەو ئاپۆڕەیە دەدات. هەر لە بەندیواری بە ئەمەوە بایەخی تایبەتیش بە پرسە ڕووناکبیرەکانی تورکی دەدات. کار بۆ ئەمە دەکرێت منداڵان بە داب و نەریت و کولتووری تورك پەروەردە بکات، تا ئاویان لە دوو بێڵی بێت دەکۆشان بۆ ئەوەی زمانی دایك – زمانی تورکی لە بیر نەکەن. ئەو کار و کۆششەی دەوڵەتی تورك لە لایەن ڕووناکبیرانی تورکەوە پێشوازی و پشتگیری و دەستخۆشی لێ دەکرێت.

ئەو حکومەتە کار و کۆششی زۆر بۆ تواندنەوەی منداڵی کورد دەکا و کوشتنی گیانی کوردبوونیان. دەوڵەتی تورك کۆشش بۆ ئەوە دەکات منداڵە تورکەکان لە ئەڵمانیا زمانی دایکیان فێر بن. کەچی هەر ئەو دەوڵەتە هەموو ئەوانە دەداتە دادگا و دەیانخاتە زیندانەوە کە دەڵێن پێویستە لە تورکیا بواری فێربوون بەزمانی دایك لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا بۆ هەموو کەس برەخسێت.

جموجۆڵی ئەو پارتە سیاسیانەش پەك دەخات کە ئەو جۆرە داوایانە بکەن. چونکە لە نێو ئەو هەموانەدا کوردیش دەگرێتەوە. بەرەنجامی ئەمەش بێبەشبوونی منداڵانی کوردە لەوەی بە زمانی دایکییان بخوێنن، ئامانجی بنەڕەتی حکومەتی تورکیش لەوەدا لە بیربردنەوەی زمانی کوردی و لە ناوبردنی کۆمەڵی کوردەواری و ڕەگاژۆکردنی کردەوەی بە تورك کردن و پەرەپێدانییەتی. ئەو کاروکردەوانەی حکومەتی تورك لە لایەك ڕۆژنامەوانانی تورك و نووسەرانی تورکەوە دەستخۆشی لی'دەکرێت، کاتێ کە دەنووسن و دەڵێن "ئەوە چارەسەرییەکی زۆر دیموکراتییە بۆ پرسەکە و چارەسەرێکی زۆر ئینسانیشە"، منداڵانی کورد کاتێ کە زمانی دایکییان، زمانی کوردی لە بیردەکەن و لە ژێر کاریگەریی ڕووناکبیریی کوردی بەدووربن، ئەوا دەبنە خەڵکێکی سەرگەردان، ڕۆژنامە و سەندیکا و هاوبەندی و کۆڕ و زانکۆ و پارتەکان لەو کارەدا بەشدارن، با ئەوەش لەبیر نەکەین دەوڵەتی تورکیا لە پەیرەوکردنی شێوازی ڕەگەزپەرستانە وکۆلۆنیالیزمانەی بۆ بەرتەسك کردنەوە و تەنگ پێ هەڵچنین بەردەوامە بۆ (پاراستنی) خەڵك.

نووسەرانی تورك و ڕۆژنامە ورادیۆ و تەلەفزیۆن.....هتد، هەر هەموویان لە کارەکەدا گلاون و دنەی دەدەن.

دووفاقی هزر یەکێکە لە خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی ئایدۆلۆژییای ڕەسمی تورك، هەروەها ڕۆشنبیری و هزری باوی ناو زانکۆکانی تورکیا، کە دەبو لە بنەڕەتدا –وەك ئەرکی بنەڕەتی ئەو– شێوازی ناوبراوی لە دادگاییکردندا پەرەپێدا با. بەڵام ڕێبازی دووفاقی لە بیرکردنەوەدا وەك ڕێباز تەواو ناکۆك و نا تەبا لەگەڵ زانستدا، هزری زانکۆیی تورك و ڕۆژنامەوانیی تورك و دام و دەزگای دادوەری و پارتی سیاسیی و کۆڕ و هاوبەندییەکان دان بە بوونی نەتەوەی کورد دانانێن.

ئەو ڕێکخراو و دەزگایانە دەڵێن ئەوەی لە تورکیا دەژیت ئەوە تورکە، دیارە ئەوەش قسەیەکی زانستیانە نییە، چونکە زانستی بابەتی لە ڕووداوەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، زانست و پیاوی زانست ماڧ ئەوەیان نییە دان بە بوونی نەتەوەی کورد دانەنێن.

چونکە بۆ ئەو پێویستە کۆشش بکات لە ڕووداوەکان بگات و بچێتە ناخیانەوە. زانکۆش وەك دەزگایەکی زانستی دەبێ زانست پێش بخات و ماڧ ئەوەشی نییە ڕووداوە ڕاستەقینەکان پشتگوێ و فەرامۆش بکات،



چونکە تێگەیشتن و روونکردنەوەی دیاردە یەکی دیاری کراو دەروازەیەکە بۆ تێگەیشتنی کار و بارەکان و دانە دواوەی رووداوەکان و بە نەبوو دانانی کاروبارێکن دەکەونە خانەی رێبازی ئایدۆلۆژیا.

جا لەو دەراوەوە دەزگا داوەرییەکانی تورک و پارتە سیاسییەکان لە دیاردەیەك خۆ دەدزنەوە، دەبێ پێش وەخت سەرانەی دەرچوون لە هزری زانستی بدات، راستی بەشێکی دانەبڕاوە لە رێبازی زانستی شیکردنەوەی روووداوەکان و ناشکرێت وازی لێ بهێنرێت، کەچی ئەو رێبازەی کە ئەو دیاردەیە دەداتە دواوە و لە شوێنی رەتدانەوە، رەفتاری لەگەڵ دەکات، هەر بە تەنیا سەربەستی بەو دام و دەزگایانە دەبەخشێ کە ئاماژەیان پێکرا، ئەو ئایدۆلۆژیایە رەسمییە دابمەزرێنن وبڵاوبکەنەوە کە لەسەر درۆ رۆنراوە.



بۆ توێژینەوە لە رووداوەکانیش، پێویستە بە تێکڕایی و تەواوی بێت، چونکە برێکییان لە گۆشەیەکەوە نەخشێکی کاریگەرییان هەیەو لەو لای دیکەشەوە نەخشێکی کاریگەرو لەسەرەخۆی وازی دەکات، ئینجا بۆ ئەوەی بە قووڵی بچینە بنج و بنەوانی زانینی رووداوەکەوە، پێویستە پێوەندییە جۆراوجۆرەکانی ناوەوە و دەرەوە لەبەرچاوبگرین، مەرجی بنەڕەتی بۆ هەموو ئەمانەش، لێکۆڵینەوە لەرووداوەکەخۆیەوە یە لەگەڵ هەڵسەنگاندنی لە ئاست نرخە راستەقینەکەیەوە.

دیارە زانست لە سروشتی خۆیدا بێ لایەنە. لە جیهاندا لایەنگیری هەر رێبازێك بکرێت یان لایەنگیری لێ نەکەیت، ئەوە مانای ئەوە نییە واقیعەکە هەڵگێڕییەوە یان پشتگوێی بخەی، لە بنەڕەتیشدا نابێ باس لەو راستییە بکرێ کەوا هەرگیز نابێت سیاسەت بخرێتە ناو بابەتی زانستییەوە، بەڵام بیروڕا سیاسییەکان رێ لەوەناگرن کە زانیارییە سیاسییەکان بەدەست بێنێت، هەڵبەت ئەو بیروبڕوایانە سەر بۆ لای هەڵەو خۆ لەراستی بابەتی نەبان دەباتەوە، چونکە زانستی بابەتی بایەخ بە لێکدانەوەی هەرهەموو شتەکان بێ هەڵاوێردن دەدات.

ئەوەتا هزری زانکۆیی تورك رۆژنامەوانیی تورك کارئاسانییان بۆ دەکەن بە جێگۆڕکێ پێ کردنییان و بەزانین و تێنگەیشتن و روونکردنەوەی کێشەکانی نەتەوەی کورد بە نکۆڵی کردنی راشکاوانەی بوونی بابەتییانە و بەخۆدزینەوە لەگیروگرفتان و تێگەیشتن لەسەر هەڵدانی گیروگرفتەکە، ئاوا بالۆرەی درۆزنانەی ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت دەڵێنەوە، تەنانەت لەوکارەشیاندا ناوە ناوە و لێرەو لەوێ خۆ دەخەنە ناکۆکییەوە، کەچی دەبوایە هەرکاتێ زانیاری تەواو نەبوو، ئەوا بەتێکڕایی روو لە زانست بکرێت بەبێ ئەوەی گوێ بدەینە کات و شوێن.

بیرو هزری زانکۆی تورك خۆی بەتێگەیشتنی بوونی نەتەوەی کورد ماندوو ناکات و لێی بکۆڵێتەوە لەبری ئەوە رقی لەوانە دەبێتەوە کە بایەخ بە دۆزی کورد دەدەن، ئەوانەش کە تێدەکۆشن چارەسەرییەکی زانستییانەی پرسەکانی پێکهاتەی کۆمەڵی کوردەواری بدۆزنەوەو تاوانی پارچەپارچەکردنی کۆمەڵی تورکیان



دەخرێتە پاڵ..
بێگومان ئەو کارە بە هیچ رێچکەیەك لە رێبازی زانستی توێژینەوەو شیکردنەوە ناکاتەوە، دیارە تەواو روونە ئەو رێبازە رێ خۆشکەرە بۆ بەئاسانی پەرەسەندنی، چونکە بەراستی زەحمەتە لە راستییەکەی بگەی و روونی بکەیتەوە، ئەوە ئەرك و ماندوبوونێکی بێ ئەندازەی دەوێت، بەڵام دیارە تاوانبار کردن نارەزایی دەربرین. شتێکی زۆر ئاسانە، بیروباوەری زانکۆی تورك و رۆژنامە و نووسەران..هتد. بەدوو فاقی بیرکردنەوەیان پاڵپشتی چەوساندنەوەی نەتەوەی کورد دەکەن و لەماف بوونیان دەشۆرێنن، ئەو داخوازی و ئارەزووانەی خۆیان بەبابەتییانە لە قەڵەم دەدەن، لەهەمان کاتیشدا دەڵێن، ئەوە لەبەرژەوەندی بەرگری کردنە لەمافەکانی مرۆڤ و لە دیموکراتییەت و کاری شۆرشگێرانە.

ئەو مافە بریارانەی بۆ دۆزی کورد لە دادگا باڵاکانی تورك دەرچوون، بریاری مافناسانە نین، بەڵکو بریاری سیاسین. بەپێی یاسای دەوڵەتی تورکیا کۆمار تورکیا بەگەل و خاکەکەیەوە یەکە و پارچە پارچە نابێت،بەمەش دام و دەزگای مافناسی تورکیا بوونی نەتەوەی کورد، واتە واقیعە کردەیەکە رەت دەکاتەوە. ئینجا لەو مەسەلەیەدا هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئەو پارتە سیاسییە تورکییانە نییە کەلە ئەنجوومەنی گەل نوێنەرانـدا نییە، لەگەڵ هەڵوێستی ئەو دادگایانەی کەهەن. بەو ئاوایە ئەرك و تێکۆشانەکان بەپشتگیری بریارەکانی دادگای رەسمی هاوکارن لە دان نەنان بەبوونی نەتەوەی کورد، لەوبارەشدا دام و دەزگای داوەری وەك دادگای رەتکردنەوە، ئەنجوومەنی دەوڵەت و دادگای باڵا بەتەواوی دەخرێنە ئاست دام و دەزگای جێبەجێکەری فەرمانە کۆڵۆنیالیزمییەکانی تورك دەرهەق بە کوردستان و نەتەوەی کورد وەکو حکوومەت و جەندرمە و پۆلیس و دەستە سەرکردایەتییەکانی کۆمەڵایەتی، ئەو جۆرە داوەرییە لەدەزگایەکی راپەرین و جێبەجێکەر بەولاوە چیدیکە نییە.

بەو شێوازەش دادگاکان کە ئەرکیان سەر راست کردنی دادپەروەردی و پەردەلادانە لەسەر راستییەکان، هەوڵدەدەن راستی پەردەپۆش بکەن، بۆئەوەی ئایدۆلۆژیای رەسمی کەلەسەر دوو روویی رۆنراوە، سەروەر بێت، دادگا "سەربەخۆکان" بوونەتە داکۆکیکەری درندانە لە رەگەزپەرستی تورك بەپێچەوانەی شوێن و کارە رەگەزپەرستی و کۆڵۆنیالیزمییەکانییان، دەوڵەتی تورکیا توانیویەتی خۆی وا دەربخات کە دەوڵەتێکی دیموکراتی و ئازادی ویستە، بیرمەندانی زانکۆکانی تورك و خەڵکە زانستییەکانیان کاروکردەوەی حکوومەتی تورك لە کوردستان بە "دیموکراتی" هەڵدەسەنگێنن. ئەوانەش کە بەرگری لەمافە نەتەوایەتییەکانی کورد دەکەن بەوە تاوانباریان دەکەن کە کۆسپ دەخەنە بەردەم پەرەسەندنی ئەو رێبازە دیموکراتییە، چونکە ئەوکارو کردەوە رەگەزپەرستییانەی کەلە کوردستاندا پەیرەو دەکرێت، هەمیشە ئەوە دەردەخات کە کارو کردەوەی پێویستن بۆ پاراستنی خەڵکەکە، هەرچی بەپێچەوانەی ئەوەش بڵاو بکاتەوە ئەوا دادگا تاوانباری دەکات.

لەو پێوەندانگەدا، لەساڵی ١٩٧١ دادگای باڵا، پارتی کاری تورکی قەدەغەکرد، چونکە گوتبووی کورد لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی تورکیا هەن، لەساڵی ١٩٨٠شدا هەمان دادگای باڵا پارتی زەحمەتکێشانی تورکی لەسەر هەمان هۆ قاچاخ کرد، چونکە گوتبووی کورد مافی ئەوەیان هەیە بەزمانی دایکییان بخوێنن و پەروەردە بکرێن. لەبەرنامەی ئەو پارتەدا برگەیەك هەیە بەو ناوەرۆکە لە سەرەوە برگەیەکمان لەیاسای پارتە سیاسییەکانی تورك وەرگرت کە تایبەتە بەقاچاخ بوونی پارتە سیاسییەکان، تێیدا بەریەرچی ئەوە دەداتەوە کە نەڵێن زمان یان کولتووری غەیرە تورك لەناو سنووری کۆماری تورکیادا هەیە، نابێت بانگەشە بۆ هیچ







داخوازییەکی پەرەپێدانی کولتووری دیکە بکرێت بێجگە لە تورکی، وێڕای ئەوەش برگەی ١٢ی یاسای بڕیار لێدراوی ساڵی ١٩٦١ کارپێکردنی بەردەوامە کە دەڵێت:

(هەموو خەڵك لەبەردەم یاسادا یەکسانن لەهەر زمان یان ڕەگەز یان تۆرمەو هەڵوێستێکی ساسیی یان بیروباوەڕێکی ئایینی یان فەلسەفی بێت، هیچ هاووڵاتی یان بنەماڵە یان توێژێکی کۆمەڵایەتی یان چینێك لەمەدا سەرپشك نییە).

ئاخۆ بەڕاستی مایەی پێکەنین نییە کەسیاسەتی کۆلۆنیالیزمی لەکوردستاندا پیادە بکرێت، تەنانەت باس لەوەش نەکرێت کە کورد هەن، کەچی لەهەمان کاتدا باس لەماف تایبەتی بکرێت یاخود جاڕی ئەوە بدرێت لە تورکیادا هیچ زمان یان کولتوورێکی نا تورکی نییە، کەچی لەهەمان کاتدا باس لە یەکسانی و ئازادی و دیموکراتی بکرێت.

هەموو ئەمانە ئاماژە بەوە دەکەن لەلایەنی بیردۆزیشەوە بیری تورك ڕێگایەکی خوار و خێچی گرتۆتەبەر و ئەو کارانەی ئەو ڕێچکە بیردۆزەیە گرتوویەتە بەر هەمدیسان ئاستەکەی دوو فاقییە.

لەکاتی پیادەکردنی هەرشێوازێکی سیاسیی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی و ئابووریە جۆراوجۆر، ئەوا هەرهەمان ئەو ڕێچکە نەخشە بۆ کێشراوەی دوو فاقییە، کە بیرە ئایدۆلۆژییەکە دەگرێتەبەر. ئەگەری بنەڕەتی ئەو ڕێچکەیەی بیرکردنەوەو کارەکانی دەقاودەقی ئەوەو هەرئەوەش دۆزی کوردە.

کەمالییەکان گەرەکیانە نەتەوەی کورد لەناوببەن و بیتوێننەوە، لەولای دیکەشەوە دەکۆشن وێنایەك لە دەوڵەتی تورکی وەك دەوڵەتێکی شۆڕشگێڕی، دیموکراتی دژبە ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم گەلالە بکەن.

لەو سەروبەندەی کە کەمالییەکان بەدەستی چەپیان لەناوبردنی کورد ئەنجام دەدەن، ئەوا دەستی دیکەیان بەرز کردۆتەوە، هاوار دەکەن ئەدی لەجیهاندا ئێمە پێشەنگ نەبووین لەڕێبەرایەتی کردنی خەباتی نیشتمانی-ڕزگاریخوازی دژ بە ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم، ئێمە بووینە ڕێبەرو چاوساغی هەموو گەلانی چەوساوەو ڕێگای ئازادی و سەربەخۆییمان بۆ ڕووناك کردنەوە.

بەوە کەمالییەکان هەموو شوێنەکانیيان لەدەست دەدەن و دەکەونە نێو دژایەتی و ناکۆکی زەق و بەرچاو. ئەوانە نە دەستبەرداری سیاسەتی لەناوبردنی نەتەوەی کورد و چەوساندنەوەی دەبن و نە لەڕۆڵی خۆیان لەسەرکردایەتی کردنی گەلانی چەوساوە وازدەهێنن.

سیاسەت و تێڕوانینی کەمالییەکان تەنیا هەر یەك ڕێگەچارەی ئەو ناکۆکییانەیان بەدەستەوەیە، ئەویش ڕێگەگرتنە لەهەموو ئەو هەڵوێستانەی کە ڕەخنەیان لێ دەگرن و گرتنی خاوەنەکانییانە، بەڵام لەسەر پێشینەی دۆزی کوردستان تەواو پڕوپووچی و گەندەڵی دیموکراتی و دژایەتیکردنی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم ڕوون دەبێتەوە، کەچ ئەتاتورك و چ دەستەو تاقمەکانی دەکۆشن بیخەنەسەر ئەو سیاسەتەی کە لەبارەی کوردەوە پەیڕەوی دەکەن. خراپ نییە ئەگەر لەبەردەم ئەوچەند خاڵەی کەسەروساختییان بە ڕاو چالاکییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە سەبارەت بەو دۆزەوە هەیە، بسەنگرێنینەوە.

## نەتەوە یەکگرتووەکان، تورکیا و کورد

یونسکۆ ڕێکخراوێکی جیهانی پەروەردە و زانست و ڕووناکبیرییە، کارەکەی پێشخستنی زانست و ڕووناکبیرییە، هەوڵ دەدات کۆمەڵ و جیهان بەزانیاری پێش بخات، هەروەها دەکۆشێت ئەو ڕێبازە بەرەو شتەکان پەرە پێ بدات و پێشی بخات. بەڵام یونسکۆ بەو بڕیارەی کەلەبارەی بیرەوەری سەدساڵەی لەدایکبوونی ئەتاتوورك داویەتی، بەمەش لەو ڕێبازە



هەڵبڕاوەو ڕووەو هاوپشك بوون لەئایدۆلۆژیای ڕەسمی خلیسکاوە، کە لە بنەڕەتدا کۆسپی بەردەمی پێشخستنی ڕێبازو بیری زانستییانەیە.

پەسندکردنی کەمالیزم وەك تەوژمێکی دژ بە ئیمپریالیزم، مانای وایە لەگەڵ ڕۆژنامەوانی ڕەگەزپەرستی تورکی و ڕێبازی بیرکردنەوەی هاوئاهەنگ بووە، ڕێبەرایەتی کۆمەڵایەتی تورکیا و ئامۆژگا پەروەردەیی-فێرکردنەکان و پارتە سیاسیی و سەندیکا و دام و دەزگای ئایینی و زانکۆکان، هەرهەموویان بەبێ هیچ مەرجێك ئەو بۆ چوونەیان پەسەند کردووە، گەر ئەمڕۆ ئێمە ڕاپرسییەك بۆ ئەو دۆزە لەوهەموو دام و دەزگایانەدا بکەین، نزیکەی هەر هەموویان لاگیری لەکەمالیزم دەکەن وەك ئەوەی کەدژی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزمە، تەنانەت ئەگەر بێتو لە بەڵگەنامەی ڕاپرسییەکەشدا ئەو جۆرە پرسیارەش کرا "تایبەتمەندییە دیارەکانی کەمالیزم دیار بکە" ئەوا ئەوان بە پلەی یەکەم پەنجە بۆ خەسڵەتە دژ بە ئیمپریالیزمو کۆلۆنیالیزمەکەی درێژ دەکەن.

بەڵام هەرچی ئەو دەرەنجامانەی کە لەڕێی ئەو ڕاپرسییەدا بەدەست بێت، کە پشت بە ژمارەو ڕێژە ببەستی، ناکرێت بکرێتە پێوانەی زانستی ڕاستی و دروستی، ناشبێت ئەو بیروبۆچوونانە بەزانستییانە لەقەڵەم بدرێن، لەبەرئەوەی بەژمارەو بڕن، بۆیە نەدەبێ و نەدەکرێ ئەو پێوانانە بکرێنە ڕاستی زانستی، نەدەشکرێت هەربیروبۆچوونێك هەر لەبەر ئەوە بەزانستی لەقەڵەم بدرێت، چونکە زۆرینەی خەڵكو ڕێکخراوەکان لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا دەست نیشانییان کردووە، لەزانستدا یەك پێوانە بۆ ڕاستی هەیە، ئەویش ڕووداوەکانن بەهەموو ئاڵۆزی و بڵۆزییەکانییەوە، دەکرێت بیروبۆچوونێك بەزانستی لەقەڵەم بدەین بەو ئەندازەی ڕێڕەوی ڕاستەقینەی ڕووداوەکانی بەسەر ڕاستی دەرخستووە. ئینجا دواتر ڕووداوەکان دەستبژێر دەکرێن و دیاردەکرێن، جا گریمانەکان لەسەر ئەو بنەمایانەدا دادەڕێژرێن و ڕۆدەنرێن، کەئەوەش بەنۆرەی خۆی هەڵسەنگاندنە لەگۆشەی ڕەوتی ڕووداوەکاندا، واتە بەکردەوە، بۆ دڵنیابوون لەراستی و ناڕاستی ئەومەرجەی کە هەرگیز ناشێ لەزانستدا فەرامۆش بکرێت.

ڕاگەیاندنی بوێرو نەگۆڕی ئەو دەرەنجامانەیە کە لەڕێی پەیڕەوکردنی ڕێبازی زانستی لەشیکردنەوەدا بەدەست هاتوون، لەزانستدا نابێت ڕاستییە زانستییەکان دیزە بەدەرخۆنە بکرێن، لەبەرئەوەی بەدڵی سەرکردایەتی سیاسی نین، هەروەها شکاندنەوەی ڕاستییە زانستییەکان بەلای چەشەو ئارەزووی سەرکردایەتی سیاسی بگونجێت سەرەنجامەکەی ڕێبازێکە دژ بە ڕێبازی زانستی بۆ گەیشتن بە ڕاستییەکان.

ئاخۆ دەبێت ئەو بەڵگەنامەیەی کە پێشبینی ئەگەری دەرەنجامەکەیمان دەکرد، چ بایەخێکی هەبێت، بێگومان لەبەرئەوەی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئایدۆلۆژیای کەمالیزم بۆتە زرێی کۆمەڵگای تورك، هەروەها جەخت لەسەر ئەوەش دەکاتەوە، کە هەموو ئادەمیزادێك و تەنانەت هەموو خەڵك و ڕێکخراوەکانیش ئەو ئایدۆلۆژیا دەوڵەتییەیان پەسەند کردووە، کە بنەماکەی درۆیە، وەك خاڵی بنەڕەتی لەسەرجەم کارو کردەوەو جموجۆڵەکانیدا، لەوکاتەدا دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگرێن، کەوا ئەو کردەو کارانەی لەوجۆرە "زانیارییە زانستی"یانەوە چنگ کەوتوون کاروکردەوەی ڕەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمییە و لەگەڵ بنەما بنەڕەتییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و یونسکۆدا دژو ناکۆکن.

هەموو نەتەوەیەك ماف ڕزگاری و پەرەسەندنی بنەڕەتی هەیە و کارەکە بەرەو ماف گەلان لە دیاریکردنی چارەنووس بەدەست خۆیان دەڕوات، هەروەها پاراستنی ئاشتی جیهانی و دادپەروەری و





دەستەبەرکردنی پەرەسەندن و پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی بەتەنیا ئەوکاتە دێتە دی کە دەستەبەری یەکسانی لەنێوان نەتەوەکان بێتەدی.
مانەوەی نەتەوەیەك لەژێر سیستەمی نەتەوەیەکی دیکەی بەرخوردار لەئازادی و سەربەخۆیی، خزمەت بەپرسی ئاشتی و ئاسایشی جیهان ناکات.
کوردستان کۆلۆنییەکی نێو دەوڵەتییە لەجەرگەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، دابەش و دابڕدابڕو پەرش و بڵاوکراوە، هەموو مافە نەتەوایەتی و رووخسارە مادی و گیانییەکانی بەئەندازەیەکی بێ وێنە تالان و بڕۆ دەکرێن، هەروەها گەلی کوردستان بە تێلدڕ، کێڵگەی مینرێژ و قۆنگرەی چاودێری و مۆڵگەی سەربازی لێك دابڕاوە و هەموو رێوشوێنێك گیراوەتەبەر بۆ ئەوەی کورد لەپارچە جیاجیاکانی کوردستاندا یەکدی نەبینن و نەگەنە یەکدی. کوردستان هەمووی بەسەربازی چەکدار داگیرکراوەو چاودێری هەموو شتێك دەکەن، هەموو شتێك لەکوردستان، بەهەموو وردەکارییەکانی رۆژانەشەوە مایەی سەرنج و بایەخی داگیرکرانە، هەموو شێوازێکی رەخساو دەگرنەبەر بۆ لێك هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگای کوردەواری و لەناوبردنی کولتووری نەتەوایەتی کورد.
هەموو ئەمانە وەك شتێکی ئاسایی بەڕێوە دەچن، تەنانەت لەتورکیادا دان بەبوونی کورد نانرێت، ئەو دەوڵەتانەی کوردستانییان بندەست کردووە بەهەموو شێوازێك کۆشش دەکەن نەتەوەی کورد بەژێردەستەیی خۆیان بمێننەوە، بۆیە لەنێوان خۆیاندا هاوکاری یەکدی دەکەن، ئەو دەوڵەتانە مەبەستییانە نەتەوەی کورد بەو کۆیلەتییەی ئەوان وەك ئەمری واقیع رازی بن و هیچ ئارەزوویەك بەرەو بەدەستهێنانی مافە نەتەوایەتییەکانی نیشان نەدات.
- بەڕای ئەو دەوڵەتانە-کورد هەقیان نییە داکۆکی لەتایبەتمەندییە نەتەوایەتییەکانی کۆمەڵەکەیان بکەن، ئەگەر دەیانەوێن خەڵکی خێرخواز و هاووڵاتی چاك بن، گەر بیانەوێ خەڵکی سەردەم بن، ئەگینا ئەوا خائینی نیشتمانن. شاڵاوی دژایەتیکردنی تایبەتی نەتەوایەتی کورد لە تورکیادا ئەوپەڕی شێوازی دڕندەیی و سەرکوتکردنی وەرگرتووەو، مەبەستییەتی زمان و کولتووری کوردی بخاتە خانەی فەرامۆشییەوە. هەموو ئەمانەش لەبەر دەستدرێژی کردنەسەرو راوەدوونان و گرتن نەتەوەی کوردی پێ ملکەچ دەکرا، لەو کاتانەی کە ژمارەی سەرباز و جەندرمە و پۆلیس لەکوردستان بەشێوەیەکی بەرچاو زێدە دەبن، دەڵێن ئێمە دەمانەوێت ئاشتی و ئاسایش بۆ وڵات دابین بکەین، هەرکاتێکیش کرداری تواندنەوە دەرەنجامی بەرجەستەی هێنایەدی، رادەگەیەندرێت کەوا کۆمەڵگا گەیشتۆتە باری هێوری و ئاشتی. ئەو کاتانەش کە داخوازییە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خڵتانی خوێن دەکرێت، وا بڵاو دەکرێتەوە پێگەکانی ئاشتی سەقامگیربووتەوە، ئاسایش هەموو وڵاتی تەنییەوە، داواکردنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد و ئەو ئەرك و کۆششەی بۆ پارێزگاریکردنی کۆمەڵگای کوردەواری دەکرێت وا لێك دەدرێتەوە کە بەمەبەستی دژایەتی ئاشتی و ئاسایش بێت، کەچی ئەوکارو کردەوە سەر کوتکەرانەی کەلە وڵاتی کوردەواریدا پەیڕەو دەکرێت وەك نیشانەی ئاشتی و سەقامگیر ئاسایش سەیری دەکرا.
زۆر دەگوترێ خزمەتکردنی گەل ئەرکی ئێمەیە، سەرلەنوێ، دەبینین جیاوازییەکی زۆر لەنێوان رێبازی دەوڵەتی تورکدا هەیە لە رەفتاریدا لەگەڵ دۆزی کورد و لەنێوان رێبازی رەفتارکردنی لەگەڵ دۆزی فەلەستیندا. لەکاتێکدا دەوڵەتی تورك مانەوەی خاکی فەلەستین و عەرەب لەژێر دەسەڵاتی ئیسرائیلدا بەهۆیەکی بنەڕەتی نەبوونی سەقامگیری ئاسایش و ئاشتی لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناڤین دەزانێ، کەچی لەلای دیکەوە، خەباتی



گەلی کورد لەپێناو سەرخۆبوون و کۆششیان بۆ ڕزگارکردنی وڵاتەکەیان لەبن باری کۆلۆنیالیزمی نێودەوڵەتی، هۆیەکی بنەڕەتی تەگەرە خستەنە بەردەم ناسەقامگیری ئاشتی لەناوچەکەدا، وەك بنەمای بنەڕەتی سەقامگیری ئاشتی، پەنجە بۆ پێویستی ڕزگارکردنی خاکی فەلەستین و عەرەب لە داگیرکاری ئیسرائیلی درێژ دەکرێت، مانەوەی خاکی کوردستان لەژێر داگیرکاریدا، ئا لێرەدا بەئاشکرا ڕێبازی دوو فاقی لەبیرکردنەوەو ڕەفتارکردن لای سەرکردەکانی دەوڵەتی تورکیا دەبیندرێت. بەڵام ئەوە لەگەڵ ئەو ڕێو شوێنەی سیستەمی جیهانیدا ناکۆکە کە نەتەوە یەکگرتووەکان بەنیازە بیهێنێتەدی. هەروەها لەگەڵ بنەماکانی ئەو لێك گەیشتنانەش ناکۆکە کە یۆنسکۆ بەکۆششێکی بێ ئەندازە خەبات بۆ پارێزگاری کردنی دەکات. ئەگەر نەتەوە یەکگرتووەکان بداتە پاڵ ئۆردووی فرۆفێڵی ڕەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمی ناتوانێت ئاشتی و دادپەروەری بەکردەوە نەك بەقسە بێنێتەدی و ناشتوانێت- ڕێککاری جیهانی بپارێزێت کەلەسەر بنەمای یەکسانی ڕۆنراوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە یارمەتی لەپارێزکاریگردنی مانەوەی ڕێککاری ڕەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمی دەکات.

لەوحاڵەتەدا لەبەرئەوەی کارەکە تایبەتە بە پرسەکانی ئاشتی و دادپەروەری و مرۆڤایەتی، ئەوا نابێت، بەراپۆرتی سەرۆکی حکوومەتەکان ڕازی بین، بەڵکو کارەکە ئەوە دەخوازێت گومانی لێ بکرێت و دادگایی بکرێت بۆ گەیشتن بەوەی کە تاچ ئەندازەیەك ڕاستە یان هەڵەیە، هەرچی ئەوەی سەروکاری بە کەمالیزمەوە هەیە، ئەوا پێویستە بەوردی لەبەردەم ئەو بۆچوونە هەڵوەستە بکەین کە دەوڵەتی تورك لەم بارەیەوە دایمەزراندووە وەك ڕووکارێکی دژ بە ڕەگەزپەرستی.
هەر لەو بەندیوارییەشدا ئەوا پێویستە کرۆکی ئەو سیاسەتەی کە ژمارەیەك لە سەرکردەکانی تورك لەکوردستان پیادەی دەکەن، شیبکەینەوە.

ساڵی ١٩٨١ بەساڵی ئەتاتورك لەتورکیادا ڕاگەیێندرا. ساڵی ئەتاتورك لەڕۆژی ١٩٨١/١/٥ بە وتارێکی سەرۆکی حکوومەتی تورکیا و بەرپرسی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە، فەرماندەی ئەرکانی سوپای تورك ژەنەراڵ کەنعان ئیڤرین دەستی پێکرد کە دەڵێت:
"ئەتاتورك بوو سەرەتای خەباتی دژ بە ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزمی دامەزراند، ڕێی تێکۆشانی لەبەردەم نەتەوە زۆر لێکراوەکان ڕۆشن کردەوە، دەوڵەتی تورکیاش بڕوای بەو سیاسەتە هەیەو بێ دەستکاری پەیڕەوی دەکات".

وێڕای پیادەکردنی سیاسەتی کۆلۆنیالیزمی و ڕەگەزپەرستی بەرامبەر بە کۆمەڵگای کوردەواری، کەچی تورکیا لەو باوەڕەدایە کە لەبەرەی نەتەوە زۆر لێکراوەکانە، هەروەها دەڵێت سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەشی هەربەو ئاقارەدا پەرە دەسێنێت، بەڵام ئاخۆ چ لەوە دەکەن کە دەڵێن ئەو جۆرە گوتەو بۆچوونانە ڕاست نین و ئەوانەی ڕەخنەش لەو ڕاو بۆچوونانە دەگرن تووشی چ دەبن؟
تاکە وەڵام هەمیشە دەستدرێژی دڕندانەو سەرکوت کردن و زیندانی و دادگای کردن بووە، لەو ڕەوشەشدا ئەو بیروبۆچوونانە نە بۆ دادگاییکردن و نەبۆ ڕەخنە لێگرتنیش، بەڵکو دەکەوێتە خانەی ئەوشتە پیرۆزانەی کە هەرگیز نابێت توخنی بکەوێت، ئەو بیرانە بۆ ئەوە خراونەتە ڕوو تاکو پەسەندبکرێن و برەوی پێبدرێت و دەستخۆشی پێ بگوترێت.

بەپێداگرتنێکی سەیرەوە بانگەشە بۆئەوە دەکرێت: کەوا لەتورکیادا کەسێکی وانییە ناوی کوردی لێ بنێین، هەرهەموو تورکن، هەمووشیان دڵخۆشن بەوەی کە تورکن، هەرچی ئەوانەن کەدەڵێن جگە لە نەتەوەی تورك، نەتەوەیەکی دیکە هەیە، یان زمانێکی دیکە بێجگە لەزمانی تورکی هەیە، یاخود کولتوورێك هەیە

جگە لە کولتووری تورک، ئەوانە خائینی نیشتمانن.
لەو گوتەیەی ئیفرین بۆ ساڵی ئەتاتورکی تەرخان کردبوو لەبارەی کەمالیزمەوە دەڵێت: ئەتاتورک نەتەوەیی بوو، بەڵام تێگەیشتنی ئەتاتورک بۆ نەتەوایەتی نەخۆپەرستی و نە رەگەزپەرستی بوو، تێگەیشتنێکی بەش بەش نەبوو، بەڵکو تێگەیشتنێکی تەواو و نەپچڕاو بوو، نەتەوایەتییەکەشی شێوازێکی نوێ بوو، ئەویش نەتەوەی تورکە کەلە کامەرانی و خۆشی گەلەوە سەرچاوەی گرتووە بۆئەوەی لەکاتی تەنگانە و خۆشی و شادی پڕوپاگەندەدا یەکپارچە بێت.

لێرەدا باس لە خۆپەرست نەبوون و رەگەزپەرست نەبوونی ئەتاتورک دەکرێت، ئایا دەکرێت رایەك بە خۆپەرست لەقەڵەم نەدەین کە دان بەماڤ ژیان بۆ کورد نانێت، کۆشش دەکات تایبەتمەندییە دیارەکانی کۆمەڵگای کوردەواری لەناوببات و ناوی کورد لەمێژوو و زمانەکانی جیهان بسڕێتەوە؟ ئایا دەکرێت ئەو رایە بەرەگەزپەرست نەبوون و برِوابوون بەیەکسانی نێوان نەتەوەکان و دادپەروەری لەقەڵەم بدەین کە مەبەستییەتی کورد لەبۆتەی زمان و کولتووری تورکدا بتوێنێتەوە.

بەپێی ئەو رایەی کە ئەگەر بە تورك کردن پەسەند نەکەیت و حاشا لەگەڵی خۆت نەکەیت، ئەوا ماڤ بوونت نییە، لەرێی توندوتیژی بەسەروبەری دەوڵەتەوە، نەتەوەی کورد تەپەسەر دەکرێت، کەچی هەموو ئەمانە بەنەتەوەی یەکگرتوو و تەواو لەقەڵەم دەدرێت، ئاشکرایە لەهیچ بارو رەوشێکدا، ناکرێت جەخت لەسەر ناوەڕۆکی دیموکراتی یان یەکپارچەیی هەر ئایدۆلۆژیایەك بکرێت، کەلە جێبەجێکردنیدا پشت بە هێزو تۆقاندنی دەوڵەت ببەستێت. هەرچی یەکێتی تورك لەکاتی تەنگانەو خۆشیدا ، ئەوا دەبێت ئاوایی هەڵبەسەنگێندرێت یەکێتی لەخۆشی و یەکێتی تورك لە چاودێریدا، بەو ئاوایە ئەوکاتەی کە سوپای تورك سەرگەرمی کاری سەربازییە لە قوبرس، ئەوا دروشمی یەکێتی لە تەنگانەو خۆشیدا بەتوندی بالۆرەی بۆ لێدەدرێت، بەڵام کاتێ کە باس دێتەسەر ئازادی و سەربەخۆیی کورد لەهەرپارچەیەکی کوردستاندا بێت بۆ نموونە "عێراق و ئێران" ئەوکاتە بەهیچ جۆری بابەتی یەکێتی لەکاتی تەنگانەو چاودێریدا نایەتە گۆڕێ، لەسنووریشدا رێ لە کورد دەگرن بۆئەوەی یارمەتی برا هاوخوێنەکەی نەدات و کۆمەکی ئینسانی پێشکەش نەکات، تەنانەت تاوانی وەك "یارمەتی بارزانیت"دا دەخرێتە پاڵ و سەرکوت دەکرێت و دادگای بۆ رێك دەخرێت، بەهەمووو ئاوایەك کۆشش دەکات کورد نەگەنە یەك و دوو. لەو رەوشەدا دروشمی یەکێتی لەکاتی تەنگانەو خۆشی و چاودێری لەهەر ناوەڕۆکێکی دیموکراتی بێبەری دەبێت، ئەو گاڤەی کە نەتەوەی تورکیش کەوتە تەنگژەی سیاسی یان کۆمەلایەتی یان ئابووری، ئەوا دروشمی یەکێتی لەکاتی تەنگانەو خۆشی و چاودێری دێتە گۆڕێ، لەهەمان کاتدا ئەو مەترسیانەش تەشەنە دەکەن کە رێ بەخەباتی کورد دەگرن، پاڵ بە دوژمنەکانییان دەدەن، تەنانەت هەرکەسێ خەبات لەدژی ئەو مەترسیانە بکات کە کوردییان تەنگەتاو کردووە یان پشتیان بگرێت، ئەوا دەخرێتە خانەی دوژمنی نەتەوەو نیشتمان، ئەوکەسە بەتەنیا دەکەوێتە بەر شێوازەکانی سەرکوتی دەوڵەت. ئەو تورکانەی بانگەشەی یەکێتی لەکاتی تەنگانە و خۆشی و چاوەدێری دەکەن، بەو سیاسەتە رەگەزپەرستانەو کۆلۆنیالیزییە یان دەبنە بەربەستی سەرەکی هەموو پڕوپاگەندەکانی "نەتەوەی کورد" هەر ئەوان خۆیان بەتەنیا هەوڵدەدەن چارەنووسییان دیاربکەن و کۆیلەتی و داگیرکاریان پێ ببەخشن. ئەوە چ سەروەری و چ جوامێرییەکە، نەتەوەیەك هەستی پێ بکات کەلەژێر زوڵمی چەوسانەوەی رەگەزپەرستی



کۆلۆنیالیزمی بنالێنی؟

لەوتارەکەیدا بەبۆنەی کردنەوەی ساڵی ئەتاتورك ئیڤرینی سەرۆکی حکومەتی تورك گووتی: هەرە گرنگترین ئەو بیروبۆچوونەی کە بایەخی کۆمەڵایەتی رێنماییەکانی ئەتاتورك دیاردەکات، خۆشویستنی خەڵك و بیروبۆچوونی بەرزی مرۆڤانەیەتی. ئەتاتورك شانازی بەگەلەکەیەوە دەکات و بەچاوی شانازی و هیواوە سەیری دەکات، لەوکاتەی کە رێزو هاوکاری بۆ هەموو ئەو گەلانە دەردەبڕێت کەلەگەڵیاندا دەژین و رێزگرتنی پێویستەکانیشیان لە هەستی نەتەوایەتییەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەو دەڵێت نەتەوەی ئێمە نەتەوەیەکی نە خۆپەرستە و نەلووت بەرزیشە، لێرەدا گوایە کەمالیزم رێز لە گەلانی دیکە دەگرێت. دانانی بەهەموو پێداویستییەکانی لەهەستە نەتەوایەتییەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە، کەچی سیاسەتی بەکردەوە پیادەکراو لەهەق نەتەوەی کورد ئەو قسەلۆکانە پووچەڵ دەکاتەوە. جەخت کردنەسەر رێزگرتنی گەلانی ناتورك، ئەو رژێمەی کە نکۆڵی لەبوونی نەتەوەی کورد دەکات و هەموو رێگایەك دەگرێتەبەر بۆ لەناوبردنی کۆمەڵگای کوردەواری ناکۆکییەکی خەفەتبارە، تەنانەت یەکێکە لەو ناکۆکییە بنەرەتییانەی کە بەدەگمەن نموونەی لەجیهاندا هەیە.

ئەو کەمالییانەی دەکۆشن کوردو کوردستان لەمێژووی زمانەکانی جیهاندا بسڕێتەوە، گوایە فەلسەفەکەیان دان بە دەستەبەرکردنی پێویستییەکانی گەلانی ناتورك دادەنێت، بەراستی کارەساتێکی گاڵتەجارییە، هەرلە بەندیواریی بەو پرسەوە، جێی خۆیەتی ئەوە روون بکەینەوە:

ئەو رایانەی ئیڤرین رایگەیاندن، رای هاوبەشی نێوان هەموو سەرکردەکانی تورکە، تەنانەت گەر ساڵی ئەتاتورك لەلایەن ئیڤرینەوە نەکرابایەوە، بەڵکو لەلایەن سەرۆك کۆمارەکانی پێشووی خۆی با، ئەوا نزیکەی هەرهەمان قسەیان دەکرد، چونکە ئەو رایانە رای ئایدۆلۆژیای دەوڵەتی حکوومەتی تورکە، هەروەها لەو راستییانەی کەجێی گومان نیین ئەوەیە، پیاوانی کۆمەڵگای تورك ئەو ئایدۆلۆژیایەیان بەدڵنیایی و بێ دەسکاری بەدڵە. بۆیە هاتنە پێشەوەی سەرکردایەتی سوپای ئێستاکەیان پێ گرنگە، نەك بۆ بەرزەفت کردنی جموجۆڵی سەربازی، بەڵکو بۆ بەرپەرچدانەوەی دوورکەوتنەوە لە ئەتاتورك و بڵاونەکردنەوە، بیرو راکانی لەنێو لاواندا بایەخێکی لەئەندازە بەدەریش دەداتە مەترسی ئەو کۆششانەی کەمالیزم لە گۆڕەپانی سیاسی تورکدا فەرامۆشی دەکەن.

کەمالییەکان ئامانج و رووداوگەلی شەڕی تورك – یۆنانییەکان و شەڕی تورك-ئەرمەن لەساڵانی ١٩١٩-١٩٢٢ ئاوا دەگێڕنەوە. ئیمپریالیزم گەرەکی بوو وڵاتەکەمان پارە پارە بکات، دەیانخواست نەتەوەی تورك ملکەچ بکەن و لەمێژوویان بسڕینەوە، مەبەستییان بوو تورکیا لەنەخشەی جیهان رەش بکەنەوە، لەهەوڵدانییان بۆ دابەشکردنی وڵاتەکەمان، دەیانویست نەتەوەی تورك بکەنە پارووێکی قووت دراو، باشە نەدەبوا ئەو وشانەی سەرەوە کە کردمانن، ببووبانە ئامۆژگاری بۆئەو کەمالییانەی کە هاوکاری ئیمپریالیزم دەکەن، بۆئەوەی کوردستان پارچەپارچە بکەن. باشە لەجێی خۆیدا نییە ئەو وشانە کاری خۆیان لەبەرپەرچدانەوەی کەمالییەکاندا هەبوایە لەوکاتەی هەوڵیاندەدا سیاسەتی پەرتکەو زاڵ بەیان دەرهەق بە نیشتمانی کورد بەرێوەدەبرد و گەلی کوردییان دەچەوساندەوەو کوردستانیان پارچەپارچە دەکرد و بەرەبەرە لێی دابڕن و کۆشش دەکەن لەزمانەکانی جیهان و لەمێژووشدا رەشی بکەنەوە. سەرەڕای هەموو ئەمانەش ئەو راو هەڵوێستە شۆڤێنییانەو کۆلۆنیانەیان پێ پێویست بوو بۆ شۆڕش و دیموکراتییەت و مرۆڤایەتی و خۆیان نە چەندین ناکۆکی جیاجیا



"دیموکراتییەت لەسەدەی بیستەمدا دەبینییەوە" هەروەك لەسەرەوە روونمان کردەوە، کەمالییەکان بەرێوەبردنی سیاسەتی رەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمییان لەهەق نەتەوەی کورد بەئەرکی خۆیان دەزانی، ئیدی بەو شێوازە بێ رەوشتانەیە دیموکراتیخوازانی تورك و کەمالییە شۆفێنییەکان رەفتاریان لەگەڵ کورددا دەکرد و بەوە گوناهباریان دەکردن کەگیانی نەتەوایەتی رەگەزپەرستی لەنێو گەلدا دەوروژێنن و ئەویش بەبڵاوکردنەوەی شۆفێنییەتی نەتەوەی بچووك، ئەمانەشییان هەموو بۆ ئەوەیە بیکەنە پاکانەی دەستدرێژییەکانیان بۆسەر نەتەوەری کورد. راستییەکەشی کەمالییەکان بەزۆری پەنا بۆ ئەو شێوازانەی دەستدرێژی کردن دەبەن. خەباتی شۆرشگێران و دیموکراتخوازان و نیشتمانپەروەرانی کورد لەدژی شۆفێنییەتی تورك، هەمیشە ملکەچی ئەو گوناهبارکردن و دەستدرێژیکردنانەن، هەمووش گوناهبار دەکرێن، سوسیالیستەکان مارکسییەکان..هتد.

هەرچی داخوازییە نەتەوەییەکان و خەباتی کورد لەپێناو پاراستنی کۆمەڵگاکەیان بە (نەتەوایەتی) لەقەڵەم دەدرێت، تورك سیاسەتێکی زۆر رەگەزپەرستانە و خوێناوییانە لەجیهاندا پەیرەو دەکەن، ئەوەی سەروکاری بەکوردەوە هەیە، ئەوەیە کە کورد خەبات بۆ مافی مرۆڤ و دیموکراتی و ئازادی دەکەن، لەدژی کۆیلەتی دەخەبتن و رەتی دەکەنەوە. لەگەڵ ئەوەش تورکەکان کورد بە بڵاوکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی و رەگەزپەرستی تاوانبار دەکەن، هەرچی کوردن خەبات بۆ بوون و ژیان دەکەن،لەپێناو بەدەست هێنانەوەی روومەتی نەتەوایەتی خۆیان و لەدژی هەوڵی لەناوبردنی کوردستان لەنەخشەی جیهاندا دەخەبتن، هەرگیز ناکرێت سیفەتی نەتەوەی شۆفێنی بدرێتە پاڵ خەباتی کورد.

بەڵام سەرەڕای هەمووشتێك، هەرکاتێ کار گەیشتە مافی تورکەکان لەیۆنان و تەراکیای رۆژئاوا، یەکسەر دیموکراتخوازە تورکەکان خوێنییان دەجوڵێ و چ نەتەوەیەکی بەترسن "حکوومەتی یۆنان دەست لە تایبەتمەندی جۆرایەتی ناسینەوەی کۆمەڵی تورك دەدات، بەنیازە تورکەکان لەتەراکییای رۆژئاوا نەهێڵن، بۆیە دەبێ حکوومەتی تورکی وا بکات ئەوکارانە رابگرن، ئەوە بۆ تورکەکانی قوبرس و کایتیك و بولگاریاش هەروایە، ئینجا تورك چ لە یوگسلافیا یان لە عێراق بن، ئەوا تایبەتمەندییە جۆرییەکانییان لەلایەن حکوومەتەکانی ئەو وڵاتانە دانی پێدانراوە، بەڵام وێنەکە لەنێو تورکیادا چۆنە؟ بۆچی خەباتی نەتەوەی کورد کەژمارەی دانیشتوانی لە (٢٠) ملیۆن رەت بووە، لەپێناو پارێزگاری کردن لەتایبەتمەندییە جۆرییەکانی کۆمەڵگای کورد و خەبات لەدژی کۆلۆنیالیزم و رەگەزپەرستی بە "رەگەزپەرستی و شۆفێنیزم" پەسن دەدەن؟ بەتەواویش روون بۆوە تاوانبارکردنی کورد لەلایەن کەمالییەکانەوە بۆ ئەوە بووە رەگەزپەرستییەتی خۆیان و کۆلۆنیالییەتی تایبەتی خۆیان بشارنەوە، دیارە مافی مرۆڤ و مافی گەلان لەدیاریکردنی چارەنووسی خۆیان هەرتەنیا بەند نەبوو بەو نەتەوەیە و ئەوی دیکەی لێ بێبەش بێت. کۆمەڵەی گەلان و نەتەوەیەککگرتووەکانیش بروایان بەو بنەمایانە هەبوو و پاراستن و پەرەپێدانییان وەك ئامانجێکی بنەرەتی لە بەڵگەنامەی مافی مرۆڤ و ئامۆژگا ئەوروپییەکانی مافی مرۆڤ دیارکرابوو. لەلایەکی دیکەشەوە نەتەوە یەکگرتووەکان و بەڵگەنامەی مافی مرۆڤ وەك ئامانجێکی بنەرەتی مەسەلەی بەدیهێنانی ئەو بنەمایانە لەسەر سەرزەمینی واقیعدا دیاری بۆکرا، لە پێشەکی بەشی پێشدەستی، برگەی یەکەمی پەیماننامەی نێودەوڵەتی مافی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووریدا کە لە ١٩٧٦/١/٣ ەوە کاری پێدەکرێ، جەخت لەسەر ئەوە



دەکات کە مافی نەتەوەکان لەدیاریکردنی چارەنووسی خۆیان، مافێکە دەبێ بەبێ هیچ مەرج و جێگرەوەیەك داکۆکی لێ بکات، نەتەوە یەکگرتووەکانیش دەڵێت، کار بۆ پارێزگاریکردن لەو مافە دەکات و رێشی بۆ خۆش دەکات بەئاسانای بەدەست بێت، لەبڕگەی یەکەمی بەشی پێشدەستی پەیماننامەی نێودەوڵەتی مافە مەدەنی و کۆمەڵایەتییەکاندا کەلە ٢٣/٣/ ١٩٧٦وەوە کاری پێدەکرێت، باس لە مەسەلەیە کراوە، کەوا پێویستە ئەو مافە بنەڕەتییە ببێتە راستی، بەلاّم نە کۆمەڵەی گەلان و نە نەتەوە یەکگرتووەکانیش بایەخییان بە دۆزی کوردستان نەداوە ئەو رێکخراوانە خۆیان بەمافەکانی نەتەوەی کورد سەرگەرم نەکرد.

لەو سەرو بەندەی کە کۆمەڵەی گەلان زۆر بەگەرمی داکۆکی لەمافی نەتەوەکان لە دیارکردنی چارەنووسی خۆیان دەکرد، ئەوا کوردستان پارچەپارچە و بەش بەش کرابوو و سیاسەتی پەرتکەو زاڵبەیان لەهەق نەتەوەی کورد پەیرەو دەکرد، بەدەر لەخواست و ئارەزووی نەتەوەی کورد، سیاسەتی دابەشکردنی ئیمپریالیزمیانە لەرێی پەیماننامەی نێو دەوڵەتییەکانەوە هاتەدی، کوردستانی خستە ژێر منداتەوە، لەو رەوشەدا ناکۆکی لەنێوان بڕوا پێبوون و پیادەکردنی ئەو بنەمایانە هەن کە کۆمەڵەی گەلان هەیەتی، چونکە لەو سەروبەندەدا ئینگلترە ئەندام بوو لە کۆمەڵەی گەلان و کێشەیەکی یەکجار ئالۆزی لەسەربوو، ئەوەبوو عێراق لەژێر منداتی ئینگلیز دابوو، بەو مانایەی کە سەر بە ولاّتە کۆلۆنیالییەکانی ئینگلیز بوو، هەر چی باشووری کوردستان بوو، لەبەرئەوەی لەژێر منداتی عێراق بوو، کەلەژێر سەرپەرشتی بەریتانیا دابوو، هەر لەو پێودانگەدا ئینگلترە سیاسەتی کۆلۆنیالیزمی لەکوردستان بەڕێوە دەبرد، چالاکی سەرەکی ئەو سەردەمەی ئیمپریالیزمی ئینگلیز خنکاندنی مافە نەتەوایەتی و دیموکراتییەکانی کورد بوو لەرێی تۆقاندنی خوێناوی، لەبەر چەندین هۆش کۆمەڵەی گەلان نەیتوانی دەستبەر و پەرە بە پەیوەندییە سەقامگیرە نەگۆڕەکانی نێوان گەلان بکات. هەروەها بێ توانایی لە ئاست راپەڕاندنی ئەرك خۆی سەبارەت بەئاشتی جیهانی، بەمەش ناکۆکییەکی قووڵی خستە نێوان یاسا نووسراو و نێوان واقیعی کردەیی.

بەزۆریش باس لە ئاشتی و دادپەروەری و یەکسانی نێوان گەلان و مافی نەتەوەکان لە دیاریکردنی چارەنووسییان دەکرا، کەچی لەواقیعدا چەندین نەتەوە لەژێر باری چەوسانەوە دابوون و سیاسەتێکی درندانەی رەگەزپەرستانەی لەهەق پەیڕەودەکرا. هەرئەو بێ توانایی و شلی و خاوییە بوو جیهانی بەرەو شەڕی دووەمی جیهانی برد و لەگەڵ شەڕیشدا کۆمەڵەی گەلانیش هەڵوەشایەوە. لەساڵی ١٩٤٥دا پەیوەندی نێودەوڵەتی سەرلەنوێ لەژێر رێبەرایەتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە باش بۆوە، لەو سەروەختەدا مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلان بنەمایەکی گرنگ دادنرا، بەلاّم پرسی مافی مرۆڤ هەر بەبایەخداری زۆرەوە مایەوە. ناویشیان لەوسەردەمەش تا سەردەمی دامەزراندنی نەتەوە یەکگرتووەکان، سەرەڕای سەرکەوتنێکی رێژەیی لەدامەزراندنی سیستەمێکی نوێی جیهانی، ئەوا کارێکی زۆریش کرا بۆ ئەوەی رەوشی پارچەپارچەو دابەش دابەشی کوردستان هەروا بمێنێتەوە، ئەوەبوو سیاسەتی پەرتکەو زاڵ بە بەبێ دەستکاری لەهەق نەتەوەی کورد پەسندکرا. مەرجی پاراستنی سەقامگیری لەرۆژهەلاّتی ناڤیندا هەروا هێشتنەوەی کوردستان بوو بەپارچە پارچەیی لەنێوان ولاّتانی ناوچەکەدا. مافە دیموکراتی و نەتەوەییەکانی بە نەتەوەی کورد لەعێراق و تورکیا و ئێران خلتانی خوێن کرابوو. بۆئەوەی نەتەوەی کورد هیچ داخوازییەکی سیاسی داوا نەکات و نەتەوەی کورد داوای ئازادی و سەربەخۆیی نەکات، ئەوا دەستدرێژی توندی دەکرایە





سەر و هەرکاتێکیش ئەو داوایانەی دەخرانەروو وێڕای ئەمە، ئەوا کورد دووچاری لەنێوبردنێکی دڕندانە دەبوونەوە.

وەك دەبینـدرێ لەسـاڵی ١٩٤٥، وێـڕای هەوڵـدان بـۆ رێکخستنی بارودۆخی جیهانی نوێ، ئەوا بارودۆخی کوردسـتان هـیچ گـۆڕانێکی بـەلای باشـیدا بـەخۆوە نەبینی، هەر لەو سەرو بەندەشدا، جیاوازییەکی ئاشکرا لەنێوان یاسا نووسراوەکان و راستی کردەییدا هەبوو، نەتەوە یەکگرتووەکان کەبایەخێکی زۆر بە پرسی ماڤ مرۆڤ و یەکسانی نێوان نەتەوەکان و ماڤی دیاریکردنی چارەنووسـییان دەدا، بـۆ بـەدیهێنانی ئـەو بنەمایانـە لەسـەرزەمینی واقیعـدا، ئـەوا هـیچ نارەزاییـەك لەسـەر دۆزی مانـەوەی کـورد بـەبێ هـیچ مـافێکی مرۆڤایـەتی دەرنابڕێـت، دژی چەوسـاندنەوەو تۆقانـدنی نەتـەوەی کـوردو دژی رەوشـی کوردسـتان وەك کۆلۆنییـەکی نێـو دەوڵـەتی، ناوەسـتێت. تەنانـەت لـە بنەڕەتـەوە وەك لەکێشەیەك لێـی ناڕوانێـت، بەئەنقەسـت دۆزی کـورد لەخشتەی کارەکانی نەتـەوە یـەکگرتووەکان فـەرامۆش دەکات و هیچ دەنگێکی کوردنییـە، ئەوەی هەیـە تـەنیا وتاری ئەو وڵاتانەیە کە کوردستانییان دابەش کردووە. ئەو وڵاتانەی کوردستانیشییان دابەش کردووە لەهیچ کارو کردەوەیەك کۆناکەنەوە، بۆئەوەی دۆزی کوردستان نەگاتە خشتەی کارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەڵام پشتگیری نەکردنی نەتـەوە یـەکگرتووەکان لەنەتـەوەی کـوردی چەوسـاوە و پاڵدانـە وڵاتـە رەگەزپەرسـت و کۆلۆنیالییەکان، بەرەبەرە دەسەڵاتی ئەو رێکخراوە کەم دەکاتـەوەو بـێ کـەڵکی دەکـات. لەرەوشـی جـێ بەجێکردنی کێشەی نەتەوە چەوساوەکاندا، پێویستە نەتەوە یەکگرتووەکان پێوانەی گونجاو بەکار بێنێت و خۆ لەو بیرو بۆ چوون و کردارانە دووربگرێـت کـە ئایدۆلۆژیای دەوڵەتی رەگەزپەرست پیادەی دەکات.

بـەڵام نەتـەوە یـەکگرتووەکان هـەر لەبنەڕەتـەوە بـوونی دۆزی کوردی لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست فەرامۆش کـردووەو هـەروەها نایـەوێت لەرەوشـی کوردسـتانی کۆلـۆنی نێـو دەوڵـەتی بگـات، چـاو لـەو هەوڵانـە دەپۆشـێت کـەناوی کـوردو کوردسـتان لەزمانـەکانی جیهان و مێژوودا بسڕنەوە.

ئێمـە دەڵـێین پەسـندانی ئـەو ئایدۆلۆژیایـە بـەدژی ئیمپریـالیزم لەلایـەك نەتەوەیـەکگرتووەکان، گاڵتـە پێکردن و بەسووك سەیرکردنە بەو بنەمایانەی کەخۆی دایڕشتووە. نەتـەوە یـەکگرتووەکان بەئاسـتی جیـاواز بایـەخ بـەو رووداوانـە دەدەن کەلەجیهانـدا روو دەدەن، دۆزی فەلەستین و دۆزی قوبرس جێی بایەخی نەتەوە یەکگرتووەکانن، هەروا دۆزی نامیبیا و خەباتی بەرەی رزگاریخوازی پۆلیساریو و بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی ئەریتریا و چەندانی دیکە لەو بزووتنەوانەی ئەفریقیا جێی بایەخی نەتەوە یەکگرتووەکانن، هەروەها بایەخ بە بزووتنەوەی ئیسلامی لەفلیپین و دۆزی ئەفغانستانیش دەدات. ئـاخۆ ئـەو پێوەرانـە چـین کـە نەتـەوە یەکگرتووەکان پەیڕەویان دەکات، کاتێ کە ئەو دۆزانە دەخاتـە خشتەی کارەکـانی، ئـەدی ئەوکاتـە بـەجۆرێك لـەجۆرەکان بایەخی پێدەدات. ئایا بۆچی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی کورد لەنەتەوە یەکگرتووەکان وەرناگیرێت؟

## تورکیا و کورد و ئیمپریالیزمی کولتووری لەکودستاندا

یۆنـسکۆ بەئامانجـە زانـست لەپێوەندییـە نێـو دەوڵەتییەکانـدا سـەروەربێت و کولتـووری مرۆڤایـەتی بپارێزێت و پێشی بخات و بەرەو کولتووری مرۆڤایەتی هـەنگاو هـەڵێنێ و لـەو کولتـوورەش بتۆژێتـەوە، کـە ئەفراندوویـەتی و گـەلان و کۆمـەڵگاکان تـا ئەمڕۆکـەش پاراستوویانەو دەیدەنە بەر رووناکی. لەو رەوشەشدا یـەکێك لەپرسـە گرنگـەکانی بـەردەم یۆنـسکۆ پرسـی کولتـوورە، کولتـوور لـەو رۆژگـارەی ئێمـەدا بەشـێکە لـە





سەرلەبەری پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی جیانابێتەوە.

جالەبەر ئەوەی ئاوایە دەبێ بایەخی تەواوی پێ بدرێت. ئەمرۆکە پرۆژەگەلی گرنگ لەپێناو بەدیموکراتی کردنی کولتوورەوە دادەرێژرێت و دەخرێتە بەر حوکمی جێبەجێکردن و سیاسەتی کولتووری ئەوە دەخاتە بەردەمی خۆی بۆ دەوڵەمەندکردنی ژیانی ناوەوەی خەڵك، بۆیەشە بەئامانجە تایبەتمەندی کولتووری خۆجێی کەلە داب و نەریتەوەو لە سەر چاوەگەلی ناوخۆی هەرگەلێك بەتەنیاوە هەڵقوڵاوە گەشەی پێ بکات و بیخاتە بەر رووناکییەوە. هەنووکەش وا بەشێوەیەکی باش زانراوە کە ئەگەر کولتوورەکە دواکەوت و سەرچاوکانی وشکاویان هاتێ، ئەوا دەستەبەرکردنی گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی مەحاڵ دەبێت. ئەو راستییەش رۆژانە روون دەبێتەوە.

هەر لەو پەیوەندییەدا، راکێشانی خەڵك بۆنێو کارە کولتوورییەکان و بەرجەستەکردنی لەواقیعدا، پرسەکەش یەکجار بایەخدارەو سەروساختی بەمافی هاوولاتییانەوەو هەموو دانیشتوانی هەر ولاتێکدا هەیە "لەبەخاوەن بوونی کەلتوور"دا، هەروەها سەروکاری بەجێبەجێکردنی بنەماکانی یەکسانی نێوان هەموو هاوولاتیانیشەوە هەیە لە "بەخاوەن بوونی کەلتوور"دا.

لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٠ لە هلسنکی یەکەمین کۆڕ سەبارەت بە کولتووری ئەورووپایی بەسترا، لەو کۆڕەدا کە بەچاودێری یونسکۆ بەرێوەچوو، شاندی هەموو ولاتان ئامادەبوون، لەوتاری کردنەوەی کۆڕەکەشدا (ئوخو کیکولون)ی سەرۆکی دەوڵەتی فنلەندا گووتی: "ئامانجی بنەڕەتی هەر سیاسەتێکی کولتووری، دەبێ دەستەبەری بەشداربوونی هەموو هاوولاتییان بکات لەهەر دەوڵەتێکدا، لەچالاکی کولتووریدا ئەو وشانە بوونە دروشمی یەکەمین کۆڕی کولتووری ئەورووپایی.

دوابەدوای ئەم کورتە روونکردنەوە بنەڕەتیانە، لەسەرمانە بپرسین: نەتەوەیەك زمانەکەی بواری قسەپێکردنی نەدرێت و دەستدرێژی دڕندانەی بکرێتەسەر، چۆن دەتوانێت جموجۆڵی کولتووری ئەنجام بدات؟

ئایا کولتوور بەبێ زمانی نەتەوایەتی گەشەدەکات؟ ئەدی کولتوور یەکێك لە سیماو رووەتەکانی زمانی نەتەوایەتی نییە؟ چۆن کولتوورێك دەپارێزرێ و گەشەدەکات کە رووبەرووی ئەوهەموو دەستدرێژییە رەگەزپەرستی و کۆلۆنیالییە ببێتەوە. سەبارەت بەدۆزی کوردیش، تەواو روون بۆوە. زمانی کوردی قەدەغەیە، بۆئەمەش چەند رێوشوێن گیراوەتە بەر، سەرەڕای زمانی کوردی ئەو کولتوورەی کوردیش لەژێر پاڵەپەستۆیەکی تووش دایە.

لەسەرەوە ئاماژەمان بۆئەو دەستدرێژییە رەگەزپەرستانە و کۆلۆنیالیزمییە کرد، بەهەبوونی ئەو دەستدرێژییە رەگەزپەرستییە، چۆن بەشداریکردنی کورد لەچالاکی کولتووری فەراهەم دەکرد؟ لەناوەڕاستدا تەنانەت دان بەبوونی کوردنانرێت؟ چۆن مەسەلەی دەوڵەمەندکردنی ژیانی گیانی خەڵك لەبارودۆخی لەناوبردنی کولتووری کوردی پارێزراوی بەمیرات بۆماوەی ئەو سەدانە، لەمەرجی وەلانانی کولتوور لەژیانی کۆمەڵایەتییدا فەراهەم دەبێت؟ چۆن کولتووری مرۆڤایەتی بە لەناوبردنی کەلەپووری کولتووری کورد دەوڵەمەند دەبێت؟

ئامانجی سیاسەتی کەمالیزم تواندنەوەی کولتوورێکە لەچوارچێوەی کولتوورێکی دیکەدا وابکرێت زمانی کوردی لەبیرببرێتەوە، ئەویش بەکوێرکردنەوە و پڕکردنەوەی سەرچاوەکانی، لەسەرێکی دیکەشەوە ئەو سیاسەتە بەئامانجە، هەموو دەسکەوتەکانی کولتووری کورد بەتورك بکرێت، وەك دەسکەوتی کولتووری تورك نیشان بدرێت، بۆنموونە شایی و گۆوەندو گۆرانی و



ستران و چیرۆک و سەربردەی میللی کورد وەک فۆلکلۆری تورک نیشان دەدرێت، گۆرانی و ستران گوتن و نووسین و نواندن و بەزمانی کوردی تاوانێکی گەورەیە، ئەوانەی ئەوکارانەش بەرێوە دەبەن دووچاری لێپێچینەوەو زیندانی کردن دێن. ئەگەر بەزمانی کوردی لەرادیۆ یان تەلەفزیۆن بدوێت، یان تەنانەت ئەگەر ناوی وشەی کورد بیبات، بەخیانەتی نیشتمانی بۆی دەنووسرێت. وەرگێرانی گۆرانی کوردیش بۆ تورکی بێ گریێ بەرێوەدەچێت، هاوکات ئاوازو شێوەی دەرەوەی گۆرانییەکە بەرگی تورکی بە بەردەکەن بەو تێکدان و شێواندنە دەوڵەتی تورک بەو "بەرهەمە فۆلکلۆرییە لەڤیستیڤاڵە جیهانییەکاندا" بەشداری دەکات. لێرەدا هۆکارەکانی تالآنکردن و تواندنەوەی نەتەوەی کورد لەگەڵ هۆکارەکانی لەناوبردنیدا تێکەڵ و پێکەڵ دەبن، دەوڵەتی تورک سیاسەتێکی کولتووری ئیمپریالیزمی لەهەمبەر نەتەوەی کورد جێبەجێ دەکات. زمانی کوردی قەدەغەیە و خوێندن بەزمانی تورکییە، بەرهەمەکانی کولتووری کورد دەخرێتە بەر پاڵەپەستۆی هەزاران دەستدرێژی و دەوڵەتی تورک نەرمی لەگەڵ بوونی هەر شوێنەوارێکی کولتووری کورد لەژیانی کۆمەڵایەتیدا نانوێنێت. جا ئەم بۆچوونە چۆن بۆی هەیە لاف و گەزاف لێ بدات کەرێز لەماڤ مرۆڤ دەگرێت. چۆن چۆنی زار هەڵدێنن بڵێن جیاوازییەکان نامێنن؟ تەنانەت چۆن دەکرێت پاراستنی ماڤ مرۆڤ بسەلمێنرێت، کەچی دەوڵەتی تورک هەموو توانایەکی فەراهەم دەخاتە ژێر دەستی ئەوانەی واز لەکوردبوونی خۆیان و بوونی تایبەتی خۆیان دەهێنن. ئەوانەی بە بەتورک بوونیان قایلن. تەنیا ئەوان دەتوانن کەڵک لە ئاسانکاری و پشتگیری جۆراو جۆر وەربگرن، کە دەوڵەت دەیخاتە بەردەستییان. بۆئەوەی هەر کوردێک لەتورکیا لەگەڵ تورکێک بەرانبەر بن، دەبێت ئەو مەرجانەی تێدا هەبن. بەواتایەکی دیکە واز لە رێز و رووەت و سەروەری خۆیان بهێنن، چونکە هەر مرۆڤێک واز لەبوونی نەتەوایەتی خۆی بێنێت، ئەوا هیچ نرخ و بەهایەکی گیانی و هیچ سەروسامانێکی نێو دەروونی بۆ نامێنێتەوە. ئایا کۆیلە توانای بوژانەوەی هەیە پەرە بەشت بدات؟ خۆ ئەوە لەگەڵ کرۆکی بنەماکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و سیاسەتی رووناکبیریی یونسکۆ ناکۆکە، یونسکۆ لەخەمی بوژاندنەوەو پەرەپێدانی هەموو کولتوورێکی جیهان دایە، پێی وایە بەو شێوازە کولتووری مرۆڤایەتیی دەوڵەمەند دەکات، کەچی دەوڵەت ئامانجی تەفروتوناکردنی سەرلەبەری کولتووری کوردی بۆ خۆ لەبەرچاو گرتووە، دیارە ئەمەش رێبازێکی رەگەزپەرستی کۆلۆنیالییە، ئا لێرەدا پرسێک سەرهەڵدەدات کە دەبێت لەئاستیدا هەڵوەستەیەک بکەین، ئەویش پرسی پەروەردەکردنە. لەوبوارە پرسی پەروەردەکردنی منداڵان لەساڵانی زووەوە دێتە پێش. وەک زانراوە پەروەردەی زووبەزوو ئەودەمە ئامانجەکانی دەپێکێ کە بەزمانی دایک بەرێوە بچێت، بێبەش کردنی منداڵان لەخوێندن بەزمانی زگماک دژی بنەماکانی سیاسەتی کولتووری یونسکۆیە.

لەناوبردنی ئەو کولتووە نەتەوایەتییە کە لەداب و نەریتی نێوخۆوە هەڵقووڵاوە و کوێرکردنەوەی سەرچاوەکانی شتگەلێکن تەواو دژبە چەمکەکانی پەروەردەیە کە یونسکۆ لەکۆششدایە بۆ پێشخستن و بڵاوکردنەوەی، چونکە هەرگیز ئەو منداڵانە ناتوانن کەسایەتی سەربەخۆی خۆیان دابمەزرێنن، ئەو کۆمەڵگایەش کەلەو خەڵکانە بنیات بنرێت ئەوا کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتی نییە.

سیاسەتی کەمالیزم کەلەهەقی نەتەوەی کورد جێبەجێ دەکرێ، بەمانای زانستی وشەکە، سیاسەتێکی رەگەزپەرستی و شۆڤێنیزمییە، ئەوەش نموونەی کولتووری ئیمپریالیزمی جۆربەجۆرە، کە گەرەکییەتی نەک هەر زمان و کولتووری کوردی لەناوببات و بیخاتە





خزمەت مەرامە رەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمییەکانی، بەڵکو مەبەستییەتی تایبەتمەندییە جۆرایەتییەکانی نەتەوەی کورد لەناو ببات و لەجیهانی بوونی نەهێڵێت و ناوی کوردستان لەزمانەکانی جیهان و لەمێژووشدا بسڕێتەوە.

ئامانج جەخت کرنەسەر بەکۆیلەبوون و چەوساندنەوەو هێنانەدی کۆمەڵگایەکی بێ کەسایەتی و کەرامەت و هێنانەدی کۆمەڵگایەکی کۆلۆنیالییە، سیاسەتی کولتووری کەمالیزم بەندە بە (شۆڕشی زمان و شۆڕش بەشێوەی دەرەوەدا..هتد.

ئەوە هەمووی بەتەنیا خەڵەتاندنە. جا دەبێ سەیری بارودۆخی رۆژگاری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بکەین، ئینجا باسکرنی ئەو گۆڕانە گەورانەی کەبوونە هەوێنی ئەو "شۆڕشانە لە ژیانی کۆمەڵ و گەلدا" ئیدی بەوئاوایە جەخت لەسەر بەشداری گەورەی تورک دەکرێت لەچالاکییە کولتوورییەکانیدا، هەرچەندە کەمالیزم هەرلەو شۆڕشانە پێك نەهاتووە، کاتێ کەباس دێتەسەر شۆڕشی کەمالییەکان و کاری کەمالییەکان لەهێنانەدی چاکسازی جۆربەجۆر- کە بەسروشتی خۆی پرسی گرنگن دەبێ باس بکرێن - ئەوا ئەو پرسانەی کەپێویستە لەئاستیاندا بسەنگرێنتەوە هەر لەپەنای دەمێننەوەو پرسگەلێکن دەبێ هەر بەنهێنی بمێننەوە، هەرچی ئەوانن کە دەکەونە بەرحوکمی گفتوگۆو یاسای سزاکان، پرسگەلی دەستدرێژی رەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمن کەلە کوردستاندا پەیڕەو دەکرێت، ئینجا ئەوە بەندیواری بە ئیمپریالیزمی کولتوورییەوە هەیە کە لەهەق نەتەوەی کورد پەیڕەو دەکرێت، لەسەرەتادا جەختمان لەسەر ئەوە دەکردەوە کەوا سستەمی سیاسی ئاسایی کوردستان، تەنانەت کۆلۆنیالیش نییە واشمان دیارکردبوو کەوا زۆر لەسیستەمی کۆلۆنیالیزم خۆشی کەمترە.

کۆلۆنیالییە کلاسیکییەکان ناوی تایبەتی خۆیان هەبوو و ئەوگەلانەی نیشتەجێش بوون دانیان پێدانرابوو، ئەو واتایەی دەوڵەتی داگیرکەر دان بەبوونی دەنێ، ناوەکانیشییان لەسەر ئاستی یاسادا بەکاردەبرا. هەرچی نەتەوەی کوردە، سەرەڕای تالان و بڕۆکردنی بەها مایەکی و گیانییەکانی، ئەوا رەسەنایەتی و رێزو پایەی لەکەدار دەکرێت، جا تەواو لەو گۆشەیەوە دەبێت سەیری ئەو ئیمپریالیزمییە کولتوورییە بکەین کە لەکوردستاندا پیادە دەکرێت. ئەو سیاسەتە کولتوورییە لەکوردستاندا لەهەمبەر زمان و کولتووری کورد پەیڕەوکراون، لەبنەڕەتدا زۆر دواکەوتوو و خوێناوی ترە لەوەی پێی دەڵێن ئیمپریالیزمی کولتووری.

دەوڵەتی دەسەلاتدار یان زلهێز بەزۆری لەیەکێك لەولاتە دواکەوتووەکاندا قوتابخانە دەکەنەوە و پۆلی خوێندن دادەمەزرێنن و بە لێشاو دەبەخشن، خەباتکەرانی پێناوی ئاشتی بۆ دەنێرن. زمانی نەتەوایەتی فێری گەلانی ئەو ولاتانە دەکەن و پێوانە و تێگەیشتنی خۆی بۆ بەهاکان دەگەیەنێتە ئەوان، هەروەها دەکۆشێت پەیوەندی کۆمەڵایەتی هاوتای ژیانی تایبەتی (واتە شێوازەکانی ژیان لەدەوڵەتی دەسەلاتداردا) دادەمەزرێنێت. ئیدی بەو ئاوایە لەنرخی کولتووری ناوخۆ کەلە داب و نەریتەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، دادەبەزێنێت. هەروەها لەئاستی کولتووری هەڵقوولاوی کانیاوەکانی نێو خۆوە کەم دەکاتەوە، دەوڵەتی سەردار کۆشش دەکات جوولانەوەی کۆمەڵ سنووردار بکات، ئەویش بەبلاوکردنەوەی کتێب و گۆڤار و سیپارەی جۆراوجۆر ، بەمەش کاریگەریی سیاسیی و ئابووری لەسەر ئەو کۆمەڵەوە زیندە دەبێت، دوای ئەمەش هەوڵدەدات دەسەلاتی خۆی بەسەر سیاسەت دەرەوەو بازێری ئابووریدا بسەپێنێت.

ئەوە بەکورتی هێڵە گشتییەکانی جموجۆڵی ئیمپریالیزمی هاوچەرخە. باشە سیاسەتی کوردستانییانەی دەوڵەتی تورك لەو هەمووەدا لەکوێیە؟ تەنانەت ناکرێت لەگەڵ ئیمپریالیزمی کولتووریشدا







بەراوردی بکرێت، چونکە بەرەو شتێکی وای دەبات کە هەرتێك و پێکدانی کولتووری کورد نییە.

بێگومان لەرێی دەستێوەردانێکی روون، دەبێتە هۆی دابەزاندنی بەهای کولتووری کورد و تێکوپێکدانی، بەڵام ئامانجەکە نەك هەر لەوەدا تەواو نابێت، بەڵکو دەگاتە ئەو ئەندازەی کۆششی هەڵتەکاندنی سەرلەبەری کولتوورەکە لەبن و بۆتکەوە دەربهێنرێت، لێرەدا رەوشەکەش هەر بەندیواری بەکێشەکانی دامەزراندنی کۆمەڵێکی کوردییەوە نییە کەلەگەڵ پرسە پەرەسەندووەکاندا هاوکاربێت، لەگۆشەنگای تێگەیشتنی کۆلۆنیالیبیەتی تورکییەوە بۆئەو پرسانە، بەڵکو کارەکە بەندیواری بە پرسێکی ترسناکترەوە هەیە، کە گەرەکییەتی هەموو شتێك تێك و پێك بدات.

هەڵبەتە ئەو دەستێوەردانە رەوشێکی لەبار بۆ جموجۆڵی دەوڵەتی کۆلۆنیالی دەستەبەر دەکات، کە دەیەوێت هەمووئەو لایەنانە بگرێتەوە کە هەرچی کوردییە وێرانی بکات، دەست بەسەر هەموو بەها مایەکی و گیانییەکانی کۆمەڵدا دەگرێت، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی باشتر دەست بەسەر کوردستاندا بگرێت و خێرو بێرەکەی بۆخۆی ببات، چونکە کوردستان سەرچاوەیەکی گرنگی کەرستەی خاوە، هەروەها بازێرێکی باشی ساخکردنەوەی کالآی بۆرژوازیەتی تورکە، هێزە دەسەڵاتدارەکانی ئابووری توانییان ئەو پرسە لەرێی دامەزراندنی پێوەندی وەك (دراو-بانك-سوودی بانك) چارەسەر بکەین، ئەویش بەکەڵك وەرگرتن لەو نەخشە گرنگەی کەلە پێوەندی نێودەوڵەتیدا هەیبووە. وڵاتانی تازە گەشەکردووی وەکو تورکیا و عێراق و ئێرانیش دەتوانن پاڵپشتی ئەو جۆرە پێوەندییە کۆلۆنیالییانە بکەن، لەرێی پەیرەوکردنی شێوازی دوژمنکارانەی توند و تیژەوە بەڵام تورکیا بەخۆی ئەوا ئەو پەیوەندییە کۆلۆنیالیانە تەنیا دەکرێت لەرێی لە ناوبردنی تەواوی تایبەتمەندییە جۆرییەکانی نەتەوەی کوردەوە درێژەی هەبێت.

جا سەرەرای چمك و بۆچوونەکانی کەمالیزم، کەچی یونسکۆ وەك "پاڵپشتیکەری خەباتی تەواوی گەلانی چەوساوەو دۆستی راستەقینەی هەموو ئەو گەلانەی نیشان دەدا کەلەژێر دەسەڵاتی داگیرکەردا دەناڵێنن" وەك بیرو چالاکییەك لەرێی خەباتی گەلانی چەوساوە رۆشن دەکاتەوە، لەپێناو ئازادی و سەربەخۆیی لێی دەدوێت. ئەو شێوە هەڵسەنگاندنە لەگەڵ بەهاوکارەکانی یونسکۆو ئەو بەهایانەی کە کۆششیان بۆ دەکات، بیانچەسپێنێت و بڵاویان بکاتەوە، دژن ئینجا ئەگەر یونسکۆ ماوەیەکی درێژ ئەو رێبازەی هەربەرنەدا، ئەوا بروا پێکردنی لاواز دەبێت و ئیدی کاریگەریشی لاواز دەبێت و تەنانەت بێ کەڵکیش دەبێت و یونسکۆ ناتوانێت ئامانجەکانی لەرێی پشتگیری و دنەدانی کارەکانی ئیمپریالیزمی کولتووری ئامانجەکانی بهێنێتەدی. بەپێچەوانەش، ئەگەر لایەنگیری لە نەتەوە خەباتگێرەکان کرد لەدژی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم، ئەوا رێزو حورمەت پەیدا دەکات.

ئەمانەی کە رووبەرووی لەبەردەم ئیمپریالیزمی کولتووری هەرە دواکەوتوو و خوێناوی دەوەستن و زمان و کەلتووریان لەژێر پاڵەپەستۆی رەگەزپەرستی بێ ئەندازە دەناڵێنێ، بەو ئاوایە ئەو ئامانجانە دێنەدی کە یونسکۆ خەباتی بۆدەکات، بەڵام بۆ چارەسەری ئەو کێشانەی ئاماژەیان پێکرا، پێویستە نەتەوە یەککگرتووەکان و رێکخراوەکانی لەبەردەم کۆمەڵێك پرسی گرنگ بوەستێت و بەوردی لێیان بکۆڵێتەوە، چونکە هەندێ کێشە هەن پێویستە یونسکۆ و یونسێف و لێژنەکانی مافی مرۆڤ لێی بکۆڵنەوە. ئیدی ئاوا بۆ نموونە، لەتورکیادا نووسەران لەزیندانەدا ئازارو ئەشکەنجە دەدرێن، ئینجا ئەگەر نووسەرێك بایەخ بەدۆزی کورد بدات ئەوا دەستدرێژی و ئازار و ئەشکەنجەی زێدەتر دەبێت. لەزیندانەکانی تورکدا و لەودیو شیشەکاندا شێوازی ئازاردانی جۆر بەجۆری





جەستەیی وەك چەپۆك و زللە و سەرەسمك- فەلاقەکردن-ی تێدا بەکار دێت، هەروەها شێوزای جل پێ داکەندنی گرتوو و زیندانییەکان تا ئەندازەی رووت کردنەوەی تەواو بەکاردێت: "جل و بەرگ و کەلوپەلەکانتان دەپشکنین".

بەڵام بەزۆری شێوزای فەلاقەکردن بەکاردێت، کە تێیدا زیندانی لەسەر زەوی لەسەرپشت رادەکێشرێن و قاچەکانی بەپەت بەبنمیچەوە هەڵدەواسرێت بەتەلی ئاسنین لەبنی پێی دەدرێت تا لەهۆش خۆی دەچێت.

هەڵبەتە نووسەرانیش ئەو ئازارو ئەشکەنجە دەدرێن و بەتەلی ئاسنین لەدەستیان دەدرێت، دەڵێن:

-ئەوە نووسەرمانە، با لەهەردوو دەستەکانی بدەین کە پێی نووسیون!

-با پەنجەو مەچەکی بشکێنین بۆئەوەی بۆ لەمەولا بزانێت کتێب نووسین مانای چییە.

زۆر درندانە پەلاماری دەدەن:

-پەنجەکانت دەشکێنم تا دواتر ببینیت و بزانیت قەڵەم چۆن بەدەستەوە دەگیرێت.

-لەسەری بدە، مێشکی بپژێنە بۆئەوەی لەمەودوا بیرنەکاتەوە.

دەست بەلێدان دەکرێت تا پەنجەکان دەئاوسێن و دەمارەکان دەتەقن و خوێن فشکە دەکات... زۆر بەتووندی و دڵرەقی لێدانەکە، بەرق و کینەو پێداگری و ئازاردان و بوغزاندنێکی نامرۆڤانە بەردەوام دەبێت.

چاك سەیر سەیر بکەن،ئەوە ئەشکەنجەدانی زیندانە، ئەوە ئەوتۆقاندنەی زیندانە کە دەرهەق بە مرۆڤێکەوە دەکرێت، کە لەبەر نووسین گیراوە، لەپێناو نووسینی کتێبێك، ئەو ئازارو ئەشکەنجەو تۆقاندنە لەزیندانێکەوە بۆ زیندانێکی دیکەش هەر هەیە، شەرمەزارییە نووسەرێك لەبەر نووسین ئەشکەنجە بدرێت، هەرگیز شەرەف لەوەدا نییە لەپێناو "ریشەکێش کردنی رەگی خراپە" و بۆ "شکاندنی دەستەمو پەنجەی تاوانبار" لەدەست بدرێت، بڕواننە ئەو دیمەنە، نووسەرێك بەرەو رووی لێپرسینەوەی پاسەوانی زیندانێك دەبێتەوە:

-بۆ دەنووسیت؟

-ئایا هەر درێژە بەنووسین دەدەیت؟

-نووسینی کتێب تاوان نییە؟

-پێت وایە کتێب نووسین کاری تۆیە؟

ئازارو ئەشکەنجەدانی نووسەر بە پێ لەقەو زیندانی کردنی ئاوێنەیەکی راستگۆی راستی رژێمی تۆقاندنەو ناکرێت مێشك و بیری خەڵك و مێژوودا بسڕێتەوە، مەسەلەکە رووێکی دیکەشی هەیە، ئەویش ئەوەیە، ئەو پاسەوانانە خوێندن و نووسین نازانن و تەنانەت ناتوانن ئیمزاش بکەن.

جیاوازی گەورە لەنێوان زانست و ئایدۆلۆژیادا هەیە، کاتێك کەپیاو و زانست مەسەلەیەك شی دەکاتەوەو دەرەنجامی گرنگ بەدەست دێنێت، هەرگیز گرنگ نییە کێ لایەنگیرییەتی و کێش دژیەتی، ئەو شیکردنەوەی زانستییانەی مەسەلەکە و بایەخی بابەتییانەی مەسەلەکەی لا گرنگە، چونکە زانست خۆی بابەتییە. دەرخستنی راستی و بوێرانەی ئەو دەرەنجامانەی بەدەستی هێناوە رەگەزێکە لە کرداری زانستییانەی دادەبڕێت، لەکاتی دەرخستنی تێڕوانینی دیاریکراودا، ئەندازەی قازانج و زیان یان ئەو ئەنجامانەی لە راگەیاندنیدا دەکەونەوە گرنگ نییە.

هەرچی ئایدۆلۆژیایە بەتایبەتیش دەوڵەتی رەسمی ئەوا ئەوخەڵکانەی وا لێ دەکرێن رفتارەیان بۆچوونی دیاریکراویان هەبێت، ئەوا بە وردی رەچاو دەکرێت، ئەوەش گرنگە کە ژمارەی هەریەکەو لەو خەڵکانە دیاری بکرێت کەئەو رەفتارە یان بۆچوونەیان هەیە.

هەروەها ئەو دەرەنجامانەش لەبەرچاو دەگیرێن کە دەبنە هۆی ئەوجۆرە رەفتارو بۆچوونانە، ئیدی ئاوا بۆ نموونە، بەڵگەنامەی مێژووی تورك و بەڵگەنامەی زمانی تورکی و بیردۆزی (زمانی هەتاو) کە لەساڵی ۱۹۳۰ هەوڵی بڵاوکردنەوەی درا، بۆچوونێکی زۆر دوور لەبیری زانستی رەنگ دەداتەوە، بۆچوونەکان ناوەڕۆکێکی





ئایدۆلۆژیایان هەیە، ئەو بۆچوونانەش لەژێر هەڵسووڕاندنی پەیمانگای مێژووی تورك و پەیمانگای زمانی تورك بەسەرپەرشتی پرۆفیسۆری مام ناوەندی کادیرە سیاسییەکانەوە، کەلە هەمان کاتدا زۆربەیان نوێنەربوون لەپەرلەمان و ئەتاتورك دایمەزراندبوون و لەقسەو بۆچوونەکانی ئەو دەرنەدەچوون، پەرەی دەسەند. ئەتاتورك گەرەکی بوو ئەوە بسەلمێنێت کەوا تێڕوانینەکانی یەکجار راست و پڕ زانستین، لەوسالانەدا ئەو تاکە پێشەوای پارتی گەلی کۆماری بوو، ئەوە وێڕای پایەی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران. ئەو پرۆفیسۆرانە بیروراکانییان لەسەر بۆچوونەکانی ئەو دەچنی و بەمادی و مەعنەویش پاداشت دەکران، ئەوەش یەکێکە لەو سەلمێندراوانەی کە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کەوا زانست لەتورکیادا لەسەر شێوازەکانی دەوڵەتدایە.

لەسالانی سی ئەم سەدەیدا، ئەو خەڵکانەی کە بیردۆزی نازانستییان بەدەست دەهێناو تەنانەت ناوی زانستییان بەدرۆ هەڵدەگرت، مادی و مەعنەوی خەلات دەکران. لەراستیدا ئەو خەڵکانە کە دەیانووسی و بیریان دەکردەوە کارو کردەوەو راو بۆچوونی کاربەدەستانی سیاسییان لەبەرچاو دەگرت. هەمیشە کۆششیان دەکرد کەهەر لەچوارچێوەی بۆچوونی ئەواندا بن. لەکاتی نووسیندا لەو ئاوازەیان دەژەنی کە بەدڵی گەورەکان بوو و بەئاگاییەوە خۆیان لەو زانیارییانە گێل دەکرد کە بنەمای رووداوی راستەقینەیان هەبوو و ئەو ماوە درێژەی نێوان بۆچوونەکانیان و ئەو جۆرە زانیارییانەیان دەپاراست، چونکە دەیانزانی بەدڵی ئەم یان ئەو کاربەدەستە سیاسییە نابێت.

بەوجۆرە لەسالی ۱۹۳۰دا پایەتی ئەکادیمیای ئەو توێژەرانەیان بەرزکردەوە کەلایەنی سیاسیی و هزری هێڵی پارتی گەلی کۆمارییان پەیرەو دەکرد و بە ئاسانی بوونە پرۆفیسۆرو بەمادی و مەعنەویش پاداشت کران. هەرچی ئەوانەبوون کە ئەو پرۆفیسۆرانەی بەزانستی لەقەڵەم دەدان، ئەوا خرانە بەندیخانەوە، ئەوەش بەروونی ئاماژە بۆ نێوانی زانست و ئایدۆلۆژیا دەکات و هەروەها جەخت لەسەر جیاوازی نێوان شێوازی ئەوکارەی کە زانست پێی دەوێت لەگەڵ ئەوەی بەئاوازی بۆچوونەکانی ئایدۆلۆژیای دەوڵەتی دەژەنی. لەو رەوشەدا جیاوازییەکی گەورە لەنێوان بیرکردنەوەو شێوازی پیاوی زانست و لەنێوان بیرکردنەوەو کردەوەی ئەو مرۆڤەوە هەیە کەلە چالاکییەکانی ئایدۆلۆژیای دەوڵەت رێبەدی بۆ دەکات، پیاوی زانست هەمیشە بیر دەکاتەوەو دەنووسێت بەبێ ئەوەی بایەخ بە ژمارەی ئەوانە بدات کە پەیڕەوی دەکەن یان لایەنگیری بۆ پەیدا بوون یان نا، ئەو بوێرانەو شێلگێرانە دەنووسێت و پەردە لەسەر ئەو مەسەلانە لادەدات کەپێی راست و دروستن، ئەو ئاوا بیر ناکاتەوە ئاخۆ لەوە چەندی قازانجە یان زیانە.

بەلام ئەوەی تێڕوانینەکانی ئایدۆلۆژیا لەبەرچاو دەگرێت، ئەوا پێشوەخت رای دەسەلاتی سیاسی دەخەملێنێت و ئاخۆ پەرچەکرداری چۆن دەبێت. ئیدی بەو جۆرەی کە کاتێ پاسەوانی بەندیخانە دارەکەی بەرز کردۆتەوەو نووسەرێك ئەشکەنجە دەدات، ئەوا هەمیشە ێ ئەوەی لەبەر چاوە کە بیرو هەڵسووکەوتی کاربەدەستان لەگەڵ ئەوکارە تا چ ئەندازەیەکە.

هەرکە رەخنە لەو بەڵگەنامانە دەگرێت کە سەروکاریان بەدۆزی کوردەوە هەیە یان لەو گۆشەیەی کە رەخنە لە کەمالیزم دەگرێت، دووچاری دژواری زۆر دێت، لەو دەوڵەتەی کە دژایەتیکردنی کوردو تایبەتمەندییە جۆرایەتی کۆمەلایەتی کوردەواری گەیشتۆتە ئاستی یاسای دەوڵەتی.

لەوتارێکدا بۆ گەل لە ۱۹۸۱/۱/۱۷ ئیڤرینی سەرۆکی حوکم سەبارەت بە نیشتمانی تورکی خودان چوار هەزار ساڵە گووتی: "هەندێ خائین هەن گەرەکیانە نیشتمانی خاوەن چوار هەزار ساڵەی تورك پارچەپارچە و لێك بلاو بکەن".



ـ ـە نیشتمانی چوار هەزار ساڵەی تورك چ واتایەك دەبەخشێ؟ ئەدی تورك لەساڵی ١٠٧١دا واتە بەری ـریکەی ٩٠٠ ساڵ نەهاتوونەتە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ـەنادۆڵ؟ کە رەوشەکە ئاوابێت بۆچی با لە نیشتمانی چوار هەزار ساڵەی تورك دەکرێت؟ ئەو زانیارییانە لەو ـەگەنامەیەی مێژووی تورك وەرگیراوە کە لەسەرەوە ـ ـاژەی پێکراوە و دەبێژێت تورك شارستانیەتی ـرۆقایەتییان دارشتووە، تورکەکانی ئاسیای ناوەڕاست ـەسەر چوارلای جیهاندا دابەش بوون و کولتووری ـ ـرستانییەتی جۆراوجۆریان دامەزراندووە. بەپێی ئەو ـۆچوونانە سۆمەرییەکان کەلە هەزارەی چوارەمی بەر ـ ـ یێ لەدوو ئاوان (میسۆپۆتامیا)و کوردستان ژیاون و حیـ ـیەکان کە لە هەزارەی دووەمی بەر لە زایین ـەنادۆڵ ژیاون، تورکن، زمانی تورکیش دایکی ـ ـنەکانی جیهانە.

ـەو تێڕوانینە نا زانستییانە دوو ئامانجییان هەیە کەلە گێژەپانی سیاسەت و ئایدۆلۆژیاوە گیریان خواردووە. ـ ـانجی یەکەمییان گەرەکییەتی بیسەلمێنێت هەرچی ـەسنووری (پەیماننامەی نەتەوایەتی)دا بژێت، تورکە، ـەو هەڵبەستەیەش بە بنەمایەکی مێژوویی پشت ـەستوور بکات، راستی پرسەکە لێرەدا سەروکاری ـەکوردەوە هەیە، واتە بیسەلمێنێت کورد تورکن. ـ ـانجی دووەمینیش بەرزکردنەوەی ورەی تورکەکان و تێکدانی پێوانەی داهێنانی کوردو کەم کردنەوەی ـ ـیەخی و ئیدی بەدواشیدا کرداری بەتورك کردن ئاسان بێت. ئەو ئایدۆلۆژیایە زۆر بەچاکی لەچارەسەرکردنی ـۆزی کورد و دۆزی ئەسکەندەرونە بەکار هاتووە بۆئەوەی بیسەلمێنن ئەسکەندەروونە تورکە، بۆیە بەو عارەبانەی لەدوورگەی ئەسکەندەروونە نیشتەجێن، تورکی ئەسکەندەروونە، ئینجا کە رەوشەکە ئاوایە ئەوا ئەنادۆڵیش ولاتی چوارهەزار ساڵەی تورکە، پشتگیری کردن لەو بۆچوونە دوور لە لۆژیکە، لەساڵی ١٩٨١دا بەڵگەیەکی روونە لەسەر رێبازی نازانستییانەی بیری

تورك، لەهەمان کاتیشدا ئامارژە بۆ تەنینەوەی ئایدۆلۆژیای رەسمی لەسەر شێوازی بیرکردنەوەی زانستی دەکات.

شێوازی کاروبیرکردنەوەی زانستی رەخنە لەو تێڕوانینانە دەگرێت و جەخت لەسەر هەڵەبوونی دەکاتەوە، هەرچی ئەو بیرکردنەوەی لەسەر ئایدۆلۆژیا هەڵچنراوە، دەست خۆشی لێدەکات و هەرگیز خۆ لەقەرەی ئەو هەڵە گەورەیە نادات و خۆی وا دەردەخات کە نە بیستوویەتی و نەدیتوویە، بەراستیش پرسی هەرە گرنگ کەدەبێ لەئاستیدا هەڵوەستە بکەین ئەوەیە، ئەو ئایدۆلۆژیایە رێ لەهەموو رەخنەیەك دەگرێت کەلێی دەگیرێت،

یەکێك لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی ئایدۆلۆژیای کەمالیزم، کەلە بنەڕەتدا لەسەر ساختەو درۆ دامەزراوە، دژایەتیکردنی رەخنەیە، هەرچی ئەو رەخنانەن کەخۆ لەقەرەی رەخنەگرتن لەسیاسەتی کەمالیزم دەدەن، لەهەمبەر دۆزی کوردستاندا، ئەوا دەنێردرێنە ئەو دەستانەی تایبەتن بەیاسای سزاکان. ئەو ئایدۆلۆژیایە ئەوانە خەلات دەکات کە ستایشییان دەکەن و پێیان هەڵدەڵێن، کەچی ئەوەی رەخنەی لێ بگرێت دەخرێتە زیندانەوە، دیارە ئەوەش دەبێتە کۆسپ لەبەردەم گەشەکردنی کەسایەتی ئازاد لەکۆمەڵدا، هەرلە بەندیواری بەوەی پێشەوە، ئەوا پرسی زۆر هەن کە ملی نەتەوە یەککگرتووەکان و ئەو رێکخراوانە دەگرێتەوە کە سەربە ئەوانن، بەلام چاوەڕوانی ئەوە لەو رێکخراوانە ناکەین، کە خۆیان وا دەردەخەن هیچ لەبارەی ئیمپریالیزمی کولتووری پیادەکراو لەلایەن کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم نازانن، لێکۆڵینەوەیەکی راستەقانی سەبارەت بەو پرسە بکەن، وەلامی حکوومەتی تورکیش بۆئەو پرسانەی کە سەروکاریان بە ئەشکەنجەوە هەیە، یەکجار کورتە: "یاسای دەوڵەتی ئێمە ئەشکەنجەی حەرام کردووە، بەپێی یاساکانی ئێمە بەتاوان دادەنرێت جا لەو سەراو دەراوەوە پێداگرتنەکانی ئێوە لەسەر

هەبوونی هەندێ شێوازی ئەشکەنجە لای ئێمە راست نییە".

دیارە ئەو رژێمە جیاجیایانەی کەلە جیهاندا ئەشکەنجە پەیڕەو دەکەن، بەزۆری بوونی ئەشکەنجە لەلایان رەت دەکەنــەوە. بەواتایــەکی دیکــە ئەوانــە کــەدەڵێن: ئەشکەنجەدان لای ئێمە نییە، ئەوا بەکردەوە ئەشکەنجە پەیڕەو دەکەن و هەرخۆشییان ئەشکەنجەیان کردۆتە پرۆگرام و سیستەم.

کــە ژەنەراڵــەکان لــە ۱۹۸۰/۹/۱۲ دەســتییان بەســەر حوکمــدا گــرت، یەکــەمین زەبریــان راگەیانــدنی هەڵوەشــاندنەوەی یاســای ســاڵی ۱۹٦۱ بــوو، کــە ئەشکەنجەدانی حەرام کردبوو و داکۆکی لە ئازادی بیرو سەربەستییەکانی مرۆڤ دەکرد، ئەنجوومــەنی مــەزنی میللــی تورکیــا و رێکخــراوە کارگێڕییــە خۆجێیــەکان و هــەموو ئــەو دەســتانەی کــە لــەڕێی هەڵبژاردنــەوە پێــك هاتبوون هەڵدەوەشاندنەوە، سیستەمی سەربازی کەبێ کــارەیی یاســاکەی راگەیانــدبوو، خــۆی کردبــووە جێگیرەوەی یاساکە. وێڕای ئەمەش، ئەمڕۆکە هەزاران لاو بــەتاوانی هــەمووارکردنی یاســا یــان بــەتاوانی پیلانگێــران بــۆ هەڵوەشــاندنەوەی ئەنجوومــەنی مــەزنی میللی دەدرێنە دادگا، بێ کەلك نییە ئەوە وەبیر بێنینەوە کەوا ئازادی بیرو سەربەستییە مرۆییەکان و بنەماکانی دیکــەی نــاو یاســای ۱۹٦۱، دێنــە جێبــەجێکردن، بەمــەرجێك تــوخنی دۆزی کــورد نەکــەوێت، هــەر لەسەرەتاوە ئاماژەمان بۆ پێویستی باسکردنی بیروڕای ئەتاتورك کرد، بەسەریەکەوە لەگەڵ کارەکانی، چونکە شیکردنەوەی بیرو راکانی بەواتایەکی دیکە دوان و نووسینەکانی، یارمەتی زۆرمان دەدەن تا تێبگەین. کــاری هــەرە گــرنگ شــیکردنەوەی مەبەســتی کارەکانییەتی، هەروەك ئاماژەمان پێکرد.

هەرلە پەیوەندی بەو پرسەوە ئاماژەمان بۆ راکانی ئەتاتورك کرد سەبارەت بە خەباتی رزگاریخواز لەئاست پیادەکردنی ئەو راو بۆچوونانە سەنگراینەوە، کە تایبەت بوون بەدۆزی کوردستان، جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە کە راو بۆچوونەکانی بەتەواوەتی لەگەڵ بیرو هزریدا ناکۆکن.

نموونەیــەکی دیکــە کــە سەروســاختی بەچــمکی دیموکراتییەتــەوە هەیــە، دەڵــێن ئــەتاتورك روونــی کردۆتەوە، خاوەنی دەسەڵات، گەلە بەبێ ئەرك و سنوور و واشی کرد کە کارەکە لەواقیعدا وابێت. ئەتاتورك چاك گەلی دەناسی کە سەرچاوەی دەسەڵاتی سیاسییە، بەزۆری جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە کاریگەریی (رەسەنایەتی گەورە) بۆ گەلە، ئەتاتورك پشتیوانێکی گەرمی دیموکراتی بوو، ئەو دەیگوت دیموکراتییەت بنەمای هەرە گەشی رەوشی ئەم سەردەمەیە، وشەکانی ئەتاتورك، گەل بێ ئەندازو ئەرك خودان دەسەڵاتە، لەگەڵ هەڵسەنگاندنی رووتی ئەو وشانە هاوشانە، بەڵام رووداوو واقیعی زینــدوو ئــەو هەڵــسەنگاندنە پەسند ناکەن.

لەساڵی ۱۹۲۳، ئەتاتورك پارتی گەلی کۆماری دامەزراند و خۆی بووە بەرپرسی گشتی، لەساڵی ۱۹۲۷ پەیڕەوی ناوخۆی ئەو پارتە پەسەندکراو لەساڵانی دواتریشدا چەندین گۆڕانکاری بەسەر ئەو پەیڕەوەی ناوخۆدا هات. بەڵام پرسە گرنگەکان هەروەك خۆی مانەوەو نەگۆڕدران، پەیڕەوی ناوخۆ دەڵێت، بەرپرسی گشتی پارت، واتە ئەتاتورك خۆی هەموو ئەندامەکانی ئەنجوومەنی مەزنی میللی بەراوێژکردن لەگەڵ بەرپرسی دووەم سکرتێری گشتی هەڵدەبــژێرێت،، بــەڵام ئــەتاتورك هــەرخۆی سەرپشکە لەدەست نیشان کردندا، بەو رەنگەش ئەوانە ئەندامانی ئەنجوومەنی مەزنی میللی تورکیا، وەك چۆن فەرمانبەران دادەمەزرێن، ئەوانیش دادەمەزرێن، هەرچی ئەوانەبوون کــە پێیــان دەگــووتن هەڵبــژێردراوی دووەم، ئــەوا بــەپێی ئــارەزووی ئــەتاتورك لیــستی ئامــادەکراو دەخەنە ناو سندوقی هەڵبژاردن، ئەوە تەواوی ئەرکی هەڵبــژێری دووەمە کە هیچ کارێکی دیکەی نییە، ئەو نوێنەرانەی کە ئەتاتورك بۆ ئەنجوومەنی مەزنی میللی



- بدەمەزرێنن لەیەکەمین کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی خۆیدا ئەتاتورکیان بۆ سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران هەڵدەبژارد، بەو ئاوایە هەڵبژاردنی ساڵانی ١٩٢٧-١٩٣١-١٩٣٥ بەڕێوە چوو، هەروا بەهەمان شێوەش هەڵبژاردنەکانی دواتری ساڵانی ١٩٣٨-١٩٣٩-١٩٤٣یش بەڕێوە چوون.

هەڵبژاردنە لاوەکییەکانیش بەهەمان شێوە بوو، هەرکە شوێنی نوێنەرێك لە ئەنجوومەنی مەزنی میللی چۆڵ دەبێت، ئەوا دەست بەجێ نوێنەرێکی دیکە لەشوێنی دادەنرێ، ئەو دامەزراندنانەش وا بەئاسانی بەڕێوە دەچوون کەزۆر لە دامەزراندنی فەرمانبەرێك لە وەزارەتێکدا ئاسانتر بوو، بوونی هەڵبژێری دووەمیش هەر بۆ ئەوە بوو کە ئەوکارە سانایە دیزە بەدەرخۆنە بکات. بەڵام گۆڕینی میکانیزمەکە هیچ لەناوەڕۆکی میکانیزمەکە ناگۆڕێت.

لەپرۆگرامی پارتی گەلی کۆماریدا مەسەلەیەکی ئێجگار گرنگ هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەتاتورك تا لەژیاندا دەبێت بەرپرسی گشتییە، بەو واتایەی پارتێك هەیە بەرپرسە گشتییەکەی تا لەژیاندا مابێت ناگۆڕێت، ئەمە بەدەر لەوەی کە ئەو پرسە گشتییە لەماوەکانی دواتردا بەرپرسی دووەم بووە.

لەساڵی ١٩٣٥، سکرتێری گشتی پارت کەلە هەمان کاتدا وەزیری ناوخۆش بوو، دیارە هەموو ئەمانە دیموکراتی نین، ئەگەر رێز لە ویستی گەل بگیرابایە، ئەوا نوێنەران بەدامەزراندن نەدەچوونە ناو ئەنجوومەنی میللی هەر لەبنەڕەتەوە ناکرێت بەو دەستە پەرلەمانییە بڵێین ئەنجوومەن  کە لە رێی دامەزراندن پێك هاتووە، کە هەر بەئەوانە دەچوو کە لەژێر سێبەری رژێمە-توتالیتییەکان-پێك دەهات کە ئەوکاتە تازە لە ئەورووپا سەری هەڵدەدا، لێرەدا پێویستە پێوەندی نێوان یاسای ساڵی ١٩٢٤و پەیڕەوی ناوخۆی پارتی گەلی کۆماری بەسەر بکەینەوە، دەقی پەیڕەوی ناوخۆ بەزۆری لەسەر یاسای ناوبراو رۆنراوە، تەنانەت لەزۆر لایەنەوە وشە بەوشە وەك ئەوە. بەڵام پێویستە وەك دەستەواژەی مافپەروەری رەفتار لەگەڵ یاسای ساڵی ١٩٢٤ و پەیڕەوی ناوخۆی پارتی ناوبراودا بکەین، بەپێی یاسا دەبێ هەر چوار ساڵ جارێك هەڵبژاردن بکرێت و ئەنجوومەنی مەزنی میللی تورکیا، سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران هەڵدەبژێرێت، بەڵام ئەو یاسا گرنگانەی کەلە پەیڕەوی ناوخۆدا هەبوو، لەبەرئەوەی باس لە چۆنییەتی هەڵبژاردنی ئەندامان لەئەنجوومەنی گەلی تورکیادا دەکات، بەو واتایەی کە پەیڕەوی ناوخۆ پرسی دیاریکردنی نوێنەری گەل دەداتە دەست ئارەزووی بەرپرسی گشتی پارت، هەروەك چۆن فەرمانبەرێك بۆکارێك دادەمەزرێت.

هەربەو شێوەیەش نوێنەری گەل دیاردەکرا، دیارە ئەوە روونە کە پایەی ئەتاتورك وەك بەرپرسی گشتی پارت، لەپایەی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران گەورەترە، چونکە نوێنەرانی گەل وەك بەرپرسی گشتی پارت دادەمەزرێنێت، نەك وەك سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، ئینجا ئەوانەی کە خۆی دایاندەمەزرێنێت وەك نوێنەر لەئەنجوومەن، ئەو وەك سەرۆکی وەزیران هەڵدەبژێرن.

ئەوە سەروساختی نێوان پارتی تاقانەو یاسایە. لێرەدا ئەنجوومەنی مەزنی گەل دڵی ئەو دام و دەزگایە و هەر تەنیا بە رواڵەت میللییە، بەتەنیا هەربۆ ئەوەیە کە شێوازی دیموکراتی بداتە کارە سیاسییەکە، چونکە دەستەیەك نییە گەل هەڵیبژاردبێت و لەسەر بنەمای هەڵبژاردن دامەزرابێت، ئەمە جگە لەوەی کە نوێنەرایەتی زۆرینەی گەل و نەتەوەش ناکات، بەڵکو نوێنەرایەتی ویستی تەنیا یەك کەس دەکات، ئەوەی جێی مشتومڕ نییە ئەو دام و دەزگایەی بنیاتی رێکخستنی دیموکراتی نییە، ناتوانێت کاری دیموکراتی بکات، تەنانەت ئەگەر ئەو راستییەشی پشتگوێ خست کەوا لەو ساڵانەشدا کە ئەتاتورك دەیگوت: "بێ هیچ کۆت و ئەرکێك گەل خودان دەسەڵاتە" دەیتوانی ئەوەش بڵێت "من لێرە کۆ و







دەکەمەوە، کە ویستیشم دەتوانم بڵاوەو پێ بکەم و لاتان بەم".

هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەتاتورك پشکی سەرەکی نەداوەتە دیموکراتییەت، بۆیە ناکرێت ببێژین ئەو رێزی لەویستی گەل گرتووە و لایەنگیری بیرو رێبازی دیموکراتی بووە، وەك زانراوە داخوازییە سیاسییەکان کە (پشت بە ویستی یەك کەس دەبەستێت، لە گۆشەنیگای ماڤ مرۆڤەوە بەخراپ هەڵدەسەنگێنرێ. دیارە جیاوازییەکی ئاشکرا لەنێوان چمکی تاکە مرۆڤێك و چمکی ماڤ مرۆڤەوە هەیە، بەڵام کە ئەو ناکۆکییە دەشاردرایەوەو دەرنەدەخرا، ئەوەیان شتێکی دیکەیە، جا لەبنەڕەتدا ئەوکاتە، جگە لەمە جێبەجێ نەدەکرا، ئەوەبوو کار بەشێوەیەك بەڕێوە دەچوو و قسەش بەشێوەیەکی جیاواز بوو. ئەو سەردەمە رۆژنامەو ناوەندە زانکۆییەکان و سەندیکاو هاوبەندییەکان، بەکورتی دیموکراتییەتی تورکیا، جەختی لەوانە دەکردەوە "ئەتاتورك بایەخێکی زۆر بە دیموکراتییەت دەدات"، هەرگیز باس لە راپرسی و شیکردنەوەی رووداوە زیندووەکان نەدەکرا، خۆیان وا دەردەخست کە نەگوێیان لێ بووەو نە بیستوویانە کەس لەسەر رەخنەگرتن لە کەمالیزم تەنگاو کرابێت، بەتایبەتیش ئەوانەی لەسەر دۆزی کوردستانەوە رەخنەیان لێ دەگرت، بڕوا ناکەم ئەوەی باسی دەکەیت وابێت، بەڵام هەرچی لەتوانام دابێت بواری ئەوەت بۆ دەڕەخسێنم بەرگری لە راکانی خۆت بکەی، ئەو چەشنە تێگەیشتنە لای تورکە دیموکراتییەکان نییە، ئەوانە خۆیان وا نیشان دەدەن کە گوێیان لەو وشانە نەبووە کەلەسەدەی هەژدەیەمدا لە ئەوروپا لەسەر زاران بووە.

بڕوانن ئەو رەوشە نەك هەر بەندیواری بەتەنیا بەڕژێمی ١٩٨٠/٩/١٢وە نییە، بەڵکو تەنانەت لەڕژێمی سیاسیی فرە حزبیشدا نییە، کاتێك کە دام و دەزگای دامەزراو بەویستی ئازادانەی گەل و لەوکاتەوەش کە هەموو ئازادییەکانی مرۆڤ و ئازادی رۆژنامەوانی و ئازادی دامەزراندنی سەندیکاکان پارێزراون.

لێرەدا پێویستە ئاوڕێك لەو پێوەندییانە بدەینەوە، کە لەنێوان چمکی دیموکراتی و کۆماریدا هەیە، راستە ئەتاتورك سەرچاوی دەسەڵاتی سیاسی گۆڕی، لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا، ئایین ئەو بنەمایە بوو کە دەسەڵاتی سیاسیی لەسەر رۆنرابوو، لەگەڵ دامەزراندنی کۆماری تورکیاش نەتەوە بووە سەرچاوەی دەسەڵات، بەڵام ئەوە هەر بەتەنیا تیوری راستەو لەواقیعدا هیچ جیاوازییەکی جۆرایەتی میرات گرتنی کوڕ بۆ پاشایەتی لەباوکەوەو لەنێوان مرۆڤ کە بەدرێژایی ژیان بەرپرسێکی گشتی بێت نییە، بەڵکو سەرباری ئەوەش سەرۆکی وەزیرانیش بێت.

وێڕای هەموو ئەمانە دەڵێن، کەمالیزم سەرپشکانە هەر لەپێش، بەویستی گەل و رێبازی دیموکراتی لەژیاندا بەخشیوە، بەبڕوای ئێمەش ئەوە بەتەنیا ئاماژە بەوە دەکات کە (کەمالیزم) پەرە دەسێنێت، سەبارەت بەپرسی دیموکراتییەتیش ئەوا لەناکۆکییەکی ئاشکرا دایە، لەنێوان لایەنی تیۆری و بەکردەوە جێبەجێ کردنی.

لە سییەکانی ئەم سەدەیەدا، لەرۆژگاری بەرهەڵستی نیشتمانی کورد لە ئەودەمی-مەحموود ئەسعەدی وەزیری ناوخۆ بۆ کورد دەدوێت گوتی:

"هەر تەنیا تورکەکان ماڤ ئەوەیان هەیە لەو دەوڵەتەدا لەمافە نەتەوەییەکانیان بەرخورداربن، هەرچی ئەوانەشن کە تورك نین تەنیا یەك مافییان هەیە، ئەویش ئەوەیە خزمەتکارو کۆیلەی تورکان بێت".

زۆرجاران عیسمەت ئەنیونوی بەرپرسی دووەمی پارتی گەلی کۆماری و سەرۆکی حکوومەت ئەو جۆرە قسانەی دووبارە دەکردەوە، لەئاکامی کەڵەکەبوونی ئەو زانیارییە لە رووداو دابڕاوانە، ئەمڕۆکە سەرباری هەمووشت، جەخت لەسەر ئەوە دەکرێتەوە کە کەمالیزم دیموکراتییەتی لەپێشەوەی ئامانجەکان داناوە.

بارودۆخ ئەمڕۆ چۆنە؟ لە ١٩٨٠/٩/١٢ ئەنجوومەنی

ـەزنی میللی تورکیا هەڵوەشێندرایەوەو دوایی بە ـحسەلاتی ناوخۆ و دام و دەزگا هەڵبژێردراوەکانی گەل هێنراو لەشوێنی ئەوەدا خەڵکی نوێ داندران، کە ـۆربەی ئەو تازە دامەزراوانە خەڵك سوپایی خانەنشین ـوون. هەروەها هەموو ئەو دام و دەزگایانەش ـەڵوەشێندرانەوە کە بەهەڵبژاردن پێك هاتبوون.
ـ ـەای کاری پارتە سیاسییەکانو سەندیکاکانیش ـحستی پێدا هێنراو سەروگوێی کرا، ئەمەش بێگومان ـرەنگدانەوەی بڕوا نەبوونە بەرژێمی سیاسیی فرەحزبی، ـەواشیدا بڕوا نەبوونە بەویستی گەل بەمیکانیزمییەتی ـیموکراتی، رژێمی ١٢ی ئەیلوول دەڵێت: لەپایزی ـاڵی ١٩٨١ ئەنجوومەنی دامەزراندن زیندوو دەکرێتەوە و یاسایەکی نوێ بۆ وڵات دادەڕێژرێت. هەر لە ـەتووکەشەوە راگەیەندراوە کە رێ بە نوێنەرانی پارتە سیاسییەکان نادرێت بچنە ناو ئەنجوومەنی دامەزراندن، ـبێت بەهیچ شێوەیەك بەشداربن. جەختیش لەسەر ـەوە دەکرایەوە کەهیچ ئەندامێکی ئەنجوومەنی کۆن ـچێتە ناو ئەنجوومەنی تازەوە، ناسینی تا ـەندازەیەکی جۆری ئەوانەی کە رێیان پێنادرێت بچنە ـاو ئەنجوومەنی دامەزراندن، رێ بۆ ئەوە خۆش دەکات ـا کێ بۆی هەیە بچێتە ناوی. دەکرێت بەناکامی بڵێین، ـەو خەڵکانەی دەچنە ناو ئەو دەزگایە کە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی پاڵێوران، دیارە ئەوەش بەکار و ڕێبازی دیموکراتی دانانرێت، بەڵکو هەندێ رێوشوێنی نادیموکراتین.
ئینجا ئەگەر ئەوە رێبازێکی دیموکراتی نییە، ئینجا ئەگەر ئەوە رێبازێکی نادیموکراتی بێت، بەڵام لەگەڵ بنەماکانی ئەتاتورك تەواو سەروبەرە، ئەوە بوو ئێمە چۆنییەتی هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی میللیمان بۆ روون کردوونەتەوە.
جا یاسایەك کە لەلایەن "ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوایەتی" پێشنیلکراو لەو بنەمایانەی پێك هاتووە و رەنگدانەوەی ویستی ئەو ئەنجوومەنەیەو پاشان دەبێتە یاسای کۆماری تورك، بێ ئەوەش وێڕای راگەیاندنی پرۆژەی پێك هێنانی ئەنجوومەنی دامەزراندن، کەچی جەخت لەسەر ئەوە دەکرێت کە هەر بەڕەزامەندی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی پێك دێت و هەر ئەخشی دەستەی راوێژکاری ئەنجوومەنەکەی دەبێت، زەمینە خۆش کردن بۆ تاوتوێکردنی پرۆژەی یاساکە لەناوەندی بەربڵاوی رۆژنامەو رادیۆ و تەلەفزیۆن، بەواتایەکی دیکە لەناوەندو کۆڕی رای گشتی، دەکرێت یارمەتی ئەوەبدات سروشتی دیموکراتی بوون بەمەسەلەکە ببەخشێت، بەڵام رێ بۆ ئەوە خۆش ناکرێت. ئینجا ئەگەر بەئاشکرا بەهیچ جۆرێك رێبازی نووسین پێك ناهێنێت، بەڵام ئەوە تەواو لەگەڵ بیروڕاکانی ئەتاتورك رێك دێتەوە. کاتێکیش کە دەڵێن ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی میراتگری ئەتاتورکە و ئەمەش ناشارێتەوە، ئەوا بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە ئەوان ئەتاتورك لەمیانەی کارەکانی هەڵدەسەنگێنن و هەرکێ بڵێت ئەو میراتگری ئەتاتورکە ئەوا ناتوانێت لەدژی کارەکانی بوەستێت، واتە لەدژی دامەزراندنەکان.
هەرکە جونتای سەربازی لە ١٩٨٠/٩/١٢ هاتنە سەر حوکم، پەرلەمان لە تورکیا هەڵوەشێنرایەوە و مافی (حصانە)ش کە ئەندامانی پەرلەمان هەیانبوو هەڵوەشێندرایەوەو بەشێکی زۆریشیان لێ خرانە ژێرچاودێری و ئیقامەی جەبری بانگ کرانە دادگا و بەرپرساریەتی یاساییان خرایە ئەستۆ و تۆمەتی قورس لە وتار و وانەکانی ژەنەڕاڵ کەنعان ئیڤرین-ی سەرۆکی حکوومەت و ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و سەرکردەی ئەرکانی گشتی دەخرا پاڵ ئەندامانی پەرلەمان و پارتە سیاسییەکان، وێڕای ئەمەش (١٢) ئەندامی ئەو پەرلەمانە بەشدارییان لە کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەن ئەورووپایی کرد و دوانی لەوجۆرەیان دەدا: "دەسەڵاتی سەربازیی بەڵێنی داوە دیموکراتییەت بگێڕێتەوە".
بانگەشە بۆ بیروڕاو کردارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی



نەتەوەیی دەکەن کاتێ دەڵێن لەتورکیادا ئەشکەنجە نییە، تەنانەت ئەگەر هەشبێت ئەوا حکوومەت کاری پێویست دەکات و لێی دەکۆڵێتەوە و گوناهباران دەدرێنە دادگا. لەو هەلومەرجەدا دیارە سەیر نابێت کە سەرکردایەتی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی پێی خۆش بێت ببنە نوێنەریان لەئەنجوومەنی ئەورووپایی. هەڵبەتە لێرەدا جێی خۆیەتی هەندێ لەو پرسیارانە بکرێت: ئاخۆ ئەو خەڵکانەی لەوەتەی حوکمی سەربازی دەسەڵاتی وەرگرتووە مافە پەرلەمانییەکانیان لەبیرکردووە، بەچ سیفەتێك لەپەرلەمانی ئەورووپایی بەشداری دەکەن؟ چ میکانیزمێك بوار بۆ خەڵکانێك دەرەخسێنێت کە بێ ماف پەرلەمانی بچنە ئەنجوومەنی ئەورووپایی؟ بەسیفەتی پەلەمانتاری؟ ئایا بەسیفەتی پەرلەمانتاری بەشداری ئەنجوومەنی ئەورووپایی دەکەن؟ مادام مافەکانییان وەك پەرلەمانتار نەماوە، چ بەندیوارییەکیان بەئەنجوومەنی ئەورووپاییەوە هەیە؟ بۆچی "ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی" گەرەکییەتی ئەو سەروکارییە درێژەی هەبێت؟ لەچ دەراوێکەوە ئەنجوومەنی ئەورووپایی کۆشش دەکات ئەو میکانیزمە درێژەی هەبێت؟.

هەموو ئەمانە پەیوەستن بەدوو فاقی لەبیرکردنەوەو رێبازدا، کە رەفتاریش لەگەل چەمکی دیموکراتییەت دەکرێت ئەوا هەرهەمان رەوش وەك خۆی دەمێنێتەوە، بەلام ئەوەی پێوانەکان دوو چەندانە ئاڵۆز دەکات جۆری بیرکردنەوە باوەکەیە لەئەنجوومەنی ئەورووپایی. بروانن ئەنجوومەنی ئەورووپایی بێت، تا هەنووکە هیچ جموجۆڵێکی لەبارەی رەوشی ماف مرۆڤ لەتورکیادا نەنواندووە. بەبڕوای ئەو یاسای تورك رەوایە و حکوومەت حکوومەتێکی شەرعییە و رێز لەمافەکانی مرۆڤ دەگرێت. لەنێوەندەکانی ئەنجوومەنی ئەورووپاییش جەخت لەسەر ئەوە دەکرێت کە حکوومەتی تورکیا بایەخێکی زۆر بەوە دەدات، نەك هەرئەو بەتەنیا، بەڵکو نێوەندەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵایەتی و دام و دەزگای پەروەردەو زانکۆکان و دام و دەزگا دادوەرییەکان و پارتە سیاسییەکانیش هەر ئاوا دەڵێن. هەرچەندە سیاسەتی پەیرەوکراو لەهەق نەتەوەی کورد بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەگەڵ چەمکی مافەکانی مرۆڤ ناکۆکە.

رێککەوتننامەی ئەورووپایی ساڵی ١٩٥٠ کە لەپاراستنی ماف و سەربەستییەکانی مرۆڤ دەخەبتی، دەڵێت، پێویستە کاری وا بکرێت کە مافەکانی مرۆڤ بێتە پاراستن و گەشەی پێ بدرێت لەلایەن ئەو وڵاتانەی کە رێککەوتننامەکەیان مۆرکردووە، ئەو وڵاتانەش کە ئەو بنەما گشتییانەیان پێ پەسەندە وەك ئەندام وەردەگیرێن، تورکیا لەلایەك خۆی ماشتەوە کە ئەو بنەما گشتییانە دەپارێزێت، کەچی لەولای دیکەوە سیاسەتی رەگەزپەرستانە لەکوردستان پەیڕەو دەکات. هەر لە دەستپێکەوە کۆششمان بۆ ئەوە بوو کە لەبارەی سیاسەتی تورکیا دەرهەق بە نەتەوەی کورد بدوێین، پێمان وانییە نێوەندەکانی ئەنجوومەنی ئەورووپایی لەو سیاسەتە بێ ئاگابن،بۆیە کەژیانی سیاسیی هەر سەرکردەو سەرۆك حکوومەتێك هەڵدەسەنگێنین، پێویستە جەخت لەسەر شیکردنەوەی کارەکانی بکەین لەوەی جەخت بکەینە سەر شیکردنەوەی هەڵوێستەکانی، یان لانی کەم هەمووی بەسەرێکەوە ناوەڕۆکی گوفتارو کارەکانی ئەوە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە زۆر ئەستەمە لە بەسەرکردنەوەی بڕیاری دام و دەزگا داوەرییەکان و دەقە یاساییەکانەوە بزانرێت، ئاخۆ ئەو حکوومەتە رێز لە مافەکانی مرۆڤ دەگرێت یان نا، چونکە ناکرێت ئەو مەبەستە لەو یاسا نووسراوانەدا بسەلمێنرێت، بەڵکو تەنیا بەوە دەبێت ئاخۆ ئەو یاسایانە لەواقیعدا پیادە کراون یان نا. ناکرێت چارەی ئەو کێشەیەش لەرێی گوفتارە مافپەروەرەکانەوە بەڕێوە بچێت، بەڵکو دەبێ وەك کێشەی کۆمەڵایەتی لێیان بکۆڵرێتەوە، کە ئەوەش پێویست دەکات هۆیەکانی ناکۆکی نێوان ئەو یاسایانەو کرداری پیادەکردنی



لەواقیعدا بکۆڵرێتەوە.
بەواتای ئەگەر یەکێك لەئەندامە هەستیارەکانی تووش بووبێت، ئەوادەتوانێت، دوای لابردنی نا تەواوییەکە، ڕاستی ببینێت وهەڵەی زانیارییەکان ڕاست بکاتەوە، لەوبارەدا ناکرێت باس لە ڕێبازی ئایدیۆلۆژیا بکرێت کـــەرەفتار لەگـــەڵ دیاردەکـــان دەکـــات .هەڵـــەش لەزانیارییەکانی مرۆڤی وەك ئەوە، ئەوابۆتەوە زنجیرە بە هەڵە وەرگرتنانەی شتەکان دەگەڕێتەوە. پەرەسەندنی تەکنـــەلۆژیاو ســـەرهەڵدانی زانیـــاری نـــوێ دەکرێـــت گۆڕانکاری قووڵ لەو زانیارییانەی کە هەنووکە لەگۆڕێن بێنێتەدی، ئینجا ئەگەر مرۆڤ نەکەوێتە نێو یەکێك لە هـزرە ئایدۆلۆژییـەکان ونـەیتوانی خـۆی لـەنێو بـیرو ڕەفتارەکـانی ونێـوان هێڵـی ئایـدۆلۆژیای ڕەسمـی ڕابهێنێـت ئـەوا زۆر بەئاســانی دەتوانێـت ئـەو گۆڕانکارییانە بکات وپاشان خۆی چاك بکاتەوە .
لەتورکیا کورد وەك تورکێك ڕەفتاری لەگەڵ بکرێت ئەوە پەیوەندی بە نەخۆش بوونی ئەوئەندامە هەستیارەوە نییە .هەروەها سەروکاری بەبەڵگەنامە سەلماندنیشەوە نییـە. بـەڵکو ئـەوە بـەبێ چەندوچـوون ڕێبـازێکی ئایدۆلۆژییـەو دەراوێـشتەی ئایـدۆلۆژیای ڕەسمییـە، وێرای زانینی تـەواوی جیاوازییە بابەتییەکانیش ئەوا ئەو ڕێبازە ڕەفتاریان لەنێوان کوردو تورك یەکە، جا ئەو مرۆڤەی کەلەو ڕێبازو ڕەفتارەدەگلێت ناتوانێت ڕەخنە و ڕەخنە لەخۆگرتن بگرێت، چونکە ئەوە بەبیرێکی شێتانە لەقەڵـەم دەدات. بەپێـچەوانەوەی ئـەوەوە ئـەو مرۆڤـە لەوپاداشتانە بێبەش دەبێت کە ئایدۆلۆژیایی ڕەسمی بۆی دابین دەکات. هاوکات لەگەڵ ئەو ڕێبازەی کەخۆی لەگەڵ ئایدۆلۆژیای ڕەسمی دەگونجێنێت، کاتێکیش کە بیرێك دەخاتە ڕوو یان لەسەر کارێك ڕێك دەکەون بیکەن، ئەوا هەڵوێستی دەسەڵاتی سیاسی لەبەر چاودەگیرێت. هـەروەها شـەن وکـەوی ئـەوش دەکات ئاخۆ بیروراکانی دەسەڵاتی سیاسیی تەبایە، بـەڵام لـەڕێبازی زانستیدا ناوەڕۆکی زانیارییەکان خۆیان گرنگن ).ئەوەش ژمارەی ئەوخەڵکانەی لامەبەست نییە کە ئەو بیروڕایانە پەسند دەکەن و ئـاخۆ لـەچ کـات و شـوێنێك پەسـندی دەکـەن، پیـاوی زانسـت هـەموو ئـەو شـتانەی دەیزانـی ئاشـکرای دەکـات و دەتوانێـت بـەرگری لێ بکات بیسەلمێنێت، کە ئەوەش دەکات ئاوڕ لەوە نەداتەوە کەچەندی

## ئەنجام- کۆتایی

١- نابێـت بیرمـان بـۆ ئەوەبـچێت کـەزانیاری وکـارو ڕەفتاری خەڵك ناگۆڕدرێن، خەڵکیش و ڕێکخراوەکانیش بـەردەوام دەتـوانن لـەڕێی ڕەخنـەو ڕەخنـە لـەخۆگرتن سـیمای تـازەو وەربگـرن، بـەڵام بـەکورتی نووسـەرو دیموکراتخـــوازانی تـــورك توانـــای ڕەخنـــەگرتنیان لەکەمالیزم لـەوەی پەیوەنـدی بـەدۆزی کـوردەوە هەیـە دەرنەکـەوتووە .ڕۆژنامـەکانی تورکیـا ونێوەنـدەکانی زانکـۆو پارتەسیاسـییەکان پەیوەنییـە جۆراوجۆرەکـان ..هتد، ناتوانێت بەرگەی ئەو ڕەخنەیە بگرێت. چونکە ئایـدۆلۆژیای کـەمالیزم بۆتـە قـەڵغانێك بەسـەر کۆمـەڵی تورکیاوەو هـەموو نێوەنـدوکۆڕە تورکییەکان بـەبێ هـەل ومـەرج بڕوایـان پـێ هەیە وبڕواشیان وایە زانیارییەکی ڕاستە وپێیـان وایـە ئـەو زانیارییە لەسـەرووی هـەموو ڕەخنەیەکەوە مـشت ومـڕ هـەڵناگرێت. بەزۆر ستایشی کەمالیزم دەکرێت، ئەوانەی بەچاکترین شێوە ستایشی دەکەن پاداشت دەکرێن، ئەوپاداشتانەشیان لەڕێکخراوە جۆربـەجۆرەکانی حکومـەت و تایبـەتیش وەك ژووری بازرگـانی وەزارەتـەوە دەبەخـشرێن - لەسـەر ئەمـەش پێشبرکێی ستایشی کـەمالیزم دەکرێت، بەڵام ئەوانەی ڕەخنەی لێ دەگرن، بەتایبەتیش لەگۆشە نیگای دۆزی کـوردەوە، ئـەوا دەخرێنـە زیندانـەوە، کـە بـۆ پـشت ئەسـتوورکردنی کـەمالیزم بنیات نـراون، کەلـە ڕاستیدا لەوە پترنین کەبەشداری لەکرداری پشت ئەستوورکردنی ئەتاتورك بکەن بەستایش کردن وپەیکەری تەواو ونیوە کەهەمیشە نۆژەن دەکرێتەوە، بەڵام پەسەندکردنی ئەو زانیارییانـە لەڕەخنـە وەژوورخـستنی وبڕواپێهێنـانی







لەلایەن کۆمەڵانی جیاجیای خەڵك بەهیچ جۆرێك نیشانەی زانستی بوونی نییە، بەڵكو لەبنەڕەتدا ئاماژەیە بۆ دەسەڵاتی كەمالیزم ئایدیۆلۆژیای دوڵەت كەلەسەر درۆو هەڵخەڵەتاندنی خەڵك وچین وتوێژەكانی جیاجیای كۆمەڵانی خەڵكەوە هەڵچنراوە. بۆ تووركەیەكیش بێت، نابێت ئەوە لەبیر بكرێت كەوا كەمالیزم ئایدۆلۆژیایەكەم لەسەردرۆودەلەسەوە ڕۆنراوەو ئایدۆلۆژیایەكی ڕەسمییە

٢–واباشە پەردە لەسەر ئەو هۆیانەش هەڵدەینەوە كە لەبەرچی نابێت كەمالیزم لەگۆشە نیگای دۆزی كوردەوە وەبەر ڕەخنە بدرێت. ئێمە لەدەستپێكدا قامكمان بۆ هاو پەیوەندی نێوان مرۆڤ وفیل ودرەختەوە درێژكرد، داوەری كە زانیاری مرۆڤ لەفیلدا درەخت دەبینێت گەر ئەومرۆڤە شتی هەڵەو ناتەواوی بینی بەدواوەن سەیری ئەوەش ناكات ئاخۆ كەس لەپشتی وەستاوە یان نا .زانست ڕاستترین ڕێگایە بۆ لەناوبردنی بیروڕای نادروست، ڕێگایەكی سەلامەتە بۆ تێگەیشتن وزانینی سروشت ومێژوو وكۆمەڵ، ئایدۆلۆژیاكان ناكارن لەنەخشی زانیارییەكان كەم بكەنەوە، بەڵكو هەمیشە ئەو زانیارییانەی هەیەتی كاوێژیان دەكاتەوە وناوە ناوەش بەراوردی ئەو زانیارییانەی بەردەستن لەگەڵ هەلو مەرج وكات وشوێنی دیاریكراو دا دەكات. ئایدۆلۆژییەكان قالبی ڕەق ونوێ بوونەوە ناتوانێت لەخۆیەوە نوێ ببێتەوە، ئەو كاتەی ناتوانێت ئەركی خۆی ڕاپەڕێنێت ئەوە فەرامۆش دەكرێت و ئایدۆلۆژیایەكی نوێ دادەمەزرێت وكاری پێویست دەكات. زانست لەهەمووسەردەمو شوێنێكدا تاكە ڕێبازێك بەكاردەهێنێت، ئەویش ڕێبازی زانستییە، هەرچی ئایدۆلۆژیایە ئەو پێوانەی جۆراوجۆر بەپێ جوداوازی كات وشوێن بەكاردەهێنێت .

٣– كە سەرنج دەدەین لەتوركیا زانست بەتایبەتیش لەبواری كۆمەڵایەتی لەسەر ئاستی ڕەسمی پەرەی سەندوەو لێناگەرێت ڕەخنە لەكەمالیزم بگیرێت، بەڵام جیهان هەرتوركیای تێدانییە بەتەنیا، خەڵك و ڕێكخراوە دیموكراتخوازەكان و رای گشتی دیموكراتی لەشوێنە جیاجیاكانی جیهاندا هەن. ئەوكردارەش پەردەسێنێت كاری خۆی دەكات. لەهەمووشوێنەكاندا خەڵك و ڕێكخراوو زاناهەن، لەڕووداوو پەیوەندییەكانی نێوانیان دەدوێت لەسەر ئاستی زانستی ڕۆژ بەڕۆژ ماوەی ئەوانەی پاك وبوێرن زێدەتر دەبن بۆ پەردەلادان لە سەر ڕاستی.

جێی خۆیەتی لەبیرەوەری سەدساڵەی لەدایكبوونی ئەتاتوركدا سەر لەنوێ هەڵبسەنگدرێتەوەو بچینەوە سەر ئەو زانیارییانەی كە سەروساختیان بەو مەسەلەیەوە هەیە. یونسكۆو رای گشتی جیهان دەتوانن ئەوكارە بكەن دەكرێ لەوكۆبوونەوانەی كە بۆ كەمالیزم تەرخان دەكرێن ئەو رایانە لەبەرچاوبگیرێن هەروەها دەكرێت ئەومەرجانە دابین بكرێت بۆ ئەوەی زاناو بیرمەندەكان راو هزری خۆیان سەبارەت بە كەمالیزم بخەنە ڕوو، بەلام ناكرێت ئەو ڕووداوانەی سەروساختیان بەدۆزی كوردەوە هەیە فەرامۆش بكەین وبڵێین كەمالیزم هەڵبسەنگێنین ، لەبەرئەوەی پێویستە كەمالیزم بەو ڕووكاردا شی بكەینەوە هەڵیبسەنگێنینەوە.

یونسكۆ دەتوانێ لەمەودوا نەخشەی هاریكاری هەبێت / كێشەی هەرە گرنگ ئەوەیە ناوەڕۆكی ئەو رایانە شی نەكەینەوە، بەواتایەكی دیكە هەرتەنیا نووسین ودوانەكانی ,بەڵكو گرنگ ئەوەیە كارەكان شی بكرێنەوە یان ئەوە گرنگ نییە چی نووسیوە وچی گوتووە شی بكەینەوە، بەڵكو كاروكردەوەكانی شی بكرێنەوە .

هەروەها ئەوەش گرنگە كە ناكۆكییەكانی نێوان نووسین وكردەوەكانی شی بكرێنەوەو پەردە لەسەرهۆی ئەو ناكۆكی وجیاوازیانە لابدەین.

٤–بنەمای مافەكانی مرۆڤ یەكێكە لەو بنەماسەرەكییانەی ڕواڵەت وسیمای سەدەی بیستەم، هەر وەكوچۆن مافی بڕیاری چارەنووس وبنەماكانی





دیموکراتی و یەکسانی وئازادیش هەروان .
ڕێزگرتن لەمافەکانی مرۆڤ یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی دنیای ئەمڕۆمان، جیێ خۆیەتی هەمووخەڵك بەمافە مرۆڤایەتییەکان شادبن، بەبێ هیچ مەرجێك .بەڵام شادبوونی کورد لەتورکیا بەمافە مرۆڤایەتییەکانیان بەندە بەمەرجێکی زۆر گرنگ .
کورد ئەو کاتە دەتوانن بە مافە مرۆڤایەتیەکانیان شادبن، بەوئەندازەی کەخۆڵە ناوەڕۆکی خۆیان وکوردبوونیان بشۆرن .
ئەوەش لە گەڵ کرۆکی مافەکانی مرۆڤ تێك ناکاتەوەهەر لەخۆیەوە هەڵیدەوەشێنێتەوە ، بۆنمونە مرۆڤ زمانی زگماکی خۆی خێرات لر فێر دەبێت لەوەی فێربێت ڕۆژنامەیەك بخوێنێتەوە. بەڵام ئەو مرۆڤەی بواری نادرێت زمانی دایکی بەکاربهێنێت ئەوا نکارە بتوانێت بیری خۆی بەکاربهێنێت و ڕۆژنامەبخوێنێتەوە مافی مرۆڤ چی لێ دەمێنێتەوە ئەگەر ویستت شتێك بخوێنیتەوە دەبێ فلان زمان فێربیت یان ئەوانەی بەتورکی دەئاخێون دەتوانن کەڵك لەخوێندنەوەی ڕۆژنامە وەربگرن، چونکە چالاکی کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیری تەنیا ئەو دەمە سەرکەوتن بەدەست دێنێت کە بەزمانی دایك بێت. بەرقەراربوونی دیموکراتیەت لەڕووناکبیری وکۆمەڵ و پەرەسەندنی کۆمەڵ لەپێوەرە گرنگەکانی جیهانی ئەمڕۆمانن، بەڵام ئەوە بەمکومی بەندە بەدەوڵەمەندبوونی ژیانی ناوەوەی خەڵك وتێکەڵ کردنیان بەچالاکی و ڕووناکبیری، ئەمەش لەو بنەمایانە بەرجەستەن کە یونسکۆ کۆششی بۆ دەکات و بەرقەراریان بکات ،پەرەیان پێبدات لەپێوەندی نێودەوڵەتیدا .
کەمالیزم ئەرکێکی زۆر بۆ لەناوبردنی کەلتوور وزمانی کوردی بەخەرج دەدات. مەرجی کەمالیزم بۆ بەشداریکردنی کورد لەچالاکییە ڕووناکبیرییەکان ستبەرداربوونیانە لەزمان وکولتووری تایبەتی خۆیان وکوردبوونیانە، ئەمەش ڕێبازێکی کۆلۆنیالی ڕەگەز پەرستانەیە .
ئەوە ئیمپریالیزمی کولتوورییە. ئینجا کە ڕەوشەکە ئاوایە ئەوا لەسەر یۆنسکۆیە لەبیرەوەری سەدساڵەی لەدایکبوونی ئەتاتورکدا کەمالیزم لەم ڕووەوە هەڵبسەنگێنێت .
ئایا پەرچەکرداری یونسکۆ سەبارەت بەسیاسەتی ڕۆشنبیری کەمالیزم لەکوردستاندا چییە؟ ئایا دەکرێت سیاسەتی ڕۆشنبیریی کەمالیزم بەبێ سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەو کۆلونیالیانەی لەکوردستاندا هەڵبسەنگێنرێت ؟
٥- لەچارەکی یەکەمی سەدەی بیستەدا کوردستان دابەشکرا ،لەوساڵانەدا سیاسەتی پەرتکەوزاڵ بە لەهەق نەتەوەی کورد پەیرەوکراوە .ئەو سیاسەتە یەکێکە لەوهۆیانەی هاتنەکایەی ناسەقامگیری سیاسییە لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وبۆتە کۆسپ لەبەردەم ئاشتی، چونکە بنەما بنەڕەتییەکانی وەك دیموکراتییەت وئازادی ومافی گەلان لەبڕیاردانی چارەنووسیان بە دەستی خۆیان مافێکە بۆ هەمووگەلان. ئەو مافانە بۆ هەموو نەتەوەیەکە بەبێ لەبەرچاوگرتنی هیچ مەرج وتایبەتمەندییەك، پێو یستە لێی بەرخوردارین.
کوردستان کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتییە لەمەڵبەندی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست، لە نێوان عێراق وسوریاو تورکیادا دابەش وپارچە پارچە کر اوە.
هەمووسامانی گیانی و زمان وکولتووروکەلەپوورەکەی بەتاڵان براوە دان بەبوونی نانرێت وسامانی مادیشی هەر وەبەر تاڵان و برۆ کەوتووە .
بۆیە خەباتی نەتەوەی کورد لەپێناو ئازادی و خۆیبون خەباتێکی ئاساییە، دیارە ئاسایشە بخەبەتی تاکو لەو ڕەوشەی کۆلۆنیالیزمی نێودەوڵەتی بێتەدەر، لەپێناو سەربەستی نەتەوەکەی. هەرگیز ناشێت بەری خەباتێك بگیرێت کەئاماجی سەلماندنی بونی خۆیەتی .
وێڕایی سیاسەتی (پەرتکە وزاڵ بە)ی ئیمپرالیزم وکۆلۆنیالیزم، نەتەوەی کوردشەست ساڵ پترە خەبات

بۆ ئازادی وسەربەخۆیی دەکات. ئەوخەباتەی گەلی کورد وەك کاری شێواندنی ئارامی لەناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست سەیری دەکرێت، کەچی ئەوکارانەی کەلەپشت کارو کردەوەی سیاسەتی ڕەگەز پەرستی وکۆلۆ نیالیزمییەوەن ئەوە پێوەری ئاشتی و ئاسۆی سیاسی نیشان دەدرێت .ئەوە بەرەنجامی ئەو ڕێبازەیە کە لەسەر ئاستی جیاجیادا لەگەڵ بزاوی ڕزگاری نیشتمانی دەکرێت .

لەسەرەتای سەدەی بیستەم ,ئەوانەی کوردستانیان دابەش کرد وسیاسەتی (پەرتکەو زاڵ بە)یان دەرهەق نەتەوەی کورد پەیڕەو کرد,ئامانجیان بەردەوامی ونانەوەی پشێوی سیاسیی بوو لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا. ئەگەر بێتوو پێکهاتەی سیاسیی ڕۆژهەلاتی ناوەراست بەسەر بکەینەوە ,بەئاسانییکی دەگەمەن ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کە ئەوکاتە ڕەوشەکە تەواو وابووە.

سیاسەتی ڕەگەزپەرستی ئێستا کە هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێ ناکەوێتەوەو پاشان ئەو هەموو بیرو بۆچوونانەی کە دەردەبڕێن وەك شۆڕشگێڕایەتی لەلایەن ئەوانەی جێگیرەوەی دیموکراتی بۆچارەسەری دۆزی کورد ناهێنن، سەرەنجام مایەپووچ دەبێت. دەباسەیرێکی ئەو ڕێککەوتننامەیە بکەین کەلە سەرەتای ساڵی ١٩٧٥ لەنێوان عێراق و ئێران بەسترا بەهاندانی ڕاشکاوانەو بەشداری نهێنی تورکیاو بەناوبژیوانی جەزائیر، دۆزی کوردستان هۆکاری بنەڕەتی بەستنی ئەو ڕێککەوتننامەیە بوو، لەنێوان ئەو دوو حکومەتە، بەگوێرەی ڕێککەوتننامەکە دەبوایە شای ئێران دەرگا بەرووی کورد لەناوچە کوردەوارییەکانی عێراقدا بگرێت و لەبەرامبەریشدا عێراق واز لەماڤ خۆی بهێنێ لەخاکی عەرەب لەکەنداوی عەرەبدا، لەئەنجامی ئەو ڕێککەوتننامەیە، بزووتنەوەی نیشتمانی کورد لەکوردستانی خوارووداکە باکووری عێراقی پێ دەڵێن، نسکۆی هێنا.

ئەو شەڕەی کە لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ لەنێوان عێراق و ئێراندا دەستی پێکرد، بەئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات کە تاچ ئەندازەیەك بناغەی ئەو ڕێککەتننامەیە لەرزۆك بووە، هەروەها ئاماژە بەوەش دەکات کە ئەو ڕێککەوتننامەیە لەسەر حیسابی کورد بەسترابوو، وەك نرخی ئێش و ئازارەکانییان، هەردەبێت بەخێرایی پووچەڵ بێتەوە، دەستبەرداربوون لەخاکی عەرەب لەیەکاوی عارەباندا (شط العرب) بۆ ئێران پەرچەکرداری توندی لەدژی حوکمی بەعس لەعێراقداو لەنێوەندەکانی ڕای گشتی عەرەبیشدا، لێکەوتەوە، بۆیە حکوومەتی عێراق لەهەلێك دەگەڕا بۆ ئەوەی جارێکی دیکە دەست بەسەر ئەو زەویانەدا بگرێتەوە، ئەوەشی لەو دەمەدا بۆ ڕەخسا کە سەرکردایەتی لەئێران پشێوی تێکەوتبوو..

ئەوە لەساڵی ١٩٧٥ ڕوویداو ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەوا لەناوبردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی کورد بۆ ڕژێمی عێراق زۆر لە مەسەلەی بێبەشکردنی لەوخاکە تایبەتییانە گرنگترە کەبە ئارەزووی تەواوی خۆی دەستبەرداری ببوو.

لەتورکیاشدا دۆزی کوردستان یەکێك لەو هۆیە گرنگانەی کە بوونەتە کۆسپی بەردەم نائارامی و سیاسیی و دژوارییانەی بەرقەرار نەبوونی ئاسایش و ئاشتی لەکۆمەڵدا، پەرەسەندنی ئابووری و گۆڕانکاری کۆمەلایەتی و تەشەنەکردنی سەرمایەداری لەو هەرێمە تازەو تازەکاندا. هەموو ئەمانە گەشبینی بەدوارۆژی دۆزی کورد پشت ڕاستتر دەکەن، کۆچکردن بۆ شارو پێشکەوتنی ئامرازەکانی ڕاگەیاندنی جەماوەری و ئەو ڕووداوانەی عێراق و ئێران و خەباتی نیشتمانی لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست و لەجیهاندا، ئاگایی کوردییان زێدەکردووە.

گۆڕانکارییە کۆمەلایەتییەکان لەجیهان و هەرێمی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و بەتایبەتیش لەتورکیاو عێراق، ئێران و سووریادا تێگەیشتنی لەبارودۆخی سیاسی تایبەتی کوردییان زێدەتر کردووە.



لەلایەکی دیکەوە، کوردستان، کوردستانی بەریٚ نییە، ئەو ڕووداوانەی کە سەروکارییان بەمێژوو و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لەکوردستان، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەیان زۆرتر دەبێت، زمان و کولتووری کورد ئێستاکە بەشێوەیەکی چاکتر بۆخەڵك ڕوونەو تێیان دەگەن و پەرەشی پێدەدرێت، لەڕۆژگاری پێشکەوتنی زانستی جێی گاڵتەیە کەقسەلۆکی بوونی خائینی نیشتمان هەن دەیانەوێت تورکیا دابەش بکەن و پارچەپارچەی بکەن. ئەوانە جگە لە پیلانی دوژمنایەتی دەرەوەو ئیمپریاستەکان بەدەرنییە "چونکە کوردستان دابەش و پارچەپارچە کراوەو ئەوەی سیاسەتی پەرتکەو زاڵ بەی لەمەقەدا جێی بەجیٚ دەکرێت نەتەوەی کوردە کە کەمالییەکان خۆیان جێبەجیٚ دەکەن. ئەمانەش هەمووی بەبەڵگەنامەی سەلمێندراوە وە واقیعی مادی زیندووش ئەوە دەسەلمێنێت، بەدڵنیاییەوە ئەو پێشکەوتنە زانستییە هەر بەرەو پێشەوە دەچێت، حکوومەتی تورکیا سیاسەتێکی بنەڕەتی بۆخۆی لەبەرچاو گرتووە، ناتوانێت خۆی لیٚ تەریك بکات، ئەویش سیاسەتی تەنگ پیٚ هەڵچنینە بەسەر پەرەسەندنی زانستدا، ئەمەش بەرەو فاشییەتی دەبات".

پێویست وایە دیموکراتییەت و ئازادی و پێرەوی فرە حیزبی هەبێت، ئەگینا حکوومەت بەوشێوەیە دەبێتە هێزێکی سەربازی، هێزەکانی ئاسایش و سوپا هەر لەزۆربوون دان چەکی حکوومەت بۆ یاساو پێرەو، لەگەڵ داخوازییەکانی کورد لەیەکسانی و ئازادی و دیموکراتییەت تێك ناکاتەوەو ئەمەش سەر بۆلای توندو تیژی حکوومەتەوە دەکێشێتەوە، بەڵام ڕاستی بێگومان ئەوەیە کەوا دەستدرێژی و پەڵەپەستۆ ناتوانن بەرلە بیری زانستی بگرن و پەرەسەندنی زانستی بوەستێنن.

ئەو سیاسەتەی لەکوردستاندا پەیرەو دەکرێت، هۆیەکی گرنگە بۆ پەرەسەندنی جووڵانەوەی فاشیزم. توندوتیژی حکوومەت و فاشییەت دەتوانن یەکبگرن. حکوومەت دەکارێت چاو لە پەرەسەندنی جووڵانەوەی فاشییەت بنوقێنێت و ناوەناوەش دەستی لەپشتی بدات، چونکە ئەو دروشمانەی جووڵانەوەی فاشیزم بەرزی دەکاتەوە زۆر لە ئایدۆلۆژیای دەوڵەتەوە نزیك دەبێتەوە، بەتایبەتیش لەتێگەیشتن بۆ دۆزی کوردستان. جووڵانەوەی فاشیزم بەبەراورد لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی پتر لەسەر بنەمایەکی لاساری ڕێك خراوە، بۆیە دەکرێت بەئاسانی لەدژی جووڵانەوەی چەپ بەکار بهێنرێت، ئەمەش بەهۆکارێکی گرنگ دادەنرێت کەکۆسپ دەخاتەبەر بنەماکانی ئاشتی کۆمەڵایەتی و ئارامی سیاسیی لەتورکیادا.

ئیمپریالیزم کوردستانی دابەش و پارچەپارچە کردووە بۆ نانەوەی نائارامی سیاسیی لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا بێگومان ئەوە ئامانجی بنەڕەتی سیاسەتی پەرتکەو زاڵ بەیە، کە دەیەوێت نائارامی سیاسیی درێژەی هەبێت، بەو شێوازەش دەسەڵات و سەرپەرشتی سیاسی و ئابووری بەسەر هەرێمەکەدا بەهێز دەکات. بەڵام هێشتنەوەی ئەو پێکهاتەی کە هەیە لەیەك قاڵبدا بەکردەوە بەهێز و فراوانی دەکات، چونکە حکوومەتە ئیمپریالیزمییەکان لەوکارەدا گلاون، هەموو هەوڵ و کۆششێك دەکەن ئەو نەخشە سیاسییەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەوشێوەی هەنووکەی بمێنێتەوە. بەبەکارهێنانی کارتی کورد پاڵەپەستۆ دەخەنەسەر حکوومەتە دیاریکراوەکان، بۆئەوەی ناچاریان بکات ئەو سیاسەتە پەیڕەو بکەن کەلەگەڵ بەرژەوەندییەکانی "بەرژەوەندی وڵاتە ئیمپریالیزمییەکان" جووتە.

سیاسەتی حکوومەتە زلهێزەکان تا ئەوکاتەش هەر بەو شێوەیە بەڕێوە دەچێت، ئەمانە لەتوانایان دانییە ببنە کۆسپ بۆ خەباتی نەتەوەی کورد لەپێناو مافە نەتەوایەتییەکانی و نەدەتوانێت تەگەرەش بخاتە بەردەم ئەو خەباتەی کە بۆ ئازادی و سەربەخۆیی خۆی دەیکات. بۆ یەکێك لەئەرکە بنەڕەتییەکانی بەردەم ڕای گشتی و دیموکراتی و شۆڕشگێڕی پشتگیریکردنی خەباتی نەتەوەی کوردە بۆ مافە نەتەوەیی و





دیموکراتییەکان، ئەرکی سەرەکی وەستانە لەدژی سیاسەتی رەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمی لەکوردستان پەیرەو کراو و وەك "کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی" پەردە لەسەر رەوشەکە هەڵماڵێت.

بۆ ئەو حکوومەتانەی کوردستانییان دابەش کردووە نەهاتووە وەك "کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی" کورد وەك ئامرازێکی هەڕەشەوپاڵەپەستۆ لەدژی یەکدی بەکاربهێنن، هەروەها نابێت بوار بەوڵاتانی زلهێز بدرێت، ئەوانەی کە رێگای دیپلۆماسی و سەربازی و ئابووری بەکاردەبەن، ئەو کارانە بکەن، پێویستە ئەو سیاسەتە ریسوا بکرێت.

ئازادی و خۆیبوون و بێلایەنی و مافی نەتەوەکان لەدیاریکردنی چارەنووسیاندا، مافگەلێکن بۆ هەموو نەوەکان بێ هەڵاوێردن. هەرچی بەکارهێنانی دەستەواژەی وەك "کەمالیزم پشتیوانی رزگاری نەتەوەیی و دۆستی نەتەوە چەوساوەکانە" لەبیرەوەری سەدساڵەی لەدایکبوونی ئەتاتورك بۆ هەڵسەنگاندنی کەمالیزم لەبەستەڵەکی بیر بەولاوە هیچ مانایەکی دیکە نابەخشێت. ئەو رەفتارە دۆگمایەو لەگەڵ دۆگماتیزم تەواو جووتن، ئەوەش لەگەڵ چەمکی یونسکۆ بۆ دانان و بەرەوپێش بردن و رەگ داکوتانی ئازادی و دیموکراتی ناکۆکە و هەروەها لەگەڵ بنەماکانی مافی مرۆڤ و یەکسانی و بنەمای مافی چارەنووسی نەتەوەکانیش ناکۆکە.

## کورتەیەك لەژیانی ئیسماعیل بێشکچی

*لەساڵی ۱۹۳۹ لەقەزای ئەسکیلیبی شاری جورم لەدایك بووە.

*خوێندنی زانکۆی بەشی زانستە سیاسییەکانی تەواو کردووە.

*ماوەی خزمەتی سەربازی لەبەتلیس و هەکاری بردۆتەسەر.

*وەك مامۆستای یاریدەرەر لەزانکۆی ئەتاتورك لەشاری ئەرزەرۆم وانەی گوتووتەوە، لەساڵی ۱۹٦۷ بروانامەی دکتۆرای لەزانستی کۆمەڵناسی وەرگرتووە، لەبەرئەوەی کتێبێکی لەبارەی رەوشی کورد لەرۆژهەڵاتی ئەنادوڵ دەرکردووە، لەپایەکەی لادراوە.

*لەساڵی ۱۹۷۱ گێراویانەتەوە سەرکار، لەزانکۆی ئەنقەرە بەشی زانستە سیاسییەکان وانەی گوتووتەوە. لەبەر چالاکی ئەدەبی و زانستی و لەبەر جۆری وانەکانی گیراوەو ماوەی ۱۳ ساڵ و ۷ رۆژ حوکمی زیندانی بۆ براوەتەوە.

*لەساڵی ۱۹۷٤ لە لێبووردنێکی گشتیدا بەردرا. بەردەوام دووچاری تەنگ پێهەڵچنین بۆتەوە و کتێبەکانی قەدەغە کراون و لێنەگەڕاون کارەکەی ئەنجام بدات، لەئاکامی بڵاوکردنەوەی هەندێ لەکتێبەکانی دوو ساڵ و ..... مانگ زیندانی بۆ براوەتەوە.

*لە ۱۲ی نیسانی ۱۹۸۰ ئازادکرا، هەواڵی گیرانەکەی زایەڵێکی زۆری لە نێوەندە رۆشنبیرییەکانی جیهاندا هەبووە و ژمارەیەکی زۆر نامەی نارەزایی لە رێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی و یەکێتی نووسەرانی سویسرا و سوید و نەرویج و هۆڵەندا بۆ فەخری کوروتوکی سەرکۆماری ئەوکاتەو سلێمان دیمیریلی سەرۆکی وەزیران نێردرا.

*جارێکی دیکە بەهۆی وەڵامنامەیەك کەلە ۱۹۸۰/۸/۱٤ بۆ سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی سویسرا و نامەی دیکە کە بۆ رێکخراوە مرۆڤدۆستەکانی نووسیبوو، گیرایەوەو دە ساڵ حوکمی بۆ برایەوە، بەهۆی ئەو نامەیە کە تێیدا باسی دۆزی کورد و چەوساندنەوەی گەلی کوردی لەکوردستانی تورکیادا کردبوو.

*چەندین دانراوی دەربارەی دۆزی کورد لەکوردستانی تورکیادا هەیە، هەروەها کتێبی دیکەشی هەن هێشتا چاپ نەکراون.

# سێ نامەی پێشەوا قازی محەمەد بۆ میر جەعفەر باقرۆف

لە رۆژی ٢٠١١/١/٢٥ لە رێگەی پۆستی ئەلیکترۆنی تایبەتی خۆمەوە لە لەرێگەی هاورێیەکمەوە کە لە وڵاتی سوێدە، نامەیەکم بە دەست گەیشت، کە تیایدا وێنەی سێ نامەی بە دەست و خەت و کۆپی کراوی بۆ ناردبووم و لەگەڵیشیاندا نووسراوێك لەناو ئەو نامەیەدا هەبوو کە تیایدا هاتووە: "سڵاوت لێبێت، دیارە چەند رۆژێك بەر لە ئێستاکە لەلای هاورێیەکی خۆشەویست کتێبێکم بینی کە بە زمانی فارسی بوو، کتێبەکە گێرانەوەی یادەوەرییەکانە لە لایەن ئەمیر عەلی لاهروودی سەدری.

ئەو هاورێیەم کە کتێبەکەی لە لابوو، گوتی ئەم کتێبە لە ساڵی ٢٠٠٧ەوە بڵاوکراوەتەوەو چەندین نامەی زۆر گرنگ و مێژوویشی تێدایە، منیش بە ئەمانەت لێم وەرگرت بۆ خوێندنەوە و لەوێدا بینیم کە سێ نامەی پێشەوا قازی محەمەد بڵاوکراونەتەوە کە بۆ میر جەعفەر باقرۆف سکرتێری پارتیی کۆمۆنیستی ئازەربایجان نێردراون کە لە هەمانکاتدا سەرۆك کۆماری ئازەربایجان بووە، دیارە ئەو نامانە بە زمانی تورکی ئازەربایجانی و بەدەستخەتی جیاواز نووسراون، تەنها نامەی یەکەم نەبێ کە لەسەر نامەی هێزی کوردستان نووسراوە، و مێژووی نووسرانەکەیشی بەسەرەوەیە، بەڵام لە هەمانکاتدا لە هەرسێك نامەکاندا ئیمزای پێشەوا قازی محەمەد بەبەراورد کردن لەگەڵ سەرچاوەی دیکە بەبێ هیچ گومانێك دەناسرێتەوە، و دەردەکەوێ کە لە ساڵی ١٩٩٤شدا نووسراون، منیش دوای بینینی ئەو نامانە لەناو ئەو کتێبەدا رێك و رەوان بۆتم کۆپی کردووەو رەوانەم کردن، بۆ ئەوەی لە گۆڤاری (k21) بڵاویان بکەیتەوە، چونکە وەك لە چەند رۆژی رابردوو لە خۆتم گوێ لێبوو گوایە ئێستاکە هاوکات لەگەڵ کارە رۆژنامەوانییەکانتدا لەگەڵ مامۆستا مومتاز حەیدەری گەورە رۆژنامەنووس کاردەکەیت و گوتیشت مامۆستا مومتاز ئێستاکە سەرنووسەری دوو گۆڤارە کە یەکێکیان تایبەتە بە ژنان و ئەوی دیکەیشیان گۆڤارێکی زانستی و مێژوویی و بەڵگەنامەیی و نەتەوەییە، بۆیەش بە دیتنی ئەو نامانە لەو کتێبەدا بۆ یەك چرکەش رانەوەستام رێك بۆم کۆپی کردی و بۆم رەوانە کردی خوا یاربێت لە ئایندەیەکی نزیکیشدا هەمان ئەو کتێبەت بە کۆپی کراوی بۆ رەوانە دەکەم بۆ ئەوەی دیسانەوەی سوودی لێوەربگریت، من تەنها توانیم شێوازی خوێندنەوەی نامەکانت بۆت بخەمە سەر تایپرایتەر، هیوادارم یەکێك بدۆزیتەوە کە ئەم نامانە وەربگێرێتە سەر زمانی کوردی و سوودی بۆتان هەبێت، ئیتر سڵاوم قبوڵ بفەرموون، بە ئەمانەتەوە سلاویشم بگەیەنە بە مامۆستا مومتاز حەیدەری و هیوای تەمەن درێژی بۆ دەخوازم".

دیارە لە رێگەی زۆر دۆست و هاورێوە بەدوای وەرگێرێکدا گەرام بۆ ئەوەی ئەو نامانە وەربگێرێتە سەر زمانی کوردی تا سەرەنجام کاك مستەفا ساڵح سەرداری نامەکانی لێوەرگرتم و بە دەست و خەتەوە بۆی رەوانە کردمەوە، ئێمەش بۆ جوانتر و تێگەیشتنی زیاتری نامەکان دەقی نووسراوەکان و تاپیکراوەکانیان و ماناکانیان بە کوردی دەخەینە بەردەستتان.

## نامەی یەکەم


33

وزارەت هیزی کوردوستان

مهاباد

اولین نامه قاضی محمد به میرجعفر باقراف

ژماره ۳۳

بروار......

نارمی کۆماری کوردستان

وزارەت هیزی کوردوستان

مهاباد"

آذربایجان کومونیست پارتیاسنن باش کاتبی جناب میرجعفرباغراوف چوق احترامله عرض اولونور سردشت و سقز و بانه رایونلارندا دشمن النده تانک لار واردر و بیرده سنه شهرنده اولارن لشکرن مرکزنده طیاره وار بونه کویره سیزدن چوق خواهش ایدرم امر بیورسنز بیزه اوچ تانک و ایکی ضد طیاره طوپی بیزه ویرسونلار.

**محمد قاضی**

**۲۰ مارس ۱۹٤٦**

*******************

**وەرگێردراوی کورد:**

**سکرتێری گشتیی پارتی کۆمۆنیستی ئازەربایجان جەنابی میر جەعفەر باقرۆف.**

**بەرێزی زۆرەوە عەز دەکرێ لەناوچەکانی سەردەشت و سەقز و بانە، دوژمن تانکی لە دەستدایەو هەروەها لە شاری سنەش لە مەرکەزی لەشکر فڕۆکەیان هەیە، بۆیە زۆر تکاتان لێدەکەم ئەمر بفەرموون سێ تانك و دوو تۆپی دژە فڕۆکەمان بدرێتێ.**

**محەمەدی قازی**

**۲۰ی مارسی ۱۹٤٦**

# نامەی دووەم

**بە زمانی تورکی ئازەربایجانی :**

محترم آذربایجان خلقینین آتاسی و بیوک معلمی اولان جناب میر جعفر باقراوف اولا شخصا من و بیز کورد خلقی طرفندن سیزه و آذربایجان ملتنه چوق لی سلام لار یترمگه باهم خوش آزاد و خوشبخت بیر خلق کیمی اولدوقجه ازون ایللار بویی یاشاماقزنی اورگدن آرزو ایدیریک. منم بو مکتوبی یازماقده مقصودم اوندان عبارت در که سیز تماما آرخاین اوله سنز که سیزن و قزل اوردونن چکدیگی زحمت لر هدر گیتمیەجک و روس قوشونی بیزم فکرمزدان، اورک مزدان چیقمیەجاق من هیچ زمان اینانه بیلمرم که روس قوشون لاری ایرانی بوشالدەرق مظلوم خلق لاردان گوز گوتوروب اوز دوغمه وطن لارنه گیدمجک لار منه ایله گیلرکه دورت بش ایل سزن گوسترشنزله یاشایان و ینه روس لارن قایتمەسنن آرزو ایدن کورد خلقنی یاد دان چقارمیەجاق سنز و بیزم حیاتی گوندەلک مسئلەلارمزمراق لانەجاق سنز .کورد ملتی آذربایجان لە باهم اوز ملتی، وطنی و آزادلغی اوغرنده دائما دشمن لە ورشوجاقلار آرتق میدان ناموس لی نن دور بیز کورد ملتی سیزن کومک نزلە متمدن بیر ملت بولماق لە باهم اونی دە یاخشی بیلیریک کە آزادلغی سیون بیر ملت بیرلیک و مبارزەنی ایتمەلیدر آزادلق مبارزەسز و قانسز ممکن دگل در بیز کورد ملتی هیچ وقت طهرانه باش ایمەرگ لاکن، سیزدن بیر خواهشم وار :

1- کورد ملتنی اوز قایغی یواسنده بسلەدیکیزکیمی اونلاری اوچونجە یاد دان چیقارمەین و دائما گوز قولاق ویرن سیز بیزه بیر بیز کورد خلقی مقابلندە یوز بورجلی اولماقە حاضرغ.

2- بیر خواهشم وار کە بیزه گوندردگز یولداش عیسی زاده تیزلیگلە گری قایترق منە بو ایش چوق تعجب گیلر بیر انسان کە ناموس لە ایشلەیە، زحمت چکە خلق مدافعە قوشونی یارادا سرحدی محکم لندره خلق آراسنده حرمتە مالک اولابیر دن ایسە روس لارن گیتمەسی و کورد خلقنن دوشمن لە مبارزە امتحاننی ویرن زمان یولداشنی گیترمک فکرنی دوشەرک بیزی ترک ایتمەسی منی معطل قویور دیەسن بو بهانه ایدی منە گویرە صلاح الدینە بیزم حقمز سیزنکی قدر اولە بیلر چونکە او اولا ساویت اوغلی و ایکینجی کورد در بونە گویرە سیزدن خواهش ایدرم هیچ اولمەسا ایشی باشە چاتدرانە قدر یولداش عیسی زادەنی و یولداشنن تشریفی گیری قایتەرسنز

**چوق ساغ و خوشبخت**
**اولەسنز سیزی اونتمەیان هم دوست**
**محمد قاضی.**

## وەرگێڕدراوی کوردی

باوك و مامۆستای گەورەی گەلی بەڕێزی ئازەربیجان جەنابی میر جەعفەر باقرۆف

یەکەم لە لایەن خۆم و گەلی کوردەوە وێڕای ناردنی سڵاوی زۆر بۆ ئێوەو میللەتی ئازەربایجان بە دڵەوە ئارەزوو دەکەین وەکو گەلێکی ئازاد و خۆشبەخت بۆ ساڵانی درێژ بژین.

مەبەستی من لە نووسینی ئەم نامەیە ئەوەیە کە دڵنیایی تەواوتان بدەمێ ئەو زەحماتەی ئێوەو سوپای سوور کێشاوتانە بە فیڕۆ ناڕواو قشوونی ڕووس لە فکرو دڵی ئێمە دەرناچێ.

من قەت بڕواناکەم کە هێزە هێزە ڕووسەکان بە چۆلکردنی ئێران و گەڕانەوەیان بۆ وڵاتی خۆیان بوو لە گەلانی زۆرلێکراو وەربگێڕن، من پێموایە کە ئێوە هەرگیز گەلی کورد لە بیر ناکەن و سەرنج دەدەنە بابەتە ژیارییەکانی ئێمە، میللەتی کورد بەیەکەوە لەگەڵ ئازەر بایجان بەرامبەر دوژمن تێدەکۆشێ و ئیدی مەیدان هی کەسانی بە ناموسە، ئێمەی کورد بە هاوکاری ئێوە بۆ دروستکردنی نەتەوەیەکی شارستان، بەیەکەوە ئەوەش باش دەزانین کە میللەتێك ئازادی خۆش بووێ دەبێ خەباتێکی یەکگرتوو بکات، چونکە ئازادی بێ خەبات و خوێن مومکین نییە، ئێمە وەکو میللەتی کورد هیچ کاتێك سەر لەبەر تاران دانانەوێنین، بەڵام تکام لە ئێوە ئەوەیە کە:

١- هەروەك چۆن لە ڕۆژی تەنگانەدا بەتەنگ میللەتی کوردەوە هاتن، لە بیرمان مەکەن و هەمیشە چاوو گوێتان بەسەرییەوەبێ و گەلی کوردیش لەبەرانبەردا ئامادەیە سەد قەرزتان بدەینەوە.

٢- تکایەکم هەیە کە هاوڕێ عیسا زادە کە ناردبوتانە لای ئێمە بە زووی بنێرنەوە لامان، چونکە بەلای منەوە زۆر سەیرە ئینسانێك کە بە ویژدانەوە کاری کردووە، زەحمەتی کێشاوە هەروەها ئارتەشی پاراستنی گەلی پێکهێناوە، سنوورەکانی توندوتۆڵکردووەو لەناو گەلدا خاوەن ڕێز و حورمەتە لەپڕ بە گەڕانەوەی ڕووسەکان لە کاتێکدا گەلی کورد لە خەباتی بەرامبەر دوژمندا لە تاقیکردنەوەدایە ئێمە بە جێ بهێڵێ گوایە دەچێت هاوسەرەکەی دەهێنێ، لەوانەیە ئەوە بیانوویەك بێ بە بۆچوونی من ئێمە بەقەد ئێوە هەقمان بەسەر سەلاحەدینەوە هەیە، چونکە ئەو ڕۆڵەی سۆڤییەت و کوردیشە، بۆیە تکاتان لێدەکەم هەرنەبێ تائەوکاتەی کارەکە تەواو دەبێ هاوڕێ عیسا زادە بنێرنەوە.

ساغ و خۆشبەخت بن.

ئەو دۆستەی لەبیرتان ناکا

محەمەدی قازی




## نامەی سێیەم

بیوک اذربایجان معظم رهبری اتا و باش معلممز میرجعفرباقراوف حضرتلری ایندی که بیزم کیچک تمدن کاراونیمیز اوز مرخصلکی تمام ایدوب ینی دان کسب علم و کمال اوز اولکەنی ایشیق لاندرمق ایچون قایدرلار وقتی غنیمت بیلرم اوز صمیمی سلام لارمی تقدیم ایدوب و تقاضا ایلیم که موکد دستور بیورسز که سزن مراحم و بیورکنز کوردلارن بارسنده کاملا عملی اولوب و او جنابن خیرخواملق لطف لاری جدی راخ تعقیب اولسون.

**محمد قاضی**

***************************

### وەرگێردراوی کوردی

رێبەری گەورەی ئازەربایجان باوك و سەر مامۆستامان جەنابی میر جەعفەر باقرۆف.

ئێستا کە کاروانی بچووکی شارستانییەتی ئێمە پشووی خۆیان تەواو کردووە و دیسان بۆ وەرگرتنی زانست و کەماڵ و روون، داگیرانی وڵاتی خۆیان دەگەڕێنەوە، ئەم کاتە بە دەرفەت دەزانم سڵاوی دڵپاکانەی خۆمتان پێشکەش بکەم و دەمەوێ داوا بکەم کە بڕیارێکی وەها بدەن کە گەورەیی و روحمی ئێوە سەبارەت بە کوردەکان جێبەجێ بکرێت، و لوتفی خێرخوازانەی جەنابتان بەشێوەیەکی جددیتر پەیرەوبکرێ.

**حەمەدی قازی**

# بەشی دووەمی ژیاننامەی زانستی و کۆمەڵایەتی گەورە جوگرافیناسی کوردستان دکتۆر عەبدوڵڵا غەفور

بەشێک لەو بابەتە لە ژمارەی پێشووی ئەو گۆڤارە، کە بریتی بوو لە قۆناغەکانی خوێندن و پێناسەیەکی کورت بۆ بەرهەمەکان بڵاوکرایەوە. بەشەکەی دیکە کە بریتییە لە هەشت بابەت بە ناونیشانی جودا و لە ٢٨ حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٨ بە دواوە بە کوردی و عارەبی لە کوردستان و سوێد و عێراق پێشکەشکراوە ئەم ژمارە بڵاودەکەینەوە.




لەسەر راسپاردەی خۆی د. عەبدوڵڵا هەردوو بابەتە عەرەبییەکەی لەگەڵ خودی بابەتە کوردییەکە بڵاو دەکەینەوە. K21

**چەند تێبینیکی پێویست.**

١. نووسینەکان، چۆن کاتی خۆی نووسراون و بڵاوکراونەتەوە، دەستکاری نەکراون.

٢. لە لێکۆڵینەوەیەکی ئیتنەدیمۆگرافی لە خوارووی کوردستاندا. تەنیا کوردستانی خواروو کراوە بە خوارووی کوردستان.

٣. کۆکردنەوەی کارەکان بەسەر یەکەوە.

٤. ئاشنابوون بە شێوازی نووسین و شیکردنەوە نووسەر.

٥. بابەتەکان بە گوێرەی ساڵی بڵاوکردنەوەیان ڕیزکراون.

## اربيل
## في عهد مظفرالدين الاربلي

اربيل من اقدم المدن الكردية من الناحية التاريخية و الحضارية حيث يرجع تاريخها الي حوالي ٢٥٠٠ ق. م. و يقال انها اقدم من مدينة بابل ، و قد جاء ذكر لها في الكتابات البابلية والاشورية وقد ظهرت في الفترة الاخيرة مدينة كردية اخري وهي السليمانية واخذت تنافس مدينة اربيل في احتلال المركز الاول من الناحية الحضارية فقط و ظهرت علي مسرح الحياة الحضارية حيث تعتبر الان الاساس الاول للفن و الادب و الحضارة




الكردية. و بالرغم من قدم مدينة اربيل من الناحية التاريخية الا اننا لانجد لهذة المدينة الكردية تاريخا مفصلا يبحث عنها الا تاريخ اربيل الذي الفة ابن المستوفي اخر وزير عهد مظفرالدين الاربيلي ولكن هذا الكتاب فقد ككثير من الكتب القيمة، ولذا فاننا لانجد معلومات او ملاحظات عن هذة المدينة الا بصورة مبعثرة في بطون الكتب القديمة والتي لا تتعدي العصور الاسلامية و عندئذ يضطر الباحث عندما يرغب في كتابة شئ عن تلك المدينة الكردية العريقة في التاريخ ان يكتب عن المدينة في فترات معينة من جهة و امرائها من جهة اخري ، ولذا فاني احاول في هذا البحث القصير ان اكتب عن مدينة اربيل في عهد احد امرائها وهو مظفرالدين الاربيلي املا ان اكون موفقا من كتابتي هذة.

## امارة اربيل

نتيجة لتفكك العالم الاسلامي في عهد العباسيين نجد ان بعض الامارات عندما يكون اميرها قويا يعلن استقلالها و بذلك تفصل عن السلطة العباسية في بغداد وهذا ناتج طبعا من ضعف الخلفاء العباسيين و عدم قدرتهم علي ادارة العالم الاسلامي و قد ظهرت مدينة اربيل كوحدة سياسية مستقلة في اواخر القرن الثالث الهجري، وكان ظهورها عن طريق اقطاع اقليمي هو اقليم الموصل فقد كانت قبل ظهورها كوحدة سياسية قائمة بنفسها مجرد مدينة مغمورة ضمن اقليم الموصل فاقطعها امير اقليم عمادالدين زنكي وقد تولي الاخير امارة اقليم الموصل عندما اختارة المسترشد باللة في ١٠ رمضان ٥٢١ هجرية و عندما تقلد زنكي اقليم الموصل سلم الية السلطان

محمود ولدية الب ارسلان و فروخ لتربيتهما ولذا عرف عمادالدين بالاتابك لقائدة زين الدين علي بن بكتكين في سنة ١١٣١ ميلادية وبذلك تحولت المدينة الي امارة صغيرة لها حكم ذاتي داخلي فقط، يدين اميرها لامير لموصل الا انة اصبح للمدينة كيان سياسي تختلف عن كيانها السابق فاصبحت تسهم في الاحداث الجارية بعد وفاة زين الدين علي بن بكتكين قائد عمالدين زنكي، وولاها ابنة زين الدين يوسف ففي عهدة كانت هناك حروبا بينة و بين صلاح الدين الايوبي . و بعد وفاة نورالدين محمود بن عماد الدين زنكي سنة ١١٧٣ ميلادية راي زين الدين يوسف ان من مصلحة امارتة ان يحول تبعيتة من الموصل الي ان يتم انفصالة سياسيا من اقليم الموصل وحولة الي جانب صلاح الدين الايوبي وهذا لا يغير شيئا من مركزها السياسي ولكن لها تاثيرا في تقوية احد الجانبين المتخاصمين و تودي الي ضعاف الجانب الاخر.

## حياة مظفرالدين

هو ابن سعيد كوكبوري بن ابي الحسن علي بكتكين بن محمد الملقب بالملك العظيم، مظفرالدين صاحب اربيل و كان من اوائل الذين اتخذوا مدينة اربيل عاصمة لهم الامير علي كجك والد مظفرالدين و ذلك بعد تحالفة مع الامارة الكردية المسماة بالزنكية و كانت علاقة الامير المذكورة حسنة مع عماد الدين زنكي صاحب الموصل، وفي سنة ٥٠٦ هجرية ذهب كل من علي كجك و عمادالدين زنكي الي بغداد لمساعدة الخليفة الراشد باللة و معهما جيش جرار من الاكراد.

اتسعت رقعة امارة علي كجك فهو بالاضافة الي استيلائة علي مناطق في لواء الموصل و ماردين و غيرهما. وكان يساعد الخلفاء العباسيين عند حصول اي خطر داخلي او خارجي، وقد سافر علي كجك مع الامير شيركو وهو عم صلاح الدين الايوبي الي الحج وقد توفي سنة ٥٦٣ هجرية.

## كيف تولي الامارة

حكم علي كجك اماكن كثيرة و فرقها علي اولاد انبك قطب الدين مودود بن الزنكي صاحب الموصل ولم يبقي سوي اربيل وقد توفي علي كجك في ذي القعدة سنة ٥٦٢ هجرية عن عمر يناهز المائة سنة وفي حياتة سار من الموصل الي اربيل وقد سلم جميع ماكان بيدة الي اتابك قطب الدين ، من سنجار و حران و قلعة عقرة الحميدية و قلاع الهكارية و تكريت و شهرزور و احتفظ لنفسة باربيل فقط و عندما توفي علي كجك تولي امارة اربيل زين الدين يوسف اخو مظفرالدين الا انة مات سنة ٨٥٦ هجرية وقد تولي امارة اربيل بعذ موتة اخوة مظفرالدين الاربلي.

## التحولات السياسية في كيان امارة اربيل

تغير وضح المدينة عندما تولي مظفرالدين و بعد وفاة صلاح الدين الايوبي تحولت المدينة من وحدة سياسية تابعة الي وحدة سياسية مستقلة استقلالا كاملا سواء في السياسة الخارجية او الداخلية يتصرف صاحبها - مظفرالدين - بوحي من مصالحة و مصالح امارتة وقد ساعدة علي هذا التحول تفكك دولة صلاح الدين الايوبي من التنازع و الحروب من اجل السلطة و الملك فاستقل كل ايوبي بامارتة التي كانت يقوم علي حكمها ايام صلاح الدين فانتهز مظفرالدين فرضة النزاع بين الاسرة الايوبية فاستقل بمدينتة و حولها الي امارة ثم اتخذ لنفسة لقب الملك العظيم و علي ذلك فان امارة اربيل ولدت في عصر اصدق وصف له - عصر الغلبة - فقد كان صاحب كل وحدة سياسية يجد في نفسة المقدرة الحربية علي التوسع علي حساب جيرانة لا يتواني في شن الحرب علي المستضعفين منهم. وقد حاول مظفرالدين ان يجاري عصرة في التوسع الا انة فشل وفي اثناء حكمة لامارة اربيل تعرضت المدينة الي غزو من قبل التتار.

الهجوم التركي

كان الجيش المغولي بقيادة ارقيونديان قد زحف علي اربيل و ضيق الخناق عليها فاراد حاكمها المدعو - تاج



الـدين سالابا- الخضوع للمغـول و تقـديم الطاعـة لـة فعارض اهل القلعة في ذلك وهم الاكراد واخذوا يدافعون عن المدينة دفاعا مريرا وتمكنوا من صد المغول مما اجبروهم علي التراجع وبعد ذلك اتفق بدرالدين لوءلوء صاحب الموصل مع المغول بالرغم من ارسال جيش الي اربيل لنجدة صاحب اربيل الا ان . بدرالدين لوءلوء . كان يطمح بالمدينة وبعد فترة سقطت القلعة بايديهم بعد مدة وجيزة و نتيجة لاحتلال المغول المناطق من اربيل قامت ثـورات ضـد ادارة هـولاء في جهـات كـثيرة مـن اربيـل و الموصل وكان في الجيش المغولي صنف من النصاري يقال لهم . كياجي . فكان فريق من الكياجية هذة ضمن حامية اربيل فثاروا تحت قيادة زين الدين بالو ضد المغول الا انة تم ابعاد هولاء سنة ١٢٧٧ ميلادية واخذ التتار ينهبون اربيل وقد قاست المدينة ظلما شديدا علي ايدي هولاء

## اعمال مظفرالدين اثناء حكمة لاربيل

قام مظفرالدين اثناء حكمة باعمال جلية للمدينة حتي كان عصرة ابهي عصور مدينة اربيل وازدهارها وقد اهتم بتنظيم نواحي الحياة المختلفة ولم تقتصر اعمالة علي تنظيم الجيش للدفاع عن كيان الامارة فقط وانما شملت النواحي العمرانية و الاجتماعية ايضا ففي عهدة قام بانشاء مدارس و خانقاهات لمساعدة الفقراء و بتقديم الطعام لهم اثناء بقائهم في الخانقاهات. وقام ببناء دار الزمني و دار الايتام و دار الارامل و دار المكفوفين وهذة الدور تدل معناها علي وظيفتها حيث كل دار باداء مهمة معينة للمحتاجين هذا من جانب العمران. اما من الجانب الثقافي فليس من السهولة تقييم الحركة الثقافية في اربيل قبل عصر مظفرالدين وذلك لقلة ما كتب عن اربيل قبل عصرة و علي ضوء التراجم القليلة التي عثرنا عليها لبعض الشخصيات الاربيلية فاننا نستطيع ان نوكد وجود عدد من المدارس في اربيل وقد تلقوا اولئك الشخصيات علومهم في المدارس الاربيلية وقد اسس مظفرالدين مدرسة باسمة و درس فيها المذاهب المختلفة ومن الذين درسوا فيها ابن خلكان المتوفي سنة ٦١٠ هجرية صاحب كتاب وفيات الاعيان والي جانب المدارس كانت هناك المجالس والندوات الدينية والادبية وقد ظهر في زمانة ابن المستوفي اخر وزير في عهد مظفرالدين وقد جمع ابن المستوفي تاريخ اربيل في اربعة مجلدات واستعان بابن خلكان الا ان الكتاب قد فقد. ولكل هذا فان الناس يذكرون مظفرالدين وان قبرة لا يزال موجودا بجانب المتصرفية حيث يقوم الناس بزيارتة في ايام الجمعة والاربعاء وقد مات مظفرالدين في الاربعاء ١٨ رمضان سنة ١٢٣٢ ميلادية.

## اربيل بعد وفاة مظفرالدين

كان موت مظفرالدين نقطة التحول في كيان امارة اربيل قد حدثت ازمات سببت اضرارا بليغة لمدينة اربيل واهلها حيث اراد كل من حاكم الموصل بدرالدين لوءلوء و صاحب دمشق ان يستولي علي المدينة لانهما كانا يطمعان في اربيل منذ ان تولي مظفرالدين حكم امارة اربيل الا انهما لم يتمكنا من تحقيق احلامهما واخيرا استولي جيش الخليفة المسترشد باللة علي المدينة وبهذا تحولت امارة اربيل من كيانها السياسي الي ولاية تابعة لخليفة العباسيين.


المصادر:

١. خلاصة تاريخ الكرد و كردستان . محمدامين زكي بك
٢. القومية الكردية وتراثها التاريخي - كتاب التاخي - هادي رشيد الجاوشلي.
٣. ترايخ الامارات الكردية . تاليف محمدامين زكي بك - ترجمة محمد عوني.
٤. وفيات الاعيان . ابن خلكان.
٥. مظفرالدين كوكبوري صاحب اربيل . عبدالقادر.
٦. العراق بين الاحتلالين . عباس العزاوي.


*تێبینی : یەکەم نووسینی بڵاوکراوەم بووە*

# حول المشاهدات السواح في كردستان

نقصد من هذا البحث القصير التطلع الي ملاحظات السواح والتي تعتبر مهمة من ناحية درس التراث الحضاري للشعب الكردي و كردستان. تلك الملاحظات التي تشمل علي نواحي الحياة المختلفة السياسية و الاجتماعية والاقتصادية و هذا ما يساعدنا علي التعرف علي ما مضي من ثورات تحريرية اجتاحت كردستان، وامراءها الذين حكموا بعض اجزاء كردستان مستقلين او تابعين الي احدي الحكومات سواء سلطة الاتراك او حكام ايران. و لهذا فان اي باحث يرغب في تدوين تاريخ الشعب الكردي من جهة و كردستان من جهة لا بد ان يطالع تلك الملاحظات لاتمام البحث وان كانت تلك اليوميات لا تخلو من بعض الاخطاء و الاوصاف قد تكون كبيرة، وهذا ما يدل علي طبيعة صاحب الملاحظات بالاضافة الي ما دونة المثقفون من الشعب الكردي او بما كتب من قبل المثقفين العرب.

عند دراستنا لتلك الملاحظات التي كتبت عن كردستان نجد بصورة عامة انها تبحث عن النواحي الجغرافية لكردستان و النواحي التاريخية للشعب الكردي. ولكننا مع ذلك كلة نجد ان تلك الملاحظات غير كافية و ذلك لعدم توفر المعلومات لدي هاولاء السواح عن الشعب الكردي من حيث العادات و التقاليد فقد وصف بعض منهم الشعب الكردي بالوحشية كما في رحلة ريض في ص ١٠٥ ولا اعتقد ان هذا الوصف يليق بشعب لة حضارتة و تراثة كما نجد بعض العبارات في كتاب الاكراد لنيكيتين. صحيح ان شعبنا لا يخلو كاي شعب اخر من بعض الصفات وان طبيعة الشعب الكردي تختلف عن طبيعة المجتمع الاورثي او المجتمع العربي و ذلك نتيجة الظروف التي عاش فيها الاكراد او الحكومات التي توالت للسيطرة علي كردستان او نتيجة لانقسام المجتمع الكردستاني. ولذا فاننا وان كنا لا نقول بعدم وجود تلك الصفات ولكن مع هذا فان للشعب الكردي عاداتة و تقاليدة. وينقسم السواح الي ماياتي حسب اعتقادنا:

١- منهم من ياتي بدافع حب الاستطلاع عن طبيعة كردستان و عن طبيعة شعبها و وطنها . كردستان - و خلال مكوثهم في كردستان يدونون ملاحظاتهم ظاهريا دون ان تكون لهم معرفة بذلك الواقع و عندئذ يكون حكمهم غير واقعي او بعيدا عن الصحة وقد يحدث ذلك الشئ نتيجة الظروف معينة و عندئذ يسجل السائح ملاحظاتة و مشاهداتة و يصف الشعب الكردي كما يتراءي لة، كما نجد في كتاب رحلة ريج الي العراق عام ١٨٢٠، عندما يصف الشعب الكردي لاسيما في منطقة رواندز بالوحشية.

اما من جانبنا فعندما نريد ان نتعرف علي ماضي شعبناالكردي و علي تاريخ كردستان فاننا لا نستغني عن تلك الملاحظات و المشاهدات لانها تحتوي علي معلومات لا باس بها ففي رحلة ريج و نذكر ذلك بقصد المثال فقط، مثلا يذكر تاريخ الاسرة البابانية بشئ من الاسهاب يساعد الباحث عن تاريخ الاسرة البابانية او حتي الحكام الذين حكموا كردستان بالرجوع الي ذلك المصدر ليكمل بحثة عن تلك الاسرة بالاضافة الي ما كتب من قبل الاكراد انفسهم او غير الاكراد. وتضع الصعوبات و العراقيل امامة اثناء انتقالة من مكان الي الاخر.

اما القسم الاخر من المشاهدات و الملاحظات فقد يتفق مع نظرة الحكومة المسيطرة علي جزء من كردستان و يكتب في صالح الحكومة و يعبر عن نظرة

الحكومة تجاة الشعب الكردي و هذا لايمكن الاتفاق علية ولا يكون واقعيا عند تعبيرة عن تاريخ الشعب الكردي.

اما من جانبنا فاننا نهتم عند بحثنا عن تاريخ الشعب الكردي و كردستان بمشاهدات و بملاحظات القسم الاول من السواح لان هولاء قد يكونون في ملاحظاتهم عن الشعب الكردي و تاريخة و وطنة ـ كردستان ـ ام الصنف الاخر فمن جانبنا لا نجعل من يومياتهم ذات اهمية في بحثنا و ذلك لما تحتوي علية تلك الملاحظات و اليوميات من امور غير واقعية عن الشعب الكردي لان السائح يستطيع ان يقول ما يقصد في يومياتة وان يصف الشعب الكردي حسب ما ترغب بة السلطات الحاكمة و لكن مع هذا فاننا لا نضعها جانبا بل علي الباحث الاهتمام بكل ما يكتب عن الشعب الكردي و كردستان سواء من قبل الاكراد انفسهم او من قبل غيرهم.

٣ـ ما يلاحظ و يشاهد من قبل الاكراد انفسهم ان السائح الكردي في ارجاء كردستان اما بقصد اتمام بحثة الذي ينبغي الحصول علية في اجزاء كردستان من قبل اشخاص او بقصد السياحة . و في الحقيقه فان هذة الملاحظات مهمة في اتمام البحث عن الشعب الكردي فيما اذا كان السائح الكردي غير متحيز الي جهة معينة و واقعيا في اظهار تلك النواحي بصورة واقعية. و قد توجد بعض الملاحظات مثل ـ طةشتيك لة كوردستاندا ـ و ملاحظات ـ في ربوع كردستان ـ لكن لم تطبع... وان الاخيرة تحتوي علي النواحي الجغرافية اكثر مما تحتوي علي الناحية التاريخية لكردستان.

قبل ان ننهي مقالتنا نحاول ان نوضح ما يجب علي السائح ان يكون عارفا عند قيامة باية رحلة و نعتقد بما ياتي:

ا. من الضروري اي يعين الهدف الذي يقصد من وراء سياحتة سواء سياحية سياسية او استطلاعية لكي يجمع المعلومات حسب ما استهدف من سياحتة.

ب ـ ان يكون لدي السائح معرفة مسبقة عن ذلك الجزء الذي يقصدة وان يكون عارفا الي حد معين بطبيعة و عادات و تقاليد ذلك الشعب.

و نحاول فيما يلي ان نذكر بعض الملاحظات او المشاهدات للسواح الذين قصدوا كردستان و الذين امضوا في ذلك الوطن بعض الوقت و في الحقيقة فان قسما منهم يصف الشعب الكردي و كردستان وصفا لا يمكن الاتفاق علية. اما القسم الاخر فكما ذكرنا سابقا يصف الشعب الكردي بصورة صادقة والاول ناتج عن قلة المعرفة بتاريخ ذلك الشعب و علي اساس ذلك يجب علي المثقف ان يميز ما يمدح الشعب الكردي بكل صراحة وما ينعت ذلك الشعب و يستطيع الانسان ان يخرج بنيتيجة صحيحة. اما الملاحظات فنذكر علي سبيل المثال مايلتي:

١. رحلة ريج الى العراق عام ١٨٢٠
٢. رحلة فريزر ـ رحلات في كردستان و بين النهرين.
٣. نواعير الفرات او بين العرب و الاكراد.
٤. طةشتيك لة كوردستاندا.
٥. سنتان في كردستان.
٦. سفرة متنكر في الجزيرة و كردستان.
٧ـ من عمان الي عمادية ـ او جولة في كردستان الجنوبية
٨. جولة في ربوع كردستان

تێبینی:

ـ لە زۆربەی کتێبەکانم، بە هەڵە نووسیومە یەکەم نووسینم بووە.
ـ ئەو وتارە و ئەوەی پێشیم لە رۆژنامەی التئاخی بە سایەیی عەبدوڵڵا زەنگەنەوە دۆزیتەوە

# دابەشبوونی ئیداری کوردستان

ستان دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای کیشوەری وە لە نێوان هێڵەکانی ٣٠-٤٠ ی پان و ٣٥-٢٠ ی رۆژهەلاتدا لە باکورەوە لەگەڵ ئازەربایجان ، مینیا و تورکیادا هاوسنوورە" لە باشوورەوە _ لە ئێران ، عێراق و کەنداو ، لە رۆژهەلاتەوە – ینجانی ئێرانی و فارس" لە رۆژئاواشەوە سنوری عێراق و سوریا و کەنداوی کەندەروونەیە. درێژایی کوردستان ، لە باکوورەوە شوور . نزیکەی ١٣٠٠ کیلۆمەترە و پانایییەکەشی، هەلاتەوە بۆ رۆژئاوا دەوروبەری ٥٥٠ کیلۆمەترە. ووبەری کوردستان بە گشتی، بەرای من ٥٣٤ کیلۆمەتر جوگۆشەییە (کچك)، ژمارەی دانیشتوانیشی سی ١٩٩٠ گەیشتە ٢٤,١٤٣٠٠٠ کەس. کەواتە لە ووی ژمارەی دانیشتوانەوە ، یەکسەر دوای تورکیا ٤٣,٧٤٤٠٠٠) و ئێران (٤٣,٢٦٤٠٠٠) دێت و پێش عێراق (١٤,٥٣٣٠٠٠) و سوریا (١١,٥١٥٠٠٠) کەوتووە.

سەم وتارە دا دەمانەوێ لە دابەشبوونی ئیداری کوردستان هەر لە کۆنەوە تا ئیمرۆ بکۆڵینەوە ، چونکە ئەم لایەنێکی هەرە گرینگی جیۆگرافیایی ئەم ولاتەیە هەروەها روونکردنەوە و دەست نیشان کردنی رووبەر حێتە بنچینەیەکی لەبار بۆ لێدوانێکی تێرو تەسەل لە گشت لایەنەکانی ژیانی دانیشتوانەکە .

ئەم رووبەرەی ئیمرۆ بە کوردستان دەناسرێ لە مێژوو ـ ناوی جۆراو جۆری لێ نراوە . بۆ نمونە لە سەدەی حەوتەمی پێش زایینیدا بە{کوردۆچیخ} ناوبراوە و بەشێك بووە لە ئیمپراتۆرییەتی ئەرمینیا کە لە یازدە ـ وچە پێکهاتبوو : کۆردوك، کۆردوکی سەروو، کۆردوکی ناوەراست ، کۆردوکی خواروو ،ئەیتواناك ، ئەگپارسی ، مۆتۆگانك ، بۆرسیرانك ، قەرە تونیس ، چاهۆك و ئەلپاکی بچووك.

لە ماوەی ١٩ سەدەدا (حەتەمی پێش زایین – دوازدەی زایین ) نووسەران کوردستانیان بەناوی جۆراو جۆر تۆمارکردووە ، وەکو – کوهستان (هەرێمی چیا) ، جەزیرە دیاربەکر و هتد.

پەیدابوونی زاراوەی کوردستان و بەکارهێنانی بە شێوەیەکی رەسمی ، یۆ یەکەمجار لە مێژوو دا لە سەردەمی دوا سولتانی سەلجوقی _ سنجەر (١١١٧_ ١١٥٧ زایینیدا) بووە . سنجەر لە دوا سالانی ژیانی دا بەشە ئیدارییەکانی (ویلایەت) رۆژئاوای – واتە هەرێمی کوهستانی ، لە بەشێکی ئیداریی تازەدا کۆکردەوە و ناوی نا (ئیالەتی کوردستان ) ئەم بەشە ئیدارییە تازەیەش پێکهاتبوو لە : هەمەدان ، دینەوەر ، کرماشان ، شارەزوور ، شەنگار و قەلای (بەهار) یش کرا بە پایتەختی. ئەمەش وا دەگەیەنێ کە ئیمرۆ ٨٣٥ سالْ زاراوەی کوردستان بەکار دێت .

مێژووی بەکارهێنانی زاراوەی کوردستان ، وەکو زاراوەیەکی ئیداری ، دیارنییە . تەنانەت سەرچاوەکانیش، هی سەدەکانی ناوەراست و دواتریش ، بە وردی رۆژگاری سەرەتای بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە روون ناکەتەوە.

کوردستان وەکو زاراوەیەکی ئیداری، بۆ یەکەمین جار لە کتێبەکەی مارکۆ پۆلۆ (١٢٥٤ – ١٣٢٤) دا بەکارهاتووە . بە پێی ئەم سەچاوەیە ، کوردستان دووەم ئیالەتی دەولەتی فارس بووە. کەچی, بەداخەوە، بەراشکاوی باسی بەشەکانی ئەم ئیالەتەی نەکردووە ، بەلاّم ، رەنگە بتوانین بڵێین کە زاراوەی کوردستان ، لە رۆژگاری مارکۆ پۆلۆ دا ، بەشێکی زۆر بچوکی کوردستانی رۆژهەلاتی ئیمرۆی گرتۆتەوە . دوای مارکۆپۆلۆ بە ٤٣ سالْ نووسەری بەناوبانگی فارس ،حەمدوللای مستەوفی





قەزوینی (٧٥٠ - ٦٨٠) بە درێژی ، لە کتێبەکەی دا (نوزهەت ئەلقلوب)، باسی بەشەکانی کوردستان ، یان راستتر رۆژهەلاتی کوردستانی ئیمرۆی کردووە . ئەوساکە واتە لە دەورووبەری ١٣٤٠ دا ، ئەم ویلایەتە لەم شانزە ناوچەیە پێکهاتووە : ئالانی ، ئەلشتەر ، بەهار ، خەفتیان ، دەربەندی تاج خاتوون ، دەربەندی زەنگی ، دزبیل ، دینەوەر ، سولتان ئابادی ، چەمچەمال ، شارەزوور ، کرمانشاه ، کرند و خوشان ،کەنکور ، مایدەشت ، هەرسین و ستام . ئەم نووسەرەش ، هەروەکو ئەوەی پێشوو ، مەبەستی ئەو بەشەی کوردستان بووە ، کە سەر بە دەولەتی فارس بووە ، ئەگینا دەبوایە ویلایەتی دیاربەکری سەر بە دەولەتی عوسمانیش لەگەلْ خستبا ، چونکە ئەمەش بەشێکی جیانەکراوەی کوردستانی گەورەیە. لێرەدا دەبێت ئەو هەلەیە راست بکرێتەوە ، کە لە گشت سەچاوەکاند ا، جگە لە کتێبەکەی دکتۆر جمال رەشید ( دراسات کردیە فی بلاد سوبارتو) ، کراوە گوایە مستەوفیی قەزوینی یەکەم کەسە کە زاراوەی کوردستانی بەکارهێنابێ . کەچی راستیەکەی ، وەکو ئاماژەم بۆ کردووە ، مارکۆپۆلۆ ٤٣ سالْ بەر لە ئەو ناوی کوردستانی بەکارهێناوە و هە ئەو زاراوەیەش تاکو ئیمرۆ بەشێوەی رسمی بۆ ئەو بەشەی کوردستانی ئێران بەکاردێت کە مەلْبەندەکەی شاری سنە ( سەنەندج یان سەنەندژ) ە .

هەروەها ، لە سەدەی حەڤدەمیشدا بۆ ماوەیەك بەشی کوردستانی گەورەی ژێر دەستی دەولەتی عوسمانی بە شێوەی رەسمی بە ئیالەتی کوردستان ناوبراوە . ئەوەی جێگەی داخە ، سەرچاوەکانی بەر دەستم سالْی بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە دیاری ناکەن. بەلاْم بۆم روونە ئەم ئیالەتە لە سالْی ١٨٤٩ (١٢٦٦ ك) دا بریتی بووە لەم پێنج لیوایە : موش ، وان ، هەکاری ، جەزیرە ، دیاربەکر ،. هەر زووش رەنگە هەر ئەو سالە ، ئیالەتەکە لەناوچووەو جارێکی تریش دووبارە نەبۆتەوە .

بەشێکە تر کوردستان سالْی ١٩٧٠ ناوی ناوچەی ئۆتۆنۆمیی کوردستانی لێ نرا، کە لە رووی ئیدارییەوە سێ پارێزگا: دهۆك ، هەولێر و سلێمانی دەگرتەوە. ئاشکرایە کە ئەم ناوچەیە هەموو بەشەکانی کوردستانی باشووری نەگرتبووە خۆ، چونکە رژێمی عێراق گەلێك ناوچەی گرنگی لێ جیاکردبۆوە، بەلکو ئەم ناوچە ئۆتۆنۆمییە تەنها ٤٦٪ رووبەری کوردستانی باشوور (یان کوردستانی عێراق) ی گرتبۆوە.

کوردستان وەکو ، ناوچەیەکی جیۆگرافی ، بەسەر چەند بەشی ئیداری جۆراوجۆردا دابەش دەبێ . بەشە ئیدارییە هەرە گەورەکانی (سەر ناوچە) ن ئەمیش بەسەر چەند بەشی ئیداری بچوك تردا دابەش دەبن بە ناوی (ناوچە) و ئەمانیش هەروەها ، هەریەکە و چەند (بەر ناوچە) یەك دەگرنە خۆ کە هەریەکەیان لە کۆمەلە گوند و لادێیەك پێکهاتووە.

بەرای من ، کوردستان لە هەشتاکاندا ، لەم بەشە ئیداریانە پێکهاتبوو کە ژمارەیان بە گشتی ٨١٦ بوو. لەمانە ٣٠ سەر ناوچە (ئیل ، ئوستان ، موحافەزە (پارێزگا)، ٢١٦ ناوچە ( ئیلچە ، شەهرستان ، قەزا ، مەنتیقە)، ٥٧٠ بەر ناوچە (بوچاغ ، بەخش ، ناحیە) و چەند هەزار گوندێك ( بروانە خشتەی ژمار ١).

لەتکردنی کوردستان ، بەو شێوەی لە خشتەی سەرەوە داهاتووە ، ئەنجامی کۆمەلە رووداوێکی سیاسی و جەنگییە کە سەرەتاکەی بۆ سالْی ١٥١٤ دەگەرێتەوە ، کاتێك دەولەتی عوسمانی لە شەری چالْدێراندا ئێرانی سەفەوی بەزاند و بەشی هەرە گەورەی کوردستانی بەرکەوت . دواتریش دەولْەتە ئیمپریالیستەکان خاك و رووبەرەکانی سەر بە دەولەتی عوسمانیان ، دوای جەنگی جیهانی یەکەم ، دابەش کردووە و کوردستان ، جگە لەو دوو بەشەی لەناو سنوورەکانی ئێران و تورکیا دا مانەوە ، دوو بەشی تریشی لێ جیاکرانەوە و خرانە سەر دوو دەولەتی تازە دروستکراوی دەستی دەولەتی بەشی تریشی لێ جیاکرانەوە و خرانە سەر دوو دەولەتی تازە دروستکراوی دەستی دەولەتی ئیمپریالیزم - عێراق و سوریا .

**خشتەی ژمارە ١**

**بەشە ئیدارییەکانی کوردستان لە هەشتایەکاندا**

| سەرناوچە "پارێزگا" | پانتایی کجگ | ژمارەی دانیشتوان | ژمارەی | | | ساڵ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ناوچە "قەزا" | بەرناوچە "ناحیە" | گوند | |
| سامسور | ٧٦١٤ | ٣٦٧٥٩٥ | ٦ | ٢٣ | ٣٤٦ | ١٩٨٠ |
| ئاگری | ١١٣٧٦ | ٣٦٨٠٠٩ | ٧ | ١٥ | ٥٥٨ | ١٩٨٠ |
| بینگۆل | ٨١٢٥ | ٢٢٨٧٠٢ | ٤ | ١٧ | ٣١٦ | ١٩٨٠ |
| بیدلیس | ٦٧٠٧ | ٢٥٧٩٠٨ | ٥ | ١٩ | ٢٧٣ | ١٩٨٠ |
| دیاربەکر | ١٥٣٥٥ | ٧٧٨١٥٠ | ١١ | ٢٤ | ٦٩٣ | ١٩٨٠ |
| ئەلازیغ | ٩١٥٣ | ٤٤٠٨٠٨ | ٧ | ٢٣ | ٥٨٩ | ١٩٨٠ |
| ئەرزنجان | ١١٩٠٣ | ٢٨٢٠٢٢ | ٦ | ٢٥ | ٥٦٧ | ١٩٨٠ |
| ئەرزەرووم | ١٥٧٩٢ | ٥٧٧٣٢٥ | ٧ | ٢١ | ٦٣٧ | ١٩٨٠ |
| عەنتیب | ٧٦٤٢ | ٨٠٨٦٩٧ | ٦ | ١٥ | ٦٠٠ | ١٩٨٠ |
| هەکاری | ٩٥٢١ | ١٥٥٤٦٣ | ٥ | ١٢ | ١٤٣ | ١٩٨٠ |
| مەلاتییە | ١٢٣١٣ | ٦٠٦٩٩٦ | ٨ | ٢٤ | ٥٢٠ | ١٩٨٠ |
| مارش | ٩٨٤٢ | ٥٥٦٥٢٠ | ٣ | ١٠ | ٣٤٨ | ١٩٨٠ |
| ماردین | ١٢٧٦٠ | ٥٦٤٩٦٧ | ١ | ٢٣ | ٧٢٠ | ١٩٨٠ |
| مووش | ٨١٩٦ | ٣٠٢٤٠٦ | ٣ | ١٥ | ٣٧٢ | ١٩٨٠ |
| سێرت | ١١٠٠٣ | ٤٤٥٤٨٣ | ١٠ | ٢٧ | ٤٩٩ | ١٩٨٠ |
| دەرسیم | ٧٧٧٤ | ١٥٧٩٧٤ | ٧ | ٢٨ | ٤٢٥ | ١٩٨٠ |
| ئورفە | ١٨٥٨٤ | ٦٠٢٧٣٦ | ٨ | ٢٩ | ٦٩٢ | ١٩٨٠ |
| وان | ١٩٠٦٩ | ٤٦٨٦٤٦ | ٧ | ٢٢ | ٥٧٠ | ١٩٨٠ |
| لە ئەدەنە | ١٧٢٦ | ١٥٤١٣٤ | ٢ | ٧ | ٩١ | ١٩٨٠ |
| لە حەتیە | ١٣٧٣ | ١٢٢٠٢٤ | ٢ | ٥ | ٤٩ | ١٩٨٠ |
| لە قارس | ٧٢٨٢ | ٢٤٠٥٥٨ | ٥ | ١٠ | ٢٧٨ | ١٩٨٠ |
| لە سیواس | ٢٧٨٢ | ٤١٤٢٠ | ١ | ٥ | ١١١ | ١٩٨٠ |
| ئازربایجان غەربی | ٣٧٥٩٩ | ١٩٧١٦٧٧ | ٩ | ١٩ | ٣٢٠٦ | ١٩٨٦ |
| کرماشان | ٢٣٦٢٢ | ١٤٦٢٩٦٥ | ٨ | ١٧ | ... | ١٩٨٦ |
| کوردستان | ٢٧٨٥٨ | ١٠٧٨٤١٥ | ٦ | ١٦ | ٢٠٢٢ | ١٩٨٦ |
| چەهار محال و بەختیاری | ١٤٨٢٠ | ٦٣١١٧٩ | ٤ | ٩ | ٨٩٥ | ١٩٨٦ |
| لورستان | ٢٨٥٦٠ | ١٣٦٧٠٢٩ | ٣ | ١٦ | ٣٣٦٢ | ١٩٨٦ |





| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئیلام | ١٩٠٨٦ | ٣٨٢٠٩١ | ٥ | ١٣ | ٩٨٥ | ١٩٨٦ |
| کوهگیلویه و بویر ئەحمەد | ١٣٦٩٩ | ٤١١٨٢٨ | ٣ | ٨ | ٢٤٦٦ | ١٩٨٦ |
| لە خوزستان | ٣٦١٩٢ | ١٤١٣٢٩٨ | ٧ | ١٠ | ... | ١٩٨٦ |
| لە فارس | ١٢١٥١ | ٣٩٢٦٣٣ | ٢ | ٣ | ... | ١٩٨٦ |
| لە بوشهر | ٥٣٣٩ | ٨٩١٧١ | ١ | ٢ | ... | ١٩٨٦ |
| نەینەوا | ١٦٢٢٢ | ... | ٧ | ٦ | ... | ١٩٨٧ |
| کەرکووک | ٩٦٧٩ | ٦٠١٢١٩ | ٣ | ٤ | ... | ١٩٨٧ |
| دهۆک | ٦٥٥٣ | ٢٩٣٣٠٤ | ٤ | ٤ | ... | ١٩٨٧ |
| هەولێر | ١٥٠٧٤ | ٧٧٠٤٢٩ | ٤ | ٩ | ... | ١٩٨٧ |
| سلێمانی | ١٧٠٢٣ | ٩٥١٧٢٣ | ٨ | ٨ | ... | ١٩٨٧ |
| لە دیالە | ١٣٠٣٤ | ... | ٤ | ٦ | ... | ١٩٨٧ |
| لە واست | ٣٦٥٠ | ... | ١ | ١ | ... | ١٩٨٧ |
| لە سەلاحەدین | ٢٣١٦ | ... | ١ | ٢ | ... | ١٩٨٧ |
| لە حەسەکە | ٨٦٥١ | ٢٨٠٧٣١ | ٣ | ٧ | ٦٢٤ | ١٩٧٠ |
| لە حەلەب | ٤٧٨٠ | ١٩٦٢٤٠ | ٢ | ١٠ | ٦٤٧ | ١٩٧٠ |
| لە رەقە | ١٨٣٣ | ١٥٨٢٥ | * | ١ | ٢٨ | ١٩٧٠ |
| ..... | ژمارەکان لەبەر دەست نین | | | | | |
| * | نییە | | | | | |

**خشتەی ژمارە ٢**

**پانتایی و ژمارەی دانیشتوانی هەرێمەکانی کوردستان ***

| هەرێم | پانتایی کچگ | دانیشتوان | بەشەکانی ئیداری | | | گوند | ساڵ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | سەر ناوچە | ناوچە | بەر ناوچە | | |
| باکوور | ٢١٥٨٩٢ | ٨٥٢٨٨١٧ | ١٨ | ١٣١ | ٣٩٩ | 9397 | 1980 |
| باشوور | ٨٣٥٥١ | ... | ٥ | ٣٢ | ٤٠ | ... | ١٩٨٩ |
| رۆژهەلات | ٢١٨٩٢٦ | ٩٢٠٠٢٨٦ | ٧ | ٤٥ | ١١٣ | ... | ١٩٨٦ |
| رۆژئاوا | ١٥٢٦٤ | ٤٩٢٧٩٦ | - | ٥ | ١٨ | ٢٦٣٨ | ١٩٧٠ |
| تێکڕایی | ٥٣٣٦٣٢ | ... | ٣٠ | ٢١٦ | ٥٧٠ | ... | ٠٠٠ |

*** کاکڵەی خشتەی ژمارە ١**

**سەرچاوەکان**

١- نووسەر لەم سەچاوەیەی وەرگرتووە.
Demographic year book 1989 n.v. 1990 p.p.165 – 173

٢- مۆیس خۆرین جوکرافیای ئەرمینیا لە چەرخی (٧) ی پێش زایین ، ئامادەکردنی بۆ چاپ ، پیاتکونۆۆ ، سان پیتەربۆرگ، ١٨٧٧،ل٤٣.(بە زمانی رووسی ).

٣- ناوە ئەسلیەکەی کۆهستان لەسەر شێوەی کوردستان و ئەفغانستان ، عەرەب زمانەکان کردوویانە بە عەرەبی و بۆتە اقليم الجبال) ئێمەی کوردیش عەرەبیەکەمان کردووتەوە کوردی و بووە بە هەرێمی چیا ، من لێرە بە باشم زانی ناو ئەسلیەکەی بەکاربهێنم .

٤.Le strange guy the lands of the eastern caliphate Cambridge 1905 p.192

**عەرەبیەکەی :**

کی لسترانج ، ترجمة بشير فرنسيس عواد بلدان الخلافة الشرقية الطبعة الثانية بيروت ١٩٨٥ ص٢٢٦

٥- کتێبی مارکوپۆلۆ میناێڤە لە تێکستی فەرەنسیی کۆنەوە کردوویەتی بە رووسی مۆسکۆ ،١٩٥٥،ت٦٥، (بە زمانی رووسی)

٦- عزيزالله بيات (دكتر) كليات جغرافیای طبيعی و تاریخی ايران ، تهران ،١٣٦٧ ص ٤٨٢، (بە زمانی فارسی )

٧- حمدالله مستوفی،باهتمام وتصحيح گای ليسترانج نزهه القلوب ، تهران ، ١٣٦٢، ص ١٠٧-١٠٩ ( بە زمانی فارسی )

٨- سالنامه سنه ١٢٦٦ هجرى طبخانة عامرده باصلمشادر ، ص ٦٢-٩١ ( بە زمانی تورکی عوسمانی )

٩- الجهاز المركزى للأحصاو ، المجموعه الاحصائيه السنويه ١٩٨٩، بغداد ١٩٨٩ ، ص ٤.

١٠- نووسەر لە ژمارەیەکی یەکجار زۆرەوە دایناوە و حسابی کردووە ، هەندێکیان ئەمانەی خوارەوەن
Genel nufus sayim, idari bolunu 12.10.1980 Ankara 1981

لاپەرەکانی ئیلەکانی کوردستان ( بە زمانی تورکی )

Turkey yearbook 1983, Ankara 1983 s.39(*) .

_ مرکزامار ایران ،سرشماری عمومی نفوس و مسکن مهرماه ١٣٦٥ نتایج نهائی ،کشور ٨ تهران ١٣٦٨، ص ١٠-١٢

_ حبيب الله زنجانی – فريدون رحمانی ( تهيه و تدوين )،راهنماوی جميعت شهرهای ايران ، ١٣٣٥-١٣٧٠، ١٥٠-١٦٣.

_ اطلس ايران و جهان سيلسی طبيعی ، چاپ هشتم تهران ، ١٣٦٩ ، ص ٤-٥

_ الجهاز المركزي للاحصاء المجموعة الاحصائية السنوية ١٩٨٩،بغداد ، ١٩٨٩ ، ص ٧-٢٣

_ المكتب المركزي للاحصاء ، دليل الترميزى الجغرافي و فق التقسيمات الادارية، في الجمهورية العربية السورية ، ١٩٨٠ .دمشق،١٩٨٠ ، چەندەها لاپەرەیە .

_ عەبدوللا غەفور و ئاریستیڤا . ت.ف، باری ئێتنۆ ـ دیموگرافیی باشووری کوردستان ، گۆڤاری (راسی ئی نەرۆدی) (رەگەز و میللەتان )، ژمارەی ١٩، مۆسکۆ ١٩٨٩ ل١١٦-١٢٣ (بە زمانی رووسی)

_ عەبدوللا غەفور خاسیەت و گیروگرفتەکانی ئاوەدانی شار و گوندەکانی عێراق ، نامەی دکتۆرا دەست نوس ، مۆسکۆ ، ١٩٨٠١١٦-١١٨( بە زمانی رووسی).





# کوردستانی سوور پێکهاتن و هەڵوەشاندنەوەی

کوردستانی سوور (قەزای کوردستان ، کوردستانی ئازەربایجان ، مەڵبەندی کوردستان یا هەر تەنیا کوردستان ) ، ناوی بەشێکی ئیداری بوو لە خاکی کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەتی پێشوو ، کە لە ساڵی ١٩٢٣ تا ١٩٢٩ ز درێژەی هەبوو. ئەم وتارە بۆ روونکردنەوەی هۆکانی دابەشبوونی ئیداری ئەو نێوچەیە تەرخان کراوە. پەیدابوونی کورد لە قەزای کوردستان مەڵبەندی ئازەربایجانی کوردستان هەر لە مێژە کوێستانی تیرە و هۆزە کۆچەرییەکانی کورد بووە،هەموو ساڵێ ژمارەیەك لە مەڕدارانی کوردی خاکی ژێر دەستی فارس (پاش ١٩٣٦ ئێران ) لە کۆتایی زستان و سەرەتای بەهاردا روویان لە لەوەڕگەکانی خاکی ئازەربایجان دەکرد، پاش وشکبوونی گیا و هاتنی گەرما، دەگەڕانەوە بۆ ئەو شوێنانەی لێیانەوە هاتبوون . وا دیارە ژمارەیەك لەو خێڵە کۆچەرانە، لەبەر هەر هۆیەك بێ ، لە کوێستانەکان ماونەتەوە و بە یەکجارەکی لەوێ جێنشین بوون.

لە چەرخی شازدەی زایینیدا ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی یەکێك لە هێزە هەرە گەورەکانی رۆژهەلات بوو، هەتا دەهات خورتتر دەبوو، ئەو خورتییەی مۆلەتی دابوو بۆ دەسدرێژکردنە سەر خاکی دراوسێکانی بەتایبەتی لە قوڵی رۆژهەلاتەوە، ئەوە بوو لە ساڵی ١٥٨٦ز هێزێکی گەورەی نارده سەر سەفەوییەکان. شەرەفخانی بەدلیسی لەو رووەوە نووسیویەتی (لەو ساڵەی فەرهاد پاشا ،خۆی ئامادە کرد بۆ گرتنی مەڵبەندی گەنجە و بەردە، پاش داگیرکردنیان )خێڵەکانی قاجار و گرمی(١) دۆرتی دەرکرد(٢) (١٣،١٤،ل٢٩٢). هەندێکیان بە ناچاری هاتنە ناو خاکی ژێر دەستی سەفەوییەکان.

رووسیاش، وەك ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی،خۆی لە خاکی دەولەتانی دەوروپشتی، بەتایبەتی قەفقاز،خۆش کردبوو،دەستی کرد بە بیانووگرتن و شەڕفرۆشتن،لە ئەنجامدا چەند شەڕێك لە نێوانیاندا رووی دا لە هەندێکیان بەتایبەتی لە شەری چیچانی (١٨٠٤ - ١٨٠٥) ز لەگەڵ قاجارەکاندا سەرکەوتنێکی باشیان بە دەست هێنا و خاکێکی زۆریان داگیر کرد. هەر بەوەند گرۆ کفیان دانەمرکایەوە،بەڵکوو درێژەیان بە شەڕدا هەتا قاجارەکانیان ناچار کرد، دەست لە بەشێك لە خاکی خۆیان هەلگرن، بە پێی پەیمانی گولستان (١٨٢٨) ز و تورکمان چای (١٨٢٨) ز ، داغستان و رۆژهەڵاتی گورجستان و میرنشینی قەرەباغ (٣) و گەنجە و کوبێن و ئالشیکۆف و یەریڤان و نەخچەوان بە تەواوی کەوتنە ژێر کۆنترۆلی ئیمپراتۆرییەتی رووسیاوە ،شایانی باسە دانیشتوانی هەندێ لەو مەڵبەندانە بە تەواوی کورد بوون.

ئەم گۆرانکارییانە لە نێوان رووسیا و قاجار دا رووی دا، نەبووە هۆی پێشگرتن لە هاتووچۆکردن و ئەمبەرو ئەوبەرکردنی خێلە کوردەکان ، بۆ نموونە ئەڤریانۆڤ دەنووسێ(پاش گرتنی میرنشینی قەرەباغ لە ساڵی (١٨٠٥ز،بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداری ئەوێ لەلایەن رووسەکانەوە،دڵی خەلکێکی زۆری لە خۆ کرد . بۆ دامرکاندنەوەی ئەم بارەش رووسەکان لە ساڵی ١٨١٠ ز دا، ١٤٠ خێزانی کوردیان رەوانە کردە لای کوردەکانی میرنشینی یەریڤان (١،ل٢٤). هەروەها لە ترسی هێرشی لە دوانەهاتووەکانی قاجارەکان و خۆ نەگرتن لەبەر باجی رووسەکان ، خەلکێکی زۆر قەرەباغیان بە جێهێشت. بەڵام ئەوە نابێ وامان لێ بکا بلێین کە لەو سەردەمەدا کورد هەر خەریکی گواستنەوەی و

شوینگۆرگێ بوویێ لەو خاکە تازانەی دەکەوێتە ژێر کۆنترۆلی رووس. ئەوەتا ئەڤریانۆڤ دەنووسێ(لەگەڵ ئەوەشدا رووداوی وا بووە،کورد لە ولاتی فارسەوە هاتوونەتە خاکی تازەی بەردەستمان (قەرەباغ ع.غ) بۆ نموونە ١٨٠٧ز دا محەمەدی سافی سوڵتانی قەرەباغی، برا گەورەی ٥٠٠ – ٦٠٠ خێزانی کورد ،هانایان بردە بەر کاربەدەستانی تازەی قەرەباغ (رووسەکان ع.غ) بۆ ئەوەی رێگا بدەن بە خۆی و خێلەکەی لە میرنشینی قەرەباغ سەقامگیر بن (١،ل٢٤) . ئەو هاتووچۆیە هەتا ئەورۆکەش نەك هەر لەو مەڵبەندە بەڵکوو لە هەموو کوردستان نەبڕاوە و نابڕێ،دەوڵەتە داگیرکەرەکان و سنوورە دەستکردەکانیان، نەیانتوانیووە و ناتوانن پێوەندی نێوان گەلی کوردستان لە یەکتر بپڕن.

دروستکردن و هەڵوەشاندنەوەی کوردستانی سوور (٤)

دامەزراندنی کوردستان وەك بەشێکی ئیداری سەربەخۆ . بابەتی گفتوگۆکردنی چەند جارەی کۆمیتەی ناوەندی بەجێگەیاندنی ئازەربایجان و کۆمیتەی دابەشکردنی ئیداری (هەرێم) و هەوەها رێکخراوەکانی پارتی بوون. بۆ ئەو مەبەستە کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنسیتی ئازەربایجان (بۆلشەفیك) لە کەسان و زانایانی مێژوو،ئابووری ،جوگرافیا و ئەتنۆگرافیا و هیتر .لیژنەیەکی دیاریکردنی سنوور و جۆری ئیداری و هەڵسوراندنی کاروباری نەگۆرنێی قەرەباغ و کوردستانی پێك هێنا. ئەندامانی لیژنەکە یەك دەنگ لەگەل دامەزراندنی نەگۆرنێی قەرەباغ بوون و کەسیان دژ نەبوون و بە هەقیشیان دەزانی،بەڵام کە قسە دەهاتە سەر کوردستان،کەس برای کەس نەبوو،هەر یەکە قسەیەکی دەکرد ورایەکی هەبوو، بە جۆرێ کە رای دوانیان بەیەك نەدەچوو.

کێشەی دامەزراندنی کوردستانی سوور،چەند مانگێك لە کۆبوونەوەی رێکخراوە رامیارییەکاندا قسەی لێوە دەکرا و بەرەبەرە رای ئەندامەکان بەرو ئەوە دەهات کە ناوچەی کوردستان دامەزرێ،بەڵام کە دەهاتنە سەر قوباتلی ، کە لە دواییدا بووە بەرناوچەیەك (ناحیە) لەو قەزایە هەرکەس بۆ لای خۆی رایدەکێشا و هەر بڕیارێ برابایە هێندەی پێ نەدەچوو هەڵدەوەشایەوە و یەکیکی تری لەباتی دەردەچوو . لە مانگی تشرینی دووەم و کانونی یەکەمی ١٩٢٢ز لە ئەنجومەنی کۆمیتەی ناوەندی بەجێگەیاندنی ئازەربایجانەوە سەبارەت بە قوباتلی سێ بڕیار دەرچوو: یەکەم لە ٢١ تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ز ،کە پەرەگرافی چوارەمی پەیوەندی بە کوردستانەوە هەبوو ، دووەم لە ٢٠تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا، کە پەرەگرافی دووەمی لەسەر کوردستان بوو، سێیەم لە ٣٠ کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ز، پەرەگرافی چوارەمی باسی کوردستانی دەکرد.

بڕیاری یەکەم ، داوای هەڵوەشاندنەوەی بەرناوچەی قوباتلی دەکرد، بەڵام دووانەکەی تر وایان پێ باش بوو ئەو کێشەیە قسەی لێ نەکرێ و بۆ ماوەیەك بنوێندرێ. کێشەی قوباتلی لە ساڵی ئایندەشدا هەر نەبڕاوەیەوە، لە ١٣کانوونی دووەمی ١٩٢٣ز کۆمیتەی ناوەندی بەجێگەیاندنی ئازەربایجان، بڕیارێکی تری دەرکرد،دژی بەستنەوەی قوباتلی بە کوردستانەوە،داوای کرد وەك بەشێکی ئیدار سەربەخۆ بمێنێتەوە. وا دیارە لە دەرکردنی ئەو بڕیارەدا، پێکهاتنی نەتەوەییان بە هۆکارێکی سەرەکی داناوە. وەك لە پاشاندا دەرکەوت لەسەرژمێری ١٩٢٦ز دا لە رووی زمانەوە دانیشتوانی قوباتلی خۆیان بە توورك لە قەلەم دا بوو.

کۆمیتەی ناوەند بەجێگەیاندنی ئازەربایجان چەند جاری تریش لە کۆبوونەوەکانی خۆیدا، باسی کوردستان دەکا،بەڵام بەداخەوە،جگە لە دوو پرۆتۆکۆل هیچ شتێکی تر لەبەر دەستدا نین بۆ لێکۆڵینەوە. بێگومان گەر هەوڵ و تەقەلای لیژنەی بۆکشبان نەبوایە ئەو دوو دەکۆمێنتەش نەدەکەوتە بەر باس،کە لە ئەرشیفی پارتی لە ئینستیتوتی مێژوو بە ناوی (سێپان





شـاولیان) ی سـەر بـە کۆمیتـەی ناوەنـدی پـارتی کۆمۆنیستی ئازەربایجان (بۆلشەفیك) دەستی کەوت. لە پەرەگرافی چوارەمی پرۆتۆکۆلی یەکەمیدا، دوو پێشنیاز سەبارەت بە قەزای کوردستان خراوەتە روو:

پێشنیازی یەکەم ئەوەیە کە کوردستان بکرێتە بەشێکی ئیداری سەربەخۆ،واتە قەزایەك یەکسەر بە سەنتەرەوە ببەسترێ. لـەم مەڵبەندانـە کجەوانـشێر، شوشـین، کوردستانی قوبـاتلی پێـك بـێ. ئـەوەش لەبـەر ئـەوەی کوردستـان لـە قـەرەباغی دەشـتاییەوە دوورە و دانیشتوانی کـە نزیکـەی (٦٠) هـەزار کـەس بـوو کەمـە. هەر بۆیە بۆ دابینکردنی گوزەران و پەیوەندی گونجاوی رۆژانە وا بە باش زانراوە راستەخۆ بە سەنتەری باکۆوە ببەسترێتەوە.

پێشنیازی دووەم ئەوە بـوو کـە کوردستـان وەك خـۆی بمێنێتەوە ، لە رووی ئیدارییەوە لە قەرەباغی دەشتایی جیانەکرێتـەوە . ئەنـدامانی پەرلـەمانی کۆمـاری ئازەربایجان، لە کاتی دەنگدان لەسەر ئەو دوو پێشنیازە بـوون بـە دوو کۆمـەڵی هاوشـان لـە دەنگـدان ، هـیچ لایـەکیان نـەیتوانی پێـشنیازەکەی خـۆی بـەویتر بسەلمێنێ. بەڵام لە پرۆتۆکۆلی دووەمدا بە راشکاوی دوا رۆژی کوردستان ئاشکرا بوو،لە کۆبوونـەوەی رۆژی ٧/ تەمووزی/١٩٢٣ز ی پەرلەمانی ئازەربایجان بڕیاری ئەوە درا،کە پاش چەسپاندنی نەگۆرنێی قەرەباغی ئۆتۆنۆمی (نـەگۆرنێی قـەرەباغ لـە ٧ی تـەمووزی ١٩٢٣ز بـووە ناوچەی ئۆتۆنۆمی) کوردستانی ئۆتۆنـۆمی دابمـەزرێ و سەنتەر و سنوورەکەی دیاری بکرێ (٥،ل٥٣).

گەرچـی بڕیـاری دامەزرانـدنی کوردسـتانی ئۆتۆنـۆمی راگەیاندرا،بـەڵام بـە کـردەوە کۆمیتـەی بـەرزی ئازەربایجان،هەولی دەدا لـەو بڕیـارە پاشـەگەز ببێتـەوە و پشتگوێی بخا،بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا نەیانـدەتوانی بـە تـەواوی خۆیـان لـەو راسـتییە بدزنـەوە کـە بڕیارێـك دەرچووە و بە کردەوەش کوردستان ناوچەیەکی ئیداری نیمچە سەربەخۆیە، هەر بۆیە لە مانگی ئاب و ئەیلوولی ١٩٢٣دا هەمان کۆمیتەی دانی بەوەدا نا کە کوردستان ناوچـەیەکی سـەربەخۆیەو پێـك هـاتووە لـە جەوانـشێر شوشین کوردستانی قوباتلی .

لە مانگی ئابی ١٩٢٣ز پیاوێك بە ناویگوسێ حاجییڤ (یوسفێ حاجی) بە سـەرۆکی کۆمیتـەی بەجێگەیانـدنی قەزای کوردستان دامـەزرا و لـە دوای ئەمـەش حاجییڤ کەوتۆتـە نامـە نـاردن بـۆ سـۆڤیەتی کۆمیساری گـەل لـە ئازەربایجـان دەربـارەی پێویـستییەکان و دامەزرانـدنی فەرمانبەر و شتی تری قەزای کوردستان.

کوردسـتانی سـوور کـە تەمـەنی هـەر شـەش سـاڵ بـوو(١٩٢٣ - ١٩٢٩) ز بـە کـردەوە ئـەوەی سـەلماند کە ئەو دروشمانەی لە یەکێتی سۆڤیتی جاراندا بانگاشەی بۆ دەکرا، سەبارەت بە مافی چارەنووس و دامەزراندنی قـەوارەی نیـشتیمانی،تەنیا درۆیـەکی ئایـدۆلۆژی بووە،لەو شوێنانەدا کە بەرژەوەندییان وای خواستبێ دەولەت یان قەوارەی فیدرالی یا ئۆتۆنۆمی بۆ گەلێك پێك بێنن ئـەنجامیان داوە،لـە شـوێنێکی تریـشدا کـە ئـەم بەرژەوەندییەیان نەبووبێ وەك (کوردستانی سوور) ئەوا بە دەردی کوردستانی سووریان بردووە.

## ژمارەی دانیشتوان و پێکهاتنی نەتەوەیی

لـە سـاڵی ١٩٢٣زدا ژمـارەی دانیـشتوانی کوردسـتانی سوور نزیکەی ٤٩هەزار کەس بوو،بەڵام بەپێی ئەنجامی سـەرژمێری ١٩٢٦، ژمـارەی دانیـشتوانی گەیـشتۆتە دەوروبەری ٥٢هەزار کەس ، واتە لەم ماوەیەدا نزیکەی سێ هەزار کەس زیادی کردووە (پیاو-٢٧ هەزار ، ژن _ ٢٥هەزار ، شارنشین ـ٥ هەزار،گوندنشین - ٥١،٥ هـەزار کـەس ). بـەڵام لـە سـاڵی هەڵوەشـاندنەوەی ئـەم نێوچـە ئیدارییـە کوردییـەدا،ژمارەی دانیـشتوان لـە ٥٢هـەزار کەس پتر بوو.

دابەشبوونی جوگرافی دانیشتوان بەسەر بەرناوچەکانی



قەزای كوردستان لە ساڵی ١٩٢٦ز دا بەم جۆرە بوو: قەرەقیشلاق – ٦٠٥٠كەس ، كەلبەجار – ١٢٠٤٦كەس قوتورلی – ٤٨٨٨كەس، قوباتلی . ١٣٥٣٣كەس، كورد حاجی – ٨٢٨٥كەس ، موورداخانی – ٦١٨٩ كەس.لاچین ــ سەنتەریكوردستانی سوور – ٤٣٥كەس(٦،ل–٧١).

قەزای كوردستان لە رووی پێكهاتنی نەتەوەییەوە زۆر ئاڵۆزە.لە سەرژمێری ساڵی ١٩٢٦زدا، ئەو نەتەوانەی لەم بەشە ئیدارییەدا دەژیان ، ئەمانە بوو: كورد– ٣٧١٨٣ كەس، (لە هەموو كۆماری ئازەربایجاندا – ٤١١٩٣كەس )، تورك – ١٣٧٤٥ كەس، ئەرمەن– ٣٧٣ كەس ، رووس– ٨١ كەس، ئۆكراین، گورجی، ئەڵمان،لازكی ،ئاڤاری، تەتەر،هەمووی بەسەر یەكەوە – ٢٨كەس (٦،ل٣١). بە ووتەیەكی تر زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوان (٧٢،٢٪)كورد بوون. لەگەڵ ئەوەشدا رێژەی كورد لە قەزای كوردستان لە ساڵەكانی دوایی، لە سایەی پۆلێتیكی تواندنەوە و بە تورككردن لە ناوچەكەدا كەمی كرد ، بۆ نموونە ، لە ساڵی ١٩٢٣ز هەتا ١٩٢٦ز ئەو رێژەی لە ٧٧،٨٠ ٪ بوو بە ٧٢،٢٪ (١٢،ل–٢) واتە ٥،٨٪ كەم كردووە.

دابەش بوونی جوگرافی كورد بەسەر بەرناوچەكانی قەزای كوردستاندا،لە سەرژمێری ١٩٢٦ز دا ، بەم شێوەیە لای خوارەوەیە:

**خشتەی ژمارە ١**
**پێكهاتنی نەتەوەیی بەرناوچەكانی**
**قەزای كوردستان لە ساڵی ١٩٢٦ز (٥)**

| بەرناوچە | دانیشتوان | کورد | تورک | |
|---|---|---|---|---|
| قەرەقیشلاق | ٦٠٥٠ | ٦٠٠٣ | ١١ | ٣٦ |
| کەلبەجار | ١٢٠٥٢ | ١١٩٦٧ | ٦٢ | ٢٣ |
| قوتورلی | ٤٨٨٨ | ٤٨٧٣ | ١٣ | ٢ |
| قوباتلی | ١٣٥٣١ | ١ | ١٣٣٦٧ | ١٦٣ |
| کوردحاجی | ٨٢٨٦ | ٨١٦٩ | ٩٩ | ١٨ |
| مراد خانی | ٦١٨٩ | ٦٠٥٩ | ٢٩ | ١٠١ |
| لاچین (شار) | ٤٣٥ | ١١١ | ١٦٤ | ١٦٠ |
| تێکڕا | ٥٢٤٣١ | ٣٧١٨٣ | ١٣٧٤٥ | ٥٠٣ |
| تێکرا | ١٠٠،٠ | ٧٢،٣ | ٢٦،٧ | ١،٠ |

وەك لە ژمارەی خشتەی سەرەوەدا دەردەکەوێ ، جگە لە بەرناوچەی قوتابلی ، لە ناوچەکانی تردا کورد بەشی هەرە زۆری دانیشتوانی پێك دەهێنن و لە هەندێکیشیاندا وەك (قەرەقیشلان) نزیکەی هەموو کوردن .

لە مانگی ئابی ١٩٣١ز دا، بە پێشنیازی کۆمیساری گەل،بۆ فێرکردن لە کۆماری سۆسیالستی ئازەربایجانی سۆڤیەت (بەشی زانیاری ) لەگەڵ ئینستیتوتی زانیاری و لێکۆڵینەوەی دەوڵەتی ئازەربایجان (بەشی رۆژهەلات )،لێژنەکەی بۆکشپانی (بەرین) رەوانەی قەزای کوردستان کرا، بە ئاواتی (وەك راگەیاندرابووو) پەرەپێدانی ئاستی کلتوری لە ناو کوردەکانی کۆماری سۆسیالیستی ئازەربایجان سۆڤیەت(٥،ل-٥). ئەم کۆمیتەیە و بۆکشپانی سەرۆکی زۆربوونی کورد ،بێویژدانانە ، لەو ناوچەیەدا بە درۆدەخاتەوە و دەنوسێ(ئەو رایەی کە دەڵێ زۆربەی دانیشتوانی قەزای کوردستانی لە ١٩٠ گوندی ناوچەی لاچیندا ، تەنیا لە ١٠ گوندیاند خەڵك بە کوردی قسان دەکەن و خۆیان بە کورد دەزانن.ئەوجا درێژە بە قسەکانی دەدا و دەڵێ: لە گوندی مێریك کە ژمارەی دانیشتوانی٣٧٤کەسە و ئەوەی (٧) بەرە بابن، هەموویان بە تورکی قسان دەکەن و تورکن،لەگەل ئەوەشدا، وەك پێیان گوتین لە ناو پیاواندا'لە پیرەکانی گوندی مێریك بە ئاستەم کوردییان لە بیر ماوە و ژمارەشیان (٣١) کەسن (پیرێژن - ٢٠کەس، پیرەمێرد- ١١) (٥،ل-٦٢-٦٣).

وا دەردەکەوێ لێژنەکەی بۆکشپان بۆ پەرەپێدانی کلتوری کوردەکانی قەزای کوردستانی پێشوو نەچووە، بەڵکوو بو ناونوسسکردنی خەڵك بە تورك و نکولێکردن لە بوونی کورد رۆیشتووە و یەکێ لە ئەرکەکانی لێژنەی بۆکشپان بۆ ناوچەکە. پاش هەڵوەشاندنەوەی ئیداری کوردستانی سوور بۆ ئەوە بوو کە کەمایەتی بوونی کورد لە ناوچەکەدا هەڵبەستێ و هەقانییەتی هەڵوەشاندنەوەکە بسەلمێنێ،بەڵام لەم کارەی وەك لە زانیارییەکانی ناو

**خشتەکەی ژمارەی ٢**

**پێکهاتنی نەتەوەیی لە قەزای کوردستانی پێشوو لە ١٩٣١ز**

| بەرناوچە | دانیشتوان (٦) | کورد | |
|---|---|---|---|
| | | ژمارە(٧) | رێژە(٨) |
| قەرەقشلان | ٦٤٥٠ | ٦٠٣٣ | ٩٣,٥ |
| کەلبەجار | ١٨٠٥٣ | ١١٩٩٣ | ٩٩,٤ |
| کورد حاجی | ٨٥٩٣ | ٨١٧٣ | ٩٥,١ |
| موراد خانی | ٦٦٠٢ | ٦١٥٩ | ٩٣,٣ |
| قوتورلی | ٧١٢٣ | ٥٨٨٥ | ٨٢,٣ |
| قوباتک | ١٨٤١٨ | — | — |
| تێکرا | ٥٥٢٤٩ | ٣٨٢٤٣ | ٦٩,٢ |

ـەم خشتەيەى لاى خوارەوەدا هاتووە، سەركەوتوو ـەبووە.

ـەت بەو ژمارانەى سەرەوەدا بۆمان دەردەكەوێ هەر ـەو نەخشەيەى لە ساڵى ١٩٢٦دا بوو،دەنا بۆكشپان ـوچى پێمان ناڵى ، كوانى ئەو توركانەى ئەو ـونووسى كردوون؟ وا ديارە ئەم پياوە ،لە ـيـرِيكردنى نەتەوەدا ئينتماى نەتەوەى لا گرنگ نييە ـ تەنيا زمان دەكاتە پێوانە ، زمانيش لێرەدا زمانى ـتەوەى باڵادەستەو وەك بەشێك لە بە ئازەريكردن ـوكراوەتەوە. لێرەدا راستييەك هەيە دەبێ وەكوو ـوى بنوسرێ،ئەويش ئەوەيە كە زۆربەى خەڵكى كو ـستانى سوور زمانى قسەكردنيان لە ١٩٢٦دا – ٣٠ و لە ١٩٣١ – ٩٠٪ توركى بوو (٦،ل– ٧١ ، ٥، ـ– ٦١). لێرەدا پرسيارێك خۆى قوت دەكاتەوە ، ـگەر ئەو خەڵكانە كورد بوون، بۆچى بە توركى قسەيان دەكرد؟ لە وەلامدانەوەى ئەو پرسيارەدا ـلێين: خوێندن بە زمانى توركى و سوكايەتيكردن بە زمانى كوردى (زمانى گێلمە گێلم)،كوتاڵفرۆش و جـڵەبڕكر و پينەدۆز و جۆڵا و عەتار و پەنيركر و ـرِيش و سەيد و مەلا و شێخ و فەتاح فال و عاشوور بە توركى بووە(٢،ل–٤١). قسەكردن بە توركى ماناى شارستانييەت و پايەبەرزى لە ناو خەلك و نزيكبوونەوە لە دەسرۆيشتووەكانى بازار بووە ،بەڵام وەنەبێ كوردەكانى ئەو ناوچەيە ،لە ماڵەوە بە زمانى زكماكى خۆيان قسەيان نەكردبێ.

## هەڵكەوتنى جوگرافى و دابەشكردنى ئيدارى

كوردستانى سوور بەو ناوچە و بەرناوچانەى كۆمارى سۆسياليستى ئازەربايجانى سۆڤيەتى پێشوو دەگوترێ كە كەوتۆتە باشوورى رۆژئاواى قەزاى كوردستان و هاوسنوورە لە باكوور لەگەڵ قەزاى گەنجە لە باشوور لەگەڵ ئێران و قەزاى جبرائيل و لە رۆژهەلات مەڵبەندى ئۆتۆنۆمى نەگۆرنێى قەرەباغ و لە رۆژئاوا كۆمارى ئەرمينيا.

بەڵام سنوورى سروشتى كوردستانى سوور بەم جۆرەيە: لە باكوورەوە چياى مرۆڤ،لە رۆژهەلات و باشوورى رۆژهەلاتەوە رووبارى ئەكارە (لە گوندى ئەفەنديلە هەتا ناوەرِێژى ميلخە ليفى (لقى ئەكارە)،لە رۆژئاوا و باشوورى رۆژئاواوە چياكانى دەرەلاگيز و كەنگورۆ ئەلاگيليز،لە باشوورەوەچياكانى جبراييل.

قەزاى كوردستان لە رووى ئيدارييەوە بەسەر چەند بەرناوچەيەكدا دابەش دەكرا ، كە هەر بەرناوچەيەك لە چەند گوندێك پێك دەهات. كاروبارى ئيدارى و هەندێ لايەنى ئابوورى و كۆمەلايەتى و راميارى ، لە قەزاى كوردستان ، لە لايەن كاربەردەستێك بە ناوى سەرۆكى كۆميتەى بەجێگەياندن بەرِێوە دەبرا. هەڵسوورانى كاروبارى گوند و پەيوەندى لەگەڵ سەنتەرى قەزادا ، لە بندەستى ليژنەيەكدا بوو بە ناوى سۆڤيەتى گوند (ئەنجومەنى گوند). بەشە ئيدارييەكانى كوردستان،بەپێى ساڵەكان بەم جۆرە بوون:

### قەزاى كوردستان لە ١٩٢٣

بە پێى بڕيارى ٧/ تەمووز/١٩٢٣، بەرناوچەكانى سەر بەم قەزايە ئەمانە بوو:

جەوانشير ، شوشين،كوردستانى قوباتلى (٥،ل–٥١)

### قەزاى كوردستان لە ١٩٢٤

بەشە ئيدارييەكانى ئەو قەزايە ، هەمان بەرناوچەكانى ساڵى پێشوو بوون و بريتى بوون لە جوانشير،شوشين،كوردستانى قوباتلى .

### قەزاى كوردستان لە ١٩٢٥

سەنتەر . عەبدەلليار(لە ١٩٢٧ ەوە لاچين ) ، پانتايى -





٣٥٣٢ کیلۆمەتری چوارگۆشە
(کچگ)، شار ـ ١،بەرناوچە ـ ٤، سۆڤیەتی گوند ـ ٢٠.
بەرناوچـــەکانی ئەمانــــە بـــوون: ئـــەکاری ، حاجیساملی،قوتورلی، پوسەیان(٩،ل ـ ٢٠٢).

## قەزای کوردستان لە ١٩٢٦

سـەنتەر ـ عەبـدەللیار،پانتایی ـ٣٥٢٣کـچگ،شار ـ١، بەرناوچە ـ٦،سۆڤیەتی گوند٧٣.
بەرناوچـەکانی ئەمانـە بـوو: قەرەقیـشلان،کەلبەجار، قۆتورلی،قوتابلی کوردحاجی موراد خانی(١٠،ل١٨٩)

## قەزای کوردستان لە ١٩٢٧

ســـەنتەر ـــ لاچـــین،پانتایی ـــ ٣٥٢٤کـــچگ،شار ١،بەرناوچە٦،سۆڤیەتی گوند ٥٨، گوند ـ ٣٨٧.
بەرناوچـــەکانی ئەمانــــە بـــوو: قەرەقیــــشلاق ، کەلبەجار،قۆتورلی ،کوردحاجی،پوسیان _١١،١٢٣)

قەزای کوردستان لە ١٩٢٨

سـەنتەر ــ لاچـین، پانتایی ــ ٣٥٢٤کـچگ،شار ــ١ ، بەرناوچە ٦، سۆڤیەتی گوند ٥٦، گوند ـ ٤٨.
بەرناوچـەکان ئەمانـە بـوو: ئـەکاری قەرەقیـشلان ،کەلبەجار،قۆتورلی،کوردحاجی،پوسیان(١١٥،٣).

## سەرچاوەکان


١. ئەڤریانۆڤ پ.ی.،کوردەکان لە شەری رووسیا لەگەڵ فـارس و تورکیـا ، بـە درێـژی چـەرخی نۆزدە،بـاری رامیاری ئێستای کوردەکانی تورکیا ،فارسو رووسیا ،لێکۆلینەوەی مێژووی تەفلیس ، ١٩٠٠(رووسی)
٢ـ ئەلەکبیرۆڤ ئا.،بەرەو کێشەی لێکۆلینەوەی کلتوری کوردەکان. ئەکادیمیای زانیاری کۆماری سۆسیالیستی یـــەکێتی ســـۆڤیەت،کارەکانی فیلیـــالی ئازەربایجـــان ٢٧،زنجیرەی مێژووی،باکۆ، ١٩٣٦(رووسی)
٣. دابەشکردنی ئیداری، خاکی کۆماری سۆسیالیستی یەکێتی سۆڤیەت ،١٩٢٩، مۆسکۆ، ١٩٢٩(رووسی)
٤. دابەشکردنی ئیداری، خاکی کۆماری سۆسیالیستی یەکێتی سۆڤیەت، مۆسکۆ، ١٩٣٤(رووسی)
٥ـــ بوکـــشپان یێ .،کوردەکـــانی ئازەربایجـــان : لاچین،کەلبەجاری مەڵبەندی نەخچەوان ، باکۆ،١٩٣٢، (رووسی)
٦/سەرژمێری گشتی دانیشتوانی سۆڤیەت ١٩٢٦،بەگی ١٤، کۆمـــاری قـــەفقازیان فیـــدرالی سۆسیالیـــستی سۆڤیەت،مۆسکۆ،١٩٢٩،(رووسی)
٧ـ سوکلێڤیچ س.یـ،بنای ئیداری ـ رامیاری کۆماری سۆسیالیـــستی یـــەکێتی ســـۆڤیەت ، لێنینگـــراد، ١٩٢٦(رووسی)
٨ـ سوکلێڤیچ س.ی.،بنای ئیداری ـ رامیاری کۆماری سۆسیالیـــستی یـــەکێتی ســـۆڤیەت، مۆســـکۆ، ١٩٢٧(رووسی)
٩. خاك و دابەشکردنی ئیداری ، کۆماری سۆسیالیستی یـــەکێتی ســـۆڤیەت لــــە ١ ــــی کـــانوونی دووەمی١٩٢٥ز،مۆسکۆ،١٩٢٥(رووسی)
١٠. خاك و دابەشکردنی ئیداری، کۆماری سۆسیالیستی یـــەکێتی ســـۆڤیەت لـــە ١ ـــی کـــانوونی دووەمـــی ١٩٢٦ز،مۆسکۆ ،١٩٢٦(رووسی)
١١. خاك و دابەشکردنی ئیداری ،کۆماری سۆسیالیستی یەکێتی سۆڤیەت ،مۆسکۆ ،١٩٢٨
١٢ـــ چورســـین گ.ف.،کوردەکـــانی ئازەربایجـــان (لێکۆلینـــەوەی ئـــەتنۆگرافی)،ی.ك.ی.ف.ی.،بـــەرگی ٣،تەفلیس. ١٩٢٥(رووسی)
١٣ـــ شـــەرەفخانی بەدلیـــسی ،شـــەرەفنامە ، بـەرگی٢،وەرگێـران و پێشەکی شیکردنەوە و پاشکۆ، ڤاسیلیڤیا ی.ی.،مۆسککۆ،١٩٧٦(رووسی)
١٤ـ جلـد ٢رز کتـاب شـرف نامـه، ترلیـف شرف خـان شمس الـدین بدلیسی ،کە باهتمـام اقل عبـاد ولادیمیر ملقب ولیـامینوف زرنـوف،در محروسە پگرسـبورغ دار الگبـاع اکادیمیـە ایمپراگوریـە، سـنە ١٨٦٣عیـسوی

# ئیالەتی کوردستان لە سیستەمی ئیداری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی

ئیالەتی کوردستان، یەکێ لەو ئیالەتانە بوو ، کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیان لێ پێك هاتبوو. لە باکوورەوە لەگەڵ ئیالەتی ئەرزرۆم ، لە باشوورەوە لەگەڵ موسڵ و حەڵەب ، لە رۆژهەلاتەوە لەگەڵ ئازەربایجانی غەربی و لە رۆژئاواوە لەگەڵ خەربوتدا هاوسنوور بووە. ئەم یەکە ئیدارییە،بە لەبەر چاوگرتنی تۆڕی دابەشبوونی ئیداری ئەورۆی کوردستان، بە شێوەیەکی گشتی ئەم ئوستانانە دەگرێتەوە: باتمان ،بدلیس،دیاربەکر ،سیرت ،شیرناق ،ماردین ،موش، وان و هەکاری .

شارەزایان لەو نووسینانەیاندا کە پەیوەندی بە دابەشبوونی ئیداریی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییەوە هەیە ، ناوی ئەم یەکە ئیداریان هێناوە ،کە ئیالەتی کوردستانیان پێك هێناوە . بەڵام کەسیان بە تەواوی ساڵی ناونان و سڕینەوەیان دەست نیشان نەکردووە ،بۆیە ئەم گوتارەمان نووسیەوە ، تا ئەو کێشەیە ساغ بکەینەوە .

مێژوویی دروست بوونی ئیالەتی کوردستان ، بە بۆچوونی شارەزایەك ،بۆ کۆتایی سەدەی حەڤدەیەمی زایینی دەگەڕێتەوە. لەو بارەیەوە مینۆرسکی گوتوویەتی: ئەم ئیالەتە لە کۆتایی سەدەی حەڤدەیەم لە لیواکانی دیاربەکر،موش،دەرسیم پێك هاتووە. (٢٣.ل١١٣) وەکوو لەو قسانەی مینۆرسکیدا دەردەکەوێ ، باسی پێکهاتنی ئیالەتەکەی کردووە، نەوەکوو مێژووی دامەزراندن و لەنێوبردنی. دوای ئەو نیکیتین هاتووە و لەگەڵ کەمی گۆڕیندا، قسەکانی مینۆرسکی دووبارە کردۆتەوە، دەڵێ لە کۆتایی سەدەی

مگابق سنه١٢٧٨ هجری (فارسی)(١٠)

١٥- الشرفنامه في تاريخ الدول والامارات الكرديه ،الفه باللغه الفارسيه،الامير شرف البدليسي،نقله الى اللغه العربيه و علق عليه،ملا جميل بندى رۆژبیانی ،مگبعه النجاح، بغداد،١٩٥٣(عربی)

١٦- شەرەفنامە شەرەفخانی بەدلیسی، هەژار کردوویەتی بە کوردی، نەجەفی پیرۆزز(کوردی)

ڕوونکردەوەکان

١ بە قسەی بوکشپان خێڵەکانی گرمی دۆرت (بیست و چوار) هەموویان کوردن(٥،ل٥٧)

٢ ئەو برگەیە کە لە چاپە رووسیەکەدا هەیە ، نەلە تێکستە کوردییەکە و نە لە عارەبییەکەدا بەرچاو ناکەوێ (١٥،ل١٥)

٣ مەڵبەندی قەرەباغ لە رووی تۆپۆگرافییەوە دەکرێتە دوو بەش : لای باکوری رۆژهەلاتی چیایە و بە گۆڕنی قەرەباغ (کوێستانی قەرەباغ) ناوی دەرکردووە و لای باشووری رۆژئاوای دەشتاییە، لەبەر ئەمە پێی دەڵێن دەشتایی قەرەباغ

٤) بۆ نووسینی ئەم پەرەگرافە ، سوودی زۆرم لە کتێبەکەی بوکشبان وەرگرتووە.

٥) ئەم سەرژمێرییانەم لە سەرچاوەی ژمارەی (٥،ل٧١) موە وەرگرتووە و لێکمدانەتەوە

٦)خەملاندنی نووسەرە و سەچاوەی ژمارەی (٤،ل٢٣٤،٢٣٦)

(٧) بوکشبان ، ل٦١

(٨) کاری نووسەرە

(٩) سەرچاوەکانی بە پێی ئەلف و بای رووسی ریز کراون.

(١٠) ئەم سەرچاوەیە و ئەوانەی دوایی ، بە پێی ساڵی دەرچوونی شەرەفنامە ریزکراون .





حەفدەیەمدا، لە دابەشبوونی ئیداریی جوگرافی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا، ئیالەتێك بە ناوی کوردستانەوە هەبووە و لە لیواکانی دەرسیم ،موش، دیاربەکر پێك هاتبو(١،ل٢٥و ٢٤، ل٢٧ ) قسەکانی ئەم نووسەرەش ، بە هەمان شێوە نابنە بەڵگە بۆ روونکردنەوەی کێشەکە .

دوای ئەو دوو شارەزایە چەند کەسێکی دیکەش قسەیان لە سەر ئیالەتی کوردستان کردووە و قسەکانی ئەوانیان دووپات کردۆتەوە ، لەوانەش شاکر خەسباك(١٧،ل٢٤) و بۆیس(٢٠،ل٧٧).

پلەی شارەزاییم لەو سەرچاوانەی کە پەیوەندییان بەو کێشەیەوە هەیە، ڕێگەی ئەوەم نادەن، لەو بیرایانەی سەرەوە دڵنیام. ئەگەر ئەوانەی ئەوان نووسیویانە ، لەگەل ڕاستیدا بگونجانایە، ئەوا دەبووایە ناوی ئیالەتی کوردستان لەگەل ئیالەت و لیواکانی دیکەی ئیمپرا تۆرییەتی عوسمانیدا ، لە یەکەم سەرژمێری دانیشتوانی گشتی سالی ١٨٣١ بهاتایە کە ئەمانەن : روم، ئەناتولی ، قەرمان ، ئەدەنە، ئەرزرۆم، شامی شەریف، تەرابلسی شام، سەیدا، حەلەبی شەهبا، رەقە، قارس، چلدیر، تەرابزۆن، وان، حەبەشە، قەندیە، شارەزوور، موسڵ، بەغدا، بەسرە، میسر قاهیرە، تەرابلسی غەرب ، تونس (٢٢، ل٦١٧-٦٢٨و ١٨، ل٩٢-٩٨)

بە تاوتۆکردنی بۆچوونەکانی پێشوو و خوێندنەوەی سەرچاوەکان، دەمانخەنە سەر ئەو بڕوایەی بڵێین : مەبەستی ئەو نووسەرانە لە ئیالەتی کوردستان ، زیاتر جوگرافی بووە وەك لەوەی ئیداریی بووبێ.

ناونانی یەکێ لە ئیالەتەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بە کوردستان، بە بڕوای نووسەری ئەم گوتارە، بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم دەگەڕێتەوە، واتا بۆ چەند سالێ دوای سەر ژمێرە گشتییەکەی دانیشتوان . لەم بارەیەوە ئۆبیچێنی M.A ubicni. گوتوویەتی:

ئیالەتی کوردستان لە سالی ١٨٣٤ دا بریتیبووە لە لیواکانی دەرسیم ، دیاربەکر، وان، موش ، حەکاری ، ماردین (٢٥، ل٤٥و ٢٦، ل١٨٨) ئەگەر چی نووسینەکانی ئەم نووسەرە، وەکوو سەرچاوەکان شایەدی بۆ دەدەن، لەبەر شارەزایی تەواویی لە سیستەمی ئیداریی و نزیکی لە کارمەندانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە ، جێگەی باوەرە. لەگەڵ ئەوەشدا، ناتوانین بۆ ساغکردنەوەی مێژووی سەرهەلدانی ئیالەتی کوردستان، قسەکانی وەك بەڵگەیەکی چەسپاو وەربگرین لە ڕاستیدا گومان لەوە هەیە ، کە ئەم ئیالەتە بە ڕەسمی لەو سەردەمەدا هەبووبێ، بەلگەش بۆ قسەکانی خۆم ، ساڵنامەی ڕەسمی ئیمپراتۆریەتەکەیە، ناوی ئیالەتی کوردستان لە ژمارەی دووەمەوە، واتا لە سالی ١٢٦٤کۆچی (١٨٤٧ز) و هەتاکوو سالی ١٢٨٤کۆچی (١٨٦٧ز) هاتووە. ئەمەش بە بڕوای نووسەر دەبێ‌سالی پێکهاتن و هەڵوەشاندنەوەی ئیالەتی کوردستان بێ.

ئیالەتی کوردستان لە ماوەی ژیانیدا ، لە رووی ژمارەی یەکە ئیدارییەکانییەوە ، چەندین گۆرانی بەسەر دا هاتووە. وا لە خوارەوە سالْ بە سالْ و بە درێژیی، ناوی هەموو ناحیە و قەزاکانی پێش چاو دەخەین. بۆ ئەوەی ناوەکان ئالۆز نەبێ، هەروەکوو خۆی بە ڕێنووسی خۆیان نووسیوەتەوە ...

* ئیالەتی کوردستان سالی ١٢٦٤کۆچی (١٨٤٦زایینی) تەنیا بریتیبوو لە لیواکانی دیاربەکر (٢، ل١١٩)

* ئیالەتی کوردستان سالی ١٢٦٥کۆچی (١٨٤٨زایینی) بریتبوو لە لیواکانی وان ، موش و ماردین (٣، ل٧٤)

* ئیالەتی کوردستان سالی ١٢٦٦کۆچی (١٨٤٩زاینیی) بریتبوو لە لیواکانی:

١. لواو موش : موش ، بدلیس ، خنوس مع تکمان ،

ملاكرد . ناحيه ، بولانق قولپ مع ليز ، ناحيه وارگوى علیا و . سفلا ، اخلاط ، ناحيه جونقور.

٣ لواو وان : وان ، پار کیری ، اغاطس ، ارجیش ، عادلجواز ، گواش مع نواحی مکس شروی ، خواسور ، ناحیه . وسطان

٣ لواو حكارى مع توابعه ،عماديه مع توابعه، محمودى ... دیکر خوشاب مع توابعه.

٤ لواو جزيره : جزیره عمریه بهتان ، حاجى بهرام، ماردين مع توابعه.

٥ لواو دیار بکر : امد نام دیکر دیاربکر مع نواحی گیکی و ترکمان ، قرهکچی محل، متنان، دیرك، دشتکور، بهرامکی ، صاور مدیات ، شروان غرزان، مع حصن کیف ، رچوان ، سعردی یا اسعرد بشیری ، کوردیلان، سلوان نام دیکر مفارقین قولب پادگان ، خیان گوینکلر جباقچور، منشکور ، کیخ مع یحتك. زکتی بجار، هویدان، مهرانی مع حچرو نام دیکر ترحیل لیجه مع اتاق و تلسمه هانی نام دیکر پالی معدن چسقه ، ایکور، رشنکان(٤، ل٨٣)

* ئیالەتی کوردستان ساڵی (١٢٦٧) کۆچی (١٨٥٠) زایینی بریتیبوو لە لیواکانی درسم، دیاربکر، موش، (٥، ل٧٢)

* ئیالـــەتی کوردســـــتان ســـــاڵی (١٢٦٨) کۆچـــی (١٨٥١زایینی ) بریتیبوون لە لیواکانی درسم، دیاربکر، موش(٦، ل٧٢).

* ئیالەتی کوردستان ساڵی ١٢٦٩کۆچی (١٨٥٢زایینی) بریتیبوو لە لیواکانی دەسم، سعرد، موش، (٧، ل٧٤).

* ئیالەت کوردستان ساڵی ١٢٧٠کۆچی (١٨٥٣زایینی) بریتیبوو لە لیواکانی درسم، سعرد، موش(٨، ل٨١).

* لیواو کوردستان ساڵی ١٢٧١کۆچی (١٨٥٤زایینی) بریتیبوو لە : نفس دیاربکر مع قراها شرق و غرب ، هویدان، مهرانی ، یادکان، جتانی، دوشنکور ، چپاقچور، کیسکین، بهرامکی، بشیری، هانی ترکمان ، خچور ، دیرك، لیچه، یکران و توابعی ، محل، بیجار. کنج، زکنی، مشنکون، کوتیك، ایكود، متینات ، سیلوان، قلب، بخیلك(٩، ل٨٩)

* ئیالەتی کوردستان ساڵی ١٢٧٢کۆچی (١٨٥٥زایینی) زانیاریمان لەبەر دەستدانییە.

* ئیالـــەتی کوردســـــتان ســـــاڵی ١٢٧٣کۆچـــی (١٨٥٦زایینی) بریتیبوو لە لواکانی :

١. لواو ماردين : مارين مع قوخچصار، زاخۆ، جزيره، عمریه، نصيبين، نواحی عاليات، وازناور، بوهگان، حاجی بهرام ، مدیات، صاور، سۆرکچی، عمرکان.

٢. لواوسعرد: سعرد نامدیکر اسعرد، رچوان، غرزان مع حصن کیف، شروان، قرهکچی، گۆردیلان، ناحیه دیرگۆل، ناحیه اروج، ناحیهصاسون، ناحیهاق کیسی، ناحیهخزان، ناحیه رشنگان.

٣. لواو دیاربکر: دیاربکر نام امد مع نواحی شرق و غرب و گیکی مع ترکمان ، محل ممتنان، دیرك، دشتکور، بهرامکی ، بشیری، سلوان نامدیکر مفارقین ، قولب، یادگان، خیان ، گۆینکلر، جباقچور، منشکور، کیخ، یحتك، زکتی، ناحیه هرگه بجار، ناحیه صاوس ، هویدان ، مهرانی، حچرو نام دیکر ترجیل، لیحه مع اتاق و تلسمه، هانی نام دیکر پالی معدن مع چسقه ایکور(١٠، ل١٠٥)

* ئیالـــەتی کوردســـــتان ســـــاڵی ١٢٧٤کۆچـــی (١٨٥٧زایینی) زانیاریمان لەبەر دەستدا نییە.

* ئیالـــەتی کوردســـــتان ســـــاڵی ١٢٧٥کۆچـــی (١٨٥٨زایینی) زانیاریمان لەبەر دەستدا نییە.

* ئیالەتی کوردستان ساڵی ١٢٧٦کۆچی(١٨٥٩زایینی ) زانیاریمان لەبەر دەستدا نییە .

* ئیالـــەتی کوردســـــتان ســـــاڵی ١٢٧٧کۆچـــی (١٨٦٠زایینی) زانیاریمان لەبەر دەستد نییە.

* ئیالـــەتی کوردســـــتان ســـــاڵی ١٢٧٨ کۆچـــی (١٩٦١زایینی) زانیاریمان لەبەر دەستدا نییە.



* ئیالــــەتی کوردســــــتان ســــاڵی ١٢٧٩کۆچـــــی (١٨٦٢زایینی) بریتییە لە لواکانی:

١. لواو ماردین : ماردین مع قوچحصار، زاخۆ، جزیرە، عمریە مع نواحی نصیبین مع نواحی عالیات و بقری و ازناور و عشیرت گیلی، حاجی بهرام مع نواحی صاور، سورکچی، عمراکان، خلیل بکلی ، عیسی بکلی، چلاغە ، خمسە ، بوهگان، مدیات.

٢. لواو سعردك سعرد نام دیکر اسعرد ، رچوان، غرزان مع حصن کیف، شروان، گۆردیلان، قرەکچی، ناحیە، صاسون، خزان، زیلان، بروای اسباین ، قرەکچی، ناحیە اق کیسی ، ناحیە رشگان.

٣. لواو دیاربکر: دیاربکر نام دیکر امد مع نواحی شرق و غرب ، گیکی ، ترکمان، محل، متنان، دیرك، دشتکور، بهرامکی ، بشیری مع نواحی سلوان نام دیکر مفارقین ، قولب ، پادگان، خیان ، چباقچور، منشکور، کیخ، یحتك، زکتی، بجار، هویدان، مهران، حچور نام دیکر ترحیل، ابکور، ناحیە بکتاش، لیجە مع اتاق و تلسمە. پالی معدن مع چسقە .گۆینکلر، ناحیە گاوس، ناحیە هرگە(١١، ل١٥٦)

* ئیالــــەتی کوردســــــتان ســــاڵی ١٢٨٠کۆچـــــی (١٨٦٣زایینی) بریتی بوو لە لواکانی:

١. لواو ماردین : ماردین مع قوچحصار، زاخۆ، جزیرە، عمریە مە نواحی نصیبین مع نواحی عالیات و بقری و ازنـاور و عـشیرت حـاجی بهـرام مـە نـواحی سـاور سورکچی، عمرکان، خلیل بکلی، عیسی بکلی، چلاغە، خمسە، بوهگان، مدیات.

٢. لواو سعرد: سعرد نام دیکر اسعرد ، رچوان، غرزان مع حصن کیف ، شیروان، گۆر دیلان ، دیرگۆل، اروج، صاسون، خزان، زیلان ، بروای، اسبایرن، قرەکچی، ناحیە اق کیسی ناحیە رشتگان.

٣. لواو دیاربکر: دیاربکر نام دیکر امد مع نواحی شرق و غرب گیکی ، ترکمان، محل، متنان، دیرك، دشتکور، بهرامکی، بشیری مع نواحی سلوان نام دیکر مفرقین، قولب، پادکان، خیان، چباقچور، منشکور، کیخ، یختك، زکتی، بجار، هویدان، مهرا، حچورو نام دیکر ترحیل، ابکور ، ناحیە یکتاش، لیجە مع اتاق و تلسمە ، پالی معدن مع چسقە، گۆینکلر، ناحیە گاوس، ناحیە هرگە، (١٢، ل١٨٠)

* ئیالەتی کوردستان ساڵی ١٢٨١کۆچی (١٨٦٤زایینی) زانیاریمان لەبەر دەستدا نییە.

* ئیالەتی کوردستان سالی ١٢٨٢کۆچی(١٨٦٥زایینی) بریتییە لە لواکانی :

١. لواو ماردین: ماردین مع قوچحصار، زاخۆ، جزیرە، عمریە مع نواحی نصیبین مع نواحی عالیات و بقری و ازناور و عشیرت گی ، حاجی بهرام مع نواحی صاور، سورکچی، عمر کان، خلیل بکلی، عیسیبکلی، چلاغە، خمسە، بوهگان، مدیات.

٢. لواو سعرد: سعرد نام دیکر اسعرد، رچوان ، غرزان مع حصن کیف ، شـروانگۆر دیلان، دێرگۆل، اروچ، صاسون، خزان، زیلان، بروای، اسبارین، قرەکچی، ناحیە اق کیس ، ناحیە رشنگان.

٣. لواو دیاربکر: دیاربکر نام دیکر امد مع نواحی شرق و غرب ، گیلی، ترکمان، محل، متنان، دیرك، دشتکور، بهرامکی، بشیری مع نواحی سلوان نام دیکر مفارقین ، قولب، پادگان، خیان، چباقچور، منشکور ، کیخ، یختك، زکتی، بجار ، هویدان ، مهران، حچور نام دیکر ترجیل، ابکور، ناحیە بکتاش ، لیجەمع اتاق و تلسمە، پالی معدن مع چسقە، گۆینکلر ، ناحیە گاوس، ناحیە هرگە (١٣، ل١٧٢)

* ئیالەتی کوردستان ساڵی١٢٨٣کۆچی (١٨٦٦زایینی) بریتییە لە لواکانی:

١. لواو دیاربکر : مع نواحی دیاربکر، حضور، مهرانی، سلوان، هانی، لیجە، جباقچور، منشکور، کیخ مع ناحیە طاوس ، زکنی ، بجیلك، هویدان، قلب مع ناحیەهریگە، بجار، جنان، بادکان، بهرامکی، گیلی، ترکمان، دیرك، متنان، محل، انکور هخمس ، بشر، دشتکو، سیورك.

* سواو ماردین: مع نواحی ماردین ، نصیبین، سورکچی، عمرکان ، صاور، خمیسه، جزره، حاجی بهرام. چلاغه، عیسی بکلی و خلیل بکلو نام دیکر میان قضالری

* سواوسعرد: سعرد، شروان، غرزان، گوردیلان، رجوان. خزان، اسبایرن، صاسون، دیرگولی، زیلان، روه. بروارى(١٤، ل٧٣)

* ئیالەتی کوردستان سالی ١٢٨٤کۆچی ١٨٦٠زایینی) بریتییەلە لواکانی :

لواو دیار بکر : مع نواحی دیابکر ، حضور، مهرانی، سوان. هانی، لیجه، جباقچور، منشکور، کیخ مع ناحیه عوص . زکنی، بجیلك، هویدان، قلب مع ناحیه هرگه، حزر. جنان، بادکان ، بهرامکی، گیلی، ترکمان، دیرك، متنان. محل، ایکور مع ناحیه خمس، بشر، دشتکور، سیورك.

* لواو ماردین : مع نواحی ماردین ، نصیبین، سورکچی ، عمرکان، صاور، خمیسه، جزیره، حاجی بهرام. چلاغه، عیسی بکلی و خلیل بکلو نام دیکر میان قضالری

* لواو سعرد: سعرد، شیروان، غرزان، گوردیلان، رضوان، خزان ، اسبایرن، صاسون، دیرگول، زیلان، روه. بروارى(١٥، ل١٨٢،١٨١)

* ئیالەتی کوردستان سالی ١٢٨٥ك(١٨٧٨زایینی) بەو ساوەوە نامێنێ و لە بەشە ئیدارییەکانی ئیالەتێك بە ناوی ئیالەتی دیاربکرەوە دروست دەکرێ ، کە بریتیبوو لە سنجاغی دیاربکر و مەعمورەی عەزیز و ماردین و سعرد رەئسول عەین(١٦، ل١٨٦،١٨٧).

## سەرچاوەکان


١ باسیل نیکیتین، نقله الی العربیه گائف من الکتاب ، الاکراد صلهم، تاریخهم، مواگنهم ، عقائدهم ، ادابهم ، لهجاتهم، قبائلهم، قچایاهم ، گرائف عنهم، بیروت ١٩٥٩.

٢ سالنامه سنه ١٢٦٤، گبعخانه عامره باصلمشدر.

٣ سالنامه سنه ١٢٦٥گبعخانه عامره باصلمشدر

٤ سالنامه سنه ١٢٦٦ گبعخانه عامره باصلمشدر

٥. سالنامه سنه ١٢٦٧گبعخانه عامره باصلمشدر

٦. سالنامه سنه ١٢٦٨شوێنی چاپ و ساڵی لەسەر نییە

٧. سالنامه سنه ١٢٦٩ گبعخانه عامره باصلمشدر

٨. سالنامه سنه ١٢٧٠ گبعخانه عامره باصلمشدر

٩. سالنامه سنه ١٢٧١ گبعخانه عامره باصلمشدر

١٠. سالنامه سنه ١٢٧٣ تقویم خان عامره گبع اولنمشدر

١١. سالنامه سنه ١٢٧٩شوێنی چاپ و ساڵی لەسەر نییە

١٢. سالنامه سنه ١٢٨٠ شوێنی چاپ و ساڵی لەسەر نییە

١٣. سالنامه سنه ١٢٨٢ شوێنی چاپ و ساڵی لەسەر نییە

١٤. سالنامه سنه ١٢٨٣ مگبعه عامره گبع اولنمشدر

١٥. سالنامه سنه ١٢٨٤ شوێنی چاپ و ساڵی لەسەر نییە

١٦. سالنامه سنه ١٢٨٥ شوێنی چاپ و ساڵی لەسەر نییە

١٧. شاکر خصباك ، الکرد و المساله الکردیه ، الگبعه الپانیه بیروت ١٩٨٩

١٨. عەبدوڵڵا غەفور، دابەش بوونی ئیداری کوردستان گۆڤاری رووناکبیری ژمارە ٢، ستۆکهۆلم، ١٩٩٢

١٩_ AGRARNY ISTROI OSMANKOI IMPERII XV - XVLL VV., DOKUMENTY I MATERILY SOS TAVLENII PEREVOD U KOMMENTAPII A.S. TVERITINOVOI MOSKVA 1963

THE ENCYLOPAEDIA OF ISLAM.VOL. V, LEIDEN 1981

٢٠ _ BOIS "KURDS, KURDISTAN

٢١ _CARTE: TH 3000 000 .BERLIN 1865 GENERALE DE L EMPIRE OTTMANEN EUROPE ET EN ASI

٢٢_ FAZIL AKBAL. 1831TARIHINDE OSMANLI IM PORATORLUGUNDA IDARI TAKSIMAT VE NUFUS. BELLETEN, TURK TARIH KURUMU, C.XV, EKIM 1951, SAYI 60, ANKARA, 1951

٢٣_ MINORISKY "THE KURD - KURDSTAN"THE EENCYCLOPAEDIA OF ISLAM. VOL 11, LEIDEN 1927.

٢٤_ NIKITUIN V. KURDY, PEREVOD S FRANCHUZKOVO. VSTUPITELNAIA STATIA I REDAKCHIIAI I.O. FARIZOVA, MOSKVA, 1964.

UBICINI M.A., LETRES SUR TURQULE 1, PARIS, 1853. 25 _

٢٦ – UBICHINI A. I DE. KURTEIL, SEFLNANSA, ARMIIA, OBSHINO NEMUSULMANSKIE PR. PER. S FRANCH. SPB. 1877.






# چەند سەرنجێ دەربارەی ناوە جوگرافیاکان یاداشتەکەی شەریف پاشا

ئەوەندەی من بزانم ، یاداشتنامەکەی شەریف پاشا دەربارەی داخوازییەکانە گەلی کورد، تاکو ئەورۆ دوو جار لە فەرەنسیەوە بۆ کوردی و جارریٚ بۆ عەرەبی و جاریٚ بۆ توورکی وەرگێردراوە. ئەم گوتارە بۆ هەڵسەنگاندنی دید و بۆچوونەکانی نووسەرو شێوەی نووسین و دەسپاکیی لە وەرگێران ورادەی دوور و نزیکی لە تێکستە ڕەسەنەکەوە تەرخان نەکراوە ، بەڵکوو باس لە لایەنێکی زۆر گرینگی دیکەی یاداشتنامەکە دەکا، ئەویش خۆی لە راستکردنەوەی ناوی شوێنە جوگرافیەکاندا دەنوویٚنیٚ، کە بە هەڵە تۆمار کراون، تا جارێکی دیکە بە شێوەیەکی ڕاست و زانستانە بیانووسنەوە. وەنەبیٚ ناوی هەموو ئەو جێگایانەی لە یادشتنامەکە هاتوون، هەڵە بن یا مەبەستی ئێمە بیٚ و ڕاستیان بکەینەوە، بەڵکو ئێمە تەنیا پەنجە بۆ ئەو شوێنە مێژوویيانە ڕادەکێشین ، کە لە چوارچێوەی کوردستان دان پەیوەندیان بە (سنووری نەتەوەیی کورد) ەوە هەیە.

ئەگەر سەرنجێکی ورد لە دەکۆمێنتەکە بدەین وەکوو لە نەخشەکە هەیە و وەك بنچینەیەك لێی بکۆلینەوە، ئەوا بیٚ یەك و دوو لێکردن ، دەتوانین بڕیار بدەین و بلێین : کە نامەکە بە خەتێکی شڕ نووسراوە، لەوانەیە ئەوە بووبێتە هۆی ئەوەی بەو شێوەیە هەندیٚ ناوی جوگرافی خوێنرابێتەوە و نوو سرابێتەوە و هەڵەی تێدا کرابیٚ، یا هەر نەیانتانیبیٚبە تەواوی بیخویننەوە . دوور نییە ئەمە کاری کردبێتە سەر ئەو کەسانەی چاپیان کردووە ، تا بە بیرو بۆ چوونی خۆیان ناوەکانیان بردبیتە سەر یەك و چاپیان کردبیٚ. لە ئەنجامدا ئەو بێسەر و بەرییە دروست بووە و هەڵە لە ناوی شوێنە جوگرافیەکاندا کراوە و هەروا بە ئاسانیی ناواندریٚ ئەو شوێنانە دەکەونە کوێوە. ئەوەی زیاتر بارەکەی ئاڵۆز کردووە ، ئەوەیە هەندیٚ لە ناوەکان لە لایەن کار بەدەستانی تورکیاوە گۆڕاوە .

یاداشتەکە بە پێیٚ ساڵی بڵاوکردنەوەی بە کوردی ئەم شێوەیە یە : بۆ جاری یەکەم لە عەرەبییەوە وەرگێردراوە و وەکوو پاشکۆیەك لە پەرتووکی کێشەی کورددا بڵاو کراوەتەوە . بۆ جاری دووەم لە فەرەنسیەوە کراوە بە کوردیی و لە گۆڤاری ڕابووندا بڵاوکراوەتەوە، پاشان جارێکی دیکە لە فەرەنسییەوە کراوەتە بە کوردی و لە مامۆستای کورددا بڵاوکراوەتەوە

سنووری کوردستانی نەتەوەیی بە ١٧ شارو گوند دا تێپەر دەکات ، ناوەکانیان وەکوو لە تێکستە وەرگێراوەکەدا هاتوون بەم شێوەن : ziven , ئەرزەرۆم ، ئەرزنجان kemahئەرەبگیر ,Haran, divick behisimi ، سنجار ، تەلەعفەر ، ئەربیل ، کەرکوك ، سلێمانی ، AKK-el-man ، سنە ، باشقەلاٌ، kale - vizir وەکوو دەردەکەویٚ ، هەندیٚ لە ناوەکان بە پیتی عەرەبی نەنووسراوون ، بەڵکوو تەنیا کۆپیە کراون ، واتە وەرگێراوەکان لەوە دڵنیا نەبوون و بۆیان نەکراوە بە کوردیی ، بۆیە هەر وەکوو خۆیان هێشتوویاننەوەتەوە . وا لە خوارەوە ڕاستیەکانیان پیشان دەدەین

## زیڤن (ziven)

ئەم شوێنە جوگرافییە ، لە هەر سیٚ وەرگێراوە و ڕاستە بەلاٌم تورکەکان بە زیڤین (ziven) دەینوسین. هەروەها ناوەکەیان گۆڕیوە و کردوویانە بە سونگوتاشی (sungutasi) ئەمەش ئێستا گوندێکە سەر بە ناحیەی قەرەئۆرغانی (karaugan) قەزای ساری قامیشی (sarikamis) ئوستانی قارسە .



## کماخ (Kemah)

ئەم شوێنە جوگرافییە ، لە پەرتووکی کێشەی کورددا بیتی h ) پەریوە و نووسراوە ( Kama) و لە ڕابووواندا بە لاتینی وەکوو خۆی نووسراوەتەوە ، بەلام لە مامۆستای کورددا بە (کێماخ) نووسراوە . ناوەکە ڕاستە بەلام لە نووسینەکانمدا (کەماخ)م نووسیوە .ئەوەش یەکێکە لە قەزاکانی ئوستانی ئەرزنجان .

## Behismi

ئەم شوێنە جوگرافییە لە پەرتووکی کێشەی کورددا بە ( بهیسمی) و لە ڕابوون و مامۆستای کورددا بە behism) نووسراوە ، هەرسێکیان ڕاستییان نەپێکاوە و پیتی (ش- s ) بە ( س - s ) و (ت - t ) یان بە م - m ) خوێندۆتەوە .: ڕاستیەکەی (بێهەشتی - behist) یە. تورکەکانیش کردوویانە بە (besni)

## بیڤیجیک (divick)

ئەم شوێنە جوگرافییە لە پەرتووکی کێشەی کورددا ، بیفیک) و لە ڕابوون و مامۆستای کورددا بە (divick) نووسراوە . هەرسێکیان ڕاست نین ، بەڵکوو ڕاستییەکەی بیرەجیکە (biredjik) و تورکەکان ئەورۆ دەنووسن (birecik) و کوردیش ئەورۆ دەنووسێ berecuk) ئەمەش قەزایەکی سەر بە ئورفایە.

## حەران (Haran)

ئەم شوێنە جوگرافییە ، لە پەرتووکی کێشەی کورددا بە هەران) و لە ڕابووندا بە (Haran) و لە مامۆستای کورددا بە (حەران ) نووسراوە . ڕاستییەکەی حەرانە)ە. بەلام تورکەکان پێش ساڵی ١٩٩٠ گۆڕییویان و کردبوویانە بە ئالتین بەشاك (altinbasak) ئەمەش یەکێکە لە قەزاکانی سەر بە ئوستانی ئورفان و بە Harran) نووسراوە .

## تەل ئەسفەر

ئەم شوێنە جوگرافییە لە پەرتووکی کێشەی کورد و ڕابووندا بە (تەلەعفەر) نووسراوە و لە مامۆستای کورددا بە (تەل ئەسغەر) تۆمار کراوە ، بەلام هەر (تەلەعفەر) ڕاستە و ئەوەی دواییان زیاتر لە هەڵەی چاپ دەچێ.

## AKK-el-Man

ئەم شوێنە جوگرافییە لە پەرتووکی کێشەی کورددا بە ( ئاکلمان ) و لە ڕابوون و مامۆستای کورددا بە (-AKK el-Man) نووسراوە. بە داخەوە ، دوای هەوڵوتەقەلایەکی زۆر ، بۆم ساغ نەکرایەوە ، چونکە لەو نەخشە و پەرتووکانەی تەماشام کردوون ، لە هیچ کامێکیاندا ناوی لەو چەشنە ، یا نزیك لەو ناوەوە نییە. بەلام هەر چۆنی بێ ، ناوەکە لە نێوان سلێمانی و سنە دایە .

## Kale - vizir

ئەم شوێنە جوگرافییە لە پەرتووکی کێشەی کورددا بە (فیزکالی) و لە ڕابووندا ( وەزیر قەلا) و لە مامۆستای کورددا (kale - vizir) نووسراوە. ئەم ناوەش وەکوو ئەوەی پێشوو، دوای پشکنینێکی زۆریش ، بە داخەوە بۆم ساغ نەبۆوە هەرچی چۆنێ بێ، دەکەوێتە باکووری قەزای باشقەلای ئوستانی وانەوە.

### پەراوێز

دەقی کوردییەکەی پەرتووکی کێشەی کورد:

بە پێی باری سەرنجی ئەنتۆگرافیك - زانستی تایبەتی گەلان - سنووری کوردستانی عوسمانلی .لە باکوورەوە لای - زیڤان ziven- ەوە بە تەرتیبی سنووری قەفقاس ، دەست پێ دەکات و ڕووەو خۆرئاوا ئەبێتەوە بۆ ئەرزەرۆم - ئەرزنجان - و کیما Kama - و ئنرابکیر - و بهمسی - و دیفیك - لە باشووریشەوە بە - هەران - و زورگەکانی - شەنگار - و تەلەعفەر - و - هەولێر - و کەرکوك - سلێمانی - ئاکلمان - و سنە دەست پێ ئەکات لە خۆرهەلاتیشەوە بە - ڕەواندووز - و- باشکالی - و - فیز بیرکالی - دەست پێ دەکات . سنووری ئێران - یش تا





تروپکەکانی ئارارات – ٥.

کـــە وشـــەنەکانی کوردســـــتانی تورکیـــا ، لـــە ڕووی ئەتنۆگرافییەوە ، بەم شێوە دەست پێدەکەن : لە باکوور دا شاری ziven ، وێراوێرای سەر سنووری وولاتی قەوقاز، کە درێژ دەبێتەوە بەرەو رۆژئاوا ، تا دەگاتە ئەرزەرۆم.ئەرزنجان – Kemah ئـەرەبگیر behsimi ، divick لـە باشـوورد Haran ، تەپۆلکەکانی سنجار (ژەنگار) ، تەلەعفەر. ئەربیل ، کـەرکوك ، سـلێمانی el-Man - AKK، سـنـە، لـە رۆژهەلاتیشدا بە

دەقی کوردییەکەی گۆڤاری مامۆستای کورد:

( سنوورەکانی کوردستانی تورکیا لـە باری نەتەوایـەوە لـە شیمالەوە لە ziven لە سنووری قەفقازەوە دەست پێ دەکات و لـە رۆژئـاواوە دەکێـشێ بـەرەو ئـەرزەرۆم، ئـەرزنجان ، کێمـاخ عـەرەبگیر behismi, divick ، لـە جنووبـەوە دەکێشێ بەرەو حەران ، بەرزایی کانی سنجار ، تـەل ئەسغەر ، هـەولێر ، کەکوك ، سولەیمانی ، AKK - el-Man سنە ، لە رۆژهەلاتەوە ، دەکێشێ بەرەو رەوانوز ، باشقەلاً، kale-vizir ، واتە سنووری ئێران هەتا چیای ئارارات .

سەرچاوەکان

- بلـەچ شێرکۆ ، کێشەی کورد مێژینـەی و ئێستای کـورد ، محەمەد حەمە باقی لە عەرەبییـەوە کردوویـەتی بە کوردی ، چاپی دووەم ، ١٩٩٠ ، ل١١٨

٤. S81 koy envanter etudu 1981.kars

و نەخشەیەکی ئیمپراتۆرییەتی سەردەمی عوسمانی سەدەی نۆزدەیەم ناونیشان و ساڵی چاپی لەسەر نییە.

– یاداشـتنامە لـە بـارەی داخوازییـەکانی گـەلی کـورد ، وەرگێرانـی لـە فەرەنـسییەوە ، فـەرهاد پیربـال ، رابـوون ، هاوینی ١٩٩١، ژمارە ٢ ، ل٦٤.

- داخوازییەکانی کورد ، چاوپێکەوتنێکە لەگەڵ (جەنـەڕال شـەریف پاشا) ی نوێنـەری کـورد لـە کـۆنگرەی ئاشـتیدا ، محەمەدی موهتەدی کردوویە بە کوردی .

. مامۆستای کورد، بەهاری ١٩٩٦، ژمارە ٢٩، ل٧٧.

# چەند سەرنجێك لەسەر کتێبی (کورد و مەسەلەی کورد) ی شاکر خەسباك

نووسـەری کتێبـی کوردو مەسـەلەی کـورد دکتـۆر شـاکر خەسباك لە نـاو گیۆکرافەکانی (شارەزایانی جوگرافیا) یکوردسـتان و عێـراق ، گـەلێ ناسـراو و بەناوبانگـە. ئـەوەش تـەنیا لەبـەر ئـەو نییـە ، مامۆسـتای زۆربـەمان بـووە، سەرپەرشـتکاری نامـەی ماجـستێر و دکتـۆرای هێندێکی دیکەمانی کردووە ، بەڵکو هەر ئەوهاش لەبەر کارە زانستییەکانی لە بواری جوگرافیا بە گشتی و هی باشووری کوردستان بە تایبەتی بووە.

خەسـباك، لـە مـاوەی بیـست سـاڵی رابـردوودا (١٩٧٢.١٩٥٢) ئەم بەرهەمانەی بە چاپ گەیاندوون:

* الكرد والمسالة الكردية (کورد و مەسەلەی کورد)( ٧و ٨)

* الاكـراد دراسـة جغرافيـة اثنوغرافيـة (کوردەکـان لێکۆڵینەوەیەکی جوگرافی ئەتنۆگرافی)(٩)

* العراق الشمالي دراسة لنواحية الطبيعية و والبشرية (عێراقـی بـاکوور لێکۆڵینـەوەی لایـەنی سروشـتی مرۆیی)(١٠)

سەرەرای ئەوانەش، چەند وتاری بە نرخی ، لە گۆڤارە تایبەتیەکانی کوردستان و عێراقدا، لەسەر هەمان بابەت بلأوکردۆتەوە.

بەرهەمـەکانی خەسـباك نـەك هـەر زانـستانەی تایبـەتی خۆیان لەگەل تێپەربوونی ساڵدا، لە دەست نەداوە بەڵکە رۆژ لە دوای رۆژیش، بە بایەخدارترو گرنگتر دەبن. هەر لەبـەر ئەوەشـبوو، ئەمجـەد شـاکەلی (کـورد و مەسـەلەی کـورد ) ی بـە زمـانێکی رەوان و پوختـەی کـردووە بـە کوردی بەم کارەی فەرهەنگی جوگرافیای بۆ دەوڵەمەن کـردین. بنکـەی چـاپەمەنی رۆژیـش لـە سـوید، بلاوکردنـەوەی چـاپە کوردییەکـەی لـە ئەسـتۆی خـۆی گرتووە.

کتێبی کورد و مەسەلەی کورد، گەلێ زانیاری بە نرخی تێدایە. بەڵام لێرەدا، بە پێویستی نازانم ئاماژەیان بۆ بکەم. ئەگەر کەسێ ویستی لە قسەکەم دڵنیا بێ، ئەوا خۆی بە خوێندنەوەی کتێبەکە ئەم راستییەی بۆ دەردەکەوێ، بەڵام هەر بۆ نموونە بۆچوونی خەسباك، بەرانبەر بەزاراوەی کوردستان دێنمەوە کە دەنووسێ (والواقع ان كوردستان الحقيقة هي مصطلح جغرافي وعرقي في ان واحد)(٨، ل٢٤). واتا(لە هەلکەوتدا کوردستانی راستەقینە زاراوەیەکی هەم جوغرافی و هەمیش رەگەزییە)(١١ل١٩). ئایا کێ لەو باشتری بۆچووە؟!!. لەگەڵ ئەوەشدا هێندێ لە بۆچوونەکانی خەسباك بەتایبەتی شێوەی پێوەندیی کوردستان عێراق، کورد عارەب، پێوەندی کۆمەلایەتییان و هێندی شتی دیکەش دەکرێ بە شێوەیەکی دیکە شیبکرێنەوە، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە جێگەی داخە هێندێ هەڵەی چاپی گەورە لە کتێبەکەدا هەیە، بەشێکی زۆر لە ئامارەکان بە ناتەواویی نووسراوەتەوە"چەندین ناو لە بەرهەمەکەدا تێکەلاو کراوە، کە بە تێکرایی بۆتە هۆی لەکەدار کردنی بۆ وەلانانیان ئەم سەرنجانەی خوارەوە نووسیوە:

١ نووسەر دەنووسێ (ومن المؤسف ان المكتبة العربية عاجزة عن تقديم المعلومات الواضحة عن الكرد لاخوانهم العرب وهم شركاء في هذا الوطن منذ الاف السنين. شركاء في هذة الدولة منذ نشوئها قبل اربعين عاما) (٨ل٥). واتا (جێگەی داخیشە کتێبخانەی عەرەبی توانستی پێشکەشکردنی زانیاری روون و تەواوی لە بارەی کوردەوە بەبرا عەرەبەکانیان نییە، لە کاتێکدا کە هەزاران ساڵە لەم نیشتیمانە دا و لەم دەولەتەیشدا کە پێش چل ساڵان دامەزراوە هاوبەشن)(١١ل٥)

گومان لە پێکەوە نووسانی خاکی کوردستان و عێراق، لە بڕبڕەی پشتی کێوە سوور (چیای حەمرین) نییە، بەڵام کورد هەرگیز بە خواستی خۆی، هاوبەشی عارەبی لەم نیشتیمانە (عێراقی ئەورۆ) و لەم دەولەتەدا (عێراقی سەردەم ) نەبووە، بەڵکو هەردەم بە چاوی براینە تەماشای نەکراوە، لەبەر ئەوەی داخوازییەکانی پێشێلکراوە، ناچار بووە لە ساڵەکانی بیستەوە تا ئەورۆ، پەنا بۆ خەباتی چەکداریی ببات.

٢) نووسەر دەنووسێ (فقد فصل السلطان سنجار القسم العربي من اقليم الجبال و وضعة تحت حكم قريبة سليمان شاة) (٨ل٢٣).واتا (سوڵتان سنجاری بەشە عەرەبییەکەی هەرێمی چیاکانی جوێ کردەوە و خستییە ژێر دەسەلاتی سولەیمان شای خزمی خۆیەوە)(١١ل١٨). بە تەماشا کردنەوەی سەرچاوە ئاماژە پێکراوەکە، دەردەکەوێت ، دەقی نووسینەکە بەم جۆرەیە (فقد فصل السلطان سنجار القسم الغربي من اقليم الجبال و وضعة تحت حكم قريبة سليمان شاة)(١٧ل١٥٢). واتا ( سولتان سنجار بەشە رۆژئاواییەکەی هەرێمی چیاکانی جوێ کردەوە و خستییە ژێر دەسەلاتی سولەیمانی شای خزمی خۆیەوە).

٣) نووسەر دەنووسێ (ولقد استعمل المورخون العرب فيما بعد هذا المسطلح ﴿ كوردستان_ ع _ غ﴾ الجغرافي )(٧ل١٠). واتا(مێژوو نووسانی عەرەب دواتر ئەم زاراوەیە جوگرافیانییەیان بەکار هێناوە )(١١ل١٨)، بەلأم لە چاپی دووەمدا ، ئەم هەڵەیەی چاکردۆتەوە، لە جیاتی ئەوە نووسیوێتی (المؤرخون المسلمون)(٨ل٢٣) واتا (مێژوو نووسە ئیسلامیەکان). لێرە دا مەبەستی لە مستەوفی قەزوینی فارسە. نازانم بۆ دەبێ ئاین بۆ ئەو نووسەرانە عارەب نین، بکرێتە ناسنامەی نەتەوەییان؟!!.

٤) نووسەر دەنووسێ( وكان اول ظهورة ﴿مسطلح كوردستان ع – غ ﴾ في كتاب (نزهة القلوب ) لمولفة المستوفي القزويني الذى كتب عام ٧٤٠ ه (٨ل٢٣). واتا (یەکەم جاریش لە کتێبی نوزهەتو لقولووب (نزهة القلوب ) دا کە ئەلمستەوفی ئەلقەزوینی (المستوفي القزويني ) لە ساڵی (٧٤٠) ی کۆچیدا نووسیویەتی )(١١ل١٨). ئەم بۆچوونە، گەرچی لەناو سەرچاوەی



مێژووییەکاندا بڵاوە ، بەڵام ڕاست نییە، یەکەم کەس زاراوەی کوردستانی بەکارهێناوە و چل ساڵ پێش قەزوینی ، مارکیۆلۆ(ساڵی ١٢٥٤ - ١٣٢٤ز) گەشتەوەری ئیتالیایی بووە (٢ل ...٥"ل٥٤"١٢ل١٥)

٥) نووسەر دەنووسێ (وقد حدد كتاب (الشرفنامة) لمولفة الامير شرف خان البدليسي (والذي كتب عام ١٥٨٦، على عهد السلطان محمد خان العثماني )(٨ل٢٣). واتا (کتێبی شەرەفنامە کە میر شەرەفخانی بدلیسی لە ساڵی ١٥٨٦دا لە سەردەمی سوڵتان محەمەد خانی عوسمانی نووسیویەتی )(١١ل٢٨) لە ڕاستیدا، شەرەفنامە لە ساڵی ١٥٩٦دا نووسراوە.

٦) نووسەر دەنووسێ(ممتد في خط مستقيم حتى ولاية ملاطية ( وهي مدينة في ولاية خربوط في كوردستان التركي ) ونريش (مدينة من الشمال الحلب)(٨ل٢٣). واتا(بە شێوەی هێڵێکی ڕاست دەکێشێ تا ویلایەتی مەلاتیە شارێکە لە ویلایەتی خەربووت لە کوردستانی تورکیا ) نەریش (شارێکە لە باکوری حەلەب)(١١ل١٨). ڕاستییەکەی (مەرعەش)ە

٧ )نووسەر دەنووسێ(وقد عين كتاب كثيرون حدودها ولعل اوضح تحديد هو ذلك الذي ذكرة اموندن)(٨ل٢٤). واتا (زۆر نووسەریش سنوورەکەیان دیاری کردووە و لە هەمووشیان ڕوونتر دیاریکردنەکەی ئەدمۆندزە)(١١ل١٩)لە ڕاستییدا، ئەدمۆندز سنووری نەتەوەیی کوردی دەستنیشان کردووە ، نەوەك سنووری کوردستان. ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە، خەسباك بۆ خۆی ڕەخنەی لە ئەدمۆندز گرتووە و دەنووسێ(فان حدود كوردستان تتمد حتى الخليج العربي على امتداد جبال زاكروس)(٨ل٢٥). واتا (ئەوا سنووری کوردستان بە درێژایی چیاکانی زاگرۆسدا تا کەنداوی عارەبی دەڕوا)(١١ل١٩)

٨) نووسەر دەنووسێ(تتبع الحدود من الشمال الخط من اريظان وارضروم واذربيجان) (٨ل٢٤). واتا (سنوورەکانی لە باکوورەوە بەو هێڵەدا دەڕۆن کە لە ئەریڤان و ئەرزرووم و تا ئازەربایجان درێژەی هەیە)(١١ل١٩) بە تەماشا کردنەوەی سەرچاوە ئاماژە پێکراوە کە بە دیار دەکەوێت. ئازەربایجان نییەو ئەرزەنجانە(٦ل٢)

٩) نووسەر دەنووسێ(پم تتمد في قوس خلال ماراش مارس) نحو حلب)(٨ل٢٤).واتا(پاشان وەك کەوانەیەکی بەنێو ماراش (یاماراس) دا بەرەو حەلەب دەڕوات )(١١ل١٩). ڕاستییەکەی بەنێو مەرعەش (یامەرەش) دا دەڕوات .

١٠) نووسەر دەنووسێ(وجزو من كوي و ريزائييه (اروميه ومهاباد سابلاخ) و تعز وسنه الى كرمانشاه)(٨ل٢٥).واتا(وبەشێکی لە کوی و ڕەزائییە (ورمێ) و مەهاباد (سابلاخ و تەعز و سنە دەگاتە کرمانشان)(١١ل١٩) ڕاستییەکەی (وبەشێکی لە خۆی و ڕەزائییە (ورمێ) و مهاباد(سابلاخ) سەقز و سنە تا دەگاتە کرمانشان.(وەرگێڕی کوردیی ئەم دوو هەڵەیە ڕاستکردۆتەوە).

١١) نووسەر دەنووسێ (عدد الاكراد ومناطقهم الحالية) (٨ ل٢٥). واتا(ژمارەی کورد و ناوچەکانی ئێستایان )(١١ل ٢٠) و پێنج خەملاندنی (دوو دەزگا و سێ کەس) بۆ نموونە دێنێتەوە . بە کۆکردنەوەی ژمارەکان دەردەکەوێت ، کە هێندە هەڵە لە نووسینەوەی خەملاننەکاندا ڕوویداوە. بۆ نموونە هی نیکیتین. نووسەر دەنووسێ(المجموع الكلي ٥٣٨٧٨٠)(١١ل٢٦). واتا (سەرجەمی گشتی ٥٣٨٧٨٠ ) یە (١١ل٢١) بەڵام کاتێ ژمارەکانی دەژمێردری سەرجەمی گشتی دەکاتە (٥٣٥٣٤٩٠)، واتا جیاوازی لە نێوانیان (٣٣٨٠٠) کەسە ئەمە لەلایەکەوە . لەلایەکی دیکەشەوە. هەڵە کەوتۆتە ژمارەی ئەرمەنستان لە چاپی یەکەمدا نووسراوە(٦٠٠٠٠) و لە چاپی دووەمدا نووسراوە(٢٨٠٠٠) هەزار (٧ل..."٨ل٢٧)(١١ل٢١) بە تەماشاکردنەوەی سەرچاوە ئاماژە پێکراوەکە دەردەکەوێ، ژمارەکانی بەم جۆرەن : تورکیا (٢٩٨٦٩٦٠)، سوریا(٢٩٨٩٤٠)، عێراق(٧٩٤٩٤٠)، ئێران(١٣٠٠٠٠٠)، ئەرمەنستان(٦٠٠٠٠) و سەرجەمی

گشتی ٥٣٨٦٢٨٠) (١٥ل٨٦).

١٢) نووسەر دەنووسێ (ويتوزع عدد لاباس بة من الاكراد خارج حدود كوردستان كما ذكرنا اعلاة .الى خارج حدود تركيا وايران و العراق، وخاصة في سوريا ) (٨ ل٢٨).واتا (ژمارەیەکی زۆری کوردیش لە دەرەوەی سنووری کوردستانن. واتە لە دەرەوەی سنووری (تورکیا و ئێران و عێراق ــ بە تایبەتی لە سووریا) (١١ل٢٢).ئەوەی جێگەی داخە گیۆگرافیکی گەورەی وەکوو خەسباک ، نکۆلی لە کوردستانی بوونی خاکی ژێر دەسەلاتی سووریا دەکات .

١٣) نووسەر دەنووسێ (اما اللر فيحتلون مقاطعة كردستان )(٨ل٢٩.واتا(لوڕیش دانیشتوی هەرێمی خوزستانن)(١١ل٢٣).لێرەدا نووسەر لوڕی لە کوردەکانی دیکەی جیاکردۆتەوە.ئەوەش لەگەڵ قسەکانی (فاذا عتبرنا الاكراد ، كما تبرهن على ذالك كثير من الدلائل لتاريخية و الغوية)(٨ ل٢٥واتا ئەگەر لوڕ بە کورد بژمێرین ــ وەك چۆن گەلێك بەڵگەی مێژوویی و زمانەوانی ئەوە دەسەلمێنێ) (١١ل١٩) یەك ناکرێتەوە.

١٤) نووسەر دەنووسێ (وكذلك الحال في لواء اربيل ماعدا عشيرة طي العربية ناحية كريت و اسر تركمانية في اربيل (٨ ل٢٩) .ئەم چەمکە لە چاپی یەکەمدا بەم جۆرەیە (وكذلك حال لواء ، اربيل ماعدا اقلية تركية)(٧ل٢٠).واتا (وە پارێزگەی هەولێریش هەر وایە بە تەنێ ئەوە نەبێ ، کە کەمینەیەکی تورکی لێیە )(١١ل٢٣). خۆزیا خەسباك هەزاران کورد کەلە عێراقدا حزین ، وەك ئەو خێلە عەرەبییە، لەبیر نەدەکرد، ئەمە لەلایەکەوە .لەلایەکی دیکەوە ، یەکە ئیدارییەکە (کرێت) نییە، بەڵکو(گوێڕ)ە

١٥) نووسەر دەنووسێ (وفى كاجيسمان حوالى قارص وفى زنجور وفى جفانهير)(٨ل٢٩) .واتا (وەکاجیسمان لە دەوروبەری قارس و زەنجەسوور و جفانهیر)(١١ل٢٣) راستییەکەی و کاغیزمان لە دەوروبەری قارس و زەنگەنە ژورو گانهیر(؟)

١٦) نووسەر دەنووسێ (بعد ان قهر شاه ايران عام ١٥١٦)(٨ ل٣٢) واتا (دوای ئەوەی لە ساڵی ١٥١٦دا شای ئێران بەزاند (١١ل٢٦). راستییەکەی لە ٢٤ ئابی ١٥١٤) (لەسەرچاوەیەکی دیکەی (٢ی رەجەبی ٩٢٠کۆچی)مانگی بەرامبەر (٢٢ی ئابی ساڵی ١٥١٤ زایینی ) بووە.

١٧) نووسەر دەنووسێ (واحمد باشا الرواندوزى عام ١٨٤٠)واتا((ئەحمەد پاشای رواندوزیش ساڵی ١٨٤٠بووە)(١١ل٢٩) راستییەکەی محەمەدی پاشای (پاشای کوێرە) رواندوزە.

١٨) نووسەر دەنووسێ (وظهرت بضع صحف ومجلات كوردية اشهرها جريدة كورد تانانف طازيتس (جريدة التضامن والتقديم الكوردى)(٨ل٣٩). واتا(چەن رۆژنامەو گۆڤارێکی کوردیش دەرکەوتن کە گرینکتریان رۆژنامەی کورت تانانف و ترقی گازیتس (رۆژنامەی هاریکاری و پێشکەوتنی کورد بوو)(١١ل٣٢). راستییەکەی رۆژنامەی (کرد تعاون وترقی غزتەسی) بوو

١٩) نووسەر دەنووسێ (وقد اجبر سمكو فى النهايه على عبور الحدود العراقيه وتسليم نفسه الى السلكات الانكليزيه التى سلمته بدورها الى الحكومه الايرانيه )(٨ل٤٥).واتا (لە پاشاندا سمکۆ ناچار کرا لە سنووری عێراق بپەڕێتەوە و خۆ بدا بەدەست دەسەلاتداریەتی ئینگلیزیەوە و ئەمانیش دایانە دەست ئێران )(١١ل٣٨)، لە ڕاستییدا سمکۆ بەپلانی ئێرانی لە رێگای شنۆ شەهید کرا .

٢٠) نووسەر دەنووسێ (جدول يبين نسب السكان فى الالويه الكورديه (٨ ل٥١). واتا(خشتەی رێژەی دانیشتوان لە پارێزگە کوردییەکاند)(١١ل٤٣). بە تەماشاکردنەوەی سەرچاوە ئاماژە پێکراوەکە ، دەردەکەوێت ، رێژەکان بەم جۆرەن: موسڵ(٣٥٪ لەسەرجەمی گشتی دانیشتوانی)، هەولێر ٩١٪). کەرکوك (٥٢٪سلێمانی (١٠٠٪)(١٦ل٢٥) بۆ ئاگاداری وەرگێری کوردیی رێژەی کەرکوکی بە هەڵە نووسیتوە و کردوویەتە ٢ر٥٥٪(١١ل٤٣).





٢١) نووسەر دەنووسێ (الموصل المسافة بالكيلومترات المربعة ـ ٢٩٧٧٠، الاراضي الزروعة باكيلومترات المربعة . ٢٩٠٥٨، نسبة الاراضي المزروعة الى المساحة العامة ٥٣٪)(٨ل٥٢ ـ ٥٣)، واتا (مووسڵ، پانتایی گشتیی زەوی کشتوکاڵی بە کم٢ ـ ٢٩٩٧٧٠، زەویی چێندراوە بە کم٢ ٢٩، ٥٨، ڕێژەی زەوی چێندراو لەگەڵ پانایی گشتیدا ـ ٥٣٪ (١١ل٤٥). ژمارەکان یاخود ڕێژەکە تەواو نییە ـ لە سەرچاوە ئامارژە کراوەکەشدا بەشێوەیەکی وانووسراوە ، ساغ نابێتەوە(١ل٣) وەرگێری کوردیی ، ئامارژەی بەو ناتەواوییە کردووە.

٢٢) نووسەر دەنووسێ(جدول يبين انتاج الالوية الكوردية للقمح والشعير لعام ١٩٥٤)(٨ل٥٣). واتا(خشتەی بەرهەمی گەنم و جۆی پارێزگە کوردییەکان لە ساڵی (١٩٥٤)(١١ل٤٦). بە تەماشای کردنەوەی سەرچاوە ئامارژە پێکراوەکە، دەردەکەوێت. بەرهەمەکە هی ساڵی (١٩٥٢ ـ ١٩٥٣) بووە (وەرگێڕی کوردیی ، هەستی بەو هەڵەیە کردووە.

٢٣) نووسەر دەنوسێ(مجموع الانتاج الكلي للعراق ـ ٤٧٩٠٠٠٠ گن )(٨ ل٥٤). واتا(سەرجەمی گشتی بەرهەمی عێراق ٤٧٩٠٠٠٠ تۆنە)(١١ل٤٦). بە تەماشاکردنەوەی سەرچاوە ئامارژە پێکراوەکە ، دەردەکەوێت بەرهەمەکە(٧٦٢٠٠٠) تەن و ژمارەی نووسراوە، پانتایی زەوی چێندراوە بە دۆنم(٣ل٧٢).

٢٤) نووسەر دەنووسێ (جدول يبين توزيع المحاصيل الصيفية في المنطقة الكردية لعام ١٩٥٣) ( ٨ ل٥٤)، واتا (خشتەی بەشینەوەی شینایی هاوینە لە ناوچە کوردییەکەدا لە ساڵی١٩٥٣)(١١ل٤٧) بەم ناونیشانەدا، دیارنییە، مەبەست لە بەرهەمە یا پانتایی .بەڵام پێدەچێ مەبەست لە پانتایی بێت ، چونکە لە ژێر تووتن و لۆکە و برنج دۆنم نووسراوە.

وەرگێڕی کوردیی دۆنمەکەی بۆ تەن گۆڕیوە ، هەڵبەتە ئەمە ڕاست نییە"

٢٥) نووسەر دەنووسێ (جدول يبين الملكية الزراعية في الالوية الكوردية )(٨ ل٥٧).واتا(خشتەیەکی ڕەوشی موڵکداریەتی کشتوکاڵی لە پارێزگە کوردییەکاندا پیشان دەدات )(١١ل٥١). بە تەماشاکردنەوەی سەرچاوە ئامارژە پێکراوەکە ، دەردەکەوێت کە ژمارەکانی هی ساڵی ١٩٥٢ـ ١٩٥٣(٣ل٦٥). وەرگێڕی کوردیی تارادەیەك هەستی بە ناتەواوی ساڵەکە کردووە .

٢٦) نووسەر دەنووسێ(الموصل مساحة الاراضي المملوكة بالكيلومترات الربعة(١٠٦٦)(٨ل٥٧).واتا (مووسڵ پانایی زەوی موڵکی بە کم (١٠٦٦)(١١ ل٥١) بە تەماشاکردنەوەی سەرچاوە ئامارژە پێکراوەکە بە دەردەکەوێت بەم جۆرەیە(مووسڵ. پانایی زەوی بە کم٢ . ١٠٦٦)(٣ل٦٥).

٢٧) نووسەر دەنووسێ (المجموع الكلي للعراق )(٨ل٦٢).واتا(سەرجەمی گشتی عێراق). وەرگێڕی کوردیی نووسیوێتی (سەرجەمی گشتی بەرهەمی عێراق (١١ل٥٧).هەڵبەتە ئەوە ڕاست نییە!

٢٨) نووسەر دەنووسێ(و ٨ بلديات في لواو كركوك لسكان قدرهم ٣٠٧٠٢١نسمه) (٨ ل٦٨). واتا(وە پارێزگای کەرکوك کە دانیشتوانی ٣٠٧٠٢١ کەسە ٨ شارەوانی تێدایە )(١١ل٦٢). بە تەماشاکردنەوەی سەرچاوە ئامارژە پێکراوەکە، بە دەردەکەوێت ، کە ژمارەی دانیشتوانی کەرکووك ٢٨٦٠٢١کەسە (٣ل٤).

٢٩) نووسەر دەنووسێ(جدول يبين معدل الولادات والوفيات في الالوية الكوردية لعام ١٩٥٣) (٨ل٦٨). واتا(خشتەی تێکرایی لە دایکبوون و مردن لە پارێزگە کوردییەکاندا لە ساڵی ١٩٥٣)(١١ل٦٣). بە تەماشاکردنەوەی سەرچاوە ئامارژە پێکراوەکە ، بە دەردەکەوێت، کە چوار هەڵە لەم خشتەیەدا هەیە :

الف. ناوی ڕەسەنی خشتەکە بەم جۆرەیە (الولادات والوفيات المجلسة في العراق والنسبة المئوية لها لسنة ١٩٥٢حسب الالوية)(٣ل٦٣).

ب. ژمارەی لە دایك بوون و مردن هی ساڵی ١٩٥١ ـ (١١ ل٦٣).

پ. ژمارەی لاپەرە ٦٣ ـ٦٤ نییە ، ڕاستییەکەی ٢٦٣ ـ ٢٦٥(٢٦٣.٣، ٢٦٥).

ـ نووسـەر (تێکرایـی) و ڕێـژەی سـەدی (٪) بـۆ لـە ـ یکبوون و مردن بەکارهێناوە لە ڕاستییدا، ئەوانە بە حووتـە لەیـەك شـوێنە کۆنابنـەوە . تێکراییکـە زیـادە وەرگێری کوردیی، تێکرایی یەکەمی لابردووە ـ کارەکە ـ ووستە ).

ـ نووسەر دەنووسێ(ان نسبة الوفيات الناتجة النحو ـ سوء التغذية قد بلغت ٤٣ من المائة)(٨ل٧٠) واتا (لە ڕێـژەی مـردن بـە هـۆی لاوازی و خراپـی خۆراکـەوە گەیشتۆتە ٤٣٪)(١١ل٦٧). بـە تەماشـاکردنەوەی سەرچاوە ئاماژە پێکراوەکە ، دەردەکەوێت ئەم ڕێژەیە ـ بۆ منداڵان و گەوران نە نووسراوە.(٣ل٢٦٣. ٢٦٥).

ـ نووسەر دەنووسێ(جدول يبين الخدمات الصحية لعرق (٨ل٧٢).واتا(خشتەیەکی خزمەتی لەشساغی عێراق دا پێشان دەدات )(١١ل٦٦).

ـ تەماشاکردنەوەی سەرچاوە ئاماژە پێکراوەکە، بە دەردەکەوێت پێنج هەڵە لەم خشتەیەدا هەیە :

ژمارەی دانیشتوانی عێراق لە ساڵی ١٩٤٧دا (٣ ل٤).

ـ ژمـارەی نەخۆشـخانە و دوکتـۆر لـە سـاڵی ١٩٥٣دا (٢٨).

ـ ژمارەی برینپێچ ، کارمەندی لەشساغی و هی دیکە ـت نەوانەم بۆ ساغ نەکراوەتەوە

ـ سەرجەمی گشتی لە عێراق دا (دوکتۆر) ـ ٧٨٠یە (٢٨ . ٢٨٦).

ـ نووسـەر دەنووسێ(جدول يبين عدد المتعلمين في الوية الكوردية ) (١١ل٧٤). واتـا.(خـشتەی ژمـارە خوێنـدووان و نـە خوێنـدووان لـە ناوچە کوردییەکـەدا) (٨ل). بـە تەماشـاکردنوەی سەرچـاوە ئامـاژە پێکراوەکە ، بە دەردەکەوێت سێ هەڵە لـەم خشتەیەدا کراوە:

ژمارەکانی ساڵی ١٩٤٧ (٣ل٨).

ب ـ سـەرجەمی گـشتی لیـوای کـەرکووک ٢٠٥٤٣(٣ل) وەرگێری کوردیی ئەم ژمارەیەی ڕاست کردۆتەوە).

پ ـ ژمارەی نەخوێنـدووانی نێرومێ لیوای سلێمانی لە یەکەمـدا هەڵـە بـوو. وەرگێـری کـوردیی ڕاسـتی کردۆتەوە(١١ل١٠٣) لە چاپی دووەمدا، نووسەر خۆی ئەم کارەی کردووە (٨ل٢٣ .٣٣.

٣٣) نووسـەر دەنووسـێ (المجمـوع العـام للعـراق ١٣٩٤٨٤٢، انـاپ ـــ ١٩٢٤٦٢٧.المجمـوع ـــ المجمـوع العـام ـ ٤٨١٦٨٥)(٨ل٧٣ـ ٧٥) بـۆ ئـەوەی خوێنـدەوار سەری لێ نەشێوێ دەبووایە ، لە پەراوێزدا بنووسرابوایە (لايشمل الاشخاص الذين تقل أعمارهم عن (٥) سنوات ولايشمل القبائل الرحل (٣ل٨).واتا (ئەو کەسانەی تەمـەنیان لـە (٥) ساڵ کـەمترە نایانگرێتـەوە هـەروەهـا خێڵـە کۆچـەرەکانیش ناگرێتـەوە) و جیاکردنـەوەی (المجموع العام للعراق ـ ٤٨١٦١٨٥) لە (المجموع (غير المتعلمين )ـ ٣٣١٩٤٩٦) پێویست بوو ، بۆ ئەوەی تێکەڵ بەیەك نەبن

٣٤) نووسـەر دەنووسـێ (جـدول يـبين عـدد المـدارس الابتدائية والمتوسطة والثانوية من الالوية الكوردية لعام ١٩٥)(٨ل٧٥). واتا (خشتەی ژمارەی فێرکە سەرەتایی خوێنگـەی ناوەنـدی و دواناوەندییـەکان لـە ناوچـە کوردییەکـەدا لـە سـاڵی ١٩٥٤). بـە تەماشـاکردنەوەی سەرچاوە ئامـاژە پێکراوەکـە ، بـە دەردەکـەوێت ، ئـەم هەڵانە کراوە:

ا. ژمارەکان لە ساڵی ١٩٥٣ ـ ١٩٥٤ (٣ل٥٨).

ب. ژمارەکان لە فێگە سەرەتایی دەوڵەتین (٣ل٥٨).

پ. ژمارەی خشتەی پەراوێزەکە ٧٨(٣ل٥٩)

٣٥) نووسەر دەنووسێ (فلقد وصف المستر ريتش: ان الاكـراد لطفـا واجتمـاعيون للغايـة ولا يعرفـون معنـى للعجرفة الفارغة كما انهم لايحسد بعضهم بعضا ، ولم اسمع الى كوردي يقدح بعدو لة مهما كان مبلغ العداء بينهما )(٨ل٨٥). واتا(کورد خـەلکێکی ناسك و جـڤاکین و واتـەی گـەورەیی لووتبـەرزی بـەتاڵ نـازانن و ئێرەیـی بەیەگدی نابەن. نەشم بیستووە کوردێك سووکایەتی بە دوژمنێکـی بکـات ، ڕادەی دوژمنایەتیشان هەرچـۆنێك بووبێـت )(١١ل٨٠). ئـەم قـسانەی ڕیـچ بـەم شـێوە لـە عەرەبییەوە کراوە بە کوردیی (پێم وایە کورد خـەلکێکی زۆر ڕووخـۆش و ، تارادەیـەکی زۆریـش کۆمەڵایـەتین، بەربـەرەکانی کـەس ناکـەن و ، ئیرەی بەکـەس نابـەن ،

لێشم نەبیستووە جوێن بدەن ، یان رقیان لە یەك بێت و ناكۆكییان بەتیین بێت ، قسەی سووك و ناشرین بەیەك ناڵێن ) (١٣ل١٢٣)

٣٦) نووسەر دەنووسێ(اما الرحالة الفرنسي بندر فقد وصف الاكراد بانهم .... ارفع من جيرانم الاتراك و الروس )(٨ل٨٥). واتا (گەریدەی فرانسی بندێر بەم جۆرە باسی كورد دەكات (لە .... هاوسێ توورك و رووسەكانیان ئاستیان بەرزتر دەبێت )(١١ل٨٠). بە تەماشاكردنەوەی سەرچاوە ئاماژە پێكراوەكە ، بە دەردەكەوێت (بانهم ... ارفع مستوى من جيرانهم الاتراك و الفرس )(١٤ل١٣١). واتا(لە .... هاوسێ تورك و فارسەكان ئاستیان بەرزتر دەبێت ) تێبینی : لە وەرگێرانی فارسییەكەی دا ، وشەی فارس كراوە بە ئێرانییان .

**نینسهامن ـــ سوێد**

**١٢ ـ ١١ ـ ١٩٩٨**

**سەرچاوەكان :**


١ . احمد سوسة (الدكتور). اطلس العراق الاداري ، مطبعة مديرية المساحة العامة ١٣٧١هجرية . ١٩٥٢ م .

٢ ـ جمال رشيد دراسات كوردية في بلاد سوبارتو ، بغداد ، ١٩٨٠

٣ ـ الحكومة العراقية ، وزارة التخطيط ، الدائرة الاقتصادية للاحصاء . المجموعة الاحصائية السنوية العامة ١٩٥٤ . مطبعة الزهراء . بغداد ١٩٥٥.

٤ ـ الحكومة العراقية ، وزارة التخطيط ، الدائرة الاقتصادية للاحصاء . المجموعة الاحصائية السنوية العامة ، ١٩٥٥. مطبعة الزهراء . بغداد ، ١٩٥٦

٥ ـ رحلات ماركوثولو ترجمها الى الانكليزية : وليم مارسون ، ترجمها الى العربية ، عبدالعزيز جاويد ، الهيئة المصرية للكتاب ـ ١٩٧٧.

٦ . سیسل .ج . ادموندس . كورد تورك و عەرەب و وەرگێرانی (لە فارسییەوە)حامید گەوهەری . سوید ١٩٧٧.

٧. شاكر خصباك (الدكتور) . الكورد والمسالة الكوردية منشورات الثقافة الجديدة . مطبعة الرابطة . بغداد ، ١٩٥٩

٨ـ شاكر خصباك (الدكتور) . الكورد والمسالة الكوردية الموسسة العربية للدرسات والنشر . الطبعة الثانية ، بيروت ١٩٨٩.

٩ . شاكر خصباك (الدكتور ). الاكراد دراسة جغرافية اثنوغرافية مطبعة الشفيق بغداد ، ١٩٧٢

١٠ ـ شاكر خصباك (الدكتور). العراق الشمالي دراسة لنواحية الطبيعية والبشرية . مطبعة الشفيق . بغداد ١٩٧٣.

١١ـ شاكر خەسباك (دكتۆر) . كورد مەسەلەی كورد ، ئەمجەد شاكەلی كردوویە بە كوردی ، لە بلاْوكراوەكانی بنكەی چاپەمەنی رۆژ. سوید ١٩٩٧.

١٢عەبدوڵلاْ غەفوور . سنووری كوردستان. چاپخانەی میدیا ستۆكهۆلم ١٩٩٧.

١٣ـ كلودیوس جیمس ریچ ، گەشتی بۆ كوردستان ١٨٢٠ . محەمەد حەمە باقی لە عەرەبییەوە كردوویە بە كوردی چاپی یەكەم ، ئێران . تەورێز ، ١٩٩٢.

١٤ . هنری بایندر ، كوردستان بين النهرين وايران ، ترجمه كرامت الله افسر تهران، ١٣٧٠.

١٥_ BAZI NIKITIN KURTLER. CEVIERN HUSEYIN, CEMAL SUREYA. 4 BASK, ISTANBUL, 199

١٦_ EDMONDES C.J., (THE KURD OF IRAQ) THE MIDDLE EAST JOURNAL, VOL. LL, UO

LLE STARNGE G THE LAND OF THE ESTERN .CALIPHATE, LONDON, 1905, WINTER 1957

١٧_ E STRANGE G. THE LAND OF THE ESTERN CALIPHATE, LONDON, 1905


**تێبینی گۆڤاری رامان**

پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەدار وەك ئاگاداره دەڵێ: كاتی خۆی كتێبی (العراق الشمالی - ١٩٧٣ ) چەند جار لە خۆیم بیستووە ناوی (كوردستان العراق) بووە، بەڵام سانسۆر زۆریان لێكردووە بیكا بە (العراق الشمالی ).

**تێبینی**

**ـ لە زۆربەی كتێبەكانم، بە هەڵە نووسیومە یەكەم نووسینم بووە.**
**ـ ئەو وتارە و ئەوەی پێشیم لە رۆژنامەی التاخی بە سایەیی عەبدوڵڵا زەنگەوە دۆزیەوە.**

سەرنج : بە باشمان زانی، دەقی ئەو وتارانەی كە چل و دوو ساڵ بەر لە ئەمرۆ (دوو وتارە بە عارەبی ) و ئەوانەی لە ئەورووپا چوار وتارە بە كوردی و رووسی ) نووسراون دووبارە لێرە بڵاویان بكەینەوە. ئەوەمان بە مەبەستی ئاسانكاری بۆ دوارۆژ كردووە.
د. عەبدوڵلا غەفور

# 17ی دێسیمبەر ،
# ڕۆژی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان و ڕۆژی دایك

حامید گەوهەری

ـرقـەی دیمـوکراتی ئازەربایجـان کاتـژمێر ۱۰:۰۰ ی ـۆژی ۱۹٤٥/۱۲/۱۲ (۱۳۲٤/۹/۲۱) لـە هـۆڵی سـینەما ـیدەبان" لـە تـەورێز یەکـەم کۆبوونـەوەی پەرلـەمانی ـتـەوەیی ئازەربایجـانی پێکهێنـا. ۷٦ نوێنـەر لـە ۹٥ ـوێنـەری هەڵبـژێردراو بەشـداریی کۆبوونـەوەی پەرلـەمانیان کـرد. کۆنـسولی سـۆڤیەت، نوێنـەرێك لـە ـنوێنزخانەی فەرەنسە، میژونی کاتۆلیکی فەرەنسیی و ـوێنەرانی پارێزگاری ئازەربایجان، جێگری بەڕێوەبەری ـەڕێوەبەرایەتی پەروەردە، بەڕێوەبەریی بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵ، دارایی و شارەبانیی و لیژنەیەك لە حیزبی ـیمـوکراتی کوردسـتان میوانـانی ئـەو کۆبوونەوەیـەی پەرلەمان بوون.

...هـەروەکوو گـوتم لیژنەیـەك لـە حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانەوە بەشـداریی کردنـەوەی پەرلـەمان و ڕاگەیانـدنی حکومـەتی ئازەربایجـانی کردبـوو. ئەنـدامانی ئـەو لیژنەیـە بـە وتەی مەنافی کەریمی ئەندامی کۆمیتـەی ناوەنـدیی حیزبـی دیموکراتی کوردستان، بریتی بـوون لـە: (حـاجی مـستەفا داودی، کـەریمی ئەحمـەدەین، وەهـابی بلوریـان، مـەناف کەریمی و عەلی ڕیحانی).

...باقرۆڤ و ڕێبـەرانی فیرقەی دیمـوکرات، هـەموو بـاکوری ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان و ناوچـەی موکریـان، تـا دەگاتـە هەوشـار و نزیـك هەمەدانیان بە خاکی ئازەربایجان دانابوو، بەو مەبەستە نوێنەرانی حیزبی دیموکراتیان بانگکردبوو کە بچن لە پەرلـەمانی ئازەربایجانـدا سـوێند بخـۆن کـە دڵـسۆزی حکومـەتی ئازەربایجـان دەبـن. لـەو بارەیـەوە، مـەناف کـەریمی لـە وتووێژێکیـدا لەگـەڵ گۆڤـاری دوومانگـەی ڕوانگـەی خوێنـدکارانی کـوردی زانکـۆی زانـستە پزیشکییەکانی تەورێز بە زمانی فارسیی دەڵێت :

- حکومـەتی ئازەربایجـان دەیویـست ناوچـەی موکریـان بخاتـە ژێـر دەسـەڵاتی خۆیـەوە، کاتێـك دەیانویـست مەجلیسی میللیی خۆیان پێکبهێنن وەك شارەکانی تری ئازەربایجـان لـە مهابادیـشیان گێڕابـووەوە. بـۆ



هەڵکردنی ئاڵا لە مهاباد لە گوگل وەرگیراوە

نوێنەرایەتی مهاباد لەو مەجلیسەدا حاجی مستەفای داودی، کەریمی ئەحمەدەین، وەهابی بلوریان، من و عەلی ڕیحانی هەڵبـژێرراین. لـە ڕۆژی کرانـەوەی مەجلیسەکەدا نوێنـەرانی شارەکانی ئازەربایجان یەك یەك قسەیان کرد و پیرۆزبایی خۆیان ڕاگەیاند و دواتر دەستیانکرد بە سوێندخواردن کە فیدایی و سەریان لـەپێناوی ئازەربایجانـدا بێت. کاتێك نـۆرە گەیشتە نوێنەری مهاباد، حاجی مستەفای داودی هەستایە سەر پێ و ڕایگەیاند: ئێمە پشتیوانی نەتەوەی ئازەربایجان دەبین، بەڵام سوێندی نـەخوارد کـە فیدایی و سەری لەپێناوی حکومەتی ئازەربایجاندا بێت. بەیانیی ڕۆژی دوایـی بـێ ئاگـاداریی حکومـەتی ئازەربایجـان لـە تـەورێزەوە گەڕاینـەوە بـۆ مهابـاد و لـە مهابـادەوە نامەیەکمان بۆ تەورێز نارد و ڕامانگەیاند ئێمە بەشێك نین لـە ئازەربایجـان و دەمانـەوێت خۆمـان سـەربەخۆ بین(١).

دوای گەڕانـەوەی نوێنـەرانی حیزبـی دیمـوکرات لـە تەورێز و ئاشکراکردنی هەست و بیری نەتەوەی کورد و حیزبی دیموکرات سەبارەت بە پێکهێنانی کۆمارێکی سەربەخۆ لـە کوردستاندا، خـەڵکی مهابـاد بـە هانـدانی بەشـێك لـە ئەنـدامانی کۆمیتـەی ناوەنـدیی حیزبـی دیموکرات، ڕۆژی ١٣٢٤/٩/٢٤ (١٩٤٥/١٢/١٥) ڕژانە ناو شـەقامەکانی شـارەوە و ئاڵـای ئێرانیـان لەسـەر بینـا دەوڵەتییەکانی ڕژێمی ئێران داگرت(٢).

دوای داگـرتنی ئاڵـای ڕژێمـی ئێـران لـە مهابـاد، لـە شارەکانی نەغەدە و بۆکانیش ئاڵای کوردستان هەڵکرا. بـەو مەبەسـتە حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتان ڕۆژی ١٣٢٤/٩/٢٦ (١٩٤٥/١٢/١٧)، لــە ڕێــوڕەسمێکی بــە شکۆدا ئاڵای کوردستانی لە جێی ئاڵای ئێران لە مهاباد هـەڵکرد. گۆڤاری کوردستان لـە ژمـارەی سێی خۆیـدا ئاماژە بۆ هەڵکردنی ئاڵا لە مهاباد دەکات.

هـەروەها گۆڤـاری کوردسـتان لـە ژمـارەی دووەمیـدا بـە سـەردێری "هـەڵکردنی ئاڵای مقدسـی کوردوسـتان لـە نەغـەدە" نوسـیویەتی: (بـە پێـی دەسـتوری هەیئـەتی ناوەنـدی حزبـی دیمـوکراتی کوردوسـتان برایـانی خوشەویسـت: ئاغـای حسین فروهـر و علـی خسروی ڕوژی ٢٦ی ٩ی٢٤ مـەئمور کـران کـە ئاڵای مقدسـی کوردوستان لە نەغەدە هەل کەن)...

دوای هەڵکردنی ئاڵا لە نەغەدە، نۆرەی هەڵکردنی ئاڵا لە بۆکـان هـات. لـەم بارەیـەوە ڕۆژنامـەی کوردستان لـە ژمـارەی یەکەمیـدا بـە سـەردێری "هـەل کردنـی ئاڵای مقدسی کوردوستان لە شاری بوکان" نوسیویەتی: (بە پیی دەستوری هەیئـەتی مەرکـەزی حزبی دیموکراتیی کوردوستان و ئەمری جنابی قازی محمد صدری اعظم و پیـشوای کوردوسـتان قـەرار درا ئاڵای مقـدس و سـی ڕەنگی کوردوستان لە بوکانیش هەل کری ئاغایان میرزا مستەفا سولتانیان، عبدولقادر مدرسی، حسین فروهر، میرزا محمدامین شرفی، علی خسروی، محمود ولی زادە، مـیرزا رحـیم لەشـکری و اعـچای هەیئـەتی حزبـی دیموکراتی کوردوستان و ئاغای شیخ الاسلامی هیمن شاعیری میللی و نمایندەی هەیئەتی رەئیسەی میللی و ئاغـای محمد نانەوازادە فەرمانـدەی ئـوردوی میللـی بـە فەرماندەی گارد ئیحترام و دەستەی موزیك لەگەل ئاغای قاسم ئاغـای ایلخـانی زادە نمایندەی کمیتـەی محـەلی حزبی دیموکرات لکی بوکان بە مـەئموری هـەل کردنی (ئاڵای مقدس) معلوم کران و......

دوای تێپـەڕبوونی نزیـك بـە پـەنجا و چـوار سـاڵ بەسـەر ئـەو ڕووداوە گرنگـە مێژووییـەدا ، بـە فـەرمانی نێـچیرڤان بارزانی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی باشوری کوردستان کابینـەی پێنجـەم ، هـەڵکردنی ئاڵـای کوردستان ڕەنگی یاسایی بەخۆیەوە گرت و تەنانەت بە بڕیاری هەیئـەتی وەزیرانـی حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان ، ڕۆژی ٢٦ سەرماوەز- ١٧ ی دێـسیمبەر ، ڕۆژی هـەڵکردنی ئاڵـای کوردسـتان لـە مهابـاد ، بـە ڕۆژی دایـك لـە باشـوری

...ستان ناسرا.

...کردنەوەیەک سەبارەت بە ئاڵای کوردستان ، دیار نیە ... کەی دروستکراوە و کێ بۆ یەکەم جار ...ستیکردووە، بەڵام ئەوە ڕونە کە بەر لە زایین ئاڵا ...بووە و دەوڵەتە کۆنەکان بۆ ناساندنی خۆیان و ...نەوەی هێزە شەڕکەرەکانیان کەڵکیان لە ئاڵا ...رگرتووە. ئەمڕۆ ئاڵا بووە بە هێمای نەتەوایەتی و ...رگ ڕەسمییەکان و لە کۆڕ و کۆمەڵە جیهانییەکاندا ...یەتی ڕێبازی سیاسی، ...ی. کۆمەڵایەتی، کەلتوریی و.. ...تەوەکان و گروپە جیاوازەکان ...کات کۆنترین ئاڵا لە جیهاندا کە بە ...حوامیی سودی لێ وەرگیرێت، ...ی وڵاتی دانمارکە کە لە ساڵانی ...ی زایینیی دروستیان کردووە ...تا ئێستاش بە بێ ئەوەی کە هیچ ...نکارییەکی تێدا کرابێت، سودی ...وەردەگرن.

...تەوەی کورد بۆ یەکەم جار لە ...ردەمی بزوتنەوەی "جەمعیەتی تەعالی کوردستان"، لە ساڵی ١٩٢٠ ... ئاڵای نەتەوایەتی بۆ خۆی ...دروستکرد. ئەو ئاڵایە لە لایەن ...کەسێکەوە بە ناوی "زەینەلعابدین" دروستکرا. ...زەینەلعابدین نوسەری گشتیی کۆمەڵەی تەعالی کوردستان بوو(٣). ئەم ئاڵایەی کە ئەمڕۆ لە باشوری کوردستان دەشەکێتەوە و کوردەکان لە شوێنە جیاوازەکانی جیهان بەرزیدەکەنەوە، بە گوتنی زنار سلوپی " قەدری جەمیل پاشا"، پێشتر لە لایەن تەشکیلاتی کۆمەڵایەتی جەمعیەتی تەعالی کوردستان"ـەوە دروستکراوە و بە ئاڵای نەتەوایەتی کورد ڕاگەیاندراوە و شێوەکەشی بەم جۆرەیە :

لە سەرەوە سور، ناوەند سپی، "لەسەر ڕەنگە سپییەکەی ڕۆژ " و لە خوارەوەیدا سەوز(٤). جگە لەوە، ئیحسان نوری پاشا لە بیرەوەرییەکانیدا ئامارژەی بۆ ئەو ئاڵایە کردووە و دەڵێت:

-برۆ حەسکی تێللی لە هۆزی جەلالی، ساڵی ١٩٢٦ ڕاپەری و بەرەو چیای ئاگری کشایەوە. من ساڵی ١٩٢٧ خۆم گەیاندە ئاگری و سەرۆکایەتی بزوتنەوەی ئاگریم پێ سپێررا. هەروەها لە لایەن کۆمەڵەی خۆیبوونەوە کۆمیتەیەکی تایبەتیی سەربازییش هەڵبژێدرا. لەو ساڵەدا ئاڵای سێ ڕەنگی سەربەخۆیی کوردستان کە ساڵی ١٩٢٠، جەمعیەتی تەعالی کوردستان پەسەندی کردبوو، هێنرایە ئاگری و بۆ یەکەم جار من ئەو ئاڵایەم لەسەر بەرزترین لوتکەی چیای ئاگری هەڵکرد. من پۆستی سەربازییم لە ڕۆڵە نەبەزەکانی کوردستان پێکهێنا. پاسەوانە دلێرەکانی ئاگری لە دورەوە هاواریان بۆ ئاڵای کوردستان دەکرد. بەو جۆرە لە ئاگری ڕێکخراوی سەربازیی و ئیدارەیەکی کوردیی هەبوو و ئاڵای کورد دەشەکایەوە(٥).




لە جێیەکی تردا "سورەیا بەدرخان" لەسەر بەرگی کتێبی "ڕاپەڕینی کورد دژی کورد" کە ساڵی ١٩٢٨، لە فیلادێلفیای ئەمریکا، بە زمانی ئینگلیزیی بڵاویکردووەتەوە، شێوەی ئەو ئاڵایەی کوردستانی لەسەر بەرگی کتێبەکەی چاپکردووە کە پێشتر لە لایەن کۆمیتەی خۆیبوونەوە هەڵکراوە و ئیحسان نوری پاشا ئامارژەی بۆ دەکات(٦).

شێخ مەحمودی حەفیدیش لە ساڵی ١٩٢٣ دا ئاڵایەکی بۆ کوردستان دروستکرد. سیسیل ج ئیدمۆندس لە لاپەڕەی ٤٠٠ ی کتێبی "کورد تورك و عەرەب" دا ئامارژە بۆ ئەو ئاڵایە دەکات کە لە هێرشی هاوبەشی هێزەکانی ئینگلیز و عێراق بۆ سەر شاری سلێمانیی، لە ١٦ ی مای ١٩٢٣، لە ژوری کاری شێخ مەحمود لە خوێندنگەی ناوەندیی ئەو شارە بە دەستیهێناوە و لەو بارەیەوە دەڵێت: (...... ئاڵایەکی کوردستان و تاجێکی پولەکەڕێزیشم دۆزییەوە کە ئامادەی پێکەوەدان بوون و دەیانویست بیکەن بە ئاڵای دەوڵەتی شێخ مەحمود(٧).




جگە لەوانە، کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستانیش ئاڵای دروستکراوی تەشکیلاتی کۆمەڵایەتی جەمعیەتی تەعالی کوردستان بە هێمای نەتەوەیی ناسیوە. هاشمۆڤ و عەلی ئەکبەرۆڤ لە ڕاپۆرتێکی هاوبەشدا کە بە ناوی کۆنسولی سۆڤیەت لە ورمێ، ساڵی ١٩٤٥ ئاڕاستەی دەوڵەتەکەیان کردووە، دەربارەی ئاڵای ژ. ك دەڵێن: (پارتی ژ. ك ئاڵای نەتەوایەتی بۆ کوردستان دروستکردووە کە بریتیە لە سێ ڕەنگ و ڕەنگەکانیشی بە پێچەوانەی ئاڵای دەوڵەتی ئێران. ڕەنگی سور لە سەرەوە، لەژێریدا سپییە و لە خوارەوەش ڕەنگی سەوزە و لە ناوەندەکەشی هەتاو کێشراوە(٨).

ڕاپۆرتی ١٢ی ئۆکتۆبەری ١٩٤٥ ی باڵوێزی سۆڤیەتیش لە ئێران ئامارژە بۆ هەڵکردنی ئاڵا لە لایەن کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستانەوە دەکات و دەڵێت: (ڕۆژی ٩ ی مای ١٩٤٥، کۆمەڵەی ژێکاف بە بۆنەی سەرکەوتنی هاوپەیمانان بەسەر فاشیزمدا، لە گۆڕەپانی ناوەندیی شاری مهاباد(٩) جەژنی گرت. لەو جەژنەدا ئاڵای نەتەوایەتی کوردیان هەڵکرد(١٠).

شایانی باسە، دوای دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان و بەشدارییکردنی نوێنەرانی حیزب لە کردنەوەی پەرلەمانی نەتەوەیی و دامەزراندنی حکومەتی ئازەربایجان، حیزبی دیموکراتی کوردستان ڕۆژی ٢٦ ی سەرماوەزی ١٣٢٤ (١٧ ی دیسێمبەری ١٩٤٥)، ئاڵای کوردستانی هەڵکرد کە هەمان ئاڵای دروستکراوی جەمعیەتی تەعالی کوردستان بوو. ئەم باسە و وێنەی ئاڵای سەر بەرگی کتێبی سورەیا بەدرخان پێشاندەدەن کە شێوە و ڕەنگەکان و نیشانەی ئاڵای کوردستان، لەو ئاڵایەوە وەرگیراوە کە "زەینەلعابدین" ساڵی ١٩٢٠ بۆ جەمعیەتی تەعالی کوردستانی دروستکردووە و پێشتر کۆمەڵەی خۆییبوون لە باکور و دوای ئەو کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان و حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەڵیانکردووە .

گومان لەوەدا نیە کە زەینەلعابدین ڕەنگەکان و نیشانەی ئاڵای کوردستانی بە چەشنی ئێرانییەکان، هیندییەکان، ئیتالیاییەکان و زۆر وڵاتی تر لە ڕەنگ و نیشانەی ئاڵای مادەکان وەرگرتووە، چونکە بە گوتنی هێرودۆت و کتسیاس مێژوونوسانی کۆنی یۆنان، میتانییەکان، کاوییەکان و ئیمپراتۆرییەتی ماد کە پایتەختەکەیان " ئەکباتانە" واتە شاری هەمەدانی ئەمڕۆ بووە، خاوەنی

--ی سێ ڕەنگی سور، سپی و سەوز بوون و نیشانەی حەوجۆری وەك تاج، هەتاو و شێریان لە ناوەندی --کەیاندا هەبووە(١١).

-ی هەرەسهێنانی کۆماری کوردستان و دەستگیرکردنی پێشەوا قازی محەمەد لە لایەن حکومەتی ئێرانەوە، پێشەوا قازی لە دادگاییکردنە --تییەکەی شادا، ڕایگەیاند من ئاڵای کوردستانم بە --یی سپاردووە. پێشەوا بە بارزانیی ڕاگەیاندبوو کە --کەس لە تۆ باشتر نابینم کە بتوانێت ئەم ئاڵایە --ێت و لە کاتی خۆیدا لەسەر خاکی پیرۆزی --ستان بیچەقێنێت(١٢).

هەروەکوو گوتم دوای تێپەڕبوونی نزیك بە پەنجا و چوار --ێ بەسەر ئەو ڕووداوە گرنگە مێژووییەدا، ئاواتی --شەوا و نەتەوەی کورد بەدیهات و بە فەرمانی --ڤان بارزانی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی باشوری --ستان، هەڵکردنی ئاڵای کوردستان ڕەنگی یاسایی -خۆیەوە گرت، تەنانەت بە بڕیاری هەیئەتی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، ڕۆژی ٢٦ سەرماوەز(١٧ ی -یسیمبەر)، ڕۆژی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە مەهاباد. بە ڕۆژی دایك لە باشوری کوردستان ناسێنرا. --ڕۆژەوە هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە باشوری کو--ستان و هەموو شوێنەکانی جیهان جگە لە بەشە -گیرکراوەکانی کوردستان، ڕەسمیەتی بە خۆیەوە گرت.

--ێ ببینێ ئەو کەسەی پێیوابوو کورد سەرناکەوێ
کێ بوو پێیوابوو تەمی نیگبەت لەسەرمان ناڕەوێ
--ی ئاڵاکەم وەکو چقڵە لەبۆ چاوی عەدو
هەر دڵێ خۆشی نەوێ، ڕەببی وەبەر خەنجەر کەوێ
.هەژار لە کۆبوونەوەی هەڵکردنی ئاڵا لە بۆکان

گۆڤاری دوومانگەی ڕوانگە، ژمارەی ١٥، گەلاوێژی ١٣٨٠ جولای ٢٠٠٣، ئامادەکردنی بە زمانی فارسیی --سماعیل مستەفازادە، وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردیی حەسەن قازی.

سەرکردایەتی هێزەکانی دەوڵەتی ئێران لە ورمێ، ڕوکنی دووەم، ژمارە ١٩١٢٥- ١٣٢٦/١/١٠ (١٩٤٧/٣/٣٠) کاتژمێر ٨ ی بەیانی .

جێگای کەمال فەوزی بەتلیسی لە ڕێکخراوی کوردییدا، نوسینی مالمیسانژ، بە زمانی تورکی، لاپەڕەکانی ١٢٧ – ١٢٩ و ١٤٨. دادگای ئیستقلال ١٩٢٣ – ١٩٢٧ نوسینی د. ئەرگون ئای باس، لاپەڕەی ١٥٢، ساڵی ١٩٨٢ بە زمانی تورکی ئەنقەرە.

ئاڵای کورد، نوسینی مەحمود لەوەندی بە زاراوەی کرمانجی سەروو، گۆڤاری ئارمانج، ژمارە ١٤١، لاپەڕەکانی ٦-٧، ئەوگوستی ١٩٩٣، سوید.

بیرهاتنا ئیحسان نوری، هیوی گۆڤاری کلتوریی گشتی، لاپەڕەکانی ٢١-٢٨، ژمارە ٢، پاریس گوڵانی ١٩٨٤.

ڕاپەڕینی کورد دژی تورك، سورەیا بەدرخان، فیلادێلفیا، ئەمریکا، ساڵی ١٩٢٨، بۆ جاری دووەم ساڵی ١٩٩٤ لە لایەن کتێبفرۆشی سارا لە ستۆکهۆڵم لە چاپ دراوەتەوە.

کورد تورك و عەرەب، نوسینی سیسیل ج . ئیدمۆندس، وەرگێڕانی نوسەری ئەم وتارە.

ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی ڕوسیای فیدراتیف، ئو ٣٠ / د ٣٢٧ / پ ٣٦٩ / لاپەڕەکانی ٥١-٥٤.

مەبەست لە مەیدانی چوارچرای شاری مهابادە .

بەشێك لە ڕاپۆرتی ڕەوانەکراو لە ئێرانەوە بۆ گ . م . دیمیترۆڤ، سکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمونیستی یەکیەتی سۆڤیەت، لەسەر ڕووداوەکانی کوردستان و پارتی ژێکاف، لە ١٢ ی ئۆکتۆبەری ١٩٤٥، لە ئەرشیڤی ناوەندی هەڵگرتن و لێکۆڵینەوەی بەڵگەنامە مێژووییەکانی سەردەم، ف ١٧ / ئو ١٢٨ / د ٤٤ / لاپەڕەکانی ٧٢-٧٩ .

هیرۆدۆت بە زمانی ئینگلیزیی. کتسیاس مێژووزان و لێکۆڵەری یۆنانی کۆن بە زمانی ئینگلیزیی.

بەڵگەنامەکانی دادگاییکردنی پێشەوا قازی محەمەد لە ١٩٤٦-١٩٤٧




# کارەساتی شاری "عامودا"ی ڕۆژئاوای کوردستان

# تراژیدیایەکی دیکەی خوێناوی لەمێژووی کورد..!!



عوسمان هورمزیار

مێژووی گەلی کورد پڕاوپڕە لە ڕووداوی خەفەتبار و کارەساتی جەرگبڕ نەهامەتیەکان ئەوەندە زۆرن مەگەر لە هەر ئان وساتە جیاجیاکانی مێژوو بڕوانین بەڵای واگەورەی بەسەرهاتوە کە بێوێنەیە ولە ئەنجامدا بە لێشاو قوربانی بێ ژوماری لێکەوتۆتەوە و چونکە کورد میلەتێکی بێ پشت و پەنا و خاوەن دەوڵەت و قەوارە نەبوە هەمیشە ئەم ڕووداوانە لە دونیای ناوەوە و دەرەوە پەردەپۆش و لەلایەنە پەیوەندارەکان فەرامۆش کراوە و کەس باسی لێنەکردوە مەگەر تاق و لۆق نوسەرێك یان ڕۆژنامەنوسێکی بیانی هەستی مرۆڤانەی جولابێت بە دوو دێڕ وشە لە لاپەڕەی ڕۆژنامەیەکا باسی کردبێت ، کارەساتی شاری عامودای ڕۆژئاوای کوردستان یەکێکە لەم چیرۆکە دلتەزێنانەی کە پەنجا ساڵ پێش ئێستا بە سەر گەلی کوردا هاتوەو بە سەدان منالی کورد بونەتە سوتماکی سیاسەتی شۆفینیانەی داگیرکەران.کارەساتی سوتانی هۆڵی سینەمای شەهرەزاد لە شاری عامودای خۆرئاوای کوردستان لە ڕۆژی یەك شەمەی کاتژمێر شەشی ئێوارە لە بەرواری١٣ـ١١ـ١٩٦٠کە تیایا ٢٨٣منالی چاوگەشی کورد سوتان کە تەمەنیان لە نێوان ١٠ تا ١٥ ساڵ بووە و بونە قوربانی و جەستە ناسکەکانیان بوە خەلوز و زیاتر لە ٢٢٥ منالیش بریندار بون بە هۆی سەختی برینەکانیان جەستەیان شێواو و کەم ئەندام بوون کاتێ دەسەلاتدارە شۆفینیەکانی ئەوسای سوریا و بەفەرمانی بەڕێوەری ناحیەی عامودای ئەوکات(ملازم مستەفا شەعبان ) بە زۆر منداڵانی کوردیان بردبوە هۆلی سینەمای شارەکە و وایان تێگەیاندبون کە فلیمێك لە سەر ژیانی (جەمیلە بوحرد) پیشان ئەدرێ بەلام دواتر فلیمێکی میسری نمایش کرا بەناوی (ترسی نیوە شەو) کە بەهیچ شێوەیەك لەگەل تەمەنی منداڵەکان نەدەگونجا پیشان درا. ئیراداتی پارەی چونە ژوورەوەش تەرخان کرابو بۆ ئەوەی بۆ چەکدارانی شۆرشی جەزائیری بنێردرێ ،لە پڕ و پاش پێنج خولەك لە دەست پێکردنی فلیمەکە هۆلی سینەما گڕی گرت و ئاگرەکە زۆر زوو بلاوبۆوە و لە کۆتایشدا کارەساتێکی گەورە و بێ وێنەی لێکەوتەوە و سەدان جگەر گۆشەی روح پەپولە جەستەی ناسکیان بوە خۆلەمێش ،دەسەلاتدارە شۆفینیەکانیش زۆر خەم ساردانەو بێ باکانە مامەلەیان لەگەل ئەم ڕووداوە دلتەزێن و بێ هاوتایە کرد کە بەم هەلوێستەیان گومان دروست بو لەسەر هۆکاری ڕوداوەکە و کەوتنەوەی ئاگرەکە بە

...یبەت و لە کاتێ بەرامبەر ئەم ئاگرە گەورە تەنیا یەك ئۆتۆمبێلی ئاگر کوژێنەوەیان ناردە شوێنەکە ئەمویش ئاوی پێنەبو .تەنیا هاوڵاتیەکی کورد بەناوی( محەمەد سەعید ئاغا) کاتی دەگاتە شوێنی ڕووداوەکە و دەیەوێ بچێتە ناو ئاگرەکە پێی دەڵێن منداڵەکەت ڕزگاری بوە لە وەڵاما دەڵێت هەموویان منداڵی منن و ئازایانە دە چێتە ناو ئاگرەکە وەك فریاد ڕەس و توانی پاڵەوانانە یانزە منالْ ڕزگار بکات پاشان خۆشی بۆرێکی ئاسنی بە سەردا کەوتە خوارەوە لە ناو هۆڵی سینەماکە شەهید بوو، پاش ئەم ڕووداوە دەسەڵاتدارانی سوریا لێ پێچینەوە و بەدواداچونێکی ئەوتۆیان نەکرد کە هۆی گڕ گرتنی سینەماکە بزانرێت و بایەخێکی ئەوتۆشیان بەم کارەساتە گەورە و ویژدان هەژێنە نەدا و نەیان هێشت کەسیش بەدواداچون بکا هۆی کەوتنەوەی ئەو ئاگرە بە شاراوەیی مایەوە تا نیستاشی لەگەڵ دابێت و کارەساتی عاموداش بوە لاپەڕیەکی تری خەم و ناسۆر و تراژیدیایەکی بێ وێنە لە مێژووی گەلی کوردا لە بەرامبەریشدا ئەم ڕووداوە بوە پەڵەیەکی تری ڕەش بە نێو چەوانی داگیرکەران و


وێنەی یەکێك لە قوربانیانی ڕوداوەکە


شەهید محمد سەعید ئاغا


چەند منداڵێك قورعان لە سەر گۆری هاورێکانیان نەخوێنن

دوژمنانی کوردستان کە لە هیچ کات و زەمانێکدا وەك مرۆڤ مامەڵەیان لەگەڵ تاکی کوردا نەکردوە بگرە لە سەرەتاترین ماف بێبەشیان کردون رۆحی مرۆڤی کورد زۆر لەلایان بێ نرخ بوە بە چاوێکی بێ بایەخ سوکیش سەیریان کردوە سینەمای شەهرەزاد کە شوێنی ١٥٠ کەسی تیائەبۆوە زیاتر لە ٥٠٠ کەسیان تیا ئاخنی بوو لە قوربانیەکانیش (٣٠)کەسیان تاقانە بوون . لێرە ڕووداوی عامودا بۆ هەتا هەتا لە بیر و ویژدانی مرۆڤی کورد ناسڕێتەوە و برینێکی بە ئازارە و سارێژ بونی ئەستەمە و بە یەکێك لە گەورەترین کارەساتی گەورە و بێ وێنە ئەژمار ئەکرێ کە بەسەر گەلی کوردا هاتوە .بەش بەخۆم هیوادارم نوسەر و ڕۆژنامەنوس و پسپۆرانی بواری مێژووی نەتەوەیمان زیاتر تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی زانستی لە سەر ئەم کارەساتە جەرگ بڕە بکەن تیایا بە تێر وتەسەلی باسی ڕووداوەکە بکەن ڕاپۆرتی جۆراوجۆری لە سەر ئامادە بکەن و هەموو ساڵێکیش یادێکی وای بکەنەوە کە شایستەی گەورەیی ئەم ڕووداوە و ڕۆحی پەپولەیی قوربانیەکانی بێت.

# ڕەچەڵەکی کورد ..

یوسف ئەحمەد مەنتك/ ئەلمانیا



## فێردیناند هینەربیشلەر
## دۆست ودلسۆزی دێرینی کورد

بۆئەوەی لەنزیکەوە خوێنەری کورد بەوە بزانێت، کەکەسانێکی ئەوروپی ئەکادیمی هەن کە دلسۆزوخەم خۆری کوردن،هەردەم لە ساتە سەخت ونوتەکەکاندا لەنزیکەوە هاوخەمی ئازارەکان بوون،بەشێکی زۆری ژیانیان تەرخان کردووە بۆ خزمەتی مێژووی گەلەکەمان،بەپێویستم زانی نوسەرو رۆژنامەنووس ومێژوو نووسی بەناوبانگی نەمساوی فێردیناند هینەر بیشلەر کە دۆستێکی دێرین ونزیکی کوردە،تیشك بخەمە سەر هەندێك لایەنی ژیان وبەرهەمەکانی کە تایبەت بەکورد ئەنجامی داون.

فێردیناند هینەر بیشلەر لە ١٩٤٦/١١/٣ لەشاری لینز لە وڵاتی نەمسا لەدایك بووە،وەك نووسەرورۆژنامەنووس ومێژوو نووس کاردەکات،لە ساڵی ١٩٦٥/١٩٧٢ خوێندن ودکتۆرای لەزانکۆی ڤییەنا لەبواری مێژوو زانستی زمان تەواو کردووە،لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٧/١٩٩٠ بۆ ئیزاعەی orfی نەمساوی وچەند کەناڵێکی تری جیاجیای وڵاتانی ئەوروپی کاری کردووە،لەساڵی ١٩٨٠/١٩٨٥ لە وەزارەتی دەرەوەی نەمسا کاری کردووە،لە ١٩٨٥ەوە وەك نووسەور رۆژنامەنووسێکی ئازادو مێژوو نووس کاردەکات .

ئەو شوێنانەی کاری لەسەر کردوون وەك: ناوەراست و رۆژهەلاتی ئەوروپای رۆژهەلات و یەکێتی ئەوروپا و کورد، ئێران، عێراق،ترکتا، ئیسرائیل، فەلەستین، لوبنان، قوبرس.

مامۆستایی کردووە لە قوتابخانەکانی ڤییەنا لە بوارەکانی زمانی ئەلمانی ومێژوو و زانستی دەرون لە ساڵەکانی ١٩٦٦ تا ١٩٦٧ لەساڵی ١٩٧٢ تا ١٩٧٣.

لەساڵی ١٩٧٣/١٩٧٤ خزمەتی سەربازی کردووە. لە ساڵەکانی ١٩٧٤ /١٩٧٦ لە نووسینگەی دەرەوەی وڵات پەیامنێر بووە بۆ یەکێتی ئەوروپا،ئەوروپای ناوەراست و رۆژهەلات و رۆژهەلاتی ناوەراست و ئەمریکای









ـتين. لـه سـالّی ١٩٧٨/١٩٧٦ ـەيامنێر بـووە لـە شـەڕی ئـەهلی ـەيروت، قاهيرە، قودس، ديمەشق، ـەيامنێر بووە لە بوينس ئايرس لە ـەر جـەنتين . لـەكاتی شۆڕشـی ـيسلامی ئێـران لـە سـالّی ١٩٧٨ ١٩٨٠ لە تەهران پەيامنێر بووە.

ـە سـالّی ١٩٨٠ /١٩٨٣ لـە وەزارەتی دەرەوەی نەمسا لەبواری ـ گەيانـدن وڕۆشـنبيری و ـۆژنامـەوانی كـاری كـردووە، لـە ـەفارەتی نەمـسا لـە لنـدن و ـەفارەتی نەمـسا لـە ئەسـينا، يارمەتيـدەری ديبلۆماتكـاری ناسـراوی نەمـساوی دكتـۆر برونـو كرايـسكی وبـاليۆز دكتـۆر هربـرت همری بووە.

لەسـالّەكانی ١٩٨٤/١٩٨١ چـەندين جـار وەفـدی مفـاوەزات بووە،بـۆ ئـازادكردنی بارمتـە دەسـت بەسـەركراوەكانی بيـانی لەلايـەن ڕژێمـی عێـراق، بـۆ ئـالوگۆڕكردنی ديلـەكانی نێـوان ئيـسرائيل وفەلەسـتين كـە هـەزار فەلەسـتينی و١٥٠ شـيعەی لوبنـان بـوون بەرامبەر سێ سەربازی ئيسرائيلی.

لەسـالّی ١٩٩١ ڕێكخـەری وڵـاتی نەمسا بوو كە گەورەترين كۆمەك و يارمـەتيان بـۆ كـوردانی ئـاواربووی نيشتەجێی كەمپەكانی ئێران هێنا.

لەم شوێنانەی وەك ڕۆژنامـەنووس كاری تێدا كردووە

نەمـسا: orf، ڕۆژنامـەی فينـر، سـەردەمی نـوێ. ئـەلمانيا: نوسينگەی پەيوەندييەكانی ڕاديۆ، راپـۆرتی گەشـەپێدان لـە جيهـان، مـاف تايبـەتی ڕاكێـشان، فرنـك سويـسری،NDR، دێـر شـپيگل، ديـدار. سويـسرا: مـاف تايبـەتی راكێـشان،كوردە گـەراوەكان دوای سالّی ١٩٧٥،ڕۆژنامەی برنر.لەزۆر شـوێنی جياجيـای تـر كـاری كردووە،چەندين جار خەلاتكراوەو ڕێزی لێنراوە لە وڵاتانی ئەلمانيا وفەرەنساو يونان ونەمسا ،ميداليای

زێرینی شەرەف بۆ ئەم خزمەتانەی کە پێشکەش بە کۆماری ئەمسای کردووە لەسەردەمی راوێژکار برونو کرایسکی،خەڵاتی سەرۆکی یونان قستەنتین ، دووجار ڕێزلێنان لەلایەن وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا هانز دیتریش غینشر، میدالیای بادن ڤوتمبێرگ ئەڵمانیا، هیومن رایتس، میدالیای سەرۆکی فەرەنسا فرانسوا میتران.

ئەم زاتە لە ساڵی ١٩٧٠وە لەبارەی مێژوو و کولتووری کورد دەنوسێت، لەزۆرێك لە ڕوداوەکانی کوردستان نزیك بووە، هاوخەم و دلسۆزیان بووە، ڕوداوەکانی وەك خۆی گواستۆتەوەو مێژوەکەی بەراست ودروستی نوسیوەتەوە،ئەو بەرهەمانەی لەبارەی کورد نوسیویەتی:

کوردە بێ ناسنامەکان لە مالێکی سوتاودا(١٩٨٦). گەڕانەوەی هەندێ لایەن لە بزوتنەوەی گەلی کورد دوای ساڵی١٩٧٥(١٩٨٦). مردن لە پێناو ئازادی(١٩٨٨)، مێژووی گەلی کورد دکتۆر برونو کرایسکی پێشەکی بۆ نووسیوە. کوردەکانی قوربانی گازی سامی عێراق(١٩٨٨)، راپۆرتێکە ئامادەکراوە لە ترکیا لە کەمپەکانی سووستو لە یوکسیکوڤا، لەگەڵ شایەتحاڵەکانی ئەوانەی بەچاوی خۆیان کارەساتەکەیان بینیوە راپۆرتەکە باسی باروودۆخ وتەندروستی ژیانی کوردانی بەرکەتووی چەکی کیمیاوی بادینان دەکات لەکاتی کیمیاباران کردنیان لەلایەن ڕژێمی سەدام. لەمەترسی لەناوچونیان کۆچیان کردبوو بۆ ترکیا (١٩٨٨/٩/١٣)،فێردیناند لەنزیکەوە لەگەڵ کەسەکان گفتوگۆی کردووە. کورد لە ئەمسا






سالی ۱۹۹۲ لە :ئازادی، و سەربەستی لە چیا.

کتێبەکانی نووسەر لەسەر کورد، سەرچاوەی بەنرخ وتوێژینەوەی زانستین ،بۆ مێژووی گەلی کورد سەرچاوەی گرنگن وپڕ بایەخن.

یەکەم/ کتابی کوردەکان ( Die Kurden )

سالی ۲۰۰٤ بەزمانی ئەلمانی چاپکراوە ،۷۰۰ لاپەڕەیە نرخی ۹۰.٤۹یورۆ. باس لە گەلی کورد دەکات لەسەرەتای مێژوو تا ئیمڕۆ، کە چەندین بواری جیاجیا باس دەکات وەك: کولتوری،کۆمەلایەتی، سیاسی،هەر چوار پارچەکانی کوردستان، جوگرافیای کوردستان، ۳٤۸ وێنە، ۱۱۷گرافیك. باس لە رەسەنایەتی رەگی کورد دەکات و نزیکیان دیاری دەکات لەگەل گەلانی ناوچەکە، ئاینی زەردەشتی و ئاینەکانی دیکە لە ناوچەکە ،کە خزمایەتیان هەیە لەگەڵ جوولەکە، زمانی کوردی بە کۆنتر لە زمانی هیندی و ئەوروپی دادەنێت کە پێش ئەوان قسەی پێکراوە، ئاماژە بە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی هەر سێ زانای جوو ئەریل ئۆپنهایم و ئەلموت نێبل و مارینا فایەرمان دەکات، کە کورد و جوو خزمایەتی نزیکیان هەیە بەهۆی جیناتیان، ئاماژە بە ناوی کورد دەکات کە لە سەردەمی سۆمەرییەکان بە Kur واتە چیانشین، kurdistan بەمانای ولاتی کوردان دێت لە سەدەی ۱۲ی زایینی را بەکار هاتووە. وشەیkarda-kurda کۆنترین وشەن لەجیاتی وشەی کوردستان بەمانای ولاتی کوردان بەکار هاتووە لە پێش زایین. قەتلوعامی کوردانی دەرسیم باس دەکات بە غازی قەدەغەکراوی کیمیاوی لەلایەن حوکمەتی ئەتاتورك. دامرکاندنەوەی سەرهەلدانی کوردەکانی عێراق لەلایەن بەریتانیەکان لە بیستەکانی سەدەی رابردوو کە گازی کیمیاویان بەکار هێنا، لێدانی کوردەکان لەلایەن سەدام بەگازی کیمیاوی.ئەم پەرتووکە هەگبەیەکی دانسقەی مێژووییە لەزۆر لایەنی جیاجیای ژیانی گەلی کورد لە کوردستانی گەورەدا، کورد لەبەردەم هەڕەشەی حوکمرانە جیاجیاکانی نەتەوەی سەر دەست لەکوردستانی داگیر کرا و دابەشکراودا لەزەمەنی رابردوو.

دووەم کتابی / رەچەلەکی کورد،توێژینەوەی زانستیی لەچەند بوارێکی دیاریکراودا( Die Herkunft der Kurden) 269 لاپەرەیە، سالی ۲۰۱۰بەزمانی ئەلمانی چاپکراوە، لەدەزگای پیترلانگ/ فرانکفۆرت/ئەکادیمیای نێودەولەتی بۆ چاپەمەنی،نرخی (٤٦،۸۰ یورۆ)، ۸۱ خشتەی بەیاناتی ئەنجامی توێژینەوەکان لەچەند بوارێك بەپێی ناوەرۆکی کتابەکە، ۷۹ گرافیك کە نەخشەی کوردستانن ئەم شوێنانەی کورد لە کۆنەوە لێی نیشتە جێبوون.

کتێبەکە چوار بەشی سەرەکی لەخۆ دەگرێت وەك: یەکەم: بۆ ماوەیی دانیشتوانی کورد urden (und Populations- Genetik)، چەند دیراسەیەکی زانستییەکە نزیکایەتی کورد لەگەڵ نەتەوەکانی دەوروبەری باس دەکات، جوولەکە بە نزیکی کورد دادەنێت.

دووەم: شوێنەوار -Archäologie (Onomastikon)،

بەپێی لێکۆڵینەوەکان ناوە کۆنەکانی کورد وا ناسراون وەك: کور Kurda, Kurta, Karda, و Kurti چەندین ناوی دیکە کە لێکۆڵینەوەکان و سەرچاوە مێژوویەکان یەکلاییان دەکاتەوە.

سێیەم: زانستی زمان (Lingustik) باسی تایبەتمەندییەکانی زمانی کوردی لە ماوەی مێژووی کوردا دەکات، باسی شێوازەکانی قسەکردن لە زمانی کوردیدا، دابەش بوونیان بەپێی هەڵکەوتەی جوگرافی و نیشتەجێ بوونیان لە کوردستان، شێوەزاری کرمانجی زۆرترین پانتایی داگیر دەکات هۆکاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زۆرترین دانیشتوانی کورد بەم دیالێکتە دەئاخڤن.

چوارەم: هەوڵەکانی پۆلێنکردنی مێژووی کۆنی کورد (Versuch einerhistorischen Einordnung von ältestem Kurdischen) بۆماوەیی دانیشتوان، هیندو ئێرانی کوردستان، هیندو ئاری زازا میتانی، ئێرانی پارسوا پارسیس




میدیا سکیتن ئەم باسانە و چەندین باس و خواسی دیکە لەخۆ دەگرن کە لە کتابی کوردەکانیش ئاماژەی بۆ کراوە، بەڵام ئەم کتێبە زانستیانە ئەم بوارانە دەخاتە روو کە لە بەشە سەرەکییەکانی کتێبەکە ناویان هاتووە.

دوا ئەنجامەکانی زانستی بۆماوەیی دانیشتوان و زانستی شوێنەوارناسی و زمان و مێژوو، ئاماژە بەوەدەکەن کە رەگ و ریشەی کورد لەبنەڕەتدا جووتیار و ئاژەڵدار بوون لە سەردەمی چاخی بەردین و ئەو کولتورانەی کە لە ناوچەکانی باکوری وڵاتی نێوان دووروبار(بلاد رافدین) کە مێژویان دەگەڕێتەوە بۆ دەهەزار ساڵ بەر لەزایین لەسەر ئەم زەویانە نیشتە جێن وخاوەن فەرهەنگ و شارستانیەتی خۆیانن،بەپێی بەیاناتی زانستی بۆ ماوەیی دانیشتوانی نوێ کورد هاوبەشییەکی فراوانی هەیە لەگەل گەلانی رۆژهەلاتی ناوین وئەوروئاسیا ،سەرەڕای نزیکی جینیات بۆماوەیی لەگەل گەلانی جوولەکە و عەرەبدا، لەرووی بەیەکەوە ژیان و هاوبەشی شارستانی، هیچ هاوشێوەیەکی (جینی) نییە، بەڵام بەکۆنترین گەل دادەنرێت لەنێو گەلانی ئەورۆ ئاسیادا.

**سەرچاوەکان :**

1- Die Herkunft der kurden
2- Die Kurden
3- www.fhe.cc

# عێراق و کوردستان لە ڕاپۆرتێکی دبلۆماسی بریتانی ساڵی ١٩٧٢ دا

**پ. ی. د. سەعدی عوسمان هەروتی**
**کۆلێژی ئەدەبیات/ زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر**



بەڵگەنامەکان بە سەرچاوەی ڕەسەن و پڕبایەخ دادەنرێن لە بواری نووسینەوەی مێژوودا، بە تایبەتی ئەو بەڵگەنامانەی کە نووسراوی فەرمی ئەو حکومەت و دەوڵەتانەن کە خاوەن سەنگ و قورسایی نێودەوڵەتین و ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە ڕووداوەکانەوە هەبووە. چونکە لەم بارەدا بەڵگەنامەکە جگە لەوەی زانیاری مێژوویی گرنگ لەخۆ دەگرێ، هەڵوێستی لایەنە جیاجیاکانیش ڕوون دەکاتەوە بە تایبەتی هەڵوێستی وڵاتە زلهێزەکان. هەندێکیشیان- نەخاسمە ئەگەر ڕاپۆرتی دبلۆماسی بن- لایەنی شرۆڤەکاریش فەرامۆش ناکەن. ئەم بەڵگەنامەی کە بە پێویستی دەزانین لێرەدا بڵاوی بکەینەوە لەم جۆرەی دواییانە. چونکە ڕاپۆرتێکی ساڵانەی بریتانیە لەبارەی عێراق لە ساڵی ١٩٧٢ دا، کە لەلایەن بەشی توێژینەوەی وەزارەتی دەرەوەو کۆمنوێلت لە شوباتی ١٩٧٣ ئامادەکراوە. ئەم ڕاپۆرتە لە ئەرشیفی نیشتمانی بریتانیا(NA) لە لەندەن لە نێو فایلی ژمارە (FCO-B/٢٠٨٩) پارێزراوە.

ڕاستە بەشێکی زۆری زانیاریەکانی نێو ئەم ڕاپۆرتە لە سەرچاوەی تریشدا دەبینرێن، بەڵام لێرەدا گرنگیان لەوەدایە کە لە گۆشە نیگای حکومەتی بریتانیاوە دەخرێنە ڕوو. هەروەها هەڵوێست و تێڕوانینی ئەوان لە هەمبەر ڕووداوو لایەنەکان ڕوون دەکەنەوە. بێگومان ئەمەش یارمەتیدەرە بۆ دیاریکردنی سیاسەتی بریتانیا لە ناوچەکە بەگشتی و عێراق و کوردستان بەتایبەتی.

ڕاپۆرتەکە بێجگە لەوەی لە پاشکۆکەیدا هەموو ڕووداوکانی ساڵی ١٩٧٢ی عێراق بەپێی مانگ و ڕۆژ دەخاتەروو، لەسەرەتادا بە شرۆڤەکاریەکی وردەوە گرنگترین هەلومەرج و پێشهاتەکانی عێراق لە چەند خاڵێکدا ڕوون دەکاتەوەو بۆچوونی بریتانیاش لەبارەیان دیاری دەکات. لەمەدا دەردەکەوێ کە بریتانیا لە نزیکەوە چاودێری بارودۆخی ئەم وڵاتەی کردووەو هەموو جموجۆڵێکی تیادا بەلاوە گرنگ بووە. بەڵام لەهەموویان گرنگتر بە بۆچوونی ئامادەکەرانی ڕاپۆرتەکە بەستنی پەیماننامەی دۆستایەتی عێراقی- سۆڤیەتی و خۆماڵیکردنی نەوت بووە لەم ساڵەدا. بۆیە ئەم دوو ڕووداوە کە جێگەی نیگەرانیەکی گەورەی

بریتانیا بوون لە راپۆرتەکەدا برێکی زۆریان لەسەر نووسراوەو کراونەتە تەوەری زۆربەی رووداوەکانی تریش. لەهەمان کاتدا بەووردی بەدوای پەیوەندییە دەرەکییەکانی عێراقدا چوونو بە رەشبینییەوە سەیریان کردووە کاتێ تێبینیان کردووە کە عێراق بەزۆری خۆی لە بلۆکی رۆژهەڵاتو وولاتانی جیهانی سێیەم نزیک دەکاتەوە. بەڵام ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکانی عێراق لەگەڵ هەندێ وولاتی عەرەبیو ئێران بە خاڵێکی ئەرێنی داندراوە بۆ بەرژەوەندییەکانی بریتانیا.

بێگومان کوردستانی باشووریش وەك بەشێك لە عێراق پشکی خۆی لە راپۆرتەکەدا بەرکەوتووە، بەتایبەتی کە لەو دەمەدا شۆڕشی ئەیلول لە ئارادابووەو پەیوەندییەکانی شۆڕشی کوردو حکومەتی عێراق دوای دوو ساڵ لە مۆرکردنی رێکەوتننامەی (١١)ی ئادار ئاڵۆزی بەخۆوە بینیوە. راپۆرتەکە ئاماژەی بەو ئاڵۆزیە داوەو هەندێ لە هۆکارەکانی روون دەکاتەوە، هەروەها هەڵوێستی سەرکردایەتی کوردی لەهەمبەر هەندێ رووداو دیاری کردووە بەتایبەتی خۆماڵیکردنی نەوتو پرۆژەی یەکێتی نێوان عێراقو میسرو سوریا. هەندێ پێشهاتی کوردستانیشی باسکردووە، وەك ئەو کارەساتە تەندروستییەی کە لەم ساڵەدا روویداوە.

لێرەدا بەدوا دەقی راپۆرتەکە دەخەینە روو کە لە زمانی ئینگلیزییەوە وەرمانگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی، بەو هیوایەی جێگەی سوودی خوێنەران بێ، بەڵام دەبێ ئەوە بڵێین کە لەبەر ئەمانەتی زانستی هەوڵمانداوە دەستکاری دەستەواژەو دەربڕینەکانی راپۆرتەکە نەکەینو پارێزگاری لە شێوازەکەی بکەین. بەڵام لە هەندێ جێگە کە کەوانەی لەم جۆرە [ ] دەبینرێ ئەوا روونکردنەوەی ئێمەیە بۆ هەندێ ناوو زاراوەو کورتکراوە. چونکە پێمان باش نەبوو پەراوێزی بۆ زیاد بکەین.

**نهێنی**

وەزارەتی دەرەوەو کۆمنوێلپ

راپۆرتی دبلۆماسی ژمارە: ١٧٥/٧٣

RR ٦/٢ بڵاوکراوەی گشتی

عێراق

شوباتی ١٩٧٣

عێراق: پێداچوونەوەیەکی ساڵانە بۆ ساڵی ١٩٧٢

لەلایەن بەشی توێژینەوە لە وەزارەتی دەرەوەو کۆمنوێلپ

ئامادەکراوە

## پوختە

١- پەیماننامەی سۆڤیەتی- عێراقیو خۆماڵیکردنی کۆمپانیا عێراقی دوو رووداوی سەرەکین. (برگەی ١)

٢- ئەم پەیماننامەیە نیشانەی قۆناغێکی نوێیە لە هاریکاری نێوان بەعسو مۆسکۆ، وە دەتوانرێ وادابنرێ کە هاوکاریەکی سۆڤیەتیە بۆ پشتیوانی کردنی سیاسەتەکانی بەعس لە کەنداودا. (برگەی ٢)

٣- فەرەنسیەکان لە بردنی نەوت بەردەوامن دوای خۆماڵیکردن، یەکێتی سۆڤیەتیش برێکی تا رادەیەك کەمی بردووە. گفتوگۆکانی دوایی نێوان عێراق و IPC [ کۆمپانیای نەوتی عێراقی/ کە کۆمپانیایەکی بریتانی بوو بۆ دەرهێنانی نەوت لە عێراقدا ] لە کۆتایی ساڵدا گەیشتە بێ ئاکامی. (برگەی ٣-٤).

٤- ئەرکە داراییەکانی خۆماڵیکردن. پێوەرەکانی دەستپێوەگرتنی توند (تقشف)دا سەپێنراوە. ئەگەری دارمانی لەناکاوی ئابووری لە گۆڕێ دانیە. (برگەی ٥).

٥- عێراق لەسەر هاریکاری ئابووری لەگەڵ وولاتانی comecon [ ئەنجومەنی هاوبەشیو هاریکاری ئابووری/ رێکخراوێکی تایبەت بە وولاتانی بلۆکی رۆژهەڵات بوو لە ساڵی ١٩٤٩ لە مۆسکۆ دامەزرا ] واژۆی کردووە، بەڵام هێشتا نەبۆتە ئەندام تیایدا. (برگەی ٦)

- هەناردەکانی بریتانی نزیکەی ١٠٪ بەرزبۆتەوە، هەر چەندە دوای خۆماڵیکردن داواکاریەکان زەحمەت بووە، ئەگەرێکی کەم لە ئارادایە بۆ دەستپێکردنەوەی پەیوەندییە دبلۆماسیەکان بەم زووانە: (برگەی ٨)
- ابرانی عێراق لە جیهانی عەرەبی بەردەوامە. برگەی٩)
- پەیوەندییەکان لەگەڵ ئێران هەر لە گرژی دان. برگەی ١٠)
- شلەژانی باردۆخی کوردی. (برگەی ١١)
- دیارە رژێم هیچ هەڕەشەیەکی لەسەر نییە. بەڵام لەگەڵ بەهێزبوونی ئەگەرەکانی سەرنەکەوتنی خۆماڵیکردنی نەوت و مانەوەی مەسەلەی کورد بەم سەقامگیرییە، ژیانی عێراقی دووبارە ناثارامی بەخۆوە دەبینێ. (برگەکانی ١٢-١٤)

**(نهێنی)**

وەزارەتی دەرەوە و کۆمنوێلت
شوباتی ١٩٧٣

لە لەندەنەوە دەبینرێ، دوو ڕووداوی گرنگی عێراق لە ساڵی ١٩٧٢ بریتین لە واژۆکردنی پەیماننامەی دۆستایەتی و هاریکاریی عێراقی- سۆڤیەتی لە نیسان، هەروەها خۆماڵیکردنی کۆمپانیای نەوتی عێراق (IPC) لە حوزەیران. گفتوگۆکانی دوای خۆماڵیکردن لە نێوان IPC و حکومەتی عیراقی بە هاتنی ٣١ی کانونی یەکەم نەگەیشتنە هیچ دەرئەنجامێك، ساڵەکە بێ یەکلاییکردنەوە بەکۆتا هات. ئەگەر دانووسانەکان دەرەنجامی باشیان هەبێ، بێگومان چارەسەری ئەو قەیرانە داراییە دەکرێ کە بە هۆی کەمبوونەوەی داهاتی نەوتی عیراقی لە حوزەیرانەوە پەیدا بووەو هەروەها سەر لەنوێ دەرفەت بە شانشینی یەکگرتووو وولاتە ڕۆژئاواییەکان دەدا بگەنەوە بەدەگی نەوتی عیراقی کە زۆر بەبایەخە. بەڵام لە لایەکی تر ئەگەر گفتوگۆکان هەرەس بێنن ئەوا دەرەنجامە ئابووریەکانی لەوانەیە بۆ عیراق ترسناکتر بێت، لەوانەیە

ئەویش زیاتر خۆی بە یەکێتی سۆڤیەتەوە ببەستێتەوە، تەنانەت لەوەش زیاتر کە خۆی دەیویست.

٢- پەیماننامەی عێراقی- سۆڤیەتی ئاماژەی قۆناغێکی نوێیە لە هاوکاری زێدەتر کارا لەنێوان حیزبی بەعس و مۆسکۆ، ئەمەش متمانەییکی زیادە بە ڕژێمی عێراق دەبەخشێ کە پێویستی پێیەتی بۆ بالادەست بوون لە کێشەکانی لەگەڵ IPC، ئەم کێشانە کە لە ساڵی (١٩٦١)ەوە بەسەربوویی مابوونەوە دوای ئەوەی قاسم [ عبدالکریم قاسم ] دەستی بەسەر زیاتر لە ٩٩٪ی ناوچەی ئیمتیازی کۆمپانیاکەدا گرت بێ قەرەبووکردنەوە. ئەم پەیماننامەیە کە لە زۆر ڕووەوە هاوشێوەی ئەو پەیماننامانەیە کە سۆڤیەت لەگەڵ هیندستان و میسر مۆری کردووە، چەند سوودێکی جیۆپۆلیتیکی ئاشکرای بۆ یەکێتی سۆڤیەت هەیە. لە کاتێکدا دەنگۆی پشتیوانی فەرمی زلهێزێك دەداتە عیراقیەکان و هەروەها گەرەنتی بەردەوامبووی هاوکاری ئابووری و سەربازیی. هەروەها لەوانەیە حیزبی بەعس پەیماننامەکە وا ڕاڤە بکا کە پابەندبوونی یەکێتی سۆڤیەتە بە پاڵپشتی کردنی سیاسەتەکانی لە کەنداو. چونکە بەهۆی گرنگی گرێدانی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئێران ڕووسەکان بەڕاستی دەیانەوێ بەئاگاییەوە پێ بنێنە کەنداو. بەڵام بایەخە چاوەڕوانکراوەکەی پەیماننامەکە دوای چەند ڕۆژێك لە مۆرکردنی بەئاشکرا دەرکەوت، کاتێ چەند پارچەیەك لە هێزی دەریایی سۆڤیەتی گەیشتنە بەسراو ئوم قەسر.

٣- خۆماڵیکردنی پشکەکانی IPC لەلایەن عیراقەوە، دوای ڕەتکردنەوەی وەڵامەکەی IPC هات سەبارەت بەو ئاگادارکردنەوە کۆتاییەی کە تیایدا داواکرابوو ئاستی بەرهەمەکانی کێڵگەکانی باکوور بگێڕێتەوە بۆ توانای تەواوی بۆڕییەکانی هەناردەکردن و کۆگاکانی عەمبارکردن (نزیکەی ٥٧ ملیۆن تۆن لە ساڵێکدا)، ئەمەش دوای ئەوەی فاکتەری بازاڕ وای لە کۆمپانیا کرد کە ئاستی دەرهێنان دابەزێنێت. تەنانەت یەکێتی سۆڤیەت (هەروەها زۆربەی عیراقیەکانیش) پێشبینی ئەم پێشهاتەیان نەدەکرد، هەروەها سەرەڕای ئەوەی





وولاتانی کۆمیکۆت پشتیوانیان دەربڕی بۆ خۆماڵیکردن بەلام بڕی ئەو نەوتەی کە ئەوان بە درێژایی نیوەی دووەمی ١٩٧٢ دەتوانن بیبەن هێشتا لە رووی رێژەییەوە کەمە. لە راگەیاندنی خۆماڵیکردنەکەدا حکومەتی عیراقی بە تەنگ روونکردنەوە ئەوەبوو کە ئەوان بەهۆی رەچاوکردنی هەڵوێستی فەرەنسا بەرامبەر نەتەوەی عەرەب ئامادەن بۆ دانووسان لەسەر رێکەوتنێکی نوێ لەگەڵ CFP، کە هاوبەشە فەرەنسیەکەیە لە IPC. CFP دەرهێنانی گەیاندەوە ئاستی پشکی پێشووی خۆی لە نەوت کە بەر لە خۆماڵیکردن هەیبوو (نزیکەی ١٢ ملیۆن تۆن لە ساڵێکدا)، لە کاتێکدا هێشتا ناوبژیوانی لە نێوان عیراق و IPC لە ئارادابوو، هەروەها هەواڵ وایە کە بەرەو زیاتریش ببات. لێك تێگەیشتن لە نێوان فەرەنساو عیراق لە حوزەیراندا زەمینە سازی بۆ ئەگەری کڕینی نەوتی خاوی زیاتر (یان زۆرتر لە مافی CFP لەپێش خۆماڵیکردن) کرد. بەلام ئەمە بەستراوەتەوە بە پابەندبوونی عیراق بە دانووسانی خێرا لەگەڵ IPC لەسەر قەرەبووکردنەوە، فەرەنسا پابەندە بەراوێژکردن لەگەڵ حکومەتەکانی تر کە کۆمپانیاکانیان پشکیان هەیە لە IPC بەر لەوەی رێکەوتنی کۆتایی مۆر بکرێ، بۆ ئەوەی هەڵوێستی IPC لە دانووساندن لاواز نەبێ.

٤- لەسەرەتادا رۆڵی شێخ یەمانی (وەزیری نەوتی عەرەبی سعودی) لە دانووساندا زاڵبوو بەسەر دانووسانەکانی تر لە نێوان عیراق و IPC کە سکرتێری گشتی ئەوسای ئۆپێك و بەڕێوەبەرێکی کۆمپانیای نەوتی فەرەنسی CFP پێی هەڵدەستان. لە کۆبوونەوەی وەزاری ئۆپێکدا لە تشرینی یەکەم، کە گفتوگۆی لەسەر ئەو مەرجانە کرد کە بەدەست هاتوون، عیراق پارێزگاری لە هەڵوێستی خۆی کرد تەنانەت لەسەر بیرە نەوتەکانی بەسراش (کە خۆماڵی نەکرابوون) بەلام کە دانووسان دەستی پێکردەوە کۆمپانیاکان هەستیانکرد کە دەرفەتێکی گونجاو هەیە بۆ گەیشتن بە رێکەوتنێکی گشتی، کە بەسراو موسڵ و باکووری رومێلەو هەروەها کەرکوکیش بگرێتەوە. عیراقیەکان هەستێکی وایان بەخشی کە بایەخێکی دڵسۆزانە دەد[...] بە یەکلایی کردنەوەی مەسەلەکە، لە کانونی یەکەم[...] ئەو رۆژنامانەی لەلایەن حکومەت کۆنترۆڵ کرا[...] بەیانێکیان بلاوکردەوە سەبارەت بەو هەوڵانەی [...] دراون بۆ دانانی ((بناغەیەك بۆ یەکلایی کردنەو[...] کۆتایی))، بەلام گەشبینیەکەیان تا ئێستا لـ[...] کەمبوونەوە دایەو ئاکامی دانووسانەکانیش نادیارە.

٥- خۆماڵیکردن کاریگەری بەهێزی لەسەر باردۆخ[...] دارایی عیراقەوە هەبووە، داهاتەکانی حکومەت لـ[...] کێڵگەکانی IPC لە (٢٣٠) ملیۆن پاوەند ساڵی ١٩٧١ دابەزیوە بۆ نزیکەی ١٣٠ ملیۆن پاوەند لە ١٩٧٢ [...] حکومەت چەند هەنگاوێکی هەڵێناوە بۆ چارەسەرکرد[...] کورتهێنانەکە، وەکو دابەزاندنی موچەی کارمەندا[...] حکومی، کەمکردنەوەی نێردەکان (بعثات) بۆ دەرەو[...] توندکردنی کۆنترۆڵی هاوردەکردن، بڕینی بودجە[...] پەرەپێدان هەروەها دەرچوواندنی ((سەنەدەکان[...] خۆراگری)) (دەڵێن کڕینی ئەم سەنەدانە خۆویستانە[...] هەروەکو کاری بێ کرێ لەپێناو بەشداری کردن لـ[...] سەندوقی یارمەتیدانی فەلەستینیەکان). لە وایت هۆ[...] [شەقامێکە لە لەندەن کە چەندین دامەزراوەی حکوم[...] لە خۆدەگرێ، وەك ئاماژەیەك بۆ حکومەتی بریتانی[...] بەکاردێ] وا مەزەندە دەکرێ کە بەهۆی ئەم رێوشوێنان[...] و زیادەی ئالوگۆڕی بیانی و کەڵەکە بوونی دراوی بیان[...] لەپێشوودا، هەورەها پاشەکەوت کردنی (العمل[...] الصعبة) بەهۆی ئالوگۆڕی تازەی کالاکان، عیرا[...] لەوانەیە بتوانێ بۆ ساڵێك یان زیاتر خۆی رابگرێ بـ[...] ئەوەی تەنگژەی ئەوتۆ بەخۆوە ببینێ. کورتهێنان لـ[...] ئالوگۆڕی بیانی (دەرەکی) کاریگەری خۆی هەبووە[...] بەلام بەهۆی کۆمەکی دارایی لەلایەن ئەواپێك [ وولاتان[...] عەرەبی ئەندام لە ئۆپێك ] و هەندێ سەرکەوتن لـ[...] فرۆشتنی نەوتی کەرکوك، کە دەگاتە نزیکەی (٢٧[...] ملیۆن تۆن لە ساڵێك بە داهاتنی مانگی تشرینی دووەم[...] عیراقیەکان مەترسی دارمانی ئابووریان تێپەڕاند.

٦- سەبارەت بە پەیوەندییە دەرەکیەکان لەم ساڵەد[...] ئەوەی جێگەی سەرنجە یەکێتی سۆڤیەتە، کـ[...]

پەیوەندییەکانی لەگەڵ عیراق ڕێکخست لە ڕێی پەیماننامەی دۆستایەتی و خستنەڕووی هاوکاری خۆی بۆ پیشەسازی نەوتی عیراقی، لە ڕێگەی کڕینی نەوتی خۆماڵیکراو و هەروەها کردنەوەی کێڵگەی باکووری ڕومەیە لە ئایاردا، کە بەشێکە لەو ناوچەیەی لەساڵی ـ١٤٠ لە ژێر دەستی IPC دەرهێنلاو دواتر بەهۆی یارمەتی سۆڤیەتی پەرەپێدرا. (بەرهەم لەم کێڵگەیەدا وا حسێبی بۆ دانراوە کە بگاتە ڕێژەی ساڵانە (١٨) ملیۆن تۆن لە ناوەڕاستی ١٩٧٤و (٤٠-٥٠) ملیۆن تۆن لە نیوەی دووەمی ١٩٧٥). لەو سەردانەی وەزیری پیشەسازی عیراق بۆ مۆسکۆ لە ئەیلول ڕووسەکان پەیمانی خۆیان زیاتر کرد بەڕازیبوونیان لەسەر بردنی نەوت بەرامبەر هەموو قەرزەکانی سەرعیراق تاساڵی ١٩٨٠. ئەگەر ئەمە لە بەرچاو بگرین کە عیراق پێشتر قەرزێکی زۆری داوەتەوە، دەتوانین بڵێین بەکورتی ئەمە دەستکەوتێکی گرنگ بوو بۆ عیراق. بەڵام ئەمە ئابووری عیراقی زیاتر وابەستەی یەکێتی سۆڤیەت کرد. لەهەمان کاتدا ڕەزامەندی دراوە لەسەر دروستکردنی پاڵاوگەیەك لە موسڵ. هێڵی نەوتی بەغدا- بەسرا، هەروەها پرۆژەکانی تریش کە ئەنجام دەدرێن بەهۆی قەرزەکانی سۆڤیەت کە ساڵی ١٩٧١ وەرگیراون. ڕاپۆرتەکانی پێش کۆتایی ساڵ وادەگەیەنن کە عیراق داوای پێشکەش کردووە بۆ ئەوەی وەك چاودێر بێتە ڕیزی وڵاتانی کۆمیکۆن، ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە تا چ ڕادەیەك پەیوەندییە ئابوورییەکانی لەگەڵ ئەم بلۆکەدا گەیشتوە. سەرەڕای ئەمەش زێدەڕۆییە ئەگەر بڵێین بۆتە پاشکۆیەکی ئابووری. سەرەڕای ئەمەش ئەو کارتەی کە هێشتا لەبەردەستدا ماوە ئەوەیە کە کۆمپانیا ڕۆژئاواییەکان کڕیاری سەرەکی نەوتی باکووری دەمێنەن. هەوڵە چالاکەکانی عیراق بۆ دۆزینەوەی بازاڕ بۆ نەوتەکەی لە ئیسپانیا، یۆنان، هیندستان، ئیتالیا، بەرازیل، میسر، یابان، و شوێنەکانی تر، ئەو ڕاستیە دەردەخەن کە وڵاتانی کۆمیکۆن پێویستیەکی کەمی ـیان بۆ بازاڕ دابین دەکەن، بەلایەنی کەم بۆ کاتی ئێستا.

١٠- ساڵەکە موژدەیەکی کتوپڕی ئەوتۆی بۆ ئەو وڵاتە ڕۆژئاواییانە نەهێنا کە بەرژەوەندی ڕاستەوخۆیان لە عیراقدا هەبوو، بێجگە لە فەرەنسا کە سوودی لەو هەڵسوکەوتە تایبەتیە بینی کە عیراقیەکان دوای خۆماڵیکردن لەگەڵیان کرد وەك ڕێزگرتنێك لە ((هەڵوێستی ئیجابیانەی لە کێشەی عەرەب)) (هەروەها، لەوانەیە ئەوەش بگوترێ، کە IPC زیاد ڕەق بوو لە مامەڵەکردنداو دادوەرانە نەبوو لەماوەی بەر لە خۆماڵیکردندا) فەڕەنسا هەوڵی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆی دەدا لە کاتێکدا کە هەوڵیداوە کێشەکانی IPC بە تەواوی یەکلابکرێتەوە. تا ئێستا فەڕەنسا هیچی لەدەست نەداوەو چاوەڕێی دەستکەوتی گەورەتریشە، بۆیە ئەگەر گفتوگۆکانی IPC هەرەس بێنێ ئەوا CFP سوودمەند دەبێ.

٨- بۆ بریتانیا هەرچەندە نەوتی عیراق تەنیا ڕێژەی٣,٥٪ی بەکاربردنی پێکهێنا لەساڵی ١٩٧١، بەڵام یەدەگی نەوتی عیراق گرنگی چاوەڕوانکراوی مەزنی هەیە. هەروەها بەشداری IPC لە تەرازووی پێدان (میزان المدفوعات)ی ئێمە بایەخی خۆی هەیە. بۆیە نیگەرانی سەرۆکی حکومەتی خاوەن شکۆ بە درێژایی ئەم ساڵە بۆ ئەوە بوو کە بگەینە ڕێکەوتنێك کە دەرفەتی بەردەوامیمان پێبدات بۆ گەیشتنە نەوتی عیراق. هەر بۆ ئەوەی زیان بە دانووسانەکانی IPC نەگات حکومەتی خاوەن شکۆ لە دژی پرۆژەکانی قەرزدانە عیراق نەوەستا کە لە نیوەی دووەمی ئەم ساڵە بەرزکراوەتەوە لە IBRD [ بانقی نێودەوڵەتی بۆ گەشەپێدانو ئاوەدانکردنەوە ] ، بۆ ئەوەی ماوە، پێدەچێ هەناردەکانی بریتانیا بە ڕێژەی ١٠٪ زیاتر بێ لە ژمارەکەی ساڵی ١٩٧١ کە نزیکەی (٢٥) ملیۆن پاوەند بوو. بۆیە خواستە تازەکان گرانە لە نیوەی دووەمی ئەم ساڵە بەدەست بێن، ئەمەش بەهۆی سیاسەتی عیراق لەدوای خۆماڵیکردن کە پێشینە دەداتە ئەو وڵاتانەی کە ڕێکەوتنی بازرگانی لەگەڵیاندا هەیە (وڵاتە عەرەبیو کۆمنیستەکان، فەرەنسا، ئیتالیا، هیندستانو بەرازیل)، بەڵام پەیوەندییە دبلۆماسیەکان هێشتا بەکەلکن، لەگەڵ ئەگەرێکی کەمی زوو دەستپێکردنەوە، بەجۆرێک

ئاسایی بوونەوەی پەیوەندییەکانی سوریاو شانشینی یەکگرتوو [ بریتانیا ] هانی عیراقیەکان دەدا کە ئەوانیش بەدوایدا بێن (واتە هەمان کار بکەن)، هەوڵی غافڵکوژکردنی سەرۆك وەزیرانی پێشووی عیراق عەبدولرەزاق نایف لە لەندەن لە مانگی شوباتدا (بەڵام ئەم ئامانجە لەنێو چەندین ئامانجی تری باندی غافلکوژی بەعسی نەپێکرا) وامان لێدەکا کۆنترۆڵی ڤیزای خۆمان توندتر بکەین، بەڵام پەیوەندی خوێندن و پرۆفیشناڵ (پیشەیی) زۆر ئەنجام نەدراون.

٩- عیراق لە هەڵسوڕاندنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ هاوسێکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیدا ڕێگەی باشی گرتووە، کۆ کردنەوەی پشتیوانی بۆ شۆڕشی عەرەبی لە عومانەوە تا فەلەستین، لەگەڵ چەند هەوڵێکی نیوە دڵی بۆ شکاندنی گۆشەگیری خۆی لە نێو حکومەتە عەرەبیەکان، پێشنیارەکەی مانگی ئاداری عیراق سەبارەت بە یەکێتیەکی نوێ کە بیبەستێتەوە بە میسرو سوریا- لە دژی پێشنیارەکانی شا حوسێن بۆ کەناری ڕۆژئاوا- ڕووبەڕووی وەڵامی نەرێنی هەردوو وڵات بۆوە. هەروەها کاتێ لیبیا لە نیسان بالیۆزی خۆی لە عیراق کێشایەوە وەك نارەزایی لە بەرامبەر پەیماننامەی عیراقی- سۆڤیەتی، ئەگەری تۆڵەسەندنەوە هاتە ئاراوە لەبەر ئەوەی خرابووە دەرەوە لە پێشنیارەکەی عیراق. ناکۆکی لەنێوان ڕژێمی بەعس لە بەغداو دیمەشق بەردەوامە، سەرەڕای هەوڵەکانی یەکێتی سۆڤیەت بۆ سەرخستنی لێکنزیك کردنەوە، بۆیە گفتوگۆکان لەبارەی دابەشکردنی ئاوی فوڕات یەکلاکەرەوە نییەو هەروەها کەمبوونەوەی داهاتەکانی هێڵی بۆریە نەوتەکانی سوریا دوای خۆماڵیکردنی IPC جۆرێکی نوێی لە ڕکەبەرایەتی هێنا ئاراوە. دانووسانە ڕاستەوخۆکان لەنێوان عیراق و کوێت لەسەر کێشەی سنوور هیچ پێشکەوتنێکی ڕاستەقینەی بەدەست نەهێناوە، هەرچەندە شاندێکی دانووسانکار کە لە ژمارەیەك پەرلەمانتاری کوێتی پێکهاتبوو لە کانوونی یەکەمدا سەردانی عیراقی کردو لەکاتی گەڕانەوەیدا ڕاپۆرتی دا کە ئامادەگی عیراق بۆ هێورکردنەوە (( بێ مەرج))ە، لە پێناو بەهێزکردنی هەڵوێستی هاوبەشی عیراقی- کوێتی بە ئاراستەی عەرەباندنی کەنداو.

١٠- لەلای ڕۆژهەڵاتەوە، پەیوەندییەکانی ئێرانی- عیراقی بەئاڵۆزی ماوەتەوە لەدوای ڕووداوی دوورگەکانی کەنداوو پچڕانی پەیوەندییەکانیان لە کۆتایی ساڵی ١٩٧١، دەستدرێژی کردنە سەریەکتر لەسنوور بەردەوامە، وەك دزەکردنی تێکدەران لە عیراقەوە. دەرکردنی هەزاران هاووڵاتی ئێرانی لە زستانی ١٩٧١- ١٩٧٢ لە لایەن عیراق وای لە دەسەڵاتدارانی ئێران کردکە لە مانگی نیسانیشدا نامەیەکی بۆ ئەنجومەنی ئاسایش هەنارد بۆ نارەزایی دەربڕین لە هەمبەر (( کارە دوژمنکاریەکانی سەرسنوور))ی ئێرانیەکان. ئێرانیەکان بە تێگەیشتنێکی تەواوەوە لە مەغزاو کرۆکی پەیماننامەی سۆڤیەتی- عیراقی مانگی نیسان دەڕوانن. لەوانەیە لە ژێر فشاری سۆڤیەت بووبێ کە عیراقیەکان لەماوەی هاوین ئاماژەی وایان دەدا کە ئەوان هەوڵی خۆیان دەدەن بۆ ئەوەی کێشەکانیان لەگەڵ ئێران یەکلابکەنەوە، بەڵام هیچ هەوڵێکی مکوڕانە نەدراو ساڵەکە تەواو بوو لە کاتێکدا هەموو میدیاکانی عیراق ئێران بە چەکدارکردنی کوردەکان تاوانبار دەکەن.

١١- ئەم تاوانبارکردنە بێ گومان بنەمای هەیە. نارەزایی کورد لە هەمبەر جێبەجێ نەکردنی زۆربەی برگەکانی ڕێکەوتننامەی ١٩٧٠، لە نێوانیاندا گرنگترینیان کە ئامارە فەرمیەکە بۆ دیاریکردنی سنووری هەرێمی کوردی، دووقات بۆوە لەساڵی ١٩٧٢ لە ئەنجامی توڕەییان لە خۆماڵیکردنی کێڵگە نەوتیەکانی کەرکوك بێ ئەوەی پرسیان پێ بکرێ. ئەمە سەرباری هەوڵەکانی بەعس بۆ غافڵکوژکردنی مەلا مستەفا بارزانی. کە ئەو نیمچە متمانە بەشی لەناوبرد کە تا ئەوکاتە لە نێوان هەردوولادا مابوو. سەرەڕای ئەمەش هیچ لایەکیان ناتوانێ بە پەرۆش بێ بۆ دەستپێکردنەوەی جەنگ، کوردەکان لە زۆر باردا بای ئەوەندە واقعین کە بزانن ئەوان تەنیا دەتوانن بەرگری لە ناوچەکانی خۆیان بکەن.

- لـه کۆتـایی ساڵەکەدا بـەعس ڕووبـەڕووی ـ ـوـنۆخێکی ئابووری تا ڕاددەیەك ناهەموار دەبێتەوەو ـ ـ ـ ـ ـامیش لـه باکوور دەستی پێکردۆتـەوە. سەرەڕای ـحمش. نیشانەکانی کامڵبوونی سیاسەتی لەناوبردنی ـمـ نەیارانەی کە پێگەیەکی ئەوتۆیان نییە، تاڕادەیەك ـحرکەوت. ئەگەر هەلومەرجی ئابووری بەرەو خراپتر ـحیۆ بێگومان لەوانەیە وێنەکە بگۆڕێ، بەڵام ئەگەرێکی ـمە جۆرە وەستاوە لەسەر بەهێزبوونی پێگەی سەدام حوسێن تکریتی، جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی ـسەرکردایەتی شۆڕش و جێگری سکرتێری گشتی ـ ـتی بەعسی عیراقی. هەژموونی بەرایی ئەو بەسەر ـسەرۆك بەکر لە پاییزدا بەدیارکەوت کاتێ وایکرد ببێتە ـ ـ ـنجی سەرەکی ئاراستەکردنی ڕەخنەکان لەهەردوو کێشەکەدا. ئیتر پێگەی ئەو [ واتـە بـەکر ] لـەنێو ـ ـمەکەدا زۆر لاواز بوو، هەروەها لەوانەیە دواڕۆژی ـحنبێ لەسەر دەرەنجامەکانی سیاسەتی خۆماڵیکردن.

- ئەگەر سیاسەتەکانی ((پارتی)) جێهێڵرابێ بۆ ـ ـوە لەم پێداچوونەوەیەدا، ئەوە بەزۆری بەهۆی ئەوە ـحومکە شوێنگەیەکی کەم بایەخی گرتووە. هەوڵەکانی ـمعس بۆ تەماع دانە بەر کوردەکان و کۆمۆنیستەکان ـهـر ئـەم دووانـەش گروپـی سیاسـی گـرنگن)و ـ کێشانیان بۆ بەرسنگی (واجهة) نیشتیمانی هێشتا ـسەرکەوتووانەیە. لە ڕووی تیۆرییەوە مۆرکردنی ـپەیماننامە لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت دەبێ یارمەتی ـمعس بدا لە مامەڵەکردنی لەگەڵ هەردوو گروپەکە، ـەڵام بەکردار پاڵەپەستۆی سۆڤیەت بۆ سەر بارزانی بۆ هـ ـوکاری کردن لەگەڵ ڕژێمدا لەم کەشوهەوایەی بێ متمانەیی ئێستادا بێ سوودە. هەروەها پەیوەندییەکانی بەعسی- کۆمۆنیستی لە ئاستەنگ دایە، دیارە ـ ـووسەکان لەکاتی بەستنی پەیماننامەکە هەندێ ـحستکەوتیان بۆ پارتی کۆمۆنیستی عیراق بەدەستهێنا، ـئەوە بوو دوای مۆرکردنی پەیماننامەکە بەماوەیەکی ـ ـوو ئەندامی لیژنەی ناوەندی دیاریکران بۆ حکومەت و هـەروەها کۆت و پێوەندەکانی سەر پارتەکە [ پارتی کۆمۆنیست ] تا ڕاددەیەك شلکرا. هەرچەندە هێشتا ئەم پارتە ڕێپێدراو نییەو بەعسیش بەردەوام ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ئەوان نایانەوێ کرۆکی دەسەڵات لەگەڵ هیچ لایەنێك دابەش بکەن. بەپێی ڕاپۆرتەکان ئەوان پێشنیاری دابەشکردنی کورسیەکانی ئەنجومەنی نیشتمانیان کردووە- کە بڕیاروایە دابمەزرێ- لە نێوان خۆیان و کوردەکان و کۆمۆنیستەکان بە ڕێژەی ٨٠ : ٣٠ : ٢٠ ، لە دژی ئەوەش وەستاون کە هەریەکە لە کوردو کۆمۆنیستەکان چالاکی سیاسی لەنێو لەشکردا بنوێنن.

١٤- بەکورتی، بەدرێـژایی ئـەم ساڵە ڕژێمـی بەعسی پارێزگاری لە هەژموون و دەسەڵاتی خۆی کردووە بەسەر ژیانی سیاسی وڵاتداو پەیوەندییەکانی لەگەڵ سۆڤیەت بەهێز کردووە. هەرچەندە بە بڕیاری سەرەڕۆیانەی خۆماڵیکردنی نەوت و ڕێگەدان بە تێکچوونی بارودۆخی کورد سەرلەنوێ نائارامی ڕووی لە ژیانی ئەو نەتەوە کردەوە، کە کێشەو ناکۆکی کەم نییە. گرنگی دانی ڕۆژئاواییەکان بەعیراق لەبەر یەدەگی نەوتەکەی و هەروەها شوێنگە ستراتیژییەکەیەتی لەسەر کەنداو، تۆماری هاوپێچ کە تایبەتە بە ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٧٢ی عیراق خوێندنەوەیەکی ڕەشبینانەی لێدەکرێ، بەڵام لەگەڵ بەردەوامبوونی دانووسانەکانی IPC هێشتا ئومێد هەیە کە داواکاریە دژەکانی نیشتمانی عیراقی و بەرژەوەندیە خۆییەکانی ئابووری ڕۆژئاوا بگەنە یەك.

## هاوپێچ

تۆماری ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٧٢

کانوونی دووەم:-

ڕۆژ: ٣ - ئەو شاندی دانووسانەی کە بە سەرکردایەتی نوێنەری وەزیری ئابووری بوو لە چینەوە گەڕایەوە. چین (١٠٠) هەزار تۆن کبریتی عیراقی ساڵانە دەکڕێ بۆ ماوەی پێنج ساڵ.

٦- کردنەوەی کێڵگەی کبریتی المشراق لە نزیك موسڵ بەئامادەبوونی وەزیری پیشەسازییە کیمیاوییەکانی پۆڵەندا.

١٥ - ١٩ - خولی یەکەمی دانووسانەکانی نێوان عیراق و IPC.

شوبات:-

١ - ٦ - خولی دووەمی دانووسانەکانی عیراق/ IPC. دانووسانەکان بە شێوەیەکی کاتی وەستا دوای ئەوەی حکومەت پێشنیاری کۆمپانیای ڕەتکردەوە.





١٠- عیراق دووبارە سنووری خۆی کردەوە بۆ بازرگانی لەگەڵ ئوردەن.

١٠-١٧- سەدام حوسێن سەرۆکایەتی شاندی دانووساندکاری حکومەت/ حیزب دەکات، کە وەزیری دەرەوەش لە خۆ دەگرێ، بۆ مۆسکۆ.

١٨- هەوڵدان بۆ غافڵکوژکردنی جەنەراڵ عبدالرزاق النایف لە لەندەن، ناوبراو سەرۆک وەزیرانی عیراق بۆ ماوەی (١٠) ڕۆژ دوای کودەتای بەعس لە ١٧ی تەمووزی ١٩٦٨.

١٩- MV Rumaila کە یەکەم کەشتی نەوت هەڵگرە لەنێو ئەو حەفت کەشتیەی عیراق کە لە ئیسپانیا دروست دەکرێن، درایە دەست عیراق.

٢٢- سەدام حوسێن بڵاوی کردەوە کە ((گفتوگۆی کراوە)) بەم زووانە دەست پێدەکات لەگەڵ هێزە پێشکەوتنخوازە نیشتمانیەکانی تر.

٢٦- هەوڵی غافڵکوژکردنی عارف عبدالرزاق (کە سەرۆک وەزیرانی پێشووی عیراق بوو) لە قاهیرە. (١٧) عیراقی دانیان بەوە ناوە کە لەلایەن حکومەتی عیراقەوە فەرمانیان پێکراوە بۆ غافلکوژکردنی شەش سیاسەتمەداری پێشووی عیراق کە لە قاهیرە دەژین.

٤- عیراق بووە ئەندام لە ئەواپیك [ ڕێکخراوی وڵاتانی عەرەبی ئەندام لە ئۆپیك ] .

٥- ئاژانسی هەواڵەکانی عیراق باس لەوە دەکەن کە کوێت (١٤٣٩) عیراقی لە نێوان شوباتی ١٩٧١و شوباتی ١٩٧٢ دیپۆرت کردووە. لەوانە (٥٣٩) کەسیان لەمانگی دوایی دەرکران.

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش پێشنیاری کردووە سندوقێك بۆ یارمەتیدانی کەسوکاری شەهیدانی شۆڕش دابنرێ. هەروەها ئەوەی خستەڕوو کە فەلەستینیەکان چونکە هاووڵاتی عەرەبی چەوساوەن بۆیە مافی نیشتەجێ بوونیان هەیە لە عیراقدا.

٩- ڕێکەوتنێك لەگەڵ چیکۆسلۆڤاکیا مۆرکرا بۆ وەرگرتنی قەرزێکی (٥٠) ملیۆنی [ دۆلار ] بەمەبەستی کڕینی کەرستەی پیشەسازی نەوت.

١٥- حکومەتی عیراقی پلانەکەی شاحوسێنی بۆ (مەملەکەتی عەرەبی یەکگرتوو) ڕیسواکردو پێشنیاری ((یەکێتی خێرا))ی لەگەڵ میسرو سوریا خستەڕوو.

١٦- حکومەت بانگی IPC کرد بۆ ئەوەی پێشنیارەکانی خۆی بخاتەڕوو لە پێناو ((هاوبەشی)). IPC ئەمەی کرد لە (١٩)ی مانگدا.

٢٠- KDP [ پارتی دیموکراتی کوردستان ] نیگەرانی خۆی دەربڕی سەبارەت بەوەی کە ڕاوێژی پێنەکراوە لەبارەی پێشنیاری یەکێتی لەگەڵ میسرو سوریا.

٢١-٢٨- سەدام حوسێن سەردانی دیمەشق و قاهیرەی کرد بۆ تاوتوێکردنی پێشنیارەکەی سەبارەت بە یەکێتی لەگەڵ میسرو سوریا.

شوبات/ ئادار- پەتای جیوەی ژەهراوی لە باکووری عیراق پەیدابوو. دوای ئەوەی پەلەوەرو جوتیاران گەنمی بەجیوە چاکراویان خواردووە. [ حکومەت ئەم گەنمەی پێدابوون تا بیچێنن و بەرهەم زیاتر بێ نەك بیخۆن ] لە نێوان ٥-٦ هەزار کەس لە کۆتاییدا مردن.

نیسان:-

٦-١١- Kosygin [ لەساڵانی چلەکان سەرۆك وەزیرانی یەکێتی سۆڤیەت بوو لەم ماوەیەشدا وەزیرێکی گرنگ بوو ] سەردانی عیراق کرد. لە (٩)ی نیساندا ڕێکەوتنی (١٥) ساڵەی دۆستایەتی سۆڤیەتی/ عیراقی واژۆکرا. لیبیا بالیۆزی خۆی لەبەغدا کێشایەوە وەك ناڕەزاییەك لە بەرامبەردا.

٧-١٤- ئاهەنگەکانی بیست و پێنجەمینی ساڵیادی دامەزراندنی حیزبی بەعس، کە تیایدا کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی عیراقی دەرهێنانی لە کێڵگەی باکووری ڕومێلە دەستپێکرد، بە ئامادەبوونی Kosygin .

٩- بەردی بناغەی پرۆژەی کەناڵی ئاوی سەرسار (ثرثار) دانرا.

١١-١٤- بەیەکدادان لە نێوان هێزەکانی عیراقی و ئێرانی لە خانەقین.

١١-١٦- هێزە دەریاییەکانی سۆڤیەت هاتنە بەسراو ئوم قەسر.

١٨- پرۆتۆکۆڵی عیراقی- سۆڤیەتی لەبارەی هاریکاری ئابووری و تەکنیکی واژۆکرا.

١٨-٢٨- سەردانی تیپی تێنسی سەرمێزی چینی.

٢٢- ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش مافەکانی ((کلتووری و زمان))ی بەخشیە کەمینە کریستیانەکان لە عیراق.

ئایار:-

١-٧- وەزیری دەرەوە سەردانی کوێت و بەحرێن و قەتەرو ئەبوزەبی کرد.

٧-١٨- سەرۆکی زانکۆی بەغدا سەردانی بریتانیای کرد وەك میوانی کۆنسوڵیەی بریتانی.

١٥- هەموارکردنی وەزاری. دوو نەتەوەخوازو دوو کۆمۆنیست و دوو بەعسی تریش وەکو وەزیر دیاری کران.

حکومەت ئاگاداری IPC کردەوە کە دابەزینی داهات بەهۆی [illegible] کردن لە ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست قەبوڵ ناکرێ.

- حکومەت ئاگاداری IPC کردەوە کە دوو هەفتەی [illegible] بۆ گێڕانەوەی ڕێژەی بەرهەمهێنانی پێشوو و [illegible] بە داواکاریەکانی حکومەت، ئەگەرنا یاساکان [illegible][ مەبەست یاساکانی خۆماڵیکردنە ] بەرنامەی [illegible] گرتنی ئابووری (تقشف) ڕاگەیەنرا.

[illegible] ڕێککەوتننامەی هاوکاری تەکنیکی و کلتووری لەگەڵ [illegible] واژۆکرا.

[illegible] حکومەت مەرجەکانی IPC بۆ یەکلایی کردنەوەی ناکۆکی [illegible]

[illegible]

- حکومەتی عیراقی IPC [ کۆمپانیای نەوتی عیراقی ] [illegible] کرد (بەڵام BPC و MPC نەخێر) و کەلوپەلەکانی [illegible] بەردەستی کۆمپانیای عیراقی بۆ چالاکیەکانی نەوت. [illegible] سەرکردایەتی شۆڕش ئامادەیی خۆی ڕاگەیاند بۆ [illegible] لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا [illegible] ئەگەر فەرەنسا بیەوێ.

[illegible] سەردانی شاندی ئابووری فەرەنسی کە لە (٥٧) پیاو [illegible] بۆ کردنەوەی گەشتی هێڵی ئاسمانی فەرەنسی.

[illegible] نەوت سەردانی سوریاو لوبنانی کرد بۆ گفتوگۆ کردن [illegible] حکومەتەکانیان لەبارەی IPC.

[illegible] وەزیری دەرەوە سەردانی مۆسکۆی کرد بۆ [illegible] کردنی خۆماڵی کردنی IPC. ڕێکەوتننامەی ئابووری و [illegible] لە (٧)ی مانگدا واژۆکرا.

[illegible] سەردانی شاندی CPSU [ پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت ] بەسەرۆکایەتی مالباخۆف.

[illegible] وەزیری نەوت سەرۆکایەتی تیمی عیراقی کرد بۆ [illegible] کۆبوونەوەیەکی تایبەتی ئۆپیک و ئەواپیک لە بەیروت.

[illegible]-١٨- سەدام حوسێن و سێ ئەندامی تری (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) سەردانی پاریس دەکەن.

[illegible] - بودجەی وەبەرهێنانی ١٩٧٢- ١٩٧٣ کەمکرایەوە لە ٢٤٢ [illegible] دیناری عیراقی بۆ ١٣٠,٥ ملیۆن. باڵیۆزی لیبیا گەڕایەوە [illegible] بەغدا (بڕوانە (٦)ی نیسان.

١٠- وەزیری نەوت سەردانی ڕۆمای کرد بۆ گفتوگۆ لەگەڵ EN[illegible] [ کۆمپانیایەکی نێو نەتەوەیی ئیتاڵی بۆ پیترۆڵ و گاز ].

١٠-٢٤- شاندێکی کۆمیتەی ناوەندی پارتی یەکێتی سۆشیالیستی GDR [ کۆماری ئەلمانیای دیموکرات ] سەردانی عیراقی کرد. ڕێکەوتننامەی هاوکاری لە (٢٢)ی مانگ واژۆکرا.

١٩-٢٠- وەزیری دەرەوەی ئیسپانیا سەردانی بەغدای کرد.

٢١-٢٤- وەزیری دەرەوەی ئەندەنوسیا سەردانی بەغدای کرد.

٢٦- وەزیری نەوت نوێنەرایەتی عیراقی کرد لە کۆنگرەی ئۆپیک لە ڤیننا.

تەمموز:-

٤- سەرۆک Giri [ جیری/ چوارەم سەرۆکی هیندستان بوو لەماوەی نێوان ١٩٦٩/٨/٢٤ تا ١٩٧٤/٨/٢٣ حوکمی کرد] سەرۆکی هیندستان سەردانی بەغدای کرد.

٦- دوو پاپۆڕی نەوتی سۆڤیەتی نەوتی خاوی کەرکوکیان لە بانیاسەوە هەڵگرت لەدوای خۆماڵیکردن.

٨- عیراق بووە یەکەم وڵاتی عەرەبی کە دان بە بەنگلادیش دابنێ.

١٠- وەزیری کشتوکاڵ بەهۆی بریندار بوونی لەئەنجامی ڕووداوی ئۆتۆمۆبیل مرد، ناوبراو لە ڕێگابوو بۆ لێکۆڵینەوە لە غافڵگیرکردنی حاکمی شنگار.

١١- وەزیری گواستنەوە شوێنی وەزیری کشتوکاڵی گرتەوە لە ئۆفیسەکەی.

١٢-١٦- وەزیری دەرەوە سەردانی دیمەشقی کرد بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی مەسەلەکانی نەوت و بەنداوی فورات.

١٥- پرۆتۆکۆلی بازرگانی سۆڤیەتی/ عیراقی لەبەغدا واژۆکرا.

١٥-٣٠- وەزیری پیشەسازی سەردانی بولگاریا و کۆماری ئەلمانیای دیموکراتی کرد بۆ گفتوگۆی ئابووری.

١٦- چوار وەزیری پایەبەرز سەردانی پێنج وڵاتی کۆمۆنیستیان کرد بۆ تاوتوێکردنی ئەگەرەکانی بازرگانی و ئاڵوگۆڕی نەوت.

١٨-٢٢- وەزیری گەیاندنی فەرەنسی سەردانی عیراقی کرد، ڕێکەوتننامەی هاوکاری لەبواری (PTT) [پۆستە و تەلەفۆن و بروسکە] واژۆکرا.

١٨-٢٧- وەزیری دەرەوە سەردانی مۆسکۆو کابولی کرد.

٢٠- التاخی، ڕۆژنامەی KDP، حکومەتی تاوانبار کرد بەهەوڵی غافڵگیرکردنی بارزانی لە (١٥)ی تەمموز. ژمارەکانی ڕۆژنامەکە دەستی بەسەر داگیرا لەلایەن دەزگاکانی ئاسایشەوە.

٢٣ تەمموز-٨ی ئاب- وەزیری دەوڵەت سەردانی چیکۆسلۆڤاکیا و سۆڤیەتی کرد بۆ گفتوگۆی ئابووری.

٢٩- یەکەم پشك لەبەرهەمی نەوتی خاوی ICOO [





کۆمپانیای عیراقی بۆ بەرهەمەکانی نەوت ] بەکەشتی بارکرا بۆ فەرەنسا لە بانیاسەوە.

٣١ تەمموز-٢٩ ئاب- وەزیری بەرگری سەردانی یەکێتی سۆڤیەت و چیکۆسلۆڤاکیای کرد.

ئاب:-

٦- رێکەوتنێکی حەفت ساڵە بۆ دۆزینەوەو فرۆشتنی نەوت لەنێوان INOC [ کۆمپانیای نەوتی نیشتیمانی عێراقی ] و ((پیترۆ براس))ی بەرازیلی واژۆکرا.

١٢-١٥- وەزیری دەرەوە سەردانی قاهیرەی کرد بە ((نامەیەکی سەرۆك))ەوە.

١٧-١٨- کۆنفرانسی ((هاریکاری نێودەوڵەتی)) لەبەغدا بەسترا.

١٩ ئاب- ٢ ئەیلول- وەزیری کاروباری باکوور سەردانی هەنگاریای کرد بۆ گفتوگۆی ئابووری. هەروەها یەکێتی سۆڤیەتیش بۆ گفتوگۆی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت.

دەوروبەری ١٩- حکومەتی عیراقی و IPC رازیبوون لەسەر دیاریکردنی ناوبژیوانان.

٢٠-٢٦- وەزیری دەرەوە سەردانی هیندستانی کرد. پرۆتۆکۆلی ئابووریان لە (٢٤)ی مانگدا واژۆکرد.

وەزیری نەوت سەردانی پۆڵەندای کرد. قەرزێکی (١٠) ساڵە بەبڕی (١٠٠) ملیۆن دۆلار واژۆکرا، بەمەرجێك نەوت بدرێتەوە.

٢٨-٣٠- وەزیری دەرەوەی بەنگلادیش سەردانی عیراقی کرد.

ئەیلول:-

٢-٧- وەزیری دەرەوەی تورکیا سەردانی بەغدای کرد.

٥- وەزیری ئابووری رایگەیاند کە ئەگەری بەشداری کردنی عیراق لە comecon وەکو چاودێر لەژێر توێژینەوەدایە.

دەوروبەری ٥- رێکەوتننامەی هاریکاری ئابووری و تەکنیکی عیراقی- هەنگاری لە بوداپێست واژۆکرا. هەنگاریا (٥٠) ملیۆن دۆلار قەرز بدات بەمەرجی دانەوە بە نەوت.

٦- کۆنتراکتی قۆناغەکانی دووەمو سێیەمی پەرەپێدانی کێڵگەی نەوتی باکوور رومێلە واژۆکرا لەکاتی سەردانی وەزیری پیشەسازی بۆ مۆسکۆ.

١٣- وەزیری فێرکردن چوو بۆ سەنعاء بۆ هەوڵی میانگیری لەنێوان YARو PDRY [ مەبەست هەردوو بەشی یەمەنە: کۆماری عەرەبی یەمەنی و کۆماری یەمەنی دیموکراتی میللی ].

١٤- سەرۆك بەکر سەردانی مۆسکۆی کردو بە ئەنکەرادا گەڕایەوە. لە مۆسکۆ پرۆتۆکۆلی هاریکاری نێوان عیراق و یەکێتی سۆڤیەت مۆرکرا لە بوارەکانی ئاودێری، ئاوەڕۆو وزەی کارەبا.

٢١- د. سەعدون حەمادی، وەزیری نەوت و کانزاکان سەردانی Kosygin دەکا لە مۆسکۆ.

تشرینی یەکەم:-

٢٢- گفتوگۆ دەستی پێکرد لەنێوان عیراق و سوریا لەبارەی قازانجەکانی نەوت.

٢٥- نوێنەری سەرۆك بەکر سەردانی قاهیرەی کرد بۆ گفتوگۆکانی ئاشتی لە یەمەن.

١٨-٣٠- شاندی ئابووری عیراقی بۆ هیندستان گفتوگۆی لەبارەی فرۆشتنی نەوتی خاوو کبریت کرد.

١٨ تشرینی یەکەم- ١٧تشرینی دووەم- زنجیرەیەك وتاری رۆژنامەوانی هەموو ئەو خاڵانەی دیاریکرد کە جێگەی ناکۆکین لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردی [کوردستان] و حیزبی بەعس.

تشرینی دووەم:-

٤- فەرمانبەرانی کۆمپانیای پترۆلی شەریفیەی مەغریب هاتنە بەغدا بۆ گفتوگۆکردنی سەودای ئالوگۆڕی نیو ملیۆن تۆنی خاو [ نەوت ].

٦- رۆیشتنی شاندی کرێکارانی نەوتی رۆمانی.

١١- سەرۆك بەکر ئەدوەی پترۆڵی نێودەوڵەتی لەبەغدا کردەوە.

کانونی یەکەم:-

٢- کۆبوونەوەی ئۆپیك لە لاگۆس. راگەیاندنی پشتیوانی کردنی عیراق لە پرۆسەی خۆماڵیکردنی (IPC)دا.

١٠- شاندی پارتی کۆمۆنیستی عیراق سەردانی بۆ داپێستی کرد.

١٥- عیراق و ئیسپانیا گفتوگۆی ئابووریان لە مەدرید دەستپێکرد بۆ باسکردنی بازرگانی و هەروەها (٢٠) ملیۆن دۆلاری قەرزی پاپۆڕی نەوت، هەروەها پرۆژەکانی یارمەتی تەکنیکی.

١٧- میسر رازی بوو لەسەر سەودای بەکاربردنی (٢,٢٧٥,٠٠٠) تۆن لە نەوت بۆ ئەم ساڵ و ساڵی داهاتوو.

١٨- شاندی حیزبی بەعس کە لە لایەن د.عیزەت مستەفای وەزیری تەندروستی سەرۆکایەتی کرا، سەردانی مۆسکۆی کرد بۆ ئاهەنگەکانی پەنجایەمین ساڵوەگەڕ، سەیدا ساڵح یوسفیشی لەگەڵدا بوو کە وەزیری دەوڵەتەو ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردیە.

٢٤- وەزیری بەرگری جێگری جەنەراڵ (شەهاب) سەردانێکی سێ رۆژی کرد بۆ مۆسکۆ.

CONFIDENTIAL 3

5. The nationalisation has had quite a severe effect on Iraq's financial situation; revenues from the IPC fields dropped from over £230 million in 1971 to about £130 million in 1972. Measures taken by the Government to compensate for the shortfall included a cut-back in Government employees' salaries, the pruning of missions abroad, the stiffening of import controls, the slashing of the development budget, and the issue of "endurance bonds" (the purchase of which is said to be as voluntary as the unpaid work drive and contributions to Palestinian funds). It was calculated in Whitehall that thanks to these measures and the surplus of foreign exchange which she had previously accumulated, as well as savings on hard currency by new barter deals, Iraq might be able to hold out for a year or so without extreme difficulty. The shortage of foreign exchange has made itself felt but, thanks to financial assistance from OAPEC and some success in marketing Kirkuk oil, which was running at a rate equivalent to 27 million tons a year by November, the Iraqis have staved off the prospect of economic collapse.

6. In external relations the year in a sense belonged to the Soviet Union, which formalised its relationship with Iraq through the friendship treaty and demonstrated its involvement in the Iraq oil industry both by taking nationalised oil and through the inauguration in May of the North Rumaila field, which formed part of the area expropriated from the IPC in 1961 and was subsequently developed with Soviet assistance. (Production from this field is scheduled to reach an annual rate of 18 million tons by mid-1974 and 40-50 million tons by the second half of 1975.). During the visit of the Iraqi Minister of Industry to Moscow in September the Russians increased their commitments by agreeing to take oil in payment of all Iraqi debts up to 1980; given the already high level of her indebtedness this was a significant gain for Iraq in the short term, but it has bound her economy yet more closely to the Soviet Union. At the same time agreement was reached on the construction of the refinery at Mosul, the Baghdad-Basrah pipeline, and other projects to be implemented under the 1971 Soviet loan. Reports towards the end of the year that Iraq had applied to join Comecon as an observer underlined how close her economic ties with the *bloc* had become. It would, however, be an exaggeration to say that she has become an economic satellite. It is, after all, still on the cards that the main purchasers of North Rumaila crude oil will be Western companies. Iraq's vigorous efforts to find markets for her oil in Spain, Greece, India, Italy, Brazil, Egypt, Japan and elsewhere have underlined the fact that the Comecon countries have little requirement for it at least for the present.

7. The year brought little immediate cheer for the Western countries most closely involved in Iraq except for France, who took advantage of the preferential treatment offered by the Iraqis after the nationalisation in appreciation of her "positive attitude to the Arab cause" (and, it may be added, of the over-rigid bargaining position and lack of judgment of the IPC which preceded the nationalisation) to protect her own interests while at the same time working towards a general IPC settlement. So far the French have lost nothing and they stand to gain a great deal, though if the IPC talks break down CFP will be in an invidious position.

8. For Britain, although Iraqi oil accounted for only 3½ per cent of our consumption in 1971, Iraq's considerable reserves are of great potential importance. The IPC's contribution to our balance of payments is valuable also. Her Majesty's Government's chief concern during the year was therefore to encourage a settlement which would give us continued access to Iraqi oil. In

CONFIDENTIAL

138703—8 A 2





order not to prejudice the IPC negotiations Her Majesty's Government accordingly did not oppose the loan projects for Iraq which came up at the IBRD in the second half of the year. For the rest, British exports look like being over 10 per cent up on 1971's figure of nearly £25 million, though new orders were harder to come by in the second half of the year because of Iraq's post-nationalisation policy of giving preference to countries with which she has trading agreements (Arab and Communist countries, France, Italy, India and Brazil); diplomatic relations remained severed, with little likelihood of an early resumption unless a resumption of Syrian-UK relations were to encourage the Iraqis to follow suit; the attempted assassination of the former Iraq Prime Minister, Abdul Razzaq Naif, in London in February (but one of many targets of Ba'athist assassination gangs abroad) led us to tighten our visa controls; but professional and education contacts were not much affected.

9. Iraq's conduct of her relations with her Middle Eastern neighbours followed well-trodden paths, combining support for Arab revolutionary causes from Oman to Palestine with half-hearted attempts to reduce her isolation among Arab Governments. Her proposal in March for a new federation linking her with Egypt and Syria—a counter to King Hussein's West Bank proposals—met with a negative response from the two countries concerned, and when Libya withdrew her Ambassador in April in protest against the Iraq-Soviet treaty there was probably an element of retaliation for having been excluded from the proposal. Friction between the Ba'athist régimes in Baghdad and Damascus continued, despite efforts by the Soviet Union to promote a *rapprochement*; further talks on sharing the Euphrates waters were inconclusive and the decrease in Syria's pipeline revenues after the IPC nationalisation provided a new bone of contention. Contacts between Iraq and Kuwait on the frontier question made no real progress, though members of a Kuwaiti Parliamentary delegation which visited Iraq in December reported on their return that Iraqi willingness to settle was "unconditional" within the context of a common Iraq-Kuwaiti attitude towards the Arabism of the Gulf.

10. On the eastern flank, Iran-Iraq relations remained tense following the Gulf Islands incident and the rupture of relations at the end of 1971. Skirmishes on the border continued, as did the infiltration of saboteurs from Iraq. Iraq's expulsion of many thousand Iranian citizens in the winter of 1971-72 was brought to the attention of the Human Rights Commission by the Iranian authorities in March, and in April Iraq sent a letter to the Security Council protesting at Iranian "hostilities on the border". The Iranians were understandably concerned at the possible implications of the Soviet-Iraqi treaty in April. Perhaps in response to Soviet pressure, the Iraqis dropped hints during the summer that they were interested in taking the heat out of the situation, but no concrete moves were made and the year ended with the Iraqi mass media accusing Iran of rearming the Kurds.

11. These accusations were no doubt well founded. The Kurds' dissatisfaction at the non-implementation of many of the provisions of the 1970 agreement, including the all-important census to determine the boundary of the Kurdish area, was compounded in 1972 by their anger at the nationalisation of the Kirkuk oilfields without reference to them and by further attempts by the Ba'ath to assassinate Mulla Mustafa Barzani, which have destroyed what little trust existed between the two sides. Neither side can be anxious to resume hostilities however; the Kurds are in any case realistic enough to appreciate their inability to do more than defend their home territory.

CONFIDENTIAL

**سەرنج :** لەگەڵ بابەتەکەدا (٨) فۆتۆکۆپی دیکۆمێنتەکانی لەدەڵدابوو، بەڵام لەبەر زێدەکاڵییەکەیەوە شایانی بڵاوکردنەوە نەبوو، تەنها ئەم دوو لاپەڕە نەبێ، کە زۆر ڕۆشن نییە.





# بەکر سدقی لەیادەوەرییەکانی دکتۆر غروبا و بیرۆکەی دامەزراندنی "دەوڵەتی کوردی"

نا: هۆشیار محەمەد ئەمین کۆیی

کتۆر "فریتز غروبا" باڵیۆزی ئەڵمانیا لە عێراق لە یوان هەردوو شەڕی یەکەمی جیهان، ئەو سەردەمە عێراق و ناوچەکە و جیهان ڕووداوی مێژوویی گرنگیان ەخۆوە بینیوە، غروبا سیاسەتمەدار و دیپلۆماتێکی ڕەك بووە و بە وردی یادداشتەکانی نووسیوەتەوە، ەگەڵ کەسایەتی و سەرکردەکانی ئەو سەردەمەی وڵەتی عێراق هەڵسوکەوتی کردووە، جگە لەوەی ـیۆزی دەوڵەتێکی گەورەی جیهان بووە و پێگەی یاری خۆی هەبووە. غروبا لەگەڵ بەکر سدقی یوەندیی بەهێزی هەبووە، لەبەر ئەوەی ئەڵمانیا کێبەریی لەگەڵ بەریتانیا هەبوو بۆیە بەکر سدقی هێنییەکانی لای ئەو درکاندووە. لێرە بە باشمان زانی و بەشەی پەیوەندیی بە ئەفسەری گەورەی کورد ەریق بەکر سدقییەوە هەیە، بە زمانی کوردی بڵاوی کەینەوە.

غروبا لە بیرەوەرییەکانی دەڵێ: "فەریق بەکر سدقی رۆڤێکی خواست بەرز بووە، لە ساڵی۱۹۳۳ توانیی بەسەر اخیبووە ئاسوورییەکان زاڵ بێ و بە هەمان شێوەش لە وچەی فوراتی ناوەڕاست، بەڵام ئەو هەردەم هەستی بەوە کرد کە بەرامبەر ئەو کارانەی پاداشتی گونجاو ناکرێ. کاتێ کە ساڵی۱۹۳۳ یاخی بووە ئاسوورییەکانی امرکاندەوە، وەزیری ناوخۆ(حیکمەت سولەیمان) هاوکاریی باشی کردبوو، هەر ئەویش لەبەر ئەو کردارە توندانەی بەکر سدقی ڕێگر بوو لە سزادانی و دادگایی کردنی لە دادگای سەربازی، ئەگەرچی ئینگلیزەکان مکوڕ بوون لەسەر ئەو سزادانە. دواتر بە یەکەوە کاریان بۆ کودەتای سەربازی کرد. بەکر سدقی جێگری سەرۆکی ئەرکانی سوپا بوو. کاتێ کە تەها هاشمی(فەریق تەها هاشمی سەرۆکی ئەرکانی سوپا و برای یاسین هاشمی "هـ") لە گەشتێکی فەرمی لە تورکیا بوو، بەکر سدقی لەگەڵ سەرکردەی لەشکری یەکەم و فەرماندەی لیوا(عەبدوللەتیف نووری) ڕێککەوت لە رۆژی ۲٦ و ۲۷ی تشرینی یەکەمی ساڵی۱۹۳٦ بە پێویستیان زانی لەشکری ۱ و ۲ لە سەعدییە و کەناڵی روز کۆبکەنەوە بەو نیازەی لە بەغداوە بە شەمەندەفەر بچن بۆ کەرکووك بۆ ڕێکخستنی پەناوپێچی(مناوەرات) و مەشق کردنی هاوبەش، لەوکاتە بەکر سدقی و عەبدوللەتیف نووری نامەیەکیان ئامادە کرد و ئاراستەی مەلیك غازیان کرد، داوایان لێکرد کە حکومەتی یاسین پاشای هاشمی لەکار دوور بخاتەوە و وەزارەتێك بە سەرۆکایەتیی "حیکمەت سلێمان" پێك بهێنێ کە بڕوایان پێیەتی و بە ناوی "هێزی چاکسازیی نیشتمانی" واژوویان کرد و بە ڕێگایەکی نهێنی گەیاندیانە حیکمەت سلێمان بۆ ئەوەی بۆ مەلیکی ببات.

دواتر دکتۆر غروبا بە درێژی باسی کودەتایەکە دەکا و

چۆنیەتیی ئەنجامـدانی و کوشـتنی وەزیـری بـەرگری لـە وەزارەتـی یاسـین هـاشمی(جەعفـەر عەسـکەری) و دانـانی حیکمـەت سـلێمان بـە سـەرۆکی حکومـەت و فـەریق بـەکر سدقی بە سەرۆکی ئەرکانی سوپا.

ئـەو حکومەتـەی(حیکمـەت سـلێمان) پەیوەنـدیی پتـەوی لەگەڵ ئەڵمانیادا هەبوو. چەندین پەیماننامە و رێککەوتنی دووقـۆڵی لـە بوارەکـانی ئـابووری و ئـاوەدان کردنـەوە و سەربازی و کڕینی چەکی جۆراوجۆر لە ئەڵمانیا. بۆ ئەم مەبەستەش چەندین پسپۆڕی شارەزا هاتنە بەغدا.

ئەوەی زیاتر مەبەستمە، هەوڵدانی فەریق بەکر سدقی‌یە بۆ دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی کـوردی، لەبـەر ئـەوەی پەیوەنـدیی لەگـەڵ دکتـۆر غروبـا بـاش بـووە و داوای یارمـەتیی لێکـردووە، بۆیـە دکتـۆر غروبـا لـە بیرەوەرییـەکانی دەڵـێ: "فەریق بەکر سدقی رۆژانە بەردەوام سـەردانی دەکردم بۆ بەدواداچوونی ئـەو مەبەسـتەی کـە هـەیبوو. رۆژێـك پێـشنیارێکی کـرد کـە ئەفـسەرێکی روکنی ئەڵمانی بـۆ بەغدا بهێـنم بـۆ ئـەوەی بـەرگری لـە کوردستان بکـا ئەگەر هات و بەریتانیا بەغدای داگیر کرد، بۆیە عەقیدی رۆکنی خانەنشین "هاینس"م هێنا، بۆ ئەوەی ئاشکرا نـەبی بـە کەسـێکی جیولـۆجیم لەقەڵـەم دا. دواتـر رۆژانـە فەریق بەکر سدقی سەردانی دەکرد. جارێك ئەو پرسیارەی ئاراسـتەی هـاینس کـرد، ئایـا پێـشنیارت چـییە بـۆ بەرگرییـەکی باش لـە کوردستان کـاتێ کە لایـەنی ئێرانی هێرشی دەکاتە سەر؟ پاشان هەر لەسەر پێشنیاری بەکر سـدقی، عەقیـد هـاینی سـەردانی ئێرانـی کـرد بـۆ ئـەوەی ئاشـنای ئـەودیوی سـنوور بـێ، دوو جـاریش سـەردانی کوردسـتانی کـرد و لەگـەڵ سـەرکردەکانی ناوچـەکە باسـی چۆنیەتیی بەرگری کردن و بەکارهێنانی تۆپ و مـەترەلۆس و چەسپاندنی بەربەست لـە رێگاکـاندا کـرد. هەوڵیـشی دا شوێنـەکانی بـەرگری بـە درێـژایی سـنووری عێـراق و ئێران دەستنیشان بکا. هـەروەها باسـی ئامـادە کـردن و داکردنـی ئازووخـە و شـتی دیکـەیان کـرد. ئـەو ئەفـسەرە ئەڵمانیـە چـەندین جـار لەلایـەن نێـردراوی دیپلۆماسـی عێراقـی لـە تاران(خالید سولەیمان) برای حیکمـەت سولەیمان ئاگادار کراوە کە رێنمایی فەریق بەکر سدقی بکا بۆ ئەوەی چیتر دوژمنایەتیی بەریتانیا نەکا.

## پلانی بەکر سدقی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی




غروبـا لـە درێـژەی بیرەوەرییەکانیـدا دەڵـێ: "کـاتێ کـە بـەکر سـدقی بـە شـێوەیەکی نهـێنی مەبەسـتی خـۆی پێ‌ڕاگەیاندم دەربارەی بەرگری کردن لـە کوردسـتان بـە راشـکاوانەی پێـی راگەیانـدم کـە مـن کـوردم و سـەرقاڵی مەبەسـتێکی دیـاریکراوم ئـەویش دامەزراندنی دەوڵـەتێکی کوردییە کە کوردەکـانی عێـراق و ئێـران و تورکیـا لـەخۆ بگـرێ. ئـەو دەوڵەتـە کوردییـە دەبـێ بـەرگری لـە سـەربەخۆیی خـۆی بەرامبـەر بـە دراوسـێکانی بکـا. بۆیـە مەسـەلەی بـەرگری لـە کوردسـتان بـە تێڕوانینی خۆی بەندە بەو توانایە و ئەگەری جێ‌بەجێ کردنی لەلایەن خودی خۆیـەوە هەیە. دواتر بەکر سدقی گوتی: داواکارییەکەم کە پێشنیارم کردبـوو بـۆ بـەرگری لـە کوردسـتان کـاتێ کـە ئینگلیـز بەغدایان داگیر کرد، تەنها رووکەشێك بوو بۆ مەبەستە راستیەکەم.(دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی. "هـ")

غروبا دەڵێ: "بەڵام من گومانم هەبوو کە یەکەم کەس نیم دەربارەی ئەو بیرۆکەیە بڕوا بە بەکر سدقی بکەم، هـەر ئـەوەش بـووە هـۆی لـەناوبردنی لەلایـەن نیشتمانپەروەرە عەرەبەکان.

ژێدەر:
رجال و مراكز قوى في بلاد الشرق - ج١ - تاليف: الدكتور فريتز غروبا - ترجمه: فاروق الحريري

# مافی پێکهاتە نەتەوەیی و ئایینەکانی کوردستان خوێندن بەزمانی تورکمانی و سریانی و ئەرمەنی لەوەزارەتی پەروەردەی حکومەتی کوردستاندا

پارێزەر/ طارق جامباز



نەتەوەی دەسەڵاتدار (حوکمڕان) گەر مافی نەتەوەکانی دیکەی کە پێکەوە دەژین بەرێکوپێکی و تەواوی جێبەجێ نەکرد ئەوا پێشێلکردنی مافی مرۆڤو لادانێکی مەزنە لە دیموکراسی و بەڵێننامە نێودەوڵەتییەکان، چونکە نکۆڵیکردنە لەیەکسانی و هاوبەشی و بەشداریکردن لەهەموو ئاستو پلەو پایەیەکی هەرسێ دەسەڵاتەکە لەوڵاتداو ئەو وڵاتانەی کوردستانیان پێوەلکێنراوە. لەمێژە لەهەوڵدان بەپلانێکی ستراتیژی تۆکمەی بۆ دارێژراوی درێژخایەن بەو نیازەی نەتەوەکانی دیکە قۆناغ بەقۆناغ لەنێو نەتەوەی باڵادەست بتوێنیتەوەو لەژێر دروشمی سواوەی بەسەرچوو (یەك زمان.. یەك نەتەوە..)و ئێمە جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکەین کە هەر نەتەوەیەك..دەبێ دەوڵەتێك پەروەردەی خوێندنی لەهەموو قۆناغەکانی خوێندن بۆیان دابین نەکرێ ئەوا گەر زمانەکانیان هەر تەنیا لەقسەپێکردنو پێئاخاوتنو پێپەیڤین بەکاربهێنن ئەوا لەدوا رۆژێکی دوور یا نزیکدا هێدی هێدی بواری بەکارهێنانی بەرتەسك دەبێتەوەو دەرئەنجام ئەوانەی پێی دەدوێن ژمارەیان کەمتر دەبێتەوە، چونکە پێداویستی رۆژانەی ژیان هەر لە (خوێندنو کارو وەرگرتنی پلەوپایە بەزمانی دەسەڵاتدار) نەتەوەکان ناچار دەبن گەر داکۆکیشی لێ بکەن (رۆژ لەدوای رۆژ زمانەکەیان بەرەو کزی و سستی و لاوازی دەچێ) لەئەنجامدا بەمردنی دوایین کەس کە قسە بەو زمانە دەکات ئەوا زمانەکەش بەزمانێکی لەناوچوو (فەوتاو) دەژمێردرێ، بەڵام جووڵانەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردستان چ لەشاخو چ لەشارو لەکاتی شەڕو ئاشتی داکۆکی هەمیشەیی لەمافی هەموو پێکهاتە نەتەوەیی و ئاینییەکانی گەلی کوردستان کردوەو ئامانجو هیواو ئاواتی پێکەوە ژیانو لێبوردەیی و تەبایی ستراتیژی پراکتیزکردنی ئەو مافانە بوەو کە لەشاخ تەنیا ئێزگەی رادیۆیێکی هەبووبێ ئەوا ماوەی پەخشەکەی هەر چەندبووبێ ئەوا (ماوەیەکی بۆ زمانی نەتەوەکانی دیکە تەرخانکردووە)و هەر لەگەڵ دەرچوونی یەکەمین رۆژنامەی کوردی (کوردستان) پێش ١١٢ساڵ داکۆکی لەمافەکانیان کراوە، هەر بۆ نموونە لە ژ٢٧ لە لاپەڕە ١ (ئەز دزانم کوبرێ چەند ساڵ والی مەجلیسی تەرتیب بیدا ئەرمینا لەکوردا بدەن قەتل کرن وی مەجلیسی دە شێخ عوبیڵلا مرحوم حازر بێ، شێخ مەرحوم مروەك گەلەك عالیمو موتەقی بی، ئیعتراز ڤێ ئەمری خنکارکر، جەواب داکو هەر کە ئێرۆ ئەم ئەرمینا بیلا سە بەب بکوژن رۆژەکی بیت، کو میلەتەك دی وی یی مەبکوژە).

ئەم هەڵوێستە جوامێرە کوردانە، بەراشکاوانە دژی کوشتاری ئەرمەنیەکانەو ئەوسا بەم جۆرە سەرکردەیەکی

مەزنی کورد داکۆکی لەنەتەوەیەکی دیکە دەکات.

لەکوردستان چ لەشاخ و چ لەشاریش هەموو نەتەوەو ئاینەکان پێکەوە بەشداریان لەخەبات و بەرخودان و سەرهەڵدان کردووەو لەپەیرەو پرۆگرامی ناوخۆی بەرەی کوردستانی (١٩٨٨) لەخاڵی سێیەم برگەی (بێ): ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان، بەرەی کوردستانی ئەنجومەنێکی نیشتمانیی، لەنوێنەرانی رێکخراوە سیاسی و پیشەیی و جەماوەرییەکان و لەنوێنەرانی کەمایەتی نەتەوەیی و ئاینیەکان و کەسانی نیشتمانپەروەری ناسراوی کوردستان، پێکدەهێنێ، بەپێی یاسایەك کە بۆ ئەم مەبەستە دادەنرێ، دەسەڵاتەکانی ئەم ئەنجومەنە دیاری دەکات).

دوای نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ ئەوا خوێندنیان بەزمانی غەیرە عەرەبی بەرتەسك دەکردەوە، تا ئەو رادەیەی ئەو باوك و دایکانەی کەرۆڵەکانیان بەزمانی زگماکیان دەیانخوێند بەهەڕەشەو گوڕەشەو گوشار خستنەسەر تاکو داخوازی خوێندن بەزمانی عەرەبی بکەن و تەنیا دیکۆمێنتێك لەم بارەوە دەهێنمەوە کەنووسراوی ژ٧١ لە ١٩٨٠/٣/١٨ زۆر نهێنی و بەپەلەیە کە لەسەرکردایەتی نووسینگەی رێکخستنی باکووری حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بۆ سەرکردایەتی هۆبەی هەمان حزب لە هەولێرو سلێمانی رەوانکراوەو بابەتەکەش (خوێندنی کوردی) کە باسی پرۆسەکانی ئەنفالە بەدناوەکان دەکات و لەنوسراوەکە باسی نەهێشتنی خوێندن بەزمانی کوردی کراوە، کە تاکو ساڵی ١٩٩٠/ ١٩٩١ لەکوردستان نەمێنێ، واتە ئەنفالی زمانی کوردیش بکەن، پێشتریش زمانەکانی دیکەیان لەبواری خوێندن نەهێشتبوو، بەڵام راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ هەموو پلانە شوڤێنییەکانیان لەرەگ و ریشە هەڵکێشا و دوای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لە ١٩٩٢/٥/١٩ و دەستبەکاربوونی کابینەی یەکەمی حکومەتی کوردستان لەهەمان ساڵدا، ئەوا نەتەوەکانی دیکە لەهەرسێ دەسەڵات (یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەری) بەشداریان کردو لەپرۆژەی دەستووری کوردستان و یاسا پەیوەندیدارەکان جەختی لەسەر کراوەو ئەمەش مافێکی رەوای نەتەوەکانە وا دەقی چەندین ماددە لەپرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان- عێراق کە پەرلەمانی کەوردستان- عێراق لە ٢٠٠٩/٦/٢٤ پەسەندی کردووە دەهێنینەوە:

**ماددەی (١٤)**

**یەکەم:** کوردی و عەرەبی دوو زمانی فەرمیی هەرێمی کوردستانن و ئەم دەستوورە مافی هاووڵاتیانی هەرێمی کوردستان دەستەبەر دەکات لە فێرکردنی منداڵەکانیان لە دام و دەزگا فێرکارییەکانی حکومەتدا بە پێی مەرج و رێککارییەکانی پەروەردەیی بە زمانی زگماکی خۆیان. ئەمەش زمانەکانی تورکمانی و سریانی و ئەرمەنیش دەگرێتەوە.

**دووەم:** زمانی تورکمانی و سریانی دوو زمانی رەسمین لە تەك زمانی کوردی و عەرەبییەوە, لەو یەکە کارگێڕییانەدا کە ئەوانەی بەو زمانانە دەدوێن, زۆرینەی دانیشتووان پێك دێنن. ئەمەش بە یاسایەك رێکدەخرێ.

**سێیەم:** لە هەرێمی کوردستان کار بە حوکمەکانی ماددەی (٤) ی دەستووری فیدراڵی دەکرێت لە بارەی زمانی فەرمییەوە لە هەر جێیەك بواری یاسایی هەبێت بۆ جێبەجێکردنی.

## بەشی سێیەم

## مافە نەتەوەیی و ئاینییەکانی پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی هەرێمی کوردستان-عیراق

**ماددەی (٢٩)**

ئەو کەسانەی سەر بە یەکێك لە پێکهاتە نەتەوەیی و ئاینییەکانن لە هەرێمدا مافی ئەوەیان هەیە بە ناوی خۆیانەوە

بە فەرمی بناسرێن و مافی ئەوەشیان هەیە، ، ناوی شوێنە خۆجییە نەریتیەکانیان بە زمانی خۆیان بەکار بێنن، لەگەڵ پابەندبوونیان بە حوکمەکانی یاسای زمانەکانی کارپێکراو لە هەرێمی کوردستاندا.

**مادەی (٣٥)**

ئەم دەستوورە مافی نەتەوەیی و رۆشنبیری وکارگێری دەستەبەر دەکات بۆ تورکمان، عەرەب، کلدان وسریان وئاشووری، ئەرمەن بە مافی ئۆتۆنۆمیشەوە بۆ هەر پێکهاتەیەك زۆرینەی هەبێت. ئەمەش بە یاسایەك رێکدەخرێ.

لەپرۆژەی دەستووری کوردستان جەخت لەسەر مافی نەتەوەکان کراوە بەمافی ئۆتۆنۆمیشەوە لەوشوێنانەی زۆرینە پێك دەهێنن.

**لەیاسای ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان- عێراق ژ١٩٩٢/١ کە بەرەی کوردستان دەریچواندووەو لەبریارێکی تایبەتی سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی کە ئەمەش دەقەکەیەتی:**

١- بریارێکی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی: بەرەی کوردستانی لەرۆژی چوارشەممەی رێکەوتی ٨ ٤ ١٩٩٢)دا سەبارەت بەم بارە نائاسایی و سەختە، کۆبوونەوەیەکی بەپەلەی سازداو بریارێکی لەبارەی تەنیا ئەم خولەی هەڵبژاردنە دەرکرد، بەتەرخانکردنی (٥) کورسی لەئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان بۆ کەمە نەتەوایەتی ئاشووری بەهەموو تایەفەکانیەوە بە (کلدانی کاپۆلیك و کلێسای رۆژهەڵاتی ئاشووری (نەستووری) و سریانی و ئەوانی دیکەوە) هەڵبژاردنیان لەلایەن رۆڵەکانی گەلی ئاشووری و لەدایەرەی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق ژمارە (١) کەلەرۆژی (١٩٩٢/٤/٨) دا دەرچووە بگونجێت، دەبوایە هەر ئەوسا چەندین کورسی بۆ تورکمان و کورسییەك بۆ ئەرمەن تەرخانکرابایە.

**لە یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان- عێراق دەقی ماددەکانی پەیوەندیدار دەهێنینەوە:**

**ماددەی پازدە**

برگەی (٣) لەماددەی سی و شەش هەموار دەکرێ و، بەم شێوەی خوارەوە ئەخوێندرێتەوە:

٣- ئەگەر حزبێ لەناو کۆمەڵە حزبێکدا کە هەموویان بەناوی یەك نەتەوە رکابەری دەکەن (تورکمان، کلدان، ئاشووری، ئەرمەنی، عەرەب) مام ناوەندی (معدل) هەڵبژاردنی بەدەست نەهێنا، ئەوا لەو بارەدا کام حزب لەحزبەکانی ئەو نەتەوەیە زۆرترین دەنگی هێنابێ، کورسیەکی دەدرێتێ).

**ماددەی هەشتەم**

ئەم ماددەیە بۆ یاساکە زێدە دەکرێ و بۆی دەبێتە ماددەی (سی و شەش/ دووبارە):

ماددەی سی و شەشەم: (دووبارە)

**یەکەم:** پێنج کورسی تەرخان دەکرێ بۆ (کلدان سریان ئاشووری) کە پاڵێوراوانی ئەم پێکهاتانە کێبرکێی لەسەر دەکەن.

**دووەم:** پێنج کورسی تەرخان دەکرێ بۆ تورکمان کە پاڵێوراوانی ئەم پێکهاتەیە کێبرکێی لەسەر دەکەن.

**سێیەم:** یەك کورسی تەرخان دەکرێ بۆ ئەرمەن کە پاڵێوراوانی ئەم پێکهاتەیە کێبرکێی لەسەر دەکەن.

**چوارەم:** دەنگدەرانی ئەو پێکهاتانەی باسکران پاڵێوراوی پێکهاتەکە هەڵیدەبژێرن.

**لەیاسای ژ٢٠٠٦/١٥ یاسای دووەم هەموارکردن بۆ یاسای وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان- عێراق ژ ٤ ی ١٩٩٢ی هەموارکراودا هاتووە:**

**ماددەی چوارەم**

برگەی (٤) لەماددەی چوارەم هەمواردەکرێ و، برگەیەکی دیکەش بۆ ماددەکە زیاد دەکرێ و دەبێتە برگەی (٥)و،





بەم شێوەیەی خوارەوە دەخوێندرێتەوە:

٤- زمانەکانی تورکمانی و سریانی و ئەرمەنی دەکرێت بەزمانی فێرکردن لەو ناوچانەدا کە ئەوانەی بەم زمانانە دەدوێن چڕییەکی نیشتەجێ پێکدەهێنن, بەپێی بەندو بەستی (ظوابط) پەروەردەیی، بەمەرجێ فێرکردنی زمانی کوردی و عەرەبی ئیلزامی بێت.

٥- گۆڕینی بەرنامەکانی خوێندن، بۆ سەرجەم قۆناغەکانی خوێندن بەپێی داخوازییەکانی سەردەم، بەجۆرێك لەگەڵ سیاسەتی پەروەردەیی و پەرەپێدان، لەهەرێمی کوردستان گونجاو بێت.

**لەماددەی حەوتەمدا هاتووە:-**

- **بەڕێوەبەرایەتی گشتی فێرکردنی تورکمانی.**
- **بەڕێوەبەرایەتی گشتی فێرکردنی سریانی.**

**یاسای ژمارە (١١) ی ساڵی/ ٢٠٠٧**

**یاسای وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی لەهەرێمی کوردستان- عێراق**

**ماددەی سێیەم**

لەدوو برگەی ئەم ماددەیە دوو بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئایینەکانی دیکە هەیە:-

**نۆیەم: بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئایینی مەسیحی:** بەڕێوەبەرێکی گشتی بەڕێوەی دەبات کە بڕوانامەی بەرایی زانکۆی هەبێت و خاوەن شارەزایی و پسپۆڕی بێت.

**دەیەم: بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئایینی ئێزدی:** بەڕێوەبەرێکی گشتی بەڕێوەی دەبات کە بڕوانامەی بەرایی زانکۆی هەبێت و خاوەن شارەزایی و پسپۆڕی بێت.

**لەیاسای ژ١٤/٢٠٠٧ یاسای وەزارەتی رۆشنبیری لەهەرێمی کوردستان- عێراق لەماددەی سێیەمدا لەبڕگەی دوازدەهەم و سێزدەهەم بەم جۆرە هاتووە:-**

**دوازدەم: بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەری تورکمانی:** بەڕێوەبەرێکی گشتی بەڕێوەی دەبات کە بڕوانامەی پسپۆڕی زانکۆی هەبێت و خاوەن شارەزایی و کارامەیی بێت.

**سێزدەم: بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەری سریانی:** بەڕێوەبەرێکی گشتی بەڕێوەی دەبات کە بڕوانامەی پسپۆڕی زانکۆی هەبێت و خاوەن شارەزایی و کارامەیی بێت.

**پوختەی ئاماری خوێندنی تورکمانی**

| ساڵی خوێندن | ژمارەی قوتابخانە/ باخچە | ژمارەی قوتابی | ژمارەی مامۆستایان |
|---|---|---|---|
| | | کۆ | کۆ |
| ٢٠٠٥-٢٠٠٦ | ١٤ | ١٦٤٤ | ٢٤٣ |
| ٢٠٠٦-٢٠٠٧ | ١٨ | ٢٢١٩ | ٣٦٦ |
| ٢٠٠٧-٢٠٠٨ | ١٨ | ٢١٠٦ | ٤٠٠ |
| ٢٠٠٨-٢٠٠٩ | ١٥ | ١٦٢٠ | ٢٣٣ |

| ژمارەی قوتابخانە- خوێندنگا | | | | |
|---|---|---|---|---|
| پارێزگا | باخچەی ساوایان | بنەڕەتی | ئامادەیی | کۆی گشتی |
| هەولێر | ٢ | ١١ | ٢ | ١٥ |
| کۆ | ٢ | ١١ | ٢ | ١٥ |

| ژمارەی قوتابیان- خوێندکاران | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پارێزگا | باخچەی ساوایان | | بنەڕەتی | | ئامادەیی | | کۆی گشتی | |
| | کوڕان | کچان | کوڕان | کچان | کوڕان | کچان | کوڕان | کچان |
| هەولێر | ٢٠٥ | ١٨٠ | ٦٢٧ | ٢٨٥ | ٢٠٦ | ١١٧ | ١٠٣٨ | ٥٨٢ |
| | ٣٨٥ | | ٩١٢ | | ٣٢٣ | | ١٦٢٠ | |

| ژمارەی مامۆستایان | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پارێزگا | باخچەی ساوایان | | بنەڕەتی | | ئامادەیی | | کۆی گشتی | |
| | کوڕان | کچان | کوڕان | کچان | کوڕان | کچان | کوڕان | کچان |
| هەولێر | ٠ | ٢٦ | ٤٩ | ١٢٢ | ١٣ | ٢٣ | ٦٢ | ١٧١ |
| | ٢٦ | | ١٧١ | | ٣٦ | | ٢٣٣ | |

ـندی وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی کوردستان سەردانی قوتابخانە حکومی و ئەهلیەکانی تورکیای لەساڵی ٢٠٠٧ کر- ولە ٢٠٠٧/٤/١٦ ولەکاتی سەردانەکان ئەو شتانەیان ڕوون کردەوە کەوا بەهەموو شێوازێك حکومەتی هەرێمی کوردستان و وەزارەتی پەروەردە هاوکاری قوتابخانەو خوێندنگە تورکمانیەکانی کردووە لەهەموو ڕوویەکەوە.
ـەروەها چاوپێکەوتن لەچەند میدیایەکی تەلەفزیۆن و گۆڤارو ڕۆژنامەکان سەبارەت بەو هاریکاییەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و بەتایبەتی وەزارەتی پەروەردە بۆ بەرەو پێشخستنی ڕەوشتی قوتابخانە تورکمانییەکان.

## ـوی قوتابخانەکانی تورکمان لەهەولێر

یەکەم: باخچەی ساوایان:

- ایبك (١٩٩٧/١١/٢٧).
٢- انجی (٢٠٠٥/١١/٢٥).

دووەم: قوتابخانەکانی بنەڕەتی:

١- دوغوش (١٩٩٣/٩/١).
٢- اق قویونلو (١٩٩٥/١٢/٧).
٣- یونس پێغمبەر (١٩٩٥/١٢/٧).
٤- فضولی (١٩٩٥/١٢/٧).
٥- باریش (١٩٩٥/١٢/٧).
٦- تورکمن ایلی (١٩٩٥/١٢/٧).
٧- قەرە قۆیونلو (١٩٩٥/١٢/٧).





٨- سولتان موزەفەر (١٩٩٤/١٢/٢٦)

٩- سلجوق (١٩٩٤/١٠/٢٦).

**سێیەم: قوتابخانەکانی ناوەندیو ئامادەیی:**

١- ئامادەیی عمادالدین زنگی کوڕان (١٩٩٥/٩/٢٥).

٢- ناوەندی اوغوزخانی کوڕان (١٩٩٥/٩/٢٥).

٣- ناوەندی اتابکی کچان (١٩٩٥/٩/٢٥).

٤- ئامادەیی غریبی کچان (١٩٩٥/٩/٢٥).

**ناوی قوتابخانەکانی تورکمانی لەسلێمانی:**

١- باریش.

٢- باخچەی ساوایانی قۆنجە گول. لەقەزای کفری.

٣- قوتابخانەی قرە اوغلانی بنەڕەتی. لەقەزای کفری.

٤- ئامادەیی دوغان. لەقەزای کفری.

لەدهۆکیش قوتابخانەی فچولی لە١٩٩٤/١٠/٢٦ کرایەوەو دواتر نەما.

## پیتەکانی زمانی تورکی

| ت | الحروف باللاتينية | الحروف وتلفظها بالعربية والكردية | ت | الحروف باللاتينية | الحروف وتلفظها بالعربية والكردية | الملاحظات |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | a | آ / ئا | ٢٥ | u | او / ئو | ① ان الحروف التركية هي (٢٩) |
| ٢ | b | ب / بە | ٢٦ | ü | أو / ئوو | ② ينقسم حسب نوع الحروف التركية الى القسمين: |
| ٣ | c | ج / جە | ٢٧ | v | ڤ / ڤە | |
| ٤ | ç | / چە | ٢٨ | y | ي / یە | أ/ الحروف الصوتية وعددها (٨) وهي: |
| ٥ | e | أ / ئە | ٢٩ | z | ز / زە | |
| ٦ | d | د / دە | | | | a, e, ı, i, o, ö, u, ü |
| ٧ | f | ف / فە | | | | |
| ٨ | g | گ / گە | | | | ب/ الحروف الغير الصوتية وعددها (٢١) وهي: |
| ٩ | ğ | غ / غە | | | | |
| ١٠ | h | ه / هە | | | | b, c, ç, d, f, g, |
| ١١ | j | ژ / ژە | | | | ğ, h, j, k, l, m, |
| ١٢ | k | ک / کە | | | | n, p, r, s, ş, t, |
| ١٣ | l | ل / لە | | | | v, y, z. |
| ١٤ | m | م / مە | | | | |
| ١٥ | n | ن / نە | | | | ③ أما بالنسبة لشكل الحروف الصوتية فينقسم الى المجموعتين |
| ١٦ | ı | إ / ئِ | | | | |
| ١٧ | i | إ / ئی | | | | أ/ مجموعة الأولى ينقسم الى القسمين |
| ١٨ | o | او / ئۆ | | | | [1] ذات صوت واسع وهي: |
| ١٩ | ö | أو / ئۆو | | | | a, e, o, ö |
| ٢٠ | p | پ / پە | | | | [2] ذات صوت ضيق وهي: ı, i, u, ü |
| ٢١ | r | ر / رە | | | | ب/ مجموعة الثانية ينقسم الى القسمين |
| ٢٢ | s | س / سە | | | | ① ذات صوت مستقيم: |
| ٢٣ | ş | ش / شە | | | | a, e, ı, i ② ذات صوت مدور: |
| ٢٤ | t | ت / تە | | | | o, ö, u, ü |




**پرۆگرامی خوێندن بەزمانی تورکمانی**




**خوێندنەوەی کوردی بۆ قوتابخانەکانی سریان و تورکامانیەکان**

**پوختەی ئاماری خوێندنی سریانی**

| ژمارەی قوتابخانە - خوێندنگە | | | | |
|---|---|---|---|---|
| پارێزگا | باخچەی ساوایان | بنەڕەتی | ئامادەیی | کۆی گشتی |
| هەولێر | - | ١٧ | ٧ | ٢٤ |
| دهۆك | - | ٣٢ | ٦ | ٣٨ |
| کۆ | - | ٤٩ | ١٣ | ٦٢ |

| پارێزگا | ژمارەی قوتابیان- خوێندکاران | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | باخچەی ساوایان | | بنەڕەتی | | ئامادەیی | | کۆی گشتی | |
| | کوڕ | کچ | کوڕ | کچ | کوڕ | کچ | کوڕ | کچ |
| هەولێر | - | - | ١٥٩٠ | ١٥٤١ | ٣٦٩ | ٤٠٢ | ١٩٥٩ | ١٩٤٣ |
| | - | | ٣١٣١ | | ٧٧١ | | ٣٩٠٢ | |
| دهۆک | - | - | ١٣٥٥ | ١٢٦٠ | ١٨٢ | ٢١٣ | ١٥٣٧ | ١٤٣٧ |
| | - | | ٢٦١٥ | | ٣٦٥ | | ٣٠١٠ | |
| کۆ | - | - | ٢٩٤٥ | ٢٨٠١ | ٥٥١ | ٦١٥ | ٣٤٩٦ | ٣٤١٦ |
| | - | | ٥٧٤٦ | | ١١٦٦ | | ٦٩١٢ | |

| پارێزگا | ژمارەی مامۆستایان | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | باخچەی ساوایان | | بنەڕەتی | | ئامادەیی | | کۆی گشتی | |
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ |
| هەولێر | - | - | ١٣١ | ٤١٤ | ٦٠ | ١٤٢ | ١٩١ | ٥٥٦ |
| | - | | ٥٤٥ | | ٢٠٢ | | ٧٤٧ | |
| دهۆک | - | - | ١٠٣ | ٢٠٩ | ٣٣ | ١٧ | ١٣٦ | ٢٢٦ |
| | - | | ٣١٢ | | ٥٠ | | ٣٦٢ | |
| کۆ | - | - | ٢٣٤ | ٦٢٣ | ٩٣ | ١٥٩ | ٣٢٧ | ٧٨٢ |
| | - | | ٨٥٧ | | ٢٥٢ | | ١١٠٩ | |

**فەرمانی وەزاری پەروەردە لەحکومەتی کوردستان بەژمارە (١٥٥٧) لە (٢٠٠٧/٢/١١) سەبارەت بەدانانی دوولیژنەی زمانی کوردی تایبەت بەقوتابخانە تورکمانی و سریانییەکان کەوا وانەکان ئاسانتر بێت لەگەڵ ئەوەی لەقوتابخانەی تر کەبەکوردی دەخوێنن.**

**ناوی قوتابخانە بنەڕەتیەکان بەزمانی سریانی لە پارێزگای هەولێر:**

**١- اربائیلو/ عەنکاوە.**
**٢- ئاشوربان/ سۆران.**
**٣- عنکاوا/ عەنکاوە.**
**٤- یەزدان/ عەنکاوە.**
**٥- حەدیاب/ عەنکاوە.**
**٦- حمورابی/ عەنکاوە.**
**٧- شلاما/ عەنکاوە.**
**٨- ئەدی شیر/شەقڵاوە.**

٩- زیومر/ شەقلاوە. ١٠- هەرموشا/ کۆیە.

١١- ئامادەیی عەنکاوەی کوران. ١٢- ئامادەیی عەنکاوەی کچان.

**ناوی قوتابخانە دواناوەندییەکان بەزمانی سریانی لە پارێزگای هەولێر دوو قوتابخانە نەبێ بەزمانی عەرەبین:-**

١. دواناوەندی شمیرامی سریانی ٢- دواناوەندی عەنکاوەی نمونەیی.

٣- نەمرێنی کچان/ عربی. ٤- ئەکیتوی کوڕان/ عربی.

٥- دواناوەندی بابلی کوران. ٦- دواناوەندی نەورۆزی کچان.

٧- دواناوەندی سەفینی بنەڕەتی. ٨- دواناوەندی شەقلاوەی نمونەیی.

٩- دواناوەندی نوری سریانی. ١٠- دواناوەندی کاوێزی بنەڕەتی.

**ناوی قوتابخانە ئامادەییەکان بەزمانی سریانی لە پارێزگای هەولێر:**

١. ئامادەیی عەنکاوەی کوڕان. ٢- ئامادەیی عەنکاوەی کچان.

**ناوی قوتابخانە بنەڕەتییەکان بەزمانی سریانی لە پارێزگای دهۆک:-**

١- نۆهەدرا/ قەزای دهۆک. ٢- ئەکەد/ قەزای دهۆک.

٣- نۆرهی سریانی/ قەزای دهۆک. ٤- شۆرەش/ قەزای دهۆک.

٥- گوندی کوسە / قەزای دهۆک. ٦- مانگیش/ قەزای دهۆک.

٧- بەهرا بنەڕەتی/ سمێل. ٨- شیزی/ سمێل.

٩- باختمێ/ سمێل. ١٠- شکەمزل/ سمێل.

١١- ئاڤزوریك ژوری/ سمێل. ١٢- بەخلەجا/ سمێل.

١٣- شیلاما بنەڕەتی/ زاخۆ. ١٤- پێشخابیر/ زاخۆ.

١٥- شوحا/ زاخۆ. ١٦- ئاڤکندال/ زاخۆ.

١٧- شرتا سوری/ زاخۆ. ١٨- لیڤو بنەڕەتی/ زاخۆ.

١٩- رزگاری بنەڕەتی/ زاخۆ. ٢٠- زین/ زاخۆ.

٢١- اورهای سرسنگ/ ئامێدی. ٢٢- ئنیشکی/ ئامێدی.

٢٣- ئاردان سریانی/ ئامێدی. ٢٤- داودیە/ ئامێدی.

٢٥- دهێ/ ئامێدی. ٢٦- دورێ/ ئامێدی.

٢٧- کوانی/ ئامێدی. ٢٨- زاب بنەڕەتی/ ئامێدی.

٢٩- سەروەری/ ئاکرێ. ٣٠- هیزانکی بنەڕەتی/ ئاکرێ.

٣١- چەم رەبەنکێ/ ئاکرێ. ٣٢ هەرماشێ/ شێخان

**ناوی قوتابخانە ئامادەییەکان بەزمانی سریانی لە پارێزگای دهۆك:**

١- ئامادەیی نصیب/ دهۆك. ٢- ئامادەیی شمئیل/ سمێل.

٣- ئامادەیی اورهی/ ئامێدی. ٤- ئامادەیی زهویر/ ئامێدی.

٥- ئامادەیی زاخۆ/ زاخۆ. ٦- ئامادەیی صوکا/ ئاکرێ





| waw | heh | dallat | gammal | beet | allap |
|---|---|---|---|---|---|
| lammat | kap | yout | teit | kheit | zein |
| saudeh | peh | ayin | simkat | noon | meem |
| | | taw | sheen | reish | qop |

**پیتەکانی زمانی سریانی**






**پرۆگرامی خوێندن بەزمانی سریانی**






**پرۆژگرامی خوێندن بەزمانی سریانی**

**پوختەی ئاماری خوێندنی ئەرمەنی**

| پارێزگای دهۆك/ قەزای زاخۆ | | | |
|---|---|---|---|
| ناوی قوتابخانە | قۆناغی بنەڕەتی | ژمارەی قوتابیان | ژمارەی مامۆستایان |
| ئاڤاك یا بنەڕەتی | ١- ٦ | ٦٤ | ١٤ |

| پارێزگای دهۆك/ قەزای سمێل | | | |
|---|---|---|---|
| ناوی قوتابخانە | قۆناغی بنەڕەتی | ژمارەی قوتابیان | ژمارەی مامۆستایان |
| هاورێشکی یا بنەڕەتی | ١-٩ | ٥٧ | ١٦ |
| ئاڤزرك بیری یا بنەڕەتی | ١- ٦ | ٦٤ | ١١ |

**پیتەکانی زمانی ئەرمەنی**

Աա Բբ Գգ Դդ Եե
Զզ Էէ Ըը Թթ Ժժ
Իի Լլ Խխ Ծծ Կկ
Հհ Ձձ Ղղ Ճճ Մմ
Յյ Նն Շշ Ոո Չչ
Պպ Ջջ Ռռ Սս Վվ
Տտ Րր Ցց Ււ Փփ
Քք և Օօ Ֆֆ



**خوێندن بەزمانی ئەرمەنی**

**بۆ پێزانین: بەڕێز وارتکێس موسێس سەرکیسیان بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی دهۆك لەنەتەوەی ئەرمەنییە.**

**خاتوو مانوش سمباط: ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای دهۆکە.**

**پەرلەمانتارە تورکمانەکانی خولی دووەمی پەرلەمانی کوردستان (٢٠٠٥- ٢٠٠٩)**

١- کرخی نجم الدین نورالدین ئالتی برماق.
٢- طلعت محمد صالح خەفاف.
٣- سهام انور ولی.
٤- اسعد شاکر اربیلی.

**پەرلەمانتارە تورکمانەکانی خولی سێیەمی پەرلەمانی کوردستان (٢٠٠٩- ٢٠١٣)**

١- یشار نجم الدین نورالدین ئالتی برماق.
٢- یاووز خورشید عثمان.
٣- شێردڵ تحسین محمد.
٣- حمدیە معروف احمد.
٥- عبدالقادر بازرگان.

**وەزیرە تورکمانەکان/**

١- عبداللطیف بندر ئۆغلو/ وەزیری هەرێم.
٢- ویداد خورشید عثمان/ وەزیری پیشەسازی.
٣- سینان عبدالخالق چەلەبی/ وەزیری بازرگانی و پیشەسازی.
٤- جودت جرجیس نەجار- وەزیری هەرێم.

**١- پەرلەمانتارەکانی خولی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان (١٩٩٢- ٢٠٠٥)/ (کلدان سریان ئاشوری)**

١- سەرکیس ئاغا جان مامەندۆ.
٢- شمائیل نەنۆ بنیامین.
٣- یونادم یوسف کەنا.
٤- ئەکرەم عاشور عودیش.
٥- بطرس اسخریا هرمز.
٦- فەرنسۆ هەریری.

**٢- پەرلەمانتارەکانی خولی دووەمی پەرلەمانی کوردستان (٢٠٠٥- ٢٠٠٩)(کلدان سریان ئاشوری)**

١- رومیو حزیران نیسان هەکاری.
٢- جمال شمعون ایلیا.
٣- اندریوس یوحنا گورگیس.
٤- گلاویژ شابا ججی.
٥- بایزار ملکو اوهان. (**ئەرمەنی**)

**پەرلەمانتارانی خولی سێیەمی پەرلەمانی کوردستان (٢٠٠٩- ٢٠١٣)**

**(کلدان- سریان- ئاشوری)**

١- سالم تۆما کاکۆ.
٢- سۆزان یوسف خوشابە.
٣- د. ئاثر عبدالرحمن اوغسطین.
٤- امیر گوگە یوسف.
٥- د. جهان اسماعیل بنیامین.
٦- ئارام شاهین داود باکۆیان (ئەرمەنی).

**وەزیرەکانی حکومەتی کوردستان (١٩٩٢- ٢٠١٠)/ (کلدان سریان ئاشوری)**

١- سەرکیس ئاغاجان مامەندۆ/ وەزیری دارایی و ئابووری.
٢- یونادم یوسف کنا/ وەزیری هەرێم.
٣- نمرود بیتو یوحنا/ وەزیری گەشت و گوزار.
٤- جورج یوسف منصور/ وەزیری هەرێم.
٥- ئەنوەر جەبەلی شابو/ وەزیری گواستنەوە و گەیاندن.
٦- یونان مرقس حنا/ وەزیری پیشەسازی و وزە.
٧- فەرەنسۆ هەریری. وەزیری هەرێم.
٨- یوسف حنا یوسف (ابو حکمت) وەزیری هەرێم.

**یەکەم/ پەرلەمانی کوردستان**

**خولی یەکەم/ فراکسیۆنی بنەوشەیی**

١- یونادم یوسف کنا
٢- شمائیل ننو بنیامین
٣- فرنسیس یوسف شابو/ لەلەساڵی ١٩٩٣ شەهید کرا.
٤- اکرم عاشور عودیش.
٥- بطرس اسخریا.

ب- کوتلەی یەکگرتووی مەسیحی کوردستان/

١. سركيس ئاغاجان مامندو.

<u>**دووەم: خولی دووەم:**</u>

أ- بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری

١- اندریوس یوحنا.　　　　　٢- گلاوێژ شابا ججی.

ب- بەرەی رۆشنبیری کلدانی/ جمال شمعون عوید

ج- پارتی بیت نەهرینی دیموکراتی/ رومیو حزیران هەکاری.

د – یەکێتی دیموکراتی کلدانی/ بایزار ملکو اوهان.

<u>**خولی سێیەم**</u>

أ- بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشوری (لیستی رافیدین):

١- سالم تۆما کاکۆ.　　　　　٢- جیهان اسماعیل بنیامین.

ب- لیستی ئەنجومەنی میللی کلدانی سریانی ئاشوری:

١- امیر گوگە.　　　　　٢– ثائر یوسف عبدالاحد.

٣- سوزان یوسف یوحنا.

## دووەم/ حکومەتی هەرێمی کوردستان

<u>**کابینەی یەکەم**</u>

یونادم یوسف کنا/ وەزیری ئاوەدانکردنەوەو نیشتەجێکردن.

### کابینەی دووەم

أ- بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری

یونادم یوسف کنا/ وەزیری ئاوەدانکردنەوەو نیشتەجێکردن.

ب- پارتی کاری سەربەخۆی کوردستان/ یوسف حنا یوسف (ابو حکمت)/ وەزیری هەرێم.

### کابینەی سێیەم

أ- بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشوری.

یونادم یوسف کنا/ وەزیری پیشەسازیو وزە.

ب- پارتی کاری سەربەخۆی کوردستان

یوسف حنا یوسف (ابو حکمت) وەزیری هەرێم.

ج- سرکیس اغاجان مامندو/ پارتی دیموکراتی کوردستان/ وەزیری دارایی

د- فرەنسو هەریری/ وەزیری هەرێم

### کابینەی سێیەم

فرەنسۆ هەریری/ پارێزگاری هەولێر/ پارتی دیموکراتی کوردستان.

### کابینەی چوارەم

گورگیس شلیمون گورگیس/ جێگری پارێزگای دهۆك/ پارتی دیموکراتی کوردستان

### کابینەی چوارەم

أ- بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری- یونان مرقس حنا/ وەزیری پیشەسازیو ووزە.

ب- پارتی دیموکراتی کوردستان- سرکیس ئاغاجان ماندو/ وەزیری دارایی.

**کابینەی پێنجەم**

أ- سركيس ئاغاجان/ پارتی دیموکراتی کوردستان/ وەزیری دارایی.

ب- جورج منصور (سەربەخۆ) وەزیری هەرێم بۆ کاروباری کۆمەڵگەی مەدەنی.

ج- نمرود بێثیو یوحنا/ حزبی نیشتمانیی ئاشوری/ وەزری گەشتو گوزار.

**کابینەی شەشەم**

انور جبلی شابۆ/ وەزیری گواستنەوو گەیاندن.

**مەجلیسی حوکم**

بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشوری- یونادم یوسف کنا.

**ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق**

**ئەنجومەنی کاتی (١٠٠) ئەندام**

١- یونادم یوسف کنا / بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشوری. ٢- جاکلین قوسین.

**خولی یەکەم**

١- یونادم یوسف کنا/ بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشوری.

٢- عبدالاحد افرام ساوا/ حزبی دیموکراتی کلدان لەنێو لیستی هاوپەیمانی کوردستان.

**حکومەتی عێراقی فیدراڵ**

**کابینەی یەکەم**

١- بهنام بولص ألبازی/ وەزیری گواستنەوە/ بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری.

٢- سرگون لازار/ معادن پارێزگای کەرکوك/ بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری.

**کابینەی دووەم/**

باسکال ایشو/ وەزیری کۆچو کۆچبەران/ بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری

سرکون لازار/ معادن پارێزگای کەرکوك/ بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری.

**کابینەی سێیەم**

باسمە یوسف بطرس/ وەزیری زانستو تەکنەلۆجیا/ بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری.

**کابینەی چوارەم**

١- فەوزی هەریری/ وەزیری پیشەسازی/ پارتی دیموکراتی کوردستان/ لە لیستی هاوپەیمانی کوردستانی.

٢- وجدان میخائیل/ وەزیری مافی مرۆڤ/ لیستی عێراقیە.

٣- ادوار اوراها/ معادن پارێزگای کەرکوك/ بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری.

**پۆستە گشتیەکان لەهەرێمی کوردستان**

١- نزار حنا بطرس/ بەڕێوەبەری گشتی فێرکردنی سریانی/ وەزارەتی پەروەردە.

٢- امیر صلیوە مروگی/ بەڕێوەبەری گشتی لەوەزراەتی تەندروستی.

٣- انیس عبدالاحد/ بەڕێوەبەری گشتی ژینگە لەوەزارەتی ژینگە.

٤- خالید البیر/ بەڕێوەبەری گشتی لەوەزارەتی ئەوقافو کاروباری ئایینی مەسیحی.

**پەرلەمانتارە ئێزیدییەکان لە پەرلەمانی کوردستان/**

١- عیدۆ بابەشێخ. (خولی یەکەم) ٢- خەیری سەعید عەلی یەگ. (خولی یەکەم)

٣- مریم حسن ابراهیم. (خولی دووەم). ٤- عزالدین باقەسرێ. (خولی دووەم).
٥- پیر خدر سلیمان. (خولی دووەم). ٦- حازم تەحسین سەعید (خولی سێیەم).

**وەزیرەکانی ئێزیدیەکان لەحکومەتی کوردستان/**

١- تمر کچو هسام/ وەزیری هەرێم. ٢- د. دخیل سهام قاسم/ وەزیری هەرێم.
٣- محمود مجید/ وەزیری هەرێم. ٤- جمیل خدر عبدال/ وەزیری هەرێم.
٥- جمیل سلێمان حیدر/ وەزیری کشتوکاڵو سەرچاوەکانی ئاو.

**مافێکی ڕەوایە لەحکومەتی کوردستان خوێندن بەزمانی تورکمانیو سریانیو ئەرمەنی سەرەڕای کوردیو عەرەبی کە دوو زمانی فەرمین لەعێراقدا بەرێکوپێکی جێبەجێدەکرێن بەڵام لەسەردەمی حکومەتی بەعسیزم نەك قوتابخانەیەکی خوێندن بەزمانی تورکمانیو سریانیو ئەرمەنی نەبوو بەڵکو فۆڕمی (نەتەوە گۆڕین) دابەشدەکراو دەبوایە خەڵك بەناچاری داوا بکەن بنووسن لەبەرئەوەی بەهەڵەو شاشی بەنەتەوەی دیکە ناوی خۆیان تۆمار کردووەو ڕاستیەکەی سەر بەنەتەوەی (عەرەبن)و ئەوەی فۆڕمەکەی پڕ نەکردبایەوە ئەوا یا بۆ هەرێمی کوردستان یا بۆ ناوەڕاستو باشووری عێراق ڕەوانە دەکرا، بەڵام ئەوانەی ڕەوانەی کوردستان دەکران قەدەغەبوو ئامێری کارەبا لەگەڵ خۆیان ببەن تا ئەو ڕادەیەی قسەکردن لەقوتابخانەکانی خوێندن جگە لەزمانی عەرەبی هەر (ممنوع) بوو و زۆر دۆکیمێنت لەم بارەوە هەیە ئەتوانین پترو فراوانتر لەسەرچاوەکان بیانخوێنینەوە، ناوی شوێنە گشتیەکان مەکتەب (قوتابخانە/ زۆر شوێنی دیکەیان بۆ زمانی عەرەبی دەگۆڕی).**

**بەپێچەوانەوە ڕژێمی دکتاتۆری هەر لە (١٩٩٢) وەزارەتی پەروەردە لەحکومەتی کوردستان هەموو پێداویستییەکانی خوێندنی بەزمانی تورکمانیو سریانیو ئەرمەنی هەر لە بینایەو مامۆستاو کتێبەکانو کەرەستەکانی دیکە دابین کردو ناوی قوتابخانەکانی خوێندنیش هەر بەناوی تورکمانیو سریانیو ئەرمەنی ناو نراون، تاکو تایبەتمەندی خۆیان بەتەواوی بپارێزنو وانەی کوردیان تیا ئاسانترە لەقوتابخانەکانی خوێندن بەزمانی کوردیو ئەوە کراوەو دەکرێ مافێکی سروشتیو ڕەوای ئەو نەتەوانەیەو پشووی فەرمیان هەیەو پوولی تایبەت بەجلوبەرگی ئەو نەتەوانە بەکاردەهێنرێ، بۆ پێزانین بەشداربوان لەشاندی کوردستان بۆ نووسینەوەی دەستووری کۆماری عێراق جەختیان لەسەر ناوهێنانی زمانی تورکمانو سریانیو ئەرمەنی دەکردو دواتر لەدەستووری کۆماری عێراق (٢٠٠٥) لەماددەی چوارەمیدا جێگیر بوو، بەڵام پێویستە ئەم لایەنە بەچاکی لەکوردستانو عێراقو هەندەران باسو خواسی لەسەر بکرێت، چونکە دەتوانم بڵێم کەمتەرخەمی لە بەدەرخستنی ڕۆڵو زۆرداری سەر ئەو نەتەوانە بەدونیای دەرەوە نەناسراوەو دەتوانین بەوەرگێڕانی بابەتو سەردانی شاندەکان بۆ ئەو شوێنانە تاکو بەزیندوویی و گەرماو گەرم لەهزرو بیری نەوەکان دابێ‌و بزانن کە یەکسانیو بەشداریو هاوبەشی لەکرۆکی دیمەکراسیەت دایەو پێکەوەژیانی هەموو نەتەوەکان ژمارەیان هەرچەندەبێ، دەبێ مافەکانیان دابینو جێبەجێبکرێو هەر کەمو کورییەك لەکاتی پیادەکردن هەستی پێ کرا بەزووترین کات لابرێو پێداچوونەوەی بۆ بکرێ. هەروەها کۆڕو کۆبوونەوەو سمینارو کۆنگرە لەبارەی سیاسەتی زمان ببەسترێ، چونکە ئەم سیاسەتە نەك لەوڵاتان بەڵکو حزبو لایەنەکانیش لەبەرنامەی هەڵبژاردن لەکرۆکی داواکاریەکانیدا هەیانەو هیوادارم ئەکادیمای زمانەکان هەبێ تاکو بەپلانی تۆکمە بۆداڕێژراوی درێژخایەن خەمخۆری زمانەکان بەڕێوە ببات‌و پێویستە یاسای زمانەکان لەپەرلەمانی عێراقو کوردستان دەربچێ، هەروەکو لەوڵاتانو هەرێمەکانیان دەریانچوواندووەو بەرێکوپێکیش جێبەجێ دەکرێت‌و پێویستە سەرژمێری گشتی ئەنجام بدرێ تاکو ڕاستو دروستی ژمارەی نەتەوەکانو ڕێژەیان بزانرێ، تاکو وڵاتو لایەنەکان بزانن ئەو مافانەی هەیانە، مافێکی ڕەوایەو ئەوەی هەیەو دابین کراوە، گەر بەدەرکەوت ڕێژەکەیان زیاتر بوو ئەوا مافەکانیش پتر دەکرێ.**





## پاشكۆى ژمارە (١)

بسم الله الرحمن الرحيم

حزب البعث العربي الاشتراكي
القطر العراقي
قيادة مكتب تنظيم الشمال

امة عربية واحدة ذات رسالة خالدة

العدد/ ٧١
التاريخ / ١١/شعبان/١٤٠٩هـ
المصادف ١٩٨٩/٣/١٨

سري للغاية ومستعجل جداً
وتفتح من قبل الرفيق امين سر قيادة الفرع

الى / قيادة فرع اربيل لحزب البعث الاشتراكي
م/ الدراسة الكردية

تحية رفاقية

اشارة الى التوجيهات والاوامر المبلغة الينا واوامر الرفيق امين سر القيادة القطرية صدام حسين حفظه الله اثناء اجتماعات القيادة القطرية تقرر مايلي:

١- قيام المدرجة اسماؤهم ادناه باعادة النظر في مشروع الدراسة التي اعدت وطبقت في محافظة دهوك في السبعينات لتغيير الدراسة الكردية الى الدراسة العربية وعلى ان تعقد الاجتماعات في مقر مكتبنا وبرئاسة الرفيق امين سر قيادة مكتب تنظيم الشمال بحيث تتلائم الدراسة مع الوضع النفسي لسكان محافظتي اربيل والسليمانية على ان تطبق بنسبة (٧٠٪) للسنة الدراسية ٨٩/١٩٩٠ وبنسبة (١٠٠٪) للسنة الدراسية ٩٠/١٩٩١ لغرض القضاء على التيار العنصري الشوفيني في المنطقة الكوردية وعدم ظهورها مستقبلاً حيث انهى عمليات الانفال الحركات الانفصالية الرجعية وابعدوا الى خارج حدود القطر وتبليغ المشاركين في الدراسة بالكتمان الشديد حول الموضوع وعلى ان تنجز خلال شهر واحد.

## پاشکۆی ژمارە ( ٢ )
## گۆڕینی ناوی شوێنەکان )
## بيان

بناء على ما جاء بقرار مجلس محافظة نينوى العام المتخذ في ١٩٧٤/١٠/١، قررنا تبديل اسماء البلديات المدرجة ادناه الى الاسماء المبينة ازاء كل منها:-

**وزير البلديات**

| اسم البلدية القديم | اسم البلدية الجديد |
|---|---|
| بلدية افنكي | بلدية العياضة |
| بلدية الشبك | بلدية الزاب |
| بلدية قره قوش | بلدية الحمدانية |

**الوقائع العراقية عدد ٢٤٢٥ ( ١٩٧٤/١٢/١٦**

بيان رقم (١١٩٤٤)

بناء على ما جاء بقرار مجلس محافظة التأميم المرقم (٥٥) في ٢-٣-١٩٧٦، قررنا تبديل اسماء القرى المدرجة ادناه التابعة لناحية قره حسن بمحافظة التأميم، بالاسماء المبينة ازاء كل منها.

| الاسم القديم | الاسم الجديد |
|---|---|
| ١- شرنجة بولاق | اليرموك |
| ٢- زندانة | النصر |
| ٣- يارمجة | جده |
| ٤- قره لو | المقداد |
| ٥- صارى تبه كبير | الرزاى |
| ٦ - صارى تبه صغير | سيناء |
| ٧- صارى تبه يونس | الوليد |
| ٨- رجيبات عليا | المتنبي |
| ٩- رجيبات سفلى | الكندي |
| ١٠- طوقما قلو | الخنساء |
| ١١- ترجيل | القادسية |
| ١٢- پنجه على | ابو محجن الثقفي |

**الوقائع العراقية عدد ٢٥٣٢ ص ٢٤ ١٩٧٦/٦/٧.**





## پاشکۆی ژمارە (٣)

## کۆتای ئەرمەنیەکان (٢٠٠٩/٢/١٢) لە پەرلەمانی کوردستان

چەند ساڵێکە بەچڕو پڕی بەدوای سەرچاوە لەبارەی نەتەوە هەڕەشەلێکراوەکان دەگەڕێمو لەبارەی ئەمازیغییەکانی باکووری ئەفریقیا پرۆژەی کتێبێکم لەبەردەستدایە، لەبەر ئەوەی وێکچوونێکی زۆر لەنێوان نەتەوەی کوردو ئەمازیغ هەیە، چونکە هەردوو سەرکردەی موسڵمان کە ڕۆڵێکی یەکجار مەزنیان لەبڵاوکردنەوەی موسڵمانیەتی هەبووە (سەلاحەددینی ئەیوبی- کوردەو تاریق کوڕی زیادیش ئەمازیغیە). هەردوو نەتەوەش لەزۆرینەی ئەو وڵاتانەی پێوەی لکێنراون نکۆڵی لەبوونیان دەکەن و ناوەکانی (کوردیو ئەمازیغی) یان گۆڕیوە بۆناوی نەتەوەی حوکمڕان و تاکو ناونانی منالآنیشیان بەناوی نەتەوەکەیان قەدەغەیە. هێندە داخ لەدڵن لەبەرامبەریان، بۆیە چەکی کیماویشیان دژیان بەکارهێناوە، بەڵام لەبارەی ئەرمەنیەکان چەند هۆکارێك پاڵی پێوەنام کە زۆرترو بەپەرۆشتر لەم بوارەدا بایەخیان پێبدەم چونکە ئەم نەتەوەیە لە هەرشوێنێکی دونیادا ژمارەیان هەرچەندبێ ئەوا زمانی نەتەوایەتیان لەبیر ناکەن و قسەی پێدەکەن و ناوی منالەکانیشیان بەناوی ئەرمەن ناودەنێن و جگە لەوڵاتی ئەرمینیا رەوەندیان لەهەر ولاتێکدا هەبێ، جێپەنجەی هەڵوێستو تایبەتمەندیی ناسنامەیان پاراستووەو عەودالی کێشەی نەتەوەکەیانن و توانیویانە تاکو ئەم نووسینە لە (٢٠) بیست وڵاتو ڕێکخراوەی نێودەوڵەتیدا جینۆسایدی ئەرمەنیەکان (١٩١٥- ١٩١٨) لەیاساو بڕیاری وڵاتان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکاندا دەربچوێنن و لەکوردستانیش هەر دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ەوە خوێندن بۆ نەتەوەکان بەزمانی زگماکیان دابین کراوەو چەندان پۆستو پلەو پایەیان لە دەزگاکانی حکومەتی کوردستاندا هەیە.

وپێشتریش لەیاسای وەزارەتی ڕۆشنبیریو پەروەردەشدا ئەوا مافی ڕۆشنبیریو پەروەردەو فێرکردن دابین کراوەو کە لیژنەی پشتیوانی پەرلەمانی کوردستان بۆ فراکسیۆنی هاوپەیمانی کوردستان _٢٠٠٥) بەشداریان لە نووسینەوەی دەستووری عێراق کرد لەوێش شاندی کوردستان داکۆکی لەمافی نەتەوەکانی کوردستان دەکردو توانی ناوی هەموویان لەدەستووری کۆماری عێراقدا جێگیرو تۆمار بکاتو ئەمساڵ کە باس لەپرۆژەی هەمواركردنی چوارەمی یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان کراو کۆتاشی بۆ نەتەوەکانی دیکە تورکان و کلدان سریان ئاشووری دانراو ناوی ئەرمەنیەکان نەهات، بۆیە بەندە لەڕاپۆرتی لیژنەی یاسایی لەتەك ناوی خۆم نووسیم (لاریمان هەیە) کە پرسیاریان کرد بۆچ گوتم لەبەر ئەوەی کۆتا نەدراوە بە ئەرمەنیەکان لە گفتوگۆی دوو قۆڵی و سێ قۆڵی دووپاتم دەکردەوەو لەدانیشتنی تایبەتمەند بۆ هەمواركردنی چوارەمی یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان کە ماددەی دەیەم خوێنرایەوە، دەستم بەرز کردەوە بۆ ئەوەی قسە بکەمو کە نۆرەم هات گوتم: (ئەو بڕگەیەی کە خوێندرایەوە. ناوی ئەرمەن لەبیرکراوە، ئەرمەن نەتەوەیەکی تایبەتەو زمانی تایبەتی خۆی هەیە، سەقافەو شتەکانی جیاوازە، لەگەڵ ئەوانی تر، زۆر پێویستە لێرەدا ناویان بێت، من پشت ئەستوورم بەوەی کەوا لایەنی دەستووری ولایەنی یاسایی باس ئەکەم، ئێمە بڕیارێکمان لەپەرلەمانی کوردستان دەرکردووە، بەژمارە (٢٦) لە (٢٠٠٢/١١/١٧) لەوێ پێکهاتەکان ئەرمەنیشی تێدایە، ئەوە خاڵی یەکەم: لەهەمواركردنی سێیەمی پەرلەمانی کوردستان بڕگە یەکمان هەیە، کە کام حزب لەحزبەکانی ئەو نەتەوەیە، زۆرترین دەنگی هێنا کورسیەکی ئەدرێتێ، ئەرمەن کورسیەکی دراوەتێ، بەڵام ئێستا ئێمە پەشیمان ببینەوەو کورسی نەدەینێو ناوی نەهێنین ئەوە نابێت، لەقانونی تاڵ لەماددەی نۆ کاك فرسەت لەهەمووما باشتر ئەزانێ کە ئێمە دواتر لەدەستووری عێراقی بەشداریمان کرد، ناوی ئەرمەن لەدەستووری عێراقیدا هەیە، لەماددەی چوارەم بەسەراحەت دێت، لێرەدا لابراوە، لەدەستووری عێراقی دان بەهەموویدا دەنێت، من کەباسی ئەوە ئەکەم لە ١٩٩٢و ٢٠٠٤ دان بەهەموو بڕیارو قانونەکانی پەرلەمانی کوردستان دەندرێت، ئێمە کە بڕیارمانداوە ئێستا پەشیمان ببینەوە، ئەوە ناکرێت، لەپرۆژەی دەستووری ئێستاشمان ناوی ئەرمەن هاتووە، بۆیە مافێکی دەستووریو یاساییە، دەبێ ناوی ئەرمەن بێت، ئەگەر هاتو لەبیرکرا، واتە مافەکانی دەستووریو یاساییان پێشێل دەکرێت، زۆر سوپاس).

دواتر هەستم کرد کەدەبێ جەختی لەسەر بکەمەوە لە (نقطة النظام) هەمدیسان دەبێ ناویان تۆماربکرێو کۆتایان بدرێتێ، چونکە باس لەوە دەکرا ژمارەیان چەندە، چونکە کۆتا ژمارەی پێویست نییە، بەڵکو مافێکی رەوایە کە دەبێ کۆتایان هەبێو، هەروەها نابێ هەڵوێستی چەندین پەرلەمانتار لەیاد بکرێ، کە ئەوانیش داکۆکێکی ڕێكو پێکییان کردو بۆ دواجاریش پێشنیازەکە بەکۆی دەنگ بڕیاردرا کە کورسییەك لە کۆتا لەپەرلەمانی کوردستان بۆ خولی سێیەمی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان بۆ ئەرمەنیەکان دابین بکرێت لە (٢٠٠٩/٢/١٢) بڕگەکە بەم جۆرە لەیاساکە دەنگی بۆدرا: (سێیەم: یەك کورسی تەرخان دەکرێ بۆ ئەرمەن کە پاڵێوراوانی ئەم پێکهاتە کێبڕکێی لەسەر دەکەن). ئەمەش ڕاستو دروستی پێکەوەژیان و لێبوردەیی نەتەوەکان لەکوردستان دەگەیەنێو لەتەك تورکان و کلدان سریان ئاشووریدا واتە یازدە کورسی بۆ نەتەوەکان بەکۆتا تەرخان کرا، کە ئەمەش مافێکی دەستووریو یاسایی پێکهاتەکانی گەلی کوردستانە.

## پاشكۆى ژمارە (٤)

| IRAQ- KURDISTAN PARLIAMENT<br>Kurdistan-hawler<br>Legal affairs committee |  | ئه نجومەنى نيشتمانيى كوردستان ـ عيّراق<br>كوردستان ـ هەولێر<br>**ليژنەى كاروبارى ياسايى** |
|---|---|---|

### بۆ/ سەرۆكايەتى ئەنجومەنى نيشتمانيى كوردستان- عێراق

### بابەت/ راپۆرتى ليژنەى ياسايى

ليژنەى ياسايى بەيانى رۆژى (٢٠٠٩/٢/٨) بەرامبەر ١٩ى رێبەندانى ٢٧٠٨ى كوردى كۆبۆوە بۆ گفتوگۆ لەسەر پرۆژە ياساى هەمواركردنى چوارەمى ياساى هەڵبژاردنى ئەنجومەنى نيشتمانيى كوردستان- عێراق ژمارە (١)ى ساڵى ١٩٩٢ى هەمواركراو كە لەلايەن ژمارەى ياسايى لەئەندامانى پەرلەمان پێشكەش كراوە، دواى خوێندنەوەى يەكەمى لەدانيشتنى ژمارە (١٢)ى پەرلەمان لە (٢٠٠٨/١١/٤) دواى تاوتوێكردنو راگۆرينەوە، ليژنەكەمان راپۆرتو راسپاردەكانى سەبارەت بەپرۆژەكە بەم جۆرەى خوارەوە پێشكەش دەكات بەمەبەستى پەلەكردن لەئەنجامدانى هەڵبژاردنى پەرلەمانى كوردستان پێش كۆتايى خولى ئێستاى:-

ليژنە پشتگيرى لەپرۆژەكە بەشێوەيەكى گشتى دەكاتو پێشنياز دەكات تەنها هەندێ گۆرانكارى لەهەندێ لەم برگەو ماددانەى خوارەوە بكرێت:-

برگەى ٢ لەماددەى ٢١.

برگەى ١ لەماددەى ٢٢.

ماددەكانى ٤٦، ٤٩، ٥٠.

هەردوو برگەى (١، ٥) لەماددەى ٥٦.

زيادەكردنى دوو برگە بۆ ماددە ١٨ لەسێيەم هەمواركردنى ياساكە.

زيادەكردنى دوو ماددە بۆ سەر پرۆژەكە.

چونكە هەمواركردنەكانى ترى پرۆژەكە جگە لە لەدارشتنەوە، چ گۆرانكاريەكى جەوهەرى نەدەپێكا بەدەر لە:-

١- كەمكردنەوەى تەمەنى ئەندامى پەرلەمان لە ٣٠ ساڵ بۆ ٢٥ ساڵ.

٢- زيادەكردنى كۆتاى نوێنەرايەتى ژنان لەپەرلەمان لە ٢٥٪ بۆ٣٠٪.

٣- تەرخانكردنى پێنج كورسى بۆ كلدانو ئاشووريو سريان.

٤- تەرخانكردنى پێنج كورسى بۆ توركمان.

تكايە بفەرموون بۆ ئەو گۆرانكاريەى لەپرۆژەكەمان كردووە هاوپێچى راپۆرتەكەمانە بكرێتە ئەساسى گفتوگۆو رادەربرين لەبارەيەوە.

**لەگەڵ رێزماندا...**

| **عبدالكريم هەمەوەند**<br>برياردەرى ليژنەى ياسايى | **دادوەر/ عەونى بەزاز**<br>جێگرى سەرۆكى ليژنەى ياسايى | **شێروان حەيدەرى**<br>سەرۆكى ليژنەى ياسايى |
|---|---|---|
| **خليل ابراهيم محمد**<br>ئەندام | **طارق جامباز**<br>ئەندام | **كريم بحرى برادۆست**<br>ئەندام |

**لاريمان هەيە**

| **محمد صالح اسماعيل**<br>ئەندام | **دلير محمد شريف**<br>ئەندام | **قادر سعيد (زانا)**<br>ئەندام |
|---|---|---|
| **سەردار هەركى**<br>ئەندام | | **د. رۆژان دزەيى**<br>ئەندام |





## پاشكۆی ژماره ( ٥ )

## ئەو گۆڤارو رۆژنامانەی بەزمانی سریانی دەردەچن

**یەكەم: كە لەدەزگای كەنیسەوە دەردەچن.**

١- مجلة الفكر المسيحي/ الآباء الدومنيكان في العراق.

٢- مجلة نجم المشرق/ بطريركية الكنيسة الكلدانية.

٣- مجلة بين النهرين / بطريكية الكنيسة الكلدانية.

٤- مجلة الافق/ الكنيسة الشرقية القديمة.

٥- مجلة الزنبقة/ مطرانية السريان الارثوذكس بغداد.

بالاضافة الى صحف ومجلات بشكل نشرات غير واسعة الانتشار في بعض الرعيات والخورنات.

**دووەم: كە لەدەزگاكانی سیاسی ( حزبەكان و چالاكوانانی نەتەوەیی ) دەردەچن.**

٦- جريدة بهرا/ طبعتين عربية وسريانية/ الحركة الديمقراطية الآشورية.

٧- جريدة ميزلتا (المسيرة)/ اتحاد الطلبة والشبيبة الكلدو آشوري.

٨- مجلة المجلس الشعبي/ المجلس الشعبي الكلداني السرياني الآشوري.

٩- جريدة قويامن (نهضتنا)/ الحزب الوطني الآشوري.

١٠- جريدة بيت نهرين (بين النهرين)/ حزب بيث نهرين الديمقراطي.

١١- جريدة نيشا (الهدف)/ اتحاد بيث النهرين الديمقراطي.

**سێیەم: كە لەدەزگای حكومەت و دەزگاكانی كۆمەڵگەی مەدەنی دەردەچن:**

١٢- گۆڤاری بانیبال/ بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەری سریانی لەوەزارەتی رۆشنبیری و لاوان لەهەرێمی كوردستان.

١٣- جريدة مردوثا (الثقافة)/ نفس المؤسسة اعلاه.

١٤- مجلة رديا كلدايا (المثقف الكلداني/ جمعية الثقافة الكلدانية في عنكاوا- اربيل.

١٥- جريدة بين عنكاوا/ نفس الجهة اعلاه.

١٦- جريدة عليموثا (الشبيبة)/ نادي شباب عنكاوا في اربيل.

١٧- مجلة ديانا/ نخبة من مثقفي قضاء ديانا في اربيل.

١٨- مجلة معلثا (المدخل)/ رابطة إتحاد الأدباء والكتاب الآشوريين في دهوك.

١٩- مجلة سيمتا (الكنز)/ دار المشرق الثقافية في دهوك.

٢٠- مجلة الابداع السرياني/ نخبة من مثقفي بخديد- قره قوش في سهل نينوى.

٢١- مجلة نجم بين النهرين/ المركز الثقافي الآشوري في دهوك.

## پاشكۆی ژماره ( ٦ )

## ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەی بەزمانی توركمانی دەردەچن

**رۆژنامەكان:**

١. دوغوش (پارتی نیشتمانی توركانی)/ هەولێر.



٢. قاردا شلق (یانەی برایەتی تورکانی)/ هەولێر.

٣. باغمسیز (بزووتنەوەی تورکمانی سەربەخۆ)/ هەولێر.

٤. الترکمان (پارتی تورکمان ایلی پاشان گۆڕا بەهەمان ناو بۆ بزووتنەوەی چاکسازی تورکانی) بەسەرۆکایەتی عبدالقادر بازرگان/ هەولێر.

٥. سارای.

**گۆڤارەکان:**

١. باریش (١٩٩٣) سەر بەوەزارەتی رۆشنبیری و لاوان/ هەرێمی کوردستان– عێراق.

٢. دوغرو (١٩٩٥) سەر بە کۆمەڵەی رۆشنبیری تورکمان لەکوردستان.

**ئێزگەو رادیۆو تەلەفزیۆنەکانی کە بەزمانی تورکمانی پەخش دەکرێن:**

١. تەلەفزیۆنی تورکمان ایلی لەساڵی ١٩٩٤ لەهەولێر دەستی بەپەخش کردووە.

٢. رادیۆی تورکمان ایلی لەساڵی ١٩٩٢ دەستی بەپەخش کردووە.

٣. ئێزگەی قاردا شلق سەسی کە سەربەیانەی برایەتی تورکمانە لەساڵی ١٩٩٩ دەستی بەپەخش کردووە.

٤. ئێزگەی تورکمان لەکفری لەساڵی ١٩٩٥ دەستی بەپەخش کردووە.

٥. ئێزگەی دوغوش لەهەولێر.

٦. رادیۆی (دوغرو) کە سەربەکۆمەڵەی رۆشنبیری تورکمانە.

٧. ئێزگەی قارداشلق کە سەر بەپارتی برایەتی تورکمانە.

**پاشکۆی ژمارە (٧)**

**زانیاری لەبارەی ئەرمەنیەکانی عێراق**

١- ژمارەی ئەرمەنیەکانی لەعێراق (١٤– ١٥) هەزار کەسن.

٢- ژمارەی ئەرمەنیەکان لەکوردستان (٤– ٥) هەزار کەسن.

٣- ئەو شوێنانەی ئەرمەنی تیا دەژی (بەغدا، بەسرا، کەرکوک، موسڵ، هەولێر، دهۆک، زاخۆ، هاوریسک، ئەفزوک، میرە، کرە، میس، قەرەقوش).

٤- مێژووی هەبوونیان لەهەرێمی کوردستان دوای جینۆسایدی ئەرمەنیەکان لەلایەن عوسمانیەکانەوە.

٥- مێژووی هەبوونیان بەشێوەیەکی گشتی لەعێراق دەگەڕێتەوە بۆساڵی ١٨٠٠ ساڵ.

**زانیاری دیکە:**

ئەرمەنیەکان بەکۆتا کورسیێکیان لەپەرلەمانی کوردستان ٢٠١٠ وەدەست هێناو هەروەها کورسیێک لەئەنجومەنی پارێزگاکان و ئازادانە کارەکانیان لەهەرێمی کوردستان ئەنجام دەدەن.

**بایزار ملکو اوهان**

**ئەندانی پەرلەمانی کوردستان**

**٢٠٠٩/٦/١٦**





**پاشکۆی ژمارە (٨)/ أ**

**برای زۆر بەڕێز تارق جامباز**

ڕێزو سلاوو خۆشەویستی...

وەکو بەڕێزتان ئاگەدارن، دیرۆکی ئێزیدیان پڕ خوێنو کوشتنو زوڵمو زۆری بویە، ژمارەی فەرمانەکان بۆسەر ئێزدیان لە (٧٢) فەرمان تێپەڕیوەو زۆربەیان لەسەردەمی عوسمانیەکان بویە، سەرەڕای ئەو مێژووە تاڵە هەر دەرفەتێك بەدەستیان کەتوویێت بەتایبەت لەعێراقو هەرێمی کوردستان سەری خۆیان بەرزکردۆتەوەو جێگای خۆیان کردۆتەوە، بۆ نمونە (حسێنی بەگی داسنی) کەلەسەردەمی خۆی میری شێخانو سۆران بووە، ونێزدی میرزا (میرزای داسنی) بووە والی موسل لەسەردەمی سوڵتان مرادی چوارەمو زۆر ناوی تریش هەنە وەکو (بابەشێخ ناسر) کە رۆڵێکی باشی لەپەیوەندی ئێزدی لەگەڵ ئەورووپیەکان هەبوو لەچەرخی نۆزدەدا، هەروەها (مەیان خاتوون) داپیری میر تەحسین بەگ کە نزیکی چل ساڵ لەچەرخی رابردوو دەستەڵاتی راسەقینە بەدەستی ئەو ژنە بەڕێزەوە بوورو پەیوەندی لەگەڵ دەستەڵاتو لەگەڵ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد هەبوو زۆر ناوی تریش هەنە، لەوانەو بەپێی قسەی (عبدالرزاق الحسنی) – مطۆ اغا خلف کە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بوو لەخولی (١١) ساڵی ١٩٤٧و (حاجی مادۆ) کە یەکەمین قایمەقامی ئێزدی بوو لەشێخانو دوو، سێ کەسیش بوون بەبەڕێوەبەر ناحیەو یەکێك بویە (ئامر لیوا پاشا خلف ناسر) و (حەسەن براهیم) حاجی) یەکەم ئەفسەری پۆلیس بوون لەپەنجاکان.

ئێستاش ناوی ئەو بەڕێزانە دەنووسم کە دوایی ساڵی ١٩٩٢ پلەو پایەیان هەبووە:-

١- خیری سعید علی بەگ/ ئەندامی پەرلەمان (١٩٩٢- پ. د .ك).

٢- عیدو حجی اسماعیل بابەشێخ/ ئەندامی پەرلەمانی کوردستان (١٩٩٣- ٢٠٠٥، ی. ن. ك).

جێگری مەڵبەندی بادینان + موسل (٢٠٠٣- ٢٠٠٦).

راوێژکاری سەرۆك کۆمار بۆ کاروباری ئێزدیان (٢٠٠٦و تائێستا). سەرپەرشتیاری نووسینگەی کاروباری ئێزدیان (٢٠٠٧و تائێستا).

٣- عادل ناسر حجی/ هاریکاری پارێزگای دهۆك (١٩٩٢) ، جیگر وەزیر پاشان وەزیری کشتوکاڵ (١٩٩٧)، ئەندامی کۆمەڵەی نیشتمانی عێراق (٢٠٠٤- بۆشەش مانگ).

٤- حیدر قاسم ششو/ ئەندامی کۆمەڵەی نیشتمانیی عێراق (٢٠٠٤- بۆشەش مانگ).

٥- کامیران خێری سعید/ ئەندامی کۆمەڵەی نیشتمانیی عێراق (٢٠٤- بۆ شەش مانگ).

٦- د. جاسم الیاس مراد/ وەزیری هەرێم ساڵی (١٩٩٧- ٢٠٠١).

٧- جمیل خدر عبدال/ وەزیری هەرێم بۆ کاروباری ئەنجومەنی ودزیران (٢٠٠١- ٢٠٠٥).

٨- نمر کجو هسام/ وەزیری هەرێم کابینەی چوارەمو دادوەر لەدهۆك _٢٠٠١- ٢٠٠٥).

٩- محما خلیل سنجاری/ ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران (٢٠٠٦- ٢٠١٠).

١٠- امین فرحان جیجو/ ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران (٢٠٠٥- ٢٠٠٩) لەسەر لیستی بزووتنەوەی چاکسازیو پێشکەوتنی ئێزیدیان.

١١- محمود عیدو وەزیری هەرێم _٢٠٠٦). نوێنەری (ی. ن .ك) لەئیسپانیا.

١٢- د. دخیل سعید خدر/ وەزیری هەرێم (٢٠٠٦).

١٣- ممو فرمان عوسمان/ وەزیری دەوڵەت بۆکاروباری کۆمەڵگەی سڤیل (حکومەتی عەلاوی).

١٤- خدر سلیمان خلیل/ ئەندامی پەرلەمان (٢٠٠٥- ٢٠٠٩). سەرۆکی یەکێتی نوسەران دهۆك (١٩٩٢)، سەرۆکی بنکەی لالش رۆشەنبیری کۆمەڵایەتی ١٩٩٢.

١٥- عزالدین سلیم خدیدا/ ئەندامی پەرلەمانی (٢٠٠٥- ٢٠٠٩)، بەرپرسی ناوچەی باشیك (پ. د. ك).

١٦- مریم حسن ابراهیم/ ئەندامی پەرلەمان (٢٠٠٥- ٢٠٠٩).

١٧- حسن مرعان علی/ جێگری سوپای بادینان- ساڵی ١٩٩٣، یاریدەدەری سکرتێری گشتی (ی. ن .ك) بۆکاروباری ئێزدیان (٢٠٠٤)

بەرپرسیاری دەستەی رێکخستنی (ی .ن .ك ) ٢٠٠٥.

١٨- د. میرزا حسن علی/ راوێژکاری سەرۆك کۆمار بۆ کاروباری ئێزدیان _بۆشەش مانگ).

١٩- سفو قەوال سلیمان سفو/ بەڕێوەبەری گشتی ئەوقافی ئێزدی بەغدا (٢٠٠٥- ٢٠٠٦).

٢٠-خێری هەسن خلیف شنگالی/ بەڕێوەبەری گشتی ئەوقافی ئێزدی سلێمانی (٢٠٠٦- ٢٠٠٨).

٢١- خیری الیاس بوزانی/ بەڕێوەبەری گشتی ئەوقافی ئێزدی هەولێر (٢٠٠٨- تاکو ئێستا).

٢٢- شارلمان معاویە اسماعیل/ بەڕێوەبەری گشتی ئەوقافی ئێزدی بەغدا (٢٠٠٧- تاکو ئێستا).

٢٣- قسم اوصمان خلف/ دادوەر (٢٠٠٤- تائێستا).

٢٤- حمد حجی داهر/ دادوەر (٢٠٠٤- تاکو ئێستا).

٢٥- فاروق سعید علی بگ/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای موسل (٢٠٠٣).

٢٦- شهید حسن نرمو درویش/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای موسل (٢٠٠٥ لەساڵی ٢٠٠٦ شەهید بوو بەدەستی ڕەشی تیرۆر لەموسل).

٢٧- قسم صالح/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای موسل (٢٠٠٥- تاکو ئێستا).

٢٨- میرزا سلێمان/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای موسل (٢٠٠٥- ٢٠٠٨).

٢٩- عمی درویش/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای موسل (٢٠٠٥- ٢٠٠٨).

٣٠- حمیدە خلف عیدو/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای موسل (٢٠٠٥- ٢٠٠٨) لەسەر لیستی بزووتنەوی چاکسازیو پێشکەوتی ئێزدیان.

٣١- سند خدیدا جیجو/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای دهۆك (٢٠٠٥- تا ئێستا).

٣٢- قادر خلیل حسێن/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای دهۆك (٢٠٠٥- تائێستا).

٣٣- درمان خلف عیدو/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای دهۆك (٢٠٠٥- تائێستا).

٣٤- نمیە کجان/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای موسل (٢٠٠٩- ٢٠١٢).

٣٥- جمال امین دینو/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای موسل (٢٠٠٩- ٢٠١٢).

٣٦- درمان حاجی ختاری/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای موسل (٢٠٠٩- ٢٠١٢).

٣٧- سیفو الیاس بابەشێخ/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای موسل (٢٠٠٩- ٢٠١٢).

٣٨- کمال گارس/ ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای موسل (٢٠٠٩- ٢٠١٢).

٣٩- نیاس مارو بیسو/ ئەنندامی ئەنجومەنی پارێزگای موسل (٢٠٠٩- ٢٠١٢).

٤٠- سکڤان مراد جندی/ بەڕێوەبەر لەنووسینگەی سەرۆك کۆماری عێراق (٢٠٠٦).

٤١- عزیز شمو الیاس/ بەڕێوەبەر لەنووسینگەی کاروباری ئێزدیان ساڵی (٢٠٠٧- تاکو ئێستا).

٤٢- د. باسل جوقی درویش/ قایقامی قەزای شێخان ساڵی (١٩٩٤- ٢٠٠٤).

٤٣- د. خێری نعمو علی/ قایقامی قەزای شێخان ساڵی (٢٠٠٤- ٢٠٠٧).

٤٤- حسو نرمو حسێن/ قایقامی قەزای شێخان ساڵی (٢٠٠٩).

٤٥- شێردل سمو جوقی/ مدیر ناحیە باعەدرێ ساڵی (١٩٩٧- تاکو ئێستا مدیر ناحیە مانگێش).

**لەگەڵ رێزمدا...**

**عیدۆ بابەشێخ**
**هەولێر ٢٠٠٩/٧/٢٠**




## پاشكۆی ژماره (٨)/ ب

**برای بەڕێز مامۆستا طارق جامباز**

ڕێزو سلاو...

ئەم ناوانەی خوارەوە زیادبكرێت:-

١- د. دخيل قاسم سعيد: قايقامی قەزای شنگال لە ٢٠٠٤ تاكو نێستا.
٢- خدر شنگالی: بەڕێوەبەری ناحیەی سنوغێ لە ٢٠٠٤- تائێستا.
٣- هندی علی رشو: بەڕێوەبەری شارۆچكەی باعدریٚ ٢٠٠٣.
٤- مروان سلێمان خانكی: بەڕێوەبەری شارۆچكەی خانكێ ٢٠٠٣.
٥- نايف سعيد سليمان عوسمان: بەرپرسی مەڵبەندی شێخانی (ی. ن. ك).
٦- قادر حسن عيدو: بەرپرسی مەڵبەندی سمێل (ی. ن. ك).
٧- خديده خدر عبدال: ئەندامی نووسینگەی پەیوەندییەكانی شێخانی (ی. ن. ك)/ ٢٠٠٦.
٨- هدرو بيبو الياس: ئەندامی نووسینگەی مافی مرۆڤ (ی. ن. ك). ٢٠٠٧.
٩- بەڕێوەبەری شارۆچكەی شنگال/
١٠- بەڕێوەبەری شارۆچكەی بعشيقە/ عايد رشيد خالتی.
١١- مو سليم خديدا/ بەڕێوەبەری شارۆچكەی شێخان، بەڕێوەبەری شارەوانی شێخان.

**عيدو بابەشێخ**
**هەولێر ٢٠٠٩/٧/٢٠**

**سەرچاوەكان**

١. كوردستان یەكەمین ڕۆژنامەی كوردی (١٨٩٨- ١٩٠٢) كۆكردنەوەو پێشەكی دكتۆر كەمال فوئاد.
٢. پەرلەمانتارانی خولی دووەمی پەرلەمانی كوردستان- عێراق، پارێزەر/ طارق جامباز ئەندامی پەرلەمانی كوردستان، هەولێر ٢٠٠٧.
٣. پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان- عێراق كە پەرلەمانی كوردستان- عێراق لە ٢٠٠٩/٦/٢٤ پەسندی كردووە.
٤. سوپاسی كاك ئیسماعیل بەرزنجی بەرپرسی ڕاگەیاندنی وەزارەتی پەروەردەی حكومەتی هەرێمی كوردستان دەكەین كە سەرچاوەی بۆ دابین كـردین و هەروەها سوپاسی پەرلەمانتارانی خولی سێیەمی پەرلەمانی كوردستان بەڕێزان كاك (شێردڵ تەحسینو سالم كاكۆ)و كاك عیدۆ بابەشێخو بـایزار ملكـو و اسعد اربيلی (ئەندامانی یەكێتی پەرلەمانتارانی كوردستان)) كاك نوزت دهوكی دەكەین كە لەم بارەوە یارمەتیان داین.
٥. التطهير العرقي (تغير القومية) للكورد والتركمان في كركوك، المحامي/ طارق جامباز عضو المجلس الوطني لكوردستان- العراق الطبعة السادسة ٢٠٠٨.
٦. من ابادة اللغات الى قانون اللغات الرسمية في العراق الاتحادي، المحامي/ طارق جامباز ٢٠٠٨.
٧. مجلس الثورة في الكوردستان- العراق ١٩٦٤- ١٩٧١ دراسة تاريخية سياسية عامة، شيرزاد زكريا محمد ٢٠١٠.
٨. كۆی یاساو بڕیارەكانی ئەنجومەنی نیشتمانی كوردستانی عێراق بەرگی یەكەم لە ١٩٩٢/٦/٤ تا ١٩٩٢/١٢/٣١.
٩. ڕۆژنامەی وەقائعی كوردستان ژ٩٨ یاسای ژ٢٠٠٩/٢ هەمواركردنی یاسـای هەڵبـژاردنی ئەنجومـەنی نیـشتمانیی كوردسـتان- عێـراق ژ١٩٩٢/١ هەمواركراو.
١٠. ضحايا عمليات الانفال ١٩٨٨ من المسيحيين والايزيديين، المحامي طارق جامباز ٢٠٠٨.
١١. القانون الاساسي لولاية كوردستان الفيدرالية ١٩٧٤.
١٢. پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان ٢٠٠٢/١١/١٧.
١٣. یاساو بڕیارەكانی ئەنجومەنی نیشتمانیی كوردستان- عێراق بەرگی هەشتەم لە ٢٠٠٢/١٠/٤ تا ٢٠٠٥/٢/٢٨.
١٤. وەزارەتی پەروەردەو دارشتنی دیدو ستراتیژی پەروەردەی نوێو چەپكێ چـالاكی لەكابینـەی پێنجـەم (٢٠٠٦- ٢٠٠٩) ئامـادەكردنو پێداچـوونەوە (تریفە عەبدوڵلا ئیبراهیمو وشیار حەمەد حاجی).
١٥. التشكيلات الادارية في جنوب كردستان، جمع وتنسيق د. عبدالله غفور ٢٠٠٦- سليمانية.
گۆڤاری هەرێمی كوردستان ژ ٢٠١٠/٢٨١ پتر ژ سێ هەزار ئەرمەنان ل كوردستانێ هەنەو زمانێ كوردی باش دزانن/ دهوك/ جانوبلاتی.



# بنەما گشتییەكانی كارگێڕی لێهاتوو

## كورتە دەروازەیەك لەسەر قانونی كارگێڕی

پارێزەر شەفیقی حاجی خدر

**بەراییەك لەسەر قانونی كارگێڕی:**

جارێ پێش هەموشتێك قانونی كارگێڕی لەو بەشكردنە كلاسیكیە (نەریتییە)ی قانون دەكەوێتە بەر قانونی گشتی. قانونی گشتی دوو ڕیزی لێدەبێتەوە. یەكێكیان قانونی سزادانە ئەوی دیكەشیان قانونی دەستور و كارگێڕییە. بەهۆی ئەوەی كە هەردوو قانونی دەستوری و كارگێڕی لەزۆر ڕووەوە لەیەكەوە نزیكن و بەیەكەوە گرێدراون، بۆیە ئاسان نیە هێڵێكی زەق و دیاریان بەنێودا بكێشین و سنورەكانیان دەستنیشان بكەین. بەڵام هەرچۆنێك بێت دەكرێ بگوترێ قانونی دەستوری لە سەروسیمای سەرەكی دەوڵەت (بەكۆی هەر سێ دەسەڵاتەكان) دەرەكی و ناوەكی دەكۆڵێتەوە. هەرچی قانونی كارگێڕیشە كردە و چالاكیەكانی دەسەڵاتی كارگێڕی دەگرێتە خۆی. لێرەدا دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگرین كە كارگێڕ لە قانونی كارگێڕیدا دوو واتای هەیە. هەردوو واتاكەش بەگوێرەی فرمان و سیستەمی ئۆرگانەكانی بازنەدار دەكرێن. بەمجۆرە كارگێڕ بەپێی

> **مامۆستای خەمخۆری وشەی كوردی**
> **مامۆستا مومتاز حەیدەری**
>
> *سڵاوێكی گەرم ...*
>
> دیارە بەڕێزتان لەپەرۆشییەوە خۆتان بە دەرچوواندنی گۆڤارێكی وا قەبە و بێ هاوتای وەك كەی ٢١ خەریك كردووە، كە بابەت گەلێ جۆراوجۆری لەخۆگرتووە. بێگومان ئەو هەوڵەتان لەپڕكردنەوەی بۆشایی و كەلێن تێپەڕی كردووە، خەریكە خۆی وەك دیاردەیەكی خێرهێنەرو پرشنگدار دێنێتەپێش، كە وەرزانە خوێنەری كورد چاوەڕوانین. ئیدی هەر لە ژێر تیشكی ئەوبنەمایەدا وا ئەمجارەش بەو بابەتە قانونییە كە تا ئێستا بەباشی لەبواری قانونیدا، نەخاسمە قانونی ئیداریدا، بەكوردی لایی لێنەكراوەتەوە. هیوادارم گۆڤارە خەرمان بەرەكەت ئەم ڕەهەندەش بگرێتەوە.
>
> هەر سەركەوتوو بن ...
>
> دڵسۆزتان
>
> **پارێزەر شەفیقی حاجی خدر**

تێگەیشتنی یەکەم هەروەک لەپێشەوە ئاماژەی پێدرا یەکێکە لەپێگەکانی دەسەڵات و سەروەری لە نێو دەوڵەتدا، ئەویش دەسەڵاتی جێبەجێکردنە. بەواتایەکی دیکە دەگوترێ هەمو ئەو کردار و رەفتارانەی چوارچێوەی دەسەڵاتی سەروەری دەوڵەتن بەگشتی بەلێدەرکردنی بەشی هەردوو دەسەڵاتی قانونـدانان و دادوەری. تێکڕای ئەو کاروکردەوانە دەچنە خانەی دەسەڵاتی کارگێڕەوە، ئەمەش بە دانانی رێوشوێنی جێبەجێکردنی قانونەکان دەکرێ کەلەگەڵ خۆیدا کۆمەڵێک رێسای پلە نزمتر لە قانون لەخۆ دەگرێ. نابێ ئاوەڵناوێ پلە لەقانون نزمتر وامان بە بەرگوێدا بدا کە پلەی فەرمانبەرداریشی هەروا لە خوارەوەیە. ئەمە وانیە، چونکە بڕیارەکانی کارگێڕی؛ ئەوەی لە قانونەوە سەرچاوەدەگرێ هەمان هێزی جێبەجێکردنی قانونی هەیە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە دەگوترێ پلەیەک نزمتر لە قانون؛ مەبەست لێرەدا روە فەرمیە گشتیەکەیەتی کە تەنها بۆ دەسەڵاتی قانون دانان دەگەڕێتەوە. لێکجیاکردنەوەی ئەو مژارە لەبەشی رەوایەتی و بابەتی قانون بەدرێژی باسی دێ. هەرچی تێگەیشتنی دووهەمیشە ئەوەیە کە کارگێڕ پێکهاتووە لە کۆمەڵێک ئۆرگانی سەربەخۆ و ئۆتۆنۆمیدار و دیسێنترال و گرێدراو بە مەڵبەندەوە، کەبەتێکڕا دەسەڵاتی کارگێڕی کارڕایی دەکەن. هەر یەک لەو ئۆرگانانە دەستەی جێبەجێکاری خۆیان هەیە. هەموو ئۆرگانێک کەسایەتی قانونیانەی هەیە کە لەچوراچێوەی قانونی مەدەنی بۆی دیاری دەکرێ. هەر ئۆرگانێکیش گەر بەپێی قانونی گشتی پەیدا بوبێت وەک دەوڵەت، پارێزگا و شارەوانی ئەوا پێویستی بەوەرگرتنی کەسایەتی قانونیانە هەیە، ئەویش بەگوێرەی قانونی مەدەنی دەبێت تاکو بتوانێت چالاکیەکانی خۆی ئەنجامبدات و لێشیەوە بەرپرسیاربێت. کەسی هەڵسوڕێنەری دەستەی بەڕێوبەرایەتی ئەو ئۆرگانانە کەسایەتی سروشتی خۆیان دەبێتە کەسایەتیەکی قانونی، ئەوەش بە قانون کایەکەی دیاری دەکرێ. بێگومان تایبەتمەندییەکانی دەسەڵاتی کارگێڕی لەڕوی کردەی فەرمانڕەوایی وجێبەجێکردنی قانونەکان و هاتنەکایەی دەچێتە نێو بازنەی قانونی دەستوریی، وەلێ دواتر کردەی رۆژانەی دام ودەزگاکانی کارگێڕی بەپێی قانون و رێنمایی چ لەگەڵ یەکدی -مەبەست سەودای دامودەزگاکان لەنێو خۆیاندا، چ لەگەڵ هاوولاتی دا، دەچنە خانەی قانونی کارگێڕی.

خاڵی لەیەکجیاکردنەوەی هەر دووقانونە ئاماژە بۆکراوەکە یان بەواتایەکی دیکە پێناسەی سەربەخۆ و لەیەک جودا بۆ هەر یەکێکیان هەوڵێکی ئەوەندە ئاسان و بەردەست نیي. کاری لەوجۆرەش کەڵک و سودێکی ئەوتۆی لێ ناکەوێتەوە، چونکە دەرچەی جیاکردنەوەیان ئاکامێکی قانونیانە بەدوای خۆیدا راناکێشێت.

خۆ دەگەر زۆر بەچڕوپڕی ناواخنی قانونی کارگێڕی بخرێتەڕوو ئەوا دەبێ قانونی کارگێڕی بەرسڤی زۆر پرس بداتەوە کە گرێدراون بە کێشەی فەرمانبەدەست و فەرمانبەسەرداکراودا. لەنێو پرسیارەکاندا ئەمانەی خوارەوە بەبایەخترینیان:

١- ئایا کامە دام و دەزگای دەسەڵاتدار توانای بڕیاردانی بەسەر هاوولاتیاندا هەیە؟

٢- ئایا دەبێت چ بڕیارێک دەربکات و بڕیارەکەش بەپێی چ پێواژۆیەک بێت؟

٣- ئایا چ جۆرە قانونێک سەبارەت بەو دوو پرسیارەی سەرەوە لەگۆڕێدایە؟

٤- ئایا چ جۆرە ماف و قانون پارێزیەک

لـەئارادایـە و بـۆ کیش؟
ئەو چەند دێڕانەی سەرەوە تاڕادەیەک سـەبـارەت بـەنـاوەڕۆکـی قانونـەکـە بـوون. هـەرچی لـەبارەی هاتنـەکایـە و پـەرەسـەندنی چە مکەکەیەتی، دەکرێ بە ئاسانی بگوترێ کـە بـەردەوام لـە گەشـەسـەندن دایە و دیرۆکـەکـەشـی زۆر کـۆن نییـە. لیرەوە بێ دوودڵی دەگـوترێ قـانونی






قانون بە تێگەیشتنی کلاسـیکیانە سـەیـردەکـرا، کـە ئەرکی ئێشکگرێکی شـەو بێت. ئەرکی میری دابین کردنی ئارامی و ئاسایش و ئۆردە و ڕێکخستنی سیستەمی گشتی بـوو. کاروبـاری ڕێگاوبـان، ئـاو ئـاودێری و خزمـەتگوزاریـە سـەرەکیەکان بوو. لەبەرامبەر ئەوەشدا مافی باج سەندنی هـەبـوو. بۆیە لـەو ڕوانگە فەلسەفیەوە

دەستوریی لەسەرهەڵدان و ناسینی وەک قانون زۆر پێش قانونی کارگێڕی کەوتووە. چونکە هەر دابەشکردنی قانون بەسەر دوو لکی گشتی و تایبەت، دەگەڕێتەوە بۆ سێ قانوننامەی سەرەکی، وەک قانونی سزادان و مەدەنی کە هەریەکەیان بەشێکی قانونی گرتووەو قانونی دەستوریش لەپاڵ قانونی سزاداندا قانونی گشتی پێک هێناوە.

گەر لاپەڕەکانی مێژووی قانون نەخاسمە قانونی کارگێڕی کە لە پێشەوە گوترا زۆر کۆن نییە هەڵدەینەوە، هەر دەبێ بچینەوە سەر بابەتەکانی دەوڵـەتـی قـانون بـە چـەمکـی نـەریتـی و کۆمەڵایەتییەوە.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئەرک و فرمانی میری _دەسەڵاتی کارگێڕیی_ وا لە بەرچاوی دەوڵەتی

میری پێویستی بەوە نەدەکرد قانونێکی کارگێڕی وا دابنێت کـە هاووڵاتیـان وەک سـوپەر لـەدژ ناڕەواییەکانی بەکاربهێنن. چونکە لەو ڕوانگەوە میری زۆر کاری بەسەر کاروباری خەڵکەوە نـەبـوو، زۆر دەسـتی نـەدەهاویـشتە نێـو ئیشوکاریان.

کەچی ئەو بابەتە لە نواڕینی دەوڵەتی قانونی کۆمەڵایەتی تەواو گۆڕا. لەو ڕێگەیەوە دەبوایە میـری دەست بهاوێتـە زۆر لـەو کاروبارانـەی هاووڵاتیان کەپێشتر سنووری بۆ دانرابوو و نەیدەتوانی بیانبەزێنێ. ئیدی لەگەڵ بەرفراوان بـوونی چوارچێـوەی ئـەرک و فرمانـەکـانی دەسەڵاتی کارگێڕی بەرەو گۆڕەپانی پەروەردە، لەش ساخی، خزمەتگوزاری گشتی، ژینگە پاک و خاوێن ڕاگرتن و خزمەتگوزاری دیکەش کشا.

هەر لەچاوی ئەو دەسەلات بەرفراوان بوونەشدا ترسی ئەوە پەیدا بوو کە دەزگاکانی کارگێڕی لەکاتی راپەڕین بە کاروباریان پێی‌لێهەڵببڕن و ئازادی تاکەکەسیانە کە دەوڵەتی قانون بە تاکی هاوولاتی رەوا دەبینێ و مسۆگەرکاریەتی، لەنێو ببا. ئیدی پێویست بەوە کرا دڵنیایی و مسۆگەریەک لەقانونی کارگێڕیدا بێتەدی کە رێگربێت لەبەردەم ستەم و شوڵێهەڵکێشانی دامودەزگاکانی کارگێڕی. خۆ گەر هەر نارەواییەکیشیان نواند ئەوا تاکی هاوولاتی لێی بێدەنگ نەبێ و بتوانێ لەسەر مافی خۆی هەڵبداتێ و لەچاوی قانونی کارگێڕیی و بنەماکانەوە مافی پێشێلکراوی خۆی بسەنێتەوە.

لەو پێشهاتە دیرۆکیانە کە قانونی کارگێری بەهۆیەوە باس و خواسی زیاتر هاتەپێش و تۆکمەتر بوو (هەرچەندە نەگەیوەتە دواقۆناخی تۆکمەیی) چەند هۆکارێکی گرنگ رۆڵی کارای خۆیان وازی کردووەو بەردەوامیشن لەوازیکردندا لەوانە:

١- زیادبوونی رێژەی خەڵک و دانیشتوان؛ ئەو زیادبوونە پێویستی بەوەکرد لەبوارە سەرەکیەکانی خۆراک و نیشتاک وپۆشاک خەمی بۆ بخورێ. ئەوەش لە رێگەی بەرفراوانتر بوونی بازنەی دەسەلاتەکانی میری بۆ باشترکردن و بەربلاوکردنی خزمەتگوزارییەکانی.

٢- پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا. ئەو پێشکەوتنە مۆری خۆی بەنێوچاوانی سەرجەم بوارەکانی ژیانەوەنا کە بەهۆیەوە پرسی ژینگە، رێگاوبان، کانەکان وزەی ئەتۆمی و بابەتەکانی دیکەی گرنگ کە قانونبەندیکردنیان وەک پێویستیەک هاتە گۆرێ.

٣- زیادبوون و نەشونماکردنی رۆڵی دەوڵەت لەبەرتیشکی پێناسەی کۆمەلایەتی دەوڵەتی قانون لە هاتنە مەیدانی دەوڵەت بۆ هێنانەدی دەرفەتی زیاتر و لەبارتر بۆ سەرجەم هاوولاتیان؛ چاککردنی باری گوزەران، لەشساخی، پەروەردەوفێرکردن، کلتوور، باروبوو یارمەتی کە هەمویان داخوازی هێنانەکایەی رێسای قانونیانەیان بەدواوەیە.

ئەوانە هەمویان بەیەکەوە هاوکات و هاوکار لەگەڵ زنجیرە نەپساوەی پێشهات و پەرەسەندن و پێشکەوتن و فرەبوونی پێداویستیەکان، ئەرکی سەرشانی دەوڵەتیان قورسترکرد؛ کەدەبێت لەهەمبەریان دەستەوەستان نەوەستێت و مەبەستە هەرە سەرەکیەکەی کەراژەی هاوولاتیانە بێنێتەدی.

بنەماکان رۆڵێکی کارانگازیان لەژیانی مرۆڤ چ وەک تاک چ وەک کۆمەڵ گێڕاوە و دەگێڕن. بنەماکان کۆڵەگەیەکی پتەوی نمونەیین بۆکردەو رەفتاری رۆژانەی مرۆڤ. ئەو بنەمایانە کە ئێمە لەباسکردن و راڤەکردنیان داین، بەهاکان لەپێویستبوونیانەوە وەرگرتووە بۆ درێژەپێدانی ژیانی ئاساییانەی مرۆڤ تاکو وەک چاوەڕوان دەکرێت و مەبەستە لەئاقاری ئارامی و ئاسایشدا بسەنگرێتەوە. هەروەها ئەو بەهایانەش بۆ رەوشت و واتا پیرۆزەکانیش دەگەڕێتەوە. خۆ ئەگەر دیرۆکیانەش بنوارینە هەوڵ و کردەی مرۆڤ ئەوا دەبینین ئەو بنەمایانە بونەتە ئامانج و لەپێناویدا خەباتێکی خوێناوی و درێژخایەن کراوە. نموونەی سادە و ساکار و زیندوویی بنەماکان ئازادی، سەربەخۆیی، یەکسانی، برایەتی، دادوەری و هتد.....

خۆ گەر ئەو بنەمایانە راستەوخۆش ئامرازی پاڵنەر یاخود مەبەستی رونی کۆششی مرۆڤ وەک تاک یان کۆمەڵ نەبووبن، ئەوا کانیاوی دنەدانی خودی کردەکەبوون. بەوەی هەر ویستێکی ئاشکراو رون بۆ بەرەوپێشچوون یان

بەواتایەکی رونتر مەبەستێکی هەوڵبۆدراو، ئەوا بنـاوانی رەوایـەتـی بـۆ یـەکێـک لـەو بنـەمایانـە دەگەڕێتەوە. لە هەناوی ئەو ڕاستیەی سەرەوەدا کـــردەی دیکـــەی مـــرۆڤ لـــە چوارچێـــوەی خۆڕێکخـستن و بـەدەرکـەوتنـی هـەوڵـەکـانی دارشـتنی رێگـەدانـان بـۆ رەفتـاری رۆژانـە و لەبەرچاوگرتنی ئایندەی؛ قانون وەک دەرەتانێکی دەسـتکرد و داهێنـانی مـرۆڤ بۆخـۆی بایـەخـی بنەماکانی زیاتر زەقکردۆتەوە. بێگومان قانون کە دەرچـەی دەسـەڵات و هـەوڵـی خۆرێکخستنەوەی مرۆڤە هەروا لەخۆوە و بێبنچوبنـاوان نـەهـاتووە و جێـی خـۆی نـەکردۆتـەوە. رەوشـت بـەواتـا رێـساییەکـەی، واتـا پیـرۆزەکـان، بنـەماکـان، پێداویـستیە یـەک لـەدوای یـەکـەکـانی مـرۆڤ و خواستی هاوڵاتی و دەسەڵاتداران- بەپێی کەش و هـەوای فـەرمـانرەوایـەتی لـە جۆرە دیارەکانی فەرمانڕەوایـەتـی لـە دیموکراسـی/ نادیموکراسـی- بوونـەتـە نـاوەرۆک و هێزی پاڵنـەری قـانون. خۆ دەکرێـت ئـەوەش بگوترێـت کـە قـانون زمـانی دەربرینی کۆمەڵە واتا ناوبراوەکانی سەرەوەن.
قورسایی سەنگی بنەماکان لەسـەر قانون بـەپێی لکەکانی قانون دەگۆرێت. قانون وەک لـەبـەشـی پێشودا ئامـاژەی بـۆکراوە دوو لکـی سـەرەکـی هـەیـە. لکی قـانونی تایبـەتـی کـەزیـاتر خواسـت و ئارەزوی تاکەکان لەدانانی گرێبەندەکان، ئەرک و مافەکاندا بڕیاردەرە. لـەو خوێندنـەوەیـەدا وادەبێ دەربکەوێ کە بنەماکان جێدەستیان بـەرونی و بـەرچـاوی دیـار نـەکـەوێ. ئـەمـەش لـەسـۆنگەی ئەوەی کە ویستی هێنانەکایەی ئەرک وفرمانەکان تەنها بۆ دوولایـەنـەی گرێبـەندەکە دەگـەڕێتەوە. بـەڵام لـەڕاستیدا بابـەتـەکە بـەو جـۆرە سـادەییە ناکـــەوێتـــەوە، چونکـــە هـــەر ئـــەو خواســـتەی دوولایەنییە گرێبەندیەکە با ناڕاستەوخۆش بێت، بەجۆرێک لەجۆرەکان دەکەوێتە بەر کارتێکردنی بنەمایەکان. نابێ ئەوەش لەبیر بکرێت کە هـەندێ بنـــەمـــا هـــەن راســـتەوخـــۆ لـــە راڤـــەکردنـــی گرێبەندەکاندا دێنە پێش؛ کاتێک جێ بەجێکردنی گرێبـەنـدەکـە گرفتـی دێتـەپـێش و رێگـای دادگـا دەگیرێتە بەر. ئیدی یەکێ لەو بنەمایانە دەروبەک لـە دادوەر دەکاتـەوە بـۆ بڕیـاری یـەکلاکـەرەوە. کاتێکیش دوولایەنە پەیوەندیدارەکە سـەروبـەندی لایـەنـەکـانی گرێبـەنـدەکـەیـان لـە رویی ئـەرک و مافەکان دانەڕشتبوو، ئەوا بێ مقۆمقۆ بنەماکان رۆڵـی شـیاوی خۆیـان دەگێـڕن. ئـەوەی جێـی سەرنج بێت لە بواری قانونی تایبەتدا بەتایبەتیش لە چارەسەرکردنی کێشەگەلی وەک گرێبەند و ئەرک و مافـەکـان، بنـەمـای نیازپـاکی و رەفتـاری ئاسایی رۆژانەی خەڵک لە هـەمـان بـاردا سـەنگی قانونیان زۆر بەباشی دەردەکەوێت.
لەبواری لکەکەی دیکەی قانون، قـانونی گشتی دا سەنگی بنەماکان قورستر و لەبەرچاوترە.
ئەمەش دەگەڕێتەوە بـۆ تایبەتمـەندێتی قانونـەکە خۆی. لێرەدا قانونی گشتی کەمتر یـان بڵـێن بـوار نـاداتە خواستی تاکەکان لە راڤەکردنـی رێساکانی ئـەرک و مافـەکـان بـەڵکو دەسـەڵاتی فـەرمـانڕەوا بڕیاردەرە. مەبەستیش لـەدەسـەڵاتی فـەرمـانڕەوا ئەو دەسەڵات(ان)یـە کـە لـەبابـەتـی جیاکردنـەوەی دەسەڵاتەکان باسـی لێوەدەکرێ. ترسـی ئـەوەش هـەیـە کـە دەسـەڵات شـوڵی لێهـەڵبکێشێ، بۆیـە سـەراتاکان دەبنە لەمپەرێک لـەبـەردەم تـەقـەڵلای ئەو زێدەڕۆییـە. لـەهـەمـان کـاتیش بـەرژەوەندی گشتی خەڵک –هاوولاتیان- پیشەنگە و بنـەماکان دەبنـە بـەربـەسـت لـەبـەردەم هـەر لارێبـونێکی ناواخنی قانون و جێبەجێ کردنـی نادروستیانەی تاکلایەنیانەی رێساکان.
کاتێـک کێـشەیـەک دەچێتـە بـەردەم دادوەرێـک



بۆنموونە کێشەیەکی تایبەت بە قانونی سزادان، ئەوا دادوەر دەقێکی قانونی لەپێشە بۆ سەپاندنی سزا بەسەر تۆمەتبار و کردنی بەتاوانکار؛ کاتێک کە تەواوی رەگەزەکانی تاوان بسەلمێندرێ. کەچی لەهەمان کاتیشدا نابێ هەروا بە وشک وبرینگی دەقی ماددە قانونە نوسراوەکە جێبەجێبکا، بەڵکو دەبێ بگەڕێتەوە بۆ بنەما پەیوەندیدارەکان.

لایەکی دیکە لە قانونی گشتی کە بریاردەرە بەسەر هەڵسوکەوتی هاووڵاتیان لەچوارچێوەی قانونی کارگێڕیدا، دامو دەزگا و دارودەستەی میریە. مەبەست لەوە ئەو پایەیە کە بەهۆیەوە دەسەڵات دەگێرێ جا بازنەی دەسەڵاتەکە هەرچۆنێک بێ. هەر لە وەزیرەوە بگرە تا فەرمانبەرێکی خوارەوە کەجۆرێک لە دەسەڵاتی هەبێ؛ بۆنموونە دەسەڵاتی مۆڵەتپێدانی لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل و دروستکردنی خانوو هتد.

راستە قانونی کارگێڕی و قانونەکانی پلەخوارو و رێسا و رێنماییە گشتییەکانی میری و وەزارەت و فەرمانگاکان، زۆر لایەنی چۆنیەتی دارشتن و جێبەجێ کردنی بریاری کارگێڕییان وەک دەق لەخۆ گرتووە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا نابێ رۆڵی سەرەتاکان پشت گوێ بخرێ، ئەو رۆڵناسینەش لە دووتوێی دەق یان لە دەرەوەی دەق. هەر بریارێکی میری –مەبەست لەمیری دەسەلاتی کارگێرییە- لەڕوانگەی فەرمانبەرداربوونی بەبنەماکانەوە جیاوازی نییە، ئیدی بریارەکە لە ئەنجومەنی وەزیرانەوە بێت یان وەزیر یان بەڕێوبەری گشتی یان هەر فەرمانبەرێکی دەسەلاتپێدراو.

ئەو لاباسەمان کە تەرخانە بە بنەماکان مەبەست زیاتر ئەو بنەمایانەیە کە دەبێ بریاری کارگێڕی لەبارودۆخی ئامادەکردن، واژۆکردن، ئاشکراکردن و جێبەجێکردنی بریارەکەدا پەیرەویان بکات. پێشێلکردنی یەکێ لەو بنەمایانە –وەک دواتر بەدرێژی باس دەکرێ- دەبێتەمایەی لەکەداربوونی بریارەکە و بناوانی ماف بۆ هاووڵاتی کەسەرەتا لەبەردەم هەمان دەسەلاتدا بەگژیدا بچێتەوە پاشانیش گەر هەر دادی نەدا روو لە دادگا بکا. لەهەمان کاتیشدا بنەما پەیوەندیدارەکە دەبێتە دەرەتانێک بۆ دادوەر بۆ لەمحەکدانی بریاری کارگێر.

ئەو بنەمایانە بە تایبەتیش ئەوانەی بواری کارگێری دەگرنەوە، هەروا لەخۆیانەوە نابنە بنەمای رەوایەتی قانونیانە بۆدەست پێوەگرتن، بەڵکو پێویستیان بەهەژاندنێک هەیە، پێویستیان بە بەجوڵەخستن هەیە بەکورتی پێویستان بەپێواژۆیەک هەیە. بەگەڕخستن و تەکانپێدانی ئەو بنەمایانە دەچێتە خانەی دەستپێوەگرتن وجێبەجێکردن. ئەو جوڵەیەش پێواژۆیە (پرۆسە)کە دەربەستیەتی. پێواژۆ بەو واتایەی داخوازینامە و تەقەللانامەی خاوەن ماف و پەیوەندیدارەکان بەو مەبەستەی کەقانون دەیناسێ رەوایەتی دەداتێ. پێواژۆ لێرەدا بەو واتایەی کە یەکنەگرتنەوەیەک لە دەرچەی بریارە کارگێرییەکەدا هەبێ، ئیدی ئەو کۆششە چ هاووڵاتی بیگرێتەبەر و پەنای بۆببات لەهەمبەر بریارێک بە رای خۆی لادەر و لاسەنگ سەبارەت بە بەرژەوەندییە چاوەڕوانیە رەواکانی لەرووی دەرەتانی قانونی، یان چ دامودەزگای بریاردەر دەستی بۆببا بە ئامانجی داکۆکی لەخۆپێکردن بەوەی لەگرتنەبەر و بەرێوەچوونی پرۆسەکەدا بنەما پەیوەندیدارەکان پێشێلنەکراون. کەواتە لێرەدا بنەما پەیوەندیدارەکان بەردەستی هەردوو لایەنی پرۆسەکە دەکەن. بەمەش

-یەحەکەیان دووقاتتر دەبێتەوە.
ـاف بـەگشتی وەک دەگوترێـت دەسـەنـرێ و نـادرێ. مـاف سـەنـدنیش بـەگـوێـرەی نـاواخنی بنەماکان لە پەیڕەوکردنی ڕێوشوێنی قانونیانەی دەستپێوەگرتنیەتی کە ئەویش لەپێواژۆکەیدا خۆی دەبینێتەوە.
نموونەیەکی سادە: هاووڵاتیەک داوای مۆڵەتی دروستکردنی خانویەک لەشارەوانی ناوچەکەی خۆی دەکا. دوای ماوەیەک شارەوانی بڕیارێکی نەرێییانە دەردەکا. ئیدی هاووڵاتیەکە نابێت هەروا لەخۆیەوە بڵێت شارەوانی نارەوایەتی لەگەڵ کردوم و هیچ تەکانێکی دیکە نەدات. بەڵکو وا پێویستە دەستبەردار دانەنیشێ و نامەیەکی نارەزایی بۆ شارەوانی بنوسێ کە تیایدا داوای رونکردنەوەی هۆیەکانی نەرێیەتیەکە بکاو لەسەر شارەوانیش پێویستە رونکردنەوەکە بدا. ئەوسا مافی هاووڵاتیە کە سکاڵانامەیەک بنوسێ لەسەر بنەمای بەڵگە، بەوەی داخوازیەکەی تەواوی مەرجە قانونییەکانی تێدابێ. یاخود لەهەمان بارودۆخی یەکساندا بڕیاری ئەرێنی بۆ کەسێکی دیکە دەرچوە، کە لێرەدا هێما بۆ بنەمای یەکسانێتی دەکرێ. ئەوسا گەر وەڵامی دووهەمی شارەوانی هەر دووپاتکردنەوەی هەمان بڕیاری یەکەم بوو، ئەوا ڕێگای دادگا (دادگای کارگێڕی) لەسەر پشتە تاکو بیبڕێنێتەوە و دوا قسەی یەکلاکەرەوەی خۆی تێدابکا. لەپێشهاتی پرۆسەکە دەگەینە ئەو راستیە کە بەنوکە قەڵەمێکی فەرمانبەری شارەوانی کێشەکە نابڕێتەوە. چونکە گەر بەو ڕێوشوێنە بێت کۆمەڵێک ڕێسای دارێژەری بنەماکان پێشێلدەکرێن، کەدواتر بەدرێژی باسیاندێ. بەڵام لێرەدا پێویستە ئەوە بگوترێ لە گرتنەبەری ئەو پرۆسەیەدا جۆرێک لە پلەداری ڕێوشوێن گرتنەبەر هەیە بەوەی دادگا دوا هەنگاو دەبێ و ناکرێ بەسەر قۆناخی سکاڵانامەدا باز بدرێ. هەروەها کاتبەندیش گرتنەبەری ڕێوشوێنی پرۆسەکە مەرجدار دەکا بەوەی هەم قۆناخی سکاڵا و هەم قۆناخی دادگا ماوەی تایبەتی خۆی هەیە کە لە دووتوێی قانونە پەیوەندیدارەکاندا بەراشکاوی هاتووە. رەچاوکردنی ئەو ماوە قانونییە دەستنیشانکراوە ،چارەنوسسازە بۆ تەکانپێدانی خودی پرۆسەکە.
پرۆسەیەک کە لەلایەن دامودەزگای کارگێڕی دێتەگۆڕێ، دەبێ بەباشی و بەلێهاتویی بەڕێوەبچێ. ئەو لێهاتووییە یان بڕیاری لێهاتوو چاوگەکەی هەر بەتەنها بۆ دەقی قانونی ناگەڕێتەوە بەڵکو هاوتا لەگەڵ قانون بۆ بنەما گشتییەکانی لێهاتویی بڕیاری کارگێڕیش دەگەڕێتەوە. لەهەر پرۆسەیەک گەر سەلمێنرا کە لە رەچاوکردنیدا ئەو بنەمایانەی پێشێلکردووە، ئەوا لەڕێگەی سکاڵاو بەگژدا چوونەوە دەکرێ هەڵبوەشێنرێتەوە.

## بەقانونیکردنی بنەماکان:

بنەما گشتییەکانی لێهاتوویی بڕیاری کارگێڕی هێزی جێبەجێکەری خۆیان لە قانون و عورف بڕیاری دادگای باڵا (تەمیز) وەردەگرن.
پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە یەکێک لە سەرچاوەکانی قانون بنەماکانن. بۆیە کاتێک بنەمایەک بەزمانی قانون دادەڕێژرێ گومانی تێدانیە کە هێزی جێ بەجێکردنی کاریگەرتر دەبێ لەبنەمایەکی دانەڕێژراو و بەقانوننەکراو. بەو ئاقارەدا بنەما هەیە لە چوارچێوەی قانون دارێژراوە. ئەو بەقانون کردنەی بنەماکان زیاتر ئەو بنەمایانە دەگرێتەوە کەگشتین و ڕێسای گشتی و ناسراو و دانپێدانراون وەک یەکسانی،




دواتر له *قانونەکاندا* دەقنوس دەکرێنەوە و روونتر دادەڕێژرێنەوە. لێرەدا پێویستە هێما بۆ ئەوە بکرێت کە جۆرێک لە تێکەڵاوی لە نێوان بنەماکان و مافە بنچینەییەکاندا هەیە. زۆرجاریش وایە ناوەڕۆکی هەردووکیان هەر یەک شتە. لەبابەتی مافە بنچینەییەکان ئەو بابەتە ئاماژە بۆکراوە بە درێژتر لێیکۆڵراوەتەوە.

سەنگی ئەو چەند بنەما ناوبراوانە لە دەقی دەستور و قانونەکاندا بەتایبەتیش لە دەستوردا بۆ بڕوانامە و ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییە جیاجیاکان دەگەڕێتەوە. ناکرێ دەوڵەتی هاوچەرخ لاری لەبەرامبەر هەبێت و پشتگوێیان بخا. چونکە سەنگی مەحەکی واتا پیرۆز و باوەکانی سەردەم ئەو چەمکانەن کە ناواخنی دەوڵەتی قانونی دیموکراسی پێکدێنن.

ئەوە لایەنێک، لایەنێکی دیکە خودی ئەو چەمکانەن وەک پەیڤ و دەستەواژە. ئەو چەمکانە بەڕەهایی بەکارهێنراون جێگەیان لەنێو دەقە قانونیەکان بۆکراوەتەوە. بۆنموونە کۆمەڵێک پرس وەک: یەکسانی چی دەگەیەنێ؟ چۆن پەیڕەو دەکرێ؟ دەوروبەرو باروودۆخ چ باندۆرێکی بەسەرەوە هەیە؟ ئایا هەموو کەسێک لە گشت باروودۆخ و کاتوساتێکدا بۆیان هەیە پەنای بۆ بەرن؟ ئایا یەکسانی چوارچێوە و سنووری هەیە؟ گەر هەیەتی چین؟ بەرسڤی ئەو پرسانە و پرسگەلی دیکەش لەدەقی دەستور و قانوندا نادۆزرێنەوە. بۆیە دامودەزگای دەوڵەت بەپێی دەسەڵاتەکانی قانوندانان، کارگێڕی و دادوەری ڕاڤەیدەکا. لەو شرۆڤەکردنەشیاندا گەر *دانپێدانراوانەیە*. خۆ لە *دەوڵەتی قانونیشدا* گەر دەسەڵاتی کارگێڕی بەتەنها سەرپشککرا لە ڕاڤەکردنی بنەما ئاماژەبۆکراوەکان ئەوا دیسان بە کردار ئەگەری داشۆرین لەناواخنیان دێتە گۆڕێ.

کاتێک دامودەزگایەکی کارگێڕیی خەریکی دەرکردنی بڕیارێک بێ کە پەیوەندی بە هاووڵاتیەوە هەبێ، دەبێ لە چوارچێوەی قانوندا ئەو کارەبکا. واتە دەبێ بڕیارەکە پشت بە قانون ببەستێ. ئەمەش کرۆکی بنەمای ڕەوایەتییە کە لە بابەتی خۆیدا بە درێژی باسی لێوە دەکرێ. فەرمانگەیەکی کارگێڕ ناتوانێ لەخۆوە و لەگۆترە، بێگوێدانە قانونی تایبەتمەند بڕیارێک دەربکا. بەڵام ئەوەش وا ناگەیەنێ کە قانون سەرتاپای کون و کەلەبەرەکانی گرتۆتەوە و ورد و درشتی شتەکانی قانونڕێژکردووە. لەو نێوەدا فەرمانبەری کارگێڕی جۆرە سەربەستیەکی هەیە کەتێیدا بخولێتەوە و قانون ڕاستەوخۆ لەقاڵبی نەدابێ، ئەوسا لەڕێگەی ڕاڤەکردن بۆی بچێ یان دەسەڵاتی خۆی بۆ بەکاربێنێ. لەو بوارەدا کە قانون نەتوانێ سەرجەم ڕەفتارەکانی کارگێڕ ڕێساڕێژ بکا ئەوا گۆڕەپان بە تەواوی بۆ دەسەڵاتی کارگێڕ ئاوەڵا نابێ، ئەوکات لەجیاتی قانون بنەماکان دێنەپێش. بۆ پڕکردنەوە و تەوکردنی قانون بنەماکان لەسەرڕێن و دەبێت کارگێڕ پێیەوە پابەند بێ ئەگینا بڕیارەکەی توشی ئەگەری هەڵوەشاندنەوە دێ؛ کاتێک هاووڵاتی بەرژەوەندیدار لێیرازی نەبێت و گازاندە بکات و دواتر پەنا بۆ دادگا ببا.

ـیـردا بنـەماکـان وەک تـەواوکـەری قـانون ـنەپێش. ئەو قسەیە تا ئێرە پەسندە. بەڵام ئەو ـسـەیە تەنیا لەو بارەدا دێتەئاخافتن کە ئێمە ـانون و بنەماکان بە دروستی وەک دووشتی ـیەک جودا بخوێنینەوە. بۆیە نابێ ئاگامان لەوە ـبـرێ کـەزۆر لـەو بنـەمایانـە لـە دووتـوێی ـانـونـەکانـدا رەنگرێژکـراون و دارێـژراون. بۆیـە ـەکان بەدوو شێواز دێنەپێش، جارێکیان وەک ـدەقێکی دارێـژراوی نێو قـانون، جـاری دیکـەش ـەک کەلێنپڕکەرەوە و جێگرەوەی قانون، چونکە ـەقـانونی نەکراون. بۆیە هیچ کایەیەک بۆ کارگێڕ ـدێنێتـەوە خـۆی لـێ لابـدا. گـەر بـەسـەرێکیش ـەبگرێ بەسەرەکەی دیکە دەیگرێتەوە.

ـرێـارێ کارگێڕی بەسـەر دوو تـا دابـەش دەبێ. ـیەکیان ناواخنەکەیەتی تایەکەی دیکەش کردە و ـێـوازی دەرچونـەکـەیـەتـی. نابێـت بڕیـارێکی ـارگێری بێ ناوەڕۆک و پرۆسەیەکی لێوەشـاوە ـیهـاتوو دەربچـێ. گـەرهـاتوو بڕیارێـک ـوردۆکـی ناشایـستە بـوو ئـەوا مـەرجـی ـایستەبوونی پێواژۆی ئامادەکاری بڕیارەکە ـدەبێتە لەمپەر بەرامبەر دەرکردنی بڕیارەکە. بەو ـیـە شـێوازی لێهاتوویی دەرکردنـی بڕیـارەکـە ـەلایەن خۆیەوە دەبێتە جۆرە چاودێرێک بەسـەر ـڕیـارەکـە –وەک دارشـتن و نـاوەڕۆک-. نـابێ ـگـشمان لەوە ببرێ کەبنەماکان هەر دووتای ـڕیـارەکـە دەگرنـەوە. بنـەمـا هـەن نـاوەڕۆکـی ـڕیارەکەیان پێ لەمەحەک دەدرێت و هـەروەهـا ـەماش هـەن پێواژۆی دەرچوونی بڕیارەکە لە ـەنگی محەک دەدەن.

ـسـەی لەسەر نییە پاراستن و لەسـەر رۆیشتنی ـیساکان دەبێتـە بـەربـەسـت لـەبـەردەم لـە ـانونلادانی بڕیـاری کـارگێڕی بـەڵام بێگومـان لـە ـێو سنووری دەوڵەتی دیموکراسی و قانوندا. ـچ قانوندانـەرانـی وڵات (نێوخـۆ) چ نێودەوڵـەتـی، ناتوانن لە دووتوێی قانوننامەکانیاندا سەرتاپای پێداویستیەکانی رۆژانەی مرۆ دابرێژن و رێسای بـۆ دابنـێن، چونکـە گـەر وابکـەن ئـەوا هـەر قانوننامـەیەکی تایبەت بەبوارێک لـە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵ دەبێ هەزاران ماددەی بۆ تەرخان بکـەن. هـەروەهـا بـارودۆخی مـرۆڤیش بـەپێی پێویستی و پێشکەوتنی کات و تەکنیک روو لە زیادبوونـدایـە، بۆیـە نـاکرێ لـەسـەر بنـەمـای پێشبینیکردن بێ. ئـەو خاڵـە لـە قانونـدا خـاڵێکی لاوازە بۆیە پێویستی بە پڕکردنەوە هـەیە. هەر لەبەر ئەوەشە داخوازی گۆڕین و هەموارکردن و دانـانی قـانونی نـوێ مـاوە بـەمـاوە یـان بـە بەردەوامی بەپێی سیستەمی وڵاتان دێتەگۆڕێ. بێجگـە لـەو رێگـەچـارەی ناوبـەنـاوەیـە یـان بەردەوامی هەموارکردن و دارشتنەوە یان دانانی قانونی نوێ، رێسا گشتییەکان ئەو کەلێنە باش پڕدەکەنەوە. هەر بۆیەشە ئەو رێسایانە کە بنەما گشتییەکانن بە قانونی تۆمارنەکراو دانراون، یان وا باشترە کە بڵێین قانونی نەنوسراون چونکە لە قانونناسیدا هەروایە. ئەو بنەمایانەش ئەو رێسا گشتیانە لەخۆدەگرن کە لە روانگەی هەست و درکپێکردنی مرۆ؛ کەلە مەبەستی دادپەروەری نزیکدەبنـەوە و لـەلایـەن هـەموانـەوە پەسـندن وتاقیش کراونەتەوە، لەو رووەشـەوە رەوایـەتیان وەرگرتـووە. تێکـرای ئـەو رێسا گشتییە مـاف لەخۆگرانـە لـەراژەی هاووڵاتیدان. ئەو رێسایانە بنەما گشتییەکانی لێهاتویی بڕیاری کارگێڕی بن یان بنەما گشتییەکانی کایەی قانونی سزادان، یان هـی قـانونی مـەدەنـی هـیچ لـە وێناکردنیـان وەک سەرچاوەیەکی بەردەستی قانونیبوون ناگۆڕێ.

بنەماکان ئەو واتا بەهادارانەن کە خەڵک بەگشتی پەسندیانکردووە. ئیدی لەسۆنگەی ئەوەوە بەهای دەرکـەوتنیـان بـۆ ئاسـتی پـەیـڕەولێکـردن دەردەکـەوێت. وەک دەرکـەوتـە یـان بـەرامبـەر



قانون پاشان بەدەق کراون واتە خراونەتە چوارچێوەیەکی قانونی و نوسراونەتەوە، یان نەخراونەتە قاڵبی نوسینەوە وەک دەق بەڵکو بە نەنووسراوی ماونەتەوە، بەڵام سیمای قانونیان لێدانەشۆراوە. لێرەدا لەبەرامبەر دوولایەنی چەمکی قانون دەوەستین: یەکێکیان قانونی نوسراوە کە لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانان دەردەچێ؛ لایەکەی دیکەشیان قانونی نەنوسراوە.

کاتێک خوێندکارێکی قانون لاپەڕەکانی کتێبە ئەکادیمیەکان هەڵدەداتەوە هەوڵی ئەوە دەدا بنەمایەکی قانون فێرببێ، ئەوا هەر لەبەراییەکانەوە بە واتاکانی قانون و سیماکان و سەرچاوەکانی قانون ئاشنا دەبێت. کە باس دێتە سەر ژێدەرەکانی قانون ئەوا ریزبەندیەکەی بە کارانگازبوونی کلتوورو دین دابەش دەبێتە سەر:

١- قانونی دانراو/ نوسراو

٢- عورف (داب نەریت)

٣- رێکەوتننامە

٤- پێشینەی دادوەری، بریاری دادگا - دادگای باڵا (تەمیز).

ئەو باسە پێشتر باسکراوە. بۆیە مەبەستمان لێرەدا ژێدەری دووهەمە. عورف زۆرجار بە قانونی تۆمارنەکراویش ناوزەدە دەکرێ.

کاتێکیش دێین وباس لە بنەماکان دەکەین ئەوا ئەوان بەرگی ئەو ژێدەرێتیەش دەپۆشن.

بەم جۆرە ژێدەری نەنوسراو دوو لکی لێدەبێتەوە کە عورف و بنەماکانن.

کارلێککەری عورف و بنەماکان لەسەر یەک یان سەودای نێوانیان زۆر بەهێزە. زۆرجاران عورف بەخۆی بنەمایەکە، یاخود بنەمایەک لەپشتییەتی. بەڵام مەرج نیە هەموو عورفێک بنەما بێ، هەروەها بە پێچەوانەشەوە. عورف زیاتر تایبەتمەندە بە زەمین و زەمانی کۆمەڵگایەک، بەچۆنیەتی رەفتارکردن و دووبارەبوونەوەی ئەو رەفتارانە و پەیدابوونی ئەو بروایەی ملکەچێتی لە بەرامبەر دووبارەبوونەوەی ئەو رەفتارانەدا بێنێتەکایە؛ یان لادان لەو رەفتارە دەبێتە مایەی پەشیمانی و سزای کۆمەڵ. کۆنیەتی عورفیش بەوە تاقیدەکرێتەوە کە نەزانرێت سەرەتای رەفتارەکە بۆ کێ و چ کەسێک دەگەرێتەوە، بەڵکو بۆ یادەوەری کۆمەڵ خۆی.

بنەماش پەیوەندیان بەباوەڕی مرۆڤەوە هەیە، بەوەی بەهای رەفتارەکە لە واتاکانی چاکە و خراپە و پێویستی بەردەوامبوونیدا هەیە و فەلسەفەیەکیشی لەپشتە.

بنەماکان ناوەرۆکی گشتییان هەیە هەر بەو لایەنە گشتگریەش بە شێوەیەک لە شێوەکان راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ سەروسەودایان لەگەڵ قانوندا پەیدادەبێت. ئەو بەشە بابەتە کە تەرخانە بە بنەماکان مەبەستمان بنەما قانونیەکانە یاخود ئەو بنەمایانەن کە قانون بۆ رێکخستنی ژیانی کۆمەڵ پەنایان بۆ دەبا، نەک بنەماکان بەفراوانی واتاوە. چونکە گەر باسی بنەماکان بەفراوانی و گشتگری واتاکانیانەوە بکەین ئەوا دەبێ خۆمان لەقەرەی بابەتەکانی کۆمەڵناسی و فەلسەفە و کلتوورناسی و ئایینناسی بدەین، ئەوەش کایەی باسەکەی ئێمە نییە.

### جۆری بنەماکان بەسەوردایان لەگەڵ قانون:

• ١- گوتمان بنەماکان چاوگێکی نەنوسراوەی قانونن. بەڵام هەندێ بنەما هەن لەبەر گرنگیان، لەبەر بەربڵاوی و ناسراوییان راستەوخۆ قانون دانی پێداناون و لەدووتویی ماددەکانیدا ئاخنیون. زۆرجارانیش دەستور لەو بوارەدا پێشەنگە، ئینجا قانونەکانی دیکەش هەمان رێگە دەگرنە بەر. کاتێک بنەماکان بەم جۆرە دێنەپێش

کارئاسانی زۆر بۆ مافناس و هاووڵاتی مەیسەر دەکەن. چونکە مقۆمقۆ سەبارەت بە دەستپێوەگرتنی ئەو بنەما پەیوەندیدارە یان دەستپێوەنەگرتنی ناهێڵێ. کێشەی فەرمانبەرداری هەر لەبەرابییەوە دەبڕێنێتەوە. قانونیش کە بەراستەرێگای خۆی - دەسەلاتی قانونداناَن- بەپێی کردەی دیموکراسی لە پرۆسەی هەڵبژاردنی گشتی ئازاددا دێتەبوون، سەنگ و بایەخی رەوایەتی بنەما دانپێدانراوە کە جێگرتر دەکا.

لێرەدا پرسێک سەبارەت بە لەخۆگرتنی بنەماکان دێتەگۆڕێ بەوەی ئایا ناکرێ هەموو بنەماکان بئاخنرێنە لیستی قانونە دارێژراوەکان کە بەمە لە کێشەی لابەلای راڤەکردن و بە ناڕاستەوخۆ دەستبۆبردن رزگارمان دەبێ؟ بۆ بەرسڤی ئەم پرسە بڕیارێکی یەکلاکەرەوە لەبەردەستدا نییە. پشتگرەی وەلامەکە بۆ ئەوە دەچێ کە هەندێ لەبنەماکان، رەنگبێ بەشێکی زۆریش بن، تارماییان لەسەر بێ و رون و ئاشکرا نەبن، یاخود شرۆڤەی زۆریان گەرەک بێ ، بۆیە وا باش نییە سەرجەمیان کۆبەندی قانون بکرێن. بێجگە لە هۆی ئاماژە بۆکراو هۆی دیکەش ئەوەیە کە بنەماکان مشەن و لەفراوانبوونیشدان، هەمووشیان هەر تایبەت نین بەلکێک لە لکەکانی قانون؛ زۆر جارانیش لە توانست و درکپێکردنی هەنوکەیی قانوندارێژدا دەردەچن. قانونیش ئەرکی فەرهەنگ لەخۆیەوە ناگرێ، واتە قانوننامە فەرهەنگێک نییە تا سەرلەبەری چمک و دەستەواژە و پەیڤەکان لەخۆی بگرێ. هەر بۆیە گرنگترین و بەرچاوترین بنەما وەک یەکسانیی، دادوەری، رەوایەتی و بنەما گشتییەکانی لێهاتوویی بڕیاری کارگێڕی بە دەقی قانونی دارێژراو کراون و ئەوانی دیکەش ماونەتەوە بۆ دادگا و راڤەکردن.

٢- لەو خاڵەی سەرو بارێکی رێسایی باسکرا کە چۆن بنەماکان بە دارشتن لە نێو بەند و ماددەکانی قانوندا یان بەدانەرێژراوی/ نەنوسراوی/ سیمای رێکخەری و پێوەپابەندبوونیان هەیە. کەچی لەم خاڵەدا باسی بارێکی جیاواز دەکەین. بنەما هەیە ئەو وەک باری سەرەوە بەلام بەهەڵگێراوەیی؛ واتە قانون راشکاوانە جاڕدەدا کە فلانە بنەما نابێ وەک بنەمایەکی هێزپێدراوی قانونیی لەبەرچاو بگیرێ، بەڵکو دەبێت بەلاوەبنرێ. زەقترینیشیان ئەو بنەمایەیە کە دەڵێ:" نابێت کەس لە بەدکاری خۆی سودمەند بێ". نموونەش بۆی: یەکێک سامانێکی (زۆری) بۆ بەجێ دەمێنێ. کاتێک کە میراتدەرەکە لە ژیاندا نەمێنێ، جا چ دایک و باوکی بێ یان کەسێکی دیکەی خزمی. ئیدی میراتگرەکە تا زوو دەستی بەمیراتەکە رابگا بەتاوانی کوشتن هەڵدەستێ. لەئەنجامدا هەرچەندە سزای خۆی لەبەرامبەر تاوانی کوشتنەکەدا وەردەگرێ بەلام قانون لە میراتەکەی بێپشکی ناکا. وەلێ ئەو بنەمایەی باسی لێوەدەکەین لێی بێبەشدەکا. بەشە سامانە بەجێماوەکە دەگەڕێتەوە خەزێنەی دەوڵەت بەمەرجێک هەر تەنها خۆی میراتگرە قانونیەکە بێ.

بنەمای مێژوویی ئەو بنەمایە بۆ دارشتنە لاتینیەکەی دەگەڕێتەوە کەدەقەکەی واهاتووە Nemo auditur suam turpitudinem allegans.

٣- کاتێک قانونی بەردەست بێدەنگبێ لە ئاست چارەسەرکردنی دۆزێک لەدۆزەکانی هەڵسوکەوتی رۆژانەی خەڵک، ئەوا بنەماکان ئەو بۆشاییە پڕدەکەنەوە. لێرەدا بنەماکان وەک یەدەگێک دێنە پێشچاو. قانونیش وەنەبێت سەرجەم بوارەکانی ژیانی مرۆڤی بێ کونوکە





لەبەر داپۆشین هێشتبێتەوە، بەڵکو بۆشایی تێدەکەوێ. ئەو بۆشاییانەش بە بنەماکان پڕدەبنەوە. هەرچەندە لێرەدا ئەوە دەگوترێ کە قانون دەربڕێکی دیموکراسیانەی خەڵکە لەڕێگەی نوێنەرەکانییەوە بۆ داڕشتنی چوارچێوەی ئەرک و فرمانەکانیان، ئیدی چۆن دەبێ کە ئەو جۆرە دەربڕە دیموکراسییە نەما و بۆشایی تێکەوت، راستەوخۆ کەلێنەکە بە پڕکەرەوەیەکی نادیموکراسی پڕبکرێتەوە، کە مەبەست لێرەدا بنەماکانن. لەبەرامبەر ئەو قوڵبینییەدا وەڵامەکە ئاوا دەکەوێتەوە کە بنەماکان لەراستیدا واتای گەورە و گرنگ لە خۆدەگرن. واتاکەشیان لە بناوانەوە لە بڕواپێبوونی خەڵکەوە هەڵێنجاوە. بەپێی داگرتن لەسەر ئەو خاڵە ئەوە دەبینرێ کە خەڵک بەتێکڕا داخوازی ناوەڕۆکی ئەو بنەمایانەن چونکە بۆخۆیان و بەرژەوەندیەکانیان هاتونەتە کایە. بەمە دەکرێ بگوترێ کە پەسەندکردنی خەڵک بۆی جۆرە راپرسییەکی گشتی نافەرمی هێناوەتەکایە کە لەگەڵ خواستی دیموکراسی هاوچەرخ هاوڕاو هاومەبەستە. هەر بۆنموونە و بەس بنەمای یەکسانی گەواهیدەرێکی حاشا هەڵنەگری ئەم بارەیە.

٤ - زۆرجاران وایە بنەماکان رۆڵی سایە دەبینن، واتە سایەی قانونێک لەقانونەکان. خۆ گەر قانونەکە هەمووشی لەژێر سێبەری بنەماکان جێی نەبێتەوە ئەوا ماددەگەلێکی یان بەندگەلێکی لە سایەی بنەمایەکدا دەردەکەون. کاتێک مادەیەکی قانون لێکدەدرێتەوە و شیتەڵدەکرێ، هەروا بە دەقاودەقی وەرناگیرێ. بەڵکو دادوەر بەرەو گیانی قانونە پەیوەندیدارەکە هەنگاو هەڵدەگرێ، پەنا بۆ فەلسەفەی قانونەکە دەبات، هەوڵدەدا رازی نێوان دێرەکان هەڵبێنێ. ئەو پرسانە لە سەلماندنی قانوندا پێویستیان بە وەڵامی دادوەرە: ئایا مەبەستی قانونەکە چییە؟ هۆکاری دانانی چییە؟ چ چاکسازیەکی لەبەر چاوگرتووە؟ لەکۆبەندی هەموو ئەوانەشدا بنەماکان قیتدەبنەوە و دەبنە پێوەر و کەرەستەیەکی لەبار بۆ راڤەکردنی قانونەکە بە ئامانجی بەدروست جێبەجێکردنی.

## ڕێسا گشتییەکانی لێهاتوویی بڕیاری کارگێڕ:

میری - دەسەڵاتی کارگێڕی- لەڕێگەی دامودەزگاکانیەوە راستەوخۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوولاتیان دەکا و کاروبارەکانیان هەڵدەسوڕێنێ. بەپێی بنەمای رەوایەتی دەبێ قانونێک لەبەردەستدا بێ کە بەشێوەیەکی دیموکراسی لەلایەن دەسەڵاتی قانوندانانەوە (بەگوێرەی بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان) دەرچووبێ. هەموو رەفتارێکی میریش دەبێت لەژێر چەتری قانون دابێ. قانون دێ نەک هەر سنوور بۆ رەهەندی چالاکی تاکی هاوولاتی دادەنێ؛ بەڵکو سنووری دەسەڵاتی کارگێڕیش دەستنیشاندەکا. لێرەشدا وەنەبێ هەر قانونی نوسراو بەتەنها ئەو ئەرکە بەجێبێنێ. زۆرجاران کە قانون دەقاودەق پەیڕەودەکرێ بارێکی ناڕەوا یاخود نادادی دێنێتە کایە، چونکە رەنگبێ راڤەکردنی دەقی نوسراوی قانونەکە بەگوێرەی بۆچوونی دەسەڵاتدارەکە بێ. لێرەدا ئەوەش راستە کە دەسەڵاتدارەکە -مەبەست دەسەڵاتی جێبەجێکردنە- داینەڕشتووە، وەلێ کرداری جێبەجێکردن کە دەسەڵاتی ئاماژەبۆکراو پێیهەڵدەستێ رەنگبێ قانونەکە ناواخنی مەبەستە سەرەکیەکەی لەباربەرێ، یان ئامێریانە دوور لە گیانپێداکردن جێبەجێی بکا. بۆیە لەپاڵ هەبوونی قانون دەسەڵاتی کارگێڕی دەبێ پابەندی کۆمەڵە ڕێسایەکی دیکە بێت کە پێیدەگوترێ: بنەما گشتییەکانی لێهاتوویی بڕیاری کارگێڕی.

لێرەدا پێویستە پرسی قانون و چۆنیەتی

جێبەجێکردنی زیاتر لە گۆشەنیگایەکی ڕوشنبیری قانونیانە بخەینەڕوو؛ بەتایبەتیش کە باس لە دەسەڵاتی کارگێڕی بکرێ. چونکە کەشی پێگەیاندنی کادرانی بواری کارگێڕی تەواو جیاوازە لەهی بواری دەسەڵاتی دادوەری. هەرچی بواری دادوەرییە ئەوا کادرەکانی بە پەروەردە و ڕۆشنبیرییەکی تاڕادەیەکی تیروتەسەل بە بابەتە جۆراوجۆرەکانی قانون تەیار و جۆشدراون. ئەو لایەنە فەرهەنگییە قانونییە ڕێگەی هەڵسوکەوت و مامەڵەکردن قیرریژ دەکا بۆ گونجاوێتی جێبەجێکردنی. بۆیە لای ئەو توێژە مافناسانە کەمتر چاوەڕوانی ئەوەیان لێدەکرێ لە گیانی قانونەکان لابدەن بە بەراوردکردن لەگەڵ کاربەدەستەکانی کارگێڕی. ئەمە لەلایەک، لەلایەکی دیکەشەوە سیستەمی سێ پێپلکەییانەی دادوەری-لەبابەتی دادوەرییدا بەدرێژی باسی دێت- وادەکات کە دادوەر لە شرۆڤەکردنی قانوندا هەبەتەنها سەرپشک نەبێ، سەرباری ئەوەش لەهەمان کاتیشدا هاوکات لەگەڵ دەقی قانون پابەندی کۆمەڵێک ڕێسان لەسەرمەشقیانەوە بنەماکانن.

کاتێکیش دامودەزگایەکی کارگێڕی -میری- لەهەڵسوکەوتی ڕۆژانەدا لەگەڵ هاووڵاتیاندا قانونی کارگێڕی جێبەجێدەکات، زیاتر ئەو دامودەزگایە یان ئەو فەرمانبەرە دەسەڵاتدارە لەبارێکی وەرگێڕانی دەق بۆ کردە خۆی دەبینێتەوە. بەواتایەکی دیکە کاربەدەستەکە هەڵدەستێ بە گۆڕینی قانون کە خۆی گشتی و ئەبستراکتە -واتە بۆ هەموانە بێ گوێدانە بارودۆخی کەسایەتی- دەیکاتە بڕیارێک بۆ تاک -هاووڵاتی-. بەم کارە هەم تایبەتمەندییە گشتییەکەی نامێنێ هەم ئەبستراکتییەکەشی. ئەوسا سەرکەوتنی ئەو کاربەدەستە لە وەرگێڕانی گیان و خواستی قانونەکە و بەکردارکردنی لەشێوەی بڕیارێکی تایبەت و کەسیتمەندیدا هونەرە. هونەرەکەش هەر تەنها ناگەڕێتەوە بۆ فەرمانبەر یان قانونەکە خۆی- هەرچەندە هەردووڵایان ڕۆڵی تایبەتیان تێدایە- بەڵکو بۆ دەست بۆبردنە بنەماکانی تایبەت بەقانونی کارگێڕی دەگەڕێتەوە کە ئەوانیش بنەما گشتییەکانی لێهاتوویی بڕیاری کارگێڕین. بێگومان لێرەدا کارامەیی بڕیاری فەرمانبەرەکە لەژێر تیشکی قانون بە پێڕەوکردنی بنەما گشتییەکان دەردەکەوێت. خۆ گەر وانەبێت ئەوا هاووڵاتی بڕیاربەسەردراو یان بڕیاربۆدراو یان بەرژەوەندیدار هانا بۆ هەمان بنەما دەبات تا بەشێوەیەکی ڕەوا بەگژ بڕیارەکەدا بچێتەوە.

لێرەدا واباشە ئاماژە بە بۆچوونێکی قوڵبین بکەین سەبارەت بە بەگژداچوونەوەی قانون. هاووڵاتی ناتوانێ ڕاستەوراست بەگژ قانون وەک دەقدا بچێتەوە، چونکە قانونەکە دەربڕی خواستی خۆیەتی- بەگەڕانەوە بۆ باسی نوێنەرایەتیکردن و دەسەڵاتی قانوندانان و دیموکراسی و ویستی گەل- بەڵکو لەگژ وەرگێڕانی قانونەکەدا ڕابچێ، کە لەبۆتەی بڕیاردا (ئەو بڕیارەی ڕاستەوخۆ تایبەتە بەهاووڵاتی پەیوەندیدار) داڕژراوەتەوە. ئەوەش لەسەر بنەمای بنەما گشتییەکانی لێهاتوی بڕیاری کارگێڕی دەبێ.

لە شۆڕبوونەوە بە ناخی ئەو باسەدا دوو سەرەداوی گرنگمان سەبارەت بە بنەما گشتییەکانی کارگێڕی دەکەوێتە دەست:

**یەکەمیان:** ئەو بنەمایانە دەبنە پێوەر و سەنگی محەکی دروست پەیڕەوکردنی قانون لەلایەن دەسەڵاتی بڕیاردەر.

**دووهەمیشیان:** هەر ئەو بنەمایانە دەبنە مایەی بەگژداچوونەوەی بڕیارەکە، کەهاووڵاتی تەقەللای هەڵوەشاندنەوەی دەدا. لێبەدەنگهاتنی هاووڵاتی لە بڕیارەکە و پاشانیش هۆی



پوچەڵکردنەوەی بەبڕیارێکی دادوەری تایبەتمەند بە کێشە کارگێڕییەکان هەر لە سۆنگەی بنەماکانەوەیە. ئەوسا کە دادگای تایبەتمەند بڕیارێکی دامودەزگایەکی کارگێڕی پوچەڵدەکاتەوە، داوا لەهەمان دامودەزگای بڕیاردەر دەکات بە بڕیاری گۆڕینی خۆی دابچێتەوە و بڕیارێکی دیکە دەربکا، بەڵام ئەمجارەیان بە لەبەرچاوگرتنی هۆکارەکانی پوچەڵکردنەوە. دادگا خۆی بڕیارێکی نوێ دەرناکا و لەسەر کورسی کارگێڕ دانانیشێ، بەڵکو چاودێریدەکا؛ چونکە گەر وابکا ئەوا بەپێی بنەمای ناسراوی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەبازنەی دەسەڵاتی خۆی دەردەچێ.

بێگومان لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی هاووڵاتی لەلایەن دەسەڵاتی کارگێڕی لەگەڵ پەرەسەندنی فەلسەفەی دەوڵەتی قانون بە واتای قانون و دیموکراسی سەریهەڵداوە یان هەرهیچ نەبێ هەرمێنی پەیداکردووە. لاریش لەوەنییە کەپێش دەوڵەتی قانون دەسەڵاتەکان هەموویان پاوانی دەستی یەک فەرمانڕەوا بوون، ئەویش فەرمانەکان وبڕیارەکانی بەزەبری ئاگروئاسن سەپاندووە. سەرەداوی دیرۆکیانەی ئەو لێکۆڵینەوە لە پێشەوەدا کەوتۆتە بەرباس وخواس.

ئەوەی پەیوەندی بە مێژووی سەرهەڵدانی ئەو بنەمایانەوە هەبێت قسەی لەسەر نییە کە بیروڕای فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و چاکەخوازان لە رووی هزرییەوە بە تایبەتیش لە باسکردنی مافە بنچینەییەکان و گەڕاندنەوەی دەسەڵات بۆ خواستی نەتەوە هاندەرێکی کەمونێنە بووە. وەلێ دەرکەوتنی ئەو کۆمەڵە بنەمایانە لە رووی بەکردەکردن واتە گۆڕینیان لە گوفتاری کتێب دانەرانەوە بۆ رەفتاری پێوەرئاسا؛ بۆسەر سەکۆی دادگاکان دەگەڕێتەوە.

دادوەرەکان لەکاتی لێکۆڵینەوە لەو سکاڵانامانە دژی بڕیارە کارگێڕییەکان، هاتوونەتە سەر رەنگرشتنێکی بەرچاوی بنەماکان. نابێ ئەوەش لایلێنەکرێتەوە کە نەخاسمە لەو رەنگ رشتنەدا دادوەرەکان دەستیان بۆ هەمبانە بۆرینەی (ئەم دەستەواژەیەم لەناونیشانی فەرهەنگەکەی مامۆستا هەژار وەرگرتووە) بیردۆزە روناکبیرە مافخوازەکان بردووە.

## بنەماگشتییەکانی بڕیاری کارگێڕی لێهاتوو:

بنەماکان وەک لەپێشەوەش ئاماژەیان پێدراوە، بەشێوەیەکی وانین کە بە دەقاودەقی ژمێردرابن و کۆنووس کرابن، ئیدی لەو ژمارە تێپەڕی بە بنەما دانەنرێن! بەپێچەوانەوە بنەماکان کۆنەکراون و دەرگەی هاتنەپێشەوەی بنەماکان یان ناسینەوە و دۆزینەوەی بنەماکان لەسەر پشتە. ئەمەش بەپێی پێداویستیەکانی رۆژانەی جڤات و بەپێی چەسپینی بنەماکانی دەوڵەتی قانون روو لەزیادبوون و گۆڕانن. ئەرکی دیارکردن و دۆزینەوەش بە پلەی یەکەم بۆ دادوەر دەگەڕێتەوە، چونکە دەبێ ئەو لەبڕیارەکانی خۆیدا دەست بۆ بنەمایەک ببا تاکو بڕیارەکەی پێ هێزدار و مافدار (رەوادار) بکا. ئەو کۆمەڵە بنەمایانەی خوارەوەش گرنگترین و بەرچاوترین بنەمان، بەڵام سەرجەمیان نین.

### ١- بنەمای لێوردبوونەوە (خەمخۆری):

ئەو بنەمایە دەخوازێ دامودەزگای کارگێڕی لەکاتی خۆئامادەکردن بۆ دەرکردنی بڕیارێک بەوردی زانیاری بایەخدار لەمەڕ باروودۆخ و هەڵسەنگاندنی بەرژەوەندییەکانی بابەتی بڕیارەکە کۆبکرێتەوە.

هەر دامودەزگایەکی کارگێڕی بیەوێ لەسەر بنەمای داواکاری لەلایەن هاووڵاتی یاخود لەسەر

هاتنەپێشی پێویستییەک بڕیارێک دەربکا؛ دەبێ لەسەرەتاوە زانیاری تەواو لەبارەی بابەتەکەوە کۆبکاتەوە لە گەڵ ئەو بەرژەوەندیانەی کە پێی دێتەجێ هەڵبسەنگێنێ، ئەوسا بڕیار بدا. نابێ بڕیارەکە بە قۆناخی ئامادەکاری تێنەپەڕێ.
زۆر جارانیش بڕیارەکە وا پێویست دەکا کە دامودەزگای بڕیاردەر لەگەڵ خودی هاووڵاتی داواکار یان بەرژەوەندیداری پەیوەندیدار لێکۆڵینەوە ئەنجامبدرێ تاکو زانیاری تەواو باری سەرنجی ئەوی خۆی پێشکەش بکا بۆ ئەوەی ببێتە کۆڵەگەیەکی پتەو بۆ بڕیارەکە. بەم جۆرە مشوری ئەوە دەخورێ بڕیارەکە بێ ئاگای پەیوەندیدار بەلارێکراوی دەربچوێندرێ.
بێجگە لە قسەکردن و دانیشتن لەگەڵ هاووڵاتی بەرژەوەندیدار، زۆر جارانیش وا پێویست دەکا کە دامودەزگای کارگێری بڕیاردەر پێش دەرکردنی بڕیارەکەی، پرسوڕا بە پسپۆڕ و لێزانێکی بوارەکە بکا. ڕاستە ڕاپۆرتی پسپۆڕ نابێتە مایەی فەرمانبەرداری بۆ دامودەزگاکە چونکە بەرگی ڕاوێژکارانە دەپۆشێ، وەلێ قۆناخی ئامادەکاریان بۆ ڕۆشندەکا. واتە ئەو بەرچاوڕوونییە دەداتە دەست دەسەڵاتی بڕیاردەر کە لەڕاستەڕێی چاوەڕوانکراوی قانونیانەی خۆی لانەدا. لەسەر ڕۆیشتنی ئەو جۆرە پرسپێکردنانە بۆ ئەوەیە دواتر بڕیارەکەی دەزگا کارگێڕییەکە گۆترەکاری و بەرژەوەندکاری و تاکلایەنی تێنەکەوێ. زۆرجاران وادەکەوێتەوە کە خۆتەیارکردن و ئامادەکاری بۆ دەرچوواندنی بڕیارێک دەربەستی ڕاوەرگرتنی پسپۆڕ و لێزان بێ. بۆنموونە کاتێک بڕیارەکە پەیوەندی بە بارێکی لەشساخی، ژینگەیی، بیناکاری یان هەر بارێکی دیکەی تاکنیکییەوە هەبێ، ئیدی لێرەوەڕا ڕاوێژی پزیشکێک لەباری یەکەم و ئەندازیارێک لەبارەکانی دیکە بایەخدار و ڕەنگە

چارەنوسسازیش بن.
کاتێکیش لەباری پێچەوانەوەوە بڕیارێک بێ‌ڕەچاوکردنی ناواخنی بنەمای لێوردبوونەوە دەربچێ، ئەوا مایەپوچی خۆی بەخۆیەوە هەڵگرتووە و دادوەریش بە پشتبەستن بەو بنەمایەوە ئەو بڕیارە پوچەڵدەکاتەوە. ئیدی دەبێت دەزگا کارگێڕیەکە بەبڕیارەکەی خۆیدا بچێتەوە و بڕیارێکی دیکە بەڵام لەبار دەربکا.
دەکرێ ئەم چوارخاڵانەی خوارەوە وا بناسین کە دەبنە مایەی هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری کارگێڕی:-
١- گەر هاتوو خودی هاووڵاتی پەیوەندیدار بە بڕیارەکە قسەی لەگەڵ نەکرا، واتە هیچ لێکۆڵینەوەی سەبارەت بەلایەنە وردودرشتەکانی بڕیارەکەی لەگەڵ نەکرا؛ لەکاتێکدا کە پێویست بوو لەگەڵی بکرابایە، چونکە بەپێی بنەماکە بارودۆخی بابەتی بڕیارەکە ئەوە دەخوازێت کە نابێت یەکلایەنە دامودەزگای کارگێڕی بێ‌تاوتوێکردن لەگەڵ لایەنی دیکەی پەیوەندیدار بڕیاردەربکات.
٢- گەر هیچ لێکۆڵینەوەیەک نەبووە پێشینەی دەرچوونی بڕیارێک، یاخود لێکۆڵینەوەکە کرا بەڵام لێکۆڵینەوەکە کرچوکاڵ بوو؛ کەرەسەکانی لێتۆژینەوەکە لەبارنەبوون و لێکۆڵینەوەکە رووکەشیانە بوو.
٣- گەر هاتوو ڕێگا بە هاووڵاتیە بەرژەوەندیدارەکە نەدرا زیاتر ڕۆشنایی بخاتە سەر داواکەی، واتە کاتێک هاووڵاتیەک داوایەک دەکات دواتر بۆی دەردەکەوێ کەوا پێویست دەکا زانیاری زیاتر بدا و بەڵگەی زیاتر بخاتە بەردەست، لێ دامودەزگای کارگێڕی گوێی لێناگرێ و یەکسەر بڕیارەکە دەردەکا. ئیدی ئەو بارەش دەبێتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکە.
٤- گەر هاتوو بڕیارەکە بەرژەوەندی




بڕیاردەرەکەی خستبووە بەرچاو نەوەک بڕیاربۆدراوەکە. کاتێک کاربەدەستی بڕیاردەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆی لەدەرچواندنی بڕیارەکەدا رەچاوکرد، بێئەوەی گوێ لەبەرژەوەندییە راستەقینەکانی هاوولاتی بگرێ، ئەمەش دژی بنەماکەیە و لەرێگەی دادگاوە دەبێتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی.

بۆ هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکە مەرج نییە هەر چوار خاڵەکە بەیەکەوە کۆببنەوە و بسەلمێنرێن. یەک خاڵ لە خاڵە باسکراوەکان دەربەستی ئەوەدێ کە بڕیارەکەی پێ‌هەڵبوەشێنرێتەوە. بڕیاردانیش لەسەر هەڵوەشاندنەوەکە وەک لەپێشەوە هێمای بۆکراوە دەگەڕێتەوە بۆ دادگا، ئەوسا چ دادگای کارگێڕی بێ یان دادگای ئاسایی(مەدەنی).

## ٢- بنەمای ئامانجدار:

هەر بڕیارێکی کارگێڕی پێویستە ئامانجێکی ئاشکراو رەوای هەبێ. مەبەست لەنیوە دێڕی یەکەم؛ ئامانجی ئاشکرا ئەوەیە کە بڕیار نابێ بێ ئامانج بێ، بەڵکو دەبێ لە دوتوویێ خۆی بەراشکاوی مەبەستەکەی خۆی دیاری بکا. لێرەدا مەبەست زیاتر ئەوەیە کە هەم لەلایەک هاوولاتی دڵنیا بکرێ لەوەی کە بڕیارەکە شتێک لەبەرچاو دەگرێت دەیەوێ بەدیبێنێ، لەلایەکی دیکەشەوە لە گۆترەکاری و سەرپێیی دووربخاتەوە. هەروەها دەبێ بڕیارەکە ئەو ئامانجەش بپێکێ کە بڕیارێکە رایدەگەیەنێ و لایەنە پەیوەندیدارەکان پێی دەزانن. واتە بڕیارێک نییە لەپەناوپەساران و بەدزی درابێ. ئەو مەبەستەش کە بڕیارەکە دەیەوێ بیگاتێ یان بیپێکێ؛ دەبێت رون و ئاشکرا بێ و نابێ تەماویی و تارمایی لەسەر بێ، تا بەئاسانی هاوولاتی لێبێتێنەگا و پێویست بە راڤەکردنێکی قوڵبکا. رادەی ئاشکرایەتیەکە و لێتێگەیشتنی بەمرۆڤی ئاسایی تاقیدەکرێتەوە، واتە دەبێ هاوولاتیەکی ئاسایی بیخوێنێتەوە و لێی تێبگا.

هەروەها دەبێ بڕیارەکە لەپاڵ ئامانجە ئاشکرایەکەی ئەو هۆیانەش روونبکاتەوە کە بوونەتە مایەی دەرچوونی. بە دەربڕینێکی دیکە دەبێ ئامانج پێکانی بڕیارەکە لەسەر بنەمایەک بێ کە قانونی بێ. بەو واتایەی کەدەبێ بڕیارەکە ڕاشکاوانە دەسەڵاتی بڕیاردانەکە و ناواخنەکەی بۆ ماددەیەکی قانونی بگەڕێنێتەوە. ئاماژەپێکردنە قانونیەکەش نابێ تارمایی لەسەر بێ و گشتگر بێ بەڵکو دەبێت بەڕوونی بێ. بۆنموونە کەبڕیارێکی کارگێڕی دەردەچێ نابێ دەسەڵاتی بڕیاردەر هەروا لەکوڵ خۆی بکاتەوە بەوەی بڕیارەکەی بۆ قانونی کارگێڕیی دەگەڕێتەوە بێ دەستنیشانکردنی مادده قانونیەکە. نەخاسمە گەر هاتوو بڕیارەکە لەقۆناخی ئامادەکاریشدا پەنای بردبێتە بەر راپۆرتی پسپۆڕ، ئەوا دەبێ لەشێوەی کۆتایی بڕیارەکەشدا بە راشکاوی هێما بۆ راپۆرتەکە بکا.

ئەو بنەمایە بۆئەوەیە کە رێگربێ لەبەردەم بڕیارێکی بێ ئامانج و ناڕەوادا، هەروەها بۆ دڵنیابوونیش لەو ماف و ئەرکانەی کە بڕیارەکە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێ. چونکە گەر وانەبێ دامودەزگای کارگێڕی کەماف و دەسەڵاتی قانون دەرکردنی نیە، دەبێتە قانوندانەر. سەلمێنراویشە ئەوە لەگەڵ بنەماکانی دەوڵەتی قانون بەتایبەتیش جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، ناگونجێ.

## ٣- بنەمای بێلایەنی:

ئەو بنەمایە دوولایەنی هەیە.

**یەکەمیان:** ئەوەیە کە دەبێ رێگە بەهاوولاتی بەرژەوەندیدار بدرێ لەسەر مافەکانی خۆی

سەبارەت بە بڕیارە بۆ دراوەکە هەڵبداتێ. کاتێک بڕیارێک پەیوەندی بە هاوولاتیەک دەبێ، نابێ بڕیارەکە یەکلاکەرەوە بێ، واتە ئیدی بڕیارەو دراوە و دەبێ وەک دەگوترێ بێ منگەمنگ جێبەجێبکرێ. بەڵکو بارەکە تەو بە پێچەوانەوەیە چونکە مافی هاوولاتی پەیوەندیدار هەر لە ئامادەکردنی بڕیارەکەوە دەستپێدەکا؛ تاکو لەسەر مافەکانی بێتە وەلام و بەگژ نارەواییدا بچێتەوە کە بڕیارەکە دەیهێنێتە ئارا.

ئەو لەسەرمافهەڵدانەش لەڕێگەی زانیاری دانەدەست، داوای لێکۆڵینەوە، پسپۆڕبانگکردن و زیاتر ڕوونکردنەوە دەبێت تاکو دامودەزگای کارگێڕیی بڕیارێکی ڕاست و دروست دەربکا. ئەو خاڵە هەندێک پەیوەندی بە بنەمای پێشوتر (وردبینییەوە) هەیە.

__دووهەمیان:__ ئەوەیە کە دەبێ بڕیارەکە بێلایەنانە بێ، نابێ بەهیچ شێوەیەک بەرژەوەندی بڕیاردەرەکە لەبەرچاوبگرێ. هەروەها نابێ بەراشکاویەوە ئەوەی پێوە دیاربێ کە بەرژەوەندی فلان هاوولاتی لەهەمبەر هاوولاتیەکی دیکەدا (بێهۆی ڕەوا) سەنگینتر ڕاگرتووە. دامودەزگای کارگێڕی لەسەریەتی بەبێلایەنی سەیری بەرژەوەندی هەموان بکا و بڕیارەکەشی لەژێر ڕۆشنایی لایەنگیرینەکردندا بێ. گەر وانەکات ئەوا دادوەر زەنگی هەڵوەشاندنەوەی بەدەستە. ئەو لایەنەش بەجۆرێک لەجۆرەکان گرێدراویی بە بنەمای (لێوردبوونەوە) هەیە. لێ ئەوە وا ناگەیەنێت کە هەردوو بنەمایەکە بکرێنە یەک بنەما. هەر واش باشترە بۆ زیاتر تەتەڵەکردن و دڵنیابوون لە ڕێکورەوانی بڕیاری کارگێڕ لەچەند لایەکەوە لەسەنگی محەک بدرێت.

### ٤- بنەمای سنووردار - Detournement de Pouvoir

ناوەڕۆکی ئەو بنەمایە ئەوە دەخوازێ کە نابێ دامودەزگای کارگێڕ دەسەڵاتی خۆی بۆ مەبەستێکی دی بەکاربهێنێ لەوەی کە بۆی دیاریکراوە. واتە ئەوە لە دەزگای کارگێڕ چاوەڕواندەکرێ کە دەسەڵاتەکەی لەشێوەی بڕیار بۆ ئامانجێک بەکاربێنێ کە سنووری دەسەلاتی بۆ کێشراوە، بەلام گەرهاتوو دەسەلاتە پێدراوەکەی بۆ هەر مەبەستێکی دیکە تەرخانکرد، بەدەر لەوەی لەبەر دەستیدایە؛ ئەوا بە لەڕێلادان بۆی دەژمێردرێ و لەڕێی دادگاشەوە بڕیارەکەی هەڵدەوەشێنرێتەوە. ئەو بڕیارە کارگێڕییانەی دەکەونە بن ڕەوایەتی هەڵوەشاندنەوەی ئەو بنەمایە لەژمارەدا کەمن، چونکە کەبڕیارێکی کارگێڕی دەردەچێ بە پێواژۆی تایبەتیانەی خۆیدا دەڕوا. هەروها تیشکی بنەمای دیکەش وەک کۆکردنەوەی زانیاری تەو، پێناسەکردنی مەبەستەکەی و پەناگەی قانونی دەبنە چاودێر بەسەریدا؛ کەتا ڕادەیەکی باش دەبنە لەمپەر لەهەمبەر لاڕێبووندا. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا جاری واهەیە باری پێشێلکاری هەر دێتە گۆڕێ. بۆ زیاتر بەدواداچوون و ڕوونکردنەوەش دەکرێ سوود لەو نموونەی خوارەوە وەربگرین:

شارەوانی بەباندۆری لەشساخی و ڕێکوپێکی و جوانراگرتنی شار و ژینگەپاراستن بڕیار دەدات کەشوێنی فیتەری (فلان) لە(فلان)ە شەقام بۆ ناوچەی پیشەسازی ، کە هەموو سازکاریەکی بۆکراوە بگوازێتەوە، لێ کابرای خاوەن شوێنەکە ڕازی نابێ و نایگوازێتەوە. ئیدی بۆ گوشار خستنەسەر خاوەن شوێنەکە، شارەوانی بە بڕیارێک هاتووچۆی ئۆتۆمۆبێل بۆ شەقامی ناوبراو قەدەخەدەکا؛ بەو مەبەستەی کابرای





خاوەن كار پەكی بكەوێ و دواتر ملبدا و بگوازێتەوە. لێرەدا خودی بڕیاری گواستنەوەی شوێنی فیتەرییی بۆ ناوچەی تەرخانكراو رەخنەی لێناگیرێ، بەڵام بڕیاری دواتر كە هاتووچۆ لەشەقامەكە قەدەخەدەكا بڕیارێكی نارەوا و نابەجێیە. چونكە دەسەڵاتەكە بۆ گواستنەوەی فیتەرخانەكە رێپێدراوە نەک بۆ قەدەخەكردنی هاتووچۆی شەقامی ناوبراو. لێرەدا هاووڵاتی دیكە كە لە كێشەدا بەشدار نین، زیانمەند دەبن. بەمجۆرە دەسەڵاتەكە خراپ و بۆ مەبەستێكی دیكەی بەدەر لە مەبەستە سەرەكییەكە بەكارهاتوە. بۆیە دەبێ لەسۆنگەی ئەو بنەمایەوە بڕیارەكە هەڵبوەشێنرێتەوە.

خۆئەگەر بەوردی لەو بنەمایە وردبینەوە، دەبیبین ماكی هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەكە نەک هەر خۆی لەو بنەمایە دەبیبێتەوە بەڵكو باسوخواسی بنەمای رەوایەتیش بەزەقی دێتەگۆڕێ. چونكە بە كامە رێپێدانێكی قانونیانە (وەک لەنموونەی سەرەوەدا هاتووە) دامودەزگای كارگێڕی فڵانە شەقام لە هاتووچۆی چوارتایە -ئۆتۆمۆبێل- قەدەخە دەكا.

بنەمای باسكراو بەكردەوە سنوور بۆ كایەی دەسەڵاتی كارگێڕی دادەنێ.

**٥- بنەمای راستەوانە:**

ناواخنی ئەم بنەمایە ئەوەیە كە نابێ كاریگەری بڕیاری كارگێڕی پێچەوانەبێ لەگەڵ بەرژەوەندی راستەوخۆی پەیوەندیدارەكان. بەواتایەكی دیكە ئەو بڕیارەی بۆ هێنانەكایەی مەبەستێک دەدرێ، نابێ ببێتە مایەی ئەوەی كە لە بەرژەوەندی كەسانێک بدا یان ئەو كەمە زیانەی كە دەیگەیەنێ لاسەنگتر بێ لە هێنانەدی ئەو مەرامەی كە بڕیارەكەی بۆ تەرخان كراوە. بۆیە دەبێ بڕیاری كارگێڕی بەرژەوەندی پەیوەندیدارەكان لەبەرچاوبگرێ.

هەر ئەم بنەمایە دەبێتە مایەی هێنانە كایەی رێسایەكی دیكە ،ئەویش رێسای قەرەبوكردنە. واتە گەر هاتوو دامودەزگای میری بڕیارێكی بۆ بەدیهێنانی ئامانجێک دەركرد، كەچی لەهەمان كاتدا بڕیارە دەرچووەكە زیانی لێكەوتەوە یاخود زیانەكەی زۆرتر بوو لەچاو ئەو بەرژەوەندییەی رەچاوی كردبوو، بەمە دەبێ دەسەڵاتی كارگێڕی چارەسەری گرفتەكە بكا و نابێ وەک دەگوترێ وەک بەرزەكی بانان بۆی دەرچێ، چونكە میری بڕیارەكەی دەركردووە ئیدی زیانیشی لێبكەوێتەوە قەیناكا! لەو بارە پێشێلكارییەدا پرسەكە بەبۆبژاردنی زیان بۆ زیان لێكەوتووان چارەسەر دەكرێ و میریش دەبێ فەرمانبەرداری بنەمای زیان بۆبژاردن بێ. لەكاتێكدا هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەكە لەرێی دادگاوە زیانەكە بسرێتەوە ئەوا لێرەدا زیان بۆبژاردن هیچ واتای نامێنێ. وەلێ گەر وانەكەوتەوە، واتە هەڵواشندنەوەی بڕیارەكە شوێنەواری زیانەكەی پێ نەسرایەوە ئەوا بنەمای قەرەبووكردن لەبەردەم دەزگای كارگێڕیدا قیت دەبێتەوە.

بەچەسپاندنی ئەو بنەمایە پێ لەسەر ئەوە دادەگیرێ كە دەبێ دامودەزگای كارگێڕی بەتەواوی بەرژەوەندییەكانی لایەنە پەیوەندیدارەكان هەڵبسەنگێنێ و بیانترخێنێ لە دەركردنی بڕیاری كارگێڕییدا. سەبارەت بەو بنەمایە پێویستە دیسان ئەوە بگوترێ كە بنەمایەكە تەو سەربەخۆ نیە و پەیوەندی و گرێدراوی بە بنەماكانی دیكەوە هەیە یان لەهەندی سەرەداودا لەگەڵیاندا كۆک دەبێ. بە بێگومانیش ئەمە سەلمێنەری ئەو راستییە كە بنەماكان بەیەكەوە گرێدراون و بەیەكەوە كارانگازێتی لەسەر بڕیاری كارگێڕی تۆكمەتر دەكەن. هەر بۆیەشە وا ئاسان نییە خوێنەر

ـەتەواوی رەش و سپی بنەماکان لەیەک جیابکاتەوە و خانەخانەیان بکات.
ئەو لەیەک نزیکیەی بنەماکان لەوەوە بناوانی گرتووە کە یەک ئاکامیان داخوازە، ئەویش ـەبەرچاو گرتن و بەرز ڕاگرتنی بەرژەوەندی هاووڵاتیان و لەسەنگدانی بڕیاری کارگێڕی بە ـەحەکی ڕێک و ڕەوایەتی. هەر ئەوەشە وادەکا زۆرجاران جۆرێک لە دوبارەبونەوەی هەندێ خاڵی سەرەکی و ناسەرەکی؛ چ وەک شیتەڵکردنی بنەماکان؛ چ وەک ئاماژەی پەیوەندیداریان بەیەکەوە یان بەگشتی ـەلیکۆڵینەوە و چوونە بنجوبناوانی باس و لاباسەکانی بنەماکان؛ بگرە خودی کۆڵەگەکانی ـدوڵەتی قانونیش بێتە گۆڕێ. ڕەنگبێ جاری وا خوینەر توشی جۆرە هەراسانی و ساردیەک بکا ـەبەردەوامبوون لەسەر خوێندنەوەی ئەو جۆرە ـەیەک نزیکیەی بابەتەکان و دووبارەبونەوەی هەندێ رووی بابەتەکان، لێ گەر وردی تیبروانین، تایبەتمەندییەکانی بابەتەکە خۆی ئەمە دەخوازێ. قسەشی لەسەر نییە کە ئەو جۆرە شێوازەش لەڕاژەی باشتر رونکردنەوە و ێتێگەیشتنی بابەتەکەدایە.

**٦- بنەمای دڵنیابوون:**

بە گوێرەی ئەو بنەمایە دەبێ بڕیاری کارگێڕی ئاشکراو روون و بێ پەردەبێ، هیچ گومانێک نەهێڵێتەوە و تارمایی لەسەر نەبێ. بڕیارەکە بەشێوەیەک بێ هاووڵاتی ئاسایی لێتێبگا و پێویستی بەڕاڤەکردنێکی قوڵنەبێ و مایەی جێبەجێکردنیش بێ. ئەوەش هەمووی لەپێناوی ئەوەدایە کە هاولاتی پەیوەندیدار لە ئەرک و مافەکانیدا دڵنیابێ و گومانی لاپەیدا نەبێ. هەر بنەمایەکەشە ئەوە دەخوازێ کە نابێ هێزوتاوی جێبەجێکردنی بڕیارەکە بۆ دواوە بگەڕێتەوە و لایەنی پەیوەندیدارەکەی پێ زیانمەند ببێ.
مەبەست لە بەرەودواوە نەگەڕانەوی هێزی جێبەجێکردنی بڕیار ئەوەیە کە نابێ بڕیارەکە ئەو کردە و چالاکیانەی هاووڵاتی بگرێتەوە کە پێش دەرچوونی بڕیارەکە لەئارادابوون. بۆ نموونە بڕیاری ڕێپێدان یان ڕێپێنەدان نابێ لەبەرواری دەرچوونی بڕیارەکە زیاتر کاریگەری قانونی بۆ پێشتر هەبێ. چونکە بڕیارەکان نابێ کاتی جێبەجێکردنیان هەروا بەبێ هۆی قانونی بۆ وادەیەک پێش بەرواری دەرچوونی بڕیارەکە بگەڕێنرێنەوە. بڕیارەکە لەو کاتەوە جێبەجێدەکرێت کە مێژووی دەرچوونی لەسەر بێ یان مێژوویەکی دیکە بەڵام نەچێتە خانەی رابردوو بەڵکو ئاینده. دەشکرێ بڕیارەکە ئەمڕۆ دەرچووبێ بەڵام ناواخنی جێ بەجێکردنەکەی بۆ دوێنێ و پێرێ (رابردوو) بگەڕێتەوە بەڵام بە مەرجێک زیان بەپەیوەندیدارەکان نەگەیەنێ. ئەو ڕیزپەڕیە لە نەگەڕانەوەی هێزی جێبەجێکردنی بڕیاری کارگێڕی ڕەها نییە بەڵکو بەدوو مەرج بەندە:-
١- وەک لەپێشەوە ئاماژەی بۆ کراوە نابێ زیان بە هاووڵاتی پەیوەندیدار بگەیەنێ.
٢- بارودۆخ و بەرژەوەندی گشتی وابخوازێ، بەڵام دەبێ هاوکات بێ لەگەڵ پرسی قەرەبووکردن. چونکە لەوانەیە پەیڕەوکردنی بڕیارەکە زیانی لێبکەوێتەوە.
بەدەر لەو دوو بارە گەر بڕیارەکە وا داڕێژرابێ کە هێزی جێ بەجێکردنی بۆ دواوە بگەڕێتەوە ئەوا خۆی لەڕێی دادگاوە هەڵگری هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی خۆیەتی.
بنەمای نەگەڕانەوەی هێزی قانونیی بۆ دواوە زۆر بەزەقی لە قانونی سزاداندا دێتەپێش. لە قانونی سزاداندا ئەو بنەمایە دەمێکە بۆتە پێگەیەکی بنەڕەتی بۆ بەرسڤی پرسی

تاوانبارکردن و سزاداندا. بابەتەکە لەبەر ئەوەی ئێرە جێگەی نیە بۆیە زیاتر لەسەری ناڕۆین.
بنەماکە لەسۆنگەی ئەوەی رون وئاشکراو نەگەڕاوەیە بۆ دواوە، دەبێ بەباری راست و دروستیشدا جێبەجێبکرێ واتە بەشێوەیەکی رەوا نەک بەگوترەکاری و بەدەر لە چوارچێوەی قانون و بەزۆرسەپاندن.

**٧- بنەمای متمانە:**

ئەو بنەمایەش ئەوە دەخوازێ کە دەبێ دەزگای کارگێری چاوەڕوانی هاوولاتی پەیوەندیدار کە لەلایەن خودی دەزگاکەوە وروژێنراوە لەبەرچاوبگرێ و بینرخێنێ.
کاتێک دامودەزگایەکی کارگێری جۆرە مۆڵەتێک (کاتی، بەڵێنێک یان چاولێپۆشینێک) بە هاوولاتیەک سەبارەت بەداخوازیەکەی دەدا، ئیدی هاوولاتیەکە لەسایەی ئەو جۆرە "بۆرە" بۆسەلماندنەدا کاری خۆی درێژەپێدەدا و متمانە بە بڕیاری کارگێری پەیدادەکا. دواتر نابێ هەمان دەزگای کارگێری بێ و بەئاسانی بەهەر بیانویەک بێ لەوەی پێشووی پەشیمان بێتەوە و بڕیارێکی دیکەی نوێ دەربکا، تەواو ئاوەژوکردنەوەی باری پێشو بێ. لەو بارەدا هاوولاتی کە متمانەی بە دامودەزگای میری پەیداکردووە (لەراستیدا دامودەزگاکە بە رەفتاری خۆی وایکردووە هاوولاتی بڕوا و متمانە بە بڕیارەکانی پەیدابکا، بۆیە لێرەدا هەموو ئۆباڵێکی قانونی لەرووی رەوایەتی پێدان بە کاری هاوولاتی دەکەوێتە ئەستۆی خۆی نەک هی هاوولاتی) لەدەستدەدا. لەئاکامی بڕیارە نوێیەکەشدا هەر هاوولاتیە پەیوەندیدارەکە زیانمەند دەبێ. بۆیە لە دادگادا بەپشت بەستن بەو بنەمایەوە بڕیاری قەرەبووکردن دەدرێ؛ گەر لەپاڵیشیدا بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی سەرلەبەری بڕیارەکە نەدرێ.
ئەو نموونەیەی خوارەوە رەنگبێ بنەماکە زێدەتر رونبکاتەوە:
شارەوانی شارێک لەسەر داخوازی هاوولاتیەک کە دەیەوێ چێشتخانەیەک لە سنووری شارەوانیەکە دابمەزرێنێ، سەرپێی رازی دەبێ و بەڵگەی رازی بوونەکەش دەداتە دەست. لەو ماوەیەدا هاوولاتیەکە هەرچی پێویستی چێشتخانەکەیە بە خانوو تەواوی کەلوپەلەکانی ئامادەدەکا و بەشاگردەوە و دەکەوێتەکار. پاش ماوەیەک لەکارڕۆیشتنی چێشتخانەکە شارەوانی بە بڕیارەکەی خۆیدا دادەچێتەوە و دێتەسەر ئەو بڕوایە کە دەبێ بڕیارێکی دیکە دەربکا ومۆڵەتی پێشینەی خۆی هەڵبوەشێنێتەوە. لێرەدا هەرچەندە خاوەن چێشتخانەکە سەرەتا بڕیارێکی هەمیشەیی یەکلاکەرەوەی وەرنەگرتبوو بەڵام لە بیناکردن و هێنانی کەلوپەل و شاگرد و ئیشکردنیدا هیچ نارەزایی و کۆسپی لەلایەن شارەوانیەوە بۆ دروست نەبووبوو، بۆیە متمانەی پەیدا کردبوو، ناکرێ هەروا بەئاسانی بچێتە ژێر باری بڕیارە نوێیەکە چونکە بەهۆیەوە هەم خۆی هەم شاگردەکانی زیانیان پێدەکەوێ.
بۆیە بەرێگەی دادگا و بەپشت بەستن بە بنەمای دڵنیابوونەوە داوای نارەوایەتی بڕیاری دووهەمی دامودەزگای کارگێری دەکا لەگەڵ قەرەبووکردن، دادوەریش بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی دەدا.
ئەوەش ئەوە دەخوازێ کە شارەوانی (هەر دەزگایەکی میری) دەبێ زۆر وشیار بێ لەکاتی خۆئامادەکردن بۆ دەرچوواندنی بڕیارێک بەوەی هەموو لایەکی بابەتەکە لێکبداتەوە و شڵۆقی نەکەوێتە شێوازی رەوایەتی دەرکرن و جێبەجێکردنی بڕیارەکانی.
جێگەی خۆیەتی بگوترێ دەستپێوەگرتنی ئەو بنەمایە کارێکی زۆر ئاسان نییە، چونکە چۆنیەتی

وروژاندنی چاوەڕوانیەکە ڕۆڵێکی کارا دەبینێ لەبڕیاردان لەسەر لەخۆگرتنی بنەمایەکە یان نا. گەر هاتوو چاوەڕوانیەکە لە سەر بنەمای بڕیارێکی (کاتی) نووسراو بێ، ئەوا بەهێزترە لەوەی بڕیارێکی سەرزاربێ. هەروها گەربێ و بڕیارەکە لەلایەن فەرمانبەرێکی کاردار بێ سەلمێنەرترە لە بڕیاری فەرمانبەرێکی دیکە.
زۆریش وایە دەستبردن بۆ ئەو بنەمایە زیاتر لەوبارەدا زەقتر دێتەپێش کە لەئەنجامی بڕیاری دووهەمی دەزگای میری ژیان بە بەرژەوەندییەکانی هاوولاتی بکەوێ. هەر ئەسونگەی زیانەکەشەوە دادوەر پەنجە بۆ ئەو بنەمایە درێژ دەکا و دەیکاتە پاڵپشتی بڕیارەکەی.

**٨- بنەمای یەکسانی _ وەکیەکبوون_:**
جارێ پێش ئەوەی لەو بنەمایە بدوێین، پێویستە ئەوە بگوترێ کە ئەو بنەمایە دیارترین و باوترین و بڵاوترین بنەمایە نەک هەر لەنێو دەقە قانونیەکاندا بەڵکو لەنێو ڕێساکانی ڕەوشت و نەریت و دینەکانیشدا.
بەڵگەنامە نێودەڵەتیەکان چ ئەوانەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ باس لەمافەکانی مرۆڤ دەکەن، سەرمەشقی ماددەکانیان داڕێژتنی بنەمای یەکسانێتین. هەر لەبەر پڕ بایەخیەکەشیەتی دەستوری وڵاتە سیستەم دیموکراسیەکان لەدیباجە و بەرایی ماددەکانیان ڕەنگڕێژیان کردوون.
ئەوەی وای کردووە بنەمایەکە بەگشتی وا باو و پەسند بێ، سروشتی بنەماکە خۆیەتی. بنەمایەکە بیرۆکەی دادپەروەرییە بەوەی خەڵک بەیەکچاو و بێجیاوازی تەماشابکرێ و سەودای لەگەڵدا بکرێ. لایەنە دادپەروەریەکە هۆیەکە؛ هۆیەکەی دیکەش ئەوەیە کە بنەمایەکە بەتەواوی و سەرتاپایی لەلایەن کۆمەڵگەوە پەسندکراوە و کۆمەڵ پێویستی پێ هەبووە و هەیە. چونکە گەر لەلایەن جڤاتەوە بەو یەکانگیرییە پەسند نەکرابا ئەوا بەردەوامێتی بەیەکەوە ژیان و پێشکەوتنی کۆمەڵ دەکەوتە بەر گەفی لەباریەکترازان و لەیەکدابڕان، ئەویش بەهۆی جیاوازی نێوان چین و توێژەکانی. مێژووش گەواهیدەرێکی سەلمێنەرە بۆ پرسەکە. هەروها خودی سروشتی مرۆڤایەتی مرۆڤیش ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕاوە و دەیگێڕێت لەو دەستپێوەگرتنەی بنەماکە.
بێجگە لەوەش نابێ ئەوە لەبیربکرێ کە بنەماکە بنەمایەکی بەردەست و ئاسانە لێکۆڵینەوەی زۆر هەڵناگرێت، لەسەرێکی دیکەشەوە کردەییە واتە بەئاسانی توانستی جێبەجێکردنی هەیە. لێرەدا ئەوە دەکەوێتە بەردەست کە سەرپێچی لەو بنەمایە زۆر ناجۆر دەبێ؛ شوێنەوارەکانی بەڕونی دیاردەکەون چونکە زەقاوزەق ئاوەژوکردنەوەی ڕەوشی مافخوازانەی مرۆڤە.
خۆ گەر هەر سەرپێیش بێ لاپەڕەکانی ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتیەکانی بواری مافەکانی مرۆڤ هەڵدەینەوە بەڕاشکاوی ڕاستی ئاماژەبۆکراومان دەکەوێتەبەردەست، هەر بۆنموونەش بنواڕە ماددەی یەکەمی جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ، ماددەی دووهەم (بنەماکانی) بڕوانامەی نەتەوە یەکگرتووەکان، بڕگەی دووهەم لەماددەی سێهەمی ڕێکەوتننامەی دروستکردنی یەکێتی کۆمەڵگەی ئاوروپایی لە ١٩٥٧، ماددەی ٢٠ەمی ڕێکەوتننامەی ئاوروپایی بۆ مافەبنەڕەتییەکان، ماددەی دوهەمی پەیماننامەی نێونەتەوەیی بۆ مافەکانی مەدەنی و رامیاری ساڵی ١٩٦٦، ماددەی دوهەم وسێهەمی هەمان ڕێکەوتننامە بۆ مافەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی، ماددەی پێنجەمی ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی دژی جیاوازخوازی ڕەگەزی ساڵی ١٩٦٦، ماددەی




هەشتەمی ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی دژی جیاوازکردنەوەی ژنان ساڵی ١٩٧٩وهتد...
ئەوەی لەباسی بنەما گشتییەکانی کارگێڕیشە هەر هەمان بنەمای ناسراوە، بەڵام ئاخنراوەتە نێو بازنەی جموجۆڵی کارگێڕی و بەرگە گشتییەکەی لەبەرداکەندراوە و پێناسەی خۆی دراوەتێ؛ بەوەی بارە وەک یەکەکان دەبێت وەک یەک سەودایان لەگەڵ بکرێ.
هەرچەندە ئەو بنەمایە لەیەکەم خوێندنەوەیدا زۆر بەئاسانی دێتەبەردەست، ڕەنگبێ ئەو سەرنجە لەلای خوێنەریش دروستبکا بەوەی گەر هاووڵاتی دوای مافخوران و نارەوایەتی لەگەڵکرانی یەکسەر بتوانێ بەپشت بەستن بەو بنەمایە داوای مافی خۆی لەدادگا بکاو دادگاش بڕیاری دەزگای کارگێڕی هەڵبوەشێنێتەوە. کەچی لەڕاستیدا بارەکە بەو شێوە سانایە و سادەییە ناشکێتەوە. چونکە زۆر کەم وایە دوو کەس یان چەند کەسێک باروودۆخیان لەبەردەم دامودەزگای میریدا دەقاودەق وەک یەک بێ، تاکو وەک یەک تەماشایان بکرێ و مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ. ئەوەی بڕیاری کارگێڕی لەناوەڕۆکی بنەمای یەکسانێتی دەخوازێ ئەوەیە کە بۆ نموونە دوو کەس یان زیاتر داوایەک لەدەزگایەکی کارگێڕی دەکەن کە لەهەموو بارێکەوە یەکسان و لەیەکچووبن. گەر هاتوو داواکەیان لەباروودۆخێکی هاوچەشندا نەبێت، ئەوا ناکەوێتە بەر فەرمانی بنەماکە. وەلێ گەر هاتوو بارەکە وەک یەک بو ئەوا داوای هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکە ئاسانتر دەبێ لەچاو بنەماکانی دیکە، چونکە کایەی سەلماندن و بەدواداچوونی لەوانی دیکە ئاسانترە. دووڵنەبوونیش بۆ دەستپێوەگرتنی بەردەست ترە لەبەرامبەر بنەماکانی دیکەی ناوهاتوودا.

## دادگا و بنەما گشتییەکانی کارگێڕی لێهاتوو

*لە چوارچێوەی بابەتی دادگا، سەبارەت بە کێشە کارگێڕییەکان دوو شێواز هەن.*

**یەکەمیان:** ئەوەیە کە لە فەڕەنسادا هەیە. لەو وڵاتەدا هەرچی کێشە و پرسی کارگێڕییە دادگای تایبەتی خۆی هەیە کە مەبەست دادگای کارگێڕییە. بەو جۆرە لەباری ڕێزپەڕ و دەرچوون لە ناواخنی بابەتەکانی پەیوەندیدار بە بواری دەسەڵاتی کارگێڕییەوە نەبێ هاووڵاتی ناتوانێ سکاڵانامەی خۆی بۆ دادگای ئاسایی (مەدەنی) بەرزبکاتەوە، گەر هاتوو سکاڵانامەکەشی بەرزکردەوە ئەوا دادگای مەدەنی دەسەڵاتی نییە بڕیاری یەکلاکەرەوەی لەئاستدا دەربکا.

**دووهەمیشیان:** وەک ئەو سیستمەی لە وڵاتەکانی ئەڵمان، هۆڵەند و بەلژیک جۆرە تێکەڵاویەکە لەنێوان دەسەڵاتەکانی دادگای کارگێڕی و دادگای مەدەنیدا هەیە. تێکەڵاویەکە قانون سنورەکانی بۆکێشاوە. ئاقاری نواڕینی کێشەکان بەوەدا دەشکێتەوە گەر هاتوو قانون بەڕاشکاوی ئاماژەی بۆ دادگای کارگێڕی کردبوو ئەوا کێشەکە دەبرردرێ بۆ ئەوێ و دادگای مەدەنی بڕیاری ئەوە دەدا کە دەسەڵاتی بەسەردا ناشکێ. گەر قانونیش ئاماژەی بۆ نەکردبوو ئەوا کێشەکە لە دادگای مەدەنی چارەسەر دەکرێ هەرچەندە پرسەکەش هی کایەی دەسەڵاتی کارگێڕی بێ. بەڵام لەهەموو بارێکدا گەر بابەتەکە رون وئاشکرا نەبوو، هاووڵاتی دەتوانێ ڕوو لە دادگای ئاسایی بکا. بێجگە لەوەش دەبێ ئەوە بگوترێ کە دادگای کارگێڕی لەهەندێ بواردا لەسەر پرسێک بڕیاری کارگێڕی خۆی دەدا بە هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری کارگێڕی یان نا،

هاولاتی دەتوانێت لەهەمان کاتدا لە دەرگای دادگای مەدەنی بدا بۆ قەرەبووردنی زیانەکانی گەر هاتووبڕیاری کارگێڕی لەگەل خۆیدا زیانی بە هاوواتیەکە گەیاندبوو. دادگای مەدەنی بریارەکەی لەسەر بنەمای بێ دادی نادادپەروەری) دەردەکا.

بۆ زیاتر رونکردنەوەی ئەو تێکچرژاویەی لە باسەکەدا هەیە وا باشترە برگەیەکی دیکەشی لەسەر باس بکەین، بەتایبەتی دۆزی دوانەیی دادگاکردنی بڕیارێکی کارگێری. هەرچەندە لە سیستمی قانونیانەی فەرەنسادا کێشە پەیوەندیدارەکان بە باری کارگێری بۆ دادگای کارگێری پاوانکراوە. بەلام لەگەل ئەوەشدا پاوانکردنەکە بەتەوی رەها نیی، چونکە لە هەندێ باردا دەبێ دادگای کارگێڕی گۆرەپان بۆ دادگای ئاسایی چۆلبکات، هەرچەندە دۆزەکە بەجۆرێک لە جۆرەکان پەیوەندی بە دەرچەکرداری کارگێریشەوە هەبێت. بارەکان ئەمانەی خوارەوەن:

١- گەر هاتو کێشەی نێوان هاوواتی و دامودەزگای کارگێری خانەبەندی قانونی تایبەتیی بوو نەک قانونی گشتی.

٢- گەر هاتوو وەک لەباری سیستمەکانی دیکەی قانونی چەشنی ئەلمان ، هۆڵەند و بەلژیک پرسی زیان لێکەوتن و قەرەبووکردن لەگۆرێدابوو.

٣- هەرچەندە کێشەکە لەنێو کایەی قانونی گشتی دابێ بەلام بە قانونێکی تایبەت دەسەلاتی بریاردان و یەکلاکردنەوە بداتە دەست دادگای ئاسایی.

بەدەر لەو سێ بارە کایەی بریاردان و یەکلاکرنەوەی کێشە کارگێرییەکان لە فەرەنسادا لەسەر دادگای کارگێری پاوانە.

تێبینیەک لەسەر خالی یەکەم شایانی درکاندنە ئەویش، رێسایەکی گشتییە کە زۆربەی سیستەمە قانونییەکان لەسەری دەرۆن ئەوەیە کە هەر کێشەیەک بکەوێتە خانەی قانونی تایبەت، با لایەکی کێشەکەش دام و دەزگای کارگێری بێ ئەوا بەپێی قانونی تایبەت و دادگای ئاسایی لێیدەکۆلرێتەوە و بریاری یەکلاکەرەوەی لێدەدرێ. واهاتنی ئەو بارە گشتیەش راستەوخۆ بە دووتابوونی قانون _گشتی وتایبەت_ گرێدراوە.

هەرچی سیستەمی قانونیانەی بەریتانیاشە تەواو پێچەوانەی هی فەرەنسایە. لە یەکێتی شانشینی بەریتانیدا دادگای ئاسایی بالادەستە بەسەر تەواوی کێشەکان تا ئەو کێشانەش کە تایەکیان دامودەزگای کارگێری بێت. هەرچەندە هەندێ شێوەی دادگای کارگێری لەو ولاتەدا هەن، وەلی بریاری ئەو دادگایانەش دەکرێ دادگای ئاسایی چاویان پێدا بخشێنێتەوە، بەم جۆرە دەسەلاتی یەکلاکردنەوەی کێشەکان هەر بۆ دادگای ئاسایی دەگەرێتەوە.

هەرچەندە کاروباری دەسەلاتی کارگێری بەهەمو لایەنەکانی بە وردودرشتی لەدوتوێی قانوندا دانەرێژراوە، ئەوەش وا ناگەیەنێ کەقانونی کارگێری هە لەگۆرێدا نەبێ. بەلام لەسۆنگەی بەرفراوانی کردە و چالاکی دەسەلاتی ناوبراو ناتوانرێ سەرلەبەری کار و پێشهاتی کردەکان رەچاوبکرێن تا لەچوارچێوەی قانوندا دەقنوس بکرێن. چونکە بریارەکانی کارگێری بەپێی ئەوەی بریاری گرێدراو بەکات و بارودۆخی رۆژن و وێنابوونی گشتاندن وئەبستراکتیان پێوە نییە، بۆ تاکی هاولاتی وەک کەسێکی ناسراو لەژینگە (دەوروبەرێکی) دیاریکراوە و بۆ هەمووان نییە، بۆیە بۆ پرکردنەوەی ئەو بۆشاییە قانونییە شرۆڤەکردنی قانونەکان و رێنماییەکان وەک کۆنووسێکی رونکرنەوەی قانونەکان دەبنە مایەی پرکردنەوەی کەلێنەکە. بەلام ئەمە ئەو واتایە




ناداتەدەستەوە کە پابەندبوونی دامودەزگای کارگێری بە دەقی قانون لاواز بکا، بەڵکو بەپێچەوانەوە دامودەزگای میری دەبێ سەرلەبەری فەرمانبەردای قانون بێ. گەر وانەکا دادگا لەسەر پێیە بریارەکانی هەڵبوەشێنێتەوە. بۆنموونە کە هاوولاتیەک سکالایەک لەمەر بریارێکی دەزگایەکی کارگێری بۆ دادگا بەرز بکاتەوە، یەکەمین کردەوە کە دادوەر پێی هەڵدەستێ و تاقیدەکاتەوە پرسی رەوایەتییە. واتە تاچەند بریاری کارگێری تیشکی قانونی لەسەرە، ئینجا دوای ئەوە دادوەر دەچێتە سەر بەدواداچوونی بنەماکانی دیکە.

## سیاسەتی چاوپۆشین:

دامودەزگای کارگێری بەپێی دەسەلاتی ئاسایانەی خۆی بۆ جێبەجێکردنی قانونەکان؛ لەگەڵ خۆشیدا دەسەلاتی ئەوەی هەیە کە سەرپێچیکار لە رێساکانی بەجۆرێک لەجۆرەکان سزابدا. ئاشکراشە سزاش سێ ئامانجی سەرەکی خۆی هەیە:

١- سزادانی سەرپێچیکار هیوای ئەوەی لێدەکرێ کە سەرپێچیکار چیدی لاساری لەبەرامبەر قانوندا نەکا.

٢- سزادانی سەرپێچیکار هیوای ئەوەی لێدەکرێ ببێتە مایەی تۆقاندنێک بۆ کەسانی دیکە. بەکورتی ببێتە پەند بۆ کەسانێک کە بیانەوێت سەرپێچی بکەن.

٣- سزادان ببێتە مایەی راستکردنەوەی بارە سەرپێچیلێکراوەکە و گەرانەوەی بۆ پێش دەمی سەرپێچیکردنەکە. بەمجۆرە سزادانە دەگوترێ سزادانی راستکردنەوە. بەلام لەهەمان کاتیشدا گەر سزادان بارە خوارەکەی پێراست نەکرێتەوە ئەوا دەبێتە سزادانی تۆڵەلێکردنەوە کە ئێش پێگەیاندنی لێدەکەوێتەوە؛ ئەوسا ئێشەکە چ جەستەیی بێت وەک بەندکردن یاخود دارایی وەک ناچارکردن بە دانی سزایەکی ماددی (پێبژاردنی برێک لەپارە).

فەلسەفەی سزادان زیاتر لەبابەتی قانونی سزادان بە گوروتینەوە دێتەپێش، چونکە ناو و ناواخنی قانونەکەی لەسەر بەندە.

هەرچی دەربارەی قانونی کارگێرییشە ئەوا دیسان پرسی سزادان دێتە گورێ، بەلام بەبارێکی سوکتر. ئۆرگانەکانی دەسەلاتی کارگێری بۆیان هەیە لەسنووری جوگرافی و فرمانی خۆیاندا لەکاتی پێشێلکردنی قانونو رێساکانی کارگێرییدا بەپێی دەسەلاتی تەرخانکراویان سەرپێچیکاران لەهاوولاتیان سزابدەن. بەلام نابێ جۆری سزاکانیان لەگەڵ سزای دادوەری سزادانادا تێکبکاتەوە، چونکە مرۆڤ بە تاوانێک تەنها جارێک سزا دەدرێت.

بەلام گەربێت و کەسی سەرپێچیکار لەلایەن دادگای سزادانەوە جۆرە سزایەکی ئێش پێگەیاندنی درا ئەوا بۆ دامودەزگای کارگێری هەیە هەمان سزادراو بە سزای جۆری راستکردنەوە وەک لەخاڵی چوارەمدا هاتوە سزا بدا، چونکە لەوکاتەدا ئامانجی سزایەکان ناچنە نێو یەک بۆتەوە.

لەهەر کردار و رەفتارێکی دامودەزگای کارگێرییدا دەبێ بگەرێینەوە سەر بنەمای رەوایەتی (بە تێهەلکێشکردنی بنەما گشتیەکانی کارگێری لێهاتوو). بەچروپری سەروەری قانون لە هەمو بارێکدا دەبێ بپارێزرێ. بێگومان لێرەدا ئێمە قسەمان لەسەر دەولەتی قانونە، چونکە لەدەولەتی ناقانونیدا هەموو شتێک بەبارە ئاوەژوکراوەکەیدا دەشکێتەوە.

لەو خاڵەوە دێمەسەر ناونیشانی سەرەوە، کە ئەو دێرانەمان بۆ تەرخانکردووە ئەویش بابەتی چاوپۆشینە.

لەدەوڵەتی قانونیشدا ئەو دۆزە دێتە گۆڕێ بەڵام بەبارێکی جیاوازدا. مەبەست لەسیاسەتی چاوپۆشین ئەوەیە کە دامودەزگای کارگێڕی بەزانیاری و ئەنقەست چاوی لە پەیڕەونەکردنی دەقاودەقانەی ڕێسایەکی قانونیانە بپۆشێ. لەم بارەدا کارگێڕ ئاگای لە پێشێلکاریەکانە بەڵام زۆر بەهەندی هەڵناگرێ، وەک دەگوترێ لەنێو درزی پەنجەکانیەوە سەیریدەکا. لەوبارە لێنەپێچینەوەدا ڕێسای سەرپێچیلێکراو بەکردەوە سڕدەکرێ، گەر هاتوو دامودەزگای کارگێڕ چاوی لەسەرپێچیکردنەکە پۆشی ئەوا جۆرێک لە ماف بۆ هاوولاتی دروست دەبێ کە لەسەر سەرپێچیکردنەکەی بڕوا بەمەرجێک سەرپێچیکردنەکە زیان بە کەسێکی دیکە نەگەیەنێ، یان کەس دەنگی سکاڵانەمەی لەئاست بەرزنەکاتەوە.

کایەی ئەو سەرپێچیانە کەمن و هۆی پۆزشتکارانەی خۆشیان هەن، ئەمانەی خوارەوە بەشێکیانن:

١- ڕەنگبێ ڕێسایەکە خۆی نادیار و ئامانج پێکەر نەبێ، بەجۆرێک کە نەتوانرێ بە باشی جێبەجێبکرێ.

٢- ڕەنگبێ ئەو کاتبەندیەی کە دەزگایەکی کارگێڕی وەک ماوەیەکی جێبەجێکردن کورت بکێشێ و کاروبارەکان لەهەمان ماوەدا نەسازێنرێن. بۆ نموونە شارەوانیەک ڕێسایەک دەردەکا بەوەی بۆ خەڵکی فڵانە شوێن هەیە لەماوەیەکی دیارکراودا دەست بکەن بە دروستکردنی خانووبەرە، بەڵام ماوەکە کورت دەبێ و تەواوی بەرژەوەندیداران ناتوانن کارەکانیان بکەن، گەر شارەوانیش لەسەر پلانەکەی سووربێ ئەوا زیان بەوانی دیکە دەکەوێ.

٣- ڕەنگبێ جاری واهەبێ دامودەزگای میری ئەو بڕە پێویستەی کارمەند و تەکنیک و پوولەی نەبێ بەسەر چاودێریکردنی بڕیارەکانیدا ڕابگا.

٤- ڕەنگبێ داموودەزگای کارگێڕی ڕێسایەکی لەمەڕ پاراستنی ژینگە یان شتێکی لەو بابەتەی دەرکردبێت، بەڵام لەبەر هۆی ئابووری یان ناچاری جاری نەتوانێ ڕێسایەکەی خۆی بچەسپێنێت بۆیە چاوپۆشی لە سەرپێچیەکانی دەکا.

٥- ڕەنگبێ لەیەک کاتدا دوو ڕێسا هەبن بۆ یەک بابەت کەئەمەش دەبێتە هۆی سەرلێشێواندنی پەیوەندیداران، ئیدی تا ساخ دەکرێتەوەو ڕێسایەکیان لادەبرێ چاوپۆشیکردن دێتە گۆڕێ. لەهەموو ئەوبارانەی سەرو ڕێسا وایە کەچاوپۆشین نەبێ بەڵام گەر هەر کراش ئەوا لەچوارچێوەیەکی تەسک بەڵام بێ لێکەوتنەوەی زیان.

---

تێبینی / ئەو بابەتە بەشێکە لەپرۆژەی کتێبێک بەناوی دەوڵەتی قانون.

**ژێدەرەکان:**


1- mr.C.P.J. Goorden, Algemeen bestursrecht Compact, derde druk, Elsevier 2000.

2-Willem Witteveen, De denkbeeldige staat, voorstelling van democratische verniewing, Amsterdam,University press,2000.

3-Willem Witteveen, De geordende wereld van het recht, Een inleiding, Tweede druk, Amsterdam,University Press 2001.

4- Prof.mr.M.C.Burkens, Beginselen van de democratische rechtstaat, Inleiding tot de grondslagen van het Nederlandse staat-en bestuursrecht, Vijfde druk, W.E.J.Tjeenk Willink,2001.






تویژینەوەیەکی تیۆری بۆ پەرەپێدانی گەشتوگوزاری سۆران

# دوێنی پاشای گەورە، ئەمڕۆش گەشتوگوزار سۆران دەبێتە پایتەختێکی ناودار

نادر روستی

## گرنگی گەشتوگوزار لە جیهانی ئەمڕۆ

ئەمڕۆ گەشتوگوزار لە زۆر وڵات بۆتە سەرچاوەی داهاتی ساڵانە. تەنانەت ئەو وڵاتانەی کە نەوت و پیشەسازی و تەکنەلۆژیایان تێدا بەهێزە، ئەوانیش لە هەندێك ساڵ داهاتی گەشتوگوزاریان دەچێتە خانەی یەکەم، وەك: وڵاتانی ئەمریکا و ئیسپانیا و ئیتالیا و چین و فەرەنسا و هند و کۆریا و تورکیا. لە وڵاتانی عەرەبیش، میسر و ئەردەن و تونس و سوریا و ئیمارات و قەتەر و سعودیە. ئەمەش وایکردوە بە بواری داهاتی گەشتوگوزار بگوترێت (پیشەسازی گەشتوگوزار). سەیری خشتەکە بکە تەنیا لە ساڵی ١٩٩٧ ژمارەی گەشتیاران و داهاتی چەند وڵاتێکی پیشەسازی لە چ ئاستێکدا بووە.

| وڵات/دهات | فەرەنسا | ئەمریکا | ئیتالیا | ئیسپانیا | بەریتانیا | چین |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ساڵ | ١٩٩٧ | ١٩٩٧ | ١٩٩٧ | ١٩٩٧ | ١٩٩٧ | ١٩٩٧ |
| گەشتیار/ملیۆن | ٦٦ | ٤٩ | ٣٤ | ٤٣ | ٢٥ | ٢٣ |
| داهات/ ملیار | ٢٨ | ٧٥ | ٣٠ | ٢٧ | ٢٠ | ١٢ |



بایەخی گەشتوگوزار گەیشتۆتە ئەو ئاستەی وەك رووبارێكی هەمیشەی داهاتی نشتیمانی سەیربكرێ. ساڵ دوای ساڵ داهاتی گەشتوگوزار لە زیادبوون دایە، لەساڵی ١٩٦٠ ژمارەی گەشتیارانی جیهان ٦٩ ملیۆن بووە و داهاتی ٧ ملیار دۆلار، بەڵام ٢٠٠٨ گەیشتۆتە ٩١٩ ملیۆن گەشتیار و ٩٤٢ ملیار دۆلار. لەلایەنی زانستیشەوە پیشەسازی گەشتوگوزار لە سەر زانست و هونەری تایبەت بنیادنراوە، لە پەیمانگا و زانكۆكان وەك زانستێك دەخوێندرێت و خاوەنی دەیان جۆر پێناسە و دیان تیۆری تایبەتە، لە بواری كرێكار و كارمەندیشەوە ئەو كرێكارو فەرمانبەرانەی لە بواری خزمەتكوزاری گەشتوگوزار كاردەكەن (هوتێل، چێشتخانە، نووسینگەی گەشتوگوزار، شوێنە گەشتیارییەكان، بواری خزمەتگوزاری) زۆر زیاترن لەو كرێكارانەی لە كارگەو دامەزراوە نەوتییەكان و لە كارگەی ئوتومبێل دروستكردن كاردەكەن، یاخود بەواتایەكی دیكە، پیشەسازی گەشتوگوزار كێبڕكێی بەشێكی زۆری جۆرەكانی پیشەسازی دەكات، بۆ نموونە پیشەسازی دروستكردنی ئوتومبێل كرێكارێكی زۆر كاری تێدادەكەن، بەڵام زۆری كرێكاری گەشتوگوزار وایكردوە كە لە هەندێك وڵات كرێكارو داهاتی گەشتوگوزاری زیاتر بێت لە كرێكار و داهات لە وڵاتە پیشەسازییەكان. لەسەر ئەم پێوەرانەی سەرەوە دەكرێ ئێمەی كوردستانی بۆ ئایندەی كوردستان و بەهێزكردنی بنەمای ژێرخانی ئابووری، گەشتوگوزار بكەینە یەكێك لە كۆڵەگەكانی بنەڕەتی، یاخود لە سەرچاوە ئابوورییەكانی داهاتی كوردستان. داهاتی پیشەسازی گەشتوگوزاریش بەندە بە چەند بنەمایەكی سەرەكی، واتە هەر شوێنێك دەتوانێت لە سەر ئەو بنەمایانە گەشە بە داهاتی ساڵانەی وەبەرهێنانی ناوچەكەی بدات. گرنگترین بنەما و رەگەزەكانی ئەم بوارە سروشتە، ئەمەش جۆری گەشتوگوزاری خۆشی(ترفیهی) و كاتبەسەربردنی لە سەر بنیاد





دەنرێت. ڕەگەزەکانی سروشتیش لە (ئاووهەوا، جوانی و بەرزی چیا، ڕوبارەکانی، بەرزونزمی، دارودرخت و سەوزایی، ئاژەل و باڵندەی کێوی، کولتووری ناوچەیی) پێکدێن. ئەگەرچی ئەمانە بە سروشت جوانن و بنەمای گرنگن، بەلاّم ئەگەر خزمەتگوزاری و جوانکاری و گۆڕانی زیاتریان بۆ بکرێت و سوود لە ئامێر و تەکنەلۆژیای سەردەم وەربگرین، ئەم بنەمایە زۆر بەهێز دەبن و زیاتر پشتی پێدەبەسترێت. ماوەتەوە لێرەدا ئاماژە بە ئامانجی سەرەکی بدەم، کە ئایا ڕاستە گەشتوگوزاری کوردستان دەتوانێ بگاتە ئاستێك وەك سەرچاوەی نەوت سەیر بکرێت و پشتی پێ ببەسترێت؟ لە ڕاستیدا ئەو بنەمایەی بۆ گەشتوگوزار پێویستە، بوونێکی زۆر بە هێزی لە کوردستان هەیە.

بەلاّم پێویستی بە سەرمایە و دەستی مرۆڤ و سوود وەرگرتن لە ئامێرو تەکنەلۆژیا هەیە، بەم هۆیەش دەتوانرێ گەشتوگوزاری دەستکرد بگەیەندرێتە ئەو ئاستەی کە لە گەشتوگوزاری سروشتی گرنگتر بێت، لە هەمانکات خزمەتی جوانکردنی زیاتری سروشتی پێبکرێت. لە لایەکی تر پەرەدان بە خوێندن و زانستی خزمەتگوزاری و دابینکردنی خزمەتگوزاری و ناساندن و بازاڕ بۆ دۆزینەوە و ڕاکێشانی گەشتیارانیش وەك زانستێك پێویستن. ئەگەر ئێمە کوردستان وەك ولاّتێك سەیر بکەین و بیر لە گۆڕان و پێشوەچوونیی بکەینەوە، ناچارین پەنا بۆ هەموو ئەو کەناڵ و ژێدەرانە ببەین کە یارمەتیدەری پێشکەوتنی ناوچەکەن. پێویستە ئەوەش بزانین کە ئەگەر گەشتوگوزار سەرەتا پەیوەست بووبێت بە ئەوروپا و ولاّتانی ڕۆژئاوا، ئەوە ڕۆژ دوای ڕۆژ دەگوازرێتەوە بۆ ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان، بێگومان ئیراق یەکێکە لەو ولاّتانە و هەرێمی کوردستانیش بەشێکە لەم ڕەوشە.

لە ساڵی ١٩٦٠ لە ٩٨٪ گەشتوگوزاری جیهان لە کیشوەری ئەوروپا بووە، بەلاّم ئەمرۆ تەنیا لە ٥٠٪ی گەشتوگوزاری جیهانی لە کیشوەری ئەوروپا ماوەتەوە، واتا ولاّتانی تری جیهان بایەخی ئەم پیشەسازیەیان زانیوە و گرنگی پێ دەدەن و گەشتیار بۆ ولاّتەکەیان ڕادەکێشن. بۆ نموونە: مالیزیا ولاّتێکی کشتوکالی بوو، ئەمرۆ بۆتە ولاّتێکی گەشتیاری کە دانیشتوانەکەی ٢٤ملیۆنە بەلاّم ١٦ ملیۆن گەشتیار سەردانی دەکەن.

پێویستە ئەو ڕاستیەش بزانین کە ئەگەر کوردستان تا دوێنێ لانکی پێگەیاندنی شۆڕش وبەرخودان بووە، ئەوا پێویستە ئەمرۆکە لەگەڵ گۆڕان و پێشوەچوونە سەردەمییەکان پێگە ستراتیژیەکەی بگۆڕێ و بیر لەو فاکتەرانە بکاتەوە کە ئایندەیەکی گەشی شارستانی لە سەر بنیاددەنرێت. لە ساڵی ٢٠٠٦ ژمارەی گەشتیارانی هەرێمی کوردستان لە دەوروبەری ٣٠٠ هەزار دەبوون ، بەلاّم ئەمرۆ نزیك دەبینەوە لە ١ ملیۆن گەشتیار.

هیچ ناوچە و ولاّتێکیش بەبێ ئابووریەکی تۆکمە و بەهێز نابێتە خاوەنی ئەو پێگە و شارستانیەتە پێشکەوتووە، کە جیهانی ئەمرۆ گەرەکیەتی. مەبەستمە لێرەدا بڵێم ئایا گەشتوگوزار تا چەند دەتوانێت پێگەی کوردستان بەهێز بکات و بە دەرەوەی خۆی بناسێنێت؟ ئەگەر کوردستان تا دوێنێ بنەما ئابووریەکەی لە سەر کشتوکاڵ بنیاد نرابێ و پشتی پێی بەستبێت، ئەوە ئەمرۆ دەتوانێت کەناڵی تری داهات زیاد بکات و سوودی لێ وەربگرێت، کە مەبەستمان داهاتی نەوت و بازرگانی و پیشەسازی و گەشتوگوزارە. ئەگەر توانرا گەشتوگوزاری کوردستان گەشەی

پێبدرێت، ئەوە دەبێتە سەرچاوەیەکی تری داهاتی هەرێمی کوردستان شانبەشانی داهاتی نەوت و کشتوکاڵ، ئەوکات لە وڵاتان دانابڕێین، ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان داهاتی نەوت کورت بێنێ، ئەوە گەشتوگوزار نەوتێکی لە بن نەهاتووە و ڕۆژ دوای ڕۆژ بایەخی زیاتر دەبێت. مەبەستمان نییە لە بایەخی ستراتیژی نەوتی کوردستان کەم بکەینەوە، بەڵکو مەبەستمانە لە ڕێگەی پەرەپێدان و دابینکردنی خزمەتگوزاری بۆ گەشتوگوزار، گەشتوگوزار شانبەشانی نەوت بکەینە سەرچاوەیەکی دیکەی هەرێمی کوردستان، چونکە داهاتی گەشتوگوزار ڕووبارێکی لەبنەنەهاتووی هەمیشەییە کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ داهاتی خۆی زیاددەکات و هەرێمەکەمان زیاتر بە نەتەوەکانی جیهان دەناسێنێ، ئەمەش دواڕۆژێکی ڕوونتر بۆ سەربەخۆی ئابووری و سیاسی کوردستان مسۆگەر دەکات.

کوردستان بنەما سروشتییەکانی بەهێزە، بنەما سروشتییەکانیش لە جیهان زیاتر لە ٧٠٪ی گەشتیاران پشتی پێ دەبەستن، بەو واتایەی بەشێکی زۆری گەشتیاران بە هۆی بوونی ئەم بنەمایانە بۆ ئەو ناوچانە گەشت دەکەن، کە ئاووهەوایەکی فێنك و گونجاویان هەیە و پلەی گەرمیان لە ٣٠ پلەی سەدی تێناپەڕێت. بەڵام ئایا لە جیهانێکی پێشکەوتووی وەك ئەمڕۆ، دەشێ گەشتوگوزار تەنیا پشت بە بنەما سروشتییەکان ببەستێ؟ ئایا لە جیهانی کراوە و بچوکراوە لە ناوچنگی ڕاگەیاندندا، گەشتیاران تەنیا پشت بەسروشت دەبەستن؟ بۆیە سرۆشت بێ پێشکەشکردن و دابینکردنی خزمەتگوزاری نابێتە شوێنێکی گەشتوگوزاری. لە ڕاستیدا زۆر لە گەشتیارانی ئەم سەردەمە پێش گەشتەکانیان دەست پێبکەن، هەوڵ دەدەن سوود لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ئەنتەرنێت وەربگرن. بۆیە سەردانی سایتەکان دەکەن و شوێنەکان هەڵدەبژێرن و پەیوەندی بە هۆتێلی شیاو دەکەن. ئەمەش بەو واتایەی کە ئەو شوێنەی گەشتیار دەیەوێت گەشتەکەی





بۆبکات، زانیاری لەسەر کۆدەکاتەوە. کەواتە جگە لە بنەما سروشتییەکان، بنەما و خاڵی تر هەیە کە گەشتیار رادەکێشێ، یەکێک لەو خاڵانەی کە ئەمڕۆ سەرنجی گەشتیار رادەکێشێ، بریتیە لە جۆری خزمەتگوزاری گەشتوگوزاری. کەواتە بەبێ خزمەتگوزاری، گەشتوگوزار نابێتە نەوتی ئاینده.

لەم بابەتەدا هەوڵمانداوە گەشتوگوزار لە دەڤەری سۆران بە تایبەتمەندییەکانی خۆیەوە بناسێنین و سەرچاوە و بنەماکانی بخەینە بەر دەستی خوێنەر، لە هەمانکاتدا هەوڵمانداوە چەند بیرۆکەیەک لە شێوەی پرۆژەی گەشتوگوزاری بخەینە بەردەست حکومەتی هەرێم و لایەنە پەیوەندارەکان، بۆ ئەوەی سوودیان بۆ گەشەپێدان و دابینکردنی خزمەتگوزاری گەشتوگوزاری لە دەڤەرەکە لێ وەربگیرێ. بۆ ئەمەش بابەتەکەم بە سەر چەند بەشێک دابەش کردووە:

## رەواندز و گەشتوگوزار

شارۆچکەی رواندز بە دووری ۱۰۷کم دەکەوێتە باکوری رۆژهەلاتی شاری هەولێر. لەسەر ناوی رواندز بیر و بۆچوونی جیاواز هەیە، وشەی رواندز لە(رەواند + دز) پێک هاتووە، رەوەند یان رەواند هۆزێکی کوردی بونە کە سەلاحەدینی ئەیوبی سەر بەو هۆزەیە و لە ناوچەکانی پیرمام و دوین و رواند ژ هەندێک شوێنی تر ژیاون. دز لە وشەی دژ وەرگیراوە کە بە مانای قەلاّ دێت. هەردوو وشە بەیکەوە واتای قەلاّی رەوەندەکان دەگەیەنێت. یەکێکی تر لە بۆچوونەکان دەڵێ بەو بەهۆیەی رواندز دەکەوێتە نێوان هەردوو گەلی خەرەند و کەلی خالەرەش، شوێنەکە سەخت و دژوارە و وەک قەلاّیەکی سەخت خۆی نیشان دەدات. رەوان بە مانای چەم دێت، واتە قەلای چەمەکان دێت.

## سروشتی رواندز و گەشتوگوزار

هەڵکەوتەی کوردستان بە گشتی سرووشتێکی جوان و لەبار و سەرنج راکێشی هەیە، لەم ناوەندەدە رواندز و دەوروبەری کەوتوونەتە بەشێکی گرنگ و رازاوەی کوردستان. بەرزونزمی، ئاووهەوا ، کانیاو رووبار، لوتکەی بەرزی چیاو و زنجیرە چیا، دۆل و قەدپاڵ و کەژ و کێو، گەلی و خەرەند، دارودرختی سرووشتی و رەزوباخی دەستکرد، ئەشکەوتی سروشتی و ئەشکەوتی دەستکردو مێژووی، باڵندە و ئاژەلی کێوی، مێرگ و چیمەنی سروشتی، تاڤگە و سولاوکی ئاو، دەریاچەو گۆماوی سروشتی، میوەجات و بەرهەمی کوێستانەکان، ژیانی لادێ و کۆچەبەری و رەوەندایەتی کوردەواری و چەندان شتی تر بنەمای سروشتی راکێشانی گەشتیارانن. ئەم بنەما گەشتیاریانە گشتیان لە دەڤەری رواندز هەیە، تەنانەت هەندێکیان بە زیادەوە و جۆری جیاواز هەن. کەواتە سرووشتی رواندز و دەوروبەری لە زۆرلاوە تایبەتمەندی هەیە و بۆ چەند جۆرێکی گەشتوگوزار لە بارە. هەڵکەوتەی شوێنی شار لە نێوان دوو گەلی قول و هەڵدێر یەکێکە لەو تایبەتمەندیانەی لە شارەکانی دیکەی کوردستان و ئێراق و رۆژهەلاّتی ناوەراست و بگرە لە جیهان نییە. هەروەها بەرزی شوێنی شاری رواندز لە روویی دەریا و لەسەر ئاستی ناوچەکە تایبەتمەندیکی دیکەی گەشتیاریی شارەکەیە. هەڵکەوتی شار لە باوەشی کۆمەلێک چیای سەر کەشی وەک کۆرەک و ئارموشە لە باشوور و هەندرێن لە رۆژهەلات و زۆزك لە باکور و گۆرەز و برادۆست لە رۆژئاوا. نزیکی لە کۆمەلێك



زنجیرە چیای ناوچەی باڵەکایەتی و برادۆست و خۆشناوەتی و بارزان فاکتەرێکی تری سروشتیە. هەڵکەوتی شارەکە وەك ناوەندی چەند شارۆچکەیەکی وەك چۆمان و مێرگەسۆر و سیدەکان و سۆران و چەندان گوندی دەڤەری سۆران خاڵێکی دیەکەی بەهێزی هەڵکەوتەکەیە. لەمانەش گرنگتر رواندز کەوتۆتە ناوەندی چەند هاوینەهەوارێکی ناسراوی وەك گەلی عەلی بەگ و بێخاڵ و جوندیان و حاجی ئۆمەران. هەروەها کەوتۆتە ناوەندی کۆمەڵێك دۆڵ و هاوینگەی نەناسراوی گەشتیاری، وەك دۆڵی ئاکۆیان و ئالانە و هەلەکان و خانەقا و وەرتێ و روستێ و سیدەکان، هەریەك لەم دۆلانە چەند شوێنێکی زۆر رازاوەی گەشتیاری تێدایە بەلاّم هیچ خزمەتگوزاری بۆیان نەکراوە و وەك شوێنی گەشتیاری نەناسراون. هەروەها هەردوو ئەشکەوتی مێژووی شانەدەر و بەستون و چەندان ئەشکەوتی دیکەی سروشتی لە دەڤەرەکە نزیکن و سوودیان لێ وەردەگیرێت. لە هەمان کات ناوچەکە بە چەند سەرچاوەی ئاوی سازگار و بە چەند رووبارێکی بچوك دەوڵەمەندە. هەروەها نزیکە لە کوێستانەکانی سیدەکان و بناری هەڵگورد و لوتکەی حەسەن بەگ، ئەمانە گشتیان فاکتەری گرنگی سرووشتی گەشتیارین و پێویستیان بە کار لەسەرکردن و ئامادەکردن هەیە بۆ بەکار هێنان و ناساندن و سەرنج راکێشانی گەشتیاران.

## رابردووی رەواندز بۆ گەشتوگوزاری ئەمرۆ

مێژووی رواندز بە تەواوی نەزانراوە، بەلاّم زۆر کۆنە و بۆ سەردەمی پێش دەوڵەتی ئۆراتۆ (٧٢٢ پ-ز ٧٠٥ پ-ز) دەگەرێتەوە و پایتەختی دەوڵەتی ئۆراتۆ (مەساسیر)بووە. شوێنی یەکەم میر نشینی سۆران (عیسای کوری کەلۆس) بووە و شوێن و پایتەختی دوا میرنشینی سۆران (میر محمەد مستەفا بەگ-پاشای





گەورە)بووە. سەردەمی زێڕینی ڕەواندز لە کاتی میرنشینی سۆران دەست پێ دەکات. بەتایبەت لەسەردەمی (پاشای گەورە میر محەمەد ١٨١٣ز تا ١٨٣٦ ز) پێگەیەکی مەزنی لە رووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و شارستانیەت بۆ کوردستان هەبووە، بەمەش سەدان لاپەڕەی سەروەری و خزمەتگوزاری و مێژووی لە مێژووی کورد تۆمار کردووە. لەسەردەمی پاشای گەورە ڕواندز بووە پایتەختی بەشێکی کوردستان و ناوەندی بڕیاردانی شەڕو ئاشتی و چارەنووسی کورد، لە هەمان سەردەم ڕواندز بوژانەوەی لە گشت لایەنێك بەخۆیەوە بینی(چەندان قولە و قەڵات و پرد و مزگەوت و مەدرەسەی ئاینی بنیات نرا، کە تاکو ئەمرۆش شوێنەواری بەشێکی زۆریان ماوە، وەك (قولەی شەمامێ لە بەرامبەر شاری ڕواندز لەبەشی ڕۆژهەڵات، کە ئێستا نۆژەنکراوەتەوە، ئیس قەلا لە نێوان سۆران و ڕواندز، پردی بەرسیرین لە گوندی بەرسیرین لە سەر ڕێگەی گشتی سۆران – چۆمان) . کارگەی دروستکردنی کەرستە و کەلوپەلی جەنگی دروست کرد، وەك: تۆپی جۆراوجۆر کە وەستا ڕەجەب دروستی کردوون و ئەمرۆش دانەیەکی لە ناو ڕواندز پارێزراوە و دانەیەکی لە مۆزەخانەی بەغدا پارێزراوە، خەنجەرو کەلوپەلی تری سەربازی کە وەستا خان گلێدی دروستی کردوون و ئەمرۆش لە لای هەندێك کەسایەتی ناوچەکە ڕەنگە مابن، ئەم پێشکەوتنە زۆر جیاواز نەبوو لە گەڵ پێشکەوتنی وڵاتانی ئەو سەردەم. لە هەمان سەردەم ڕواندز بووە پایتەختی سکەی پارە و دەرکردنی دراوی تایبەت بە دەسەڵاتی پاشا و سنووری دەسەڵاتی. گۆمانی تێدا نییە کە سوپای پاشا جلوبەرگ و شێوازی تایبەتیان هەبووە، بەهەمان شێوە دانیشتوانەکەشی جلوبەرگ و کەلتووری تایبەتیان هەبووە) . دەسەڵاتی پاشای گەورە وایکرد دەیان گەڕیدە و سەرکردە و زانای ناوخۆ و دەرەوە ڕوو لە ڕواندز بکەن و گەشتی بۆ بکەن و ناوچەکە ببینن. لە سەردەمی رووسەکان ١٩١٧ بەشێکی بەر هێرشی روسەکان دەکەوێت و





دەستوتێنرێ. لە سەردەمە جیاوازەکاندا جێگای ململانێی سیاسی بووە و هەردەم دژی داگیرکەران وەستاوە. ئەمانە و چەندان لایەنی تر لە قۆناغی جیاواز سەردەمی جیاواز لە رواندز و دەوروبەری بوونیان هەبووە، رواندز لە چاپەخانە و چاپەمەنی(زاری کرمانجی ١٩٢٤ز) و لە هونەر و مۆسیقا و کەسایەتی جیاواز زۆرجار پێشەنگ بووە. بەڵام ئایا تاچەند ئەوانەی ناوم بردن وەك مێژوو وەك کەلتووری ناوچەکە پارێزراون و تاچەند بە دانیشتوانی ناوچەکە و بە گەشتیار و بە گەلانی دنیا ناسێندراون؟ ئایە پێویست نییە کە مۆزەخانەیەکی تایبەت بە ناوچەکە هەبێت کە کۆپیەك لە شوێنەوار و کولتووری ناوچەکە لە خۆبگرێت.

یان ئەو شوێنەوارانەی ناومان بردن نۆژەن بکرێنەوە و بە گەشتیار و میوانان بناسێندرێن؟ ئایا پێویست نییە جوانترین و گەورەترین پەیکەر بۆ پاشای گەورە لە دەروازەی شار دروست بکرێت. یان ئەو هەوڵانەی لە سنوورەکە دراون زیاتر بە گەشتیاران بناسێنین. بۆنموونە تۆپەکەی وەستا رەجەب کە لە ١٨١٦ز دروستکراوە لە رواندز پارێزراوە، یان قولەی شەمام و خانووی حوزنی و شتی تر کە نۆژەنکراوەنەتەوە یان تۆژەن دەکرێنەوە، خانووە کەلتوورییەکانی رواندز و گوندی کاولۆکان کە کارگەی دروستکردنی چەك و تۆپەکانی وەستا رەجەبی لێ بووە. هەروەها قەڵای ئیسقەڵا لە بەرامبەر رواندز کە

شوێنوارەکەی ماوە بپارێزرێن. لە راستیدا گرنگە بەمانە و بەچەندان لایەنی دیکە تایبەتمەندی زیاتر بۆ رواندز بگەڕێتەوە و تایبەتمەندیەکان بە گەشتیاری بکرێن و بە دنیا بناسێندرێن.

## نموونەی چەند شوێنێکی گەشتیاری لە دەڤەری سۆران

### ئیسقەڵای پاشای سۆران

قەڵای ئیسقەڵا (ئیچ قەلا) کە دەکەوێتە باکوری شاری رواندز، بەرامبەر گوندی کاولۆکان لە سەر رێگای قەزای سۆران– رواندز ، لە ساڵەکانی (١٨١٣-١٨٣٦) دەسەڵاتی پاشای سۆران (میر محەمەد – پاشای گەورە) دروست کراوە . لە سەر دەمی دەسەڵاتی پەشای گەورە قەڵای (قەڵاتی– قەراتی) ئیس قەڵا پارێزگاری لە کیان و دەسەڵاتێکی کوردی بەر فرەوان کردوە و سەری کوردی پێ بەرز بووە، کاتێ بە سەر ئەم شوێنە بەرزە دەکەوی کە قەڵایەکەی لێ دروست کراوە، لە رووی دەروونی هەست بە ئارامی و سەربەرزیەکی زۆر دەکەیت " چونکە لە لایەك خەیاڵ بۆ رۆژگاری سەردەمی نزیەکەی ٢٠٠ساڵ لەمەوبەرت دەباتە کە دەسەڵاتی





کورد ئا لێرەدا توانیویەتی چۆك بە دوژمنانی کورد (عوسمانیکان)دا بدات و سەر بەخۆی خۆی رابگەیەنێت و دراوی تایبەتی کوردی دەربکات و گەورەترین کارگەی تۆپ و خەنجەر و تەقەمەنی دابمەزرێنیت و قایمترین پرد کە تا ئەمڕۆش ماون و بەهێزترین قەلاَ ی سەردەم بۆ بەرگری بنیات بنێت. لە لایەکی دی ئەم شوێنە بە سەر رواندز و گوندی کاولۆکان و بەشێکی سۆران خەرەندی رواندز دەروانێت کە ئەمەش دیمەنێکی جوان دەبەخشێتە دەروونی ئەو گەشتیارەی بۆ ئەویَ دەچێت. بەلاَم بە داخەوە کاتیَ دەچیتە ناو کۆنە قەلایەکە چاوت بە وێرانەیەك دەکەوێت کە گریانت بۆی دێت کە نەتوانراوە ئاوەرێك لەم وێرانەیە بدرێتەوە و لە خەرابوون وفەوتان رزگاری بکریَ. ماوەتەوە بلێین هاولاتی و رۆشنبیران و بەرپرسە دلَسۆزەکان و دەولەمەندەکان و نەوکانی پاشای سۆران، تاکەی ئەمەتان قەبولە و بەدیار کەلاوەی قەلای مێژووی پاشا ئازا و سەربەرزەکەتانەوە دادەنیشن و چاوەروانی لە ناوچوونی دەکەن؟! کەچی خەریکە رواندز و دەڤەری سۆران دەبنە شوێنی گەشتیاران و لە سەرجەم ئیراق و زۆرێك ولاتانی



بیانی رووی دەکەن ، بێگومان شوێنەواریش یەکێکە لە بنەما بەهێز و سەرنج راکێشەکانی گەشتیاری .

## گوندی کاولۆکان

بە دووری ۷۰۰م دەکەوێتە خواروی شارۆچکەی رواندز، دیمەنێکی سەرنجراکێشی هەیە، خانووەکانی بەئەندازەی کوردەوای دروستکراون، هەندێك لە خانووەکان کەوتوونەتە سەر لوتکە و تەپۆلکی شاخ کە بەسەر رووباری رواندز و گەلیەکانی دەوروبەریاند دەڕوانن. هەندێکیان خانووی کەلتووری و شوێنەواریە و پێویستی بە پاراستن هەیە. لە سالَی ۱۸۱٦ لە کاتی دەسەلاَتی پاشای سۆران کارگەی چەك دروستکردن لەم گوندەبووە. تۆپەکانی وەستا رەجەب لەم گوندە دروست کراون.

## مۆتێلەکانی کاولۆکان

لە رۆژهەلاَتی گوندی کاولۆکان بەدووری ۱کم چەند مۆتێلێك و چێشتخانەیەك دروست کراون، ئەمە جگە لەوەی کە لە جندیان ۱۳ مۆتێل و لەهەوارگەی پانك و لە ناو رەواندز چەند مۆتێل و خواردنگەیەکی گەشتیاری هەیە و گەشتیاران دەتوانن سوودیان لێوەرگرن.

## هەوارگەی پانکی گەشتیاری

هەوارگەی پانك بە دووری یەك کیلۆمەتر دەکەوێتە رۆژئاوای شارۆچکەی رواندز، هەوارگەکە لە شوێنێکی بەرز و پانتایەکی فراوان

-روستکراوە و چەند جۆرە
-ریەکی جیاواز و چێشتاخانە و
-ۆتێلی لێیە. ساڵانە هەزاران
گەشتیار سەردانی دەکەن. ئەم
-ەوارگەیە نزیکەی ١٠٠ مۆتێل و
چێشتخانە و کۆمەڵێك یاری
سەرنجڕاکێشی لێیە. ساڵانە...

-روستکراوە و چەند جۆرە
-ریەکی جیاواز و چێشتاخانە و
-ۆتێلی لێیە. ساڵانە هەزاران
گەشتیار سەردانی دەکەن. ئەم
-ەوارگەیە نزیکەی ١٠٠ مۆتێل و
چێشتخانە و کۆمەڵێك یاری
سەرنەمیانە لە خۆدەگرێت. یەکێك
-ە یاریەکان یاری (شنگل بانە)یە
کە بۆ یەکەم جارە لە خۆر هەڵاتی
-وەراست دروست بکرێت.
-ەبەرنامەدایە کە لە ئایندە
-ەوارگەکە فراوان بکرێت و بە
-ەرزای و چیای باپشتیان
ببەسترێتەوە و خزمەتگوزاری
جۆراوجۆری نوێی بۆ
-روستبکرێت و بکرێتە پرۆژەیەکی
گەورەی گەشتیاری لە دەڤەرەکە.
ئەمە پرۆژەی کەرتی تایبەتە
کەهاوڵاتی شاری ڕواندز (حازم
کوردە) خاوەنیەتی .

## تەلەفریکی کۆڕەك و بێخاڵ

بە دووری ٢کم لە کانی بێخاڵ و ٣کم لە ڕواندز ، واتە لە نێوان بێخاڵ و ڕواندز، پرۆژەی دروستکردنی تەلەفریك لە نێوان لوتکەی چیای کۆڕەك و دەڤەری ڕواندز دروست دەکرێت. بۆ ئەوەی گەشتیاران بتوانن بە هۆی تەلەفریك بتوانن سەردانی سەر لوتکە چیای کۆڕەك بکەن و کاتێکی خۆش لەو میوانخانە و لە گازینۆکانی سەر لوتکەی کۆڕەك بەسەر بەرن کە لە گەڵ پرۆژەکە دروست دەکرێن. چیای کۆڕەك دیمەنێکی سەرنج ڕاکێشی هەیە و پلەی گەرما لە هاویندا زۆر نزمە کە ڕەنگە نەگاتە ٢٠پلەی سەدی و بەرزترین لوتکەیە لە دەوروبەی ڕواندز کە دەڕوانێتە سەر دەڤەری ڕواندز و سۆران و مێرگە سۆر و خەلیفان و دۆڵی ئاڵانە و دۆڵی مەلەکان و دۆڵی ئاکۆیان هەروەها بەشێك لە دەڤەری بارزان. لەسەر لوتکەی بەرزایەکە ڕوانگەی فەلەکی ئیراق دروست کراوە.





بە چیایی بەرز دەورەدراوە، بەرزترین لوتکەش چیای کۆڕەکە کە دەکەوێتە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی. لە بەشی ڕۆژهەڵاتی لوتکە شاخی پانك هەیە کە هەوارگەی گەشتیاری پانکی لەسەر دورستکراوە.

## هاوینگەی بێخاڵ

ئەم هاوینگەیە بەدووری ٤کم دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوای شارۆچکەی ڕواندز، بەدووری ١٠٣کم دەکەوێتە باکوری شاری هەولێر. بیخال ناوی گوندێکە سەر بە قەزای ڕواندزە لە پارێزگای هەولێر، لە نزیك گوندەکە لە نێوان دوو شاخی بەرز و لە دۆڵێکی ڕازاوەدا و لە قەد پاڵ و دامێنی چیاکەدا کانییەکی ئاوی بە خوڕ هەڵدەقولێت کە پێی دەڵێن کانی بێخاڵ، زۆری ئاوەکەو بەرزای شوێنی هەڵقوڵانی ئاو، وایکردوە ئاوەکە بە پرژە و پەرتوبڵاوی بڕژێتە خوارە و لە هەندێك شوێن شەلالی بچوك دروست بکات. ئاوەکە سازگار و پاکە و کە پەرت و بڵاو دەبێت و دێتە خوارەوە خۆی وەك بەفر سپی نیشان دەدات، ئەم دیمەنە ناوچەکەی بەجۆرێك ڕازاندۆتەوە کە مرۆڤ لە سەیرکردنی تێرنابێت، ڕەنگە دیمەنی سپی ئاوەکە وایکردبێ پێی بلێن بێخاڵ. بۆ بینین و بۆ گەشتیاری شوێنی پشودان و چێشتخانەو گازینۆی گەشتیاری لە دەورووبەری دروستکراوە و کراوەتە هاوینگە و بەردەوام گەشتیاران ڕووی تێدەکەن.

پلەی گەرما لە مانگی تەمووز لە بێخال دەگاتە ٣٢ پلە. بێخاڵ کەوتۆتە ناو دۆڵێك کە چواردەوری بەشی ڕۆژئاوا و باکوری بە لوتکە چیاکانی گەلی عەلی بەگ دەورە دراوە. ئەو ئاوەی هەڵدەقولێت لە کانی بێخاڵ زۆر بە خوڕو زۆرە، ئەمەش وایکردووە ڕووبارێکی ئاو لە خوارەوە دروست بکات. لە دەوروبەری دیمەنە جوانەکانی پرژەی ئاوی کانی بێخال زیاتر لە ٦ گازینۆ و چێشتخانەی لێ دروستکراوە، لە هەمان شوێن نزیکەی ٣٠ دوکانی لێدروستکراوە. هەریەك لەم گازینۆ و چێشتاخانەکان زیاتر لە ٣٠٠ گەشتیار لەخۆدەگرێت. کەواتە توانای هەیە لە یەککات زیاتر لە ٢هەزار گەشتیار لە خۆبگرێت.

## گەلی عەلی بەگ

تاڤگەی گەلی عەلی بەگ بە دووری 95 کم لەناوەندی شاری هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان دوورە و دەکەوێتە بەشی باکوری پارێزگای هەولێر، تاڤگەکە لە سەر رێگەی سەرەکی هاملتۆنە، واتە رێگەی سەرەکی و ستراتیژی هەولێر بۆ سۆران و بۆ حاجی ئۆمەران و لەوێشەوە بۆ ئێران بە ناو گەلی عەلی بەگ رەتدەبێت. گەلی عەلی بەگ دەڤەری سۆران و پایتەختی هەرێم بەیەکەوە دەبەستێتەوە، جگە لە گەشتیاران، بازرگان و میوانێکی زۆر بەم رێگە سەرەکیە هاتووچۆ دەکەن. گەلی بە درێژای زیاتر لە ١٠کم چەند شوێنێکی دیکەی گەشتیاری لەخۆ دەگرێت، هەروەها دەیان شوێنی تری گەشتیاری لە دوور ونزیکی گەلی هەیە، بەم هۆیە سالانە هەزاران گەشتیار لە شارەکانی کوردستان و خوارووی عێراق روو لە شوێنە گەشتیارییەکانی ئەم دەڤەرە دەکەن، بەتایبەت بۆ دیتنی تاڤگەی گەلی و دیمەنە سورشت جوانەکەی گەلی.

کاتێک لە هەولێر بۆ بەشی باکور رێگە دەگریە بەر تادەگەیتە گەلی عەلی بەگ، دەیان شوێنی گەشتیاری دەکەوێتە سەر رێگە، کە دەتوانی بۆ گەشتەکەت سوودیان لێوەربگری. هوتێلی خانزادی پێنج ئەستێرە بە دووری ١٨کم لە شوێنێکی بەرز دروستکراوەو دەکەوێتە سەر رێگەکە، چێشتخانەی تارینی پێنج ئەستێرە بە دووری ١٥کم لەسەر هەمان رێگەیە. قەلای خانزاد بە دووری ٢٢کم بەهەمان شێوە، پێچەکانی شارۆچکەی پیرمام - صلاحدین دەبڕی و دەگەیتە هاوینەهەواری سلاحەدین، دواتر گوندی کۆڕێ و سەیرانگەی شێرەسوار، دواتر هاوینەهەواری شەقلاوە، ئەنجا شارۆچکەی هەریر و خەلیفان و چەند گوندێك رەتدەبیت و دەگەیتە دەروازەی گەلی عەلی بەگ.

لە شارۆچکەی خەلیفان دەچیتەدەر و دەگەیتە دەروازەی گەلی، سەرەتای گەلی بە چیای بەرز دەست پێ دەکات، کە لە شێوەی پیتی V ئینگلیزی هەڵکەوتون، بە درێژای رێگەکە لە ناوگەلی بە چیای بەرز دەورەدراوە و رێگەگەکە دەروات، بە درێژای قەراغ رێگەکە رووبار دەروات. لە ناو گەلی چەند شوێنێکی گەشتیاری دروستکراون، لە کۆتای دار و درختی ناو گەلی، بە دەستە راست رێگای کۆنی گەلی کە هاملتۆنی ئەندازیار لە ساڵەکانی ١٩٢٨ بە دەست لە شاخی سەخت دروستی کردوە. لە دەستی چەپ بەسەر پردێك دەپەڕیتەوە کە لە ژێرەوەیدا





دوو رووبار تێكەڵ دەبن و دەچنەوە ناو زێی گەورە و بۆ بەنداوی بێخمە دەڕۆن، دواتر چاوت بە چیاو لوتكە و دیمەنی زۆر سەرنج ڕاكێش دەكەوێت، كە مرۆڤ لە سەیركردنیان هەرگیز تێر نابێت، من كە هەندێك جار لەیەك مانگ دووجار بەم ڕێگەیە دەڕۆم بەڵام لە سەیركردنی دیمەنكان هەرگیز تێر نابم. دواتر دەگەیتە پردی سێیەم و تاڤگە پەرت و بڵاوەكەی دووەمی گەلی لە نزیك كانی ماران ، ئەنجا ئاوە بە خورەكەی كانی ماران و چێشتخانە سادەكانی دەبینیت. گەشتكردن بە ناو گەلی و سروشتە جوان و ڕازاوەكەی فێنكی و خۆشیەكی زۆر بە دەروونی گەشتیاران دەبەخشێت، ئەمەش وایكردوە گەشتیارێكی زۆر ڕوو لەو شوێنە بكەن. دواتر دەگەیتە پردی چوارەم، بەر لەوەی بگەیتە پردی چوارەم لە دوورەوە لە سەر لوتكەی شاخ چاوت بە هەوارگەی پانكی گەشتیاری شارۆچكەی ڕواندوز دەكەوێت

جاران تاڤگەی گەلی ٥دیناری ئیراقی ڕازاندبووەوە، ئێستاش ٥هەزاری ئیراقی ڕازاندۆتەوە. وێنەكانی تاڤگەكە سەدان هوتێل و شوێنی گشتی پێرازاوەتەوە، وێنەی تاڤگەكە بۆ دەیان كارت و پۆستكار بەكارهاتووە، لە بەشێكی كتێبەكانی خوێندن بەرچاو دەكەوێت. لە هەندێك شوێن وێنەی تاڤگەكە كوردستانی پێ دەناسرێتەوە . ئەمەش وای كردوە لە وەرزی هاوین دەیان گەشتیار و گەشت بۆ ئەم هاوینگەیە بكەن وگەشتیاران لە ناو ئاوی گەلی مەلەوانی بكەن. كاتێك لەبەر تاڤگەكە ژمارەیەك گەشتیار خەریكی مەلەكردن و یاری كردن بوون لە ناو ئاو لەبەر دەم تاڤگەكە، بۆم دوان و سەر سامی بێئەندازەی خۆیان لە جوانی دیمەنە سورشتیەكان دەربڕی و گوتیان ئێمە ئەمرۆ لە خۆشترین ڕۆژی ژیان داین. بە هیوای ئەوەی ئێوەش بگەن بەم گەشتە.

## هاوینەهەواری جندیان

هاوینەهەواری جندیان بە دووری ١١٢ كم دەكەوێتە باكوری ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێر، هەروەها دەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی سۆران و ڕەواندز، ٧كم لە قەزای سۆران و ٥كم لە قەزای ڕەواندز دوورە. دەكەوێتە نزیك ڕێگەی سەرەكی هاملتۆن كە هەولێرو حاجی ئۆمەران بەیەكەوە دەبەستێتەوە. بە هۆی جوانی سروشتەكەی و كانییە



سیحریەکەی و ئاوە بەخوورەکەی و سێبەری دارەکانی لە وەرزی هاویندا هەزاران گەشتیار لە هەموو بەشەکانی ئێراق ڕووی تێدەکەن. لە وەرزەکانی تری سالیش بۆ ئاهەنگی بوك و زاواو خۆشی و کاتبەسەربردن هاوڵاتیانی ناوچەکە ڕووری تێدەکەن.

ناوی هاوینەهەواری جنديان لە ناوی جنۆکە وەرگیراوە، ئەو کانیەی لە ناو ئەشکەوتی هاوینەهەواری جنديان ئاوی لێهەڵدەقولێت، بۆتە سەرچاوەی ئاوێکی بەخوڕو سازگار لەم هاوینەهەوارە. کانیەکە هەندێك جار لە ناکاو لەپێش چاوی گەشتیاران وشك دەبێت و نامێنێت، ئەوەی دەمێنێتەوە تەنیا ئەشکەوتێکی قوڵی ترسناکە. هاتنەوە و گەڕانەوەی ئاوەکە هیچ کاتێکی دیاریکراوی نییە، بۆیە بۆی هەیە دوابکەوێت و بۆشی هەیە دوای کەمێك کە کاتژمێرێك ناخایەنێت بگەڕێتەوە و ببێتەوە ئاوە بەخوڕەکەی جاران. خەڵکی ناوچەکە بۆچوونیان وابووە کە جنۆکە ئاوەکەی بۆخۆیان دەگرنەوە و کاری تایبەتیان پێ ڕادەپەڕێنن، بۆیە پێیان گوتوە ئاویی جنۆکان یان ئاویی جنديان کە کۆی جنە، هەروەها لە ناوچەکە دیان(مەسیحی) زۆر بووە و ئێستاش ماون. ڕەنگە دیانەکان زۆر روویان لەم شوێنە کردبێت و کاتەکانیان لەوێ لە هاوینان بەسەر بردبێ، بۆیە پێیان گوتبێت جنۆکەی دیانەکان، کە کورتکراوەتەوە بۆ جنديان. هەندێك جاریش بە عەرەبی بەم کانیە دەگوترێك (کانی سیحری).
هەر لە ڕۆژهەڵاتی ئەم شوێنە بە ٣کم شوێنێکی تر بە ناوی جنێراوە هەیە. هەروەها کانیەکی بچوك هەیە، کە دەستی بخەیتە ناو لە شوێن خۆی وشك دەبێت.
هاوینەهەوارەکە کەوتۆتە قەدپاڵ و باوەشی دیوی باکۆری چیای سەربەرزی هەندرێن. شوێنی هاوینەهەوارەکە لە نیمچە قولایەك دایە کە چواردەوری ناوچەکە بە چیای بەرز دەورە دراوە. واتە لە بەشی باکوری زنجیرە چیای زۆزك و لە باشور زنجیرە چیای هەندرێن و کۆرەك درێژبۆتەوە. شوێنی هاوینەهەوارەکە وەك نیمچە گەلیەك وایە. لە لای خوارەوەشی ڕووبارێك هەیە کە لە چیاکانی ناوچەی باڵەك سەرچاوەی گرتوەو دەچێتەوە گەلی عەلی بەگ و دەرژێتە زێی گەورە. هاوینەهەواری جنديان بە دارودرختی بەرز داپۆشراوە و سێبەرێکی زۆری هەیە. لە ڕۆژهەڵاتی جونديان ناوچەی باڵەکایەتیە، ئەم ناوچەیە چەندان هاوینەهەواری وەك حاجی ئۆمەران و دۆڵی سەکران ...شوێنی گەشتیاری و لوتکە چیای بەرزی لێیە، کە لوتکە چیای هەڵگورد یەکێکە لە چیاکان و بەرزترین چیای کوردستان و ئێراقە.
لە کۆنەوە سەروچاوەی کانیەکە وەك جێگای میوانداری و دیواخانی هاوینە لە لایەن ئاغاکانی گوندی جنديان بەکار هێنراوە. بەلأم لە سەرەتایی حەفتاکان کەپرو گازینۆ بۆ گەشتیاران لێ دروستکراوە و پێشوازی لە گەشتیاران کردووە. هاوینەهەوارەکە ساڵ دوای ساڵ فراوان کراوە و نۆژەنکراوەتەوە و باشتر کراوە، لە سالی ٢٠٠٢ بەباشی نۆژەنکراوەتەوە، هەروەها لە سالی ٢٠٠٨ چێشتخانەو گازینۆی هاوینە بە ٣ نهۆم لەبەردەم سەروچاوی ئاوەکە بۆ دروستکراوە، لە ژێر دارەکان کەپری حەسیر و قرمیت و دار دروستکراون و جێگای ٢٠٠ خێزان دەبێتەوە، ڕەنگە زیاتر لە ٢هەزار گەشتبار جێگای ببێتەوە. ڕێگەوبانەکان و قادرمەکانی سەرکەوتن و دابەزین بە سەب و بەکاشی چاککراون ، هەروەها ژێرکەپرەکان بەشێکیان بە کاشی چاککراون، ئاورێژی ئاوی کانیەکە تاکوخوارەوە بە دیمەنێکی جوان لە بەرزای ٢م لە چەند شوێنێك





دەرژێتە خوارەوە. ساڵی ٢٠١٠ شوێنی مانەوە (١٣مۆتێل) ی گەشتیاری بۆ دروستکراوە. هەروەها لە نێوان رواندز و جندیان بە دووری ١کم لە جندیان، چیشتخانە و چەند مۆتێلێکی گەشتیاری دروست کراوە. کەواتە گەشتیاران دەتوانن شەوانە لەم هاوینەهەوارە کاتەکانیان بە سەر ببەن. رێگەی قرکراو تاکو ناو هاوینەهەوارەکە دەروات، گۆرەپانێکی فراوانی بۆ ئوتومبێل هەیە، لە دەم ئاورێژەکان چەند دوکانێک هەیە و پێداویستی گەشتیاران دەفرۆشن. چاوەروان دەکرێ ساڵانی داهاتوو ژمارەی مۆتێلەکان زیاتر ببێت. لە بەرامەبر هاوینەهەواری جندیان پارکی گوڵان دروستکراوە کە چەند جۆری یاری منداڵان و گەنجان لە خۆدەگرێت، پارکەکە بەداروگوڵ رازاوەتەوە و چەندان شوێنی خێزانی و کاتبەسەر بردنی هەیە. لەو کاتەی ئاوی جندیان وشک دەکات و ئاو نامێنێت. لە رێگەی پرۆژەیەک لە رووبارەکەی خوارەوەی جندیان ئاو بە هۆی چەند ماتۆرێکی کارەبای بۆ سەر لوتکەی شاخی سەر کانییە راکێشراوە و بە شێوەی ئاو پرژە دێتە خوارەوە دیمەنێکی جوان دروست دەکات.

## پارکی گوڵان

لە بەرامبەر هاوینەهەواری جندیان کە دەکاتە رۆژهەڵاتی شارۆچکەی سۆران، پارکی گوڵان لەسەر رووبەرێکی فراوان دروست کراوە، پارکەکە بە چەندان جۆر نەمام و دیمەنی سەرنج راکێش رازاوەتەوە. دەیان جۆر یاری منداڵان و گەنجانی لە خۆگرتووە، وەك چەرخ و فەلەك، یاری ئوتومبێل، فڕین، مقەس و جۆری تر. شوێنی پشودان و خواردن و خواردنەوە و چەندان خزمەتگوزاری بۆ دابین کراوە.

## هاوینگەی فەقیان و دۆڵی ئاکۆیان

هاوینگەی فەقیان بە دووری ١٢٠کم دەکەوێتە باکوری رۆژهەلاتی شاری هەولێر، ئەم هاوینگەیە دەکەوێتە ناو رەزوباخچەکانی گوندی فەقیان لە دۆڵی ئاکۆیان سەر بە قەزای رواندز لە پارێزگای هەولێر. شوێنەکە بە دار گوێز و دار چنار و





چەندان جۆری میوە داپۆشراوە، کانیاوی بە خوڕ و سازگاری لێیە، گەشتیار دەتوانێ لە ژێر سێبەری دارەکان و نزیك دەنگی ئاو پشوو بدات و کاتەکانی بەسەر بەرێ، لە هاویندا پلەی گەرما لەو دەڤەرە نزمتر لە شوێنەکانی دەوروبەری.
شارۆچکەی رواندز و سۆران لە گوندی فەقیان نزیکە، رواندز هەردەم مەدرەسەی ئاینی لێبوە و کۆمەڵێك فەقێ دەرسیان لێ خوێندوە. فەقێکان کە قوتابی بوونە، لە وەرزی هاوین گەشتیان بۆ فەقیان رێکخستوە و کاتەکانیان لە هەواری فەقیان بە خۆشی بەسەر بردوە، ئەمە وایکردوە شوێنەکە بە هەواری فەقێکان ناوببرێت و دواجار وشکە بسوێ و ببێت بە فەقیان.
بۆ گەیشتن بەم شوێنە گەشتیارییە، پێویستە گەشتیار لە شاری هەولێر بە رێگەی هاملتۆن روو لە شارۆچکەی رواندز بکات. لە شارۆچکەی رواندز روو لە رۆژهەڵات و دۆڵی ئاکۆیان بکات، ئەوسا دەگات بە شوێنی مەبەست. دەڤەری رواندز بە شێوەیەکی گشتی شاخاویە و چەند چیایەکی لوتکە بڵندی وەك کۆڕەك و زۆزك و هەندرێن دەوریان داوە، لە رۆژهەڵاتی رواندز دۆڵی ئاکۆیان درێژدەبێتەوە، دۆڵکە بە چیاو بەرزای دەورە دراوە، بە دووری ١٦کم لە رۆژهەڵاتی رواندز و لە دەستەراستی دۆڵکە بەرزایەك کەرت بووە و نیمچە دۆڵێکی تر دروست بووە، لە ناو پانتای دۆڵکە رەز و باخچەو دارودرختێکی زۆر هەیە و ناوچەکە سەوز داپۆشراوە. لە ناو بخچەکان گوندی فەقیان هەڵکەوتووە. لە رۆژهەڵاتی گوندەکە چیای زێرینۆك و لە رۆژئاوا گاولاوە و لە باشور قوپی جوانگا دەورەی ناوچەکەیان داوە و گوندی فەقیان و هەوارەکەی لە باوەشیان گرتووە. ئەم دیمەنە زۆر جوان و سەرنج راکێشە و مرۆڤ لە سەیرکردن و هەڵمژینی هەوا پاکەکەی تێر نابێ.

## شوێنانی گەشتیاری فەقیان

کاتێك لە رواندز روو لە دۆڵی ئاکۆیان دەکەیت، سەیرانگەی بێرۆیان بەدووری ٥کم لە رواندز دێتە سەر رێگەت، لە وەرزی بەهار هەزاران گەشتیار لە دەڤەری سۆران و رواندز روو لەم سەیرانگەیە دەکەن. دوای سەیرانگەی بێرۆیان دەگەیتە گوندی ئاکۆیان، لە گوندی ئاکۆیان دەردەچیت بەدەستی راست بۆ دۆڵی فەقیان رێگە

دەگریەبەر، نزیکەی ١کم ڕێگەی قیرکراو دەڕۆیت و دەگەیتە دیمەنی دەروازەی گەلی فەقیان، دەروازەی گەلی و ناو گەلی بە داری بەرزی سپیندار و گوێز و چنار داپۆشراوە، لە قەراغ ڕێگەکە و لە ناو گەلیەکە خوڕەی ئاو دێت. لە ناو گەلی و لە ژێر سێبەری دارەکان چەندان شوێنی پشودان و دانیشتن و سەیران بەشێوەیەکی زۆر سادە ئامادە کراون. شوێنەکان وایێدەچن لە سروشتی خۆی وادروست بووبێت، چونکە کەمترین دەسکاری کراوە. لە ناو گەلی و لە ژێر سێبەری دارەکان تاڤگەیەکی بچوکی ئاو بەبەرزی ٢م دەڕژێتە ناو نزمایەکە، ئاوی ئەم تاڤگەیە لە ئاوی کانیەکانی ناو باخچەکانی گوندی فەقیان سەرچاوەی گرتووە. چەند بە سەردەکەویت و لە گوندی فەقیان نزیك دەبیتەوە دیمەنەکان جوانتر دێنە پێش چاو. پێش کۆتایی گەلیەکە بە دەستی چەپ گازینۆیەك بە کەپر دروستکراوە. ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە هەزری گەشتوگوزاری و خزمەتگوزاری لە قۆناغی سەرەتایدان. بەلاّم چاوەڕوان دەکرێ بۆ ساڵانی داهاتوو گەشتیاران زیاتر ڕووی تێبکەن، چونکە شوێنەکە تاکو ئەمڕۆ نەناسراوە خزمەتگوزاری پێویستی بۆ نەکراوە. خاوەنی شوێنەکان پارەی دانیشتن لە گەشتیاران وەرناگرن و زۆر بە ڕێزەوە پێشوازیان لێ دەکەن. بەلاّم وەك عوسمان حەسەنی دانیشتوی گوندی فەقیان هیوای خواست کە ناوچەکەیان ببێتە شوێنی گەشتیاری و سوود بە دانیشتوانەکەی بگەیەنێت. عوسمانی تەمەن ٤٥ ساڵ پێی ڕاگەیاندین کە لە سەرووی گوند شوێنێك بە ناوی گۆڕ ئاکۆ هەیە و بۆ سەیران و گەشت زۆر لە بارە بەلاّم ڕێگەکەی ناخۆش و خۆڵە. کەواتە ناوچەکە گەشتیارییە بەلاّم پێوستی بە خزمەتگوزارییە.

## چیای حەسەن بەگ

چیای حەسەن بەگ بە دووری ١٥٢کم دەکەوێتە باکوری شاری هەولێر، چیایەکی سەرکەش و بەرزە، بەسەر ناوچەی سیدەکان و دۆڵی ڕوست و دەڤەری سۆران و مێرگەسۆر دەڕوانێت. صەدام چەند کۆشك و خانوێکی گەشتیاری بۆ خانەوادەکەیان لەو شوێنە دروست کردبوو، بەلاّم تێکدراون و نەماون، گەشتیاران دەتوانن بە ئۆتومبیل تا سەر ترۆپکی چیاکە بڕۆن بەتایبەت بۆ بینینی دیمەنە جوانەکانی دەوروبەری و بۆ سوود وەرگرتن لە نزمی پلەی گەرمی شوێنەکە، کە پلەی گەرمی لە ٢٨ پلە تێناپەڕێت. ترۆپکی سەر لوتکە چیاکە پانتایەکی فراوانە و کراوەتە فرکەخانەی کۆپتەر و زیاتر لە ٤ ئەلی کۆپتەر شوێنی دەبێتەوە، هەروەها لەلایەکی تر شوێنی ٨٠٠م هەیە، کەوات شوێنێکی زۆر لەبارە بۆ پرۆژەی گەشتوگوزاری،



بە هەمان شێوە لە دامێنی چیاکەدا شوێنی لەبار بۆ دروستکردنی چادرگە و گوندی گەشتیاری هەیە و چەند مێرگ وکانییاوێکی سازگاری لێیە و دەتوانرێ ڕێژەی سەوزای بۆ زۆر بکرێت و دیمەنی تەسکردی رازاوەی بۆ بسازێندرێ.



## بێرمێ دیندارا

گۆماوێکە بە دووری ٢٠٠کم نەکەوێتە باکوری شاری هەولێر. لە ناوچەی برادۆست لە باکوری شارۆچکەی سیدەکان هەڵکەوتووە. شوێنەکە کوێستانیە و زۆر بەرزە، لە مانگی تەمووز پلەی گەرما لە ٢٥ پلە تێناپەرێ. ژمارەیەکی زۆر مێرگی هەمیشە سەوز لە ناوچەکە هەیە، وەك مێرگە مێر، مێرگەپان. بۆ ئایندە شوێنێکی لەبارە بۆ پرۆژەی گەشتیاری.

## هێزی مرۆی و کادیری شارەزا

دەڤەری سۆران ناوچەیەکی فراوانە و دانیشتوانێکی زۆر لە ناوچەکە دەژین، لەمانە ژمارەیەکی زۆر گەنج هەیە، کەواتە هێزێکی ئامادەی کار بوونی هەیە. بەڵام ئەم هێزە پێویستی بەرێکخستن و هۆشیاری و ئامادەکردن هەیە. ئەم هێزە پێویستە لە لایان حکومەت و کەرتی تایبەت و رێکخراوی مەدەنی ئاراستە بکرێ، پێویستە هەلی کاری بۆ برەخسێندرێ و فێری بەکارخستنی هێزی بازوی بکرێ. گەشتوگوزار بوارێکی گرنگە بۆ بەکارخستنی هێزی مرۆی، بۆیە دەکرێ سوود لەو توانا مرۆییە وەربگیرێ کە لەو ناوچەیەدا هەیە. کەواتە ناوچەکە لەرووی هێزی مرۆی رەنگە کێشەی نەبێت، بەڵام کێشەی لە کادیر و کەسی پسپۆر و شارەزا هەیە، بە تایبەت لە کەرتی گەشتوگوزار، بۆیە پێویستە هەوڵبدرێ لە رێگەی خول و خوێندن و ناردنە دەرەوە کادیری پێویست بۆ کارگێری کاروباری گەشتیاری لە دەڤەرەکە دەستەبەر بکرێ. هەروەها پێویستە کار بۆ ئەوە بکرێ کە هۆشیاری گشتی لە بواری گەشتیاری لە ناوچەکە پەرەی پێ بدرێ، واتە بەشێوەی گشتی پێویستە هەموومان بە شێوەیەکی باش لەوە تێبگەین کە گەشتوگوزار یەکێکە لە سەرچاوەکانی داهات بۆ ناوچەکە، بۆیە دەبێت هەموومان بە دوای ئەوە بگەڕین کە چۆن پەرە بە بواری گەشتوگوزار بدەین وچۆن رێز لە گەشتیار بگرین و ناچاری بکەین بۆ ساڵی داهاتوو سەردانی ناوچەکە بکاتەوە و گەشتیاری زیاتر لە گەڵ خۆی بێنێ.نابێت چیتر وا تێبگەین گەشتیار ناوچەکە تێکدەدەن وپیس دەکەن، بۆیە پێویستە ئەم تێگەیشتنە بگۆڕین و گەشتیار وەك سەرچاوەی داهات سەیر بکرێ. هەروەها لە رێگەی گەشتیاران پەیامی ئاشتیخوازانەی دانیشتوانی کوردستان بە دنیا بگەیەنین.





## نەبوونی خزمەتگوزاری گەشتیاری لە دەڤەرەکە

ئەو بنەما و فاکتەرە گەشتیاریانەی کە لە دەڤەرەکە بوونیان هەیە و لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کردن زەمینەیەکی کونجاو بۆ پێشخستنی گەشتوگوزار دەرەخسێنن. ئەمەش وایکردووە کە هەندێك پرۆژەی سەرەتای و گرنگ لە دەڤەرەکە بکرێن و زیاتر بایەخی گەشتیاری دەڤەرەکە بەدەر بخەن، وەك پرۆژەی هەوارگەی پانکی گەشتیاری لە خودی رواندز، پارك و شاری یاری گولآن لە سۆران، مۆتێل و گازینۆکانی هاوینەهەواری جندیان، دروست کردنی چەند چێشتخانەیك لە دەڤەرەکە، نۆژەنکردنەوەی بەردەم تاڤگەی گەلی عەلی بەگ، پرۆژەی تەلەفریکی نێوان بێخال و رواندز و چیایی کۆرەك. بەلآم تەنیا ئەو بنەمایانە نابنە هۆی پێشخستنی گەشتوگوزار، بەڵکو بنەما و فاکتەری زۆرتر هەیە کە دەڤەرەکە بە گەشتیاری دەکات، کە ئەمانیش تەواوکاری بنەماکانی سەرەوەن کە ئاماژەمان بۆ کردن. لێرەدا هەندێك بنەما دەخەینە روو کە لە دەڤەرەکەدا بوونیان نییە:

**یەکەم- خزمەتگوزارییە بنەڕەتییەکان(ژێرخانی گەشتیاری):**

خزمەتگوزاریەکانی ژێرخانی ئابووری زۆر گرنگن(رێگەوبان، کارەبا، ئاویی خواردنەوە، شوێنی مانەوە، پەیوەندییەکان، تەندروستی). هەوڵدەدەین بەکورتی تیشك بخەین ە سەر هەندێکیان:

١- رێگەی هاتووچۆ- پێویستە شوێنە گەشتیارییەکان بە رێگەیەکی باشی قیرکراو بە رێگەی سەرەکی ناوچەکە ببەسترێنەوە، چونکە نابێ گەشتیار بە ترس و شلەژاویەوە رێگە ببڕێ و گەشت بکات. لە هەرێمی کوردستان تا ئەندازەیەك رێگە سەرەکییەکان بایەخیان پێدراوە و چاککراون، بەلآم ناوچە دوور و گەشتیاریەکان ئەم بایەخەیان پێ نەدراوە. دەکرێ لە ئایندە رێگەکانی ناوچە گەشتیاریەکانیش گرنگیان پێبدرێت و چاك بکرێن، بە تایبەتی ناوچە چیاییە گەشتیاری و سەرنجراکێشەکان، هەندێك شوێن لە دەڤەری رواندز ئەم کێشەیان هەیە، بۆ نموونە: رێگەی بێخال ، دۆلی ئاکۆیان، رێگەکانی باڵەکایەتی و سیدەکان...



٣- ئاوی خواردنەوە: ئاو یەکێکە ـو پێداویستییە سەرەکیانەی کە گەشتیار بۆ خواردنەوە و کارەکانی تر بەکاری دەبات. پێویستە شوێنە گەشتیارییەکان ئاوی خاوێنی خواردنەوەیان بۆ دابین بکرێ، چونکە رەنگە رووبارەکان جێگای متمانە نەبن بۆ گەشتیاران. جگە ـە پێویستە بە شێوەی ـەردەمیانە پرۆژەی ئاو بۆ شوێنەکان دابین بکرێت.

٤- سەرچاوەی رووناکی(کارەبا)- کارەبا بۆتە سەرچاوەی ـەکارخستنی دەیان ئامێر و رووناکی. ئەگەر گەشتیار لە کاتی مانەوەی لەو شوێنەدا، ئەم سەرچاوەی نەبێ، بێزاری و ـەکەتی لە جیاتی پشوو و خۆشی ـەشی دادەگرێ و گەشتەکەی ئەو ـەیە نابەخشێ. هەندێك لە شوێنە گەشتیاریەکانی رواندز کارەبای نیشتمانییان بۆ ـەرنراوە.

٥- بنکەی تەندروستی- لە بەر ـەر روودانێکی لە ناکاو یان تێکچوونی تەندروستی گەشتیاران، پێویستە شوێنە گەشتیارییەکان بنکەی تەندروستیان لێبێ یان لێیانەوە ـزیك بێ.

٦- Wc ی گشتی، واتە جگە ـەوەی کە گازینۆ و هوتێلەکان و شوێنی مانەوە ئەم پێداویستییەی پێویستە هەبێ، لە هەمان کات شوێنی گشتیش پێویستە ئەم پێداویستییەی هەبێ.

٧- نەبوونی شوێنی وەستانی ئوتومبێلی گەشتیاران بە شێوەیك کە لەگەل پێداویستی شوێنەکان گونجاو بێت.

**دووەم. خزمەتگوزاری و هۆشیاری (سەرخانی گەشتوگوزار):**

سەرخانی گەشتوگوزار پێکدێت لە بینایە و میوانخانە و چێشتخانە و مۆتێل و گازینۆ و یاریگا و شاری یاری و نووسینگەی هاتووچۆ و فرۆکەخانەی سەرەکی و فرۆکەخانەی بچوك لە شارە گەورە و بچوکەکان. شەمەندەفەری هاتووچۆ و پاکوخاوێنی و دەیان خزمەتگوزاری تر. هەرچەندە هەندێك لە خزمەتگوزاریەکان لە سەرەتای هەنگاودان و خەریکە دابین دەکرێن. بەلام ئەوەی بۆ ناوچەکە زۆر گرنگەو بوونی نییە ئەمانەی خوارەوەن:

١- شوێنی مانەوە و پشوودان(میوانخانە و مۆتێل)- لە پێناسەی گەشتوگوزاردا، گەشتیاری راستەقینە ئەو کەسەیە کە زیاتر لە ٢٤ کاژمێر لەو شوێنە دەمێنێتەوە. ئەگەر گەشتیار لەم کاتە کەمتر بمێنێتەوە، ئەوە ناتوانێ پارە لە خزمەتگوزاری خەرج بکات. کەواتە هەبوونی سەرخانی گەشتوگوزار (میوانخانە و مۆتێل و خێوەتگا و هەرشوێنێکی تری خزمەتگوزاری) پێویستیەکی زۆر گرنگی شوێنە گەشتیاریەکانن. یەکێك لە بنەما لاوازەکانی ناوچەکە ئەم خاڵەیە.

٢- نەبوونی سەوزای و دارودرختی دەستکرد: سەوزای و دارودرخت و باخچەی رازاوە ئەوهۆکارەن کە سەرنجی گەشتیاران رادەکێشن، بەلام بە داخەوە کە شوێنە گەشتیاریەکانی ناوچەکە گرنگیان بە دارچاندن و سەوزکردنی دەوروبەریان نەداوە. هەروەها ناوچەکەش بە گشتی ئەم لایەنەی بەهەند وەرنەگرتووە. کەواتە پێویست دەکات دەروازەکان و رێگاوبانەکان و شەقامەکان و دەوروبەری شاری رواندز و دەڤەری سۆران بەگشتی هەڵمەتی دار چاندن بەرپابکات و ناوچەکە سەوز بکات، چونکە هەرشوێنێك سەوز بێت، راستەخۆ سەرنجی گەشتیاران رادەکێشێت.

٣- جوانکاری شوێنە گەشتیارییەکان: ناوچەکە لە

ڕووی سروشتەوە بنەمای بەهێزی هەیە، بەڵام هەندێکیان پێویستی بە دەستکاری و دابینکردنی خزمەتگوزاری هەیە. شوێنەکان نەرازاونەتەوە کە سەرنجی گەشتیار رابکێشن. بۆ نموونە دەتواندرێ دەیان تاڤگە و رووبار و جۆگەی دەستکرد لەو شوێنانە دروست بکرێ کە ئاوی زۆرە و گونجاوە. یان دەیان تابلۆی هونەری کوردەواری لە هاوینەهەوارەکان لە شێوەی پەیکەر و هەڵکۆڵین و شێوەی دیکە دروست بکرێ. بەڵام بە داخەوە شوێنە گەشتیارییەکان لەسەر سروشتی خۆیان ماون و کەمترین دەسکاریان نەکراوە.

٤- مەلەوانگە و یاری ئاوی: ناوچەکە کانیا و رووباری زۆرە، بۆیە دەکرێ چەندان مەلەوانگەی داخراو کراوەی تایبەت دروست بکرێ. هەروەها دەکرێ رووبارەکان بەربەست و بەنداوی بچوکیان بۆ دروست بکرێ و شوێنی یاری و مەلەوانیان لە ناو دروست بکرێن. بەڵام ئەمانە بوونیان لە ناوچەکەدا نییە. رەنگە مەلەوانگە هەبێت، بەڵام وەك پێویستی ناوچەکە نەبێت.

٥- پاکوخاوێنی شوێنە گەشتیاریەکان. وەك پێویست نەتوانراوە گرنگی بە پاکوخاوێنی ئەو شوێنانە بدرێ کە گەشتیار رووی تێدەکەن و ناسراون.

٦- ڕێبەری گەشتیاری و نەخشە و کارتی ڕێگە نیشاندەر و کارتی دیاری کە وێنەی شوێنە گەشتیاریەکانی کوردستانی لە سەربێت (ئەمە زیاتر ئەرکی حکومەتە).

٧- چۆنیەتی پێشوازی گەشتیار و ڕێزگرتنی گەشتیاران و هەلرەخساندن بۆ پشوودان و مانەوە و کار ئاسانی لە ڕێبەریکردن و گەیشتن بەشوێنەکان، واتە کە رەنگە وەك پێویست مامەلە لە گەل گەشتیاران نەکرابێ.

٨- چاپ و چاپەمەنی (رۆژنامە و گۆڤار و پەرتووك و ڕێبەر)، بە شێوەی گشتی ئەمانە لە بواری گەشتوگوزاری رۆڵی تایبەتییان هەیە، بۆ گەشەسەندن و بەهێزکردنی بواری گەشتوگوزاری، بەڵام نەك لە دەڤەری سۆران بەڵکو لە کوردستان بوونیان زۆر کەمە.

٩- راگەیاندن و ریکلام : راگەیاندن بەهەموو جۆرەکانی دەتوانێ ڕێگە لەبەردەم گەشتیارانی ئاسان بکات و زۆرترین گەشتیار رابکێشێ(التسویق السیاحی). شوێنە گەشتیارییەکان کەمتر فێری

هونەری ریکلام بوونە.
ـیا تا چەند ئەم جۆرە
خرمەتگوزاریانە بۆ گەشتیاران
ـبینکراون، دەکرێ بگوترێ
ـهەندێ بوار نەکراوە و لە هەندێك
ـوار بەشێوەیەکی ناڕێك و لاواز
کراون. بۆیە زۆر پێویستە بۆ
ـێندەی گەشتوگوزار پلانێکی
ـراوان بۆ ناوچەکە هەبێت
بودجەیەکی باشی بۆ تەرخان
بکرێ، تاکو ناوچەکە بتوانێ
گەشتوگوزار بکات بە یەکێك لە
سەرچاوە گرنگەکانی داهاتی
ناوچەکە و کوردستانیش بە
گشتی.

## راسپاردە و پێشنیار

١- پێکهێنانی لیژنەیەك یان ئەنجوومەنێك بۆ لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی خاڵە لاواز و بەهێزەکانی بواری گەشتوگوزار و چۆنیەتی گەشەدان بە گەشتوگوزاری دەڤەرەکە، گرنگە لە کەسی پسپۆر پێك هاتبێت. لە دوای تەواوبوونی کارەکەیان راپۆرتی کۆتایی پێشکەش بکرێت و بخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە.

٢- ئەنجامدانی رووپێوێکی گشتی هەمەلایەن بۆ گشت ناوچەکە، بۆ ئەوەی شوێن و ناوچە شیاوەکانی گەشتیاری دەستنیشان بکرێن و جۆری گەشتوگوزاریەکەیان ئاماژە پێ بدرێت.

٣- بانگێشتکردنی کۆمپانیا ناوخۆ و بیانییەکان بۆ هاندانیان و زەمینەخۆشکردن بۆ دروستکردنی میوانخانە و مۆتێل و کۆمەڵگای گەشتیاری لە ناوچەکە، بە تایبەت ناوچە شیاوەکانی گەشتیاری.

٤- حکومەتی هەرێمی کوردستان ژمارەیەك پرۆژەی خزمەتگوزاری بۆ رێکخستنی ژێرخانی کەرتی گەشتوگوزار لە شوێنە گەشتیارییەکان ئەنجامبدات، وەك چاککردنی رێگەوبانەکان، دابینکردنی کارەبا، دابینکردنی بنکە و مەرجی تەندروستی و دابینکردنی ئاوی خواردنەوە و پاك، هەروەها لە کاتی پێویست ئوتێل و چێشتخانە لە جیاتی کەرتی تایبەت دروست بکات و بە کرێ پیان بدات، بۆ ئەوەی کەرتی تایبەت باوەڕو متمانەی لەلادا دروست ببێت.

٥- کردنەوەی بەنك و سلفەی تایبەت بە گەشتوگوزار و دابەشکردنی زەوی تایبەت بەسەر ئەوانەی دەیانەوێت لەم بارەوە پرۆژە لە شوێنە گەشتوگوزارییەکان بکەن.

٦- هاندانی ئەوانەی خواردن و کەرەستە و کەلوپەلی کوردەواری دروست دەکەن و پیشە میللییەکان بە شێوەی هونەری گەشە پێدەدەن و خواستی گەشتیاران تێر دەکەن. ئەمەش دوای دراسەکردن و زانینی خواستەکان ئەنجام بدرێت.

٧- زیادکردن و بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری گەشتوگوزاری بۆ هاوڵاتیان و ئەوانەی خزمەتگوزارییەکانی گەشتوگوزار پێشکەش بە گەشتیاران دەکەن، ئەمەش لە رێگەی راگەیاندن و خول و راهێنان دەبێ.

٨- پەرەدان بە خوێندنی ئەکادیمی گەشتوگوزاری لە ناوچەکە، بە تایبەت کردنەوەی پەیمانگای گەشتوگوزار لە دەڤەرەکە و بە لەبەرچاوگرتن و دامەزراندنی ئەوانەی ئەم بوارە تەواو دەکەن.

٩- گرنگیدان بە چاندنی دارودرەخت و دروستکردنی دارستانی دەسکرد و دروستکردنی باخچە و پارك و شاری یاری بۆ گشت تەمەنەکان، دروستکردنی بەنداو بۆ دروستکردنی دەریاچە و گۆمی قەبارە جیاواز لە سەر رووبارەکان.

١٠- دروستکردنی مەلەوانگەی کراوە و داخراو و رووبار و تاڤگەی دەستکرد و رازاوە و شوێنی یاری کردن لە هاوینگەو هاوینەهەوار و هەوارگەکان .

١١- بەستنەوەی چیا و دۆڵ و لووتەکەکان بە هۆی تەلەفریك و




پردی هەڵواسراو.

١٣- دابینکردنی هۆیەکانی گواستنەوە لە ڕێگەی کردنەوەی نووسینگەی تایبەت بەم بوارە، دابینکرنی هۆیەکانی پەیوەندی .

١٤- دابینکردنی سەرجەم بوارەکانی پێشوازی و چاوساغی(دەلیل) و ڕێنمایی لە ڕێگەی نووسراو بینراو لە سەر ڕێگە و دەروازەکان و لە میوانخانە و شوێنە گەشتیاریەکان.

١٥- دروستکردنی پەیکەرێکی گەورە بۆ پاشای گەورە لە شوێنێکی شیاوی ناوچەکە.

١٦- گرنگی دان بەشوێنەوارەکان و نوژەنکردنەوەی قەلاّ و شورە و قولەی سەردەمی پاشای گەورە.

١٧- کردنەوەی مۆزەخانەیەکی فراوان بۆ پاراستن و کۆکردنەوەی شوێنەوار و کەلتووری ناوچەکە. بەتایبەت کۆکردنەوەی ئەو کەرستە و کەلوپەلانەی لە سەردەمی پاشای واندز دروست کراون.

١٨- دروستکردنی نموونەی ئەشکەوتی شانەدەر و بەستوون لە پارکەکان و لە هاوینەهەوارەکان تاکو سەرنجی گەشتیاران رابکێشین، ئەمە جگە لەوەی شوێنە گەشتیارییەکان بە کەلتوور و کەلوپەلی دەستکردی کوردەواری برازێندرێنەوە.

لە کۆتایدا دەڵێم گرنگی دان بە گەشتوگوزار تەنیا ئەرکی بەڕێوەبەرایەتیەکی گەشتوگوزار نییە، بەڵکو پێویستە سەرجەم دامودەزگاکانی سنووری سۆران بەشداری لەم پرۆژەیە بکەن، وەك: هێزی پۆلیس و ئاسایش، شارەوانی، کارەبا، ڕێگاوبان، تەندروستی، ژینگە، پیشەسازی، ڕاگەیاندنەکان و سەرجەم بەڕێوەبەرایەتی و دەزگاکانی تر.

***تێبینی : ئەم بابەتە بۆ کۆنفرەنسی گەشتوگوزار لە ٢٠١٠/١٠/٣ لە شاری رواندز ئامادە کرابوو، لەبەر چەند هۆیەکی تایبەت پێشکەش نەکرا، دواتر پەرە بەتوێژنەوەکە دراو چەند برگەیەکی بۆ زیاد کرا، بۆ ئەوەی دانیشتوانی دەڤەری سۆران لە بابەتەکە بێبەش نەبن و یەکە ئیداریەکانی ناوچەکە لە بیرۆکە و پێشنیارەکانی سوودمەند بن، پێمان باش بوو لێرەدا بڵاوی بکەینەوە.***



## پرۆفایل

نادر روستایی ناسراو بە نادر روستی لە گوندی روست سەر بەشارۆچکەی چۆمان لە دایك بووە.

خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە شارۆچکەی هەریر تەواو کردووە

پەیمانگەی مەڵبەندی مامۆستایینی لە ١٩٩٥ تواو کردووە

کۆلیژی ئاداب بەشی کۆمەڵناسی لە ساڵی ٢٠٠٦ تەواو کردوە

زیاتر لە ٥٠٠ بابەتی لە رۆژنامە و گۆفارەکانی کوردستان بلاّو کردۆتەوە

بەرێوەبەری نووسین بووە لە رۆژنامەی را لە زانکۆی سلاحەددین

٦ ساڵە بەرپرسی لاپەڕەی گەشتوگوزارە لە رۆژنامەی خەبات

سەرنووسەری گۆڤاری دنیای گەشتوگوزار ە

٤ کتێبی بە چاپ گەیاندوە، یەکێکیان تایبەتە بە گەشتوگوزار بە ناوی (گەشتوگوزار نەوتی ئایندەی کوردستانە)

2نامیلکەی لە بارەی گەشتوگوزار ئامادەیە بۆ چاپ

پرۆژەی رێبەرێکی زانیاری گەشتیاری بە ناوی (گەشتێك بۆ گەشتوگوزار)لە ژێر دەستدایە

ئێستا بەرێوەبەری ئامارو توێژینەوەیە لە وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوەکان

## گەورە مرۆیەکی کورد

# ئەحمەد شاڵی: نەتەوەپەروەر، شاعیر و وەرگێڕ

**ئامادەکردنی: K21**



هەرچەند مێژووی رەوشتی نەتەوەیی، کۆمەڵایەتی، سیاسی و کلتووریی گەلی کوردستان، هەر لە سەرەتاوە بەمرۆ دەگات، زێدە ئاڵۆز و دژوار و دواکەوتوو بووە. لەوەش زیاتر ئەوە سەدان ساڵە ژێردەستی داگیرکەرانی کوردستان، واتا بە لای کەمی، لە شەڕی چاڵدێرانەوە، نەتەوەی کورد لەناو دۆزەخی دواکەوتنی کۆمەڵایەتی و بەردەستی داگیرکەرە شۆڤینی و رەگەزپەرستەکانی عەرەب، تورك و فارس دەناڵێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا، بە پێچەوانەی ئەومێژووە پڕ کارەساتە لە هەر قۆناغ و بەشێکی کوردستانی ژێردەستدا، ژمارەیەك رۆڵەی دڵسۆز و بەتوانا، گیان بەخشان، رێگەی خەباتی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئازادیی نەتەوەیی، رێگەی پڕ ئێش و ئازار و قوربانی دەوری بەرچاویان گێڕاوە. جا هەر یەکێ لەو مرۆڤە نموونەییانە لە هەر بوارێکی ژیان بووبێت، بەتایبەتی لە سەردەمە تاریك و تۆقێنەرەکاندا، دەوری جوامێرانەی گێڕاوە، بێگومان بە پێی رەوشتی هەر دژواریی کۆمەڵی کوردەواری لەچاو میللەتانی سەربەخۆ و پێشکەوتوو، ئەوە نموونەی ئەو جۆرە مرۆیانە زۆرن، بەڵام بەداخەوە، زۆربەشیان(لەبەر هەر فاکتەرێك) ؟؟؟ کە لە دەرەوەی ویستی خودی کورد بووبێت، فەرامۆش کراون، ئەوەندە باسیان ناکرێت، بەتایبەتی نەوەی نوێ زۆر بێئاگان. بۆیە پێویستە لە بەرنامەیەکی فراوانی سەرتاسەری کلتووری – نەتەوەیی، زانستیانە باسییان بکرێ، بخرێنە پرۆگرامی قۆناغەکانی خوێندن و دەزگاکانی لێکۆڵینەوەی مێژوویی – شارستانی ...هتد.

یەکێ لەو گەورە مرۆڤانەی کۆچی کردووە، پارێزەر "ئەحمەد شاڵی"یە کە لە هەرەتی لاوییەوە بە رێگای قەڵەمەکەیەوە هاتە مەیدانی نیشتمانپەروەرییەوە. بەڵێ ئەحمەد شاڵی وەکو نیشتمانپەروەرێکی دیار و شاعیرێکی هەستناسك و وەرگێڕێکی کارامە، زۆر کەم باسی کراوە. جا ئێمە لەبەر رۆشنایی پەیامی گۆڤاری K21 بە پێویستمان زانی لەم ژمارەیەدا قەرزێکی بچووکی ئەم مرۆڤە کوردپەروەرە بدەینەوە. بە کورتی ئەم بابەتە ئامادە بکەین، پێشکەشی بە خوێنەرانی K21 بە شانازییەوە، بکەین. ئومێد دەکەین مایەی رەزامەندی هەموو لایەك بێت.

لەگەڵ چەپکێ گوڵی رەنگین بۆ گیانی شادوڕەوان جەنابی ئەحمەد شاڵی.

## بەرهەمەکانی : ئەحمەد شاڵی

ژمارەیەك نووسین و وەرگێڕان لە گۆڤاری گەلاوێژ بڵاو کردۆتەوە:

١- گۆڤاری گەلاوێژ - ژمارە ٢ - سالی دووەم - شوباتی١٩٤٨

* چیرۆکی ئەم مانگە:

کارەساتی دەریان - نووسەری ئیسپانی بلاسکوا بانیز - گەلاوێژ ژمارە٣ - ٩ی مارتی ساڵی١٩٤٨

* چیرۆکی ئەم مانگە:

دڵداری بەهێزترە - بە کورتی لە گۆڤاری "الهلال"ەوە.

* گەلاوێژ ژمارە ١١- ٩ی تشرینی دووەمی ١٩٤٨

بیرکردنەوەیەك

* گەلاوێژ ژمارە ١ - ١٠ی کانوونی دووەمی ١٩٤٩

دڵی پیاوێکی ئازاد - شاعیری بەناوبانگی رووسی لێرمە فتوف

* گەلاوێژ ژمارە ٢ - ١٠ی شوباتی ١٩٤٩

بێ...

* گەلاوێژ ژمارە ٣ - ١٠ی مارتی ١٩٤٩

* گەلاوێژ ژمارە ٣ - ١٠ی مارتی ١٩٤٩

ئەزیز دوراوبك!

* گەلاوێژ ژمارە ٤ - ١٠ی نیسانی ١٩٤٩

ڕێگای دڵداری و ژیان - شاژنی شاعیری فەرەنسا بول فور

* گەلاوێژ ژمارە ٨ - ١٠ی ئابی ١٩٤٩

چیرۆکی مانگانە:

بە کورتی:

گێژەڵووکە: نووسەری هەرە بەناوبانگی فەرەنسی "ئەندرێ سورییە" ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسا.

لەگەڵ دیوانێکی دەستخەت، هێشتا بڵاو نەکراوەتەوە.

دوا بەرهەمی کە پاش کۆچی خۆی ژنە بەوەفاکەی نەسرین خان چوارینەکانی "خەیام"ە بە چاپ گەیاندووە.

ئەوەی شایانی باسە، مامۆستا تاها بابان، پێشەکییەکی پوخت و باشی نووسیوە، پێمان باش بوو دەقەکەی وەکو خۆی بڵاو بکەینەوە. هاوکات چەند چوارینەش لە تەکی بخەینە بەرچاوان، وەك نموونەیەکی زیندوو لەمەڕ کارامەیی وەگێڕانەکە. هەروەها چەند پارچە و کۆپلەیەك لە شێعرەکانی کە بۆ یەکەم جارە بڵاو دەکرێنەوە، پێشکەش بە خوێنەران دەکەین:

## ناوی کتێب: چوارینەکانی خەیام

### پێناسین

خەیام کێیە؟

ناوی تەواوی "ابوالفتح عمر کوڕی الخیام"ە. لە شاری نیشابور لە دەوروبەری ساڵی٤١٣ی کۆچیدا لە خێزانێکی پایەدار لە زانین و ئاشنا بە وێژە هاتۆتە دنیاوە و لە هەمان شاریشدا لە ساڵی٥٠٩ یان ٥١٧ و هەندێکیش دەڵێن ٥٢٧ی کۆچی مردووە بەم مێژووەی دوایدا ئەبێ خەیام ١١٤ساڵ ژیابێت.

خەیام لە کاتی خۆیدا کەمتر بە شاعیر ناسراوە. ئەوەی کە ناوبانگی پێدەرکردبوو پزیشکی و ماتماتیك و ئەستێرەناسی و حیکمەت بووە، کە شانزە کتێبی تیا داناون لە هەموویان گرنگتر کتێبی "جەبر و بەراورد" و لە پەخسانیشدا "نەورۆزنامە"یە.

کاتێك خەیام ناوبانگی دەرکرد وەك شاعیرێك کە چوارینەکانیان وەرگێڕایە سەر هەندێك زمانی بێگانە، ئەو چوارینانە ئەمەندە کاریگەر بوون کە ئێستا کەم زمان هەیە لە جیهاندا ئەو چوارینانەی بۆ وەرنەگێڕابێ. سەرژمێرێك لەم رووەوە دەریخستووە کە زیاتر لە ٨٠٠جار وەرگێڕاوە و نزیکەی سەد ملیۆن نوسخەی بڵاوکراوەتەوە ئەمە وای کردووە کە ئەمڕۆ هەموو کەسێك بتوانێت بە زمانی خۆی لە خەیام بگات و ببێ بە ناسراوترین شاعیری فارسی لە جیهاندا.

لە چوارینەکاندا خەیام بیر و باوەڕی فەلسەفیی خۆی تیا دەرئەخات کە بریتیە لە سەرسوڕمانی ئەو کەسانەی کە بیر لە نهێنیی دروستبوون ئەکەنەوە، ناڕەزایی دەردەبڕن لە چارەنووسی ڕەش و نەزانراوی مرۆڤ و کۆتایی ژیان و کلۆلیەکانی ئەو زیندووبوونەوەیەی خستوتە لاوە و ئەمان بە بەڵایەکی گەورە ئەزانێت و بۆیە هەوڵ ئەدات کە هەتا بتوانێت خۆشی لە ژیان وەربگرێت.

سەدان چوارینە هەیە بە ناوی خەیامەوە بەڵام شارەزاکانی شیعری خەیام هەندێکیان تەنیا ٦٦ و هێندێکی ترینا ١٧٨ لەو چوارینانە بە شیعری ئەو دەزانن و ئەوانی تر بە شیعری شاعیرانی تر دادەنێن، ئیتر لە نەشارەزاییەوە بووبێت یان بە ئەنقەست، بۆ هەر مەبەستێك بووبێت، داویانەتە پاڵ خەیام.




### خەیام بە کوردی

لە کاتێکدا لە ساڵی١٨٥٩دا شاعیری ئینگلیزی "ئەدوارد جیرالد" خەیامی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی خۆیان، ئێمەی دراوسێی فارس و ئاشنا بە شیعری فارس، یەکەمجار لە ساڵی١٩٥١دا شیعری خەیاممان وەگێڕاوەتە سەر کوردی واتە دوای ئەوان بە نزیکەی سەد ساڵێك ئەویش لەسەر دەستی "سەلام"ی شاعیرماندا بووە. ئەو دواکەوتنەمان بەلای منەوە ئەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆ: یەکەمیان ئاشنا نەبوونمانە بە وەگێڕانی شیعری هیچ شاعیرێکی‌تر، دووەمیان ئەگەر شاعیرە کۆنەکانیشمان زانیبێتیان کە شتێکی واش هەیە لەبەر ئەوەی زۆربەیان پیاوی ئایین بوون هەرگیز حەزیان نەکردووە گوێی کورد بە شیعری خەیام بزرینگێتەوە.

"سەلام" ئەگەر یەکەم شاعیرمان بووبێت کە چوارینەکانی خەیامی بۆ کەربین بە کوردی، تەنیا سوارچاکی ئەم مەیدانە نییە. لەو کاتەوە تا ئێستا ژمارەیەکی تریش لە شاعیرەکانمان ئەم کارەیان ئەنجام داوە، لەوانە: بێخود، گۆران، هەژاری موکریانی، شێخ مستەفا، شێخ سەلام، دکتۆر محەمەد نووری عارفیش مامۆستای ئەدەب و زمانی فارسی لە دانیشگای سلێمانی دیسان پرۆژەی گۆڕینی بەدەستەوەیە. هەروەها ئەم بەرهەمەی لەبەردەستاندایە لەلایەن خوالێخۆشبوو "ئەحمەد شالی"یەوە کراوە.

## وەرگێڕان چییە؟

وەرگێڕان وەك هەموو كارێكی تر پێویستی بە بەهرە هەیە، شارەزایی لە هەر دوو زمانەكەدا مەرج نییە بۆ سەركەوتن تیایدا، بەڵكو ئەبێت وەرگێڕ خاوەنی زەوقێكی ناسك بێت كە جوانترین و ورشەدارترین وشە و رستە بەكار بهێنێت كە پڕ بە پێستی وەگێڕاوەكە بێت، بە رادەیەك هەست بكرێت ئەو كارە وێژەییە لە بنەڕەتدا بەو زمانە خۆماڵییە نووسراوە و بە پێنووسی یەكێكیشە كە لە هەڵبژاردنی وشە و دركاندنی هەستدا دەستێكی باڵا و لێهاتووییەكی تایبەتی هەیە.

شێعر چونكە هەر بریتی نییە لە دانانی رستە و وەزن و قافیەیەكی تایبەت بەڵكو ئەبێت سۆزیشی تیابێت.

ئەبینی هێندێك وەگێڕ هەر لە شێعرەكانی خەیامیشدا زۆر بە وردی ماناكەی داوە بەدەستەوە بەڵام هەتا بڵێیت وشك و سارد و سڕ و دەستەوسانە لە بزواندنی هەست و بزواندنی خوێندەواردا بە پێچەوانە هێندێكی تریان هەیە بڵێیت وەرگێڕانەكەی گەرم و گوڕ و رەوانە بەڵام بۆ ئەوەی بتوانێ ئەوە بەدەستەوە بدات، زۆر لە بیری شاعیرەكە و مانای شێعرەكە دوور كەوتۆتەوە، جا وەرگێڕی سەركەوتوو لێرەدا ئەویە بتوانێ لە بەرگێكی رەسەنی قەشەنگی خۆماڵیدا وەگێڕاوەكە بدات بەدەستەوە و لە هەمان كاتیشدا پارێزگاریی تەواوی مەبەستی دانەریش بكات. وەك ئەم وەرگێڕەمان كردوویەتی، بۆ سەلماندنی راستیی ئەم بۆچوونەم با نموونەیەك لە چوارینەكان وەگرین و شی بكەینەوە. جا با لەپێشدا دەقی فارسییەكەی بنووسین لە چوارینەكەی خەیامدا بە زمانی خۆی ئەڵێت:

*شیخی به زنی فاحشه گفت مستی*

*هر لحظه بدام دگری پا بستی*

*گفت شیخا تو چنانکه گویی هستم*

*اما تو چنانکه می‌نمایی هستی*

ئێستاش وا كوتموت بە پەخشان ئەیكەمە كوردی:

"شێخێكی تەریقەت بە ئافرەتێكی داوێنپیسی وت تۆ سەرخۆشی، هەر ساتێ پێت بە داوی پیاوێكەوەیە. ئافرەتەكەش وتی شێخ تۆ چۆن ئەڵێیت من وام بەڵام تۆ وەك دێتە بەرچاو ئەوەیت؟"

باشە با بزانین وەرگێڕ ئەم چوارینەی چۆن كردووە بە كوردی:

*شێخێ بە ژنێكی ئەوت سەرخۆشی*

*ئەم باخەڵ ئەكەی لەسەر ئەو كۆشی*

*وتی من وەهام بەڵام توخوا تۆ*

*راستە ئەو بەرگە كە بۆ خوا ئەیپۆشی*

وابزانم پێویست ناكات كە بڵێم مەعنای دەق و گۆڕینەكەی بە گشتی یەك شتە، لە هەردووكیاندا شێخێكی تەریقەت سەرزەنشتی ئافرەتێك ئەكات لەسەر سەرخۆشی و بوونی هەرساتەی لەگەڵ پیاوێكدا، ژنەش ئەڵێت شێخم تۆ چیم پێ‌ئەڵێیت وام بەڵام ئایا تۆ بە رواڵەت خۆت بە داوێنپاك و لەخواترس ئەدەیتە روو لە ژێریشەوە وایت؟ یان چاوبەست لە خەڵكی ئەكەیت؟ بەڵام وەرن با سەرنجێكی هێندێك وشە و رستە بدەین بزانین لە فارسیەكەیدا چۆن هاتووە و ئەم چۆنی گۆڕیوە. لە فارسیەكەیدا ئەڵێت هەر سات بە دوای پیاوێكەوە قاچت گیراوە، ئەگەر وای بگۆڕایە ئەوا گۆڕینێكی وشە بە وشە بوو(حرفی) بەڵام ئەم هەمان مەعنای داوە بەدەستەوە بەڵام وەك كوردێك بیڵێت: "ئەم باخەڵ ئەكەیت لەسەر ئەو كۆشی". بڕوانە ئەو وشە كوردیە رەسەنە رەوانە دیسان چونكە شێخەكە هی تەریقەتە لەباتی ئەوەی وەك فارسیەكە بڵێت تۆ چۆن دێتە بەرچاو ئاوایت، ئەڵێت: راستە تۆ ئەو بەرگە بۆ خوا ئەپۆشی؟ واتا تۆ بۆ ریا و دەستبڕین ئەیپۆشی لە راستیشدا وایت؟ واتا هەر وەك فارسیەكەی ئەڵێت تۆ وانیت وەك دێتە بەرچاو، بەڵام بە زاراوەیەكی كوردیی رەسەن ئەم ئەو مەعنایەی داوە بەدەستەوە. هەر وەك

نەڵێن: مشتێك نموونەی خەروارێكە. لەبەر ئەوەی ئەم شكڵە كوردییە رەسەنە، ئەم پارێزگاری تەواوی مانایە، لە هەموو چوارینەكانی تریشدا بەرچاوتان ئەكەوێت بە پێویستمان ئەزانی هیچی تر نموونە بێنینەوە.

## ئەی وەرگێڕ كێیە ؟

لە هەمووان زیاتر وابزانم وەرگێڕ پێویستی بە پێناسین هەیە، چونكە ئەگەر وەك نووسەرێك بەلای ئەوەی پێشوومانەوە ناسراو بێت، من دڵنیام كە ژمارەیەكی زۆر كەم لە خوێندەوارانی ئەم سەردەمەمان ئەیناسن. تەنانەت كە لە هاوینی ساڵی١٩٦٦دا بۆ یەكەمجار خۆی ئەم شێعرانەی بۆ خوێندمەوە زۆر بەلامەوە سەیر بوو بۆ یەكێك كە رابردوویەكی نەبێت لە نووسین و شێعردا ئاوا بتوانێت بەم سەركەوتووییە كارێكی وا وێژەیی ئەنجام بدات. دوای چەند ساڵێك بۆ چەند نووسەر و شاعیرێكی خوێندەوە، هەر چەندە هەندێكیان لە نەوەی پێشوو بوون كەچی بەیادیاندا نەدەهات كە نووسینێكی وەگێڕیان بەرچاو كەوتبێت. ئەمە وای كرد كە بە پێویستی بزانم شتێك دەربارەی وەرگێڕ بدوێم تا بۆ خوێندەواران دەركەوێت كە بەر لەوەی وەرگێڕ بەم كارە وێژەییە هەڵسێت رابردوویەكی زۆری بووە لە دنیای نووسینی شێعردا.

لە دوا تەموزی ساڵی١٩٧٧ مامۆستا سەباح غالب لە بارەگای یەكێتیی نووسەرانی كورد لە سلێمانی وتارێكی خوێندەوە بە ناوی "رۆڵی گەلاوێژ لە پێشخستن و گەشەكردنی زمان و ئەدەبیاتی كوردیدا" كە هاتە سەر بەشی پەخشان لە وتارەكەیدا ووتی: "... بەڵام لە سەردەمی گەلاوێژدا، پەخشان بۆ پێشەوە هەنگاوی نا و بە گیانێكی هەست بە لێپرسینەوە و ورەیەكی بەرزەوە لە خزمەتدا بوو. دیارترین پەخشاننووسی هونەری سەر لاپەرەكانی گۆڤاری گەلاوێژ، "رەفیق چالاك"، "ع.جەوهەر"، "دڵشاد رەسووڵ"، "ئیبراهیمی نادری" و "ئەحمەد شاڵی" بوون." لە كۆتایی وتارەكە زیاتر دەربارەی ئەحمەد شاڵی دەدوێت و ئەڵێ: "ئەحمەد شاڵی یەكێكە لەو پەخشاننووسە گەورانە كە لاپەرەكانی گەلاوێژیان رازانبۆوە و ئەمیش لە زمان و لە نووسیندا لە هاوەڵەكانی كەمتر نییە، بۆ نموونە نووسینی شاڵی پارچەیەك لە پەخشانی "دەك شەرمەزار بیت" بڵاو دەكەینەوە كە لە ناڵەی گەنجێكی دڵدار بە دەست ئافرەتێكەوە دەدوێت، بێوەفایی ئەو بێگیان و بێهەستە دەخاتە روو بەڵام دوای چی؟ دوای ئەوەی هەتا دەمێنیت هەر بە برینداری ژیان دەباتەسەر، ئای كە تاوانێكی گەورە و ئازارێكی هەمیشە تازە و بەسوێیە ئەو جۆرە پێكانە؟ دەك شەرمەزار بیت وەك شەرمەزاری، بەڵام هەر خۆت نا منیش لەگەڵتا، زۆر شەوان بە داخی داختەوە شەوم كردەوە، لەناو فرمێسكی خوێنینی چاوما خەفەتم بۆ تۆ خوارد كە خەفەتباری، بۆچی لە ئەوەڵ رۆژدا دەرت نەكردم؟ بۆچ بەمرۆژەت گەیاندم؟ بۆچ...؟ بۆچ...؟ ئای كاشكی هەر ئەم دیتایە، بۆ خۆم وەك پەپوولەیەكی بێباك وا بووم لەم گوڵ شەونمەكەیم ئەمژی كە تێر ئەبووم ئەڕۆیشتم بەو گوڵەوە ئەنیشتمەوە... بەڵام ئەویان لەویان بەهرەدارتر نەبوو... لەم بۆ ئەو تا گەیشتمە تۆ، تۆ فێرت كردم بەڵام دڵداری نا، ملی رێی مردن گرتن بە دەستی خۆ، خۆكوشتن."

ئەوەی لە وتارەكەی مامۆستا سەباح سەرنجڕاكێشە ئەوەیە كە بە هیچ شێوەیەك ناوی ئەحمەد شاڵی نەبردووە كە لە گەلاوێژدا شێعری بڵاو كردبێتەوە، وابزانم هۆكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە شێعرەكانی بە ناوی ئاشكرای خۆیەوە بڵاو نەئەكردەوە، بەڵكو زۆر جار نازناوی "ا.ش"ی دائەنا. هەر چۆنێك بێت بۆ ئەوەی پلەی شاعیری و شارەزای لە هونەری شێعردا بەلای خوێندەوارانەوە بزانرێ وا چەند كۆپلەیەك لە شێعرەكانی ئەخەینە روو كە لە ساڵی١٩٧١دا لە

ڕۆژنامەی ژیندا بڵاوکراوەتەوە، لە پارچە شیعرێکدا کە لە ژێر ناوی "ئەسمەر" دایە ئەڵێ:

***ئەسمەر، ئەسمەر گیسو عەنبەر***
***چاو مامزەی باڵا عەرعەر***
***هەی خوای جوانی بە فیز و فەڕ***
***حەبەشزادەی، بێچووە بەربەر***
***تۆ یارمی هەر تۆی تاسەر***
***تاقە دولبەر***
***تاجەکەی سەر***
***بەندی جگەر***
***لەحەد بەدەر***
***بەناز پەروەر***
***هەی جادووگەر***
***لە هەر پێچ و پەنای گیانتا***
***زۆر شاراوە زۆر پەنەانتا***
***لەشی رەشی بێئێسقانتا***
***هەڵچووی گەرمی وەك بورکانتا***
***هەزارەها شتی بەخرۆش***
***گشت ئارەزووم دێنێتە جۆش***
***ئەمکا سەرخۆش***
***بۆنێکی خۆش***
***خۆشتر لە گوڵ***
***عەتر، سمڵ***
***لە بۆنی مەی***
***لە بۆنی بەی***
***بۆی ئەو لەشە***
***رەشە گەشە***
***وەك وەنەوشە***
***ئای کە خۆشە...***

لە چەند دێڕێ پێشینی شیعرێکی تردا ئەڵێت:

***خۆشت ئەوێم گیانە***
***هەروەك ووتت برایانە***
***چۆنە ماچی خوشك و برا***
***ئاخۆ گیانە تامی چی با***
***دوێنێ خوشکم ماچی کردم***
***ئەزانی شەقی پێبردم... هەتا دوایی***

ئەحمەد شاڵی وەك شاعیرێك شارەزای تەواوی لە هونەری شیعردا بووە. ئەگینا هەرگیز چاوەڕوان ناکرێت یەکێکی دوورەپەرێز لە دنیای شیعر، ئاوا بتوانێت لە پڕێك بێئەوەی بچووکترین لەنگی یان تەنانەت نارەوانی لە شیعرەکانی‌دا هەبێت، شیعر بگۆڕێت بە شیعر وەك لە گۆڕینی ئەم چوارینانەدا بەدی ئەکرێت.

ئەحمەد شاڵی کوڕی حاجی فەقێ حاجی محەمەدی شاڵیە لە گەڕەکی سەرشەقامی شاری سلێمانی ساڵی ١٩٢٤ لەدایك بووە. وەك زۆربەی منداڵانی ئەو سەردەمە نێرراوەتە حوجرە و قورئانی خەتم کردووە و کتێبی گوڵستان و بۆستانی سەعدی و خواجە حافزی شیرازی بە فارسی خوێندووە. خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی "خالدیە" بووە و ناوەندیشی هەر لە سلێمانی بووە، بەڵام ئامادەیی لە بەغداد لە زانکۆی ئەمەریکان تەواو کردووە دوا پلەی خوێندنی لێسانس بووە لە یاسادا کە لە کۆلێجی حقوق لە بەغداد وەریگرتووە. هەموو ژیانی فەرمانبەری لە ئیدارەدا بەسەر بردووە، مدیر ناحیە، قائیمقام، هەتا گەیشتۆتە پلەی جێگری پارێزگار لە دهۆك. دوای ئەوە خانەنشین کراوە. لە ڕۆژی ١٩٧٧/٢/١٤ بە نەخۆشیی دڵ کۆچی دوایی کردووە. ئێستا گۆڕەکەی لە گردی حاجی ئەوڵایە لە سلێمانی.

***

بۆ ئەم پێناسینە نووسەر سوودی لەم سەرچاوە و بەڕێزانە وەرگرتووە:

١- پێشەکیی کتێبی "رباعیات عمر الخیام المصورە" کە دکتۆر محەمەد عزەت نەسروڵڵا بۆ وەرگێڕانەکەی ئەحمەد ئەلساق ئەلنەجەفی نووسیوە – منشورات دار حیا و التراث العربی بیروت.

٢- کتێبی "فارسی برای سال سوم رشتەی زبان کردی" نووسینی دکتۆر محەمەد محەمەد نووری عارف – بەشی یەکەم.

٣- وتاری "رۆڵی گەلاوێژ لە پێشخستن و گەشەکردنی زمان و ئەدەبیاتی کوردیدا" – مامۆستا سەباح غالب.

٤- شاعیر و رۆژنامەنووس مامۆستا کاکەی فەلاح بۆ ئەوەی چەند کەس خەیامی گۆڕیوە و ئەو نموونانەی لە شیعری وەرگێڕ کە خستوومەتە روو ئەو پێی بەخشیم.

٥- پارێزەر و نووسەر مامۆستا جەماڵ شاڵی – برای وەرگێڕ – هەرچی دەربارەی ژیانی تایبەتی وەرگێڕ نووسیومە لەو وەرمگرتووە.

٦- کاک سۆران مەحوی(چیرۆکنووس و رەخنەگر) ئەو بوو کە بۆ یەکەم جار پێی راگەیاندم کە "شێخ مستەفا"ش خەیامی گۆڕیوە.

٧- جەنابی حاجی مەلا رەحیمی پەرخی کە هاوڕێی شێخ مستەفا بووە ئەو گۆڕینەی دیوە بەڵام دڵنیای کردم کە ئەو گۆڕینەی دوای مردنی لەناوچووە. دیسان لەو بەڕێزەوە زانیم کە ناوبراو کوڕی شێخ ئەحمەدی شێخ سەلامە کە مزگەوتی شێخ سەلامی بەناوەوە ناو نراوە. لە بنەڕەتدا لە ساداتی بەرزنجەن بەڵام کەوتوونەتە ناوچەی قەرەداغەوە. دەستێکی باڵای بووە لە ئاینناسیدا، زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکیی زانیوە خۆم کە منداڵ بووم هەموو جارێک ئەمدی لەسەر سەکۆی ڕاڕەوی مزگەوتی شێخ سەلامدا دانیشت یان لە ڕاڕەوەکەدا پیاسەی ئەکرد باوکم دەنگ و باسی جیهانی هەموو جارێک لە دەم ئەوەوە بۆ ئەگێڕاینەوە کەوا دیار بوو ئاگای تەواوی لە رامیاریی جیهانی هەبوو.

بۆ ئەو بەڕێزانە سوپاس و پێزانینمان پێشکەش ئەکەین.

**تەها بابان**

**١٩٧٨ – سلێمانی**

## ژمارەیەك لەشیعر بڵاونەکراوەکانی

### ئەسمەر

***ئەسمەر ئەسمەر گێسو عەنبەر***
***چاو مامزەی باڵا عەرعەر***
***هەی خوای جوانی، بەفیز و فەڕ***
***حەبەش زادەی، بێچووە بەربەر***
***تۆ یارمی هەر تۆی تا سەر***
***تاقە دولبەر***
***تاجەکەی سەر***
***بەندی جگەر***
***بەناز پەروەر***
***هەی جادووگەر***
***لە هەر پێچ و پەنای گیانتا***
***زۆر شاراوە، زۆر پەنهانتا***
***لەشی رەشی بێئێسقانتا***
***هەڵچووی گەرمی وەك بورکانتا***
***هەزارەها شتی بەخرۆش***
***گشت ئارەزووم دێنێتە جۆش***
***ئەمکا سەرخۆش***
***بۆنێکی خۆش***
***خۆشتر لە گوڵ***
***عەتر، سمڵ!***



لە بۆنی مەی
لە بۆنی بەی
بۆی ئەو لەشە رەشە گەشە
وەك وەنەوشە ئای کە خۆشە
لەشی مەخمەلیی تۆخت
نەرمۆڵەی بێ ئێسك و موخت
بەژنی رێکی شەنگ و شۆخت
بەستەی خۆشی ئاخ و ئۆخت
جووتێ لێوی تێنووی تەنگت
دوو شەمامەی سپی رەنگت
ئەو دوو هێشووە یاخیە رەشە
چەن سەرەڕۆ چەن سەرکەشە؟!

***

منیش چەن جوان بە چەشنی مەنگ
چوست و چالاك و بەبێ دەنگ
ئانا بە چەشنی پەپوولە
ئەکەومە هاتوچۆ و جوولە
ئەم چڵ ئەکەم بۆ ئەو چڵە
لەم گوڵ ئەچم بۆ ئەو گوڵە
ئەم ئەگوشم
لەو ئەنۆشم
ئەو ئەمژم لەم ئەچێژم
تا ئارەزووم تێر ئەڕێژم
لاشە سست ئەبێ ئەینێژم
وەك بەندەیەك لە حەرەمتا
لە کۆشی گەرمی بێ غەمتا
دەمم لەناو لێو و دەمتا
دەستم لەناو سینە و مەمتا!
ئەڵێم ئۆخەی ئا ئەمەتا
بەهەشتی راستی ئامەتا!!

*****

## بۆمباکەی هیرۆشیما

من کانوونم
من کانوونم
کانوونی بەفر و بارانم
مانگی رەشەبا و تۆفانم
هەرچەن جوانم
هەرچەن جوانم
من بێ گیانم
من بێ گیانم
سەهۆڵبەندانی کوێستانم
سارد و سڕم من زستانم
منم هەر بە ناو ئینسانم
وەرە خۆت بە بەسەر لەشما
وەك بۆمباکەی هیرۆشیما
وەك برووسکە ئاخم شەق کە
هەروەك بورکان
گڕ بخە گیان
ئێسك و پۆستم بسووتێنە
وەك برێشکە بمبرژێنە
سەرما و سۆڵەم لە گیان دەرکە
لەشم پڕ کڵپە و گڕ کە
لەناو ئاشی ئارەزووتا
وا ورد بمهاڕە تامەتا،
ئەمکەی بە خاك لە ژێر خۆتا!

*****

## ماچی بەزۆر

ماچێ نەیسێنم بەزۆر
تامی نییە کەم و زۆر
چەن جوانە دەمی ئەسپێ
نارەزایی دەر ئەبڕێ
بە چرنووك، گاز و لێدان
مستەکۆڵە و جنێودان
تێم بەرئەبێ گوایە شەڕە

*بەڵێ قەسدی خوێنی سەرە*
*ئەمبا و ئەمهێنێ و ئەمگرێ*
*تا پەل و پۆی لەبەر ئەبڕێ*
*ئەوسا هەروەك پشیلەی بەجۆش*
*ئەكەوێ دەستەمۆ و بێهۆش*
*لە كۆشی ئارەزووی گەرما*
*نە گاز نە چرنووك نە شەڕما*
*بە غەیری نووزەك لەسەرخۆ*
*بەستە خۆشكەی ئۆف و ئۆ*
*لەگەڵ هەڕەشە و ئیتر بەس*
*نەكەی باسیكەی لەلای كەس!!*
*****

## لەرەی ئەو جووتە مەمكانە

*چ خۆشخوانە چ خۆشخوانە*
*چ ئاوازێكی خۆشخوانە؟!*
*چەن سیحراوی چەن رەوانە*
*خۆشتر لە نای لە كەمانە*
*وەك دەنگی بەختە بارانە*
*تێكەڵ شنەی دەغڵ و دانە*
*وەك ئاوازی ئەو لێدانە*
*خورپەی دڵی چاوەڕوانە*
*وەك ئەو نەغمە جاویدانە*
*تریقەی ساوای بەر مەمكانە*
*لایلایەی دایك بۆ تاقانە*
*گۆرانیەكەی ئێوارانە*
*ئێوارانی بەهارانە*
*بەستەی خۆشی بەریوانە*
*هاڕەی تافگەی بەفراوانە*
*قاسپەی كەوی نیسارانە*
*ئاوازی شمشاڵی شوانە*
*لەرەی ئەو جووتە مەمكانە*
*****

## كورتە ژیاننامەی ئەحمەدی شاڵی

### ١٩٢٤-١٩٧٧

* ئەحمەد حاجی فەقێ شاڵی ساڵی ١٩٢٤ لە شاری سلێمانی لەدایك بووە.

* خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە سلێمانی تەواو كردووە.

* قۆناغی ئامادەیی لە بەغدا، لە زانكۆی ئەمەریكان تەواو كردوو.

* بڕوانامەی لیسانسی لە قانووندا وەرگرتووە.

* لە دامودەزگـای حكومـەتی ژمـارە یـەك پلـەی بـەڕێوەبردنی پـێ سـپێردراوە و تـا گەیـشتۆتە پلـەی جێگری پارێزگار.

* ساڵی ١٩٦٤ قایمقامی چوارتا دەبێ، لەبەر هەڵوێستی كوردایەتی لە پۆستەكەی دەردەكرێ.

* دوای رێككـەوتنی نێـوان شۆڕشـی ئـەیلوول و حكوومەتی عێراق لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦، دووبارە بە پلەی قائیمقام دەگەڕێتەوە و لە ئامێدی دەست بەكار دەبێ. كە دهۆك دەكرێتە پارێزگا، بە وەكالەت پۆستی پارێزگار بەڕێوەدەبات.

* ساڵی ١٩٧٤ كـە دووبـارە شۆڕشـی كوردسـتان دژی رژێمـی بـەعس دەسـت پێدەكاتـەوە، جـارێكی دیكـە پەیوەنـدی بـە شۆڕشـی ئەیلوولـەوە دەكـات، لـەناو دامودەزگاكـانی شۆڕشـدا، پۆسـتی پارێزگـاری دهـۆك وەردەگرێ.

* پـاش شكستی شـۆڕش لـە سـاڵی ١٩٧٥، بـە مـاڵ و منداڵەوە دەچێتە ئێران.

* پـاش ماوەیـەك دەگەڕێتـەوە عێـراق بـە پۆسـتی فەرمانبـەرێكی بـچووك لـە بەڕێوەبەرایـەتیی گـشتیی پۆستە و گەیاندن دادەنرێ.

* پاش ماوەیەك خـۆی خانەنشین دەكات و دەست بە پیشەی پارێزەری دەكات.

* لە ساڵی ١٩٧٧ بە هۆكارێكی نادیار لە شاری بەغدا، كتوپڕ بە وەستانی دڵ كۆچی دوایی دەكات. لە گردی سەیوان بە خاك دەسپێردرێت.





## چوارینەکانی خەیام

و. ئەحمەد شالّی

دارنده چو ترکیب طبایع آراست
از بهر چه افگندش اندر کم و کاست
گر نیک آمد شکستن از بهر چه بود
ورنیک نیامد این صور عیب کراست

ای مفتی شهر از تو پرکار تریم
با این همه مستی ز تو هشیار تریم
تو خون کسان خوری و ما خون رزان
انصاف بده کدام خونخوار تریم

جامیست که عقل آفرین میزندش
صد بوسه ز مهر بر جبین میزندش
این کوزه گر دهر چنین جام لطیف
میسازد و باز بر زمین میزندش

از جرم گل سیاه تا اوج زحل
کردم همه مشکلات عالم را حل
بیرون جستم ز بند مکر و حیل
هر بند گشاده شد مگر بند اجل

خوا کە خوڵقانی سروشتی ئینسان
بۆچی کەم و کورت نارێکی خوڵقان
خۆ ئەگەر باشە بۆچ مان و نەمان
گەر خراپیشە لە کێ بوو تاوان

یا شێخ هەرچەندە تەواو سەرخۆشین
هێشتا هەر لە تۆ زیاتر بە هۆشین
خوێنی خەڵق ئەخۆیت ئێمە خوێنی ڕەز
پێم بڵێ کاممان خوێناو ئەنۆشین

حەیرانە بەشەر لە شێوەی جوانی
سەد جار دڵ ئەکا خۆی بە قوربانی
لەم گۆزەکەری دەهر ئەو جوانە
لەبینی وەک شێت لە پڕ شکانی

لە جەرگی زەوی تا لووتکەی زوحەل
یەک یەک نهێنی دنیام کردۆ حەل
هەر مەکرو فێڵ و گرێ کوێرەیەک
هەمووم کردەوە ، ما گرێی ئەجەل

# شەهید یوسف دەرگەڵەیی

***بەقەد شێری دارستان ئازاو ژیر بوو .....***
***بەقەد ڕێواسی قەندیل تەڕو تازە بوو ....***
***بەقەد نەهەنگی دەریا هێمن و لەسەرە خۆبوو ....***
***بەقەد قەڵای هەولێر بەرزو خۆڕاگربوو .....***



**د. ئەحمەد شەریف**



شەهید یوسف دەرگەڵەیی

لەرەوتی مێژووی مرۆڤایەتیدا قارەمانی دەگمەن زۆرن ....
ئەوانەی لەپێناو ئازادیی گەل گیانی خۆیان بەخشیوە و تا دوا هەناسە خۆڕاگر بوونە و دوژمن زەفەری پێنەبردوون . شەهید یوسف دەڵێت ((کوردایەتیم کرد بەماڵ و تەمەنی خۆم پێ بەخشی ، کوردایەتی دەرگای زانین و فێربوونی بۆ کردمەوەو هەر کوردایەتی ڕێگای ژیان و مردنی پێ نیشاندام )).
ئاخر زۆر نهێنی گرنگ و رازی نەگوتراو و نەبیستراو هەبوو بە (سەرمۆری ) لەسەر سنگ و لەناو دڵی ئەودا مانەوەو لەگەڵ خۆیدا بردنیە ژێر گڵ ؟!
ڕاستە دەڵێن کۆمەڵگا هەڵگری هەگبەی ئاڵوگۆڕی هەڵچوون و داچوونەو پەیوەندی بە ئاستی ڕۆشنبیری سەردەمەوە هەیە و پەیوەندی بە "مەدلول" مرۆڤەوە هەیە .....
"دال" و "مەدلول" ئەو مرۆڤە گەورانە لە کارو کردەوەکانیاندا دەردەکەون ....
ورد شەهیدی ئازاو قارەمانی زۆرن، بەتایبەتی لەسەنگەرەکانی بەرگریدا .. بەڵام خۆڕاگری لە بەندینخانەکانی بەعسی فاشی تا بەنووکی نێزە ئەنجن بە ئەنجنی دەکەن بەبێ ئەوەی تاکە یەك ووشەی لێوەربگرن و یەك نهێنی لێ ببیستن ، ئەوە ئەوپەڕی فیداکاری و ئازایەتییە ......!!
شەهید یوسف ئەحمەد عەبدوڵڵا دەرگەڵەیی لە زەویە ئەستەویرو ڕووتەکەی شاری هەولێرو






لەخێزانێکی هەژارو بێ دەرامەت لە گەڕەکی قشڵە لەمانگی ئابی ساڵی ١٩٤٣ ز لەدایك بووە ..

لەتەمەنی پێنج ساڵیدا باوکی مردووەو بە هەتیووی ماوەتەوە .لەبەر باری نالەباری خێزانەکەیان ناچار لەو تەمەنە بچوکە ئەرکی بەخێوکردنی دایك و خوشکی دەکەوێتە ئەستۆو بەو تەمەنەوەماڵیان دەچێتەوە گوندی ((دەرگەلە))ی هەواری باب و باپیرانی ، لەو گوندە دڵگیرە ئەرکی قورسی ژیان دەگوزەرێنێ ...

لەساڵی ١٩٥٢ ز دەچێتە قوتابخانە لەگوندەکەیان و هەر لەبەر هەژاری و نەداری ئەو خێزانە خێر لەخۆ نەدیوە لەساڵی ١٩٥٧ دەچنە شارۆچکەی رەواندوز وشەهید یوسف لەپۆلی پێنجەمی سەرەتایی دەستدەکاتەوە بەخوێندن ..لەساڵی ١٩٥٩ ز دەچێتە ڕیزی یەکیەتی قوتابیانی کوردستان و دواتر دەچێتە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان و پلە بە پلە پێش دەکەوێ تا دەگاتە ئەندامی ناوچەی پارتی لەرەواندوز ......

لەساڵی ١٩٦٠ ز بەهۆی هەڤاڵ و هاوڕێ ی خۆشەویستم م . محمد حسن مەنگوری و لەڕێگای ریکخستنەکانی پارتییەوە لەگەڵ شەهید یوسف بەیەکتر ئاشنا بووین .دیارە ئەو سەردەمە من ئەندامی لیژنەی ناوچەی هەولێرو لیپرسراوی قوتابیانی پارێزگای هەولێر بووم .

شەهید یوسف هەموو سەرە مانگان دەهاتە کۆبوونەوەکان و کاکی مەنگور زۆر تەعریفی کاك یوسفی بۆ کردم و داوای لێکردم گرنگی زۆری پێبدەم و پشتگیری بکەم ، چونکە تواناو ووزەی لە رادە بەدەری هەیە .....

ئیتر لەوساڵەوە تاڕۆژی شەهید بوونی کاکە یوسف هەرسێکمان بووین بەهەڤاڵ و برای راستەقینەی یەکتری و لە زۆر جێگاو بۆنەدا باسی ئەو پەیوەندییەی نێوان هەرسێکمان کراوە ....

شەهید یوسف لەساڵی ١٩٦٣ لەلایەن رژێمەوە دەستگیر دەکرێ ، لەساڵی ١٩٧٠ لەلایەن رژێمەوە دوور دەخرێتەوە بۆ گوندی (گەرمە ) لەپارێزگای رومادی .

لەساڵی ١٩٧٤ دەچێتە ریزی شۆڕشی ئەیلول وە ماوەی دوو مانگ لەبەندینخانەی (رایات ) دەسگیر دەکرێ بەبیانووی ئەوەی لە ریکخستنە نهێنیەکانی کۆمەڵە کار دەکات ...

لە یەکەم کۆنفراسی یەکیەتی مامۆستایانی کوردستان کە لە هاوینەهواری پیرمام بەسترا : شەهید یوسف بە سکرتێری گشتی یەکیەتی مامۆستایانی کوردستان هەڵبژێردرا .....

لەساڵی ١٩٨٤ بەشداری لەکۆنفراسی کۆمەڵە کردووە ..

لەڕۆژی ١٩٨٥/٥/٢٨ لەو بەهارە تەڕو تووشەدا و لەو ڕۆژە گرژو مۆنەداو لەکاتی فراویندا لەلایەن جانەوەرەکانی بەعسی فاشی و چڵکاو خۆرەکانی و بەدەسیسەی کوردی گەوجوو لەڕێ دەرچوو دەسگیر دەکرێ ...

دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر ودوای ئەوەی جەلادەکان نائومێد دەبن

ـتوانن تاکە یەك ووشە
ـەسەر خۆی و هەڤاڵەکانی
ـیوەربگرن وچەندین بەکرێ
گـیراوی روبەروو دەکەنەوە
ـەو هەر نکوڵی لێدەکات
ئینجا بریار دەدەن
ـەنووکی نێزەکانیان ئەنجن
ـەنەنجنی بکەن و تەرمە
ـەوزەکەی دەبەنە دەرەوەی
شـار لە ژێر گڵی دەنێن .
ـەو رۆژ دوای ئەو تاوانە
گەورەیە واتە لەرۆژی ٥/٣١
ـەلایەن پیاوێکی خێرخوازو
ـیشتمان پەروەرەوە
ـئاگاداری کەس و کاری
ـدەکەنەوەو ئێمەش لەگەڵ
خێزانی و کەس و کاری
چوویـن تەرمەکەیمان
ـدەرهێنـاو بردمانە
گۆرستانی شارەوانی هەولێر
ـەسەر رێگای مخمور بەحورمەت و
ـرێزێکی زۆرەوە بەخاکمان سپارد
کردووە .




دیارە بۆ تەونی ئەوکرە لەبارو سەفەتەی خۆی واتە

(لەنووسینەکانیدا) زمانی هەولێری کردۆتە تەخت و بۆ نەخش و نیگاری وێنەکانی ووشەی رەنگینی جوان و زاراوەکانی هەولێرو رەواندوزی تێکەڵ کردووەو بەکاری هێناوە

لێرەدا دەمەوێت هەڵوەستەیەك لەسەر ئەم شەهیدە قارەمانە و شەهید وەسمانی برای و برازاکەی بکەم ...

کە بۆچی بەشەهیدی سەرکردە ئەژمار نەکراوە ؟!

خانووی تایبەتیان بۆدروست نەکراوەو مووچەی شەهیدی سەرکردەیان بۆ تەرخان نەکردووە؟!

دیارەلەبەرئەوەیە کەسێکی نزیکی خۆی لەناو یەکیەتی دا دەست رۆشتوو نەبووە .!!

بۆیە بەداخەوە دەبێ بڵێم یەك لە

شەهید یوسف ئەحمەد عەبدوڵلا ئەندامی یەکیەتی نووسەرانی کورد بوو ....

دەستێکی باڵای هەبوو لە نووسیندا لە گۆڤارەکانی هەولێر .دەنگی مامۆستا ،رۆشنبیر .نووسەری کورد ......

هەروەها پەرتوکێکی ئامادەکراوی چاپ نەکراوی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە بەناوونیشانی (هەولێر ) چەندین هەڵبەست و شیعری جوانی خۆی تێدا تۆمار



نیمزا / ١٥ی ئێوارەی هەینی ١٩٦٦/٧/٨ی زایینی – لەشاری هەولێر – لە ستۆدیۆ سپۆرت وەرگیراوە.
وێنەی سێ هاوڕێی زۆر خۆشەویست ( محمد حسن مەنگوری ، احمد شریف ، یوسف احمد )
نیمزا/ ئەحمەد شەریف



هەولێر سەربانی ماڵی کاك یوسف دەرگەڵەیی ١٩٦٧/٦/٢٢

کێشە گەورەکانی کورد شێوەی بیرکردنەوەو رەفتاری سەرکردەکانیەتی لەگەڵ رێزی زۆرم بۆیان .

ئەو برادەرانە وا بیر دەکەنەوە پێویستیان بەکەس نەماوە تەنها حزم و کەس و کاری خۆیان نەبێت؟!.

کێشەکەی ئێمە لەوەدایە !

ئەو برادەرانە لەسیاسەتدا خۆیان پێ لە لینین و چەرچڵ و کیسەنجەر شارەزاترە ...

لەبواری سەربازیدا خۆیان بە مونتی گومری ناگۆرنەوە .....لەبەرئەوەی سەرپەرشتی ئەنجومەنی گوندەکانیان کردووە وا دەزانن پسپۆری ئیدارەو بەرێوە بردنن ، بۆیە شکستیان هێناوەو حاڵمان بەم رۆژە گەیشتووە .

لەبواری راگەیاندن دا دەبێ هەموو دەزگاکان بە بەژن وبالای ئەواندا بلێ وگەر رۆشنبیرێك یا سیاسی و نووسەرێك بەمیزاجی ئەوان رەفتار نەکا یا رەخنە بگرێ پەراوێز دەخرێ ؟

لە بواری داراییدا تەخشان و پەخشان لەداهاتی نەوت وگازو گومرگدا دەکرێ هەروەك بەمیرات بۆیان مابێتەوە و کەس بۆی نەبێ رەخنەیان لێ بگرێ .

لە کۆتاییدا داوا لەسەرکردایەتی سیاسی دەکەم کەس و کاری شەهیدە بێنازەکان ، تێکۆشەرە دێرینەکان ، ژنان ، گەنجان ، لاوان ، خوێندکاران ، نەوەی دوای راپەرین لە یاد نەکەن و رێزیان لێبگرن و داخوازیەکانیان فەرامۆش نەکەن .چونکە ئەم ئەزموونە بەرهەمی خەباتی ئێوەو ئەوانە وئەگەر لەدەستمان بچێت بەسەد ساڵی تر نابێتەوە ....

**هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی شەهید یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی، شەهید یوسف جەمیل قەشقەیی،**

**شەهید بەهرۆز قەشقەیی ،**

**شەهید نادر قەشقەیی**

**شەهید قادر مستەفا قەشقەیی**

**و گشت شەهیدانی کوردو کوردستان .**



# سەرکردەیەکی ڕاپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێر بەبێ دەنگی ماڵئاوایی لێکردین

نووسینی : فوئاد زیندانی- ئەڵمانیا

زۆرن ئەوانەی لەژیاندا قارەمانانەئەرکی خۆیان بەرامبەر نیشتیمان و کۆمەڵگاکەیان بەجێ دەهێنن بەبێ ئەوەەی چاوەڕێی پاداشت و خەڵاتێك بن یان منەت بەسەر خەڵکەوەبکەن لەبەرامبەر بەجێهێنانی ئەو ئەرکەیان.

زۆرن ئەوانەی لەرۆژگارەسەخت و دژوارەکاندا کاریگەری گەورەلەسەر کۆمەڵگاکەیان بەجێ دەهێڵن، ژیانێکی جەربەزەو پڕ لەسەرکێشی بەسەر دەبەن بەڵام بەهێمنی و بەبێ دەنگی ماڵئاوایی لەخەڵك و وڵاتەکەیان دەکەن.

عەزیز غەفوور ئەبوبەکر یەکێکە لەو مرۆڤە نیشتیمانپەروەرانەی شاری پیرەقەڵاو منارە، کەزۆربەی ژیانی بۆ کۆمەڵگەکەی، بۆ وڵات و نیشتیمانەکەی تەرخان کرد، هەتا باری سەختی ژیان و تەمەنی پیری و خراپی تەندروستی زەفەریان پێی نەبرد ئەو هەر بەدڵ و بەگیان بۆ وڵات و نەتەوەکەی دەسووتا. مام عەزیز کەلەناو خەڵکدا بەیەکێك لەسەرکردەقارەمانەکانی ڕاپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێر ناسراوە، کۆتایی ساڵی پار لەرۆژی ٧,١١,٢٠١٠ بەبێ دەنگی ماڵئاوایی لێکردین.

مام عەزیز ساڵی١٩٣١ لەخێزانێکی هەژاری گوندی قەرەسناغە، لەدایك بووە، ئەو گوندە ئێستاکە نەماوە چونکە کەوتۆتە ناو سنووری شاری هەولێر، لەشوێنی بازگەی سەر ڕێگەی هەولێر. باوکی مەلایەکی ناسراوی سەردەمەکەی خۆی بووە، ئەمیش هەر لەرێگەی باوکیەوەفێری خوێندەواری بووەو بەڵام فەقێیەتی نەکردووە، ئەوکاتەی باوکی نیشتەجێی شاری هەولێر دەبێ، لەوێ بۆ بژێوی ژیان دەست بەکرێکاری دەکات و تێکەڵی ژیانی شار دەبێ. لەو سەردەمەدا لەڕێگەی حەمید عوسمانی ئامۆزایەوە تێکەڵی و دۆستایەتی لەگەڵ کۆمەڵێك گەنجی ئەو سەردەمەپەیدا دەکات. حەمید عوسمان ئەوکاتە کادیرێکی باڵای ناو حیزبی شیوعی عیراقی دەبێ، کەدواتر بوو بەسکرتێری







وێنەی لاپەڕەیەك لە( دفترالخدمه )کەی مام عەزیز کە تیایدا ئاماژە بەسێ ساڵی مەحکومیەتەکەی کراوە

حێزبەکـــــە. یــــەکێك لەوکەســــانەی کەلـــــەو ڕێگەیەوەهاوڕێیەتی لەگەڵ پەیدا دەکات.

عەزیز محەمەد دەبێ، ئەوانەهەموویان لەریزی حیزبی شیوعی عێراقی کاریـان دەکرد،لـەو ڕێگایەوەئـەمیش چـووەرێزەکانی ئـەو حیزبـە ئەوکاتـەش تەمـەنی تـەنها شانزەساڵ دەبێ کەچالاکانە ئەرکە حیزبیەکانی خۆی جێبــەجێ دەکــرد. چـالاکیەکانی ئـەو پۆلەگەنجـەزۆر کاریگـــەری هـــەبووە لەهۆشـــیارکردنەوەی خـــەڵك و هێنانـەریزی ژمارەیـەکی زۆری خـەڵك بۆنـاو ریزەکـانی حیـزب، کـاتێ رژێمـی پاشایەتی ئـەو سەردەمەهەست بەمەترسـی چـالاکیەکانیان دەکـات ، لەرێگـەی دام و دەزگـا ئـەمنی و سـیخوریەکانی دەکەوێتەچـاوەدێری کردنیـان، سـەرئـەنجام هەڵمـەتی گـرتن و راوەدوونانیـان دەسـت پـێ دەکـات، ئـەوەبوو مـام عـەزیزیش بـەر ئەوشـــالاوی راوەدوونانەدەکـــەوێ و ســـاڵی ١٩٤٨ دەسـتگیر دەکـرێ، پاشـان بۆمـاوەی سـێ سـاڵان حـوکم دەکرێ و دەخرێتەزیندانی نوگرەسەلمان، لەوێ چەندین تێکۆشەری تریش زیندانی دەکرێن وەك عەزیز محەمەد و حەمیـد عوسمـان و زۆرانـی تـر، بـاری سـەخت و ناخۆشی زیندانی نوگرەسەلمان، ورەی ناروخێنن، هەر لەزیندان تێکۆشەری ناسراوی عیراقی کامیل چادرچی دەناسـێت، کەئـەویش ئـەو کاتەلەگەڵیانـدا لەزیندانـدا دەبێت. مام عەزیز ئەو هەڵەدەقۆزێتەوەبۆ ئەوەی لەوێ پەرەبەخوێندەواریەکـەی بـدا و خـۆی فێـری زمـانی عارەبی بکات. پاش سێ ساڵان کە لە زیندان بەر دەبێ بەگوڕو تین و حەماسێکی زیاتر لەجاران درێژەبەخەباتی خـۆی دەدا. چـونکەلەبناغەدا ریـشەیەکی ژیـانی جوتیانـــەیان هـــەبوو، بۆیـــەروو دەکاتەدێهاتـــەکانی دەوروبـەری هـەولێرو لـەوێ لـەناو لادێکانـدا، لـەرێزی جوتیاراندا دەست بەخەبات دەکاتەوە.

مـام عـەزیز وەك كـادیرێکی چـالاك هەمیـشەهەولی هۆشـــیار کردنـــەوەی جوتیـــارانی دەدا، هـــەولی

ـرێکخستنیانی دەدا،کاریگـەری مام عـەزیز لـەناو خـەڵك ـمیندەدیارو بەرچاودەبێ، کەکەسایەتیەکی وەکو مـەلا عـەبـدوڵلا ئیـسماعیل(مـەلا مـاتۆڕ) کەلـەو سـەردەمەدا کـادیرێکی زۆر چـالاکی پـارتی دەبـێ، لـەکتێبی ـیـەوەریەکانی بەناوی( سەربردەی ژیانی سیاسیم) زۆر ـسـەرسـامیەوەباس لـەرۆڵ و کاریگـەری مـام عـەزیز ـحکات لەرێزی جوتیاران. ئەو کاتەلەگوندەکانی دەشتی ـهـەولێر قوتابخانەبەدەگمـەن هـەبوو، ئەمـەش کـاری کردبووەسەر نزمی ئاستی هوشیاری جوتیاران، ئاغاکان ـهیاندەهێـشت قوتابخانەلەگونـدەکانیان بکرێتـەوە ـبـەوەکوو منـداڵی جوتیـار پێبگـەن و هۆشـیار ببنـەوەو ـسـەزوڵم و زۆریـەکانی رازی نـەبن، جـا ئەگـەر ئـەو بـارو ـدۆخـەی ئـەو سەردەمەبهێنینەبەرچـاومان بۆمـان ـدەردەکـەوێ کەخـەباتی سیاسـی لـەو دۆخـەدا کـارێکی چەند سەخت و گران بووە، بەڵام ئەوەرێگەلەمام عەزیز و هاوەڵـەکانی نـاگرێ کەبـەردەوام خـەڵك لـەدژی زوڵـم و چەوسانەوەی ئاغاو دەرەبەگـەکان هۆشـیار بکەنـەوە و رێگەی خـەبات و بـەرەنگاریان بـۆ رۆشـن بکەنـەوە، ئـەو خەباتەمانـدوو نەناسانەیەی مـام عـەزیز و هاوەڵـەکانی گـەورەترین رێگەخۆشـکەری بـەرپا بـوونی راپەڕینـە مێژوویيەکەی جوتیارانی دەشتی هەولێر بووە. کەجێی خۆیەتی لەپاڵ ژیان نامەی ئەو مرۆڤەتێکۆشەرەتیشکێك بخەینەسەر ئەو راپەڕینـەو ڕۆڵـی مام عەزیز وەك یـەکێك لەسەرکردەکانی ڕاپەڕینەکەبخەینەڕوو.

## راپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێر

جێگـــەی داخەکـــەزۆر رووداوی گەورەلەمێـــژووی هاوچـەرخی میللەتەکـەمان فـەرامۆش کـراون و وەك و پێویست ئاوڕیان لێ نەدراوەتەوە، یان ئەگەر ئاوڕیشیان لـێ درابێتەوەبـەناکامڵ و کـرچ و کـاڵی بـووە، یـان بەناتـەواوی و شێواوی بووە، کەئەمـەش کاریگـەری زۆر خراپی هەیەبۆ سەر نەوەی نوێمان کەنەزانن لەڕابردووی نزیکـی خۆیـان چـی لەنیـشتیمانەکەیان ڕووی داوە. یـەکێك لـەو ڕووداوەمێژووییانەراپـەڕینی پـڕ لەشـکۆی جوتیارانی دەشتی هەولێرە.

هەندێ کەس زۆر بـێ ویژدانانەویستوویانەڕاستیەکانی ئـەو ڕووداوەبەلاڕێیـەکی تەسـکدا بـەرن و بەشـەڕێکی شکستخواردووی خەڵکی نەزان و نەخوێندەوار وەسفی بکەن، تەنانەت پێی ڕەوا نابینن ناوی راپەڕینیشی لێ بنـرێ، یـان وەك هـەوڵێکی دەسـتکردی شـیوعیەکانی ئەوسەردەمەبۆ لەخشتەبردنی جوتیاران بیهێننەبەرچاو کەسەر ئەنجام شکستی خواردو جوتیاران دۆڕاندیان پـێ بـڕا!!!. قـسەو بیرکردنـەوەی ئـەو کەسـانەڕێك وەك قـــسەی ئـــەو دەرەبەگەشکـــست خواردووانەیـــە کەلەسـەردەمی خـۆی گاڵتـەیان بەڕاپەڕینەکـەدەکردو بەپاڵپشتی دام و دەزگا پۆلیسیەکانی رژێمی ئەوکاتە هـەوڵی سـەرکوت کردنـەوەیانیان دەدا. بـەڵام بائیمەلـەو کورتـەوتارەدا ڕاستیەکانی ئـەو ڕووداوەڕوون بکەینـەوە ئینجـا بۆمـان دەردەکـەوێ کـەئایا ئەمەڕاپـەڕینێکی مێژوویی بووەیان نا؟ وەئایا شەڕێکی شکستخواردووی خـەڵکی نـەزان و نەخوێنـدەوار بووەیـان ڕاپـەڕینێکی مێـژوویی سـەرکەوتووبووە؟ هـەروەها بۆمـان ڕوون دەبێتەوەکەئایا ئەمەهەوڵێکی دەستکردی شیوعیەکانی ئـەو سـەردەمەبووەیان لـەئاکامی بـارودۆخێکی مێژوویەوەهاتۆتـەئاراوەو ڕۆڵـی شـیوعیەکان تـەنها هۆشیار کردنـەوەو پـشتگیری و بـەرگری کـردن بووەلـەو ڕاپەڕینە؟

سـاڵی ۲۰۰۲ بەهـەوڵی چـەند کەسـێکی دڵـسۆز نامیلکەیەکی بچووك بەڵام بەناوەرك پڕبایەخ دەربارەی ئەوڕاپەڕینەبڵاو کراوەتـەوە، ئـەو دلسۆزانەهەستاون دێ بەدێ و کۆڵان کۆڵانی شار گەڕوان تا ژماریـەکی زۆری ئـەو خەڵکانـەیان دۆزیوەتـەوە، کەبەشـداری ئـەو راپەڕینـەیان کردووەیـان شـایەدحاڵی ئـەو ڕووداوەمێژووییـەبوون، قـسەکانی ئەوانـەیان هـەمووی





بەدەنگ تۆمار کردووەو سەرلەنوێ نووسیویانەتەوە.
بەڕاستی هەوڵی ئەو مرۆڤانەی کەبەم کارەهەڵساون جێگەی دەست خۆشی و پێزانینە.

بەپێی زانیاری من (کەمن لەکوردستان ناژیم) تا ئێستا ئەمەبایەخدارترین شتێکەبەرچاوی من کەوتبێ دەربارەی ڕاپەڕینەکە. لەو نامیلکەیەدا لەچەندین شوێندا وەك سەرکردەیەکی ئەو ڕاپەڕینەباسی ڕۆڵی مام عەزیز کراوە، بەشداران و شایەدحاڵەکانی ڕاپەڕینەکەش ئاماژەبەناوی مام عەزیز دەکەن. لەخوێندنەوەی نامیلکەکەبۆمان دەر دەکەوێ کەڕاپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێر لەئەنجامی زەمینەیەکی بابەتی و مێژووییەوەسەری هەڵداوە. لەو سەردەمەدا زوڵم و زۆری ئاغەو دەرەبەگەکان بەرامبەر بەخەڵکی جوتیارو ڕەش وڕووت گەیشتبووەئاستێکی بەرز. ئاغاکان هەر بەوەندەلەجوتیار نەدەگەڕان کەبەشێکی داهاتی زەویەکەی لەبەرامبەر کار کردنی لەزەوی ئاغا لەجوتیاری هەژار بستێنن بەڵکو پەڵپی شتی تریشیان لێیان دەگرت وەك سەرانەو پووشانەو زبارەو سوغرەو سوورانەو بێگاری، سەرەرای ئەوانەهەمیشەهەوڵیان دەدا بەچاوێکی کەم و نامرۆییانەلەجوتیار بڕوانرێ، ڕێگەیان نەدەدا قوتابخانەلەدێدا بکرێتەوە، دەبووایەلەهەموو خۆشی و ناخۆشیەکدا پرسیان بەئاغا بکردبووایە، بۆیان نەبوو ئەگەر جلی جوانیان هەبوایەلەبەری بکەن، ئەگەر جوتیاری هەژار ئەگەر کچی بەشوودابووایەدەبوایەپارەبدات بەئاغا، ئەگەرجوتیار ژنیان بۆ کوڕی بهێنابووایە بەفەرمانی ئاغا جوتیاری پارەی هەبووایەیان نا دەبووایەحەوت شەوو حەوت ڕۆژ شایی لەگوندەکەبگێڕێ تا ئاغاو دارو دەستەو کوڕەکانی هەڵپەڕن. هەڵبەتەلەو زەماوەندانەژن و کچەکانی ئاغا نەك بۆیان نەبوو هەڵپەڕن بەڵکوو بۆیان نەبوو بێن سەیریشی بکەن. ئاغەبەکەیفی خۆی بۆی هەبوو جوتیارێك لەگوندەکەی خۆی وەدەر بنێ و بیتارێنێ، لەنەهاتی و وشکەساڵی دەبوایەباج و سەرانەی خۆی لەجوتیار وەربگرێ. ئەو حاڵەتەلەدەشتی هەولێر هەتا دەهات ڕووی لەزیادی دەکرد تاوای لێهات ئیتر جوتیاران بێزار و هەراسان ببن و ئیتر نەتوانن سەر بۆ هەمووشتێك دانەوێنن. جێی ئاماژەپێکردنەئەو کاتەکادیرەکانی حیزبی شیوعی کەهەر لەناو جوتیاران خۆیان پەیدا بووبوون ڕۆڵێکی زۆریان هەبوو لەهۆشیار کردنەوەی جوتیاران و هان دانیان بۆ ئەوەی چیتر لەئاغا کانیان قبووڵ نەکەنەوە.



مـام عـەزیز غـەفوور یـەکێك بـوو لـەو کادیرەجوتیارانـەی کەبـەدەوام و بـێ مانـدوو بـوون لـەنێوان گونـدەکانی دەشتی هەولێر دەها ت و دەچوو خەڵکی ئەو گوندانەی ڕێك دەخست و هـانی دەدان کەچیتر بەرامبـەر زوڵمـی ئاغـەو دەرەبەگـەکان بـێ دەنـگ نـەبن، بـەم جۆرەتـوانی ژمارەیەکی زۆری جوتیاران بێنێتەڕیزی ڕێکخستن. بەڵام بارودۆخەمێژوویەکـــەبۆ ئـــەوەگونجاو بـــوو کەڕاپـەڕینێکی وای تیا سەهەڵبدات، ئەگینا هـەر تـەنها هۆشـیار کردنـەوەو ڕێکخـستنی خـەڵك بـەس نـین بـۆ شۆرش و بەرخوردان.

سەرەتای ئەو ڕاپەڕینەمێژووییە ساڵی ١٩٥٣ لەگوندی قازیخانەسەری هەڵدا. کاتێ ئاغای ئەو گوندەکۆمـەڵێك ئاواکـاری زاڵمانەبەسـەر خەڵکەکـەدا دەسـەپێنێ، بەجۆرێك کەلـەتواناى ئەو خەڵکەرەش و ڕووتـەدا نـابێ جێبـەجێی بکـەن. ناچـار جوتیارەکـان لەناوخۆیانـدا کۆدەبنەوەو پەیمان دەبەستن کەسەر بۆ ئاغا دانەنوێنن. کـاتێ ئاغـا بـەم ڕێکەوتنـەیان دەزانـێ زۆر هـەوڵ دەدا پەشـیمانیان بکاتــەوە، نــاتوانێ هــەوڵ دەدات درز بخاتەڕێزەکانیانەوەهـەر نـاتوانێ، ئـیتر ئاغـا هەڕەشـەی کوشتنیان لێ دەکات، لەبەرامبەر ئەوەدا جوتیاران چەك دەکـڕن و خۆیـان چـەکدار دەکـەن. ئاغـا فـەرمان دەدا کەکـەس نـابێ جـووت بگـرێ بجێتەزەویـەکانی بـەڵام جوتیـاران گـوێ بـەم قـسەیەی ئاغـا نـادەن و لـەئاغا دەگەیـەنن کەلـەو بەشـەی یاسـا بـۆی بریوەتەوەلەبەروو بوومی زەویەکەی ئامادەنین زیاتر بدەن بەئاغاو هیچی تری بۆ بکەن. کەئاغا دەزانـێ هیچی لەگەڵیان پێناکرێ پـەنا دەباتەبەرشـار و شـکاتیان لـێ دەکـات، بـۆ ئـەو مەبەســـتەمەفرەزەیەکی پـــۆلیس دێنەدێیەکـــە، بـــەڵام ئـەوەش جوتیـاران چـاو ترسـاو ناکـات، پـۆلیس هـەوڵ دەدات بزانــێ کــێ ڕابەرایــەتی ئــەو ڕاپەڕینــەدەکات لەئەنجامــدا چـــەند جوتیارێـــك دەســـگیر دەکـــەن و دەیانخەنەبەندیخانـە، بـەڵام ئەوەش خـەڵك چـاو ترسـاو ناکات، بەڵکو کاتێك دەنگ وباسی ئەوڕاپەڕینەی گوندی قازیخانەبەدەڤەرەکـــەدا بڵـــاو دەبێتـــەوە، ئاراســـتەی ڕووداوەکەبەئاقارێکی دیکەدا دەڕوات..

مـــام عـــەزیز و هاوەڵـــەکانی لەگـــەڵ خـــەڵکی گونـــدی گردەرەشـــەو قەرەچـــناغەکۆدەبنەوەو تـــا هـــەموویان سوێندو پەیمان بۆیەکتری ببەستن و چیتر لەئاغا قبوول نەکەنەوە، ئیتر بەم جۆرە بڵێسەی بەرخوردان سەرتاپای ناوچـەکەدەتەنێتەوەو لـەو گوندانـەش ڕاپـەڕین بـەرپا دەبێ:

شەمامك، دیبەگە، چەڵتووك، لهێبان، دارەخورما، عاڵڵا، دووگرتکان، دووسـەرە، چـەغەمیرە، مووڕتکە، میرزاغـە، گەڕەشـێخان، یەدیقزلـەر، ئێلینجـاغ، پاڵانیـان، کـەردز، گردمەلا، سەردەشت، بیستانە، سێقوچان، گردەرەشە، بیرەجنە، ئۆمەرەسوور، گردلانکە، عەلیاوە، قوچەبڵباس، شـێراوە، شـێخانان، ئـاودەلۆك، قۆریتـانی گـچکە، قۆریتانی گەورە، کۆیەقڕان، سووریژە، بزندز، قوڵتەپە، قولتەپـەی سـەروو، کەسـنەزان و بـاقرت، باشـتەپە، سێقوچانی کەندێناوە، شۆڕەزەرتکە، سیاو، بەرزەوار، حاجیاوەعەوێنە،..هتد

بەشـێکی جوتیـارانی ئـەو ڕاپەڕینـەخۆیان چـەکدار کردبـوو، لەوکاتـەهێزی ڕاپەڕینەکەگەیشتبووەئاستێك کـەجوتیاران دەیـانتوانی سـەری هـەموو ئاغاکـان بپلیـشێننەوە، بـەڵام مـام عـەزیز غـەفوور کەئـەویش چەکدار بوو گوند بە گوند بەسەر جوتیارەکاندا دەگەڕێ و ئاگاداریان دەکاتەوەکەنابێ کارێکی وەها بکەن خوێن بڕژێ، چونکەئەوان داوای ماف خۆیان دەکەن مەبەستیان شـەڕو کوشـتن و ئـاژاوەگێڕی نیە، ئـەوەبوو جوتیـاران خۆیان لەوەپاراست شەڕو کوشتار بێتەئاراوە. سەرەڕای ئـــەوەش زۆر لـــەئاغاکان لەترســـی کوشـــتن و تۆڵەلێکردنـــەوەخۆیان شـــاردەوە چـــونکەهەتا دەهـــات ڕاپەڕینەکەپەرەی دەسەند.

لەبڵاو بوونەوەی ئەوڕاپەڕینانەئاغاکان ناچار بوون پـەنا ببەنەبـەر حکومـەت و داوای هێـزی نیزامـی بکـەن. ئـیتر ئـەوەبوو هێزەکـانی پۆلیـسی حکومـەت بـەرەو ئـەو دێهاتانـەی دەشـتی هـەولێر جووڵـان وبەربوونـەگرتن و





راوەدوونانی جوتیاران، ژمارەی ئەو جوتیارانەی لەو راپەرینەگیران و خرانەبەندیخانەوەدەگەیشتە ٣٠٠ کەس، چەند کەسێکیش کوژران، زۆریان بەماڵەوەدەربەدەر کران و گوێزرانەوەبۆ دەڤەری کۆیەو رانیەو کەرکوك شوینەکانی تر ئەوەبوو لەزۆربەی گوندەکان مەخفەری پۆلیس دانران بۆکۆنترۆلکردن و رێگەگرتن لەتەشەنەکردنی راپەرینەکە، جوتیارانیش پەنایان بردەبەر دادگا، بەڵام چونکەئاغاکان جوتیارانیان بەشیوعیەت تۆمەتبار دەکرد بۆیەلەدادگا دەیانبردەوە، دیارەرژێمی ئەوکاتەش تەنها لەبەرژەوەندی ئاغەو دەرەبەگەکاندابوو. بێرێزی و ناکەسبەچەیی ئەو ئاغایانەگەیشبووەرادەیەك کەدەبوایەجوتیارەکان خۆیان خەرجی پۆلیسەکان بکێشن بەڵام لەزۆربەی گوندەکان جوتیاران ئەوەیان قبووڵ نەکردەوە، بۆیەپۆلیسەکانیش گوندەکانیان جێهێشت. ئەوەی جێگەی سەرنج بوو لەو راپەرینەجوتیاران هەموو بەیەك دەنگ دژی ئاغاکان هەستابوونەوە، حکومەت زۆر هەوڵی دەدا جوتیارەکان داوای لێبووردن لەئاغاکانیان بکەن بەڵام هەموویان ئامادەی بەندیخانەو دەربەدەری بوون نەوەکو سەر بۆ ئاغا دانەوێنن و داوای لێبووردنی لێ بکەن. هەروەها لەم راپەرینەئافرەتی جوتیاری کورد رۆڵی ئازاو دلێرانەی هەبوو، ژنانی گوندی قەرەچناغەو قۆپەقڕان هێرش دەبەنەسەر ئاغایەك و بەدار و پیشەقان هەموو لەشی دەشکێنن، ئەم هێرشەدەنگ دانەوەیەکی گەورەی‌لەناوچەکەدەبێ، تەنانەت کاتی دامرکانەوی راپەرینەکەموتەسەرِیفی هەولێر و قایمقامی مەخموور و مودیر ناحیەی دیبەگەبەگوندەکاندا دەسووڕانەوەتا لەبەژەوەندی ئاغا قسەبۆ جوتیاران بکەن و هەڕەشەیان لێبکەن کەجارێکیتر کاری وەها نەکەن، شێرەژنێك لەگوندی قەپڵان لێیان دێتەدەنگ و پێیان دەڵێ ئێوەزاڵم و دەستپێشخەرن لەچەوسانەوەی خەڵك، جوتیاری هەژار چیبکات، بەم جۆرەقسانەی ریسواو شەرمەزاریان دەکات، بۆ بەیانی ئەو شێرەژنەلەگەڵ کوڕەکەی زیندانی دەکرێ.

بەم جۆرەراپەرینی جوتیاران دامرکرکێنرایەوە، بەڵام توانی ئامانجەکانی خۆی بپێکێ، ئیتر ئاغەو دەرەبەگەکان دەسەڵاتی رەهایان لەدێهاتەکاندا نەما، بۆ هەموو کارو فەرمانێك دەبوایەپەنا بەرنەحکومەت. ئاغاکان سامی جارانیان نەما، زۆر لەو ئاغایانەلەهەڵس و کەوتەکانیان دوورکەوتنەوەو زۆریان گوندەکانیان بەجێهێشت و لەشارەکان نیشتەجێ بوون و کوێخوایان لەدوای خۆیان دانا، رژێمی ئەوکاتەش بەهەمووشێوەیەك هەوڵی دەدا چیتر ئاژاوەروو لەو ناوچەیەنەکاتەوە بۆیەهەوڵی دەدا وا لەئاغاکان بکات لەکاری یاسایی زیاتر پاڵەپەستۆ نەخەنەسەر جوتیارەکان. هەروەها جوتیار لەوکاتەدا بۆ یەکەم جاری بوو کەهەست بەهێزی خۆی بکات، لەئاغاکانیش بگەیەنێ کە جوتیار ئەگەر بیەوێ دەتوانێ بەرژەوەندیەکانی ئاغا تێکبشکێنێ.

لەدوای راپەرینەکەژمارەیەك جوتیار ئامادەنەبوون سەر بۆ رژێم دانەوێنن، بەڵکو بەردوامیان بەخەباتی خۆیان داو چەکیان کردەشان و بەردەوام لەنێوان دێهاتەکان دەسووڕانەوەو ورەی جوتیارانیان جارێکیتر بەرز دەکردەوەکەمکوم بن لەسەر داواکاریەکانیان یەکێك لەو مرۆڤەشۆڕشگێڕانەمام عەزێز غەفوور بوو. مام عەزیز دەیزانی رۆژێك دادێ ئامانجەکانی ئەو جوتیارانەدێنەدی و چەوسێنەران ریسوا دەبن، مام عەزیز دەیزانی خەباتی جەماوەری دەچێتەناو توێی مێژووەوەو فەرامۆش ناکرێ، هیچ هەنگاوێکی خەبات بەفیڕۆ ناڕوات. بیرکردنەوکانی مام عەزیز راست دەرچوون چەند ساڵێکی نەبرد شۆڕشی چواردەی تەمووز بەرپا بوو، ئیتر لەوێوەیاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵ هاتەئاراوە، ئەگەرچی ئەم یاسایەکێشەی زەوی بەتەواوی بنەبڕ نەکرد بەڵام وەك پێشینەیەك بۆ ئەوکاتەدەسکەوتێکی مێژوویی زۆر گەورەبوو، کەهیچ گومانێك لەوەدا نەبوو راپەرینی جوتیارانی دەشتی هەولێر کاریگەریەکی زۆر گەورەی هەبوو تا

ـەوشۆڕشـەبیر لەڕەوشـی خراپـی ژیـانی جوتیـاران ـکـتـەوەو یاسـایەك دەربکـات سـەرتاپای جوتیـارانی عـێراق و کوردسـتان لێـی سـوودمەند بـن. مـام عـەزیز ـۆڕشـی چواردەی تـەمموزی بـەڕووداوێکی مێـژوویی ـگـەورەدەزانی، لەسـایەی ئەوشۆڕشەحیزبەسیاسـیەکان ـئاشـکرا دەیانتوانی خـەباتی خۆیـان لـە نـاوڕێزەکـانی ـجـەماوەردا پیادەبکـەن، ئـەویش لـەو بارودۆخەنوێیـەدا ـیـتر پـەرەی بەخـەباتی خۆیدا هـەر لەدەشـتی هـەولێر و ـناو ریـزی جوتیـاران. خـەباتی مام عەیز بـەدەوام بـوو هەتا کودەتاکـەی سالّی ١٩٦٣ ئیتر لـەوێ پاش ئەوەی ـشۆڤێنیەکان دەسەڵاتیان گرتەدەست لەڕێگەی حـەرەس قەومیەکانەوەبەربوونـەگیانی خـەڵك و راوەدوونـانی ـئـازادیخوازان و سـەدان و هـەزارانیان لـێ بەبـەر ـەوشاڵاوی کوشتن و زیندانی کردنە دا، لـەو کاتـەدا مام عـەزیز نایـەوێ بکەوێتەبـەر دەسـتیان ناوچـەکەبەجێ ـدەهێڵـێ و رووەدەکاتەدەڤـەری ڕانیـەو بیتـوێن، چـەند سـاڵێك لـەوێ دەمێنێتـەوە، پاشـان روو دەکاتەناوچـەی بالەکایـەتی، کەئەوکاتەناوچـەیەکی ئـازاد کـراوی ژێـر ـدەسـەڵاتی پێشمەرگەدەبێ، لـەو کاتـەش هـەر لـەکاری حیزبی دانـابڕێ، بـەم جـۆرە لەخـەباتی سیاسـی خـۆی ـبـەردەوام دەبـێ، تـا سـەرەتای حـەفتاکان، ئەوکاتـەی حیزبی شـیوعی دەچێتەناو بـەرەی نیشتیمانی لەگـەڵ حیزبـی بـەعس مـام عـەزیز زۆری پێنـاخۆش دەبـێ، چونکەئەو لای وابوو بەعسیەکان جێگەی متمانەپێکردن نین، ئـەو وای دەزانـی ئامانجی بەعسیەکان لـەو ئاشـت بوونەوەیەئەوەیـەناوی ئەنـدام و ڕێکخراوەکـانی حیزبـی شیوعیان بـۆ ئاشـکرا بـێ تـاکوپاشـان کەئیشیان پێیـان نـەما و دەسـەڵاتی خۆیـان بـەهێز کـرد ئـیتر بەئاسـانی بتوانن دەستیان بەسـەردا بگرن، بۆیەئـەم وازی لـەحیزب نـەهێنا بـەڵام وەك هەڵوێـستێك دوورەپـەرێزی لـەحیزب هەڵبـژارد. چـەند سـاڵی نـەبرد ئـەوەی مـام عـەزیز بەمەترسـی دەزانـی لەسـەر حیزبەکـەی ڕووی دا، بەعـسیەکان ئـیتر کاریـان بـەحیزبی شـیوعی نـەما، کەوتنـەڕاوەدوونانیان بەسـەدانیان لـێ لەسـێدارەدان و وبەهـەزارانیان لـێ زینـدانی کـردن، ئـەو بـارودۆخی راوەدوونانەهـەتا روخـانی یـەکجارەکی بەعـسیەکان لەعیراق هەر درێژەی هەبوو.

لای مام عـەزیز خـەبات کۆتایی نـەدەهات، ئـەو هـەردەم خەونی بەهاتنەدی کۆمەڵگایەکی مرۆڤدۆستەوەدەبینی کەئازادی و سەرورەری و دادپـەوەری کۆمەڵایـەتی تێدا بەرقەراربێ، هـەر لـەو پێناوەشدا چووەرێزی حیزبێك و لـەپێناو حیزبەکەشـدا سـاڵی ١٩٤٨ سـێ سـاڵ چـووەزیندان سـاڵانێکی زۆری ژیانیـشی بەدەربـەدەری گوزەراند، هـەتا دوارۆژی ژیانیشی خـۆی بەخـەباتگێڕی ئـەو حیزبـەدەزانی، تەنانـەت شانازیـشی بـەوەدەکرد کەسەرەڕای ئەو هەموو نوشوستیانەش ئەم ئیستیقالەی لەحیزب نەداوە!! ئەو حیزبەی مام عەزیز غەفور بەریشی سپیەوەبەدڵ و بەگیان بەرگری لێ دەکرد، ئەو حیزبـەی پـاش ئـەوەی هـەواڵی کۆچـی دوایـی ئـەو کۆنەئەندامەتێکۆشەرەی بەسەرکردایەتیەکەی راگەیەنرا، نـەك هـەر لەمەراسـیمی پرسـەی کۆچـی دواییەکـەی ئامادەنـەبوون، تەنانـەت یـەك وشەشـیان لـەبڵاوکراوەو راگەیاندنـەکانیان لەسـەر ئـەو کۆنەئەندامەتێکۆشـەرەی خۆیان نەنووسی!!!

ئاخۆ دەبێ چەند تێکۆشـەری تری وەك عـەزیز غەفوور ناویـان چـووبێتەناو لیـستەی فـەرامۆش کـراوان و لەخودی خۆیان زیاتر کەسێك نەبێ ئاوڕ لەرابردووی پڕ لەخەبات و قوربانی دانیان بداتەوە؟ بەڵام دیارەئامانجی کەسـانی تێکۆشـەری وەك مـام عـەزیز لـەپێناوی نـاو دەرکـردن و شـۆرەت پەیـدا کـردن نەبووەبەقـەد ئـەوەی خزمـەتی گـەل و نیـشتیمانەکەی خۆیـان بەئـەرکی سەرشـانی خۆیـان زانیـوەو وەك ڕۆڵەیـەکی دڵـسۆزی نیشتیمان ئـەرکی مێژوویی خۆیان جێبـەجێ کردووە. بـەڵام ئـەرکی ئێمەئەوەیەکەتێکۆشـان و قوربـانی ئەوکەسـانەلەبیر نەکـەین کەلەرۆژەسـەختەکاندا گیـان لەسـەر دەسـت خـەباتیان کردووەبـۆ هێنانـەدی ئایندەیەکی رووناك بۆ نەوەی دوای خۆیان، بەڵێ ئەرکی ئێمەئەوەیەکەسانی وەك مام عەزیز غەفور لەبیر نەکەین..





# کۆچی دوایی جەنابی مامۆستا شێخ عیزەدین حوسینی



لە بەهاری سالی ۱۹۳۱ ی زایینی لە شاری بانە لە بنەماڵەیەکی ئایینی لە دایك بوو و لە سالی ۱۹۳۸ لە گوندی سییی دەرسی فەقیەتی خوێندوە و دوای ماوەیەك لە گوندەکانی دەوروبەری بانە و مەریوان خوێندنی مەلایەتی درێژە پێدا لە سالی ۱۹٤۳ بۆ پەرەپێدانی خوێندنەکەی دەچێتە ناوچەی موکریان و لە و ساڵەوە دەبێتە ئەندامی کۆمەڵەی ژێکاف لە ناوچەی بۆکان و چالاکی سیاسی دەست پێی دەکات و لە رێو رەسمی هەڵدانی ئالای کۆماری کوردستان بەشداری دەکات . لە سەردەمی دەسەلاتی کۆماری کوردستان لە مەهاباد لای کەسایەتی ئاینی بە ناوبانگی ناوچەکە ( مەلا حوسێنی مەجدی ) لە سەر خوێندن بەردەوام دەبێت تا سالی ۱۹٤۸ کە مۆڵەتی مەلایەتی وەردەگرێت و دەبێتە پێشنوێژی گوندی کانی ڕەشی ناوچەی موکریان . مامۆستا لە سالانی پەنجا بەدواوە کە بزووتنەوەی جوتیاران لە ناوچەکە سەرهەڵدەدات و لەبرە لایەنگیری بۆ جوتیارانی ناوچەکە و هەڵوێستی ئازایانە و دژ بە خورافاتی ئایینی ناچار بە جێ هێشتنی شوێنی خۆی دەبێت . هەر بۆیە لە سالی ۱۹۵۸ وەك مامۆستایای وانە بێژ لە قوتابخانەی ئایینی مزگەوتی سووری مەهاباد دادەمەزرێ وە دەست دەکات بە پەروەردەکردنی قوتابی . یەکێك لە قوتابیانی ناسراوی ئەو کە دواتر بو بە تێکۆشەری ناوداری گەلەکەمان ( مەلا ئاوارەی شەهید ) ە . لە سالی ۱۹٦۸ مامۆستای مەلا شێخ عیزەدین دەبێتە ئیمامی مزگەوتی مەهاباد و هەر لەو سالانەدا بۆ ماوەیەکی کورت بە هۆی پەرەگرتنی جولانەوەی رزگاری خوازی کوردستان زیندانی دەکرێ و مامۆستا هیچ کات پەیوەندی خۆی لە گەڵ تێکۆشەران و خەباتکارانی نەتەوەکەی دانەبری و بەردەوام لە کاتی وانەووتنەوەدا هەوڵی دەدا کە قوتابیەکانی بە بیر و هۆشی کوردایەتی جۆش بکات و دەرد و ئازارەکانی نەتەوەکەیان بەبیر بێنیتەوە و هەر

ئەمەش وای کرد کە لە پووشپەری ساڵی ١٩٧٨ لە ڕێوڕەسمی ناشتنی تەرمی تێکۆشەری کورد عەزیزی یوسفی کە بە نەخۆشی لە زیندان ئازاد کرابوو وتارێکی گرنگ پێشکەش بکات ئەمە ببێتە دەسپێکی بزووتنەوەی جەماوەری خەڵکی کوردستان لە دژی حکومەتی شا . پاش ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتی ڕۆڵی مامۆستا شێخ عیزەدین وەك کەسایەتێکی ئایینی زیاتر بەرچاو کەوت و لەبەرئەوەی کە دەسەڵاتدارانی کۆماری ئیسلامی و بڕیاردەرانی کۆمار نوێنەریەیان مەلا بوون بۆ کێشە و چارەسەری گرفتەکان ڕوویان لەو دەکرد ئەوەش وای کرد کە مامۆستا ببێتە سەرۆکی دەستەی نوێنەرایەتی گەلی کورد کە لە حیزبە سیاسیەکانی بەشدار لە خەباتدا لەو سەردەم پێکهاتبوو . مامۆستا لە زۆربەی وتووێژ لەگەڵ نوێنەرانی حکومەت بەشداری کرد . مامۆستا شێخ عزیەدین بۆ ڕێکخستنی بیروباوەری سیاسی خۆی ناوەندێکی کردەوە بە نێوی دەفتەری مامۆستا شێخ عیزەدین کە لە زۆربەی شارەکانی کوردستان نوسینگەی هەبوو . دوای ئەوەی کە ڕژێمی کۆماری ئیسلامی ئێران دەستی گرد بە سەر ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ، هێزەسیاسییەکانی کورد ناچار بە پەرینەوە لە سنوور بوون مامۆستا شێخ عیزەدین لە باشووری کوردستان بۆ ماوەیەك ناوەندێکی هەبوو کە هاوکاری لە گەڵ هێزە سیاسییەکان دەکرد . لە ساڵی ١٩٨٢ مامۆستا باشووری کوردستان بەجێ دێڵێت و لە سوید دەگیرسێتەوە . لە ماوەی ژیانی لە ئەوروپادا بۆ زۆر بۆنەی سیاسی و نەتەوەی پەیامی دەنارد و گفتوگۆی لە سەر مافە نەتەوەیەکانی کورد لە گەڵ میدیاکان دەکرد ، دوای دەرکەوتنی مامۆستا لە میدیاکان لە سیپتەمبەری ٢٠١٠ بوو لە تەلەفزیۆنی فارسی بی بی سی کە دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو وە بیروبۆچوونەکانی مامۆستا لە سەر کوردستان و ئێران و هەروەها ڕاوبۆچوونی لە سەر ئازادی و دیموکراسی و ئایین و پرسی ژن تێدابوو . لە سەرەتای مانگی شوباتی ٢٠١١ مامۆستا نەخۆش کەوت و پاش چەند ڕۆژێك کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەشی هێنرایەوە باشووری کوردستان و بەرێز و حورمەتی لە گۆڕستانی گردی سەیوان بەخاك سپێردرا . لە ڕێو ڕەسمی گەڕانەوەی تەرمی مامۆستا بۆ کوردستان هەموو هێزە سیاسییەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان و جەماوەری کورد پەورروەری باشوور هەروەها کەسایەتی حیزبی و حکومیەکانی هەرێمی کوردستان بەشدار بوون و ڕێزیان لە خەباتی چەندین ساڵەی مامۆستا مەلا شێخ عیزەدین گرت .

**بە ڕێزان لە بنەماڵەی تێکۆشەر، مامۆستای کۆچکردومان جەنابی مامۆستا شێخ عیزەدین حوسێنی ڕێزدار کاک بابە شێخ حوسێنی سکرتێری سازمانی خەبات**

بە کۆچی دوایی ماموستای خەباتکار و سەرکردەی ئایینی و سیاسی کورد لە ڕۆژهەلاتی کوردستان دلگران بووین ، تکایە سەرخۆشی ئێمە لە ستافی هەردوو گۆڤاری"کوردستان سەدەی٢١، لەیلا قاسم - لەیلا زانا " قبول بفەرمون

مومتاز حەیدەری

berez kak mumtaz haedery. supastan dekem ke hawbashitan kirduin ba boney kochy diwaey mamosta shex lezaden husaini.

**babashex husaini**

# کۆچی دوایی تێکۆشەرێکی دێرینی کوردستان

# مامە غەنی بلووریان


غەنی بلووریان

لە ساڵی ١٩٢٤ لە مەهاباد لە دایک بوو لە سەردەمی لاوێتی بوو بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ژێکاف و بەشدار لە کۆماری کوردستان . ئەندامی رێکخراوی لاوانی دیموکراتی کوردستان بوو لە سەردەمی کۆمار و لە شانۆی ( دایکی نیشتیمان ) کە لە سەردەمی کۆماری مەهاباد نمایش کرا ، رۆڵی ئەکتەری هەبوو . مامەغەنی لەو پۆلە لاوانە بوو کە حکومەتی کۆماری کوردستان بۆ خوێندن رەوانە وڵاتی شۆڤیەتی جاران کردن و دوای تێکچوونی کۆماری کوردستان مامەغەنی بلووریان یەکێك بوو لەوانەی کە گەڕایەوە کوردستان و پاش ماوەیەك لە گەڵ هاورێیانی دەستی دایەوە زیندوکردنەوەی رێکخراوەکانی حیزبی . لەو سەردەمەدا بۆ یەکەم جار لە گەڵ دەستێك لە تێکۆشەرانی ئەو کاتی حیزبی دیموکراتی دەگیرێ و ماوەی زیاتر لە سێ ساڵ لە بەندینخانە دەمینێتەوە . ئێستا ساڵێك بە سەر ئازادبوونی دا تێپەر نەبوو کە جارێکی تر قۆڵ بەست دەکرێ و رەوانەی زیندان دەکرێتەوە و تا دوایین ساتەکانی رژێمی حەمەرەزاشا بە خۆراگری و هەستی بەرزی کوردانە ، زیاتر لە بیست ساڵ لە تەمەنی خۆی تێپەر دەکات . گیرانی ئەمجارەی مامەغەنی حوکمی ئیعدامی پێوە بوو بەڵام لە سەر داواکاری نێودەوڵەتی و گوشارێکی کە حکومەتی شا بە بۆنەی ئیعدامی تێکۆشەران و لە ئاستی جیهانی دا کەوتە سەری مامەغەنی بلووریانیش لە گەڵ ئاخر دەستەی ئەفسەرانی

حیزبی توده حوکمی ئیعدامەکەیان بۆ کرا بە ـزیندانی هەتا هەتایی کە لە سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێراندا ئازاد دەبێت . مامەغەنی لە ڕۆژهەلاتی کوردستان بە سوونبولی خۆڕاگری ناو زیندانەکانی ڕژێمی حەمە ڕەزا شا ناسراوە کە لە هەموو ئەو سالانی دا کە ئەو لە زیندان بوو بەرخودانی لە سەر زاری خەلك بە نموونە دەهاتووە ، دوای ئازادی لە زیندان لە سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران مامە غەنی بلووریان لە گەلْ پێشوازیەکی کەم وێنەی جەماوەری لە مەهاباد کە هەموو خەلکی شار و شارۆچەکانی دەوروبەر تێدا بەشدار بوون ڕووی لە مالەکەی خۆی کردوە .

مامە غەنی لە سەرەتای شۆرشی گەلان وەك ئەندامی دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەشداری چالاکانەی خەبات و تێکۆشانی گەل بوو . سالی ١٩٨١ مامە غەنی بلووریان لە گەلْ چەند هاوبیر و باوەڕی خۆی لە ریزی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کشایەوە و بەشێوەیەکی تر درێژەی بە خەبات و تێکۆشان دا . پاش ماوەیەك کە دەرفەتی چالاکی لە ناوخۆی وەلات نەما و کۆماری ئیسلامی سروشتە دزێوەکەی بە یەکجاری دەرکەوت هیچ گومان لە سەرکەوت کاری و خوێنرێژی و دژ بە گەلی بوونی دا نەما ، مامە غەنی بلووریان ناچار بە تەرکی ولات بوو کە پاش ماوەیەك گیرسانەوە لە باشووری کوردستان بەرەو ئەوروپا چوو . مامە غەنی بیرەورییەکانی خۆی لە کتێپێکدا بە ناوی ( ئالە کۆك ) بلاو کردۆتەوە لەم سالانەی دوایشدا وتوێژێکی دوور و درێژی لە سەر رابردوو و خەباتی خۆی لە نێو حیزبی دیموکراتی کوردستان لە گەلْ برایمی فەرشی کردووە کە بلاْ و بۆتەوە . بە داخەوە مامەغەنی لە رێکەوتی ٢٠١١/٣/٩ دلّە خۆراگرەکەی لە وەستان کەوت و چووە ریزی نەمرانەوە . لە سەر وەسیەتی خۆی تەرمی بەرێزی گەڕایەوە باشووری کوردستان و لە هەولێری پایتەخت بە خاك سپێردرا. سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە پەیامی سەرە خۆشیدا دەلێت : کە گەلی کورد بە مردنی مامە غەنی سەمبوولێکی خۆراگری و ئێمەش دۆستێکی دلسۆز و بە وەفامان لە دەست چووە .


غەنی بلووریان

# سیاسەتی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵات

نووسینی : د.ئاراس فەریق زەینەڵ / زانکۆی سلێمانی



## سیاسەتی ئەمریکا لەڕۆژهەڵات

### یەکەم/ستراتیژی ئەمریکا

وێنە کێشانی ستراتیژیەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەی کارێکی ئاسان و بێ بەرنامە نییە، بەڵکو پلانداناو دارشتنی ئەو سیاسەتە یاخود ستراتیژییە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ دادەنرێت نەك بۆ ساڵ و دوان، هاوکات ئەو کەس و گروپ و لایەنانەی دەسەڵات و ئیدارەی نویێ ئەمریکا دەگرنە دەست، ئەرکە لە سەریان ، لەگەڵ بۆچوون و سیاسەتی ئەو ئیدارە نوێیە ئەو ستراتیژییە جێبەجێ بکەن، کە خاوەن بڕیار لە ئەمریکا دایناوە ، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئۆباما ئەو خەونە گەورەیەی ئەمریکا بەدی بهێنێت، کە پێش ئیدارەکەی ئۆباما وێنەی بۆ کێشراوە بەتایبەت لە پاش تەواوبوونی جەنگی ساردو ڕووخاندنی یەکێتی سۆڤیەت و مانەوەی ئەمریکا وەك تاکە زلهێزی جیهان.

زۆرێك لە چاودێرانی سیاسی پێیانوانییە، کە ئۆباما لەم سیاسەتە یاخود ستراتیژیەتە هەڵبێت و جێبەجێی نەکات و ئەمریکا گۆشەگیر بکات و دایبڕێت لە جیهان وەك ئەوەی (مۆنرۆ) لە ساڵی (١٨٢٣ ) لە چوارچێوەی بنەماکانی خۆی، کە بە بنەماکانی مۆنرۆ ناسراوە ئەنجامیدا، بنەمای مۆنرۆ بنەمایەکی نەتەوەیی بوو، حزبی کۆمارییەکان (الجمهوری) کاری پێدەکرد، بەم هۆیەشەوە بوونە خاوەنی عەقڵی خەڵکی، ئەمەش لە هەڵبژاردنی ساڵی (١٨١٦) دەرکەوت کاتێك پاڵێوراوی کۆمارییەکان (جایمس مۆنرۆ) بوو بە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە ماوەی سەرۆکایەتی دووەمی مۆنرۆدا، حکومەتی ئەمریکی بیردۆزەیەکی نوێی دانا، کە پێی دەوترێت بنەمای مۆنرۆ (مبدأ مونرو )، کاریگەریەکی گرنگی هەبوو لەسەر گونجاندنی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا، ئەم بنەمایە لەو بەیاننامە ساڵانەیەدا هەبوو، کە سەرۆك لە مانگی ئەیلول ئاراستەی کۆنگرێسی دەکات، ئەوەبوو مۆنرۆ لە ئەیلولی ساڵی( ١٨٢٣ ) ئەم بنەمایەی ئاراستەی کۆنگرێس کرد، کە دوو بۆچوونی لە خۆگرتبوو:

یەکەمیان: نەهێشتنی داگیرکردن لە نیوەی ڕۆژئاوای گۆی زەوی دا دیارە مەبەست ئەمریکای لاتینە لەلایەن وڵاتە ئەوروپییەکانەوە.

دووەمیان: ڕێگرتن لە وڵاتە تازەکان و هەڕەشەکردن لە

سەربەخۆییان، هەروەها ئەمریکاش لە کاروباری تایبەتی وڵاتە ئەوروپییەکان خۆی بە دوور بگرێت.

گەشەکردنی ئەم دوو بیرە شتێکی لە ناکاوو نوێ نەبوو، بەڵکو لە مێژەوە لە مێشکی (بیری) ئەمریکییەکاندا بوونی هەبوو. دەتوانین ئەم بیروباوەڕە لەوەدا ببینین کاتێ (تۆماس جیفەرسۆن) بەرامبەر بە گواستنەوەی خاوەنداریێتی (لویزیانا) لە ئیسپانیاوە بۆ هەر وڵاتێکی جگە لە ئەمریکا نارەزایی دەربڕی، جگە لەمەش (جورج واشنتۆن) لە ساڵی (١٧٨٩) هاوکاری شۆڕشی فەرەنسی نەکرد، هەروەها لە ساڵی (١٨١٩) توانییان فلۆریدا بەرامبەر بە (٥) پێنج ملیۆن دۆلار لە ئیسپانیا وەربگرن، پێش ئەوەی هەر وڵاتێکی تر داوای ئەم شوێنە بکات، بەڵام بیروبۆچوونی دووەم بیرێکی دابڕاو نامۆ بوو، دەتوانین لە دوا وتاری جۆرج واشنتۆندا تێبینی شوێنەواری ئەم بیرە بکەین، لە کاتێکدا نزیک بوو لەوەی ماوەی سەرۆکایەتی یەکەی تەواوبێت، ئەو نەتەوەکەی ئاگادار کردەوە لە دەست تێوەردانی کاروباری وڵاتە بیانییەکان و هاوپەیمانانی لە گەڵیاندا، چونکە ئەوە پەلکێشیان دەکات بۆ شەڕو ئاژاوە، دوا بە دوای ئەمەش (تۆماس جیفەرسۆن) خەڵکی لەمە ئاگادار کردەوەو تا ئێستاش ئەم هەستە هەر ماوە.

لە جەنگی جیهانی یەکەمدا (١٩١٤ – ١٩١٨)، ئەمریکییەکان بەو وڵاتانەشەوە، کە لە گەڵیدا دژ بە ئەڵمانیا شەڕیاندەکرد پێیانیان دەووت (شەریك) نەك (هاوپەیمان)، ئەمەش لەگەڵ ئەو بیروبۆچوونە ڕێك دەهاتەوە، کە لە بنەمای مۆنرۆدا باسکرابوو.

ئەم بیری دەست تێوەرنەدانە هۆکارێکی تریش کاری لێکرد، کە بریتیی بوو لە مافی چارەنووس. گەلی ئەمریکی لەگەڵ گەلە ئەمریکییەکانی تری ژێر دەستی ئیسپانیا کاتێك داوای سەربەخۆییاندەکردو ئەم هەوڵەی داگیرگەکانیان بە بەشێك لە بزوتنەوەی دیموکراتی دادەنا، کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی داگیرکەران.

بۆ دەرکەوتنی ئەم بیرە (بیری دەست تێوەرنەدان) و پەیڕەوکردنی بە شێوازێکی ئاشکرا لە بیری مۆنرۆداو چەسپاندنی لە بیری ئەمریکییەکاندا کاتێکی زۆری ویست، هۆکاری سەرهەڵدانیشی زۆر بوو، لەوانە ڕوسیا هەستا بە داواکردنی زەویە درێژکراوەکانی باشووری (ئالاسکا) هەتا هێڵی پانی (٥١) لە هێڵەکانی پانی، ئەمە لە کاتێکدا ویلایەتە یەکگرتووەکان بانگەشەی ئەوەی دەکرد ئەم ناوچانە موڵکی خۆیەتی و وای دەبینی لە بەرژەوەندی ئەمریکادایە، بۆیە هەڵوێستی خۆی بەرامبەر ئەم کێشەیە بە ئاشکراو بەبێ پێچ و پەنا دەربڕی، ئەو هەڵوێستەش ڕازی نەبوون بوو بە هەر داگیرکردنێك، کە لە جیهانی نوێدا لەلایەن هەر وڵاتێکی ئەوروپییەوە ڕووبدات، هۆکارێکی تری ئەم بیرە دەگەڕێتەوە بۆ سەربەخۆبوونی ویلایەتەکانی ئەمریکای باشوور لە ساڵی (١٨٢٢) کە دوای تێکۆشانێکی زۆر دژی ئیسپانیا بە دەستیان هێنابوو، لە پاشاندا درێژبوونەوەی ئەم تێکۆشانە لە ئەمریکای ناوەڕاست و مەکسیك کارێکی وایکرد، کە هیچ نەما لە دەستی ئیسپانیادا جگە لە (پورتوریکوو کوبا)، ئەمریکییەکان پێشوازیانکرد لەم بارودۆخە نوێیەی ئەمریکای باشوور و وایاندادەنا گەلانی ئەمریکای ئیسپانی لە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆی و هەمان ڕێبازی ئەمانیان وەرگرتووە هەندێك لە بیرمەندە ئەمریکییەکان وایاندەبینی، کە ئەم کۆمارە نوێیانە لە جیهانی نوێدا شێوازێکی برایانەی باوەڕبوون بە ئازادی و پەیوەندییە ئابوورییەکان لە نێوانیاندا هەیە، بۆیە دەیانویست پارێزگاری لە سەربەخۆیی ئەو کۆمارانە بکەن و



هەر کارێک دووربخەنەوە کەدەبوویە هۆی تێکدانی هاوکاری نێوان ئەم دوو کۆمارانەو ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەڵام هەندێک لە وڵاتە ئەوروپییەکان لە بڵاوبوونەوەی دیموکراتی و گیانی شۆڕشگێڕی لەنێو میللەتەکەیاندا، دەترسان چونکە دەبوویە هۆی لە دەستدانی دەسەڵاتی پادشاکان، وایاندەبینی پێویستە هێزەکانیان یەکبخەن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم شۆڕشانە لە هەرشوێنێک سەر هەڵبدەن، بۆ ئەم مەبەستە هاوپەیمانییەک پێکهات لە نێوان(ڕوسیا و پروسیا و نەمسا)، کە ناسرا بە هاوپەیمانی پیرۆز (الحلف المقدس)، فەرەنساش لە پاش گەڕانەوەی بنەماڵەی بۆربۆن بۆ سەر دەسەڵات هاتە ناو ئەم هاوپەیمانییەوە.

سەرەتای کارەکانیان ڕێگەپێدانی نەمسا بوو بۆ سەرکوتکردن و لەناودانی بزوتنەوە دیموکراتییەکان، کە لە دوو دەوڵەتی ئیتالیا (الدولتين الإيگاليتين) ناپۆلی و پیدمونت - سەریان هەڵدابوو، لە ساڵی( ١٨٢٢) هاوپەیمانەکان کردەوەکانی کۆمارەکانی ئەمریکییەکانیان تاوتۆی کرد و باسی چۆنیەتی گەڕانەوەیانکرد بۆ ژێر دەستی ئیسپانیا، ئینگلترا لەم کردەوەیەی وڵاتە هاوپەیمانەکان ترسا، چونکە بە هەرەشەیەکی دەزانی بۆ سەر ئەو پەیوەندییە بازرگانییەی کە لەگەڵ کۆمارەکانی ئەمریکای باشووردا هەیبوو.

لەبەر ئەم هۆیە وەزیری دەرەوەی ئینگلترا (جورج کایننغ) وای دەبینی کە پێویستە لەگەڵ حکومەتی ئەمریکادا دەقێک دەربکەن، کە تێیدا دژی هەر دەست تێوەردانێک یا داگیرکردنێکی نوێ بوەستنەوە لە ئەمریکای ئیسپانیادا، حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تەنها ئەو کارانەی بە ئەنجامگەیاند لە ڕێگەی (بنکەی دەست تێوەرنەدان)ەوە، لەو کردەوانەی لە بنەمای مۆنرۆدا کە سەری هەڵدا و پەیوەست بوو بە بڕیارەکانی ئەمریکاوە وتووبوی (پێویستە لە ئێستا بە دواوە وادانەنرێت ئەمریکای لاتین ببێتە جێگەیەک بۆ داگیرکردن لەلایەن هەر وڵاتێکی ئەوروپییەوە).

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وایدادەنا هەر دەست تێوەردانێک لەلایەن ئەم دەوڵەتانەوە لە کاروباری وڵاتەکانی ئەمریکای لاتین و فشار خستنە سەریان بە خراپە بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە، بەمشێوەیە دەبینین گیانی کەنارگیری (الاعتزالية) لە ئەمریکادا بە شێوازێکی ڕوون دەرکەوت و کاریگەری لەسەر سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا ڕەنگی دایەوە ئەمەش لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی دەرکەوت و ئەوەی ڕەتکردەوە لە کۆمەڵەی گەلاندا (عصبه الامم) بەشداربێت و کێشە نێو دەوڵەتییەکانی وەلانا وەک دەیبینین.

جێی باسە ڕێگە نادرێت بە ئۆباما دووبارە ئەمریکا گۆشەگیر بکات و سیاسەتی دابڕان (الانعزال پیادە بکات، لە کاتێکدا ئەمریکا بە شێوەیەکی گشتی پاڵەوانی هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم بووە، ئەمە جگە لە جەنگی سارد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەمریکا سەدەی ڕابردووی بە سەرکەوتوویی تەواو کردووە و خاوەن گەورەترین ئیمراتۆریەتی سەردەم بووە، بۆیە وا چاوەڕوان دەکرێت ئۆباما و ئیدارەی نوێی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەو ستراتیژییەی، کە پێش ئیدارەکەی ئەوان داڕێژراوە بێ زەرەردان لە بەرژەوەندی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە جیهاندا جێبەجێبکرێت، چونکە کاتێک لە ساڵی( ٢٠٠٢) بڕیاری شەڕی عێراق درا ئۆباما دژی ئەم بڕیارە بوو، بەڵام لە ساڵی( ٢٠٠٨) و لە کاتی پڕوپاگەندە بۆ هەڵبژاردنەکان لە ژێر فشاری (ڕاستڕەوەکانی) نێو حزب و ئیسرائیل و ڕەخنەی کۆمارییەکاندا لێدوانەکانی گۆڕانی بەسەرداهات، ئەوەبوو کە پێشتر لە کاتی هەڵبژاردنەکان دەیووت لە ماوەی (٦) شەش مانگدا هەموو

ـێزە سەربازییەکانمان لە عێراق
ـکشێنمەوە. کەچی کاتێك بوو بە
ـەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی
ـمریکا لە یەکەم وتاری خۆی کە
ـوەی (٢٠) خولەکی خایاندو لە
ـ مبەر نزیکەی (٢) ملیۆن
ـمەورو کۆنگرێسی ئەمریکا وتی
ـیعە بەرپرسانە (المسئول) و لە
ـێراق دەکشێینەوە بەپێی
ـلانەکانی فەرماندە
ـەربازییەکانمان لە عێراق،
ـەمەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت
ـەرج نییە ئەوەی ئۆباما لەکاتی
ـەڵبژاردنەکان بانگەشەی بۆ دەکرد
ـوانێت هەمووی جێبەجێ بکات،
چونکە خاوەن بڕیار لە ئەمریکا
ڕێگە بە هیچ سەرۆکێك نادات
ـلان و بەرنامەو بەرژەوەندیی و
ـتراتیژی ویلایەتە
ـەکگرتووەکانی ئەمریکاو
ـاوپەیمانانی تێکبدات".

## دووەم/ سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر بە عێراق

دۆسیەی عێراق ئاڵۆزترین
هاوکێشەی سیاسی ئەمریکای
پێوە سەرقاڵ کردوە بەتایبەت لە
ماوەی سەرۆکایەتی (جۆرج.W.
بۆش) کە عێراق خاوەن کێشەی
جۆراوجۆرو ئاڵۆزو چارەسەر
نەکراوو هەمبەری هێزەکانی
گۆڕەپانی سیاسی عێراق بە کوردو
شیعەو سوننە هتد...بوو، بە
تێپەڕبوونی ئەو ڕۆژە سەختانەی
سەردەمی بۆش، بەڵام ئێستا لە
سەردەمی ئیدارەی نوێی ئەمریکادا
بە سەرۆکایەتی ئۆباما دەتوانین
بڵێین تا ئاستێکی زۆر عێراق بە
بەراورد لەگەڵ ساڵانی ڕابردوودا،
لەو تەنگژانەی تێکەوتبوو
بەتایبەتیش کێشە ئەمنییەکان
ڕزگاری بووە، چونکە ئیدارەی
نوێی ئەمریکا باس لە سیاسەتێکی
نوێ دەکات لە عێراق بەتایبەتی
پاش واژوکردنی ڕێککەوتنامە
ئەمنییەکەی نێوان هەردوولا کە هەر
یەك لە عێراق و ئەمریکا لە کۆتایی
ساڵی (٢٠٠٨) ڕێککەوتنامەیەکیان
ئیمزاکرد تێیدا هاتووە دەبێت
هێزەکانی ئەمریکا پێش
ساڵی(٢٠١١) خاکی عێراق
جێبهێڵن، ئەوەش جێگای
خۆشحاڵیە بۆ زۆرێك لە
عێراقییەکان بۆ گێڕانەوەی
سەروەری وڵاتەکەیان کە لە ساڵی
(٢٠٠٣) وە هێزەکانی ئەمریکاو
هاوپەیمانانی تێدایە ، کشانەوەی
هێزەکانی ئەمریکا کەمکردنەوەی
ڕۆڵی سەربازی و لێپرسراوانەی
ئەمریکا دەبێت بەرامبەر هێزەکانی
عێراق، بێگومان ئەمریکا لە
کاتێکدا گەیشتوەتە ئەم ئەنجامە
کە توندو تیژی تائیفی نێوان
شیعەو سوننە تا ئاستێکی زۆر
لاواز بووە، هاوکات تاڕادەیەك
شکست هێناوە بە دیاردەی تیرۆر
ئەویش بە پووکانەوەی تواناکانی
ڕێکخراوی ئەلقاعیدە لە عێراق،
لەگەڵ ئەوەی باراك ئۆباما لە
وتارەکەیدا ئاماژەی کرد بە
کشانەوەی سوپای ئەمریکا لە
عێراق، بەڵام کشانەوەی خێراو
کتوپڕ ، نەك تەنها زیان بە
بارودۆخی عێراق دەگەیەنێت ،
بەڵکو بەرژەوەندییەکانی
ئەمەریکاش لە ناوچەکەدا دەخاتە
مەترسیەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئۆباما
دەتوانێت وردە وردە ژمارەی
سەربازەکانی ئەمریکا کەمبکاتەوە
و، ڕۆڵی شەڕکردنیان سنوور دار
بکات و بە شێوەیەکی زۆر
بەرپرسیارێتی بخاتە ئەستۆی
هێزە عێراقییەکان، پێویستە کەم
کردنەوەی ژمارەی سەربازەکان بە
کارامەیی و زیرەکانە جێبەجێکرێت
، بۆ ئەوەی مەترسی هەڵگەڕانەوەی
بەرەو پێشچوونی ئێستای
لێنەکەوێتەوە، ئەگەر ئەمە
پیشاندانی دیوی مەسەلە
ئەمنییەکان بێت وەك ئەوەی کە
عێراق لە ڕووی جێگیریی و
ئاسایشەوە هەنگاوی گەورەی
ناوە، بەڵام لە ڕووی سیاسییەوە
چەند کێشەیەکی چارەنوسساز
ماون وەك کێشەی کوردو شیعەو
سوننەو ئەوانی تر، ئەگەر ئەم
کێشانە هەروا بمێننەوە ، دوور
نییە جارێکی دی عێراق
ڕووبەڕووی گێژاوو بارودۆخی
ناهەمواروو پڕ لە قەیرانو کێشەی
چارەسەر نەکراوبێتەوە و





مێژوویەکی خوێناوی دووبارە بکاتەوە.

## سێهەم/ سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر بە کورد

لە ئەنجامی ئەو بارودۆخەی، کە ڕۆژهەلاتی تێدایە بە شێوەیەکی گشتی و کێشەی کورد لە عێراق بەتایبەتە، هەروەها هاوکێشە سیاسیەکانی نێو خودی عێراق لە ململانێ و توندو تیژی و بەڵێندان و پاشگەز بوونەوە لە بەڵێنەکان و سستی جێبەجێکردنی بەندەکانی دەستور لەمەڕ کێشەکانی کورد بەتایبەت کێشەی کەرکووک و ناوچەجێ ناکۆکەکان و ناڕوونی سیاسەتی ئیدارەی ئەمریکا بەرامبەر کورد وەك هاوپەیمانێك لە ناوچەکە، وەك ئەوەی لەگەڵ تورکیاو عەرەب دەکرێت وەهاش لەگەل کورد بکرێت، بەلام ئەو هیواو ئاواتەی لای کوردەکان هەیە بەرامبەر دەسەلات و بوونی ئەمریکا لە عێراق و ناوچەکە بە پێچەوانەوە لای ئیدارەی واشنتۆن بەدیناکرێت، چونکە تا ئێستاش ئەمریکا بە گەل و حکومەتی کوردی نەوتوە هاوپەیمانی ئێمەن، جگە لەوەی زۆرجار دەبیستن ئەمریکا دەڵێت کورد لە وەفادارترین دۆستەکانی ئێمەن لە عێراق، ئەمەش بۆ خۆی زەنگێکە بۆ سەرکردایەتی کورد، چونکە ئەمریکا کورد بە هاوپەیمان و شەریك نازانێت ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا لە عێراقێکی پڕ لە کێشەو ئاژاوەدا بۆ ئێمەی کورد مەترسیدارە لەوەش زیاتر لای هەموان ئاشکرایە ئێمەی کورد بە درێژای مێژووی حکومەتەکانی عێراق لە ساڵی (١٩٢١) تا ئەمڕۆ حکومەتە یەك لە دوایەکەکانی عێراق لەگەڵ میللەتی کورد ڕاستیان نەکردووە، چونکە حکومەتەکانی عێراق درکیان بە قورسایی کێشەی کورد نەکردووە، هەرچەندە لە سەردەمی (عبدالكريم قاسم)دا باسی مافەکانی کورد کراوە، بەلام بە هیچ شێوەیەك نەچوەتە بواری جێبەجێکردنەوە، هەروەها لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق لە ساڵی(٢٠٠٣) بە دواوە، سەرکردایەتی کورد لە پرۆسەی ئازادی عێراق و دانانی دەستورو دامەزراندنی یەکەم حکومەتی فیدراڵی لە عێراق و چارەسەرکردنی کێشەکانی نێو خودی عێراق لە نێوان گروپە جیاوازەکاندا بە هەوڵ و هیمەتی زۆری سەرکردایەتی کورد لە بەغدا ڕۆڵی بەرچاو وگرنگیان گێڕاوە، لە بەرامبەردا کورد بۆ خۆی هیچ دەستکەوتێکی دڵخۆشکەری نیە لەچاو هەموو ئەو هەوڵ و چالاکی و ماندووبوون و قوربانییە زۆرانەی، کە لەو پێناوەدا پێشکەش کراون، هاوکات ئێمەی کورد قایل بووین بەوەی لەپێناو پاراستنی یەکێتی خاکی عێراق و ڕێگرتن لە دابەشبوون و هەڵوەشاندنەوەی عێراقدا کێشەکەمان لە چوارچێوەی عێراقدا چارەسەر بکرێت، کەچی عێراق قایل نییە کێشەکانی ئێمە بەتایبەت کێشەی کەرکوك چارەسەر بکات، دەبێ ئۆبالی ئەم بارودۆخە ناهەموارە هەمووی بخرێتە ئەستۆی کێ؟ (ئەمریکا) کە بە وڵاتی خەونەکان ناسراوە و بتوانێت خەونی ئێمە بەدیبهێنێت لە چوارچێوەی قەوارەیەکی سەربەخۆدا، یاخود عێراق کە نایەوێت خۆی لە قەرەی کێشەی کورد بدات بە مەبەستی چارەسەرکردنی یەکجارەکی، یان خودی کورد دەیەوێت وەك ئەمریکیەکان بکات کاتێك لە ساڵی( ١٧٧٥ ) لە دژی بەریتانیا شۆڕشیان بەرپا کرد تاکو یەك ساڵ بەهیچ شێوەیەك بیریان لە سەربەخۆیی و جیابوونەوە لە بەریتانیای مەزن نەدەکردەوە، تا کێشەکان لە نێوانیاندا زیاتر ئاڵۆزبوون و شۆڕشەکە ماوەی (٨) ساڵی خایاندو لەو پێناوەدا قوربانیەکی زۆریاندا تا لە(٣-٨-١٧٨٣ )توانییان سەربەخۆیی ئەمریکا بەدەست بهێنن، بەلام ئێمەی کورد زۆر لەوە زیاتر قوربانیمان داوە کەچی دەستکەوتەکانمان لە مەترسیدایە، چونکە ئیدارەی نوێی ئەمریکا بە سەرکردایەتی ئۆباما لە یەکەم

...ی خۆیدا بەڵێنیدا کرد لە ...یەکی دیاریکراودا هێزەکانی ...ی لە عێراقدا بشکێنێتەوە، ...گەر ئەمەریکا بکشێتەوە، ڕەنگە ...خەکە لە دەست دەربچێت و ...ی و ناکۆکی و باری نائاسایش ...ت دابپۆشێ، بێگومان ئەم ...خە بۆ کورد زیاتر گەورەیە، چونکە تا ئێستا کێشەی کەرکوک ...چە دابڕاوەکانی دیکەی ...ستان چارەسەر نەکراون.

... ئێمەی کورد هەموو شتەکان ...ینە ئۆباڵی ئەمریکاو عێراق، ...کو خودی خۆمان کەمتەر خەمین ...ر چارەسەرکردنی کێشەکانی ...مان و هەموو هەوڵەکانمان بۆ ...و دەسەڵاتە، لە کاتێکدا دەبێت کێشەو مەسەلە ...نوسسازەکان بە گشتی و ...وەییەکانمان بە تایبەتی لە ...شەنگی هەموو مەسەلەکانەوە ...ت. دەبێ ئێمەی کورد ئەو ...ستیە باش بزانین وڵاتانی ...وسێی عێراق بە عەرەب و غەیرە عەرەب ڕێگە نادەن کێشەی کورد ...ە عێراق بە ئاسانی چارەسەر بکرێت. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەم ...گەرەکان دەبێت کورد پێگەی ستراتیجی خۆی لە عێراقدا لە بیر نەکات و ئەگەر هاتوو عێراق توانی حکومەتێکی دیموکراتی فیدراڵی ڕاستەقینە دروست بکات، ئەوا کوردیش دەتوانێت ببێتە خاوەن حکومەتێکی فیدراڵی بەهێز بە کەرکووکەوە لە چوارچێوەی ئەو عێراقە فیدراڵیە ڕاستەقینەییەدا، ئەوکات ئەمریکا ناچار دەبێت بە ڕەسمی دان بنێت بە حکومەتی هەرێمی کوردستانداو وڵاتانی دیکەی دونیاش لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا دان بنێن بە دەسەڵاتی کورددا.

## چوارەم/ ئەمریکا و کێشەی ئێران

پچڕانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی نێوان ئێران و ئەمریکا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧٩ بەتایبەت لە پاش سەرهەڵدانی شۆڕشی ئیسلامی و دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی ئێران، پچڕانی ئەم پەیوەندییە دبلۆماسیە تا ئێستا نزیکەی (٣٠) ساڵی خایاندووە، بەڵام چاودێرانی سیاسی بە هیوای ئەوەن ئیدارەی نوێی ئەمریکا بە سەرۆکایەتی ئۆباما کێشەکان بە ڕێگەو شێوەی دبلۆماسی چارەسەر بکات، لە کاتێکدا حکوومەتی ئۆباما لە سەرەتای وەرگرتنی دەسەڵاتیدا ئامادەیی خۆی نیشاندا بۆ ئەنجامدانی گفتوگۆی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئێرانداو هەوڵدان بۆ چارەسەری دبلۆماسیانەی ناکۆکیەکانی نێوانیان.

لە ڕاستیدا ئیدارەی پێشووی ئەمریکا بە سەرۆکایەتی جۆرج بۆش بیری لەوە نەکردبووەوە ئێران وەك وڵاتێکی دوژمن سەیری بکات، بەڵکو هەوڵی دەدا کێشەکان ڕاگرێت، بە پێچەوانەوە وا سەیری ئێرانی دەکرد کە، ڕۆڵێکی بەرچاو بگێرێت لە چوارچێوەی ستراتیژی نێو دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، بێگومان ڕۆڵی سەرەکی لە بەدیهێنانی ئامانجەکانی ئەمریکا نەك لە ڕووبەڕوو بونەوەیدا، چونکە ئێران بەهۆی هەڵکەوتەی ستراتیژی جوگرافی خۆی دەتوانێت لە زۆر لایەن ڕۆڵی کاریگەر ببینێ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بۆ نموونە ئێران ڕۆڵی هەیە لە ناو عێراق بە تایبەتی ناوەندو باشوری عێراق، جگە لە باشوری لوبنان وسوریا و بزووتنەوەکانی حەماس و حیزبوڵلا. هاوکات ئێران، وڵاتی ڕوسیا لە وڵاتە عەرەبیەکانی ناوچەی کەنداو جیادەکاتەوە، لە هەمان کاتدا ئەمریکا دەتوانێ ئێران وەك کارتێکی فشار بەسەر وڵاتانی ناوچەکە بەتایبەت کەنداو بەکار بهێنێت لەپێناو سەپاندنی ستراتیژی نێو دەوڵەتی و پاراستنی بەرژەوەندیەکانی لەڕۆژهەڵات، هەموو ئەم هۆکارانە وا لەو وڵاتانە دەکات کە هەمیشە پێویستیان بە ئامادەبوونی ئەمریکا و ڕۆڵ و چەك و تەکنۆلۆجیای ئەمریکا بێت لەناوچەکەدا، بۆیە دەتوانین بڵێین ئیدارەی نوێ ئەمریکا، کە ئۆباما





سەرکردایەتی دەکات سیاسەتی (ئیحتیوای ئێران) پیادە دەکات ڕۆڵی گرنگی خۆی دەبێت، ئێران لە چوارچێوەی سیاسەتە ئیستراتیجیەکەی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵات پێگەی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە ئەمریکا ناتوانێ ئێران فەرامۆش بکات یان خۆی گۆشە گیر بکات لە بەرامبەر ئێران.

(سۆزان ڕایس) بالیۆزی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان لە بارەی پەیوەندیەکانی وڵاتەکەی لەگەڵ ئێران ئەوەی ڕاگەیاند، کەوڵاتەکەی ئامادەیە لەگەڵ ئێراندا دەست بەدانوستانی دبلۆماسی ڕاستەوخۆ بکات، بە مەرجێك ئێران سەرجەم بریارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش جێبەجێ بکات، کە مەبەست لێی وەستاندنی بەرنامەی پیتاندنی یۆرانیۆمە، دۆسیەی ئەتۆمی ئێران بە هەموو ڕەهەندە زانستی و سیاسیەکانیەوە، کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر جۆر و شێوازی پەیوەندی ئێران لەگەڵ ئەمریکا بە تایبەت و جیهان بە گشتی، چونکە ئەم دۆسیەیە ڕۆڵی ئێران لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دیاری دەکات، ئایا ئەمریکا ڕێگە بە ئێران دەدات ڕۆڵی خۆی بگێڕێت لە ناوچەکە وەك خۆی دەیەوێت لە کێشە هەنووکەییەکاندا وەك عێراق و لوبنان و سوریا و فەلەستین...هتد یاخود بە پێچەوانەوە سیاسەتێکی نوێ پیادە دەکات، بەپێی داخوازیەکانی سەردەمی ئۆباما، چونکە ئۆباما لە یەکەم وتاری خۆیدا بەڵێنیدا ڕێبازێکی نوێ بگرێتەبەر بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دۆسیێی ئەتۆمی ئێران، بە گرتنەبەری چەند ڕێوشوێنێکی پێویست بۆ فشار خستنە سەر ئێران بە مەبەستی دەستهەڵگرتن لە بەرنامە ئەتۆمیەکەی، ڕەنگە زمانی دیالۆك و دبلۆماسیەت بەردەوام بێت لەگەڵ ئێراندا، لەلایەکی ترەوە ئەو دەوڵەتانەی کە ئەندامی هەمیشەین لە ئەنجومەنی ئاسایش، سەرقاڵی هەوڵدانێکی دبلۆماسی چالاکن بۆ قایلکردنی ئێران بۆ وازهێنان لە پیتاندنی یۆرانیۆم، لە پێناو دوورکەوتنەوە لە ڕوودانی کێشەو قەیران، هەرچەندە لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا ئێران بە بەردەوامی پێشنیاری دەوڵەتە گەورەکانی لەوبارەیەوە ڕەتکردۆتەوە، هاوکاتیش لەگەڵ درێژ پێدانی ناکۆکیەکاندا دەوڵەتە گەورەکان(٣) بریاریان لە ئەنجوومەنی ئاسایش دەرکردووە، کە سەرجەمیان داوا لە کۆماری ئیسلامی ئێران دەکەن پرۆسەی پیتاندنی یۆرانیۆم ڕابگرێت و (٤) لەو بریارانەش سەپاندنی سزای ئابووریی بەسەر ئێراندا، سەرەڕای ئەمانەش ئەمریکا و ئەوروپا مەترسی زۆریان هەیە لە بەرامبەر تواناکانی ئێران بەتایبەت ئەوەیان بۆ ئاشکرا بووە کە تاران توانیویەتی ئەوەندە یۆرانیۆم بپیتێنێت، کە بەس بێت بۆ دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی پیتاندنی یۆرانیۆم تەنها کێشە نییە لە چوارچێوەی کێشەکانی ئێران و ئەمریکا، بەڵکو هەموو ئەو کێشانە دەگرێتەوە، کە بوونەتە هۆی قووڵبوونەوەی کەلێنی پەیوەندیەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتە، دەستپێکردنەوەی پەیوەندی دبلۆماسی، پەیوەندی ئابووری و بازرگانی، هەروەها بەرژەوەندییەکانی هەردوولا لە عێراق و ئەفغانستان و ناوچەی کەنداو پێویستە، چونکە ئەمریکا دوای ئەو گۆڕانکارییە بنەڕەتییە لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ناوچەکە. وایکرد چاوێك بە ستراتیژیەکەی خۆیدا بخشێنێتەوەو داڕشتنەوەیەکی نوێ بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکات، بۆ ئەو وڵاتانەی کە پێیان وایە ئێران ڕۆڵی گرنگ دەبینێت بە ئامانجێکی تر کار بکات و گۆڕانکارییەکان لە نەخشەی سیاسی و جوگرافی نوێ دابڕێژێت، لەلایەکی ترەوە ئێران هەوڵ ئەدات شێوازی لێکترازانی وڵاتانی ناوچەکە لە بەرژەوەندی خۆیدابێت، هاوکات ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش هەوڵ دەدات ئەم لێکترازاندنە لە بەرژەوەندی ستراتیژی

سیوحولـــەتی و پاراســـتنی
ەرژەوەندییەکانی لە ڕۆژهەڵاتدا
یت

لەلایـــەکی دیکـــەوە زۆر
یکدانـــەوەی سیاســـی هەیـــە،
کەپێیان وایە لە سەردەمی باراك
ئۆبامادا ئێران و پاکستان زۆرترین
سیاسەتی ئەمریکایان بۆ تەرخان
کردووە . بەتایبەتیش ئێران کە
ئەمان لێوە کردوە . جگە لەوە،
ئەمریکا لە سۆنگەیەکی ترەوە
دەیـــەوێت دیـــالۆگی ســـوری
ئیسرائیلی زیاتر بەرەو پێشەوە
بچێت. بۆ ئەوەی ئێران کەمترین
کاریگـــەری بمێنێـــت لەســـەر
حەماس و حیزبو للاّ.

ئەم بۆچونە سیاسیە بەرامبەر
ئێران لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێت،
لەلایەك واشنتۆن دەیەوێت ئێرانی
ئەتۆمی لە ناوچەکە دروست نەبێت
و لەلایەکی دیکەش دەیەوێت بە
دیـــالۆگی وڵاتـــانی تـــر ڕۆڵـــی
کاریگەری ئێران نەهێڵێت.

هەرچۆنێك بێت، دانوستان و
ڕێککەوتن لـــە نێـــوان کۆمـــاری
ئیـــسلامی ئێـــران و ویلایەتـــە
یەکگرتوەکانی ئەمریکا پێویستی
بەوە هەیە وردە وردە و هەنگاو بە
هەنگاو بەرەوباشی بچێت، چونکە
پـــچڕانی پەیوەنـــدی دبلۆماســـی
تەمـــەن (٣٠) ســـاڵ، ئەمـــەی
پێویـــستە، ئـــەم نزیکبوونەوەیـــەی
نێوانیان تەنها قازانجی بۆ ئێران و
ئـــەمریکا نییـــە، بـــەڵکو قـــازانجی
زیاتری دەبێ بۆ جیهان بە گشتی و
ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی.

## پێنجەم/ ئەمریکا و دەوڵەتی سوریا

پەیوەندییـــە نێودەوڵەتییـــەکان
بریتییـــە لـــە کۆمـــەڵێك ململانـــێ و
هاوکـــاری تێهەڵکێـــشی یـــەکتر، کـــە
بـــەپێی پێویـــست دەردەکـــەوێت بـــۆ
بـــەکارهێنانی هێـــز یـــاخود
وەلامدانەوەی سیاسەتی بەرامبەر،
پەیوەندییـەکانی ئـەمریکا و سوریا
بـە هـەموو تایبەتمەندییەکانیـەوە
لـــەم چوارچـــێوەیە دەرناچـــێت و
بـەهۆی واقعـی نێودەوڵـەتی تـاك
جەمـسەری و هـەژموونی ئـەمریکا.
هەنـدێ تایبەتمەنـدی خـۆی هەیـە
ئەمـەریکا ســوریا بـە یـەکێك لـە
تـــەوەرەکانی ئـــاژاوەو شـــەڕو
هاوکـاری تـیرۆر لـە ڕۆژهـەڵات لـە
قەڵـــەم دەدات، لـــە چوارچـــێوەی
ســتراتیجیەتی ئـــەمریکا بـــۆ شـــەڕی
دژە تـــیرۆر لـــە پێنـــاو پاراســـتنی
ئاسایشی نێودەوڵـەتی بە گشتی و
ئاسایـشی نـاوخۆی ئـەمریکا بـە
تایبەتی.

بـــە گەڕانـــەوە بـــۆ مێـــژووی
پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا لە
نیـوەی دووەمـی سـەدەی ڕابـردوو
تائێـستا تـەرازووی ململانێیـەکان
کلاسـیکی بـوو، بـەلام بـە هـاتنی
(بەشـــار ئەســـد) لـــە مـــانگی
حـــوزەیرانی ســـاڵی( ٢٠٠٠ )وەك
سـەرۆك کۆمـار، جێگـای هیـواو
متمانـەی زۆرێـك لـە چـاودێرانی
سیاسـی بـوو، بـە ئامـانجی پیادە
کردنی سیاسەتێکی نوێ بۆ وڵاتی
سـوریا، لـە هـەموو بوارەکـان و بـە
تایبـەت سیاسـەتی دەرەوە، بـەلام
لەگـــەڵ ئەوەشـــدا بـــە وتـــەی
چاودێرانی سیاسی (بەشار ئەسد)
نـەیتوانی سیاسـەتی دەرەوە لـە
چوارچێوەی پەیوەندییەکانی خۆی
بگونجێنێـــــت لەگـــــەڵ
گۆڕانکارییـــەکانی دەوروبـــەری
سوریا، بەڵکو لەسەر هەمان ڕێبازی
سەرۆکی پێشوو هەنگاوی ناوە.

ئـەوەی پێویـستە ئامـاژەی بـۆ
بکەین، ئەوەیە کە ڕژێمی سیاسی
سـوریا ڕووبەڕووی دوو قۆنـاغ لـە
بەرهەڵستکاری بووە، بە تایبەتە لە
پـــاش ڕووداوەکـــانی (١١)ی
ســـێپتەمبەری ســـاڵی( ٢٠٠١)
ئەویش قۆناغی پێش داگیرکردنی
عێراقـــە لـــە لایـــەن ویلایەتـــە
یەکگرتووەکانی ئەمریکا و قۆناغی
پـاش داگیرکردنـی عێراقـە. هـەر
قۆناغێکیش کۆمەڵێك تایبەتمەندی
خـۆیی هەیـە، کـە لـە قۆناغەکـەی
پێش خۆی جیای دەکاتەوە .

## قۆناغی یەکەم:

قۆنـــاغی پـــێش داگیرکردنـــی
عێـــــراق لەلایـــەن ویلایەتـــە
یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا، سیاسی
ڕژێمـــی ســـوریا ڕووبـــەڕووی
هاوکێشەی سیاسی ناوخۆیی بوو،

چونکە ئەم سیستەمە بە دەستی کۆمەڵێکی بچووکی شیعەیە، کە لە سەرووی دەسەڵاتەکانن لە وڵاتدا لەگەڵ هەندێك هاوپەیمانی تائیفیو ئەتنیکیو مەدەنیو سەربازی لە پێناو بەردەوامبوونی ئەم دەسەڵاتەو لە خۆگرتنی هەموو چینو توێژەکانی نێو کۆمەڵگای سووری، بەڵام ئەم هاوکێشەیە ڕووبەڕووی بەرهەڵستکاریو مەترسی بووە، وەك: ((گەندەڵی، کەمکردنەوەیٚ ئازادییەکان، تێکچوونی باری تەندروستی سەرۆك... هتد))، هەموو

ئەمانە ڕژێمی ڕووبەڕووی ئیفلیجی کردووە، هەر بۆیە (حافظ أسد) ناچار بوو تەرکیز لەسەر هەندێ کێشەی نێودەوڵەتی بکاتەوە بۆ پارێزگاریکردن لە پێگەی ناوچەییو نێودەوڵەتی سوریا، هەروەها کارکردن بۆ گواستنەوەی دەسەڵات بۆ ((بەشار))ی کوڕی بەبێ کێشە.

بە هاتنی (بەشار ئەسەد) بۆ سەر دەسەڵات، واچاوەڕوان دەکرا کە بەرنامەی چاکسازی لەگەڵ خۆیدا بهێنێت، لەگەڵ دەرگا واڵاکردن لە سیاسەتی دەرەوە لەگەڵ ڕۆژئاوادا، هەروەها گەشەکردنی گفتوگۆ لەگەڵ وڵاتانی عەرەبو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو پاراستنی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئێرانو دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ عێراقو چاککردنی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئوردنو تورکیا.

بەڵام نەبوونی ئەزموونێکی باش بۆ بەڕێوەبردنی پەیوەندییەکانی دەرەوەی سووریاو لە یادکردنی پێگەی ستراتیجی سوریا لە ناوچەکەدا گرژیو ئاڵۆزی دروستکرد.

لە ڕاستیدا ئەمریکا لە چوارچێوەی بەرنامەو ستراتیجییەتی خۆی کار دەکات بۆ نزیککردنەوەی سوریاو ئیسرائیل لە ڕێگای دیالۆگی(سوری-ئیسرائیلی) بۆ چارەسەرکردنی کێشەی (ئیسرائیل- فەلەستین) لە ڕۆژهەڵاتدا.

## قۆناغی دووەم:

قۆناغی داگیرکاری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانییان بۆ عێراق لە مانگی ئازاری ساڵی (٢٠٠٣)دا، کە بە پرۆسەی ئازادی عێراق ناسراو پاشان بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایشی بۆ دەرکرا، ئەم قۆناغەش تاقیکردنەوەیەکی نوێ بوو بۆ (بەشار ئەسەد) لەو ماوە کەمەی کە دەسەڵاتی سووریای گرتبووە دەست، لەو ماوەیەدا دۆخێکی گرژیو ئاڵۆزی لە پەیوەندییەکانی نێوان سورياو ئەمریکا دەستی پێکرد، لە سەروبەندی ئەم گرژیو ئاڵۆزییانەشدا حکومەتی سوریا زمانی توندی بەکارهێنا، چونکە سوریا لە بەرامبەر سیاسەتی ئەمریکا پێی وابوو واشنتۆن لە پاش پرۆسەی ئازادی عێراق ئامانجی سوریایە، بەڵام حکومەتی سوریا ڕایگەیاند لە بەرامبەر سیاسەتو ئامانجەکانی ئەمریکا بێدەنگ نابێت.

لە ڕاستیدا حکومەتی سوریا پێش ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام حسێن بە ماوەیەك بە ئاشکرا پشتگیری عێراقی دەکرد، بە هیوای دروستکردنی بەرەیەکی عەرەبی یەکگرتوو لە دژی ئامانجەکانی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵات. ئەوەبوو سنورێکی بۆ ئۆپۆسزیۆنە عێراقییەکان دانا، کە لە دژی سەدام حسێن بوونو لە بەرامبەر ئەم کارەدا حکومەتی عێراقی بڕیاریدا کە ڕۆژانە بڕی (١٥٠-٢٠٠) هەزار بەرمیل نەوت لە ڕێگای بۆریەکانی (کرکوك-بانیاس) بە خاکی سوریادا بنێرێتە دەرەوە، بەڵام پێش دەستپێکردنی پرۆسەی ئازادی عێراق،حکومەتی عێراق هێزە سەربازییەکانی بەرەو سنورەکانی سوریا برد وەك ئاماژەیەك بۆ ئاگادار کردنەوەی ئیسرائیل. لە هەرهێرشێکی چاوەڕوان نەکراودا ئەو وڵاتە بۆسەر عیراق.

لە سەرتای ساڵی (٢٠٠١) لە ڕێگای خاکی سوریا چەكو

تەقەمەنی لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتەوە گەیشتە خاکی عێراق، هەروەها لە ساڵی (٢٠٠٢) حکومەتی سوریا ڕێگەیدا بە ڕژێمی عێراق هەندێ لەچەکە کۆکوژەکانی لە خاکی سوریا بشارێتەوە جگە لە ناردنی هەندێ چەکی عێراقی بۆ (حزبوڵڵا).

هەموو ئەمانە ئەوە ناگەیەنێت سوریا بەردەوام هەڵوێستی توندو ڕەتکردنەوەی دیبلۆماسیەتی لەبەرامبەر ئەمریکا وەرگرتبێت، سوریا لە ئەنجامی هاوکارییەکانی لە شەڕی کەنداوی دووەم لە ساڵی(١٩٩١)و پشتگیری نەکردنی بۆ ڕژێمی عێراق یارمەتی دارایی باشی دەسکەوت، کە داگیرکردنی کوێت کێشەیەکی دوولایەنە لە جیهانی عەرەبی و نێو دەوڵەتیدا، بەو بیانووەی لایەك لە سەر حەقەو لایەکەی دیکە ناحەقن، هەروەها سوریا ئیمزای لەسەر بڕیاری ژمارە (١٤٤١) ئەنجومەنی ئاسایشی کرد، کە خۆی لە خۆیدا سەرکەوتنی دیبلۆماسیەتی سوری بوو لەو کاتەدا.

بەڵام لە کاتی داگیرکردنی عێراق لە ساڵی (٢٠٠٣)(بەشار ئەسەد) ئەوەی ڕاگەیاند کە هەموو ئامانجەکانی ئەمریکا دەستکەوتنی گرێبەستە نەوتییەکانی عێراق‌و کێشانی نەخشەی سیاسی ناوچەکەیە، کە لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل مەترسیدارترە، چونکە لەم قۆناغەدا پرۆژەکە چوارچێوەی ڕۆژهەڵاتی گەورە دەگرێتەوە کە بە وتەی چاودێرانی سیاسی سوریا لە پەیمانی (سایکس بیکۆ)و (وعد بلفور)ەوە زۆربەی زۆری وڵاتانی عەرەب هاوپەیمان و هاوکاری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکان.

چاودێرانی سیاسی وا چاوەڕوانی ئیدارەی نوێی ئەمریکا بە سەرۆکایەتی ئۆباما دەکەن لە ژێر ڕۆشنایی پڕوپاگەندەکانی خۆی لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا، دەرگای گفتوگۆو دیالۆگ لەگەڵ هەریەك لە سوریا و ئێران بکاتەوە، هەرچەندە دانیشتن لەگەڵ ئەم دوو وڵاتە زۆر ئاڵۆزو زەحمەتەو هەروا ئاسان نییە، بەڵام ئۆباما بێ هیوا نییە لەم سیاسەتەی خۆی لە چوارچێوەی بەرنامە ستراتیجییەکەی لە ڕۆژهەڵات‌و نزیکبوونەوەی سوریا و ئیسرائیل، لەڕاستیدا ئەوەی ئێستا ئەمریکا بە دەستییەوە دەناڵێنێت، هاوکارییەکانی سوریاو ئێرانە بۆ بزوتنەوەی حەماس لە فەلەستین و (حیزبو ڵڵا)ی لوبنانی لە دژی ئیسرائیل.

بێگومان ئیدارەی نوێی ئەمریکاو ئۆباما ئەو ڕاستییە دەزانن، کە سوریا لە ناوچەکە دا ئەو هێزە گەورەیە نییە، کە ببێتە مایەی مەترسی بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا، ئەگەر هاتو هێزە پەیوەندیدارەکانی دەرەوەی لێی دابڕێن، لە هەمانکاتدا ئەمریکا ئەوەش دەزانێت، کە دەتوانێت سوریا بکاتە وڵاتێکی سوود بەخشی ناوچەکە تا بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوچەکە، ڕۆڵی باش و کارا بگێڕێت، چونکە لەم قۆناغەدا لە بەرنامەی ئۆبامادا نییە لە دژی سوریا و ئێران هێز بەکاربهێنێت، بەڵکو لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانی لە ڕۆژهەڵات سیاسەتی نەرم‌و دیبلۆماسی‌و گفتوگۆو دیالۆگی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ پیادە دەکات.

هاوپەیمانییەکانی نێوان ئێران‌و سوریا لەسەر دوو بنەمای سەرەکی بنیادنراوە، ئەویش:

یەکەم: ئێران پێی وایە تێڕوانین‌و ئامانجەکانی ئەمریکا لە ناوچەکەدا بەدینایەت تا ئەو هۆکار و یارمەتی لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێران‌و سوریادا بمێنێت، لەلایەکی دیکەوە ئێران ئەو ڕاستییە دەزانێت کە هاوپەیمانی لەگەڵ سوریا و گروپە فەلەستینییەکان‌و حیزبوڵڵا، بەرەیەکی یەکگرتوو پێکدەهێنێت دژ بە سیاسەتەکانی ئیسرائیل لە ناوچەکەدا، کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی دەکات.

لە ڕاستیدا ئەم هەستەی ئێران بۆ توانا سەربازییەکانی

دەگەڕێتەوە بۆ پێشکەوتنی لەو بوارەدا، لە ناوەڕاستی ساڵی (٢٠٠٥)وەزیری بەرگری ئێران رایگەیاند، کە ئێران لە تاقیکردنەوەی مووشەکی دوور هاوێژدا کە مەوداکەی (٢٠٠٠) کیلۆمەترە، سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، هەروەها لە پاش ئەو تاقیکردنەوەیە خێراترین مووشەکی ژێر ئاوی لە جیهاندا دروستکرد کە لە یەک چرکەدا (١٠٠)م دەبڕێت، ئەوەبوو ئێران لە ساڵی (٢٠٠٦)گەورەترین مانۆڕی سەربازی خۆی لە بەندەری هورموز ئەنجامدا بە مەبەستی دەرخستنی توانا سەربازییەکانی.

هاوکات راپۆرتی (پەیمانگای لێکۆڵینەوەی ستراتیجی لە لەندەن) ئاماژەی بەوە کرد سوریا بۆ بەرگری ئاسمانی خاوەن سیستەمێکی چالاک و بەهێزە، جگە لەوەش سوریا گرێبەستێکی دەستخستنی چەکی لەگەڵ وڵاتی روسیا واژۆکرد، ئەمەش دوای سەردانەکەی بەشار ئەسەد بۆ ئەو وڵاتە لە کانونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥)و لەنێو ئەو گرێبەستەدا مووشەکی پێشکەوتووی تێدایە کەبە(S-A-18) ناسراوە، حکومەتی سوریاش نکوڵی لەم گرێبەستە نەکرد.

دووەم: بۆچوونی دووەم بۆ نزیکبوونەوەی ئێران و سوریا بۆ ئەوەی هۆکاری نزیکبوونەوەیان دانەبڕێت بە تایبەت لە پاش نەبوونی هاوکاری و هاوپەیمانی ئەوروپی بۆ هەردوولا، لە چوارچێوەی ئەو ئاراستە سیاسیەی ئەوروپا کە هاوکارو پشتیوانە بۆ سیاسەتەکانی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، لە بەرامبەر گەڕانەوەی ئەوروپییەکان بۆ ناوچە کۆنەکانی خۆیان، بە تایبەتی لە پاش داگیرکردنی عێراق راستەوخۆ لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە، هەروەها لە حاڵەتی سەپاندنی گەمارۆی ئابوری بۆسەر سوریا لەلایەن ئەمریکاوە تاران پاڵپشتێکی بەهێزە بۆ دیمەشق، چونکە لە ساڵی (٢٠٠٦)کۆمەڵێک رێککەوتنی ئابوری بازرگانی گەورەیان واژۆ کرد.

بە سەردانەکەی بەشار ئەسەد لە مانگی ئابی ساڵی (٢٠٠٥)بۆ پیرۆزبایی بەبۆنەی سەرکەوتنی ئەحمەدی نەژاد لە هەڵبژاردنەکانی ئێران، ئەم هاوپەیمانێتییەی نێوانیان زیاتر پتەو بوو، پاشان سەردانەکەی ئەحمەدی نەژاد لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٦)بۆ دیمەشق بۆ توندوتۆڵکردنی ئەو تەوەرە تەکتیکییەی نێوان ئێران و سوریا، هەردوولا رێککەوتن لەسەر پێکهێنانی بەرەیەکی هاوبەش بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەر رووداوێک و لەسەر ئەم خاڵانە رێککەوتن:

١-دەستدرێژی کردنە سەر هەر لایەک دەستدرێژی کردنە سەر ئەوی دیکەیە.

٢-پابەندبوونی ئێران بە پێشکەشکردنی هاوکاری بۆ سوریا لە کاتی هەر دەستدرێژییەکی دەرەکیدا.

٣-زیادکردنی ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێوان هەردوولا.

٤-هاوکاری سەربازی نێوان هەردوولا.

لە سەروبەندی ئەم هاوپەیمانییەی نێوان ئێران و سوریا و کاریگەرییان لەسەر رووداوەکانی ناوچەکە، هەڵوێستی سوریا سیاسی و ستراتیجی زۆر زەحمەت و ئاڵۆزە بە هۆی فشارەکانی ئەمریکا لەسەر سوریا لە ناوەندە نێودەوڵەتییەکان، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بە ریفۆرم و کردەوە تیرۆریستییەکانەوە هەیە، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە بوونی سەربازی ئەمریکاوە هەیە لە عێراق و نزیک لە سنورەکانی سوریادا، دوو بۆچوونی لێدەکەوێتەوە:

١-پەیوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا - سوریا بەردەوام دەبێت لەسەر بنەمای ململانێ و گۆڕانی گەورەی لێ بەدی ناکرێت، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەوە ناگەیەنێت پەیوەندی و دیالۆگ رەت بکاتەوە و بەردەوام دژی ئەمریکا بێ، چونکە هەڕەشەکانی

ـەمریکا لە ئارادایە. بەتایبەت لە پـــاش داگیرکردنـــی عێـــراق، هەرچەندە لەم قۆناغەی ئێستادا ئۆباما بەرنامەی بەکارهێنانی هێزی لە بەرامبەر سوریا نییە، بەڵکو لەپێناو بەدیهێنانی ـ مانجەکانی لە ڕۆژهەڵاتدا هەموو هەوڵە دیبلۆماسییەکانی خستۆتە گەڕ.

٢-گۆڕان لە پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولادا، لە ڕاستیدا ـیمەشق هەنگاوی ئیجابی واقعی ـنا بەحوکمی ئەو بارودۆخەی کە بەسەر ناوچەکەدا هاتووە، ئەمەش بە هیوای خاوکردنەوەی گرژییەکانیان لەگەڵ واشنتۆن، جگە لە بارودۆخی ناوخۆی هەردوو دەوڵەت، ئەمەش پێویستی بە نەرمی و دیبلۆماسی هەیە لە پەیوەندییەکانیاندا، بۆ سوود وەرگرتن لەم بارودۆخە پێویستییان بە کرانەوەیەك هەیە لە پەیوەندییەکانی دەرەوە لەگەڵ وڵاتانی زلهێزدا، بەتایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەروەها کارکردن لەسەر بنەمای عەقلانیەت و واقعیەت بۆ کاراکردنی پەیوەندییەکانی نێوانیان، چونکە ئەمریکا پێگەو هاوپەیمانی و ڕۆڵ و دەستتێوەردانی سوریا و ئێران لە ناوچەکە دەزانێت، بۆیە زۆر بە وردی چاودێری ئەو هاوپەیمانێتیەی نێوان سوریا و ئێران دەکات لە ناوچەکەدا.

## شەشەم/ ئەمریکا و پرسی فەلەستینی- ئیسرائیلی

پرسی فەلەستینی یەکێکە لەو کێشانەی کە زیاترین ئاڵۆزی و مەترسی دروست کردووە بۆ سەر ئاشتی و ئاسایشی جیهان بەتایبەت بۆ ئاشتی و ئاسایشی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەو ئاڵۆزی وکێشە وهەڵوێستە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی وئەمریکیانەی کە لە خۆی دەگرێت. هەموان دەزانین چ بارودۆخێ تەنگی هەڵچنیوە بە دامەزراندی دەوڵەتی ئیسرائیل و کردویەتی بە واقعی سەر زەوی، دەکرێت بڵێین دیدی سیاسی ئەوروپی وئەمریکی پێویستە بە داننان بە دەوڵەتی فەلەستینی کە بتوانێ لە پاڵ ئیسرائیلدا بژیت، ئەمەش بە واتای قبوڵکردنی ئەوەی ناودەبرێت بە (چارەسەری دوو دەوڵەت) سەرەڕای ئەوەی سەرۆك بۆش یەکەم سەرۆکی ئەمریکی بوو کە بە ئاشکرا باسی پێویستی دامەزراندنی دەوڵەتی فەستینی کرد، بەڵام سەرۆك ئۆباما لە یەکەم ڕۆژی دەسەڵاتیەوە بەڵێنی دا بە کارکردن لە پێناو ئەوەی ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست بچەسپێ، دەوڵەتی فەلەستینی ئەبێ ببێ بە واقع. بۆیە لە ڕۆژی دواتردا جۆرج میشیل دیاری کرا بۆ ئاهەنگی دانانی لەبەر (بەڕاست سەلماندنی) بەڵێندانی پێشووی لە ماوەی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەیدا، میشیل دیاریکرا تا بچێ بۆ کێشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەت بەوەی ناسراوە بە ڕۆڵی لە چارەسەری ناکۆکی نێوان ئێرلەندای باکور و پاشان شارەزایی قووڵی بە کاریگەری نشینگە ئیسرائیلەکان و ڕەخنەگرتنی لەوکارە لە ماوەی ئەرکی خۆی بە نێردراوی ئاشتی لەنێوئیدارەی سەرۆك بۆشدا.

ئێستا و دوای ئەوەی سەرۆکی نوێ ئۆباما کارگێری ئەمریکای گرتوەتە دەست سەر لە نوێ جموجووڵی لەسەر پرسی فەلەستینی دەستپێکردەوە تا دەقی چارەسەرێ پەیدا بکات کە کۆتایی بهێنێ بە ئاڵۆزترین کێشە جیهان لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم لەساڵی (١٩٤٥) یەوە. ئایا دەکرێت ئۆباما ئەوچارەسەرە بێنێتە دی کە بۆ سەرکردەکانی دیکەی ئەمریکا و ڕۆژئاوا نەهاتە دی؟ ئایا سەرۆکی ئەمریکی ئۆباما لە ویست و جوولەی لە پێناو گەیشتن بە ئەنجامێك کە ئەو ململانێیە کۆتایی پێ بێت سوور و ڕاستاڵە؟ ئایا ئەوە بۆ دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ناوچەکە وجیهان بە دیدێنێت کە ئاشتی وئاسایش بکاتە بەشیان و ئەو





ناوچــە لــەو وێرانکاریـــە دوور بخاتەوە کە بەردەوامەو ودوور نیە وێرانکارییــەکی گــشتگیری لــێ بکەوێتــەوە، لــە ئــەنجامی ئــەو ململانێیەی کە گەیشتۆتە لوتکە.

چونکە بارودۆخـەکان ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ لـــە گـــۆڕانی خـــراپتردان بەتایبــەتی لــەم قۆناغــەدا کــە ململانێـــێ نێـــوان ئـــەو لایەنـــە نوێیانەی هاتونەتە مەیدان جەنگە کە توندتر بوەتەوە وەك ئێران کە بێباکانــە لــە هــەموو بۆنەیەکــدا دژایــەتی خــۆی بــۆ ئیــسرائیل و پــشتگیری بــۆ تونــدخوازی نــاو فەلەســتین و لوبنــان و دوژمنــانی دیکــەی ئیسرائیل نیشان دەدات.

هــەروەها دڵتــەنگی ئیــسرائیل بــە پێشکەوتنی ئێـران لـە بـواری بـە دەستهێنانی تەکنەلۆجیای ناوەکی و توانــای بەدەســتهێنانی چــەکی ناوەکیدا کــە ئیــسرائیل بــە وردی وریـای هـەموو هـەنگاوێکی ئێرانە لەو بوارەدا و ئەویش و ئەمریکاش دەترسـن ئێـران ببێتـە دەوڵـەتێکی نــاوەکی وەك کۆریــای بــاکوور کــە لەگــەڵ ئێــران هاریکــارە، ئێــستا ئێـران چـەکی نـاوەکی هەیـە یـان توانای بەرهـەمهێنانی ئەو چەکەی هەیــە وهێنـــدەی ناوێـــت تـــا ئەزموونەکانی ڕابگەیەنێت.

لێدوانی دیبلۆماسی وسیاسی کۆتــایی نــاو کۆشــکی ســپی لــە بەیەکگەیشتەکانی نێوان سەرۆکی ئـەمریکی و وەزیـری دەرەوەیـدا لـە لایــەك ونێــوان ســەرۆك وەزیرانـــی ئیسرائیل و سەرۆکی فەلەستینی و وەزیـری دەرەوەی میسر لەلایـەکی دیکــەوە چــەند بەڵگــەو ئاماژەیــەك نیــشان دەدات، بـــەو پێیـــەی ناوەنــدەکانی هــەواڵ و شــیکارە سیاسیـەکانی ئـەمریکا و ڕۆژئـاوا سـەبارەت بـەو یـەکتر بینانـە قـسە دەکـەن گەشـبینی هەیـە سـەبارەت بەو پرسە، باراك ئۆباما بە زمانێکی نـوێ ئیـسرائیلیەکانی دوانـد کـە پێـشتر لـە سیاسـەتی ئەمریکیـدا نەبووە بەڵکو جەختی دەکردەوە لە بێلایــەنی ڕووخــساری ئــەمریکا بەرامبــەر ئیــسرائیل و لــە هــەموو بوارەکانــدا وای دەنوانــد، بــەڵام ئێستا بەڵگەکان ئاماژە دەکەن بە گـۆڕانی دەربڕینـەکانی بـە چـەند پلەیــەك بــەوەی دەســتێوەردانی وردی ئــەمریکا ئەگــەر کــونجی دەســـتێوەردانی بـــە ئیجـــابیش بکاتــەوە و ویــستێکی ڕاســتگۆ و وردی تــەواو بنــوێنێ زیــاتر لــە کــونجی تونــدی ئــەوا پرســەکە دەتەقێتـــــــەوە و عـــــــەرەب جۆرەگەشـــــبینیەك بەرامبـــــەر هەڵوێـست وبەڵێنـەکانی ئـەمریکا بەدیدەکــەن، داوای ئۆبامـــا بـــۆ وەســـتاندنی هـــەموو جـــۆرە نیــشتەجێ کردنێــك لــە خــاکی عەرەبی لە بەرەی خۆیدا کرۆك و واتاگــەلێکی هەیــە کــە ئاســتی سووربوونی لەسەر جووڵان لەسەر ئــەو پرســە ودەسگرتنیــشی بــە چارەسـەری هـەر دوو لاوە نیـشان دەدات (دەوڵـــــەتی ئیـــــسرائیل ودەوڵـــــەتێکی ســـــەربەخۆی فەلەستینی) کە بتوانێ کرانەوە بە ئاراستەی عەرەبیـدا بـەدیبهێنێت دەکرێـت عـەرەب دڵنیـا بێتـەوە لـە ڕاستگۆیی و وردەکاری نیازەکانی باراك ئۆباما بەوەی ئەوانیش بچنە ناو چالاکیە ئاشتیخوازیەکەوە بە ویــستێکی زیــاترەوە بەتایبــەت فەلەســتینیەکان جگــە لــە چــەند بــاڵێکی گــەلی فەلەســتینی وەك بزوتنەوەی حەماس کە هەڵوێستی تونـدە و بـەپێی نەخـشەی ئێـران دەجووڵێنـــــــەوە و دژی بـــــاڵی میانڕەوەی فەلەستینیە.

## حەوتەم/ئەمریکا و کۆریای باکوور

لە پاش تەواو بوونی جەنگی دووەمـــی جیهـــانی لـــە ســـاڵی (١٩٤٥)و کاتێك کۆرییەکان خۆیان بە دەستەوەدا، سوپای ئەمریکا و ڕوسیا ئیدارەی ئەو وڵاتـەیان لـە نێـوان هـەردوولادا دابـەش کـرد. ڕووســـەکان بەشـــی بـــاکوور ئەمریکییـەکان بەشـی باشـوریان بەرکەوت لە وڵاتی کۆریادا.

لـــە کـــاتی جـــەنگی ســـارد بەتایبەت لە نێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٥٣)جـەنگ لـە نێـوان هـەردوو بەشەکەی کۆریا سەری هەڵدا، بۆ دەست تێوەردان لە نێوان هەردوولا

نەتەوە یەکگرتووەکان یارمەتی کۆریای باشووری دەدا.

لە بەرامبەردا چین هاوکاری کۆریای باکوری دەکرد، ئەم شەڕە لە نێوان هەردوو کۆریا نەبوو، بەڵکو شەڕێك بوو لە جیاتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەت دەکرا، لە پاش دوو ساڵ جەنگ، سنوری نێوان هەردوو بەشی کۆریا گەڕایەوە بۆ پێش کاتی جەنگ.

پەیوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ نیمچە دوورگەی کۆریا لەسەر دووبنەمای دیار مایەوە، ئەویش:

یەکەم: پەیوەندی لەگەڵ بەشی باشوور تایبەتمەند بوو بە هاوپەیمانی و پاراستن و واژۆ کردنی پەیماننامەی ساڵی (١٩٥٣).

دووەم: پەیوەندی لەگەڵ بەشی باکوور خراپ بوو، ئەمریکا کۆریای باکووری بە سەرچاوەی ئاژاوەی لە قەڵەم دادە. بەڵام ڕووداوەکانی (١١ی سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠٠) پەیوەندییەکانی لەگەڵ کۆریای باکوور ئاڵۆزتر کرد بە تایبەت گۆڕانکارییەکانی پاش ساڵی( ٢٠٠٣)، ئەمەش بۆ خۆی کاریگەری خراپی هەبوو لەسەر پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا. ناچار ئیدارەی بۆش چاوی خشاندەوە بە هەڵوێستەکانی پێشتری، چونکە تا دەهات کێشەکانی ئاڵۆزتر دەبوو و ڕووی لە دوژمنکاری دەکرد. ئەمەش دوو ئاراستەی لێکەوتەوە یەکەمیان لە پاش ئەوەی کۆریای باکوور هەڵوێستی(بەرهەڵستکردنی) وەرگرت بە ڕاگەیاندنی (بیۆنك یانك) بە پێشخستنی بەرنامە نەوەویەکەی و بەگەڕخستنەوەی کە دژە لەگەڵ بەند و بنەماکانی ڕێککەوتننامەی جنێڤ کە لە ساڵی (١٩٩٤) واژۆ کراوە.

دووەم- پەرەسەندنی ئۆپۆزسیۆنی جەماوەری.

لە بوونی بنکەی سەربازی ئەمریکی لە ناو کۆریای باشوورو داواکردنی چاوخشاندنەوەو دانوساندن بەشێوەیەك لەگەڵ گۆڕانکارییە سیاسی و ئابوورییەکانی ناوخۆی کۆریا لەلایەك و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کۆریای باکوور لەلایەکی دیکە بگونجێ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕۆڵێکی نموونەیی و وێنەو چەشنی شتێکی گێڕا لە پێناو مانەوەی سەربازی خۆی، بەشێوەیەك کۆریای باشوور بەردەوام لە دۆخی ئابووری خراپدا بێت، سەرەڕای لاوازی بنیادنانی هێزی سەربازی خۆی تا پشت بە هێزەکانی ئەمریکا ببەستێت، چونکە دوژمنێکی گەورەی بۆ دروست بووە ئەویش کۆریای باکوورە.

لە ساڵی (١٩٩٣) کۆریای باکوور هەستا بە گەشەپێدانی بەرنامە ئۆتۆمییەکەی خۆی و هاوکارییەکانی ڕاگرت لەگەڵ ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ وزەی ئەتۆم و لە پەیماننامەی بڵاونەبوونەوەی چەکی ئەتۆم کشایەوە. ئەمەش قەیرانێکی توندی هەڵگیرساند لەنێوان(بیۆنگ یانگ)و ئیدارەی (بیل کلینتۆن)، لەو سەردەمەوە وەزارەتی بەرگری پلانێکیان دانا بۆ لێدانی چالاکییەکانی کۆریا لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاو کۆریای باشوور لەناو خودی کۆریای باشوور، بە هەڵگیرسانی ئەم شەڕە بەلای کەمەوە یەك ملیۆن کەس لەناو دەچێت، چونکە هێزەکانی ئەمریکا تەنها (٢٠) میل لە سنوری کۆریاوە دوورن.

لە ساڵی (٢٠٠٣) ئەمریکا لە ڕێگای لێکۆڵینەوەیەکی دوور و درێژ کە لە سەنتەری نێودەوڵەتی و ستراتیجی لە واشنتۆن-((CSIS)) بە ناونیشانی ((proliferation in the Axis of Evil)) لەلایەن (انتونی کرودسمان) بەپشت بەستن بە زانیارییە هەواڵگرییەکان ئامادەی کردبوو، کەباس لە گرنگترین هۆو فاکتەرە پاڵنەرەکانی ئەمریکا دەکات، کە کۆریای باکور بخاتە تەوەری شەڕو مەترسی لە ڕۆژهەڵات.

قسەکردن لەسەر شەڕی





پێشوەختی ئەمریکا لەگەڵ کۆریای باکوور پێویستی بە ژیری و ووردبینی هەیە لە شێوازو ناوەڕۆك لەلایەك ئاکام و شوێنەوارەکانی لەلایەکی دیکە، چونکە لەم قۆناغەدا ئیدارەی نوێ ئەمریکا بە سەرۆکایەتی ئۆباما هەندێ جار پێویستی بە هەڕەشە هەیە، بەڵام ناچارە پەنا بباتە بەر سیاسەتی دەوردان لە ڕێگای یابان و کۆریای باشوور بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانی نێوانیان زیاتر ئاڵۆز نەبێت و مەترسییەکانی کۆریای باکوور لە ڕۆژهەڵات بە گشتی و بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا بە تایبەت نەخاتە مەترسییەوە، لەم بارەیەتەشەوە ئۆباما وتی ئەم هەنگاوەی کۆریای باکوور پێشێلکارییە بۆ بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەروەها وتی مووشەکی (تایبودونك-٢) پێشێلکارییەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ بڕیاری ژمارە (١٧١٨) ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، کە بە ئاشکرا ڕێگا نادرێت بە کۆریای باکوور هەستێت بە هیچ چالاکییەکی پەیوەندیدار بە بەرنامە ئەتۆمییەکەی. هاوکات ئاماژەی بەوە کرد کە ئەم کێشەیە بە ڕاوێژ لەگەڵ هاوپەیمانانی وەك (یابان و کۆریای باشوور) و ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ڕەوانەی ئەو ئەنجومەنە دەکرێت بۆ چارەسەرکردن لە چوارچێوەی سیاسەتی دەوردانی لە ناوچەکە.

## هەشتەم/ ئەمریکا و مەترسییەکانی چین

دەرکەوتنی چین وەك هێزێکی ئابووری گەورەی جیهان، بۆتە جێگای تێڕامانی زۆربەی چاودێران و هەروەها بابەتی لێکۆڵینەوە لە هەموو بوارەکان، بە تایبەت نهێنییە سیاسییەکانی ئەم گەشەکردن و کارابوونە.

هیچ کەس گومان لەوە ناکات پێشکەوتن و گەشەکردنی چین هەنگاوی تری بەدواوەیە، چونکە چین هەنگاو بەهەنگاو لە قۆرخکردنی بازاڕەکانی جیهاندایە، لە ڕاستیدا وڵاتی چین وەك هێزێکی چالاك لەخۆ سەلماندندایە بۆ سیستەمی نوێی جیهان. مێژوو ئەو ڕاستییەی بۆ تۆمار کردوین کاتێك دەوڵەتێك لە گەشەکردن و پێشکەوتندایە ڕووبەڕووی وڵاتی گەورەو زلهێز دەبێتەوەو ئەمەش لە سەدەی (١٩) و (٢٠) لە نێوان ئەڵمانیا و بەریتانیای مەزن و پاشان لە نێوان ژاپۆن و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕوویدا.

ئایا ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان چین و ئەمریکا ڕوودەدات، ئایا چین دەتوانێت هەژموونی خۆی بسەپێنێت بەسەر گۆڕەپانی سیاسی نێودەوڵەتیدا؟

ڕەنگە ئێستا و لەم قۆناغەدا نەتوانین بڕیاری ئەو باڵادەستییە بدەین، بەڵام لە هەمانکاتدا دەتوانین لە چوارچێوەی هونەری دەسەڵات و بۆچوونەکان بۆ ئامانجەکانی و بەکارهێنانی هەموو ئەو ئامرازانە، کە خزمەتی ئەو پرۆسەیە دەکات، تێگەیشتنمان هەبێت بۆ واقعی وڵاتی چین.

ڕەنگە ئەم گەشەکردنەی وڵاتی چین لەم سەردەمانەی دواییدا مەترسی هەبێت بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جیهان بە گشتی و ڕۆژهەڵات بەتایبەت. هاوکات حکومەتی چین بەردەوام پاساوی ئەوە دێنێتەوە، کە گەشەکردن و پێشکەوتنی وڵاتی چین ((ڕێنسانسی ئاشتی))/ مەترسی نییە بۆ سەر سیستەمی نوێی جیهانی، کە ئەمریکا سەرکردایەتی دەکات، هەروەها توێژەری بەناوبانگی چینی (وانگ جیسی) دەڵێت: "ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا با دڵنیا بێت لەوەی گەشەکردن و ڕێنسانسی چین پێویستی بە پتەوکردنی پەیوەندییەکانیەتی لەگەڵ ئەمریکادا ئەگەر بیەوێت هەوڵەکانی لەپێناویدا سەرکەوتوو بێت".

لە ڕاستیدا ئەم هەوڵانە واتە شەراکەت و هاوکاری واشنتۆن بۆ پەکین هۆکارێکی زۆر گرنگە بۆ ئەو ڕێنسانسەی کە چین هەنگاوی بۆ

ناوە.

دەسەڵاتدارانی چین دەزانن بەتایبەتی سەرۆکی چین(هوینتاو) کەبەردەوام باس لەجیهانێکی تەبا دەکات و دەڵێت با هەموو وڵاتانی دونیا بە تایبەتمەندیو ئاراستە جیاوازییەکانییەوە پێکەوە بەئاشتی ژیان ببەنە بەسەر.

گومان لەوەدا نییە وڵاتێکی گەورەی وەك چین بەم لێدوانانەی ئامانجی هێورکردنەوەی ئەمریکایە لەلایەكو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیەتی لە ئاسیا بە گشتی و لاوازکردنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکایە بەتایبەت، ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم بوارەدا، تێگەیشتنی چینو رووسە لەگەڵ یەکترداو دامەزراندنی رێکخراوی (شانگەهای) بۆ هاوکاری لەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست وەك (کازاخستان، قرغیزستان، ئۆزبەکستانو تاجیکستان)، هەروەها ئەم رێکخراوە بە پەلە نارەزایی خۆی دەربڕی لەمەڕ بوونی هێزی سەربازی ئەمریکا لە ئاسیای ناوەڕاست، ئەوەبوو لە ناوەڕاستی ساڵی(٢٠٠٥) داوایان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد کە خشتەی کشانەوەی هێزەکانی خۆی لە ناوچەکە دیاری بکات، هاوکات چینییەکان رێگایاندا بە وڵاتی هندو پاشان ئێران بەبێ بەشداریکردنی ئەمریکا وەك چاودێرێك لەم رێکخراوە کاربکەن.

چینییەکان کاریان کرد بۆ بەستنی چەند کۆبوونەوەیەك، لەوانە کۆبوونەوەی لوتکەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە بریتین لە(١٠) دەوڵەت وەك(کەمبودیا، ئەندونیسیا، برونی، دار السلام، لاوس، مالیزیا، میانما، فلیپین، سەنگافورە، تایلەندو ڤێتنام)، جگە لە (چین، ژاپۆن، کۆریای باشور، ئوسترالیا، نیوزلەنداو هند) ئەمەش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای تێدا نییە، وادەردەکەوێت کە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئاسیاو رێکخراوی (شانگەهای) بۆ هاوکاری بازرگانی لە چوارچێوەی پەیوەندییە ستراتیجییەکانی چین لەگەڵ وڵاتی ئاسیا، بۆ دەرخستنی گرنگی پەیوەندییەکانی چینو لاوازی پەیوەندییەکانی ئەمریکا بێت.

لە راستیدا دوو هەڵوێستی تر گومانی زیاتر دەخاتە سەر نیازەکانی چین، ئەوانیش:

یەکەمیان: زۆر بەبێ دەنگیو هێمنی گەشە بە توانا سەربازییەکانی دەدات، بۆ نموونە تاماوەیەکی زۆر هیچ لایەنێك زانیاری دەربارەی ئەوە نەبوو کە وڵاتی چین چەکی دژی مانگی دەستکردی هەیە، ئەمەش لەلای ئەمریکا و زۆرێك لە وڵاتانی جیهان دڵەراوکێو مەترسی دروست کردووە.

دووەم: چینییەکان لە رێگەی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ وڵاتانی ئەفریقیا لە رێگەی بەستنی کۆنگرەی سەرکەوتووو پێدانی قەرز بە قازانجی کەمو پێشکەشکردنی هاوکاری بەبێ کۆتو بەندو رێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ لەم وڵاتانە چالاکییەکانیان فراوانتر کرد، ئەمەش بۆ خۆی لەلایەن وڵاتانی ئەوروپاو ئەمریکاوە دوو بۆچوونی جیاوازی لێدەکەوێتەوە، ئەویش هەندێك لەو وڵاتانە پێشوازی لەم هەنگاوانەی چین دەکەن بۆ وڵاتانی ئەفریقیا، چونکە پێویستییان زۆرە بە و هاوکارییانە، لەبەرامبەردا هەندێکی دیکە بەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاشەوە لەچوارچێوەی بەرنامە فراوانخوازییەکانیو بۆ گەیشتن بە سەرچاوە سروشتییەکانو دروستکردنی پەیوەندی بازرگانیو دەستکەوتی کەرەستەی خاو، بەبێ ئەوەی هیچ پەیمانێك بدەن بەگەشەکردنو پێشخستنی وڵاتانی ئەفریقاو رەنگە جموجۆڵ و چالاکییەکانی چین لەئاستی بەرگریکردنی بێت بە ئامانجی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی چین و رێگرتن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جێبەجێکردنی ستراتیجییەتی دەوردان (الاحتواو) لە دژی تواناو

هێزی چین، ئەگەر هاتوو لەلایەکی دیکەوە تەماشای مەترسییەکانی چین بکەین لەئەمریکا، بەئاسانی تێبینی ئەو مەترسییانە دەکەین بەتایبەت پەیوەندییە سەربازییەکانی ئەمریکاو بنکە سەربازییەکان لە کیشوەری ئاسیا هەر لەکۆریای باشووروو ژاپۆنەوە تا تایوان و لەوێشەوە بۆ ئوستراڵیاو پاکستان، پاشان بۆ ئاسیای ناوەڕاست.

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت ئەمریکا شورایەکی نیمچە بازنەیی بە دەوری وڵاتی چیندا دروستکردووە، دەبێ ئەو ڕاستییەش بزانین هیچ هێزێك جگە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەم سەردەمو قۆناغەدا توانای بەرگرتن و ڕێگرتنی لە کارابوون و هەڵسانەوەی چین نییە، هاوکات چینییەکان پێیان وایە ئەمریکا لە بەرامبەر چیندا سیاسەتی ئیحتیوا پیادە دەکات، ئەمەش لە ترسی ئەوەی ئەوەك کۆنترۆڵی لاواز بێت بەهۆی هێزو تواناکانی چینەوە، جگە لە ئارەزووی ئەمریکا لە مانەوەی وەك تاك جەمسەر لە جیهاندا.

## ئەمریکای گەورە زلهێزی جیهان

لە پاش ڕووخاندنی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی (١٩٩٠) ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك تاکە جەمسەر لەسەر سیستەمی نوێی جیهان مایەوە، ئەم سیستەمە نوێیە کە ئەمریکا دایهێنا، بۆ دەرخستنی توانا و هەیبەت و دەسەڵاتی بەسەر جیهان وەك گەورەترین ئیمپراتۆریەت یاخود وەك گەورەترین زلهێزی جیهان، پرۆسەی ڕزگارکردنی کوێتی جێبەجێ کرد بە دەرکردنی ڕژێمی عێراق لە کوێت و گەڕانەوەی سەربەخۆیی بۆ گەل و وڵاتەکەیان، هاوکات زەمینەی ڕەخساند بۆ سەرهەڵدانی ڕاپەڕینی شەعبانی باشووری عێراق لەلایەن شیعەکانی عێراقەوە، هەروەها بەرپابوونی ڕاپەڕینی مەزنی بەهاری گەلی کورد لە کوردستان و ئازادکردنی کەرکوك و پاشان دروستکردنی پشتێنەی ئەمنی لە کوردستانی عێراق و گەڕانەوەی خەڵکی کوردستان بۆ شارەکانی هەولێرو سلێمانی و گەرمیان و دهۆك و دروستبوونی بەرەی کوردستانی و دەستپێکردنی هەڵبژاردنەکانی کوردستان و دامەزراندنی یەکەم حکومەت و پەرلەمان لە کوردستان پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی حکومەتی عێراق بەجێی هێشت، ئەمەش بەرهەمی خوێنی شەهیدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بوو، هەرچەندە لە ساڵی( ١٩٩٦) شەڕی ناوخۆ دەستی پێکرد و حکومەتی هەرێم دابەش بوو بۆ دوو حکومەت، یەك لە هەولێرو ئەوی دیکە لە سلێمانی و ئیفلیجکردنی پەرلەمان و دابەشبوونی هەرێم بۆ دوو بەشی جیاواز، بەڵام لە سایەی سیستەمی نوێی جیهانی. بەتایبەت لە دوای ڕووداوەکانی (١١) ی سێپتەمبەر لە نیویۆرك و واشنتۆن، ئەم سیستەمە گۆڕانی بەسەردا هات و ئەمریکا وەك هێزێکی گەورە لە شێوەی ئیمپراتۆریەت سەریهەڵدا لە پێناو پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا، بەو بۆنەیەوە وەزارەتێکی نوێ لە حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای دامەزرا، ئەویش وەزارەتی ئاسایش (ئەمن) بوو بۆ ئاگاداربوون و ڕووبەڕووبوونەوەی هەر کێشەو گرفتێکی چاوەڕواننەکراوە، کە مەترسی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا هەبێت، ئەم ئیمپراتویەتە کە لە پاش ڕووخاندنی یەکێتی سۆڤیەت سەری هەڵدا، پێویستی بە ڕابەرو سەرکردایەتی هەبوو، نەك لەلایەن یەك کەسەوە، وەك ئێمپراتۆریەتەکانی پێش خۆی، چونکە ئەم ئیمپرا تۆریەتە لەم سیستەمە نوێیەی جیهاندا پێویستی بە کۆمەڵ و گروپ و لایەن هەیە تا بتوانن بە باشی بەڕێوەی بەرن، بۆ نموونە لە

پاش سالانی نەوەدەکان گرووپێک بە ناوی پارێزگارە نوێیەکان سەریانهەڵداو خاوەنی ڕاوبۆچوونی تازە بوون بۆ ئەوەی چۆن ئەمریکا بتوانێت سەرکردایەتی جیهان بکات لە پاش ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت، لەوانەش (دیک چینی و ڕامسفیلدو کۆندالیزارایس)و ئەمڕۆش (جۆن بایدن و جونس و هیلاری کلینتۆن...هتد)، جگە لەمانە، جولەکە خاوەن دەسەڵاتەکان لە ئەمریکا لە پشتی پەردەوە ڕۆڵیان هەیە لە بڕیاردان لەسەر چارەنووسی ئەمریکا، بەتایبەت ڕاوێژکارانی پنتاگۆن و ئاسایشی نەتەوەیی و کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەموو ئەمانە پێکەوە کاردەکەن تا بتوانن خزمەتی ئەمریکا بکەن و ئەمریکا بەردەوام لەپێشکەوتن و گەشەکردنی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی..هتد بێت. بێگومان ئەم ئیمپراتۆریەتەی باسی لێوە دەکەین، وەک هەموو ئیمپراتۆریەتەکانی قۆناغەکانی مێژوو ئامانج و ئامڕازو بەرژەوەندی تایبەتی خۆی هەیەو گرنگترین ئامانجە ستراتیژییەکانی ئەوەیە کە ئەمریکا بەردەوام بێت لە پێشەوایەتی جیهان، چونکە ئەمریکا سەدەی بیستەم بە سەدەی خۆی دەزانێت، بۆیە بە هیچ شێوەیەک ڕێگە بە هیچ وڵاتێک نادات سەدەی بیست و یەک لەدەستی ئەمریکا دەربکات بە مانەوەی توانا سەربازییەکانی لە جیهان پاش شکستهێنان بەدیاردەی تیرۆرو پوکانەوەی تواناکانی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە لە عێراق و ئەفغانستان، جێگیری باری ئەمنی تارادەیەکی زۆر لە عێراق و کەمبوونەوەی کوشتاری تایفی نێوان شیعەو سوننە، هەنگاونان بەرە و چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەفغانستان، خستنەگەڕی هەوڵە دیبلۆماتییەکان بۆچارەسەرکردنی کێشەی ئەتۆمی ئێران و کۆریای باکوورو نزیککردنەوەی دیالۆگی سوری – ئیسرائیلی، کەمکردنەوەی ڕۆڵی ئێران لە عێراق و لوبنان و فەلەستین و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆی و هاوپەیمانەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، جگە لە کۆشش و هەوڵی جیددی بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی ئابوری ئەمریکا بە بوژانەوەی دارایی ئەمریکا ئەوەک وڵاتانی ئەورووپا و چین بازارەکان بۆ خۆیان قۆرخ بکەن، لە هەمانکاتدا ساغکردنەوەی کاڵا ئەمریکییەکان لە بازارەکانی ڕۆژهەڵات و کۆنترۆڵکردنی نەوتی کەنداو بەگشتی و نەوتی عێراق بەتایبەت وەک فاکتەرێکی سەرەکی و ڕۆڵی لە ئابوری جیهان گرنگترین ئامرازەکانی پاراستن و مانەوەی ئیمپراتۆریەتی ئەمریکی وەک سەدەی ڕابردوو کە بە تاک جەمسەر کۆتایی پێهێنا بەمانەوەو گەشەکردنی تواناو چالاکییە سەربازی و تەکنەلۆجییەکانیەتی بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی جیهان و زیادکردنی خەرجییە سەربازییەکانی، کە یەکێکە لەهۆکارەکانی سەرهەڵدانی قەیرانی ئابوری ئەمریکا، بەڵام ئەمریکا نایەوێت بەهۆی خەرجییە زۆرەکانی خۆی گۆشەگیر بکات، بەڵکو بۆ ئیدارەی نوێی ئەمریکا بە گشتی و وەزارەتی بەرگری بەتایبەت بودجەی زیاتر دابین دەکات، چونکە ئیستاشی لەگەڵدا بێت، تەنها بودجەی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا بەرامبەر زیاتر لە (١٠)دە وڵاتی گەورەی جیهانە، ڕەنگە زیادەڕەوی تێدانەبێت گەر بڵێین بودجەی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا بەرامبەر بودجەی وەزارەتەکانی بەرگری هەموو وڵاتانی دنیایە، بۆیە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناچارە بودجەی زیاتر تەرخان بکات لەپێناو پاراستنی هەیبەت و هەیمەنەتی ئیمپراتۆریەتە پیرۆزەکەی خۆی لە جیهاندا.




# مەلا رەسولی پێشنەماز و بیرەوەرییەکانی سیاسی و حزبی لە پەنجاکانەوە تا ئیمڕۆ

بەشی دووەم

**پێشەکی:**



مەلا رەسووڵ پێشنەماز کەسایەتیی سیاسیی ناسراوی رۆژهەڵاتی کوردستانە کە زیاتر لە ٥٠ساڵ لە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دا خەباتی کردووە. لە ساڵی١٩٣٤ لە بنەماڵەیەکی ئیبن عەباسی لە کاوڵانی ناوچەی گەورکانی شاری مهاباد لەدایك بووە. سەردەمی هەرزەکاریی ئەو لەگەڵ دامەزراندنی کۆماری کوردستان و خەباتی نەتەوەیی لە رۆژهەڵاتی کوردستان، هاوتەریب بووە، بۆیە ئاساییە ئەگەر دواتەمەنی خۆی بە جۆش و خرۆشی کوردایەتییەوە سەرقاڵ کردبێت.

ئەمەی خوارەوە، بەشێك لە بیرەوەرییەکانی مەلا رەسووڵە کە لە دوای رووخانی کۆماری کوردستان و لە سەردەمی حکومەتی موسەدیق را دەست پێدەکات.

لەو بیرەوەرییانەدا هەموو باس و خواسی سیاسیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە کۆمیتەی ساغکەرەوە ڕا بگرە تا شۆڕشی چەکداریی ١٩٦٧-١٩٦٨ حیزبی دێموکرات و دواییش دەست پێکردنی خەباتی ئاشکرای حیزب لە رۆژهەڵاتی کوردستان و خەباتی چەکداری لە سەردەمی کۆماری ئیسلامی و... دەگێڕدرێنەوە.

لە راستی دا بیرەوەرییەکانی مەلا رەسووڵ، بەشێکی هەرە زیندووی مێژووی حیزبی دێموکراتە بە درێژایی تەمەنی، هەروەها خەباتی نەتەوەیی رزگاریخوازانەی کوردە لە رۆژهەڵاتی کوردستان و کە لەگەڵ مێژووی خەباتی سیاسیی باشووری کوردستان بەیەکەوە گرێدراوە.

مەلا رەسووڵ راشکاوانە بیرەوەرییەکانی دەگێڕێتەوە و بەشێك لەو کەسانەی ناویان دێت، لە ژیاندا ماون. دەکرێت ئەگەر کەسانێك پێیان وایە لە گێڕانەوەی ئەو بیرەوەرییانەی کە مەلا رەسووڵ بە راست و دروستیان دەزانێت، زیادڕەوی کراوە، یان سنووری هەق و ناهەق شوێندراوە، یان تەنانەت بە ناڕاستی گێڕدراوەتەوە، ئەوە عەرز و ئەوە گەز، با کەسانێك هەبن لەوە راستتر وەدەرخن.

ئەحمەد سەفا

**پ ١٦: ئە ی بۆ ناوچەکانی مهاباد بۆکان چیتان کرد؟**

و ١٦: کۆمیتەیەکی دیکەمان ە مهاباد دانا و یەك لە بۆکان کە وابزانم ناوەکەی تەرەغە بوو لە بانەش بە ناوی ئاربابا کۆمیتەیەك داندرا. ئێمە ناوچەکانی سەردەشت، مهاباد، پیرانشار، بۆکان، سەقز و بانە گەڕاین، خەڵك و ئاغاکان پێشوازییەکی یەجگار زۆریان لێکردین و ناویان نابووین بێچووە مەلائیکەکان و ە پول و پوشاك و شتی نایاب هیچیان بەرچاو نەدەهات. کێشەی ئاغا و ڕەعیەت کە دوای دابەشکردنی زەوی بەسەر خەڵکدا حکومەت بە ئەنقەست ناکۆییەکی زۆری خستبوونە نێوانەوە بەتایەتبی پاسگاکان و ژاندرمەکان وەك دووکانێك کەڵکیان لێوەردەگرت بۆ ڕیشوە وەرگرتن و گیرفان پڕکردن، شەهید فایق دەوری زۆری هەبوو بۆ هێورکردنەوەی ئەو کێشانە منیش لە ناو گەورەکان و مەنگوڕان کە بەشی زۆری جگە لە کاری حیزبی ئاسیاو و خزم و دۆستمان بوون، تەبلیغاتی فایق لەسەر ئەو مەسەلە هێندە بەهێز بوو کە لە زۆر جێگا دوژمنانی گەل بڵاویان کرد بووەوە سلێمانی موعینی، چونکە ژنەکەی کچە ئاغای مەنگوڕە لایەنگریی لە ئاغایان دەکا.



تەنزیماتێکی وامان دامەزراند چەند ساڵ لە هەموو ناوچەکان گەنم و دانەوێڵە و زەکاتی بەشی حیزبیان کۆدەکردەوە و بۆیان لە چاڵ دەکردین و پاشان بە ناوچەی پیرانشار و سەردەشتدا بە وڵاغی خۆیان بۆیان دەهێنایین بۆ بنکەکانی زینوێ و سوونی و ئیمەش بە ناو هێزەکاندا هەتا لای بارزان دەمان ناردن لەو سەفەرەدا نێزیك ٣ مانگمان پێچوو کاتێك گەڕاینەوە بنکەمان لە سوونی تەواو ببوو برادەرانی دیکەمان زۆر هاتبوون. مەلا سەید ڕەشید و عومەر سادق نگلی و سەید جەمیل و مەلا ڕەحمانی سەرشیووی سەقزیش هاتن و زۆری پێنەچوو کاك ئەحمەد تۆفیق وەك نوێنەری بارزانی لەو ناوە پەیدا بوو بە خۆی و حەوت هەشت پێشمەرگەوە سەردانی بنکەی زینویشی کردبوو لە هەوەڵەوە، ئەو سەفەرەی پارمەتی هێنان و تەشکیلات پێکەوەنانەی زۆر بە دڵ بوو، پاشان هێندێك نامەمان کە بۆ هێنابوو دیاربوو هێندێك لە نۆکەر سەفەتەکان بۆیان نووسیبوو کە ئێمە لەو سەفەرەماندا دژی ئەو قسەمان کردووە لەگەڵ ئەوەی فایق لە یەك جێگا قەت بە خراپ باسی ئەحمەد تۆفیقی نەکرد ئەگەر منیش دەمکرد تکای لێ دەکردم و دەیگوت هەوڵبدە ئەم خەڵکە فەقیرەی ئێرە، زەینیان لەسەر ئێمە خەراپ نەبێت و تکات لێ دەکەم ئەو باسانە مەکە.

ئەحمەد تۆفیق لە هەوەڵەوە





کۆبوونەوەیەکی تۆزێك داخراوی لە خۆی و فایق و مەلا سەید ڕەشید و ڕەئوف مەلا حەسەن پێکهێنا لە دیوەخانی عەلی حاجی حوسێنی و پاشان عومەرسادق نگلی و مەلا ڕەحمانی سەرشیووی و سەید جەمیلیان بانگ کرد و ئەو کاتی هاتنە دەر وەك سلقی ڕوتیان لێکردبوون و چەکەکانیان لێ ئەستاندبوون و بە بیانوی ئەوەی کە لەگەڵ سەلاحی موهتەدی و محەمەدی ئیلخانیزادە کۆمەڵەی ڕزگاریان پێکەوە ناوە زۆر نارەحەت بوون. منیش هەرسێکیانم زۆر خۆشدەویست. شەهید منیەشەم و پێشمەرگەکانم کۆکردەوە و گوتم ئەحمەد تۆفیق قەرار بوووە لای بارزانی بێ و کاری ئەو بکا هەتا پێکهێنانی کۆنگرە لە خۆڕا هاتووە بۆ ئێرە نەقڵی چیای برادۆست زیندو؟ دەکاتەوە چەند ڕۆژی دیکە دەست دەکا بە چەك کردنی ئێمەش گوتیان نەزەرت چییە؟ گووتم با بە ناوی پێشمەرگەکان نامەیەکیان بۆ بنووسین و هەتا کۆنگرە ئەوانە لە نەزەر ئێمە هیچ بەرپرسیارەتێکیان نیە. هەموو ڕازی بوون.

نامەم نووسی و ناردمە ژووری. نامەکەم زۆر توند بۆ نووسیبوون و هەمووش ئیمزامان کردبوو، داوای من و منیەشەمیان کرد، کاتێ چووینە ژوورەوە ئەحمەد تۆفیق گووتی برام ئەوانە حیزبیان دە حیزبدا دروست کردووە بۆیە چەکمان کردوون هەرچی گووتی نەمان بیست ئاخرەکەی نووسراوێکی مەلا حەسەنی ڕەستگاری نیشاندام لەگەڵ شتێکی وەك بەڵگەی یارمەتی بە ناوی کۆمەڵەی ڕزگاری کە لە ئێرانەوە بۆ کاك حەسەنیان ناردبوو گوتمان ئەوە نە ناوی ئەوانەی تێدا و نە بەڵگەیە بۆ چەك کردنی ئەوانە ئێمە ڕازی نابین و هەتا کۆنگرە کەس هەقی چەك کردنی کەسی نیە و ئەوانەش باشترین کادر و ڕەفیقی ئێمەن چەکەکانمان بۆ وەرگرتنەوە کەچی دوای چەند ڕۆژێك قەراریان دا بچن ئەوانیش لە لای شلێر و ناوخوان و گۆخلان و ئەو ناوە بنکە بکەنەوە و بێ وەعدیشیان لەگەڵ فایق و ئێمە کرد و نەیان وێرا بڵێن ئێمە شتێکی ترمان پێکەوە ناوە دوایەش ئەحمەد تۆفیق هەر چووە سەریان و چەکی کردن، بەڵام ئەمن ئێستاشی لەگەڵ بێ هەر خۆشم دەوێن و پێم ئینسانی باش بوون وابزانم مەلا ڕەحمانیان فەوتی کردوە، سەیر ئەوەیە مەلا سەید ڕەشید ڕەفیقیان بوو وابزانم کەین و بەینیشی لەگەڵیان هەبوو کەچی لە ترسی ئەحمەد تۆفیق دە پێش هەمووان دارەئی دابوو کە ئێمەش دیفاعمان لێ کردن و زانی تەنگەمان بە ئەحمەد هەڵچنی و دووبارە بەولایدا پەشیمان بۆوە. دوای چەند ڕۆژی دیکە ئەحمەد لە سلێمانی هەڵکێلا و گووتی چووە لە ماڵی یەکێك لە سوونی حەمامی کردووە و ئەوە دوورە لە ئەخلاقی پێشمەرگایەتی. بە بڕیای ئەو سێ نەفەرە ئەویشی چەك کرد. فایق هێندە نارەحەت بوو هات لە لای من گریا ، ئەویشمان قبولْ نەکرد و چەکەکەمان بۆ ئەستاندەوە و ئەحمەدمان ڕەوانە کردەوە بۆ لای بارزانی و دەستمان کردەوە بە کاری خۆمان.

**پ ١٧: دەکرێ باسی وتووێژی بارزانی و حکومەت بکەی لە ناوچەی ڕانیە؟**

و ١٧: سالی ١٩٦٤ و پێش ڕێکەوتنی بارزانی و حکومەت بارزانی و ئێمەش ، بارەگامان لە سەنگەسەر بوو، ڕۆژێك ئەحمەد تۆفیق دەستەیەکی لێ جیاکردینەوە و گووتی: (لەگەڵ بارزانی دەچین بۆ شوێنێك). کاتێ ئەحمەد و ئێمە و بەشێك لە حەرەسەکانی بارزانی وەڕێکەوتین بە چەند سەیارەیەك ڕوومان دە ڕانیە کرد لەوێ شێخ ڕەزا گولانی و مەلا عەولای بارزانی کە کارگێڕی بارزانی بوون لە ڕانیە پێشوازیان لێکردین و هەموومان بە بارزانیشەوە ڕوومان دە مەیدانێکی خوار شار کرد لەوێ مەیدانچەیەکی بەتاڵ بوو ڕاوەستاین پاش تاوێ



هێلیکۆپتەرێك هات و نیشت كاتێ هاتنە خوار دیتم شێخ ئەحمەدی بارزانی برا گەورەی مەلا مستەفا دابەزی. من ناسیمەوە چونكە وەك لە پێشەوە ئاماژەم بە سەفەری ڕێزان و ماڵە مەلا مستەفا كردوە لەگەڵ فایق و كاك عەزیز محەمەد ئێمە لەو سەفەرەماندا چوینە گوندی بارزان و شەوێك میوانی شێخ ئەحمەد بوین دوایی دەركەوت حكومەت تەنگاو بووە و چووە شێخ ئەحمەدیان لە بارزان ڕا هێناوە. ماوەی زیاتر لە دوو سەعات لە شوێنێك دانیشتین و دووبارە هاتینەوە لای هێلیكۆپتەرەكە و ئەوان ڕۆیشتن. دوایی ئەحمەد تۆفیق و سلێمان گووتیان ئەو كەسە محافیزی سلێمانی و چەند كاربەدەستێك بوون، شێخ ئەحمەدیان هێنابوو بۆ ڕازیكردنی مەلا مستەفا. هێشتا بارزانی نەگەیبۆیە. لە گەڕانەوەدا لە دەربەرندی ڕانیە لە بەرازێك تەقە دەكرا ، ئەحمەد تۆفیق هاواری كرد با كەس تەقە نەكا بۆ خۆیی دوو تفەنگی پێوە نا لەگەڵ ئەوەی زۆریش تەنگیوە بوو، نەی تەنگاوت یەكسەر گووتی: دەی برام كاك ڕەسوڵ نۆرەی تۆیە منیش برنۆیەكی ڕەقەم حەڤدەم پێبوو هەر بەسەر پێوە یەكەم تفەنگ دەناو لاقی بەرازەكەم كرد، دووهەم تفەنگ ئەنگاوتم و كەوت و ئێمە ڕۆیشتین بارزانی كە گەیبۆیەوتەقەكەی گوێ لێ دەبێ بەراز كوشتنیشی زۆر پێ خۆش بوو. دەپرسێ و دەڵێن ئەزبەنی جەماعەتی ئەحمەد كوڕێكیان لەگەڵ بوو كلێتەیەكی بەسەرەوە بوو ئەو بەرازەی لەوبەر گوشت بە دووربینی تۆزێك تەماشای دەكا و هەر گەیشتەوە و داوای ئەحمەدی كرد حاچك بارزانی هات بە دوایدا ئیتر كە لێی پرسیبوو بارزانی ٥٠ فیشەكی برنۆی قۆڕخانە كە زۆر مەشهور بوون بە ئەحمەددا بۆی ناردم وێنەیەكی ئەو ڕۆژانەم هەیە هی ئەحمەد تۆفیق و حاچك و سەلیم ئەسعەد خۆشەوی سەید حاجی كەلەوی و حەسەنی برازای ئەحمەد تۆفیق و حەمەفەرەج ناوێكی بانەیی زۆر ئازا مان لەگەڵ بو.

**پ ١٨: ئەی چۆن بوو كێشەی ئێوە و ئەحمەد تۆفیق قوڵتر بووەوە و كۆمیتەی ساخكەرەوە پێكهات؟**

و ١٨: بە دوا ئەو وتووێژ و لێك نێزیك بوونەوە كێشەی ئێمە لەگەڵ ئەحمەد تۆفیق توندتر بوو كار گەیشتە گرتنی بنكەكانمان ئێمە لە ماوەی پازدە بیست ڕۆژدا هەردووك بنكەی سوونێ و زینوێمان گرت دیارە زۆرتر ئەمن بە هاندانی قادر شەریف و سەعید كوێستانی ئەو كارەم دەكرد كە یەجگار زۆر كارێكی مەترسیدار بوو. بارزانی بە هەموو هێزیەوە دیفاعی لە ئەحمەد تۆفیق دەكرد. ئەمن چگارم بەوەدابوو كە خۆم تووشی ئەو خەتەرە گەورەیە بكەم ئەویش بەو شەرتەی هەردووك جار مەفرەزەی بارزانی و ئەحمەد تۆفیق هاتنە سەرمان و من و

ڕەشید سمێڵ و سەعید سەقەلی، یاخی بووین و چەکمان دانەنا ئەوەش بۆ خۆیی داستانێکی دوور و درێژە و خۆمی لێ دەبوێرم کە چۆن لە کوشتن ڕزگارم بوو. دوایی بۆ خۆم پاش زیاتر لە مانگێک یاخی بوون لەگەڵ حەسەن ڕەستگار چووینە سەنگەسەر و تفەنگ و دووربین و دەمانچە و هەرچی پێم بوو تەحویلم دان و هاتینە قەڵادزێ. لەوەی زیاتر لە بیست کەس بووین برادەرێک بە خێرا خۆیی ژوورێکی داینێ و هەتا بەرەو مەکتەبی سیاسی ڕۆیشتین لەو ماڵەدا بووین و دەتوانم بڵێم بە هەموومان بیست دینار پارەمان نەبوو. دوای تەماس گرتن بە کاک سەید عەزیز شەمزینی و مەکتەب سیاسییەوە ئێمە ئەو نەفەرانەی خوارەوە، ئەوەی لە بیرم بێ بەرەو مەکتەب سیاسی ڕۆیشتین کە ئەکسەرێتی تەواوی کادرەکانی حیزب بووین: ١ . حەسەن ڕستگار ٢ ـ ڕەسوڵ پێشنماز ٣ ـ قادر شەریف ٤ ـ سەعید کوێستانی ٥ ـ حوسێن مەدەنی ٦ . مامەندی قازی ٧ ـ جەعفەر کەریمی ٨ ـ سەید فەتاح خەیات ٩ . ئارەحمانی شیلم جاران ناسراو بە ڕەشید سمێڵ ١٠ ـ خدرمەرە سەنە ١١ ـ عەبدوڵڵا گاپیلۆنی ١٣ ـ قالە قووچ ١٣ ـ حەسەن شاتمان ١٤ ـ عوسمانی حەسەن بابی مهابادی ١٥ ـ قادری خلەچاوەشی چایچی ١٦ ـ یونس خەیاتی نەغەدەیی ١٧ ـ حەسەن نەغەدەیی ١٨ ـ محەمەدی کاکا غازادە ١٩ . ئەحمەدی جەوانمەردی ٢٠ ـ عەلی ئازا. لەوێش ئەوانەی پێمانەوە زیاد بوون ئەوانە بوون: ١ . مەلا ئاوارە ٢ . عەولای ناڵبەندی ٣ ـ مەلا ئەبوبەکری فەلسەفی ٤ ـ حاجی دەروێش بانەیی. دیارە دوای زیاتر لە چل ساڵ ڕەنگە زۆریانم لە بیر نەمابێ دەبێ بمبورن دەنا ئەمن ڕێز بۆ هەموو تێکۆشەرێك دادەنێم و لەوانەش نیم هەر خۆم بکەمە قارەمانی داستان ڕەنگە لە زۆر جێگادا زۆر شتی خۆم پشت گوێ خستبێ ئەندامانی کۆمیتەی ساخکەرەوەش بریتی بوون لە:
١. حەسەن ڕستگار ٢ ـ مەلا ئاوارە ٣ ـ قادر شەریف ٤ ـ حوسێن مەدەنی ٥ ـ سەعید کوێستانی ٦ ـ ڕەسوڵی پێشنماز ٧ ـ مامەندی قازی دوایی مەلا ئەبوبەکری فەلسەفی و عەبدوڵڵای ناڵبەندیشمان پێوە زیاد بوو.

ئێمە لەوێ بەیانێکمان لەسەر دیکتاتۆری و سەرەڕۆییەکانی ئەحمەد تۆفیق دەرکرد بەتایبەتی ئیشارە کرابوو بە دەستێوەردانی ئەحمەد تۆفیق دە کاروباری شۆڕشی گەرمێن و زیاد لە ڕادە بەدەر هجوومی ناڕەوا بۆ سەر مەکتەبی سیاسی پارتی و داواش لە فایق کرابوو هەرچی زووترە سەڤ خۆی لە ئەحمەد جیا بکاتەوە دەنا وەك ئەو حیسابی بۆ دەکرێ بەداخەوە هەرچی دەکەم ئەو بەیانەم دەست ناکەوێتەوە.

ئێمە بنکەمان لەو ماوەدا لە زۆر شوێن دانا یەکەمجار هەموومان لە مالومە بووین لەسەر ماڵان و بە دوو بەش دابەش بووین پاشان گوازتمانەوە بۆ سەرا ووك میراو و شەشۆ هەموومان لە میراو و لە مزگەوتدا بووین، چونکە ماڵەکان هەمویان لە هەوارو سەرباخچە و شتی وا بوون پاشان قادر شەریف سەعید کوێستانی و چەند کەسێکیان بە بەهانەی نەحەوانەوە و شتی وا چوونە شەشۆیە و ئێمەش هەر هەموومان چوینەگوندی گرگاشە کە لە چۆمی چۆمانی نێزیکتر بوو بۆ ماسی خواردن پێش ئەوەی هجوومی بارزانی بۆ سەر مەکتەبی سیاسی بێ ئێمە کە بەیاننامەکە تەواو بوو لە کۆبوونەوەیەکدا تەقسیمی کارمان کرد و بە چوار دەستە دابەش بووین بۆ سەردەشت و مهاباد و بانە و پیرانشار بەو شێوەی خوارەوە:

**دەستەی مهاباد:** حەسەن ڕستگار ، ڕەسوڵ پێشنماز ، مامەند قازی، ئارەحمانی شیلم جاران ناسراو بە ڕەشید سمیل، جەعفەری کەریمی،

عەلی ئازا و قادری چایچی.

**سەردەشت:** حوسێن مەدەنی ، خدر مەرەسەنە ، حەسەن شاتمان ، خدر بیورەیی و چەند کەسی دیکە.

**دەســـتەی بانــە :** مــەلا ئەبوبــەکری فەلسەفی ، عەبـدوڵڵا نەعلبەنـدی ، حــاجی دەروێــش ، قالــە قــووچ و چەند کەسی دیکە.

**دەســتەی نەغـــەدە:** قادر شــەریف ، ســـەعید کوێـــستانی ، یـــونس نەغەدەیی ، محەمەدی کاکاغازادە، حەســـەنی نەغـــەدەیی، ئەحمـــەدی جوانمەردی .

دەســتەی سەردەشــت و مهابــاد بەیەکـــەوە هاتینـــە قـــەڵادزێ و لەوێشەوە بۆ هێرۆ و لە جەماڵەدین لێك جیابووینەوە.

ماوەیــەك بــوو ئێمــە خـــەریکی فەعالیـــــەت و بڵاوکردنـــــەوەی بەنایەکــەمان بــووین. خەبــەرمان وەرگرت لوقمانی مەلا مستەفای بە قـــوەتێکی زۆرەوە هاتۆتـــە ســـەر مەکتـــــەبی سیاســـــی و دوای تێکهەڵـچوونو شـەڕ لـە چـیاکانی ســـوورین و گـــەمۆ و ئـــەو نـــاوە برادەرانـــی مەکتـــەبی سیاســـی هاتبوونە خاکی ئێران و ئیتر بێ جێگا و بێ پشتیوان ماینەوە و لە ناو خۆماندا لێمان بوو بە کێشە ، کــاك حەســەن ڕسـتگار دەیگــووت ئــەمن بــاوەڕم بــەو بەیاننامــە ی نەماوە و کەسیش لێرە پشتیوانی لە ئێمە ناکا و تەنانەت خزمەکانی خۆمان دەڵێن دیارە ئەحمەد تۆفیق لە ئێوە تێکۆشەر و باشترە، بۆیە بارزانی دیفاعی لێ دەکا ڕاستیشی دەکـرد لەگـەڵ هەرکـەس قـسەمان دەکرد زۆر کەم هەبوون کە دژایەتی ئەحمـــــەد تۆفیـــق و بارزانییـــان پێخۆشـبێت، بەتایبـــەتی ئـــەو دەم ســــەدی هەشـــتای لــــە هـــەموو کوردستان خـەڵك مـەلا مستەفایان دەپەرست.

دوای یــــەك دوو وردە تەقــــە و تەحویلدانەوەی سێ برادەرمـان لە دەســـتەی ئێمـــە، ئـــەمن مـــاڵ و منداڵەکـەم بـە هـۆی قاچاخـچی و ڕەفیقی خۆم لە مهاباد هینا دەر و یەکـــسەر هاتـــەوە قـــەڵادزێ. بـارزانیش ئـەو کـات بـارەگـای لـە هێــرۆ بــوو بــە پەلــە تیمــسار مەنـسورپور و ڕوکـنی دوو خۆیـان گەیانـد بۆیـە بـۆ ماوەیـەکی کـەم برادەرانی ئێمە غەیری چەند نەفـەر نـەبێ هەموویان هاتنـەوە و لەسـەر بڕیـــاری بـــارزانی لـــە ڕانیـــە شـوێنێکیان بـۆ دیـاری کـرا و کـا حەســـەنی ڕســـتگار سەرپەرشـتی دەکـردن و ئـەو کـات زۆر بـرادەری دیکەشیان پێوە زیاد بوون، بـەلام مـــەلا ئـــاوارە و قـــادر شـــەریف و ســـەعید کوێـستانی نەگەڕانـەوە و جەماعـــەتی مەکتـــەبی سیاســـی هێنـدێك چەکی چاکیان دابوونێ و چوار پێنج نەفەری دیکەیان لـە خـۆ کۆکردبـــــووەوە لـــــە ناوچـــــەی سەردەشت بە تایبـەتی لـە گونـدی ورچـــەك کـــە زۆر چـــەپەك بـــوو دەمانــەوە. قــادر شــەریف خــۆیی لێکردبـوون بـە دەم ڕاسـت و کـاری ئەوە بوو بە نامە و بە قسە کردنی ناڕاست لەسـەر بارزانی و ئەحمـەد تۆفیق و بەرە بەرە برادەرانیش لـە کۆنگرەی دوو نێزیك دەبوونەوە.

**پ ١٩: دەکرێ باسی پەلاماری سـاڵی ١٩٦٤ ئێـران و کـۆنگرەی ٢ بکـەیت و بڵێــیت چــۆن بــوو ئەحمــەد تۆفیــق دوورخرایەوە بۆ گونە ماسی؟**

و ١٩: سـاڵی ١٩٦٤ ڕژێمـی ئێـران پەلامارێکی هێنایەوە سەر حیزب و هێندێك گیران و زۆری دیکەش وەك منیـەی سیراجی ، سمایل شـەریف زادە ، ســالار حەیــدەری، ئــەمیر قـازی، حەمــەدی ڕەشــو ، بـایزی ئاریا ، هەمزەی ئاریا ، عەبدوڵڵای موعینی ،مەلا سەعیدی کامەمی و عوسمــان عــەزیزان ڕایــان کــرد و هاتنە سەنگەسەر و سوونی بۆ لای برادەران. ئەو کاتە من بە ماڵەوە لە قـەڵادزێ بووم و برادەرەکانیـشمان لە ڕانیە. بۆ تازە هاتووەکان ئێمە بـە دایـم لەسـەر سـەرەڕۆییەکانی ئەحمەد تۆفیق قسەمان بۆ دەکردن و بـۆ خۆشـیان بـەرە بـەرە لـە نێزیکـەوە زیـاتر لـە هەڵسوکەوتی ئەحمـــەد تۆفیـــق حـــاڵی دەبـــوون ئـــەوانیش دوای ماوەیـــەك بەشـــی





زۆریـــان ڕۆیـــشتنەوە و خۆیـــان تەحویلدایەوە. سیراجی، شەریف زادە و سالارحەیدەریش هاتن لە قەلادزێ بۆ خۆیان مالیان گرت و بۆ هەموو شتێك ڕەئیان لەسەر ئەحمـــەد تۆفیـــق و زۆر لـــە مەسەلەکان وەك ئێمە بوو.

لەو ماوەیەدا ئاخری پایزی١٩٦٤ کۆنگرەی دوو لە سوونێ دەستی پـێ کـرد. ئیـدی پاشمـاوەی کۆمیتـەی ساخکەرەوە و تـازە هاتوەکانیانێ بانگهێشتی کۆنگرە نەکران، تەنیا دەعوەتی سەید حەسەنی هاشمیان کردبوو کە لە مالی ئێمە و لەگەلێ ئێمە دەژیا کە ئەویش نەدەچوو، بەلام ئێمە بە زۆری ناردمان تا بزانین لە کۆنگرە چ دەگوزەرێ و نامەیەکیشمان بۆ کۆنگرە نووسی بۆ بەشداربوونمان و داوای ئەوەمان کرد کە ئێمە ئامادەین لە کۆنگرە لەگەل ئەحمەد تۆفیق ڕوو بە ڕوو بین و چیش کۆنگرە بڕیارمان لە سەر دەدا ئامادەین لە وەلامدا گوتبویان لەو جەماعەتە تەنیا حەسەن ڕەستگا و مامەندی قازی و مەلا ڕەسولی پێشنماز دەتوانن بێن، دەنا ئەوانی دیکە هیچیان حیزبی نین.

بە دوا ئەو نامەیدا ئێمەش ١٨ نەفەر بە ٣ تفەنگەوە ملمان پێوە نا بۆ کۆنگرە ئەوەی لە بیرمە حەسەنی ڕستگار، ڕەسولی پێشنماز، حەمەدەمینی سیراجی، سمایلی شەریفزادە، سالاری حەیدەری، سەید فەتاح، مامەند قازی، ئارەحمان شیلم جاران، خدر مەرەسەنە، فەقێ ڕەسولی پینەچی، عەبدوللا خەیاتی سەردەشت ، خەلیل شەوباش ، قادر چایچی و زۆری دیکە لە بنکەی سوونێش ڕا نامەیەکمان بۆ نووسین. دووبارە وەلام هەر ئەوەی پێشەوە بوو دیارە ئەحمەد تۆفیق یەك نامەی ئێمەشی بە سەدیقی ئەنجیری و برادەران نیشان نەدابوو هەر بۆ خۆیی وەلامی دەدایەوە ئیتر ئێمەش بەرەو کۆنگرە ، کە لە داوێنی چیای مامەندەی بە ڕووی سوونیدا بوو لە دەوری کۆنگرە کە بە دوا یەکدا دەڕۆیشتین و ڕێچکەمان بەستبوو لێیان لە چەخماخ داین و دەنگیان داین حەسەن ڕستگار و مامەندی قازی لا باسکێك لە پێش منەوە بوون گوێیان پێنەدا و ڕۆیشتن خدر مەرەسەنە کە تفەنگی منی پێبوو هەلاتە خوار و هاواری حەسەنی برازای ئەحمەد تۆفیقی دەکرد و دەیگوت کاك حەسەن ئەمن بۆ شەڕ نەهاتووم و ئەوە هەتا قەلادزێ ڕاناوەستم، منیش گورج فیشەکم وەبەردا و بەردێکی چکۆلەم لە پێش بوو خۆم هاویشتە بن بەردەکە و دوو سێ قسەی ناشیرنم بە ئەحمەد تۆفیق گووت، چونکە حەسەنی برازای ئەحمەد تۆفیق یەك بە خۆیی لە کاتی فیشەك وەبەر تفەنگداندا هاواری دەکرد مەلا ڕەسولێ ئێمە لەسەر شەرەفی بارزانی پێمان سپێردراوە ئەوەی بەرەو کۆنگرە بێـی تەقـەی لـێ دەکەین ئارەحمانی شیلم جارانیش کە تفەنگی شەخسی خۆی پێ بوو لە جێگای خۆی ڕاوەستا بوو نە چاکی دەگووت نە خەراپ. سیراجی و شەریفزادە و سالاریش خۆیان لە پەنای من بە عەرزدا دا و شەریفزادە یادی بە خێر گووتی کاك ڕەسولێ گیان نەی تەقێنی گووتم بۆ سمایل گووتی ئاخر لای بارزانی مەحکووم دەبین و ئەو زۆرجار گووتیەتی کارتان بە ئەحمەد نەبێ.

لەو کاتەدا کە لە بەریەك دامەزرابووین فایق و سەدیقی ئەنجیری و مونتەقیمی قازی گەیشتنێ و کردیان بە هەرا و هاتن بۆ لای ئێمە. منیش هەرچی بە زارمدا هات پێم گووتن گووتم فایق ئەو خەلکەی هاتووە ئەمن و ئەتۆ تەنزیمان نەکردون؟ ئەگەر منت لەگەلێ نەبایم ئەتۆ ئەو سەفەرەت پێ دەکرا؟ ئێوە ئەو پیاوەن لەسەر شەرەفی مەلا مستەفا من بکوژن؟ خولاسە زۆریان تەکلیف لێکردین و گووتیان بچنەوە بنکەی سوونی و ئەوە کاك حەسەنی ڕستگار و سەید حەسەن لەوێن با کاك منیەی سیراجیش بێت لە کۆنگرەدا قسەی

ـــێ دەکـــەین و ئاگادارتـــان دەکەینەوە.

بەولاشدا کە زانیبویان خدر مەرەسەنە و فەقێ ڕەسوڵ هەڵاتبوون، ناردبویان هێنابویانەوە ناو کۆنگرە و قسەیان لەسەر ئێمە پێ کردبوون کەچی خدر مەرەسەنە لە زۆر جێگا دەخونیمەوە ئەو شتەی بە نێوی ناوێنەی ڕاستییەکان نوسیوێ هەموو پێچەوانەیە. ئەگەر ڕۆژێک زیاتر ئەو مەسەلانە ڕوون بکەمەوە، شتی زۆر نهێنی و گرینگ هەیە بە شاهیدەوە کە لەسەرخدر و نوسینەکانی بنووسم.

ئێمە هاتینەوە بنکەی سوونی و هەتا دوای نان خواردنی شەو چاوەڕوان بووین، کەچی وەڵام نەبوو. حەسەن ڕستگار و منیەی سیراجیش هاتنەوە و گووتیان زۆرمان لەگەڵ برادەران باس کردووە و ئەحمە تۆفیقیش هەر دەیگوڕاند و لەگەڵ ئەوەی بارانێکی زۆر توند دەباری ئێمە گوێمان بە بارانی نەدا و بەو تاریکەشەوە وبارانەی گەڕاینەوە قەڵادزێ و خدر مەرەسەنە و فەقێ ڕەسووی پینەچیشمان خەسار دابوو کە لە ئێمە هەڵگەڕانەوە و ڕەگەڵ وان کەوتن دوای شەش حەوت ڕۆژ دوای کۆنگرە خدر مەرەسەنە دووبارە هاتەوە لای ئێمە.

هەر ئەو شەوەش ئەحمەد تۆفیق بە ناوی کۆنگرە نامەی بۆ بارزانی نووسیبوو کە گۆیا ئێمە بە هاندانی مەکتەبی سیاسی کۆن چوینە سەر کۆنگرە و بە سەید ڕەسوڵی ورچان و چەند پێشمەرگەی دیکەیدا ناردبووی بۆ بارزانی کە ئەو دەم لەلای پلێنگان و دۆڵە ڕەقە دەبوو بە بێ ئەوەی بۆ ئەو نامە پرس بە یەک نەفەر بکا لە کۆنگرە بۆ بەیانی بارزانی بە دوای حەسەنی ڕستگار یدا نارد و ئەگەر کاک شەمسەدین موفتی فریای نەکەوتبا لەوانە بوو زیندانی بکا، بەڵام ئەو کات کاک شەمسەدین موفتی لە تاران نوێنەری بارزانی بوو زۆریش جەماعەتی مەکتەبی سیاسی خۆشدەویست زۆری نێوبانگی کا حەسەنی ڕستگار و ئێمەی بیستبوو، ئەحمەدیشی خۆش نەدەویست ئیتر دیفاعێکی زۆر جوانمێرانەی لێکردبوو.

بە دوای کۆنگردا فایق هاتە قەڵادزێ سەدیق ئەنجیری لەگەڵ بوو داوای لە من کرد کە چەند شەوێك لە شوێنی زۆر نهێنی دانیشین و خواردنەوە بۆ سەدیقی ئەنجیری پێك بێنین، چونکە زۆر هیلاك و تورە و ماندووە. بۆ ئەو خەرجیە ٥ دیناری دا بە من یەکەم شەو قادری مامەند ئاغای نورەدینی کە ڕەفیقی خۆم بوو و لەوێ دەیخوێند، کلیلی ماڵەکەم لێوەرگرت و چوینە ئەوێ. فایق و سەدیق و مینەی سیراجی و شەریفزادە و سالاری حەیدەری بووین. لەگەڵ خواردنەوە دەستمان کرد بە گازندە و ئەو ناهەقیانەی کە ئەحمەد تۆفیق لە هەمووی ئێمەی کردووە و چەند جار بە دەستی مەلا مستەفا ئێمەی بە چەککردن داوە و چەند برادەری دیکەی بۆ خۆی چەك کردوون و عەزیز فەلاحی و هاشم حوسێن زادە و قاسم سوڵتانی و قادر شەریفی وەدەرناوە. دوکتور قاسملوو و کەریم حیسامی بە مەلا مستەفا لە ئێراق دەرکردووە و ئەسعەدی خودایاری کوشتوە ئیتر کە من ئەو باسانەم کرد، سەدیقی ئەنجیری پەپوولە ئاسای سادق بێ فڕوفێڵ و عالم لەسەر هەست لە پێشەوە دەستی کرد بە جنێودان بە فایق و گووتی نامەرد ئەدی بۆ لە کۆنگرەدا یەك کەلیمەت لەو شتانە نەگووت. زیاتر لە دوو سەعاتی پێچوو ئەو پیاوە فەقیرە ئاوری گرت هەر جنێوی بە فایق و بە خۆیی دەدا و فایقیش نەیدەتوانی یەك قسەی من ڕەت بکاتەوە، چونکە کاتی خۆیی هەر ئەو ئەمنی لە دژی ئەحمەد تۆفیق تەحریك دەکرد.

شەوی دواتر لە ماڵەکەی سیراجی و شەریفزادە و سالاری حەیدەری بووین ئەو شەوەش هەموو



برادەران بە تێکڕا ئەوەی دەیانزانی لەسەر ئەحمەد قسەیان کرد بە ڕاستی فایق یەکجار زۆر ڕێزی لە کاک سەدیقی ئەنجیری دەگرت و هەر ئەویش لە تاران ڕا هێنابووی، بەڵام کاک سەدیق هەر زووزو ئیهانەی دەکرد و دەیگووت ئەتۆ بۆ درۆت لەگەڵ من کردووە بۆ یەك جار بە حزوری کۆنگرە ڕەخنەت لە ئەحمەد تۆفیق نەگرت و بە عەکسەوە هەرچی دەیگووت قبوڵت دەکرد.

شەوی ئاخر خدر مەرەسەنە ماڵێکی لە گەڕەکی مام قاسم گرتبوو، سەڵت بوو چووینە ئەوێ ئیتر لەوێ شتەکە تەقیەوە کاک سەدیق هەتا بێهۆش بوو هەر جنێوی بە فایق دا و پاشان بۆ لای بەیانی زوویر بوو گووتی دەچمە حەمام و تازە نایەمەوە ماڵی هیچتان. بە هەزار پاڕانەوە ڕازیمان کرد کە بێتە ماڵی ئێمە، چونکە زۆر حەزی لە سەراحەت و ڕاستگۆیی من دەکرد. بۆ بەیانی فایق و جەماعەت هاتن و بە خواهیش و تەمەنا لەگەڵیان ڕۆیشتەوە سەنگەسەر و بیستمانەوە لەگەڵ ئەحمەد تۆفیق کێشەی توندیان لێ پەیدا بووە و برادەرەکانیش بە فایقەوە هەموویان پشتی ئەویان گرتووە.

ئەحمەد تۆفیق داوا لە بارزانی دەکا و دەڵێ مادام وتوێژو هەیە، ئەگەر ئیزنم بدەی دەچمە بەغدا بۆ هێندێك پێوەندی وردەکاری خۆم ٣ برادەریشم هەن دیبلۆمیان هەیە بەڵکو بتوانم بیان نێرمە دەرەوە. برادەرەکانیش عەبدوڵڵای موعینی و هەمزەی ئاریای مەنگوور بوون و قەولیشی بە سمایلی شەریفزادە دابوو لەگەڵ وان بینێرێ بۆ ئەوەی هەم لە کۆڵ خۆیان کاتەوە و هەم لە دەرەوە پشتیوانی لێ بکەن. ئیتر ئەو چوونە بەغدایە بۆ ئەحمەد بوو بە بەڵا و بۆ بارزانیش بوو بە ئەوە کە ئەحمەدی بەو بەهانەوە لە کۆڵ خۆی کردەوە و دواتر ئەحمەد تۆفیق لە بەغدا گیرا و خەبەر بە بارزانی درا کە وریای ئەحمەد بێت و گرتنەکەی بەڕاستی نیە کە ئەحمەد گەیشتەوە سەنگەسەر بارزانی نەی دیتەوە و گوتبووی بۆ ماوەیەك با بچێ بۆ قەندیل و کام لە ڕەفیقەکانیشی دەبا کەیفی خۆیەتی.

ئیترئەو لەگەڵ خوارزاکانی و چوار پێنج نەفەر بە بەهانەی ڕاو، ڕووی لە قەندیل کرد و شەڕ لە نێوان حکومەت و بارزانیدا لە١٩٦٥ دەستی پێ کردەوە ئێران لە جاران زیاتر نفوزی لە نێو شۆڕش پەیدا کرد ئەحمەد تۆفیق لە داخی ئەوەی کە بارزانی نابینێ وەك شێتانی لێهات و چەند کەسێکی دیکەی لە جەماعەت کۆکردەوە و لە ناوچەی باڵەکایەتی لە گوندی شێخان بنکەی دانا و دەستی کرد بە شەڕ کردن هەتا دووریان خستەوە بۆ لای شێخان و گوندی کانی ماسی چاکترین شەڕی کردن ئەو جەماعەتەی دەگەڵیشی بوون زۆر ئازا بوون لە شەڕی بە ناوبانگی هەندرێن چاکترین شەڕیان کرد و زۆرترین دەستکەوتیان وەدەست هێنا.

**پ ٢٠: دوای ڕۆیشتنی ئەحمەد تۆفیق، چۆن کادیرەکانتان کۆکردەوە؟**

و ٢٠: کۆمیتەی ناوەندی دوای کۆنگرەی دوو، من و کا حەسەنی ڕستگار و مەلا ئاوارەی وەك مشاویری کۆمیتەی ناوەندی دیاری کرد. کاك سەدیقی ئەنجیری لەلای دەربەندی ڕایەت بە شێوەیەکی زۆر نهێنی لە ناو باخچەکاندا و لەگەڵ سەعید کوێستانی و فەقێ برایم و یونس دەژیا و هەر دادە ڕۆی بوو کە ئێمە کوردی ئێرانی نابێ لێرە چەکمان پێ بێت و دەبێ کاری نهێنی بکەین دەشیانگووت کاك سەدیق یەك دوو جار بە نهێنی بارزانی دیوە. فایق و زۆر لە برادەران هەر لە سوونی مابوونەوە و شتێکیان بە ناوی لکی ٣ بڵاو دەکردەوە و مەلا ڕەحیمی وێردی وەك ئەندامی کومیتەی ناوەندی لە ناوچەی شارباژێری لەگەڵ چەند کەس دەژیا و پێوەندی بە وڵاتەوە هەبوو. من کەوتمە گوندی هێرۆ،

قادر شەریف و مەلا ئاوارە و سەعید کوێستانیش لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك لە ناوچەی سەردەشت مابوونەوە و ئەوانیش لەسەر سەرەرۆییەکانی قادر شەریف کێشەیان لێ پەیدا بوو، چونکە قادر شەریف زۆرتر کاری ئاژاوە نانەوە بوو دەگەڵ یەك ئینسانیش ٣ مانگ نەدەمایەوە و بە دایم لە گوماندابوو. دوو کەس بە یەکەوە قسەیەکیان کردبا وای دەزانی ئەوە نەخشەی کوشتنی بۆ دەکێشن و کار و پیشەی ببووە جنێودان بە ئەحمەد تۆفیق و بارزانی بە پیاوی ئێران و ئیسرائیل و ئیمپریالیزم تاوانبار دەکرد. مەلا ئاوارە چوو بۆ سوونێ و لەوێ لەگەڵ فایق و ڕستگار و باقی برادەران کۆبونەوەی کردبوو گوتبووی من و سەعید کوێستانی لەگەڵ ڕەئی ئەو نین و نامانەوێ لەوێ بە جێ بمێنێت و ئەگەر ئێوە بتوانن بیهێننەوە، من و سەعید کوێستانی هەموو هاوکاریەکتان دەکەین. ئەوەی ڕاستیش بێ ئەو تەشکیلاتەی لە کە ناوچەی سەردەشت هەبوو ئەو تەشکیلاتە پتەوە و نەهێنکارە بوو کە لە کاتی خۆیدا مەلا ئاوارە بە هاوکاری مەکتەبی سیاسی پارتی پێکیهێنابوو و هەتا ئێستاشی لەگەڵ بێ حیزبی دیموکرات تەشکیلاتی ئاوای نەبووەتەوە.

لەو کۆبونەوەیەدا هاوینی ١٩٦٥ بڕیار دەدەن هەیئەتێك لەو نەفەرانە پێك بێنن بە هاوکاری مەلا ئاوارە بۆ گەڕانەوەی قادر شەریف ١ ـ حەسەن ڕستگار ٢ . مونتەقیم قازی ٣ . مامەند قازی ٤ ـ مەلا ڕەحیمی لۆمانی ٥ ـ مەلا ڕەسوڵ پێشنماز نووسەری ئەو دێڕانە. بەو هەتیەتەدا کاك فایق نامەیەکی بۆ من نووسیوە و تکای کردووە کە لەگەڵ عەزیزی برام لەگەڵیان بچین بۆ هێنانەوەی قادر شەریف ودەڵێت هەتا پێتان دەکرێ بە خۆشی بە قەناعەت پێکردن بیان گێڕنەوە.

ئێمە لە گوندی هیرۆێ ڕا دە نەفەر دەبوین ئێوارە درەنگانێك بە گردە شیخالدا و بێناسەی عەولا ئاغا پشدەری و بە پشتی گوندی باوزی و باژێرێدا بۆ شەو درەنگانێك گەیشتینە گوندی قەلەڕەشێ پیتەختی خاڵە مەری کە زەمانی ڕەزا شا، لە دژی سەربازگیری ڕاپەڕی و تەختی چەپەری دروست کرد و ناویان نا ئۆمەر پاشا. ئەو کات مابوو زۆریش بەگوڕ بوو پێوەندی حیزبی بە مەلا ئاوارەی شەهیدەوە هەبوو یەکجار زۆری خزمەت کردین. دەیگوت هێندە دڵم پێتان کراوەتەوە، لاموایە جارێکی دیکە کۆماری کوردستان زیندوو بووەتەوە. دوای ماڵ نوستنان، سنورا و سنور بەرەو لای ورچەك

کەوتینە ڕێ و مەلا ئاوارەی شەهید بە شێوەیەکی ئەوەندە جوان و ڕێکوپێك وتەشکیلاتیانە ئێمەی گەیاندە ورچەك بە قەولی دەڵێن نەیدەهێشت ئەو دەست بەو دەستەی بزانێت. تەنانەت لای دوو کەس نەبێ دیاربوو زۆری حیساب لەسەر دەکردن دەنا نە باسی ئێمەی کرد نە هێشتی ئێمە کەس بناسین. ڕوحی شاد و یادی بەخێر بەڕاستی ئەو پیاوە خوا بۆ کاری نهێنیێ و تەشکیلاتیی دانابوو بە تایبەتی ئەو چەند ساڵەی لای مام جەلال و جەماعەتی مەکتەبی سیاسی بوو، زۆر چاکیان پوختە کردبوو.

شەوێ مابوو گەیشتینە ورچەك برادەران پێیان باش نەبوو بە هیچ شێوەیەك لە هەوڵەوە قادر شەریف ئەمن ببینێ لایانوابوو هێندەی دیکەش مەشکوك دەبێ. مەلا ئاوارە چووە بنکەکەیان و ئێمەشی بەسەر دوو ماڵان دابەشکرد زۆری پێنەچوو سەعید کوێستانی هات بۆ لای ئێمە و زۆر خۆشحاڵیی نیشاندا لەوەی کە هاتوین و بیانبەینەوە و بەتایبەتی کە لە دوای کۆمیتەی ساخکەرەوە ئێمەی نەدیبوو، بەلام گووتی قادر شەریف لەگەڵ ئەرسەلان وچەند پێشمەرگە لە جەولەیە.

بۆ بەیانی ئێمە خەریکی دەم وچاو شۆشتن بووین لە پڕ قادر شەریف

سەروگوێلاکی دەرکەوت لە هەوەڵەوە کە چاوی بە حەسەن ڕستگار و مونتەقیم قازی و مامەند قازی و ئەوانی دیکە کەوت، تۆزێك قووت بووەوە. ئەمن هەرچی ویستم خۆمی نیشان نەدەم بێ کەڵك بوو هەر چاوی بە من کەوت، کەوتە تەوس و پلاران و ها کاك ڕەسوڵی قارەمان مەگەر ئەتۆ نەبووی دەتگوت نابێ ئەحمەد تۆفیق هەر بمێنێ؟ ئێستا چۆنە لەگەڵ وانە کەوتووی و چیتان بە دەستەوەیە؟ دوای ئەو قسانە و هێندێك مشتومڕ، بڕیارماندا بچینە باغەکانی پشت ئاوایی و لەوێ قسەی خۆمان بکەین با عالەمەکە دە کەین و بەینی ئێمە نەگا. پێش وەڕێکەوتن بە سەعید کوێستانی و مەلا ئاوارەی گوتبوو دەبێ وریای خۆتان بن و ئەوانە نەزەریان باش نیە و ڕەنگە بمانگرن بە دیاری بۆ بارزانیمان بەرنەوە بۆ ئەوەی لای ئەوان جێگای خۆیان خۆشکەن، ئیتر بێخەبەر بوو لەوەی کە ئەوە نەخشەی مەلا ئاوارە و سەعیدە کە ئێمەیان هێناوە بۆ ئەوەی کێشەی قادر شەریف لە کۆڵ خۆیان کەنەوە هەر لەوێ بە پێشمەرگەکانیان گوتبوو، ئێوە نابێ لە ئێمە نزیك ببنەوە هێندێکتان لە ناو گوند و هێندێکتان وەرنە نزیك ئێمە ئاگادارین ئەگەر تەقە کرا وەرنە فریامان، بەڵام سەعید و ئاوارە ئەوانەی کە تێیان ڕادیبوون، غەیری دوو نەفەری ڕاوە ڕووتچی نەبێ پێیان گوتبوون کە ئەوانە هاتوون ئێمە بەرنەوە بۆ ناو حیزب و هیچ نەزەرێکی خەراپیشیان نیە و ئێمەش لە غەیری ئاژاوە نانەوە لێرە کارێکی دیکەمان نیە. موشکیلەی گەورە ئەحمەد تۆفیق بوو ئێستا هیچ بەرپرسیارەتێکی نەماوە و ئەوە بە خۆی و جەماعەتەوە لە بەرەی شەڕە لەلای هەندرێن و بارزانیش وەك جاران ڕووی نادات و حیزب ئێستا تەقریبەن بە شێوەی دەستەجەمعی بەڕێوەدەچێ و برادەرانی کۆمیتەی ساخکەرەوەش چەند کەسیان وەك مشاویری کۆمیتەی مەرکەزی کار دەکەن.

ئێمە لەوێ زۆر بە حورمەتەوە نامەی سلێمانی موعینی (فایق)مان دایە کە بە ناوی کۆمیتەی مەرکەزی بۆی نووسیبوو. نوسیبووی ئەوە برادەران بە ناوی هەیئەتی حزب هاتن بۆ لات و ئەتۆ ئینسانێکی زۆر خاوەن ڕابردووی و ئێستاش کاك ئەحمەد تۆفیق ئەو دەورەی پێشووی نەماوە و بارزانیش زۆری کار بە کاری ئێمە نەداوە: ئێمە ئێستا دوای کۆنگری دوو ئەو هەموو کێشە و ناکۆکییانە کە بوومانە لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستیمان بە یەکگرتن هەیە. جا بووەیە داوات لێ دەکەین بە خۆت و برادەرانەوە وەرنەوە لێرەش هەر کەس بە گوێرەی لێوەشاوەیی و ڕابردووی خۆیی حیسابی بۆ دەکرێت و هەتا پلینۆیومی کۆمیتەی ناوەندی. ئەوە مەلا ئاوارەش لەلایەن خۆی و سەعید کوێستانیەوە هاتە ئێرە و نەزەری گەڕانەوەیە بۆ ناو حیزب.

لەگەڵ نامەی خوێنەوە، زانی مەلا ئاوارە و سەعید نەزەریان لەگەڵ ئەو نەماوە، ئاوری گرت ئێمە بەو شەش حەوت کادرە دڵسۆزانەوە چوار پێنج سەعات موناقەشەمان لەگەڵ ئەو پیاوە کرد و هەرچی شێر و ڕێوی بوو بۆمان هێنایەوە بێ فایدە بوو، وەڵامی هەموومانی دەدایەوە و هەر تیکراری دەکردەوە کە ئێوە خۆتان فرۆشتووە بە ئەحمەد تۆفیق و بارزانی و لەگەڵ ڕژێم فەرقتان نیە و ئەمن خۆم وە ئیمپریالیزم هەڵناواسم.

کوڕێکی لەگەڵ بوو بە ناوی ئەرسەلان کە پێشتر مەلا ئاوارە و سەعید گوتیان: ئەو کوڕە ژنێکی بە مێردی لە گوندەکە هەڵگرتووە و نە مەسڵەت دەکا نە وەڵامی کەسیش دەداتەوە و لەگەڵیشی دەژی و قادر شەریفیش دەڵێ: ڕەئی ئازادە و ژنە هەقی خۆیەتی و بە زۆری داویانە بەو کابرایە. ئۆرە قسەی حەسەن ڕستگار بوو، منیش زۆر هیلاك بووم لە پێش لوتیان ڕاکشابووم و گوێم لە قسەکانیان

بوو کا حەسەن زۆر بە ئارامی و بە ئیحترامەوە گووتی: کاك قادر هەر لەگەڵمان نایەوە؟ گوتی نەخێر، گووتی: ئەتۆ جێگای ڕێزی و ئێمە بێحورمەتی بە تۆ ناکەین، بەڵام بەو کوڕەی کە ڕوو بە ڕوومان تفەنگی برنۆی بە دەستەوە و ئامادە دانیشتبوو، گووت: تفەنگەکەت دانێ ئەتۆ تاوانباری هەر وای گووت خڕە لە چەخماغی تفەنگی کوڕە و تەقەیەك هات ئەمن پێموابوو حەسەن کوژرا کە هەستام دیتم حەسەن وەك هەڵۆ و زەمانی وەرزشکاری گەیوەتە کوڕە و وای دە دەم و لووتی سرەواند بوو کە خوێن فیچقەی دەکرد. قادر شەریفیش تومەس هەر پێش ئەوە فیشەکی وەبەر کلاشینکۆفەکەی دابوو یەکسەر تەقەی لە حەسەنی کردبوو مونتەقیمی قازی کە لە پەنایان دانیشتبوو زۆر ئازایانە و مەردانە لولەی کلاشینکۆفەکەی قادر شەریفی گرتبوو ئەویش هەر دەیتەقاند منیش لە تاوی حەسەن، قادر شەریفم وەبەر قۆنداغە تفەنگاندا، هەتا هاواری کرد و تفەنگەکەی دا بە مونتەقیمی قازی لەولاش حەسەن کابرای نیوەمردوو کرد و چەکەکەی لێ ئەستاند. منیش هەتا پێم کرا لەو ئەرسەلانەم دا کە ژنە بە مێردەکەی هەڵگرتبوو ئیتر ئەوانی دیکەمان هەموو چەك کردن و هاتینەوە ناو گوند پێش ئەوەی بگەینەوە ناو ماڵان ئەوانەی کە لە ناو گوند دایان نابوون بۆ دیفاع پێیان وادەبێ ئێمە ئەوانەمان بە قادر شەریفەوە کوشتووە ئیتر شەش حەوت نەفەر بوون چەکەکانیان دابوو بە خەڵکی گوند و کەیخودایەکان و ئەوانیش بە پیرمانەوە هاتن و گوتیان بۆ خاتری خودای مەیان کوژن و ئەوە چەکەکانیان.

هەر لەوێ بووین بە دوو دەستە من و شەش حەوت نەفەر و عەزیزی برام قادر شەریف و ئەو کوڕەی ژنی هەڵگرتبوو ڕەگەڵ خۆماندان و بۆ گەڕانەوە مەلا ئاوارە و حەسەن ڕستگار و سەعید کوێستانی و زۆری دیکەش گەشتێك بە ناوچەکەدا بکەن بۆ هێورکردنەوەی خەڵك و هێندێك کەلوپەلی شاراوە هەبوو بیان هێننەوە لە عەینی حاڵدا مزگێنی بدەن بە خەلك کە ئێمە هەمووومان یەکمان گرتەوە و کێشەمان نەماوە.

ئێمە گەڕاینەوە سەعاتێك دوور لە ئاوایی ڕەز و کۆخی حاجی شێخ قادر ناوێکی حیزبی دڵسۆز لەسەر ڕێگمان بوو بە زۆر بە تەکلیف وایکرد لاماندا خەریکی نان خواردن بووین دوو کەس هاتن نامەی حەسەن ڕستگار و مەلا ئاوارەیان بۆ هێنام نووسیبوویان لەبەر ئەوەی کە ئەوانی ژنەکەیان لێ هەڵگیراوە هەموویان خزمی یەکن و لەو گوندەدان لە ترسی ئەوەی کە ئێمە لەسەر مەسەلەی نامووس ئەرسەلان لە بەینی نەبەین بۆ خۆیان هەر ئەوڕۆ سوڵحیان کردووە و تکامان ئەوەیە ئەرسەلانمانا بەو نەفەرانەدا بۆ بنێرنەوە لەگەڵ ئەوەی زۆرم پێناخۆش بوو ئەمن لە ژیانمدا خۆم بە پاراستنی ماڵ و نامووسی خەڵك زانیوە بوویە نیوسەدە ژیانی خۆم خستۆتە مەترسیەوە و دوورە وڵاتی و خزم و کەسم قبوڵ کردووە، پێم خۆش بوو بیگەیننەوە سوونی و کاری وای بەسەر بێنم زۆرەهای دیکەشی پێوە چاوترسێن بکەم کە زۆر جاریش لەو کارانەم کردووە خەڵك شاهیدن ئیتر کوڕەم تەحویلی وان دایەوە بۆ خۆمان کەوتینەڕێ.

لە پێش لێك جیابوونەوەمان سەعید کوێستانی گووتی کاك ڕەسوڵ گیان بە دەس زارای خێزانم و شێواوی کچمەوە زۆر ناڕەحەتم لەو ماوەیەدا هەر ڕۆژە و مانگەی لە جێگایەك شاردوومنەوە و هیچ ماڵ و شوێنێکم نیە بە ڕەئی تۆ چیان لێ بکەم، گوتم من ماڵم لە گوندی هێرۆیە و ئاغاکان و خەڵکی گوند یەکجار زۆر ڕێزمان دەگرن و دایکم و خێزانم و دوو کیژۆڵەی چکۆڵەم هەیە کە یەکیان بە ناوی هێرۆ ئەو ڕۆژانە لەدایکبووە ئەگەر بە ئێمە ڕازی بن، بیانێرە بۆ لای من



و وەك خوشــكی خــۆم ئاگــام لــێ دەبێت.
پـاش ماوەیـەك هـاتن بـە گـوێرەی پێویست ڕێزمان لێگرتن. نیازمان هـەبوو لـە نێزیـك خـۆم خـانووی بەتاڵ هەبوو بۆیان خاوێن کەینـەوە خوشـكە زارا ڕازی نـەبوو، گـووتی هەر لێرە لەگەڵ دایكت و مەلا ژن و ئێوە دەبم و نـاوێرم بـە تـەنێ بـەو منداڵـەوە لـەو ماڵـەدا بم. ئێمـەش هەریـەك ژورمـان هـەبوو لـەو ژوورە ڕەش و پیسانەی ئەو كاتی دێهاتی كوردەواری. پاشان هەر بۆ خۆیی برژانـە زارا بـە دایكمـی گوتبـوو پێمخۆشـەو ئـەو بـن بانیـژەم بـۆ خـاوێن كەنـەوە پـێم جـوان نیـە هـەموومان پێكـەوە لـە ژوورێكـدا بنـوین. ئـیتر دایكـم و خێـزانم ئەوێیان بۆ خاوێن كردبۆوە و نوێن و ڕایـەخیان بـۆ دانـابوو، هـەتا ناردمانـەوە بـۆ ئێـران لەگـەڵ پـورە مەلا زادەی خەسووم كە بۆ خۆیی شێرە ژنێكی هەڵكەوتوو بوو هەتا لە نەغەدە تەحویلی كەس و كاری نەدابۆوە وازی نـەهێنا بـوو ئـەویش لە ترسی تەیارە ڕۆیشتەوە ئەو ژنـە ئازایە كە داویی نێوبانگی هـەبوو. هەمیشەش لە سەعید ئازا تر بوو كەچـــی هـــەموو جیرانـــەكانمان شـاهیدن كە تـەیارە دەهـات و لێـی دەدا ئـەو ژنـە فـەقیرە بـە تـەواوی كـۆنترۆڵی خـۆی لـە دەسـت دەدا. كەچی دوای ساڵەها كاك سەعیدی بەڕێز لە بیرەوەرییەكانیدا بە ناوی (ئاوڕێـــــك) دەنووســــێ زارای خێزانیـشم مـەلا ڕەسـوڵ بـە خێـرا خـۆی جیـچگا ی قـەلانی بـۆ پـاك كردبـۆوە و ماوەیـەك لـەلای ئـەوان حاوابۆوە.
ئـەو جـۆرە سپڵەیی و بـێ نمەكیـە هـــەر لـــەو جـــۆرە تودەنمایانـــە دەوەشێتەوە بۆ مەگەر مەلا ڕەسوڵ كـێ بـووە ئاغـای هێرۆیـە بـووم تـا جێگای قـەلانم هـەبێ مەگـەر منیش وەك ئـەو ئاوارە نـەبووم و خـەڵك بـە خێـرا خـۆیی ژووری نـە داومـێ ؟ ئەوجار ئێمە ئەو كات تەنانەت یـەك دانە مریشكیشمان نەبوو نوكتەیەك بـۆ ڕاسـت و درۆی كـاك سـەعید وەبـیر دێنمـەوە كـە هـەم سـەید حەسەن هاشمی ماوە هەم كاك مەلا عومەری عەسری كە هەردوكیان لـە ســـویدن و حەســـەن ڕســـتگار و حەسـەنی قـازی و سـالار حەیدەری و سمـایلی شـەریفزادەش و زۆری دیكـەش ئـەو كـات لـە نـاو شـاری قەڵادزێ مابوونەوە، بەڵام ئەو كات مـەلا عومـەری عەسـری، سـەلاحی موهتـەدی و كـاك سـەعدی ماميـان یادی بە خێر لەگەڵ ئێمـە كۆمـەڵێك بوون لە هێرۆ دەژیان.
تـازە هێـرۆی كـچم چـاوی بـە ژیـن هـەڵێنابوو پـێش ئـەوەی خێزانـی سـەعید بێـت بـۆ لامـان گەلاوێـژی كـچم كـە لـە مهابادلـەدایك ببـوو وە دوو سـاڵ لـەو گـەورەتر بـوو ڕۆژێـك دایكــم تەماشــا دەكــا گەلاوێـــژ چـــەقۆیەكی زۆر گـــەورەی بـــە دەســـتەوەیە و هـــەر لـــە دەورەی هێرۆی مەڵۆتكە هەڵدەسوڕێ دایكم تەنگاو دەبێ و دەڵێ ئەوە گەلاوێژ چ دەكـەی ئـەو چەقۆیە چیە پێتـە ئـەویش ڕا دەكـا و چـەقۆكە فـڕێ دەدا و دەڵـێ: ئـەدی ئێمـە هێرۆیـی نـەخۆین؟ ماوەیـەك بـوو گۆشتمان نەخواردبوو منیش عەینی شتم بۆ سـەید حەسـەنی خـزم و حەسـەنی ڕستگاری ئامۆزام نووسی و دەڵێم ئەگـەر فریامـان نەكـەون و هێنـدێك گۆشـــتمان بـــۆ نـــەنێرن ســـەهلە منداڵـــەكان بـــۆ خۆشمـــان یـــەكتر دەخـۆین. ئـەوە نـە چـیرۆكە و نـە دروستكراوە و ئەوانەش كـە باسـم كردن ڕەنگە هەر لە سوید زیاتر لە بیـست جـار ئـەو مەسـەلە بـاس كرابـێ، ئـیتر كـاك سـەعیدی بـەڕێز قـەلی چـی و لـە جیـاتی سـوپاس گوزاری ئەو درۆ گەورەیەت لە كوێ ڕا ساز كرد هەی ماڵت ئاوەدان بێ. دەبێ ئەو بەڕێزە بێتەوە یادی كە بنكەی زینوی شێخیمان هەبوو ئەو مـاڵی لەوێـدا بـوو مـن بـە میـوانی لـەوێ بـووم هـەر ئـەو كیـژەی دە سـكی براژنـە زارادا بـوو تـەیارە زەلامـەكانی ئـەوكات بـە نـاوی ئەلوێـشین هـات و یـەك ناپـاڵمی لـە نـاو گوندەكـە دا و ئێمـە هـەموومان دەرپـەڕینـە دەرەوە. باخـچەیەك لـە پـێش مەدرەسـەكە بـوو كـە مـن

گەیشتمە ئەوێ براژنە زارا لە نێو پەرژینە دڕوا و یەکەدا عاسیە ببوو وەك مێژۆکەی دەلەرزی نە سەعید و نــە کەســی بــە دەورەوە مـابوو. تەیارەش هارەی دنیای پڕ کردبوو تـەواوێکم پێـچوو هـەتا ئـەو ژنـە بەستەزمانە سك پڕەم لە پەرژین و دڕ و داڵ نەجات دا. بەو سەروێژە ناخۆشـەدا گەیاندمـە لای ئـەوان و یەك دوو قسەی بە شێوەی خۆم کە بـرادەران هــەموو دەزانــن ئەگــەر توڕەم دەبوم دەمگوت بەویم کوت پـــاش چـــەند ســـاڵەهای ســـال کەبراژنــەزارا لــە گونـدی هێرۆیـە ئەئاوا دەترسا پێم وابوترسی ئەو ڕۆژەی لەوجودیداماوە،کەلـەزینوێ تەیارە لێی داین.دەنا وەکی دیکە ئەوژنە ژنێکی زۆر مەردورەندبوو، هەمیـــشەش پێمـــان لـــە ســـەعید کوێستانی ئازاتروچاکتربوە،

**پ ۲۱: دەکرێ باس لە ساڵی ۱۹٦٦ و شێواندن و ئاڵۆز بوونی وەزعتان بکەیت؟**

و ۲۱: ئــەو ســاڵە بــۆ تێکــڕای تێکۆشــەرانی حیزبــی دیمــوکرات ســاڵێکی زۆر نــەگریس و شــووم بـوو، چـونکە لـەو ساڵەدا ڕژێمـی ئێران بە تەواوی خۆی خزاندبۆ نێو شۆڕشـــی باشـــووره وە زۆر لـــە کاربەدەســـتان و بەڕێوەبـــەرانی شۆڕش و خـەڵکی ئاسایی کـار و پیشەیان ببـوو بـە پێهـەڵا گـوتنی ڕژێمی شا. لایان وابوو لەو دنیا پان و بەرینەدا ئەگەر فریادڕەسێك بـۆ کـورد هـەبێ حەمـە ڕەزا شایە. زۆر جـاران کێشەیان لەگـەڵ ئێمـە دەکرد دەیانگوت ئێوە بۆ نارۆنەوە حکومەت لە حکومەتی شا باشتر هەیـە؟ هـەر ئـەو سـاڵە ئەحمـەد تۆفیقیـان لەگـەڵ شـەش حـەوت پێـشمەرگە نـاردە شـێخان بـۆ لای عیسا سوار و ئەسعەد خۆشەوی و لـە گونـدی کـانی ماسـی جێگریـان کرد.

سلێمانی مـوعینی (فـایق)یـان لـە سوونی ڕا هێنـا بـۆ پـشتی سـەر کـــەپکان و لـــە گونـــدی دێـــرێ جێگیریان کرد بە ۳۵ پێشمەرگەوە. بەرپرسەکان بەشی زۆریان شێوەی هەڵسوکەوتیان بەرامبەر بە ئێمە بە تەواوی گۆڕا. جەماعەتی مەکتەبی سیاسی کۆن لە دۆڵەرەقە تینیان بۆ هات و ڕایان کرد بۆ ناو حکومەت. هەتا زەخت بۆ ئێمە زیاتر دەبوو زیـاتر ئێمـە کۆبوونـەوە تـەگبیری زۆرترمـان دەکرد ئاخۆ چی بکەین زیاتر لە دە پازدە کۆبوونەوەمان لە گـەڵوەڕەز و قـەڵادزێ و دۆڵەرەقـە کـرد بـۆ یـەك جاریش بیرمان لـەوە نــەکردەوە کــە ئێمــە هــیچ هەڵوێــستێکی دژی شــۆڕشمان هەبێ، چونکە بە ڕاستی ئێمە زیاتر ئـەو شۆڕشـەمان بـە هـی خۆمـان دەزانـی. فـایق لـە هـەموو بـرادەران دڵسۆزتر بوو بەرامبەر بە بارزانی و شۆڕشـــی کـــورد. جەماعـــەتێك پێشمەرگەی زۆر چاکمان لە هێزی کـــاوە لـــە ژێـــر ئیتاعـــەتی حەســـۆمیرخان دابـــوون و ســـەید ڕەســـوڵی ورچـــان و ڕێبـــوار سەرپەرشتیان دەکردن. شەڕی زۆر چاکیشیان دەکرد سەید ڕەسوڵی بـابی گـەورەی بـە خـۆ و بـە جانتـا دەرمانـەوە بە دایم لەگەڵ زۆربـەی بەرپرسـانی پێـشمەرگە بـوو لـە بـەرەکانی شـەڕ بە ئیمانـەوە کـاری خـــۆی دەکـــرد. حەمـــەدەمینی سـیراجی و سمـایلی شـەریفزادە و سـالار حەیـدەری لـە گـەڵوەڕەزی پـشتی سـوونێ ماڵێکیـان هـەبوو خـەریکی موتالەعە و شتی خۆیان بـوون، بـەبێ ئـەوی کـە کاریـان بـە هــیچ شــتێکەوە بێــت. حەســەن ڕستگار و کۆمەڵێك برادەر لە بناری بەستە و مارەدۆ و ئەو ناوە بوون و عالەم زۆری خۆشدەویستن. خۆیان دە هـــیچ شـــتێك نەدەگەیانـــد. ســـەلاحی موهتـــەدی، محەمـــەدی ئیلخانیزادە و کاك سەعدی ماميان و مـەلا عومـەری عەسـری و خالیـد ئاغاش (مام هێدی)و زۆری دیکە و بەنـدەش ماڵمـان لـە گونـدی هێـرۆ بوو کە لەلایەن ئاغاکان و خەڵکەوە بێ ئەندازە ڕێزمان لێ دەگیرا.

بەرە بـەرە هـەر لـە سـاڵی ۱۹٦٦ و هەهەتا سەرەتای ٦٧ وایان تێن بۆ ئێمـە هێنـا لـە هـەموو لاوە بـوو بـە ڕاوە کـوردی ئێرانـی و بـە تایبـەتی ئەنـــدامانی فـــەعالی حیزبـــی دیموکرات بە مێژووی ۱۹٦٦/٦/۲٤

نامەیەکی کاك فایقم بۆ هات دەڵێ کاکی خۆم ئەوە تێکۆشەر و رەفیقی چەند ساڵەمان کاك سەدیقی ئەنجیری ئازەر سەری تێداچوو. دەڵێن سەرهەڵقەنە پەیدابووە ئەوەی پی خواردانی سەری پێوە نامێنێ، چونکە پاشان کە مەیتێکی بێ سەریان دیتەوە. دیار بوو سەدیق بوو سەریان بڕیبوو بۆ ئەوەی نەناسرێتەوە لەو نامەیەدا دەڵێ تکات لێ دەەم ئاگات لە خۆت بێ و زۆر هاتوچۆ مەکە کەریم نەستانی و ئەحمەد نەستانیشم بۆ بنێرە ئەگەر مینە شەمش پێی خۆشە بینێرە، چونکە ئەوانە هەموویان لەگەڵ من لە گوندی هێرۆ بوون پاش ماوەیەك مونتەقیمی قازی لە ناوچەی باڵەکایەتی گیرا و درایەوە بە ئێران زۆری پێنەچوو مامۆستا مەلا رەحیمی وێردی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی لە هێزی خەبات بە بڕیاری عەبدولوەهاب ئەتروشی گیرا و لەگەڵ چەند کەسی دیکە کوژران و درانەوە بە ئێران.

**پ ٢٢: هۆیەکانی سەرهەڵدانی جوڵانەوەی ٦٧ و ٦٨ چی بوو؟**

و ٢٢: دەو هەرا و بگرە و بەردەیدا سەرەتای ١٩٦٧ مەکتەبی سیاسی پارتی داوای فایق دەکەن کە لە دۆڵە رەقە ڕا بچێتە لای کاك ئیدریس، فایق لەگەڵ دوو ئەندامی مەکتەبی سیاسی تەماس دەگرێ و دڵێ منتان بۆچیە؟ ئەوان دەڵێن ئێمە ئاگامان لە شتی وا نیە ئیترترسی لێ دەنیشێ لەگەڵ هەڤاڵەکانی بەرەو لای سوونی و ئا لیەمەران دەکەونە ڕێ بۆ خۆ پەنا دان.

لە پشتی زیوکە و ئالیەڕەش ڕا نامەیەکی بۆ من نووسیوە و دەڵێ ئەمن ئەوە بۆ ماوەیەك ڕووم دە خاکی پیرۆزی خۆمان کردووە بۆ خۆ پەنا دان لە چنگی تەحویلدانەوەمان بە ئێرانێ هەتا هەشت نۆ ڕۆژ لەو ناوە چاوەڕوانت دەبم هەرچی زوترە دەبێ یەکتر ببینین لە هاتندا لای سیراجی و شەریف زادە و سالار لادە و مەلا ئاوارەش لەوێیە بیانبینە بۆ خۆم هێندێك شتم لەگەڵ باس کردون من لەو کاتدا کە سەرە بەهار بوو لەگەڵ حاجی مەحمود ئاغای هێرۆ و کۆمەڵێك پێشمەرگە لە ڕاوە کەو بووم لە سەری جەماڵەدین و پشتی بیورانی سەردەشت، بەڵام سەلاحی موهتەدی و کاك سەعد و کاك محەمەد و مەلا عومەری عەسری و زۆری دیکە لەو ڕاو ڕاوێن و هەڵلایەدا پێوەندیان بە ئێرانەوە گرت و خۆیان تەحویلدایەوە کە من ئەو دەمیش و ئێستاش پێموایە کارێکی زۆر چاکیان کرد. چ کاریان بەوەدابوو جگە لە داگیرکەرانی کوردستان خۆیان تووشی ئەو هەموو دم بە دمە و شەڕە چەقەی بکەن و وەکو ئێمە کە ئەو هەموو ئێیسانە باشانەی وەك فایق و شەریفزادە و مەلا ئاوارە و مەلا رەحیم و ساڵح لاجانی و سلێمان کەرقە شان و عەبدوڵڵای موعینی و مەلا مەحمودی زەنگەنە و سەید فەتاح و موراد شیرێژ و محەمەدی رەسوە مەرەی و قادر شەریف و سەدیق ئەنجیری و منیە شەم و زۆرەهای دیکەمان لێ شەهید بوو، منیش ئەگەر شێخ لەتیفی شێخ مەحمودی نەمر نەبا کە دوو مانگ لە داری کەلی و سیتەك شاردمیەوە بە دەردی ئەوان چوو بووم، کەچی ئەوانیش دوای گەڕانەوە یان گیران و پاشانیش ئەو خەڵکە زۆریان شتی ناڕەوا لەسەر بڵاوکردنەوە.

کاتێك نامەی فایقم پێگەیشت تفەنگێکی وەسەتی زۆر باش و کوڕێکی خەڵکی بێران بە ناوی برایم باڵدار پێشمەرگە بوو لای حاجی ئاغا بە ئەمانەت وەرم گرتن و هاتین بۆ گەڵوەڕز کە مینەی سیراجی و سمایلی شەریفزادە و سالاری حەیدەری لێ دەژیان و مەلا ئاوارەش وەك میوان لەوێ بوو. لە داوێنی مامەندەی کۆمەڵە کارگێکمان دینەوە کە ئەمن بۆ خۆم لە ژیانمدا کارگی وا گەورەم نەدیبوو هەمووی لە چوار پێنج دانە تێنەدەپەڕی لەگەڵ کورادەیەکی زۆر بردمانن و یادی

بە خێر شەریفزادەش شتی باشی لێدەنا. ئەو شەوە باشترین کورادە و کارکمان خوارد و دەستمان کرد بە قسان. دوو نەفەریش لە سەنگەسەرەوە لەلایەن پێشمەرگەکانی خۆمانەوە هاتبوون بۆ ئەوەی خەبەرێکی فایق و برادەرانی بزانن لەوێ کردمان بە کۆبونەوە و بڕیار هاتە سەر ئەوەی من و مەلا ئاوارە و سالاری حەیدەری بە نوێنەرایەتی هەموو برادەران ئەو ۳ کەسە بچین و داوا لە فایق و برادەران بکەین سەبر بگرن هەتا هەموو برادەران نامەیەك بۆ بارزانی دەنووسن و داوای گەڕانەوەی برادەران بکەین و بارزانی وەك ئەحمەد تۆفیق هەر جێگایەکمان بۆ دیاری بکا لەسەر مەسلەحەتی شۆڕش ئێمە قبوڵی بکەین و بچین، بەڵام بەو شەرتەی شەخسی بارزانی بۆ خۆی بڕیاری لەسەر بدا هەر لەوێش نامەکە نووسرا و هەموومان ئیمزا مان کرد و بەو دوو نەفەرەدا ناردمانەوە یەکیان شەهید ڕێبوار بوو و ئەوی ترم لە بیر نەماوە بۆ بەیانی ئێمەش بە پشتی ئاڵیە ڕەشدا بۆی سەرکەوتین و دوای دە سەعات لە پشت ماڵەکانی ئاڵیەمەران و کاولان دیتمانەوە و دوای چاك و چۆنی فایق و عەبدوڵڵای برای و مەلا مەحموود زەنگەنە و منیە شەم و هەڵمەتمان لێ جیا کردنەوە و دەستمان کرد بە کۆبوونەوە. فایق یەکجار زۆری پێخۆشبوو گووتی ئێمە لەو ناوە دەبین و غەیری مەلا ڕەسوڵ ئێوەش بگەڕێنەوە هەر خوا بکا مەلا مستەفا موافەقەت بکا. دوای گەڕانەوە خەبەرمان بدەنێ بە عەجەلە دەگەڕێینەوە ئەوەی زۆر دڵگەرم بوون بۆ نەگەڕانەوە عەبدوڵڵای موعینی و منیە شەم و هەڵمەت بون.

ئێمە چەند ڕۆژ لەو ناوە ماینەوە و چاوەڕوانیمان کرد ئاخرەکەی خەبەرمان وەرگرت کە بارزانی ڕازی بە گەڕانەوەمان نەبووە و لە هەموو لاشەوە بەشی پاراستن و هێزەکان کردیان بە هەرا کە گوایە فایق و زۆر لە کادرەکانی دیموکرات نیازی تێکدانی شۆڕشیان هەیە و گەڕاونەوە قولایی وڵات بۆ ئاژاوە نانەوە.

ئێمەش بە ناچاری کۆبونەوەیەکمان کرد و لەو کۆبوونەوەیەدا برادەران بە تێکڕای دەنگ، منیان بە بەرپرسی پێشمەرگە هەڵبژارد منیش بە سێ دەستە دابەشم کردن و دەستەیەك مەلا مەحمودی زەنگەنە بەرپرس بوو، دەستەیەك مینە شەم و دەستەیەك هەڵمەت. لەبەری سەردەشت و میراوە ئاشکرا بووین و زۆری دەنگدا بۆوە ناچار دوای بێ ئومێد بوون لە گەڕانەوە بۆ بەشی مەنگورایەتی دوای چەند ڕۆژ گەڕان و دیتنی زۆر لە کۆنە برادەران بۆمان دەرکەوت لە چوار پاسگا لە پیرانشارەوە هەتا مەنگوران یەکیان گرتووە بۆ تاقیبی موراد شێرێژ کە چەند مانگ پێش ئێمە گەڕابۆوە و دەستی کردبوو بە ژاندرم کوشتن ئێمە تاقیبمان دەکرد ئەویش خۆی لە ئێمە دەشاردەوە و پێیوابوو ئێمە بۆیە هاتوینەتەوە ئەو بگرین.

**پ ۲۳: یەکەم تێکهەڵچوونتان لە کوێ بوو؟**

و ۲۳: ئێمە لە گوندە دوور دەستەکان و ئاستەمەکان دەماینەوە ئەو شەوە لە سێووی گەدەی بووین عادەتمان بوو تۆزێکی شەو دەما و نەفەرێکی شارەزامان لەگەڵ خۆمان دەخست و هەتا لە گوندیش نەهاتباینە دەرێ پێمان نەدەگووت بۆ کوێ دەچین. تەنیا من و فایقیش ئەو شوێنەمان دەستنیشان دەکرد ئەو ئێوارە کوڕە ئاغایێکی خوشکەزای ماڵە قازیان بە ناوی سلێمان هاتە لامان و گووتی ئاغا مەنگوڕەکانی بەشی لێرەوار منیان ناردووە دەڵێن پاسگاکان زۆرلە ئێمەیان ڕەگەڵ خۆیان خستووە و تاقیبی موراد شێرێژ دەکەن. و جارێ خەبەری ئێوەیان نیە لەوناوە دوو جێگای دوورە دەست و ئاستەم هەبو، یەکیان کوێستانی سپی سەنگ کە بەسەر هەموو گوندەدا



دەروانی و ئەوی تریان دۆڵێ رەش بوو کە دەکەوێتە لای گوندەکانی میشەدێ بۆ لای لاجان . ئێمە بەو کورەمان گووت دەچینە دۆڵی رەش، کەچی ئەو ئێوارە و شەوەکەی هێندەمان عالەم لێ کۆبۆوە کاتی ڕۆیشتن بە کابرای بەڵەدم گووت برۆ بۆ سپی سەنگ تومەس موراد شیرێژیش لە ترسی ئێمە و ژاندرمە رووی دە سپی سەنگ کردووە. هەر تاریك بوو ئێمە لە سەری سپی سەنگ بە ٣ دەستە دامەزراین و نە هاتوچۆمان دەکرد نە ئاورمان دەکردەوە و نە هیچ تەنیا بە نۆرە کێشکمان دەکێشا و ئەگەر برسی باین نانمان دەخوارد مورادیش پێش ئێمە لە پۆلە شاخێکی خوار ئێمەدا بوو نەفەرێکی خۆی بە ناوی رەسوو ناردبووە لە گوندی کانییە کلێ ڕا نان و پێخۆری بۆ بێنێ. ئەویش دە داوی عەجەمان کەوتبوو یەکسەر گوتبووی ئەمن هاتووم خۆم تەحویلدەمەوە و ورەن دەتانبەم بۆ سەر موراد شیرێژ.

دوو سەعاتی رۆژ مابوو ئەحمەد نەستانی کە ئێستا لە کۆیە دەژی هات خەبەری بۆ من و فایق هێنا و گووتی عەجەم ئەوە لە هەواری مێری ڕا بەرەو رووی ئێمە دێن و جاشی زۆریشیان دەگەڵن بە دووربین تەماشامان کردن و فایق و چەند کەس نەزەریان وابوو خۆمانیان لێ ئاشکرا نەکەین و نەشمان دەزانی ئەوان بۆسەر موراد دەچن و ئەوەشمان لە بیر چۆبووەوە کە ئێمە بۆ خۆمان گووتومانە دەچینە سەری رەش. هاتن هەتا خوار ئێمە لەوێ هەر هەموویان دانیشتن و ئەوانیش دیاربوو کێشەیان بووە زۆریان نەزەریان ئەوە بوو بەو ئێوارە درەنگە با خۆیان لە موراد شیرێژ ئاشکرا نەکەن. دوو رەئیس پاسگاش گوتبوویان ئێمە ئەو هەموو پوڵ و جایزە باشانە کە بۆ گرتن و کوشتنی موراد شیرێژ داندراوە لە کیسی خۆمانی نادەین. ئێمەش لە هەموو لاوە لەبەریان دامەزرا بووین لەو کاتەدا رێبوار کە رەشاشێکی گەورەی پێبوو ئەوانیش زۆر نێزیك لە خوار وانەوە بوون، گوتبووی یەك ریزیان لێ دەکەم و دە پازدە کەسیان لێ دەکوژم. ئیتر کە تەقەی کرد یەکەم گوولە رەشاشەکە ڕاوەستا و لەو کوێستانە پڕلە گوێنی و زەمەندەدا عەجەم خۆیان شاردەوە. نێزیکەی سەعاتێك تەقەمان لێکردن و ئەوان وەلامیان نەبوو، بەلام زۆریان لێکوژرا.

تاریك داهات و ئێمە بۆ ماڵەکانی خوار خۆمان هاتینە خوار و لە رێگادا بەو تاریکە شەوە تووشی چوار کەس بووین گرتمانن تاپڕ و دەمانچەیان پێبوو لە مەنگورەکان بوون و عەجەمان ناردبوویانن کە لەو ماڵانە ئاورێك بکەنەوە بە ئیشارەی ئەوانیش بێنە خواری ئیتر دوای چەککردن لە ناو ماڵەکان بۆ خۆمان ئاورەکەمان کردەوە بۆشیان دامەزراین کە هاتنە خوار لێماندان و دوو رەئیس پاسگا و ئەو پێشمەرگەی موراد شیرێژ و چەند کەسی دیمان لێ کوشتن و عەبدوڵڵای موعینی لە پەنای من بریندار بوو ئیتر بەو شەوە لەوێوە هاتینەوە بەری ئاڵواتان و خوار و کۆترەڵ ئەو چوار ئەسیرە مەنگورەشمان هێنان و لەوێ لە کۆبونەوەیەکدا بڕیارماندا ئەسیرەکان ئازاد بکەین بۆ دەرمان کردنی عەبدوڵلا نە هیچ جێگایەك هەبوو کە پەیوەندییمان پێوە هەبێت نە دەمانزانی بۆ کوێ بەرین، چونکە لە ناو شۆڕشدا بە هەموو لایەکدا تاقیبی ئێمەیان دەکرد. بڕیار درا من لەگەڵ خۆم بۆ قەلادزێی بەرم و لەوێ بە هۆی برادەرانی شیوعیەوە بە نهێنی تەداوی بکەن لەبەر ئەوە کە من لە مێژ بوو لە برادەران دوور کەوتبوومەوە و تازەش هاتبووم بۆ ناویان گوترا رەنگە کەس نەیزانیبێ و تەنیا ئەوە رێگامانە.

من ئەو کارەم کرد و لە قەلادزێ خزم و دۆستی زۆر چاکمان هەبوو پێوەندیم بە مەحمودی حاجی فەقێ خدری دۆستمەوە و وەستا محەمەدی نانەواوە گرت.

هەردوكیان بەرپرسی شیوعییەكان بوون و زۆر ئینسانی چاك بوون و ئیستا لە سوید دەژین، چەند رۆژان سەید عەلی موزەمید تەداوی كرد و پاشان حەسۆمیرخان هەستی كردبوو كەوتە تاقیب و بە ناچاری هێنامەوە گوندی هێرۆ و لەوێشرا بە نامەی حاجی مەحموود ئاغای هێرۆوە بەرەو شێخ لەتیفی حەفید كەوتینەرێ پێشمەرگەیەكی خزمی خۆم و دوو ئەسپی ژاندرمەكان كە لە شەری سپی سەنگ لێمان گرتبوون ئیتر هەر خوا دەزانێ لەو هەموو رێگایەدا هەتا سلێمانی و لەوێش را بۆ داری كەلی چۆنمان قوتار بوو. نێزیك دوو مانگ لە سیتەك و لە داری كەلی لای شێخ ماینەوە و نێوە نێوە دەینارد دوكتۆر دەهات و تەداویان دەكرد. لەوێش رۆژێك شەفیق لایەن وەك نوێنەری بارزانی لەگەڵ دوو ئامر بە تالیۆن پەیدا بوون لە سیتەك باس هاتە سەر ئێمە و شێخ لەتیف زۆری سەركۆنەی شۆرش كرد و گوتی: غەدر لە كوردەكانی ئێرانی دەكەن كوا ئەوە پیاوەتیە ئەدی هەر قازی محەمەد نەبوو رێگای بارزانی دابوو بە خۆی و بەو هەموو عالەمەوە و هەر ئەویش نەیكرد بە ژانراڵ ئێستا بۆ شای ئێران بۆ ئاوا لەو فەقیرانە وەخۆ كەوتوون. شەفیق لایەن گووتی كاكە شێخ ئەوانە دەیانەوێ ئاژەوە بنێنەوە و موشكیلە بۆ ئێمە دروست كەن و لەگەڵ قاعید فیرقەی سلێمانی و لەگەڵ قاهیرە دژی ئێمە پەیوەندییان گرتووە ئەوە كەس جارێ ئێمە ناناسێ و هەروای گووت شێخ لەتیف گوتی: ئای شەفیق لەو درۆ گەورەیە، ئەو دوو كورە گەنجە دەبینی لەلای بابە تاهیر و مەنسوری شێخ كەریم دانیشتوون ئەوە یەكیان مەلا رەسوڵی مهابادیە و وەكیلی فایقە و ئەوی تریشیان عەبدوڵلای برای فایقە و بریندارە و هاواریان بۆ من هێناوە بۆ تەداوی كردن و بە قاچاغ و لە ئێران را بە ناو حكومەت و پێشمەرگەدا هاتوون و لە سلێمانیش بایز ئاغای محافیز خەریكی گرتنیان بووە و خێرخوازێك نەجاتی داون ئەگەر پەنای دیكەیان هەبا دەهاتن بۆ لای من؟

بە دوای قسەكانی شێخ لەتیفدا من وە جواب هاتم و گوتم كاك شەفیق بۆ ئێوە ئەو شۆرشە گەورەی كورد زۆر ئیرادە ئاوا لە ئێمە وەخۆكەوتوون بۆ گرتن و كوشتن و تەحویل دانەوە ئێمە نە هیچ خەتایێكمان هەیە نە هیچ كارێكی دژی ئێوەمان كردووە تەنیا ئەوە نەبێ لە ترسی گیانی خۆمان پەنامان بۆ میللەتی خۆمان بردۆتەوە، ئێستاش لە سەر دەستی شێخ لەتیف شەخسی بارزانی بریار بدا ئەمن بۆ ماوەی مانگێك ئاخر نەفەرمان دەهێنمەوە. كوێمان بۆ دیاری دەكەن ، دەچین قەرارەكە بوو بە ئەوە ئەوان لە گەورەی دێ را كە گۆیا بێتەلی لێبوو پێوەندی بە بارەگای بارزانیەوە بگرن و هەتا شەش حەوت رۆژی دیكە خەبەرەكە بدەنەوە بە شێخ لەتیف. دوای دە رۆژ خەبەر درایەوە بە شێخ لەتیف كە بارزانی رازی بە گەرانەوەیان نیە و چی دەكەن با بیكەن. ئیتر ئەوە كوێ خەتای ئێمە تێدابوو من لەوێ را عەبدوڵلام تەحویلی فەقێ محەمەدی گۆمانی دا كە فایق ناردبووی و بۆ خۆم لە سەر داوای كاك حەسەنی رستگار و ئەمیری قازی و برادەران گەرامەوە هێرۆ و لەوێ را بردیانم بۆ لای حەسۆمیرخان و ئەویش گووتی بچۆ لە ماڵی خۆت دانیشە.

لە گوندی هێرۆش را پێش هاتنمان بۆ لای شێخ لەتیف فایق هاتبۆ جەماڵەدین لەوێ را نامەی بۆ من نووسیبوو كە پێیخۆشە یەكتر ببینین و ئەگەر دەكرێ حاجی ئاغاش لەگەڵ خۆم بەرم. ئێوارەیەك لەگەڵ حاجی ئاغا چووین هەواری ماڵی سمایل ئاغای برای لەو كوێستانە خۆشە هەتا لای بەیانی من و حاجی ئاغا لەگەڵ فایق و برادەرانی قسەمان كرد بارزانیش



ئـەو کـات داوای زۆر لـە ئاغاکـانی پشدەری کردبـوو فـایق نامەیـەکی دوور و درێژی بە حاجی ئاغادا بۆ بارزانی نووسی و وەك جاران هـەر بە نێوی بابە گەورە ناوی دەهێنا و نووسیبووی کـە مـن و هەڤاڵـەکانم هەر کوڕی خۆت و ئەو شۆڕشەین و هـەر ئـەو سلێمانەم کـە لـە ڕۆژە سەختەکاندا لە خزمەتتدا بووین لەگـەڵ ئەحمـەد تۆفیـق و بـاقی ڕەفیقـەکان و هـەموو کـارێکی حیزبی خۆمان واز لـێ هێنابوو بۆ سەرکەوتنی ئێوە و شۆڕشەکەتان کە بە شۆڕشی هەموو گەلی کوردی دەزانین نامە درا بە حاجی ئاغا و ئێستاش وەڵامی نەبوو.

دەی لێرەدا خەتای ئێمە چیبوو بۆ ئەو دەردەیان بەسەر ئێمـە هێنـا، گریمـان ئێمـە پێوەنـدیان بـە هـەر جێگایەکەوە گرتبێ نابێ ڕاوەستن، داخوا ئێمـە دژی ئـەوان دەبین یـان کـاری خۆمـان دەکـەین؟ بـە دوای هـەمووی ئەو شتانەشدا کەوتنـەوە ڕاوەدوونـانی بـرادەران و حەسـەن ڕسـتگاریان گـرت کـاك حەسـۆو پێـشمەرگەکانی خۆمـان قوتاریـان کـرد، دەنـا گـەیبا لای گەڵاڵـە بـە دەردی مونتـەقیمی قـازی دەچوو. حەمـــــەدەمینی ســـــیراجی و شەریفزادە و سالاریان لە گەڵوەڕەز ڕا هێنایە خوارێ. ئەوانەش کە بە نـاوی حیزبـی تـودە یـان تـاقمی کورشـی لاشـایی و مائۆییستەکان یـــان کەســـــانی وەك ســـــەعید کوێـستانی داسـتانێکی سـەیر و سەمەرەیان لەو جوڵانەوەی ١٩٦٧ و ٦٨ دروسـت کـردووە، هیـچی وانـەبووە و بەشـی زۆریـان هـەر بـە خـەیاڵ و دە عالـەمی خەیاڵـدا ئـەو شـتەیان بـۆ خۆیـان دروسـت کـردووە، دەنـا ئێمـە قـەت خـەیاڵی ئـەوەمان نـەبوو حەرەکەیـەکی چەکداری ئاوا بکەین. ئەگەر لە ناو شۆڕشدا پاڵمان پێوە نەندرابایە و لەلایـەن ئەوانـەی کـە گوێڕایـەڵی ئێـران بـوون هـەر هـەمووشمان دیمـوکرات بـووین و هـیچ نـاوێکی دیکە لە سەر کەس نەبووە، ئەوە هـەوڵی حەرەکە بـووە کـە مـن بـۆ خـۆم لەگـەڵ سلێمانی مـوعینی و هەتا شەڕی سپی سەنگ تێدابووم. شـەریفزادە و مینـەی سـیراجی و سـالار و مـەلا ئـاوارە لـە سـوونی بوون و من لەگەڵ ئاوارە و سالار بە نوێنـــەری ئـــەوان چـــووم بـــۆ گەڕاندنەوەی فایق و برادەران، ئیتر کۆمیتـەی ئینقلابـی چـی و مـانوی چی؟.

بە ڕای مـن هـەموو ئـەو دروسـت کراوانە دوایە بووە پاش ئەوەی کە فـایق شتەکەی بەستۆ دابـڕاوە و لەلایـەك ڕادمـەنیش و کیـانوری و حیزبـی تـودە لـە ڕێگـای کـەریم حیـسامی و دوکتـۆر قـاسملووەوە لەلایەکی دیکەوە کە ئەو دەم چەپی ئینقلابی بە شێوەی ئەورووپا گوڵی کردبـوو، چـەند کەسـانێکی وەك کورش لاشایی و ئەوانە ویستیان لـە ڕێگـای کـا حەمـەدەمین و سمایلـەوە خۆیـان لـە قەزیەکـە وەردەن، چونکە سالار و سەناری مامەنـدی هـەر لـە دەسـت پێکـی مەسەلەکە خۆیان تەحویل دایەوە. دەنا زۆر دواتریش و لە بەینی ئەو هـەموو دەسـت تێـوەردان و خـۆ تێهەڵوقورتاندنـەی حیزبـی تـودە و ماوییـەکان، هەرچـی کـە بـە خەیاڵیش دروستیان کردبوو، هەر بە ناوی دیموکرات بووە. مەسەلەن کۆمیتـەی ئینقلابـی حیزبـی دیمـوکراتی کوردستان و کۆمیتەی ساخکەرەوەی حیزبـی دیمـوکرات لێـرەدا بـە بۆچـوونی مـن کـاك سەلاحی موهتـەدی لە جێگایەکدا بـە نـاوی ڕامانێـك لـە تراژیـدیای براکاندا ئەو مەسەلەی لە هەمووان باشـتر ڕوون کردۆتـەوە کـە دەڵـێ تـەنیا ئێمـە بـووین کە بە تـەواوی سـەفی خۆمـان لـە دیمـوکرات جیـا کـردەوە و شـتێکی ترمـان دانـا و ئـەوانی دیکـە هـەر بـە نـاوی دیموکراتەوە بوون.

مەسـەلەن سـەعید کوێـستانی لـە دوای فـەوتی کـاك حەمـەدەمین سیراجی لـە سایتەکەیدا دەڵێ لـە پرسەی کاك منیە غەدریان لە من کردووە لە کۆمیتەی ئینقلابیدا بە جێگـای مـن باسـی مـەلا ڕەسـوڵی پێـشنیازیان کـردووە مـن قـەتم

نەگوتووە لە کۆمیتەی ئینقلابیدا بووم، بەڵام ئەوە پەرێزی من و لە یەکەم ڕۆژی گەڕانەوەمان بۆ وڵات، بەڵام با کاک سەعید بۆ نمونە باسی یەک جێگا بکا، کەچی کردووە غەیری خۆ تەحویلدانەوە.

ئەگەر ئینساف لە کاردابێ و ڕاستییەکان ڕوو بکرێن بە بۆچوونی من نە حیزبی تودە و نە دوکتۆر قاسملوو و نە کەریم حیسامی و نە تاقمی لاشائی و ماوییەکان، هیچ هاوکارێکی بە ڕاستی ئەو برادەرە لێ قەوماوانەی ئێمەیان نەکرد. بە هیچ شێوەیەک هەر ویستیان سودی خۆیانی لێوەرگرن و هیچی تر لە سەرووی هەمووشیانەوە شۆڕشی کوردستانی عێراق گەورەترین غەدری لە ئێمە کرد. دەبێ ڕۆژێک عوزرمان بۆ بێننەوە، دەنا مێژوو لێیان خۆش نابێت بەوەی نیە هەردوو بەشی دیموکرات وەک کەوەکەیان کردووە و سەریان دە بن بەفر ناوە لەبەر مەسلەحەت و بەرژەوەندی خۆیان لە دواڕۆژدا وەڵامی کەس و کاری شەهیدەکانمان چۆن دەدەنەوە؟ ئەوە بۆ پازدە ساڵ دەچێ تەنیا ئەمن وەک شاهیدێکی زیندوو کە بۆخۆشم لە هەموو کێشەکاندا هەبووم زۆر سادقانە و بە سەراحەتەوە شت دەنووسم و یەک کەلیمەشم لە بارەی هیچ کەسێکدا

درۆ نەنووسیوە، چونکە نە زەعفم هەیە و نە لە بارەی ماڵ و هیچ شتێکەوە چاوەڕوانیم هەیە. لەو شەش حەوت ساڵەشدا کە گەڕاومەتەوە کوردستان ماڵی یەکیەتی نیشتمانی و مام جەلال ئاوەدان بێ، ئەگەر میوانی وان نەبام و خانوویان بۆ تەئمین نەکردبام لە دوکان کرێشم پێ نەدەدرا، لە حاڵێکدا هەموو دەزانن کە بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری بووم و هەرچی میراتی حەمەڕەزا شا بوو لەبەر دەستی من بوو. منیش کەئەبو تاراکە لە حیزبی شیوعی قەرزمان کردبوووە جێگری من بوو ئەوم کردبوو بە بەرپرسی هەموو فرۆشتن و هەموو حەیف و مەیلێک کە ئەوە ماوە، قەتم خۆ لە کۆمەک و یارمەتیش نەگەیاند. هەرچی با هەر حەواڵەی ئەوم دەکرد، ماڵم هەقە زۆر چاکیشی بەڕێوە دەبرد. بۆ ڕوون کردنەوە، مادام هاتە سەر گەڕانەوەم بۆ لای برادەرانی یەکیەتی نیشتمانی با نەبێتە بێ ئەمەکی یەکەم جار کاک نەوشیروان کە جێگری مام جەلال بوووەلە کۆنەوە دۆستایەتیمان هەبووەو لە دەرەوەش زۆر جار باسی گەڕانەوەمان دەکرد ئەو خۆی لە دوکان جێگیری کرد مو بە قسەشم نەکرد دەنا بۆی نووسیبووم چوار خانوم بۆ دروست بکەن و نامەکەشم

هێشتاش هەر ماوە و ئەمدا بە کاک عومەر فەتاح کە ئەو کات سەرۆکی حکومەت بوو، لەلای یەکیەتی هەر بەو بۆنەوە هەتا هەم خۆم بە مەمنوون و قەرزداری هەم کاک نەوشیروان و هەم یەکیەتی دەزانم، چونکە بۆ وەڵامدانەوەی زیاتر لە نێوسەدە تێکۆشانی من بە بێ پسانەوە غەیری یەکیەتی نیشتمانی نەبێ تەنانەت ئەو حیزبەی کە دوو بەشی خۆشترین ژیانی خۆم تێدا مەسرەف کرد، کەس ئاوڕی لێ نەدامەوە. دیارە منیش قەت نە هیچ داوایەکم لێیان بووە و نە دەشمبێت. هەر خوا بکا سەری خۆیان پێ ڕابگیرێ و چیتر لەت و پەت نەبن حاشا لە من. بۆ کێشەی بەینی هەموو حیزبەکانی ڕۆژهەڵات و باشوریش لەت بوون و لێک جیابوونەوەم زۆر پێ ناخۆشە، چونکە لە زەرەر بەولاوە بۆ کورد هیچ قازانجێکی نیە دۆستی هەر هەموشیانم. ئەوانی خۆشمان هەر جارە خۆ بەلایەکەوە هەڵدەواسن، پێموایە کارێکی زۆر خەراپ دەکەن. بێلایەن بن و دۆستی هەموشیان بن باشترە و لە جێگای خۆیدا ڕەخنەی ئوسوڵیشیان لەسەر هەر کام هەبێ هەقی خۆیانە، هیوام وایە بەشی زۆریان وەک پارتی و یەکیەتی ناکۆکیەکانیان وەلانێن و لێک نێزیک ببنەوە ئەو کات ئەوانەی





خۆیان بەوان هەڵواسیوە بە قەولی دەڵێن کاسەی لە ئاش گەرمتر بوون خەتاکە بە ئەستۆی ئەوان دادێ و تووشی سەرلێشێواوی دەبن. بوونی هەموو معارەزە و ئوپۆزسیۆنێکیش بە ڕەوا دەزانم، بەو شەرتەی بە شێوەی ئەورووپا و دنیای ئازاد بێت، نەك عەینەکی ڕەش لە چاو کردن و هەموو شتێك بە خەراپ دیتن.

ئەو جوڵانەوەیە بە بەرنامە نەبوو ، نە خۆمان، خۆمان بۆ ساغ دەبووەوە نە هیچ جێگایەك هەبوو بە ڕاستی و دروستی پشتیوانیمان لێ بکا تەنانەت بۆ خۆشمان بە چەند دەستە بۆچوونی جیا دابەش ببووین سەید ڕەسوڵی بابی گەورە و ئەمیری قازی و زۆر لە پێشمەرگەکان لە سەنگەسەر خۆیان ماتدابوو، لە ڕاست ئەو هەموو گرتن و تەحویلدانەوە و کوشتنەدا هیچیان نەدەگوت. من و حەسەنی ڕستگار و شەریفزادە و سالار و مەلا ئاوارە، بێلایەن بووین و لە دەرفەتێك دەگەڕاین کە ناو ماڵی حیزب یەك بگرینەوە و دەست بە کار بێینەوە. هەتا بە زۆری دەریان نەپەڕاندین ئێمە وەخۆ نەکەوتین.

دوای گەڕانەوەی من، فایق نامەیەکی بۆ برادەرانی حیزبی شیوعی قەڵادزێ نووسیبوو کە هەرچۆنێك بێت من و کاك حەسەنی ڕستگار قەناعەت پێ بێنن بۆ گەڕانەوە بۆ ناویان. ڕۆژێك مەحموودی حاجی فەقێ خدری و وەستا محەمەدی نانەوا بە دوایان دا ناردین و زۆر بە دڵسۆزییەوە باسی ئەو وەزعەیان کرد کە بەسەر ئێمەدا هاتووە و گوتیان فایق داوای لە ئێمە کردووە کە پێتان بڵێین ئێوە ڕابردووتان هەیە و لە باری عەشایرییەوە لە ناو مەنگوڕان و گەورەکان و مهاباددا خزم و لایەنگیری زۆرتان هەیە و دەیەوێت بگەڕێنەوە ناویان و باشتر لەوەیە کە لێرە تووشی گرتن و لەناوچوون بن. کا حەسەن گووتی ئێمە حیزبی شیوعی بە دۆستێکی زۆر باشی خۆمان دەزانین و پێمان بڵێن بزانین ئێوە چۆن هاوکارییەکی ئێمەتان پێ دەکرێ؟ لە وەڵامدا گوتیان ئێمەش لە هیچ بوارێکدا توانامان نییە غەیری ئەوە نەبێ یارمەتی مەعنەویتان بکەین. کا حەسەن گووتی جا یارمەتی مەعنەوی بە بێ فیشەك و تفەنگ و نان و پێخۆر چ دەردێکی ئێمە دەرمان دەکا؟ ئەوە دۆستە هەرە دڵسۆز و باشەکەمان بوون لە کاتی کوشتن و تەحویلدانەوەی برادەرانیش تەنیا هێزێکی کە بە ئیعلامیە ئەو مەسەلەی مەحکوم کرد هەر حیزبی شیوعی بوو. حیزبی تودە نەك هیچی نەگووت دوای پەرش و بڵاوبوونی برادەرانمان لە ڕۆژنامەی (مردم)دا بڵاوی دەکردەوە کە ئەندامانی حیزبی دیموکرات بێن و لە دەوری حیزبی دایکدا کۆبنەوە. بۆخۆشیان سی ساڵ بوو، دوورە وڵات بوون و نە پێوەندیان مابوو نە دایك . تەنیا باری تەبلیغاتی و ڕادیۆی پەیکی ئێرانیان هەبووە.

بە داخەوە بۆ ساڵی ٦٨، شەریفزادە و هەڤاڵانی لە گوندی دارینەی بانە بە دەستی کوێخـ شەریفێکی جاش کە پاشان حیزبـ بە سزای خۆی گەیاند شەهید کر و عەبدوڵڵای موعینیش لە مووچییەکی قالوی گەورەکان بە هاوکاری ئاغا جاشەکان و ژاندرمەکان شەهید کرا و حاجیـ و وسێنکە دوو پێشمەرگەی قارەمان بوون لە چیای نسـ شەهید کران. سەید فەتاح و مەلا مەحموودی زەنگەنە و زۆری دیکەش لە نزیك گوندی بەیرەم لە نزیك مهاباد شەهید کران.

پێشتریش سلێمانی موعینی و حەمەدەمین سیراجی هاتبوون بۆ لای سلێمانی کە هێندێك برادەر ببینن و سلێمانیش خێزان و کوڕەکەی لە ڕێگای شێخ لەتیفەوە نەجات دا و لە شوێنێك دایانمەزرێنێ. بەشی پاراستن قادر تەگەرانی لەسەر کردبوونە مەئموور و سەرئەنجام لە داویان خست و لە خوار ئەزمەڕ بە ڕووی سیتەکد سەدیق ئەفەندیان ئاگادار کرد و

گرتی و ناردی بۆ لای بارەگای بارزانی. مەکتەبی سیاسی و هەروەك هەژاری موکریانی لە چێشتی مجێوردا نووسیویەتی کە بارزانی ناردویە بۆ لای و قسەی لەگەڵ کردووە پاشان کوشتیان. دیارە کوشتنەکەی زۆرتر لە سەر قسەی هەژار بووە، چونکە بۆ خۆی لە چێشتی مجێوردا دەڵێ بە مەلا مستەفام گووت ئەوە ترسنۆکە ئەگەر بە زیندووی بدرێتەوە بە ئێران عالەم زۆر بە گرتن و بە کوشتن دەدا. مەیتەکەشیان دایەوە بە ئێران و ساواك بە کەیفی خۆی بەهرەی لێوەرگرت و گووتی ئەوان کوشتویانە و ئەگەر بە زیندویی درابا‌وە بە ئێمە نەماندەکوشت. دیارە ئەو قسەیە هەر بۆ گێرەشێوێنی بو، ئەگەرنا ئەوانیش هەر دەیان کوشت. خەلیل شەوباشی بانەییش کە لەگەڵ بوو کوشتیان بەڵام نە تەحویلیان دایەوە نە بە خاکیان سپارد. ئەوە سەیدەکانی وەسانی بوون کە دوای چەند ڕۆژ مەیتەکەیان لەو ناوە دۆزیبووەوە بە خاکیان سپاردبوو.

کاك مینەی سیراجیش کە لەگەڵ فایق هاتبووەوە، نەگەڕایەوە و لە ناو حیزبی شیوعیدا خۆی مات کرد. برادەران بێ سەرپەرست مانەوە. قادر شەریف گەڕایەوە بۆ بەکرەجۆ. من و حەسەن ڕستگار و ئەمیر قازی و سەید ڕەسوڵی بابی گەورە لەگەڵ زۆر لە بەرپرسان قسەمان کرد بۆ گەڕاندنەوەی هاورێکانمان و چەند جار سەید ڕسووی ورچان و چەند برادەرمان ناردن بۆ لایان و قەولیاندا بە رازی بون بۆ گەڕانەوەیان،بەلام بە شێوەیەکی ئارام و بێدەنگ , بۆ ماوەیەکی کەم هەموومان هێنانەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەی قەولیان دابوو، دوبارە دەستیان کردەوە بە گرتن و تەحویلدانەوەیان. شاهیدی



زیندوومان ماوە وەك ئەحمەد نستانی کە دەگەڵ پیرەباب و ڕەحیم کەپەکەندی و چەند کەسی دیکە، نامەیان دابونێ لە هێزی دەشتی هەولێر بۆ بارەگای بارزانی کاتێك بەگومانەدەبن و نامەکە دە خوێندنەوە نووسراوە کە لەسەر نووسراوی خۆتان ئەوە ئەوانەمان بۆ ناردن بۆ تەحویلدانەوە. ئیتر لەوێ ڕا ڕایان کرد بوو چووبوونە بەکرەجۆ. ساڵح لاجانی و سلێمان کەرقەشان و عەزیز ئەحمەد و زۆری دیکەش لە خانێ وە تەحویلدرانەوە و لە جەڵدیان ئیعدام کران. عەزیز ئەحمەد ماوە لەبەر ئەوەی عومری تەقازای نەکرد، نەیان کوشت و دوای چەند ساڵ ئازاد کرا مەلا ئاوارە لە نەخشەیەکی داڕێژراودا لە دیوالان بە هۆی چەند خۆفرۆش وەك حەسەن سەکردەدا وکەوت بە خۆی و چوار نەفەرەوە دیارە تا ڕادەیەك زەعفی خۆشی تێدابوو دەنا پێشمەرگەکان لەوانە بوو نەجاتی بدەن، نامەکانی ماون کە دەپاڕێتەوە و دەڵێ من بۆ خۆم ئەو کارەم کردووە تکایە تەقەی مەکەن با خەڵك نەکوژرێ .

بەو شێوەی کە باسم کرد جوڵانەوەی ٦٧ و ٦٨ کۆتایی پێهات و کۆمەڵێك ڕەفیقی زۆر چاکمان شەهید بوون و ئێمەش بۆ ماوەیەکی زۆر کەوتینەوە بەر بێ لوتفی وبەهانە پێ گرتنی دەستەڵات دارانی شۆڕش، بەڵام ماڵم هەقە خەڵکی ناوچەی قەڵادزێ و پشدەر و بناری قەندیل و ناوچەی سەنگەسەر لە ڕادە بەدەر ڕێزیان لە ئێمە دەگرت بە دایم لەگەڵ بەرپرسانی شۆڕش لەسەر ئێمە کێشەیان بوو.





# بۆ برای ئازیز و تێکۆشەر کاك مومتاز حەیدەری

لەگەڵ ڕێزمدا هیوام وایە هەتا خوێن لە دەمارەکانتدا دەجووڵێتەوە، قەڵەمە بەهێزەکات و گوڕ و تینی خەباتی ڕۆژنامەگەریت کەمایەسی نەهێنی و دە ڕێگای خزمەت و فەرهەنگی گەلی کورددا ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ بەردەوامتر و سەرکەوتووتر بی.

کاکە گیان بەڕاستی ئێوە هەر لە کۆنەوە بۆتان بە میرات ماوەتەوە کە بنەماڵەیەکی شۆڕشگێڕ و تێکۆشەر بن بەتایبەتی لەباری نووسین و لێکۆڵینەوە من دەمێکە لەگەڵ کاك دکتۆر جەمشیدی برات دۆستایەتی و ڕەفاقەتیم هەیە و ساڵەهاشە نێوبانگی خۆت و برا شەهیدەکانیشت بە کوردستان و دنیادا بڵاو بۆتەوە و لە دیدی منەوە ئەو جۆرە بنەماڵانە هەتا مێژوو هەیە دەبێ جێگای ڕێز و پێزانین بن.

کاکە گیان، جاری پێشوو بەهۆی سەفەری سوید و نەخۆشییەوە تووشی بێوەعدی هاتم، بەڵام لەوەتی هاتوومەوە زۆر بەپەلە زیاتر لە ١٨٠لاپەڕەم بۆ نووسیوی، ڕەنگە تۆڵەم بۆ کردبییەوە و دواتریش ئیدامەی دەبی لەوەی کە پەلەم کردبێ و کەم و کوڕیی هەبێ، دەبێ بمبووری. ئەوە بە کاك ئەحمەدی سەفام سپاردووە و ئێوەش مەیلی خۆتانە چۆنی تێکدەخەنەوە.

هەر بژی بە شادی

برای دڵسۆزت مەلا ڕەسووڵ پێشنەماز

٢٠١٠/٩/١



# بیرەوەرییەکانم

## بەرگی دووەم - بەشی حەوتەم

**ستۆکهۆڵم ١٩٨٣/٣/٥**

**د. جمشید حەیدەری**

ئەمڕۆ بەیانی لەگەڵ خوشکە زینەتی خێزانی کاك فەرهاد شاکەلی چووینە کەمونی سۆلۆنتونە بۆ ئەوەی من بە کارمەندانی ئەو کەمونە بناسێنێ وەك پەنابەری سیاسی. لەوێدا کارەکان بە زوو ئەنجام دران و کاتیان دامێ و ئامادەییان نیشان دا کە یارمەتیم بدەن، بەڵام پێویست بوو خانووەك بدۆزمەوە. هەر لەگەڵ خوشکە زینەت چووینە دەستگای خانووبەرەی خوێندکاران لە سۆلنا – کەمون. لەوێ لە خانووی خوێندکاران لە بێریس هەمرا لە رۆژی ١٩٨٣/٣/١١ ژوورێکم وەرگرت لە باڵەخانەیەکی سێ نهۆمی. لە رۆژی دوایی چووینەوە کەمونی سۆلۆنتونە ئاگادارمان کردنەوە کە خانوومان چەنگ کەوتووە و ئەوانیش نامەیەکیان بۆ فرۆشگایەکی خۆیان نووسی کە پێداویستیی خانووەکە لەو فرۆشگایە بکڕم و پارەکەش کەمون دەیدا. پێداویستیی ژووری نووستن و چێشت لێنانیان بە ویستی خۆم وەرگرت. بۆ ژۆرژێکی دیکە پێویستیم بە تەلەفۆن هەبوو، واتە خەتێك رابکێشم، بەڵام ئەوەیان دەبوایە یەکێك ببێتە کەفیل، خوشکە سوعادی خێزانی کاك ئەمجەد شاکەلی لەگەڵما هاتە تەلەفۆنات و خەتم وەرگرت، واتە لە ماوەی یەك هەفتەدا کارەکانم ئەنجام دران و هەروەها سوعاد یا زینەت لەگەڵما هاتن و چووینە کۆڤی(KV– خوێندنگەی زمانی سوێدی بۆ بێگانەکان کە سەربە زانکۆی ستۆکهۆڵم بوو) خۆم ناونووس کرد. ئەوکات دوو خوێندنگە بۆ فێرکردنی بێگانەکان لە ستۆکهۆڵمدا هەبوو کۆڤی و ئا.بێ.ئیف(ABF– سەربە سۆسیال – دیموکرات بوو، پێموایە یەکێکی دیکەش هەبوو کە سەر بە پارتی پارێزگاران – مۆدەرات بوو) بەڵام کۆرسی یەکەمم تەواو نەکرد، پاشان لە ساڵی١٩٨٤ گەڕامەوە خوێندنی زمانی سوێدی لە شوێنی دیکە ئاماژەی پێدەکەم.

ئەوەی شایانی باس بێت، لەو باڵەخانەیەی خوێندکاران لە "بێرس هەمرا" ژمارەیەك پەنابەری کوردی باشووری کوردستانی لێبوو، کە هەندێکیان خەڵکی شارەکەی خۆم(هەولێر) بوون. لەوانە: سامی حەسەن، شێرۆ فەیسڵ، سەمیر عەبدۆك و فەخرەدین گەردی هەروەها دوو کوردی سلێمانی و ئاکرێ–شم ناسی کە ئەوانیش لە هەمان باڵەخانەدا دەژیان، عەبدولوەهاب عەلی(سلێمانی) و شاکر ئاکرەیی. هەر لەو ماوەیەدا ناسیاویم لەگەڵ کاك شێروان عەزیز پشتیوان پەیدا کرد. کاك شێروان برای هاوڕێی دێرینم، دکتۆر نەریمان عەزیز پشتیوانە(من کاك نەریمانم لە سۆڤیەت ناسی، کوردێکی دڵسۆز بوو، کە من ئەوم ناسی ئەو ئەندامی حزبی شیوعیی عێراق بوو، لە ساڵی١٩٦٧ هاوبیری ئێمە(قیادەی مەرکەزیی حزبی شیوعی) بوو. دکتۆر

نەریمان، دکتۆرای لە ئەندازیاری هەبوو. وازی لە حزبایەتی هێنابوو، بەڵام کوردپەروەرێکی دڵسۆز بوو، ئەو بنەماڵەیە هەموویان، بەتایبەتی تێکۆشەر عەزیز پشتیوان، کە تووشی زیندان و دەربەدەری و راوەدوونان بوو، بەڵام تا کۆچی دوایی کرد، کۆڵی نەدا، هەروەها رۆڵەیەکی ئەو بنەماڵەیە - کامەران - شەهید کرا و کورێکی دیکەیان لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی دوای ۱۹۷۵ شەهید کرا. دکتۆر نەریمان، لە دوای رووخانی سەدام حوسێن، چالاکانە هەوڵی دەدا ماستەرپلانی شارەکانی کوردستان دابڕێژێ لەو کاتەی نەسرین بەرواری وەزیر بوو لە بەغدا، بەڵام بەداخەوە کۆچی دوایی کرد. رەوانی شاد. ئەوەی شایەنی باس بێت، من کاک شێروانم لە رێگەی کاک عەبدولوەهاب عەلی‌یەوە ناسی.

دوای هاتنم بۆ سوێد، بۆ یەکەم جار لە دوای۱۹۷۷ەوە توانیم پەیوەندیی تەلەفۆنی لەگەڵ هەولێردا بکەم. لە ئاداری۱۹۸۳ بە تەلەفۆن لەگەڵ خوشکەکان و دایک و برام(مومتاز) قسە بکەم. بەداخەوە دایکم لەبەر نەخۆشی گوێی لە دەنگی نەبوو. لە ۱۱ی ئاداری ۱۹۸۳ بڕیارم دا واز لە جگارەکێشان بهێنم، چونکە پاکەتی جگارە لە سوێد زۆر گران بوو. من پاکەتی "دانهێڵ"م دەکێشا، ئەو کات دانەی بە ۱٤کرۆن بوو، بەڵام ئێستا واتە لە دوای۲۰۱۰ پاکەتی دانهێڵ بە ٦۰کرۆنە. لە ۲۷ی ئاداری ۱۹۸۳ بۆ جارێکی دیکە پەیوەندیم بە هەولێرەوە کرد تا دەنگوباسی دایکم بزانم، بەڵام مومتازی برام ئاگاداری کردم کە دایکم ئەو رۆژە کۆچی دوایی کردبوو. بەراستی ئەو هەواڵە زۆر ئازاری دام، چونکە لە ساڵی۱۹۷۰ کە بۆ دووەم جار عێراقم بەجێهێشت، چەند خۆشەویستێکم کۆچیان کرد و من بە دیدەنیان شاد نەبووم. لە ساڵی۱۹۷۱ برای گەورەم کاک عاصم کۆچی کرد، لە تەمموزی۱۹۷۹ خوشکی گەورەمان مەلیحە کۆچی کرد. "سەلمە" ئەویشم هەر نەدیت. هەواڵی کۆچی دوایی دایکم دووبارە منی گەڕاندەوە سەر جگەرەکێشان کە تا ئێستاش(۲۰۱۱/۲/۹) هەر بەردەوامم لەسەر کێشانی.

من دوای یەك مانگ لە هاتنم بۆ سوێد، پەنابەریم بۆ دەرچوو. دیارە کە من بۆ سوێد هاتم، هەندێ کەسایەتیی رۆشنبیر و ناسیاوم لە سوێد دەناسی. لە بەشی شەشەمی بیرەوەرییەکانم ئاماژەم پێکردوون. لە ماوەیەکی کورتدا، ژمارەیەك لەکوردەکانی باشووری ناسی، لەوانە کاك مومتاز حەسەن، عاسی رەباتی، ئاسۆس کەمال و ژمارەیەکی دیکە کە ناویانم لەیاد نەماوە.

بێگومان وەك لە بەشی رابردوو ئاماژەم پێکردووە، من بە تەنیا هاتم بۆ سوێد، منداڵەکان لە لنینگراد مانەوە. بەڵام رۆژانە پەیوەندیم پێیانەوە هەبوو، چونکە ئەو کات جوانەی کچم تەمەنی بچووك بوو، چوار ساڵان بوو، دڵم زۆر لەلای بوو. لە ۱۹۸۳/٦/٦ بە رەسمی پەنابەریم پێدرا، بەلام بۆشم نەکرا سەریان لێدەم، چونکە پاسپۆرتم نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی پاسپۆرتم وەرگرت. لە ۱۹۸۳/۹/۱۹ بۆ چەند هەفتەیەك سەردانی لێنینگرادم کرد.

لە رێگەی کاك حەنەفییەوە ئاشنایەتیم لەگەڵ ژمارەیەك لە کوردەکانی باکووری کوردستان پەیدا کرد. لەوانە: کاك مەمۆ یەتکین کە کوردێکی ئادی‌یەمان بوو. کاك مەمۆ ساڵانێکی زۆر بوو لە سوێد دەژیا، خولیای کۆکردنەوەی کتێبی هەبوو. کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی هەبوو بە زمانەکانی تورکی، ئینگلیزی، فەرەنسی، کوردی و عەرەبی. بە هەر زمانێك شتێك لەسەر کورد نووسرابێ، مەمۆ دەیکڕی. لە دوای۱۹۹۳ مەمۆ سوێدی جێهێشت و روویکردە بەلجیکا و لە بروکسل دەژی.

وەك لە بەشی رابردوو ئاماژەم پێکرد، من لەگەڵ شاعیری میللی جگەرخوێن لەو سەردانەی بۆ سۆڤیەت ناسیاویم پەیدا کردوە. جگەرخوێن جگە لەوەی




شاعیرێکی گەورەی زاراوەی کرمانجیی سەرووە، لە هەمان کاتدا تێکۆشەرێکی کۆڵنەدەری ڕێگەی کوردایەتی بوو. جگەرخوێن لە ساڵی١٩٨٤ کۆچی دوایی کرد، لە قامیشلۆ لە خانووەکەی نێژراوە. لە ساڵی١٩٨٨دا سەردانی گڵکۆکەم لە قامیشلۆ کرد. لە ڕێگەی مامۆستا جگەرخوێنەوە ناسیاویم لەگەڵ کاک کەمال بورقای پەیدا کرد. کاک کەمال تا ساڵی٢٠٠٤ سکرتێری پارتی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیا بوو. کەمال بورقای سیاسەتمەدار و شاعیرێکی ناسکە، بەرلەوەی روو لە هەندەران بکات، ئەندامی یەکێتیی نووسەرانی تورکیا بوو. کەمال بورقای دیوانی شێعری بە زمانی کوردیش هەیە.

کە لە بریس هەمرا دەژیام، لە ڕێگەی عەبدولوەهاب عەلی، ئاشنایەتیم لەگەڵ جەوهەر نامیق پەیدا کرد. کاک جەوهەر بە ناوی "سەلیم" لە شاخ ناسراوبوو. کاک جەوهەر ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمیتەی کاتی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو تا کۆنگرەی نۆیەم. دوایی لەگەڵ ژمارەیەک لە ئەندامانی سەرکردایەتیی ئەوکات لە کۆنگرە وازیان لە حزبایەتی هێنا، بەڵام هەندێک لەوانە پارتی گەلیان دروست کرد. لەوانە: نووری شاوێس، سامی عەبدولڕەحمان (محەمەد مەحموود عەبدولڕەحمان)، ئازا خەفاف، کەریم شنگاری و وریا سەعاتچی. بەڵام کاک جەوهەر کاری حزبیی نەدەکرد، بەڵکو وەک کرێکار یاخود کارمەند لە پۆستە کاری دەکرد. مرۆڤێکی خوێندەوارە، بە ڕۆژنامەنووسی میسری "محەمەد حەسەنێن هەیکەل" کاریگەر بوو. دەستی هونەریشی هەیە. کاک جەوهەر دوای سەردانی کاک مەسعوود بارزانی بۆ سوێد، ساڵی١٩٨٧؟ گەڕایەوە ریزی پارتی تا گەیشتە سکرتێری مەکتەبی سیاسیی پارتی و لە دوای ڕاپەڕینیش کە پەرلەمانی کوردستان دامەزرا، یەکەم سەرۆکی پەرلەمان بوو، بەڵام دوای رووخانی ڕژێمی بەعس لە ساڵی٢٠٠٣، کاک جەوهەر لە کاری حزبی دوور کەوتەوە، بەڵام سیاسەت دەکات و کتێب و وتار دەربارەی باری سیاسیی کوردستان بڵاو دەکاتەوە. من و کاک جەوهەر دۆستایەتیمان هەیە، لە هەندێ خاڵدا بۆچوونیشمان نزیکە. {بەداخ و پەژارەوە لە ٢٠١١/٣/٢٢ لەستۆکهۆڵم کۆچی دوایی کرد}.

هەر لە ساڵی١٩٨٣ دوای ئەوەی پاسپۆرتی پەناهەندییم وەرگرت، سەردانی منداڵەکانم لە سۆڤیەت کرد. لەو سەردانەمدت زۆر ئازارم کێشا، چونکە جوانە زۆر دەگریا و نەیدەخواست بەجێی بێڵم. لەبەر دەرگای شەمەندەفەر توند قاچی گرتبووم، نەیدەهێشت بچمەوە نێو ڤاگۆن.

لە مانگی شوباتی١٩٨٤، کۆرسەکی زمانم بۆ دەرچوو کە هەفتانە ٣٠کاتژمێر بوو و لە ١٩٨٤/٢/١٣ دەستی

پێکرد و لە ١٩٨٤/٦/٢١ تەواو بوو. لە ساڵی ١٩٨٤ خۆم ناونووسی کرد بۆ شوقەیەك، چونکە منداڵەکان بڕیاریان دابوو بۆ ماوەیەك بێنە سوێد، ئەگەر بە دڵیان بوو، ئەوە بۆ ساڵی داهاتوو بە یەکجاری دێن، بەڵام ئەوجارەیان تەنیا بە میوانی دەبێ.

لە کۆتایی ئاداردا، شوقەم بۆ دەرچوو لە هوسبی، شەقامی ئۆسلۆگاتان ٢٧. شوقەکە ١٠٠ مەتری دووجا بوو لە نهۆمی چوارەم بوو و نزیك وێستگەی میترۆ. لە ١٩٨٤/٤/١ خانووەکەم وەرگرت.

لە هاوینی ١٩٨٤، حەیدەر و جوان و دایکیان بۆ ماوەی دوو مانگ هاتنە ستۆکهۆڵم، پاشان گەڕانەوە لێنینگراد و بڕیاریان دا لە ساڵی داهاتوو بە یەکجاری بێن، بۆیە پێویست بوو بەڵگەنامەی پێویست ئامادە بکەن و لە ڕێگەی باڵیۆزخانەی سوێد لە مۆسکۆ ڕەوانەی وەزارەتی پەنابەران بکرێت و منیش لەلای خۆمەوە داوەتیان بکەم.

کە هێشتان لە بریس هەمرا دەژیام، ناسیاویم لەگەڵ کچە کوردی سوریایی نۆڤین سەرحان پەیدا کرد. نۆڤین ئەوکات خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی بوو، هەروەها کاری وەرگێڕانی دەکرد. نۆڤین ئەو کات ئەندامی حزبی شیوعیی سوری بوو و زۆر دۆستی حزبی شیوعیی عێراقیش بوو. نۆڤین کچێکی چالاك بوو لە بواری ڕێکخراوی دیموکراتیی ژنان – کورد و سوێدی. ئەو بیست ساڵەی من لە سوێد بووم، نۆڤین خوێندنی تەواو نەکرد، بەڵام وەك وەرگێڕ بێوچان کاری دەکرد. چەند جارێك سەردانی کوردستانی باشووری کردووە. ئێستا وەك ئاگادارم نۆڤین کادیرێکی چالاکی پارتی سۆسیال – دیموکراتی سوێدیە.

هەروەها لە سوێد کاك حەسەنی ڕەحیمی قازیم دۆزیەوە. من و کاك حەسەن لە ساڵی ١٩٧٧ لە بەرلین یەکتریمان ناسیوە. کاك حەسەن و برایمی جۆرابچی بەرپرسی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوون.

کاك حەسەن کوردێکی دڵسۆزە، زمانزانەکی بەتوانایە. لە کارکردن ماندوو نابێت، بەڵام بەداخەوە لە سیاسەتدا دەمدەمیە. لەو ماوەی من کاك حەسەنم ناسیوە، ماوەیەك دۆستی یەکێتیی نیشتمانی بوو، ماوەیەك لەگەڵ حزبی دیموکرات بوو، لە ناوەڕاستی نۆهەدەکانەوە لە بروکسل لەگەڵ برادەرانی پ.ك.ك لە تەلەڤزیۆن کار دەکات. ئەوسا، واتە لە سەرەتای هەشتاکان هەندێك لە پارتەکانی ڕۆژهەڵات و باکوور و باشوور، بۆچوونیان بەرانبەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان خراپ بوو، دیارە هۆی ئەوە زۆرە و دەگەڕێتەوە دوای شکستی شۆڕشی ئەیلوول و هەڵوێستی پارتی لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی گەلانی ئێران و پێکدادانی نێوان پارتی دیموکرات و حزبی دیموکرات، دوای تەرمی بارزانی.

لەوکاتەی کۆرسی زمانی سوێدیم دەخوێند، لەگەڵ دکتۆر تاهیر بابان یەکتریمان ناسی. ئەوکات دکتۆر تاهیر بەرپرسی کۆمیتەی سوێدی حزبی شیوعیی عێراق بوو، یاخود یەکێك بوو لە بەرپرسەکان. دکتۆر تاهیر داوای لێکردم بە بۆنەی ٥٠ساڵەی دامەزراندنی حزبی شیوعیی عێراق لەگەڵ دکتۆر سەلام بەهائەدین نووری کۆڕێك بگێڕین. دکتۆر سەلام لە تەمەنی ١٠ساڵییەوە لە سۆڤیەت دەژیا و خەریکی خوێندن بوو، حزبایەتیی نەکردبوو، چونکە لە ساڵی ١٩٦٤ لە شارۆچکەی ئیڤانۆڤا خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندیی لەوێ تەواو کردبوو، پاشان زانکۆی لە مۆسکۆ تەواو کردبوو و دکتۆرای لە بیۆفیزیك وەرگرتبوو و وەك پەنابەر هاتبووە سوێد. ئەوەی شایانی باس بێت. دکتۆر سەلام لە ستۆکهۆڵمیش دکتۆرایەکی دیکەی وەرگرت لە بیۆشیمیك(کیمیا). ئێستاش هەر لە سوێد دەژی، بەڵام لەبەر ئەوەی کوڕی بەهائەدین نووری بوو کە باوکی لە پەنجاکان سکرتێری حزبی شیوعیی عێراق تا هەشتاکانیش لە سەرکردایەتیی ئەو حزبەدا بوو، هەر

لە کۆنفراسی یەکەم، کـۆنگرەی یەکـــەم و کۆنفرانــــسی دووەم ســـــــالّی١٩٥٦، هەڵوێــستی حزبــی شـــــــیوعی دوای شۆڕشــــــی ١٤ی تـــــەمووزی١٩٥٨، کودەتــــــای ٨ی شــــــوباتی١٩٦٣ هەڵوێــــــــستی راستڕەوی حزبـی لـە ســـــــالّی١٩٦٤ و پشتگیریی حزب بۆ هـــــــەنگاوەکانی حکومــەتی "موشـیر



ماموّستا بەهائەدین نوری - ماموّستا برایم ئەحمەد

بۆیە دکتۆر سەلامیان لەگەڵ من دانا. ئەوەی شایانی باس بێت، دکتۆر سەلام شارەزایی لە مێژووی حزبی شیوعی نەبوو و زانیاریی لەسەر باروذۆخی عێراق نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کەرەستەیەکی ئەرشیفی دەوڵەمەدنم لەسەر مێژووی حشع هەبوو، هەمووم خستە بەردەستی. من بە دکتۆر تاهیر بابانم راگەیاند کە لە کۆڕەکەدا من تەنیا لەسەر سیاسەتی حشع دەربارەی کورد و سیاسەتی حشع لەو ماوەیەی کە خۆم ئەندامی ئەو حزبە بوومە، واتە لە نێوان ١٩٥٩-١٩٦٨، چونکە چالاکانە بەشداری خەباتی حزبی شیوعیم کردوو.(لە دوای١٩٦٨ کە من لەگەڵ قیادەی مەرکەزی بووم و پاشانیش وازم لە حزبایەتی هێناوە)، بەڵام ئەوەشم پێ گوتن کە من لە سەر سیاسەتی حزبی شیوعیی عێراق دەربارەی کێشەی کورد بە گشتی دەدوێم. لەوەی لەگەڵیدا بوومە و رەخنەم لێگرتووە، من بە چاوێکی رەخنەگرانە لەسەر سیاسەتی حشع لە ١٩٣٤ باسم کرد

عەبدولسەلام عارف" و سیاسەتی حزب لەنێوان ١٩٦٤-١٩٦٧ واتە تا جیابوونەوەی قیادەی مەرکەزی لە ١٩٦٧/٩/١٧، ئاماژەم بەوەکرد کە من لە دوی ١٩٦٧ هەڵوێستم گۆڕاوە، بەڵام من لە مایسی١٩٦٨ لە حشع دەرچووم(لێرەدا مەبەستم لە لایەنگرانی لێژنەی مەرکەزی)، بەشێکی دیکە لە قسەکانم پەیوەندییان بە سیاسەتی حزب بوو دوای کودەتای١٩٦٨ کە بۆ جاری دووەم بەعس دەسەلاتی وەرگرت و ئاماژەم بە رێککەوتنی ئاداری١٩٧٠ و قانوونی ئۆتۆنۆمیی کوردستان١٩٧٤، هەڵوێستی حزب لەو بەرەیەی لەگەڵ حزبی بەعس١٩٧٣ و رێککەوتنی سەدام و محەمەد رەزا شا ١٩٧٥ و هەڵوێستی حشع تا ئەو کاتەی سەدام حوسێن جڵەوی سیاسەتی عێراقی بە تەواوی لەدەست گرت لە تەمووزی١٩٧٩ و راوەدوونانی شیوعییەکان و هەڵگرتنی چەک لەلایەن شیوعییەکان و خۆدانە پاڵ شۆڕشی کوردستان.





لەو کۆڕەی بەبۆنەی پەنجا ساڵەی دامەزراندنی حزبی شیوعیی عێراقم گرت، ئاماژەم بە نامەیەك كرد كە لە ساڵی ١٩٧٤ بۆ هاوڕێ عەزیز محەمەدم ڕەوانە کردبوو دەربارەی سیاسەتی حزب لەو سەردەمەدا. لێرەدا بە پێویستی دەزانم دەقی نامەکە بڵاو بکەمەوە بێ دەستکاریی ناوەڕۆك، تەنیا دەستکاریی زمانی نامەکەم کردووە، چونکە کەم و کوڕیی لە نووسینی کوردیەکەمدا هەبوو.

"هاوڕێی بەڕێز و خۆشەویست، عەزیز محەمەد - سکرتێری یەکەمی پارتی کۆمۆنیستی عێراق(*)

سڵاوێکی گەرم و ڕێزگرتن

ئەوەی هانی دام ئەو نامەیەت ئاراستە بکەم، ئەوە بوو کە زروفی ئێستای وڵات، تەنگوچەڵەی ناوەخۆ گەیشتۆتە ڕادەیەك لە سەرسانی هەمووومان، هەموو هاوڵاتیەك دڵسۆز ئەوەیە بەشداریی دۆزینەوەی ڕێگایەکی ڕاستە بۆ خزمەت کردنی گەلی عێراق﴿دەبوایە بنووسم گەلانی عێراق﴾ بە کورد و عەرەبەوە و گەشە پێدانی ڕژێمێکی دیموکراتی ڕاست، لەسەر بنچینەی دیموکراتی فرەوان بۆ جەماوەری گەل.

هەست کردنم بەو دەورە باڵایەی ئێوە لەنێو پارتی کۆمۆنیستی عێراق دەگێڕن و لەبەر ئەوەی ئەو هەڤاڵانەی ئێوە کە لەم وڵاتەدا دەخوێنن، تەنیا دۆڵی کاربەدەستانی﴿کاربەدەستانی ڕژێم﴾ لێدەدەن. هەر جۆرە قسەیەك لەگەڵیاندا دەگاتە پێوەنووساندنی تاوان(تۆمەت)ی شۆڤینیەتی کوردی بە نێوچاوانیەوە، بۆیە دوای ئەوەی لەگەڵ کاك محەمەدی مەلا کەریم﴿کاك محەمەد ئەوکات لە سۆڤیەت بوو﴾ دوام، بە پێویستم زانی ئەو نامەیە بۆ جەنابتان بنووسم و وێنەی نامەکەش لای خۆم هەڵدەگرم بۆ دواڕۆژ.

جا ئەوەی دەمەوێ لەو نامەیەدا لەگەڵ ئێوە لێبکۆڵمەوە، چەند خاڵێکە:

١- یاسای ئۆتۆنۆمیی کوردستان کە پارتی کۆمۆنیست ڕەزامەندیی لەسەر داوە.

٢- دەربارەی وەزعی ئاڵۆزی کوردستان و ئامادە کردن بۆ شەڕ دژی کوردستان.

٣- ڕۆژنامەی - طریق الشعب - ڕێڕەوی ڕۆژنامەکە.

٤- دوا وتاری سەدام حوسێن لە ڕۆژی ٤/٢٥ لە بەردەم نوێنەران و ئەندامانی کۆمیتەی پارێزگاکانی عێراق لە بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز.

## ١- یاسای ئۆتۆنۆمیی کوردستان

ئەوەی بە وردی سەیری ناوەڕۆکی ئەم یاسایە بکا و لەگەڵ یاسای ئۆتۆنۆمیی وڵاتی سۆڤیەت یا وڵاتە بورجوازییەکانی وەك هیندستان و ئەمەریکا بەراوردی بکات، دەبینی کە یاسای حکومەتی بەرەی نیشتمانی کەم و کورتیی زۆر تێدایە، کەم و کوڕییەکانیشی بریتییە:

١- دەستنیشان نەکردنی سنووری کوردستان، ئەمەش زۆر گرنگە، چونکە ئاشکرایە کە بورجوازیەتی عەرەبی دان بەو شوێنانەی کوردستان نانێت، دواڕۆژ ڕەچاو دەکات، چونکە جوولانەوەی ئازادیی گەلی کورد هەر دەبێت سەربکەوێت، جا ئەگەر هاتو ئێستا دان بەوە بنێن کە ئەم شوێنانەی نەوتی تێدایە دەکەوێتە قەوارەی کوردستان، سوبەی ڕۆژێ، ئەگەر هاتو میللەتی کوردستان ڕزگاری بوو، هەوڵی یەکگرتنی ئەو پارچەیەی خاکی کوردستانی دا، ئەوان﴿مەبەست لە بورجوازیەتی عەرەب، ئەو ناوچانە لە کوردستان دامالن﴾، پاشان ئێوە زۆر باش دەزانن کە چارە نەکردنی ئەم خاڵە هۆیەکی بنچینەییە لە ناکۆکیی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی بەعس.

٢- دانی سوڵتە (دەسەڵات) بۆ سەرۆك کۆمار هەروەك بەعس دەیەوێ، واتە ئەنجومەنی نیشتمانی لە کوردستان هیچ توانای نابێ، لە کاتێکدا حوکمی شەش ساڵەی دوایی بەعس بۆمان نیشان دەدات کە


جەوهەر نامق سالم – د. جمشید حەیدەری

ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی بەعس هەموو کارێکی خستۆتە دەستی خۆی، تاکو ئێستا ئەنجومەنی وەزیران هیچ ڕۆڵێکی نییە، بەڵکو وەك حکومەتی قاسم وایە. حزب«مەبەست لە کۆمۆنیستەکانە» تەحەمولی مەسئولیات لە هەموو بڕیارەکانی حکومەتی عێراق دەکات، چونکە بەشدارە و لە بەرەی نیشتمانی لەگەڵ بەعس دایە. تەبعەن ئەگەر مرۆڤ بیەوێ لە کەم و کوڕیی یاسای ئۆتۆنۆمی بدوێت پێویستیی بە نەتروحەیەك هەیە، لەبەر ئەوە من تەنیا دەڵێم ئەم یاسایە، کەمترین ئامانجی میللەتی کورد جێبەجێ دەکات و لەگەڵ بیروباوەڕی حزب ناگونجێت کە لە کۆنفرانس و کۆنگرەکان و پرۆگرامی چەسپاندووە.

## ٢- وەزعی ئاڵۆزی کوردستان

ئەوەی من دەیبینم کە پارتی کۆمۆنیستی عێراق، هەرچەندە داوای ئەوەی کردبوو کە ماوەی١٥ ڕۆژەکەی بەعس پتر بکرێت(درێژ بکرێ) و دەرگا لەبەردەم پارتی بکرێتەوە بۆ ئاڵوگۆڕ کردنی بیروڕا دەربارەی یاسای ئۆتۆنۆمیی کوردستان. هەر چەندە ڕۆژنامەی – بیری نوێ – هەستی(هەڵوێستی) خۆی دەربڕیوە دەربارەی دوور کردنەوەی کرێکارانی کورد لە کەرکوك، بەڵام بە جۆرێکی گشتی ئێوەش(حزب) بەشدارە لەتەك بەعس لە ئاڵۆزیی وەزعی کوردستان. هەر چەندە من لەو بڕوایەدام کە شەڕ بە هیچ جۆرێك چارەی مەسەلەی کورد ناکات، تاکە ڕێگە ئەوەیە کە پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتیی بارزانی بەشداری بکات، چونکە هەر جۆرە کاری دیکە وەزع ئاڵۆزتر دەکات. ئێوە زۆر باش دەزانن نە عەزیز عەقراوی و نە عوبێدوڵڵا(بارزانی) ناتوانن چارەی وەزعی کوردستان بکەن. نەدەبوایە ئێوە(پارتی کۆنۆنیستی عێراق) هاوبەشی ئەوانە بکەن کە ئەوە چوار ساڵە، بەڵکو دەمێکە هەوڵ دەدەن جووڵانەوەی نیشتمانیی گەلی کورد کەرت کەن. نەدەبوایە ئۆرگانی کۆمۆنیستەکانی عێراق، ببێتە شوێنی بڵاوکردنەوەی وتارەکانی وەك عەزیز عەقراوی و... هتد.

میللەتی عێراق بە چاوی ڕێزگرتن سەیری پارتی کۆمۆنیستی عێراق و ئێوە«مەبەستی هاوڕێ عەزیزە» دەکات کە یەکێکی لە ڕۆڵە دڵسۆزەکانی کورد. دڵنیام لەوەی کە پارتی کۆمۆنیست نابێتە بەشێك لەو هێرشەی دەکرێتە سەر کوردستان، چونکە کاتی فڕۆکەکانی عێراق کوردستان بۆمباران دەکەن، سەیری ئەوە ناکەن

ئەمە کێیە؟!

دێتەوە یادتان ساڵانی١٩٦٣ چۆن برا بەعسیەکان کوردستانیان ئاوەدان دەکرد! میللەتی کورد تا ئێستا خوێنی شەهیدانی کوردستان لەبەر چاویەتی، لەبەر چاوی لاوانی کۆیسنجق، رواندوز و سلێمانی لە کاتی سەیرانگەی بەهار(وەك عماش دەیگوت) میللەتەکەمان دڵنیایە کە ئێوە بە هەموو جۆرێك هەوڵ دەدەن کە حزبی بەعس دووبارە کوردستان بە خوێنی کورد و عەرەب نەخش ناکات.

شەڕ قەزیەکە چارە ناکات، تاقە رێگە ئەوەیە بە چاوێکی دووربین سەیری دواڕۆژی عێراق بکرێت، برایەتیی کورد و عەرەب لەبەرچاو بگیرێت لەسەر بنچینەی رێزگرتنی تەواوی ماف گەلی کورد لە عێراقدا.


مامۆستا عەزیز محەمەد

## ٣- رۆژنامەی – طریق الشعب – ڕێڕەوەکەی

ئەوەی چاو بە لاپەڕەکانیدا بگێڕێت ناتوانی لەگەڵ رۆژنامەی "الیوره" لێکی بکاتەوە، بە تایبەتی لەکاروباری ناوەخۆی وڵاتدا. بڵاوکردنەوەی بروسکەی عەزیز عەقراوی! بڵاوکردنەوەی ناوی ئەو کوردانەی گەڕانەوە لای حکومەت؟! بڵاوکردنەوەی بانگهێشت بۆ پێشمەرگەی کوردستان!! پیاو سەیر دەکات﴿جێگەی سەرسوڕمانە﴾ ئایا لە بەرژەوەندیی حزبی شیوعیدایە ئەم جۆرە کارانە، یاخود ئەمە دەبێتە هۆی ئاڵۆزکردنی وەزع و پەیوەندیەکە لە خەباتی خوێناوی پەیدا کرابوو لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبدا. بۆ چ دەبێ رۆژنامەی حزبی شیوعی لەم هێرشە دژی پ.د.ك بەشداری بکات. ئێمە لەبەرچاومانە – قاسم کاتی داود سایغی دروست کرد﴿مەبەست لە رێگادان بە حزبە کارتۆنییەکەی داود سائغ-ە﴾، خۆتان دەزانن پەیدابوونی هەر حزبێك بە قانون یاخود بە هەوستی ئەم و ئەو نییە بەڵکو زروف مەوزوعی و زاتیی جووڵانەوەی نیشتمانی فەرزی دەکات. جا حزبێکی کارتۆنی ئەمڕۆ حکومەت دەیەوێ دروستی بکات، بۆ دەبێت پارتی کۆمۆنیست خۆی بکاتە هاوبەش؟ بەلای منەوە ئەگەر ناتوانن رێگا لە حکومەت بگرن، بەشداری مەکەن، چونکە دواڕۆژ مێژوو هەموو لایەك موحاسەبە دەکات، موحاسەبەی ئێوە گرانترە، چونکە پێشڕەوی کرێکارانی عێراقن مارکسیزم و لێنینزم پەیڕەو دەکەن؟!

دەربارەی – طریق الشعب – دەمەوێ ئەوەش باس بکەم

که رۆژنامەی – إتحاد الشعب – کاتی خۆی«گۆشەیەکی تێدابوو» – دەنگی گەلی کورد –ی تێدا بوو، بەلام "طریق الشعب" ئەمەشی نییە، بەبۆنەی ٤٠ساڵەی دامەزراندنی حزبدا، نە لە رۆژنامەی "طریق الشعب"دا و نە لە گۆڤاری "الثقافة الجدیدة" و لە ژمارەی تایبەت "گ.ش" باسی هاورێی تێکۆشەر و شەهیدی نیشتمانی جەمال حەیدەری نەکراوە، ئەمەش یەکەم جار نییە، پارەکەش لە دە ساڵەی هاورێی شەهید سەلام عادل و جەمال حەیدەری، دیسان باسی جەمال نەکرا، لە کاتێکدا باسی شەهید فەهد، عەبدولڕەحیم شەریف کرا، تەنیا وتارە بچووکەکەی محەمەدی مەلا کەریم کە لە مۆسکۆ نووسیبووی، باسی جەمال دەکات. ئەوە چۆن لەقەڵەم دەدەن؟!

لەلاپەڕەکانی " طریق الشعب"دا وتاری "ام سلام"«مادلێن مونیر – خێزانی بەهائەدین نووری» بلاو دەکرێتەوە!! کە زۆر چاك دەزانن هەڵوێستی لە ١٩٦٣ چ بووە، بەلام بە یەك وشە باسی تێکۆشەر "نەرگز ئەلسەفار" و تێکۆشەرانی دیکە ناکرێت. رۆژنامەی "ط.ش" و گۆڤاری "پ.ج" بۆتە رۆژنامەی تایبەتی برادەر "زەکی خەیری" و خێزانەکەی. «ئەو دێرە تەنیا بۆ هاورێ عەزیز نووسراوە، نەك بۆ سەرکردایەتیی حزبی شیوعی و لە کەوانە دانراوە – لە نامەکەدا.»

## ٤- دەربارەی وتاری سەدام حوسێن «ئەم وتارە لە ١٩٧٤/٤/٢٥ دروە و لە خاڵی ٤م ئاماژەی پێکراوە.»

هێرش بردنە سەر شەخسی بارزانی، هەردەم لەلایەن دوژمنانی گەلی کورد بووە. نووری سەعید، قاسم، بەعس ١٩٦٣ و ئێستا سەدام حوسێن!، بەلام ئەوەی جێگای داخە ئەمە لە بەردەم نوێنەرانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق روودەدات، لە عەهدی قاسم شیوعیەکان بەند دەکران، بەلام هێرشیان نەدەبردە«کردە» سەر بارزانی. بەلام ئێستا پاش هێرش بۆ سەر بارزانی، نوێنەرانی(بەرەی نیشتمانی!) بروسکە بۆ سەرۆك بەکر(کۆمار) رەوانە دەکەن، من لەو بڕوایەم ئێوە(پارتی کۆمۆنیست) بە هیچ جۆرێك بەشداری لەم هێرشە ناکەن و هەوڵدان بۆ بەدکردنی مێژووی گەشەداری کورد،ل چونکە بارزانی بە هەموو کەم و کورییەوە، مرۆڤێکی کوردی دڵسۆز بوو بۆ کورد و کوردستان. ئێوە لە ساڵی١٩٧١ لە مۆسکۆ: بارزانی نابێتە عەمیل«ئەوەی شایانی باس بێت لە ساڵی١٩٧١ لە مۆسکۆ لە هاورێ عەزیزم پرسی: بارزانی عەمیلە؟ گوتی، بارزانی لەگەڵ چیرچل-یش هاوکاری بکا، نابێتە عەمیل.»، بەلام سەدام-ی هاوبەشی ئێوە دەڵێت: بارزانی عەمیلە.

هاورێ عەزیز

من لەو بڕوایەم کە ئێوە هەوڵ دەدەن بۆ چاك کردنی پارتی کۆمۆنیست، هەڵوێستی راست لەم مەسەلەیەدا وەرگرێت.

ئیتر خۆشیتان ئاواتەخوازم.

براتان

جەمشید حەیدەری

٢٦/نیسانی/١٩٧٤

(*)

– هەموو ئەو دێرانەی لەنێوان کەوانە«»دا هاتوون لە کاتی پاکنووس کردنەوە نووسراوە.

– حکومەتی عێراق لە ساڵی١٩٧٤ یەك لایەنە و بە لەبەرچاو نەگرتنی بەیانی ئاداری١٩٧٠ لەنێوان سەرکردایەتیی کورد و بەعس، قانوونی (مەجلیسی تەشریعی) راگەیاند، کە بووە هۆی هەڵگیرسانەوەی شەڕ





لــە کوردســـتاندا. بــێگومــان حکومەتی عێراق بە پشت بەستن بـە ڕێککـەوتی نێـوان سـۆڤیەت و عێراق لەلایەك و ڕاگەیاندنی بەرەی لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی عێراق و ڕەزامەنــدیی کۆمۆنیـستەکان بــە قانوونەکــە، هــەروەها نــاکۆکیی نێـــوان پـــارتی دیمـــوکرات و کۆمۆنیست و فشاری ئێران لەسەر سەرکردایەتیی پارتی دیموکرات و کـــورتبینیی سیاســـی(پـــارتی و کۆمۆنیـــست)- مەبەســـتم ئەوەیـــە بڵـێم کــە بزاڤــی کۆمۆنیـــست و دیمـــوکراتی گـــەلانی عێـــراق هاوپەیمانی ستراتیژی بزاڤی کورد بـوون، بـەڵام هـەردوولا لــە ژێــر فـشاری دەرەکـــی، هاوپـــەیمانی ستراتیژییان بە هاوپەیمانیی کاتی گۆڕییەوە – ئاکامەکەشی شکستی بزاڤـــی کـــورد و لێـــدانی کۆمۆنیـــستەکان دوای شکـــستی بزاڤـــی کـــورد.﴿هــــەولێر – ٢٠١١/٣/١﴾

# CARDRI

Committee
Against Repression &
For Democratic Rights in Iraq

CHAIRPERSON: ANN CLWYD MP P.O.BOX 210, LONDON N18 5PL

TURKEY
SYRIA
IRAN
IRAQ
SAUDI ARABIA

SPONSORS INCLUDE:
[illegible]

CARDRI ANNUAL SUBSCRIPTION RENEWAL/FINANCIAL APPEAL

Dear Friend,

The past year has witnessed increasing hardship and repression for Iraqi people. There is hardly an Iraqi family which not lost someone in the Iraq-Iran war, which continued to drag on into its 7th year. [illegible] Saddam Husain dictatorship have become increasingly more brutal, with the escalation of the war and the continued use of chemical weapons.

The economic and political crisis which the war brought has left no section of Iraqi society untouched.

As the Ba'ath regime becomes increasingly unstable it continues to resort to torture, execution and detention to maintain its precarious grip on power.

In Britain CARDRI's work has responded to these events with increased vigour and activity. We continue to publish information on Iraqi political prisoners and the 'Disappeared', meet with and brief MPs, Trade Unionists and political organisations, organise demonstrations, pickets and cultural activities and keep our membership informed of the news that isn't reported in the British press.

Since last year CARDRI's work has taken on new directions; we saw the publication of **SADDAM's IRAQ**, a comprehensive and up-to-date account of Iraq under President Saddam Husain, edited by CARDRI; we also seen the development and expansion of our network of branches.

However all this activity needs resources both in human and financial terms if CARDRI is to develop and continue its work.

We ask you to consider supporting our work by affiliating yourselves and your organisations to CARDRI, giving a donation to CARDRI or by considering a longer term financial commitment to the work of CARDRI by completing the BANKER's ORDER overleaf. Banker's Orders allow you to plan your giving whilst allowing CARDRI to have a firmer and more committed financial base.

Please do not ignore this appeal [illegible]

Yours fraternally,

Vaughan West [illegible]

PLEASE SEE OVER

من هێشتا لە سۆڤیەت بووم، واتە لـە سـاڵی١٩٨٢ دوای سـەردانی سـەیدا جگـەرخوێن و محەمـەد ئـەمین بۆزئەرسـەلان بـۆ لێنینگـراد، بیرۆکـەی دامەزراندنی ئەنستیتۆی کوردی لە پاریس هاتە گۆڕێ کـە دکتـۆر کەنـداڵ نـەزان و یـەلماز گۆنـای خـەریکی کـارێکی وانـە. ئامـادەیی خـۆم نیـشان دا روو بکەمـە پاریس و هاوکاریان بکەم، بەڵام وەرگرتنم لە فەڕەنسا بە وتـەی محەمـەد ئـەمین بۆزئەرسـەلان لــە زمـانی دکتـۆر کەندالـەوە، دەبوایە سەرەتا بچمە بەلـچیکا ماوەیـەك و پاشان لەوێوە بۆ پاریس. ئەوەم بۆ نەکرا، ١٩٨٣ رووم کردە سوێد.

دوای دامەزرانـدنی ئەنیـستیتۆی کـوردی لـە پـاریس، بانگهێـشت کـرام بـۆ کۆبوونەوەیـەك لـە پـاریس، بـەڵام ڤیـــزەی فەرەنـــسیم پـــێ‌وەرنـــەگیرا و بەشـــداریم لـــە کۆبوونەوەکـەدا نـەکرد، بـەڵام لـە دەسـتەی پـشتگیریی

گۆڤاری "هیوا"ی ئەنیستیتۆی کورد دانرام. بە پێی پرۆگــــــرام گۆڤارەکــــە دەبوایـــــە بەســــێ زاراوە -حریـچی(کرمـانجیی خـواروو، کرمـانجیی ســەروو و ـزایــی(دملـی). مــن نامەیــەکم بــۆ بەشــداربووانی کۆبوونەوەکــە رەوانــە کــرد، بەتایبــەتی دەربــارەی بەکارهێنانی سێ زاراوە لە گۆڤارەکەدا، کە لە خزمەتی یـەکتێی زمـانی کوردیـدا نییـە، وەك ئاگـادار کـرام لـە کۆبوونەوەکــەدا دکتــۆر کــەمال فوئــادیش، هـــەمان هەڵوێستی هەبوو.

من لەچەند ژمارەیەکی گۆڤاری هیوادا ئەندامی دەستەی پشتگیری بـووم و لـە گۆڤارەکـەدا دوو وتاریـشم بـڵاو کردەوە. لەبەر ئەوەی لە دەستەکەدا بووم، وتارەکـانی گۆڤارەکـە بـەر لـە بڵاوکردنـەوە، بـۆم دەهـات و منـیش بۆچوونی خۆم دەربارەی بڵاوکردنەوەیان یاخود نا بۆم دەنووسین، بەڵام هەندێ وتاریش بێ پرس کردن بەئێمە، ئەو برایانەی لە پاریس بوون بڵاویان دەکردەوە. لەبەر ئەم هۆیە، من خۆم لە دەستەی پشتگیری کێشایەوە، چونکە بە بۆچوونی من مافی ئێمە پێشێل دەکراو هەندێ لەو وتارانەش لەگەڵ گۆڤارێکی ئاکادیمی نەدەگونجان، هەروەهالـە گۆڤاری – دراسات کردیـە – کـە بـە زمـانی عـەرەبی و فارسـی دەردەچـوون و کـاك سیامەند زەیـد و ئەحمـەد عوسمـان سەرپەرشـتیی دەکـرد، دوو وتـارم بــەزمانی عــەرەبی تێــدا بــڵاو کــردەوە. یــەکێکیان کورتەیەکی چڕ دەربارەی پەخشانی هونەری کوردی – تێـزی دکتۆراکـەم بـوو، ئـەویتریان رەتــی نامەیــەکی نووسەر و بیرمەندی بەنێوبانگی عێراق هادی العلوی بوو کە هێرشی تێدا کرابوو سەر کۆڕی زانیاریی کورد لە عێراق.

– کاك کەریمی حیسامی لە ساڵی ١٩٨٤ بە پاسپۆرتێکی تونسی سەردانی ستۆکهۆڵمی کرد. من لـە رێگـای نۆڤین سەرحان ئاگادار کرام کە رۆژێك مێوانی ئەو بوو. من کـاك کـەریمم لـە سـاڵی١٩٦٨ەوە دەناسـی، لـە کـاتی بەشـداریم لـە فـسیڤاڵی قوتابیـان و لاوانـی جیهـان لـە سۆفیا.

ئەو چاوکەوتنم بەتەواوی لەیاد نەماوە، بەڵام نامەیەکی کاك کەریم حیسامیم کە لە ١٩٨٤/١٢/٣ بۆ هاتووە کە داوای کـردووە کورتـە بـاس(ئـەو نامیلەکیـە کـە کـاك کـەریمی رەدی دکتـۆر قـاسملوی داوەتـەوە دەربـارەی سۆسیالیزمی مەوجود) وەرگێڕمە سەر زمانی عەرەبی. دیارە منیش ئاماژەم بە هەندێ سەرچاوە کردووە کە کاك کەریم لە نووسینەکەی بەکاری هێناوە.

کــاك کــەریم دەنووســێ: بــرام پێــشەکی سوپاســی وەرگێڕانەکە دەکەم، بەڵام لەمەڕ سەرچاوەکان هەروەك لە کتێبەکەش‌دا هەیە و لە پشتی ئەم نامەش نووسیومن، لێرەدا بـۆم روون نییـە و لەیادمـدا نـەماوە باسـی کامـە کتێب دەکات، بەڵام لە ناوەرۆکی نامەکە بۆم دەرکەوت کە باسی کورتە باس نییە، چونکە دەنووسێ: "لەبارەی کورتە باس، بە گیانی تۆ لە فارسی بەدەر لام نییە و راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی پێنجەم تاقە یەکێکم لەلا بوو ئەوە بۆم ناردی." لە کۆتایی نامەکەدا دەنووسێ: "وەبیرم هاتەوە، کورتە باسی کوردیم داوە بە رەفیق (مەبەست رەفیق سابیرە)، لێی وەردەگرمەوە و بۆتی دەنێرم."

بەپێی ئـەو نامەیـە، کـاك کـەریم جـاری یەکـەم لـە ١٩٨٤ هاتۆتـە سـوێد، بـەڵام جـاری دووەم لـە ١٩٨٥/١٠/٢٤ هــاتووە و لــەو هاتنەیـدا باســی دەرکردنــی رۆژنامــەی "سەردەمی نوێ"ی لەگەڵدا کردووم.

لە ساڵی ١٩٨٥ لە رێگـای نووسینگەی کـار، بۆ شەش مـانگ کـارێکم دەسـتکەوت لـە کتێبخانـەی دەوڵـەتی لـە رنیکـەبی. رۆژانـە لـە بەیانییـەوە تـا سـەعات ٥ی ئێـوارە کــارم دەکــرد و سەرپەرشــتیاری کتێبخانەکــە ژنێکــی فینلەنـدی بوو بە نـاوی "پیرکۆ"، تا بڵێی ژنێکی باش بـوو، تـا رادەیـەك دۆسـتایەتیمان پەیـدا کـرد، بـۆ مـاڵی خۆی بانگهێشتی کردم لەدوای هاتنی دایکی حەیدەر و منداڵەکان لە ساڵی١٩٨٥.



UTGIVNINGSBEVIS för periodisk skrift

| Datum | Ub |
|---|---|
| 1986-03-19 | 14773 |

KUNGL PATENT- OCH REGISTRERINGSVERKET

Patent- och registreringsverket meddelar härigenom bevis att hinder enligt tryckfrihetsförordningen inte möter att utge nedannämnda periodiska skrift.

Skriftens titel
Serdemi NÛ

Utgivningsort
Stockholm

Skriftens ägare
Jamshid Al-Haydari

Detta bevis gäller intill dess det återkallas.

Lars Gullstrand

H-B Skylling

Avskrift till
postverket
akten

Patent- och registreringsverket — Postadress: Box 5055, 102 42 STOCKHOLM — Telex: 17978 PATOREG-S — Telegram: PATOREG-VERKET Stockholm

بەشداری دەکەن و تۆش بۆ ئەو مەبەستە دیار کراوی. منیش گوتم ئەگەر سەربەخۆ بێت و کوردستانی بێت و ناوەکان بناسم و مەبەستەکەی لام ڕوون بێت، لاریم نییە. کاک کەریم ئاماژەی بە هەندێ ناو کرد. لەوانەی کۆنە ئەندامی حزبی دیموکراتی کوردستان بوون: ئەمیری قازی عەزیزی ماملێ، سالاری حەیدەری مەلا محەمەدی خدری، حاجی ئەحمەدی و کەسایەتیی دیکەی ڕۆژهەلاتی کوردستان کە لە سویسر دەژیان بە ناوی سارەمەدینی سادق وەزیری و هەروەها ناوی چەند ڕۆشنبیرێکی باشووری کوردستان کە دووانیانم دەناسی: ئەنوەر قادر و عەبدوڵڵا پەشێو، بەلام ئەو دوو شاعیرە، نە ڕاستەوخۆ و نە ناڕاستەوخۆ لە داهاتوود بەشدارییان لە ڕۆژنامەکەدا نەکرد. بەلام من ڕەزامەندیم ڕاگەیاند و پێشنیاری ئەوەشم کرد کە پێویستە چەند کەسێکی باکووری کوردستانیش بەشداریی تێدا بکەن. ئەوە بوو کاک کەریم لە سەرەتای مانگی ١١ی ١٩٨٥ بەرەو بەرلین بەڕێکەوت و دەبوایە لەوێوە بۆ پاریس بچێ و بەشداریی کۆبوونەوەیەك بكات لەگەڵ ئەوانەی نیازیان هەبوو ڕۆژنامەکە دەربکەن، بەلام لە بەرلین پۆلیسی ئەڵمان ڕێگەیان نەدا و گەڕایەوە بولگاریا. کۆبوونەوەی پاریس وەك لە نامەیەکی مەلا محەمەدی خدری کە لە ١٩٨٥/١١/٢٠ بۆ کاك کەریمی ڕەوانە کردووە، هاتووە: "...برادەران بە تێکڕا ڕایان

لە هاوینی١٩٨٥ لە ڕێگای نۆڤین سەرحانەوە زانیم کە کاک کەریم هاتۆتە ستۆکهۆڵم و لەلای نۆڤینەوە بانگهێشت کرام و لەوێ لەگەڵ کاك کەریم دانیشتین و پاشان پیاسەیەکمان کرد و ئاگاداری کردم کە نیازی هەیە ڕۆژنامەیەکی کوردی دەربکەن، – واتە ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆ بێت و کوردستانی بێت – ژمارەیەك کەسایەتیی سیاسی و ڕۆشنبیری تێیدا

لەسەر دەربڕی. دیارە کاک ئەمیر نەزەری تایبەتیی خۆی هەبوو، ئەویش ئەوە بوو کە نووسەر و هەیئەتی تەحریری ڕۆژنامەکە تەنیا کوردە ئێرانییەکان بن... بەڵام ئەو نەزەرە بە تێکڕا ڕەت کرایەوە.﴿لە بیرەوەرییەکانم – کەریم حیسامی – بەرگی نۆیەم – ل٦٢ – ستۆکهۆڵم ١٩٩٥.﴾

دوای گەڕانەوەی، مەلا محەمەدی خدری لە پاریس و باسی کردنی کۆبوونەوەکە، منیش نامەیەکم بۆ کاک کەریمی حیسامی نووسیوە کە تێیدا هاتووە: "دوای گەڕانەوەی مەلا محەمەد باسیێ ئەوەی بۆ کردم کە لە پاریس چ بڕیارێک وەرگیراوە دەربارەی دەرهێنانی ڕۆژنامەیەکی کوردی بە ناوی "ئاگری". جێگای خۆشییە کە ئێمەی کوردیش بتوانین کاری وا بکەین کە خزمەتی مەسەلەی گەلەکەمانی تێدا ڕەچاو بکرێت. ناوی چەند کەسێکی باس کرد کە بەشداری لە ڕۆژنامەکەدا دەکەن. زۆر سوپاستان دەکەم کە منیشتان دەستنیشان کردووە. بەشداری کردن لە نووسین بۆ ڕۆژنامە جیاوازیی هەیە لەگەڵ ئەوەی مرۆ ئەندامی دەستەی نووسەران بێت. ئەگەر مەبەست لەوە دایە کە وەك نووسەرێك بەشداری بکەم و جاروبار وتارێك ئامادە بکەم، ئەوە بێگومان کەمتەرخەمی ناکەم، بەڵام ئەگەر ئەندامی دەستەی نووسەران بم، ئەرکی تایبەتی لەسەر شانی دەستەی نووسەرانە، پێویستە بەشداریی تەواو بکەم لە هەموو کارەکانی ڕۆژنامە و دیار کردنی ڕێڕەوی سیاسی..."﴿بیرەوەرییەکانی کەریمی حیسامی، بەرگی نۆیەم، ١٩٩٥، ل ٦٣-٦٤.﴾

دیارە کاک کەریم و هاوڕێیانی بڕیاریان دابوو من لە دەستەی نووسەران دابم، کە دەستەکە لەمانەی خوارەوە پێکهاتبوو: سارەمەدین سادق وەزیری – سەر نووسەر، کەریمی حیسامی – جێگر و ئەوانەی دیکە دەستەی نووسەران: عەزیز ماملێ(پاریس)، حاجی ئەحمەدی(ئاڵمانیا)، مەلا محەمەدی خدر و جەمشید حەیدەری(سوێد) و هەروەها مستەفا دوزگون(سوێد – بەشی کرمانجیی سەروو).

لە ١٩٨٦/٢/١ لە ستۆکهۆڵم هەندێ لە ئەندامانی دەستەی نووسەران دیاری کرا و کۆبوونەوەیەکمان کرد کە تێیدا، جگە لە نووسەری ئەو بیرەوەرییانە، کاک سالاری حەیدەری، مەلا محەمەدی خدری، حاجی ئەحمەدی و مستەفا دوزگون ئامادە بوون، بۆ دیاری کردنی باسەکانی ژمارەی یەکەمی. ئەوەی شایانی باس بێت، لە کۆبوونەوەی پاریس – ئاگری – پێشنیاز کرابوو، بەڵام دیارە کاک کەریم و سارەمەدین لەسەر "سەردەمی نوێ" ڕێککەوتبوون.

هەرچەند لە سەرەتا کاک ئەمیری قازی و کاک سالاری حەیدەری ئامادییان نیشان دابوو، بەڵام کاک سالار تەنیا یەکجارئامادەی کۆبوونەوە بوو. کاک ئەمیر هەر ئامادە نەبوو، بەڵام ئێمە ئەوانەی لە ستۆکهۆڵم بووین، بابەتەکانی ژمارەیەك یەکەممان ئامادە کرد. دوای ئەوەی کاک کەریم(وتارەکانی سارەمەدین بە فارسی و کوردی وەك سەروتار بۆ ڕەوانە کردین – ژمارەی یەکەم لە بەشی کرمانجیی خواروو و سەروو و لەگەڵ پاشکۆیەکی فارسی) ئامادە کران، بەڵام کێشەی لەچاپدانمان هەبوو. پاشان لەگەڵ چاپخانەیەکی فینلەندی پێکهاتین کە ژمارەی یەکەممان بۆ چاپ بکات. ئەوەی شایانی باس بێت، ژمارەی یەکەم بۆ دووی ڕێبەندان ئامادە کرابوو، بەڵام لە کۆتایی شوبات دەرچوو. ڕۆژنامەکە لە چاپخانە دابوو کە سەرۆك وەزیرانی سوێد ئۆلف پالمە تیرۆر کرا. ئێمە لە لاپەڕەی یەکەم کە بە هەڵە ببووە دوالاپەڕە، وێنە و هەواڵی تیرۆر کردنی و مەحکوم کردنی ئەو کارەمان بڵاو کردەوە.

ژمارەی یەکەمی سەردەمی نوێ لە کۆتایی مانگی شوباتی١٩٨٦ دەرچوو. بۆ ئەوەی خەڵکانێك یاری بە چارەنووسی خەڵکی دیکە نەکەن، وشك و تەڕ پێکەوە نەسووتێ، دەربارەی ئەو پووڵەی ڕۆژنامەکەی پێ چاپ





دەکرا، من لە سەرەتادا هەندێ شتم گوێ لێدەبوو، بەڵام لەم داواییانەدا هەندێ شتم بۆ ئاشکرا بوو.(نەک بە تەواوی، لەوانە بە مەزەندە یاخود...!) هەرچەند گومانم لە هەندێ بۆچوون لەمبارەیەوە هەیە. من لە ساڵی١٩٩٥ لەبارەی رۆژنامەی "سەردەمی نوێ" هەندێ شتم نووسیوە، دەمەوێ وەک خۆی لێرەدا بڵاویان بکەمەوە.

دوای ٥ساڵ لە راوەستانی رۆژنامەکە، هەندێ سەرەداو باسی ئەوەیان دەکرد کە پارەی رۆژنامەکە لەلایەن دەوڵەتانی بلۆکی رۆژهەڵات دابین دەکرێ، من ئێستاشی لەگەڵدا بێت، بە تەواوی نەگەیشتوومەتە سەرچاوەی تەواوی پووڵەکان، چونکە راستەوخۆ و نە ناراستەوخۆ ئاگاریم نەبووە، تەنیا ئەوەی کاتی خۆی من لە کاک کەریم حیسامی-م زانی، دوای شۆڕشی گەلانی ئێران و گەڕانەوەی کاک کەریم بۆ کوردستان، دیاری و یارمەتیی زۆری بۆ هاتوو پێشکەش کراوە (ئۆتۆمبیل...) ئەوانەی بۆی هاتبوو، فرۆشتوویەتی پارەکەی لە ئەڵمانیا لە بانگ داناوە، هەروەها کاک کەریم پەیوەندی و ئاسیاویی زۆری لە هەندەران هەبوو، چ لە کوردەکانی رۆژهەڵات و چ هەردوو پارتی کۆمۆنیستی عێراق و ئێران. کاک کەریم یارمەتیی بۆ دەهات لە هەندێ لە دەوڵەمەندەکانی کورد لەو کاتەی من لە رۆژنامەکەدا کارم دەکرد کە جێگەی دڵخۆشیی من بوو. هەروەها رێبازی رۆژنامەکە کوردانە بوو. من ئێستاش کاتێ بۆچوونەکانی ساڵی١٩٩٥ دەنووسمەوە و کاک کەریم لە ژیاندا نەماوە، لەو بڕوایەدام کە کەریمی حسامی، مرۆڤێکی کوردپەروەر و سۆسیالیست بوو. بڕوایبە بیری کۆمۆنیستی هەبوو، ئەگەر چی پابەندی هیچ حزبێکی کۆمۆنیستی نەبوو.( بە رای من) هیوا و ئامانجی سەربەخۆیی کوردستان بوو. ئەوەی هەندێ جار سەرنجی رادەکێشام، نەک نووسینەکانی خودی کاک کەریم، بەڵام هەندێ لەوانەی من دەمنووسی - کاک کەریم نەیدەویست بە هیچ شێوە پەسنی سۆڤیەت بدەم - بەڵکو ئەو خۆی لەوە دوور دەخستەوە و راستەو رێگریی دەکرد کە باسی سۆڤیەت لە رۆژنامەکەدا بکر لەگەڵ ئەوەشدا دوای چەند ژمارەیەک کاک فەر شاکەلی - مۆرکی رۆژهەڵاتی - مەبەست بلۆ رۆژهەڵاتی دا پاڵ رۆژنامەکە. بێگومان رۆژنام سەردەمی نوێ کە ٥٤ژمارەی لێدەرچوو، لە روانگ بەرژەوەندیی کورد و برایی رزگاریخوازی کو وتارەکانی دەنووسی و لایەنگری هیچ ئۆردوگای نەبوو. داگیرکەرانی کوردستانی ریسوا دەکرد بەرگریی لە مافی رەوای کورد دەکرد لە هە پارچەکاندا دەکرد، بەڵام حزبی دیموکرات دژایەتی دەکرد، لایەنگرانی حشع بە گومانەوە سەیریان دەکر بە وتەی کاک کەریم ئەحمەد(کە ئەندامی م.س حش بوو)، مام جەلال رۆژنامەکەی بە لایەنگری حشع دە قەڵەم. لە راستیدا نە حشع، نە ئەندامانی بەشداری تێدا نەدەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ تێبینیی ک کەریم لەسەر وتارەکانی من دەربارەی کوردەکا سۆڤیەت یان لە بواری کوردەلۆژیی سۆڤیەت کە لە چە ژمارەیەکدا بڵاوم دەکردەوە، سەرنجی رادەکێشام دەبێ لایەنێک لە پشت رۆژنامەکەدا هەبێ. من ل رۆژنامەکەدا دوو جۆر وتارم دەنووسی، سیاسی رۆشنبیریی گشتی. جارێک وتارێک لەسەر هەڵوێست سۆڤیەت "پێریستوریکا و کێشەی کوردی سۆڤیەت نووسی، کاک کەریم بە هیچ شێوەیەک رازی نەبوو "سەردەمی نوێ"دا بڵاو بکرێتەوە، هەرچەندە م خاوەن ئیمتیازی رۆژنامەکە بووم، بەڵام لەبەر ئەوە پارەی دەرکردنی رۆژنامەکەی دابین دەکرد، من ناچ بووم وتارەکەم لە گۆڤاری "بەربانگ"دا بڵاو کردەو دەربارەی راگرتنی زنجیرە وتارەکانی - کوردناسی کوردۆلۆژی - کاک کەریم گوتی: برادەرانی سۆڤیە ئەوە ناخوازن - من لەوەوە گەیشتمە ئەنجامێک... بۆ ئەوان چ پەیوەندییان بەوە هەیە... وازم لێهێنا، چونک

ئەستۆی من و مەلا محەمەدی خدری بوو، لەگەڵ مستەفا دوزگون، بەڵام لەبەر ئەوەی مەلا محەمەد بەپێچەوانەی ڕێککەوتنمان کە پێکەوە کاری دەستەجەمعی بکەین ؟؟؟، کاک مەلا محەمەد بێ‌پرسی ئێمە و لە پەیوەندیی‌دا لەگەڵ سارەمەدین وەزیری کارەکانی دەکرد و پاشان بە ئێمەی دەگوت. بۆیە من لە ١٩٨٦/٦/٤ دوای دەرچوونی ژمارەی سێیەمی ڕۆژنامەکە، نامەیەکی ٧لاپەڕەییم بۆ دەستەی نووسەران نووسی کە هەندێ ڕەخنە و پێشنیار و بۆچوونی خۆم دەخەمە بەرچاویان بۆ ئەوەی کارەکە بە ڕێك و پێکی ئەنجام بدرێت.

لێرەدا خاڵە گرنگەکانی نامەکە دەخەمە بەرچاوی خوێنەران:

– لە یەکەم ژمارەی – سەردەمی نوێ – پاشکۆیەکی فارسی هەبوو، من بەرهەڵستکار بووم، بۆ ئەو پاشکۆیە، بەڵام تا سێ ژمارە درێژەی هەبوو، چونکە پێم وابوو بوونی ئەو پاشکۆیە بە فارسی ئێرانچیەتیی بەدواوەیە، بۆیە پێشنیارم کرد لابچێ یاخود پێویستە بە زمانی عەرەبی و تورکی‌یش پاشکۆکە دەربکرێ، واتە بە زمانی میللەتانی دراوسێمان.

– لە نامەی پێشوومدا کە لە مانگی ١١ی ١٩٨٥ ئامانژەی پێکراوە، نابێ هیچ بابەتێك لە دەستەی نووسەران شاراوە بێت و هەر ئەندامێکی دەستەی نووسەران ئەرکی خۆی بۆ دیاری بکرێ و هەموویان یەکسانن بەرانبەر ئەوەی بڵاو دەکرێتەوە.

– دوای دەرچوونی هەر ژمارەیەك پێویستە دەستەی



MELBENDI
ROSINBIRI
KURDI

KURDISH CULTURAL CENTRE
15-15 STOCKWELL ROAD
LONDON S.W.9
TEL- 01-2746251

لەندەن ١٩٨٧/٤/٢٢

بۆ مامۆستای بەڕێز د. جەمشید حەیدەری

سڵاوێکی برایانە

بەناوی کۆمیتەی بەڕێوەبەری مەڵبەندی ڕۆشنبیری کوردی - لەندەن پڕ بەدڵ سوپاسی هەستی پیرۆزتان ئەکەین بۆ بەشداربوونتان لە چالاکییەکانی فیستیڤالی نەورۆزی ئەم ساڵدا . بەشداربوونی ئێوەی ڕۆشنبیر لە پێشخستنی باری ڕۆشنبیری کوردیدا جێگەی ڕێز و سوپاسە .

ئومێدەوارین چالاکی و پشتگیریتان لەم ڕووەوە بەردەوام بێت بۆ ئەوەی زیاتر خزمەت بە میللەتە چەوساوەکەمان بکەین لە دەرەوەی وڵات و ڕووی ڕاستەقینەی پێشکەش بە میللەتان بکرێت .

هەر بە هیوای سەرکەوتن

لەجیاتی

لیژنەی سەرپەرشتی نەورۆز

به گشتی ڕێبازی ڕۆژنامەکەم بەدڵ بوو کە لە خزمەت ڕێبازی کوردایەتی‌یە، بۆیە چاوم لێ‌پۆشی. تا ڕادەیەك گەیشتمە ئەو بڕوایە سۆڤیەت بە شێوەیەك لە شێوەکان یارمەتیی ڕۆژنامەکە دەدات، بەڵام مەسروفاتی ڕۆژنامەکە لەوە زۆرتر بوو، بۆیە کاک کەریم هەوڵی دەدا یارمەتی لە هەندێ دۆستەکانی ئەوروپا کۆبکاتەوە...

بەو شێوەیە ڕۆژنامە کە تا ١٩٩٠ درێژەی هەبوو.

دیارە ڕۆژنامەی "سەردەمی نوێ" لە ١٩٨٦ پتر لە

نووسەران کۆبێتەوە بۆ هەڵسەنگاندنی ژمارەکە.

- وتارەکانی سارەمەدین سادق وەزیری، بەر لە چاپکردنی پێویستە لەلایەن دەستەی نووسەرانەوە پەسەند بکرێ، نەك دوای چاپکردنی وەك ئەوەی مەلا محەمەدی خدری دەیکات.

- لە کۆبوونەوەی کۆتایی مانگی یەك و سەرەتای مانگی شوبات کە هەموو دەستەی نووسەران تێیدا ئامادە بوون، جگە لە سارەمەدین و کەریم حیسامی ئەو بنەمایە تۆمار و پەسەند کرابوو، بەڵام مەلا محەمەد پابەند نەبوو، بەڵکو تەنیا بۆوونی سارەمەدینی لا گرنگ بوو.

- مەلا محەمەد و عەزیزی ماملێ ئاماژەیان بە قورسیی زمانی فارسیی سارەمەدین دەدا، بۆیە لە توانای مەلا محەمەددا نەبوو وتارەکانی سارەمەدین بە چاکی وەرگێڕێ، وشەی عەرەبی لە وەرگێڕانەکەدا زۆر بوو. بۆ نموونە تەنیا لە سەروتاری ژمارەی یەکەمدا ١٣وشەی عەرەبی و لە ژمارەی٢ دیسان ١٣وشەی عەرەبیی تێدا هاتبوو. بە لای مەلا محەمەدەوە زمانی کوردیی عێراق هەر عەرەبییە، لە کاتێکدا زمانە کوردییەکەی خۆی بەمجۆرە بوو کە ئاماژەی پێکراوە، لەوانەیە کوردەکانی لە ژێر کاریگەریی ڕێزمانی عەرەبیدا بن، بەڵام لە جیاتی وشەی عەرەبی، پتر فارسی بەکار دێنن.

- بە پێی ئەنجامدانی کارەکان لە لای مەلا محەمەدەوە، دەستەی نووسەران هیچ ڕۆڵێکیان نییە، تەنیا پرسە خەسوانەیان پێ دەکرێ، بەڵکو خۆی و سارەمەدین و کاك کەریم هەون.

- بۆ دواڕۆژ و مێژوو، پێویستە وتارەکان ئیمزای خاوەنەکانیان لەسەر بێت، بەڵام لەو سێ ژمارەیەی بڵاو کراوەتەوە، تەنیا وتارەکەی من کە نازناوی "بروسك"ی پێوە نووسراوە.

- بە بۆنەی یادی "هێمن" وتارەکەی بڵاو نەکراوە، بەڵکو هی کاك کەریم، هەرچەندە من پێم وانییە وتارەکەی من لە هی، کاك کەریم خراپتر بێت.

- گۆشەی ئەدەب کە دەستی پێکرد، من وتارێکی بچووکم نووسی لەسەر ئەدەب و ئاماژەم بە بابا تاهیری هەمەدانی کردبوو، وەك شاعیری کورد، مەلا محەمەد بابا تاهیری بە شاعیرێکی ئێرانی لەقەڵەم دەدات لەوانەیە برایانی دیکەش هەمان بۆچوونیان هەبێ. بەڵام زانایانی کورد وەك عەلائەدین سەجادی، ئەمین زەکی ڕەفیق حلمی، عزەدین مستەفا و... و خۆشم هەر بە کوردی دەزانم. ئەوانەی بە کوردی نازانن دەتوانن بە وتار و بەڵگە وەڵام بدەنەوە.(مەلا محەمەد دەیگوت دەبی بۆ سارەمەدین بنێرین بزانین ئەو رای چییە؟)

- بەکارهێنانی ساڵ و مانگ لە ڕۆژنامەکەدا، پێویستە ستادارد بێت، لە تەك کوردیدا زایینی بەکار بێت لە جیاتی ئێرانی و ناوی مانگەکانیش هەر بەو شێوەیە بێت. بۆ نموونە: فەورییە، واتە فێبریوەری – شوبات جورێك هەڵبـژێردرێ کە بۆ کوردی عێراق و تورکیا و سوریاش باو بێت، نەك تەنیا ئێران.

- وتارەکانی ڕۆژنامە زۆر درێژ نەبێ، چونکە خوێنەر مافی ئەوەی هەیە بڵێ گۆڤاری "سەردەمی نوێ" نەك ڕۆژنامە. چونکە هەندێ وتار چەند لاپەڕەیەکی پڕ دەکرد. وەلەو ١٢لاپەڕەیەی ڕۆژنامەکە.

- لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی لە سوێد لە ڕۆژنامەکەدا کاریان دەکرد تەنیا من مافی ئەوەم هەبوو ڕۆژنامە بە ناوی خۆم دەرکەم، چونکە کاك ئەمیری قازی و سالاری حەیدەری هەر بەشدارییان تێدا نەکردبوو و لەبەر ئەوەی بە پێی قانوون ئەگەر ڕۆژنامە یان بڵاوکراوەیەك شەش ژمارەی بە ڕێکوپێکی لێ دەرچوو، حکومەت یارمەتیی ماڵیی دەدات. بۆیە بە ناچاری وەك کاك کەریم لە بەرگی ٩ی بیرەوەرییەکانی ئاماژەی پێدەکات: "بە ناچار هاتینە سەر ئەو باوەڕە کە بە ناوی دکتۆر جەمشیدی حەیدەری ئیجازەی دەرکردنی ڕۆژنامەی "سەردەمی نوێ" وەرگرین."(ل٧٧) من ئەو چەند دێرەم نووسی کە

کاتی خۆی لە نامەکەدا نەبوو، چوکە هەر باسی ئەوەمان نەکردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کاک کەریم لە ساڵی١٩٩٥ بەو شێوەیەی بڵاو کردۆتەوە، بۆیە دەیخەمە بەرچاوی خوێنەران، ئەگەر لە کاتی خۆی بمزانیبووایە بە ناچاری داوایان لە من کردووە، بێگومان نەمدەکرد، بەڵام لەدوو چووان مەچوو...! لەو خاڵەدا من تەنیا ئاماژەم بەوە کردووە کە ئەوان(مەلا محەمەد و سارەمەدین...) من وەك میوان و هاوکار دادەنا، نەك ئەندامی دەستەی نووسەران.

- لە نامەکەدا پێم راگەیاندوون ئەگەر خواستیارن من دەست لەکار دەکێشمەوە و دەکرێ "ئیجازەی رۆژنامەکە" بە ناوی کەسێکی دیکە بێت، لە من ببوورن.

- لە کۆتایی نامەکەدا ١٠خاڵم پێشنیاز کردووە، هەندێك لە خاڵەکان لە مەتنی نامەکەدا ئاماژەیان پێکراوە، بۆیە لێرەدا بە پێویستی نازانم، بەڵام ئەوانەی دیکە دەخەمە بەرچاوی خوێنەران:

١- دەبێ لە کۆبوونەوەدا، ئابووری، داهات و سەرف بە تەواوی روون بێت، چونکە من و کاك مستەفا دوزگین نازانین سەرچاوەی ئەو پارەیە لە کام لایەوە دابین دەکرێ.

٢- دەنگوباسی شەڕی چەکداری لە کوردستان و دەنگوباسی کوردستان لە هەموو ژمارەکان بڵاو بکرێتەوە، کە بە داخەوە تا ئێستا لە رۆژنامەدا هیچ بڵاو نەکراوەتەوە.

٣- نابێ لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەکەدا هێرش بکرێتە سەر ئەو هێزانەی لە کوردستان خەبات دەکەن و توانجیان لێ بگیرێت.

٤- لاپەڕەی - بیری سەربەست - لە رۆژنامەکە بڵاو بکرێتەوە.

٥- لە هەرسێ ژمارەی رابردوو باسی کوردی سووریا نەکراوە.

**لە کۆتایی نامەکەدا هاتووە:**

برایانی خۆشەویست، ئەگەر لەسەر ئەو پرۆگرامە رێککەوتین، بێگومان گیروگرفت کەم دەبێ، بەڵام ئەگەر نا، من داوای لێبوردن دەکەم لە بەشداری کردن لە دەستەی نووسەران. هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم.

لە خزمەتی کوردستان و گەلە بەشخوراوەکەی.

براتان

بروسك

١٩٨٦/٦/٤

ستۆکهۆڵم

لێرەدا چیتر بە پێویستی نازانم لەسەر رۆژنامەی "سەردەمی نوێ" بدوێم، ئەگەر یەکێك مەبەستی بێت، بگەڕێتەوە سەر وتارێکم لە گۆڤاری "رۆژنامەڤانی" ژمارە ١١-١٢، ساڵی٢٠٠٣، لاپەڕەکانی ٤٣٣-٤٤٩-٤٩٩.

* * *

## - شوباتی ١٩٨٦ تیرۆرکردنی سەرۆك وەزیرانی سوێد ئۆلف پاڵمە

من لە ساڵی١٩٨٣ کە هاتمە سوێد، ئۆلف پاڵمە لە ئۆپۆزسیۆن بوو، رۆژێکیان لەگەڵ کاك فەرهاد شاکەلی لە گاملەستان(ستۆکهۆڵمی کۆن) لە قاوەخانەدا رۆنیشتبووین. کاك فەرهاد سەرنجی راکێشام بۆ مرۆڤێك کە دوو جانتای لەدەست بوو، پاڵتۆیەکی لەسەر شان بوو، گوتی: ئەوە ئۆلف پاڵمەیە، سەرۆك وەزیرانی پێشووی سوێد، سۆسیال - دیموکراتە، ماڵی خۆی دەگوێزێتەوە. لە هەڵبژاردنی داهاتوودا، ئۆلف پاڵمە سەرکەوت و بووە سەرۆك وەزیرانی سوێد. ئۆلف پاڵمە هەڵوێستی بەرانبەر بە مەسەلەی کورد زۆر دۆستانە بوو. هەروەها هەڵوێستی لە پشتگیریی خەباتی رزگاریخوازی گەلانی ئەمریکای لاتین و ئاسیا و ئەفریقیا روون و ئاشکرا بوو. دەگێرنەوە کە پاڵمە خۆی







STOCKHOLMS
STADSBIBLIOTEK



Jamshid al-Haydari ( 430502-4533) arbetar sedan 14 januari 1985
på biblioteket i Rinkeby. Till hans arbetsuppgifter hör:

- arbete i låneexpeditionen ( utlån, återlämning)
- posthantering
- bokuppsättning ( ca. 50 språk finns representerade på biblioteket)
- viss maskinskrivning
- genomgång och rådgivning av arabiskt, kurdiskt, turkiskt, nyiranskt och ryskt bokbestånd och även informationsmateria l
- muntligt informationsarbete med olika språkgrupper (se ovanstående språk)
- distribution av bokdepositioner ute i området

Dessa arbetsuppgifter motsvarar ungefär de arbetsuppgifter som en bibliotekskontorist har.

Pirkko Wergenius
filialchef

850129 Rinkeby

سەرکردایەتیی خۆپیشاندانی دژی "پینۆچێت - ژەنراڵی شیلی و CIA دەزگاری هەواڵگریی ئەمەریکا کە لەساڵی ١٩٧٣، ئەمریکا لە ڕێگەی کودەتای ژەنراڵ پینۆچێ لە شیلی کە بووە هۆی کوشتنی سەرۆکی ئەو وڵاتە سیلڤادۆر ئەلێندی و کوژرانی هەزاران هاوڵاتیی شیلی کروە، کە بەدەستی کۆدەتاچییەکان، گۆرانیبێژی بەناوبانگی شیلی فیکتۆر گارا شەهید کرا و هەروەها سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی شیلی لویس کارڤالان و شاعیری گەورەی شیلی پاپلۆ نێرۆدا دەستگیر کران.

لە ١٩٨٦/٢/٢٩ دەبوایە کۆنفرانسی سەر لە نوێ دامەزراندنی فیدراسیۆنی کۆمەڵە کوردستانییەکان بە شێوەیەکی تازە و لەسەر بنەمای جێنشینیی کوردەکان لە شارەوانییەکانی دابمەزرێتەوە بەیانیی ڕۆژی ٢/٢٩ هاتمە قوتابخانەو دەستگای "ئا.بی.ف ABF" کە دەبوایە کۆنفرانسی تێدا ساز بکرێ. هاتم چەند برادەرێک هاتبوون و ڕایانگەیاند کە کۆنفرانس دواخرا لەبەر ئەوەی شەوی ڕابردوو سەرۆک وەزیرانی سوێد ئۆلف پالمە شەهید کراوە.

هەرچەندە لە سەرەوەدا باسی هەندێ ڕووداوی ساڵی ١٩٨٦م کردووە، بەڵام بە پێویستم زانی هەندێ ڕووداوی دیکە کە لە ساڵی ١٩٨٥ ڕوویان داوە و هەندێ لە چالاکییەکانم لە بواری نووسین و کۆڕگێڕان لە دەفتەرێکی کۆن نووسیبوو، کەوتە بەردەستم. پێویستە ئاماژەیان پێبکەم. لەوانە چەند کۆڕ و سیمینارێك کە لەو ساڵەدال گێراومن. لە سوێد لە ١٩٨٥/١٢/١٥ کوڕێکم گێرا لە چلەی کۆچی دوایی قەناتی کوردۆ(١٩٠٩-١٩٨٥). کۆڕەکە لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی قەنات بوو، لەگەڵ پێشانگەی کتێبە چاپکراوەکانی. هەروەها لە ١٩٨٦/٢/٢ لە یادی چل ساڵەی کۆماری کوردستان کۆڕێکم لەگەڵ کاك محەمەدی موهتەدی و دکتۆر کەمال عەلی گێرا. هەروەها لە ١٩٨٦/٥/٢١ لە ساڵڕۆژی دووەمی شاعیری گەورەی گەلەکەمان هێمن، کۆڕێکم لەسەر ژیان و نووسینەکانی گێرا، بە پشت بەستن بە پێشکەیی دکتۆر ئاوڕەحمانی قاسملوو و پێشەکیی خودی هێمنی شاعیر بۆ "تاریك و ڕوون" و کتێبێکی کاك کەریم حیسامی لەسەر هێمن و

گۆڤاری "نیشتمان" – ژ.ك...

دوای کۆچی دوایی مامۆستا سەجادی، لە شاری یۆتۆبۆری کۆڕێکم لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی مامۆستا سەجادی گێڕا و لەگەڵ نموونەی هەندێ لە نووسینەکانی و گوڵبژێرێك لە "رشتەی مرواری" کە هەواڵی کۆچی کامەران موکری لە ۱۹۸٦/۱۲/۷م پێگەیشت، وتارێکم لە رۆژنامەی "سەردەمی نوێ" و کۆڕێکم لە ستۆکهۆڵم گێڕا و لە پێشەکیی کۆڕەکەدا وتم: "لە ۱۹۸٦/۱۲/۷ هەواڵێکی دڵتەزێن لە هەموو کوردستانی خوێناوی و دەرەوەی وڵاتیش دەنگی دایەوە. هەواڵی وەستانی دڵە گەورەکەی شاعیری نیشتمانپەروەر و تێکۆشەر کامەران موکری بوو." هەروەها نووسیومە: "لە تەك ئەو کارەساتانەی داگیرکەران بەسەر کورد دەهێنن، سروشتیش لە پەلاماردانمان نەکەوتووە. ناوە ناوە پەنجەی مەردن لە گیانی رۆڵەیەکی لێهاتوو و زانایەکی بێهاوتا و شاعیرێکی ناودار و هونەرمەندێکی گەورە گیر دەکات لە ساڵی۱۹۸۳ وەپەنجەی مردن ئەستێرەی ئەو رۆڵە لێهاتووانەی کوژاندۆتەوە، مامۆستایان: تۆفیق وەهبی، یەلمانز گونای، جگەرخوێن، عەلائەدین سەجادی، قەناتی کوردۆ و هێمن و قزڵجی، ئەمڕۆش کامەران موکری.

لە ساڵی۱۹۸٦ لە تەك کۆڕ و سیمینارەکاندا، چەندان وتارم لە یادی کەڵە پیاوانی کورد لە رۆژنامەی "سەردمی نوێ" و گۆڤاری "بەربانگ"دا بڵاو کردۆتەوە، لە یادی ۳۰ساڵەی شێخ مەحموودی نەمر، قازی، گیوی موکریانی و گۆرانی شاعیر، شێخ مارف بەرزنجی و... هتد.

– لە ساڵی۱۹۷۷ەوە من کەسم لە خزم و کەسەکان چاو پێنەکەوتبوو، چونکە هەموویان لە کوردستان و عێراق بوون. لە دوای هەڵگیرسانی شەڕێ نێوان عێراق و ئێران ۱۹۸۰، برازایەکەم لە شەڕدا بە دیل گیرا – سەردار – کە تا ساڵی ۱۹۹۰ ئازاد کرا، لە ساڵی۱۹۸۵ لە تارانەوە نامەیەکم پێگەیشت کە کوڕە بچووکەکەی ساڵحی برام – کاوە – لە تارانەوە بەرەو هەندەران دێ. نامە گۆڕینەوەمان هەبوو تا گەیشتە دانمارك. لە رۆژی ۱۹۸۵/۱۰/۱۰ بە شەمەندەفەر رووم کردە کۆپنهاگن – پایتەختی دانمارك. کە گەیشتمە کۆپنهاگن، لە وێستگەی شەمەندەفەر لەگەڵ کاوە پێكگەیشتین. کاوە ئاگاداری کردم کە تەنیا چەند سەعاتێك بۆمان هەیە پێکەوە بین، چونکە ئەو ئەو رۆژە بۆ دوورگەیەك رەوانە دەکرێ. کاوە رۆژی ۱۹۸۵/۹/۲۹ گەیشبووە دانمارك. هەندێك دەنگوباسی دڵتەزێنی لەبارەی دیلکردنی سەرداری برازام پێراگەیاندم کە لە ئێران لە بەندیخانەیە.

– لە ۱۹۸٦/۳/۱۹ بە فەرمی ئیجازەی دەکردنی رۆژنامەی "سەردەمی نوێ" و تۆمار کردنم پێگەیشت. من و کاك کەریم هەوڵمان دا کە ژمارەیەك لەو نووسەرانەی لە سوێد دەژین، بەشداریمان بکەن و بانگهێشتی هەندێکمان کرد، بەڵام زۆربەیان ئامادەییان تێدا نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە رۆژی ۱۹۸٦/۱۰/۲۲ لە ماڵی مندا من و کاك کەریم و خەبات عارف و فەرهادی شێخ مارف بەرزنجی دانیشتنێکمان کرد بۆ ئەو مەبەستە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوان داوایان دەکرد کە رۆژنامەکە پابەندی هیچ رێبازێك نەبێ و هەر کەس بە ئارەزووی خۆی چ دەنووسێ و چۆن دەنووسێ تیدا بڵاو بکرێتەوە، ئێمەش لەو بڕوایەدا بووین پێویستە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی هەبێت، بۆیە بەشداریان لەگەڵمان نەکرد.

– ئەگەر لە ساڵانی خەباتی شاخ نووسەرانی کورد، ئەوانەی لەگەڵ شۆڕش بوون، یەکێتیی نووسەرانی کورد و یەکێتیی نووسەرانی کوردستانیان دامەزراندبوو، نووسەر و رۆژنامەنووس و هونەرمەندانی کورد و عەرەب لە دەرەوەی وڵاتدا، بە تایبەتی ئەوانەی





له سوريا دەژيان، ڕێكخراوێكيان به ناوى "رابگه الكتاب و الـصحفيين و الفنـانين الـديمقراطيين العـراقيين" دامەزراندو گۆڤارێكيان بەناوى "البديل" دەردەكرد. ئەو ڕێكخـراوه هەوڵيـدا نووسـەرو ڕۆژنامەنووسـانی دیموكراتی له هەندەرانیش بەشداریی تێدا بكەن، دیاره ژمارەیەك لەوانه بوونه ئەندامی ئەو ڕێكخراوه، منیش یەكێك بووم لەوانه.

ئـەو ڕێكخراوەیـه لـه نیـسانی سـاڵی١٩٨٦ هەفتـەی "الپقافه التقدميه العراقيه"(رۆشنبیری پێشكەوتنخوازی عێراق)یان له دیمەشق(شام) ڕێكخست كه هیچ باس له كەلتوور و ئەدەبیاتی كوردی نەكرابوو، بۆیه منیش وەك ئەنـدامی ئـەو ڕێكخـراوه لـه ١٩٨٦/٧/٢١ نامەیـەكم بـه زمـانی عـەرەبی ئاراستەی ئـەو ڕێكخـراوه كـرد. لێرەدا دەقی نامەكه به زمانی عەرەبی بڵاو دەكەمەوه:

"رسالة مفتوحـة الـي رابطـة الكتـاب و الـصحفيين و الفنانين الديمقراطيين العراقيين

تحية و بعد

إن الأنظمـة المتـسلطة علـي رقـاب الـشعب الكـردي في البلدان التي تقتسم كردستان، تخنق كل صوت حر في بلادنا و تحارب الثقافة الكردية و تشوة تاريخ الكرد و كردستان. إن المثقفين الكرد في كردستان العراق كانوا في طليعة المناضلين من أجل حرية العراق و كرامة شعبة، كانوا و لايزالوا موضع إعتزاز الشعب الكردي و العربي في العراق.

و كان الأدب الكردي طيلة العهود الماضية و لازال مرآتا لنضالات الشعب الكردي من أجل الحرية و الديمقراطية. إن الادباء الكرد رغم الاضطهاد و القمع، رغم الاغراءات لم يتحولـوا الـي أبـواق الانظمـة الفاشـية. إن العناصـر الكرديـة مـن الادبـاء الـذين يخـدمون النظـام و يغنـون بأمجاد الحكام الفاشيين لايتجاوز أصابع اليد، بل كان الادباء الكرد دعاة الاخوة و الصداقة بين الشعب الكردي و الشعوب المجاورة. و قد إنعكست في نتاجات شعرائ الكبار من أمثال: طوران، جطرخوين، هەژار، كامران، ديلان و بيكەس، تلك الأخوة و الصداقة.

لقد غنى شعراءنا للجزائر المناضلة و فلسطين الحرية و ظيتنـام البطلـة، مجـدوا نـضال الـشعوب الـسوظيتية ضد الفاشية و بطولات أمريكا اللاتينية ضد اليانكي. إن التقاليد الطيبة و الصداقة العريقة هذة إنعكست اشعار عدد من الشعراء العراقيين من أمثال الشاعر العربي الكبير محمد مهدي الجواهري و الشاعر الكبير سعدي يوسف و...

و الآن عنـدما يخـيم الليـل الفاشـي علـي كردسـتان العراق، و عندما يحتضن كردستان المناضلين الكرد العرب ضد الفاشية و الإرهاب، عندما يضطر المثقفون تـرك الـوطن أو إلتحـاق بالأنـصار و البيـشمەرگة و يـشكلون منظمـاتهم الادبيـة و الفنيـة داخـل الاراضي المحررة في كردستان أو خارج الوطن و يساهمون فعلا في النشاطات الثقافية، رافعين راية الثقافة التقدمية، نجد في هـذة الظـروف بالـذات و خلافـا للتقاليـد العريقـة يُستبعد ممثلي الثقافة الكردية من ما أطلق علية اسبوع "الثقافـة التقدميـة العراقيـة" الـذي جـري في نيسان الماضي في دمشق.

عندما قرات لأول مرة أخبار هذا الاسبوع علي صفحات مجلة "الحرية" المناضلة تصورت أن الصحفي الذي نشر الخبر، قد أهمل الاشارة الي الثقافة الكردية، رغم قناعتي بان محرري "الحرية" و المجلة نفسها تعتبر من المنابر المدافعة عن حقوق الشعب الكردي، الا أن الانباء التي نشرتها فيمـا بعـد جريـدة "الغـد الـديمقراطي" و "رسالة العراق" اكدت غياب الثقافة الكردية في الرابطة و التسمية في ذلك "الاسبوع".

إن اهمال دعوة ممثلى الثقافة الكردية لمشاركة في هذا الاسبوع، حيث يتواجد عشرات من الشعراء والكتاب والفنانين الكرد في الغربة وعدد منهم اعضاء في الرابطة،

يذكرني بالمزيد الشعرى الذي انعقد في السبعينات في ظل النظام الفاشي المتسلط على العراق "مع الفارق طبعاً" لقد خاب ظني في الرابطة والتسمية التي اعطيت لذلك الاسبوع.

ايها الزملاء

حرصا علي الثقافة التقدمية العراقية، التي لاوجود لها بدون الثقافة الكردية - طبعا كان بامكانكم تسمية "أسبوع الثقافة العربية في العراق" و لأجل ان لايتكرر من أمثال هذه الاخطاء في المستقبل، و من اجل ان تتحول الرابطة الي هيئة نشيطة في خدمة الثقافة التقدمية في العراق، ادعوكم الي استدراك ذلك.

تقبلوا فائق الاحترام.

عضو رابطة الكتاب و الصحفيين و الفنانين العراقيين.

د. بروسك (جمشيد الحيدري)

السويد - ستوكهولم"

من تا سالّى١٩٨٨ پەيوەنديم لەگەڵ ئەو ڕێكخراوە مابوو، لە ساڵى١٩٨٧ نامەيەكى ديكەم بۆ نووسيون و هەروەها لە ساڵى١٩٨٨ دوا نامەم بۆ نووسيون، بەلام لە گۆڤارى "البديل" بابەتێكم لەسەر "ڕۆشنبيريى كوردى لە تاراوگە" بە زمانى عەرەبى بلاو كردۆتەوە، هەروەها لە ١٩٨٩/٣/١٧ لە لەندەن بۆ لقى ئينگلترا و ئيرلەندە، كۆڕێكم گێڕاوە بە ناوى "الثقافة الكردية في المنفي". بۆ ئەوەى لە بەشەكانى ديكە جارێكى ديكە نەگەڕێمەوە سەر باسى ئەو ڕێكخراوە و هەڵوێستم دەربارەيان، بە پێويستى دەزانم لەو بەشەى بيرەوەرييەكانمدا هەردوو نامەكەى ديكەش بلاّ بكەمەوە كە يەكيان لە ١٩٨٧/١١/١٧ نووسراوە و ئەوى ديكەيان لە ١٩٨٨/٢/٢٤ نووسراوە.

لەبەر ئەوەى هەموو نامەكان بۆ ئەو ڕێكخراوە بە زمانى عەرەبى بوو، وەك خۆى بلاّويان دەكەمەوە.

## نامەی ١٩٨٧/١١/١٧:

"الزملاء الاعزاء في الهيئة الادارية لرابطة الكتاب و الصحفيين و الفنانين الديمقراطيين العراقيين

بعد إطلاعي علي رسالة السكرتارية الموجهة الي سائر اللجان و الفروع بعد عقد مؤتمرها الثاني و التوجهات البرنامجية العامة لعام ١٩٨٧-١٩٩١ التي جاءت مخيبة للآمال بشأن الثقافة الكردية و ذلك:

اولا: ان البرنامج و الأسماء الواردة في الهيئات المسؤولة لا صلة لهم بالثقافة الكردية أو الادباء الكرد، و سبق أن وجهت في العام الماضي رسالة مفتوحة الي الهيئة الادراية السابقة حول إهمالها لمسألة مشاركة الثقافة الكردية في اسبوع الثقافة التقدمية العراقية في دمشق، حيث ان الثقافة الكردية في العراق تعتبر رافدا من روافد الثقافة التقدمية العراقية.

و ان في برنامجكم المرسل في رسالة السكرتارية لا ذكر للثقافة الكردية أو ثقافة الاقليات القومية، بل ان السكرتارية استعملت جملة مطاطة "الثقافة الوطنية الديمقراطية"، بدون الاشارة الي الخصوصيات الموجودة في ساحة الثقافة العراقية.

ثانيا: كنت أعتقد سابقا بان الأخوة في الرابطة، ينظرون الي الثقافة التقدمية العراقية بشقيها، و لكن الأمور تجري علي عكس ذلك، أو انكم ترون في الثقافة العراقية جانبها العربي فقط؟ و اتمني ان اكون مخطئا في تقديري و لو ان نظرة سطحية الي التوجهات البرنامجية - باب النشاطات يزيل هذة الشكوك حيث ورد في فقرة أ-ه مايلي:

دراسة إمكان إصدار مداهيات تحمل صور: جواد سليم، ابو كاطع، ابوسعيد، الجواهري، السيباب، احمد السيد(يقصد ب(محمود احمد السيد).

ان هذة الفقرة أزال كل شكوكي إزاء مواقفكم من الثقافة الكردية و هل ياتُري لم يتذكر الهيئة الادراية الموقرة أسماء احد من عمالقة الادب الكردي في العراق أو ان

شعراءنا الفطاحل لايمثلون وجهة الثقافة التقدمية العراقية؟!

و انني كمثقف تقدمي كردي و احد الاوائل في الانتماء الي الرابطة، كنت اتتطلع ان تدرج الرابطة ضمن برامج نشاطاتها العامة إقامة إحتفال مهيب في الذكري ٢٥ لوفاة شاعر كردستان الكبير "عبدالله طوزان" و تكون علي رأس مهامها الثقافية بعد مؤتمرها الثاني و لكن للأسف أهمل هذا الموضوع كذلك.

د. جمشيد الحيدري

- نسخة الي الصحف و المجلات العربية و الكردية للنشر
- الاستاذ بلند الحيدي للاطلاع فقط"

دوای ئەم نامەیە لە کانوونی یەکەمی ١٩٨٧ ئەو ڕێکخراوە وەڵامی نامەکەی پێشوومی(١٩٨٧/١١/١٧) داوەتەوە، بەڵام من لە ١٩٨٨/٢/٢٤ وەڵامی ئەو نامەیەم داوەتەوە و لێرەدا دەقی وەڵامەکەم بڵاو دەکەمەوە:

"ستكهلم
١٩٨٨/٢/٢٤

الزملاء الاعزاء في سكرتارية الرابطة
تحية و بعد

تسلمت رسالتكم المؤرخة في كانون الأول ١٩٨٧، جوابا علي رسالتي المؤرخة ١٩٨٧/١١/١٧ حول برنامج عملكم لمدة ثلاث سنوات و الموزع من قبل السكرتارية. ملاحظاتي حول الاسماء المرشية لصنع الميداليات التذكارية و كذلك حول الثقافة الكردية. يسعدني جدا ان اكون مخطئا في تصوراتي حول موقف الرابطة من الثقافة الكردية و المبدعين الكرد. و لايسعي الا ان أسأل لماذا اهملت السكرتارية الاجابة علي رسالتي المفتوحة بعد ما يسمي (اسبوع الثقافة التقدمية العراقية) في دمشق.

اما بشأن التمثيل الكردي في الهيئات القيادية للرابطة و كذلك حول المندوبين المنتخبين لمؤتمر الرابطة الأخير
- فلي سؤال واحد:

هل جري اختيار المندوبين الي المؤتمر حسب الاصول الديمقراطية ضمن الفروع؟ إني اشك في ذلك.

اما بشأن تكوين فرع للرابطة في السويد، فليس هناك إمكانية في الوقت الحاضر، و شخصيا غير مسعتد للعمل ضمن الرابطة، لأنني حاليا منشغل مع الزملاء الكتاب و الفنانين الكرد من كافة اجزاء كردستان باقامة أو تكوين إتحاد الادباء الكردستانيين خارج الوطن. لذلك سلمت كافة الرسائل و الادبيات المرسلة(البديل ٥٠عددا) الي الزملاء في نادي ١٤تموز الديمقراطي العراقي و إنهم سوف يراسلونكم حول العدد١١ من مجلة و كذلك يحولون أثمان المجلة البديل. علما هذة هي المرة الاولي تصلنا البديل.

حول المساهمة في الكتابة الي مجلتكم، سبق و ان ارسلت قبل عدة سنوات مقالا مطولا حول الشعر الكردي المعارض، كتبناه مع الزميل أنور قادر محمد و كذلك بعثت لكم في شهر تموز الماضي تقريرا عن الثقافة الكردية في المنفي. عندما تجد هذة المقالات النور. سوف لن اتأخر بالكتابة اليكم. مع تمنياتي لكم بالنجاح لخدمة الثقافة التقدمية في بلاد الرافدين.

المخلص

د. جمشيد الحيدري"

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بەوە بکەم، کاتی خۆی لە مۆسکۆ لەگەڵ کاک ئەنوەر قادر دەربارەی شیعری بەرهەڵستکاری کورد بە زمانی عەرەبی خەریکی کارێک بووین. ئەو بەشەی کاک ئەنوەر ئامادەی کردبوو، لە گۆڤاری "افاق عربيه"دا بڵاوکرایەوە.

لە ساڵی ١٩٨٧ من درێژەم بەو کارە دەدا لەرۆژنامەی

"سەردەمی نوێ" لەگەڵ کاک کەریم و بە هاوکاریی کاک ناسر ئیبراهیمی و دۆستانی دیکە. لە کۆنگرەی حەوتی فیدراسیۆنی کۆمەڵە کوردستانییەکان وەک نوێنەری کۆمەڵەی سپونگە بەشداریم کرد کە کۆنگرە لە ١٤-١٥/٢/١٩٨٧ لە ستۆکهۆڵم بەسترا. لەو کۆنگرەیەدا بە ئەندامانی کۆمیتەی کارگێری فیدراسیۆن هەڵبژاردرام.

- لە نەورۆزی ١٩٨٧ لەسەر بانگهێشتی مەڵبەندی رۆشنبیریی کوردیی لەندەن، بەشداریم لە هەفتەی کەلتووری کرد و لەوێدا کۆڕێکم گێڕا. لە ١٩٨٧/٣/٢٨ ئامادەی کۆنگرەی کاردری رێکخراوێکی بەریتانی بوو، بۆ پشتگیری لە گەلانی عێراق کە ئەندامی پەرلەمانی بەریتانی تێیدا ئەندام بوون. لەو کۆنفرانسەدا کە لە سەعات ١١:٣٠ی رۆژی ١٩٨٧/٣/٢٨ دەستی پێکرد، لەوانەی قسەیان لە کۆنفرانسەکەدا کرد، دکتۆر کازم حەبیب و ئازاد بەرواری، لەسەر شەڕی ئێران و عێراق و سیاسەتی بەعس دژی گەلانی عێراق. لەو کۆنفرانسەدا ئاماری کوشتار و وێران کردنی گوندەکان و ٨هەزار بارزانی و ٧٤٨ قوتابخانە، هەروەها لەوێدا ئاماژە بەوە کرا کە ٥حزبی کوردی ئامادە کردنی کۆنگرەیەکی گشتیی کوردستانی بن، هەرچەندە بەرەی کوردستانی نییە، بەڵام هاوکاری لەنێوانیاندا هەیە.

- هەر لەو ماوەیەی لە لەندەن بووم، لە رۆژی ١٩٨٧/٣/٢٥ مەڵبەندی رۆشنبیریی کوردی کۆڕێکی بۆ دکتۆر فوئاد مەعسوم، نوێنەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی رێکخست.

ئەوەی شایانی باس بێت، بەر لەوەی کۆڕەکەی دکتۆر فوئاد مەعسوم دەست پێبکات، من لەگەڵ خوالێخۆشبوو کاک عومەر مستەفا(دەبابە) راوەستابووین. کاک عومەر دەعوەتی کردم کە بچمە ماڵەوەیان و خوکە سورەیای خێزانی(کچی مەلای گەورە) دۆڵمەکمان بۆ بکات، ئەوەی شایانی باس بێت، لە کۆڕەکەی من خوشکە سورەیا ئیدارەی دەکرد، کاک عومەر ژمارەی تەلەفۆنەکەی دەدامێ، گوتی بەڵام پێمەکەنە. سەیرم هات، مەزانە ژمارەکەی چوار(شەشی) تێدا بووە. پاشان موسەجیلەم لەگەڵ خۆم هێنابوو، کاک عومەر بە دکتۆر فوئادی گوت: کاک جەمشید تۆماری دەکات. منیش لە ریزی پێشەوە، بەرانبەر دکتۆر فوئاد رۆنیشتم و موسەجیلەکەم لەسەر مێزەکەی دکتۆر فوئاد دانا. گوتی بۆ، گوتم بەیانی ئەگەر قسەکەم نووسی و گوتم دکتۆر فوئاد وایگوتووە، دنگت تۆمار کرابێت. دوای ئەو دکتۆر فوئاد کۆڕەکەی تەواو کرد، بووە گفتوگۆ. لەنێو ئامادەبووان، سەردار عەربەتی(سەردار سوور) و مەلا(کۆنە قیادەی مەرکەزیی حزبی شیوعی بوو)، قسەی توندیان کرد، بەتایبەتی سەردار بورجوازی کوردی بە خیانەت لە قەڵەم دا. دکتۆر فوئاد لە وەڵامدا گوتی: "وەرە لەوێ بەمجۆرە قسە بکە." لێرەدا بە پێویستی نازانم بچمە نێو وردەکاری، چونکە کاسێتی کۆڕەکەم لەبەردەستدا نییە، بەڵام لە ساڵی١٩٩٣ لە ٩٠ساڵەی بارزانی لە پیرمام ئامادە بووم، لە پشوودا دکتۆر رۆژ نوری شاوێس گوتی، کاک جەمشید دایکم دەیەوێ قسەت لەگەڵدا بکات.(دایکی رۆژ - ناهیدەی شێخ سەلام) منیش چوومە لای. گوتی لە لەندەن کاسێتی کۆڕی دکتۆر فوئاد مەعسوم-ت هەیە؟ گوتم بۆ؟ گوتی سەردار باسی بۆ کردووم.(دەرچوو سەرداره سوور خزمایەتیی لەگەڵ ناهیدەی شێخ سەلام هەیە) باسی ئەو کۆڕەی کرد، باسی گفتوگۆی نێو کۆڕەکە و وەڵامی توندی دکتۆر فوئادیشی کرد. گوتم کاسێتەکەم هەیە، بەڵام لە کوردستان نییە، لە سوێدە.

- لە ساڵی١٩٨٧، لە سەردانەکەم بۆ لەندەن، شەوێك لەلای بنئامۆزا و شاعیری ناوداری عێراق بلند حەیدەری مامەوە. باسی زۆر شتمان کرد، رابردوو، خزم و کەس، ئەدەب. داوام لە بلّند کرد هەندێ زانیاریم لەسەر دکتۆر قوتەبیە شێخ نوری بداتێ، چونکە دکتۆر قوتەبیە، جگە لەوەی پزیشکێکی بەناوبانگ بوو، هونەرمەندی



شێوەکاریش بوو. دەمزانی ژمارەیەك تابلۆی جوانی لە زیندانی "نوگرە سەلمان" کێشاوە، لە دوای ١٩٦٣ کە کودەتاچییەکانی بەعس دەستگیریان کردبوو. بلند گوتی: بۆ لەسەر من؟ گوتم: ئەو هونەرمەندە، هونەری شێوەکاری زمانێکی جیهانییە، من وەك هونەرمەندێکی کورد تەماشای دەکەم، بەڵام تۆ شاعیری، شێعرەکانت بە زمانی عەرەبییە و ئەدەبەکەی تۆ ناچێتە نێو مێژووی ئەدەبی کوردی، لە شێعرەکاندا باسی کوردی تێدا نییە. بەوە زۆر قەڵس بوو. گوتی: من کوردم، ئێمە ئامۆزاینە. گوتم راستە تۆ کوردی، بەڵام نەمدیوە باسی ئەوە بکەی لە نووسینەکاندا کە کوردی. گوتی باشە. دوای ساڵێك کارەساتی هەڵەبجە رووی دا. بلند و رۆژنامەنووس هەیفا و زەنگەنە کە هەردووکیان لە گۆڤاری "المجلة"ی سعودی لە لەندەن کاریان دەکرد، لەساڵیادی هەڵەبجەدا، بە دووان، ژمارەیەك گۆڤارێك بە ناوی "هەڵەبجە" کە بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی بڵاو کردەوە کە ژمارەیەکی زۆر لە شاعیر و نووسەرانی عەرەب زمان(چونکە هەندێك لەوانە کورد بوون، بەڵام بە زمانی عەرەبییان دەنووسی) بڵاو کردەوە. هەر چەندە بلند بە ناوی خۆی هیچی بڵاو نەکردەوە، بەڵام شێعرێکی خۆی تێدا بە ناوی خواستراو بڵاو کردەوە. پاشان ژمارەیەك گۆڤاری "نیوزویك"ی بە زمانی ئینگلیزی بۆ رەوانە کردم کە تێیدا چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بلند کرابوو. لەوێدا ئاماژە بەوە دەکات ئەو کوردە و خەڵکی کوردستانە. بێگومان کارەساتی هەڵەبجە زۆر کاری لە هەڵوێستی بلند کرد، وەرچەرخانێك بوو لە بۆچوونەکانی، لە دوای راپەرینی١٩٩١ زۆر بە پەرۆش بووسەردانی کوردستان بکات، نیازی هەبوو لەگەڵ شاعیران "ئەدۆنیس، قەبانی، بەیاتی" پێکەوە بێنە کوردستان، بەڵام شەڕی ناوەخۆ و نەخۆشی ئەو دەرفەتەی نەدا تا لە ١٩٩٦/٨/٦ کۆچی دوایی کرد.

لە ئاداری ١٩٨٧ کە لە لەندەن بووم، شەوێك لە ماڵی دکتۆر کەمال میرئاودەلی مامەوە. دکتۆر کەمال ئەو کات خێزانێکی نیوە ئینگلیز و نیوە سوودانیی هەبوو، کچەکی زۆر باش بوو. دایکی ئینگلیز بوو، باوکی سوودانی. رۆژی دوایی مامۆستا محەمەد رەسوول هاوار لە چێشتخانەیەك دەعوەتی کردین. من، دکتۆر کەمال، مامۆستا برایم ئەحمەد و هاوار. لەنێو هەموومان مامۆستا برایم داوای ماسیی کرد. مامۆستا هاوار تەعلیقی لێدا، گوتی دەزانی بۆ ماسیی داوا کرد؟ گوتم نەخێر، گوتی مامۆستا برایم لە ماڵەوە ماسی ناخوا. پاشان من و مامۆستا برایم کەوتینە قسە و من پرسیاری ئەوەم لێکرد کە لە هەندێ نووسینی خەڵکانی دیکە تۆ بە پیاوی ئینگلیز دەدەنە قەڵەم، بۆ؟ گوتی برام، کاتی خۆی کە لەگەڵ مەلا مستەفا تێکچووین، مامۆستا تۆفیق وەهبی گوتی، برایم، با نامەیەك بۆ مەلا مستەفا بنووسم ئاشتان بکەمەوە، بەڵام من رازی نەبووم، لە دوای بەیانی ئادار کە گەڕامەوە، مەلا مستەفا پرسیی: برایم ئینگلیز کۆنە؟ لەوەدا زانیم کە مامۆستا تۆفیق وەهبی نامەی بۆ نووسیوە، بەڵام برام هەندێ جار دەیانگوت برایم لە گیرفانەکی روبڵ (رووسی) هەیە و لە گیرفانی تر دۆلار. گوتم باشە مامۆستا بیرەوەرییەکانی خۆت بنووسەوە، ئەوانە روون بکەوە. هاوار هاتە دەنگ و گوتی: مامۆستا برایم ترسنۆکە، نانووسێ. منیش گوتم، مامۆستا ئەگەر نەنووسێ، مێژوونووسان ئەوەی دەربارەی نووسراوە ئەوە تۆمار دەکەن، پێم وایە زۆرێك لە ئێوە سیاسیە کوردەکان دەتانەوێ ئەوەی لاتانە بیبنە ژێر گڵەوە. ئەمن زۆر جار ئەوەم بە مامۆستا هەمزە عەبدوڵلاش گوتووە. بە داخەوە نە بیرەوەریی مامۆستا هەمزە، نە بیرەوەریی مامۆستا برایم ئەگەر نووسرابیش، رووناکیان نەدیوە.

***هەندێ لە رووداوەکانی ساڵی١٩٨٧ دەخەمە بەشی هەشتەم کە تا ساڵی١٩٩٣ بەخۆوە دەگرێ.***

### بیرەوەریی ...

# ڕێپێوانی لاوانی ڕواندز بۆ سلێمانی بۆ پشتگیری کردنی مانگرتوان لەساڵی ١٩٩١



**ئومێد شێرکۆ شاکر مەجروم**

پەرتوکخانەی پەیوەند لەرواندز لەوکاتەی لەساڵی ١٩٨٧ دانراوە، بۆتە شوێنی کۆبونەوەی لاوانی ڕوشنبیرو خوێندەوار، بۆوەدەدەست هێنای گۆڤارو ڕۆژنامەو پەرتوك، هەروەها گفتوگۆی ئەدەبی ورەوشنبیری، ئەمە دوای ڕاپەرین بەردەوام بوو، تا داخستنی لەساڵی ١٩٩٥ بەهۆی شەری ناوخۆ، هەمووئەولاو ورەشنبیرانەی ئەوكات ماون شایەتن بۆ ئەم دەورەی پەرتوكخانەی پەیوەند، من ئەم پێشەكیەی بۆیە دەنووسم تاخوینەر بزانێت، ڕۆژەكانی مانگرتنی لاوانی سۆران وهەولێر وسلیمانی، یەكێك بووە لە گەرمترین باس وخواسی نێو پەرتوكخانە، بۆیە لەرۆژی ١٩٩١/١٢/٨ لەپەرتوكخانەی پەیوەند كۆمەڵی لاویی دڵسۆز كوبوونەوە وبریاریان دا بۆپشتیوانی (مانگرتوانی بەردەم بارەگای نەتەوەیكگرتوەكان "un"لەسلیمانی وهەولێرو سۆران كەماوەی چەندرۆژ بوو مانیان لەخواردن گرتبوو) بەپێ بچن بۆسەردانیان ئەوەبوو ئامادەكاری بۆكرا چەندلافیتەیێك نوسرا بەزمانی كوردی وعەرەبی و ئینگلیزیكەئەمە بوو "بۆپشگیریی كردن لە مانگرتوانی سلیمانی ئەم ڕێپێوانە لەشارەكەمان رواندز بەرەو سلیمانی لەرێگای هەولێر ئەنجام دەدەین "، هەروەها چەندپێداویستی فریاكەوتنی سەرەتایی لەنەخۆشخانەی رواندز لەلایەن دكتۆر تەهاوەستا مستەفا هێنرا، ئنجادەست بەناونوسین كرا بۆكاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆ ژمارەی خۆبەخشان گەیشتە نزیكەی سی كەسێك، بریاردرا كاتژمێر دووی پاش نیورانە لەبەردەم پەرتووكخانەی پەیوەند ئامادەبن، هەرچەندە كەشوهەوا گۆرا و بووبەباران بەلام بریارەكە هەڵنەوەشایەوە، لەكاتی دیاریكراو بەرێكەوتین سەرتا بەرەو سۆران، بەبەرزكردنەوەی لافیتەكان و ووتنەوەی دروشمی "نەما باوی دكتاتۆریەت و بمری عەلی كیمیاوی، ئەگەر ئێوە یوئێن مافی كوردان بسێنن". لەنێو بازاڕی رواندز چووینە خوارچەند باران دەبارێت حەماسی كوردایەتی گەرمتردەبێت، بەپێچەكانی كاولوك رۆیشتین ئنجا بەرەو سۆران بەرێكەوتین بەتەنیشت قەلای پاشای گەورە "ئەسقەرا"سەركەوتین، گەیشتینە راستی ماڵەكانی ئۆردوگای گەلاڵە خەڵك لەگەڵ دەنگی دروشمەكانی ئێمەلەماڵ دەهاتەدەرەوە، بەچەپڵەو هەلهەلەی ژنان پێشوازی دەكریان، بەنێو بازاری سۆران رۆیشتین تاگەیشتینە ئەو شوێنەی كە كۆمەڵێك گەنج مانیانیان



گرتبــوو لــەخواردن لەبــەردەم بارەگــای un چــووین بۆســەردانیان و ماوەیــەك لــەلایان ماینــەوە، سـلاوی رواندزمان پێگەیانـدن وپـشتیوانی خۆمـان بۆدووبـارە کردنەوە، ئنجا لەویی بەرێکەوتین هـەر بەپێان چووین بۆنێو گەلی عەلی بەگ باران بەردەوامـە لـەکانی مـاران هەندێك گەرانەوە، چوونکە توانـای روویـشتنیان نـەما ئێمـە زۆریمـان لـە کـەس نـەدەکرد چـونکە شـتەکە ئارەزومەندانـــە بـــوو، بەرێکـــەوتین بـــەروە خەلیفان، تا دەهات دونیا تاریـك دادەهــات و شــەو بــاڵی خــۆی بەســەرمان دەهێنـا لـە خـەلیفان شـەو داهات و تاریك بوو ئێمەش مانـــدوو و شـــەکەتین هـــەروەها برســـین بۆیـــە بەســـەر بارەگاکـــانی لایەنـــەکانی بـــەرەی کوردســـتانی دابەشـبوون هەرچەندکەسـێك چـووین بۆبارەگایەك لە بارەگاکانی حزبـــەکانی بـــەرەی کوردســـــتانی، دوای نـــانخواردن وحەســـانەوە بـەدەم گفتوگــۆی سیاســی وقـسەی خــۆش خــەومان لێکـەوت بـەیانی زوو لـە خەوهەڵـسایین دوای بەرچـایی کــردن بەرێکــەوتین بــەرەو هــەریر بــەدۆڵی نیــشاوی سەرکەوتین بۆ سپیلك لە خەلیفان باران وەستابوو بەلام کەلەخەلیفان دەرکەوتین دووبارە باران دەستی بەبارین کردەوە، ئێمە لەپێچەکانی سپیلك دەچووینە خوار باران هــەردەباری ، زۆرمانـدووبووین تــاوای لێهـات توانـای



رۆیشتنمان نەما، ووتمان چیبکەین هەندێك دەیانو بابــەردەوام بــین بــەلام هەنـدێکی دیکــە دەیــان وو باتاهــەریر بــەئۆتۆمۆبیل بـرۆین، لـەکۆتایی بەناچـا بریاردرا کەبەئۆتۆمۆبیل برۆین، دەستمان لە بەرازیـ راگـرت ووتمـان ئـەوەی زۆرمانـدوە باسـواربێت لەگـ ئۆتۆمــۆبیلی دیکــەهات رایـدەگرین بۆئـەوانی دیکـ ئـــەوەبوو مـــن لەگـ بەرازیلیەکە رۆیـشتە کـ شوفیرەکە سورچی بوو دوای ســـــــلاوکردن وبەخێرهێنان، پرسیاری کــرد ووتــی ئەوەچـی دەکەن بەوبارانە بۆکوێ دەچـــن دوای ئـــەوەی هەڵوێـــستی خۆمـ روونکـــردەوە، وتـ کـارێکی پـیرۆزە بـەلا دەتـــوانن ماوەیـــەماوە بـــەئۆتۆمۆبیل بـــرو خۆئـەم رۆیـشتنەی ئێوە شـتێکی رەمزیــە و بـ پــشتگیری مانگرتوانـە ئاخرئـــــــــاوابروو دوادەکـــەون و زۆریــش مانــدوودەبن، لــەنێوا شـارەکان بە ئۆتۆمۆبیل برۆن، لەناو شار بەپێی، بۆیـ ئێمەش بریاماندا تاشەقلاوە رانەوەستین چوونکە بارا تادەهــات بــەخورتر دەبـاری، پـاش ئـەوەی هــەموومان گەیـشتینەوە یـەك لـە هــەریر بەرێکـەوتین بـۆ شـەقلاوە بەرلەوەی بگەین بەشەقلاوە لەمیراوە دابەزین و بەپێیان بەرێکەوتین بۆنێو شەقلاوە، کـاتی گەیـشتینە شەقلاوە بـانگی نیورانـەی دابـوو ئێمـە بەبەرزکردنـەوەی لافیتـە



بڕیاردرا تا هەولێر بە ئۆتۆمۆبیل بڕۆین، دووبارە بەسەر ئۆتۆمۆبیل دابەش بووین بەرێکەوتین بۆ هەولێر کاتی گەیشتینە هەولێر بووبەشەو بۆیەدابەشبووین بۆخەو، چوینەلای قوتابیانی زانکۆکەخەڵکی رواندز بوون، لە ئوتێلەکانی نزیک گەراجی شەقڵاوە شوینیان بۆگیرابوو لەلایەن زانکۆوە، هەرئەم شەوە بۆیەکەم جار چاومان شادبوو بە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان کەماوەیەك بوو کەوتبوە کاروداهێنراوێکی گەورەبوو بۆئەوکات.بۆرۆژی پاشتر ١٠ی مانگ دوای لەخەوهەڵسان و بەرچایی کردن هەرلەلای قوتابیەکان، کۆبوینەوەتا بەرەو عەنکاوە بەرێبکەوین بەرێگای سیی مەتری تەیراوە ئنجا فلکەی فەرنسۆمیتران لەوێش بەرەو بارەگای یوئێن، ئێمە لەگەڵ ئاپورای خەڵکی هەولێر تێکەڵبووین کەئەورۆژە خەڵك هەمووی بەگەورەو بچووك بەژن وپیاوەوە لەوێبوو بێ جیاوازی، ئێمە جێگای رێزو ستایشی خەڵك بووین، کەئاماژەیان دەکرد ئەمانەش لەرواندز هاتوون. بۆیە کەگەیشتینە لای مانگرتوان لەبڵندگۆی لیژنەی پشتوانی مانگرتوان بەخێرهاتنی ئێمە کرا وهەزارجار"مام هەژار"لەبڵندگۆیەکە ووتی بەخێربێن لاوانی شاری پاشای گەورەو وەستا رەجەب، هەروەها سڵاوی رواندزیەکانیان گەیاندەمانگرتوان دەیووت ئەوە لاوانی رواندز هاتون بۆپشتوانی لە هەڵوێستی جوامێرانەی ئێوە بەراستی رۆژانێکی پربەحەماسەت بوو خۆزگە ئەوحەماسەتەیان خامۆش

ووتنەوەی دروشمی نشتیمانی و ووتنی سروود بەنێو بازاری شەقڵاوە سەرکەوتین بەرەو سەرمەیدان، هەرخەڵك بوو لەنێودووکان وماڵەکان دەهاتنە دەرەوە بە چەپڵەو هەلهەلە پێشوازیان لێدەکردین، کاتی گەیشتینەئەو پێچەی کە ئاشی لێ بوو نزیك پەیکەری کاویس ئاغا چەند ژن وکچێك لەماڵ هاتنە دەرەوەلەسەربانی خانووەکانیان بەچەپڵە وهەلهەلە چووکلات بارانیان کردین، هەروەها چەندژنێك بەدەم گریانەوە دوعایان بۆدەکرین هەزارجار دەیان ووت بەقوربانتان بین لەرواندزەوەهاتوون ئێمە هەرچەندە باران هەموولەشمانی تەرکردبوو بەڵام ئەم پێشوازیە هەموماندوبوونەکەی لەبیربردینەوە، باران هەردەبارێت ئێمە تەربوون وماندوبوونمان لەیادچووبوو بەهۆی ئەم پێشوازیکردنە بۆیە تا کۆری بەپێیان چووین، لە کۆری هەندێك پشوومان داو شتێکمان خوارد ئنجا بەرێکەوتین تا پێچەکانی مەسیف وچانێکمان دا، راوێژمان کرد لەگەڵ یەکتر ووتمان ئەگەر بەردەوام بین لەرۆیشتن شەومان بەسەرداتێت ئەی چی بکەین لەکۆتایی

نــەدەکر تــا هەمیــشە لاوان ئاوابۆنــشتیمان بەخــەم بــان. مــانگرتوانیش بەدوپاتکردنــەوەی بــەردەوامبوون تاجێبــەجێکردنی داواکاریــەکانیان بــەردەوامبن یــان ئەوەتــە دەبــی لێــرە گیانیــان فیــدای کوردســتان بکــەن، سوپاسی ئەم لاوانەی رواندزیان کردوو وتیان پشتگیری کردنی ئێوە وهاتنتان لەرواندزەوە بۆئێرە هانماندەدات کەبەردەوام بین لەم هەڵوێستەمان تاسەرکەوتن یا مردن ، ئنجــا دوای هەواڵپرســینی یەکەیەکــەی مــانگرتوان و ســوپاس کردنیــان بۆنــەم هەڵوێــستە جوامێرانــەیان خواحافیزیمــان لێکــردن.و ئــەوێمان بەجیهێــشت بــۆ خــەڵکی دیکــە کــەهاتبوون بۆپــشتگیری کردنیــان، ئنجا بریــاردرا بــەرەو ســولەیمانی بــرۆین، بــەڵام لەبەرئــەوەی درەنــگ داهــاتبوو، بریــار درا کەبــەیانی بــەرەو سلیمانی بــچین، وەك رۆژی پێــشوو بۆپــشوودان چــوینەوە لای قوتابیـــــــــــــەکان، ئەوماوەکەمـــــــــــــــــەی لەرۆژمابووهەرکەسەوچــــووبۆلای کــــارێکی تایبـــــەت بەخۆی، ئێمەکۆمەڵێك لەبرادەرچووین بۆبازاری هــەولێر کەوێنــەیکمان لەبــەردەم قــەڵای هــەولێر گــرت بۆیادگــاری کەئەمانــەبووین "لەراستەوەوەستاوەکان مەلاوسوسـەید مستەفا، یوسف عوسمان، ئاکۆئاکۆیی، ئومێدشێرکۆ، محەمەدئەحمـــــــــەد دانیـــــــــشوەکە رزگــــــــــار شــێرکۆ" رۆژی١١یمــــانگ خۆمــــان ئامادەکردتابــــچین بۆســــلیمانی، بــــەڵام هەنـــدێك بـــەهۆی نەخۆشـــی و مانــدوبونی ئــەم دوورۆژەی رێگــا کەبــەردەوام بــارانی لێدەدایین گەرانەوەبۆرواندز، بەڵام سیانزەکەس مانەوەو بەرە و سلیمانی بەرێکەوتن، ئامۆژگاری کابرای شوفێری سورچــیمان لــەگوێی گــرت، چــووین بــۆ گــەراج کوستەرێکمان گرت و کەوتینە رێگا بــەرەو سلیمانی، بەرێگای کۆیێ دوکان، کاتی گەیشتینە دەروازەی شار دابــەزین لەکۆســتەر و بــە پێیــان چــووینە نێوشــاری سلیمانی، هەرلــەدەروازەی شار تا بــەردەم بارەگــای un بەچەپڵە و هەلهەلە پێشوازیان لەئێمە دەکرد، ئێمــەیان رێنــــووێنی کــــرد تاگەیــــشتینە شــــوێنی مەبەســــت هەرلەدوورئاپورای خەڵك و دەنگی سروودی نشتیمانی و ووتنەوەی دروشمی نشتیمانی ئەم ناوەی پرکردبوو هەرکە ئێمە پێمان خستە نێو ئاپورای خــەڵك هــەزارجار لەبڵنــدگۆی لیژنــەی پێشوازی وتــرا بــەخێربێن لاوەکانی شاری پاشای گــەورە شــاری وەســتا رەجــەب شــاری روانــدز، ئــەی مــانگرتوان ئــەوە لاوانــی روانــدز هــاتوون سڵاوی پاشای گەورەیان بۆتان هێنــاوە، هــەروەها دەیان وت بــــەخێربێن هەرلەروانــــدزەوە تاســــلیمانی بەســــەر چاومان هــاتن.کەئێمــەش گەیــشتین بــەلای مــانگرتوان و ســـڵاوی خـــەڵکی روانـــدزو پـــشتوانی خۆمـــان دووپـــات کــــردەوە بۆیــــان، کەبەراســــتی دیمــــەنێکی حەماســــەت خــولقێن بــوو، کەیــەکێك لــەمانگرتوان دارەبــازی لــەلای خــۆی دانــابوو، واتــە تــامردن دەســـت لــە مــانگرتن هەڵناگرێت یا دەبێت وەڵام یان بدەنەوە، بۆئەوەی گەل کورد پارێزراوبێت، لەبەرئەوەی خــەڵك هــەردەهات، ئێمە وردەوردە کــشاینەوە کاتێــك مــان زانــی بووبەشــەوبۆیە ووتمان تازووە بابچین شوێنێك بۆنووستن دابین بکــەین لــــەئوتێلێك پرســــــیارمان لەچــــەند گــــەنجێك کــــرد تارێنوێنیمان بکەن بۆناوەندی شار، بەڵام ئــەوان ووتیان فــەرموون بۆماڵــەکانی ئێمــە ئــەم شــەو لەخزمــەتان بین ئێمەش ووتمان ژمارەمان زۆرەسوپاستان دەکەین، کاتی رۆیــشتین ژن وپیــاوانی ماڵــەکانی دەوروبــەری بارەگــای un داوایــــان کــــرد لــــەلایان بمێنەوەئێمــــە ووتمــــان نامێنینــەوە، ئــەوان دەیــان ووت ئێوەلەرواندز بێن شــەو بۆلەلای ئێمەنامینەوە هەرچەندە زۆریــان کرد کەجێگای سوپاسە بــەڵام ئێمــە چووینە ئوتێل، پاش ئەوەی نانی ئێوارەمــان خــوارد لەیــەکێك لــە چێشتخانەکان و کــەمێك گــەران بــەنێو بــازاری ســلیمانی کەبۆزۆربــەمان یەکــەم جاربوو بۆ سلیمانی بێن. چوینەوە بۆئوتێل هەرکەسە چووە سەرجێگای خۆی بۆئەوەی بنوێت تا بــەیانی زوو لەخەو هەڵسێت چونکە دەمانویست بگەرێنەوە رواندز.

تەنها کاك یوسف عوسمان چووەلای ماڵی برادەرێکی، هەرچەندە من چەند ماڵێکی خزمم هەبوو لە سلیمانی بەڵام لەبەربرادەرەکانم نەچووم. بەیانی کە هەڵساین هاتینە خوار بۆبازاری شار، ووتمان بانانێك بخۆین و بچین بۆ گەراج تابگەرێنەوە.ئەوەبوو ئەوبرادەرانەی کەلەگەڵمان بوون هەندێکیان لە حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان بوون، ووتیان: ئەمرۆ١٢/١٢یە رۆژی دامەزراندنی حزبمانە، بۆیە دەچین بۆچێشتخانەیەك کە برنج وشلەو گۆشتی هەبێ چونکە چەژنمانە.ئێمەش ووتمان کەواتە ئێوەبرۆن ئێمەش دەچین بۆئەوشوێنەی خواردنێکی بەیانیانی ئاسایی هەبێ لەم کاتەکاك مەغدید حەمەد خوالێخۆشبێت "کە لە رۆژی ١ی شوبات کەوتە بەر کارە تیرۆریستەکەی لقی دووی پارتی دیموکراتی کوردستان و شەهید بوو" یادی بەخێر ووتی : کاك ئاکۆ منیش لەگەڵ ئێوەدێم ئێوەچی بخۆن منیش هەرئەوە دەخۆم.ئێمە ووتمان کاك مەغدید ئەوان چەژنیانە ئەی تۆچیتە ؟ کاك مەغدید ووتی: بۆ برادەری ئێمەنین چەژنی ئەوان چەژنی ئێمەش نیە ؟چوون ئەوان. ئێمەش چووین نانی خۆمان خوارد و گەراینەوە، ئەوان هەرلە چێشتخانەکە بوون. رووم لە کاك مەغدید کرد ووتم نانت خوارد؟ ووتی: بەڵێ. من ووتم: ئاخر غەریب ئەمرۆ رۆژی دامەزراندنی زەحمەتکێشانە بۆیە ئەوان برنج و شلە و گۆشتیان خوارد بەڵام ئەی تۆ نازانی ئەمان لە سۆسیالست جیا بوونەتەوە، ئەی تۆ سۆسیالست نیت دەبا هەر نانت نەخواردبا!! کاك مەغدید ووتی: تازە نانم خوارد بەڵام بیرم لەم باسە نەکردبۆوە، کە ئەمان لە ئێمە جیابوونەتەوە. بوو بە پێکەنین ووتمان تا درەنگ نەبووە بابرۆین بۆگەراج. "دەمەوێت ئاماژە بەوەبکەم ئەم باسەی نانخوارد بۆخۆشی گێرامەوە هیچ مەبەستێکم نیە، چونکە ئێمە کەلەرواندز بەرێکەوتین لایەنگری هەموبیروبۆچونیکمان لەگەڵبوو وەك مام جەلال دەڵێت چەپکە گوڵەکە بووین، حزبایەتی نەبوو کارەکەمان بەڵکو کوردایەتی هانی دابووین ئەم رێرویشتنە بکەین لەسەر گیرفانی خۆمان و خۆبەخشانەبوو.تەنها دەمانویست ببین بەنوێنەری شاری رواندزو سڵاو پەیامی خەڵك بگەێنین بە مانگرتوان لە سۆران و هەولێر و سلیمانی. لە هەولێر و سلیمانی خوالێخۆشبوو مەغدید حەمەد لەنێو لاوە مانگرتووەکان دەهات و دەچوو، بەخۆی و هەندی کاغەز و قەڵەم داوای لە مانگرتوەکان دەکرد تا ووتە و بۆچوون و دەربرینەکانیان بۆمان بنووسن، ئەمانیش بەوپەری خۆشحاڵیەوە دەهاتن بەرەوپیری کاك مەغدید هەرێکە و چەند پەیڤێکی سۆزئامێز و کوردانە بە دڵێکی بێگەرد نووسیان و دایانەوە بە کاك مەغدید، ئەوکات من داوام لە کاك مەغدید کرد هەندێکم بۆ کۆپی کات تا لەلام هەبێت ئەویش بەخۆشحاڵیەوە بۆی کۆپیی کردم. لێرە وەك بەڵگەی مێژوویی بڵاوی دەکەمەوە تا هەستی ئەوکاتی خەڵك بۆ نیشتمان لەگەڵ ئێستا بەراورد بکرێت، ئەمەش بۆخوێنەری بابەتەکە جێدەهێڵم.

**بەڵگەنامەکان یان دەستنووسی مانگرتوەکان:**

***ا ـ چەند کچێکی لاو لە هەولێر لەگەڵ برامانگرتوەکانیان لەیەك سەنگەر، مانیانگرتوە لە نانخواردن چاوەرێی مردنن ئەگەر وەڵام نەدرێنەوە بەم شێوەیە هەستی خۆیان دەردەبڕن.***

***سڵاوێکی شۆڕشگێرانە***

***ئێمەی ئافرەتە مانگرتووەکان هەستو سۆزی کوردایەتیمان پاڵی پێوەناین کەبێینە ریزی برامانگرتووەکانمان وئامادەیی خۆمان دەربڕی بۆمردن لەپێناوی کوردو خاکی کوردستان. باهەربژی کوردستان ومردن و ڕووڕەشی بۆ دووژمنانمان.***

***میڤی حەسەن زیرو:دانیشتووی دیانا - جوان حسین قادر: دانیشتووی هەولێر - ئاوات عبدالستار: دانیشتووی کۆیە - ریزان ابراهیم حمدامین:***



دانیشتووی کۆیە.

٢ـ مانگرتووێکی دیکە بەناوی هەموو مانگرتووەکان هەستی خۆی دەربریوە گرینگی بەناوی خۆی نەداوە تابنووسێت چونکە ئەم لاوە مەبەستی کوردایەتی بووە نەك شتێکی دیکە فەرموون بۆبەڵگەکە.

بەناوی گشت مانگرتوانی شاری هەولێری قارەمان بەخێرهاتنی هاوڵاتیانی رواندز دەکەین و وەبەڵێن دووپات دەکەینەوە بۆ شاری رواندزو گشت کوردستان کەهەردەم رۆڵەی بەئەمەکی کوردو کوردستان بین وتاداواکاریەکانمان بەجی نەگەیەنن لەبریاری خۆمان پاشگەز نەبینەوەو هیچ کاتێك بەردەرگای نەتەوەیەکگرتووەکان بەرنەدەین.

ئیتر سوپاس

مانگرتووەکان

٣ـ قوتابێکی ئامادەیی هەولێر چۆن باسی ئەوە دەکات کە دایکی هاتووە بۆسەردانی باوەشی پیا کردوە تا بەبۆن وسۆزی دایکایەتی کۆرپەکەی تێربکات، ئنجا پسکویتێکی بۆجێهێشتوە بەلام سەردار کەقوتابی ئامادەیی بووە پسکویتەکەی فریی داوە، لەم بەڵگەیە زیاتر هەستی کوردانەی سەردار بخوێنەوە:

من وەك یەکی لە ئەندامەکانی مانگران سوپاس و بەخێرهاتنی جەماوەری رەواندزئەکەم بۆپشتگیری کردنیان لەئێمە.

من کە دایکم گەیشتە لام ویستی بەبۆن و سۆزی تێرم بکات. بەلام بەوەش هەر کلپەی دڵی نەکوژایەوە دەستی خستە ناوباغەڵم بۆئەوەی بسکویتێ بۆبەجێ بێڵی.....

بەلام من بسکویتەکەم فرێی دا... هەرچەندە دڵی داکیشم شکاند بەلام دڵو هەستی کوردایەتیو ئازادیم لازۆر گەورەترە. دایەگیان بمبورە کەدەستتم لابرد چونکە ئیمە کەسانێکین بۆژیان ئەمرین نەوەك بۆمردن بژین ... ئیتر سوپاس

٤ـ هەموو چین و توێژێك بەشداربوو ئەویی رۆژی، ئەوەتا پارێزەر عزت جەمال ئاواهەستی خۆی دەردەبڕێت.

خوشکە هیام کەدانیشتوی کوردستانی سوریایە وادوو رۆژە دیتە سەردانی مانگرتووەکانی شاری هەولێر هەموو دەم بەچاوی پرلەگریان وسۆزەوە ئەمرۆ باقە گوڵێکی رەنگاورەنگی پیشکەش کردین بەئێمەی مانگرتو ئێمەی هەربەچاوە پرفرمیسکەکانمانەوە بەتینوی ئازادیو برسیەتی گوشتی گیانی سەدام وعەلی کیمیاوی چوار گوڵی رەنگاورەنگمان پیش کەش کرد کەبیگەینی بەکوردی سوریاو بڵی گولیکی بۆ کوردستانی سوریایەو ٢ی یەکەی دیکەی بۆ ئیران وتورکیایە ئەوەی دیکەیش بۆکوردستانی راپەرین ومانگرتوە، خوشکە هیام گوتی ئەی دەمەوە بەیەکی لەم دووخوشکە مانگرتووە. واتە ئیمەی کورد ئافرەتی وەك خوشکە هیام لاوەکانی سنەو مهابادمان هەبی بە سەدان کیلومەتر ببرن بین بۆ سەردان وپشتگیری مانگرتواوە مژدەیە مژدە کەگومانی تیدانیە مەشخەڵی ئازادی واهەلکراوە ودروشمی ئازادی وادەگاتە دەستمان دەتوخوا باوەشی گەرموگوری بۆبکەنەوە. خوشکە ئازادی بەهەموو لایەك لەباوەش بکەین ئەملا و ئەملای رۆژی سەدجار ماچ بکەن و لەدەستی نەدەن بە یەککرتنی هەمولایەك.

پارێزەر

عزەت جەمال

٥ـ لەشاری سلیمانی یەکێك لەمانگرتووان ئاوا هەستی خۆی دەردەبڕێت بۆ ئەو پشتیوانیەی کەلەمانگرتووانکراوە لەلای جەماوەری کوردستانەوە، بەرلە وەی بۆچونی کاك دلشاد بخوێنەوە دەبێت ئاماژەبەوەبکەم ئێمە (١٣) کەسبووین بەلام ئەوکات کاك

دلشاد بە (١٧) نوسیویەتی بۆئاگاداریی. فەرموو بۆخوێندنەوەی هەستی ئەم مانگرتووە.
پێشەکی بەخێرهاتنیی (١٧) لاوی رەواندز ی دەکەم، شارەکەی پاشای کوێر شاری دێرینی کوردستان.
ئومێدم هەیە بەسەرکەوتن، گەر مردنیش رێگەی بینین مان لێ بگرێ ئەوا میللەتی کورد وزەحمەتکێشان ئەیبینن. سوپاس پشت گیری و یارمەتی و قارەمانی گەلەکەم دەکەم.
بەرەو پێش چێ خەباتی دیموکراتی

٦ـ هەروەها یکێکی دیکە لەمانگرتووان لە سلیمانی ئاوا هەستی خۆی دەردەبرێت.
ئێمەی (٢٥) کەس زەحمەت کێش
ئێستا مردن چاوەڕوانمان ولەبەردەماندا
بەچۆکداهاتوەو لێ ی ناترسین وچاوەڕوانی ناکەین.
خالید سلیمان
سلیمان

٧. ئێمە کەلە ١٢/١٢ لەسلیمانی گەراینەوە، مانگرتن هەربەردەوام بوو، کاك مەغدید لەسۆران بیربۆچوونی مانگرتوانی وەرنەگرت بوو بۆیە رۆژی ١٣ی مانگ دووبارە دەچێت بۆ سۆران ئەم دوو بیروبۆچوونەی مانگۆتوان وەردەگرێت، پاشان بۆمنی هێنا فەرموون بیخوێنەوە.

هەڵ گرن پاچو بێلو قەڵەم
هەرلە رۆشنبیر تا شوانوسەپان
هەڵتەکێنن ئەم نیزامە بۆگەنە
دابرێژین کۆشکی یەکسانی ژیان
ئەودەمەش پرۆلیتاری کورد
دەبنە رابەر بۆ وڵاتی کوردستان

~~~~~~~~~~~~~~~~~~~~

ئەمرۆکە کە رێکەوتی ١٩٩١/١٢/١٣ رۆژی هەینی بو ٤٢ کات ژمێر ئەچێ مانگرانی قەزای سۆران مان مان گرتوە هەست بەنیشتیمان پەروەری وهەوستوسوزی کوردایەتی ئەکەین ورە مان لەگشت کاتێ کی رابردودا بەرزترە ولە سەربریاری خۆمان سورین کەئەگەر بەشانازیەوە بشمرین لە مانەکەمان پەشیمان نابینەوە.

ادریس جلال
کرکوك رحیماوە

٨ـ ئەمەی خوارەوەش هەستی یەکێکی دیکەیە لە مانگرتوانی قەزای سۆران.
من کە ناوم (نوری فقی عبدالله ) یە ناسراوم بە سید نوری نازناوم (هیدی ) یە لە ٩١/١٢/٧ مانم گرتوە لەسعت ٣ی پاش نیوەرۆ بەهۆی ئەو هەموو زوڵم ستەمەی کە سەدام بەسەر ئێمە ــ بێنێ وەك ١٨٢ هەزار ئەنفال و ٨هەزار برا بارزانی و ٧هەزار برا فەیلی و چەند زیندانی سیاسی و لەسەر ئەمەش خاکیان لێ داگیرکردوین و تاکو ناتوانین ئەگەر بچین بۆ شارێکی دیکە بەزمانی کوردی قسە بکەین و تاکولەستەمی ئەم خەلکە باس بکەین تەواونابێ کە بەسرمان دادێت؟
ئێستاش لەگوندی قەسرێ دانیشتوم پیشەم ئەندامی کەرتی رێکخستنی قەندلی یەکیتی نیشتمانی کوردستانە. ...هتد.

نوری فقی عبدالله
٩١/١٢/١٣
مانم گرت لەشاری (سۆران)
دانیشتوی (سەرتێل) یان خەلگی گوندی (قەسرێ)



~~~~~~~~~~~~~~~~~~~~

**٩- ئەم بەڵگەی خوارەوە دوو مانگرتو نوسیویانە بەڵام بەداخەوە بۆم روون نەبۆوە کە لەکام شار نوسراوە، فــەرموون بــۆ خوێندنــەوەی هەســتی نــشتیمان پەروەریان.**

**بــەناوی شۆرشــگێرانی ســەنگەری برســی یەتی.بەخێرهاتینی . لاوە پشتگیرەکانی شاری رەوانــدزی خۆشەویــست دەکــەین بــەڵێن وپــەیمان دووبارە دەکەینەوە.تاکو داواکاریەکانی جەماوەر حیّ بەجیّ نەیّ دەست لەمان گرتن هەڵنەگرین.**

**مانگران میرووەل احمد کانبی**

**کریم عبدالمجید پیرداود**

پیویستە لێرە ئاماژەبەوە بکەم هەندی لە نوسینەکانی مانگرتوان لە رووی رێنوسەوە ئەگەر هەڵەیێکی هەبی ئەوا هەستی خۆیان دەربریوە لەم کاتە، بەتایبەتی باری دەروونی ئەوان کەتیدابوون، چەند رۆژبوو نانیان نەخواردوە، بەڵام ئەوەی گرینگە هەستێکی کوردانەی بێگەردیان هەبوو ئەم بەرێزانە، هیوادارم ئێستا لەژیان دابن و بتوانن بیرەوەریەکانی خۆیـ بنوســنەوە، لــەم کاتــە مێژوویــەی ئــەو تێدابوون.هەروەهاپێویستە ئاماژەبەوەبکەم کە لەدوا رۆژیــسیانزەی مانگەوەخــەڵك پەیتاپــەیتا لەشا شارۆچــکەکانی دەوروبــەریی ســۆران ســەردانی ســۆرانیان دەکردبەمەبەســتی ســەردانیکردنی مانگرتوانی سۆران، لەرەواندز چەندرۆژێك بوو خەڵ بەکۆمەڵ لەرواندزەوە بۆسۆران دەرۆیشتن بەپێیان ئەوەبوو رۆژێکیان کۆمەڵی گەنجی رواندز بەرووت هەرلەرواندز تاسۆران لەبەردەم ئاپورای خەڵکی رواند دەرۆیشتن و خەڵی لەدوایان ئەوەی شایانی باسـ هەموو چین و توێژێك بەشداری لەم رێپێوانانە دەکر وەك لە وێنەکە دیارە هەموو جۆرە کەس و ئاستێکی تیایە.

لەکۆتایی دا دەمەوێت ئاماژەبە ناوی بەژداربوانی ئە رۆیشتنە بکەین، ئەوانەی تا سلیمانی بەردەوام بوو "ئاکۆ ئاکۆیی، یوسف عوسمان، مەغدید حەمەد، ور مستەفا، عەلی ئەحمەد، لوقمان حەسەن، مەلاوسو سەید مستەفا، رسو سەیدحەسەن، محەمە عەبدولرحمان وەرتی سەعدی عەزیز کەرەکی حەسەن سەید مستەفا، هیو سەید سەلیم، ئومێـ شێرکۆ". هیوادار توانیبێت بەتەواو سەربوردەی ئەم چەندرۆژە گێرابێتەوە، لە نووسینەوە بەشێکی کەمی مێژووی شا و وڵاتەکەم بەشداربم.



سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

ئێمە دە ئافرەتە مانگرتووەکان
هەست و سۆزی کوردایەتیان
پاڵی پێوە ناین کە بنێینە ریزی
برا مانگرتووەکانمان و ئامادەیی
خۆمان دەربڕی بۆ مردن لە پێناوی
کورد و خاکی کوردستانا.
باجور بژی کوردستان و ... مردن و
رووڕەشی بۆ دوژمنانمان.

| | |
|---|---|
| هێڤی حسن زێرو | جوان حسین نادر |
| دانیشتووی دیانا | دانیشتووی هەولێر |
| ئاوات عبدالستار | ریزان ابراهیم حمدامین |
| دانیشتووی کۆیە | دانیشتووی کۆیە |

هەڵگرن پاچ بێڵ و قەڵەم
هەر لە رۆژ شنبیر تا شوانوسەیان
هەڵکێشن ئەم نیزامە بۆگەنە
دابڕێژن کۆشکی یەکسانی ژیان
ئەوەدەمە ش پرۆلیتاری کورد
دەبێ رابەر بۆ وڵاتی کوردوستان

~~~

ئەمڕۆکە کە رێکەوتی ١٢/١٠/١٩٩١
رۆژی هەینی بوو ١٠ کات ژمێر
ئێ جێت مانگرانی قەزای سۆران
مان مانگرتووە هەست بە نیشتمان
پەروەری و هەست و سۆزی کوردایەتی
ئەکەین وە مانەکەمان لە گشت کاتێک رابوردوا
بەرزترە و لە سەر بڕیاری خۆمان سوورین
کە ئەگەر بەسەرمانا زیاوە بشمرین لە مانەکەمان
پەشیمان نابینەوە

کوردستان / هەولێر ٢٠١٠/٨/٢٨




~~~

## دیدارێکی نەتەوەیی لەگەڵ عارف باوەجانی دا

# سەربەخۆیی کوردستان .. ! ؟



**عارف باوەجانی لە ساڵی ١٩٧٣ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دایکبووە، لە سەرەتای هەشتاکانەوە بە بنەماڵەوە ئاوارەی باشووری کوردستان بوون و لە کەمپی ئەلتاش ماونەوە، چەند ساڵێک پێشمەرگەی حزبی دیموکراتی ئێران بووە، لە بنەماڵەی شەهیدە، لەساڵی ٢٠٠٥ لەو حیزبە کشاوەتەوە، دوای چەند مانگ لەگەڵ هاوبیرانی پارتی سەربەستی کوردستانیان دامەزراندووە، لەو ساڵەوە کۆنگرەی دامەزراندن و هەروەها کۆنگرەی دووی حزبەکەشیان لە ئەورووپا گرتووە، بە نیازن لەمەولا کە لە باشووری کوردستان نوێنەرایەتیان هەیە بۆنەکانی خۆیان لە پایتەختی هەرێم بەڕێوەبەرن، پارتی سەربەستی کوردستان خوازیاری سەربەخۆییە بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لەو پێناوەدا خەبات دەکات، عارف باوەجانی سەرۆکی گشتی ئەو پارتەیە.**

**دیداری K21**

***پ/ چۆن گەیشتنە ئەو قەناعەتە بۆ دامەزراندنی پارتێکی سەربەخۆ خواز بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لەگەڵ کێ ئەم بیرۆکەیەت خستە بواری کردارەوە؟***

وەڵام/ دیارە لە پاش کارەساتی ١١ی سێپتێمبەر دونیا گۆڕانێکی بە سەرداهات، زۆر ئاسایی یە کە ڕێکخراوێك یان گەلێك ئەو گۆڕانە لە بەرژەوەندی خۆی بقۆزێتەوە، حکومەتی ئەفغانستان ڕووخا، دوایی بەعسیش ڕووخا و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست ئالوگۆڕی جیدی بە خۆوە دیت، لە ڕووخانی بەعسدا کورد هەلێکی بۆ ڕەخسا و وەك یاریکەرێکی بەرچاو هاتە مەیدانەکە، دیارە لە باشوور هەلی سەربەخۆیی لەلایەن کوردەوە لە دەست چوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش بووە لایەنێکی بەرچاوی گۆڕەپانی سیاسی عێراق ، جا لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە دونیا ڕووی دا، بەداخەوە حزبەکان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە جیاتی ئەوەکە خۆ لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانە ڕێکبخەن، بەداخەوە وردە وردە دوچاری لێك بلاوی و ئینشیقاقات و پەرتەوازیی بوون، هەر لە ٢٠٠٢ وە ئەمە هەست پێکرا، من هەر لەوەساوە وەك بیرۆکەیەك من لەگەڵ هاوڕێانم ئەوەمان هەست پێکرد کە ئەگەر حزبەکانی ڕۆژهەڵات توانیان ئەو گۆڕانکاریانە

دەرك بكەن و خۆی لە بەردا رابگرن ئەوە لە ریزی ئەوان دادەمێنین و ئەگەریش نا ئەوا لەگەڵ دۆستان هەوڵی دامەزراندنی حزبێكی نەتەویی مۆدێرن و سەربەخۆ خواز بۆ رۆژهەلات كوردستان دەدەین، كە بە ستەری ئامادەیە و ریشەی ئەو خواستە لە ناخی هەموو تاكێكی كورددا هەیە، بە داخەوە حزبەكانی رۆژهەلاتی ئەمەیان بۆ نەكراوە لە جیاتی بۆ پێشەوە چوون، لیكترازان دەستی پێكرد ودەرفەتی ئەوە بۆ ئێمە نەما تا لە نێو ئەواندا پەرە بە بیر و هزری خۆمان بدەین، لەگەڵ ئەوەی كە پێمانوابو رەنگە كاتەكەی گونجاو نەبێ و ئامادەكاری زیاتری بوێت لە ۲۰۰٦/۲/۱۷ كە دەبێتە ۲/رێبەندانی ۲۷۰٥ی كوردی، پارتی سەربەستی كوردستانمان وەكو پارتێكی نەتەوەیی مۆدێرن بۆ خەبات لە رۆژهەلاتی كوردستان راگەیاند.

***پ/ لەو كاتەوە تا ئێستا وەزعی رێكخراوەیی و توانای مرۆڤی تان گەیشتۆتە ئاستی بەرچاو.***

وەلام/ لە راستیدا، كاتی راگەیاندنی بیر لە ماوەیەكی زۆر دەكراوە بۆ خۆ گرتن و سەقامگیری و جێگیر بوونی حزب لە ریزی ئەو هێزە سیاسییانە كە دەیان ساڵە رابردووی خەباتیان هەیە یان لانی كەم ئاگەینە ئەو ئاستەی كە ئێستا هەین، بەلام لەبەر ئەوەی پرۆژەكە پرۆژەیەكی نوێ و مۆدێرن وخاوێنە و بیرۆكەكەش بیرۆكەیەكی پیرۆزە لە ماوەیەكی زۆر كەم لە سەرتاسەری ئەو ولاتانەی كە كوردی لێیە و لە ناوخۆشدا لە زۆربەی شارەكانی رۆژهەلاتی كوردستان تا ئیلام و كرماشان پەیوەندیان پێوەكردین و دەست خۆشیان لێ كردین و هاتنە ریزمانەوە و ئەوەی كە زیاتردلگەرمی كردین لەناوچە یادكراوەكان وەك لۆرستان و ئیلام و كرماشان و دەڤەرەكانی دوورتریش وەك خۆراسان و تاران ئامادەی هاوكاری كردنمان بوون.

پ/ ئایا پێش راگەیاندنی پرۆژەی خۆتان لەگەڵ هێزی سەربەخۆ خوازی تر راوێژ تان نەكرد تا بەیەكەوە ئەم هەنگاوە هەڵێنینەوە؟

وەلام/ لەم رۆوە ئێمە بیرمان كردەوە كە لایەنێكی ئەكتیڤ بدۆزینەوە بۆ هاوكاری، رێكخراوی وا هەبوون كە لانی كەم سێ هێندەی ئێمە مێژوویان هەیە، بەلام لەبەر ئەوەی چالاك نین تەنانەت بوونی ئەوانیان بە رووی ئێمەدادەدا كە وەختێك حزبێكی وەها بەو بیرۆكەوە هەیە و لە سالانێكی زۆوە دامەزراوە، بەلام لە چەند كەس زیاتر نین ئەمەش دەبێتە ئەنجامی كاری ئێوە، بۆیە رەنگ بێت كەس و لایەنێكی وا بیانەوەێ هەر لە ئاستی مانەوەی سیاسی دابن و زۆر خۆماندوو نەكەن، كە ئەمەش لەگەڵ ویست و داخوازی ئێمە نەدەگونجا، لەبەر ئەوە ئێمە هەستمان دەكرد كە دەبێ بیرۆكەیەكی وا بە چالاكی و دلگەرمی و تێكۆشانەوە بۆی بچین، ئێمە دەمانەوەێ ئەو بیرۆكەیە ببێتە كولتوور لە ناو جەماوەردا، حزبێكی سەربەخۆ خواز لە ئەوڕۆپا دروست بێت و هیچ چالاكی و بزوتنێكی نەبێ دەبێتە هۆی دلساردی كەسانی نەتەوەخوازی تریش، من بۆ خۆم پێش ئەو هەنگاوەی خۆمان پەیوەندیم بە دوو سێ لایەنەوە كرد و ئەوان لەگەڵمان رێك نەكەوتن و دەیانوست هەر ئەو چوارچێوەیە بمێنێ ویەكتر بینینەكانی ئوسلۆ و ستۆكهۆڵم بەس بێت بۆ كوردایەتی كردنەكە، منیش بە پێچەوانەوەی ئەوان پێم وابوو كە دەبێ مەسەلەكە دەنگ بداتەوە هەر لە ئەوروپا و ئەمریكاوە تا دەگاتە گوندە دوورەكانی رۆژهەلات جەماوەری كورد لە چالاكی و ئامادەكاری مان ئاگاداربن و بتوانن هاوڕێ و هاوكاریمان بكەن.

***پ/ ئێوە لەگەڵ كام هێزی سەربەخۆخواز (( نەك حزب و گرووپی فیدراڵ خواز یان ئۆتۆنۆمی خواز)) وەك یەكێتی شۆڕشگێران یان پارتی سەربەخۆیی یان حزبی رزگاری لە پەیوەندی دان؟***

وەلام/ ئێمە وەكو پارتی سەربەستی چوارچێوەی خەباتمان رۆژهەلاتی كوردستانە و راستە خۆمان پێ نەتەوەیی یە و باوەڕمان بە رزگاری هەر چوار پارچەی كوردستان هەیە، بەلام لەگەڵ ئەوەش حزبێك نین بۆسەرتاسەری كودستان، ئێمە حەز دەكەین كە لە رۆژهەلاتی ناویندا چوار دەوڵەتی كوردی هەبێت، هەر بەشەو



تایبەتمەندی خۆی هەیە و ئێستا ئـەو ئاسـانکارییەی کـە بـۆ سەربەخۆیی لە رۆژهەلات هەیە، لە باشوور نییە.
لـە رۆژهـەلات ٥ نەتـەوە هەیـە لـە ناوچەکە و چ دەوڵـەتی فارسـی تـر لە ناوچەکەدا نیە کە لە دەسەلاتی داهـاتووی نەتـەوەکانی ترنیگـەران بێـت لـە تەنیـشت ئێمـە عـەرەبی ئەحوازی و بەلوچ و ئازەری داوای سەربەخۆیی دەکەن ئیبشە کە بۆ ئێمە ئاساتر دەبێتەوە لە باشوور تـەنیا کـوردە و عـەرەب هەیـە لـە پـەنای عەرەبەکـە ٢٢ دەوڵـەتی عـەرەبی هەیـە، چـل دەوڵـەتی ئیـسلامی هەیـە و لەگـەڵ زۆر ئامادەکـاری، بـوونی سـەربەخۆیی دەکەوێتە گێرە و کێشە و کارەکە سەخت دەکات، ئەو لایەنانەی کە باسمـان کـردن یـەکیان ویـستی لەگەڵ ئەودا کار بکەین و ئێمەش رەتمـان کـردەوە، کـە ئێـوە چـۆن دەتوانن لەلایەک ئەندامی کۆنگرەی نەتـەوەکانی ئێرانـی فیـدراڵ بـن و باوەرتان بە ئێرانی فیدراڵ هـەبێت ولەلایـەکی تـر حزبێکی سەربەخۆ خوازبن، من بەش بەحاڵی خۆم پێم خـۆش بـوو کـە لـە حزبێکـی سـەربەخۆخوازدا چـساپەزی مەقەرەکـەش بم نـەک هەربـەر پرسیارێتیم هەبێ بەو مەرجەی کە باسـی سـەربەخۆیی کوردسـتان بکات و بەراستی بێت، هەر بۆیە بەوانم وت ئەگەر باوەرم بە فیدراڵی مابایە هەر لەو حزبەی دا کە چەند سـاڵە ئەنـدامم و دوو شـەهیدی بنەماڵەم تێیدا هەیە دەمامەوە.

***پ/ کام حزب؟***

وەلام/ حزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران، مـن تـا ٢٠٠٥یش ئەندامی ئەو حزبە بووم، حزبـی رزگـاری کوردسـتان کـە باسمـان کـرد، خەباتەکـەی بـۆ باشووری کوردستانە، لە بەرئەوە ئێمە دەتـوانین لەگـەڵ ئـەو حزبانـە دۆست بین، بەلام ناتوانین لە یەک بەرەدا خۆمان ببین ولە توانای هیچ لایەنەکیشماندا نییە کە هەر ئێستا سەنگەر لە چواردە دەوڵەت بگرین، بـارودۆخی جیهـان ئـەم رێگایـەمان پێنـادات، بـەلام دەکـرێ لەگـەڵ حزبـەکانی نەتـەوەیی رۆژهـەلاتی کوردسـتان بەیەکـەوە کـار بکـەین، بۆنموونـە کۆمەڵـەی پـارتی سۆسیالستی دیموکراتی کورستان لـە ئێمـە نـزیکترن و بەیەکـەوە کاردەکەین، و هاوپەمانی سەربەخۆ خـوازانی رۆژهـەلاتی کوردستانمان پێـک هێنـاوە، ئامـادەی هاوکـاری لەگەڵ ئەو حزبانەی کە باوەریان بە سـەربەخۆیی هەیـە و رێنمایـەکانی ئـەو هاوپەیمانیەتییـە پەسـەند دەکـەن هـەین، لایـەنی تـریش هەیـە داوا دەکـەن لەگـەڵیان بین، من رای دەگەێنم کە کۆسپ نین ونابین، هەر لایـەک رازی بێـت لـە سـەر بنـەما سەرەکییەکانی پەیوەندی ، ئەوە بە دڵنیاییەوە لەگەڵی دەبین.

***پ/ بۆ پێت وایە لە باشوور هەل سەربەخۆیی لە دەست چووە؟***

وەلام/ ئـەوە منـیش دەیلـێم و خەڵکی تریش دەیلێن، بەلام مرۆڤ تـا خـۆی لـە مەسـەلەکەدا نـەبێت نازانێت چەندی کۆسپ لە پشتەوە هەبووە، ئەگەر دەسەلاتدارانی دوو حزبـی سـەرەکی کوردسـتان وەک پارتی و یەکێتی ئەوکات بۆ خۆیان جـەماوەریان هانـدا بـا و دوای نەمانی سەدام نەچووبانە بەغدا و کـۆنترۆڵی تـەواوی کـەرکوکیان بگرتبـا دەسـت و ئەگـەر ئـەو هاوپـەیمانی و دۆسـتایەتی کـە ئێستا هەیانە، ئەو سا هەیان بە مەسەلەکە جۆرێکی تری لێدەهات. راسـتییەکەی ئەوەیـە کـە هەنـدێک دەرفەت هەبوو لە دەست چوو، زۆر لـە دۆسـتانی کـورد نووسـەری بیانیش پێیان وایە کە کورد دوای روخـانی سـەدام هـەلی باشـی بـۆ سەربەخۆیی لە دەست داوە، دیارە فـشاری نێودەوڵـەتی و دراوسێیەکان زۆر بووە، بەلام خۆ ئەگەر بە ملیۆن خەڵک کێشرابانە سەر شەقام بۆ سەربەخۆیی کە ئەوە ویستی خەڵکە، زەمانی وەی نـەبوو کـە لایـەنێک بێـت و شـەر لەگەڵ ئەوخەلکە بکات و بە ملیۆن خەڵک لـە سـەر شـەقام بکوژرێت. نموونە زۆرە ولاتی دیکە بووە، کە رای گـشتی و جیهانیـشی لەگـەڵ نـەبووە بـەلام چـونکە سـەربەخۆ خـواز بـوون و لـە سـەر ئێرادەی نەتـەوەیی خۆیـان راوەسـتاون، سەربەخۆیی خۆیان راگەیاندووە.

***پ/ باسـت کـرد کـە لـە ٢٠٠٣وە حزبەکانی رۆژهەلات بەرەو دابران و ئینشیقاق چوون، هەر خۆشت وتت کە تا ٢٠٠٥ ئەندامی حدکا***

***بووی، ئەمە زیاتر روون بکەوە؟***

وەلام: تا ٢٠٠٥یش ئینشیقاق لە حزبی دیموکراتدا رووی نەدا بوو و پێم وابوو دەبێ هەوڵ بدرێ کێشەکە چارەسەر بکرێ، دوای کۆنگرەی ١٣ کێشەکە سەری هەڵدا، من پێم وابوو چارەسەری دەبێت و ئەگەری مانەوەی رێککەوتنەوە هەیە و پێویست ناکات حزبێکی تر دابمەزرێ و ئەوەندە حزب لە رۆژهەلات هەبێت کە بیری نەتەوەیی لە بیر بچێتەوە و خەڵك زۆر ماندوو بێت، دوایی دیتم نەخێر وەزعەکە بەرە و خراپی دەڕوات بۆیە تا ٢٠٠٣یش خۆم راگرت لە ئەنجامدا بە شێوەی رێك و پێك دەست لە کارکێشانەوەی خۆم نارد بۆ سکرتێری گشتی حزب و ئەو کۆمیتەیەی کە پەیوەندی بەمنەوە هەبوو، دوای واز هێنان ئیتر لەگەڵ هاوبیرانم بریارماندا کە خۆ کۆبکەینەوە و ٨ مانگ دوای وازهێنام پارتی سەربەستی کوردستانمان راگەیاند.

***پ/ پارتی سەربەستی کوردستان داوای سەربەخۆیی بۆ رۆژهەلاتی کوردستان دەکات یان بۆ هەر چوار پارچەی کوردستان؟***

و/ پارتی سەربەستی داوای سەربەخۆیی بۆ رۆژهەلاتی کوردستان دەکات و خۆی بە پشتیوان و هاندەری بەشەکانی تری کوردستان دەزانێت، هەروەها هەموو بەشەکانی کوردستان بە خاك و بە نەتەوە بە یەك وولات دادەنێت و ئەو دابەش کردنەی کە داگیرکەران کردوویانە بە شێوەیەکە کە گونجاو نی یە لەو هەل و مەرجەدا تێکرا داوای یەك دەولەتی کوردی بکەین، من پێم وایە ئەو یەکدەوڵەتە کوردی یە راگرین بۆ هەر چوار پارچەی کوردستان، ئەو کات کە رزگار بوو، با پەرلەمانەکانمان لە کاتی خۆیدا ئەو شتە بخەنە بەر باس، کە یەك دەوڵەت بین یان چوار دەوڵەت، زۆر نەتەوەی دیکە هەن کە سەرەرای یەك نەتەوەیی و یەکرەگەزی بوون چەند دەوڵەتیان هەیە، خۆ ئەگەر بتوانین چوار سوپا و چوار نوێنەر لە یوئێن و چوار دەسەلاتمان هەبێت ئەوا هێزێکی بەرچاوین لە ناوچەکەدا، دوژمن وای لێك دابریوین کە زۆری دەوێت تا بە یەك بلكێندرێینەوە، سەرەرای ئەوەش من داوام ئەوەیە کە ئێمە کورد چیتر خەبات نەکەین لە پێناو ئاوەدان کردنەوەی تاران و ئەنکەرەو دیمەشق و بەغدا، حەول بدەین شارو ناوچەکانی خۆمان بکەینە ناوەندی بریاردان، چی تێدایە ئێمە لە کرماشان بریاری خۆمان بدەین نەك لە تاران؟ یان خەڵکێکی وەك عەلی رەزا نوریزادەو کەسانی تر بیانەوێت ریگەمان پێ شان بدەن و چارەنووسمان بۆ دیاری بکەن، مادام زیاتر خەبات دەکەین و زیاتر ماندوو دەبین با کەسایەتی خۆمان ببیننەوە و خۆمان لە ئاستی خەڵکی تر بزانین، با سەر بەخۆ خوازی وەك مەترسی و دڵەراوکێ یەك لە گۆرەپانی ناوچەکەدا نەهێڵین و بیکەین بە رۆژەڤی رۆژانەمان کە خەڵك هەمووی باوەری پێ ی هەیە، لێ بگەرێین خەڵك بیر لە سەربەخۆیی بکاتەوە، بە داخەوە زۆربەی حزبەکانی تری رۆژهەلات لەوانەی پۆلی یەکەمی خۆیان دا فێرمان دەکەن کە ئێرانی بین، حەول بدەین کە ئەو ووشەو رستانە لابدەین، ئەوە دەسەلاتی ئێرانە کە وولاتی لێ داگیر کردووین، با چیتر کەس و کاری خۆمان هەر لە منالیەوە فێری خۆشەویستی ئێران و ئێرانچیەتی نەکەین، رەنگە ئەو پرۆژەیە هەتا هەشتا سالی دیکەش بە ئاگام نەکات بەلام دواخستنی زیانبەخشەو نابێ وەدوای بخەین.

***پ/ ئایا ئێوە لەناو نەتەوەکانی تری پێکهاتەی ئێران دۆست و هاوپەیمانتان هەیە؟ ئایا ئێوە توانیوتانە لەگەڵ سەربەخۆخوازەکانی نەتەوەکانی تری ئێران پەیوەندیتان هەبێت؟***

و/ وەلام ئێمە پەیوەندی باشمان لەگەڵ سەربەخۆ خوازەکانی تری نەتەوەکانی تری ناو ئێران هەیە، لەگەڵ عەرەبەکان بۆ نموونە بەرەی دیموکراتیکی بەرەی عەرەبی ئەحواز کە بە داخەوە ئینشقاقیان تێ کەوتووە پەیوەندیمان باشە، لەگەڵ بەرەی ئازادی خوازی ئەحواز، هێزی بەرگری بۆ رزگاری ئەحواز کە بریتین لە چوار لایەنی سەربەخۆ خوازی ئەحوازی و زۆریش بەهێزن، هەروەها لەگەڵ





(زرمبەشک) کـە لـە چـەند هێـزی سـەربەخۆ خـواز پێـک هـاتووە بـەینمان باشـە، هـەروەها لەگـەڵ بەلوچـەکان بـۆ نموونـە بـەرەی ئـازادی بەخـشی بەلوچـستان و کۆنگرەی نەتـەوەی بەلوچستان لـە پەیوەنـــدی دایـــن، لەگـــەڵ ئازەریـەکانیش پەیوەنـدی باشمـان هەیە، بەڵام بەداخەوە وەکو جاران نـی یـە، چـوونکە هـەر چـەندە ئەوانیش سەربەخۆ خوازن بەڵام بێ ریـزی بـە خـاك و ناوچـەکانی کوردستان دەکەن، ئێمە سەرەرای ئەو هاوپەیمانیەتیەی کە لە کەنەدا لەگـەڵوان پێکمـان هێنـا، لێیـان دوورکەوتینـەوەو بـە ئاشـکرا رامانگەیاند کە ئێمە لەگـەڵ هـەر لایەنێك لە پەیوەندی دابین، دەبێت ئـەو لایەنـە چـەندەی رێـز و خۆشەویستی بۆ نەتەوەکەی خۆی هەیە ئەمەنەشی بۆ کورد هەبێت، لە راستیدا ئێمە ناتوانین لەگـەڵ لایەنێك دۆست و هاوپەیمان بین کە لـە سـایتەکەی جنێـو بـە کـورد دەدات، منی پـێ بـاش بێـت بـەڵام لایەنەکانی تری کوردی بە خراپ بزانێت، ئێمە لە لای هیچ غـەیرە کوردێك رێگە نادەین سوکایەتی بە کورد بکرێت، لەگەڵ ئیدانەکردنی ئیـــدارەی فەرهـــەنگی تورکمـــان سەحرا نێ،انمان خۆشە، هەروەها بریار وایە بیست و سێ ی مانگی داهـاتوو لـە زانکـۆی ئاکـسفۆردی لەندەن کۆنفراسێکی سەرتاسەری ببەسـتین لەگـەڵ ئـەو هێزانـەو کۆبەنـدێك بـەناوی کۆمیتـەی نەتـەوەکانی ژێـر سـتەمی ئێـران دروست بکەین کە هەموو لایەنەکان لەم کۆری ئەم کۆبەندەدا بە جل و بـەرگی نەتـەوەیی خۆیـان لەلایـەن چـــەند ئەنـــدام پەرلـــەمانێکی بەریتیانی پێشوازی دەکرێت، ئێمە بـە نیـازی کـاری هاوبەشـین و دروشمی ئەو کۆڕەش ئەوەیە کە نەتـەوەکانی ژێـر سـتەمی ئێرانـی دەیانەوێت لە ئێران جیا بنەوە و سەربەخۆ بـن، تەنانـەت مـن دوای گەرانـەوەم بـۆ ئـەورووپا دەچـمە کانەدا و دوایش بۆ بەریتانیا، بۆ ئەو کارە هاوبەشەی کە برادەرانی ئـــەهوازی پێیـــەوە هەســـتاون، حەزدەکەم دووپاتی بکەمەوە، کە ئـەو لایەنانـەی لـە کـۆنگرەی نەتەوەکانی ئێران هـەن جگـە لـە حزبە کوردیەکان کە خاوەنی هێز و نفـوزن زۆر لاواز و بـێ هێـزن لـە ئاستی نەتەوەکانی خۆیاندا، لایەنە بـە هێزەکـانی ئـەو نەتەوانـە سەربەخۆخوازەکانن، ئەوان خۆیان بـە ئاشـکرا دەڵـێن کـە ئێمـە لـە کوردەوە فێری سیاسەت و خەبات بووین کەچی سەرەرای ئەوەی زۆر درەنگ دەستیان پێ کردووە داوای سەربەخۆیی و جیا بوونەوە دەکەن لـە حاڵێکـدا کـورد داوای ئـاوەدان کردنـەوەی تـاران دەکـات و بـەوە دڵخـۆش دەبێـت کـە جارێکی تـر تەسـلیمی قـەول و بەڵێنیـەکانی فارس بێت لە تاران و وەك هەمیشە کـە بەسـەرمان زاڵ بوونـەوە کـورد ناناســـن و پێمـــان دەکەونـــەوە هـــەروەکو دیتمـــان لـــە سـەرەتای شۆرشـی گـەلانی ئێـران کۆمـاری ئیـسلامی چـۆن جـێ ی ... کردەوەو یەکەم گوررزی خۆشـ... سەر سەری کورددا تاقی کرد... جێگـا داخـە کـەڵك لـەو ... تالانـە وەرناگیرێـت و بـە ... باوەرِیـەوە دەژیـن تـا فارسـ... واشـــنتۆن و پـــاریس ... بەڵێنیان دا کورد باوەری پێ ... ئاسانکاری بۆ دەکات، فارسـ... هـەبووە کـە زۆر ناسـراو ... کەچی لە ریگای راگەیاندنە... کوردەوە خزاونەتە هەموو ماڵ... و زۆری وەك فـلان و فیـسار ... دەنەفـەریان نـی یـە لـە تار... شـــارەکانی تـــردا کـــورد ... ناودارەکانی خۆشمانیان زیاتر ... ناو بانگ کردوون، ئێمە وەك ... سەربەستی دژی ئـەمجۆرە کار... هەڵوێست وەردەگرین .

***پ/ ئێوە کە داخوازی سەربەخۆ... رۆژهـەڵاتی کوردسـتانن چـ... دەتانـەوێت لەگـەڵ دیمـوکرات ... کۆمەڵەو فیدرالخوازەکان هاوکار... ؟ ئایـا پێتـان وایـە فیدراڵیـ... هەنگاوێکە بەرەو سەربەخۆیی؟***

و/ شـێوەی هاوکـــاری جیایـ... وولاتەکـــەمان بەدەســـت ... دووژمنـەوە داگـیر کـراوە، دە... پرۆتۆکـۆڵی هاوکـاری هەیـە ... دەتـوانین لەسـەری کـۆك بـین، ... نێوەیـەدا مەسـەلەی ئایـدۆلۆژ... جیایە بۆ یەك بوون زۆر خاڵ هەیـ... بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی... یـەکانی نەتەوەکـەمان، هـەروە... دوورخـستنەوەی گەلەکـەمان لـ...

شەری براکوژی و تالان کردن و پاراستنی خاکی وولاتەکەمان، مەرج نی یە چوونکە ئێمە داوای سەربەخۆیی دەکەین نەتوانین بە یەکەوە دۆست بین، یان دژی یەکتر بین، یەك بوونمان ئەساسە بۆ پاراستنی خاك و نەتەوە، لەدوای رووخانی کۆماری ئیسلامی بە داخەوە زۆر کارەساتی مەترسیدار چاوەڕێ دەکرێت، ئەوانەی پێیان وایە کە سەربەخۆیی ئێستا کاتی نی یە، بۆچوونی خۆیانە لە هەمان حاڵیشدا لە سەر ئەو باوەڕەی کە تا لەو حزب و لایەنانە نزیکتر بین زیاتر دەتوانین کاریگەری خۆمانیان لەسەر دابنێین، ئێمە سەنگەر لە حزبەکانی تر ناگرین، چوونکە داوای سەربەخۆیی ناکەن، دەبیت کارێکی وا بکەین کە لانی کەم ئەندام و لایەنگرەکانیان گوێمان لێ بگرن، با هەموو لایەك تێ بگەن کە سەربەخۆیی ئەو مینە مەترسیدارە نی یە کە بەرووی کورددا بتەقێتەوە، ئێمە لەسەر ئۆتۆنۆمی کەسایەتی وەك شەهید قاسملوومان لە دەست داوە، ئێستا هاوڕێکانی دکتۆر قاسملوو لەریزی سەرۆکانی وولاتانی ئەورووپاین، لەسەر ئۆتۆنۆمی لە باشوور سەد و هەشتا هەزار ئەنفال کراومان هەیە و کیمیا باران کراوین، ئایا ئەگەر داوای ئۆتۆنۆمی و فیدرالیمان کرد هیچ کەس بە چەپکە گولەوە دێتە پێشوازیمان ؟ تا لە داواکردنی سەربەخۆیی لێمان دڵگران بن ؟ بۆ هەموو داخوازیەکانی کورد هەمان لێدان و هەمان سزایە، دڵنیام ئەگەر خەباتەکەمان سەربەخۆ خوازانە بووایە ئێستا دەنگدانەوەی زیاتری هەبوو ،بە داخەوە ئێمە کێشەی نەتەوەکەمان کردۆتە بنەماڵەیی، بۆ لە دەرەوە وا تێ بگەن کە ئێمە کێشەیەکمان هەیە لەگەڵ باوکمان کە ناوی ئێرانەو ئێمە منداڵە ووردەکانی ئەوین ؟ کورد منالێکەو بەلوچ منالێکی ترەو ...... ئێمە تا ئێستا نەمان توانیوە کێشەکەمان وەکو کێشەی فەلەستین و کۆسۆفۆی لێ بێت، نێو دەوڵەتیمان نەکردووە، حزبی ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەیە کە دەبێت نزیکایەتی حزبەکان لەسەر ئەو خالانە بێت کە بەرژەوەندیەکانی گەلمان دەپارێزێت .

***پ/ ئایا پارتەکەی ئێوە لە ئاستی جەماوەری یەوە توانای ئەوە هەیە کاریگەریەکی وای هەبێت؟***

و/ ئێمە نالێین زۆر شتمان کردووە بە پێ ی بێ ئیمکاناتی و تەمەنی کەممان تا رادەیەکی باش چووینە پێش و کارمان کردووە .

***پ/ تا ئێرە چەند لە بەرەو پێشەوە چوونەکەتان رازین ؟***

و/ ئێمە لە ناوچەکانی ئیلام و کرماشان و ... تا دەگاتە موکریان و دەڤەرەکانی تر توانیومانە ریکخستنمان هەبێت لە ئاستێکی باش، لە ناو کوردەکانی هەندەران لە زۆربەی وولاتان کۆمیتەمان هەیە، توانیومانە لە نێو ناوەندی لیبرال دیموکراتەکانی جیهان پەیوەندی دۆستانەی باشمان هەبێت، هەموو ئەو پەیوەندیانەشمان لەبەرژەوەندی گەلەکەماندایە تا بەرژەوەندی تەسکی حزبی، ئێمە زۆر جار لەگەڵ ئەورووپیەکان لەسەر مەسەلەی کەرکوك قسەمان کردووە، یانی ئێمە بەردەوام لەسەر کێشەی کورد لە هەر پارچەیەك کار دەکەین و ئێمە چەندین جار مەسەلەی ئاسیمیلاسیۆنکردنی کوردمان بە هەزار شێوە بۆ ئەورووپایی و ئەمریکایەکان باس کردووە.

***پ/ زۆرجار کە باس لەو چالاکیانەی دەرەوەی ئێوە دەکرێت، پێتان دەڵێن عارف باوەجانی خۆی و دووکەسی ترە هەروەها دەڵێن حزبێکی ئینتەرنێتی یەو کەسیان نی یە، ئەمە تا چەند راستە؟***

و / دیارە ئەگەر حزبێك ئەو هەموو چالاکیە بە یەك کەس بکات، دەبێت دەستخۆشی لەو کەسە بکرێت، زۆرمان لەو قسانە پێ ووتراوە حزبی ئینتەرنێتی، حزبی یەك دووکەسی ... ئێمە خۆشحالین کە قسەی خراپمان لەسەر ناکەن، هەر ئەو تەبلیغاتانەی کە دەیکەین نیشانەی ئەوەیە کە ئێمە چالاکین و وەك خەڵکی تر دەستەو وەسان نەوەستاوین، ئێمە کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسمان نی یە، بەڵکو کۆمیتەی سەرۆکایەتیمان هەیە کە ۹ کەسین، لەو ۹ کەسە سێ یان کۆمیتەی سەرۆکایەتین کە بریتین لە





ســــــەرۆکی گــــــشتی و دوو جێگرەکەی، کاك ئیبراهیم جاف و کاك فەرهاد جەهانگیری بەردەوام لــە چـالاکی دان و لــە رۆژنامــەو سایتەکانیشدا بابەتـەکانیان بـڵاو دەبێتــەوە، بەشـێکی زۆرمـان لــە باشـووری کوردسـتانین بـەڵام بـە داخەوە لەبەر ئەوەی نەمانتوانیوە بژێوی ژیانی هـەموو ئەنـدامانمان دابــین بکــەین بــە پێویتــسمان نەزانیوە وەکو پێویست ئاشکرایان بکەین، من زیادەڕەوی ناکەم بەڵام لــە خانــەقین تــا هــەولێر ئێمــە هاوبیرمـان هەیـە و ئەگـەر رۆژێـك وەك حزبەکانی تر ئۆردوگاو کەمپ بکەینەوە، ژمارەی ئەندامـەکانمان لە حزبەکانی تر کەمتر نابێت، ئێمە بۆخۆمـان لـە باشـوور کارەکـانی خۆمـان وەسـتاندبوو تـا بتـوانین راســــــتەوخۆ نووســــــینگەو نوێنەرایــــەتی لــــە پایتــــەخت بکەینــەوە، بــە هــەر حـاڵ ئێـستا نوێنــەرایتیمان هەیــە لــە هــەولێر لەگـەڵ ئـەوەی کـە لـە نـاوەخۆش بـەردەوام چـالاکی و پەیوەنـدیمان هەیــــە، بەراســــتی حزبێکــــی ئێنتـەرنێتی دوکەسـی ئـەو هـەموو وڵاتـەی پـێ دەکرێ ؟ ئـەو هـەمووە چالاکیەی پـێ دەکـرێ ؟ مـن دوای سەفەری کوردستان لە ٩ی مانگ لە تۆرۆنتــۆم. لــە ١١ ی دەبێــت لــە تالەرگەری بم، ١٤ ی لە بانکۆڤەرم، دوبـارە ١٦ ی مـانگ دەگەڕێمـەوە تۆرۆنتۆ، دوایش بچمە لەندەن بۆ کۆنفراسەکەی کە بۆم باس کردیت، ئەگەر لە زۆر جێگا من کە بە تەنیا دەچم لەبەر ئەوەیە کە هـاوبیرانی تـرم مەشغولی کـاری دیکـەن، کـاك ئیـبراهیم جـاف سـەرۆکی گـشتی بەرپرسی هەموو ئەورووپای ئێمەیە، لــە زۆر کــار و دیــداری جیهایــدا بەشداره، ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە لـە نـاوەخۆی وڵاتـدا هـەن ناکرێـت ئاشکرایان بکەین، کێ دڵی بە چی خۆشە با بیڵێت، ئێمە خۆشحالین کـە وەك خـەڵکی تـر درۆ و قـسەی خراپمــان لەســەر ناکرێــت، بــە دڵنیاییەوە پێت دەڵێم کە پارتی سەربەسـتی هـەر عـارف نـی یـە و ئەگەر عارفیش بە تەنیا هەموو ئەو کارانە بکات جێگای شانازیە .

***پ/ئایـا ئێـوە نووسـینگەتان لـە هەولێر کردۆتەوە؟***

و/ بـەڵی لـە مێژبوو خـەریك بووین مۆڵەتمان پـێ نەدەدرا، فشارەکانی وڵاتـانی دراوسـێ بـۆ سـەر هـەرێم زۆر بـــــوو، لەلایـــــەکی تــــر ســەرکردایەتی سیاسـی کـورد لـە باشوور بە کۆمەڵێك کێشەو گرفتی ئەو حزبانەی رۆژهەڵاتـەوە خـەریك بوو، ئەمەش جێگای نیگەرانی بوو کە سەرەرای ئەو هەموو حزبەو ئەو هـەمووە کێـشەیە حزبێکـی تـریش بێت لە هەولێر نووسینگە بکاتـەوە کە دروشم و داواکاریەکەی لە مەر کورد لـەوان گرنگترە، رەنگە کێشە دروست بکـات بۆیـە مـن لەسـەر بــەڵێنی ئــەوان راوەســتابووم و قەناعەتیــشم بــە دەلیلــەکانیان هـەبوو، کـە پێیـان دەگـوتین پەلـە مەکـەن، ئێرە بەشێکە لە وڵات و خـــاکی خۆمـــان و ئەگـــەر هاوکاریشمان بکەن ئاساییە، بەڵام بەداخـــەوە تـــا ئێـــستا هـــیچ هاوکاریــەکی مـاڵی و سیاسـی و مەعنـەویان نـەکردووین . بۆخۆمان هاتووینەوە کوردستان.

***پ/ مــادام جــەنابت میــوانی کۆنگرەی ١٣ ی پارتی دیموکراتی کوردستان بوویت، وەك حزبەکانی تری رۆژهـەڵات و نووسینگەشتان لــە هــەرێم کردۆتــەوە، ئاســاییە ئــەوەی بـۆ ئــەوان دەکرێـت بـۆ ئێوەش هەبێت؟***

و/ وەڵا پێمان خۆشە وابێت، بەڵام تـا ئێـستا وا نـەبووە، بەشـداری لـە کۆنگرەش بە مانای ئەوە نی یە کە چـی ئیمکاناتێـك هـەبێت دەخرێتـە بەردەسـتمان، ئێمـە لـە کـۆنگرەی یـەکێتی نیشتمانیشدا بەشداریمان کـرد و میـوان بـووین، لـە پـارتیش وەکـو هـەموو حزبـەکانی تـری هـەر چـوار پارچـەی کوردسـتان، دیـارە چـاوەڕێ ی هاوکـاری و ئـەوانین. ئەوان بەشێکن لە وڵات و نەتـەوەی خۆمان، خۆ ئێمە داوای هاوکاری لە خـەڵك و وڵاتێکـی بێگانـە ناکـەین. بەڵام ئەوەت پێ بڵێم تا ئەو دەقەیەی کــە بەیەکــەوە دانیــشتووین هــیچ هاوکاریەك نەکراوین.

# دیدارێکی هەمەڕەنگ لەگەڵ مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن زادە



عەبدوڵا حەسەن زادە کەسایەتی ناسراوی کوردو حزبی دیموکراتی کوردستان هەم مەلایەکی تەواو بووە، هەم سیاسەت وانێکی بەتوانا هەم رۆژنامەنوس‌و هەمیش نوسەرو وەرگێر هەم کوردو هەم ئێرانی لە گشت بوارەکاندا گەیشتۆتە ئاستێکی دیارو بەرچاو کاریگەر. هەموو ئەمانەی چۆن بەیەکەوە گرێداوەو وەك دەڵێن چۆن توانیوێتی دوو شوتی یان چەند شوتی بەدەستێکەوە هەلگرێ خۆی وەڵام دەداتەوە لەگەڵ ئەوەی کە بەدڵنیاییەوە سەربەخۆی کوردستان نەك بۆ هەر چوار پارچەبەیەکەوە تەنانەت بۆ پارچەیەکیش حەواڵەی ٢٠تا ٣٠ساڵی تر دەکات بەپێچەوانەی زۆر کەس.



ئەحمەد سەفا

**پ/ باسی سەربەخۆی کوردستان‌و پێکهاتەی دەوڵەتی کوردی باسێکی گەرمی گۆرەپانی سیاسیە جەنابت چۆنی بۆ دەچی واقیعە یاخود خەون؟**

و/ بەرای من ئەو دوانە زۆر بەیەکەوە ناکۆك نین من پێم وایە بوونی دەوڵەتێکی کوردی کوردستانێکی یەکگرتوو سەربەخۆ شتێکە دەتوانێ بوونی هەبێ بۆ نەتەوەی تر هەیە بۆ بۆ کورد نەبێ بەڵام ئەوەی دیکەشیان ڕاستە کە دەڵێ ئەمرۆکە ناموکینە، منیش پێم وایە ئەگەر لە ١٠ساڵی داهاتوودا یان ٢٠ساڵی داهاتوودا شتی وا مومکن بێ پێم وابێ شتێکی عەجایب روودەدات کورد ئەو حەقەی هەیە خەون بەمانای شتی خورافاتی نیە کە دەڵێی خەون بەوەوە نیە کە دەیبینم یانی ئارەزووی دەکەم‌و ئەو خەون‌و ئارەزووە زۆر رەواو تەنانەت زۆریش واقیعیە. ئیدی ئەوە کاری ئەورۆیە یان بەداخەوە بڵێم ٢٠تا٣٠ساڵی دیکەشە پێم وایە





**خۆمان فریودەدەین**

**پ/ دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی کە لە هەر چوار پارچە پێك هاتووە جودایەو دەسەڵاتێکی کوردی لە پارچەیەك سەربەخۆبێت جودا ئایا ئەگەری سەربەخۆی بەشێك لەو چوارپارچەیەش دورە**

و/ بەش بەحاڵی خۆم هەردووکیان وەك یەك دەبینم رەنگە خەڵك ئەوەی پێ خۆش نەبێت بەڵام من قسەی خۆم دەکەم یانی هەردووکیان هەر دوورن چ کوردستانێکی یەکگرتوو هەبێت ببێت بەیەك دەولەت چ بەشێك لەو بەشانە ببێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ هەر دووکیان هەر دوورن پێکهاتەی دەوڵەتی کوردی بەباوەری من شتێکی مومکینە بەڵام بەستراوەتەوە بەدیموکراسی ناو ئەو ناوچەیەی کە کوردی تێدا دەژیو یەکێك لە ئاڵۆزترین ناوچەکانی دوونیایە مەبەستم رۆژهەڵاتی ناوەراستە ئەگەر دیموکراسی لەو ناوچەیە جێگیرببێت ئەو کات بیر لەوە دەکرێتەوە کە کۆنفیدرالیەك لە هەموو نەتەوەکان دروستبکرێت یانی با هەموو عەرەب دەوڵەتێك بن هەموو فارس دەوڵەتێك بن هەموو کوردیش ببنەیەك دەوڵەت رەنگە لەچوارچێوەیەکی وەهادا ئەوە مومکین بێت دەنا کورد لەبەشێکی کوردستاندا سەربەخۆبێت لەنێو ئەو هەمووە دژبەرەی دەوروبەر چۆن دەتوانێت لەسەر پێی راوەستێت ئارەزوو خۆشە زۆر جار دەڵێن کورد بۆ واز لەو دەوڵەتانە ناهێنن. ئەوەی پێی دەکرێ واز لەو دەوڵەتانە بێنێ دەوڵەتی کوردی دروست بکات بۆ دروستی ناکات کێ هەیە دەست خۆشی پێ نەڵێ قسەکردنی بێ باجو گومرگ ئاسانە هەزار تانە لەرێبەرە سیاسییەکانی کورد دەدەن بۆ دەچنە بەغدایا بۆیە دەچن بۆیە مەسەلەکە لە بەغدایێ حەل دەبی بۆیە دەچن دەنا بۆدەچن خۆ ئاشقی چاو برۆی بەغدایێ نین بەڵام دەزانن لە واقیعی ئەمرۆکەدا ئیمکانی ئەوەی کە کوردەکە بۆ خۆی دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێك بێنێ نیە، نەهێزی بەرامبەر لەگەڵ حکومەتی ناوەندی وایە کە بەسەری دا زاڵبێ نە دراوسێکانی دەهێڵنو نە هەلومەرجی ناوچەکەش رێگە دەدات ئێمە لە حاڵەتێکی ئاوادا لەگەڵ واقیعیەت سەروکارمان هەیە لەگەڵ ئارەزوو سەروکارمان نیە.

**پ/ ئەدەبو سیاسەتت چۆن لێك داوەتوانیوتە لە هەردووبواردا وا کاربکەی کەبگەیتە ئاستێکی بەرچاو؟**

و/ ئاستو شتەکە قەزاوەتی من نیە بۆخۆم یەکجار بەدبینم بە هەردووکیان نە لە سیاسەتدا موعجیزەیەکم کردووە نە لە ئەدەبدا بەڵام ئەوە کە هەردووکیانم کردووە هیچیان رێگری هیچیان نەبوون

**پ/ ئەی چۆن هەردووکیانت بەیەکەوە پێ کراوە**

و/ ئاخر بەیەکەوە دژ نین واتە ناکۆکیان نیە چەند باشە وتارێکی سیاسی بە ووشەی ئەدەبی دەربردرێت.

**پ/ یانی سیاسەت مەداری ئەدیب سەرکەوتووترە**

و/ بەباوەری من قسەی سیاسەتمەدارێکی ئەدیب زۆر کاریگەری زیاترە لە قسەی سیاسەتمەدارێکی کە لەو بارەوە کڵۆڵ و ماڵ ویرانە لەنێو کورددا بەتایبەت لە رۆژ هەڵاتی کوردستان سیاسەتو ئەدەب هەردوو خزمەتی یەکتریان کردووە ئەگەر بیروباوەری سیاسیمان نەبایە لەوانە بوو تا ئێستاش ووشەیەک بە کوردی نەنوسرێت. ئەوە حزبە سیاسییەکان بوون بیریان لەوە کردەوە کە بەکوردی بنووسن چونکە ئەو هەستەیان تێدا هەبێ ئەو حەقە دەرك دەکەن، دوای بەرێگای ئەدەبدا دیسانەکە خزمەتی بیروباوەرە سیاسیەکەیان کردزووە ئەو دووانە لەجیاتی ئەوەی کە موقابلی یەکتر بن یەکتر تەواو دەکەن.

**پ/ جەنابت کەسایەتیەکی ئاینی بووی ، کە هاتووی لە سیاسەتەوە لە ئایندا مەلایەکی تەواو بووی و لە سیاسەتیشدا گەیشتوویەتیە سکرتێری گشتی حزبی دیموکراتی ئێران بۆ دوو دورە لە حزبدا چۆن ئاینت بەرێوە بردووە؟ ئێستا کە پیر بووی کامەیانت تێدا لاوازترە ؟**

و من پێم وایە دیسانە دەبی بڵێم ئەو دووانە شتێک نین کە دژایەتیان پێکەوە هەبێت ئەوەندەی کە من لە ئاین حاڵی بووم، دیارە حاڵی بوونی من وەکو هێندی کەسی دیکە نی یە یانی تێگەیشتنی من لە ئاین وەکو نە ئەوانەیە پێیان دەڵێن سەلەفی و نە وەکو ئەوانەیە کە پێیان وایە کە دەست بۆ سیاسەت بەری نوێژت بەتاڵ دەبێت، وەک من تێ ی دەگەم لە واقیعدا دینی ئیسلام هیچ موخالەفەتی لەگەڵ سیاسەت نی یەو تەنانەت ئەو ئەسڵانەی کە ئێمە هەمانە ئاینی ئیسلام لەگەڵ هەمووانیان سازگارەو لەگەڵ هیچیان ناکۆک نی یە ، راستە مەشغوول بوون بە کاری سیاسیەوە حەتمەن نوێژ و رۆژوو چوونی پێوەیە من باسی ئیسلام دەکەم وەکو فەلسەفەو بیر و باوەڕ نەک وەکو عیبادەت و کەسێکی موسوڵمان ، چونکە کابرا خەریکە میتینگێکی سیاسی دەدات نوێژی عەسرێ ی دەچێت ، ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیەو ئیسلام و سیاسەت نەک لە دژایەتی یەکتردا نین بەڵکو زۆر لەو مەسائیلانە کە سیاسیەکان و دەوڵەتیەکان بۆیان تێ دەکۆشن لە خودی ئاینی ئیسلامدا هەنە .

**پ/ جەنابت ئەوەندەی لە سیاسەت چوویە پێش ، باوەڕی دینیت کزتر نەبووە ؟**

و/ نا باوەڕی دینی نا باوەڕم بە ئیسلام کز نەبووە ، بەڵام جارێکی کە تازە کۆماری ئیسلامی هاتبووە سەر کار و من گەڕابوومەوە بۆ ئێران و چووبوومە ناوچەکەی خۆمان مەلایەکان دەورەیان دام و زۆر بە پارێز لێیان پرسیم و گوتیان شتێکت لێ دەپرسین بەڵام نارەحەت مەبەو پێمان خۆشە بیزانین ، ووتم فەرموون ووتیان " دەڵێن تۆ عارەقی دەخۆیەوە " گوتم وا ریککەوتووە کە عارەقی ناخۆمەوە بەڵام من کەنگێ ئیدعام کردووە بەرمالم لەسەر ئاوێ دەگەرێت؟ من ئیدیعام کردووە کەسێکی نیشتمان پەروەرم و تێکەشۆرێکی سیاسیم ، قەت لێتان بیستووم کە من قوتبی زەمانەم ، من شتی وام نەگووتوە وەکو فەلسەفەیەکی دینی من نەمدیوە سیاسەت لەگەڵ دین ناکۆک بێت ، هێندێک شت هەیە کە لە ئیسلامدا قەبیحن ئەو شتانە لە سیاسەتیشدا قەبیحن ، لەگەڵ ئەوەی کە لە ووردەکاری عیبادەتدا نا تەباییەک لەگەڵ بنەماکانی فیقهی ئیسلامیدا هەبێت .

**پ/ جەنابت لە کاری سیاسیدا فێری کاری رۆژنامەوانی بوویت و لە ئەدەبیاتی حزبیدا نووسیوتە سیاسیەک تا چەند دەتوانێت رۆژنامەگەرێکی سەرکەوتوو بێت یان بە پێچەوانەوە ؟**

و / من پێم خۆش نی یە بڵێم رۆژنامەگەر ، رۆژنامەنووسی سەرکەوتوو مەرج نی یە حزبایەتی بکات بەڵام لە رووی سیاسیەوە ئاگادارە ئەگینا سەرکەوتوو نابێت ، بۆ ووتووێژێکی سیاسی لەگەڵ شارەزایەک پێویست بە زانیاری لەو بوارانەدا هەیە ، بەڵام مەرج نی یە سیاسیەک ئاگای لە کاری رۆژنامەوانی بێت و رەنگە هەر قەتی نەکردبێت ، لەگەڵ ئەوەش لەبەرامبەر یەکا نین ، کەسانی وەک من لە رێگەی کاری سیاسیەوە فێری کاری رۆژنامەنووسی بوون من لە هیچ دەزگایەکی راگەیاندن ئەو کارەم نەکردووەو فێر نەبووم ، بەڵام حزبەکەم رۆژنامەی دەرکردووەو من تێمدا نووسیوە ، لەگەڵ ئەوەش کە من رۆژنامەی حزبیم زۆر خۆش دەوێت بەڵام بە رۆژنامەی نازانم ، رۆژنامەی حزبی کە بە یەک دالآنی تەنگدا دەڕوات بۆ رۆژنامەیە؟

**پ/ئەی کابرای حزبیش یەک لایەنەیە ، کەوابوو ئەویش تەواو نی یە؟**

و/ نا بۆ کەسی حزبی مولتەزەم ئەوەیە کە یەک لایەنی هەبێت و بەراستە رێگەکەی خۆیدا بڕوات ، سیاسی ئازاد جیایەو سیاسی بەرپرسیار جیایە ، سیاسی بەرپرسیار خەتی خۆی هەیەو بۆ ئەوە تێ دەکۆشێت خۆ نابێت دژ بە حزبی خۆی بنووسێت ، ئەمە پێچەوانەی ئازادی رادەربڕینیش نی یە ،حزبی سیاسی کە بڕوای بە ئازادی چاپەمەنی هەیە مانای وایە کە رۆژێک دەسەلاتی هەبوو ، رێگە لە ئازادی رادەربڕینی خەلکانی تر ناگرێت ، نەک ئەوەی کە بۆخۆی





نەهێڵێت یان بە ناوی ئازادی لە ڕۆژنامەکەی خۆیدا بابەت دژ بە حزبەکەی خۆی بڵاو بکاتەوە .

**پ/ تا چەند باوەڕت بە ئازادی ژن هەیە ؟**

و/ لەبارەی ئازادی ژنانەوە من قسان بۆ ئەوە ناکەم ڕێك و لووس بن ، پێم وایە ژن هەموو مافێکی کۆمەڵایەتی بەرامبەر بە پیاو هەیە ، بەڵام لە هەمان کاتدا بۆ ئازادی ژن هەندێك بنەما هەیە کە دەبێت لەبەر چاو بگیرێن، لەو ماوەدا شتێك بڵاوبووە کە گوایەلەوەتی حکومەتی هەرێم لەسەر کارە دوازدە هەزار ژن کوژراوە ، هەموو دەزانین شتی وا نی یە ، خۆ مانگێ شەش سەد ژن ناکوژرێت ! بەڵام لەو باوەڕەدام ژن کوشتن و خۆکوژی ژنانیش لە دەساڵی دوایدا بەبەراورد لەگەڵ پازدە ساڵی پێشتر زیادی کردبێ ، ئەوە دەلیلی ئەوەیە کە میدیای کوردی و بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد نەیتوانیوە بە باشی مامەڵە لەگەڵ کێشەکانی کۆمەڵایەتی و مەسەلەکانی ئافرەتدا بکات بۆ نموونە میدیای کوردی شتێك دەڵێ کە دەبێتە هۆکاری ئەو کارەساتانە جگە لەوەی دەسەڵاتیش ڕەخنەی لەسەرە کە لێپرسینەوەی کەمەو یان کە دەیکات لێپرسینەوەکە وا نی یە کە بەر گێرەوە بێت بۆ نموونە دەکوترێت (سی جی سی) خوشکەکەی بە ناوی (بێ جێ بێ) وا لێ کردووە ، ئەمە قسە نی یە دەبێ بگوترێ فلانی کوڕی فلانە کەس خەڵکی فلانە جێ ئەوەی کردووەو منیش بەو تاوانە هێناومەو لە زیندانێم قایم کردووەو بیست ساڵم حوکم داوەتێ ، ئەوە دەتوانێ خەڵکی لەکاری خراپ بگێڕێتەوە ، دەبێت مافی ئافرەت وا جێ بەجێ بکرێت نەبێتە ریگا خۆشکەر بۆ پێچەوانەی مەبەست ، ئێمە لە کوردستان وامان کردووە لە دە ساڵی دوایدا ٥٠٪ کوژران و خۆکوژی ژن زیادی کردووە ، بۆ ؟ چوونکە بۆچوونی واقیعیمان لەسەر مەسەلەکان نەبووە.

**پ/ جەنابت ووتت باوەڕم بە هەموو مافێکی کۆمەڵایەتی ئافرەت هەیە ، لە پێشیشدا ووتت باوەڕم بە ئیسلام لاواز نەبووە، خۆشت دەزانی مافی ئافرەت و ئاینی ئیسلام لەو سەردەمە ناتەباییان هەیە ؟**

و/ من باوەڕم بەوە هەیە کە لە مێژە دەیڵێین دەبێت دین و دەوڵەت لە یەك جودابن ، دەبێت لەو مەسایلە گەڕێین قانونێك دەبێت لە وولاتدا هەبێت بۆ هەموو دینەکان موساوی بێت ، ناشچمە نێو ئەو وردەکاریەوە کە موناقەشەی بنەماکانی ئاینی بکەم ، دین مەسەلەیەکی تایبەتیەو کەسیەو پێوەندی مرۆڤ و خوایە . بەڵام دەسەڵات دەبێت یاسایەکی هەبێت بۆ هەمووان بێت ، بۆ نموونە کوڕو کچێکی بە یەکەوە دەبینن بابی کوڕەکەی کوڕەکەی خۆی لە ئامێز دەگرێت و ئەگەر پێویست بێت خۆی بۆ هەراج دەکات کە مەسەلەتی بۆ بکات ، باوکی کچەکەش دەیەوێت کچەکەی بکوژێت کە ئابڕووی بردووە بۆ؟؟!! یەك گوناهیان کردووە بۆیە بە بڕوای من ئەوە گەورەترین ناحەقیە دەرهەق بە ژنان ، من زۆرم پێ ناخۆشە کە ژن و پیاو بە نێر و مێ ناوبەرم ، نێر و مێ مەعمولەن بۆ حەیوانات بەکاردەبرێت ، ژن و پیاو کوڕو کچ پێم خۆشە بەکارهێنانی ووشەکانیش بە ووردی بێت ، نێرینەو مێینە نە شان و شەوکەتی مرۆڤ کەم دەکاتەوە .

**پ/ ئەی ژن و ئافرەت ؟**

و/ ئەمە موناقەشەیەکی زارەکی یە ، من پێم وایە ژن رەسەنترە ئافرەت یان لە ئافرۆدیتەوە هاتووە یان لە عەورەتی عەرەبی یەوە هاتووە ، یان لە ئاروادی تورکی یەوە هاتووە ، یان لە عەفیفەوە هاتووە ، بۆیە پێم وا نی یە ریشەی کوردی هەبێت ، پیاو ماقوڵانی کۆن بە ژنەکانیان دەگوت ئافرەت ، عەفیفە ، بە هەر حاڵ بەکارهێنانی هەر کام لەوانە عەیب تێدا نی یە .

# مستەفا ئیلخانی زادە لەبارەی پرۆژە کلتوورییەکەی خۆی دەدوێ



مـــــستەفای ئیلخـــــانی زادە بەرپرسی ناوەندی فێرکاری و فەرهـــەنگی ئــــەدەب لـــە دیمانەیـەك لەگـەڵ (شـەقام)دا باس لە پەروەردەو راهێنانی قوتابیـان بـە زمـانی کـوردی دەکات، ناوەندێکی کە نزیك بـە حـەوت سـاڵە لـە شـاری بۆکـــان لــــە رۆژهـــەلاتی کوردستان توانیویـەتی زیـاتر لە هەشت نۆ هەزار خوازیاری فێربـــوونی زمـانی کـــوردی پەروەردە بکات.

دیمانە : ئەحمەدی سەفا

**پ/تکایە خۆت بناسێنە ؟**

و/ مـــن بەرپرســـی ناوەنـــدی فێرکـاری و فەرهـەنگی ئـەدەب لـە بۆکانم، زیـاتر لـە پـەنجا کتێبم لـە زمانـــەکانی کـــوردی فارســـی تـــورکی(ئـــازەری) لـــە هـــەرێمی کوردســـتان و ئێـــران چـــاپ و بلاْوبۆتەوە.

**پ/ ســەبارەت بــە چـــالاکیەکانی ناوەندەکەتان بۆ خوێنـەرانی ئێمـە بدوێ؟**

و/ئـەو ناوەنـدەی ئێمـە جگـە لـە کـاری فێرکـاری زمـانی کـوردی خەریکی پەروەردەکردنی شاعیران و نووسـەرانی لاوەو ئەنجوومـەنی ئەدەبیـشی هەیـە، کـە هـەموو چوارشـــەموان کۆبوونـــەوەی بـــەردەوام دەگرێت،هـــەروەها دووسالْ دەبێت کە ناوەندەکەمان لقـــی ریکخـــراوی پـــەروەردەو بارهێنانی لە ئەدەبی منالاْن، کە ریکخراوێکـــــی حکـــــومی و سەراســـەری یـــە لـــە ئێـــران کردۆتـەوەو وەکـو بەشـی کـوردی ئـەو ریکخـراوە کاردەکـەین، جگـە لـــەوەی ریزلینـــانی شـــاعیران و نووســـەران و دانـــانی ســـیمینار لەســـەر زمـــان و ئـــەدەبی کـــوردی بەشـێکە لـە چـالاکیەکانمان لـە شاری بۆکان و دەورووبەر.

**پ/ئێوە سەبارەت بە فێرکاری زمـانی کـــوردی کارەکانتـــان لـــە ســـەر چ بنەمایەکە؟**

و/یەکـەم کـاری ئێمـە فێرکردنـی زمـــانی کـــوردی یـــە لـــە چـــەند قۆناغێکـدا، بەداخـەوە لـە ئێرانـدا

زمانی کوردی لە قوتابخانەو زانکۆکان ناخوێندرێت بە فەرمی هەرچەندە بەندی ١٥ی یاسای بنەرەتی دەستووری ئێران باس لەو مەسەلەیە دەکات بە کەم و کورتیەکی زۆرەوە،بەڵام تا ئیستاش کار بەو ئەسلە دەستووریە ناکرێت و بیانووی جۆر بە جۆری بۆ دێتەوە،ئێمە بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو کەم و کوڕیەو لەسەر ئەو باوەڕەی کە هەرچی بیکەین لە هیچ باشترە بۆیە ئەو ناوەندەمان پێکەوە ناوە،ئێمە لە ساڵی ١٩٨١ ەوە تا ئێستا زیاتر لە هەشت هەزار کەسمان لە شاری بۆکان و گوندەکانی دەوروبەری سەقز و دیاواندەرەو ساینقەڵە میاندواو، وە هەروەها لە حەفتا ئاوایی ئەو ناوچانە مەشغولی پەروەدەکردن و بارهێنانین بە زمانی کوردی، تەنانەت جگە لەو ناوچانە لە شاریاری کەرەج نزیک تارانی پایتەختی ئێران لە ریگای برایەکی یارسانی(ئەهلی هەق)، ناوەندێکمان دامەزراند کە مامۆستاکەی لە ماڵی خۆی زیاتر لە ٣٠ کەسی کۆکردەوەو وانەی کوردی پێ گوتن، لە زانکۆکانی ئێراندا لە شاری قەزوێن مامۆستا سەلاح سۆران کاتی خۆی کتێب و بڵاوکراوەکانی ناوەندی ئێمەی بە قوتابیان دەگوتەوە کە نزیك پەنجا کەسێك بەشداری خولەکەی بوو، لە زانکۆی هەمەدان مامۆستایەکی کورد بە هاوکاری ئێمە پۆلی زمانی کوردی کردۆتەوە کە تەنانەت دوو قوتابی فارس زمانیش بەشداریان تێ داکردووەو ئێمە بروانامەی ئەو قوتابیانەمان پێیان بەخشیوە، هەروەها خەریکین ماوەیەکی تر خولی فێرکاری بۆ زانکۆی پەیامی نوری بۆکان بکەینەوە،قۆناغی یەکەمی خولی فێرکاری ئێمە رێنووس و خوێندنەوەی کوردی یە بە شێوەی زانستی، کە ئەوانەی شارەزاییان لە زمانی فارسی هەبێت دەتوانن کەڵکی لێ وەرگرن، بەشداربووانی ئەو قۆناغە بەلایەنی کەم خوێندەواری سێ ی سەرەتاییان هەبێت، هەرچەندە خوێندکارانی ماجستێریش بەشداری تێدادەکەن، چوونکە بە داخەوە خوێندن بە زمانی کوردی لە ئێران یاسایی نی یە گشت قوتابیان چ سەرەتایی چ ماجستێر و چ مامۆستای ئەعدادی هەمووی ئەو کەم و کوڕیەییان هەیە کە زمانی زگماکی خۆیان نازانن، بۆیە لەو خولانەی ئێمەدا خوێندکاری لە هەموو ئاستێکی خوێندەورای تێدایە،بۆ قۆناغی دووهەممان قوتابی نابێت لە پۆلی هەشت کەمتر خوێندەورای هەبێت. لە قۆناغەدا ریزمانی کوردی و باسی زمانەوانی رەخنەی ئەدەبی و بنەماکانی وەرگێران بە زمانی کوردیان فێر دەکەین و چیرۆکی کورتی فارسیان پێ دەکەینە کوردی، لەگەڵ ئەوەی کە رێنووسی لاتینی و ئارامیان فێر دەکەین، قوتابی قۆناغی سێ یەمی ئێمە دەبێت پۆلی دوازدەی تەواو کردبێت لە قوتابخانەی حکومی، ئەم قۆناغە بۆ بارهێنانی قوتابیانە بۆ وانە ووتنەوەو بوون بە مامۆستای زمانی کوردی دیارە دەبێت بەشداربووی ئەم قۆناغە جگە لە قۆناغەکانی تری خولی فێرکاری ئێمەی بڕیبێت دەبێت پلەی زۆر باشیشی هەبێت و تێکرای نمرەی ١٧ لەسەر ٢٠ ی هێنابێتەوە، لە بەشێکی دیکەی ئەم قۆناغەدا قوتابی پێویستە بەکالۆریۆسی تەواو کردبێ و لەگەڵ دەرچوونی لە هەموو قۆناغەکانی پێشووی خولەکانی ئێمە تێکرای نمرەی ٤٥ لەسەر ٥٠ بۆ هاتبێتەوە، لەم قۆناغەدا ئێمە سەرەتای کتێبی شەرەفنامەو رەخنەی ئەدەبی و خوێندن و نووسینی کوردی بەلاتین و زۆر وانەی تری فێر دەکەین، ئێوە ئەوانەی کە

خوولەکانی ئێمە تەواو دەکەن بروانامەی مامۆستایان دەدرێتێ و خۆمان و هێندێك ناوەندی تر کەڵك لەو مامۆستایانە وەردەگرن، ئێمە ئامادەین لە هەر گوندێك کە دانیشتووانی داوا بکەن خوولی فێرکردنی زمانی کوردی بکەینەوە .

**پ/ ئەی چالاکی یە ئەدەبیەکانتان چی یە ؟**

و/وەك باسم کرد هەموو چوارشەمەیەك ئێمە لە بۆکان کۆڕی ئەدەبیمان هەیە، شیعر خوێندنەوەو باسی ئەدەبی و کورتە چیرۆك و هەڵسەنگاندنی بابەتی ئەدەبی بە بەشداربوونی کۆمەڵێك نووسەر و شاعیر بەڕێوە دەچێت،هەروەها توانیومانە بۆ ڕیزلینان لە مامۆستایان (هێدی، ئەفغەمی، ڕاوچی ) هەروەها بۆ ئەو خوێندکارانەی کە خوێندن تەواو دەکەن کۆڕ بەڕێوەبەرن، جگە لەوەی وەك لە سەرەوە ئاماژەم پێ دا وەك لقی کوردی ڕیکخراوین، ئەدەبی منالانی ئێران کە خۆم ئەندامی کارای ئەم ڕیکخراوە سەراسەریەم کارو چالاکی دەکەین، وە سێ دەورەشمان لە بواری ئەدەبی منالان کردۆتەوە،لەگەڵ ئەوەی هەموو ئەو چالاکیانە بە هاوکاری مامۆستایان و زەحمەتی نووسەرانی وەك لەیلا سالحی، سیامەندی بە ختازەر، رەحمانی جەواد، فەریدەی کەریمی ئازەر، کوردستانی مەلا مەحموودی و دۆستانی تر، هەروەها ئاغای زەحمەتکێش و یادی بەخێر مامۆستا سەلاح سۆران ئەنجام دراوە، هەر ماوەیەك لە مەو پێش ڕیورەسمێك بەبۆنەی کۆتایی هاتنی پێنج خوولی ئاستەکانی خوێندنی زمانی کوردی لە فێرگەکەمان بەڕێوەبرد کە جەماوەرێکی زۆر تێیدا بەشداربوون.

**پ/ ئایا ئێوە مۆڵەتی یاساییتان پێ دراوە لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە؟**

و/ نا ئێمە مۆڵەتی یاساییمان نی یە، بەڵام بەشێوەیەکی نافەرمی چالاکیەکانی ئێمەیان قبوول کردووە، لەبەشی منداڵێنیشدا وەك گوتم وەکیل لقی دەزگایەکی گشتی سەراسەری ئێرانیم، کارەکانی ئێمە لەگەڵ زۆر ئاستەنگیش هەروا بەڕێوە چوەو پشت ئەستوورین بەبەندی دەستووری ١٥ ی کۆماری ئیسلامی، هەروەها بەو مەنتقەی کە هەموو ئادەمیزاد بە هەموو جۆرە زمانێك خەلق کردوەو ئەوەی ئەمە لە ئادەمیزاد مەنع بکات، نەك دوژمنی ئادەمیزاد بەڵکو دوژمنی خواو فەرمایشتەکانی پێغەمبەریشە(د.خ)، تەنانەت ئەوەی ئاسانکاریش بۆ ئەم مەبەستە ناکات بە پێ ی یاساکانی ئیسلامی و مرۆڤایەتی تووشی تاوان بووە .

**پ/ ئایا نەتان توانیوە لق لە شارەکانی دیکە بکەنەوە؟**

و/ نا، چوونکە ئێمە زۆر بە بێ ئیمکاناتی ئەم کارانە دەکەین، ئەو پارە کەمەی کە لە قوتابی وەردەگرین، بەشی زۆربەی خەرجی کارەکانمان ناکات، مامۆستاکانمان زۆریان خۆبەخشن و یان پارەیەکی رەمزی بۆ ئەم کارە وەردەگرن، کردنەوەی لق و بارەگا لە شوێنەکانی تر پێویستی بە ئیمکانات هەیە، لەلایەکی تر بروانامەکەی کە ئێمە دەیبەخشین حکومەت بایەخی بۆ دانانێ و ئێمە زیاتر وەك ڕیزلینان دەیدەین بە قوتابیەکانی خۆمان کە خوولەکان تەواو دەکەن، ڕەنگە جاروبار بۆ ئیش کردن لە دەزگایەکی ئەهلی یان رادیۆو تەلەفزیۆنی بەشی کوردی بۆ سەلماندنی کوردی زانین لە کاتی تەعین بوون بەکاربێت.

**پ/ ئایا حکومەتی هەرێمی کوردستان پاڵپشتی و هاوکاری ئێوە ناکات؟**



و/ من لەگەڵ وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێم هاوکاریم زۆرە، لە هەولێر چەند خولی فێرکاریم کردۆتەوە، لەگەڵ دەزگاکانی ڕامان و سەردەمیش هاوکاریم هەیە، سەرەڕای ئەوەی حکومەتی هەرێم تا ئێستا یەك دیناری بۆ پەرەپێدانی زمانی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هاوکاری نەکردووین، کۆماری ئیسلامی ئێران لە سەر مەسەلەی خوێندن بە زمانی فارسیی لە دەرەوەی وولاتەکەی وەك پاکستان و ئەفغانستان و گورجستان و زۆر شوێنی تر، پارەیەکی زۆر خەیاڵی خەرج دەکات و خۆی بە پاڵپشتی زمانی فارسی لە هەموو دونیا دەزانێ و دەیان ناوەندی بۆ کردۆتەوە لە ناوچەکە، تەنانەت بە نیازە ئەم کارە لە هەرێمی کوردستانی عێراقیش بکات، بەداخەوە حکومەتی هەرێمی کوردستان کە تەنیا نیمچە حکومەتێکی کوردی یە سازبووەو یەك لە ئەرکە ویژدانیەکانی ئەوەیە کە یارمەتی بدات بۆ پەروەدەکردن و پەرەپێدانی خوێندن بە زمانی کوردی لە پارچەکانی تر بەداخەوە چی بۆ ئێمە نەکردووە، ناوەندەکەی ئێمە لە وەزعێکی زۆر کەم دەرامەتی دەژیت، ئێمە بۆ خولێکی مانگ و نیوی بڕی پانزە هەزار دینار وەردەگرین، کە دەبێت کتێب و جێگەی خوێندن و پڕۆپاگەندی کارەکانمانی پێ دابین بکەین، کە ئەمەش بەشی هەمووی ناکات، لە هەندێك گوند مامۆستامان هەبووە کە بە خەرجی خۆیی و لە ماڵەکەی خۆیدا قوتابخانەی خوێندنی بۆ زمانی کوردی لە ماڵەکەی خۆی کردۆتەوە، هەق وایە حکومەتی هەرێم ئاوڕێك بۆ بەرەو پێش بردنی زمان و فەرهەنگی کوردی لە ئێران بداتەوە، خۆ ئێمە ناڵێین ئەوان خۆ لەکۆماری ئیسلامی دوور بگرن، ماف خۆیانە کە پەیوەندی سیاسیان هەبێت، ئێمەش ئەو هەموو زەحمەتیە دەکێشین و چەند جار ئاکامی کارەکانمان لە زاگرۆس تیڤی و کوردستان تیڤی بلاوبۆتەوە، کەچی جارێکیش دەستخۆشی لە ئێمە نەکراوە، چ دەگا بەوەی کە یارمەتی دارایی کراین .

**پ/ئایا جەماوەر یارمەتیتان نادات؟**

و/ زۆر کەم، بەو دەلیلەی کە تا ئێستاش لەوولاتی ئێمە سەرمایەدانان لە بەشی پەروەدەو داهێنان نەبۆتە وەسیلەی داهات،لە لایەکی تریش خەڵکەکە وا هیوا براو کراوە کە خوێندنی کوردی بەکاری چی دێت و کەسی پێ تەعین نابێت و لەگەڵ ئەوەشی حکوومەت پێ ی ناخۆشی ئاستەنگیش دروست دەکات زۆر کەس هەن ناوێرن یارمەتی دەزگایەکی وەکو ئێمە بدەن. وا چاکە خەڵکی ئێمە لەبەرامبەر ئەو کەمتەرخەمیەی کە حکومەت بەرامبەر بە خوێندن بە زمانی کوردی دەیکات نارەزایەتی نیشان بدەن و مناڵەکان بۆ لای کەم یەك ڕۆژ نەنێرنە قوتابخانەکان، نوێنەرانی شارە کوردیەکان لە مەجلیسی شورای ئیسلامی داوای جێ بەجێ کردنی بەندی ١٥ بکەن و هەموو هاو بکەن کە مەدرەسەی کوردیمان دەوێت، تۆ بڵێ ی ئەو هەموو عالەمەی بکوژن!

**پ/ لێرە کەمپینی (قوتابخانە بە کوردی بێتە دامەزراندن) کراوە، ئایا ئێوە پاڵپشتی لەو کەمپینە دەکەن؟**

و/ئێمە لە هەموو هەنگاوێکی غەیرە سیاسی کە تایبەت بێت بە چالاکی فەرهەنگی و کلتووری و چەسپاندنی خوێندن بە زمانی کوردی وەك مافێکی سروشتی و ئاینی میلەتەکەمان پشتیوانی دەکەین، کاری ئەو کەمپینە کارێکی پیرۆزەو هەر ناوەندێك بۆ پەرەپێدانی زمان و فەرهەنگی کوردی هەنگاوێك بنێتەوە، ئێمە پشتگیری لێ دەکەین.

لە دیمانەیەکدا :

# دکتۆر هێمن خورشید خۆی خۆی دەخوێنێتەوە !



## بەشی یەکەم

**زۆرن ئەوانەی لەگەڵ خوێندنەوەی یەك دوو لاپەڕەی کتێب خەو دەیانباتەوە، یان دووچاری سەرئێشە و کەم بینایی دەبن، کەچی لەم لاشەوە لە ئێوارەوە تاکو درەنگانی شەو لە بەردەم شاشەی تەلەفزیۆن زەقە زەقی چاویان دێت. بەڵام کەسانی وەك "هێمن خورشید" زۆر دەگمەنن، لە بەیانی تا ئێوارە، لە ئێوارە تا نیوەشەو کتێبی هەر لە دەستە، خۆ ئەگەربێت و باسی شتێکی دیکەی غەیری کتێبیشی بۆ بکەی قەڵس دەبێت و دەڵێ: ئەمانە شتی نامەعریفین، تکایە خۆتیان پێ مەخەریکێنن، ئەگەر لە قسەکانم بەگومانن فەرموون ئەم دیمانەیە بخوێننەوە.**

### دیمانە : حەیدەر عەبدوڵڵا

**سەرەتا نازانم بڵێم هێمنی پزیشك، یان هێمنی ئەدیب و شاعیر، یان هێمنی کۆمەڵناس و ئاییناس، یان هێمنی ڕۆژنامەنووس و وەرگێر، یان هێمنی عاریف و صوّفی، دەکرێ بڵێم هێمنی هەموویان؟**

و: دەمەوێ ڕێگەکەت بۆ کورتبکەمەوە، دەتوانی هیچیان نەڵێیت و هەمووشیانت وتبێت، بڵێ هێمنی مرۆڤ!

دەزانی ئەمرۆ مرۆڤەکان ئەوەندە خەمی ناوو ناوبانگیانە، وەختە ناخ و ناوەڕۆك فەرامۆش دەکەن؟!

ناچارم پەیوەندیی خۆم و ئەو شتانەی باستکردن بە وردی ڕوون بکەمەوە. سەرەتاش دەبێت لەسەر هەر هەریەکێکیان بووەستم و شییانبکەمەوە، تا بزانین بەندە شیاوی ئەوەم ئەو هەموو ناوو نازناوانەم وە دواخرێن؟!

پزیشکایەتی: پزیشکایەتی پیشەی منە، ئیتر هەر مرۆڤە و پیشەیەکی هەیە، هەیە مامۆستایە و هەیە دوکتۆرە و هەیە جوتیارە و هەیە کرێکارە.

خەڵکی پێیان سەیرە پزیشکێك بنووسێت، لە کاتێکدا بەلایانەوە ئاساییە مامۆستایەك نووسەر بێت. جیاوازی لە نێوان پیشەی پزیشکایەتی و پیشەی مامۆستایەتییدا چییە؟! چ قەیدییە با نووسەر بیت و شێلم بفرۆشیت؟ ئەی خۆ نووسین لەم وڵاتەدا نانت نادات! من پزیشکم وەك چۆن یەکێك ئەندازیارە و یەکێکیتر فیتەرە و ئەویتر وەستای کاشییە. ئاساییە چۆن نەخۆشێك یان موراجیعێك بانگم دەکات پزیشك یان دوکتۆر، جەنابیشت و هەر کەسێکی تریش هەروام بانگ بکەن.

شاعیرێتی و ئەدیبوون: بەڕاستی هەندێجار شیعر

بەرۆکم پـێ دەگرێـت. ولـێ نـاتوانم بڵێم شاعیرم، ئاخر شاعیربوون، بە هەر کەسێك شیعر بنووسێت ناگوترێت، ئەگەر وابێت لە سەدا هەشتای کورد شاعیرن! خۆ ئەمرۆ بە ناشوکری نـەبێت خوێنـدەوارو نەخوێنـدەوار شـیعر دەنووسـێت، شـیعر بووەتـە ئـەو کـابرا بێدەسـت و بـێ پـشتیوانەی هەرکـەس هەڵدەسـتێت تـاوێکی بـاش دارکاری دەکات و پاشانیش خۆی بە خزمی دەزانێت! زوو لە شیعرێکدا وتوومە:

*کەسێ کەسێکی خۆش بوێ*

*گوڵێك و پارچە شیعرێکی*

*وەکو دیاری بۆ دەنێرێ*

*بەس من زۆرم رِق لە شیعرە*

*بۆچی هێندە ترسنۆکە*

*هەموو کەسێك*

*پێی دەوێرێ؟!*

راستە حەزم لە ئەدەبە، لە تەنکایی دەریای ئەدەبیاتدا مەلە دەکەم، لێ هێشتا جورئەتم نەکردووە خۆم فرێدەمە ناوەراسـتی ئـەو دەریایـەوە. زۆرن ئەوانـەی تەمـەنیان بەسـەربردووە، پـیر بـوون و لـە خەیاڵیشیاندا وا دەزانن ئەدیبن، کەچی هێشتا نازانن دەرگای ماڵی ئەدەب رووی بە کام لاوەیە! ئـەرێ بەراست ئەوانـە لـە کـوێی بـاڵای دەستۆیفسکی و تۆڵستۆی دان؟ چەندی تر بڕِێن لە ژێر باڵی سێبەری شکسپیرو مەولانای رۆمی دەردەچن؟

بـا زۆر دوور نـەرِۆم، ئەگـەر هـەموو تەمـەنیان بەسـەر کاغەزێکەوە بەسەر بەرن دوو دێری وەك:

(لافی دەمەکەت غونچە لە دەمیا بوو بە عەمدا

بـا خوستی بـڕی خستی کەسێکـی لـە دەم دا)ی نالی دەنووسن؟!

مەولانا جەلالەددین دەفەرموێت:

*حاصل عومرم سه کلم بیش نیست*

*خام بودم پوخته شدم سوختم*

واتە:

*بەرهەمی عومرم سێ وشە زیاتر نییە*

*کـاڵ بـووم، کـوڵام و سـووتـام*

بـێ موجامەلـە و خۆشـکاندن، بەنـدە خـۆم لـە قۆنـاغی یەکەمـدا دەبینمـەوە و تەمەنەکەیـشم هەروایـە، نـاتوانم لافی گەورە گەورە لێبدەم، مامۆستا (مەسعود محەمەد لــە وەڵامــی یــەکێ لــە رۆژنامەنووســاندا کــە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا سازدابوو و زۆری بە شان و باڵـدا هەڵـدابوو، دەڵێـت: هێنـدەت هـەڵبڕیم، دەترسـم خەڵکەکە تێمنەگەن. یـان دەیفـەرموو: سـوپاس بۆ ئـەو موجامەلەیـەی جـەنابت! ناچـار منـیش هـەروا بڵـێم زۆرجار خۆشەویستی وا دەکات بەرانبەرت لەبەرچاو گەورە بێت. پەیمانت پێدەدەم هەوڵبدەم نەوەستم تا دو قۆناغی شیعرەکەی مەولانا کە سووتانە(واتە قاڵبوون و حـەکیمبوون)، وەلـێ دەبێـت پێـت بڵـێم هێـشتا لـە سـەرەتای رێگـەدام و هەنـدێجار خەریکـە بێئومێـدیش دەبم، ئـاخر مـرۆڤ کێـوی وەك غـەزالی لـە پـێش خۆیـەوە دەبینێت هەر ئەوە نییە زراوی بچێت، کێ بێت بتوانێت لە پایەی ئەو پیاوە نزیك ببێتەوە؟

**کۆمــەڵناس و ئاییننــاس:** پــڕ بــەدڵ ئاواتــەخوازم توێــژەرێکی کۆمەڵایــەتیی باشــم لێدەربــچێت، کــورد پێویستی بە کۆمەڵناسی بەتوانایە. لە پەنجاکاندا (عەلی وەردی)یەك پەیدا بوو، کۆمەڵگەی عێراقیی خوێنـدەوە و لـێی کۆڵییـەوە، زۆر کـەلێن و عـەیب و عـاری خستەروو. زۆری وت و کـەس گـوێی نەدایـە، بە دەردی نالی دەڵێت: (زۆرم وت و کەس تێی نەگەیی و ئێستە خەمۆشم). بەڵام کورد تا ئێستا خەو بە عەلی وەردییەکەوە دەبینێت، لە ئەمرۆدا میللەتی کورد لە هەموو شتێك زیاتر پێویستی بـە دەروونـنـاس و کۆمـەڵناس هەیـە . . زۆرن ئەوانـەی پێیـان دەوترێـت توێـژەری کۆمەڵایـەتی، کەچـی خۆیـان پێویـستیان بـە دەروونـنـاس و کۆمەڵناسـە تـا فێـری هەڵــسوکەوتی دەروونناســییانە و کۆمەڵناســییانەیان بکـات . . ئەگـەر مامۆسـتایەکی بەشـی دەروونناسـی لـە

زانکـۆدا، خوێنـدکارەکانی لـە ڕەفتـارو هەڵـسوکەوتی نارازی بن‌و حەز بە وانەکانی نەکەن‌و هەر بە ناوهێنانی دەمووچاویان گرژبێت، تۆ پێت وایە دەروونناسە؟

بە بڕوای من کۆمەڵناسیی تێکۆشانێکی زۆری دەوێت، عــەلی کــوڕی ئــەبو تاڵیــب (خــوای لــێ ڕازی بێــت) دەفەرمووێت: " من عرف نفسه، فقد عرف ربَّه." (ئەوی خــۆی ناســی، بێگومــان خــوای خۆیــشی ناســیوە)، پێچەوانەکەیشی ئەوەیە: هەرکـەس خـۆی نەناسـیبێت خـوای خۆیـشی نەناسـیوە! ئـەم گوتەیـە دەکرێـت بـۆ ئێرەش تەوزیف بکرێت، کەسێك خۆی نەناسیبێت چۆن دەتوانێت لافی ئەوە لێبدات کۆمەڵناسە؟! تـۆ سـەرەتا خۆت بناسە، ئینجا وەرە باسی کۆمەڵناسی بکە.

چەند ساڵێك لەمەوبەر برادەرێك کە خاوەنی ناوێکیشە لـە دونیـای کوردییـداو بـە حیـساب کۆمەڵناسـە، لـە بابەتێکـدا باسـی لە ڕەفتـاری خـەڵکی شـارێك کردبـوو، خەریك بوو شار بەدەر بکرێت، لە دەیان لاوە بەر تانەو تەشەر درا. من نازانم ئەو ئەنجامانەی ئەو بەرێزە پێی گەیشتبوو ڕاستن یان نا؟ ناشزانم مەبەستی چی بوو لەو قسانەی‌و دەیەویست چ ئامانجێك بپێکێت؟ وەلێ ئەوە دەزانم ئەو قسەیەی قسەی کۆمەڵناسێکی بەرچاوڕوون نەبوو، دەزانی بۆ؟ چون دەبوا بیزانیبا پەرچەکرداری خـەڵکی بەرانبـەر بـەو قـسەیەی چـی دەبێـت؟ ئیـتر یـان شتێکی وای نەوتبایاو یان وەختێك گوتی ماوەیەك لەو شارە ون بووایە. ئاخر کۆمەڵناس هەر ئەوە نییە لە نێو کتێبــدا بــژێت، دەبێــت کــردارو پەرچــەکرداری کۆمەڵگاکەشی بزانێت.

مەبەستیشم ئەوە نییە بڵێم هەرکەس شتێکی بە ناهەق زانی بیشارێتەوەو لە ترسی خەڵکیدا نەیڵێت، بەڵام وەك قورئـان دەفـەرموێت: ﴿ولاتُلقـوا بأنفُسِكم الى التهلُكـه﴾، مـرۆڤ نابێت لە خـۆڕا خـۆی تووشـی گرفتێك بکـات کـە ئەوە ناهێنێت تووشی بێت.

بیرت نەچێت ئەو خۆ نەخستنە تەنگانەوە، بەرەنگاریی گەنــدەڵی‌و دژایــەتیکردنی فــەرمانڕەوای ســتەمکار ناگرێتەوە، هەر ئەو پێغەمبەرەی ئەو قورئانەی هێناوە دەفەرموێت: "أفضل جهادٍ عند الله كلمه حق عند سلطانٍ جائر": (باشترین جیهاد لای خوا، وتنی وشەیەکی هەقە لە بەردەم دەستەڵاتدارێکی ستەمکاردا". ئیتر هەر ئەو (الله)یەی (ولاتلقوا)ەکەی وتووە، باشترین جیهادی پێ وتنی هەقێکی ڕەقە لای پاشایەکی کەللەڕەق!

شارەزابوون لە کۆمەڵناسی ئاواتێکی هەرە گەورەمـە، وەلــێ ئیــددیعاکردنی ئــەوەی کۆمەڵناســم دەبێتــە فشەیەکی زیادەو هیچی تر.

بەنیــسبەت ئاییناســییەوە، بــەڵێ مــن کۆلێــژی شەریعەتیشم تەواوکردووەو تاڕادەیەك شارەزای زانستە ئیـسلامییەکانم، بـەڵام ئاییناسـی واتـە: ئاگـاداربوون لەســەرو بنی هــەموو ئایینــەکان، ئیـسلام، مەسـیحی، جولەکایــەتی، بــوزیی، زەردەشــتی، کۆنفۆشیۆســی، مانـەوی... هـەروەها شارەزابوون لە هەرچی ڕێبـازو ڕێـچکەی ئـەو ئایینانەیـە. بـۆ نموونـە هـەر شیعە کـە مەزهــەبێکی ســەر بــە ئــایینی ئیــسلامە نزیکــەی چـل ڕێچکەی لێدەبێتەوە! جا تۆ بڵێی لەم تەمەنەی بەندەدا کەسـێك هــەبێت بــەو قوڵییــە شــۆڕبووبێتەوە بـۆ بنـی دەریـای ئاییناسـی؟ با هـەموو تەمەنیشی هـەر خـەریکی خوێندنەوە بێت لـەو بوارەدا، بڕوا ناکەم! بەندە شەش حـەوت ساڵ بـەس خـەریکی خوێنـدنی پزیشکی بـووم، خۆیـشم تەمـەنم هـەر چـوار حـەوت ساڵییە، کـە حـەوتی یەکــەمیانم هــەر بــە یــاریکردنی نێــو کۆڵانــەوە بەسەربردووە!

ڕۆژنامەنووسی: دەبێت بڵێم کاری ڕۆژنامەنووسی ڕێك پێــچەوانەی نووســین‌و خوێندنــەوەی بــە بەرنامەیــە، نامــەوێت پیــشەی ڕۆژنامەنووســی ســوك بکــەم، لــێ دەتـوانم بڵـێم مـن قـەت نـاتوانم ڕۆژانە بە دوای نرخـی تەماتـەو گرانـی بلیتـی عیـادەی پزیـشکان‌و پژمـەی لـە ناکـاوی سـەرۆك حیزبێکـدا بگـەڕێم‌و یەکـسەر بیکەمـە



ڕاپۆرتێکو بینێرم بۆ بڵاوکراوەیەکو، سەری مانگیش چاوەڕێی موکافەئەکەی بکەم! ڕاستە بۆ ماوەی دە ساڵ لەسەر ڕووپەڕی ڕۆژنامەکاندا بابەتم نوسیووەو ئیستاش بەپێی هەبوونی دەرفەت هەر دەنووسم، وەلێ جیاوازی هەیە لە نێوان وتاری ڕۆژنامەیی و ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسییدا، لای خۆمان تا ئێستا زاراوەیەك بە ناوی نووسەری ڕۆژنامەوە نییە، مەبەست ئەو نووسەرەیە کە بۆ ڕۆژنامە دەنووسێت. دەکرێت بەندە پێم بوترێت (كاتب الصحافة)، چونکە بە درێژایی ساڵانی خوێندنی زانکۆو تا ئێستاش کەمو زۆر لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بابەتم بڵاوکردووەتەوەو دەکەمەوە. بەدەر لەوە ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی و چاوپێکەوتنو هەواڵناردنو ئەو جۆرە شتانەم قەت نەکردووە، چونکە نە بواری ئەوەم هەیەو نە حەزیشی پێ دەکەم.

وەرگێڕان: هەرچی وەرگێڕانە، ئەوە شەڕێکەو یەخەی پیاو دەگرێت، ئاخر تۆ کە بەدەر لە زمانەکەی خۆت یەك دوو زمانی تر بزانیت، بێگومان چاوت بە دەقی جوان دەکەوێتو چێژی لێ دەبینێتو حەز دەکەیت هاوزمانەکانیشت لەو چێژبینینەتدا بەشداربن، لەلایەکی تریشەوە تەماشای ئەو بازارە بێسەروبەرەی وەرگێڕان دەکەیت لە وڵاتەکەتدا، تووشی کۆخەو تەنگەنەفسی دەبێت، هەرکێ هەڵدەستێت بێ ئەوەی زمانی خۆی بە باشی بزانێتو بێ ئەوەی هیچ زمانێکی تر بزانێت دەست دەکاتە وەرگێڕانو، کایەی بێ سانسۆری داتەپیوی ڕۆشنبیریی ئێمەش پێی دەڵێت: فەرموو قوربان تۆش قولاپی خۆت هەڵبدە، ئیتر هەروا کتێبەو بە ناوی وەرگێڕانەوە بڵاودەکرێتەوە. وەرگێڕانی چی؟ تۆ بڵێ: وەرگەڕان، ماڵکاولکردنی نووسەران، هەڕاجکردنی بەری ڕەنجی بیریاران، شێتکردنی خوێنەری کوردی بەستەزمان..! ئاخر کتێبی وەرگێڕدراو هەیە دەیخوێنیتەوە نازانیت باسی چی دەکاتو مەبەست لێی چییەو دەیەوێت چی بڵێت؟! ئیتر لە داخاندا تووڕە هەڵدەدەیت، لە کاتێکدا نووسەرەکەی بیریارێکی بەناوبانگی عەرەبی یان فارسی یان ڕۆژئاواییە! ئەوە خەتای کێیە؟ بەدڵنیاییەوە ئەو کەسەی کردوویەتییە کوردی، نەك هەر خەتای کردووە بەڵکو دووچاری گوناهێکی گەورەیش بووە، تۆ کە کوردی نازانیت ج ئیشت بە وەرگێڕان داوە؟ تۆیەك کە دە کتێبت نەخوێندووەتەوە چۆن پێنج کتێبت وەرگێڕاوە..؟!

ئەمانە وا دەکەن، لە پاڵ بۆڵەبۆڵو وردە گلەییەوە دەست بۆ بەکوردییکردنی هەندێ بابەتو نووسین ببەم بەشێکی زۆری ئەو وەرگێڕانانەم لەسەروەختی خوێندنی زانکۆدا کردووەو جگێکیشیان لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوکراونەتەوە. چەند کتێبێکیشم وەرگێڕاوە، وا وردە وردە ڕێگەی چاپخانە دەگرنەبەر.

عیرفانو سۆفیگەری: عیرفان دەریایەکە نە ئەمسەری دیارەو نە ئەوسەری، عاریف بە کەسێك دەوترێت مەلەوانێکی باشی ئەو دەریایە بێت، هەموو عارفێك سۆفییە وەلێ هەموو سۆفییەك عاریف نییە.

ئەگەر بچینە نێو باسی تەسەووفەوە، ڕەنگە بەم زووانە دەستمان لە یەخەی یەکتر نەبێتەوە. زۆر زانست هەن تەنها لایەنی تیۆرییان هەیە، بە نموونە زانستە مرۆییەکان، وەك فەلسەفە، لاهووت (تیۆلۆژیا)... هتد. زانستیش هەیە دوو لایەنی تیوریو پراکتیکی هەیە. ئەمانە پێیان دەوترێت زانستی ئەزموونی، وەك پزیشکی، فیزیا، کیمیا... هتد.

ئەگەر بمانەوێت تەسەووف لەو نێوەندەدا جێبکەینەوە. ناتوانین بیخەینە ڕیزی هیچ یەك لەو دووانەوە، ئاخر تەسەووف لایەنی تێوری هەیە، ئەوەیان لە کتێبدا هەیەو هەموو کەسێك دەتوانێت بیخوێنێتەوە، وەلێ لایەنە کردارییەکەی وەك هەڵدڕینو توێکاریی تەرمێك نییە کە خوێندکاری پزیشکی دەیکات، یاخود تێکەڵکردنی دوو توخمی کیمیایی نییە، بڵێی ئەمە

ـدیدرۆجینەو ئەوەیش ئۆکسجین و تێکڵیان بکەیت، دوو ـەمیان و یەك لەویان و ئاوت دەستبکەوێت، یان ـحزییەك بکەیتە تەوقەسەری بۆقێکداو هەر چوار پەل ـەکبخەیت و دوایش هەناوی بە نووکی نەشتەر ـەڵدریت و دەرسی لەسەر بخوێنیت .

ـێەنی کرداریی تەسەووف، جیاوازییەکی جەوهەری هەیە لە زانستە ئەزموونییەکان، لەمیاندا ئەوەی خەریکی توێکارییەکەیە خۆتی و تەرمەکەیش cadaver) هەر خۆتی، ئەوەی توخمەکان تێکەڵدەکات خۆتی و توخمەکانیش هەر خۆتی، ئەوەی ورگی بۆقەکە هەڵدەدرێت خۆتی و بۆقەکەیش هەر خۆتی!

لە تەسەووفدا مرۆڤ دەبێت بە دوو کەس، یەکێك لەو ـروانە هەوڵدەدات ئەوی تر جێبهێڵێت، بۆ ئەوەی ـدەستی بگاتە ئاسمان، بۆ ئەم کارەیش یەك رێگەی لە بەردەمدایە: دەبێت پێ بەسەر ئەوەکەدا بنێت تا بەرز ببێتەوە، ئەوەکەیش هەر خۆیەتی. کەواتە دەبێت پێ بە خۆیدا بنێت . . ئەمەیە مەبەستی شیعرەکەی مەولانا:

***این جام نهادەاند در تاق بلند***

***پا بر سر خود نه که دستت برسد!***

ئەو بادەیان _بادەی عیشق_ لە تاقێکی بەرزدا داناوە، بۆ ئەوەی دەستت پێی بگات، دەبێت پێ بەسەر خۆتدا بنێیت) .

هەندێکی تر لە سۆفییان پێیان وایە دەبێ نەمێنێت و ببێتە خۆڵ لە بەر پێی مەعشوقدا بەو ئومێدەی لێت رازی بێت. ئەوەتا (مەحوی) دەفەرموێت:

***مەبزوە (مەحویا) لەم رێگەدا تا دەبیە خاکی رێ***

***ئومێدە دەستی گەردت هەر دەگا ئاخر بە داوێنی!***

خۆ رەنگە بەو حاڵەشەوە هەر دڵی وەدەست نەهێنێت و نەتوانی وا بکەیت خۆشی بوێیت:

***تەپ و تۆزی غوباری دیم و رێگەی گۆڕی و دەیگوت***

***دەترسم دامەنم ئاخر ببێ ئالوودە بەم گەردە!***

لە هەردوو بارەکەدا، چ ئەوەی پێ بەسەری خۆیدا بنێت و چ ئەوەی ببێتە گەرد و تۆز، سۆفی بەردەوام لە حاڵەتی دوودڵی و دڵەڕاوکێدا ژیان دەگوزەرێنێ .

ئەم موجاهەدەت و ماندووبوون و هیلاکییە پێی دەوترێت (سلوك)، فیعلی سلوك (سلك)ەیە، واتە رێدەبڕێت، (سلوك) واتە رێبڕین، ئەم وشەیە هاتووەتە ناو زمانی کوردییشەوەو لە هەندێ ناوچەدا بە واتای رەوشت و رەفتار بەکاردەبرێت، دەوترێت فلانەکەس سلوکی جوانە، واتە رەوشتی بەرزە یان خاوەن رەفتارێکی رێکە

(نالی)ش دەڵێت:

***بە میعراجی سلووکی سالیکاندا تا نەچی رۆژێ***

***لەناو جەهلی مورەککەبدا دەمێنی هەر وەکو ماوی!***

خاڵێکی تر هەیە گرنگە باسی بکەین، ئەوەی لە ناو خەڵکدا بە سۆفی ناو دەبرێت و باس دەکرێت فری بەسەر تەسەووف و سۆفیگەرییەوە نییە، سۆفیگەری شتێکی زۆر جودایە لە دەروێشایەتی. تەنانەت هەندێ کەس دەڵێن تەسەووف یان بورهان یان حەقیقەت جودایە لە شەریعەت و بگرە ئەوەی یەکەم شۆڕشێکە بەسەر ئەمەی دوابیدا!

ئاخر شەریعەت بریتییە لە ئەحکامە وشك و رەقەکان بە بێ رووح، وەلێ تەسەووف یانی رووح، واتە رەچاونەکردنی حوکمە رووکەشەکان (الأحکام الظاهریة).

هەر ئەمەیشە هۆکاری نامۆبوونی سۆفییە گەورەکان لە مێژووی ئیسلامداو بە گومانەوە روانین لە رەفتارو کرداریان لەلایەن فەقێیان و مەلایان و زۆرینەی خەڵکەوە.

کەسانی وەك حەللاج، ئیبن عەرەبی و سوهرەوەردی لەو رێگەدا گیانی خۆیانیان بەختکرد.

خۆ کەسانێکیش هەبوون هاوسەنگیی نێوان شەریعەت و حەقیقەتییان راگرتووە، لە نموونەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك، ئبراهیمی کوڕی ئەدهەم، حەسەنی بەصری، ئەبو حامیدی غەزالی و . . .





هتد.

لـه نموونـەی گـەورە سـۆفییانی جیهـانی ئیـسلام دەتـوانین نـاوی کەسـانی تـریش ببـەین، وەك ڕابیعـەی عەدەوی، جونەیدی بەغدادی، شیبلی، شێخ ئەحمەدی ریفاعی، ئیمامی سەرهەندی کە بە قوتبی ڕەببانییش ناودەبرێت. ئەمەی دواییـان زاراوەی (وحدة الشهود)ی داهێنا. (وحدة الوجود) بە واتای ئاوێتەبوونی ڕووحی بەندە لە خودادا دێت، ئەمەیش لە دیدی شەریعەتەوە بە کـوفر دادەنرێـت. لـە کاتێکـدا (وحـدة الـشهود) یـانی: نومایـانبوون و تەجەللابوونی هێـزو گـەورەیی و جـوانی خوا لـە ڕێگـەی درووستکراوەکانییەوە، تۆ کە گوڵێکی جـوان دەبینیـت یەکـسەر هێـزو گـەورەیی خـودات بـۆ دەردەکـەوێت، بـەڵام ئەمـە مانـای ئـەوە نییـە خـودا لـەو گوڵـەدا خـۆی حەشـارداوە، ئـەوە سـنووردارکردنی خودایە، خودایش نابێت سنووردار بێت، کە سنووردار کرا لە خوایی دەکەوێت!

تەسـەوف (mysticism) تـەنها لـە ئیـسلامدا نییـە، خـەڵکانێك پێیـان وایـە، سـۆفیگەریی ئـایینێکی سەربەخۆیەو لە هەموو ئایینەکاندا بە پێی کات و شوێن دەردەکـەوێت، هـەروەها وای بـۆ دەچـن گەورەسـۆفییانی وەك حـەللاج و ئـیبن عـەرەبی مـسوڵمان نـەبوون و لەبـەر بـاروودۆخ و بێدەسـەڵاتییان و هـەروەها بـۆ ڕاکێـشانی مـسوڵمانە سـادەکان و ڕەشـۆکی خـەڵك خۆیـان بـە مسوڵمان پیشان داوە! ئەوان دەڵێن ڕستەی (انا الحق) کـە مەنـسووری حـەللاج بـەردەوام لەسـەر زاری بـووە بریتیە لە وشەی (انا )و (الحق). کە لە (مبتدأ)و (خبر) پێکهـاتووە، هـیچ واتایـەك هـەڵناگرێت جگـە لـە (مـن خودام)! . ئاخر (الحق) ئەلیف و لامی تەعریفی پێوەیەو بەو شێوەیەش تەنها مانای خودا بە دەستەوە دەدات .

یان (محی الدینی عەرەبی) هەندێ وشەو دەستەواژەو شیعرو دەربڕینی هەیە، بە ئاسانی تەئویل ناکرێن. ئەو لـە هەنـدێ نووسـینیدا بـە شـێوەیەکی (مـەرموزم)و

نامـەفهوم دەڵێـت: (وەلی) لـە (نـەبی) گـەورەتر... (نـەبی) لـە ڕێگـەی جوبرائیلـەوە وەحـی بـۆ دێـت... کاتێکدا (وەلی) ڕاستەوخۆ لە خواوە ئیلهام وەردەگرێ... یـان لـە ئاوێتـەبوونی ڕووحی خـالیق و مەخلووقـدا... ڕۆدەچێت، ئەوەتا ئێژێت:

***وما الکلب والخنزیر الا الهنا***

***وما الله إلا راهب فی کنیسه***

واتە: (سەگ و بەراز هەر هەمان ئەو خودایەن بڕوا... پێـی هەیـە، خـودایش هـەر ئـەو ڕاهیبەیـە کـە لـە کڵێسەیەکدا دەیبینین!) .

ئەمە وایکردووە زانایەکی گەورەی وەك (ئیبنو تەیمیە) کە بە (شیخ الإسلام) ناسراوە بە کافری بزانێت. ئەو... کتێبی (الفُرقان بین أولیاء الرحمن واولیاء الشیطان) بـە ڕاشـکاوی (ئـیبن عـەرەبی)ی بـە کـافرو بێـدین... نـاوبردووە، لە چەندین نووسینی تریشیدا بە توندی هێرشی دەکاتە سەر .

لـە کاتێکـدا زانایـەکی پایەبڵنـدی وەك (سـەعیدی نوورسی) کە بە (بدیع الزمان) ناودەبرێت، لەم بارەوە دەبێـژێت: " ناکرێت وا بە سانایی کەسێکی وەك ئیبن عەرەبی کە زانایەکی شارەزاو گەورە بووە کافر بکرێت، چونکە وتەو دەستەواژەکانی ناڕوونن و بە ئاسانی ڕاڤە ناکرێن" .

بـە هـەرحاڵ عیرفـان و تەسـەووف دوو دەریـان، کەسـێ مەلەوانی باش نەبێت ناشێت بە دەوریاندا بچێت .

مـن لـە ڕووم نایـە تەنانـەت لافـی ئـەوە لێبـدەم بۆنی عیرفان بە لووتمدا چووە، کەچی تۆ لێم دەپرسیت: بە عاریف بانگت بکەم یان بە سۆفی؟!

**بیستوومە تۆ زۆر دەخوێنییەوە، بەڵام بە خوێندنەوە قەلـەق دەبیـت، بۆچـی خوێندنـەوەی چـەندەها ساڵ نەیتوانیوە فریات کەوێت و لە قەلەق ڕزگارت بکات؟**

و: ڕاستت بوێت من لە پێنجی سەرەتاییەوە دەستم بە خوێندنەوە کردووە، سەرەتا هەندێ گۆڤاری منااڵان...

ـ ستانە بە شیعرکراوەکانی وەك: شیرین و فەرهادو ـیلا و مەجنوون و خورشیدی خاوەرو چل تووتی و، ـ ی ئەوەیش: دیوانی قانع و بێکەس و یەك دوو کتێبی ـ مۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس کە ناویانم بیر ـەماوە، بەس دەزانم باسی ئامۆژگاری ئایینی و ـەماکانی ئاینیان دەکرد، ژیانی پێغەمبەرانی محەممەدی شڵماشی)یشم هەر لەو سەردەمەدا خوێندووەتەوە. پاشان دەستم بە خوێندنەوەی ڕۆمان کرد. بێسەرپەرشتان و حەمەدۆکم لە یازدەو دوانزدە ساڵیدا بە تامەزرۆییەکی ئەوتۆوە دەخوێندەوە وەخت بوو کتێبەکەش قوت بدەم! دوای ئەوە ڕووم کردە خوێندنەوەی هەندێ کتێب و نامیلکەی فیکریی _ ئایینی، هەڵبەت بە زمانی کوردی، وەك کتێبەکانی محەممەدی مەلا صاڵحی شارەزووری، سەردەمێکیش زۆربەی چیرۆکەکانی (عەزیز نەسین)م خەتم کرد.

ئەمانەی باسیان دەکەم لە نێوان پۆلی پێنجی سەرەتایی و پێنجی ئامادەییدا کردوومن، لە پۆلی چواری ئامادەییشەوە بە باشی خوێندنەوەی کتێبی عەرەبیم دەستپێکرد_خوێندنی من هەر لە سەرەتاییەوە بە عەرەبی بووە_، هەر لەو کاتەوە عاشقی ناوەکانی عەباس محمود العقادو سەید قطب و توفیق الحکیم و نجیب محفوظ) بووم، شەوو ڕۆژ لە خەیاڵی ئەوەدا بووم کەی بتوانم زیاتر بەو نووسەرانە ئاشنابم و بەرهەمەکانیان بخوێنمەوە، زۆرم حەز لە وانەی عەرەبی دەکرد، بیرم نایە قەت نمرەم لەو وانەیە لە نەوەد هاتبێتە خوارەوە، لە پۆلی چوارەمی ئامادەییدا مامۆستای عەرەبیمان ڕۆژێ وتی: دەبێ هێمن بکەم بە (طه حسین)، ئیتر لە وەختەوە هەمیشە حەزم دەکرد (طه حسین) بە باشی بناسم، هەر ئەو مامۆستایە ڕۆمانی (شرق المتوسط)ی (عبدالرحمن منیف)ی بۆ هێنام، ڕۆیشتم وەرگێڕانێکی کوردی هەبوو پەیدام کرد، دێڕ بە دێڕ عەرەبییەکەم دەخوێندەوەو کوردییەکەیشی هەروا، پاشان بەراوردم دەکردن، ئەو وشە عەرەبییانەی ماناکانیانم نەدەزانی دەمنووسینەوەو واتاکانیانم دەردەکردو لەبەرم دەکردن، دوای خوێندنەوەی ئەو ڕۆمانە عەرەبییەکەم ١٠٠٪ بەرەو پێشەوە چوو، بووم بە کەسێکی تر. من تا ماوم ئەو مامۆستایەم کە لەم ڕۆژانەدا ماستەری لە ئەدەبی عەرەبییدا وەرگرت لەبیر ناچێت، ببمە پرۆفیسۆریش هەر قوتابیی ئەوم، زۆر نین ئەو کەسانەی کاریگەریی وا گەورە لە ژیانماندا جێدەهێڵن.

هەر لە دوانزدە سیانزە ساڵیشەوە لە ڕێگەی تەلەفزیۆنەوە فێری فارسی بووم، نەك هەر من خوشك و براکەیشم بە باشی فێری ئەو زمانە بوون، تەنانەت دایکیشم کە تەمەنێکی هەیە ڕەنگە وەختێك تەماشای فیلمێکی فارسی دەکات پێویستی بە وەرگێڕان نەبێت. ئەو فارسی فێربوونە چونکە لە تەمەنی منداڵییدا بووە باش چەسپیوە. پاشان وردە وردە دەستم بە خوێندنەوەی گۆڤارو ڕۆژنامەی فارسی کرد تا گەیشت بە دیوانی حافیزو سەعدی و (فیه فیه مافیه)و (مثنوی معنوی)ی مەولانای ڕۆمی.

لە پۆلی پێنجی ئامادەییەوە خۆم بۆ فێربونی زمانی ئینگلیزی ئامادەکرد، وشەی وەهام لە فەرهەنگەکان دەردەهێنا و لەبەرم دەکردو خۆمم پێوە فشدەکردەوە، لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نەبوو: دوخێنی شەرواڵ، سەروپێ، دارلاستیك، دەنگی گەلا...، دواییش کە لە کۆلێژی پزیشکی وەرگیرام هەموو خوێندنم بوو بە ئینگلیزی، شەش حەوت ساڵ خوێندنی زانکۆ بەو زمانە بەزۆر فێری ئینگلیزیی کردم!

بەدرێژایی ساڵانی خوێندنم لە زانکۆو مانەوەم لە بەشی ناوخۆیی، قەت ڕۆژێ ژووری من بێ کتێب و کاغەز نەبووە، هەڵبەت مەبەستم کتێبی پزیشکی نییە، شیعرو ڕۆمان و فیکرو فەلسەفە! لە هەر شوێنێ بم تەنها بوون و نەبوونی کتێبم لا مەبەستە، لەگەڵ کتێبدا دەنووم و سبەینێش یەکەم شتێك دەیبینم کتێبە!

وەختێ تەلەبە بووم پارەم دینار دینار کۆدەکردەوە و کتێبم پێ دەکڕی، کاتێکیش دەستم قەڵەمی گرت و جارجار پاداشتی نووسینێکم بۆ دەهاتەوە بێ دوودڵی





دەمدا بە کتێب، ئێستا بە قەولی دایکم ئەگەر ماڵمان بڕوخێ بەسەر کتێبدا دەڕوخێ، پێچ و پەنای ماڵمان کتێبە. دایکم هەندێجار بە سوعبەتەوە پێم دەڵێت: بۆ ڕێم نادەی بەو کتێبانەت تەنورێ دابخەم! _لە گەرمیاندا تەنووری قوڕ هەیەو بە دارو پشقل گەرمدەکرێت_.

ئەگەر سەرچاوەیەکی دارایی‌یم شك ببردایە بێگومان وازم لە پزیشکایەتی دەهێناو هیچ کارێکی تریشم نەدەکرد، هەموو کاتم بۆ خوێندنەوە تەرخاندەکرد، من وەختێ دەیشنووسم بێتاقەت دەبم چونکە لە کاتی خوێندنەوەم دەگرێت! (هاوژین) بەرلەوەی ببێتە هاوسەرم خوێنەرێکی باش بوو، کەچی ئێستا نەك هەر نێوانی لەگەل کتێبدا خۆش نییە، بگرە ڕقیشی لێیەتی، ئەو کتێب بە (هەوێ)ی خۆی دەزانێت. دەڵێن هاوسەری یەکێك لە زانایانی کۆنی دونیای ئیسلام وتوویەتی: بریا لە بری ئەم کتێبانەی مێردەکەم سێ هەوێم هەبوایە!

من لە پێناو خوێندنەوەو فێربووندا قوربانییم بە زۆر شت داوە، چۆن کەسێك کە لەسەر جگەرە یان ئەلکهول ڕاهاتبێت ئەستەمە بتوانێت بە ئاسانی وازی لێبێنێت، بۆ منیش دەستهەڵگرتن لە کتێب و کاغەز ئاوها سەختە.

گرنگە ئەوەش بڵێم، کۆکردنەوەی خوێندنی پزیشکی و خوێندنەوەی فیکرو ئەدەبیات قوربانیی دەوێت، زەحمەتێکی زۆری پێویستە. من زۆرجار وتوومەو ئێستاش لێرەدا دەیڵێمەوە، خوێندنی پزیشکی بە کچێکی شۆخ و شەنگی نازپێدراوی تاقانەی داك و بابی دەچێت، بهێنە بەرچاوت حەز لە کچێکی وا بکەیت و ئەویش قبوڵت بکات، دوای ماوەیەك دڵت بچێتە سەر کیژێکی تر، چی دەقەومێت؟ ڕاستییەکەی هیچ ئافرەتێك پێی خۆش نییە لە هەمانکاتدا یەکێکی ترت لەگەڵیدا خۆشبووێت، وەلێ کیژی تاقانەی شۆخ و لەباری نازپێدراو ڕێگەت نادات لە خەیاڵیشتدا بیر لە کەنیشکێکی دی بکەیتەوە، خوێندنی (طب)یش ڕێك وایە، ئەو پەندەی دەڵێت: (دوو کاڵەك بە دەستێك هەڵناگیرێت) ئەگەر بۆ هیچ شتێك ڕاست نەبێت، بۆ کۆکردنەوەی خوێندنی پزیشکی و خوێندنەوەی ئەدەب و فیکرو فەلسەفە پڕاوپڕی واتا ڕاستە، وەلێ من ئەو دوو کاڵەکەم هەڵگرت، ئەمن ماست و ماسیم پێکەوە خوارد_ لەناو خەڵکدا قسەیەك هەیە، دەڵێن گوایە خواردنی ماست و ماسی پێکەوە دەبێتە هۆی تێکچوونی ڕەنگی پێستی مرۆڤ و دروستبوونی پەڵەی لەککە لەسەر جەستە_! بەڵام ئەمە هەروا بە ئاسانی بەسەرمدا تێنەپەڕی، لە کۆلێژدا هاوڕێم هەبوو لە زانستی پزیشکی بترازێت یەك دێڕی لە هیچ زانستێکی هونەرێکی تردا نەدەزانی، ڕەنگە ئەگەر پرسیاری سوکراتت (Socrates) لێی بکردایە بە سوکرۆز (Sucrose) تێگەیشتبایەو، باسی ئەرستۆیشت (Aristos) بۆ کردبا وایدەزانی باسی (ئارپرایتس Arthritis) (جومگە ئێشە)ی بۆ دەکەیت، کەچی ئەو هەر ناجیح دەبوو، بەڵکو نمرەی باشیشی دەهێنا. لێ من هەموو ساڵێك بە هەزار ناری عەلی دەردەچووم.

جا قوربان باسمان لە زۆر خوێندنەوەیە، بەڵێ زۆر دەخوێنمەوەو زۆر پەرتووکم تەماشاکردووە، وەلێ زۆر لەوە زیاتریش کتێب ماون خەیاڵ بۆ خوێندنەوەیان دەچێت و لە بەردەست و لە پێش چاودان و کەچی کات بۆ خوێندنەوەیان نییە!

دەپرسیت زۆر دەخوێنیتەوەو تا بێت زیاتر قەلەق دەبیت، ئەی بۆ بەنیازی خوێندنەوەی زۆر دڵنیاییت پێ ببەخشێت؟ ئەدی نەتبیستووە تا زیاتر بزانیت خەمت زۆرتر دەبێت؟ تا مێشك کراوەتر بیت خەفەتبارتریت. خوێندنەوە پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی بیرو باوەڕی جێگیرە، کردەی گوللەبارانکردنی دڵنیاییە، سەربڕینی ڕاوەستانی فیکرو شکهەڵاتنی قەناعەتە.

مرۆڤ کە خەریکی خوێندنەوە بوو_هەڵبەت مەبەستم خوێندنەوەی مەعریفییە(ئەبستمۆلۆژی)_ هەرگیز ناتوانێت دوو ڕۆژی وەکو یەك بێت، بەردەوام ئاڵۆزتر دەبێت، تا بێت دڕدۆنگتر دەبێت، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە بری ئەوەی لەگەڵ زۆربوونی زانیارییەکانیدا دەرگای وەڵامی بە ڕوودا بکرێتەوە، پرسیار لە پزدانی

خەیاڵییەوە دێنە دەرێ، هەروا پرسیارەو بە دەمی کراوەوە پەلاماری دەدەن . تۆ دەزانیت ئەم دونیایە هێندەی پرسیار تێدایە چارەکێکی ئەوە وەڵامی تێدا جێنگناکەوێت؟ ئەرێ بەڕاست ئێمە لە کوێوە هاتووین؟ بۆ هاتووین؟ بۆ کوێ دەڕۆین؟ بەڕاست ئەم سوڕی ژیان و مردن و پەیدابوون و نغرۆبوونە تا کەی بەردەوامە؟ ئەم دەستاری مەرگە تاکەی دەهاڕێت و تێر ناخوات؟ ئێمە چین؟ کێین؟ بەرەو کوێ ملدەنێین؟ مردن چییە؟ ئەرێ ئێمە بەرەو داهاتوو دەڕۆین یان داهاتوو بەلای ئێمەدا بەرەو لای ڕابردوو هەنگاو دەنێت؟ باشە داهاتوو و ڕابردوو هەبوون یان عەدەمن؟ ئەو هێزەی ئێمەی دروستکردووە مەبەستی لە خوڵقاندنمان چ بووە؟ دەیەوێت چیمان بەسەربێنێت؟ ئەمەو هەزارەها پرسیاری تر کە ڕەنگە ئەگەر تا بەیانی بە دوای یەکدا بیاننووسین تەواو نەبن، هیچیان وەڵامێکی ڕوونیان نییە

ئەوەی ئایینەکان پێمان دەڵێن، ئەو وەڵامە حازرانە تەنها قەناعەت بە دڵمان دێنن، نادیار(غەیب) بە قەولی (کانت) بابەتی عەقڵ نییە، لە هەر شوێنێکدا قسە گەیشتە سەر باسی (غەیبیات) ئیتر ئاوەز دەوەستێت، بۆیە پێویستە پەنا وەبەر باوەڕ(ئیمان) بەرین، ئەوە بۆچوونی (ئیمانوئێل کانت)ی گەورە فەیلەسوفی ئەڵمانە.

**پۆشنبیر کائینێکی گومانبەرە، مەخلوقێکی پرسیارکەرە، ڕۆشنبیریش پرۆسەی بەرهەمهێنانی پرسیارە، ئێمەی مرۆڤ ئەوەندەی ئەهلی سوئالین نیو هێندە ئەهلی جەواب نین!**

شاعیری گەورەی عەرەب (المتنبی) دەبێژێت:

***ذو العقل یشقی في النعیم بعقله***

***وأخو الجهالة في الشقاوة ینعم!***

ئاقڵ لە ناو نازو نیعمەتیشدا بە هۆی ئاوەزییەوە هەر گرفتاری بەدبەختییە، ئەقڵ ناهێڵێت ساتێك بسرەوێت، ڕێنادات خەو بچێتە چاوی، کەچی دەبەنگ و گێلۆکە لەوپەڕی بەدبەختی و گرفتارییشدا هەر کەیفخۆش و لە دونیا بێخەبەرە .

مالی ئەقڵ ئاوا بێت، کارێك بە مرۆڤ دەکات سەد جار خۆزگە بە شێتان بخوازێت، ئارامی و ئۆقرەی لێ دەبڕێت .

تۆ وەرە لە شەوێکی ئەنگوستەچاوی بێ کارەبادا چاوێك بە ئاسماندا بگێڕە، بزانە تەزوویەك بە تەوقەسەرتدا نایەت و لە ئەنگوستەکانی پێتەوە دەرچێت؟!

زانست دەڵێت ئەستێرەی وەها هەیە دە ملیار ساڵی ڕووناکی لە ئێمەوە دوورە، واتە تیشکەکەی بە دە ملیار ساڵ دەگاتە ئێمە، ئێ خۆ زانایانی بواری ئارکایۆلۆژی و جیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی و چوزانمۆلۆژی(!) هەموو کۆکن لەسەر ئەوەی تەمەنی زەوی ناگاتە پێنج ملیار ساڵ. هەندێ ئەستێرە کە تازە چاوی ئێمە دەیبینێت، نزیکەی پێنج ملیار ساڵ لەمەوبەر تەقیوەتەوە و نەماوە، ئەو تیشکەی ئێمە دەیبینین هی پێنج ملیار ساڵ لەمەوپێشە، واتە هی پێنج ملیار ساڵ بەر لە دروستبوونی زەوییە، ئەدی ئەمە جێگەی تێڕامان نییە؟!

تۆ قەت لە چۆنێتی گەشەکردنی منداڵ وردبوویتەتەوە؟ هەرکەس لە زانستی کۆرپەلەزانی (ئیمبریۆلۆژی) شارەزا بێت، مەحاڵە سەری لە چۆنێتی دروستبوون و گەشەکردنی زارۆك نەسوڕمێت.

ئەی فێربوونی زمان؟ ئەی خودی زمان؟ زمان وەك پارچەیەکی جەستە، وەك پێکهاتە (**Anatomy**)، هەروەها وەك کارکردن (**Physiology**)، پارچەیەك لە دەمی هەموو مرۆڤێکدا هەیە، کەچی ئەوەی دەمی مرۆڤێکی توونسی بە عەرەبی دەدوێت و ئەوەی دەمی مرۆڤێکی بریتانیایی بە ئینگلیزی قسان دەکات! هەر یەك شتە و ئەو هەموو دەنگە جیاوازەی لێوە دەردەچێت، بنیادەمێکی ئینگلیزی بیکوژە ناتوانێت پیتی (ق) دەرببڕێت، کەچی مامۆستا (مەسعود محەمەد) دەڵێت کورە گەورەکەی، یەکەم وشەیەك لە زاری دەرچووبێت (قووقە) بووە!

ئایا ئەوە ژینگەیە کاریگەری لەسەر دروستبوونی



زمان هەیە؟ ئەگەر وەڵامەکە بەڵێیە خۆ ئەو منداڵە تازە زمانی پـژاوە، ئـەم دوو (ق)ەی چـۆن بـەدوی یەکـدا دەربڕی؟ ژینگەی چی و حاڵی چی؟! ئەو جاریٚ هۆشی بە دەوروبەریدا نەبڕاوە ئەم ژینگە ئەفەندییە کوێرا وا زوو سـێبەری بەسـەریدا داو دەسـتی لـە بیناقاقـای گیرکرد؟!

ئـەی ئایـا پێکهاتـەی ئانـاتۆمی زمـانی خـەڵکی هـەر ناوچەیەك جودایە؟ ئەدی بۆ گەر منداڵێك لە وڵاتێکی غـەیری وڵاتـی خـۆی دایبنێیـت و لـە ڕەگـەزی خەڵکەکەیشی نەبێت، زۆر بە ئاسانی فێری زمانی ئەو وڵاتەی لێی دانراوە دەبێت و وەك هەر تاکێکی ئـەویٚ زمان دەگرێت؟!

لە سادەترین شتی دەوروبەرت وردبیتەوە، سەدان پرسیار هوروژم بۆ مێشکت دێنن، لەگەڵ خوێندنەوەی هەر لاپەڕەیەکی نوێدا، لانی کەم پرسیارێکی تازە لە بەردەمتدا قوتدەبێتەوە .

هیچ یەك لە فەیلەسووفانی مێژووی مرۆڤایەتی کەسی ئاسـایی نـەبوون، زۆرێکـیش لـەوان لـە دوادوایـی تەمەنیاندا شێت بوون، ئاخر ئەوان نەیانتوانیوە لە هەمبـەر ئـەو هـەموو پرسـیارە گـەورەو گرانانـەدا ڕابووەسـتن، (مـەولانا جەلالـەددینی ڕۆمـی)یـش دەفەرموێت:

*عیلمهای اهل تن احمالشان*

*عیلمهای اهل دل حمالشان*

(زانستی ئـەهلی دڵ باربـەریانن، زانسـتی ئـەهلی لـەش باری کۆڵیانن).

مەبەستی لە (اهل دل) عاریفان و لە (اهل تن)یش فەیلەسووفانە .

مـرۆڤ کـائینێکی لاوازە، ئـاوەزی سـنووری هەیـە، بیرکردنـەوەی تـا ڕادەیـەك بڕدەکـات، لـەوە بـە دوا سـەرزەمینی ئـەو دیـوی ئەقڵـە، ئـەقڵ ناتوانێـت پێـی تێبخات، فەلسەفەی پۆستمۆدێرنیزمیش هەر شتێکی لەو بابەتە دەڵێت، (نیچە) کە بە یەکەمین و گەورەترین فەیلەسووفی پۆستمۆدێرنیست دادەنرێت، بە ئاشکرا نـەفرەت لـە ئـەقڵ دەکـات و ڕەتیدەکاتـەوە، وەلـێ (هاپرماس) دەڵێت: بە چی ئەقڵ ڕەتدەکەینەوە؟ ئایا هەر بە خودی ئەقڵ نییە؟!

(نیچە) وەختی خۆی هانی ئەوەی دەدا شۆڕش بەسەر ئەقڵدا بکرێت و ئاوەز تووڕهەڵبدرێت، ئەو بڕوای وا بوو بە (شیعر) ئەو کارە دەکات! وەلـێ ئەم قسەیە هەر لە وڕێنە دەچێت؟ ئەی شیعر خۆی بەرهەمی کوێیە؟

بەڵام لەلایەکی تریشەوە ئەو قسەیەی نیچە لە قسەی عاریفانی مێژووی ئیسلامەوە نزیکە، ئاخر (مەولانا)ش بۆچوونێکی وای هەیە، ئەو دەڵێت: (عەقڵ تەلاق بدە) بەس جیاوازی نێوان (مەولانا) و (نیچە) لە خاڵێکی جەوهەریدایە، (مەولانا) بە پشت بەستن بە (ئیمان و عیرفان) ئەو کارە دەکات، (مەولانا) کە بڕوای وایە (عیلمهای اهل تن احمالشان) و پێی وایە:

*(پای إستدلالیان چوبین بود*

*پای چوبین سخت بی تمکین بود*

(پێی زانایانی زانستی مەنتیق لە دارە، پێیەکیش لە دار بێت زۆر سست و لاوازە) .

بۆیە هانی دوورکەوتنەوە لەو ئەقڵە دوور لە باوەڕە دەدات، ئەقڵێك کە بە وەڵامی ئیمان قایل نابێت، ئاوەزێك کـە ڕێگـەی خـودای نـەگرتووە، ئەگـەرنا (ئـەقڵ) وەك جەوهـەر لای مـەولانا پـیرۆزەو ڕێگەیەکیـشە بـۆ مـانی ئیمان، ئەوەتا دەفەموێت:

عقل دشنامم دهد من راچیم

زانکه فیچی دارد فیاچیام

(ئەقڵ جنێویشم پێ بدات من لاریم نییە، چونکە بەشێك لەو فەیزەی بە من دراوە بەویش دراوە!).

کەوایە لای (مەولانا) دوو ئەقڵ بوونی هەیە: ئەقڵی باوەڕدار و ئەقڵی بێباوەڕ، یان ئەقڵ وەك جەوهەر و ئەقڵێکی دیاریکراو (ئەقڵی فەیلەسووفان و موتەکەللیمان) .

هەروەها مەولانا بانگەشەی وەلانانی عەقڵی کردووە بۆ ڕووکردنە ئیمان و باوەڕ . .

ئەی (نیچە) چی؟ هیچ یەك لەم شتانە لای ئەو



ـدستناكەوێت، جارِدانی مەرگی خوداوەند لەلایەن نیچەوە شتێكە لە كەس شاراوە نییە، كۆڵەكەی باوەڕ نیمانهێنانە بە ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە، نیچە بڕوای بەویش نییە، ئاخر كە خودا نەبوو زیندووبوونەوەو بەهەشت و دۆزەخ مانایان نامێنێت، نیچە ئامۆژگاریمان دەكات و پێمان دەڵێت: " دڵسۆزی ئەم زەوینە بەو گوێ شل مەكە بۆ ئەوانەی موژدەی ژیانێكی باشتر لە دونیایەكی تردا پێدەدەن"!

ئێستا لە ئەوروپادا ئاراستەیەكی دژە نیچەوی، دژە پۆستمۆدێرنیزم لەئارادایە. گەورەترین فەیلەسوفی ئەڵمانی كە لە ژیاندا مابێت ڕێبەرایەتی ئەم تەوژمە دەكات، مەبەستمان (یورگن هاپرماس)ە.

ئەو پێی وایە پۆستمۆدێرنیزم تەوژمێكی فەوزەوی(ئەنارشیزم) و دژە ئەقڵەو دەبێت ڕێگەی لێبگیردرێت، چونكە شارستانیەتی ڕۆژئاوا بەرهەمی ئەقڵەو لە دوای قۆناغی ڕۆشنگەرییەوە هاتووەتە بوون، دژایەتیكردنی ئەقڵ یانی دژایەتیكردنی ئەم شارستانییەتە. هەروەها لەو بڕوایەدایە بەرهەمی پۆستمۆدێرنیزم و بەتایبەت فیكری (نیچە) نازیزم و فاشیزم بوو، كە بوونە هۆی شەڕێكی گەردوونی ئەوتۆ نزیك بوو دونیا وێران بكات. گەڕانەوە بۆ مۆدێرنێتە و عەقڵگەرایی ئامانجی (هاپرماس) و لایەنگران و شوێنكەوتووانیەتی.

من دەڵێم كەسێكی وەك (نیچە) كە بانگەشەی تووڕهەڵدانی عەقڵی دەكرد و سەرەنجامیش بە فیعلی شێت بوو و یانزە ساڵی كۆتایی تەمەنی لە شێتخانەدا بەسەربرد، هۆكارەكەی ئەوەیە توانای وەڵامدانەوەی پرسیارە گەورەكانی نەمابوو، مرۆڤ تا ئاوەزی فراوانتر بێت ئاسۆی بینینی لێڵتر و نیگای تەماوی تر دەبێت، تا زیاتر بزانێت و زۆرتر بخوێنێتەوە زمانی زیاتر دەشكێت و دەرگای دەربڕینی توندتر كلۆم دەدرێت . .

چی بڵێم كە هیچ شتێك زانراو نییە؟! ئەمەیە زمان حاڵی زۆرێك لە فەیلەسوفان.

(د.عەلی شەریعەتی) دوو بەرگ كتێبی بە ناونیشانی (گفتوگوهای تنهایی) هەیە، لەو كتێبەدا دەڵێت: (دەمەوێت بەرگی سێیەمی ئەم كتێبە بنووسم، لەودا هەر پەڕە دێنم و هەر نانووسم، هەر كاغەزی بێخەت كۆدەكەمەوەو دێڕێكیشی تێدا یادداشت ناكەم، دەمەوێت قسە نەوتراوەكانم كە بەهێزترین بەشی كتێبەكەمن بڵاوبكەمەوە، قسەیەلێك كە نایانڵێم و نایشتوانم بیانڵێم!)

تۆ دەتەوێت خوێندنەوە ئارامی بە من ببەخشێت؟ من دارێكم ڕیشەكەم لە بنی ئاودایە، خوێندنەوە ئەو زریانەیە كە زەریا دەخاتە شەپۆلدان، لەگەڵ هەر شەپۆلێكیشدا دوور نییە منی دار لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵبكەندرێم و بەر شەپۆلی زەریا بكەوم و نایشزانم كەی و لە كوێدا دەگیرسێمەوە!

*من از بود و نبودی خود خموشم*
*اگر گویم كه هستم خود پرستم*
*ولیكن این نوای سانەای كیست*
*كسی در سینە میگوید كە هستم؟*

واتە:

*من لە بوون و نەبوونی خۆم بێئاگام*
*ئەگەر بڵێم هەم خۆپەرستم*
*وەلێ ئەم دەنگە نەرمە هی كێیە؟*
*یەكێك لە سنگمدا دەڵێت ئەمن هەم!*

**لە جیهانی خوێندن و خوێندەواریت دا تا چەند توانیوتە كەسێكی تەقلیدی نەبیت، نووسراوەكانی جەنابت چەندە مۆركی نوێگەرییان پێوەیە؟**

و: ڕاستە پرسیارەكەت بە ڕووكەش یەكێكە، وەلێ پێویستی بە سێ وەڵام هەیە. هەرچەند بەباشی لە مەبەستی (جیهانی خوێندن و خوێندەواری) تێناگەم و، پێم وابێت تەنها بۆ وشەئارایی و ڕازاندنەوەی ڕستە هەردوو وشەی (خوێندن) و (خوێندەواری)یت بەدووی یەكدا هێناوە، وەلێ ناچارم لە خۆمەوە ڕاڤەیان بكەم و بەپێی ئەوەی لێیان تێدەگەم وەڵام بدەمەوە. هەموومان



له خوێندن تێدەگەین، وەلێ (خوێندەواری) وشەیەکی بەرفراوانە، هەم خوێندن دەگرێتەوەو هەم خوێندنەوەو هەم ڕۆشنبیری کەسیی. وا دەزانم ئەگەر لە جیاتی خوێندەواری وشەی خوێندنەوەت بەکاربهێنایە لە بارتر دەبوو. بە هەرحاڵ من وەڵامی سێ پرسیارت کە لە شێوەی یەك پرسیاردا ئاراستەت کردووم دەدەمەوە:

١ . لە جیهانی خوێندنمدا تەقلیدیم یان نا؟

٢ . لە دونیای خوێندنەوەمدا تەقلیدیم یان نا؟

٣ . نووسینەکانم نوێگەرییان پێوەیە یاخود نا؟

کە دەڵێی خوێندن یەکسەر بیری خوێنەر بۆ قوتابخانەو زانکۆو بەدەستهێنانی بڕوانامە دەچێت، هەڵبەت منیش کە تیری پرسیار ئاراستەی سنگم کراوە یەکێکم لە خوێنەرانو هەروایشی تێدەگەم.

(موعەممەر قەززافی) لە کتێبی سەوز (الكتاب الأخضر)دا کە خۆی بە کتێبێکی پیرۆزی دەزانێتو پێی وایە ڕۆژێك دێت دونیا دەگۆڕێت، ڕایەك دەخاتە ڕوو دەربارەی خوێندنی مەنهەجیی، کە هەم جێگەی تێڕامانو هەم مایەی پێکەنینیشە، ئەو دەڵێت: ئەوەی کۆمەڵێك قوتابی بە زۆر بکرێنە پۆلێکەوەو یەك یەكو دوو دوو لەسەر تەختە(ڕەحلە)یەك دابنیشێنرێنو مامۆستایەك بێت وانەیان پێ بڵێتەوەو، چەند ساڵ تەمەنی مرۆڤ ئاوها بە هەدەر بدرێت تا بڕوانامەیەك بە دەستدەهێنێت، کارێکی نەك هەر ناماقووڵە بگرە جۆرێکیشە لە ستەمکاری! ئەو وای بۆ دەچێت مافی هەرکەسێکە چۆنی بوێت ئاوها فێری خوێندنەوەو زانست ببێت، بەبێ ناچارکردنی. ئەو ڕایەی قەززافی ڕەنگە مایەی پێکەنین بێت لای زۆر کەسو تەنها بۆ خوێندنەوەو کات بەسەربردن خۆش بێتو لە حاڵی بە کارداریکردنیدا کارەسات بنێتەوە، ئاخر ئەوە هاندانە بۆ نەمانی سیستەمو جۆرێکە لە فەوزییەت(ئانارشیزم)و هەرکێ بۆ خۆی، خۆ ئەگەر سیستەمی خوێندن نەمێنێتو خوێندنگاکان بڕوخێنرێنو هەرکێ چی ویستو چۆنی ویست بەدەستی بهێنێت، چی ڕوودەدات؟ ئایا شتی وا دەشێت لە واقیعدا بێتە دی یان جۆرێکە لە یۆتۆپیا؟ وەلێ لێت ناشارمەوە یەکەمجار (کتاب الأخضر)م خوێندەوەو چاوم بەو کەوت، بە جۆرێك لە جۆرەکان کەیفم پێی هات. بۆ؟! ڕەنگە هۆکەی ئەوە بێت وەختی خوێندنەوەی کتێبەکە هێشتا خوێندکار بووبێتم، لێ وا هەستدەکەم شتێکی تریش پاڵنەرم بێت بۆ کەیف پێهاتنی. تەمەنی خوێندنی من زۆر لە هی خەڵکی ئاسایی زیاتر بوو، زانکۆشدا دوو تەمەنو نیوی خوێندکارێکی ئاسایی مامەوە، دوو کۆلێژم لە سێ شاردا تەواو کرد. زۆر لە پرۆسەی خوێندنی وڵاتی خۆمان ڕامامو کردەوە، لە کۆتاییدا گەیشتم بە دەرەنجامێك کە لە ڕاکەی قەززافییەوە نزیك بوو!

دەپرسی لە جیهانی خوێندنمدا تا چەند توانیوم تەقلیدی نەبم؟ تۆ بپرسە ئەرێ کەسێ هەیە لەم وڵاتە تەقلیدییانە نەیخوێندبێت؟ لە تەمەنی شەش ساڵی دەچێتە مەکتەب، یەکەم ڕۆژ مامۆستایەك دێتە پۆلەوە وەك ئیزرائیلێك دێتە پێشچاوت، نە قسەیەکی خۆش بزە پێکەنینێكو نە لاواندنەوەیەك . . . بەپێچەوانەوە درژو مۆن . بە توڕەییەوە دەدوێت، کە دەڵێ بێدەنگ بن مێچی پۆلەکەش دەلەرێتەوە. هەر لەو ساتەدا قوتابی زراوی دەچێتو وا هەست دەکات یەکەم ڕۆژی ژیانی لە کارەساتی دەستی پێکرد، ناهەقیشی نییە! دوای شەش ساڵ_ئەگەر هەموو ساڵێك ناجح بێت_ دەپەڕێتەوە بۆ ناوەندیو لەوێشەوە بۆ ئامادەیی. دوای ئەوەی دوانزدە ساڵ لە تەمەنی بە فیڕۆ دەچێت پێ دەنێتە نێو بەهەشتی زانکۆوە! لەوێش چوار سێ دەخوێنێت تا بڕوانامە وەردەگرێت . . لە شەش ساڵی دەچێتە بەر خوێندنو بە فەرزی ئەوەی هیچ ساڵێك دو نەکەوێت، لە بیستو دوو ساڵیی خوێندن تەواو دەکات تۆ پێم بڵێ کێ لەو شانزە ساڵەی خوێندنیدا شتێکی بابیی یەك لەسەر چواری ئەو ساڵانە، واتە بایی چوار ساڵ زانیاری پێ دەدەرێت؟! وەرە دوو قوتابی بێنە یەکێکیان بخەرە بەر خوێندنو ئەوی تریشیان خۆت لە ماڵەوە ڕێنمایی سەرەتایی بدەرێو لەبەرەوە کتێبی

بخەرە بەردەست، دوای شازدە ساڵ وەرە بەراوردیان بکە بزانە کامیان زیاتر فێر بوون؟ بەدڵنیاییەوە ئەوەی بە هەوڵی خۆیو دوور لە قوتابخانەو مەنهەجی خوێندن پێگەیشتووە شارەزاترو چاوکراوەترە. ناهەقمە ئەگەر بڵێم ڕاکەی عەقید قەززافی بە ڕاست دەزانم؟ لە سەدا نەوەدو نۆی خاوەن بڕوانامەکانی ئێمە بە شێوەیەکی تەقلیدیی پێگەیشتوون، وەلێ من لە ١٪کەی ترم، دوو کۆلێژم تەواو کردووە، تاڵە موویەك پەیوەندییان لە نێواندا نییە، کۆلێژی پزیشکیو کۆلێژی شەریعە یان بە قەولی زانایانی کۆن: (علم الأبدان)و (علم الأدیان)، زانستی جەستەو زانستی ئایین!

لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندەی خەریکی فیکرو ئەدەبم، نیو هێندە نە بە خوێندنی (طب)ەوە خەریکمو نە بە شەریعەیشەوە، لە ئێستادا خۆم ئامادە دەکەم بۆ خوێندنی باڵا لە یەکێك لە بوارەکانی دەروونناسی، کۆمەڵناسی یان مێژوودا کە هیچ پەیوەندییەکیان بەو دوو پسپۆرییەوەی بڕوانامەم تێیاندا وەرگرتووە نییە.

بۆیە وا نازانم لە جیهانی خوێندنمدا تەقلیدی بووبم، هەڵبەت تا تەواوکردنی ئەو دوو کۆلێژە نارەحەتیی زۆرم هاتوونە ڕێو ماندوویەتی زۆرم کێشاوە. ئەمن تەقلیدیی نیم وەلێ چبکەم کە سیستەمی خوێندن لە وڵاتەکەمدا تەقلیدییە؟ ئێستا من جگە لە (طب)و (شەریعە) ناتوانم هیچ پسپۆرییەکی تر بخوێنم لە ناو عێراقدا، بۆ؟ چونکە سیستەمی خوێندنی باڵا نە لە عێراقو نە لە هەرێمی کوردستاندا ڕێگە بە هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە پسپۆرییەکی دیاریکراودا نادات بچێت ماجستێر یان دکتۆرا لە بوارێکی تردا بخوێنێت، هەڵبەت ئەم سیستەمە تەنها لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا هەیە، لە وڵاتانی پێشکەوتوودا مرۆڤ ئازادە پسپۆری بگۆڕێتو لە هەر بوارێکدا حەزی لێ بوو بخوێنێت!

**_ ئایا لە جیهانی خوێندنەوەمدا کەسێکی تەقلیدیم؟**

هەڵبەت پێناسەی تەقلیدو تەقلیدی بە پێی نەریتی خەڵکی هەر زەمانو مەکانێك دەگۆڕێت، لای ئێمە کەسی تەقلیدیی لە خوێندنەوەدا چۆن پێناسە دەکرێتو؟ تەقلیدی بە کێ دەوترێت؟ ئەوەی من بە تەقلیدیی دەزانم کەسێکە هەموو عومری بە خوێندنەوەی یەك جۆرە شێوازی نووسینەوە خەریك بێت، یان یەك بوار بۆ خوێندنەوە هەڵبژێرێت یاخود تەنها موتالای ئەو کتێبانە بکات کە لەگەڵ باوەڕو تێڕوانینی خۆیدا تەبان.

تەقلید خوێندنەوە لە وڵاتی ئێمەدا جۆری زۆرە، خەڵکی هەیە تەنها کتێبی مەلایانە دەخوێنێتەوە، ئەمە توێژی مەلاکان دەگرێتەوە، کتێبەکانی تایبەت بە فیقهو ئوسوڵو نەحوو صەرف ... هتد، وەختێ لەگەڵ مەلایەکدا دادەنیشیت یان باسی شافیعیت بۆ دەکات یان ئەبو حەنیفە، یان ئیبن حەجەر یاخود ئیبن حەزم، زانایەکی ئایینی کە شارەزای بواری زوهدو پارێزکاری بێت، ناوی زاهیدگەلی هاوشێوەی حەسەنی بەصری، عەبدوڵڵای کوڕی موبارەكو ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمی زۆر لێدەبیستیت. بوخاریو موسلیمو ئەبو داودو ترمزیو نەسائییش لە باسی (صحیحو ضعیف)ی فەرموودەی پێغەمبەردا زۆر باسدەکرێن. مەلایەك قووڵتر بڕوات، لە تەسەووفدا باسی غەزالیو ئیبن عەرەبیو سوهرەوەردی دەکات، لە بواری عەقڵو مەنتیقیشدا کەسانی وەك فەخری ڕازی، ئیبن سینا، فارابیو ئیبن ڕوشد ناو دەبات، ئەگەرچی ئەم سیانەی دواییو بە تایبەت ئیبن سیناو فارابی زۆر بە کەمی لە لایەن توێژی زانایانی ئایینییەوە باس دەکرێن.

مەلایانی کۆنی کورد کە زۆرینەیان لەم پارچەیەی کوردستانی خۆماندا، لە (فروع)دا سەر بە مەزهەبی شافیعیو لە عەقیدەو بیروبڕوایشدا (ئەشعەری)ی بوون، باسیان بەزۆری هەر بە دەوری ئەوانەدا دەسوڕێتەوە، باسی (شێخ عبدالقادری گەیلانی)و ( شێخ ئەحمەدی ڕیفاعی)و ڕێبازی تەریقەتەکانی (قادری)و (نەقشبەندی)و زانایانی وەك (مەولانا خالیدی نەقشبەندی)و (شێخ مارفی نودێ)و ... .هتد لە ناو مەلاو فەقێی حوجرەکانی بیست ساڵێك لەمەوبەردا زۆر دووبارە دەبوونەوەو تارادەیەك ئێستاش ماوە.



لەگـەڵ بڵاوبوونـەوەی بزوتنـەوە ئیسلامییەکانیـشدا لـە کورسـتان، نـاوی دوو زانـای دواییـنـی مێـژووی ئیسلام هاتنـە نـاوەوە، (ئـیبن تـەیمییـە)و قوتابییەکـەی: (ئـیبن قەییم) .

ئێستاشی لەگەڵدا بێت وەختێ لەگـەڵ مەلایـەك یـان زانایەکی ئایینی دا دادەنیشیت، ئەگەر شارەزای زمانی مـەلایان نـەبیتو باسـی (جمـع الجوامـع)و (تەصـریفی زنجانی)و (ضربَ زیدٌ عمراً) نەزانیت، قسەیەکت بۆ وتن پێ نییەو دەبێت قرِوقپی لێبکەیتو تەنها گوێگر بیت .

لە ئەدەبیاتی بزاوتە ئیسلامییەکانیشدا، چەمکەکانی (دعوە)، (إرشاد)، (جهاد)، (عقیدە)، (توحید)، (شرك)، (مەنهـەجی سـەلەف)و . . . هتـدو، لای ئیخوانییـەکان نـــاوی کەســـانی وەك (حەســـەن بـــەننا)، (ســـەیید قوتب)،(ئـەبو ئـەعلای مـەودودی)، (محەممـەد غـەزالی)، (فتحی یەکن)، (راشد غەننوشی)و (یوسف قـەرەزاوی)و لای سەلەفییەکانیش (محەممـەد ناصرەددین ئـەلبانی)، (ئیبن باز)و (ئیبن عثیمین)و، لای نورییەکانیش (سەعید نوورسـی) زۆر دووبـارە دەبنـەوەو لـە غـەیری ئەوانـە بـە دەگمـەن باسـێك بـۆ وتـن هەیـە، ئەگەرچی لـەم ساڵانەی دواییدا بـە حـوکمی کرانـەوەی وڵاتـی خۆمـان بـە ڕووی دەرەوەداو لـــــەژێر کاریگـــــەریی هـــــەژموونی جیهـانگیری(Globalization)و تۆڕەکـانی گەیاندنـدا، هەنـدێك لـە برادەرانـی ئیـسلامیی بـاس لـە پارلـەمانو دیموکراسیو لیرالیزم . . . دەکەن، لێ من باسی بنەمای فیکریو ئەدەبیاتی وان دەکەم .

بـــەرەی چـــەپو سۆشیالیـــستیش ئینجیلـــی فیکـــری مـــارکسو ئـەنگلزو وەعزەکـانی (لیـنین)و (سـتالین)و چەمکگەلی وەك: ژێرخان، ژوورخان، چینی پرۆلیتاریا، فیـودالیزم، کاپیتـالیزم، دیـالێکتی میـژووییو شـەڕی نەبراوەی چینەکان ...هتد، ئەو بابەتانە بوونو هەن کە لە کۆنەوە تا ئێستا پێوەی سەرقاڵن!

ناسیۆلیستەکانیش ئـەدەبیاتی خۆیـان هەیـە، ڕووحـی نەتـەوەو گیـانی ئاریـاییو دەوڵـەتی مـادو ... ئاسنگەرو نەورۆزو داگیرکاریی عەرەبو فارسو تورك . . . هتد .

لـە ئـەمڕۆدا خـەڵکانێك ڕوویـان بـە لای ڕۆژئـاوا فەلسەفەی مۆدێرنیزمو پۆستمۆدێرنیزمدا وەرگێڕاوە باسی ڕۆشنگەریو ڕێنیسانسو شۆڕشی فەرەنسی فیکری ڕۆسۆو دیکارت . . . دەکەنو، فێر بوون لە هەردوو دێڕێکدا سێ جار بڵێن: (دواجار)، (بەڕاستی) (ئەزانی)!و زوو زوو ئێژن: نیچە وای گوتو هێگل وا کردو، ناوی کۆمەڵە بیریارو فەیلەسووفێکی فەرەنسی ئـەڵمانیی وەك: فۆکـۆ، سـارتەر، کانـت، هایدگەر، هاپرمـاسو... بوونەتـە وێـردی سـەر زمانیـانو وەك نوێـژی ئیمانـدار ڕۆژانـە چـەندین جـار دووبارەی دەکەنەوە .

من لەم ژیانە کەمەمدا _ وا نازانم سێ ساڵ تەمەن بێـــت!_و ســـەرەڕای ســـەرقاڵیم بـــە خوێندنی تەلەبایەتییەوە، کەم تا زۆر ئاشنای چەمكو ئەدەبیاتی هەریـەك لەوانـەی بـاسمکردن بـووم، نـاڵێم شـارەزا تـــەواوی بوارەکـــانم، ئێـــژم شـــارەزای زمـــانی ئەدەبیاتەکانیانم . وەختێك لەگەڵ مەلایەکدا دادەنیشم قسەی چـەندین سـەعاتم پێیـەو کـە لەگـەڵ هاوڕێیەکی کۆمۆنیستیـشدا پیاسـە دەکـەین، بـە سـەعات قسە دەکەین . بە زمانی کەس لەگەڵ کەسی تردا ناپەیڤم بـەڵکو هەرکـەس وە زوان خـۆی (بلسان قومـه) . . زمان جیاوازیی هەر ئەوە نییە دوو کەس بە کوردیو بلووچی یان بە تورکمانیو هیندی بدوێن، زمانی پەیڕەوانی هەر ڕێبـازو ڕێـچکەیەك لـە هـی ڕێبـازو ڕێـچکەیەکی دی جودایە با لە یەك هۆزیش بن .

لە سەرەتای تەمەنمەوە ئەو ڕاستییەم بۆ دەرکەوتووە بۆ ئەوەی لە بەڵا و خراپەی هەر هۆزێك قوتار بیت دەبێت زمانیان بزانیت: (مَـنْ عـرَفَ لغـةَ قـومٍ آمَـنَ مِنْ شَرِّهم) لەوەش گرنگتر زانینی زمانی بەرانبەر دەبێتە پردێك

بەرینەوە بۆ ماڵی بیرو ئەندێشەو هەستو سۆزی، زمان ئەو پردەیە مرۆڤەکان بە یەکترەوە دەبەستێت، وەرە بتوانە مەلایەکو مارکسییەك پێکەوە لەسەر سفرەیەك کۆبکەرەوە، تا بەیانی ئەو دەڵێت: بەپێی مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەستنوێژی پیاو لە ئافرەت ناشکێتو ئەمیش ئێژێت بەگوێرەی مەزهەبی ئیمامی مارکس (ئایین ئەفیونی گەلانە)و (ئەوە ژیانە ئاگایی بە مرۆڤ دەدات نەك پێچەوانەکەی)...!

مرۆڤەکان یان دەبێت شەڕ لەگەڵ یەکتردا بکەنو یاخود پێکەوە هەڵبکەن، شەڕ لە ئەنجامی نەزانینی زمانی بەرانبەرەوە دێتە ئاراوە، تۆ کە لە بەرانبەرت حاڵی نەبوویت پەنا وەبەر کوتەك دەبەیت، ئایا باشتر نییە لە بری دەست بۆ کوتەك بردن زمانی ئەوانی دی فێر بین؟ من لەو لایەنەوە خوا بۆ کردووم، تێکەڵیو پەیوەندیی بەرفراوانم هەر لە سەردەمی تازە لاویمەوە لەگەڵ خەڵکێکی زۆرو لەتەك ئەهلی هەموو پیشەو پسپۆرییەکاندا وای لێکردووم ئاشنای زۆر بوار ببم، چەندەها جار ناچار بووم بابەتی ئەوتۆ بخوێنمەوە کە بۆ خۆم مەیلی موتالاکردنیم هەر نەبووە..

بە کورتیو کرمانجی ئەگەر لە هەر شتێکمدا تەقلیدی بووبێتم، لە خوێندنەوەدا وا نەبووم، بڕوا بکەو ئەم قسەیە بۆ خۆهەڵنان ناکەم، زۆر جار ڕێکدەکەوێت لە یەك کاتدا سێ چوار کتێبم بۆ خوێندنەوە لە بەردەستدان، هەر یەکەی بە زمانێكو هەر دانەی لە بوارێکدا، وەك دەوترێت شامو شیرازم پێکەوە کۆکردووەتەوە، هەر لەم ڕۆژانەدا بە نموونە دیوانێکی شێخ ڕەزای تاڵەبانیو کتێبێکی د.عبدالکریم سروش (ایدولوژی شیطانی) کە بابەتی فیکرییەو (ڕۆمیۆو جولێت)ی شکسپیر بە تەرجومەی عەزیز گەردیو، مەمو زینی خانی بە تەرجومەی (محمد سعید رمضان البوطي) بۆ عەرەبی، ئەوەندە کتێبەم لە یەك کاتدا لەبەردەستدان، ئەمە سەرەڕای ئینتەرنێتو تەماشاکردنی بابەتی نوێی پزیشکی کە بواری خۆمەو ناچارم ناو بەناو چاو بە پێشکەوتنە تازەکاندا بخشێنمو موراجەعەیەکی زانستەکەیش بکەم.

لە کاتی دەوامیشدا کەمجار ڕێکدەکەوێت کتێبم لەگەڵدا نەبێت، دوو خولەك نەخۆش نەبێت کتێبەکە دەکەمەوەو دەخوێنمەوە.

کەم بواری مەعریفی هەیە حەزم لێی نەبێتو سەری پێدا نەکەم، لە بواری ئابووریو ئەندازیاری دا دەستو پێ سپیم، بەتایبەت ئەندازیاری هیچی لێ نازانم، بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ بەشە زانستییەکاندا _ بە پزیشکیشەوە! _ نێوانم کەمترە، لێ ئەوەی ئەدەبو فیکرە، چیم بەردەست بکەوێت تەماشای دەکەم، هەر کتێبێك لە هەر شوێنێك ببینم، دەرفەتم هەبێت دەستی بۆ دەبەم.

هەر ئەو عەشقەم بۆ زۆربەی بوارەکان وایکردووە تا ئێستاش نەتوانم خۆم کۆبکەمەوە، ئەوەندەی زانیاریی ئاسۆییم (Horizontally) لەلایە، هێندە زانیاریی ستوونیم (Verticallly) نییە، هەرچی دەکەم ناتوانم دەستبەرداری هیچ یەك لەو بوارە جیاوازانە ببم.

**_ ئایا نووسینەکانم نوێگەرییان پێوە دیارە؟**

تۆ بەم پرسیارانەت مرۆڤ ناچار دەکەیت یان خۆی بشکێنێت یاخود بە شانو باڵی خۆیدا بێت، ئێ خۆ کەسیش بە دۆی خۆی ناڵێت ترشە، کەوایە دووەمیان هەڵدەبژێرێت! ڕاستت بوێت دەبێت خوێنەر وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، وەلی کە لە من دەپرسیت هەوڵدەدەم بڕوای خۆمت پێ بڵێم، وایش دەزانم کەس بە قەد خۆم نامناسێت، بە قەولی مام هەژار (چۆلەکە خۆت چیتو شۆرباوت چی؟)، من تا ئێستا چوار کتێبم لە بازاڕدان، دیوانە شیعرێك، کۆمەڵە وتارێكو دوو وەرگێڕان، بە زۆری وتارم نووسیووە، ئەوەی بە نیازم لە داهاتوودا بیکەم، ئەگەر هەلم بۆ بڕەخسێتو دەرفەتم هەبێت ڕەنگە کاری گرنگ بن، وەلێ ناکرێت گرەو لەسەر شتێك بکەین کە هێشتا خەیاڵە!





(دیوانی شووشه) له ۲۰۰۷دا دەرچووو بە تیراژێکی کەمو چاپێکی ناشیرین بڵاوکرایەوەو هیچ دەزگایەکی ئیعلامییش دەهۆڵی بۆ نەکووتا، لەگەڵ ئەوەیشدا تا ئێستا حەوت هەشت بابەتی لەسەر نووسراوەو بە چاكو بە خراپ هەڵسەنگێنراوە، ئەگەرچی نووسینی شیعر بە نیسبەت منەوە شتێکی لاوەکییەو قەت خۆمم بە شاعیر نەزانیوەو، لە ئێستاشدا دەقی شیعری نانووسم، ئەوانەیشی نووسیومن خورپەی شیعریینو لەژێر کاریگەریی بارودۆخو سەردەمێکی تایبەتدا لەدایك بوون، هەروەها شیعرەکانی نێو ئەو دیوانە هی وای تێدایە لە تەمەنێکی زۆر کەمدا نووسیومنو لەڕووی ڕێنووسو ڕێزمانیشەوە هەڵەی زۆریان تێدایە، من لە دوای بڵاوبوونەوەی ئەو دیوانەوە بە شێوەیەکی چڕوپڕ دەستم بە خوێندنەوەی ڕێنووسو ڕێزمانی کوردی کردو، ئێستا ئەگەر بەو چاپەی دیوانەکەی خۆمدا بچمەوە ڕەنگە داری بەسەر بەردییەوە نەهێڵمو سەرلەنوێ شیعرەکانی دابڕێژمەوە، لێ بە هەرحاڵ ئەوەیش هی قۆناغێکی دیاریکراوی تەمەنمەو شانازی پێوە دەکەم.

کتێبی (نەخوێندەواری لە زانکۆدا)، دووەم کتێبمەو کۆکراوەی ئەو بابەتانەیە کە بە درێژایی هەشت ساڵ دەربارەی زانکۆو گەنجو پرۆسەی خوێندن نووسیومن، ئەویش بابەتی چەند ساڵێکی جیاوازی تەمەن لە خۆ دەگرێت کە بە پاشخانی مەعریفیی جیاوازو دنیابینیی جیاوازەوە نووسراون، نووسینێك کە لە ۲۰۰۰دا نووسرابێت چۆن لەگەڵ یەکێکدا کە لە ۲۰۰۷دا نووسرابێت دەبن بە یەك؟ مەگەر خاوەنەکەیان لەو هەموو ساڵەدا هیچی نەخوێندبێتەوە! ئەمە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، وەلێ زمانی ئەو کتێبە خۆم لێی ڕازیمو نووسەری گەورەش پەیوەندییان پێوە کردوومو زۆر لێی ڕازی بوون، وەختێ بۆ چاپ ئامادەم کرد، بەوردی بە زمانی بابەتەکاندا چوومەوەو ئەوەندەی توانیم خستمە سەر ئەو شێوازە ڕێنووسو ڕێزمانەی لە ئێستادا باوەڕم پێیەتی.

بە نیسبەت پرسیارەکەتەوە، ئایا نووسینەکانی نوێگەرییان پێوە دیارە؟ لە ڕووی زمانەوە، وا دەزانم زۆر کەسیش پێیان وتووم کە خاوەن زمانێکی تایبەت بە خۆمم، ئەمە ئیددیعا نییە، جەنابیشتو ئەو خوێنەرانەیشی لەمەوبەر بابەتمیان خوێندبێتەوە هەست بەوە دەکەن، لە شێوازی خستنەڕووو تەنانەت هەڵبژاردنی ناونیشانیشدا دیسانەوە ستایلی خۆم هەیەو لاسایی کەسم نەکردووەتەوە، لە نووسینی منا نووسەر ون نییە، هەوڵدەدەم خوێنەر وا هەست بکات قسەی لەگەڵدا دەکەم، ئیتر تۆ ئەمە ناو دەنێیت چی ئازادیت، خۆ ڕەنگە هەندێك کەس بەو شێوازە بڵێن بازاڕی یان لانی کەم نائەکادیمی، وەلێ من ئەوەم پێ خۆشەو ناتوانم جیاواز لەوە بنووسم، لەم ماوەیەی پێشوودا وتارێکی نووسەری بەناوبانگی عەرەب (هاشم صالح)م بەرچاوکەوت، دەربارەی کتێبی (الهرطقات)ی (جۆرج تەرابیشی) نووسیبووی، ئەو دەڵێت: "ئەم کتێبە بە شێوەکی وا نووسراوە نووسەرەکەی ون نییە. ئەم شێوازەیش هانی خوێنەر دەدات دەستی لێهەڵنەگرێت." لە درێژەی بابەتەکەیدا دەڵێت: "ئەمڕۆکە بە ناوی ئەکادیمیبوونەوە کارێکیان کردووە تام لە نووسین نەکەین، هێند وشكو ئەبستراکتییانە دەنووسن".

سەد لە سەد لەگەڵ قسەکانی (هاشم صالح)دام، من وا هەستدەکەم نووسینم بێ خوێنەر نییە، تەنانەت ئەو خوێنەرەیشی ناوی منی نەبیستبێتو بە ڕێکەوت بەسەر بابەتمدا بکەوێت، ناتوانێت دەست لە خوێندنەوەی هەڵگرێت، لە نووسیندا هەوڵدەدەم بە شێوەیەکی زنجیرەییو پێکەوە گرێدراو بابەت بخەمە ڕوو، بە جۆرێکی وا خوێنەر لە سەروەختی خوێندنەوەیدا ماندوو نەبێتو نەتوانێت بە ئاسانی وەلاوەی بنێت، تۆ کتێبی (تأملات فی الإنسان)ی (رجاء النّقاش)ت خوێندووەتەوە؟ شێوازی خستنەڕووی ئەو نووسەرە بیۆینەیە، وا دەکات پەلە بکەیت زوو کتێبەکە

تەواو بکەیت، لە هەمان کاتدا حەز دەکەیت تەواوی نەکەیت، ها فیلم هەیە پێت خۆشە کۆتاییەکەی بزانیت‌و لە هەمان کاتیشدا ناتەوێت وا زوو تەواو بێت!

نووسینەکانی (هاشم صالح)یش لە عەرەبیدا هەر لەو جۆرەن، ئەو کابرایە دونیایەك زانیاری تازە بە خوێنەر دەدات، بە زمانێکی وایش دەیخاتەڕوو قەت وەڕس نەبێت‌و تا دوا دێڕ وە دووی کەوێت، کتێبەکانی (د.عەلی وەردی)یش هەروان، لە کاتی خوێندنەوەیاندا خوێنەر هەمیشە ئامادەیە پێبکەنێت‌و، لە دڵی خۆیدا دەڵێت: ڕەنگە لەم لاپەڕەیەدا بکەوم بەسەر نوکتەیەکدا، لە مەیاندا نا لەوی تریاندا... لە کاتێکدا ئەو باسی کارەساتی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و دواکەوتوویی‌و بەدبەختی خۆت‌و کۆمەڵگەکەت دەکات.

من زۆر نانووسم، نووسین نە پیشەمەو نە پێی دەژیم، نووسین کە بوو بە مایەی پارە پەیداکردن تام‌و چێژ لە دەستدەدات، دەزانی بۆ؟ چونکە ئەو نووسەرەی بە داهاتی نووسین بژێت یان ئامانجی لە نووسین پارە وەدەستهێنان بێت، پێویستە بەردەوام بنووسێت، وەك چۆن کرێکارێك ئەگەر ڕۆژێك ئیش نەکات قووتی ئەو ڕۆژەی نییە، نووسەرێکیش کە بە نووسین بژێت وایە، دەبێت بەردەوام کار بکات، وەختێکیش وای لێهات ڕۆژێك دێت بابەتی نامێنێت‌و وردە وردە خوێنەری لێدەتەکنەوە، بۆ نووسەر وا جوانە خوێنەر چاوەڕوانی بڵاوبوونەوەی بابەتی بێت، باش وایە نووسەر نە بەردەوام بنووسێت‌و نە لە یەك بواریشدا ماوەیەکی زۆر بنووسێت، ئەو نووسەرانەی لە بواری جیاوازدا دەنووسن‌و ناو بەناو بێدەنگ دەبن، خوێنەر زیاتر تامەزرۆی خوێندنەوەی بەرهەمیانە، ئەمە هاندان نییە بۆ کەم نووسین، خۆ نووسەر هەیە زۆریش دەنووسێت‌و بەرهەمیشی تا بێت زیاتر دەخوێنرێتەوە، بەتایبەت بنووسە بە تەمەنەکان، ئەوانەی ساڵانێکی زۆری ئەزموون‌و خوێندنەوەیان لە جانتایاندا کۆکردووەتەوە، لێ بۆ نووسەری گەنج باشتر وایە وەختێك ویستی پەنجا لاپەڕە بنووسێت لانی کەم پێنجسەد لاپەڕە بخوێنێتەوە، خۆشبەختانە من لەوانەم خوێندنەوەم لە نووسینم زێترە!

ئەوەیش بڵێم لە نووسیندا هەمیشە شیعرو پەندو وتەی دانایان بەکاردەهێنم، بە زۆرییش ئەو شیعرو پەندو وتانە دەنووسمەوە کە لەبەرمن، چونکە نووسینم بە زۆری یان وتارن یان وەڵامدانەوەی پرسیاری کەسێکی وەك جەنابتن، وەختێ دەست بە نووسینێك دەکەم هەڵناستم تا لێی نەبمەوە، ئێ خۆ ناکرێت بە نێو کتێباندا بگەڕێم بۆ بەیتە شیعرێك یان گوتەی فەیلەسوفێك؟! هەربۆیە لە وەختی خوێندنەوەمدا ئەو قسەو پەندو بەیتە شیعرانەی کارم تێدەکەن‌و دڵم دەیانگرێت دەنووسمەوەو ئەوەندە لەبەر خۆمەوە دەیانڵێمەوە تا لەبەریان دەکەم، ئێستا خەزێنەیەك لە پەندو شیعرم لە هەر سێ زمانی عەرەبی، فارسی‌و کوردییدا لەلا کۆبووەتەوە، هەر ڕووداوو نوکتەیەکیشم لە ژیانمدا بەسەر هاتبێت لە نووسیندا جێی بۆ دەکەمەوە، خوێنەر زۆر حەزی لەو جۆرە نووسینانەیە‌و بە هەڵپەوە دەیانخوێنمەوە.

پێم ئاساییە لە ساڵێکدا یەك بابەت زیاتر نەنووسم، بە مەرجێك شتێکی نوێی تێدا بێت، من زۆر بەلاساییکردنەوە قەڵس دەبم، تۆ بڵێی خۆیشم بکەومە ناو داوی تەقلیدەوە؟



حەیدەر عەبدوڵڵا
شێخ وەسانی



# ئـایـەتـوڵـلا

## چەمك و پلەكانی بوون بەئایەتوڵلا

حەسەن یاسین

**پێشەكی :**

لێكۆڵینەوە لەبابەتێكی وەك پلەبەندی لەپۆستە ئایینییەكانی نێو مەزهەبی شیعە گەرایی لەئایینی ئیسلامدا مەسەلەیەكە پێویستیی بە دەرفەتو بوارێكی فراوانتر لەوتارێكی لێكۆڵینەوەیی راگوزەر هەیە، بەڵام ئەگەر بەكورتیش بێت، تا دەرفەت بۆ بە قووڵی شۆڕبوونەوە بە نێو ئەم باسەدا دەڕەخسێ، پێموایە باشە ئەگەر بۆ بەرچاوڕوونیی خوێنەران شەنو كەوێكی تێدا بكەین.

هەردوو زاراوەی ئایەتوڵلاو ئایەتوڵلای عوزما (مەزن) دوو پۆستی ئایینین لەنێو شیعەكانی دوازدە ئیمامیدا كە شیعەكان بەر لەوەی ناوی مەرجەعەكانیان بێنن ئەو دوو زاراوەیە دەخەنە بەردەم ناوەكانیان. هەر كەسێكیش لەنێو شیعەكانی دوازدە ئیمامیدا یەكێك لەو دوو پۆستەی هەبێت ئەوا شیعەكان خۆیان بۆ بەدەستهێنانی حوكمێكی شەرعی لەهەر مەسەلەیەكی دیاریكراودا پەنای بۆ دەبەنو بەپێی فەرمانەكانی ئەو ئایەتوڵلا یان ئەو ئایەتوڵلا عوزمایە هەڵسوكەوت لەگەڵ مەسەلە دیاریكراوەكەدا دەكەن.





ئایەتوڵلا عوزما سەید محسن ئەلحەكیم



ئیمامی خومەینی



ئایەتوڵلا محەمەد باقر محسن ئەلحەكیم



## لەڕووی زمانەوە

زاراوەی ئایـــەتوڵلا لـــەزمانی عەرەبیدا واتە پیتۆڵ یان چاوساغ کە مانا مەجازییەکەی واتە زانا یان دانا و، لەقورئانی پـیرۆزدا وشـەی ئایـەت( الآیـة) بـە چـەند مانایـەك هاتووە وەك هێما، پەند، بیانوو و رێبـــەر، یـــان رێنمـــونیکردن و سەلماندن و ... هتد.

خـــودا لەسـورەتی (البقـــرة) ئایـــەتی ٢٥٩دا دەفـــەرموێ: (ولنجعلـك آیـة للنـاس). هـەروەها لەسـورەتی (الأنبیـاء) لـە ئایـەتی (٩١)دا رووی لەپێغەمبـــــــەر عیسایەو ئـەوو مریـەمی دایکـی بە(ئایەت: پەند) بۆ خـەڵك وەسف دەکـات کـە دەفـەرموێ: (فنفخنـا فیها من روحنـا وجعلناهـا وابنها آیة للعالمین). هەروەها لەسورەتی (مـــریم) لەئایـــــەتی (٢١)دا دەفەرموێ: (ولنجعلـه آیـة للنـاس ورحمـــة مـــنا). هـــەروەها دەفـەرموێ: (ومن آیاتـه الجـوار في البحـر کـالاعلام). هـەر لـەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: (ومن آیاتـه اللیـل والنهـــار والـــشمس والقمـــر). لەســـورەتی (الــنجم) لەئایـــەتی (١٨)شـــدا دەفـەرموێ: (لقـد رأی مـن آیـات ربـه الکـبری). کـە بـاس لەســـەرەنجام و چارەنووســـی فیرعـەونیش دەکـات دەفـەرموێ: (فالیوم ننجیك ببـدنك لتكون لمـن خلفك آیة).

## پۆستی ئایەتوڵلا

وەك پێـــشتر باسمـــان کـــرد ئایـەتوڵلا هـەر بـە تـەنیا زاراوەیـەك نییـە، بـەڵکو پلەیـەکی زانستییەو پۆسـتێکی مەزهــەبیی ئایینیـشە لەنێو شیعەکانی دوازدە ئیمامیداو ئـەو زاراوەیـە دەدرێتـە پـاڵ نـاوی کەسێك کە پلەی ئیجتیهاد کردن لـە (زانــــــست)ە ئایینیـــــەکانی بەدەســـتهێنابێ و تـــوانیبێتی و بتوانــێ حـوکمی شـەرعی لەسـەر مەســـەلەکان بـــۆ رێنـــوێنیکردنی شـــیعەکانی دوازدە ئیمـــــامی هەڵبهێنجێت.

ئـەو کەسـەی دەبـێ بە ئایـەتوڵلا نابـێ بـەهیچ شێوەیەك پێچەوانەی ئــــەو حوکمــــە شــــەرعییانە هەڵــسوکەوت بکــات کــە خــۆی بۆرێنوێنیکردنی شیعەکانی دوازدە ئیمامی رایاندەگەیەنێت.

## ئایەتوڵلای عوزما

وشـەی عوزمـا, واتـە مـەزنترین, ئـەو کاتـە دەخرێتـە پـاڵ وشـەی لێکـدراوی ئایــەتوڵلاوە کــە ئــەو کەســـــە لەئیجتیهادکردنـــــــدا گەیـشتبێتە ئاسـتێك کـە (هـەموو مەرجەکانی تـەقلیکردن)ی لەخۆیـدا کۆکردبێتـەوە, تەقلیـدکردنیش لای شـیعە واتـە بەڕێوەچـوون بـەپێی رێنمـــایی و فتواکـــانی ئیمـــامێکی دیـــــاریکراو, بەمانایەکیدیکـــــە دەتوانین بڵێین تـەقلیکردن بریتییـە لەپرۆسەی پابەندبوونی هەموو یان گروپێـــك لەشـــیعەکانی دوازدە ئیمـــــامی بـــــە ئایەتوڵلایـــــەکی دیـــاریکراو کـــە وەك مەرجـــەعی خۆیان تەماشای دەکەن و لەهـەموو مەسەلەیەکدا حوکمە شەرعییەکانی ئـەو رەچـا و دەکـەن و جێبـەجێیان دەکەن، واتە لەهەموو مەسەلەیەکدا خۆیـــان تەســـلیمی حوکمـــــە شەرعییەکانی ئەو مەرجەعە دەکـەن کە پۆستی ئایەتوڵلای هەیە و بۆیە بۆتە "مەرجەع".

ئایـــەتوڵلای عوزمـــا دەبـــێ گەیشتبێتە ئەو ئاستەی کە بتوانـێ هـــەموو حوکمـــە شـــەرعییەکانی خـۆی، کـە بـە (فـەتوا) حسێبن، لـە (نامەیـــەکی زانـــستی) دا بـــڵاو بکاتـەوە، ئەمـەش ئـەو هەلـەی بـۆ دەرەخـسێنێ کـە لەسـەر هـەموو مەســـــەلەکانی خواپەرســـتی و مامەڵـەکردنی بازرگـانی و رۆژانـەو گرێبەست و ... هتد, راوبۆچوونی خـۆی بخاتـەڕوو، کـە لـەلای ئـەو کەسانەی شیعەی دوازدە ئیمامین و بـەو ئایـەتوڵلا مەرجەعـەوە پابەنـدن وەك (فـەتوا) تەماشـای دەکـرێ و مایەی جێبەجێکردنن، نەك گفتوگۆ لەسەرکردن، یان رەتکردنەوەی.

## مەرجەکانی

ئـەو مەرجانـەی کـە پێویـستە لەکەسێکدا هەبن بۆ ئەوەی ببـێ بە



ئایەتوڵلا بریتین لەوەی دەبێ ئەو کەسە:

* پیاو بێت (واتە نێر بێت).
* باڵق بووبێت.
* عاقڵ بێت.
* شیعەی دوازدە ئیمامی بێت.
* بەپاکی لەدایك بووبێت، واتە رەچەڵەکی بێگەرد بێت. کە لێرەدامەبەست ئەوەیە دایك و باوکی موسڵمان بن و شیعەی دوازدە ئیمامی بن و لەوانەش گرنگتر (سەید) بن واتە لەبنەماڵەی پێغەمبەر (اهل البیت) بن.
* زیندوو بێت.
* ئازاد بێت.
* دادپەروەر بێت.

## یەکەمین ئایەتوڵلا

دەڵێن یەکەمین کەسێك کە پلەی ئایەتوڵلای بەدەستهێنا بێت زانا (حەسەن بن یوسف بن موتەهھەر ئەلحللی) بوو کە بە (العلامة الحلی) ناسراوە و یەکەمین کەسیش کە بۆتە ئایەتوڵلای عوزما سەید (بەحرو لعلوم) بووە.

## چۆن دەبی بە ئایەتوڵلا؟

کەسێکی شیعەی دوازدە ئیمامی، کە بەمەبەستی خوێندن دەچێتە (حەوزەی عیلمی)ی نەجەف یان حەوزەی عیلمیی(قوم)و دەست بەخوێندن دەکات بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕ دەبێت، کە هەر قۆناغێك نازناوی خۆی هەیەو هەرچەندێکی لەخوێندندا بەرەو سەر هەڵکشێت، ئەگەر مافی گەیشتن بەدوا قۆناغی خوێندنی هەبێت (کە دواتر بۆ خوێنەر روون دەبێتەوە کێ ئەو مافەی هەیەو کێش نییەتی)، بەو ئاستەش پلەکەی بەرز دەبێتەوە تا دەگات بە لوتکە، کە ئایەتوڵلا عوزمایە.

ئایەتوڵلا لە پلەی یەکەم ئەو بابەتانە دەخوێنێت کە پێی دەڵێن (سطح المقدمات)و ئەو کەسە پێی دەگوترێت (طالب) واتە خوێندکار یان قوتابی، هەروەها (مبتدا)یشی پێدەڵێن واتە دەستپێکەر،کە چووە سەر بابەتەکانی (سطح المتوسط) ئەوا پێی دەگوترێت (ثقة الأسلام) واتە جێگە بڕوای ئیسلام. پاش ئەوەی چووە قۆناغی خوێندنی ئەو بابەتانەی کە پێیان دەگوترێ: (سطح الخارج)و بە تەواوی بابەتەکانی بەسەرکەوتوویی خوێند، ئەوا پێی دەگوترێ (حجة الأسلام). پاش ئەوە زیاتر لەمەسەلە شەرعییەکان قووڵ دەبێتەوەو دەگاتە ئەو ئاستەی بتوانێ ئیجتیهادیان تێدا بکات. کە ئیجازەی ئیجتیهادکردنی وەرگرت، ئەو کاتە پلەو نازناوی ئایەتوڵلای پێدەخشرێت. کاتێ کە دەست دەکات بەوەی لەئەڵقەکانی وانە وتنەوەدا، پرۆسەی ئیجتیهادکردن جێبەجێ بکات و ئەو مەسەلانەی کە پێویستیان بە حوکمی شەرعی هەیە تێیاندا قووڵ ببێتەوەو رای خۆی لەبارەیانەوە بەیان بکات، ئەو کاتە دەبێتە ئایەتوڵلای عوزما.

ئایەتوڵلای عوزما، پاش ئەوەی لایەنگرانێکی زۆر، بۆ راو حوکمە شەرعییەکانی خۆی، لەنێو شیعەکانی دوازدە ئیمامیدا پەیدا دەکات، پاش ئەوەی بازنەی ئەو کەسانەی تەقلیدی ئەو دەکەن و بە حوکمە شەرعییەکانیەوە پابەند دەبن، بەرفراوان دەکات و جەماوەرێکی دیاریکراوی شیعەی دوازدە ئیمامی لەدەوری رایەکانی کۆدەکاتەوە، ئەو کاتە ئەو ئایەتوڵلا عوزمایە دەبێ بە مەرجەع و تا دەمرێت لەو پۆستەدا دەمێنێتەوە.

**سەرچاوەکان:**

١. قورئانی پیرۆز.
٢ـ لويس معلوف، المنجد، ط ٣، سنة ١٩٥٣، المطبعة الكاثوليكية، بيروت، ص٢٠.
٣ـ الشيخ محمد حسين المظفري، تاريخ الشيعة، منشورات مكتبة بصرتي، قم (ايران)، ساڵی چاپی بەسەرەوە نییە.

# سوپای محەمەد عەتا
# ئەنجامدەرانی (١١)ی سێپتەمبەر

رانانی : حەسەن یاسین

## ١

فرۆکەوانانی پەلامارە خۆکوژییەکەی (١١)ی سێپتێمبەری ٢٠٠١ چۆن بیریان دەکردەوە؟ گروپەکە لەڕووی ڕێکخراوەییەوە کەی؟ پێکهات. کێ ئەم گروپەی دروستکرد، کە بە شانەی (هامبۆرگ) ناسرا.

هەموو ئەم پرسیارانە لەم کتێبەی کە باسی لێوە دەکەین، وەڵامیاندراوەتەوە. کتێبەکە رۆبەرت کلەین بەناونیشانی سوپای محەمەد عەتاوە نوسیویەتی و ساڵی ٢٠٠٦ بەزمانی عەرەبی چاپکراوەو لە بڵاوکراوەکانی (الجمل)ە، لەشاری (کۆڵن)ی ئەڵمانیا کە لە بەغداش بڵاودەکرێتەوەو هەریەکە لە (حسن الشریف) و (کامیران حوج) وەریانگێراوەتە سەر زمانی عەرەبی و (١٨٢) لاپەڕەی قەوارە ناوەنجیە.

ئەم کتێبە جگە لە هەوڵێك بۆ ئاشکراکردنی پێشینەی کەسایەتییە سەرەکییەکانی شانەی هامبۆرگ، تیشکیش دەخاتە سەر (نیۆیۆرك)، کە ئامانجی سەرەکیی گروپەکە بووە.

## محەمەد عەتا

محەمەد عەتا لاوێکی میسری بووەو بۆ درێژەدان بەخوێندن کەسوکاری رەوانەی ئەڵمانیایان کردووە. ناوبراو پاش ئەوەی دەچێتە ریزی رێکخراوی قاعیدەوە، سەرکردایەتی شانەی هامبۆرگی کردووەو بۆ جیهاد هانیداون. یەکێ بووە لە فرۆکەوانە خۆکوژەکەکانی پەلاماری (١١)ی سێپتێمبەر. ساڵی ١٩٩٢ چۆتە ئەڵمانیا و کەسێك بووە هەوڵیداوە بەتوندی رێنمایی و شەریعەتی ئایینی ئیسلام لەژیانی رۆژانەدا جێبەجێبکات. عەتا هەرزوو لە ئەڵمانیا گروپێکی لە موسڵمانە توندڕەوەکان لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوەو وەك مامۆستای ئەو گروپە هەڵسوکەوتی کردووە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٩ محەمەد عەتا گەنجێکی ئەڵمانیی ناسیوە کە بۆتە موسڵمان و ناوی لەخۆناوە (شەهید). شەهید هەمیشە شانازیی بە محەمەد عەتاوە کردووە، بەڵام هەرگیز لەوباوەڕەدا نەبووە، بتوانن کارێك دژ بە زلهێزێکی وەك ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکەن. بەڵام محەمەد عەتا وا وەڵامی داەتەوە: (دەکرێ،

روبرت كلاين

جيش محمد عطا

ترجمة
حسن الشريف و كاميران حوج



منشورات الجمل





ڕێگاش هەیە بۆ ئەم کارە. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هێزێکی خودایی نییە).

گەنجە ئەڵمانییەکە، کە ئەوکات تەمەنی (١٨) ساڵ بووە، لە قوتابخانەدا لە پۆلی دوازدەهەم بووە، ئەگەرچی بە هیچ شێوەیەك هامشۆی شوێنەکانی کات بەسەربردن و ڕابواردنی نەکردوەو هیچ شتێکی لەبارەی کچانەوە نەزانیوە، کەچی محەمەد عەتا پێی گوتوە کچان خراپن وەك جولەکە، نابێ تخونیان بکەوین، نابێ لەمەودوا بەهیچ شێوەیەك شەوانە بچی بۆ ڕابواردن. محەمەد عەتا بەڵێنی ئەوەی پێداوە کە شەهید لە ئەو دنیادا کچانی پاکیزە و کۆشك و حەفتا حۆری بەنسیب دەبێ، ئەمەش وا دەکا ژیانی لە ئەودنیادا وەك هەنگوین شیرین بێ.

گەنجە ئەڵمانیەکە لەوەڵامدا پێی گوتووە: (من حەزم لە هەنگوین نییە). ڕستەی (من حەزم لەهەنگوین نییە)، زەنگێك بوو بۆ محەمەد عەتا کە یەکێك هەیە بەرئەمر و ملکەچی ئەو نییە و نایەوێت تا کۆتایی ڕێگا... تا مردن لەگەڵی بێت. بۆیە محەمەد عەتا لەمەودوا ئیدی نهێنییەکانی خۆی و گروپەکەی نەخستە بەردەستی شەهید، ئەمەش وای کرد گروپەکە لەمەودوا لە ناوخۆیاندا، بۆ ئەوەی شەهید تێیان نەگات چی دەڵێن، تەنیا بەعەرەبی قسەبکەن.

کۆتایی ساڵی ١٩٩٩ کۆتایی دوورکەوتنەوەی گروپەکەبوو لەو گەنجە ئەڵمانە، بەڵام گروپەکە هەر لەسەر خۆئامادەکردن بۆ جەنگێکی پیرۆز بەردەوام بوون، سەرۆکی گروپ پێویستی بە کەسانی ترسنۆك نەبوو، پێویستی بەو شەهیدە نەبوو کە ئامادەی گوێڕایەڵی و ملکەچبوون نییە، بەڵکو پێویستی بە(شەهید)انی بەهەشتویست هەبوو، بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە.

## ٢

دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر تەقینەوەکانی (١١)ی سێپتێمبەر، ڕۆژی ڕفاندنی چوار فڕۆکەکەو ...پەلاماردانی هەرجوو تاوەرەکەی سەنتەری بازرگانیی جیهانی و بینایەی وەزارەتی بەرگری (پنتاگۆن)، لەئەنجامی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی ٦٠٠ لێکۆڵیاری ئەڵمان و هەزاران لێکۆڵیاری ناوچە جیاجیاکانی جیهان، زۆرترین زانیاری و نهێنی لەبارەی دزێوترین تەقینەوە لەمێژوودا ئاشکراکران.

دوای ئەم لێکۆڵینەوەیە ئێستا دەزانرێ تەقینەوەکەی (١١)ی سێپتێمبەر چۆن ڕوویدا؟ محەمەد عەتا چۆن گروپەکەی پێکەوەنا؟ خۆکوژەکان چۆن بیریان دەکردەوە؟ چۆن پلانیان داناوە؟ چۆن بڕیاریان دەدا؟ ئێستا چەندین شایەتحاڵ کە محەمەد عەتا و گروپەکەیان لەنزیکەوە ناسیوە پەردەی بێدەنگیان دڕیوە، کە (شەهید)،

واتە لاوە ئەڵمانەکە یەکێکە لە... ئێستا لەنێو کۆمپیوتەرەکەی (سەعید بەهاجی)دا، کە یەکێکە لە خۆکوژەکانی (١١)ی سێپتێمبەر، ئەو فیلمەی (بن لادن) کەوتۆتە دەست کە تیایدا، وەك ئاماژەیەك بۆ سەنتەری بازرگانیی جیهانی و هەڕەشە لە ئەمریکا دەکات و دەڵێ: (لەهەرکوێ بن مەرگ دەتانگاتێ، تەنانەت ئەگەر لە... بورجی زۆر بەرزیش بن).

ئێستا چەندین نامەو ئیمێل و ... لەبەردەستدان، جگەلە ... ئەرشیفی کۆمەڵەی ئیسلامی (جمعیە الاسلام) کە محەمەد عەتا لەنێو زانکۆی هامبۆرگ... هاربۆرگی تەکنەلۆجیدا دروستی کردووە. ئەرشیفەکە پڕیەتی لە کاغەز و دەنگی تۆمارکراو و ڕیکلامی جۆراوجۆر، کە زانیارییەکی زۆر لەبارەی گروپەکە بەدەست دەدەن. ئەوەش دەخاتە ڕوو کە ئەم لاوە نمونەییانە چۆن بوون بە کەسانی توندڕەو و پاشان بوون بەسەربازی گوێڕایەڵی (بن لادن) و ئەنجامدەری (١١)ی سێپتێمبەر.

## ٣

تەنیا ڕێکەوت هامبۆرگی کرد بەشانۆی ئەم هەموو ڕووداوە، ئەگینا دەکرا هەر شوێنێکی تر لە ئەڵمانیا یان ئەوروپا بەگشتی ببوایە بەشانۆی ئەم ڕووداوە ... ئەو شوێنە، وەك هامبۆرگ، کەسێکی بکوژی وەك محەمەد عەتا

لیبوایە.

محەمەد عەتا خاوەنی بڕیارەکەبوو. لەناوچەکەی خۆیدا لە هامبۆرگ دەگەڕا بەدوای ئەو کەسانەدا کەوەک ئەو بیردەکەنەوە. ئەو خۆی گروپەکەی دروستکرد، خۆی فێری کردن. خۆی پابەند دەبوو بەو هەڵسوکەوتانەی کەداوای دەکرد پێیانەوە پابەندبن. خۆی نمونەی جێبەجێکردنی ڕێنماییەکان بوو. کەسێك بوو بۆ سەرۆکایەتیکردن شیاوبوو. هەر خۆی بڕیاری دەدا ئاخۆ فلانە کەس بۆی هەیە بێتە ناو گروپەکەیەوە یان نا. گروپەکە ببوون بە پێڕێکی تەواو کە محەمەد عەتا ڕابەری ڕۆحییان بوو.

**سەرکردەکانی گروپەکە، جگە لە محەمەد عەتا ئەمانەبوون:**

**محەمەد حەیدەر زەمار:** ئەرکی ناردنی کەسانی هەواداری قاعیدەو جیهاد دژی ڕۆژئاوای بۆ سەربازگەکانی ڕاهێنانی قاعیدە لە ئەفغانستان لە ئەستۆ بوو، دەڵێن خۆی لە ئەفغانستان و بۆسنەدا بەشداریی شەڕی کردوە.

**فرۆکەوان مەروان ئەلشەحی:** نمونەی کەسانی قسەخۆش بوو، پێش ئەوەی بچێتە نێو گروپەکەی هامبۆرگی ئەڵمانییەوە. جلی ئەفغانی لەبەردەکرد. ئەو پارەیەی کە بۆ خوێندن وەریدەگرت و بڕەکەی (٢٢٠٠٠٠) مارکی ئەڵمانی بوو، بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەکاروباری تیرۆر خەرجی دەکرد، نەك خوێندن.

**فرۆکەوان زیاد ئەلجەراح:** ساڵی ١٩٩٦ لەلوبنانەوە چووبوو بۆ ئەڵمانیا. پێ ئەوەی ئەو گروپە بناسێ خۆی دابووە مەی خواردنەوەو چوون بۆ مەلهاکان، دۆستێکی کچی هەبوو. لەژێر کاریگەری محەمەد عەتادا بوو بەکەسێکی توندڕەو.

## یاریدەدەرەکانی گروپ

**سەعید بەهاجی:** لەجیاتی گروپەکە کاروباری بەکرێگرتنی خانوو و دانی کرێی لەئەستۆ بوو. لەسەر کۆمپیوتەرەکەی خۆیدا فیلمێکی ڤیدیۆیی بن لادنی هەڵگرتبوو کە تیایدا هەڕەشە لەئەمریکا دەکات. هەروەها لەناو کۆمپیوتەرەکەیدا فایلی مامەڵەی خۆکوژەکانی هەڵگرتبوو.

**زەکەریا ئەلسەبار:** بەگوێرەی پلانێك دەبوو ناوبراو یاریدەدەری (بن ئەلشەیبە) بێت، وەك فرۆکەوان. بەڵام نەیتوانی ڤیزای چوونە نێو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەدەست بێنێت. وەك بەهاجی و بن ئەلشەیبە، پێش ڕووداوانی پەلامارەکەی (١١)ی سێبتێمبەر هامبۆرگی بەجێهێشت.

**ڕەمزی بن ئەلشەیبە:** دوای محەمەد عەتا بەکەسی دووەمی گروپەکە دەژمێردرێت. توانایەکی گەورەی سەرنجڕاکێشانی کەسی بەرامبەری هەبوو. دەیویست ببێت بەفرۆکەوان و لەپەلامارەکەی ١١ی سێبتێمبەردا بەشدار بێت، بەڵام نەیتوانی ڤیزای چوونە نێو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەدەست بێنێت. ئینجا خۆی بۆ کاروباری دارایی گروپەکە تەرخان کرد. هەروەها ئەرکی پەیوەندیکردنی بەکەسانی توندڕەوی لەهەموو لایەکی جیهانەوە لەئەستۆ بوو.

**مونیر ئەلموتەسەددیق:** پاش ئەوی گیرا داواکاری گشتی فیدراڵی ئەڵمانی بەیارمەتیدانی گروپەکەی محەمەد عەتا تۆمەتباری کرد، یارمەتیدانەکەی بریتیبوو لەوەی کاتێ کە گروپەکە بۆ مەشقکردن لەسەر فرۆکە لەئەمریکا بوون، ئەو نوێنەرایەتی گروپەکەی کردووە لەهامبۆرگ.

## ٤

بەخوێندنەوەی ئەم کتێبە، کە بەپشت بەستن بەچەندین دۆکیۆمێنت و شایەتحاڵ و کاسێتی دەنگی و ڤیدیۆیی و بەڵگەنامەی نووسراو، ئامادەکراوە. خوێنەر زانیارییەکی زۆری لەسەر گروپەکەی محەمەد عەتا لەهامبۆرگ دەست دەکەوێت، ئەو گروپەی کە بوون بەسوپایەك و بەسەرکردایەتی محەمەد عەتا پەلاماری هەردوو تاوەری سەنتەری بازرگانیی جیهانی لەنیویۆرك و تەلاری پنتاگۆنیانداو کارەساتی ١١ی سێبتێمبەری ٢٠٠١یان خوڵقاند.

# مێژووی بوونی شارستانیەتی هۆزەکانی شاری هەمەدان ـئەکباتانا ـ کە دامەزرێنەری دەوڵەتی سەبا و معین بوون لە کۆماری یەمەنی ئێستادا...!.

گەر باس لە مێژووی رابردووی گەلانی کێشووەری ئاسیاو، بە تایبەتی رۆژهەڵاتی ناوەراست بکەین، هەندێ جار نووسەرو رووناکبیرو شارەزاکان تووشی سەر سوڕهێنەر دەکات. ئەویش لە ناکاو دەبینی چەندین نووسەر، یاخوود پرۆفیسۆر، یاخوود شووێنەوارناسان، بابەتی وا دەردەخەن کە جێگەی گوومان نیە بە پێی توێژینەوەکانیان و شیکردنەوەی شووێنەواروشارستانیەتەکانی گلانی کۆنی مرۆڤایەتی لە سەر ئەم گۆ زەویەدا.

عەلی کەندی

لە بەر ئەو رۆشنایەش گەلان، توانیویانە مێژووی بوونی خۆیان بە شێووەیەکی جوان و رێك و پێك لە هەموو بوارەکانی، مێژوو و، زمان و، هەڵکەوتەی جووگرافیا و، داب و نەریت و، کەلتوور و، شووێنەوار و، شارستانیەتەکەیان، بە پێی ئەو زانیارییە بە پێزوو تێرو تەسەلەی کە لە لایەن شارەزایانی ئەم بوارانەدا شیکراونەتەوە.

کە ئەمرۆش ئامێری نوێی وا بەر دستی ئەو شارەزایانە هەیە ئەویش بۆ بە بەکار هێنانی بە – کاربۆنی/١٤ – بۆ شێکردنەوەو لێکۆڵینەوە، کە کار بۆ ئەم مەبەستە دەکەن و جێگەی گوومان نیە و میللەتانیش کردویانەتە سەرچاوەی گرنگ بۆ سەلماندنی بوونی خۆیان لەو بوارانەی کە لە سەرەوە باسمان لێووە کردوون.

هەر لەو چوارچێووەدا منیش بە دوای سەرچاوەی بڕوا پێکراو گەراوم کە لە لایەن شارەزایانی بیانی و



**عەلی کەندی**

ناوخۆیی ئەو ووڵاتانەش، کە خۆیان درکیان بە ژیا[illegible] بوونی خۆیان نەکردووە، یاخوود بە ویژدان[illegible] بابەتەکانیان بە شێووەیەکی راستگۆیانە دارشتۆتەو[illegible] خۆیان خۆیان کردۆتە خاوەنداریەتی ئەم شووێنەو[illegible] شارستانیەتە، کە دەڵێن هی تۆیە، بەڵام هی ئێمەیە[illegible] ئێمە کردومانە.

کە هەست و هۆشە راستەکانیان دەرخراون، بە[illegible] زۆریان بە پێچەوانە وەریگێراوەو نازانێ کە هەر خۆش[illegible] راستیەکانی درکانندووە لە هەموو بوارەکاندا. بە[illegible] سەیر لەوەیە کە خۆت بنیووسیەوەو شارزایان[illegible] شووێنەوارناسان و رۆژهەڵاتناسان و گەریدەکان ب[illegible] پێچەوانەی ئەم بە خۆنووسینەوە بن لەو بوارانەی کە[illegible] سەرەوە باسمان کردن.

بەڵام بە پێچەوانەی ئەو کەسانە، کورد رۆژێك لە رۆژانی مێژووی بوونی خۆی لە سەر خاکی کوردستان بە ئارەزووی خۆی بوونی خۆیی شارستانیەتیەکی نەنووسیووەتەوە، بەڵکو نووسەرو پرۆفیسۆر و گەریدە بیانیەکان مێژووی بوونی کوردیان نووسیووەتەوە لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا.

بە تایبەتی نووسەرو رووناکبیری ناوداری جیهان – وویڵ دیورانت – کە لە کتێبە بەناوبانگەکەی – قصة الحضارات – کە لە بەرگی ١/ ٢ باس لە چۆنیەتی بوونی کورد و، داب و، نەریت و، کەلتوور و، زمان و، مێژوو و، شارستانیەتەکەی، دەکات و، هەروا باس لە ئاینی زەردەشتی و میدیا دەکات لە کێشووەری ئاسیادا .

لێرەدا نامەوێت بچمە ناو هەندێ لایەن، کە بابەتەکە لێك بترازێنێ، بەڵکو دەگەرێمەوە سەر بابەتەکەی کە من مەبەستە روونی بکەومەوە ئەویش :-

کە وەزارەتی معارف و ئاژانسی شووێنەوارو مۆزەخانەکانی کۆماری یەمەن – هەروا مۆزەخانەی میترۆبۆلیتان لە ئەمەریکا و، بە تایبەتی پرۆفیسۆری رووسی – ئەندریێ کاراتائف – لە کتێبەکەیدا بە ناوی – مێژووی یەمەنی کۆمەڵایەتی – کە ساڵی ٢٠٠٦ لە شاری مۆسکۆ بە چاپگەیاندراوە، ئەمانە و ئەم بەم شێووەیەی خوارەوە باس لە مێژووی چۆنیەتی دامەزراندنی ئیمارات، یاخوود دەووڵەتی سەبا لە کۆماری یەمەنی ئێستادا دەکەن.

لێرەدا من هەوڵ دەدەم کە چەندین نموونەی دروست بخەمە روو بۆ راستی ئەم بابەتە کە دەووڵەتی سەبا لە لایەن ئەو کەسایەتیانە دامەزراوە، کە لە سەر خاکی کوردستان بەرەو ئەو ناوچانە کۆچیان کردووە و توانیویانە ئەم شارستانیەتە دروست بکەن و تاکو ئێستاش کەس ناتوانێ نکۆڵی لەم شارستانیەتە بکات.

کە دەووڵەتی سەبا لە لایەن ئەسیوبیەکان پێی گوتراوە – ماکدینا و، لە لایەن رومانەکان پێی گوتراوە – نیکۆلا – لە بەر ئەوەی دەووڵەتی سەبا ٧٠٠ ساڵ بەر لە مێژووی زایینی دامەزراوە و دوور نیە بەر لەو مێژووەش دامەزرابێت، ئەویش بە پێی ئەو نیگارانەی کە لە نیگارەکانی – ئاراد ئانار –ی یەکێك لە شاکانی شاری ئوور هاتووە، کە پێی گوتراوە – سابووم – واتە سەبا، کە ئەمەش وا دەریدەخات کە دەووڵەتی سەبا زۆر بەر لەو مێژووە بووە و سۆمەریەکانیش رۆڵی گرنگیان لە پەرەپێدانی دەووڵەتی سەبا هەبووە .

کە لە لایەن کەسانی لێهاتوو دامەزراوەو ئەم کەسایەتیانەش لە سەر



نەخشەی شانشینی سەبەء

یگـتن تـامر بـووه. هـەروا شـاری عـەدەن ناونراوە بە ناوی – ئەدەن کـوری سـەبا کـوری شـالە کوری ئەرفخشد کوری سام کوری نوح هەروا شاری **حەزرە مۆت بە** ناوی ئەزرەمۆت کوری یگتن کوری تامر ناونراوە، کە لە ئەزرە مۆتیش لە کتـابی پـیرۆزی تـەورات بـە ناوی ئەزرەمۆت هاتووە.

هـەروا نووسـەری نـاودار – رازی لـە کتابەکـەی بـە نـاوی – مێژووی شاری سەنعا – دەڵێ :–

لەو کاتەی کە نوح دەمرێ، سامی کوری زۆر خۆش ویستووە و کە لە بـاکوور نیـشتەجێ بـووە، واتە کوردستان.



دابەشکردنی جوگرافی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە دیدی تۆرانییەوە

خـاکی کوردستان وەك سۆمەریەکان، کە لە کەسایەتیە یەکەمیـەکانی چیای زاگـرۆس و دەووروبـەری بوونـە، شارسـتانیەتی سـۆمەریان دامـەزرانج لـە سـەر خـاکی کوردستان و دەووروبەری و لە وولاتی نێوان دووزێدا، واتە میزۆبۆتامیا .

بە تایبەتیش کە یەکەم شار دروستیان کردبێ لە بواری بیناسازی شاری ئوور بووەو دوایی بەرو پەرەپێدان و ئـاوەدان کردنـەوەیان بـردووە و دەسـتیان کـردووە بـە بوارەکانی کشتووکاڵ و بوارەکانی دیکەی شارستانیەت لەو ناوچەیەدا.

بۆ نموونە :– **یەمەن بۆچی ناونراوە یەمەن**، کە بە ناوی – بەیمەنی کوری سام کوری حەزرەتی نوح بووە، کە دوای خۆی ۱۳ کوری هەبووە، یەکێك لەو کوڕانە بە ناوی – تیمـەن کـوری یگـتن بـووەو لـە دوایـی لـە لایـەن عەرەبـە زووبەیدیەکانی بووە بە یەمەن .

هەروا – سەنعا بە ناوی سەنگاهی کوری ئازای کوری

دوای ئەوە بەرەو باشوور کۆچی کردووە تا گەیشتۆتە ناوچەی یەمـەنی ئێستا و ئەم ناوچەیەی بۆ نیشتەجێ بوون دەست نیشان کردووە، لەوانە خاکی دەڤەری کە شاری سەنعای لێ دروستکردووە ، کە لەو کاتە شاری سـەنعا بـە نـاوی ئـازای بـووە تـاکو هێرشـی یەکـەمی حەبەشـیەکان بـۆ سـەر شـارەکە، کـە لـە سـاڵی ۳٤۰ ی کۆچیدا ئەنجامیانـدا. دوای ئـەوە ناوەکـەی گـۆڕاوە بۆ سەنعا.

هەروا گەر باس لە شارستانیەتی معین بکەم، کە کەتۆتە نێـوان خـاکی شانـشینی سـعوودیە و یەمـەنی ئێـستا، ئـەویش لـە لایـەن نـەوەی دامەزرێنـەری دەوڵـەتی سەبایەکان دروستکراوە کە ناوی – تەموود ژائر ئیبرام سام – ە وە بووە، کە ئەویش دەگەرێتەوە سەر بنەماڵەی خاتوو بەلقیس ، هەر وەك لـــــــــــە خوارەوە ئامارەم بۆ کردووە .

کە شای دەووڵەتی سەبا بووە، کە ئەم دەووڵەتەش لە

شێوەی ئەو ٢٧ ئیمارەتەی کە لە شاری ئەکباتانا هەبوونە ، بە هەمان شێووە لە دەووڵەتی سەبا و معین هەبوونەو لەوانەش شاری فرنۆ پایتەختیان دەووڵەتی معین بووو، هەرواش شاری مەئرەب پایتەختی دەووڵەتی سەبا بووە ,

ئەمە لە لایەك و لە لایەکی دیکەش، هەردوو شووێنەوارنناسان – ڤلی و ملاکر – لە دوای لێکۆلینەوەو پشکنین لە سەر نووسراوەکانی سەر تابلۆ بردینیەکان ئەوەیان ڕوونکریتەوە کە ئەمانە دەگەڕێنەوە سەر هۆزە ئاریە میدیاکان، هەروا باس لە هێرشی هێزەکانی ئیمپراتۆریەتی میدیا دەکات بۆ سەر میسر و کە لە ئەنجامی ئەو شەڕەش شاری قمبیزی میسری دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، کە ئەم هێرشانەش لە ناوچەی دەووڵەتی سەبا و معینەوە ئەنجام دەدرێن.

کە پەیووەندی بەهێزی خزمایەتی لە نێوان میدیاکان و سەباو معینەکاندا هەبووە لە هەموو بوارەکانی بیناسازی و بازرگانیدا .

هەروا – ئیبن ئەسیر لە کتابەکەی – کامل فی تاریخ – باس لە دەووڵەتەکانی سەبا و معین دەکات.

بەلأم بەداخەوە لە دوای سەر هەڵدانی عەرەب و بە هێزبوونی دەسەڵاتیان بە سەر ناوچە جیا جیاکاندا، بە تایبەتی لە دوای هاتنی ئایینی ئیسلام بە داگیرکردنی هەرێم و ناوچە جیا جیاکان لە ڕێگەی هەڵمەتەکانی فتووحاتی ئیسلامی، هەرچی شووێنەوار و شارستانیەتی کۆن ونوێ هەبوون دەستکاریان کردووەو ناو ناوەڕۆکی مێوو و شارستانیەتەکانیان گۆڕیووە بۆ سەر زمانی عەرەبی و بە هی خۆیان زانیووەو لە هەموو بوارەکانی ئەم بوارەدا، گەر توانایان هەبوایە حەزرەتی نووحیشیان دەکردە عەرەب و دەیان گووت لە نەوەی کەنعانیەکانە.

شاری هەمەدان – ئەکباتان – شارێکە لە شارە کۆنەکانی ئێستای ئێران، کە بە مانای رایەخی سپی دێت، یاخوود داپۆشراو بە ڕەنگی سپی، یاخوود سپی پۆش، بە زمانی دەسەڵاتی میدیەکان لە سەردەمی میدی، کە گۆری زانای پزیشکی بابا تاهیر هەمەدانی بەناوبانگی تێدایە، کە بە زمانی مەلایریە ئاخاوتنیان دەکرد، کە دانیشتووانەکەی کورد بوون و لە گۆڕیکان و برزیکان پێك هاتبوون، بەلأم ئەمرۆ دانیشتووانەکەی کوردن، کە لە هۆزەکانی لۆرو، للك و، زەنگەنە ، پێکهاتوون، لە گەڵ فارس و ئەزەریش.



وێنەی خانووی تەمودییەکان کەوا لە شاخ دابڕاوە

ئەمە لە لایەك و لە لایەکی دیکە – وویڵ دیورانت – لە بەرگی ١/٢ لە لاپەڕە ٣٩٩ی– قصة الحضارات – نووسیوویەتی و دەلێ :–

ئەمەش بە پێی تابلۆی تۆمارکراو لە دوای گەڕان لە لایەن – شەلما نەسری سێیەم بۆ شاری پارسوا لە چیاکانی کوردستان، هۆزو تیرە کوردیەکان بەر لە ٨٣٧ ساڵ پێش مێژووی زاینی – ٢٧ – ئیماراتی کوردی هەبووەو پایتەختی ئەو ئیماراتانەش شاری ئەکباتان

بووە، کە ئێستا شاری هەمەدانی پێ دەڵێن.
کە ئەم کارەش بە سەداساڵی بردووە تا ئەو هۆزو تیرە کوردیانە توانیویانە یەکتر بناسن و گفتووگۆ بکەن و ڕێکەون لە سەر ئەوەی کە ئەو ٢٧ ئیماراتە دابمەزرێنن و دەستەی خۆجێ و دەستەی گشتی بۆ خۆیان پێك بێنن و هەمەدانیش بکەنە پایتەختی خۆیان، دوای ئەوە دەوڵەتی میدیاش لە سەر بنەمای ئەو ٢٧ ئیمارەتە دامەزراوەو دەسەڵاتداریەتی خۆی بەرێوە بردووە لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا.
بەر لەوەش یەکێك لە کەسایەتیەکانی ئەو شارە، واتە لە شاری ئەکباتانا – هەمەدان – بە ناوی – شالە هەمەدانی – دامەزرێنەری دەوڵەتی سەبا و سارستانیەتی سەبا بووە و و دوای ئەویش نەوەکانی، کە کوڕە گەورەکەی یەگرب بووەو بووەتە شای دەوڵەتی سەبا.
دەوڵەتی سەبا لە سەدەی دەیەمی بەر لە مێژووی زاینی دامەزراوە، کە پایتەختی دەوڵەتی سەبا شاری مەئرەب بووەو شاکانی ئەو دەوڵەتە بەنداوێکیان دروست کردووە بە ناوی بەنداوی مەئرەب و تاکو ئێستاش ماوە و گرنگی مێژوویی خۆی هەیە.
بەڵام بە پێی قۆناخە تێپەڕ بووەکان ناوی شووێنەوارو شارستانیەتەکە گۆڕاوە لە سەر دەستی دەسەڵاتدارە یەك لە دوای یەکەکان، بە تایبەتی لە دوای هاتنی ئاینی ئیسلام، کە هەر هەمووی گەمارۆدراوو بە هی خۆیانزانووە، کە قەحتانیەکانیش لە نەوەی ئەو هۆزانەی، کە لە هەمەدانەوە بەرەو ئەو ناوچەیە کۆچیان کردووە و بە هیچ شێووەیەك پەیووەندیان بە نەتەوەی عەرەب نەبووە.
هەروا بۆ ڕاستی ئەم بابەتەش شاری مەناخە. کە دەکەوێت نێوان هەردوو قەڵای – بیەژو شیام و هەراز – کە ١١٥ کیلۆمەتر لە شاری سەنعای پایتەختی یەمەن دوورە و بەرزی ٢٢٠٠ مەترە لە سەر ئاستی دەریا و لە ڕۆژهەڵاتی هەراز چەند گوندێکی چیای هەیە لەوانە گوندی – هەتیپ – کە ئەویش گۆڕی داواکاریە ئیسماعیلەکان – حاتم ئیبراهیم هەمەدانی – لێیەو کە مەزارێکی گرنگی گەشت و گوزاریەو تاکو ئێستاش پێی دەگوترێ – مەزار – کە مەزاریش ووشەیەکی کوردیە و لە هیچ زمانێکی دیکە ئەم ووشەیە بەکار ناهێنرێت تەنیا کورد نەبێت و هەتا لە نووسینەکانی زمانی عەرەبیش، کە ئەمەش مانای وایە سەبا لە لایەن کورد دامەزراوە.



شوێنەواری مۆزەخانەی بلاسوور و شاژن بەلقیس تەمەنی ( ٦ ) هەزار ساڵە

هەروا لە نووسینە کۆنەکان و نوێیەکانی شارەزا و نووسەران و پرۆفیسۆرانی بواری شووێنەوارو مێژووی شارستانیەتی مرۆڤایەتی، ئەوە دەردەخەن کە خاتوو – بەلقیس – کچی ڕەماح کوری کوش کوری حام کوری نوح بووە.
کە هەموو نەتەوەو ئاینێك ئەوە باش دەزانن، کە نوح لە چیای جوودی بووە وچیای جوودیش خاکی


پەرستگای ئەوام

کوردستانە و، بە پێی تێپەڕبوونی گۆڕانکاریەکان بەرەو ناوچەی یەمەن کۆچیان کردووە و هەر لەوێش بۆتە هاوسەری حەزرەتی سلێمان و، دوای ئەوەش دەسەڵاتی دەوڵەتی سەبای گرتۆتە دەست .

یەکێك لەوشایانەش کە لە ساڵی ۱۹۷۲ کۆتایی بە شانشینەکەی هێندرا شانشینی ئەسیوپیا هیلاسیلاسی بووە ، کە بنەماڵەکەی لە نەوەی هۆزە دامەزرێنەرەکانی دەوڵەتی سەبا بووە.

هەروا دەوڵەتی سەبا زۆر کۆنە و لە هەزارەی دووەمی بەر لە مێژووی زایینی بووە، کە یەمەنی ئێستا و، حەبەشەی ئێستا و، ئەسیوبیاو ئەریتریای ئێستای، لەخۆگرتووە و ئەم دەوڵەتە بەردەوام بووە تا دەوڵەتی - حەمیریەکان - دامەزراوە.

ئەمە لە لایەك و لە لایەکی دیکە چیرۆکی خاتوو بەلقیس و سلێمان، وەك ئەوەی کە باسی لێوە دەکەن، کە گوایە حەزرەتی سلێمان باڵندەی هودهودی ڕەوانە کردووە بۆ ئەوەی بزانێ مردوو زیاترە یاخوود مردوو، یاخوود بە کاری جادوکەری هەوڵی دابێ بەلقیش بۆ خۆی بهێنێ.

بەڵام ئەم بیروو بۆ چونانە ڕاستی تیا نیە و، بەڵکو ڕەوانەی دوای بەلقیسی کردووە بۆ ئەوەی سەردانی بکات، کە کێشە هەبووە لە نێوان بەلقیس و حەزرەتی سلێمان، کە بەلقیس سەردانی حەزرەتی سلێمانی کردووە و لە ئاکامی گفتووگۆی نێوانیان و پاداشت گۆڕینەوە لە گەڵ یەکترا کێشەکەیان چارەسەرکردووە.

هەروا لە شارستانیەتی دەوڵەتی سەبا گرنگیان بە ئاینی خۆیی ئەوکات داوە، کە ڕۆژپەرست بوونە و بە دەیا مەزاریان هەبووە، کە ئەویش لە سەر تابلۆ نەخشێندراوەکانیان ئەوە بە دەردەخات، بە تایبەتی لە تابلۆیەکی بەردی کە خاوەنەکەی - شەریە - شەرهەم - ئەیمەن هەمەدانی - نووسیویەتی لە گەڵ لە شووێنەواری - بەکی - کە ئەم شووێنەوارەش دەکەوێتە ناوچەیەکی سووری دارستان لە ناوچەی -کمیم - لە پارێزگاری زمار و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتی سەباییەکان و حەمیریەکان.

کە بەکی شووێنەوارێکی گرنگەو پەیکەری شای حەمیری بەناوبانگ - زمارو کورەکەی - تاران - ی لێ دۆزراوەتەوە لە گەڵ بە دەیا نەخش و نیگارو نووسین لە سەر تابلۆی بەردی لە ناوچە شووێنەوارە شارستانیەتەکەدا.

هەروا ئەو نەخش و نیگارەکانەش بە دروستکردنی ئاژەڵ بووە و، بە تایبەت لە پەرستگای خواکانیان کە وێنەی ڕۆژ و مانگ و گوڵ بووە.

بە تایبەتی لە پەرستگای ملگە، کە پیرۆزترین پەرستگای سەباو حەمیریەکان بووە و، هەروا لە پەرستگای ئاوام، کە ئەمڕۆش لە ناو دانیشتووانە یەمەنیەکان پێی دەگوترێ - محرم بلقیس - کە ئەو پەرستگایەش بە دووری/ ٤ کیلۆمەتر لە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری - مەئرەب - ە لە یەمەن.

ئەم زانیاریانەش لە ئاکامی پشکنین و لێکۆلینەوەی شووێنەوارناسانی ئەمەریکی بە تایبەتی شووێنەوارناس- ئارنۆ - کە لە ساڵی ١٨٤٢ - ١٨٧٠







پاشماوەی شوێنەواری پیتەکانی نووسین بۆ سەدەی شانشینی سەبەء دەگەڕێتەوە

لە پەرستگای ئاوام کاری لە سەر کردووە.

هەروا زانای شوێنەوارناس -ئەدوارد ژلازر- کە لە ساڵی ١٨٨٨ پشکنین و لێکۆڵینەوەی لەو شوێنەوارە کردووە.

هەروا بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٤٣ وێنەی فۆتۆگرافی پەرستگای ئاوام گیراوە، کە ئەمەش لە لایەن دەزگای ئەمەریکی بۆ لێکۆڵینەوەی مرۆڤ ، کە لە ساڵی ١٩٥١ – ١٩٥٢ لە پەرستگای ئاوام بە سەرۆکایەتی - ویندڵ فیلیبس – کاریان لە سەر کردووە.

بەڵام دوای ئەوە بۆ ماوەی ٤٥ ساڵ کاری پشکنین و لێکۆڵینەوە وەستێنرا ، دوای ئەوە، هەمان دەزگا بە سەرۆکایەتی - مارلین هۆژسۆن فیلیبس – لە ساڵی ١٩٩٨ دەستی بەکارەکانی کردەوە لە پەرستگای ئاوام و بەردەوام بوو تاکو ساڵی ٢٠٠٥.

لە گەڵ ئەوەشدا بە دەیا پەرستگای دیکە لەو دەوڵەتە هەبووە، وەك پەرستگای – مەگە، لە سەرواخ و، پەرستگای – هیران – لە هوومران و، پەرستگای – میفئیم – لە نزیك خەمەر لە یەمەنی ئێستادا.

لە ئاکامی ئەم پشکنین و لێکۆڵینەوەیە لە سەر نووسینی سەر تابلۆ و وێنەکێشراوەکان، وا دەرکەوتووە کە دەووڵەتی سەبا پەیوەندی بە هێزی لە گەڵ ئیمپراتۆریەتیەکانی وولاتی نێوان دووزێ - میزۆبۆتامیا – و شام و میسری کۆن هەبووە .

هەر وەك لە سەرەوە باسی ئەوەمان کرد، کە ئاینی سەبایەکان زۆر نزیك بووە لە ئاینی بابلیەکان، کە دوو خوای مەزنیان هەبووە ، ئەویش رۆژو مانگ و لە کاتی رێوروسمی کاری ئاینی روویان لە رووناکی کردووە لە کاتی بەیانی بە تایبەتی رووکردنە رۆژ کە رۆژیش سەرچاوەی بوونی ژیانە.

لە هەمان کات گرنگیان بە بیناسازی و کشتووکاڵ بازرگانی داوە، هەر وەك نووسەری ئەگریگی - بلینی - کە لەوکاتەی کە سەردانی ناوچەی یەمنی ئێستای کردووە.

مێژووی دروست بوونی دەووڵەتی سەبا لە بیروو بۆ چوونەکان جیاوازیان هەبووە، لە بەر ئەوەی دەووڵەتی سەبا گرنگیان بە نووسینی راپۆرتی رۆژانەیان نەکردووە تا ساڵی ٦٠٠ بەر لە مێژووی زاینی. کە ئەمەش بۆتە هۆی نەبوونی تۆماری کۆن لە لایەن

دەووڵـتـــی ســـەبا، واش مەزەنـــدە دەکرێـــت کـــە دەسـەڵاتداریەتەکانیان لـە سـاڵی ۱۱۰۰ – ۱۰۰۰ ساڵ بەر لە مێژووی زاینی بوو بێت و لە ساڵی ٥٥٠ کۆتایی بـە دەسـەڵاتی سەبایەکان هـاتبێ، ئەمـەش بـە هـۆی هێرشکەرانی ساسانیەکان .

ئەمەش بە پێی سەرچاوە ئاماژە پێکراوەکانی دەووڵەتی سـەبا بـووە لـە لایـەن تۆمارگاکـانی شـا –سـەرجۆنی دووەمی ئاشووری – لە تۆمارەکانی جەنگی لە ساڵانی ۷۲۲ – ۷۰٥ بەر لە مێژووی زاینی.

ئەمەش لەو تۆمارگایانەی ئاشوریەکان بووە، کە باجی کۆکراوەی تیا تۆمارکراون کە لـە لایـەن شـای سـەبا – ئیـت ئیمـار – دراوەتـە ئاشـووریەکان ، کـە ئەمـەش کۆنترین سەرچاوەی تۆماری تۆمارکراوە، بە ناوی شای سەبایەکان و لە هەمان کاتدا تۆمارکردنی شارستانیەتی سەبایەکان.

هـەروا زانـای شووێنەوارناسـی ئـەڵمانی – کریـستیان رۆبان – باس لە چۆنیەتی بوونی شارستانیەتی سەبا دەکات، بە پێی ئەو نەخشانەی کە لە شووێنەوارەکانی دەووڵـەتی سەبا لـە یەمـەن دۆزراونەوتـەوە و، ئامـاژە بـە چۆنیەتی بـوونی دەووڵـەتی سـەبا دەکـەن و دەسـەڵاتی دەووڵـەتی سـەبا تـا سـەدەی یەکـەمی زایـنی بـەردەوام بوونە لە سەر تەواوی وولاتی یەمەنی ئێستا.

کە دەووڵەتی سەبا بەهێزترین سووپای هەبووە لەوکاتدا و چەندین ناوچەی لە کێشووەری ئەفریکیا خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، لە گەڵ بەزاندنی سووپای مارکۆس ئیلیوس گالوسی رۆمانی کە لەوکاتدا وولاتی میسری کۆن بەشێك بووە لە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی.

هـــەروا ســـەبایەکان زمـــان و کـــەلتوورو رێزبەنـــدی زمانەوانیان هەبووە و هەمان پیتیان بەکارهێناوە کە لە تـەواوی زمـانی سـتاندەری زمـانی کوردیـدا هـەن و پیتەکانی زمانی عەرەبی تیا بەدی نەکراوە .

هەروا شووێنەوارنناسی ئەڵمانی کریستیان رۆبان باس لەوەش دەکات، کە پەیوەندی بەهێز لە نێوان شاکانی ئوورو دەووڵەتی سەبا هەبووە لە بوارەکانی بیناسازی و کشتووکاڵ و بازرگانی و هەتا پەیوەندی خزمایەتی.

لێرەدا با ئەوەش بخەینە بەر چاوان، کە سۆمەریەکان لە کەسە یەکەمیـەکانی چیای زاگـرۆس و دەووروووبـەری بوونـــە لـــە کوردســـتان و بـــەرەو پێدەشـــتەکانی دەووروووبەری ناوچەکە هەنگاویان ناوە، لە پێناو بەرەو ژیـانێکی باشـترو دەسـت کـردن بـە دروسـتکردنی شارسـتانیەت، کـە ئـووریش یەکێکـە لـە شارستانیەتی سۆمەریەکان و هـەروا لـە ناوچـەی وولاتـی نێـوان دوو زێـی و شـام و چـەندین جێگـەی دیکـە لـە رۆژهـەڵاتی ناوەراستدا .

هـەروا دەسـتەی شـووێنەواری ئـەڵمانی کـە سـەر بـە پـەیمانگای ئـەڵمانی بـۆ شـووێنەوار و بـە هاوکـاری گرووپێکی شووێنەواری کۆماری یەمەن لە ۲۰۰٦/۱۰/۲۸ دەسـتیان کـرد بـە پـشکنین و لێکۆڵینـەوەی ژیۆلـۆژی و جـــووگرافی و هیدرۆلۆکیـــە، لـــە چـــۆنیەتی بـــوونی شـــووێنەوارەکان و شارستانیەتی دەووڵـەتی سـەبا لـە ناوچەی پارێزگای مەئرەب لە کۆماری یەمەنی ئێستادا، کـە زیـاتر لـە ۳۰۰ جێگـەی شـووێنەواریان لـە سـەر نەخـــشەی جـــووگرافی کـــۆنی ئـــەو شـــووێنەوارانە دۆزییەوەو لێکۆڵینەوەیان لە سەر کردووە و راستیەکان ناوەرۆکی ئەم بابەتە پشت راست دەکەنەوە.

## سەرچاوەکان :–


۱- وزارت المعارف، وكالة الاثار والمتاحف اليمنية.

۲- متحف مبتروبوليتان للفنون فى امريكا.

۳- منحوتات وفنون اليمن القديم .

٤- تأريخ اليمن الاجتماعي - اندرية كاراتائف – موسكو - ۲۰۰٦. isbn ٥-٤٨٤- ۰۰۵۲۹-۹.






# نۆتەی ترس لە سیمفۆنیای لێپرسراوە نوێیەکاندا

م. ڕێزان عوسمان مستەفا
زانکۆی سۆران

ماوەیەك بەر لە ئێستا ڕووداوێکیان بۆ گێڕامەوە، منیش دەیگێڕمەوە، چونکە حیکمەتێکی تیایدا دەبینن. میوزیك سەرتاپای ژیانی مارگرێت بوو، کە هەر لە تەمەنی شەش ساڵییەوە خولیای ژەنینی ببوو، خەوی بەوەوە دەدیت ڕۆژێك لە ڕۆژنا ببێتە میوزیكژەنێکی بەناوبانگ. بەڵام لە بیستەکانی تەمەنی لەناکاو تووشی خوێنبەربوونی مێشك دەبێ و دەبێتە هۆی ئیفلیج بوونی دەستی ڕاستی. دونیا لەبەر چاوی ڕەش دەبێ بە هۆیەوە کە خەوی ژیانی لەناو چوو.

بەڵام لە ڕێگای چەند هاوڕێیەکییەوە کە بەردەوام هانی دەدەن لە ساڵی١٩٨٣ بڕیار دەدات بچێتە سەنتەری پێگەیاندن بە ئامانجی یارمەتیدانی کەمئەندامان بۆ ڕاهێنانیان لەسەر کار، تاکو بتوانن کارێك بکەن و نەبنە بارگرانی لەسەر خانەوادەکانیان .

هەر هێندەی دەست بەکاربوو لەو سەنتەرە، لەگەڵ خانمێك یەکتریان ناسی بەناوی "ڕۆس" کە هەمان حاڵەتی مارگرێتی تووش هاتبوو، بەڵام ئەو دەستی چەپی ئیفلیج ببوو. ڕۆس لەم سەنتەرەدا هەوڵی دەدا خۆی ڕابهێنێ چۆن ئارەزووی میوزیکەکەی بگۆڕێت بۆ پیشە، تاکو بتوانێ بژێویی ژیانی پێ دەستبەر بکات و چاوی لە یارمەتیی کەس نەبێت.

خولیا بوونیانم بەم ئارەزووە وادەکات لە ماوەیەکی کەمدا پەیوەندییەکی گەرم لەنێوانیان دروست ببێت و ڕۆژانە چەند کاتژمێرێك بە باسی میوزیك و حاڵی خۆیان بەیەکەوە بەسەر بەرن.

ڕۆژێك ڕۆس بیرۆکەیەکی بە خەیاڵدا دێت، بۆچی لەگەڵ هاوڕێیەکەی بەیەکەوە پیانۆ نەژەنن ئەم بە دەستی ڕاست و ئەویش بە دەستی چەپ. هەرچەندە ئەو بیرۆکەیە بەلای هەندێکیانەوە ئەستەم بوو، بەڵام مارگرێت و ڕۆس بیرۆکەی خۆیان لەگەڵ بەرپرسانی سەنتەرکە تاوتوێ کرد ئەوانیش هەر زوو بە زوو بەدەم داواکارییەکانی ئەوان هاتن و بەپەلە پیانۆیەکی نوێیان بۆ کڕین. دوای چەند مانگێك ئەو جووتە میوزیكژەنە توانیان ئاهەنگێکی میوزیکی سەرکەوتوو پێشکەش بکەن کە نەیاندەتوانی بەبێ یەکتری ئەو کارە بە ئەنجام بگەیەنن.

ئەو ڕووداوە ڕووداوێکی دیکەی بیرهێنامەوە، چۆن زڕدایکێك دەست کوڕی هەوێیەکەی دەشکێنێ، تاکو ناشیرین و بێکەڵکی بکات، بەڵام کە گەورە دەبن، ڕۆژێك لە ڕۆژان کوڕی هەوێی گەورە تووشی شەڕ دەبێ و کوڕی ژنی بچووکیش کە بەم هەواڵە دەزانێ بەپەلە دەچێتە یارمەتیدانی، لە کاتی شەڕ دەڵێت: خۆزگە دەستەکەی دیکەشم ئیفلیج نەبوایە اکو بمتوانیبایە بە هەردوو دەستم لەسەر برایەکەم بکرایەتەوە. کاتێك دایکەکە ئەم هەڵوێستەی کوڕی هەوێیەکەی دەبیستێتەوە، هەست دەکات چ تاوانێکی لە بەرانبەر ئەو لاوە ئەنجام داوە، بۆیە دان بە تاوانەکەی دەنێت.

لە ئاستی کۆمەڵگەشدا، لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بە پێچەوانەی ئەم ئەزموونە مرۆڤایەتییە پڕ بەهایانە "دوو کەس، دوو بیر و دوو فەلسەفەی جیا" لەناو کەسێکدا کۆبۆتەوە و بڕیار دەدات. گەر ئەزموونەکەی ئەوان لە خۆبەخشی

خۆشەویستی بوونەوە سەر هەڵدابێت، بێ‌شک ئەزموونەکەی ئێمە لە ترس و ئێرەییەوە سەری هەڵداوە و ئەمانەش دەرەنجامی نەبوونی فەلسەفەیەکی راست و دروستە(جا ئایدیایی یان مەتریالی بێت) یاخود خۆ بەکەم زانینە و هەریەك لەمانەش دەبنە هۆکاری هێنانەکایەی چەندین ئاژانجی نێگەتیڤ، لەوانە:

*ناولێنەنانی دیاردەکان وەکو خۆیان و هەر ساتەوەختە ناوێکی لێ دەنرێت بە پێی پێویست.

*ئینتیما نەمان بۆ خاك، لێکەوتنەوەی ناوچەگەریەتی.

*خۆشاردنەوە لەهل پشت بەها پیرۆزە ئاسمانییەکان و چەواشە کردنی خەڵکی بەم بەها پیرۆزانە.

*سووکایەتی کردن بە "ئەخلاقی سیاسی" خودی خۆیان و مێژووی دامەزراوەکانیان.

ئەوەی جێگەی مەترسییەکی زیاترە، ئەوەیە خەڵکێکی بیر کرچ و کاڵ، بێ‌ئاگا لە مێژووی ئەوان لەخشتە براون و بەرەو ئاقارێکی نادیار بردراون. لە پشت داواکاریی هەندێ بەناو رێکخراوی پیشەیی و مەدەنییەوە.

لێرەدا دەڵێین ئایا ئەرکی ئەم بەناو رێکخراوە پیشەیی و مەدەنیانە بە تایبەتی گەر پاشکۆی ئەم دامەزراوانە نەبن، هەروەها رێکخراوە پیشەیی و مەدەنییەکان بە گشتی، گەر بوێر بن، سڵ لە توندوتیژی نەکەنەوە، بۆ ئاسۆیەکی گەشی ئەم کۆمەڵگەیە کاربکەن، کە گوایە ئەوان دەنگ و نوێنەری ئایندەی ئەو خەڵکەن و... دەبوو راشکاوانە کاریان بکردایە:

*لەسەر رەواندنەوەی دیاردەی "رق لێبوونەوە و رەتکردنەوەی یەکتری" لەنێو کۆمەڵگەدا کە لە ئاکامی شەڕە ناوخۆییەکاندا بە درێژایی مێژوو بەردەوامیی هەیە، بۆتە کەڵچەرێکی بۆماوە بۆمان.

*ناولێنان لە دیاردەکان بەبێ ترس لە زەمەنێکی زووترەوە.

*وشیار کردنەوەی جەماوەر لە هەمبەر فەلسەفەی پیرەوکراوی لایەنەکان و چۆنیەتیی کارکردنیان لەسەر خەڵکی لە نێوان بەرەوپێش‌چوون یاخود چەواشەکردنی خەڵکی لە پشت بەهای پیرۆزی ئاسمانی بێت یاخود بە ناوی تەیاری عیلمانی بێت.




*وشیارکردنەوەی جەماوەر و هەڵوێستیان لەبارەی ئینتیما بوونیان بۆ خاك، نەك بۆ سەرکردە، ئەمەش ترسناکترین دیاردەیە لە کۆمەڵگەکەمان کە بە درێژایی مێژوو دووبارە دەبێتەوە و دوژمنانیش ئەم خاڵە لاوازە بەردەوام دەقۆزنەوە و لە دژمان لی رێی هەندێ لێپرسراوی ترسنۆك.

*وشیار کردنەوەی جەماوەر و هاندانیان "بۆ خوێندنەوە بە گشتی و خوێندنەوەی مێژووی نەتەوەکەیان بەتایبەتی."

*وشیار کردنەوە و شارەزایی کردنی جەماوەر لە چۆنیەتیی شێوازی بەرنامە(پلان)سازیی حکومەت لە رووی پلانی درێژخایەن، مامناوەند و کورتخایەن، هەروەها بەرنامەی بەدیل لە کاتی پێشهاتی رووداوی لەناکاو وەکو: رووداوی سیاسی، سروشتی و....

*رووبەڕوو بوونەوەی ئەم رێکخراوانە لە بەرانبەر ئەم لێپرسراوە بیرتەسکانە، "ژن" لە بەرنامە و فەلسەفەی ئەواندا بۆ چ مەبەست و مەرامێك وەکو کاڵایەك بەکاردێت.





# قارەمانییەتی ژنێکی کوردستان

# سەبەی کەم وێنە

ن: عەبباس داوودی/
بناری حەمرین



جیاواز لە کەنیشکە هاوتەمەنەکانی لە دەڤەرەکەدا، سەبەی کوێخا نامیق کە لە ئاوایی "لفتی ئاغای"ی سەر چۆمی "ئاوەسپی"ی گەرمیان ژیانی بەسەر دەبرد، بە شان و شکۆ، نموونەی ئافرەتی گەرمیان بوو. پتر لە رۆڵی سەرەکیی خۆی وەکو کەیبانۆیەک، هەردوو زارووە چاوگەشەکانی رزگار و هێلین بەوپەڕی توانـاوە بەخێوی دەکردن، کارەکانی مەشکە ژەنین و باخاتی ئەنجام دەدا. ئازادی هاوسەری ژیانی بۆ جەولەی پێشمەرگایەتی بوو، لەو دەشتە کاکی بە کاکییەی گەرمیانـدا، ناوێکی درەوشاوە بوو لە قارەمانێتیدا، ئەوەندە بواری نەبوو بکەوێتە ماڵەوە، لەولاشەوە ماڵیان ببووە سیپە بۆ حەوانەوەی هەڵۆ بەرزەفڕەکانی کوردستان. رەوشت و هەڵسوکەوتی سەبە ببووە مایەی سەرنجڕاکێشی و قسە و سەر زوبانی خەڵکی ناوچەکە.

سەبە بێمنەت بوو لە خزمەتی پێشمەرگەکان، هیچ کات نەیدەهێشت سفرەی کەمناز بێت، بەردەوام بە جێ سییەکەوە هاموشۆی دەکرد. بڕواتان بێت ئەم ئافرەتە هێندە قارەمان بوو، تەنانەت ناوی گەیشتبووە دەزگای ئەمنی شاری خورماتوو، لێی دەترسان و چەند جارێک سیخوڕیان نارد بۆی بۆ ئەوەی دەستگیری بکەن و رەوانەی ئەمن و موخابەراتی تکریتی بکەن، لێ هەیهات.

دەمەو بیانییەک، لەگەڵ دەرکەوتنی خۆردا، کۆمەڵێک پێشمەرگەی ماندوو، سەروچاو خۆڵاوی، دیاربوو چالاکییەکیان ئەنجام دابوو، گورزیان لە بەعسییەکان وەشاندبوو، چووبوونە سەرجادەی سەرەکیی بەغدا. لە نێوان سەربازگەکەی خورماتوو - سلێمان بەگ بۆسەیان دانابوو. خۆشبەختانە پێشمەرگەکان سەلامەت و بێزیان گەڕابوونەوە، لە مزگەوتی ئاوایی "لفتی ئاغا" پەنایان

گرتبوو. سەبە خان ئەوەندە خەوی نەبوو، لە پاش نوێژی بەیانییەوە دەکەوتە خۆ بۆ دەست پێکردنی ئەرکەکانی رۆژانەی، منداڵەکانی دەبردە لای نەنکیان و تەشتیْ هەویری بەو بەیانییە دەکردە نان بە تەنووره قوڕێنییەکەی، بە جیددی نانی دەستی بەتام و چێژ بوو.

کاتژمێر حەوتی بەیانی کە لە ماڵ دەرچوو، بە تفەنگەکەی سەرشانیەوە هەستی کرد غەڵبە غەڵبێك دێت لە قەراخ ئاوایی، هەر کە لە مزگەوتەکەی گوندەکەیان نزیکەوە بوو، پێشمەرگەکانی ناسی و ماندوونەبوونی لێکردن. بە جەسووری و غیرەتی خۆی گەڕایەوە ماڵ. ئەو تەشتە نانەی کە ئامادەی کردبوو، لەگەڵ نیو مەشکە دۆ و هەندێك تەرە پیاز، بردنی بۆ بەرچایی پێشمەرگەکان. لەوێشەوە بەرەو چەمەکە رۆیشت بۆ نێو بێستانە پڕ کاڵەك و ترۆزییەکەیان. دەنگێك رایچڵەکاند.

سەبە وتی: خوایە بەخێری بگێڕی، کارەساتێك روونەدات، ئەم دەنگە چ بوو، خۆ ئەم گەرمیانە بەردەوام کارەساتبارە، ئەم بەعسیانە تەنیا لە مرۆڤ ناچن، بەزەییان بە ئاژەڵیشدا نایەتەوە.

پاش ماوەیەکی کورت، جەیش و جاش بەرەو ئاوایی رێچکەیان گرت، سەبەی کەم وێنە، نەبەرد و جوامێر، بە جارێك ئۆقرەی لێبڕا و گوتی: خوا عالیمە ئەو هەموو چەکدارەی سەددام بەخۆڕا بەرەو لای ئاوایی ئێمە نەهاتوون، بێگومان بۆ ئەنجامدانی تاوان هاتوون، بەتەمان ئەو پۆلە پێشمەرگانە قەتڵ و عام بکەن، ئەم بیْشەرەفانە وا ئەزانن ئەم گەرمیانە بێکەسە، مەرج بێت دەبیْ هەر ئێستا بۆیان بسەلمێنم هەر گردێکی ئەم کوردستانە، سەنگەرە و پێشمەرگەیەکی لە پشتە.

ئەو پێی وابوو ئەگەر هەنووکە هەڵوەستەیەك نەکات، ئەوا ئەو شێرە کوڕانە (پێشمەرگەکان) جینۆساید دەکرێن، بۆیە دەستی دایە چەکەکەی و سەنگەری گرت، یەکسەر بە دەستڕێژ کردن جووڵەی هێرشبەرانی راگرت و لە لایەکی ترەوە پێشمەرگەکانی بە ئاگا هێنایەوە. شەڕێکی قورس دەستی پێکرد. تا دوا فیشەکی بەرگریی کرد. دەرئەنجام سوپای شەڕخواز بە سەرشۆڕی و کوشتارەوە گەڕانەوە مۆڵگەکانیان لە دەورووپشتی خورماتوو. پێشمەرگەکان هەر هەموو بە سەرکەوتوویی لە ئاوایی دەرچوون، لێ مەخابن سەبەی کەم وێنە قارەمانێتیی لەبەر ئەوەی لە پێشەوەی شەڕەکەوە بوو، کەم ئازووخە بوو، پێکرابوو، بە توندی زامدار بوو و هەر لەو شوێنەدا خوێنی خۆی بەخشییە نیشتمان و رزگار کردنی ئەو پۆلە پێشمەرگە گەرمیانیانە.






دۆسیەی تایبەت : یەڵماز گونەی

# گۆنای کورد: گەورە تێکۆشەر و هونەرمەندی جیهانی

## ( 1 ) لەفەرهەنگی سەربەرزیدا.....!

# گونای دەچێتە ئاسمان و ئەستێرە دەرژێنە دەریا



ئامادەکردنی :

سەعید عەبدوڵڵا

**من هونەرمەندو دەرهێنەرێکی کوردم نکوڵی لە بنەچەی نەتەوایەتی خۆم ناکەم**

یەڵماز گونای

ئەورۆژەی دەمویست ئەم پێشەکییە بنووسم بۆ ئەم دۆسییەیە هەرچەندی کردم نەمزانی چی بکەم بە پێشکی بۆی، چونکە ئەو کەسایەتییە هێندە مەزن و نیشتیمانپەروەرو نەتەوەپەرست، یان بوو، رەنگە هەر ناوونیشانێکی بۆ دابنێی یان هەر پێشگرێك و پاشگرێك بدرێتە ناوەکەی رەنگە ستەمی لێبکرێت چونکە ئەو کەسە دەبێ چی بێت.؟!!

ئەوەی مرۆڤ بەخەیالیدا دێت زۆر لەوە گەورەتر و شایستەتر شایانی گونایەو هیچ کاتێك مرۆڤ لە ئاست ئەو قوربانیدان و جوانیانە ناگاتە لوتکەی ئەوەی ئایا دەبێت گونای چی بێت (هونەرمەند- ئەکتەر- دەرهێنەر- نووسەر- سەرباز- بەندی- دامەزرێنەری گەورەترین دەزگای کوردی لە ئەوروپا- باوك- هاوسەر- هتد....) کەمن ژمارەی ئەو مرۆڤانەی کە لە تەنها کایەیەك لە کایەکانی ژیان زیاتر دەتوانن سەرکەوتن بەدەست بهێنن، بەلاّم ئەوەتا کەسایەتییەکی وەك گونای لەوپەڕی هەول و تەقەلاو لەو پەڕی بارودۆخی ناهەمواری دەروونی و جۆرەها ستەم و دەردەسەرییەك، وەك سەرکەوتووترین کەسایەتی لەهەر بووارێکدا دەردەکەوێت. ئەوەیش دەقاو دەق بەجێهێنەری ئەو راستییەی لای سەرەوەیە کە خۆی لە دەقی بەناوبانگترین وتەکانیدا دەڵێت ﴿هیوا تەنها گوڵێکە لەسەر داری بێئومێدی دەپشکوێ﴾ بەڕاستی هاتنەدی هیواکان و شکۆفەکردنی گوڵ لەسەر داری بێگومێدی و لە خاکی بێئومێدیدا هەر لەتۆ وەشایەوە ئەی باوکی (سینەمای کوردی).



یەڵماز گونای ئەو کەسایەتییە کوردەیە کە بەهۆی وەشاندنی پەیامە هونەریی و فیکری و رۆشنبیرییەکانییەوە جێ دەستی هیچ کەمتر نییە لە جێدەستی کەسایەتییە شۆڕگێڕەمەزنەکانی ئەم نەتەوەیە کە بە درێژایی مێژوو خوێنیان ڕشت بۆ تێکەیاندنی دوژمن بۆ مافی نەتەوەکەیان. یەڵماز گونای ئەو دەرهێنەرەیە کە بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە لەوەی هەروەك خوالێیخۆشبێت خالید ئەحمەدی نووسەر لەبارەی یەڵماز گونایەوە نووسیویەتی (یەڵماز گونای ٤٧ساڵ تەمەن و ٥٢ساڵ زیندان[1]) کاتێکیش لێمپرسی مامۆستا مەبەستت چییە لە وەڵامدا گوتی (یەڵماز گونای لەکاتی لدایك بوونییەوە تا ئەوکاتەی کە کۆچی دوایی کردووە ٤٧ ساڵ تەمەنی بووە، بەلاّم





بەهۆی ئەو بیرۆکە نەتەوەیی و شۆڕشگێڕییانەی لە بەرهەمە ئەدەبی و هونەرییەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە ٥٢ ساڵ زیندانی بەسەردا سەپێنراوە، ئیتر ئەگەر زیندانەکەیشی بەسەر نەبردبێ، ئەوا حکوم دراوە!) ئەوەیش لە دوو لاوە جێگای هەڵوەستە لەسەر کردنە، لە لایەك گونای چۆن دەتوانێت ئەو دوو هێزە گەورەیەی هونەرو ئەدەب بەیەکەوە ئەدا بکات، خۆ ئەگەر دژ بەیەکیش نەبن، بەڵام زۆریش هاوتەریب نین، چونکە گومان هەڵناگرێت ئەوەی کە هونەر دەتوانێت بیگەیەنێت ڕەنگە ئەدەب نەتوانێت پێچەوانەکەیشی ڕاستە.

لە لایەکی دیکەشەوە ویست و بەرخودانی گونای لەوە دەردەکەوێت کە بۆ چەند جارێك زیندانی کراوە، خۆ ئەگەر یەکەمجار کاردانەوەیەکی نەرێنی دەسەڵات بووبێت و پێشتر هەستی پێنەکردبێت، ئەی دەبێ بۆچی بۆ ئەوەی جارێکی دیکە نەکەوێتەوە زیندان، کەمێك لەو ڕیتمە دژایەتیکردنانەی دوژمن و خۆچەقاندن لە سەنگەری نەتەوەپەرستێتیدا نەهاتە خوارەوە، بۆچی نەی دەزانی کە حوکم هەر حوکمی جاران، لەگەڵ ئەوەی دڵنیاین گونای هەمووکات هەستی بە جەوروستەمی دەسەڵاتی تورك کردووە لەو پێگەتەسکەی ژیانی خۆیدا کە خاکی نەتەوەکەیەتی و داگیرکراوە، بەڵام هەروەك دیسانەوە خۆی باسی دەکات جگەلەوەی کە لەدەرەوەی بەندیخانە تاکە جارێکیش لەوە سڵی نەکردۆتەوە ببێتە قوربانی کارەکانی لەپێناو نەتەوەکەیدا، بەڵام بەندیخانەش نەبووەتە هۆی ساردکردنەوەی لە داهێنان و گەڵاڵەکردنی چەندین بیرۆکەی پیرۆزی سەرکەوتنەکانی ئەوەیش بە بەڵگەی ئەوەی کە خۆی لە دەقی پێشەکییەکیدا بۆ یەکێك لە کتێبەکانی نووسیوویەتی ﴿بەندیخانە هۆکارێکی سەرەکیی داهێنانەکانمە﴾.

لێرەدا وای بە باش دەزانم بەرلەوەی بچینە ناو بەشەکانی ناو ئەم دۆسییەیە ئەگەر چەند نموونەیەکی دیکەی باسکراو لەبارەی یەڵماز گوناوە بەسەر بکەینەوە ڕەنگە زێدەڕۆیی نەکەین کە بڵێین یەڵماز گونا هێشتاکە هیچی بۆ نەکراوە لە ڕۆژی ٢٠١٠/٢/١٠ لە شاری دهۆك یەکەم فیستڤاڵی کورتە فیلمی سینەمایی دهۆك سازکرا[٢] لەوێدا فیلمێکی دۆکیۆمێنتاری لەبارەی یەڵماز گونایەوە بووە دەست پێکی نمایشی فیلمەکانی فیستڤاڵ ئەو فیلمە یەك کاتژمێرو ٢٩ خولەك و ٢٠ چرکەبوو، کە دەرهێنەری لاو شێنوار کەمال جێگای دەستخۆشانەیە کە زۆر بە ووردی پێ بەپێ لەگەڵ ژیان و بەسەرهاتەکانی یەڵماز گونای هاتبوو تا کۆچی دوایییەکەی. لەکاتی ئەو نمایشەدا ئێمە کەیەکێك لە ئامادەبووان بووین. بۆ چەندجارێك هەموومانی گریاندو خەڵاتی دەستخۆشانەیش تەنها بەو فیلمە دۆکیۆمێنتارییە بەخشراو ئەوکات من تێگەیشتم کە یەڵماز گونای چی بووەو چۆن بووەو تا ئێستا چی بۆکراوە. هەروەها لە ژمارە (٥)ی گۆڤاری فیلم[٣] بەناوونیشانی (یەڵماز گونەی دەستپێك و کاروانی درێژکراوەی سینەما تا ئەمڕۆ[٤]) ئەویش دۆسییەیەکە و نزیکەی ٥٠ لاپەڕەی ئەو گۆڤارەی گرتووەو زیاتر ١٥ بابەتی جۆراوجۆر هەیەك بەناوێك بڵاوکراونەتەوە، بەڵام ئەوەی کە سەرەنجی ڕاکێشام وتارەکەی کەریمکۆی سەرنووسەری گۆڤارەکە بوو، لەو نووسینەدا کەریمکۆ دەڵێت (هێشتا سینەما لە کوردستان ڕەوتە ڕێ نەبووە، هێشتا سینەما نەبووتە بەشێك لە ژیارو دیدێکی ڕۆشن لەنێو کایەی ڕۆشنبیریی



ئێمەدا بەرامبەر سینەما ئامادەیی نییە، هێشتا هەر باس باسی خراپ بەکارهێنانی سەرمایەی دەوڵەتە، هێشتا هەر خەریکی قسەو قسەلۆك و یەکتر شکاندنین، بەلام هێشتا یەلماز گونەی لە دووندی نەمریدایەو بەتاسوقەوە سەیری دەکەین و ناوەکەیمان وەك ناوی خۆمان لەبەرە...)[5]

لە بەشێکی دیکەی وتارەکەیدا نووسەر وەك ئەوەی مەبەستی بێت سەیر بنوێنێت و نیشان بدات دەڵێت (هەموو تەمەنی یەلماز ٤٧ ساڵ بوو، ١٠ ساڵ منداڵی و ١٤ ساڵیشی لە زینداندا بردەسەر. ئەی کەی کاتی کارکردنی هەبوو، چۆن توانی دەرهێنان بۆ ٢٤ فیلمی درێژ و رۆڵگێڕان لە ١٢٠ فیلم و نووسینی ٥ رۆمان و دەیان چیرۆك و دەیان وتاری ئەدەبی سیاسی بکات....؟؟!)[6]

لە کۆتایی نووسینەکەیشیدا نووسەر توانجێك دەگرێتە سینەماکاران و هەموو ئەوانەی کە خۆیان بە خەمخۆرانی سینەمای کوردە دەزانن دەڵێت (وەسف و گوزارشتی ئێمە بەرامبەر ئەو هونەرمەندە نەك هەر لە ئاست بەرخودانی ئەودا نییە، بەڵکە مرۆ تووشی دردۆنگیش دەبێت، چونکە لەوە حاڵی دەبین کە دوای ٢٦ ساڵ مەرگی یەلماز گونەی، گەورەیی ئەو هونەرمەندە لە کوێیە رەوشی ناشارام و پەرتەوازەی سینەمای ئێمە لە کوێ....؟!)[7].

خوێنەری ئازیز لێرەوە ئاشنای چەند باس و لێدوان و ناساندن و قسەلەسەرکردنێك دەبێت کە هەمووی تایبەتە بە هونەرمەند یەلماز گونەی، لێرەشەوە ئێمە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەین کە ئەو دۆسییەیە ناگاتە تۆسقاڵێك لەو ماندووبوونانەی کە گونای لە کاتی دەرهێنانی فیلمێکدا لایان بەشداری کردن لە فیلمێکدا کێشاویەتی، هەر ئەم دۆسییەیە ناگاتە ئێشی تەنها چرکەیەکی گونەی لە زینداندا کە لە پێناوی گەیاندنی پەیامەکانی بۆ خزمەتکردنی نەتەوەکەی چەشتوویەتی. هەروەك کەریمۆك گوتەنی ئەوە یەلماز گونایە کە بوو، ئەوەیش ئێستاو سینەمای کوردییە کە هەیە و دەی بینین. هەروەك حەمیدی قەوامی گەورە وێنەگری کوردی سینەمایی لەبارەی سینەمای کوردییەوە دەڵێت (تائێستا سینەمای کوردی لە دایك نەبووە، بەلام کۆرپەیەکەو لە هەناوی دایکیدایە، رەنگە ئەو منداڵە لە دایك ببێت، بەلام بە کەمئەندامی)...!

## پەراوێزەکان:

(١) جێگای داخە من تەنها دەستنووی ئەو وتارەم بینیوە بەلام نازانم مامۆستای خوالێخۆشبوو ئەو وتارەی لەکوێ بلاوکردۆتەوە.

(٢) فیستیڤاڵی سینەمایی دهۆك، یەکێك بوو لەو فیستڤاڵە نایابانەی کە من تا ئێستاکە هاوشێوەکەییم لە رووی رێکخستن و بەڕێوەچوونی پرۆگرامەکانی فیستڤاڵ و ئەو کەسایەتییانەیشی دەستنیشانکرابوون و دانیشتن و گفتوگۆکانی فیستڤاڵم نەبینیووە. بینینی فیلمێکی دۆکیۆمێنتاری لەبارەی یەلماز گونای رێك بیرۆکەی ئامادەکردنی دۆسییەیەکی لەلا گەلاڵەکردم، بەلام بڕیارم نەدا بۆ کوێ و کەی، کاتێکیش مامۆستا مومتاز حەیدەری باسی ئەوەیکرد کە پێویست دەکات دۆسییەیەك لەوبارەیەوە بکرێتەوە، من ئامادەگی خۆم نیشاندا.

(٣) گۆڤاری فیلم گۆڤارێکی هونەرییە لە خزمەتی فیلم و سینەمای کوردیدا، بە دروشمی (بەرەو سینەما) و مانگانە لە لایەن وەزارەتی رۆشنبیریی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەردەچێت و کەریمۆك سەرنووسەرییەتی و ئازاد سەوزە خاوەنی ئیمتیازییەتی.

(٤) دیارە لەکاتی خوێندنەوەی ئەو دۆسییەیەدا وێڕای ئەوەی کە ئاشنا دەبیت بە چەندین زانیاری تازە لەبارەی گونای، بەلام جێگای داخە کە سەرسامیش دەبیت بەوەی لە زۆر شوێن و جێگادا، لەو دۆسییەیەدا لەسەر زاری ئەوانەی دەگێڕنەوە لەبارەی یەلماز گونەی وەك کەسێکی تورك ناوی هاتووە، بەلام ئامادەکارانی دۆسییەکە هیچ پەراوێزێکیان بۆ دانەناوە و روونی بکەنەوە و ئاماژە بۆ ئەوە بکەن کە ئەو بۆچوونی نووسەری وتارەکەیە کە پێی وایە یەلماز گونەی تورکە.

(٥) گۆڤاری فیلم – ژمارە (٥) ل٢ (یەلماز گونەی هەمیشە بوێری هەمیشە نەمری) نووسینی کەریمۆك.

(٦) هەمان سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥).

(٧) هەمان سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥).



## گەورە تێکۆشەر هونەرمەندی جیهانی:

# (2) چەردەیەك لە ژیاننامەی یەڵماز گونای



لەناو خێزانێکی کوردی هەژاری خەڵکی گوندی (سێوەر)ی راگوێزراو بۆ گوندەی (یەن) کە ٢٧ کیلۆمەتر لە شاری (ئەدەنە)ی (باشووری تورکیا) دوورە، لەوێدا لە سەرەتای نیسانی ساڵی ١٩٣٧ لەکاتی پشکوتنی گوڵو گوڵزار منداڵێك لە دایك بوو ناویان نا (یەڵماز)، ئەو ناوەیشیان بۆیە لێنا تاوەکو خاوەن هێز و خۆراگری بێت، تاوەکو ببێتە جوتیارێکی بەهێز و کاربکات و باری گرانی ژیان لەسەر شانی باوکی سوك بکات، چونکە ئەو خێزانەو دەیان خێزانی دیکە، بە جوتیاری و هەژاری و کارکردنی سبەینان تا ئێوارە بۆ ئاغاکەیان کاریان دەکرد کە لەبەرامبەردا کرێیەکی کەمییان پێدەدرا، لەو رۆژانەدا یەڵماز لەگەڵ بەردەوامیدا بە خوێندن کاری گەورەیشی دەکرد، و زۆر کاریگەری کردە سەری لە کارەکانی داهاتوویدا، هەروەك خۆیشی دەڵێت: (من هیچ کاتێك خۆشیم لە ماڵی خۆماندا نەبینی، باوکم دایکم و منداڵەکانی بەدەردەناو ئێمە لە دەرەوەی ماڵمان لەسەر دارێك تا بەیانی لەوێدا دەخەوتین، گەلێك جارێکیش دایکم دەستی دەگرتین بۆ ئەوەی بچینە ماڵی ئامۆزاکەی لە ئەدەنە، من هیچ جارێك ئەو گۆرانیانەم لە یاد ناچنەوە کە دایکم بە درێژایی رێگا بۆی دەگوتین)
سەرەرای ئەوانەش یەڵماز سێ قۆناغی سەرەتایی لە گوندی خۆیان خوێند و ناوەندی و ئامادەییشی لە ئەدەنە تەواوکرد. یەڵماز ئەوەی بۆ روون بۆوە کە ئەو لە شەری بەرامبەر ژیان بەتەنهایەو بۆیە پێویستە بەرەنگاری نەهامەتییەکان ببێتەوەو کۆسپەکان بپەرێنێت، ئەویش بە خۆنزیك خستنەوەی لە خەڵك و هەستکردن بە ئێش و دەردەسەری ئەوان. هەر کەسێك یەڵمازی دیبێ ئەو نائومێدییەی هەست پێکردووە کە

هـــەرگیز لەناوچـــاوانی ئـــەودا وون نـــەبووە، بـــەڵام لەهەمانکاتیشدا خۆراگری و نەبەزینیشی خوێندۆتەوە، هەرکەسێك دیبێتی دەزانێت کە ئەو دەنگە دەنگی ئەوە، کـە چـۆن دەیـەوێت دەربکـەوێت. لـەو کاتـەی کـە لـە قوتابخانـە دەیخوێنـد فرۆشـتنی شـتومەکی خـواردنی بچووك لەسـەر شەقام و پاشـان کرێکاری و پاشـانیش بووە کرێکار لە (کۆمپانیـای ئاند فیلم)ی سینەمایی و کۆمپانیـای (کـەمال فـیلم) دەسـتی بـەکار کـردووە، وە هەندێکجاریش وەك (کۆمبارس) لەناو فیلمەکاندا رۆڵی بینیوە.

لەناوەراستی سـاڵی ١٩٥٢ تـا ١٩٥٤ لـەو کاتـەی کـە لـە کۆمپانیـای (کـەمال فـیلم) کـاری دەکـرد کاریگەرییـەکی زۆری بەســـەرەوە هـــەبوو. لەســـەر داواکـــاری ئـــەو کۆمپانیایـــەی کـــاری تێـــدا دەکـــرد دەبوایـــە فیلمـــە سینەماییەکان لەناو گوند و شاروشارۆچکەکان بگێڕێت بۆئـەوەی ریکـلام بکـات و فیلمـەکان بـەکار بخـات، بەتایبـەتی لەناوچـە کوردنـشینەکان وەك (ئەلعـەزیز) و (غازی عـەنتاب) و (دیاربەکر) و چەند شوێنێکی دیکە، دوای ئـەوەی سـەردانی ئـەو شـوێنانەی کـرد و لەگـەڵ خەڵکانی ئەوشوێنانە دانیشت، ئەوە بـووە هـۆی ئەوەی بزانێت ژیانی ئەوان چۆن دەگوزەرێت. ئەوانـەش بوونـە بناغەیـەکی سـەرەکیی بـۆ هـەموو بەرهەمـەکانی ئـەو، بەتایبەتی لە سەرەتای نووسینەکانی کە پشتی بەسـت بەو چیرۆکانەی کە پێشتر گوێبیستیان بووە تـا گەیشتە کـارە سـینەماییەکانی، کـە تائەوکاتـە هـیچ بەرهـەمێکی تایبەتی خۆی نەبوو.

لـە منداڵیـدا زۆر ئـارەزووی کـاری هونـەری بـوو لەبـەر ئەوەی (باوکی) کەسێکی هونەر دۆست بووە بەردەوام لە ئاهەنگـەکان سترانی چڕیوە، و ئامێری سازی ژەنیـوە، شەوانەش ماڵی ئەوان پڕ دەبوو لـە میـوان بـۆ گوێبیست بوونی ئەفسانەو چیرۆك و مێژووی کوردی کە (دایکی) دیگێڕانـــەوە. لەوبارییـــەوە یـــەڵماز دەڵێـــت: (مـــن پـــێم خۆشبوو ئەو چیرۆکانە بنووسمەوە، بەڵام من نووسینم نـەدەزانی). وە (یـەعقوب) نـاوێکیش لـە گوندەکەیان کـە پیرەپیـــاوێکی شـــارەزای بـــوواری شـــیعرو چـــیرۆك و سـازلێدان بـوەو، یـەڵمازی خـۆش دەویـست و کاتێـك یەڵماز یەکەم شیعری نووسی نیشانی ئەویدا.

لـە یەکـەم جـاریش کاتێـك چووە هـۆڵی سینەما تـەمەنی تـەنها ١٣ سـاڵان بـوو، خوێنـدنی خـۆی لـە قۆنـاغی دواناوەنـدی لـە سـاڵی ١٩٥٦ کۆتـایی پێهێنـاو ئینجـا بـەرەو زانکـۆ لـە شـاری (ئەنقـەرە) کەوتـەرێ و لـەوێ لـە (کۆلێـژی مـاف) وەرگیـرا، بـەڵام تـەنها دوو مـانگ لەوێـدا مایـەوەو پاشـان بـەرەو (ئەدەنـە) گەڕایـەوە، ئـەویش بـەهۆی سـەختی ژیـان چـونکە پێویـست بـوو دایـك و چواربراو دووخوشـکی خـۆی بـەخێوبکات، راسـتەوخۆ دوای گەڕانـەوە لـە کۆمپانیـای دار فـیلم دەسـتیکردە کـارکردن و پاشـانیش چـووە (ئەسـتەمبوڵ) و لـەوێ لـە کۆلێژی (ئابووری) دەستیکردەوە بە خوێندن، لەوێـدا زۆر هەوەســـی چـــووە ســـەر نووســـینی ئـــەدەبی، بەتایبـەتیش نووسینی چیرۆك، بۆیـەش وەك (یـەڵمازی چیرۆك نووس) هاتە ناسین.

هـــەر لەوکاتـــەدا دووگۆڤـــاری بـــەناوەکانی (بـــۆران) و (دوقوك) لەگەڵ هاورێیانی خۆی بڵاوکردەوە. بەڵام لەبەر هۆکـاری مـاددی هـەردووکیان راوەسـتان، پاشـانیش دەستیکردە چیرۆکی ریالیزمی و ناوەرۆکی چیرۆکەکانی جۆراوجۆربـــوون و بـــەردەوام لـــەدوای ئـــەوەبوو کـــە بەسەرهاتی دەوروبەرەکەی بخاتە سەر کاغەز و بڵاویـان بکاتەوە، بۆئەوەی گوزەرانی ژیانی ئەوان بەشێوەیەکی روون نیشان بدات. ئەوانەش بوونە هۆکاری ئەوەی کە چەندین رەخنەگر چیرۆکەکانی یەڵماز هەڵبسەنگێنن.

لـە سـاڵی ١٩٥٦ چـرۆکێکی خـۆی بـەناوی (ئـاوکێش و سێ نهێنـی) بڵاوکـردەوە کـە ئـەو چیرۆکە باسـی کـچێك دەکـات بـە هـەژاری و ژێـر دەسـتی و دابـی کۆمەڵگـەی ئاغایی بۆتە قوربانی، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە ئەوکچە





به جورئەتەوە چووەتە بەردەمی ئاغای دێیەکەیان و پێی گوتووە رۆژێك تۆش کۆتاییت دێت، ئەوەش وایکرد کە ئەو چیرۆکە لێکدانەوەی جیاوازی بۆبکرێت و وەك بۆمبایەك بتەقێتەوەو دەنگوباوی ئەوەی بۆ دروست بکەن گوایە یەڵماز بانگەشە بۆ کۆمۆنیست دەکات، ئەوەبوو چیرۆکەکە قەدەغە کراو یەڵمازیش درایە دادگاو بۆماوەی ساڵ و نیوێك زیندانی کراو ٦ مانگیش دورخرایەوە، ئەوە یەکەم جار بوو ئەو وەك کەسێکی نارەحەت ناسراو تا کۆتایی ژیانیشی هەموو کارەکانی کەوتنە ژێر چاودێرییەوە، هەموو حکومەتەکانی تورکیا بێ جیاوازی هزرو بینینی سیاسەت و ئایدۆلۆژیا ئەو خوێندنەوە ناهەقانەیان دەرهەق بە یەڵماز پەیرەوکرد.

لەساڵی ١٩٥٧ چووە ناو دونیای سینەماو هاورێکەی (عاتف یەڵماز) زۆر هاوکاری کرد، لە کۆمپانیای (کەمال فیلم) بووە نووسەری سیناریۆو ئەکتەرو هاریکاری دەرهێنەر، لە یەکی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٨ یەکەم رۆڵی لە فیلمی (خەزاڵی سۆر) و (کوڕی ئەم وڵاتە) لە سیناریۆی ئەوان بە هاوکاری (عاتف یەڵماز) نووسیبوو لە دەرهێنانی (عاتف یەڵماز).

سەرەڕای ئەوانەش ئەو هونەری حەوتەمی وەك بەهێزترین کارتێکەری سەر دۆزی گەلەکەی دەبینی ئەویش بەو تێڕوانینەی کە دەڵێن سینەما هێزێکی رادەبەدەری هەیە و دەکرێت زۆرترین کاریگەری لەسەر جەماوەر هەبێت، (یەڵماز بۆتۆن)[1] بەشداری لە ٩ فیلم کردو شارەزاییەکی باشی بۆ بەرهەم هێنانی فیلم لەلا پەیدابوو. بۆیەش رۆژانە دەرگای کارکردنی بۆ دەخرایە سەر گازەرەی پشت.

ئەوەبوو لە چەندین بەرهەمی دیکەی سینەماییدا رۆڵی بینی و هەزران بینەری سینەمایی بۆلای خۆی پەلکێش کرد، ئەوەبوو هەوڵی گیرانی درا بۆئەوەی ئەو حکومەی لەدەرهەقی ئەو دەرکرابوو جێبەجێبکرێت و شەو و رۆژ هێزەکانی سیاسی و بەدواداچووان لە دوای دەگەڕان تا سزاکان جێبەجێ بکەن، بەڵام یەڵماز خۆی نەدەدایە دەست. پشتی چوار ساڵ لە خۆشاردنەوە لە ساڵی ١٩٦١ لە لایەن پۆلیسەوە بەتۆمەتی پروپاگەندە بۆ کۆمۆنیست دەستگیرکراو لەوکاتەوە زیندان بووە ماڵە سروشتییەکەی ئەو.

لەوکاتەشدا رۆمانە بەناوودەنگەکەی (ستوخوار مردن

لەناو چوار دیواری زینداندا نووسی و بۆ چەندین زمانیش وەرگێردراو چەندینجاریش چاپکرایەوە.
لە نۆی حوزیرانی ساڵی ١٩٦٣ دوای ئەوەی زیندانی نەو کۆتایی هات گەڕایەوە (ئەستەمبووڵ) و زۆر بەدوای کاردا گەڕا، بۆئەوەی بتوانێت بەئەرکی بەخێوکردنیماڵەوەیان رابگات، بۆماوەی ساڵێك و نیو بێ کار مایەوە، تا هاورێیەکانی پشتیان گرت و لەساڵی ١٩٦٣ فەرهاد جیهان) فیلمێکی ئامادە دەکرد، داوای لە یەڵماز کرد تا سیناریۆیەك بنووسێت بۆئەوەی بیکات بە فیلم، بەڵام تاوەکو بەرهەم هێنانی ئەو فیلمە هیچ کێشەیەکی بۆ دروست نەکرێت، دەبێت ناوی نووسەری سیناریۆ بگۆڕێت، ئەوەبوو لەبەر ئەو هۆکارەو چەندان هۆکاری دیکە (یەڵماز بۆتون) ناوی خۆی گۆڕی و ناسناوێکی دیکەی بۆخۆی هەڵبژارد کە جیهان ئێستاکە هەمووی بەو ناوەوە دەیناسێتەوە ئەویش (گونای) واتا (یەڵماز گونای) واتە (باشوری خۆراگر) یان (ئەوباشوورەی نایەتە شکاندن) مەبەستیش لە (باشوور)، (باشووری تورکیایە) کە دەبێتە (باکووری کوردستانی گەورە)، ووردبوونەوە لە ناوەکەیشی واتە (کوردی خۆڕاگر) چیرۆکی ئەدەبییەکەیشی بەناوی (دوو مێرخاس) کرایە فیلم و یەڵماز رۆڵی سەرەکیی تێدا بینی، کە لە رێگەیەوە ناوودەنگێکی مەزنی بۆ خۆی دەستخست، پاشان لە کۆمپانیای (مێریس فیلم)ی سینەمایی دەستیکرد بە رۆڵ بینن لە فیلمەکانیانداو زۆر بە شارەزایی کارەکانی ئەنجام دەدان، لەو رووەشەوە رۆژانە بینەری زیاتر لەو فیلمانە کۆدەبوونەوە کە یەڵماز تیایاندا رۆڵی دەبینی، هەر لەو کاتەشدا هەموو کارەکانی ئەو لەژێر چاودێریدا بوون، و نەیارانی بە پێشکەوتنەکانی ئەو چاویان هەڵنەدەهات، بۆیە دیسانەوە چینی بۆرژوازی و سەرمایەدار بەو کارانە هەراسان بوون، هەروەك ئەوەی کە لە فیلمەکاندا پێیان دەگوت پاشای جوانی کە جوانیش نەبووە، بۆیە قینی زیاتریان لێهەڵگرت و ئەوە سەرباری ئەوەیشی کە رۆژانە جێی پێی خۆی لەناو سینەمادا قایمتر دەکات و دڵی ملیۆنەها کەس بەلای خۆیدا رادەکێشێت بۆیە بیریان لەوەکردەوە کە رێگەی لێبگرن. گونایش لەبەرامبەردا پێی گوتن (ئێوە پاشای جوانی بن و منیش پاشای کرێ دەبم).
لەساڵی ١٩٦٦دا لەگەڵ ئەکتەرێکی بەناوبانگ (نەبهەت جێرە) کە لە چەندین فیلمدا وەك ئەکتەر کاریان بەیەکەوە کردووە ژیانی هاوسەری پێکهێناو لەدوای دووساڵ لێك جیابوونەوە.
لە ساڵی ١٩٦٦ گونای وەك هاریکاری دەرهێنەر لەگەڵ دەرهێنەر (لوتفی عومەر عەقاد) لە فیلمی (یاسای سنوورەکان) کاری کرد و ئەوفیلمەش دیسانەوە سیناریۆکەی هی گونای بوو، هەروەك رۆڵی سەرەکیشی تێدا بینی و لە ساڵی ١٩٦٧ خەڵاتی باشترین ئەکتەری پیاوی لە (فیستڤاڵی تورکیا) لە (ئەنتاڵیا) وەرگرت.
لەودەمەدا یەڵماز گونای وەك ئەستێرەیەکی گەشی سینەمای تورکیا ناسراو بەدەیان داخوازی لەلایەن کۆمپانیاکانی فیلمەوە بۆ دەهات بۆئەوەی بەشداری لە فیلمەکانیاندا بکات، ئەوەبوو ساڵانە لانی کەم لە ١٠ فیلمدا رۆڵی دەبینی و لە ماوەی ٥ ساڵدا بەشداری لە ٦٠ فیلم کرد. لەوانەش (روباری سور)و (رۆژی قوربانی) و (کیسکی رەش) و (باڵندەی بریندار) و (هەتا دەمرم دەژیم) و (گورگی چیا)و ....هتد. گونای لەبەر ئەوەی خۆی لە خێزانێکی هەژار گەورەببوو بۆیە دەیتوانی بە ئاسانی بچێتە ناو ناخی ئازارەکانی ئەو خەڵکانەی کە لە فیلمەکاندا باسیان لێوەدەکراو لە رێگەی کامیراوە وێنەکانی دەگواستنەوەو دەستی دەخستە سەر برینەکان، بۆنموونە فیلمی (کۆچەر) کە باس لە رووبەرووبوونەوە دژی ستەم دەکات، بە شێوەیەکی نهێنی بەرهەم هات و نیشان دەدرا. لەناو ئەوفیلمەش چیرۆکێکی خۆشەویستی بوونی هەبوو.





هەروەها فیلمی (یاسای سنوور)، باسی سنووری تورکیاو سوریا دەکات و فیلمێکی دیکەیە کە گونای باسی چەندین ئێش و ئازارو چیرۆکی تراژیدیا دەکات. فیلمەکان بە ئاشکرایی دیاری دەکەن کە ئەو سنوورانە دژی ئەو نەتەوەیە دانراوە. فیلمەکان لەناو دەشت و چیاکانی کوردستان وێنەیان دەگیرا ئەوەبوو رۆڵی گونای رۆژانە لەنێوەندە سینەمایی و ئەدەبییەکاندا بەرەو پێشەوە دەچوون.

لەدوای سەرکەوتن و کۆکردنەوەی پارەیەکی وەها کە ئیدی ئومێدەکانی دێتە دی زانی کە کاتی ئەوە هاتووە ئاواتەکەی خۆی بەجێ بهێنێت ئەو پلانانەی کە بە درێژایی ساڵان دایناون جێبەجێیان بکات (ئاخۆ ئاواتەکەی چی بێت؟). ئومێدەکەی دروستکردنی فیلمی سیاسی و وەڵامدەرەوەی پرسیاری هەزاران کەس بێت، ئەزموونی خۆی تاڵی ژیانی خۆی و دەرەتانی لە منداڵی و ژیانی جوتیاری و ناکۆکی کۆمەڵایەتی و بەرەنگاربوونەوە و بندەستی و چینایەتی بخاتە سەر پەردەی سینەمایی.

گونای لەسەر ئەرکی خۆی سیناریۆی دەنووسی و رۆڵی سەرەکیی و دەرهێنەرایەتی بۆخۆی دەیکرد و لە ساڵی ١٩٦٧ یەکەم فیلمی بەناوی (من ناوم کەریم)ە دەرهێناوە، لە ساڵی ١٩٦٨ فیلمی (سەیدخان)یشی دەرهێنا کە فیلمێکی بەناو بانگەو زۆرترین خەڵاتی ئەوساڵەی بەدەستهێناو نزیکەی ٨ ملیۆن کەس ئەو فیلمەی بینی. ئەو فیلمە سەرکەوتنی باشی بەدەستهێنا. بە بۆچوونی رەخنەگرانیش ئەو فیلمە بە دەستپێکی ریالیزمی گونای لە سینەمادا لەقەڵەم دەدرێت. لەبەر ئەوەی لەناو فیلمدا هۆشیاری و زانین و رامان و کۆمەڵایەتی جێگایان بۆتەوە و نیشاندراون. رەخنەگران ئەو فیلمەیان هێنایە ریزی فیلمی دەرهێنەری ئیتاڵی بەناو بانگ (لۆتچینۆ) لە ئاداری ساڵی ١٩٦٨ فیلمێکی دیکەی بەرهەم هێنا کە باسی چەند قۆناغێکی ژیانی خۆی دەکات و ناوبانگێکی باشی بەدەستهێناو خەڵکیش لێی رازی بوون. بینەران هەریەکێك خوێندنەوەی تایبەتیان بۆی هەبوو ئامانجی دەرهێنەریش ئەوەبوو هەندێك شت نیشان بدات کە ئەوکاتە لە (تورکیا) قەدەغە بوو. لە ساڵی ١٩٧٠ لە (ئەنتاڵیا) بە باشترین فیلمی ساڵ ئەژمارکراو دیسانەوە

خەڵاتی باشترین ئەکتەری پیاو و ئەکتەری ساڵی وەرگرت. لەو قۆناغەدا ئەو کارانەی ئەو ئەنجامی دەدان، نەك سینەما لە (تورکیا) گۆڕی بەڵکو لە (جیهانی سینەمدا) کاریگەری تەواوی خۆی نیشاندا.

لە شەشی ئایاری ساڵی ١٩٦٨ ناوی ئەو وەك هەر گەنجێکی دیکە بۆ ئەنجامدانی ئەرکی سەربازی هات و پەیوەندیکرد بە هێزی (جەزا) لە شاری (موشە) کە لەوێ ئەرکە سەربازییەکانی جێبەجێ بکات.

چوونی ئەو بۆ ئەو ناوچەیە نەك هەر چانسی گونای بوو بەڵکو بەختی نەتەوەکەیشی بوو. چونکە لە نزیکەوە گوزەرانی نەتەوەکەی بینی و زوڵم و ستەمی زۆرداری بینی دەرهەق بە تاکەکانی نەتەوەکەی، چونکە ئەو تا ئێستا تەنها دەیزانی دایك و باوکی ئەو کوردن و زیاترنا، بەڵام لەوێ هەمووشتێکی بینی کە دەرهەق بە نەتەوەکەی دەکرێت. ئیتر یەڵماز گونای وەك دەرهێنەرێکی خاوەن تواناو لێهاتوو بووە جێی سەرنجی میدیاکان و پرسیاریان دەکرد گونای لە کوێیەو بۆ کوێ چوو.

هەندێك بە بزربوونی ئەو ئاسوودەبوون و زۆرێکیش بەوون بوونەکەی خەمناك بوون، شاشەی سینەماش هەستی بە غەریبی دەکرد. بەڵام زۆری نەبرد مۆڵەتی لە سەربازی وەرگرت بەهۆی نەخۆشکەوتن و دەرکەوتنی نەخۆشی لە بڕبڕەی پشتی و داخڵبوونی لە نەخۆشخانەدا، ئیتر دەستی دایەوە کامیراو دەستی بە بەرهەم هێنانەوەی فیلم کردەوە، فیلمێکی بەناوی (گورگی برسی) بەرهەم هێنا کە تیایدا رۆڵی سەرەکیی بینی، بەڵام سێ مانگ زیاتری نەکێشا کە گەڕاندیانەوە سەربازی و لەجیاتی ئەوەی کە دەبوایە پلەی ئەفسەری پێ ببەخشن بەڵام پێیان نەدا. لە نیسانی ساڵی ١٩٧٠ دوای ئەوەی کە خزمەتی سەربازی کۆتایی هات، گەڕایەوە (ئەستەمبووڵ) لە ئایاری ساڵی ١٩٧٠ لەگەڵ (فاتوش سلێمان گویل) چووە نێو کەژاوەی ژیانەوە، ئەویش لەخۆشی و ناخۆشی لەگەڵیدا مایەوە. تا کۆتایی ژیانی لەساڵی ١٩٧١ یەکەم منداڵ (کوڕ)ی یەڵماز گونای لەدایك بوو.

گونای بەو هەموو کارانەی کە ئەنجامیدان تێرنەبوو، هەرزوو فیلمێکی دیکەی بەناو بانگی بەناوی (ئومێد) بەرهەم هێنا، ئەویش ویژدانی بینەرانی هەژاند، لەبەرامبەردا رەخنەگری سینەمایی یۆنانی بەناوبانگ (دیمیتریس زانیا کیس) دەڵێت: **(یەڵماز گونای ژیانی رۆژانەی خەڵکی وێنەکردووەو فیلمی ئەو وەك بەڵگەی بندەستی گەلەکەی ئەژمار دەکرێن).**

لەو فیلمەدا هەردەم قارەمان سەردەکەوێت و باسی ژیانی دەوڵەتی پاشکەوتوو دەکات، ئەو فیلمە دەرهێنەرەکەی خۆی کردە دەرهێنەرێکی جیهانی بەناوبانگ، ماوەی یەك هەفتە لە هۆڵەکانی کەنەدا بۆ رەخنەگرانی سینەمایی نیشاندرا، لە ساڵی ١٩٧٠ دیسانەوە گونای وەك باشترین سیناریست و ئەکتەر هاتە ئەژماردن.

لە ئایاری ساڵی ١٩٧١ فیلمی (بێ ئومێد)ی دەرهێناو خەڵاتی سینەمایی (فیستڤاڵی تورکیای سینەمایی) لە (ئەدەنە) وەرگرت، لەساڵی ١٩٧١ فیلمی (خەمباری) دەرهێناو لە هەمان ساڵ لە (فیستڤاڵی تورکیا) لە (ئەدەنە) وەك باشترین سیناریست و ئەکتەر گونای دەستنیشانکرا. وە لەساڵی ١٩٧١ فیلمی (دەردەسەری) دەرهێناو خەڵاتی دووەمی فیستڤاڵی بەدەستهێنا، هەروەها خەڵاتی یەکەم بۆ (خەمباری) و خەڵاتی دووەم بۆ (بێ ئومێد) و خەڵات سێیەم بۆ فیلمی (بێ ئومێد)و دیسان لە فیستڤاڵی (نۆبڵی جیهانی) خەڵاتی دادوەرانی تایبەتی بۆ فیلمی (ئومێد) وەرگرت.

ئەگەر گونای بەتەنها دەرهێنەر یان سیناریست یان ئەکتەر یان بەرهەم هێنەر بووایە، ئەوا بەتەنیا بوارێکی زۆر گەورەیە و کارکرن و سەرکەوتن تیایدا ئاسان نییە، بەڵام ئەو بووارانە هەموویان بەیەکەوە لەناو گونایدا



کۆببونەوە، بۆیە لە هونەری جیهانیدا بێ وێنەیە.
گونای بەبێ ترسی لەو پیلانانەی کە لەدژی دەگێردران، رۆژانە فیلمێکی وێنە دەکرد و شەوانیش سیناریۆیەکی دەنووسی، ئەوەبوو ئەنجامێکی باشی بە دەستهێنا، تا لە ماوەی ٢ ساڵدا ٩ فیلمی گەورەی گرانبەهای بەرهەم هێنا کە خۆی بەرهەم هێن و دەرهێنەرو سیناریست و ئەکتەری سەرەکیی بوو تیایاندا، ئەوانیش فیلمەکانی (ئەوانەی رەت بوون) و (عیبرەت) و (بێ ئومێد) و (دەردەسەری) و (خەمباری) و (باب) و .... هتد.
بەتایبەتی فیلمی (خەمباری) چەندین خەلاتی گرانبەهای بە دەستهێنا چ ناوخۆیی یان نێودەوڵەتی و خەلاتی رەخنەو جیهانی لە (فیستڤالی فینیسیا) لە ساڵی ١٩٧٢ هەروەها (فیستڤالی سانریمۆ)ی لە ساڵی ١٩٧٧، بەدەستهێنا.
لەساڵی ١٩٧١ چیرۆکی (ستوخوار مردن) بە ئاشکرا بلاّوکرایەوە، لەساڵی ١٩٧١ فیلمی (باب)ی دەرهێناو لەوکاتەشدا گونای بووە یەکێك لە ناودارترین هونەرمەندانی تورکیا، لە هەمان کاتیشدا بووە دوژمنی حوکمدارەکانی ئەوکاتەی تورکیا، هەندێکجار پێیاز دەگوت (برۆ دەرەوە لە ولاّت) و هەندێکجاریش بێ هیچ هۆکارێك (پۆلیس) گەفی کوشتنیان لێدەکرد، بەلاّم گونای بەردەوام کارەکانی رایی دەکرد و ماڵەکەیشی کەوتە ژێر چاودێری پۆلیسەوە تا توانیان پیلانێکی بۆ دابرێژن ئەویش (هاریکاری قوتابیانی شۆرشگێری کردووە، و لەناو ماڵەکەیدا شاردوونییەتەوە، لە دادگاد ئەو دانی بەو کارەداناو بەدرێژایی باسی هەموو کارەکانی ئەو هاریکارییە کرد، لە ئاداری ساڵی ١٩٧٢ بە (٧ ساڵ) زیندانی و کاری گران یەکسەر حوکمدرا. و بردرایە زیندانی (سلێمییە)، لەوێدا لە دیمانەیەکید لەگەڵ رۆژنامەیەکدا کە پرسیاری لێکراوە ئەگەر ئەو خۆی دانی پێدا نەنابوایە ئەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەبوو، لە وەلاّمدا گونای دەڵێت: (ئەگەر ئێستاش ئەو قوتابیانە داوای هاریکاری لەمن بکەن، من ئێستە داواکەیان رەت ناکەمەوە).



لەساڵی ١٩٧٢ لە نامەیەکی خۆیدا لە زیندانەوە بۆ هاوسەرەکەی دەنووسێت و دەڵێت: (خۆشەویستەکەم، ئێمە دەمانویست ژیانێکی خۆش بەسەر ببەین، بەڵام ناتوانین، ئەو ژیانە بەو شێوەیە بەسەر ببەین، ئەویش لەبەر هۆکارێکی بچووك کە ئێمە هەست بە ئێش و ئازاری کەسانی دیکە دەکەین، هەروەك ئێش و ئازاری ئێمە، وە ئێمە بۆ دەردەسەری هەندێك مرۆڤ دەناڵێنین، کە نەمان بینیون، و بەسەرهاتەکانیان ئاگر بەردەدەنە هەناومان، ئێمە هەمووشتێك و سروشتیش دەپارێزین، چەند جوانە ئێمە بەشداری خەمی کەسانی دیکە دەبین، چەند شتێکی مەزنە هاریکاری خەڵکی بکەینن بۆئەوەی لە کێشەکانیان رزگاربکەین، من لە ژیانی خۆمدا زۆر ناخۆشیم دیت، بەڵام ئەو ژیانە چەندە خۆشە کە تیایدا هاریکاری ئەو خەڵکانەبکەین و ئەوانیش ئێمەیان خۆش بوویت. لە ژیان بێزار مەبەو هەرگیز مەهێڵە خۆشیت لە تۆ دوور کەوێتەوە. بە خۆشی بەرەنگاری ژیان ببەوە).

گونای هیچ کاتێك شکستی نەخواردووەو ئەو تەنها پیاوی سەرکەوتنەکان بوو، نەزیندان و هیچ شتێك نەیان شکاند، دوای زیندانیکردن بە دوو مانگ رۆمانە بەناو بانگەکەی (ستوخوار مردن) خەڵاتی (ئۆرهان کەمال) وەرگرت و کە مەزنترین خەڵاتی (تورکیایە لە بواری ئەدەبی)، هەر لەو ساڵەدا گۆڤاری (هونەری میللیەت) لەناو ٢٥ کەسایەتیی هونەری تورکیادا، گونای وەك باشترین کەسایەتی هاتە ناسین وەك (هونەرمەندێکی نوێخوازی تورکیا). سەرباری ئەوانەش فیلمەکەی بەناوی (باب) لەساڵی ١٩٧٢ خەڵاتی (شێنەخواری زێرین) لە گشت تورکیا لە (ئەدەنە) وەرگرت، وە باشترین خەڵاتی ژن و پیاویش بەو فیلمەدرا. ئەو ئەنجامە نەچووە سەرەوەو لیژنە ناچاربوو لە بریاری خۆی پەشیمان بێتەوەو خەڵاتی یەکەمی دایە (کارا دۆغان) و باشترین ئەکتەر (جونێت ئەرکان) وە خەڵاتی ژنیش وەرنەگیرا، بەڵام (جونێت ئەرکان) ئەو خەڵاتەی رەتکردەوە و بۆ رۆژنامەوانان گوتی: (ئەوە بەهیچ **شێوەیەك جێگای قبوڵکردن نییە، بۆچی خەڵات نادرێت بە گونای و دەدرێت بەمن، ئەوە ریسواییە نەك فەخرو شانازی، چونکە من گونای بە شایستەتر دەبینم بۆ وەرگرتنی ئەو خەڵاتە)**. ئەوەبوو سەرۆکی ئۆپۆزسیۆنی تورکیا (بلند ئەجەوید) بە سەرکردەکان گوت کە خەڵات بۆ فیلمی (باب) نەدراوە، بەڵکو بۆ هونەردراوە ئەوەش رەوانییە کە پێی نەدرێت، وێرای ئەوەی کە خۆی لەنێو قەفەزی ئاسندابوو، خەڵات لە دوای خەڵات دەچوونە ناو زیندانەوەو لە هەمان ساڵ لە رێگەی فیلمی (خەمباری) تورکیا لە مێژوودا بەشداری لە فیستڤاڵی (کان)داکرد و پێشوازییەکی بەرفراوانی لێکراو داواکرا گونای ئازاد بکرێت، دوای ماوەیەك لە گرتنەکەی هونەرمەندە سینەماییەکانی جیهان نامەیەکی نارەزاییان دایە حکومەتی تورکیاو نارازی بوونی خۆیان لە گرتنی گونای دەربری و ٧٠ کۆمپانیای سینەمایی ئەو یاداشتەیان مۆرکرد و (یەکێتی شانۆیی و سینەمایی سوید) و (ئەڵمانیا) و زۆرێك لە (وڵاتانی رۆژئاوا) و ١٥٦ هونەرمەندیش لەنێویاندا (کۆستاگا فراس) و (ئەنگێمان پراگمان) و (تۆنی ریچارد سۆن) و (جان بێری کۆرین) و (مێلیان مێرکۆری وەزیری رۆشنبیری ئەوکاتەی یۆنان) و (جاك لانگ وەزیری رۆشنبیری ئەوکاتەی فەرەنسا) و (ئەلیزابێت تالوور) و گەلێکی دیکە ئەو یاداشتەیان ئیمزاکرد کە بۆ (حکومەتی تورکیا)یان راوانەکردو داوای ئازادکردنی گونایان کرد.

بۆماوەی ٢ ساڵ و نیو گونای لە زیندانی (سیلێمییە) مایەوە کە ناخۆشترین ساڵەکانی ژیانی بوون، ئەو هەموو ئێش و ئازارەکانی دەخستە سەر لاپەرەی کاغەزەکانی کتێبە بەناوبانگەکەی (حوجران یان ژووری گرتنی من).

دوای ئەوەی کە حکومەت لەلایەن (پارتی کۆماری) و (پارتی پاراستنی نیشتیمانی) بەسەرۆکایەتی (بلند

ئەجەوید) هاتنە سەر تەختی سەرۆکایەتی بە بڕیارێکی لێبووردنی تایبەتی، لە ٤ ئایاری ساڵی ١٩٧٤ گونای ئازادکراو هەزاران کەس چوونە پێشوازیی هاتنەدەرەوەو گەڕانەوەی بۆ ماڵ. دوای ئەوەش ڕاستەوخۆ دەستیکرد بە بەرهەم هێنانی فیلمی (هەڤاڵ)، ئەو فیلمە بۆ یەکەمجار لە مێژووی (تورکیا)دا بۆ ماوەی ٤ هەفتە زۆرترین بینەر پێی ئاشنا بوون. و خەڵاتی دووەمی لە (فیستڤاڵی سینەمایی تورکیا) لە (ئەنتاڵیا) لە ساڵی ١٩٧٥ وەرگرت و دوای تەواو بوونی ئەو فیلمە دەستیکرد بە بەرهەم هێنانی فیلمی (ئەندێشە)، کە یەکێك بوو لەو شەش سیناریۆیانەی کە لە زینداندا نووسیبوونی.




گونای ئەوەی دەزانی مانەوەی ئەو لە دەرەوەی زیندان تەنها چەند ڕۆژێکەو بەس، لە دەستپێکی ساڵی ١٩٧٤ گونای لەگەڵ ستافی کارکردن چوونە شاری (ئەدەنە) بۆ دەستپێکردنی فیلمی ناوبراو، لە شەوی ١٤ی ئەیلوولی ئەوساڵە دوای ئەوەی کە لەگرتنی هەندێك وێنەی فیلمەکە ببوونەوە گونای لەگەڵ هاوژینەکەیی و کوڕی خوشکەکەی بەناوی (عەبدوڵلا بوتون) بۆ نانخواردن چوونە گازینۆیەکی کەنار ئاو لەو شارەو حاکمی گشتی ئەو شارە بەناوی (مستەفا ئۆکلود) لەگەڵ چەند لەپیاوانی خۆی، لەوێ بوون، دوای ئەوەی کەچەندین قسەی نەشیاوی ئاراستەی گونای کرد، تێکهەڵپژانێك دروست بوو، ئیتر چەندین گوللە بۆ ئاسمان هاویژران، لە لایەکی دیکەوە گوللەیەك بە حاکمی شار کەوت و دوای ڕووداوەکە نزیکەی چل کەس چوونە دادگەو تەنها کەسێك گوتبووی کە گونای گوناهبارە، لە ١٥ی ئەیلوولی ١٩٧٤ گونای بە تۆمەتی کوشتنی ئەو حاکمە. ئەوەش سێیەم جاربوو کە گونای بەرەو زیندان بچێت.

بەڵام گونای نەیزانی سەرنەکەوتن چییەو دەستی لە شەڕی خۆی بەرنەداو داخوازی مافی گەلەکەیی و هەموو مرۆڤە بندەستەکانی کرد، وە کۆتایی هێنان بە کارەکانی فیلمی (ئەندێشە)ی بە (شەریف گورین) سپارد و ئەویش ئەوکارەی بەوپەڕی دڵسۆزی و وەفاوە کۆتایی پێهێنا.

گونای تا سیناریۆیەکی دەنووسی چیرۆکێکی دەنووسی، تا چیرۆك کۆتایی دەهات ڕۆمانێکی دەنووسی، تا ڕۆژمانیش کۆتایی دەهات سیناریۆیەکی دەنووسی، دوژمنانیشی هەموو پیلان و هێزێکی بەکاردەهێنا تاوەکو لەناو ببەن و بیچەمێننەوە، بەڵام یەڵماز ئەو هێزەبوو کەس نەیدەتوانی بیشکێنێت و

کەسیش نەیتوانی ئیرادەی ئەو کەم بکاتەوە. لەساڵی ١٩٧٥ یەکێك لە سیناریۆکانی کرایە فیلم و هەروەها دەرهێنەر (شەریف گۆرین) رۆمانە بەناوبانگەکەی (باران)ی کردە فیلم، وە لە ساڵی ١٩٧٦ دەرهێنەر (بێلجین ئۆکاچ) سیناریۆیەکی دیکەی گونای کردە فیلم و هەروەها (زەکی ئۆیتانیش) فیلمی (دوژمن)ی لە سیناریۆی گونای کردە فیلم و لە (فیستڤاڵی سینامایی تورکیا) لە (ئەدەنە) وەك باشترین سیناریست ئەژمارکرا، لە ئاداری ساڵی ١٩٧٥ رۆمانەکەی بەناوی (ساڵپا) بڵاوکرایەوەو تائێستاکە بۆ نزیکەی ٥٠ زمانی جیهان وەرگێردراوە، هەندێك سەرچاوە ئاماژە بۆئەوەدەکەن کە بەهۆی نووسینی ئەو رۆمانەوە گونای کاندیدکرابوو بۆ وەرگرتنی (خەڵاتی نۆبڵ)، لە نیسانی هەمان ساڵ رۆمانی (تۆمەتبار) بڵاوکرایەوەو (ژووری گرتنی من)یش لە ئەیلوولی هەمان ساڵ بڵاوکرایەوە، لە کانوونیشدا (نامە) لە سیلێمییە چاپکرا، سەرەڕای رۆمانەکانی دیکەی کە لەزینداندا نووسیبوونی و کۆتا بەرهەمی کتێبیش بەناوی (دۆرفا شیا) نووسی.

لەساڵی ١٩٧٧ (فیستڤاڵی بەرلینی نێودەوڵەتی) خەڵاتی رێزگرتنی بۆ هەموو کارەکانی ئەو دابینکرد و گونای هەموو شتێکی پشتگوێخست و هەموو ئامانجی ئەوەبوو تەنها خزمەتی گەل و وڵاتی خۆی بکات، ئەویش (کوردستان!) کە (تورك) پێی دەڵێن (باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ)، یان (چیاکانی تورکیا)، بەڵام گونای زۆر بەداخ بوو کە هێشتاکە گوندەکەیان رێگەی بۆ ناچێت و قەدەغەیە بە کوردی بدوێن، و جلی کوردی لەبەربکەن، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە میوزیکی کوردی کردە میوزیکی فیلمەکانی و ناوی کوردیشی کردە ناوی قارەمانەکانی فیلمەکانی، و بابەتە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ئەو خەڵکانەی کردە هەوێنی کارەکانی خۆی. گونای زۆر نزیکبووە لە کەسانی سادەو هەژارو بندەست، سەرەڕای زیندانی و بزرکردنی، بەڵام هەر ئەوبوو سەرکێشی سینەمای تورکی و ئەکتەرو سیناریست و دەرهێنەری پلەیەك.

لەساڵی ١٩٧٨ گونای لە زینداندا دەستیکرد بە دەرهێنانی فیلمی (جەلەب)، ئەو فیلمە سەرکەوتنی زۆری لە (وڵاتانی ئەوروپا) بەدەستهێنا لەوانەش باشترین خەڵاتی (فیستڤاڵی سجودی دووەم) لە (لۆکارنۆ) و (سویسرا) و لەساڵی ١٩٧٩ش (فیستڤاڵی بەرلینی نێودەوڵەتی) خەڵاتی (کاسۆلیکی جیهانی)، و خەڵاتی (فیستڤاڵی فیلمی جیهانی) و خەڵاتی (دادوەرانی مەزن) و خەڵاتی (شێری زێر) و خەڵاتی (سێوی زێر) و خەڵاتی (بەڵگەی سینەمایی بەلجیکی) و (لەندەن) و خەڵاتی (خۆشترین و باشترین فیلم)ی بەدەستهێنا، لەلایەنی بیرکردنەوەش دیسان لە (بەلجیکا) خەڵاتی (فیمینیا)ی بەدەستهێنا، لە هەمووشیان گرنگتر لە (فیستڤاڵی ڤالانسیا لە ئەسپانیا) لە ساڵی ١٩٨٠ گەورترین خەڵاتی بەدەست هێناو ئەو فیلمە نەك سینەمای (تورکیا) بەڵکو تەواوی سینەمای (وڵاتانی دواکەوتوو)ی گەیاندە ئاستی سینەمای جیهانی و هەموو ئاواتی گونای لە ژیانی ئەودا بڵندبوونی دەنگی هەژاران و بندەستان بوو بۆ دابینکردنی یەکسانی سەرانسەری و ئازادی گەلەکەی لە بندەستی و پاشکەوتوویی و بێ خاوەنی و ئامانجی بوو کاریان بۆ بکات. گونای لە دیدارێکی رۆژنامەوانیدا دەڵێت: (ئەگەر کوردیش نەبم، پێویستە گرنگی بە کێشەی میللەتی کورد بدرێت، بیربکەنەوە ئێستا زیاتر لە ١٢ ملیۆن کورد لە تورکیا لە بچووکترین مافی مرۆڤایەتی خۆیان بێبەشن و ناتوانن بە زمانی دایك بئاخڤن، ئەرێ رەوایە مرۆڤ چاوی خۆی لە ئاست ئەو زوڵمانە بنوقێنێت؟). بەڵام لەناو کۆت و زنجیردا چۆن بە ئامانجەکانی دەگات. لە زینداندا دەستیکرد بە نووسینی سیناریۆی فیلمە بەناو بانگەکەی بەناوی (رێگا) بەشێك لە دەرهێنانەکەی لە زینداندا ئەنجامداو



لە ساڵی ١٩٨٢دا لە فیستڤاڵی (کان)ی سینەمایی خوولی سیو پێنجەم دەنگدانەوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینی و خەڵاتی یەکەمی (دارقەسپی زێرین) کە گەورەترین خەڵاتی جیهانی سینەماییە بەدەستی هێنا، لەگەڵ گەورە دەهێنەر (کۆستا کافراس) خەڵاتی وەرگرت، وە نیشاندانی ئەو فیلمەش لە هۆڵی (پاریس) بە وەرچەرخانی وەرزی ناوزەدکراو لەبەر ئەوانەش فیلمی ناوبراو لە هەموو جیهان بڵاوکرایەوە.

گونای دەڵێت: (سیناریۆی فیلمی رێگا لە زینداندا نووسیم و لەوێدا من زۆر کەسم ناسی و هاورێیەتی ئەوانم کرد لەکاتێکدا من گوێم لە چیرۆکەکانی ئەوان بوو کە بەهۆیەوە کەوتوونەتە زیندانەوە، وەك ئەمانەتێك من لەلای خۆم دەمنووسین تا گەیشتنە نزیکەی ١١ چیرۆك و نووسینم و لەناویاندا من ٥ لەو چیرۆکانەم دەرهێنا کە لەگەڵ ئامانجی من دەگونجا کە وێنەکردنی ژیانی دروستی تورکیابوو). دوای ئەوە هاورێی خۆشەویستی خۆی (شەریف گورین) راسپارد بۆئەوەی هاریکاری بکات بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانی ئەو فیلمە، دەستینشانکردنی ئەو کەسەش لەسەر دووبنەمابوو، یەکێکیان ئەوەبوو (گورین) لە جیهانی هونەری و سیاسی و سینەمایی گونای دەگەیشت و دووەمیش (شەریف) کورد بوو. ئەوەبوو بەهەموو توانایەکەوە کاری لەو فیلمەدا دەکرد و گونای چۆنی دەویست ئاوەها کامیرای دەسوڕاند، ئەو دوولایی ئامادەکردنی ئەو فیلمە زۆر پرسیاری لەلای رەخنەگران دروستکرد، گونای لە زینداندا فیلمی بەرێوەدەبرد و (گورین)یش راسپاردەکانی بە ووردی جێبەجێ دەکرد، ئایا کێ دەرهێنەری دروستە، گونای یان (گورین)، بەڵام (گورین) ئەو پرسیارەی وەڵامدایەوە کە گوتی (گونای خاوەنی ئەو فیلمەیەو ئەوەش خۆشەویستی ئەوە، چونکە ئەو لە زینداندا ئێمەی رادەسپارد و ئێمەش هەموومان لەژێر فەرمانی ئەودابووین).




بەڵام گونای چۆن لە زینداندا فیلمی بەرێوەدەبرد، لەوبارەیەوە گونای دەڵێت: (لەو دەمەدا کە بلند ئەجەوید سەرۆکایەتی وڵاتی دەکرد سەردانی بەردەوام بۆ زیندان ئاسایی بوو، ئەو دەرفەتەمان قۆستەوەو ستافی وێنەگرتن هەموویان پێکەوە سەردانی منیان دەکردو ئێمە لەو کاتەدا دەیان لاپەڕەمان ئاڵوگۆڕدەکرد و داوامان لە ئەکتەرو ستافی فیلم دەکرد سەردانی شوێنی وێنەگرتن بکەن، وە لەرێگەی کامیرای فۆتۆگرافیەو ژیان و نەریتی ئەوان وێنەبگرن، تاوەکو وێنەکانیان کاریگەرییان هەبێت بەسەر رۆڵ بینینتانەوە). یەکێکیش لە ئەندامی ستافی فیلمەکە دەڵێت: **(گونای داوای لە هەموو ستافی کار کرد تا بەوانەیشەوە کە کرێکاری روناکیی بووون**




بچنە ناو زیندانەوە بۆئەوەی بەکاری زارکردنەوە هەڵبستێت، بۆئەوەی هەریەکێك بزانێت چۆن کارەکانی دەکات. وەك وێنەگرتن و ئەکتەران، بۆیەش ژووری پێشوازی زیندانی کردبووە ستۆدیۆی سینەمایی. دوای ئەو دیدارەش هەموویان چوونە مەیدانی کارو هەموویان کاری خۆیان دەزانی چونکە گونای کارەکانمانی دەستنیشانکردبوو). دیسانەوە گونای ئاواتی ئەوەبوو کە ئەو فیلمە بە زمانی کوردی دروست بکات، بەڵام نەیتوانی و لەوبارەیەوە بەرۆژنامەوانانی گوت: (من تەنها کوردم و وام لە زینداندا، ئەگەر فیلم کوردی بووایە دەبووایە ستافی فیلم هەموو کوردبوونایە، سەرەڕای ئەوانەش فیلمەکە بێبەش نەبوو لە وشەی کوردی و خەڵکی گوندی بە کوردی قسەیان دەکرد). فیلمی (رێ) فیلمێکە لە هەموولایەکەوە تەواوەو وێنەی راستەقینەی (تورکیا) دەکات.

دوای ئەوەی ئەگەری کودەتای لەشکری لە (تورکیا) بەسەرکردایەتی (کەنعان ئیڤرین) و هاتنی فاشییەکان بۆسەر حوکم لە ئەیلوولی ساڵی ۱۹۸۰ کەوتەوە، بڕیاردرا گونا بگوازرێتەوە لە (ئەزمید) بۆ (ئەمیرال) و پاشان بۆ زیندانی (سپارتە) کە نزیك دەریای (مەڕمەرە)یە و تەنها بوون و مردن لەوێدا هەبوو. دوای ئەوەی کە گونای بەو هەولانەی زانی بۆ کوشتنی ئەو دەدرێت ناچاربوو بیر لە هەڵهاتن بکاتەوە. کاتێکیش کە گونای بۆ جەژنی قوربان چووەوە ماڵەوە بەهاوکاری هەندێك لە هاوکارە دڵسۆزەکانی توانی لە زیندانی (سپارتەو تورکیا)ش رزگاری ببێت و بەرەو (یۆنان) بچێت، لەوێ (وەزیری رۆشنبیری یۆنان) هونەرمەندی بەناو بانگ (میلینا میرکۆری) پێشوازییەکی گەرمی لێکرد و وەك (هونەرمەندێکی گەورەی شۆرشگێڕ) ئەوی ناسی. پاشان بەرەو (سویسرا) رۆیشت و داوای پەنابەرێتی کرد، بەڵام مافی پەنابەرێتیان پێنەدا، پاشان بەرەو (فەرەنسا) رۆیشت و لەوێ وەك پەنابەرێکی سیاسی وەرگیراو (لەپاریس) نیشتەجێبوو، سەرەڕای ئەوەی کە گونای لە تورکیا نەمابوو، بەڵام ژیانی ئەو هەر لەمەترسیدابوو، ئەو هەردەم لەژێر چاودێریدابوو، (تورکیا) گەفی لەو وڵاتانە کرد کە داڵدەی گونایان داوە، و پێی گوتبوون ئەگەر رێگە بدەن و فیلمەکانی ئەو نیشان بدرێن، پەیوەندییە دیبلۆماسییەکانیان لەگەڵدا دەبڕێت. بەڵام ئەو وڵاتانە هیچ گوێیان بۆ قسەکانی (تورکیا) نەگرت و دەرگای هۆڵە سینەماییەکانی خۆیانیان بە هەفتە بۆ دەخستە سەرگازەرەی پشت، فیلمەکانی گونای لە هەموو (ئەوروپا) نیشان دەدران و یەکێکیش لە سینەماکارە گەورە تورکەکان لەبارەی گونایەوە دەڵێت: **(لە تورکیا ئەگەر کەسێك وەك باشترین سینەماکار دەستنیشان بکرێت ئەوە بێ دوودڵی یەڵماز گونایە، ئەگەر کەسێکی دیکە پشتی ئەویش بێت هەر**

ئەوە، دوای دەجاریش بپرسین کێ لەپشتی گونایەوەیە هەر دەڵێین ئەوە). سەرەنجام لە رۆژی ٢٤ی شوباتی ساڵی ١٩٨٣ گونای لەگەڵ ژمارەیەك لە هەڤاڵانی خۆی (پەیمانگای کوردی لە پاریس بۆ پاراستنی کلتووری گەلی کورد لەژێردەستی وڵاتانی داگیرکەر دامەزراند)[٢] و لەساڵی ١٩٨٢ و نیسانی ساڵی ١٩٨٣ یەکەم فیلمی خۆی لە غەریبی و دوایین کاری خۆی بەناوی (دیوار) کۆتایی پێهێناو وەك هەرجارێك ئامانجی ئەوە ئەوەبوو کە بەبێ هیچ سانسۆرێك ئەتککارییەکانی دکتاتۆریی دەسەڵاتی (تورکیا) لەو کاتەدا دیاری بکات، ئەو فیلمە لە (باشووری فەرەنسا) بە هاریکاری (حکومەتی فەرەنسی) بەرهەم هات و چیرۆکی فیلمەکەش لەناو زینداندا نووسرابوو. کە باسی لەناو زیندانی ژن و منداڵان دەکرد. بەهۆی ئەوەی کە کارەکانی گونای نارەحتییەکی زۆریان بۆ دەسەڵاتی ئەوکاتەی تورکیا دروست کردبوو، هەروەها توانی رای گشتی بە شێوەیەکی باش بۆ لای گەلەکەی ببزوێنێت، بۆیەش (دادگای تورکیا) بریاریدا هەمووکارە ئەدەبی و هونەرییەکانی گونای قەدەغە بکات و کۆیان بکاتەوەو بیان سوتێنێت، بەو فیلمانەشەوە ئەگەر تەنها ئەکتەرێکی کۆمبارسیش بووبێت تیایدا، لە رۆژی ١٩٨٣/١٠/٩ ئەو بریارە جێبەجێکرا و ناوهێنان و بیرکردنی گونایش قەدەغەکراو ناسنامەی تورکیشی لێسەندرایەوەو (تورکیا) گەفی لەچەند وڵاتێك کرد و بەهۆیەوە (ئینگلتەرە) و (ئەڵمانیا) گونایان وەرنەگرت. دەسەڵاتدارانی فاشستی (تورکیا) بەوانەش نەوەستان بەڵکو چەندین هەوڵی کوشتنیشی درا، لەهەمووشیان مەترسیدارتر ئەوەبوو کاتێك گونای لە (تونس) هەوڵی کوشتنی دراو خۆشبەختانە رزگاری بوو. لە رۆژی ١٨ی ئاداری ساڵی ١٩٨٤ بە هەڵکەوتی جەژنی نەورۆز لە هۆڵی (پەیمانگەی کوردی لە پاریس) گونای وتارێکی زۆر بەهێزی پێشکەشی ئامادەبووان کرد[٣].




لەبارەی غەریبیشەوە گونای دەڵێت: (غەریبی بۆمن بیرهاتنەوەو عەشقی داروبەرد و باڵندەو دەشتیایی وڵاتی منە، غەریبی بۆمن گەرانەوەیە بۆ وڵات و بەردەوامی شۆرشە بەهەموو ئیرادەو توانای خۆمانەوە، وە غەریبی بۆمن ناسانی ئێمەیە بۆ جیهان و ناسینی ئەوانە بۆ ئێمە). ئەو پەیڤانە عەشقی گونای بۆ وڵات دیاری دەکەن، وە تامی غەریبیشیان دێت، کە بەردەوام دەیگوت: (من لە وڵاتی خۆم غەریبم و ئەوەش ئازارم دەدات، ئێستا خەبات لەوێدا گەرمەو من دەمەوێت لەگەڵ ئەوان بم و بەشێك بم لەوان)، گونای بە هەموو بڵندی دەنگی خۆی بانگی دەکرد (ژیانی من مولکی گەلی منی ژێردەستەیەو ئەز شۆرش بۆ ئازادی ئەو دەکەم و ئارمانجی من لە ژیاندا هونەرنییە بەڵکو ئازادیی گەلە بندەستەکەمە، و هونەر ئامرازی گەیشتنی ئۆمێدی منە). هەر لەبەر ئەوەیە گونای قابیلی ئەوەیە بە

یەکێك لە شەهیدانی بزاڤی رزگاریخوازی کورد نەژماربکرێت.

حسێنۆڤ) لە کتێبەکەیدا بەناوی (یەڵماز گونای ژیانی ئەفسانەیی) دەڵێت: (**ئەو مرۆڤە مەزنە هەتا هەتایە دەمێنێت و نموونەیەکی گەشە**). هەروەها (جاك لانك) وەزیری ئەوکاتەی رۆشنبیری فەرەنسا دەڵێت: (**گونای لە ریزی پێشەوەی سینەمای جیهانیدایەو شۆشگێرو پارێزارێکی بەتوانابوو بۆ بندەستان و کارەکانی تا هەتایە دەمێنن**).

دیارە ٤٧ساڵ تەمەن زۆر کورتە بۆ ژیانی گونای کە ١٤ ساڵ لە زینداندا و ساڵەکانی دیکەیشی بۆ خزمەتی دۆزی نەتەوەکەی بەکار هێنابوو، ٥ رۆمانی نووسی و ١٠٠ چیرۆك و سیناریۆی فیلمی ئامادەکرد و نووسی، و ٢٣ فیلمی دەرهێنا کە لە رووی سیاسی و کۆمەلأیەتییەوە بابەتگەلێکی زۆریان لەبارەوە نووسراوە، هەروەها بەشداریکردووە لە زیاتر لە ١٢٠ فیلم ئەو فیلمانەیشی کە گونای وەك سیناریست و دەرهێنەرو ئەکتەرو هاریکاری دەرهێنەر کاری تێداکردوون نزیکەی ٢٠٠ فیلمن. لەوانە ١٩ فیلمی (عاتف یەڵماز) و ١٦ فیلمی خۆی و ١١ فیلمی (عەتا دینیز) و ٦ فیلمی (رەمزی جان تورك) و ٥ فیلمی (حەسەن کاجاناکیا) و (محەمەد عەقاد) و ٤ فیلمی (نوری ئێرکون) و (نوری ئاکینچی) و ٣ فیلمی (لوتیفی عەلی عەقاد) و (شەریف گورین) سەرەڕای ئەوانەش ژمارەیەکی زۆر لە دەرهێنەران سینایۆی ئەویان بەکار هێناوە. یەکێکیش لە رەخنەگرانی سینەمایی دەڵێت: (**ئەوکارانەی کە گونای ئەنجامی داون لەماوەی ٤٧ ساڵدا، لە توانای کەسدا نییە ئەگەر سەد ساڵیش بژیت**).

دوای تێپەڕبوونی ٤٧ ساڵ بەسەر ژیانی گونایدا، لەوکاتەیدا کە خۆی ئامادە دەکرد بۆ دەرهێنای فیلمێکی دیکە لەبارەی (مێژووی کوردو کوردستان) لە رۆژی ٩ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٤ زۆرینەی هەرە زۆری رۆژنامەکانی (فەرەنسا) وێنەی گونایان لەناو چوارچێوەیەکی رەشدا لەلاپەڕەی یەکەمدا بلأوکردەوەو دەنگو باسی کۆچی دوایی گونای لە (نەخۆشخانەی یونیڤێرستی پاریس) بە هۆی (نەخۆشی شێرپەنجەی گەدە)وە بلأوکردەوە. لە رۆژی ١٢ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٤ بە ئامادەبونی ژمارەیەکی زۆر لە سیاسەتمەدارو بەرپرس و وەزیرو هونەرمەند و رۆشنبیرانی بیانی و ژمارەیەکی زۆری رەوندی کورد لە ئەورووپا، کاتژمێر ٢ و ٣٠ خوولەکی دوای نیوەرۆ لەناو گوڵو گوڵزاردا تەرمەکەی لە (پەیمانگای کوردی لە پاریس) و پاشان بۆ (مەیدانی کۆماری لە پاریس) و ئیتر بەرەو گۆرستانی (پێرلاشێز) گۆرستانی شۆرشگێڕانی فەرەنسی و لەنزیك (بۆدلێرو سارتەر) و داهێنەرانی فەرەنسا بەخاك سپێردرا تا ئەوکاتەی کوردستان ئازاد دەکرێت و پاشان لە خاکی کوردستان تا هەتایە ئارام دەگرێت.

پەراوێزەکان:

(١)لەسەرەتادا بەناوی (یەڵماز بۆتۆن) بەرهەم و نووسینەکانی بلأوکردۆتەوە نەك بەناوی یەڵماز گونەی.

(٢)تا ئێستاش ئەو سەنتەرە لە پاریس بوونی هەیە، و کەسایەتی رۆشنبیری کورد دەروێش فەرعۆ سەرپەرشتی دەکات.

(٣) دیارە ئێمە بەهۆی دەستنەکەوتنی دەقی وتارەکە چ بە دەنگ یان بە نووسین نەمانتوانی هیچ بکەین، بەلأم جێگای ئامارژە بۆکردنە کە زۆرێك لەوانەی لەبارەی یەڵماز گونایەوە نووسیویانە باسی ئەوە دەکەن کە گونای لەو وتارەدا هێشری توندی کردۆتە سەر هەریەك لە تورك و عەجەم بەهۆی ئەو زۆرو ستەمەی لە کوردی دەکەن.

دیارە بە رەنگدانەوەی ئەم وتارە باڵیۆزخانەی تورکیا لە پاریس نامەیەکی ئاراستەی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا کردووەو تیایدا باسی ئەوەیکردووە کە گونای لێرە (واتا لە پاریس) وەك رێبەری شۆڕش دەناسرێت و بۆیەش پێویستە هەرچی زووە مشووری بخورێت. هەربۆیەش دوای ئەوەی دەسەلأتدارانی تورکیا هەوڵەکانی پێشتری خۆیانیان چڕکردۆتەوە بۆ لەناوبردنی یەڵماز گونای.



# (3) دیـــدارێك لە زینـــدانـــدا

**دیمانە: حسینۆڤ ـــــــــــــــ وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە - ئارام ئەمین شوانی**



((یەڵماز گونەی ئەو داهێنەرە سینەماکارەی کوردە کە هەر لە منداڵییەتییەوە هەستی هەبوونی جیاوازی چینایەتی بزووانددوویەتی و تا گەیشتووە ئاستی نووسینی چیرۆکە تراژدیاییەکانی وەك (کۆتاییەك بۆ سوکایەتی پێکردن نییە)و لە چیرۆکە خۆشەویستییەکانیشیدا عەشق و نەداری و ستەم و نایەکسانی دەگاتە لووتکە و لەوێدا چیرۆکی (بۆچی کوشتمت، دەمویست بژیم تا خۆشمبوێی) دەنووسێ، دیارە لێرەدا ئێمەی ئامادەکارانی ئەم دۆسییەیە دوور و نزیك ناچینە ناو هەندێك باسەوە کە لە ڕێگەی دیمانەیەکی ڕۆژنامەوانیانەوە دەستەبەر بوونە، ئەم دیمانەیە لە بەندینخانەی ئەستەمبووڵدا لەکاتی گیرانی بەهۆی ئەو پەیامە سیاسییانەیەوە کە لە ڕێگەی ئەو فیلمە سینەماییەکانی وەشاندوونی و بەر لە گۆڕانی حکوم بۆ دیموکراسی لە تورکیادا دەستگیرکراوە، و ئێمەیش بەمەبەستی دەوڵەمەندکردنی ئەم دۆسییەیە سوودمان لێوەرگرتووە و دوای وەرگرتنی لە ماڵپەڕی ئەنتەرنێت هەروەك لە خوارەوە ئاماژە بۆ ناوونیشانەکەی کراوە، هەر لە ڕێگەی پۆستی ئەلیکترۆنی بۆ ئارام ئەمینی وەرگێڕمان ڕەوانەکردو بە سوپاسەوە ئەویش لە کاتێکی کەمدا وەریگێڕاو هەر بە پۆستی ئەلیکترۆنی بۆی ناردینەوەو وا لێرەدا دەقی وەرگێڕانەکەیتان پێشکەش دەکەین- ئامادەکاری دۆسییە)).

ساڵی ( ١٩٨٧) لە خانەی زانستی (ناوکا) لە مۆسکۆ کتێبێك بڵاوبۆوە بەناوی (یەلماز گۆنەی) کە حسینۆڤی ڕۆژنامەنوس و سیناریستی سینەمایی ئازەربایجانی نوسیبووی. کتێبەکە بە گشتی چاوپێکەوتنێکی قۆناغ بە قۆناغی درێژبوو لەگەڵ سینەماکاری کوردی[1] کۆچکردوو (یەڵماز گۆنەی)، کە ئەوکات لە زینداندا بوو. دوای چاپ بوونی ئەو کتێبە کە نیازم بوو وەری بگێڕمە سەر زمانی عەرەبی، هەر بەڕاستیش دەستم دایە وەرگێڕانی، بەڵام بەهۆی چەند هۆکار و هەلومەرجێکی تایبەتەوە دەستم لێهەڵگرت، گەرچی کتێبەکە زۆریش گەورە نەبوو. بەهەرحاڵ ئەوکات ئەوەی وەرم گێڕابوو لە گۆڤاری (الاغتراب الادبی) بڵاوم کردەوە، ئەو گۆڤارە لە لەندەن دەردەچوو. نەمتوانی درێژە بە وەرگێڕانەکە بدەم، بەهۆی ماڵ گواستنەوە و هاتوچۆوە کتێبەکەم



وون کرد. ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە ئەوەی لەو چاوپێکەوتنە وەرم گێڕابوو دووبارە لە (تیرێـژ) و لە بەشی (سینەمای کوردی)یدا بڵاوی دەکەمەوە، ئەوەش لەبەر دوو هۆکار:

یەکەم: ئەرشیڤکردنی هەموو ئەو بەڵگەنامە و هەواڵ و لێکۆڵینەوە و دەقانەی کە پەیوەندییان بە سینەمای کوردییەوە هەیە، بەشێوەیەك ئەو بەشە وەك (بانکێکی زانیاری) لێبێت تایبەت بە سینەمای کوردی.

دووەم: بۆ ئەرشیڤکردین هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە یەڵماز گۆنەیەوە هەیە، تا لە زمانی خۆیەوە ئاشنای ژیانی ببین. بێ تەفسیر و تەئویل و پشێوی زانیاری لەو بارەوە، بەتایبەت ئەو بەشەی کە وەرم گێڕاوە تایبەتە بەو بابەتەوە. نازانم چ خوێندکار و مامۆستایەکی کورد هەیە ئەوانەی لە روسیا خوێندوویانە و پەیوەندییان بە سینەما و ئەدەب و رۆژنامەگەرییەوە هەیە تا ئەم کتێبە وەربگێڕنە سەر زمانی کوردی، چونکە بەم کارەیان خزمەتێکی زۆر بە کلتور و هونەری کوردی دەکەن.

**** ناوی تەواوت چییە؟***

– یەڵماز حەمید، دایکیشم ئۆگلو بیتۆن.

**** کەی و لە کوێ لەدایك بوویت؟***

– لە یەکی نیسانی ساڵی (١٩٣٧) لە گوندی (ئینجە) کە (٢٧) کیلۆمەتر لە شاری (ئەزنە)وە دوورە.

**** بۆچی هەندێ کەس دەنووسن ئەتۆ لە ساڵی (١٩٣١) لە دایکبووی؟***

– بەهەڵەدا چوون.

**** تکایە بە وردی باسی سەردەمی منداڵی و دامێنانەکانتمان بۆ بکە؟***

– دایك و باوکم کوردن. دایکم لە خانەوادەیەکی زەنگینبوو، دوای هێرشی هێزەکانی قەیسەری لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا خێزانەکەیان هەڵاتوون. بە پێچەوانەوەش باوکم لە بنەماڵەیەکی هەژار و نەداربووە،



لە گەنجیدا ناچاربووە لە ترسی تۆڵەی عەشایری کەس و کارەکەی بەجێ بێڵێ. دواجار لە (ئەزنە) یەکتریان بینیوە و ژیانی هاوسەریان پێکهێناوە. لەبەر ئەوەی نە پارە و نە زەوییان نەبووە ژیانێکی تاڵ و دژوار ژیاون. بەڵام دواجار بەخت بە رووی باوکمدا پێدەکەنێ و دەبێتە تێبینەر لە کۆمپانیای دەرەبەگێکی گەورە، ئەوەش کاردانەوەی دارایی گەورەی بەسەر خێزانەکەوە دەبێت.

سەردەمی منداڵیم تاکو حەوت ساڵان سەردەمێکی بەختەوەر بووە، تا ئەوکاتەی باوکم ژنی دووەمی هێنا. لەو رۆژەوە ژیانی خێزانیمان ئارامی بەخۆوە نەبینی و بوو بە دۆزەخ. باوکم هەمیشە دەکەوتە وێزەی دایکم و جاروباریش لە ماڵ وەدەری دەناین. لەو ماوەیەدا خوشکێکم هەبوو دوو ساڵ لە خۆم بچوکتر بوو، ناوی (لەیلا) بوو، لەبەر دەرگای ماڵەکەمان دار توویەك و دوو داری هەنجیر هەبوو، کاتێك باوکم لە ماڵ وەدەری دەناین لە ژێر سێبەری ئەو درەختانە پاڵ دەکەوتین.

جارێکیان هەرسێکمان بەرەو شاری (ئەزنە) چووین، لەو شارە ئامۆزایەکی دایکم هەبوو، بەدرێژایی رێگە دایکم دەگریا و گۆرانی خەماوی کوردی دەچڕی. گەرچی من و خوشکەکەم ئەوکات زمانی دایکمان بەباشی نەدەزانی، کەچی تەماشامان دەکرد و فرمێسکمان دەباراند. ئەوکات وام بیر دەکردەوە کە کڵۆڵی و نەهامەتیەکانمان کۆتاییان نایە، حەزم دەکرد بمرم نەك ببینم دایکم ئازار دەکێشێ، ئینجا دەستم دایە کارکردن، گەرچی هێشتا منداڵبووم. لە وەرزی چنینەوەی میوەجاتدا لە کێڵگەکاندا کارم دەکرد یا چینەوەی پەموو و کۆڵکێشیم دەکرد (دواتر یەڵمەز گۆنەی فیلمێکی لەمەڕ تۆڵەسەندنەوەی عەشایەری و کرێکاری پەموچنینەوە بەرهەمهێنا. و.ع). هەر لە گونددا تاپۆلی سێیەمی سەرەتاییم خوێند، دوای گەیشتنمان بە (ئەزنە) خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییشم تەواوکرد، کارم دەکرد و دەیشم خوێند. لەسەرەتادا لەسەر شەقام گێلاسم دەفرۆشت، جا رۆژنامە فرۆشتن، پاشان سەوزە و میوە فرۆشتن. تا سەرەنجام هەروەك ئیشپێکەری ئامێری سینەما لە کۆمپانیاکاندا کارم کرد لەسەرەتادا لە کۆمپانیای (ئاند فیلم) کە ستۆدیۆیەکی سینەمایی و خانەی نیشاندان بوو دەستم پێکرد.

دوای ئەوە چوومە کۆمپانیای (کەمال فیلم)، گونداوگوند دەگەڕام بۆ پیشاندانی فیلمەکان، هەروەها وەکو کۆمبارسیش رۆڵم دەبینی، دەتوانم بڵێم بەم شێوەیە هاتمە نێو جیهانی سینەماوە (لێرەدا یەڵمەز خەندەیەك دەکات).

**** دواتر لەکوێ خوێندت؟***

– ساڵی (١٩٥٦) لە زانکۆی ئەنقەرە چوومە کۆلێژی یاسا، بەڵام تەنها دوو مانگ بەردەوام بووم، چونکە بێ کاربووم، دیارە دەبوو بژیم و هاوکاری خێزانەکەشم بکەم کە ئەوکات بووبووین بە چوار برا و دوو خوشك. بۆیە ناچاربووم بگەڕێمەوە بۆ (ئەزنە) و راستەوخۆ لە کۆمپانیایەکی بەکرێدانی فیلم کەوتمە سەر کار. لە کۆتایی ساڵی (١٩٥٧) هەر لەسەر ئەوکارە گەیشتمە ئەستەمبوڵ بۆ بنکەی سەرەکی نوسینگەی کۆمپانیای (خانەی فیلم). ساڵی (١٩٥٨) چوومە کۆلیژی ئابووری زانکۆی ئەستەمبوڵ، بەڵام نەمتوانی خوێندن تەواو بکەم، چونکە ساڵی (١٩٦١) بۆ یەکەمجار دەستگیرکرام. دوای ئەوە هەر بۆ خۆم درێژەم بە خوێندندا، زۆرم خوێندنەوە و لە زانکۆی ژیاندا وانەم خوێند.

**** چۆن هاتیە نێو جیهانی هونەرەوە؟***

– بەر لە هەموو شتێك من قەرزاربار و منەتباری دایکم و باوکمم، زۆر راشکاوانە دەڵێم، گەرچی هەمیشە باوکم دایکمی ئازار دەدا، بەڵام زۆری منداڵەکان خۆشدەویست، بەتایبەت من کە نۆبەرەبووم، چی پارەی هەبوو بۆ درێژەدان بە خوێندنی منی خەرج دەکرد. باوکم و دایکیشم دڵفرێنترین و خەماویترین گۆرانی کوردییان دەچڕی. باوکیشم سەنتوری دەژەنی.

خێزانەکان لە جەژن و یادی لەدایکبوون و بوك گواستنەوە و بۆنەی تردا داوەتیان دەکرد و ئەویش منی لەگەڵ خۆی دەبرد، من زۆر چێژم لە گۆرانی و

ژەنینەکانی وەردەگرت. بەڵام دایکم شەوانی درێژی زستان حەکایەت و چیرۆك و ئەفسانەی کوردی بۆ دەوتین،ماڵەکەمان پڕبوو لەو دراوسێیانەی ئامادەبوون تا بەیانی گوێ رادێرن بۆ ئەو چیرۆکانەی دایکم. ئەوکات دەمویست کۆی ئەو چیرۆك و سەرگوزشتانە بنوسمەوە، لێ ئەوکات لەو کارەدا باش نەبووم. لە گوندەکەشماندا پیرە پیاوێك هەبوو بەناوی (یەعقوب) زۆر لێهاتووانە گۆرانی دەچڕی و سازی دەژەند و شیعر و گۆرانی دەوت. من و ئەو بووین بە هاوڕێ، زۆری خۆشدەویستم، ئەو فێری کردم چۆن شیعر دابنێم، لە تەمەنی سێزدە ساڵاندا و بۆ یەکەمجار چوومە نێو جیهانی سینەماوە. لە تەمەنی چواردە ساڵیدا وەك باسمکرد داگیرسێنەری ئامێری نیشاندانی فیلم بووم، پاشان وەکو کۆمبارس کارمکرد، ئا لێرەدا ژیانم وەرچەرخانی بەسەرداهات.



*** کەی و چۆن دەستت دایە نووسین؟**

- لە ساڵی دووەمی خوێندنی ئامادەییدا چیرۆکێکم بۆ بڵاوکراوەیەکی دیواریی نووسی لەمەڕ جوتیارێکی هەژار کە ژنە نەخۆشەکەی دێنێ بۆ شار و هیچ پارەیشی پێ نابێ، ئینجا دەچێ بۆ لای پزیشکێکی پەلەوەر بۆ چارەسەرکردنی کەڵەشێرەکەی، چونکە کەڵەشێرەکەی لە ژنەکەی پێ گرنگتربوو، بەڵام کاتێك پزیشکەکە دەزانێ پارەی پێ نییە، هەرسێکیان وەدەردەنێ (جوتیارەکە و ژنەکەی و کەڵەشێرەکە). (دواتر یەڵماز فیلمی رانەمەڕ)ی دەرکرد، کە باس لە جوتیارێك دەکات ژنە نەخۆشەکەی دێنێ بۆ شار، بەڵام بە رووداوی زۆر تراژیدیترەوە. و.ع). بە تۆمەتی چەپباوەڕی ئەو چیرۆکە بڵاونەکرایەوە، گەرچی ئەوکات من نەمدەزانی چەپ بوون مانای چییە.

ساڵی ١٩٥٣ - ١٩٥٤ دەستم دایە نووسینی وتار و کورتە چیرۆك و دەمناردن بۆ رۆژنامە لۆکاڵی و دەوڵەتییەکان. لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٥٤) وتار و چیرۆکەکانم لەسەر لاپەڕەی ژمارە تایبەتییەکانی رۆژانی یەکشەممە بڵاودەکرانەوە، تا کۆتایی ئەو ساڵە بەرهەمەکانم لە گۆڤارەکاندا بڵاودەکردەوە. گرنگترین چیرۆك کە ئەوکات بۆیان بڵاوکردمەوە لە ژێر ناوی (مەرگ بانگم دەکات) بوو کە باسی لە خۆشەویستی جەرگبڕی دوو جوتیاری هەژار دەکات، گەنجەکە ناتوانێ کاربکات و ئایندەی خێزانەکەی دابین بکات، خۆشەویستەکەی خۆی دەکوژێ و تەنها جێی دەهێڵێ و نامەیەکی بۆ جێ دێڵێ و تیایدا دەنووسێ (**بۆچی کوشتمت، دەمویست بژیم تا خۆشبووێی**)، هەروەها چیرۆکی (کۆتاییەك بۆ سوکایەتی پێکردن نییە)، ئەم چیرۆکە باس لە کەسێك دەکات کە سۆراخی کار دەکات، لەو سۆراخەشدا بەرگەی سوکایەتی بێ ئەژمار دەگرێ، سەرەڕای ئەوانەش کاری وەچنگ ناکەوێ و ناچار لەسەر پردێکەوە خۆی دەهاوێژێتە رووبارەوە. هەردوو ئەو

چیرۆکە ساڵی (١٩٥٦) لە گۆڤاری (ئایینی ئۆمولار – ئاسۆی نوێ) بڵاوبوونەوە. بەڵام پڕ کێشمەکێشترین چیرۆکم، چیرۆکی (سێ هۆکاری نایەکسانی کۆمەڵایەتی)بوو کە لە گۆزڤاری (توێژینەوە هونەرییەکان –ئۆنۆج – ژمارە ٣١) بڵاوبووەوە. ئەو چیرۆکە بوو بە قۆناغێک لە ژیانمدا، کاردانەوە و رەنگدانەوەی بەدرێژایی ژیانی داهاتووم دیار و بەرچاوبوو. بۆیە کاتێک ساڵی (١٩٥٧) هاتم بۆ ئەستەمبوڵ پتر لە سێ وتار و چیرۆکی بڵاوکراوەم هەبوو، هەر ئەوکات هاورێکانم یەکەم نازناوی (یەڵمازی چیرۆکنوس)یان پێ بەخشیم.

**** دەکرێ ئەگەر بەکورتیش بێ باسی ئەو چیرۆکەنام بۆ بکەی، چونکە من هەرگیز ئەو گۆڤارەم نەبینیوە کە ئەو چیرۆکەی تیا بڵاوبۆتەوە؟***

– هەرگیز نایشبینی، چونکە رووناکی نەبینی، سانسۆر دەست بەسەری کرد، هەموو کۆپییەکان بە ژێر مەقەس و چەقۆدا تێپەردەبوون. بەڵام چیرۆکەکە لەمەڕ نایەکسانی کۆمەڵایەتی بوو لە وڵاتدا، یەکێک کار دەکات و ئەوی تر دەیچنێتەوە. یەکەمیان وەکو مرۆڤی سەرەتایی لە کلۆڵی و چەرمەسەریدا دەژێت و دووەمیان بروانامەی باڵا و دەستەبەری تەندروستی و ژیانێکی خۆشگوزەران بەدەست دێنێ و هەوڵدەدات بەهۆی پارە و ئایین و داب و نەرێتەوە ئەوی تر کۆنترۆڵ بکات. دیارە رووداوەکان لە واقیعەوە وەرگیرابوون، بەڵام ئەوکات بە کۆمۆنیست تۆمەتبار کرام.

**** رۆمانەکانت و زۆرێک لە چیرۆکەکانتم خوێندوونەتەوە و فیلمەکانیشتم بینیوون، زۆرباشیش زەمینە و باکگراوندی سیاسیت شارەزام، بەڵام دەکرێ ئەو شتانەی تر بزانم کە کاریان کردۆتە سەر هۆشیاری و رۆشنبیریت؟***

– ژیان، ئەو ژینگەیەی تیایدا گەورەبووم. لە منالیمدا هەستی کوردایەتیم نەبوو، دەوروبەرەکەم بە تورکی دەدوان، لێرەوە دووبارە دەیڵێمەوە من ئەوکات زۆر خراپ بە زمانی دایکم کە زمانی کوردی بوو دەدوام.

دوژمنایەتی نێوان گەڕەکە کوردی و گەڕەکە تورکەکان. یا تێڕوانینی دوژمنکارانە دژی کورد و نەتەوەکانی تر زۆر بە ئاشکرا دیاربوو. ئەو رەوشە هەستی خۆشەویستی کوچەبەرانی تیا تەقاندمەوە. لە کاتی یاریکردنم لەگەڵ منالە دەوڵەمەندەکاندا کە ئەوکات من منالیشبووم، تێگەیشتم جیاوازی چینایەتی مانای چییە.

هاوینان دایکم لەگەڵ باوکم لە کڵێگەکەمان کاریان دەکرد. لە زستانیشدا وەکو خزمەتکار لە ماڵە زەنگینەکاندا کاری دەکرد، دواجار ئەو خواردنەی لەگەڵ خۆی دەهێنایەوە کە هێشتا تێك نەچووبوون. بەڵام لەگەڵ تێپەڕینی رۆژگار تێگەیشتم ئەو هەلومەرجە زۆر سوکایەتیپێکەرە، جا ململانێی ئەو هەستە زەلیلیەم دەکرد کە لە قوڵایی دەروونمدا هەبوو.

لە رواڵەتدا پەیوەندی نێوان دەرەبەگ و جوتیار لەسەر بنەمای دیموکراسی دامەزرابوو، جوتیار قاوەی دەخواردەوە و دەرەبەگیش هەروا، لەرووی یاسا و لەرووی کۆمەڵایەتیەوە هەردووکیان بەتەواوی یەکسان بوون، بەڵام چەوساندنەوە و ستەم بەو یەکسانییە کاریگەر نەبوو.

باوکم هەمیشە خەونی بەوەوە دەبینی من درێژە بە خوێندن بدەم، دەیگوت: (کوڕم بڕۆ بۆ قوتابخانە و فێر ببە، تا وەکو ئێمە نەبینە کۆیلە)، بەڵام ئەو تێنەدەگەیشت لە کۆمەڵگەی بورژوازیدا دەشێ خوێندەواریشبی و کۆیلەش بیت.

سەرچاوە: ماڵپەری هونەری جیهانی- ژیاننامەی کەڵە هونەرمەندانی جیهانی.

**پەراوێزەکان:**

١– دیارە لەگەڵ وشەی (سینەماکای کوردی) کۆچکردوو وشەی تورکیش بوونی هەبوو بەم شێوەیە (سینەماکاری کورد – تورکی کۆچکردوو)، بەڵام لەبەر ئەوەی کوردبوونی یەڵماز گونەی هیچ گومانێک هەڵناگرێت، بۆیە ئێمە دەستکاریمان کرد و وشەی (تورك)مان لێی کردەوە– ئامادەکاری دۆسیە.

# ( 4 ) هەر کورد پێویستی بە یەڵماز گونا هەیە؟

## رۆبن هۆکار وەرگری خەڵاتی ئۆسکار

و. لە ئینگلیزییەوە: سنوور

دەرهێنەرو ئەکتەری سینەمای ئەمریکایی رۆبن هۆکار وەرگـری خـەڵاتی ئۆسـکار، لـە ماڵپـەڕی تایبـەتی هەفتەنامەی دەیلی هۆلیۆد وتارێکی ٦ لاپەڕیی لەبارەی پێویـست بـوونی سـینەمای سـەردەم بەکەسـایەتییە سینەماییەکانەوە نووسیووەو ئەو وتارە بەپێی نزیکەی ٦ کاتژمێر لەسەر رووپەڕی سەرەکیی ماڵپەڕەکە مایەوە و پاشـانیش چـووە بەشـی ئەرشـیڤی ئـەو ماڵپـەڕەوەو بۆماوەی ٤ هەفتە لەوێشدا مایەوە. لەو وتـارەدا نووسـەر لـە نزیـک کۆتـایی لاپـەڕە ٣ تـا ناوەراسـتی لاپـەڕە ٥ هاتووەتـە سەرباسـی گـەورە هونەرمەنـدی کـورد یـەڵماز گونای و لەوێدا چەندین ئاماژەی گەورەو بچووکی داوە. ئەمـە وێـڕای ئـەوەی کـە نووسـەر، دوای تـەواو بـوونی باسی هونەرمەندێکی دیکەی پێش گونای نووسیویەتی (نۆرەی ئیمپراتۆرێکی دیکەی سینەمایە کە لە تورکیا لە دایـك بـووەو لـە پـاریس کۆچـی دوایـی کـردووە رەگەزنامـەی تورکیـای هـەڵگرتووەو بـەڵام لایەنـە نەتەوەییەکـەی قسەی جۆراوجۆر هەڵـدەگرن)، ئێمـەی ئامادەکارانی ئەم دۆسییەیە بەباشمان زانی دەقی ئەو بەشەی وتارەکەی هۆکار وەك خۆی وەرگێڕینە لەسـەر زمانی کوردی و هیچ پەراوێز و قسەیەکیشی لەبارەیەوە بۆ زیاد نەکەین.

(یـەکێکی دیکـە لـەو کەسـایەتییانەی کـە مـن پێموایـە لەسەردەمی ژیانی خۆیدا من چەند جارێك ناوونیشانیم بیـستووەو ئەوەنـدەیـشی لەبارەیـەوە خوێندومەتـەوەو زانیـاریم کۆکردۆتـەوە ئـەو هونەرمەنـد و دەرهێنـەرە بە نەتـەوە (کـورد)ەو رەگەزنامـەی تورکییـە، بـەڵام ئەگـەر لـەبارەی سینەما و پـرۆژە سـینەماییەکانی ئـەو کەڵـە



هونەرمەندەوە بدوێین کە یەکێکە لە وەرگرانی خەڵاتی کان، پرسیارێك دێتە پێشەوە کە ئەویش ئەوەیە ئایا هەر کورد پێویستی بە یەڵماز گونا هەیە، رەنگە ئەوەش قسەی جۆراوجۆر هەڵبگرێت، دیارە هەبوونی کەسایەتی سینەمای نەتەوەیی پێویستەو بۆ ئاستی مرۆڤایەتی و ژیاریش پێویستییەکی دیکەی لەپێشە، چونکە ئێمەی هونەرمەنـدانی بـواری سـینەما تـەنها ئـەوەمان بـۆ شـانازییە تاچـەند بـە تـەنگی کێـشەکانی دەوروبەرمانەوەین و ئەو سیناریۆیانەی کە دەچنە نێو فیلمەکانـەوە و وێنە دەکرێت بە بەرگیانـدا، تاچەند لـە راسـتییەکانی دەوروبـەرمان دەدوێـن، ئـەو جـۆرە

کەسایەتیانەش، هەموو کاتێك و لە هەموو شوێنێك و لەناو هەموو نەتەوەیەك هەڵناکەون، بۆیە من لەسەر ئەو بڕوایەم کە تەنها کورد پێویستی بە یەڵماز گونەی نییە. شەپۆلەکانی سینەمای جیهان هێندە بە توندی دێن و دەگەڕێنەوە، ڕەنگە لەوکاتەی کە دەگەڕێتەوەش هێشتا هەندێك لە شوێنەوارەکانیمان بۆ دەرنەکەوێت و نەزانین ئایا ئەو شەپۆلانە لەپێناو دیاربوون و هەستکردن بە بوونی ئاوە یان نیشاندانی هێزێکە لە نەرمترین بوونەکانی سەر ئەم زەمینە، دیارە ئەوەیش کە دووپرسیارە لە پەرەگرافێکدا، بێگومان دوو وەڵامیش هەڵدەگرێت، بەسەرهات و بەشێك لە ژیان و فیلم و ڕۆڵ بینینەکانی یەڵمازیش وەهایە، ئەو کەسێکە مرۆڤەو پێویستی بە مافی خۆیەتی، بەڵام چەند و چۆن و لە کوێ و کێ دەبێت ئەو هەقەی پێ بدات لە پێناوی دەرهێنانی فیلمێکی سینەماییدا ڕێگەی هەزاران میل نەبڕێت بۆ ئەوەی بگاتە جێگایەك بۆ ئەوەی تەنها تیایدا ئازاد بێت.

ئەگەر جارێکی دیکە سینەمای جیهان ناسنامەکانی خۆی دابەش بکاتەوە، دیارە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتانێکی وەك تورکیا بە تایبەتی ڕەنگە چەند کەسانێك ناسنامەکان وەربگرن، لەنێو ئەو چەند کەسانەدا تەنها یەك کەسایەتی بۆی هەیە شانازی بەو ناسنامەیەوە بکات، ئەویش بەهۆی ئەو نەبەزینەی لە پرۆژە سینەماییەکانییەوە دیارن، ڕەنگە ئەو کەسە ئێستاکە تەنها مابێت ناوەکەی بێت کە ئەوەتا بەو وەسفکردنەی پێشتر ڕێك دێتە بەرچاوتان ئەویش گونایە، چونکە ئەو ڕێگایەك لە ڕێگاو جوانییەك لە جوانیدا دەبینێتەوەو لەبەرامبەردا دانایانە نووسینی سیناریۆیەك دەبەخشێتە پرۆژە جیهانییەکانی سینەما، کە سەرەنجام بابەتێکەو دووبارە بوونەوەی نییە. بۆیەش من ئێستاکەو بۆ بەڵگەیەکی مێژوویی دەڵێم کە ئێمەیش لە خۆرئاوا پێویستمان بە کەسێکی وەك گونای هەیە.

سیاسیەت بووە بە پرۆژەیەکی وەها بێزلێکراو زۆرن ئەوانەی کە پرۆژە هونەرییەکانیشیان بەهۆیەوە لەدەستداوە، نمونەی زەقی ئەو بووارەش یەڵمازە.

ئەگەر پرسیارێك بکرێت لەبارەی ویستی بەرهەم و دانانەکانی ئەو هونەرمەندە بەلامانەوە سەیر دەبێت. دەسەڵات هێندە بە نامۆیانەو وەك شتێك کە پێشتر نەیبیستووە وەها هەڵسوکەوت دەکات، ڕەنگە ئەوەیش سەیر نەبێت ئەگەر بڵێم ئەگەر جارێکی دیکە یان یەڵماز زیندوبێتەوە (نا زیندونابێتەوە)، بەڵام ئەگەر کەسێکی دیکە وەك یەڵماز دروست بێت و بەهەمان ئامانج و لێکدانەوەکانی ئەو لە تورکیای ئەمڕۆدا کاربکات، ئاخۆ دەسەڵاتی تورکیا لەئاست بابەتە هونەری و هونەرەکانی سینەمادا هەمان ڕەفتارەکانی دووبارە دەکاتەوەو ئامارژە بۆ ئەوەش دەکات کە ئەوان پێویستیان بەو جۆرە هەڵکەوتنانانە نییە. ئەمەش پرسیارێکەو وەڵامەکەیشی لە لای عەقڵییەتی دەسەڵاتی تورکیایە.

دیارە باسکردن و گەشەدان بە باسەکانمان لەبارەی کەسایەتییەکانی سینەماو پێویست بوونی ئێمە بۆ ئەو جۆرە کەسایەتییانە، بابەتێکی حەتمییەو لیستێکیش بوونی هەیە کە جۆرەها کەسایەتی لە خۆی دەگرێت. لەنێو ئەو کەسایەتییانە جێگاو پێگەی یەڵماز گونایش بوونی هەیە، ئەویش نەك لە ڕوانگە نەتەوەییەکەیەوە!، بەڵکو لە ڕوانگەی گرنگیدانەکانی بە گرنگی پەیامی سینەما و بڵاوکردنەوەی هۆشیاری و تێگەیاندن لە ڕێگەی شاشەیەك و دانیشتنی چەند بینەرێك لە بەرامبەریدا.

ویستی ئێمە بۆ هەبوونی سەرباسێك لەبارەی دەرهێنەران بەگشتی و سینەماکاران بەتایبەتی، پێویست بوون و ئاسۆیی هەوڵەکانی، بینین و خوێندنەوەی تازە هەڵدەگرن و ئەوەیش بەقەد ئەوەی کە کاری توێژەرانە، ڕەنگبێ کاری منێکی سینەماکار نەبێت، چونکە ئەگەر ئامارژە بۆ هەر لایەنێك و هەڵوەستە لەسەر هەر باسێکی دیکە بکەم، بێگومان خوێندنەوەی وەهام بۆ دەکەن، کە بچووکترین زیانەکانی شکانەوەی بۆچوونەکانمە بەسەر خۆمدا.

# ( 5 ) یەڵماز گونای ڕێبەری شۆرشی سینەمای تورك...!

م.م. ئـۆغــــان / و. لە تورکییەوە : ئاری ئارامگری




لە ڕۆژانی ١٤ی مانگی مایۆی ساڵی ٢٠٠٩ لە شاری ئەستەنبوڵی پایتەختی دووەمی وڵاتی تورکیا، نووسەری بەناوبانگ و ڕەخنەگری تورك (مم. ئۆغان) لە گۆڤاری تورکیا سینەماییدا، وتارێکی ٨ لاپەڕیی بڵاوکردۆتەوەو لەوێدا ئاماژە بۆ چەند لایەن و بابەت و باسێکی گرنگی نووسەرو هونەرمەندی گەورەی نەتەوەییمان (یەڵماز گونای) دەکات، لەو وتارەدا ئەو نووسەرە بەبێ هەستڕاگرتن لە ویژدانی خۆی بە دەیانجار ناوی یەڵماز گونەی وەك هونەرمەندێکی تورك ناوی هێناوەو وشەی نەتەوەی تورکی خستووەتە پاڵ، دیارە ئەو نووسەرە ئەو وتارو دیمانانەی نەخوێندۆتەوەو نەی بیستووە کە دەیانجار یەڵماز بە دەمی خۆی دەڵێت من (کوردم)، بەلاّم ئێمە بەهۆی گرنگی بەشێکی نووسینەکە کە خۆی لە خۆیدا دانپیانانییەتی کە یەڵماز گونا چی بووە، بۆیەش وتارەکەمان وەرگێڕایە سەر زمانی کوردی و لە هەر شوێنێکی نووسینەکەیشدا پێویست بووبێت بە پەراوێز و ڕوونکردنەوە ئێمە خۆمان لێنەداوە چونکە هەندێك سەرەداوی وەها وروژێنراون جگەلەوەی کە زیان بە خودی نەتەوەی تورك دەگەیەنێت، لەبەرامبەریشدا پێویست بە هیچ ڕوونکردنەوەیەکیش ناکات، (م.م. ئۆغان) لەو بەشەی نووسینەیدا کە ئێمە وەرمانگێڕاوە باس لە بەرپابوونی شۆرشێکی سینەمایی دەکات و نووسەر یەڵماز گونای وەك پاڵەوان و ڕێبەری شۆڕش

ناو زەد کردووە لەوێدا نووسیویەتی (لەو دوادواییانەی ساڵەکانی ناوەراستی سەدەی رابردوو کە دەکرێت لە ۳۰یەکانەوە ئەژمار بکرێت و ئاماژە بۆ هەندێك هەوڵی ناساندن و بەربڵاوبوونی زیاتری سینەمای تورکی بدرێت، ئەوا لە ٦۰یەکانەوە ئەو هەوڵانە چڕتر بوونەوە تا گەیشتە ئەوەی شۆرشێك بەرپا ببێت، بەڵام لەسەرەتادا ئەو شۆرشە هیچ رێبەرێکی نەبوو تا سەرەنجام یەکێك لە تورکە لە خۆبووردووەکانی قاڵبووەوەی ناو بوواری سینەمادا بەناوی (یەڵماز) توانی شەرەفی رێبەرێتی ئەو شۆرشە وەربگرێت، بۆیە ئێمە وای بە پێویست دەزانین لە دەرفەت و داهاتوویەکی نزیکدا تەرمی یەڵماز لە وڵاتی غەریبایەتی بگەڕێنرێتەوە خاکی تورکیا و لە زێدی باب و باپیرانیدا بۆ تا هەتایە ئارامبگرێت.

ئەوە من نیم کە ناسناوێکی وەها دەدەمە پاڵ یەڵماز بەڵکو بە بڕوای زۆرێك لە نووسەران و پسپۆرانی سینەمای تورکیا و جیهانیش کاتێك ناسنامەی تورکیایی لەبەرباخەڵی یەڵماز دەبینن، رێك ئەو بڕیارە دەدەن کە یەڵماز گونەی رێبەری شۆرشی سینەمای تورکییەو ئەوەندەی ژیا بۆ سینەما ژیاو ئەو کاتەیشی کە مرد، لە پێناوی سینەمادا مرد).




لە بەشێکی دیکەی نووسینەکەیدا م.م. ئۆغان لەبارەی ئەو شۆرشەو تایبەتمەندییەکانی سەرکردەکەی نووسیویەتی (دیارە بەهۆی ئەوەی کە لە ساڵانی ناوەراستی سەدەی رابردوو هۆکاری تازەیی لە پێکەوە ژیانی پێکهاتەکانی ناو خاکی تورکیا. بۆیەش تا نزیکەی کۆتایی سێیەم چارەکی سەدەی رابردوو کۆمەڵێك کێشەی کۆمەڵایەتی لەناو تورکیادا سەریان هەڵدا، کە دوای ئەوەیشی پەرە بە سینەما درا، وەك پێویست کاری لەسەر نەکرابوو، بەڵام کاتێکیش سەرکردەکەی کە (یەڵماز)ە بە بێ گوێدانە دەرەنجامەکانی کە رەنگە وەك پەرچە کردارێك لەو هەوڵە بکەوێتەوە، کاری لەسەر زۆرینەی هەرە زۆری رووداوە کۆمەڵایەتییەکانکردو لە زۆر لاشەوە بووە هۆی چارەسەرو نەهێشتنی ئەو گرفتانە).

## (6) محەمەد ئەکتاش :

# یەڵماز گونای خاڵی دەستپێکی سینەمای کوردییە!




له دیمانەیەکی تایبەتیدا محەمەد ئەکتاش دەرهێنەری بەناوبانگی کورد ئاماژە بۆ هەوڵو ماندووبوونەکانی هونەرمەندی خۆشی نەدیو یەڵماز گونای دەکات و لەوێدا چەندین نمونە دەهێنێتەوەو لە وەڵامی پرسیارێکیشدا کە ئێمە کردوومانەتە یەکەم پرسیارو یەکەم وەڵام باسی ئەوە دەکات کە یەکەم خاڵی دەستپێکی فیلمە سینەماییە کوردییەکان، ئەو فیلمانەن کە دەرهێنەر یەڵماز گونای دەریهێناون، بەڵام جارێکی دیکە وشەیەکی زۆر نارەوا بە گیان و ڕۆح و ویستی یەڵماو نووسێنراوە کە ئەیوش تورك بوونە، بەراستی سەیرە کە ڕۆژنامەوانی ئەو دیمانەیە دوور لە هەر پرەنسیپێکی ئەخلاقی هەڵساوە وشەی تورکی داوەتە پاڵ یەڵماز گونایەوە.

دیارە ئەو دیمانەیەی لەگەڵ محەمەد ئەکتاشدا کراوە دوورودرێژەو لە زۆر شوێندا باس لە کاروبەرهەم و کێشەکانی سینەمای کوردی دەکات و ڕێك دەپرژێتە سەر باسەکانی ئەمڕۆی سینەمای کوردی، بەڵام تەنها پرسیارێك کە پەیوەندی بە یەڵماز گونایەوە هەیەو ئێمەش بەلامانەوە گرنگە چونکە ئەم دۆسییەیە تایبەتە بە گونای بۆیە تەنها پرسیارو وەڵامی ئەو پرسیارەمان وەرگێڕاوە.

* - بەڕای بەڕێزتان لەکەیەوە سینامەی تایبەتی کورد لە دایك بووەو کاری تێداکراوە؟

- دیارە یەکەم خاڵی دەستپێکی سینەمای کوردی لە لای یەڵماز گونایەوە دەستی پێکردووەو بەتایبەتی کارە کۆتاییەکانی بەتایبەتیش فیلمنی ڕێگا لە ساڵی ١٩٨١ بەرهەم هاتووە، لەوێدا یەڵماز زمانێکی تایبەتی هەبوو کە پرۆسە سیاسییەکان لە ڕێگەی هونەرەوە دەستیان پێدەکرد، ئەوەش بووە هۆی دروستبوونی سینەمای کوردی.



(7) سەبری پار چین :

# توركیا كەسی هەیە لەجیاتی گونای

وەرگێرانی : ئاری ئارامگری



رەخنــــەگری ســــینەمایی سـەبری پارچین لـە ولاتـی نەمسا وتـارێكی لـەبارەی زۆروســـتەمەكانی توركیـــا نووســـیوەو ئامـــاژە بـــۆ راوەدوونانی هونەرمەندان و نووسـەرانی توركیـا دەكـات لـە تـری دەسـەلاتی توركیـا، لـــەم وتارەیـــدا بەتایبـــەتی باسی یـەڵماز گونای دەكات و دەڵێت (ساڵی ۲۰۰۵ ساڵ رۆژی كۆچی دوایـی یـەڵماز گونای بوو، كە سەرۆكی توركیام لە ولاتێكی ئەورووپی بینی لێم پرسی ئێوە بۆچی رێز لە كەسایەتییە هونەری و ئەدەبییەكانی خۆتان نانێن، ئەویش پێی گوتم بۆچی، منیش گوتم بۆی دەپرسی یانی كەسێكی وەك یەڵماز گونایتان بیرنایەتەوە، گوتی با، بەلام تازە چی دەكرێت، خـۆ ناكرێـت بەدیارییـەوە دابینیـشین، بـا نـەوەكانمان هـەوڵ بـدەن و بتـوانن شـوێنی بگرنـەوە، منـیش بـەبێ ئەوەی لە چاوسووركردنەوەی پاسەوانەكانی بترسم پێم گوت بۆچی توركیا كەسی هەیە لـەجیاتی یـەڵماز گونای بۆئەوەی شوێنی بگرێتەوە.....

لەســـالانی هەشـــتاكانی ســـەدەی بیـــستەمدا توركیـــا كەسێكی لـە دەستدا كە من پێموایە هـەرگیز كەسێكی دیكە نییە شوێنی بگرێتەوە، ئەوەی دەڵێن و دەكرێت بریتی نییە لە هەوڵدان بۆ ئەوەی سینەما جارێكی دیكە بگەڕێتەوە دۆخەكەی جارانی و رەنگە زۆربن ئەوانەی كە بە ئاواتـەوەن بـۆ جارێكیش بگەنـە سەر تەختـەی كـان، هـەروەك ئـەوەی كـە تائێـستاكە توركیـا بـۆ جـارێكیش نەیتوانیوە خەلاتی كـان وەربگرێت و لـە ئێرانیشدا بەم دواییانـە (عەباسـی كیـا رۆسـتەمی) تـوانی بگاتـە كـان، كەچی ئەوەتا یەڵماز گونای بە تەنها و بەبێ ئەوەی هیچ كەسێك دەسـتی بگرێـت بـەو پـەڕی خـەم و پـەژارەوە گەیشتە تەختەی كان و مەچەكی راستكردەوە، بۆیـەش من زۆر بەرگری لە خۆم دەكەم بەرامبەر ئەو پرسیارەی كە دەڵێن توركیا كەسی هەیە لە جیاتی گونای جارێكی دیكـە بـچێتە سـەر تەختـەی شـانۆی فیـستڤاڵی كـان و خەلات بە دەست بهێنێـت كە هەمیشەیش من بە (نا) بەرگری لە خۆم دەكەم، بریاریشمداوە هەر جارێك ئەگەر بۆم برەخسێ لە گـەورە بەرپرسـەكانی توركیـا دەپرسم ئایا توركیا كەسی هەیـە لـە جیاتی گونای بـچێتە سـەر تەختەی شانۆ؟).



# ( 8 ) سینەما ئەو چەکەی کە یەلماز گونای لە سێرەی سەرکەوتنەوە سەیری دەکرد

هەریەك لە هونەرمەندان سیروان بەهائەدین و بەدرەدینی دەفچی لەبارەی هەوڵ و ماندووبوونەکانی یەلماز گونایەوە باسی ئەوە دەکەن ئەو هونەرمەندە لە خۆیەوە کاری سینەمایی هەڵنەبژاردووەو هەموو کات بیری لەوەکردۆتەوە کە لەکات و ساتی پێویستدا گەراتەوە سەری.

ئەو دوو هونەرمەندە کە دووان بوونە لەو هونەرمەندانەی گوایە بەشێکی زۆری کاروبارە هونەری و سینەماییەکانی یەلماز گونایان هەڵسەنگاندووە، چەند پرسیارێکمان ئاراستە کردن و ئەوانیش بەم شێوەیە وەڵامیان داینەوە:

*- یەلماز گونای چۆن سەیری سینەمای کردووە؟

- دیارە بەلای سینەما ئەو چەکە بووە کە یەلماز گونای لە سێرەی سەرکەوتنەوە سەیری کردووە تا سەرەنجام، ئەگەر نەیتوانیبێت بەهۆیەوە نەتەوەکەیشی رزگاربکات، بەڵام توانی لە سێرەی ئەو چەکەوە نیشانە گەورەکەی بەردەمی بشکێنێت ئەویش گەیشتن بە کان و بەدەستهێنانی خەڵاتی کان.

*- دەکرێت خوێندنەوەیەکی گشتی کرابێت بۆ بەرهەمەکانی یەلماز گونای مەبەستم بەرهەمە سینەماییەکانییەتی؟

- دیارە هەر ئێمە نا بەڵکو زۆرێك لە سینەماکاران و بەرهەم هێنەران و بینەرانی فیلمەکانی یەلمازیش دەتوانن وەڵامی ئەم پرسیارە بە یەك رستەی چەند سەرە بدەنەوەو بڵێن (فیلمەکانی یەلماز گونای (ئەوانەی ئەو تیایاندا دەرهێنەر بووە) فیلمگەلێکی سیاسی ئامێزی لێوانلێو لە هونەرو رەنگدەرەوەی حاڵەت و دیاردەکۆمەڵایەتییەکان و بەدەرخەری راستییە کۆمەڵایەتییە ئاڵۆزەکانی تورکیایە ئەویش بەهۆی ئەو تێکەڵییە نەتەوەییەیەی لەوێدا بوونی هەیە).




*- لە بەرهەمە سینەماییەکاندا تاچەند بیروباوەڕی چەپێتی و چینایەتی بوونیان هەیە؟

- دیارە جگە لە بیروڕای نەتەوەیی و خۆشەویستی و بەرگریکردن لە نیشتیمان هیچ شتێکی دیکە بوونی نییە.

*- رێگەم بدەن دوایین پرسیارم لەبارەی کەسایەتی یەلماز گونایەوە بێت، کە باسی ئەوە دەکرێت کەسێکی رووخاو بووە ئەویش بەهۆی بەر لە بوونی بە دەرهێنەر وەك ئەکتەرێك بەشداری لە چەند فیلمێکی سێکسیدا کردووە، ئەمە تاچەند راستە؟

- دیارە بەهۆی نالەباری رەوشی داراییەوە یەلماز لەسەرەتادا چووەتە ناو ئەو فیلمانەوە، بەڵام پاشانیش لێیان پەشیمان بووە، ئەو پەشیمانییەش رەنگە دادی نەدابێت، بەهەر حاڵ ئەو حاڵەتەی وەك تاوانێك بەسەردا سەپاوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە لە تورکیا هەڵهاتووە لە راپۆرتی گشتیدا بۆ ریسواکردنی یەلماز ئەو فیلمانەو وێنەی یەلمازیش بڵاوکراوەتەوە، دیارە دوای بڵاوکردنەوەیان کاریگەرییان لەسەری هەبووە. بەڵام نەیان رووخاندووە، خۆ ئەگەر بروخابووایە ئەوا نەدەگەیشتە بەرزترین پلەی سەرکەوتنەکانی و ئێستاش لە مێژوودا ناوی وەك ئەستێرەیەکی گەش نەدەمایەوە.

# ( 9 ) ئاوازی سەرکەوتن لەنەغمەی مۆسیقاکانی فیلمی ( گونای )ەوە

س.ج. هۆلمێت لەکاتی چاوپێکەوتنێکیدا لەبارەی ئاوازی فیلمە سینەماییەکانەوە باسی ئەوە دەکات کە میوزیک رۆح دەکات بە بەرفیلمەکانداو بینەر دەدوێنێت و ناهێڵێت دابڕێن.
لەبەرامبەردا کامیران سلڤێتۆڤی سینەماکاری رووسی دەڵێت میوزیک و ئاوازی فیلم تەنها هۆکارێکە جارێکی دیکە ناهێڵێت ئێمە بەردیار فیلمەکانەوە بخەوین و هەموو کات بەئاگامان دەهێنێتەوە.
جۆن ماکیلینی سیناریستیش دەڵێت ئەگەر میوزیک نەبێت و مۆسیقا ژەنەکان نەبن، وێنە لەگەڵ مۆسیقاکاندا تێکەڵ نەبن، بێگومان سیناریۆکانم خۆیان خوێنەران دەدوێنن، بەلام کاتێک میوزیک و وێنەیان لەگەڵدا تێکەڵ دەکرێت، دەبنە فیلمێکی سینەمایی و دەگانە هۆڵەکانی کان و ئۆسکارو ڤینیسیا.
جولیا بێرتیش لە وتارێکیدا لەبارەی گرنگی میوزیک نووسیویەتی کاتێک من گوێم بە میوزیک ئاشنابوو زانیم کە رۆڵەکەی لە هەموو بوارەکاندا گرنگی خۆی هەیە کاتێکیش چوومە ناو سینەما هەستم بە بوونی سینەماکرد چونکە میوزیکی تێدایە.
"پۆلسن یۆمێرد" دەڵێت میوزیک هەستانەوەو جوانکردنی قۆناغێکی گرنگی ژیانی ئێمە پێك دەهێنێت لەکاتی بەرهەم هێنانی فیلمێکی سینەماییدا.
"میرل ستریپ" شانۆکاری و دراماو سینەما و فیلمە نا سینەماییەکان و دۆکیۆمێنتارییەکانیش، بەبێ بوونی دەروازەیەکی میوزیک جگە لەوەی خشپەیان دێت هیچی دیکە نین.
"شانا فێستی" یاریدەدەری دەهێنەرو ئەکتەری چەندان فیلم، لەبارەی میوزیکەوە لە فیلمی سینەماییدا دەڵێت بۆچی دەبێت میوزیک پێمان نەڵێت لە داهاتووی ئەم فیلمەدا چی هەیە و چۆن دەڕوات و کێ دەگاتە ئامانج و لەکوێوە پرۆسەکان یەك دەگرنەوە.



"گارێت هێڵدن"یش لە دیمانەیەکی تەلەفزیۆنیدا باسی ئەوەیکردبوو کە هیچ کاتێك بەبێ میوزیك فیلمی سینەمایی بوونی نییە. بۆیەش واباشترە قۆناغی فیلمە بێدەنگەکان وەك قۆناغی تێستی سینەما بناسێنین و جارێکی دیکە بیر لەوە نەکەینەوە ئەگەر بە تەنها نەغمەی باڵندەیەکیش بێت میوزیك لەناو فیلمەکاندا بدۆزینەوە.
"ئێما ئالتۆن" زانستی میوزیك لەلای هەموو دەرهێنەرێك دەرناکەوێت و کەمن ئەو دەرهێنەرانەی بە جوانی میوزیك دەناسن و دەزانن چەندە گرنگە، کاتێك هەست بە گرنگی میوزیك دەکرێت ئەگەر بێت و بەشێکی یەکلاکەرەوەی فیلمەکە دەنگێکی میوزیکی لەگەڵدا تێپەڕێت و لەدوای ئەکتەرەکانەوە بە قسە بێت.
لەم چەند بۆچوونەی سەرەوەدا خوێندمانەوە کە قسەی جۆراوجۆر لەبارەی میوزیك دەکران و چەندە گرنگی میوزیکیان خستە بەردەممان کە چەندە پێویستە لەناو فیلمێکی سینەماییدا بوونی هەبێت، بەلام ئایا یەڵماز گونای یەکێك نییە لەو دەرهێنەرانەی کە میوزیك دەناسێت، بێگومان بەڵێ، چونکە ئەوەتا لە سەرجەم فیلمەکاندا جۆرێك لە ئاواز و هەتا گۆرانیش بوونیان هەیە. کەواتە رێگای سەرکەوتن و جوانتر کردنی بابەتە سینەماییەکانی گونای پشت ئەستووربوونە بە پەیامە میوزیکییەکان و هیچ کاتێکیش بینەر ئەوەی لە یاد ناچێت چی لە فیلمەکانی گونای گوێ لێبووە.

# ( 10 ) پەیکەری گوناى لەبەردەم هۆلیۆددا



پەیكاریان لەبەردەم هۆلیۆددا بۆ دابنرێت. بائەمجارەیان هۆلیۆد لەدوای ئەوەی نمایشیە فیلمە سینەماییەکانی کۆتایی دێنێت بینەرانی سینەما دوای ئەوەی فیلمێکی سینەمایی دەبینن، چاویان بە ژمارەیەك پەیكەری دیكەیش بكەوێت. ئەو پەیكەرانە شۆڕەسوارەكانی جەنگ و قارەمانەكانی شۆڕش و بلیمەتەكانی سیاسەت و داهێنەرەكانی ئەدەب و لێكدەرەوەكانی فەلسەفەو دارێژەری میتۆدو پایەكانی ماتماتیك نین، ئەوانە هونەرمەندن و سینەماكارو خۆبەختكاری ئەو پرۆژانەن كە بەناوی ئەوانەوە ئێستاكە سینەما دێتە بەرچاو.

ساسا رۆتێنیان– وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە – سنوور

((...... لەبەردەم هۆلیۆددا هیچ پەیكەرێك نابینم و بەلام داوا دەكەین دابنرێت، پەیكەرانێك دابنرێن كە لە سینەمادا قالبوونەتەوەو پەیامی سینەماییان هەبووە، رەنگە ئەوانەی كە بە تەواوی لە سینەماو بۆ سینەما ژیابن زۆر نەبن، بۆیەش من پێموایە دەكرێت ئەوانە

كاتێك ئێمەی هونەرمەندان دەمرین و دەرۆین، هیچ كاتێك و بۆ هیچ شوێنێك بەبێ لێكدانەوەی سیاسەت و جوانییەكانی ئەو رێرەوەی كە رێگایەكە بۆ هەلزنان بە جوانییەكانی رووداوەكاندا، ئەوە تەنها لە شاشەی سینەمادایە، كەسانێك هەموو ژیانی خۆیانیان كردە






قوربانی سینەماو ناوی سینەمایان لەناو دڵیاندا نووسی و بوونە ئەستێرەی ئاسمانی داهێنانی سینەماو جیاکارییەکانی جوانی و ناجوانی لەیەکتری بەو چاوەی کە هەر خۆیان خاوەنین، ئایا قابیلی ئەوەنین پەیکەریان لەبەردەم هۆلیوۆددا بۆ بکرێت؟ ... بەڵێ.

ئەگەر بڕیارماندا پەیکەر لەبەردەم هۆلیوۆدا دابنێین چی بکەین و پەیکەری کێبن. دیارە دوای ئەوەی ئەگەر بڕیارێکی وەها دەدرێت بێگومان مشتومڕیش دەکەوێتەوە لەوەی چەند پەیکەربن و پەیکەرەکان کێبن. دیارە من لێرەوە نامەوێت ناوی هیچ کەسێك بێنم تەنها یەکێك لە پەیکەرەکان دیاری دەکەم و بەس. رەنگە ئەوانەی دەگەنە ئەم چەند دێرە رێك بۆناوی ئەو خاوەن پەیکەرە بگەڕێن، بزانن کێیە، و لە چ وڵات و نەتەوەو کیشوەرو چەند بەرهەم و چۆن بەرهەمی هەبووە، من ئەو ناوە دەهێنم و دەنووسم (یەڵماز گونای) دیارە یەکێکە لەو کەڵە هونەرمەندانەی زۆر پێویست بەوە دەکات زۆری لەسەر بڕۆین و کەمی لەسەر نەنووسین. چونکە ئەوەتا ئێستاکە لە مەیدانی (بەهێزان) لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا پەیکەرێك بە بۆیاغی رەشەوە دانراوە و لەژێرییشیەوە نووسراوە (ئەوکەسەی لەپێناو سینەمادا مرد) (یەڵماز گونای!) کەواتە چونکە لەپێناو سینەمادا مردووە، با لەپێناو ئەویشدا پەیکەرێکی بەردەمی هۆلیوۆدا بۆ دانبرێت و بۆئەوەی ئەگەر هەر کەسێك هات بۆ هۆلیوۆد، سلاوێك بۆ گیانی بەرزەفڕو عاشقی ئەو هونەرمەندە مەزنە بنێرێت، بۆئەوەی هەر نەبێت، ئەوەی بەیاد بێتەوە یەڵماز هێندە ئەشقی سینەمابووە، بۆیەش دوورنییە هەموو کات رۆحی وا لە هۆڵەکانی هۆلیوۆد و ئۆسکارو کان دەسوڕێتەوەو هەرگیز جێیان ناهێڵێت....)).

ئەو نووسینەی سەرەوە دوای ئەوەی کە ماڵپەڕی سینەما تیك لە زمانی فەرەنسییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی و پاشانیش وەرگێڕدراوەتە سەر زمانەکانی دیکەی جیهان، ئێمەش پێمان باشبوو لە زمانی ئینگلیزییەوە وەك چۆن دانراوە هەر ئاوەهاش وەریبگێڕینە سەر زمانی شیرینی کوردی و ئەم چەند وشەیەی خۆمان لە خوارەوەی وتارەکە بنووسین.

***ئێمەش لێرەوە دەڵێین، پێشتر پێویستە لە شارە گەورەکانی کوردستان دابندرێ. تۆ بڵێی لایەنە پەیوەندیدارەکان پاش ئەوەی ئەم دوسییەیە دەخوێننەوە بیرێك نەکەن...؟!***

K21

# پیرۆزبایی

**هاوکارە بەڕێزەکان :**

**- مامۆستا ئازاد جندیانی بەرپرسی مەکتەبی ناوەندیی ڕاگەیاندنی "ی.ن.ک"**
**- مامۆستا ستران عەبدوڵڵا سەرنووسەری ڕۆژنامەی کوردستانی نوێی تێکۆشەر**
**- تێکڕای دەستەی نووسەر و کارمەندە ئازیزەکان**

**سڵاوی وشە و داهێنان**

## کوردستانی نوێ بە نەتەوەیی و گەورەیی لەدایك بوو

بە بۆنەی داگیرسانی بیستەمین مۆمی لەدایك بوونی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێی تێکۆشەر، گەرمترین، جوانترین و ناسکترین پیرۆزبایی خۆم پێشکەش بە ئێوەی بەڕێزان و سەرجەم ئەوانەی پێشتر لە ماوەی ئەو ٢٠ساڵەدا دەوری بەرچاویان گێڕاوە، دەکەم.

دیارە، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، وەك یەکەم ڕۆژنامەی ڕۆژانە لەسەر خاکی پیرۆزی کوردستان – پاش دەرچوونی ڕۆژنامەی برایەتی ی ڕۆژانە لە بەغدا لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٤دا – دەرچووە، دەستکەوتێکی گەورەی نەتەوەیی – شارستانیی کوردە بە گشتی و ئەستێرەیەکی هەرە گەشی ژیانی ڕۆژنامەنووسیی پاش ڕاپەڕینە. هەڵبەت لەو ماوەیەدا، کوردستانی نوێ لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆ و فاکتەری پێش شەڕی خۆکوژی پاشتر و هاوکات پێش ڕووخانی ڕژێمی فاشیی بەغدا و پاشتر و تائێستادا تێپەڕ بووە، بۆیە ناتوانین بڵێین پڕاوپڕ هەر هەمووی سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، بەڵام هاوکات بە دڵنیاییەوە دەڵێین، کوردستانی نوێ کەلێنێکی گەورەی لە ڕەوتی شکۆداری ژیانی ڕۆژنامەنووسیی کوردی پڕ کردۆتەوە، بەڵکو بە نەتەوەیی‌و بە گەورەیی لەدایك بووە. لە چوارچێوە گشتییەکەیدا، دەوری قوتابخانەی ڕۆژنامەنووسیی هاوچەرخی گێڕا و بە دەیان کادیری ڕۆژنامەنووسی پێگەیاند، بگرە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ خۆی لە خۆیدا ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی کلتووری، سیاسی و کۆمەڵایەتیی دروست کردووە.

بە هەرحاڵ ئومێد دەکەم، دەستەی نووسەرانی لەم بۆنەیەدا، زیاتر بەخۆیاندا بچنەوە و بە گیانێکی زیاتر گەنجانە و ئەرکی نەتەوەیی و شارستانیی سەدەی ٢١ بەرەو پێشەوە بڕۆن.

***دووبارە پیرۆزبایی و هیوای لەشساغی و سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم.***

**مومتاز حەیدەری**
**ئەندامێکی دەستەی دامەزرێنەی کوردستانی نوێ و سەرنووسەری هەردوو گۆڤاری " K21 " و "لەیلا قاسم – لەیلا زانا"**
**هەولێر – کوردستان - ٢٠١١/١/٨**



## کورد لە سەدەی 21 دا

گۆڤاری (کورد لەسەدەی 21 دا)، گۆڤارێکی کەلتووری، زانستی، مێژووی، بەڵگەنامەیی، نەتەوەیی، وەرزی ئازادەو ژمارە (9)ی کە ژمارەی تایبەتی کۆتای ساڵە کەوتە بەردەستی خوێنەرانی.

لەم ژمارەیەشدا گۆڤارەکە چەندین بابەتی بەپێزی ئەو بوارە جیاجیانەی کە خۆی هەڵیبژاردووە لەکۆی (544) لاپەڕدا بلاوکردۆتەوە، هەروەك سەرنووسەر لەسەرەتای گۆڤارەکەدا ئاماژەی پێدەکات کە بەنیازنەبوون قەبارەی گۆڤارەکە چیدی ئەوەندە زۆر نەبێت، بەڵام هەروەك دەرکردنی گۆڤار جگە لەتوانای تاکە کەس خاوەن قەڵەمە دیارەکانیش لەبوارە جیاجیاکاندا بەهۆی باشی گۆڤارەکەوە بابەتی بۆ دەنێرن و بۆیە ناکرێت ئەو بابەتە گرنگانە بۆ چەند مانگێك دوابخەن، هەر بۆیە قەبارەی گۆڤارەکە لەرووی لاپەڕەوە هەر بەو ژمارە زۆرە ماوەتەوە، هەروەك لەم ژمارەیەدا جگە لەسەروتارو بابەتە مێژووی و ڕۆشنبیری و بەڵگەنامەیەکان چاوپێکەوتن لەگەڵ چەندین کەسایەتی دیاری کورد شی تێدایە.

ئەم گۆڤارە زیلان حەیدەری خاوەن ئیمتیاز و مومتاز حەیدەری سەرنووسەرێتی.

کوردستانی نوێ – ژمارە ٥٢٧٤ – ٢٠١١/١/٩ – ل٢





# پەیڤێك بۆ گۆڤاری کوردستان لە سەدەی بیست و یەکدا ( K21 ) پێشکێشە

## سەعید عەبدوڵڵا




خوێنەرانی ئازیزی گۆڤارە پڕبەرهەم و زانیارییەکەی k21 ئەم بەهاری کوردستان و بەهاری تەمەنی گۆڤارەتان پیرۆزبێت، ئەوا گۆڤارەکەتان دوای تێپەڕبوون بەسەر دەیان کۆسپ و تەگەرەو نەبوونی و دەستکورتی و پاشانیش دیاریکردنی بڕێك پارە بۆ دەرچوواندنی و بە هەوڵوو هیممەتی هەموولایەك و نووسەران و تۆژەران و رووناکبیران و شارەزایانی بوارە جیاوازەکان و لەسەروی هەموویانەوە خودی سەرنووسەری گۆڤارەکە (مامۆستای پڕ بەرهەم مومتاز حەیدەری) ئەوا دەیەم ژمارەی خۆی دەرکرد، دیارە من لێرەوە تەنها مەبەستم لەم نووسینە ئەوەیە کە جارێکی دیکەو هەر بۆ مێژوو، ئەوە دووپات دەکەمەو لەسەری رادەوەستم و دەڵێم (k21 بە هەوڵو هیمەت دەردەچێت و شوکر سلێمانی نووسەر و تۆژەری کۆمەڵایەتی گوتەنی گۆڤارێکە بەقەد هەموو گۆڤارەکان، منیش وەك ئەوەی بمەوێت شتێکی دیکە بخەمە سەر قسەکانی مامۆستا شوکر سلێمان دەڵێم ئەوەتا ستافی گۆڤاری k21 کە لە خودی مامۆستا مومتاز حەیدەری تێپەڕناکات و لە بارەگایەکی بچووکدا گەورەترین گۆڤار دەردەچێت، بەلأم جێگا داخە زۆرن ئەو باڵەخانە گەورەو بودجە زەبەلاحانەی کە بچوکترین گۆڤار دەردەکەن، رەنگە بەلاتانەوە سەیر بێت ئەگەر بڵێم k21 وەك گۆڤارێك دەردەچێت، بەلأم وەك سەرچاوەیەکی دانسقەی پڕزانیاری مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و هاورێیەکی نووسەری دەست رەنگینم پێی گوتم کاکەگیان ئەوە گۆڤار نییە، وتم ئەی چییە؟ وتی ئەوە ئینسکلۆپیدیای زانیاری و ئەرشیفی نەتەوەییە!، بەلأم راست دەکات، ئەوەتا من هەروەك مامۆستا مومتاز حەیدەری ناومی خستووەتە ناو ستافی ئەو گەنجانەی کە هاوکاری دەکەن، ماوەی ٤ مانگی تەواوە لە دوای ژمارە (٣)ی ئەو گۆڤار دەگەڕێم و لە لای خودی سەرنووسەری گۆڤارەکەیش جگە لە دانە کتێبخانەو دانەی خودی نووسینگەی گۆڤارەکە هیچی دیکەی لا نەماوە، هەر بۆ یادگاریش ئەوە دەگێڕمەوە، رۆژێکیان لە بارەگای هەفتەنامەی بارزان نیوز من و مامۆستایانم مومتاز حەیدەری و عەبدوڵڵا زەنگەنەو کاك غازی حەسەنی سەرنووسەری هەفتەنامەی بارزانیش لەوێ بووین، کاتێك باسی ژمارە (٣)ی k21م کرد، لەوەڵامدا مامۆستا مومتاز گوتی نیمە، غازی حەسەنیش گوتی من دوو دانەم هەیە دانەیەکیان بۆتۆبێت، بەڕاستی ئەو قسەیە زۆر خۆشحاڵی کردم، دوای ٤ رۆژ، پێم گوت کاك غازی کەی ژمارە (٣)م بۆ دێنی، گوتی دوێنێ بەیانی فەیسەڵ دیهاتی هاتووە لە ماڵ بردویەتی بۆخۆی، بەڕاستی جاری یەکەم چەندە دڵخۆشی کردم، ئەو جارەیان دەهێندە دڵگرانیکرد ئیتر سەرتان نەیەشێنم لەوە زیاتر لەسەری ناڕۆم، خوێنەرانی ئازیز ئەوەی لەبەردەستدایە مشتێکە لەو خەرواره زانیارییانەی کە تەنها لە لای مامۆستا حەیدەری بوونیان هەیە، بۆیە من داواتان لێدەکەم با هەموومان وەك ئەوەی بۆ خۆمان بۆ خۆمانبێت کاری تێدا بکەین و چیە دەست دەکەوێت و بۆ مان دەکرێت، بیگەیەنینە ئەو گۆڤارە، ئەوەش وەنەبێت گۆڤارەکە لەسەر نەبوونی بابەت پەکی کەوتبێت، یان بابەتی وەهای نەبێت شیاوی بلأوکردنەوە نەبێت، من بە گێرانەوەی دوو گفتوگۆی کورت لەگەڵ خودی سەرنووسەری ئەم گۆڤارە هەوڵ دەدەم ئەو گومانەتان لا نەمێنێت، جارێکیان مامۆستا مومتاز حەیدەری لەکاتی نانخواردنی ئێوارەدا لە ماڵی خۆمان، بەتەلەفۆن پێی گوتم بابەتێکی هاتووە (١٠٠) لاپەڕەیە، جارێکی دیکەیش لەو کتێبخانەی کە منی شێتتر کردووە بەهۆی جۆرییەتی و چەندایەتییەکەیەوە، پێی گوتم بابەتی وەهام لەلاهەیە، ئەگەر بلأویان بکەمەوە، دوور مەبینە، کێشە دروست بکات، بەلأم لەبەر ئەوەی هێشتا عەقڵیەتی سیاسیمان تەواو پێنەگەیشتووە بۆیە بلأویان ناکەمەوە، هیوام وایە، لەم جۆرە بەڵگەنامە لای من و خەڵکی دیکەش بلأو بکرێتەوە، چونکە پێویستە نەوەکانمان بزانن چیمان هەیە و چیمان هەبووە).

ئیتر خەرمان بەرەکەت وا ژمارە (١٠)ی k21 دەرچوو، هیوای تەمەن درێژی بۆ مامۆستا مومتاز حەیدەری و دەستخۆشی لە هاوکارانی گۆڤارەکە دەکەم و پیرۆزبایی لە ئێوەی خوێنەرانیش دەکەم. وڵات ئاوەدان و ئێوەش بە هەر خۆش بن.

## بۆ کاکی خۆشەویست مومتاز حەیدەری

**سڵاوێکی گەرموگوڕ**

ئومێدەوارم تەندروستیت زۆر باش بی و شینگ و تاقەتت باشتر بی لە ئیش و کارەکەت کە بۆ خزمەتی گەل و نیشتمانەکەتە، کە خۆی خۆی هەڵدەسەنگێنی و هەموو کەسانی تێکۆشەر و رەوشەنبیر و جەماوەری گەلەکەمان رێزیان هەیە بۆت.

کاکە، نامەوێ درێژەی پێ بدەم، زۆر سوپاست دەکەم کە هەموو جارێ گۆڤارەکەتان دەرچی بۆمی دەنێری.

ئەو نووسینانەی هاوڕێی نەمر سالح حەیدەریم بۆ رەوانە کردی چونکە لە وەختی خۆیدا بە منی دابوو بڵاوی بکەینەوە و زۆریشم هەوڵ دا ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەم، کە دەسەڵاتم هەبوو، بەڵام بۆم رێکنەکەوت، ئەوا ئەو ئەرکە داوێمە ملی تۆ. ئومێدەوارم بیکەی. ئیدیشی هەیە دەگەڕێم بیدۆزمەوە بۆتی دەنێرم...

***ئیتر هەر بژی بۆمان***

**دڵسۆزت / کەریم ئەحمەد**

**٢٠١٠/١١/٢٢**

PNA
PEYAMNER NEWS AGENCY
NEWS AS IT HAPPENS
Ajans a Peyamnêr
ئاژانسی هەواڵ و بەدواداچوونی کوردستان - پەیامنێر



**رۆشنبیری - ژمارەیەکی نوێی گۆڤاری کەی بیست و یەك بڵاوکرایەوە**
**PNA-**

**هەولێر- "K21" گۆڤارێکی وەرزی، کلتووری، زانستی، بەڵگەنامەییە، لە چەند رۆژی رابردوودا، ژمارە (٩)ی کەوتە بەردیدی خوێنەران.**

لە دوایین ژمارەی ئەم گۆڤارە کە لەلایەن رۆژنامەنووس مومتاز حەیدەری دەردەچێت، کۆمەڵێك بابەتی مێژوویی، بەڵگەیی و کۆمەڵێك وێنەی مێژوویی دەگمەنی لەخۆگرتووە.

بابەتەکانی ئەم گۆڤارە بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بڵاودەبێتەوە و قەبارەی دوایین ژمارەی، ٥٤٤ لاپەڕەیە و زیاتر لە چل بابەت لەخۆ دەگرێت.

مومتاز حەیدەری ماوەی زیاتر لە دوو ساڵە، سەرقاڵی دەرکردنی گۆڤاری "K21"ە و بەم دواییانە، گۆڤارێکی تایبەت بە ئافرەتانی بەناوی "لەیلا قاسم - لەیلا زانا" دەرکردووە.

# K21 گۆڤارێك ... هاوارێك... بۆ گەلێك...

K21 گۆڤارێکە بۆ گەل پڕ لە پەیام و نامە،
خانەیەک لە دیرۆک،
بانەیەکە لە خامەو فامەو چیرۆک..،
گۆڤارێکە هەڵگری یەک دنیا کوردایەتی و یەک
هەزار بەڵگەنامە.،
گۆڤارێکە وەک چەکی دەستی گەریلا هەمیشە بۆ
نیشتمان..،
وەک خامە جوانەکەی ئاپۆ
لە هەر کوێیەک
لەهەر جێیەک
بۆ ئەوان بۆ من بۆ ..،
دەگری دەنووسی بۆ کوردستان..،
K21 بۆ یەک و دووان و سییان نیە..
خەرمانێکە لە تێکۆشان..
بۆ هەر شەنکارێکی گەل کە دڵ و دەستی بە
سامە..،
لۆکەیەکە بۆ برینی جەستەی پێنج لەتکراوی..
کاولکراوی
دزراوی وەڵات..،
گۆڤارێکە بۆ زارۆڵان پڕ لە هەست و نوقڵ و
نەبات..
کاڵایەکە پڕ بە باڵای گەریلایە..
بۆ پێشمەرگە
بۆ خوێندکارو کرێکارو ژن و پیاو
زۆر بە نرخە بە بەهایە..
بۆ هەر تاکێکی ئەم گەلە لە دوارۆژدا دەبێتە
دیاری و خەڵات..

هێڤیە ئارمانجە مەبەستە لە تەک ئاوات..،
K21 ناوەندەکەی باشورە..
تێخی دژی سێدارەکەی ڕۆژهەڵاتە..
دەنگی نەبیستراوی ڕۆژئاڤایە
خزمەتکاری ئەریڤانی کوڤانداری بێ دەوایە..
چاو بەرەژێری ئامەدی پایتەختی گەورەی
باکورە..،
گۆڤارێکە وەکی پزیشک هەردەم سازی چارەی
زامە..
بۆ ژن و کیژی ئەم خاکە خانەیەکی دوور لە تانەو
لانەیەکی بێ ئافاتە..،
کوردستان لە سەدەی بیست و یەکدا،

ڤیانە...
عەگیدە...
زیلانە...
قاسملۆو...
بێریتانە...
قازیە سمکۆیە ...
شێخی دڵ گەنجی پیرانە..
خەزنەوییە ڕیشەیە
خەباتکاری هەمیشەیە..
هەستە ...
ویژدانە ...
دیرۆکە ...
بەڵگەیە ...
کوردستانە...،




۱۱-۷-۲۰۱۰ بەختیار مام حەمید

# دوورەدەستی

"بۆ برا هاندەران لە دەرەوەی ئەم پارچەیەی کوردستان"

"ئاگر دەپژێ،
خاك دەسووتێ،
ئاسمان رەشە و بەری تەنگە
دەریا بە لافاو هەڵچووە"
دەڵێن: کۆچ کەن،
بە نێو پڕوشکەی ئاگر
بەسەر خاکی خۆڵەمێشا،
بەرەو ئاسمانی بێباڵا و خۆنەگرا
بەسەر دەریای خۆ هەلکێشا.
چۆن کۆچ بکەم؟
کە "قالبی" پۆڵا و سەری ئاسنیان دزیم
کە لە دەستی خەم و خەفەت
وەك دوا سێوی بێ خاپەرۆك
کەوتم و رزیم.
بۆ دواجار، گەر پێم بلێن دەبێ بڕۆی،
دەست لە باڵای بەرزی چیا و
دارتوو، گوێز و بەڕوو هەلگری.
بە دەریا رەز و
خانووی سووتاو و رووخاوا
هەر پێبکەنی و نابێ بگری.
چیم پێدەکرێ... بە بێ ئێوە
من دەست بەستەم... دوور لە گریان
نایە بزە، لەم دوو لێوە.
ئەی هاوڕێیان...
ئەی هەڤاڵان، ئەی دۆستانم.
"لە ترسانا
چاویان لە گلێنە دەرهێنام،
هەردوو باسکیان کوتمە کردم،
قاچیان بڕیم، کە چی هێشتا لە وەستانم..."
نەوەك رۆژگارێکی تر بێ
"قەندیل" باوەش بکاتەوە،
"هەندەرێن" سەنگەر دانێتەوە،
"سەفین" دەست بکاتە شمشێر و
"مەتین" قەڵغانی هەلگرێ
"ئاسۆس" رقی لێیان هەڵسێ
"زمناکۆ" خوێنیان وەرگرێ.
بەڵێ، دۆستانم لێم ترسان
هەر بۆیەشە:
خێوەتگای بە زۆرە ملیان بۆ سازاندم.
"لە پاڵ ئەشکەوت و ناو بەفرا،
لە ژێر سێبەری داری بی و
کانیی روون و سایەی کەپرا"،
بۆ ئێلافی بێسەوزاییان دابەزاندم.
بەڵێ دۆستان لێم دەترسان
ئەگینا بۆ:
کە سنوور هاوگیانی من بوو
ئاوێران چاو بکەنە چاوم.
بە خەردەلیش نەیانتوانی
بیشکێنن بڕی تینووی شاهەنگاوم.
هاوسەرانم،
ئەی دەستنیشانکەرانی رێم:
کە دوورەدەستی ئێوەیان
پێزانی لێم،
دایان کوتایە سەرسەرم،
"پەڕ و باڵیان" لێ سووتاندم،
بۆ دەوری بیری ئاو سوێر و
خاکی بێپیتیان رەتاندم.
ئێستا دوورم، دوور لە ئێوەم،
نازانم کێم...
بێشوێن و رێم.
بێلان و جێم.

٩حوزەیرانی ١٩٨٩ - هەولێر - کاردۆ

ئەم شیعرە لەناو ئەرشیفی خۆم دۆزیتەوە، نازانم خاوەنەکەی کێیە؟ هیودارم، لەژیان دا مابێ بەشیعرەکەی خۆی شادبێت.

م.م



«دوورە دەستی»

«بۆ هاوڕێیانی لە دەرەوەی ئەم پارچەیەی کوردستان»

«ئاگر دەپرژێ ،
خاك دەسووتێ ،
ئاسمان پەشە و سەنگەر
دەریا بەلافاو هەڵچووە»
دەڵێن : کۆچ کەن ،
بەشێوەی پشکۆی ئاگر
بەسەر خاکی خۆڵەمێشا ..
بەرەو ئاسمانی بێ باڵندە هۆنەگر
بەسەر دەریای خۆشێتیا -
چۆن کۆچ بکەم ؟
ئەم تالییە ، چ لێرە و بەهەر بەرچاوانی دەژیم
کە لە دەستی خەم و خەفەت
وەك دوو سێبەری بێ خاوەرۆك
کەوتم و پڕیم .
تۆ دوا هاوارێکەر پێم بڵێی دەبێ بڕۆی ،
دەوەستێ لە باڵندەی بەرزی چیاو
دار تووو ، گوێژو ، بەروو هەڵگری .
بەدیار پرەزو
خانوو و لە سووتاو و
هەر پشکەی وا ناگری -
چیم پێدەکرێ ... بەبێ ئێوە
من دەستەوەستاوم ... دوور لە ژیان
نایەژی ، لەم دوور لێتۆ .

# بۆ/ زۆر بەڕێز و خۆشەویست مامۆستای پایەدار مومتاز حەیدەری

## سڵاوی سەرخۆبوون و ئازادی.

من وەك ڕۆژنامەنوسێك لە ناخی دڵەوە پیرۆزبایی گەرمتان لێ دەکەم بە بۆنەی ئەم هەوڵ و کۆششە لە خۆبردوانەی کە داوتانە بۆ دەرچوونی گۆڤاری کوردستان سەدەی ٢١ کە تاکو ئیستا چەند ژمارەیەکەی لێ دەرچووە،لە ڕاستیدا ئەم گۆڤارە گەنجەتیەکی بە نرخ و ژێدەر و ئەرشیفێکی دەولەمەندە بۆ نێوەندی ڕۆشەنبیری کوردیمان سەرجەم کاکەیەکانی تری خوێندن سودێکی یەکجار پڕ بایەخی هەیە. من وێڕای دەست خۆشی لە جەنابتان ڕۆڵی کارا و لە خۆ بردوانەی خانەوادە وڵات پارێز و پێشکەوت خواز و کورد پەروەرەکەی شەهید جەماڵ حەیدەری مایەی هەڵوەستە لە سەرکردن و بەرز نرخاندنە کە بە درێژای مێژووی خەبات و ڕوناکبیری نەتەوە کەمان ڕۆڵێکی دیار و شەرەفمەندانەتان هەبووە لە نێو تەڤگەری ڕزگاری خوازی گەلی کوردستان و بزووتنەوەی دیموکراتی و چینایەتی و نەتەوەیی لە دیرۆکی گەڵەکەمان لەسەر ئاستی کوردستانی باشوور و ئیراقدا،ئەم پێنگاڤەتان گەلێك مەزنە، هیڤیدارین خامەکەتان هەمیشە بە بڕشت بێت لە پێناو زیاتر خزمەتکردنی کەلتووری ڕەسەنی گەڵەکەمان و برەودان بە بواری ڕۆشەنبیری و شارستانی کۆمەڵگەی کوردستان.هەر لەگەڵ ئەم پەیڤانەشدا پیرۆزبایی دەرچوونی گۆڤاری "لەیلا قاسم - لەیلا زانا" لە بەڕێزتان دەکەم،ئومێد خوازم ئەم گۆڤارەش بەردەوام بێ و ببێتە مایەی خزمەتگەیاندن بە پرسی ئافرەتان و ئاریشەکانایان لە نێو کۆمەڵگای کوردی دا، کە هەمیشە بەهۆی عەقلیەتی پاشڤەڕۆیی خێلەکی ستەم لە هەمبەریان دەکرێت، خوازیارین لەم کارە پڕ بەخششەتان هەمیشە سەرکەوتوو بن،ئیتر هەرشاد و سەرفراز بژین بۆ دۆزی ڕەوای گەلەکەمان و یەکگوتاری نەتەوەیی.

دڵسۆزتان ڕۆژنامەوان

**حەمید سورچی**

٢٠١٠/١٢/١١/ هەریر





# ٨٨ ساڵ بەر لە ئەمڕۆ

**ئەم بەڵگەنامەیە گەر بە وردی بیخوێنینەوە ئەوا لە هەشت مادە (٤،٥،٨،١٢،١٣،١٥، ١٦،١٧) راشکاوانە ناوی پەرلەمانی کوردی بە (ئەنجوومەنی نیشتمانیی کورد) و لە مادە (١٠) ناوی (دەزگای قەزای کوردستان) و لە مادە (١) دەزگای ئیداری و لە مادە (١٥)ش باسی خوێندن بە زمانی کوردی دەکات و هەروەها لە مادەی(١٦) داوای دامەزراندنی زانکۆیەك لە کوردستان دەکات و خۆزیا ئەم بەڵگەنامەیە و بەڵگەکانی دیکە لە ئەرشیفی تورکیا بکرێنە زمانی کوردی و بەم جۆرەش زۆر لایەنی لێڵ و نەزانراو تا یەکلا دەکرێتەوە و سەرەنجام دەتوانین بە رێك و پێکی لەبارەی ئەم بەشە لە کوردستان بنووسینەوە.**

## ساڵی ١٩٢٢ لە پەرلەمانی تورکیا پرۆژەی خودموختاری (ئۆتۆنۆمی) کوردستان گفتوگۆی لەسەر کرا

گەرچی مرۆڤایەتی لە دوو هەزارەوە بەرەو هەزارەی سێیەمین دەچێت، بەڵام لەو وڵاتانەی کوردستانیان پێوە لکێنراوە(جگە لەو ناوچە ئازاد کراوەی کە فیدراڵی تیا راگەیەندراوە) هەروەها لە دەستووری عێراقیشدا دانی پێدانراوە، دەنا لە بەشەکانی دیکەی کوردستان، نکووڵی لە بوونی نەتەوەیەکی چل ملیۆنی دەکەن کە ناچاربوون ئەودەم بە رواڵەت دەست بە گفتوگۆ و ئاخاوتن و بەڵێنی بریقەدار دەکەن و بۆ ماوەیەك مرۆڤی کورد(هاونیشتمانی) لە ماف و ئەرك یەکسان و هاوبەشین، بەڵام کە هۆی ناچاریە کە نەهێڵرا ئەوا دژ بە هەموو یاسا و رێسایەك هەوڵی تواندنەوەی نەتەوەکەمان دەدەن و ئێمەش نەمانتوانیوە بە شێوەیەکی هاوچەرخانە (تاوانبارانی جینۆسایدی کورد) بدرێنە دادگایێکی نێودەوڵەتی تاکو بە سزای پڕ بە پێستیان بگەن. لەم بەڵگەنامەیە بەدەردەکەوێ کە جارێ باسی کورد وەکو ئێستا یاساغ نەبووە بەداخێکی

**ئا: پارێزەر تارق جامباز**

زۆرەوە دەڵێم زۆر بەڵگەنامەی دیکە لە وڵاتانی دوور و نزیك هەن بەڵام بڵاونەکراونەتەوە بۆیە پێویستە و ئەرکی سەرشانی یاساناسان و رۆشنبیرانی کوردستانە کە هەوڵبدەن ئەم بەڵگەنامانە بدۆزنەوە و بڵاویان بکەنەوە، بەم جۆرەش زۆر لایەنی شاراوە و نەزانراو نهێنی و لێڵی نەتەوەکەمان روون و ئاشکرا دەبێت.

ئەم بەڵگەنامەیەش پوختەی(١) پرۆژەی خودموختاریی کوردستانە کە لە پەرلەمانی تورکیا ساڵی١٩٢٢ گفتوگۆی لەسەر کرا. بۆ مێژوو بۆ بەرچاوی خوێنەران بڵاوی دەکەینەوە:

وا پێدەچێ(٢) لە شوباتی ١٩٢٢دا رەشنووسی ئەم یاسایە بۆ لێکۆڵینەوە درابێتە ئەنجوومەنی نیشتمانی گەورە لە تورکیا، پێنج کەس لە نوێنەران دژی ئەم تێزە دەنگیان دا: سەباری سێ ئەندامی لیژنەی (قۆچگیری)، ساڵح ئەفەندی نوێنەری (ئەرزرۆم) و سەلاحەددینی نوێنەری (مێرسین) دژی باسکردنی تێزی ناوبراو دەنگیان دا، بەڵام پێشنیارەکە بە زۆربەی دەنگ قەبوڵ کرا و بریار درا لە ١٠ی شوباتدا تێزەکە لە دانیشتنێکی تایبەتدا باسی لێوە بکرێ. ئەندامانی حیزبی بەرگریی نیشتمانی (مدافع میللی جەمعیەتی)

لەگەڵ رەشنووسی ئەم یاسایەدا بوون، بە شەست و پێنج کەس لە نوێنەران دژی بوون.

ساڵح ئەفەندی باسەکەی دەست پێکرد و گوتی: مەسەلەی کورد ناتوانرێ بەم هەنگاوە رووکەشانە لە پێشەکی ئەم یاسایەدا هاتووە، چارەسەر بکرێ.

هەروەها گوتی: ئەگەر بمانەوێ ئەم ئاژاوەیەی کە لە ناوچەی (قۆچگیری)(۳) مستەفا پاشاوە وروژاندوویەتی، ئارام بکەینەوە، دەبێ ئەو کوردانە ئازاد بکەین کە لە یاخی بوونی بەهاری ساڵی۱۹۲۱ی قۆچگیری‌دا گیراون، ساڵح ئەفەندی داوای کرد لە پێناوی بەرژەوەندیەکانی وڵات، راسپاردەکانی لیژنەی لێکۆڵینەوە لە رەشنووسی یاساکەدا رەنگ بداتەوە.

هەروەها گوتی: هەرچەند دەزانی جەواد پاشا فەرماندەی لێپرسراو، هەندێ هەنگاوی ناوە، بەلام (لە بارێکدا وڵات دەستەویەخەی شەری یۆنانی‌یەکانە،(٤) ئەم جۆرە مەمامەڵەیە لەگەڵ مەسەلەکەدا کارێکی ئاسان نابێ).

ساڵح ئەفەندی درێژەی بە قسەکانی دا: (یاخی بوونەکانی قۆچگیری ئەنجامی زوڵم و ستەمی دەزگای ئیداری و مامەڵەی حکومەتی ئەنقەرەیە لەگەڵ خەلافەتدا) ئەو لەوباوەرەدا بوو کە (هێز بەکارهێنان جگە لە خراپتر کردنی بارودۆخ ئەنجامێکی دیکەی نابێ، بێ‌هودەیە ئەگەر بوترێ یاخی بوونێك لە کوردستاندا نییە، چونکە بینینی گوندەکان لە نزیکەوە خۆی دەربری هەموو شتێکە).

ساڵح ئەفەندی لە کۆتایی قسەکانی‌دا گوتی: ئەمیر فەیسەڵ و ئینگلیزەکان(٥) پشتیوانی لە یاخی بوون دەکەن (بەرژەوەندییەکانی وڵات پێویست دەکات بە بێ‌توند و تیژی مامەڵە لەگەڵ مەسەکەدا بکرێ) ژمارەیەك لە نوێنەران بە توندی پشتیوانییان لە ساڵح ئەفەندی کرد و دژی رەشنووسی یاساکە بوون، بەلام زۆربەی نوێنەران بە ۳۷۳دەنگ لە بەرامبەر ٦٤دەنگ، رەشنووسەکەیان بریار لێدا، ئەگەر ژمارەی نوێنەرانی کورد لە ئەنجوومەن‌دا هێشتا نزیکەی ۷۲کەس بووبێ.(٦)

قسەکانی ساڵح ئەفەندیش دەربری باوەر بە هەمان مەسەلە دەبێ بە شێوازی تر نەك بە هێز مامەڵە لەگەڵ کورداندا بکرێ، هەروەها نیشانی دەدا کە نوێنەرانی کورد وێرای ئەو پشتگیرییەی لە حکومەتی کەمالیستیان دەکرد، سەرباری ئەوەش کە کەسێکیان لە دژی ئەو توند و تیژییەی یاخی بوونی قۆچگیری پێ دامرکاوە، قسەیەکی نەکرد، هەستیان دەکرد دەتوانن مافێکی زۆرتر لەوەی لە رەشنووسە یاسایی‌دا هاتووە وەدەست بخەن. ئەمە خۆی نیشانی دەدا کە هەتا نوێنەرانی کورد بە هیوا بوون خودموختارییەکی زۆرتر لەوەی لە تێزی (دەزگای ئیداری کوردستان)دا هاتبوو، وەدەست بخەن. لە لایەکی دیکەشەوە نیشانی دەدا کە تورکەکان بە لایەنی کەمەوە ئەوانەی لە ئەنجوومەنی نیشتمانیی گەورەدا بوون، لە مامەڵەی کورداندا لە گرتنەبەری سیاسەتێکی توند و بەکارهێنانی هێز، رازی نەبوون، بەلام هەر کە ئەم تێزە یاساییە لە ئەنجوومەنی نیشتیمانیی گەورەدا خرایەروو، خۆی نیشانەی بوونی ئازادەییەکی رێژەییە کە ئەو ئەنجوومەنە هەیبووە توانیویەتی مەسەلەی کورد بە راشکاوییەوە بخاتە بەرچاو. وا پوختەی دەقی پرۆژەی یاسای خودموختاری(ئۆتۆنۆمی) کوردستان کە لە دانیشتنی رۆژی ۱۰ی شوباتی ۱۹۲۲ی ئەنجوومەنی نیشتمانیی گەورەدا گفتوگۆی لەسەر کرا:(۷)

## پرۆژە یاسای خودموختاری کوردستان کە لە دانیشتنی رۆژی ۱۰ی شوباتی ۱۹۲۲ی ئەنجوومەنی نیشتمانیی گەورەدا گفتوگۆی لەسەر کرا

وەزارەتی دەرەوە ۳۷۱/۷۷۸۱ رۆژهەلاتی (تورکیا) ٦٥/٩٦-٣٥٥٣ ئەی. ژمارە ۳۰۸، سیر ئێچ. رامبولد بۆ مارکویس نوفکدلستۆن (مێژووی وەرگرتن ۱۳ی نیسان). ئەمەی خوارەوە پوختەی پرۆژە یاسای سەروەرییە:




(١) ئەنجوومەنی نیشتمانیی گەورەی تورکیا بە مەبەستی دابین کردنی پێشکەوتنی کورد و گونجاو لەگەڵ پێداویستییەکانی مەدەنیەت، پەیمان دەدا دەزگای ئیداریی خودموختاری بۆ خەڵکی کورد گونجاو لەگەڵ ڕێ و ڕەسمی نەتەوایەتیان، دامەزرێنێ.

(٢) بۆ ناوچەکە کە دانیشتوانی بە زۆری کورد، فەرمانداریکی گشتی لە لایەن گەورە و کەسایەتییەکانەوە هەڵدەبژێرێ، لەگەڵ یاریدەدەر و پشکێنەرێك کە بە پێی بریاری ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورە، دەکرێ تورك یان کورد بن.

(٣) ئەنجوومەنی نیشتمانیی گەورە فەرمانداریکی گشتی کە ئیدارییەکی بە ئەزموون و ناوبانگ باش و جێگای ڕێزی کوردان بێ، هەڵدەبژێرێ.

(٤) ئەم فەرمانداره گشتییه بۆ ماوەی سێ ساڵ کاندید دەبێ و دوای تەواو بوونی ماوه دیاریکراوەکە، ئەنجوومەنی نیشتمانی (کوردەکان) فەرمانداریکی گشتی نوێ دادەنێ، مەگەر ئەوەی زۆربەی خەڵکی کورد حەز بکەن فەرمانداری کۆن درێژە بە کارەکانی بدا.

(٥) ئەگەرچی بریار لەبارەی ئەوەی کە یاریدەدەری فەرماندار کورد یان تورك بێ، بەدەست ئەنجوومەنی نیشتمانیی گەورەیە، لەگەڵ ئەوەدا هەڵبژاردنی ڕاستە و خۆ لە لایەن ئەنجوومەنی نیشتمانیی کوردەکان ئەنجام دەدرێ، پێشنیاری دامەزراندنی فەمانداری گشتی و یاریدەدەر و پشکێنەر بە هەرحاڵ دەبێ بۆ بریار لێ دانی بدرێتە دەوڵەتی ئەنقەرە.

(٦) ئەنجوومەنی نیشتمانیی کورد لە ویلایەتی ڕۆژهەڵات و لەسەر بنچینەی ڕای ئازاد و گشتی پێك دێ و ماوەی خولی هەریەك لەم ئەنجوومەنانە سێ ساڵ دەبێ. ئەنجوومەن لە یەکەمی ئاداری هەر ساڵێکدا کۆدەبێتەوە و خولی دانیشتنەکانی چوار مانگ دەبێ. هەرکاتێ ئەنجوومەن نەیتوانی لە ماوەی خولی ناوبراودا کاروبارەکانی جێبەجێ بکا، خولی دانیشتنەکان دەتوانرێ بەداوای زۆربەی نوێنەران و پشتگیریی فەرمانداری گشتی، درێژ بکرێتەوە.

(٧) ئەرکی ئەنجوومەنی نیشتمانی، لێکۆڵینەوە لە بودجەی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات و ئەو زوڵم و زۆریە کە کارمەندی ئیداریو دەوڵەتی کردوویانە. ئەنجوومەنی نیشتمانیی دەتوانێ بریاری دیار دەربارەی پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی ئاوچەکە بدا. بەڵام هەموو ئەم بریارانە بۆ ئاگاداری ئەنجوومەنی نیشتمانیی گەورە دەبێ، بدرێتە دەوڵەتی ئەنقەرە.

(٨) ئەنجوومەنی نیشتمانیی گەورە هەموو جوداییەکانی فەرمانداری گشتی و ئەنجوومەنی کورد یەکلا دەکاتەوە و هەردوولا بە دید و بۆچوونی ئەو ڕازی دەبن.

(٩) دیار کردنی سنوورەکان لە لایەن کۆمیسیۆنێکی تێکەڵ، ناوچەی ئیداریی کوردستان بریتی دەبێ لە ویلایەتەکانی بتلیس، دیاربەکر، سنجاقی دێرسیم و هەندێ لە قەزا و ناحیەکانی.

(١٠) دەزگای قەزایی کوردستان گونجاو لەگەڵ ئاکار و ڕێ و ڕەسمی ناوچە تایبەتییەکان دروست دەکرێ. لەبارەی ئێستادا ئەم دەزگایە لەو کارمەندە شایستانە پێك دێ کە نیوەیان کورد دەبن و نیوەکەی دیکەشیان تورك. لە کاتی خانەنشین بوونی تورکەکان دەتوانرێ، کوردیان لە جێگا دابنرێت.

(١١) لە مێژووی جێبەجێ کردنی ئەم یاسایەوە، هیچ باجێك چ وەك باجی شەڕ یان هەر شێوە و ناوێکی دیکەوە بێ، وەرناگیرێ. هەموو ئەو پارانەی تا ئێستا وەرگیراون لەمەودوا بە پێی بریاری دانانی دەزگای ئیداری دەستی بەسەر دادەگیرێ و دانی باج لە ساڵێکدا تەنیا یەك جار دەبێ، ئەو داهاتانەی دەبێ بدرێتە دەوڵەتی ئەنقەرە ؟؟؟ کۆمیسیۆنێکی تێکەڵ لە

نوێنەرانی ئەنجوومەنی نیشتمانیی گەورەی ئەنقەرە و ئەنجوونی نیشتمانی، دیار دەکەن.

(١٢) بـۆ پاراسـتنی ئاسـایش لـە ویلایەتـەکانی رۆژهەڵات، هێزێکی جەندرمە پێك دێ، ئەنجوومەنی نیشتمانیی کورد پێڕەوی نێوخۆی ئەم هێزە رێك دەخا، بەڵام بەڕێوەبەرایەتیی ئەم هێزە بە شێوەیەکی سەرەکی تا بەستنی پەیمانی ئاشتی، بە ئەستۆی لێپرسـراوانی تورکـەوە دەبـێ و لەگـەڵ بەسـتنی پەیمانی ئاشتیدا، ئەوانەی لە ئەندامانی ئەم هێزە بیانەوێ، دەتوانن بگەڕێنەوە مەڵبەندی خۆیان.

(١٣) ئەفـسەر و سـەربازانی کـوردی نێـو هێـزی چەکداری تورکیا تا بەسترانی پەیمانی ئاشتی لە خزمـەتی هێـزی چـەکداریدا دەبـن و دوای ئـەوە ئەوانـەی حـەزیان لـێبێ دەتـوانن بگەڕێنـەوە شـوێنی خۆیان.

(١٤) دوای بەسترانی پەیمانی ئاشتی، دانی نرخی ئەو مەڕ و ماڵات و کەل و پەلانەی لە میانەی شەڕی گشتی و دوای ئـەوەی دەسـتیان بەسـەردا گـیراوە، یەکەمین کاری دەوڵەت دەبێ و بە لایەنی زۆرەوە لە ماوەی ساڵێکدا جێبەجێ دەکرێ.

(١٥) لە ئەنجوومەنی نیشتمانیی کورد و ئیدارەکانی فەرمانداری گشتی و ئیدارەی دەوڵەتیدا تەنیا زمانی تـورکی بـەکاردەهێنرێ، بـەڵام دەتـوانرێ لـە خوێنـدنگاکاندا زمـانی کـوردیش بـەکاربهێنرێ و فەرمانداری گشتی دەتوانێ بەکارهێنانی ئەم زمانی پـەرە پـێبدا، بـە مـەرجێ ئـەم کـارە نەبێتـە پێگـە و بنـچینەیەك بـۆ هـیچ جـۆرە ئیدیعایـەکی ئایـندە لـە زەمینـەی ناسینی زمـانی کـورد وەك زمـانی رەسمـی دەوڵەتی.

(١٦) ئـەرکی سـەرەتایی ئەنجوومـەنی نیـشتمانیی کورد دامەزراندنی زانکۆیەك دەبێ کە کۆلێژی ماف و پزیشکیی تێدابێ.

(١٧) ئەنجوومەنی نیشتمانیی کورد بەبێ رەزامەندیی فەرمانـداری گـشتی و ئاگـاداریی پـێش وەخـتی ئەنجوومەنی نیشتمانیی گەورەی ئەنقەرە، هیچ جۆرە باجێك دانانێ.

(١٨) بەبێ راوێژی پێش وەخت لەگەڵ ئەنجوومەنی نیشتمانیی ئەنقەرە و دابین کردنی رەزامەندییەکەی، هیچ جۆرە ئیمتیازێك نادرێ.

﴿لەم کورتەیەدا ئاشکرابوو کە بۆچی نوێنەرانی کورد بـەو جـۆش و خرۆشـەوە لـە دژی ئـەم پرۆژەیـە راوەستان﴾

**دڵسۆزتان**

**هوراس رامبولد**

**کۆمیسەری باڵا**

**پەراوێزەکان:**

١) پوختەی یاساکە لە کتێبی راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران لە ل٢٦٧-٢٦٩ بڵاو کراوەتەوە.

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٠-٧٢

٣) یـاخی بـوون و ئاونـاتۆرەی تـریش لـە لایـەن داگیرکـەرانی کوردستان دراوەتە پاڵ شۆڕشەکانی کورد.

٤) کوردیـان دژی یۆنانیـەکان بـەکار هێنـا، گەرچی زۆر بـەڵێنی بریقەداریان پێدابوون. بەڵام کە سەرکەوتن بەسەر یۆنانەکان، ئەوا دواتر لە (بەڵێنەکانیان) پەشیمان بوونەوە.

٥) تۆمەتێکی ئامادە کراوە بۆ هەر شۆڕشێکی کورد بەرپا بووبێ ئەوا لەم جۆرە تۆمەتەیان داونەتە پاڵ.

٦) لە ٧٢نوێنەرە کوردەکان(تاك و تەرایان) نەبێ دەنا هوشیاریی نەتەوایەتیان کز و لاواز بووە.

٧) پـرۆژەی ئـەم یاسـایە لـە ژێـر کـارتێکردنی کـۆنگرەی سـیڤەر گفتوگۆی لەسەر کراوە.

**سەرچاوە:**

١) راپـەڕینی شـێخ سـەعیدی پـیران (کوردسـتان ١٨٨٠-١٩٢٥)، رۆبەرت ئۆلسن، وەرگێڕانی: ئەبوبەکر خۆشناو، ١٩٩٩.





# اللجنــة المركــزية تدعو كـــافة الاحزاب والمنظمـات الى الاعمـــال المشـتركـة

٢

## نـص المـذكـرة التى قدمتهـا اللجنـة المركـزية للحـزب الشـيوعى العـراقى

الى : جميع ممثلي الاحزاب والمنظمات الوطنية والاجتماعية ، الموقعة على ميثاق الجبهة الوطنية ، جميع الهيئات العمالية ، الحزب الوطني الديموقراطي ، حزب الاستقلال ، حزب الجبهة الشعبية ، حزب بارتي ديموقراطي كورد ، جميع لجان الجبهة الوطنية ( لجان جبهة الكفاح الوطني ضد الاستعمار والحرب ) ، اتحاد الشبيبة الديموقراطية ، جمعية تحرير الفلاحين ، جمعية رابطة الدفاع عن حقوق المرأة ، نقابة المحامين ، نقابة الاطباء ، اتحاد الطلبة العراقي العام ، جميع عناصر المعارضة في البرلمان السابق ، جميع الجنود وضباط الصف والضباط الوطنيين ، جميع المثقفين والمهندسين والكتاب والشعراء والفنانين والصحفيين ورجال السياسة المستقلين ، جميع انصار السلام والمحبين لوطنهم وشعبهم العراقي ، عرباً واكراداً وتركماناً واثوريين ، وارمناً ، رجالا ونساء .

### اليـــكم جميعاً أيهـا الاخـوان والاخــوات المحتـرمون !

- في وقت يبدي حزبنا موقفه بجلاء تجاه الاخطار الجدية المحدقة ببلادنا جراء محاولات الولايات المتحدة الامريكية لفرض مشاريعها الاستعبادية وجر بلادنا الى الاحلاف والتكتلات الحربية . وما يقف عادة تلك المحاولات ، انقضاض القوى السوداء على حركة الشعب التحررية . . .

وقد اظهرت الحوادث الاخيـرة اهداف الولايات المتحدة الامريكية بكل وضوح ، كما ظهرت في الانتخابات التي قدمتها الرجعية لاسيادها اثناء المساعدة العسكرية ، في الوقائع الاخيرة ، بزج الاحرار في السجون واراقة الدماء ، حيث شملت الاعتقالات معظم المرشحين للنيابة الذين كسبوا عطف وتأييد الاوساط الشعبية الواسعة ، بسبب ، ما نادى به هؤلاء الوطنيون من اهداف وطنية تعكس اهداف الشعب في رفض الاحلاف العسكرية وضمان حقوقه الديموقراطية . وتستمر الاستعدادات الاستفزازية المرفقة في بغداد ايضاً لاجل منع المرشحين الوطنيين من الوصول الى البرلمان ، وان للزيارات المريبة لبعض الساسة الامريكيين والجواسيس الامريكان لمعظم المناطق في العراق ، واخيرا اجتماعاتهم السرية مع فيصل في ( سرسنك ) لها دلالة قاطعة عـلى ان الاوساط الاستعمارية والرجعية مصممة على تنفيذ كامل الخطط الحربية العدوانية بوسائل الارهاب البوليسي .

ولكنه في نفس الوقت لم تمنع جميع هذه التهديدات واراقة الدماء ، شعبنا من اعلان مقاومته الحازمة لمشاريع الحرب الانكلو – امريكية ، كما دلت على ذلك مظاهرات الشعب واجتماعاته الجماهيرية ومسيرات الالوف من تراكيب الاحتجاج عـلى سلوك الفئة الحاكمة في الحياة الوطنيـة .

وقد كانت لدى لجنة حزبنا المركزية جملة مقترحات وانتقادات بخصوص التجمع السريع القاصر لتشكيل الوطني الاخير ، وما رافق ذلك من تواقيع على ميثاق الجبهة الوطنية ، وما حفت هذه الاجراءات ذات الطابع المتسرع ، من اخطاء تستوجب العلاج السريع طبقاً لمصلحة الوطنيـة واهداف المستقبل . ولكن لجنة حزبنا المركزية وجدت ان سرعة الحوادث ، خصوصاً في هذه الايام ، الملتهبة بالاحداث الهامة ، تمنعها وتحول دون عرضها التبادل وجهات النظر بشأن المسائل العالقة التي ليست لها طابعاً مستعجلا في قضايانا الوطنية وقضايا شعوبنا العربية . ولكن الموضوع الذي نحن بصدده لا يمكن ان يقبل التأجيل ، باي حال من الاحوال ، ذلكم هو ما يجب عمله فوراً من اعمال مشتركة من شأنها ، ليس فقط وضع حد للاستهتار بمصير شعبنا ووطننا من قبل عصابة من اللصوص الاستعماريين وخدمهم فيه ، بل وايضاً من شأنها توسيع الجبهة الوطنيـة وجعلها شاملة خلال الكفاح الفعلي .

### أيهـا الاخـوان المحترمون !

اننا لواثقون من انكم تتفقون معنا ، في كل ما اوضحناه لكم في مذكرتنا هذه ، عن الوضع السياسي ، وما من شك ؟ ان متطلبات هذا الوضع **ليست هي الا تنسيقاً للجهـود ؛ اكثر ، وتركيزاً لفعاليات قـوى الشـعب** نحو الطريق الرحب الذي سلكه شعبنا ضد معاهدة ( بورتسموث ) ولا تكتنف الا الحقيقة اذا قلنا بان شعبنا بدأ بتصميم اعظم في نفس ذلك الطريق تجاه المشاريع الحربية الانكلو – امريكية .

اما مسؤولياتنا نحن القوى الوطنية المنظمة ايها الاخوان ، هي ان ندرك واجبنا في هذه اللحظة الراهنة ، ذلك الواجب القائم على مبدأ : ان القوى الوطنية المنظمة في الاحزاب والمنظمات الوطنية لن تسلك مطلقاً طريق الزاوية ، بل على العكس ، تسلك طريق السير في قيادة نضالات الشعب وفي طليعتـه . وان قوانا الوطنية القادرة كل القدرة على اجراء تغيير في السياسة العراقية القائمة على الخضوع لمشيئة الاستعمار باقامة سياسة وطنية عراقية تخدم الاستقلال وامن الشعوب . .

فالى القيام بجميع المهام والاعمـال التي تحتمها الاوضاع السياسية الراهنة ، تدعوكم لجنـة حزبنا المركزية ، ايها الاخوان الوطنيون المحترمون ؟

مع احر تحياتنا النضالية

بغـداد : ٧ حزيران ١٩٥٤

اللجنـة المركزيـة
الحزب الشيوعي العراقي

(ترجمة النشر المعثور عليها في ليلة ١٤ ــ ١٥/١/١٩٥١م٠)

ايها الشعب المناضل حيوا ذكرى الوثبة التحررية الكبرى ٠ عززوا جهودكم لاجل وثبة اكبر لتحقيق امال وثبـــة كانون ٩٤٨ ٠ لتحطيم الحكومة السعيدية الخائنـة راشقيا٠ بورتسموث ومجلس كلا يتون ــ صدر المزيف ٠ لاجـل السلم وحرية الوطن وديمقراطيـــة الشعب ٠

نداء الحزب الشيوعي العراقـــي
الى الشعب العراقي المناضـل

ايها الشعب العراقي المناضـل ٠

في هذا الشهر من سنة / ٩٤٨ لم تخضع لسلاسل العبودية البورتسموثية بوثبتك الجرئية الكبرى طاردت الاشقياء المذنبين الى جانب الاستعمار الذي هو رئيسهم وامحيت معاهدة بورتسموث بدماء ابنائك الاقوياء وهدمت ذلك المجلس غير الحقيقي الذي كان ممثلا عن عدوك ٠ في هذا الشهر نبهت اعداءك المستعمرين وخدامهم البورتسموثيين وبرهنت بان قوة الشعب فوق الارهاب وفوق النار والحديد والسجون والمشانق ٠ في هذا الشهر تمر سنتان على يوم ٢٧ كانون ٤٨ يوم نضالك العظيم من اجل خبزك واستقلالك ٠ يوم انتصارك على اعدائك وتحطيم مشروع العبودية والان تقف امام خطر اكبر من خطـــر بورتسموث وان الاستعمار وخدامه يعملون باستمرار لارغام الشعب على قبول مشروع بورتسموث ــ ويعملون لربط بلادنـــا بـ (الوحدة العراقية ــ السورية ) وبالمشاريع والتكتلات والمواثيق وتشكيل مخافر ومطارات للجنود الانكليز والامريكـــان في بلادنا بغرضهم من ذلك ان يجعلوا بلادنا جسرا اماميا لمشعلي الحروب الذرية في الوقت الذي يواجه فيه شـــعبنا اوضاعا اقتصادية وسياسية سيئة ويتعرض الكادحون لخطر الابادة والبطالة وتزداد الضرائب بصورة غير محدودة لصرفهـــا على الاسلحة وتجويع الشعب عن طريق الارهاب البوليسي وقتل المناضلين في زوايا السجون والمعتقلات الفاشية وفـــي سجون الفصنايو ويتذيع مؤامرات لجعل شبابنا لحوما لفوهات المدافع في ميدان الحرب التي تريد وحوش وول ــ ستريت ومساعديهم وخدامهم اشعالها ضد اكبر صديق لشعبنا الاتحاد السوفيتي من اجل ارباح الاحتكارات الاستعماريـــة يا ابناء البلاد الشرفاء على اختلاف اديانكم ولغاتكم وافكاركم السياســــية ٠

ان وثبة الكانون اعلمتنا بان الاستعمار وخدامه سوف يخضعون لرغبات الشعب في الوقت الذي يتحد فيه المناضلـــون على اختلاف اديانهم ولغاتهم وافكارهم وينزلون الى الميدان بكل قوة وجرأة لمواجهة العدو من اجل تحقيق اهداف ــ الشعب ٠ لاشك ان انتصار كانون كان نتيجة اتحادنا ومساعينا المتواصلة ضد العدو دون ان نتردد في التفاني بارواحنـــا نحن الان في ثالث ذكرى لتلك الوثبة التاريخية المباركة اكثر حاجة من كل وقت مضى (للتوحيد ) توحيد الصفوف بـــين (شيوعي وديمقراطي وحزبي ولاحزبي ونقابي ) لاجل السلم والخبز والحرية والاستقلال ٠ من اجل هدم حكومة الجاســـوس الكبير (نوري الســـعيد ) والانتقام من سفاكي دماء هذا الشعب وهدم مجلس كلا يتون ــ صدر المزيف ٠

تلك الوثبة التي حققها الشعب في كانون / ٩٤٨ وسفك فيها دماء ابنائنا برشاش شرطـة صالح جبر بامر من المستعمرين الانكليز لم يبق من تلك الوثبة اثر ورجع البورتسموثيون الى الحكم وتشكل مجلس اكثر اخلاصا لعدو شعبنا من المجلس السابق لتحقيق امالهم ٠ وبدون محاكمة شنق اقوى رؤساء الشعب وارسل الى السجون الاف من المخلصين المناضلين٠

ايها المناضلون الشرفاء ٠ لاشك ان في مقدورنا ان ننتصر على العدو بالاتحاد والسعي٠ وان مستقبل هذا الشعب مربوط باتحادنا وسعينا ضد الاستعمار والرجعيين ٠ لايوجد اي شك من انتصارنا ومن هدم حكومة نوري السعيد المجرم وجميع الحكومات التي من امثالها ومن تشكيل حكومة ديمقراطية حرة لاننا مع الشعب والشعب معنا٠ لان الشعب لايرضى حيـــاة العبودية ولايرضى ان يسلب منه المستعمرون وخدامهم حقوقه وكرامتـــــه ٠

يحيا ذكرى وثبة كانون التحررية الكبرى ٠ يحيا الجبهة الوطنية الموحـــــدة ٠

الانتصار والسعادة لشعبنا ومعسكر الشعوب بقيادة الاتحاد السوفيتي ٠
الموت لمشعلي الحروب والخدم العراقيين الخونـــــة ٠

الحزب الشيوعي العراقـــي
كانون الثاني / ١٩٥٠٠

(مطبعة القاعـــدة )

کاکی خۆشەویست، ممتاز الحیدری بەڕێز

سڵاوێکی برایانە... ئاراستەی جەنابت ئەکەم هیوام
خۆشیتانە داوا ئەکەم لە یەزدان تەمەنی درێژ بێ
بۆ خزمەتی وەرشەی ڕاستەقینەی کوردی.
جوان ئەزانم جەنابت من ناناسی بەڵام خوا ئەکا ڕۆژێکی
پێکەوە شاد بین من برای خوالێخۆشبوو (حسن عدو)مە.
یەک دانە لەم جزوانەم ناردووە بۆ شاعیری بەڕێزمان
هێمن موکریانی و مامۆستا صالح الحیدری برات ئەم دانەیەش
پێشکەشە بە بەڕێزت چونکە جەنابت بەشداری ئامادەکردنی
پاشکۆی عیراق ئەکەی هەردەم،

ئیتر دڵسۆزتان

برات
اسعد عدو رسول
محافظه ذی قار / ناحیه الغراف
١٢/٢/١٩٧٩

[illegible]
٢٠١١/٦/٣



# عەبدوڵڵا زنگەنە پەیکەری نەمریی پیرەمێرد بەرزتر دەکات



**ڕوونکردنەوە:**

ئەوە چەند مانگ بوو، چاوەڕێی ئەم بابەتەی مامۆستا عەبدوڵڵا زەنگەنە لەبارەی بیرەوەرییەکانی پیرمێردم دەکرد، هەر دەیگوت تەواو نەبووە، سەرم زێدە قاڵە ناتوانم تەواوی بکەم، منیش بەپێچەوانەوە، بەتەلەفۆن بێزارم کردبوو..!! دواییکەی نیوەڕی ٢٠١١/٣/١٧ سیدیەك و هاوکات، بابەتەکەشی لەسەر کاغز چاپی کردبوو، هێنایە ماڵەوە... گوتی ئەوە بیرەوەرییەکانی پیرمێردە، بەڵام من بەدڵم نییە،ئەوە نییە ناوم بێنی، هیچ مەنووسە یان ناوێکی خوازراوە، یان ناوی خۆت بنووسە.... هتد؟!!

منیش گوتم دەنووسم (نایاب) واتە بە(مومتاز) پێکەنی و ڕۆیشت.

هەر بۆ دوای نیوەڕۆ دەستم بەخوێندنەوەی کرد، جا لەبارەی ئەم بابەتەی (م. زەنگەنە)لەبارەی پیرەمێردەوە دەڵێم: ( دەك سەد جار دەست خۆشبی بەراستی کارێکی گەورەت کردووە منیش بۆیە دووپاتم دەکەمەوە ئەم جۆرە (دەقانە- تێکست) لەمەیدانی لێکۆڵینەوەو هەمە جۆردا، یان نووسینەوەی مێژوویی دیسان سەرچاوەیەکی هەمە چەشنی مایەی متمانەن، هاوکات هەر خۆی لەخۆیدا خوێندنەوەی زۆر تام و چێژی ئەدەبی، کۆمەلایەتی، جۆری نووسین... هتد، بەمرۆڤ دەبەخشێ.

جا داواکارم (م. زەنگەنە) لەنووسینەوەی بەردەوام بێت منیش دووبات دەکەمەوە، لە هەر ژمارەیەکی گۆڤاری (K21) بەسوپاسەوە بڵاوی بکەمەوە بۆیەکەش بڕیارمدا هەر بەناوی خۆی لەژێر سەردێری: (عەبدوڵڵا زەنگەنە پەیکەری نەمریی پیرمێرد بەرزتر دەکات بڵاو بکرێت.

سوپاس

**مومتاز حەیدەری**

سەعات ( ٧ )ی ئێوارە - ٢٠١١/٣/١٧



# بیرەوەرییە

# رۆژنامەنووسییەکانی پیرەمێرد

## بەشی یەکەم

لەبەر نەبوونی توانای دارایی و داروباری دەزگاکانی زوو بێت، یان نەخوێندەواری خەڵکەکە و کەم بایەخدانیان، وەکو مرۆڤی کوردی ئەوسا، بە ژیان و سەربوردەی پێشەنگەکانی خۆیان بووبێت، کەم وابووە ئەو کەسانە بیرەوەرییەکانی خۆیان هێنابێتە سەر کاغەز، ئەوانەشیان کە هەبوون، هەر لە رەفیق حیلمی و ئەحمەد خواجەوە تا ئەوانەی دواتریش، زیاتر لایەنی سیاسی ژیانیان وەرگرتووە، لەم ١٠-١٥ ساڵەی پێشوودا، هەر جارەی گۆڤار یان رۆژنامەیەکی کۆنمان دەکەوتە بەردەست و یەک بە دوای یەک لاپەرەکانیمان هەڵگێر و وەرگێر دەکرد و ناوەرۆکەکانیمان دەخوێندەوە، بەرامبەر بە ئیمزای زۆر ناوی سەر ئەو لاپەرە کۆنانە تووشی سەرسوڕمان دەبووین، بۆیە زۆرجار خۆزگەمان دەخواست خۆمان یان یەکێکی دیکە بێت و تاوتوێی ناوەڕۆکی ژێر ئەم ئیمزایانە بکات و بۆ خوێنەری هاوچەرخ لێکیان بداتەوە، ئەوە بوو دوای یادەوەرییەکی سەد ساڵەی رۆژنامەنووسیی کوردی هەندێ کەس خۆیان لە قەرەی ئەم جۆرە کارانە دا بەڵام وا دیاربوو کەلێنەکان هەر زۆر بوون، ئەوەتا چەند مامۆستایەک، لەوانە خوالێخۆشبوو (ئومێد ئاشنا) کارێکی لەم جۆرەی کردووە، بە نموونە ئەو چەند نموونەیەکی لە نووسینەکانی (پیرەمێرد)ی لەسەر لاپەرەکانی رۆژنامەی (ژیان) و دواتریش (ژین) وەرگرتووەو بە رێنووسی نوێ نووسیوییەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی (پیرەمێرد) زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێ، کە ئەو کاری لەسەر کردەوە، بۆیە هەستمان دەکرد، ئەو کارەی ئەو هێشتا گری دەروونی هەڵچووی

ژین

رۆژنامەیەکی کوردی وادبی و کومەڵی یە

سالی ٢١ — ژمارە ٩٥٣

خوێنەری ئەمڕۆ فێنك ناكاتەوە. لە ساڵی ١٩٩٨ بەدواوەكە بەدوای سەرچاوەی ڕۆژنامەووسیدا دەچووینە سلێمانی و لەوێ چەند جارێك كتێبخانەی گشتی ئەو شارە، هەروەها كتێبخانەكانی (مەتحەف) و (ئەوقاف) و (زانكۆ)مان بەسەر كردەوە، دواتریش كە كتێبخانەی (زانكۆی سەلاحەدین)مان لە هەولێر بەسەركردەوە، دەتوانین بڵێین هەموو ژمارەكانی (ژیان) و دواتریش (ژین)مان خوێندۆتەوە، لەم ماوەیەدا بۆمان دەركەوت (پیرەمێرد) وەكو پێویست نەخوێندراوەتەوە و بیروبۆچوونەكانی بە تەواوی نەخراوەتە بەردەم ئەوەی نوێ. ئەو بۆ خۆی كە زیاتر بە شاعیر ناسراوە لەم لایەنەوە هەندێ هەقی خۆی دراوەتێ، بەڵام ئەو نیوەی تەمەنیشی لە ئەستەمبوڵ و سلێمانی بەكاری ڕۆژنامەوانی بەسەر بردووە، ئەو ئەزموونە خۆیشیان زۆربەی لەسەر لاپەڕەكانی (ژیان) و (ژین) تۆمار كراوە، بۆیە لە مەودوا ئەگەر خوا تەمەنی داین هەرجاری چەند ژمارەیەكی هەردوو ڕۆژنامەی(ژیان) و (ژین) تان بۆ دەخوێنینەوە، دیارە خوێندنەوەی ئەم ڕۆژنامەیەش دوای (٦٠_٧٠)ساڵ سەلیقەو ماندووبوونێكی زۆری دەوێت، چونكە ئەوە بە چاوپۆشین لەوەی هەموو ڕۆژنامەكانی ئەوسا لەبەر كۆنی پیتەكانیان، وەكو پێویست چاپ نەدەبوون، دیارە دوای ئەوەندە ساڵەش خوێندنەوەیان بە هەموو كەسێك ناكرێ...

## غەزەتەچییەتی( * )

غەزەتە، لە بناغەوە كە دانراوە بۆ ئەوەیە كە ڕێی ڕاست و دروستی نیشان گەل بدا و هەمیشە مەنفەعەت و مەسڵەحەتی عامە تەعقیب بكا و بۆنی ئارەزووی شەخسی لێ نەیێ و بە هیچ ڕەنگێ درۆ و دەڵەسە نەخاتە سەر لاپەڕەی بەشەرەفی خۆی و ڕووی ئەو سیفەتە بە قیمەت و پاك و جوانەی غەزەتە بە مەرەكەبی درۆ و ڕەش نەكا، چونكو حورمەت و حەیسییەتی مەتبوعات چشتێكی كەم نییە كە بۆ ئارەزووی نەفسانی لەكەدار بكرێ، ئێستا ئەبینین هەندێ تەقلیدی مەملەكەتە متمەدینەكان پەیدا بوون هەروا هەندێ دەستە، دەستە جوێ ئەبنەوە ناوی خۆیان ئەنێن حزبی فلان و فلان كە ئەم ناوانەی وەكو ئەحرار و دیموقراتی و چی و چی لەم موحیتەدا كەم كەس ئەبینین كە بە فعل و نیسان و ماسبقی حال لایقی ئەم ناوانە بێ، جارێ لەپێشدا ئەبێ كەسێك لە حەیاتی خۆیا نەزاهەت و وەتەنپەرستی بۆ خۆی فیعلەن ئیسپات كردبێ و لە وەزیفەدا ئیشی باش و ئاسار ئەسلا چرووری و ئیدارەیێكی پەسەند و بە فائیدەی نواندبێ ئینجا تەقلیدی كاربەدەست و عەلاقەدارانی ڕجالی ئیداری دوای خۆی بكا. چەند جار شەخسمان دیوە پەڕیوەتە مەوقیعی ئیقتیدار و ڕێ دەسەڵاتی بوون دوایی ئەو ئیشەی كە خۆی موكەلەف بووە بكا و نەیكردووە بە ئیعتیراز و تەنقیدی ڕەخنەی لەوانە گرتووە كە لەدوای خۆی چوونە سەر ئەو ئیشە، دە هەی موبارەك تر كە خۆت هیچت نەكرد چۆن ڕووت دێ قسورەكانی خۆت بە تەعن و ئیعتیراز بدەی بە ڕووی خەڵقا. بێینە سەر سیفەتی ئەحرار كە ئەڵێن (حور) بەسەری خۆزگە كە ئەمزانی لە چ خاكێك و لە چ مجتەمعێك و چ وەزعیەتێكی موحیتدا لە حوریەت ئەدوێن ئەم خاكی ئێمەیە كە عێراقە و هیچ گۆشەیێك و خاكێك و زندەوەرێكی لەیەك ناكا لە ڕۆژی سروشتی ئەزەڵییەوە زۆرتری عەشائیرە كە شێخ و ڕەئیس و سەركۆماری خۆیان بە خوا ئەزانن ئەز جملە بە شێخی بارزان ئەڵێن (خودان) و سنجار هەندێ ئەو ناوە. ڕەهبەریانە. زۆر شێخی خۆمانم دیوە كە دەعوای خەڵقی بینینە كابرا وتویە سوێندی بدە بە (واللە وباللە وتاللە) وە بە قورئان سوێندی خواردووە نەیوێراوە بەسەری شێخ سوێندی درۆ بخوا و دیارە ترسی لەپێش نەبێ لە خوا ناترسێ چ جار (حدیپ) یەعنی (حریت) ئەتوانێ لەخۆیەوە هەڵسێ





و بچێ ئەم عەشائیرەی بادیەنشینە و ئەم کوردە کێویە بێنینە سەر مەدەنیەتێك کە کوشتن و تالان بە خراپ بزانن. یەکە پیاوی عەشائیر سواری برمین و کوشندە و دڕندەیە تالانیشی غــزوەی جیهــادە کــەوا ئــەو ئــەمن ئەمانــە و پــەیمان تەیمانــەی ئــەوی ئەبێ ئەوە خواری قــووەت قــودرەتی حکومەت بێ.

هێشتا زۆرمان ماوە کــە بــە تەبیعــەت خۆمان بە بەشەری بێ شەڕ بناسین و بەحەق رەزا بین تا بلــێین بــە بــیر و حورریەتەوە ئەچین جــاری تەماشــای ساحەی مەحکەمــە و دالای محاکەمـــە بکـــەن ڕێ، بـــەر، رێــــدار ناکـــەوێ. هـــەموو ئیـــشی ئەوەیە کــە کەسێ بە حەقی خۆی رەزا نییە و ئەمانیش کە هەرا و هۆریایانە هەموو لەوانەن کە لەسەر ئیش نین بە تەجروبە کامیان دیموکراتی و ئەحراری توند و تیژە بیانخنە سەر وەزیفە ئەگەر دەنگیان لێوە هات وەرن غەزەتەکەم و ماکنەکەم شڕ و وڕ بکەن. ئەما هیچ کەس ناتوانێ هیچ بەخۆم بڵێ چونکە هەرچی ترس و ئەمەل و ئیحتیــاج بــبێ نیمــە، بــەم ســیفەتەوە کــە ٢١ ســالە غەزەتەچیم و بەحەقی مەکسوب (شیخ الصحفی)م رجا لە غەزەتەچیەکان ئەکەم بۆ ئەشخاس لاپەڕەی ئیعتباری خۆیان لەکەدار نەکەن و مــن ارشــد العمــری مورشیدمە ئەزانم ئەڵێم چی.

(*) لــە ژمــارە (٨٧٥)ی رۆژنامــەی (ژیــن)ی رۆژی پێنج شەموی رێکەوتی ١٩ی حوزەیرانی سالی ١٩٤٥دا، سالی ٢١، بلاوکراوەتەوە.

## رۆژنامەگەری

مەولەوی فەرموویە:

ئــاخ مــن و شــەوال

هەردوو هام دەردین

هــەردوو گرفتــار ئێشی

یەك دەردین

منـــیش دەردەکـــەی

حــاجی مــەلا رەســوول

مــەرحومی واعــزم لــێ

قـــەوماوە، وەعـــزی

دەخونــد ئــەبوون بــە

دوژمـــنی. منـــیش

هەڵساوم زبان و ژیانی

قــەومێك دەژیــەنم بــە

گەلۆرم دەزانن!!

رۆژنامەچــییەتیی مــن بــە چــەکۆش تفــەنگی مــارتین دروســتکردنی حسکەی چەقماچیسازی کە لــە هــەموو رووی زەمین دا رۆژنامەیێك لای کەم چوار پێنج کەسی پێ دەوێ!

ژیـان) بـە کوتـە پیاوێـك شـەش، تـا هەشـت لاپـەڕە دەردەچێ، هەرچی تۆ بڵێیت ڕۆژنامەی پێ شیرین ئەبێ تیایـەتی. عیلمـی، فـەنی، ئیقتیـسادی، ئـەدەبی، ئیجتیمـاعی، ڕوحـی مەولـەوی و پەنـدی پێـشینیان، کۆنەفرۆشـی، تـەئریخی، گاڵتـەو گـەپ، ئینتیقـادی کـە کوشندە ئەمەیە و دڵ ئازاریەکە لەمەوە دێتە بەرهەم.

لـە پەنـدی پێـشینیانە تـەنها شـیعرێ کـە نووسـرابوو، مەشهووره حـەمزە لـە هەباسـی چـی، چرچـە قـەلآیی لـە مۆریاسی چی، ئەمە (ضرب المثل)ێکی سەد ساڵییە!.

جارێك بەوە کـافر بووین هـاتین لـە تـاریخ و ئەشخاسـدا مەحموود پاشای جافمان بە پرنس (بسمارق) دایە قەڵەم لە ناو ئێلاتدا (فەدراسیۆن)مان پـێ تەشکیل کـرد و دوو حکومـەتمان لەبـەر دالەرزانـد، ئەمـەی کـە گوتمـان لـە هـەنگامی تووڕەبیـدا زبـانی دەگـیرێ بـەوەیش نیـوەی ئیمانمان و ڕەنجی شایەریمان بەباد ڕۆیی..

جارێك لە ئەرکی مندالآنمان دوابووین کە لە مەکتەبدا بە جل و کتێـب ئـەدرێ ئێـستاش هەرچـی موعـەلیم هەیـە بویقوتاژی غەزەتەی کردووە قەتعییەن هیچ موعـەلمێك و حەتا لە هیچ مەکتەبێکدا تەنها یەك غەزەتەمان ناکڕێ!!

ئەمە گوایە صوحوف و مەعارف یەك خەمین. با وجود ئەمەندە ساڵەیە من ئیسپاتم کرد کە ئەم ڕۆژنامەیە بۆ پارەو مەنفەعەت دەرنایێنم لەسەر ئەوە دە نوسخەی لـێ نافرۆشم. هەموویم کردووە بە (قولکسیون) و بـەرە بـەرە ئابۆنەچێتی کەم دەکەمەوە!!.

چونکو ڕۆژنامەیێ قەومێك ساڵی بە چارەگە دینارێك کە تەنها کاغەزەکەی بفرۆشن بە حەلواچی و بـەقاڵ چارەك دینارێك دەکا.

بـاوەڕ بکـەن زۆری وا هەیـە هێـشتا فلـسێکی بـۆ نـەناردووین لەگـەڵ ئەوەیـشدا بـە پیاوخراپمـان دەردەخەن.

هـەتا (ژیـان) بـڕی منـەتباری عومـەر ئاغـای قۆڵـچی هەڵەبجەیە کە بە (عـەلی باپیر ئاغا) و مـەلا کـەریم ئـەو بەیت و باڵۆرەیان نووسی بوو (ژیان) چاپی کرد! چونکو بەقەد ڕەئیس الوزەرایێکی ئەوروپا بەدەماغ بوو، تووڕە نەبوو.

ڕەئیس الـوزەرا دەکەن بە گولـوی درێـژ (فاریق تـوری) دەکێـشن تـوڕە نـابێ. ئێمـە چووینەوە دەوری سـوڵتان حەمید کە ئەعلام شەرعی خەلعیان پەساغ کرد. کە بە ئیملای کۆن خەلع و خولع یەك بۆ سەدە - خۆزگە - بەو زەمانە(*)

(*) ژین) ژمارە (٥٠٥)ی ساڵی (١١)، دووشەممە ٣ی کانونی یەکەمی ١٨٣٦.

لە هەمان ژمارەدا لە ژێر ناوونیشانی (ژیان)دا نووسراوە (ژیان) تا ئێستا ڕۆژی شەموان دەردەچوو. خۆ هەموو ڕۆژی ڕۆژی خوایە.

بەلآم شـەموو ڕۆژی ئێمـە نییـە و لـە هیچ ناترسین لەبـەر ئەوە ئیتر خستمانە ڕۆژی دووشـەموان بە کوردی ئـەڵێن دووشەموان بەرد لە جێی بجوولێ دێتەوە جێی خۆی!!

## پیاوی مەعقول

## قسەی نامەعقول( * )

لە مەبعوسەکانی ئێمەدا بەهائەدین نووری کە بە عیلم و زەکـای خـۆی مەنـسەبی وەزارەتـی ئەشـغال کـردووە لـە مناقەشـەیێکی مـەجلیس نوابدا دوکتـۆر عەبدوڵڕەحمان جەلیلی نائیبی موسڵ پێـی وتـووە ئەمە پیاوێکی غێر فەنییـە نـابێ بـە وەزیـری ئیـدارەی فەنییـە، ئێمـە بیـستوومانە دوکتـۆر جـەلیلی دیپلۆمـەی خوێنـدەواری هەیـە، زاتێکی مەعقولـە کەچـی ئـەڕوانین ئـەم قەزیـە و قیاسـەی نامەعقولییە!! وەزیـر بـۆ تـەنزیمی ئیدارەیـە، شـئونی ئیجتیماعییـە بـە مـەعنی ئـەوەی ئیـدارەی سەحییەشی پێ سپێردراوە شەرت نییە وەزیـر هەڵـسێ شرینقە بوەشێنێ، من لە تورکییـەدا نـازری بەحرییەم



ژین

لە پەندەکانی پیرەمێرد

ڕیابـی و دروبـی
ڕاستی و دروستی

کارگەی شەکرەکەی
سلیمانی

ناشیرینترە، بەهائەدین نووری داهێنکی وەك نووری سەعید هەڵبژاردووە و ئیعتیمادی پێکردووە کەس ناتوانێ ڕەخنەی لێ بگرێ.

* ژین، ژمارە ٩٦٦ی رۆژی پێنجەشەممەی ٢٤ی مایسی ١٩٤٦.

## چیم دی!!( * )

تا منداڵ بووم باوکم و دایکم بە شەو چیرۆکەی شەڕی حاکمانی بابان و داوای گردە گروێ و قەرەقوڵ و مەریوان و ئەواوەو دوایی مازوری ئەحمەد پاشای ئاخیر حوکمداری بابان و ڕەوی تەهران، کە چوونە لای ناسرەدین شاو لە ڕێگا ئێواریێك لەسەر گۆلی زرێبار عەسکەری ئەحمەد پاشا کەمەرەی ئاڵتونیان لە پشتی باوکم کردووەتەوە و ئەحمەد پاشا چۆنی دۆزیوەتەوە و لەم سەفەرەدا چییان بەسەر هاتووە ئەمانەیان بۆ ئەگێڕامەوە کە هەمیشە ئەم شاری (سلێمانی)یە لە شەڕی برایاندا و لە چ فەلاکەت مەحنەتێکدا بووە، ئینجا کە خۆم پێگەیشتم شەڕی رووس و عوسمانی ٩٣دا هات هەرچی پیاومان هەیە یا بە عەسکەری یا بە غەزایی لە خدمەت شێخ سەعیددا چوون بۆ قارس و بایەزید، باوکیشمیان لە خدمەتدا بوو، دوای ئەوە گرانی گەورەی ٩٦ داکەوت پیاو پیاوی ئەخوارد، ئیتر نەکوژایەوە جەردەیی و تاڵانی و بڕۆ وای لێهات هەروا دەستەدەستە هەرچی

دیوە نەیوێراوە سواری واپۆر ببێ و ئیدارەیەکی باشیشی کردووە، ئیدارە و دیپلۆمەی خوێندەواری لێك جووێن، ئەمڕۆ نیشانتان بدەم زاتێك دەرەجەی علی الاعلی شەهادەتی مولکیەی شاهانەی عوسمانی هەیە و ئیدارەی وەزیفەیێکی زۆر بچووکی عادی نەکردووە کەوابوو قیاسێکی غێر مەنتیقی لە زاتێکی تەحسیل دیدە عەیبە، خۆ ئەگەر غایەیێکی شەخسی تیابێ

ڕاست ئەبۆوە شەش حەوت سواری لە پشت خۆیەوە کۆ ئەکردەوە بۆ خۆی لە دێهات خەرج و باج و سیوساتی ئەسەند لە پێشدا (ئەلیوەیسی) ئاخەسوری لە قەرەداخ و شارەزووردا ناوی خۆی نا ئەلیوەیس شا و تا ئیعدام حوکمی ئەکرد. تا دوایی شێخ حسێنی شێخ عەلی لە قرالی گرتی لە قرالی خست، ئینجا (مەکە) چنکنی ئالە کەوەلەکەی لەگەڵ بوو ئەویش چەندی ئەسپی خۆی ئاخاوت ئەویش گلا!! دوای هەموویان مرادە لاڵ هەیاسی کەوتە ئەو شارباژێڕە لە گەورەدێ حوکمداری ئەکرد تا شێخ مستەفا نەقیب شەوێ چووە سەری دەری پەڕاند، ئیتر جەردەیی ناو شاری وای لێهاتبوو شەو دزی پشت ئەستوور چوونە سەر ماڵی فەرەج ئەفەندی سەلیم ئاغا کوشتیان، سەلیم ئاغای باوکی بەو ئیختیارییە فیلەتەنێکی وەك ئەحەی وەتمان گەورەدێی یخ دا شەق و پەقی کرد، ئیتر مەپرسە ئەم حاڵە دەوامی کرد شەو لەبەر باخچەکەی بەرماڵی ئێمەدا عەزەکچانی پیاوی رووت ئەکرد تا نەچووین بۆ ئەستەمبوڵ شەو کە ئەنوستم تفەنگەکەم لە پێش ژنەکەمەوە و ئینجا لە ئەستەموڵ شەو بەدڵ ئەمینی بێ پشتێن و فیشەکلغ ڕائەکشام ئەنوستم کە هاتینەوە ئیتر ناوشارەکە کە ئاسایشێکی باش و حکومەتی ئێرە کە تێکچووبوو و شار چۆڵ بووبوو سەر لەنوێ دامەزرایەوە، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ یەکەم متەسەرڕفی دەوری تازە بوو، هەروا متەسەرڕفان هاتن و ڕۆیین، هیچیان لە هیچیان نەچوون، یەکێ توندو یەکێ خاو یەکێ بە ڕەوت و یەکێ بەناو، هەروا هاتن و ڕۆیین، لەو میانەدا مەجید یەعقوبی بەرگوزارێکی تەئریخی بەجێهێشت باغ و جادە و خانووی متەسەرف و ئیدارەیێکی حکومەتی باشی دانا بەڵام زەمانی بەسەردا هات هێندە نەمابوو ئەو پارك و حەدیقە و درەختەکانی سەر ئەو جادەیە وشك بێ، ئەم متەسەرفەش خەریکە وەك ئەو ئەسەری باش بهێنێتە مەیدان جارێ، خوا بۆی سەهل بکا ئاوی سەرچنار دێنی ئەو باغ و باغچەیەی پێ ئەژێنێتەوە و ئیتر مەملکەتەکەیش تینوەتی و تەنگانەی وەك پار نابینن ئەم چشتێکی تریشی هەیە چونکە تازە کورەیە زۆر بە مەراقە ئەکسەر ئیشی بازاڕەکەیش خۆی ئەیبینێ و بەراستی نەیهێشت نان و گۆشت وەك پشێوی بخرێتە ئیحتیکارەوە ئەو دووانە ئەهوەنترن، ئینجا خەڵکەکەیش دوعای بۆ ئەکەن و زەمدارانی ئوموریش وا بەم ڕەنگەی ناسییان ئەلبەتە ئەوانیش تەرویحی تەشەبوسات و ئیشعاراتی ئەکەن، ماوەتەوە پیاوی وا هەڵبژێرێ کە هاوشانی بکەن.

* ژمارە ٩٦٦ی ڕێکەوتی پێنجەشەمە ٢٦ی مایسی ١٩٤٩، ساڵی ٢٤.

## یەکی نیسان

### پواسۆن داوریل( * )

لە ئەورووپادا ڕۆژی یەکی نیسان ڕۆژی تەفرەیە ئێمە لەو ڕۆژە زەوق و نیشان و سەیران و میوانی عەزیزانمان دێ دەستەیێکی بیست کەسی گوڵی نوبهاری باغی عیلم و مەعاریف لە مەعهەدی مەلیکە عالییەی بەغدا هاتنە سلێمانی. ئەم دەستەی فریشتەی سەمای عالییە کە بە میوانی هاتبوون زۆر فائیدەی مادی و مەعنەوی تیایە. ئەوەڵەن بۆ تەئییدی رابیتەی وەحدەتی عیراقییە بۆ ئیستیفادە لە مەنازیری بەدیعییەو تەبیعییەی شیمال و ڕاهاتنی کچانمان بۆ سیاحەت وەلێ زەوقی مسافریەروەری و مەمنونی قەومی شیمال ئەمانە لە ژێر حیمایەو چاودێری ڕەهبەری ئوستادی موحتەرەم عەبدولمونعیم دا کە خەبەریدا دێن بۆ سلێمانی، مدیری مەعاریف جەنابی عەبدولمەجید حەسەن, کە بەڕاستی موجەدیدی مەعاریفمانە, بەدەستە و دائیرەی معەلیمات و مدیراتەوە چوون بەپیریانەوە, لەسەر ڕێدا لەسەر جۆگەی بەکرەجۆ دایان بەزاندن, لە دوای خۆش ئامەدی



بە کەوکەبەو زەمزەمەوە بردنیان بۆ سەرچنار، ئەو شوێنەی کە هەموو شاعیرەکانمان شیعریان پیا هەڵداوە ئەو ئاوە ڕەوانە و ئەو چیمەنە جوانە بە قدومی ئەو بێهووە پەریانە جەنەتێکی دنیا بوو لەوێ سفرەیان بۆ ڕازابووەوە تا ئێوارە لەو سەیرانە خۆشەدا بوون، ئێوارە بەکۆمەڵ هاتنە متەوەسیتەی کچان لە تەرەف مەعاریفەوە میواندارییان کراو شەوێ بەشەرەفی ئەو میوانە عەزیزانەوە پیرەمێردیش هێزی هاتەوە بەبەردا بە دەستگیری مدیر مەعاریف چوو بەخێرهاتنی کردن و هەردووك پێیان خۆش بوو، باخسوس ئەم پیرەمێردە کە ئەوەل هەوڵی تەئسیسی مەکتەبی کچان بووە. ئەم سەمەرەی سەعیدەی دی، حەیاتێکی تازەی بۆ پەیدابوو ئینجا فیرقەی تەمسیلی سانەوی، تەمسیلی (خەلیفەی خەیالی)یان کرد، بەراستی لە مونتەهای تەکامولدا ئەو شەوەیان بەخۆشی ڕابوارد. بەیانی بەحورمەتەوە دیسان مەعاریف جەماعەتەکەی ڕەوانەیان کردن، خوایان لەگەڵ بێ و بەیانی مەمنوونییەت و دوعای بۆ مدیری مەعارف.

(*)لە ژمارە (۱۰۰)ی (ژین)ی ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ٦ی نیسانی ۱۹٥۰دا بڵاوکراوەتەوە.

## غەزەتەی کەرکووك

غەزەتەی کەرکووك، کە یادگارێکی زبانی محەلی و هیمەتی عەونوللاَ کازمی بوو، لە دواییدا بە جەمیلەییێکی ناجەمیلە کردیان بە دوو ڕەگ و ئیتر کەسیش هەوەسی لێی نەما وا ئەم چەندامە مەقالە و مەنزومەی تورکی و هێجگار قوریاتە پڕ سەنعەتی و جوانەکەی تیا ئەبینین. چاومان ڕوون ئەبێتەوە — توخوا حەیف نییە ئەو ئەدەبیاتی تورکییە، کە زەوی و بەهرەمان لێ وەرگرتووە، فەرامۆشی بکەین و شێوەی باوك و باپیر لە بیر بەرینەوە، لەم دواییەدا لە ئەستەموڵ دەورەی ئەدەبیاتی تورکی کە شاعیری وەك عەبدولحەق حامد و تۆفیق فیکرەت و فائیق عالی و ئیسماعیل سەفا و ئەکرەم و سلێمان نەزیف و محەڕڕی وەك خالید زیا و بابان ئیسماعیل حەقی و نەعیم بەگ و حسێن جاهد و هەزاران ئەدیب کە سەروەتی فنونیان لە ئەدەبیاتدا کردبووە خاوەند سەروەت و ڕوحێکیان پێ دابوو منیش لە دوایانەوە گولوەچن بووم ئێستا لە کەرکووك کوێرە ئاگرێکی ماوە یاخوا نەکوژێتەوە

(*)لە ژمارە ۱۰۰٥ی (ژین)ی ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ٦ی نیسانی ۱۹٥۰دا بڵاوکراوەتەوە.

## گرانییێکی ناڕەوا

ئەم شارەی ئێمە، کە سەراپا بێ کاروبارو بێ مامەڵە و بازاڕ ماوەتەوە دەردێکی ناڕەواشییان کەوتووەتە ناو. بە بێ سەبەب هەرچی ئیحتیاجات هەیە لە خۆیانەوە گرانیان کردووە، جارێ نان لەو ساڵانەدا کە گەنم بە دوو دینارو سێ دینار بوو کیلۆی هەر بەو نرخەیە بگرە نانەکەیان خراپترە، گۆشت ئارزم تازە بوو بە سەدو بیست ئەویش یا بزنەلەڕ یا گوێرەکە گەر خۆ کەس نییە نەیەڵێ ئەو نەوعە حەیواناتە سەربڕی، ڕۆن لە وزەی خواردنیا نییە هەی هاوار حوققەنی حۆقەی پیاز بەدوو سەدو پەنجا فلس ماستی بیخوا هەر نان و چایە وا شەکریش گران بوو ئەڵێن فابریقەی شەکرتان بۆ دائەنێن، ئەمە هەموو ئەوەیە کەس لە کەس ناپرسێتەوە.

* پێنج شەممە.

## دەرمانی کەم گوزەرانی( * )

ئەمڕۆ هەرچی لەم شارەدا هەڵدەسێ، تەنانەت دەوڵەمەندەکانیش، هاواری کەم گوزەرانی و دەستتەنگیانە هەرچەند کە وەکو ئێمە تێگەیشتووین ئەم نەبوونییە سەرجەم و عمومی نییە زۆرتر وەك لافاو

بەسەریا ئەڕژێ قوڕ هەر بۆ بێ دەستەڵاتەکان گێراوەتەوە کە ئەگەر نەختێکی تر ئەم گرانییە لەم ئەندازەیە تێپەڕی ڕەنگە فەقیر لە برسا لێیان بمرێ ئێستا کە هەوا خۆشە و تاق ڕەنجی ڕەنجبەری و کرێکاری و کاروانی ئەم لاو ئەولایە نانی پەیدا ئەکرێ کە ڕێگیران و بەفروباران پەیدابوو ئیشی بۆ نەکرا بەشی دوو ڕۆژی نانێ سەر یەك نەخستووە تا ئەگەر چوار ڕۆژ ئیشی بۆ نەکا پارەی نانی بەدەستەوە بمینێ ئەمە ترسی تەنگانەیێکە کە لەڕێ دایە خۆ دەوڵەمەندیش وای لێهاتووە بە ئیعانە بێژراوە و بێزراوە بە بەریەوە نەماوە ئەمە لەسەر هەموو عیلاقەدار و قسە پەسندێك لازمە هاواری ئەمە بکا، بەلآم هاوار بکاتە کێ؟

حکومەت دەرەقەتی ئەم ئیشە بەجارێك نایێ خۆ جگە لە ناچاری، حکومەت و تیجارەتیان نەوتووە ئەوا گریمان دووجاری تر ناردی بە ڕەنج و کۆششی وەزیرەکان و بەخاترخواهی وامتان وەجبەیێکی تری گەنم کڕی بەچی دارا ئەکا دەستدار لەڕێوە ئەیقۆزنەوە و بێدەست تەماشای ئەکەن و ڕەنگە هەر ئەو گەنمەیش لەگەڵ قافڵەیێك ڕۆن و برنج و مەحسولآتی تری ئێرە هەر بەو ڕێیەدا بێ سەرگێری. بچێتەوە دەرێ ئەمە دەستی بەکەس ناگیرێ چونکو بالآدەستە بەڵێ کاربەدەست ئەوە ئەتوانێ ئەگەر بیەوێ مەنفی ئیخراجات بکا بەلآم نایبینین نایکا کە ئەیکا زۆرچاك دیارە کە گرانی ئەم عیراقە لە ئیخراجاتەوەیە ئەویش وا لێبووەتەوە تازە چرا هەڵکەن ئەمە چارەیێکی عمومی هەیە ئەویش بە یەککەوتن و ڕێکەوتنی سەرمایەدارەکان تەرەف تەرەف شەرکەتێکی بەقووەت تەشکیل بکرێ یەکێ ئەمە بجا. بەراستی ڕووم نایێ ناوی شەرکەت بێنم چونکە مەعریفەی شەرکەت بەڕێوەبردنمان دی ئیتر چۆن؟ ئومێدمان بە شەرکەتی ئێرە بێ لەگەڵ ئەوەیشدا چارەی ئەوەل و ئاخر شەرکەتە بە شەرتی ئەمە هەیئەتی شەرکەت خوێندەواری وایان تیابێ کە بزانن ئوسولی شەرکەتی ئەوروپا چۆنە و بتوانن ئویرامنامەکانیان بینن و تەرجەمەی بکەن ئینجا بەو پێیە و بە وردەکاری عیلمی ئیقتیسادی کردو کۆشی بکەن عیلمی ئیقتیساد دەستوورێکی هەیە سێ چشتی بە ئەساسی داناوە یەکەم خوێندەواری و بەو خوێندەوارییە زانست. دووهەم هەوڵ و ڕەنجی بەراست و بێ فێڵ سێهەم سەرمایە ئەم سێ سیفەتە لەناوا نەبێ بۆشە خۆ ئەمەیش لەم وڵاتەدا لە کەسدا جەمع نەبووەتەوە دەوڵەمەندی لێرەدا بە ڕێکەوت یا قۆنتەرات یا بایعی یا لە پڕێك بەکرێی لە ئەندازە بەدەری ئۆتۆمبێل و لەمانە زیاتر بە قاچاخچییەتی خۆ تیجارەتی حەلالی ئێرەیش سوود و سەلەم و تەرازوو باری ڕوون کردنەوەیە دە ئینجا ئەمە چۆن پایەدار ئەبێ و میللەتێك علمی (نوکوڤیسی) نەزانی بەچی دەوڵەمەند ئەبێ خاتیمەی هەموو مەرامێکمان دێتەوە سەر فابریقەی شەکر ئاخ و دریخ.

---

(*)(ژین) ژمارە ٩٣٥ پێنج شەممە ١٦ ئەیلول ١٩٤٨.

## ژنی ژان

یەکێکی تر لە پێغەمبەرەکانی کۆن کە کوشتەی خیانەتی ژنان بوو شەمعون پێغەمبەرە کە خوا بەزۆر و شجاعەت و عیبادەت ئیمتیازێکی وای دابووێ کە لە زەمانی خۆیدا کەس دەرەقەتی نەدەهات. زاتەن ئەوسایە گوللە و بۆمبا و زرێ نەبوو لە دوورەوە بتوانن یەکێ بکوژن، مەیدانداری و بۆکس و شەڕە زلە و پاڵەوانی بووە، هی ئەوتۆ بووە دەستی داوەتە گوێی پیاو لە بنی دەرکێشاوە و پیاوێکی گرتووە داویە بە پیاوێکی تردا هەردووکی هاڕیون، جا ئەم شەمعونە زۆر بە قوەت بووە و لەشیشی ئەمەندە تیسکن بووە جلوبەرگی پێ نەویستووە، خوا ئەمری پێ فەرمووە کە بچێتە شاری عەمودیە، مەلیکێك بووە ناوی توتی بووە، لە کەناری

دەریا قەسرێکی زۆر گەورەی بووە. ئەو مەلیکە دەعوەت بکاتە سەر رێی خواپەرستی ئەگەر موسوڵمان نەبێ قەسرەکەی بەسەردا بروخێنێ. شەمعون چووە دەعوەتی کردوون، گوێیان نەداوەتێ شەڕیان لەگەڵ کردووە، زۆری لێ کوشتون. ناچار مەلیك وتویە لێم راوەستە تا لەناو خۆماندا قەرارێك ئەدەین، مەقسودیشیان ئەوەبووە کە فێلێکی بۆ بدۆزنەوە لە ناوی بەرن، شەمعون ژنێکی بووە لەگەڵ ئەو پێغەمبەریەشیدا بەقەد خوای خۆش ویستووە. پادشاه بەدزییەوە جەواهیرو ئەڵماسێکی زۆری بۆ ناردووە کە شەمعون لەناوبەرێ، ژنە شەوێکیان گوریسێك دێنی لە خەودا هەردوو دەست و پێی شەمعون توند شەتەك ئەداو ئەیبەستێ و خەبەری ئەکاتەوە. شەمعون تەکان ئەدا گوریس ئەپچرێنێ و بەژنە ئەڵێ ئافرەت تۆ بۆچ منت وا شەتەك دا. ئەڵێ هەروا ویستم قووەت و هێزی تۆ تاقی بکەمەوە، پێ ئەکەنی ئەڵێ هیچ قوەتێك نییە من زەبوون بکا مەگەر بە مووی سەرم دەستم ببەستن، ژنەیش ئەمجا دیسان لێ ئەگەڕێ تا ئەنوێ و لە خەودا بە مقەس هەندێ لە پرچی سەری ئەبڕی و توند دەستی ئەبەستێ. ئەمجارە کە خەبەری ئەبێتەوە ئەبینێ بە مووی سەری خۆی بەستراوە ناتوانێ جم بدا، ئافرەت خەبەر بە مەلیك ئەدا دێن ئەیگرن و ئەیبەن بۆ مەلیك لەت و پەتی ئەکەن.

---

* لە (ژین)ی ژمارە ۱۰۰۵دا و لە رۆژی پێنج شەممەی ٦ی نیسانی ۱۹٥۰دا بڵاوکراوەتەوە.

## ئەبو نواس

## رۆڵەی حەبزبوز( * )

ئێستا وا، (گەرما) داهات هەمووکەسێ بۆ شوێنێك هەوڵ ئەدا فێنك بێ، هەواییکی نەسیمی بدا لە هەناسەی گیانی پێ تازە بێتەوە، عالەمی غەزەتەو ئەخباریش بەشرارەو و گەلی فەلەستین و سوریە و ئەملا و ئەولاوە وای لێهاتووە نەشئەی بە میزاج و گاڵتە و گەپ و نوکتەی ئەدیبانە جاربەجار فەرەحێك ئەبەخشێ بەدڵ و هەندێ جاریش نموونەی ئەدەبیات ئەنوێنێ، ئەم جارە چووبوو بەولاترەوە (فسیۆلۆژی و سیکۆلۆژی و کەهانەت و عیلمولنەفسی تێکەڵاو کردبوو، نەزەریەی (هل تلفي السجون) صەنعەتی تیا بوو، بەو رەنگەی ئەم بە قسەی خۆش فەرەح ئەدا بەدڵ!! نەشرەی خەدەمات دینییەش قووەت ئەدا بە روح، چونکو بۆ ئەم نوشوستی و نەگبەتی عالەمی ئیسلامەوە پەرێشانی بێ سامانی قەومی نەجیبی عەرەبە یەکانە دواو چارەی نەجاتی دیانەتی ئیسلامیەیە!! هەر دیانەتە کە موسوڵمانمان یەك دەخا و غیرەتی دینی و وەتەنەییان پێ پەیدا ئەکا و بەدڵ و گیان و بە ئیشتیاق جۆرو قسورو باغ و جینان و زۆرتر بە محەبەت ئەو رەزامەندی خوای یەزدان هیچ مانیعەیێك مانعی جیهادیان نابێ.

---

(*)(ژین ژمارە ۹٦۷ پێنج شەممە ٢ی حوزەیرانی ١٩٥٠.

## هیوای خودایی( * )

ساڵە و ساڵ لە کۆبوونەوەی مەجلیسی نوابدا خوتبەی خۆش خۆش و کەللەی بەجۆش و دڵسۆزی وەتەنی بە پەرۆشی وا دێنە مەیدان کە ئینسان خوتبەکانیان ئەبینی بە نەغمەیێکی بڵندی غیرەتکەشییەوە ئاوازەیێکی کردوکۆشی و ئۆکۆنۆمی دێتە بەر گووێ و دڵی خۆش ئەبێ و ئەکەوێتە خولیای سەعادەتی خۆشگوزەرانی و سەروەت و سامانی ولاتەوە ئیتر وا ئەزانی ئەم هەموو ئاوو زەمین و دەشت و چیای ولات کەوتووەتە بەکارهێنان و جۆگاکانی شارەزوور سەراپا داچێنراون و میوەی شارباژێرو قەرەداخ و هەورامان خراوەتە شکڵێکی

فـەنی واوە کـە نـازگ هـەرمێی وراز ئەبـەن بـۆ ئـەوروپا و قـۆخی دێگـەل لـە پارسـدا دانـەی بـە فرانقێکـە و ترێـی بـاخی ئاشـی و گـەدەرە و هـەنجیری هۆمـەر قـوم بـاوی لـە تـرێ و هـەنجیری ئـەزمیر زیـاترە، چـونکو هـیچ کەسـێ نـاتوانێ ئینکاری ئەمە بکا کە میوە و سەوزەی ئەم وڵاتە لە تام و لەزەتدا مانەندی نییە, ئێمە ئەزمیریشمان دی و لـە ئاماسـیەش بـووین سـێوو بامیـەی ئەوانیـشمان خـوارد تەنانـەت وتویانـە (هـەموو تیجـارەتی ئـەزمیری هـەر بـە ئـەنجیرە – ئەمەنـدە زۆرە ئەترشێ و فرێی ئەدەن. لێرە عەلی کەمالی خۆمـان چـەند جـار تـەدابیری عەمرانیـە و ئیقتیسادیە و مەشاریعی رەئیسیەی بەوقوفێکی علمییـەوە لـە مەجلیـسدا بـەیان کـرد و غەزەتـەکانیش نووسـیان و ئێمـەیش بـە خۆشـی خۆشـی و ئیفتیخـارەوە لـە ژینـدا نووسـیمان و گەلاوێـژ وەری گـرت تـەنها صـەدایێکی خۆش بـوو لە مەجلیسدا دەنگی دایەوە، بەجۆ عکس صـدا چیزی نەدیدم – ئەمە هەمووی بە ئیرادەی خوایە ئەگینە پیـاوی وا دێتـە سـەرکارو ئـەبێ بەسـەرکار پیـاو ئـەڵێ ئـیتر بیگمـان مەشـاریعی عـومرانی کەوتـەکارو مەحـسولاتمان هاتـە بـازار کەچـی ئەبینین ئەو شوێنانە کە ئێمە بەهیواین وارداتی لـێ پەیـدا بکـرێ لـەبیر چـۆتەوە و لـە دەفتـەری مەوجوودیەتیـدا دەرهاوێـژراوە رێگـای ئاموشورەفتی لەگەڵ لیوادا نییە, ئەمە راستە ئەم پـایزە قائیمـەقامێکی هۆشـیارو بـەکارهات بـۆ شـهربازار تـا بـەهار رێـی نـەبوو. بـچێتە سـەرکار، پێنجـوێنیش بـەو رەنگـە رێـی ئاموشـۆو تەنانـەت تەلـەفۆن و تەلغرافیـشی نـەبوو، دە، توخـوا رەئیـسێکی ئیـدارە و ئـامیرێکی مەحـەلی کـە بـەم رەنگـە مـساعەدەی رێ و بـانی نـەکرێ بـا لـەم زاتـە کـە ئیقتیـداری فـوق العـادە و شـەوقێکی گـەرمی هەیە. باشترییش بێ (کە باشتر نابێت) چی بکا؟ بێ هیوا خۆم و شەکری شارەزووری، یا، من هەروەها بیرێسم لە دوور(٨)

(*) لە ژمارە (٩٦٧)ی رۆژنامەی (ژین)ی رۆژی پێنج شەممەی رێکەوتی ٢ی حوزەیرانی ١٩٤٩دا بڵاوکراوەتەوە.

## شێوەی شیعرو ئەدەبیات ( * )

گەردو خۆڵی جیهـان خستینیە گەردو باوێکی بـێ ئامانی واوە نەشئەی شیعرو زەوقی ئەدەبیاتی لەبیر بردوینەوە، شەڕی ئەقلیمگیر لە وزەی شیروتیر ترازا کەوتـە جـەنگی زەدیـوانی هـەوایی ئاسمـان پـەیماو قونبەلەی زەرپیەی عزرائیلی!! ئەمەندە کوژرا کە لە هیچ شەڕێکی تەئریخی ئەم کۆنە جیهانەدا نەبووە، حیرصی بەشەری بەشەڕو ترسی سێیەم جاری شەڕ هێـشتا نەیهێـشتووە شـعورێکی ئـەمن و ئـەمان و فـەرەحێکی سـامانی بێتـەوە کەڵلـەمان تەنانـەت قودرەتی شیعری شێوە ماتەمیشمان نەماوە. جارە، جارە کە کتێبێکی کۆنی ئەدەبیات ئەبینم وەکو ئەڵێن شیعر یا ئەبی پیاو بگریێنێ یا ئەبێ هەلی پەڕینی، سا هەرچۆنێ بێ من راستەو راست ئەگریم و ئاوی فرمێـسکی سـوور بەسـەر ریـشی سـپیما دێتـە خوارەوەو خەڵك پێم پێئکەنێ بۆچی ئەگریم؟

لـە منداڵییـەوە ئولفـەتم لەگـەڵ شـیعرو ئـەدەبیاتی ئێرانـدا و کـە ئێـران جلوەگـاهی وەحـی شـیعر بـوو چەند پێغەمبەری شیعری تیا هەڵکەوت ئەو برایەوە




لـە دەورەی خولیـای شـەبابدا کەوتمـە ئەسـتەموول. یەکەم جار لە (ئاطە) دراوسێی ڕەجایی زادە ئەکرەم بـەگ و عوشـاقی زادە خالیـد زیـا و حسـێن ڕەحمـی بووم، ڕەزا تۆفیقشیان پێ ناسیم، کەوتمە بەهەشتی سـەروەتی فنونـەوە کـە ئێـواران لـە ئەسـتەمولەوە بـە واپۆر ئەگەڕامەوە بۆ لانەی سەعادەتی خۆم کە (اطە) بـوو و سـەروەتی فنـونم لـە گوگرتـەی ئـەو واپـۆرەی سـەر دەریـای مەرمەرەیـەدا ئەخوێنـدەوە. تەئسیری ئەو شیعرو ئەدەبیاتـە لـە سـەندبادی بـەحری زیـاتر ئەیخـستمە دەریـای خولیـاوە و کـە لـە غراموفونـدا گوێم لـە نەغمـەی بەستەڵەکەی خـۆم ئـەگرت کـە بـۆ مهرالنـسام وتبـوو (اگـەر سـاحلندە بکلیـورم) روحـم ئەچووە سەر تەختی سلێمانی سلێمانی، وام ئەزانی فرشتەی ئاسمان و پەری سەرکێوی قاف گوێ لـە دەنگـی شـیعری مـن ئـەگرن، هەنـدێ جـار شـەوی مانگەشـەو کـە ئەچـوومە کـەناری دەریـا و تریفـەی مـانگ ئەیدا لـەو ئاوەو جریـوەی نازو غـەمزەی ئـەو کچە ڕۆمە دلبەرانە و (قالەنیکدە)ی پڕ ئەفسۆنی ئەو ئەفسونگەرانەم ئەبیست لە هیچە ئەکەوتمە خولیای شیعرەوە وام ئەزانی گول بۆیـە ئارایشی خۆی ئـەدا مــن شــیعری پیــا هەڵــدەم، بلبــل بۆیــە بــەدەریا ئەسـوڕێتەوە شـیعری مـنی بەسـەرا بخوێنێتـەوە. نەسیمی ئاهستەوە زانی شەوان عەشقی من ئەبا بۆ کـچان و لـەلای ئەوانـە بـۆنی لەوانتـەی نـاطـوریلـی زولفـی ئـەوان دێـنێ بـۆمن ئـا.. نـەوجوانێکی واو خولیاییێکی سەردەر هەوای وا دەورێکی ئەدەبیات و زەمزەمـەی موسـیقی و مـەقاماتێکی روضــواری لـە رودام دیــوە ئیــستە هــەموو مــەقامات نوحــاتی فەلەستین حەساری ئەلمان الامانی ئێران وەك چینی فتەر تێکشکانی چین و گەورەو برەی ورچی یاری نەزان شامی تاریکی سوریەی بەخت رەش و لبنان و چی و چی بشێوێ هەموو جیهان بۆچی ئەگریم ئاه شاعیر بومایە بە لەوحەی ماتەم و شین قوبەی شینی سپهرام پڕ بکردایە لە گریەی مەلەکوت.

---

(*) لە ژمارە (٩٦٧)ی ڕۆژنامەی (ژین ٢ی ڕۆژی پێنج شـەممەی ٢ی حوزەیرانی ١٩٤٩)دا بڵاوکراوەتەوە.

## حەیاتی مادی و مەعنەوی

ئێمـە حــەیاتی مـادی بـە تـەرتیباتی سـەحی و حەیاتی مەعنـەوی بـە مـەعارف تـەعبیر ئەکـەین کـە لـە پێـشدا لـە هـەردووکیان بـێ بـەهرە بـووین. تـا پێـرار دائیـرەی مـەعارفمان لـە گـەورکێکا یـا کونـە گـەورێکا بـوو کـە چـەند جـار لـە غەزەتـەدا لێـی دوابـووم کـەس گـوێی نەئـەدایێ خـواو ڕاسـتان تۆفیق وەهبی کاری ڕاست بێ کە بوو بە وەزیری مـەعارف و غەزەتـەکانی ئەخوێنـدەوە و خۆشـی زۆر ئاسارو گوفتارو کرداری ئەدەبیاتی کوردی هەیە، دائـیرەی مـــەعارفی بـــە ڕاســـتی هێنایـــە مەیـــدان شـوێنێکی بـۆ پەیـداکردن کـە لـەم شـارەدا ئـەمڕۆ دائیرەی مەعارف یەکەمین جێیە و مدیرێکیشی بۆ نــاردین کــە زۆر بــەڕێ و جێیــە وا ئەمــساڵیش حـەیاتی مادیمـان کەوتـە دەسـت ئـەو ئینـشائەللا بۆمـان ئـەبێ بـە لوقمـان ئـەوەش ئێمـە دائـیرەی سەحەمان بۆ دانراوە ئەمە یەك کە رەئیسی سەحە و دوکتۆرمان لە خۆمان بێ خۆ من لە منداڵییەوە وەحشیانە و لادێییانـە بە دەرمـانی پـرو پیرێـژنان ڕاهـاتووم هێـشتا سـلفاتم نـەخواردووە تـا بڵـێم ئیـشم نەکەوێتـە دوکتـۆر بـەلام بـە بـەختم دوکتـۆر ئاوڕەحمـانی رەئـیس سـەحەی خۆمـان تـا بڵێـی

چاکە و دەم لە ئەدەبیاتیشەوە ئەو لەفەقەن بە دەستێك چەپڵەی بۆ لێنادرێ هەرچی تووڕە ئەبێ ببێ دەوروپشتەکەی باش نین و هەندێ پێکووەی کۆنی تیایە کورەیان دی وا ئەمساڵە خەستەخانێکی تازەیان کردووەتەوە موبیلە و تاقمی تازەی گیاندارو بێ گیان دوای ئەوە دارو دەرمان ئەمانەیە خزمەتی سەری ئینسان و ئەمەیشە کە ناوی پیاو ئەخاتە لاپەڕەی تەئریخی جیهان. من لە پێش ئەم تۆفیق وەهییەدا کە ئاساری خدمەت و حوسن نییەتم لێ دیوە بۆ پێشوەکەی ئەوم نیوە شیعرێکی تورکی نووسیبوو (باقی قالان بوقیەدە بر خۆش صەدا (عیش) گوایە ئەمەندەی پێ خۆش بوو بە تەلغوراف و بە شیعر جوابی دابوومەوە کەچی ئاردەکەمان بێ پێز بوو قەد وا نەخەلەتاوم ئینشائەللا خوا هەموو تەمانایێکم بەخێر ئەگێڕێ.

## شەکر و دوعا

ئێمە ئاگامان لێ نەبووە کە غەزەتەکەمان لە بابەت ئیحتیاجات و ئیسلاحاتی عومومییەوە هەرچی نووسیوە متەسەڕف نۆتی کردووە و بەخسوسیش خۆی تەحقیقی کردووە و لێی پرسیوەتەوە بەو رەنگە نان و باراش و گۆشت و ئەوانەی کە ئیحتیاجاتی موبرەمی عومومییە بیلزات تەعقیبی کردووە و بارەها خۆی چووەتە بازاڕو بە شوێن ئەم ئیشانەدا گەڕاوە تا هێنایە دەرەجەیێك کە جارێ خواردنەکەمان تەئمین بوو، نان و گۆشت لە ئیحتیکار دەرچووە، ئەگینە ئەگەر نەیپرسیایەوە فەقیرو هەژار لە تەنگانەدا بوون. چونکو بە جارێ کاروکاسبی لە بازاڕ نەماوە، نانیش گران بووایە بەچی بەڕێوە ئەچوون، ئەم زاتە کە هات ئێمە نەمان ئەناسی تا کەوتە ئیشەوە دوای ئەوە عومەر نەزمیش کە تەشریفی هاتە ناومان تەعریفێکی وای کرد کە ئێمە شوکری خوا بکەین متەسەڕفێکی وامان بۆ هاتووە، زاتە قدومیشی خێر بوو هەراو هۆریا و بڕوخێ نەما، بارانی رەحمەتیش فەیزو بەرەکەتی دەغل و دانی زیاد کرد، ئێمەش هەموو لایێکمان دوعای خێری بۆ ئەکەین، خۆ ئەگەر بۆ رێك بکەوێ وەکو ئاوی سەرچناری خستەکایەوە لە جێگای قشلە کۆنەکە کە ئێستا لایێکی دراوە بە معارف و لایێکی بەقیمەتتری بەر ماڵی کاك ئەحمەدی شێخی ماوەتەوە دەستەیێك خانووی کرێ بۆ مەئموورە بی جێ و رێگای دروست بکا، ئەوە نووری عەلا نوورە. جاری موئەسەسەیێکی بە ئیراد ئەبێ و رێکییش ئەدا بە شارەکە، مەئموورِیش لە سخڵەت و تەنگانەی مەسکەن رسگار ئەکا، ئەو ئەگەر بێتە فکرییەوە کە ئەمە بکا، یا بە ئیستیعراضي بەلەدیە، یا بە شکلێکی تر رێکی ئەخا ئەو شوێنە کە لەناو شارایە و نزیك بە سەراو بازاڕو مزگەوتە خوا داینیاوە بۆ شوێن خانووی مەئموران ئەوسا مەئموور کە عائیلەکەی لە رەحەتیدا بێ خۆشی بەدڵێکی ئەمین ئەتوانێ ئیشی ببینێ.

## دین و ئایین

ئێمە لەم دواییەدا تێگەیشتن کە ئەم نەگبەتی و پەرێشان حالی و شکستیەمان لەرووی بێ دینی و سەفاهەت و بەدئەخلاقییەوەیە و چیشی بە زەجرو





تەوبیخ و حەپس و جەزا ناکرێ، مەگەر ترسی خواو پەشیمانی لە گوناه بەئارەزووی خۆمان لامان بداو ئەخلاقمان بێتەوە سەر، رووبەی موسوڵمانی ئینجا بەو هیوایە جار، جار ئاوا بێ دیانەت ئەنووسین زۆر عەقیدەنامەی کوردی هەیە مەولەوی شا ئەسەرە، بەڵام شێخ سەمیع ناوێکی بیارەو شێخ مارف ناوێکی پێنجوینی بە شێوەی زبانی سلێمانی مەوعیزەو خوتبەیان نووسیوەتەوە ئەگەر ماین و بۆمان لوا جارێك هەندێکی ئەنووسینە ئەمە شێخ مەعروف پێنجوین وتوویە:

ایها المعروف بلغ ما علیك

هەرەشەم لێ ئەکردن ئەم وت راوەستن بچمەوە ئەفسەرتان بۆ بێنم بیپەرستن ئەوانیشم ئەکرد بەکارەکەری.

ئاخ خۆزگە شاعیر بوومایە ئەو شەوە بانگەشەی بەهارە کە لە نیوەشەودا چووبووینە سەر ئەستێرەی کارێزی حسێنی عەزیزە جۆلا دانیشتبووین ئەمڕوانییە تۆ شەوقی مانگە شەودا.

## برناردشۆ

ئەم چەندانە هەموو غەزەتەکانی جیهان لە عومرو زهنی برناردشۆ ئەدوێن و لەو پیرییەدا و ئەو زهنە کە ئەتوانێ وەك جاران بنووسی بە چشتێکی عەجائیبی ئەزانن.

بەڵی راستە پیاو بە ئەکسەرییەت کە لە حەفتا تێپەڕی هەرچی لە سروشتا خوا بەوی داوە ئەکەوێتە سستی. لە پێشەوە بینایی و شنوایی و وریایی و یاداشت و تاب و توانی نامینێ و خۆشی بێ و ترشی بێ قەدی ئەچێمێتەوە و ئەو نەوعانە کە لە عومری نوودا ئەتوانن بیەن و ببینین و وەك جاران بنووسن زۆر بە نایاب هەڵدەکەون. بۆ هەندێ سیفاتی ئەو لە خۆما گەڕام، چونکو منیش تەنها هەنگاوێك لە دوای ئەوەوەم، بەڵام لە شوێن و شارێکی وا دایە کە هەموو دنیا بیناسێ، من لە دنیەکدام کەم کەسی ئەورووپایی ناوی ئەزانن چە جای خۆم، بەڵێ من لاف ئەو لێ نادەم کە بڵێم برناردشۆی کوردم. بەڵام هەندێ وەزعییەتی من هەیە لەو عەجائیبترە زۆر خەلقمان لێك ئەکاو زۆر تەبیعەتیشمان عەکسییە کە تەمەنی کە ئێستا ئەو ئەتوانی بنووسی من لەو عەجائیبترم، خۆ مەقسەدم ئەمە نییە بڵێم داناتر یا عالمترم بەڵام ئەمڕۆ بە نسبەت ئەوەوە من لە کوێرە دنیەکدا هەڵکەوتووم و ئەزانم بنووسم بە تەنها خۆم و قەڵەمە شکاوێکەوە بیست و سێ ساڵە غەزەتەیێك دەردێنم نزیکە هەزار هەفتە تەواو بکا، غەزەتەکەم لە حەوت رەنگ مەعلوماتی تیایە، عیلمی، فیقهی، ئەدەبی، تەئریخی، فەلسەفی، فکاهی و میزاحی و ئیجتیماعی خۆ نزیك بیست هەزار شیعرو پەندی پێشینیانیشی زیاد. هونەرەکەی من ئەوە کتێب و کتێبخانەم نییە هەرچی ئەنووسم لە تورەکەی مام برینداری عەتار، یەعنی حوجەیراتی دەماغیەی خۆمی دەردێنم و ئەوەی بە منداڵی لای مەلا حسێنە گۆجە خوێندومە لە سمایلنامەوە بیگرە تا بەیتی مشك و پشیلە و ئەوەی خۆم بە حیکایەت خوێندومەتەوە وەك ئەرچوو شێرو یوسف و زولەیخا و ئەسکەندەرنامە حەوت جلد و زۆر شیعری کۆن هەرچی لە وڵاتی ئێمەدا باوە لەبەرمە و دەست و چاوو وجودم ئەمەندە لە کارایە چشتی زۆر گران بە دەست هەڵدەگرم و بە شەو خەتی زۆر ورد ئەخوێنمەوە و پشتیشم راستە، ئەمانە لە هاوساڵی خۆم و پیرەکانی ترا شك نابەم، بێینە سەر خواردن من لەو باشترم و خۆشتر رائەبوێرم چونکو دائیم هەموو رۆژێ کەباب

ئەخۆم ئەو گیاخۆرە، قەد عەرەقم نەخواردۆتەوە، ئەو ناتوانێ لە گەرمادا بژی بە زستان پەنجەرەی ئۆدەی داناخا، من بە چلەی هاوین لە ژێر خانێکا ئەنووم و بیست ساڵە ژوور سەرم نەکردووەتەوە، ئەمە سرێکی دینی و ئەدمانێکی زیاتری ئاگری جەهەنەمە ئەگینە بە چلەی زستان بەو جلانەی هاوین لەبەرمایە لە بەفرو سەرمادا ئەگەڕێم و ئەتوانم لە سەربانیش بنووم، ئەمانە ڕاستن و درۆیان تیا نییە.

لە بابەت خواردنیشەوە بەدەست خۆمە توانیومە لە زەرفی هەموو بیست دەقیقەدا جارێکی تر نان بخۆم و توانیویشمە دوو ڕۆژ بە هەوەس هیچ نەخۆم، تا ئەمساڵیش لە حەیات خۆما ڕەمەزانان نەخۆش بووبم هەرچی بووبم بە ڕۆژوو بووم ئەویش لە بیست و چوار سەعاتا جارێك ئێواران نانم خواردووە، ئەمە من و ئەوە برناردشۆ کە ئەو لە شوێنێکی وا دایە ئەیگرن بەسەر سەرەوە من لە شوێنێك دام ئەڵێن بڕوخێ و تووڕەیش نابم و ئیدیعای ئەمەیش ئەکەم ئەو پەندی پێشینیانە من و هەموو ژمارەیێکی غەزەتەکەمدا ئەینووسم تا ئێستا نەبێژراوە و نە ئەبێژرێ و نە ئەبێژرێ. خوا لێی خۆش بێ غاندی جارێك قینی هەڵسا وتی: هیچ ناخۆم تا دەمرم. من لە غەزەتەکەما نووسیم ئەوی ئەو نایەوێ من بۆی ئەخۆم ئازایە با، نەداتەوە سەر خواردنی من، ئاخری ئەو هاتەوە، بەم بزانین برناردشۆ کەی پەکی نووسین و بینینی نەکەوێ و کاممان بەگوڕتر ئەمێنین و کاممان زووتر ئەمرین.

گوێلکی خۆماڵی بۆچ نابێ بەگا

گورتان بێ یا گا قۆچتان تێهەڵدا(*)

(*) لە (ژین)ی ڕۆژی پێنج شەممەی ڕێکەوتی ٢ی ئەیلوولی ١٩٤٨دا بڵاوکراوەتەوە.

# دوو دوشمنی کوشندە

*دوو دوشم هەیە کەوتنە ناو هەر قەومێکەوە پەرێشانی ئەکەن.*

## جەهل و حەسەد

## نادانی و بەغیلی بەیەك بردن



نادانی چاری ئەکرێ، دەرمانی خوێندنە، بەڵام بەغیلی و قینەبەری لە ڕەگ پەیدایە، زۆرتریش خوویێکە و لە باوکەوە لە سرشتدا پەیدا ئەبێ، بەهەر چیم ئەزانن بزانن، من ئەڵێم ئەم خووە بەدە و ئەم قین لە یەك بەستنە لە تەبیعەتی خاك و هەوای نیشتمان دایەو زۆرتریش ئەم لکە پیسە ئەکەوێتە دەماخێکی زۆر بڵند و زیرەکەوە، ئینکار ناکرێ ئەم





بستە خاکەی ئێمەیە نەوعی زەکای تیا هەڵکەوتووە لە کەم شوێنی تردا بووە، جارێ لە عیلم و ئەدەب و فەزڵ و هونەردا من بیست و پێنج ساڵە بە ریزە ئەدیب و شاعیر و نامدارانی تەئریخی و سیاسی ئێرە ئەنووسم ژمارەی ژین ٩٥٣ بۆ هەزار چل و حەوتی ماوە هێشتا تەواوم نەکردووە. تا دەوری عوسمانی هەرچی لێرەوە ئەگەیشتە ئەستەمۆڵ ناوداری و مەوقیعێکی بڵندی پەیدا ئەکرد. ئاخر حوکمداری ئێرە ئەحمەد پاشا (یەمەن) کە بە هەموو قوەتی عەسکەریەی عوسمانی دانەمرکا، بە تەنها چوو ئیسلاحی کرد، سەعید پاشا کە لەوان بەجێ مابوو شوێن کاروان کەوت و چووە ئەستەمۆڵ بوو بە وەزیری خارجیە و هەرچی زبان و هەرچی سیاسەتی جیهان هەیە ئەیزانی، ئیبراهیم حەیدەری کە لێرە لە حوجرەی مزگەوتان خوێندبووی بوو بە (شێخ الاسلام)ێکی ممتازی خەلافەتی ئیسلامیە و هەرچی ئەچووە مەکتەبی حەربییە بە ئەرکان دەردەچوو و لە عیراقیشدا وەزارەت کەمتر پایەیان بوو، ئەمە زەکا!! بێینە سەر تەبیعەتی خاکەکە تا لە خاکی سلێمانیدان بەعمومی ناهەواو دوژمنی یەکن گرەوی ئەو کەسە ئەدەم دوو برای لەگەڵ یەك ڕێکوپێکم پێ نیشان بدا ئەمە زۆر ئاشکرایە هیچ دەلیلی پێ ناوێ دوو ناحەزی یەك لێرە دەرچن لە کەرکووك ئامۆزای یەکن لەوە بەولاوە برای بە ڕاستین ..

*تەئریخی ئێرە ساڵی دووسەدە*
*وا دەرئەکەوێ خاکەکەی بەدە*
*ئەگینە تا شار قەڵاچوالان بوو*
*دوازدە سوارەمان مەردی مەیدان بوو*

*لێرە پەروەردەی ئەم خاکە بەدن*
*جووجەڵەن دەندوك بە توێکلا ئەدەن*

دەلیلی تەئریخیش لەگەڵ گواستیانەوە ئێرە ئەوەل پادشا لەسەر تەخت دانیشت براکەی لەشکری لێکرد دەری پەڕاند تا بڕانەوە شەڕی برایان بوو، ئەمە دەردێکە وەك ڕەگی گولی دەوای نییە مەگەر بەدوو چەشت یەکێکیان تەحسیلێکی بەرزی وا کە بزانێ نیفاقی ناوخۆ چەند خراپە و هیچ کەسێ کە کەسێ بە گەورە نەزانی بەهیچ نابێ کە لەوە گەیشتن و پشتیان دایە یەك تەماع ناکەنە لاکیان، ئەگینە هیچ حکومەتێك لە لاوە کەسی نەهێناوە بەسەرمانا بیکا بە جاسوس بەناو خۆمانا جاسوسی وامان تیا هەڵکەوتووە بێ ئەمان و بێ ویجدان و مامۆستای شەیتان. سەیرکەن ئەم چەندانە کە ئیدارەی عورفیە هەیە ڕۆژی دەفتەری دەستەیێك لە بەغداوە دێت یاللا بیان بەن، متەسەڕفەکەمان ئەنووسێ باوە ئەمانە سەهووە کەمیان ڕاستە، ژۆرنالچییەکانی ناوخۆمان ئەڵێن اشهدبالله سڕی پۆلیسی شکاند و گووی ڕوخاند ئینجا کە سەویەی خۆمان ئەمەبێ لاوە بەغیرەتەکانمان بۆچ بەخۆڕایی ئیستیقبالی خۆیان مەحو بکەنەوە. ئاخ خۆزگە ئەم غیرەت و مەتانەتە و ئەم لە هیچ نەپەڕموونەوەی ئەم جگەرگۆشانە لەسەر تێگەیشتن و یەکدڵی ڕێك وجودی هەموو لایێك ئەبوو – بەڵام ناوەخت و نابەجێ بە گورگان خواردوویان ئەدەن.

دووەم ئەمەیە وەك ئەولادێکی چاك بە خدمەت و ئیتاعەت و قابلییەتی خۆی باوك ماڵی بۆ جوێ ئەکاتەوە، ئەگینە بەم جانە حەبەشییە نابێ، بەڵێ ناتوانم بڵێم ناحەقی زۆرە، بەڵام بەم ڕەنگە نابێ بە

زۆرەملێ كار ناچێتە سەر بە زبانى شيرين مار لە كون دێتەدەر، تورك ئەڵێ: (كوپرى يى كچنجەيە، قدرايى يە دايى ديمەلى)[*]

## دووبارەى مێژوو

دەورى جيهان و گەردشى زەمان هەر لە سى و شەش ساڵدا دووبارە ئەگەڕێتە سەر ڕاهەڕێى خۆى، ئەمڕۆكە سێى نيسانى ئەفرەنجى يە ڕۆژ لەچ بورجێكدا هەڵاتبێ و بە چ (كەلو)ێكدا ڕۆيى بێ دواى سى و شەش ساڵى تر ديسان ئەم هەوايە و ئەم سەعات و وەضعييەتەيە كە پێى ئەڵێن (قرن)، تەئريخيش زۆرجار هەندێ وەقايع ئەنوێنێ لەمەو پێش رووى داوە و ئەم جاريش هەرچەند عەينى ئەشخاس و مەوقيع و مادە نييە، بەڵام ئەشوبهێتە ئەو و ئەهلى كەمال دەرسى عيبرەتى لێ وەرئەگرن، من لە حەياتى خۆما سێ مەسئەلەى حال و ئيستيقباڵى كوردەواريم دى كە تەجروبەيێكى ئاشكرا و عەينى نەتيجە بوو. گرتومەتە هۆش و ئەيشى لێم گوێى پێ نادەنێ و لێم نابيەن. خۆم لەوانەم كە بۆ حالەتى كوردەوارى ئەوانەم لە بيرە و باوەڕيشم پێى هەيە كەچى بە كەمتر هەوايێكى هيوا ئەكەومە مەلە و ئەو هەقيقەتە مانيعەيەم لەبير ئەچێتەوە جارێ لە پێش عمومى ئەم تەبەقەى ئێستايەى كوردەواريەدا ماخولانى كوردييەتى و قەومييەت و وەتەنيم كەوتە مەلەوە لە ئەستەمۆل نەعرەى وەتەنيم كێشا و لە فۆتۆغرافەكانى كە ئەمنارد بۆ كەس و كارم و ئێستا لاى جەميلى خوشكەزام مەوجودە ئەمنووسى: (اوج وطنمدة اوجوشان روح رەوانم) ئينجا لە پايتەختدا غەزەتەى كورديم دەركرد و لە غەزەتەى (محيطى مصور) ى و مصردا و لە ڕۆژنامەى هەرە گەورەى پاريس (تان) و لە (شفق سرخ) و (فرهەنگ)ى ئيراندا بانگى كورديم ئەدا و لەسەورە و قۆميتەى ئەرزڕۆمى كوردانەدا لەگەڵ خاليد بەگ و يوسف ضيا و دوكتۆر فوئاد و كەمالدا و لە خدمەت مەلا سەعيد بديع الزماندا رەنجم ئەداو ئيدارەى عورفيەتى ئەستەمۆل بە ئيعدام مەحكومى ئەكردم عارم نەئەنا، ئێستا كە بێ دەنگ ئەو سێ چار تەجرەبەيە خاوى كردوومەوە و بە صوڕەتى وەسيەت يا حيكايەت بۆتانى ئەگێڕمەوە.

ساڵى ٣٠٣ى ڕۆمى تا ئەيلولى ٣٠٥ لە هەڵەبجە لەسەر وەزيفەى ئەراضى سەنيية بووم، زۆرتر موحەبەتى مەحموود پاشا بووم ئەگەرچى وەتمان پاشا قائيمقام بوو مەحموود پاشايان كردبوو بە متەصەڕفى ئورفە نيازى نەبوو بچێ تا شەوێكى ٢٥ى ڕەمەزانى ١٤/٣٠٦مايسى ى ٣٠٥ لە ماڵە گەورەى كەنارى زەڵم مەحموود پاشام ئيقناع كرد بچێ بۆ ئەستەمۆل هەر ئەو شەوە دواى پارشێو سوار بوو ڕۆيى. لە ئەستەمۆل راى كرد بە ڕێى باكۆدا هاتەوە و دنياى تەجرەبە كرد لە ١٥ى شەوى ٣٠٩ و ١ى مايسى ٣٠٨ چووەوە ئەمجا بە عەفو ئيعادەى نيشانەى لە جمادى الاول ٣١٢ هاتەوە لەو هەموو تەجرەبەيە و چاوپێكەوتنى نەگبەت و سەعادەتەدا هاتبوو بە خەياڵيا كە حكومەتى عوسمانى حوكمى نەماوە ئەو حكومەتێكى كوردى تەشكيل بكا، بەو خەياڵەوە هەرچى ناودار و سەركومارى كوردستانى ئەم لايە كۆى كردنەوە لە ١ى مايسى ٣٠٩ دا لە

---

[*] لە ژمارە ١٥٣ى ڕۆژى پێنج شەمەى ڕێكەوتى ٣ى شوباتى ١٩٤٩ لە ل (١)دا بڵاوكراوەتەوە.





کەناری زەڵم قۆنغرەیەك بەسترا و قەراریاندا کە بەڵێ مانعێك نییە کوردستان حکومەت بێ، زۆرتر ئومێدی بە من بوو تەشکیلی حکومەتە تازە پێگەیشتوەکەی بۆ کۆ بکەمەوە و بیکەن بە دەستوری ئیدارەی، منیش لە هەموو تەرتیبێکدا ئوصولی (فەدەراسیۆن)ی پرنس بسمارقم پەسەند کردووە، کە تەشکیلاتی ئەساسیەی جاف عەینی ئەو قانونە بوو، تا دوای ڕۆژ بانگی کردم فەرمووی بێنە بزانم چیت هێناوەتە قەڵەم، منیش شێتانە بە زبانما هات وتم پاشا بە خۆڕایی خۆم ماندوو ناکەم، زۆر تووڕە بوو، ناحەقیشی نەبوو هەموو ئومێدی سەڵتەنەتی کوردستانم ئەشێواند دوایی عەرزم کرد پاشا تەشکیلی حکومەت سەهلە و قانوونەکەیشی حازرە، بەڵام لێکی بدەرەوە کێ؟ ئەبێ بە رەئیسی حکومەت، محەمەد پاشای باوکی تۆ، کە یەکە دانای عەهد و پەسندی پاشای ئێران و پاشای عوسمانی بوو متەصەڕفی سلێمانیان دایێ و قوەتی دەوڵتێکی بە شان و شکۆی لە پشت بوو خەزورەکانی، کوڕەکانی تووڕەیان کرد متەصەڕفی جێ هێشت، سلێمانی لە ئیبتیدای تەشکیلییەوە هەرچی ئەبوو بە حوکمدار برا بچووکەکەی دەری ئەپەڕاند. ڕاوەستە تا هۆشی برایەتی و یەکیەتی دێتە کەللەوە ئەوسا سەهلە، هەناسەیەکی هەڵکێشا و وازی هێنا. لە ئەستەمۆل جەمعیەی کورد کۆبونەوە و هەزار حەمال و کاسب و مەئموور و پاشایان بۆ هاتنە سەر ئەوەی یەکێ بکەن بە رەئیس، بوون بە حەوت فرقە، دەستەیێك شێخ قادری شێخ عوبەیدولاهی، دەستەێك شەریف پاشای سەفیری پاریس. ئەم حەوت لەشکرە لە مزگەوتی ئایا صۆفیەدا یەکتریان دایە بەر خەنجەر کەس گەورەیی کەسی قبوڵ نەکرد خالید بەگی رەئیسی سەورەی ئەرزڕۆم قەراری



دابوو کە لە حکومەتی عوسمانی جوی نەبینەوە شەهزادەیێك والی عمومی کوردستان بێ ئەوە باسی بووم، بەڵام قیامی شێخ سەعید هەموو رەنجێکی بەبا داین و هەموو نامدارەکان لە قەنارە دران، بارزانیش وا لێرەیش تەحەڕور و پارت - خولاسە تا خۆمان نەبین بە پیاو و یەك نەکەوین کەس نامان کا بە پیاو کەواتە با بە عارو مۆری خۆمانەوە دانیشین و بە خۆڕایی ئەم جگەرگۆشانە نەدەین بە کوشت و ئێستیقبالیان مەحو نەکەینەوە.(*)

تکایە ئەم بابەتەی پیرەمێرد (دوو دەردەی کوشندە) (٣) جار بیخوێننەوە!
K21

(*) لە (ژین)ی ژمارە ٩٥٣ی ڕۆژی پێنج شەموی ڕێکەوتی ٢ی شوباتی ١٩٤٩ لە ل (٢ ـ ٣)دا بڵاوکراوەتەوە.

## مستەفا ئەمین گەورە ڕۆژنامەنووسی عەرەب :

# هەروتارە و تەنگژەیەکی هەیە



**پێشەکی و وەرگێڕان: جەوهەر کرمانج**

**پێشەکی وەرگێڕ:**

**سەرەتا پێویستە ئەوە بڵێم کە بیرۆکەی وەرگێڕانی ئەم کتێبە هی کاک ستران عبدالله بوو کە ئەو دەمە سەرنووسەری ڕۆژنامەی ((ئاسۆ)) بوو ئەو پێشنیازی کرد بە ئەڵقە لە ڕۆژنامەی ئاسۆ بڵاوی بکەمەوە، دوای ئەوەی بە وردی خوێندمەوە دەستم بە وەرگێڕانی کرد.. ڕەنگە هەبێ بپرسێ کتێبێک کە باس لە ڕەوشی ڕۆژنامەوانی زیاتر لە هەفتا ساڵ بەر لە ئێستای وڵاتی میسر دەکات چ سودێکی بۆ ئێستای ڕۆژنامەگەری کوردی هەیە..؟ بەڵام ئەگەر خوێنەر بەتایبەتیش ئەوانەی لە بواری ڕۆژنامەوانیدا کار دەکەن سەرنج بدەن بۆیان دەردەکەوێ کە لێکچوونێکی زۆر لە نێوان ئەم سەردەمەی ڕۆژنامەوانی ئێمەو ئەو سەردەمی ڕۆژنامەوانی میسردا هەیە ئەویش لە چەند ڕوویەکەوە کە گرنگترینیان ئەمانەن :**

**یەکەم :** لێرەی کوردستان‌و لەوێی میسردا گەرەلاوەژەیەکی بەرفراوانی دەرچوونی ڕۆژنامەو گۆڤار هەیە بە جیاوازیی زەمان.

**دووەم:** لەهەردوو شوێن دوو جۆرە ڕۆژنامەو گۆڤار هەن ، گۆڤارو ڕۆژنامەی ئازادو سەر بە کەرتی تایبەت ، ڕۆژنامەو گۆڤاری سەر بە حیزبەکان.

**سێیەم:** لە هەردوو وڵات بە جیاوازی سیستەمی حوکمڕانی کەم‌و کورتی ئیداری بەرچاو دەکەوێ‌و تا ڕادەیەکیش گەندەڵیەکان لە یەک دەچن‌و ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیش بەیەک ئاراستە کاریان کردووە.

**چوارەم :** لە هەردوولا ڕۆژنامەو گۆڤارە ئەهلیەکان ئازادترن لە ڕۆژنامەو گۆڤارە حیزبیەکان بەتایبەتیش سەبارەت بە ڕەخنە گرتن لە کارو بەرنامەی دام‌و دەزگاکانی حکومەت‌و خستنە ڕووی کێشەو گرفتە سیاسی‌و کۆمەڵایەتیەکاندا.

**پێنجەم :** بوونی سانسۆر بە شێوەیەک لە شێوەکان یان هێڵی سوور بەر چاو دەکەوێ، لە میسر بۆماوەیەکی زۆر دەوڵەت سانسۆری لە سەر هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا داناوەو دەستی خستۆتە بینە قاقای ڕۆژنامە نووسەکان، لەلای خۆشماندا ئەگەر چی حکومەت بە هیچ شێوەیەک سانسۆری لەسەر بڵاو کراوەو میدیاکاندا نەبووەو نیە، بەڵام لای زۆرێک لە سەرنووسەرەکان هێڵی سوور دادەنرێ‌و وێڕای ئەوەی کە لە دامێنی یەکێ لە لاپەرەکانیاندا دەنووسن « جگە لە سەروتار ڕۆژنامەکە بەرپرس نیە لە وتارو نووسینەکاندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ جار نووسین ڕەت دەکرێتەوەو گۆشە سەریان دەکرێ بە پەتا..! من وای بۆ دەچم کە ئەم جۆرە سانسۆرکردنەی لای خۆمان زیاتر بۆچوون‌و لێکدانەوەی سەرنووسەرەکانە نەک بۆچوون‌و فەرمانی حیزبەکان.

**لەسەر ئەو لێکچوونانەی سەرەوە بەپێویستم زانی ئەم کتێبە بەزمانی کوردی بخەمە بەر دەستی خوێنەرو ڕۆژنامە نووسان بۆئەوەی ئەوانیش بەراوردێك لەنێوان ڕەوشی ڕۆژنامەوانی میسرو کوردستاندا بکەن‌و کەڵك لە لایەنە باشەکانی وەرگرن‌و لایەنە چەوت‌و خراپەکانیشی بەلاوە بنێن.**





## هەر وتارێ تەنگژیەك و سەربردەیەكی هەیە..!

من چۆن هەناسە هەڵدەكێشم واش دەنووسم، لە نووسینیش ناكەوم مەگەر دەست بخەنە سەر دەمم و هەناسە بڕم بكەن..! ناشزانم كە دەنووسم وتارەكانم خەڵك دڵخۆش دەكەن یان ناڕەحەت، پێشموانییە وتارێكم نووسیبێ هەموو خەڵكەكەی دڵخۆش كردبێ، بەڵام وتاری وام هەبووە هێندێكی دڵخۆش كردووە و هێندێكیش ناڕەحەت، كە هەوڵیش دەدەم بە كێشانی وێنەی گوڵێك دەست پێبكەم و دواتر ببێ بە خەنجەر، یان بە سەلام كردن لە دەسەڵاتدارێك و پێنووسەكەم سەلامەكان لەگەڵ نەفرەت تێكەڵ بكەن، لەوەدا كەسانێك پێیانوایە دەمەوێ نەفرەتی لێبكەم و هێندێكیش پێیانوایە ویستوومە سەلامی لێبكەم، كەچی خۆم نەمویستووە نە نەفرەتی لێبكەم و نە سەلام، بەڵكو مەبەستم ئەوە بووە هەقیقەت بنووسم، هەقیقەتیش ڕەش یان سپی نییە، زۆر ڕەنگی دیكەی لەنێوان ڕەش و سپیدا تێدایە، جاریواش هەیە وتارێكی خۆڵەمێشی دەنووسم و خوێنەوار هەیە دێ و دەڵێن سپییە، هێندێكی دیكە دێن و سوێند دەخۆن دەڵێن ڕەشە، لە بەدبەختیدا گەلێ لە دەسەڵاتداران و زەبر بە دەستان تووشی نەخۆشیی كوێری ڕەنگ هاتوون و ڕەش بە سپی و سپیش بە ڕەش دەبینن، چەندین وتارم نووسیوە و پێموابووە توندە كەچی وەك شنەبایەك تێدەپەرێ، دەوای ئەوەش وتاری ئاساییم نووسیوە كەچی دنیای خراپ كردووە و ڕەشەبا و گەردەلوولم بۆ هەڵكراوە.

بۆیە هەر وتارێكم نووسیبێ سەر بردەیەكی هەیە، جاریواش هەیە سەر بردەكە بەر لە نووسینی وتارەكە سەرهەڵدەدا، هەندێ جاریش دوای نووسینی، یان لەكاتی نووسینیدا.

زۆر وتاریشم نووسیون ڕووناكییان نەدیوە. پێنووسی سانسۆر هاتووە و ئەتكی كردووە، یانیش چەند دێڕێكی لێ قرتاندووە و چەند دێڕێكیشی بۆ زیاد كردووە.!

لە گەپجاریی چارەنووسیشدا لە ژیانمدا نەبووە زنجیرە وتارێكم نووسیبێ و تەواوم كردبێ، هەمووجارێ دەستێك پەیدا بووە و ڕایگرتووە و شەهرەزاد دەمكوت كراوە، خوێندەوارەكانیش نازانن چی قەوماوە..!

بۆ لەناكاو زمانم لاڵ بوو..! زنجیرەكە بۆ نەما..؟

ئەگەرچی من لە کۆتایی دوا وتارمدا گوتوومە: "بەشێ داهاتوو سبەی" بەڵام ئەو سبەینە هەرگیز نایێ..!

ساڵی ١٩٤٤ زنجیرە وتارێکم بڵاو کردبۆوە بەناوی "بۆچی پەیوەندیی نێوان کۆشك و وەفد تێکچوو..؟" لەسەر ناکۆکیی نێوان مەلیك فاروق و مستەفا ئەلنەحاس پاشای سەرەك وەزیران بوو، لەوێ نهێنییەکانی ئەو تەنگژەیەم درکاندبوو کە لەگەڵ ڕووداوەکەی ٤ی شوبات سەریان هەڵدابوو.

لەوان ڕۆژانیشدا ئەو ناکۆکیانە بە سیاسەتی باڵا لە قەڵەم دەدران و نەدەبوو میللەت وردەکارییەکانیان بزانن، منیش ڕاموابوو دەبێ میللەت هەمووشتێك بزانێ. من سێ وتارم دەرهەق بەو نهێنیانە و شاراوەکانی ئامادە کردبوو کە ١٤یانم لە (اخبار الیوم) بڵاو کردەوە، کەچی لە پڕ مەلیك فاروق فەرمانێکی بە قەدەغەکردنی بڵاوکردنەوەی دەرکرد. لەو سەردەمیش سانسۆر لەسەر ڕۆژنامەکاندا هەبوو و نەمتوانی وتاری پازدەهەم بڵاوبکەمەوە.

نازانم مەلیك فاروق بۆ بڵاوکردنەوەی قەدەغە کرد..! پێیان گوتم هەندێك لە پیاوەکانی وایان حاڵی کردبوو کە نووسین بەم ڕاشکاویە لەسەر ناکۆکی نێوان سەرەك وەزیران و مەلیك کەمایەتیە بۆ مەلیك کە یەکسانی دەکات لەگەڵ سەرەك وەزیراندا..!

بەڵام بۆچی مەلیك فاروق چواردە هەفتان ڕاوەستا تا ئەم بڕیارە دەربکات.؟!

ساڵی ١٩٥٢ش لە زنجیرە وتارێکمدا دەستم بە نووسینی تەواوی سەربردەی مەلیك فاروق کرد لە "اخبار و اخبار الیوم"دا، بەڵام بەر لەوەی بنووسم قسەم لەگەڵ جەمال عەبدولناسر کرد و ڕەزامەندی لەسەر بڵاوکردنەوەی نیشاندا، چەند بەشێکیشم لێ نووسی، کەچی بێکباشی جەمال عەبدولناسر بە تەلەفۆن داوایلێکردم زنجیرەکە ڕابگرم چونکە هەندێ لە برادەرەکانی لە ئەنجومەنی شۆڕشدا ناڕازی بوون..

ئەوە بوو زنجیرەکە ڕاگیرا..!

دیسان دەستم پێکردەوە، بەڵام بێکباشی جەمال عەبدولناسر داوای کردم و چوومە ماڵەکەی و داوایلێکردم ڕایبگرم چونکە هەندێ لە ئەفسەرەکانی پێیانوایە مەلیك فاروق بەبیر خەڵك دێنێتەوە کەچی پێویست وایە لە بیر کرێ.

زنجیرەکەم ڕاگرت کە هێشتا نزیکەی شەست وتاری مابوو..!

ڕۆژێکیان بێکباشی عەبدولناسر داوایلێکردم و پێی گوتم وای پێباشە سەربردەی شۆڕش بنووسمەوە و ناوی ئەو نۆکەسەی دامێ کە ئەنجومەنی شۆڕشیان پێکدەهێنا و بە درێژیش باسی شۆڕش و نهێنییەکانی بۆ کردم. پێشی گوتم بێکباشی ئەنوەر سادات لە ماڵەکەی خۆیدا لە (منیل الدوخە) لەگەڵم کۆدەبێتەوە بۆئەوەی بەر لە بڵاوکردنەوەی وتارەکان چاوێکیان پێدا بخشێنێتەوە.

بێکباشی سادات یەکەمین وتاری خوێندەوە و بەتەلەفۆنیش جەمال عەبدولناسری لێ ئاگادار کرایەوە و دوای گۆڕینی سێ وشە بڕیاری لەسەردا، ئەوەبوو لە لاپەڕەی یەکەمدا وێنەی جەمال عەبدولناسرم بەتەنیا بڵاوکردەوە و وێنەی ئەندامەکانی دیکەی ئەنجومەنیش کە هەشت کەس بوون پێکهاتبوون لە (جەمال سالم، ئەنوەر سادات، عبدول لەتیف بەغدادی، کەمال الدین حسین، حەسەن ئیبراهیم سالم و عەبدلحکیم عامریش لە لاپەڕەیەکی ناوەوەدا لەگەڵ پاشماوەی وتارەکە.

دواتر لە وتارەکەی دیکەمدا ئەوەم بڵاوکردەوە کە "زکریا محی الدین و عبدالمنعم امین و حسین الشافعی و یوسف صدیق بۆ ئەنجومەنی شۆڕش زیاد کراون، پاشانیش مەسەلەی زیادکردنی محمد نەحیب و هەڵبژاردنی بۆ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی شۆڕش دوای دەستبەرداربوونی جەمال عەبدولناسرم





نوسیبوو، هێندەی نەمابوو (الاخبار) زنجیرەکە بەناونیشانی "سەربردەی نۆ کەسەکە" بڵاوبکاتەوە، چەند ئەفسەرێك لە ئەفسەرانی "زوبات ئەلئەحرار" قیامەتیان لێ ڕابوو هەریەك لەوانە خۆیان بە ئەندامی ئەنجومەنی شۆڕش هەژمار دەکرد و جمال عەبدولناسر ناوی ئەندامانی ئەنجومەنی شۆڕشی بەوان نەگوتبوو..! جەمال عەبدولناسر بە تەلەفۆن پێی ڕاگەیاندم کە فەرمانی داوە لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا بکرێ چونکە ئەو وتارانەی بڵاومکردوونەتەوە ئاژاوەیان لەنێو هێزی سەربازیدا خوڵقاندووە و یەکێك دەنێرێ کە فەرمانڕەی باڵێکە و جەمال سالم ـ ە بۆئەوەی لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم تۆمەتە ترسناکە ئەنجام بدات.

جمال عەبدولناسر مکوڕبوو بە درێژیش باسی لێوە نەکرد و بە پەلە کۆتایی بە قسە تەلەفۆنییەکە هێنا – * ئەگەرچی ئەوە خەسڵەتی ئەم نەبوو کەچی لەگەڵ ئەمەشدا پێی ڕاگەیاندم کە بەتەنیا نەبووە لەوکاتەی، ئەم بڕیارە سەیرەی دەرکردووە... زەندەقم چوو، ئاخر تاوانی ئاژاوە دروستکردن لە ڕیزی سوپادا سزاکەی سێدارەیە بە تایبەتیش لە سەرەتای شۆڕشدا. پاشان خۆم دەزانم جەمال سالم چەند توندوتیژە ئەو لەو دەمەڕا برادەرمە کە لە زانکۆی ئەمریکی دەمخوێند.. جەمال سالم هاتە نووسینگەکەم لە ڕۆژنامەی (اخبار الیوم) و بە زمانێکی فەرمانپێکردن داوایکرد دەرگاکە داخەم، ئەوەبوو دەرگاکەم داخست، کەچی جەمال لە تریقەی پێکەنینیدا و گوتی ئەوە شانۆگەرییەکە جمال عەبدولناسر ڕێکی خستووە بۆئەوەی کەف و کوڵی ئەفسەرە تووڕەکانی پێ دامرکێنێتەوە کە لەسەر چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شۆڕش تووڕە ببوون، فەرمان دەدا بە ڕاگرتنی وتارەکان، لەسەر منیش پێویستە لە هەموو کەسێکی بشارمەوە کە جەمال عەبدولناسر سەرچاوەی ئەو زانیارییانەیە.

ئەم ڕاستییەشم بۆ کەس باس نەکردووە، ئەوە ئەمڕۆ بۆ یەکەمین جار باسی لێوەدەکەم..! ئەوەبوو زنجیرە وتاری (سەربردەی نۆ کەسەکە) ڕاگیرا.

ساڵی ١٩٦٠ جەمال عەبدولناسر پێی گوتم:

–خەڵك ئاگایان لەو گەشتە تەم و مژاوییە نییە کە تۆ لەکاتی (دوژمنکاری)دا (عدوان) کردت، بۆ بە زنجیرە بڵاوی ناکەیتەوە و وردەکارییەکانی ئەم گەشتە سەیرە باس بکەیت، بە مەرجێك بەر لە بڵاوکردنەوەی هەر وتارێکدا پێشتر بە تەلەفۆن بۆم بخوێنیتەوە.

لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە سەر لە بەیانیانی هەموو ڕۆژێك لە کاتێکی دیاریکراودا وتارەکانی بۆ بخوێنمەوە، عەبدولناسر هەندێکی کە نەیدەویست بڵاوببێتەوە لایدەبردو زانیاری دیکەشی بۆ زیاد دەکرد کە پێیوابوو خەڵکەکە بیزانن باشە. ئەو زۆر گرنگیی بەم وتارانە دەدا تەنانەت داوای لە دکتۆر عەبدولقادری جێگری سەرەك وەزیران بۆ کاروباری ڕاگەیاندن کرد، هەر وتارە و ڕۆژی سێ جاران بڵاوبکرێتەوە. جارێك لە ڕادیۆی بەرنامەی گشتی و جارێك لە ڕادیۆی (دەنگی عەرەب) و جارێکیش لەیەکێ لە ڕادیۆیە ئاراستەکراوەکاندا. لە پڕ سەرۆك عەبدولناسر فەرمانی ڕاگرتنی وتارەکانیدا، چونکە هێندێ ڕاپۆرتی لە دەزاکانەوە پێگەیشتبوو کە گوایا من مەبەستم لە بڵاوکردنەوەی وتارەکاندا ئەوە بووە بڵێم من پاڵەوانی شەڕی ١٩٥٦ بووم نەك سەرۆك جەمال عەبدولناسر.

خوداش دەیزانی من نە لە نزیك و نە لە دوور مەبەستم ئەوە نەبووە، تەنانەت هەر بە خەیاڵیشمدا نەهاتبوو، ئاخر من بە تەواوەتی نەمدەزانی پاڵەوانی شەڕی سوێس جەمال عەبدولناسر بوو، ئەوەی منیش کردوومە ئەرکی سەرشانی سەربازێك بووە کە بەشداری لەو شەڕەدا کردووە. هۆیێکم لە خۆم زانی کە سەرۆك ناکۆکییەکی قۆزتۆتەوە کە لە نێوان

ئەنجومەنی ئیدارەی (اخبار الیوم) و ئەمین شاكری بەڕێوەبەری نووسینگەكەیدا ڕوویدابوو، ئەوەی كە وەك ئەنجامێكی نێردراو لە (اخبار الیوم)دا دایمەزراندبوو، ئەوەبوو فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنەكەی دا و من و عەلی ئەمین و جەلالەدین ئەلحەماسی وەك سەرنووسەرانی (اخبار الیوم)ی لا برد شەش مانگان من و عەلی ئەمینی لە ماڵەكەماندا دەستبەسەركرد و لەم ماوەیەشدا لیژنەیەك لە موخابەرات و نوێنەرایەتی كارگێڕی و سانسۆری ئیداری لەسەر سەدان تۆمەت لێكۆڵینەویان لەگەڵدا كردین، سەرەنجام جەلال ئەلحەماسی لە (اخبار الیوم) دەركرا، چونكە چەند وتارێكی نووسیبوو تێیدا ڕەخنەی لە قەوارەی نان گرتبوو..! پاشان لیژنەكە بڕیاری بێتاوانی من و عەلی ئەمینی دەركرد و عەبدولناسر بانگی كردم بۆ ئەوەی پاش شەش مانگ خۆ دابڕانی ببینم. پێمگوت: "سەرۆك چۆن ئەوە بە خەیاڵتدا گوزەردەكات كە من زنجیرە وتاری (گەشتە تەم و مژاوی)یەكە بە مەبەستی ئەوە بنووسم پاڵەوانێتی شەڕی دوژمنكاری (حرب العدوان) لە تۆ زەوت بكەم؟ مەگەر لە بیرت چوو تۆ خۆت داوای نووسینی ئەو وتارانەت لێكردبووم؟ خۆ من پێشنیازی ئەوەم نەكردبوو، چوار ساڵان بێدەنگ بووم و دەمم نەكردەوە، تەنانەت بە وشەیەكیش ئاماژەم بەو گەشتە نەدا، یان ئەوەت لە بیرچوو جەنابی سەرۆك كە ڕۆژانە هەموو وتارەكانم لەسەرەتاوە تا كۆتایی بۆم دەخوێندیتەوە و بە كەیفی خۆت دەستكاریت دەكردن.. سەرۆك ئەوەشت لەبیرچوو كە تۆ فەرمانتدا ڕۆژی سێ جاران لە ڕادیۆكاندا بخوێندرێنەوە؟ سەرۆك عەبدولناسر گوتی: "لە ڕاستیدا من گومانم لەو وتارانە نەدەكرد، گوێشم بە قسەی دەزگاكان نەدەدا، بەڵام لەو دەمەیدا گومانم لا دروستبوو كە سەبارەت بە مەسەلەیەكی سیاسی لە مەڕ "كۆنگۆ" وتارێكتم خوێندەوە، كاتێكیش كە ڕاپۆرتم بۆ هات كە مەبەستت قاهیرەیە نەك كۆنگۆ..! واقم وڕما.. كۆنگۆ..؟ من نایەتەوە بیرم شتێكم لەسەر كۆنگۆ نووسیبێت، جگە لەو ناڕەزایی دەربڕینەی دەرهەق بە كوشتنی سەركردەی نیشتمانی (لۆمۆمبا) نووسیبووم. هەروەها سەبارەت بە كردەوەكانی داگیركەری بیانی دەرهەق بەو نیشتمانپەروەرانەی كۆیلایەتی ڕەتدەكەنەوە و بەرەنگاری زوڵم و زۆر دەبنەوە.. هاتمەوە ماڵەوە و وتارەكەم خوێندەوە كە ئەمەیە:

دەستگیركردنی لۆمۆمبا كۆتایی شەڕی ئازادی نابێ لە كۆنگۆ، بەڵكو سەرەتایەتی، قەفەزێك نییە جێی گەلی كۆنگۆی تێداببێتەوە، بەڵچیكا و نۆكەرەكانی بە هەڵەدا دەچن گەر وابزانن گەلی كۆنگۆیان لەگەڵ سەركردەكەی زینداینكردووە لە یەك زیندانیان ئاخنیوون!، چونكە شیشەكانی قەفەزی ئاسنین ناتوانن شنەبای ئازادی زیندانی بكەن..! ئەو هەناسانە لە توانایاندایە هەڵكوتنە سەر قەفەزەكان و بینە نەڕەیەك ئاسنەكەی بلەرزێنن و بینە ڕەشەبایەك چەپەرەكانی هەڵتەكێنن..! ئازادی زەرەر ناكات بە گرتنی یەكێ لە سەركردەكانی، چونكە كردەوەی سەركوتكردن و گرتن ئەو سووتەمەنییەن ئاگری ئازادی دادەگیرسێنن.. ئەو هەمیشە پێویستی بە هاوكاریی زاڵم و ستەمكاران هەیە، ئەگەر ستەمكاری نەبێ ئازادی گەورەترین شەڕەكانی ناباتەوە، هەر لێدانێكی ستەمكاریش لە ئازادیدا بەرەوپێشەوەی دەبات و هەر خوێنێكیش لە پێناویدا بڕژێ ئاگرەكەی خۆشتر دەكات و ڕۆژی سەركەوتن نزیكتر دەبێتەوە.

ئێمە بۆیە لە تەك گەلی كۆنگۆ ڕاوەستاوین، چونكە بەمە لەگەڵ خۆمان ڕادەوەستین.. ئازادی سنووری نییە، هەر شەڕێكیش بۆ ئازادی لەهەر كوێیەكی ئەم دنیایەدا بێت شەڕی ئێمەیە، هەر برینێكیش لە جەستەی ئازادی خوازاندا بێ لە ئەفریقیا لە

جەستەی ئێمە دەبێ.. ئێمە باوەڕمان وایە کە کیشوەری ئەفریقیا دەبێ ببێتە کیشوەری ئازادیخوازان و باوەڕیشمان بەوە هەیە کە هەر شکستێکی ئازادی لەهەر کوێیەك بێت بۆ ئازادی و سەربەخۆیی ئێمە خراپە.. لە قاهیرەوە بانگەوازی ئازادی بە هەموو زمانە ئەفریقییەکان و شێوە زارەکانی بەرزبۆوە، قاهیرە هەمیشە مۆڵگەی ئەو ئازادیخوازانە بووە کە داگیرکەر ڕاوینراون یان چەوساندونییەتەوە، ئێمە لە هەموو شەڕەکانی ئەفریقیا لە دژی داگیرکەران بەشداریمان کردووە، بەرگەی ئەو سزایەشمان گرتووە کە داگیرکەران بەسەریاندا سەپاندووین، چونکە ئێمە ڕازی نەبووین گەلێك لە کیشوەرەکەی ئێمەدا بە تەنیا بجەنگێ بێ ئەوەی دەستی یارمەتیی بۆ درێژکەین، بۆ ئەوەی لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ و ئەو داگیرکەرانە وردوخاش بکات کە بەرقامچییان دەدەن..!

ئازادی لە کۆنگۆ نامرێ.. بەلجیکاییەکان ناتوانن دەنگ کپکەن و گڕەکەی دابمرکێننەوە، یان پێشکەوتنی ڕابگرن..! هەر گۆڕێك بۆ ئازادیخوازانیان هەڵکەندبێ گەلان ئەوانیان تێدا ناشتووەن..! قەڵەمەکانیان شکاندن.. ئاخۆ شکاندنیان ڕێگا لە دەستەکان دەگرێ بەردێك بنەخشێنن وادەستەکانیان بڕین.. ئاخۆ بڕینیان ڕێگا لە چاوان دەگرێ سوور هەڵگەڕێن و چاوەکانیان کوژاندنەوە.. ئاخۆ کوژاندنەوەیان ڕێگا لە هەناسە هەڵکێشان دەگرێ؟ واهەناسەکانیان خامۆش کردن.. ئەوە تەقەڵلای ئێوەیە و بەمەش ئێمە لەدەست ئێوە ڕزگاردەبین و سوپاس.

من بڕوا و بیر مەبەستم ئەوە نەبوو خۆم لەپشت کۆنگۆدا ڕووپۆش بکەم بۆ ئەوەی باسی ستەمکاریی میسر بکەم، بەڵام زۆر لە بەرپرسان وای تێگەیشتن وا حاڵی ببوون من سەرزەنشتی حوکم و زوڵمی وڵاتەکەم دەکەم..! ئەو ڕۆژە شتێکم وەبیرهاتەوە کە سی ساڵ پێشتر ڕوویدابوو، ئەو دەمەی حکومەتی ئیسماعیل سدقی پاشا حوکمی میسری بە ئاگر و ئاسن دەکرد، ئەوێ دەمێ ئەم سەربردەیە بڵاوبۆوە:

"پیاوێك بە بەردەم سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیراندا تێپەڕی و بە هەموو دەنگی هاواری دەکرد:

-بڕوخێ حکومەتی دزان.. بڕوخێ حکومەتی جەردان.

پۆلیسێك هەڵیکوتایە سەری و داپڵۆسی و گرتی. کابرا هاواریکرد: کابرا بۆ دەمگری..؟ کێ ناڵێ مەبەستم حکومەتی عەدلی پاشا یان سەروەت پاشا یان زێوەر پاشا یان نوبار پاشا نییە..!

پۆلیسەکەش بە تووڕەییەوە پێیگوت: تۆ دەتەوێ پێم ڕابوێری..؟ من سی ساڵە پۆلیسم و هیچ حکومەتێك نەهاتۆتە سەرکار دز و جەردەبێ جگە لەم حکومەتە..! پەلکێش بە لەگەڵمدا بۆ بەشی پۆلیس.

بەرپرسەکان بەمجۆرە ویستیان مێژوو دووبارە ببێتەوە.

جاری وایە نووسەر وتارێکی پڕ بەرائەت دەنووسێ و خوێندەواری ئەوتۆی لێ قیت دەبێتەوە بۆ هەر وشەیەك ئاوازێك دادەنێ، بۆ هەر ڕستەیەکیش واتایەك، تەنانەت بۆشایی نێوان دێڕەکان و وشەکانیش دەخوێننەوە.. ئەو وشانەش دەخوێننەوە کە سانسۆر لایداون، گەلێ جاریش ئەو وشانەی خوێنەر زیادی دەکەن ڕەقەکارترن لەو وشانەی سانسۆر ڕەشی دەکەنەوە!

بەم جۆرە هەر وتارە و سەربردەیەکی دەبێ..!

## ئەدەبی ڕەفتار لە دواندنی میر و مەلیکاندا..!

زەنگی تەلەفۆنەکەی نووسینگەی مامۆستا تۆفیق دیاب-ی خاوەنی ڕۆژنامەی (الجهاد) لێیدا.. کە لەو

سەردەمیدا بەربڵاوترین ڕۆژنامەی سبەینانی میسر بوو. ئەوەی قسەی دەکرد وتی: "من مەحمود شەوقی پاشای سکرتێری تایبەتی خاوەن شکۆ مەلیك فوئادم". تۆفیق دیابیش وتی: "ئەهلەن و سەهلەن".

سکرتێرەکەی مەلیك وتی: "خاوەن شکۆ زۆر هەڵچووە و تووڕەیە، بەهۆی ئەو وتارەی ڕۆژنامەکە سەبارەت بە سەفەرەکەی (جێ نشین) بۆ ئینگلتەرە بۆ تەواوکردنی خوێندنی، لەو وتارەدا تەشەری تێدایە کە لە (جێ نشین) ناوەشێتەوە و دەستوەردانێکیشە لە کاروباری خاوەن شکۆی مەلیك".

تۆفیق دیاب وتی: "من وتارەکەم خوێندۆتەوە و هیچ تانەوتەشەرێکی بۆ (جێ نشین) تێدا نییە، هەروەها بۆ مەلیکیش".

سکرتێری مەلیك وتی: "خاوەن شکۆ دەیەوێ ناوی نووسەری وتارەکە بزانێ بۆ ئەوەی داوا لە دادوەری گشتی بکەین بدرێتە دادگا".

تۆفیق دیاب وتی: "من لەو وتارە بەرپرسم، ئەگەر کەسێك شایانی دادگایکردن بێت ئەوا منم..!".

سکرتێری مەلیك وتی: "خاوەن شکۆ پێیوایە وتار نووسەکە کۆمۆنیستە و پێشتریش وتاری هەبووە و هێرشی کردۆتە سەر خاوەن شکۆ و میرەکان ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە کۆمۆنیستە".

تۆفیق دیاب وتی: "من نووسەری هەردوو وتارەکە باش دەناسم و دەشزانم کۆمۆنیست نییە، خۆ ئەگەر ئەو کۆمۆنیست بێت ئەوا دەبێ منیش کۆمۆنیست بم..!

سکرتێرەکەی مەلیك بە سڵاوێکی لالووتانەوە کۆتایی بە قسەکان هێنا.

کاتێ بەو گفتوگۆیەم زانی، هەڵوێستەکەی تۆفیق دیابم لا سەیر بوو، ئەو لەمێژ نەبوو لە زیندان هاتبووە دەر دوای ئەوەی نۆ مانگ لە زیندانی (قەرەمەیدان) بە تۆمەتی ئیهانەکردنی سەرەك وەزیران گیرابوو، ئەو نە وتارەکەی یەکەم و نە ئەوەی دووەمی منی نەخوێندبۆوە تا لەبەردەم مەلیکدا بەرپرسیارێتییەکەی لە ئەستۆ بگرێ، سەرەڕای ئەوەش سەرنووسەری ڕۆژنامەی (الجهاد)یش نەبوو کە لە ڕووی یاساییەوە بەرپرسی هەموو ئەو نووسینانەی ڕۆژنامەکە بێت، بەڵکو سەرنووسەرەکە مامۆستا محەمەد فەهمی حسێن بوو.

ئەو وتارانەم دوای چەند ڕۆژێك لە دامەزراندنی باوکم وەك وەزیری مفەوەزی میسر لە ئەمریکا نووسیبوون. ئەگەر تۆفیق دیاب ناوی منی هێنابا من لە کۆلێژی ماف دەردەکرام و دەدرامە دادگای کەتن و باوکیشم لە وەزیری مفەوەزی میسر لە ئەمریکا لا دەدرا، بەر لەوەی بگاتە شوێنی کارکردنی، بەڵام لەوان ڕۆژانەدا شەهامەتی سەرنووسەرەکان وابوو.

مەلیك فوئاد نەیدەویست تۆفیق دیاب بە تۆمەتی لەکەدارکردنی مەلیك بدرێتە دادگا، چونکە ئەو دەمە هودنەیەك لە نێوان (الوفد) و (مەلیك)دا هەبوو کە ڕۆژنامەی (الجهاد)یش یەکەمین ڕۆژنامەی (الوفد) بوو. من وتارەکانم بە ناوی گێرەشێوێنی و بە ئیمزای (ئاژاوەگێڕی) بڵاودەکردنەوە هەینێ لە تەمەنی (٢١) ساڵیدا بووم.. کەسیش نەیدەزانی من ئەو وتارانە دەنووسم کە ڕۆژانە لە ڕۆژنامەی (الجهاد)دا بڵاومدەکردنەوە و دوو ستوونی بە تەواوەتی داگیردەکرد.

ڕۆژنامەی (اهرام)یش ڕۆژانە چەند بەشێکی لێ بڵاودەکردەوە و ناوی نابوو (قسەی ڕۆژنامەکان)، من لەوێ سەردەمیدا جێگری سەرنووسەری





گۆڤـاری (اخـر سـاعە)ش بـووم کـە خاوەنەکـەی ماموستا (تابعی) بوو و بەنیازبوو لەگەڵ ماموستا مەحمود (ئەبو فەتح) و (کەریم سابت) ڕۆژنامەی (المصری) دەربکەن، منیش خەونم بەوە دەبینی لەو ڕۆژنامە نوێیەدا کاریان لەگەڵدا بکەم، بەلام ماموستا تابعی پێیوتم بە کەڵکی کارکردن نایێم لە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەدا و هەر بۆ ئەوە خولقاوم لە گۆڤارێکی هەفتانەدا بنووسم، بێهودە هەوڵمدا قەناعەتی پێبکەم بە کەڵك دێم، بەلام لەسەر ڕایەکەی خۆی مکوڕ بوو و ڕەتی کردەوە، ناوم لە لیستی نووسەرانی (المصری) بێت. وام پێ چاکبوو بە کردەوە پێی بسەلمێنم کە دەتوانم ببمە نووسەری ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە، ئەوەبوو پەیوەندیم بە ماموستا تۆفیق دیاب کرد کە خاوەنی ڕۆژنامەی (الجهاد) بوو پێشنیازمکرد کە ستوونێکی بەردەوامم بە ناونیشانی (ئاژاوەگێڕی) لە ڕۆژنامەکەیدا بنووسم ڕۆژانە بێت بریتیبێ لە سێ چوار کورتە وتار بە قەوارەی (بیرۆکەیەك).

تۆفیق دیاب پێشوازی لە بیرۆکەکەم کرد و داوای لێکردم هەر ئەمڕۆ دەست بە نووسینی بکەم، یەکەمین وتارم نووسی و لەنێو خوێنەراندا ڕەواجی پەیداکرد، ماموستا تابعیش خوێندیەوە و لێی پرسیم: "کێیە ئەوەی ئەم ستوونە تازەیەی نووسیوە؟". وتم: "لەوانەیە فیکری ئەبازە یان عەبدولعەزیز ئەلبشری بێت". ڕۆژێکیان تابعی بۆ نووسینگەکەی خۆی بانگیکردم و وتی کۆبوونەوەی لەگەڵ هەردوو شەریکەکەی کردووە واتە (مەحمود ئەبو فەتح) و (کەریم سابت) و بڕیاریانداوە گرێبەست لەگەڵ نووسەری (ئاژاوەگێڕی)ی ڕۆژنامەی (الجهاد) بکەن بۆ ئەوەی نووسینەکەی لە ڕۆژنامەی (المصری) بلاوبکاتەوە و منیان داناوە قسەی لەگەڵدا بکەم تا ببێتە دەستەی نووسەرانی (المصری).

هاتە ناو دەستم..!

ئاخر دەبێ قسە و گفتوگۆ لەگەڵ خۆمدا بکەم. دوای دوو ڕۆژ هاتمەوە لای تابعی و وتم: "نووسەری (مشاغبات) ناوی عەلی ئەلنوحاسە و نووسەرە لە ڕۆژنامەی (الجهاد)". دوای دوو ڕۆژی دی چوومەوە لای و پێموت عەلی ئەلنوحاس داوای سەد جنیە دەکات لە مانگێکدا، ئەو پارەیەش لەوان ڕۆژانەدا خەیاڵی بوو، کەچی داوای لێکردم گرێبەستەکەی بە سەد جنیە لەگەڵ مۆر بکەم. دیسان چوومەوە لای و پێموت عەلی ئەلنوحاس داوای بووردنی کرد لەگەڵ ئێمەدا لە ئەلمیسری کار بکات، چونکە گرێبەستەکەی لەگەڵ تۆفیق دیاب ساڵێکی ماوە و پێی جوان نییە گرێبەستێك هەڵبوەشێنێتەوە و گرێبەستێکی دیکە مۆر بکات. تابعی بە ئەخلاقی ئەلنوحاس سەرسام بوو.

هەموو ئەم بەزمە و عەلی ئەلنوحاس نازانێ چی لە دەوروبەریدا ڕوودەدات، ئەو هەینێ نووسەرێکی گچکە بوو لە ئەلجیهاد و مانگانە (١٢) جنێی وەردەگرت..! هەڵوێستی تۆفیق دیاب لە دەرهەق بە من کەم وێنە نەبوو، من پێشتر جێگری سەرنووسەری (ڕۆز ئەلیوسف) بووم و هەواڵێکم لەسەر مەلیك فوئاد بلاوکردەوە کۆشکی مەلیك بە خەوشیان زانی بۆ مەلیك و خاتوو ڕۆز ئەلیوسف لەلایەن دادوەری گشتییەوە بۆ لێکۆڵینەوە بانگکرا. بە پەلە خۆم گەیاندێ و دانپێدانانێکم بە دەستی خۆم نووسی کە من نووسەری هەواڵەکەم. خاتوو ڕۆز ئەلیوسف کاغەزەکەی دڕاند و چووە لای دادوەری گشتی و بەرپرسیارێتی نووسینەکەی خستە ئەستۆی خۆی. دواتر مەحمود فەهمی پاشا ئەلنقراشی هەواڵێکی دایە ماموستا تابعی و لە

گۆڤاری ڕۆز ئەلیوسف بڵاوبۆوە، ئەوە بوو وەزیری داد و دادوەری گشتی بە تانە و تەشەریان زانی بۆ سەر خۆیان و لێکۆڵەرەوە داوای لە تابعی کرد سەرچاوەی هەواڵەکە ئاشکرا بکات وەك نیازپاکییەك و بەڵێنیشی دایێ لێکۆڵینەوەکە بپارێزێ ئەگەر بێتو ناوی سەرچاوەکە بڵێ، بەڵام تابعی قبوڵی نەکرد و درایە دادگا و حوکمی زیندانیکردنی درا بە چوار مانگ لە زیندانی قەرەمەیدان، بەڵام ئەو وتارەی سەبارەت بە خوێندنی ئەمیر فاروق بڵاومکردبۆوە مەلیکی زۆر تووڕە کردبوو، یان وەك عەلی ماهر پاشای سەرۆکی دیوانی مەلەکی ئەو کاتە بە تۆفیق دیابی وتبوو: "وتارەکە بێ ئەدەبانە و بێ زەوقانە نووسراوە". خۆشم پێموابوو زۆر بە زەوق و ئەدەبەوە بوو و ئەو هەموو فەرتەنەیەشی نەدەویست.

ئەمەی خوارەوە دەقی ئەو وتارەیە کە لە ڕۆژنامەی ئەلجیهادی ڕۆژی (٩)ی سێپتەمبەر ساڵی (١٩٢٥) بڵاو ببۆوە کە تیایدا ڕەخنەی لەو بەرنامەیە گرتبوو کە مەلیك فوئاد بۆ سەفەری ئەمیر فاروقی جێنشینی بۆ خوێندن لە ئینگلتەرە ڕێکیخستبوو:

من تێبینم لەسەر سەفەرەکەی ئەمیر فاروق هەدیە بۆ ئینگلتەرە و بەڕێزەوە بۆ لایەنە پەیوەندیدارەکانی بەرز دەکەمەوە، ڕەنگە ئەم کارەی من بە خۆتێهەڵقورتاندن بزانن یان دەست تێوەردانێك کە مافی من نییە و کاری منیش نییە، بەڵام پێموایە ئەوە کاکڵەی ئیشی من و میللەتیشە، خۆ ئەگەر پەرلەمانمان هەبوایە ئەوا داوایان دەکرد بەرنامەی خوێندنی ئەمیر ببینن و هەروەهاش سیستەمی پەروەردەکردنی ئەمیر بۆ ئەوەی وشە بە وشە قسەی لەسەر بکەن. یەکەمین شت کە من تێبینیم کرد ئەوەبوو خاوەن شکۆی ئەمیر بە مەبەستی خوێندنی کاروباری جەنگ سەفەر بۆ ئینگلتەرە دەکات، ئەوەش لە ڕابردوودا وای لێ حاڵی دەبوون کە دەبێ مەلیك سەرکردە و داگیرکەر و وڵات ژێردەست بخات، بەڵام ئێمە لە ئێستادا لەسەردەمێکی دیکەداین، سەردەمێك کە سەرباز سەرکردایەتی ناکات، بەڵکو سیاسەتمەداران سەرکردایەتی سەربازەکانیش دەکەن و لەشکر ئاراستە دەکەن چەند باشتر دەبوو ئەگەر ئەمیر زانستی سیاسەت و ئابووریی بخوێندایە بۆ ئەوەی لە گوزەرانی خەڵك بگات بە تایبەتیش میللەتەکەی خۆی.

پاشان ئەو هەموو حەشەمەی بۆ چییە..؟

بەڵێ ئەمیرەکانی میسر ئەوانەی پێشتر بۆ خوێندن دەچوونە ئەورووپا حەشەمێکی زیاتریان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد، بەڵام ئەمڕۆ لەسەردەمی دیموکراسیداین، لە زەمانێك کە دەبێ ئەمیر تێکەڵ بە میللەت بێت و ئاگاداری کاروباریان بێت و میزاجی گشتی بخوێنێتەوە و گوێ لە بیروڕاکانیان بگرێ، من هەزار جار پێم چاکترە ئەمیر وەك خوێندکارێکی سادە سەفەر بکات بۆ ئەوەی لە گیانی سەردەمی ئێمە بگات کە ئەوەش شتێکە ناکرێ مرۆڤ تێی بگات ئەگەر لە کۆشکێکی زەبەلاح دانیشتبێ و پڕی دەوروبەری حەشەم و خەدەم بێت و سیستەمی ژیانی ڕێگای نادات کەس ببینێ مەگەر زۆر تایبەت بن، بە تایبەتیش بەو ڕێ و ڕەسمەی کە لە کۆشکە مەلەکییەکاندا بەڕێوە دەچن.

من پێم باشتربوو ئەمیر لە زانکۆی میسردا بخوێنێ، چونکە ئەو حوکمی میسرییەکان دەکا نەك هی ئینگلیز، بەڵام مادام بڕیارەکە دراوە و شمشێر پێش لۆمەکە کەوتووە، جا با ئەوانەی فەرمانەکەیان بەدەستە با ئاراستەی خوێندنەکەی ئەمیر بگۆڕن بۆ ئەوەی لەگەڵ گیانی سەردەم و دنیای تازەدا بگونجێ.

دواتر لە عەلی ماهر پاشای سەرۆکی دیوانم بیستەوە کە ئەم وتارە مەلیك فوئادی وروژاندووە،





چونکە ئەوە یەکەم جارە نووسەرێك دەست لەو جۆرە کاروبارانە وەربدات، مەلیکیش پێیوایە خوێندنی کوڕەکەی مەسەلەیەکی خێزانییە و کەس مافی ئەوەی نییە خۆی تێهەڵقورتێنێ و خاوەن شکۆ خۆی بەرنامەی سەفەری جێنشینی داناوە بۆ خوێندنی و سەرەك وەزیران و ئەنجومەنی وەزیران لێی بێ ئاگان، تەنیا ئەوە نەبێ مەلیك بە تۆفیق نەسیم پاشای ڕاگەیاندووە کەی جێ نشین سەفەری ئینگلتەرە دەکات بۆ ئەوەی شەرەفی بەرێخستنی هەبێت.

عەلی ماهیر پاشا پێی وتم: مەسەلەی خوێندنی ئەمیر فاروق و ئەو زانکۆیەی تێیدا دەخوێنێ لەنێوان مەلیك و (سێر مایلز لامسبۆن)ی مەندوبی سامی بەریتانیدا باسکراوە بێ ئەوەی سەرەك وەزیرانی میسر ئاگای لێبێت، چونکە مەلیك جۆرجی پێنجەم و حکومەتی بەریتانیا داوایانکردبوو جێنشین بۆ خوێندن بچێتە بەریتانیا و وەزیری دەرەوەی بەریتانیا خۆی ئەو زانکۆیەی هەڵبژاردووە کە جێنشین تێیدا بخوێنێ.

لە عەلی ماهیر پاشام پرسی جێنشین لەسەر حیسابی خۆی سەفەر دەکا یان لەسەر حیسابی میسر..؟

سەرۆکی دیوانی مەلەکی وتی: "ئەڵبەتە کە لەسەر حیسابی دەوڵەتە".

وتم: "کە وایە دەبوو پرس بە ئەنجومەنی وەزیران بکرێ..!".

وتی: "ڕاستدەکەی، بەڵام ئەگەر سەرەك وەزیر پیاو بوایە دەبوو وازبێنێ بەڵام سەرەك وەزیر وازینەهێنا، چونکە هەموو شتەکان لە پشتی ئەوەوە کراو کەس لە وەزیرەکان ناڕازی بوونی لەسەر پشتگوێخستنی ئەنجومەنی وەزیران نیشان نەدا".

عەلی ماهیر کەمێك بێدەنگ بوو، ئەوەی کە لەم وتارەدا مەلیکی تووڕە کرد هەستی بە ئیهانە کردن کردبوو ئەوەبوو کە دەڵێ: "دەبوو جێنشین بچێتە زانکۆیەکی میسری بۆ ئەوەی گەلی میسر بناسێ".

بەڵام هەرچی کردم لەخۆم ڕانەبینی پێی بڵێم من ئەو نووسەرەم..!

عەلی ماهیر پاشا لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو و وتی: "مەلیك وا هەزر دەکات ئەوە شاڵاوێکی بە دەسیسەیە لە دژی کۆشك، چونکە ئەمە یەکەم وتاری ئەو نووسەرە نییە، پێشتریش وتارێکی نووسیبوو گەپجاڕی بە ئەمیرەکانی ئەندامی خانەوادەی مەلیك دەکات، تۆ دەزانی من ڕام لەسەریان خراپە، بەڵام ئەوانە لە خزمانی مەلیك و خانەوادەی ئەون و هەر ئیهانەیەك بۆ ئەوان ئیهانەیە بۆ مەلیك. مەلیك پێشی وتم: "بۆنی کۆمۆنیستی لەو وتارەدا دەکات و پێیوایە نووسەری وتارەکە شیوعیە و نووسەرەکە لەم وتارەیدا دانی بەوەداناوە کە زمانی درێژە و بێ ئەدەبە..!

وسکت بوو منیش داکۆکیم لە نووسەری وتارەکە نەکرد.

گەڕامەوە نووسینگەکەی خۆم و وتاری "ئەمیرەکان"م خوێندەوە کە لە ڕۆژنامەی (الجهاد)ی ڕۆژی (۲۸)ی یۆلیۆی (۱۹۳۵)دا بڵاوم کردبۆوە و تێیدا نووسیبووم:

"من پیاوێکی زماندرێژم.. ڕەنگە ئەوەش تاکە خەسڵەتی باشی من بێت لە زەمانێکدا کە خەسڵەتی باش بە نرخی خۆڵە.

ئەو بابەتەی کە ئەمڕۆ لەسەری دەنووسم بێزارم دەکات و تەنیاییم ناڕەحەت دەکات هەرچەند ناوی خوام دێنا و شەیتانم بە نەعلەت دەکرد و هەرچەند لەسەر "هەواڵ" ەکە خۆم بە کرێگرتە دەهاتە بەرچاو و هەوڵمدەدا خۆمی لێ گێلکەم هەرچیم دەکرد خۆم بە ترسنۆك تاوانبار دەکرد.

ئاخر ئێمە ئەمیرەکانی خۆمان نابینین و هیچیان لێ نابیستین مەگەر هەواڵی گەڕانەوەیان

یانیش لە پێشبڕکێی ئەسپاندا، یان سەفەرکردن و گەڕانەوەیان لە ڕاو لە ناوەڕاستی ئەفریقیا کە ئەو سەفەرانەیان سەدان و هەزاران مەسرەفیانە.

ئێمە هەست ناکەین ئەوان لە هەوڵی ناسینماندابن، ئێمە ئەو ئەمیرانەمان خۆش دەوێن پەیوەندی بە میللەتەوە بکەن و لەگەڵ میللەت و بۆ میللەت بژین.

بۆیە تکامان وایە بیانبینین گرنگی بە بزوتنەوەی گەنجانمان بدەن و لەگەڵ ئێمە بەشداریی خەبات بکەن و پارە و پولەکانیان بۆ سەرخستنی کێشەکەمان تەرخانبکەن. بۆیە لەسەریان پێویستە لە سەفەرەکانیاندا کەم مەسرەفبن و چاویان لە میللەتەکەیان بێت کە ئەوانیش بەشێکی دانەبڕاون لێی.

(١٧) ساڵ بەسەر قسەکانی من لەگەڵ عەلی ماهیر پاشای سەرۆکی دیوانی مەلەکیدا تێپەڕی کە لە کۆشکی ئەسکەندەریە کرابوو. لەسەرەتای ئابی (١٩٥٢)دا سەردانی عەلی ماهیر پاشام کرد کە سەرۆک وەزیران بوو و لە وەزارەتی دەرەوە دانیشتبوو. شۆڕش مەلیک فاروقی لە (٢٦)ی یۆلیۆ لەسەر کار لابردبوو و ئەسکەندەرییەی بەجێهێشتبوو.. عەلی ماهیر پاشا دانیشتبوو سەبارەت بە هۆکاری ڕووخانی فاروق بە منی وت: "یەکەمین هۆکار ئەوەبوو کە هیچ فێرنەبوو، هەڵەیەکی گەورەبوو کە ڕەوانەی ئینگلتەرا کرا بۆ خوێندن، دەبوو لە میسر بمێنێتەوە و بچێتە زانکۆیەکی میسری".

دەلحاز پێموت: "جەنابعالیتان بە بیرتانە کە وتارێکم لە ڕۆژنامەی (الجهاد) بەر لە (١٧) ساڵ بڵاوکردبۆوە و وتبووم دەبێ مەلیك فاروق لە زانکۆی میسریدا بخوێنێ..؟"

عەلی ماهیر پاشا وتی: "نایەتەوە بیرم".

بۆم باسکرد چیم نووسی بوو.. وتی: "ئەمە حەقە"

من ئەو وتارەم نووسیبوو، عەلی ماهیر وتی: "بۆ هەنگێ پێتنەوتم.؟ وتم ترسام نەبادا مەلیك فوئاد لە ملم بدات..! عەلی ماهیر وتی: "موسیبەت ئەوەیە لەنێو هەموو ئەمیرەکان دەگەڕێم یەکێکیان بە کەڵکی ئەوە بێت لەسەر تەختی میسر دانیشێ، نایدۆزمەوە، گەورەترین هەڵەی ئەوان ئەوەیە پەیوەندییان لەگەڵ میللەت نییە و لەگەڵیاندا نەژیاون..!"

پێموت: "ئاخر ئەوە بابەتی وتاری دواترم بوو..!

هەر وتارێکم نووسیبێ سەر بردەیەکی هەیە، جاریواش هەیە سەر بردەکە بەر لە نووسینی وتارەکە سەرهەڵدەدا، هەندێ جاریش دوای نووسینی، یان لەکاتی نووسینیدا.
زۆر وتاریشم نووسیون ڕووناکییان نەدیوە، پێنووسی سانسۆر هاتووە و ئەتکی کردووە، یانیش چەند دێڕێکی لێ قرتاندووە و چەند دێڕێکیشی بۆ زیاد کردووە..!
لە گەڵ پچڕپچڕی چارەنووسیشدا لە ژیانمدا نەبووە زنجیرە وتارێکم نووسیبێ و تەواوم کردبێ، هەمووجارێ دەستێك پەیدا بووە و ڕایگرتووە و شەهرەزاد دەمکوت کراوە، خوێنەوارەکانیش نازانن چی قەوماوە..!
بۆ لەناکاو زمانم لاڵ بوو..! زنجیرەکە بۆ نەما..؟
ئەگەرچی من لە کۆتایی دوا وتارمدا گوتوومە: "بەشی داهاتوو سبەی" بەڵام ئەو سبەینە هەرگیز نایێ..!
مستەفا ئەمین

# گۆڤاری بەرەو رووناکی ...
# دەنگێك لە مەملەکەتی ئازادیدا



کاروانی ئیمە واکەوتوتە ری قوناغ بە قوناغ بەرەو رووناکی
لە بوشایی ئەتوم . لە تاریکی ری . لە کوت و زنجیری هیچ نیە باکی





رەنگە بەلای هەندێك کەسەوە سەیربێت، لە نێو ئەو هەموو گۆڤارو رۆژنامە زۆرو زەوەندەی ئەمڕۆ بە تەکنیکی سەردەم لە کوردستان دەردەچن، کەچی باسی گۆڤارێکی نیوەی یەکەمی حەفتاکانی سەدەی رابردوو دەکرێت، دەشێ بەلای هەندێ کەسی دیکەشەوە، گرنگ بێت ئاوڕ لە مێژووی رۆژنامەگەری بدرێتەوە. لە راستیدا رەنگە سەردەمێك ئارەزووی ئەوەم کردبێ چەند سەرەقەڵەمێك دەربارەی گۆڤاری (بەرەو رووناکی) بنووسم، ئەوکارەی کە ئەستەم بوو بێ دیتنی ژمارەکانی ئەو گۆڤارە بکرێ، لێ بە پشت بەستن بە چەند سەرچاوەیەك دەربارەی رۆژنامەنووسیی کوردی، ئەوکارەم بەکرچوکاڵی لەکۆتایی هەشتاکانی سەدەی رابردوودا کرد(١). بەڵام بیرۆکەی ئەم بابەتە لەلایەن سەرنووسەری گۆڤاری k21 سەری هەڵداوەو نووسەری ئەم چەند دێرە بۆ ئەم مەبەستە راسپێردراوە، لێ بۆ من ناخۆش بوو جارێکی دی دەربارەی ئەو گۆڤارە بنووسمەوە بەبێ ئەوەی چاوم بە ژمارەکانی بکەوێ، بۆیە هەوەڵ جار خۆم نەدایێ و پاساویشم ئەوە بوو کە ناکرێ بێ ئەوەی ژمارەیەکی ئەو گۆڤارە ببینم، لەبارەیەوە بنووسم، دیاربوو ئەو هەنجەتەشیان پێ بڕیم و هەرسێ ژمارەی گۆڤارەکەیان بۆ پەیدا کردم(٢).



دڵشاد مستەفا وەسانی





ئازاد جوندیانی / بەرپرسی مەکتەبی ناوەندی ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

نەژاد عەزیز سورمێ / سەرنووسەری ڕۆژنامەی خەبات

لە شاگردەکانی قوتابخانەی ( بەرەو ڕووناکی )

## ناسینی گۆڤاری بەرەو ڕووناکی

گۆڤاری بەرەو ڕووناکی، وەك لە سەرچاوەکانی مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردی دا هاتووە(٣) و بەقسەی ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری گۆڤارەکە(٤) ، هەر سێ ژمارەی لێ دەرچووە. ژمارە (یەك)ی لە تەمموزی ١٩٧٢ و ژمارە (دوو) ش لە هەمان ساڵ و ژمارە (سێ)ی کە دوا ژمارە بووە لە ساڵی ١٩٧٣ دا دەرچووە. قەبارەی لە شێوەی نامیلکە دا بووە (٢١ ×١٣) سم و ژمارەی لاپەڕەکانی وەکو یەك نەبووە، ژمارە (یەك)٤٤ و ژمارە (دوو) ٥٢ و ژمارە (سێ) ٦٤ لاپەڕە بووە.

دەربارەی لۆگۆی گۆڤارەکە لەسەر بەرگ (٥) ، لە هەرسێ ژمارەدا وەکو یەك نییە، بەڵام لە لاپەڕەی یەکەمدا بە یەك شێوە نووسراوەو لە ژێریدا هاتووە (گۆڤارێکی وێژەیی و ڕۆشنبیری گشتی یە، لێژنەی زمان و وێژەی کوردی لە خوێندنگەی ناوەندی گەلاڵەی کوڕان دەری دەکات). لە هەرسێ ژمارەدا بەناوی دەستەی بەڕێوەبەر وتەی ژمارە نووسراوە.

ئەوانەی لە گۆڤارەکەدا کاریان کردووە، بەناوی دەستەی بەڕێوەبەری گۆڤار ناویان هاتووە، وەك گرووپ و دەستەیەکی هەرەوەزی کاریان کردووە، زنجیرەی بەرپرسیاریەتی ڕۆژنامەوانیی وەك سەرنووسەرو پلەکانی خوارتری ڕۆژنامەنووسی بەدی ناکرێ و تەنیا لە ژمارەی یەکەم و دووەمدا ناوی ئەو دەستەیە بەم شێوەیە ریزکراوە (ئیبراهیم سەعید بەرزنجی، نەژاد عەزیز سورمێ، سەردار کەمال مەولود، ئازاد عەبدولوەهاب جندیانی، غەفور حسێن گەلاڵی، فەوزی جەودەت جەمیل) (٦).

## ڕێگەیەکی سەخت ..
## سەرەتایەکی گرنگ

ئەگەر چاوێك بە لاپەڕەکانی مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا بخشێنینەوە، هەست بەوە دەکەین کە پیشەی ڕۆژنامەنووووسیی لەچاو ئێستا، چەندین جار تاڵی و سوێری و ماندوویێتی بووە، جاریٚ ئەو جیاوازییە زۆرەی نێوان ئێستاو ئەوکات لە ڕووی هۆیەکانی وەدەستهێنان و وەرگرتن و بڵاوکردنەوەی هەواڵ لەکاتی خۆیدا هەرمەپرسە چەندە، لە لایەکی دی، ئەوانەی بڕیاریان دەدا ئەرکێکی وا قورس بگرنە ئەستۆ، دەبوو هەڵمەتی کۆکردنەوەی کۆمەك و پیتاك بکەن، ئەم مەسەلەیە ڕێك بۆ گۆڤاری بەرەو ڕووناکیش هەروابووە، دەستەی بەڕێوەبەری گۆڤار، وێڕای ئەوەی قوتابی قۆناغی ناوەندی بوون، ئەو ئەرکە قورسەشیان لە ئەستۆ بووە. سەرەتای ئەو پرۆژەیە لە بڵاوکراوەی سەر دیوار بە ناوی (مەشخەڵ) لە قوتابخانەی ناوەندی لە لایەن ئەو قوتابیانەی دواتر بەرەو ڕووناکییان دەرکرد دەستی پێکردووەو سیٚ ژمارەیان لەو بڵاوکراوەیە دەرکردووە(٧) جموجۆڵی ئەو قوتابیانە بەو ئاقارەدا چووە کە بیرۆکەی



نەژاد عەزیز سورمێ و کارمەندانی چاپخانەی کوردستان لە کاتی چاپ کردنی بەرەو ڕووناکی دا

دەرکردنی گۆڤارێك بەناوی بەرەو ڕووناکی هاتۆتە ئارا، بەڵام گرفتی سەرەکی دارایی بووە کە دەبوو پیتاکی بۆ کۆبکەنەوە، نەژاد عەزیز سورمێ لەم بارەیەوە دەڵێ: (دوای گەڵاڵەبوونی بیرۆکەی دەرکردنی گۆڤارەکە لە ڕێی ئاهەنگێك لە قوتابخانەی ناوەندی گەڵاڵە سەرەتای کۆکردنەوەی کۆمەکمان بۆ دەرکردنی گۆڤاری بەرەو ڕووناکی دەست پێکرد) (٨). هەروەها غەفور حسێن گەلاڵی لەوبارەیەوە دەڵێ: (ئەوکات کە هەموومان لە یەکێتی قوتابییان بووین، پسوولەی پیتاك کۆکردنەوەمان دروست کردو دوای ئەوەی چووینە لای فەرەنسۆ هەریری کە قایمقامی چۆمان بوو، پێشنیازی ئێمەی لەمەڕ کۆکردنەوەی پیتاك بە پەسەند زانی، هەمووومان کەوتینە کۆکردنەوەی کۆمەك و پیتاك، من چوومە لای سەرکردەی خوالێخۆشبوو ئیدریس بارزانی لە حاجی ئۆمەران، بە (١٠) دە دینار هاوکاری کردین کە بۆ ئەوکات پارەیەکی باش بوو، ئیدی کە پارە پەیدابوو ژمارە (یەك)ی گۆڤارەکەش بۆ چاپ ئامادەبوو (٩). بەم شێوەیە توانیویانە بە پارەی فرۆشتنی ژمارە ١ ی گۆڤارەکە ژمارە ٢ و ٣ ش دەربکەن (١٠)، ئەمەو دەستەی بەڕێوەبەر هەر بەوە نەوەستاون، بەڵکو ڕێکلامیشیان بۆ گۆڤارەکە کردووە. بەتایبەتیش لە سەیتەرەی بەرزێوە کە یەکەم سەیتەرەی نێوان ناوچە ئازادکراوەکان و حکوومەتی عێراق


گەلاڵە - ١٩٧٣

بوو(١١) پەیوەندی کردن و سەردانی میوان و ڕۆژنامەنووس و هەر وەفدێك بۆ لای بارزانیی نەمرو سەرکردایەتی و چوون و هاتنی وەفدی گفتوگۆی نێوان شۆڕش و حکوومەتی عێراق بەو ڕێگایەدا بوو .

شوێنی دەرچوونی گۆڤارەکە گەلاڵە بوو، کە ئەوکات مەڵبەندێکی سیاسی و کارگێڕی و بازرگانیی ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان بوو، هەرچەندە کاتی دەرچوونی گۆڤارەکە دەکەوێتە دوای ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئاداری ١٩٧٠ ، واتە ئەو ماوەیەی کە شەڕی نێوان شۆڕشی ئەیلوول و حکوومەتی بەغدا وەستابوو و بە ماوەی ئاشتی ١٩٧٠- ١٩٧٥ دەناسرا، لەگەڵ ئەوەشدا بەغدا پیلانی دەگێڕاو کۆسپی زۆری دەخستە ڕێی ئەو ئیشوکارانەی پێویستیان بە بەغدا بوو.

بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی دەرکردنی گۆڤاری بەرەو ڕووناکی دەبوو لە وەزارەتی ڕاگەیاندنی عێراق وەربگیرێ، کە لە ڕاستیدا زۆر زەحمەت بوو و بەغدا ڕێگەی نەدەدا(١٢)، بۆیە گۆڤاری بەرەو ڕووناکی مۆڵەتی پێنەدراوەو تەنیا ژمارەی سپاردنیان وەرگرتووە، ئیبراهیم سەعید بەرزنجی ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر لەوبارەیەوە دەڵێ : (بەو پێیەی ئەوکات شەڕ وەستابوو ئەو کارە بەمن سپێردرا کە بچمە بەغدا بەڵام تا ژمارەی سپاردنی گۆڤارەکەیان دامێ زۆر ئەزیەتیان دام و هێنان و بردنێکی زۆریان پێکردم و بۆ ئەوەی وازی لێبێنم کۆسپی زۆریان هێنامە ڕێگا، هەر سێ ژمارەمان لە سایەی ئەو ژمارەیەی سپاردن دەرچوون) (١٣) . هەروەها بەو پێیەی گۆڤارەکە لە قوتابخانەی گەلاڵە دەرچووە، بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر چاودێری کردووەو بابەتەکانی یەکەم ژمارەی هەڵسەنگاندووە، لەوبارەیەوە بەڕێز فەوزی جەودەت جەمیل ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر دەڵێ : (پەروەردەی هەولێر قسەیان لە چەند بابەتێك هەبوو، لەوانەش



وێنەی سەرۆك مستەفا بارزانی و ئەحمەد حەسەن بەكر سەرۆك كۆماری عێراق و داوایان كرد وێنەی ئەحمەد حەسەن بەكر بێتە پێشەوە، هەروەها داوایان كرد گلەییەكانی فەرەنسۆ هەریری قایمقامی چۆمان لەبارەی نەبوونی شوێنی شیاو بۆ فەرمانگەكانی حكوومەت لابدرێت، دەستەی بەڕێوەبەری گۆڤار مەسەلەی ریزبەندی وێنەكانی قبوولْ كرد، بەڵام دەستكاری كردنی چاوپێكەوتنەكەی قایمقامی رەتكردەوە بەو پێیەی ئەو نوێنەری حكومەت بوو لە ناوچەكە(١٤) .

## تەكانێك بۆ هۆشیاری

دوای كۆنگرەی ٦ ساڵی ١٩٦٤ ، دەزگاكانی راگەیاندنی پارتی دیموكراتی كوردستان لە ناوچەی باڵەكایەتی دامەزران و تا نسكۆی ١٩٧٥ ڕۆڵی خۆیان گێڕا، جگە لە رادیۆی دەنگی كوردستان، رۆژنامەی خەبات و هەردوو گۆڤاری دەنگی پێشمەرگەو كادیر لەو ناوچەیە دەردەچوون و، شۆڕش كاریگەریی خۆی لەسەر دانیشتوان هەبوو، گۆڤاری (بەرەو رووناكی) ش هەوڵی چەند قوتابییەكی هۆشیار بوو، دەكرێ بە یەكەم هەوڵی بزاڤی رۆشنبیریی و بە بناغەی قۆناغەكانی دواتری بزووتنەوەی رۆشنبیری لە ناوچەكە دابنێین، نووسەرو رۆژنامەنووس مامۆستا مومتاز حەیدەری لەبارەی هەوڵی ئەو دەستەیە دەڵێ : (دەستەیەكی چالاك و هۆشیارو رۆژنامەنووسی سەردەمی خۆیان بوون، بە پەرۆشەوە بوون بۆ پێشخستنی رۆژنامەگەری كوردی بە گیانی كوردایەتی، بۆ ئەوكات و لە



ئیبراهیم سەعید بەرزنجی

ناوچەیەكی دوورەدەست لە ئاستی قوتابخانەی ناوەندی، بەڕاستی كارێكی گەورەو نموونەیەكی ئەو سەردەم بوو) (١٥) .
وێڕای ئەوەی خەڵكی ناوچەكە بەگشتی و بەتایبەتیش خوێندەواران پێی خۆشحاڵ بوون و بە پەرۆشەوە بەدوایدا دەگەڕان (١٦)، هەروەها پێویستە لێرەدا ئاماژە بەوەش بكەین كە ئەوكات ژمارەیەكی نووسەرو رۆشنبیر لە ناوچەكە بوون، بەهۆی ئەزموونیان سوود لە رێنماییان وەرگیراوە. ئیبراهیم سەعید بەرزنجی لەوبارەیەوە دەڵێ : (چووینە لای مامۆستا ئیبرایم ئەحمەد كە ئەوكات لە گوندی ناوپردان دادەنیشت، زۆر هانی داین و لەوبارەشەوە رێنمایی كردین (١٧) ، گۆڤاری بەرەو رووناكی زوو دەنگی دایەوەو نووسەری دیار بابەتیان تیادا بڵاودەكردەوە (١٨ بەم شێوەیە (بەرەو رووناكی تەكانێك بوو لە رووی رۆشنبیری و هۆشیارییەوەو هەندێ لەوانەیشی لێی كۆبببوونەوەو هەڵیاندەسوڕاند. دواتر وەك ناوێك لە مەیدانی رووناكبیری و رۆژنامەنووسیی دا دەركەوتن.

## بڵاوبوونەوەو دابەشكردن

مەسەلەی بڵاوبوونەوەو چۆنیەتی دابەشكردنی هەر گۆڤارو رۆژنامەیەك، بە یەكێك لە هۆكارەكانی سەركەوتن دادەندرێ، بۆ گۆڤاری بەرەو رووناكی مەسەلەیەكی زۆر گرنگ بوو، چونكە لە ناوچەیەكی دوورە دەست و دوور لە ناوەندە قەرەباڵغەكانی دانیشتوان دەردەچوو، بەو پێیەی كە كاركردن

تیایدا خۆبەخش بووە. کاری دابەشکردنەکەشی بە خۆبەخش کراوە، بۆ ئەو گۆڤارە گرنگ بوو بگاتە شارە گەورەکان، بەرەو ڕووناکی لە هەولێر چاپ دەکرا، لە لایەکی دیکەشەوە، گەلاڵە لە ڕووی کارگێڕیەوە سەر بە پارێزگای هەولێرە، بۆیە هەولێر ناوەندێکی گرنگی بڵاوبوونەوەو دابەشکردن بووە. لەو بارەیەوە مامۆستا مومتاز حەیدەری دەڵێ : (ئەوکات دابەشکردن زیاتر لە ڕێگەی یەکێتی نووسەرانی کوردەوە بوو، جا چ بۆ فرۆشتن یان بەدیاری دابەش کرابا، یەکێتی نووسەران وێستگەیەك بوو بۆ چاپەمەنی، هەندێ جاریش کتێبخانەکان دەیانقۆستەوە، بۆیە بەرەو ڕووناکیش بەو وێستگەیەدا تێدەپەڕی) (١٩)، هەروەها لەبارەی دابەش بوون و چۆنیەتی گەیشتنی ئەو گۆڤارە بە خوێنەر بەڕێز نەژاد عەزیز سورمێ دەڵێ : (گۆڤاری بەرەو ڕووناکی لە هەموو کوردستان دابەش دەکراو بڵاودەبووە، هیچ ژمارەیەك نەدەمایەوە) (٢٠).

## بەرنامەی بەرەو پێش بردنی گۆڤارەکە

ئەگەر سەیری کاتی دەرچوونی هەرسێ ژمارەی ئەم گۆڤارە بکەین، دەبینین بە کاتی دیاریکراو پابەند نەبووە، ژمارەی یەکەمی لە تەمموزی ١٩٧٢ و ژمارە دوو لە هەمان ساڵ و ژمارە سێ کە دوا ژمارەی بووە کەوتۆتە ساڵی ١٩٧٣ ، هەروەها لە هیچ ژمارەیەکیدا ئاماژە بەوە نەکراوە کە ئاخۆ گۆڤارێکی مانگانە یان وەرزی



غەفور حوسێن گەلاڵی

بوو بێت، تەنیا نووسراوە (گۆڤارێکی وێژەیی و ڕۆشنبیریی گشتییە لێژنەی زمان و وێژەی کوردی لە خوێندنگای ناوەندی گەلاڵەی کوڕان دەری دەکات)، واتە دەستەی بەڕێوەبەری گۆڤار خۆی بەوە پابەند نەکردووە کە مانگانەبێ یان وەرزی، هۆکارەکەشی دیارە کە ئەو سێ ژمارەیە بە چ دەردەسەرییەك دەرچووە، لەگەڵ ئەوەشدا بەرنامەی بەرەوپێش بردنیان هەبووە. وەك لە بەدواداچوونماندا بۆ ئەم بابەتە دەرکەوت، دیارە بەنیازبوون بارەگا بۆ گۆڤار دابنێن و بیکەنە مانگانە، جگە لەمە بەرنامەی ئەوەشیان هەبووە کە فۆلکلۆر کۆبکەنەوەو لێژنەیەکیان بۆ گەڕان بە گوندەکاندا بۆ ئەم مەبەستە پێکهێنابوو، بەڵام بەهۆی بەرپابوونەوەی شەڕ، نەك ئەم کارەیان پێ نەکراوە، بەڵکو گۆڤارەکەش وەستاوە (٢١).

## چاپخانەی کوردستان

کە باسی گۆڤاری بەرەو ڕووناکی دێتەگۆڕێ، دەبێ ناوی (چاپخانەی کوردستان) یش بێنین، چونکە چاپخانە کۆڵەگەی سەرەکی دەرچوونی گۆڤارو ڕۆژنامەیە، لێرەشەوە جارێکی دی قورسایی ئەرکی دەرچوونی ئەم گۆڤارە بەدیار دەکەوێت، چونکە پێویستی بەوە بوو کە ماوەیەکی زۆر هاتووچۆی چاپخانە بکەن، کاری چاپکردنیش زۆر زەحمەت بوو، تەکنیکی ئەوکاتی چاپ پێویستی بە پشوو درێژی هەبوو، ئەگەرچی گۆڤارەکە مۆڵەتی وەزارەتی ڕاگەیاندنی عێراقی نەبوو، بەڵام بەهۆی ژمارەی سپاردن کە لە بەغدا وەریان گرتبوو گۆڤارەکەیان چاپ دەکرد، لە لایەکی دیکەشەوە





ڕەحمەتی گیوی موکریانی کە خاوەنی چاپخانەکەبوو هاریکاری دەستەی بەڕێوەبەر بوو. وەك لە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەرم بیستووە، گیوی موکریانی بەدیتنی ئەوان خۆشحاڵ دەبوو و بەوپێیەی لە ناوچەی رزگارکراو دەهاتنە هەولێر پێی دەگوتن بۆنی ئازادیتان لێ دێت (٢٢) . چاپکردنی ئەم گۆڤارە پێویستی بە کات بووەو ماوەیەك لەچاپخانە دەمایەوە تا چاپ دەکرا، چونکە ڕۆژانە هەر دوو لاپەڕە چاپ دەکرا(٢٣)، بەڕێز شێرزاد فەقێ ئیسماعیل کە کرێکارێکی چاپخانەی کوردستان بووەو لە چاپ کردنی گۆڤاری بەرەو ڕووناکی دا بەشداربووە دەڵێ : (من کرێکارێکی شارەزابووم ئینجا ڕۆژانە ئەوپەڕی چوار لاپەڕەم چاپ دەکرد) (٢٤)،گۆڤاری بەرەو ڕووناکی قەبارەی (٢١ ×١٣) سم و ژمارەی لاپەڕەکانی وەکو یەك نەبووە، ژمارە (یەك)٤٤ و ژمارە (دوو) ٥٢ و ژمارە (سێ) ٦٤ لاپەڕە بووە، کەواتە ئەگەر ڕۆژانە چوار لاپەڕەی لێ چاپ کرابێ، ئەوا ژمارەی یەکەمی ١١ ڕۆژی خایاندووە. گیوی موکریانی هانی دەستەی بەڕێوەبەری گۆڤاری بەرەو ڕووناکیی داوەو خاتری زۆری گرتوون و دەیگوت : (چاوم بەو گەنجانە ڕوون دەبێتەوە، کە دەبینم خەریکی دەرکردنی گۆڤارو کاری ڕۆشنبیرین) (٢٥).



فەوزی جەودەت جەمیل

## ناوی خوازراو

لەو سێ ژمارەیەی گۆڤاری بەرەو ڕووناکیدا، چەند بابەتێك بەناوی خوازراو بڵاوبوونەتەوە، ئەمەش وەك مافێکی نووسەرەکان بووەو لەسەر داوای خۆیان بووە، ئەگەرچی شاعیرو نووسەری دیار بابەتیان لەو گۆڤارە بڵاوکردۆتەوە، بەڵام جار هەبووە بابەتی بەهێزیان بۆ هاتووەو گرنگ بووە کە بۆ ناوبانگی گۆڤارەکە ناوی خاوەنەکەی بەسەرەوە بێت و وەك خۆی بڵاوبێتەوە، لە ژمارە (دوو) دا شیعری (کوردستان) ی شاعیری فەلەستینی مەحمود دەروێش بڵاوکراوەتەوەو هەشت لاپەڕەی بۆ تەرخان کراوە کە لە لایەن ناوی خوازراو(ڕاوچی) کراوەتە کوردی، کە بۆ ئەو سەردەم و تا ماوەیەکی دوور ئەو هۆنراوەیە دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو. لە کۆتایی شیعرەکەدا تێبینییەك بە ناوی گۆڤار بەم شێوەیە نووسراوە (ئەم شیعرە لە "برایەتی"شدا کاك جەلالی میرزا کەریم وەریگێڕابوو. بەڵام لەبەر بەهێزی و ڕەوانی وەرگێڕانی برادەری ناو نەزانراو- ڕاوچی- وا بڵاوی دەکەینەوە ئومێدەوارین جێگەی ڕەزامەندی بێت - بەرەو ڕووناکی) (٢٦). هەندێ لە ناوە خوازراوەکان بەتایبەتی (ڕاوچی) و (کاروان) و (ن) و (ژ.ن) و (سەرلق) و (سەردار هەڵۆ) بەم شێوەیە ساغکرانەوە (٢٧): (ڕاوچی) د.عەزیز گەردی. (کاروان) مومتاز حەیدەری، (ن) خوالێخۆشبوو سەعید ناکام، (ژ.ن) نەژاد عەزیز سورمێ، (سەرلق) شەهید مەهدی خۆشناو، (سەردار هەڵۆ) (٢٨) سەردار کەمال مەولود.

## ڕوویەرێك بۆ ئەدەبی کوردی

بەو پێیەی گۆڤارەکە ئەرکی خۆی دیاری کردبوو، وا خۆی ناساندبوو

کە (گۆڤارێکی وێژەیی گشتی یە) و لێژنەی زمان و ئەدەبی کوردیی قوتابخانە دەری دەکرد، شتێکی چاوەڕوانکراوە کە گرنگی بە ئەدەبی کوردی دابێت، بۆیە کە چاو بە هەرسێ ژمارەدا دەخشێنی، شیعرو پەخشان و فۆلکلۆر بەشێکی زۆری لاپەڕەکانی گرتووە، لە ژمارە (یەک) دا ١٤ شیعرو ٣ پەخشان و چیرۆکێك و ٢ بابەت بە شێوەی چاوپێکەوتن بلاوبوونەتەوە. گۆڤاری بەرەو رووناکی لە یەکەم ژمارەیدا خۆی خزاندۆتە نێو مشتومڕی ئەوێ رۆژێی ئەدەبی کوردی و دەرکەوتنی روانگە لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابردوو، لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ سەبری بۆتانی دەربارەی هۆنراوەی ئازادەوە پرسیاری لێکراوەو ئەویش رای خۆی دەربڕیوەو لەو باسەوە قسەی لەبارەی روانگە کردووە وەك بزووتنەوەیەکی ئەدەبی (٢٩). هەوڵیان داوە لەو رێیەوە بچنەوە خزمەت کوردایەتی، بۆ نموونە بە بایەخەوە شیعری (کوردستان)ی شاعیری فەلەستینی مەحمود (دەروێش)یان بلاوکردۆتەوە، هەروەها لە گۆشەی (چیرۆکی ژمارە) چیرۆکێکی بەڕێز ئازاد جندیانی بەناوی (پێشمەرگەیەکی پۆستەچی) بلاوکراوەتەوە (٣٠)، ئەمەو چەندین شیعرو بابەتی پەخشان و وتاری ئەدەبی بلاوبوونەتەوە، هەوڵیشیانداوە گرنگی بەئەدەبی گەلان بدەن و لە ژمارە ٢ دا دوو



مومتاز حەیدەری

پارچە هۆنراوەی شاعیری جیهانی پاپلۆ نیرۆدا بلاوکراوەتەوە کە (ژ) گۆڕیویەتی بۆ کوردی.

## باسی ئافرەت

ئافرەت وەك مەسەلەیەکی بایەخدار لە گۆڤاری بەرەو رووناکی دا رەنگی داوەتەوە، جا چ لە نێو چیرۆك و شیعر پەخشاندا بێت، چ لە رێی بابەتی تایبەت بە دۆخی ئافرەت لە کۆمەڵگەی کوردستاندا، بۆنموونە لە دوا ژمارەدا گۆشەیەك بۆ قسەکردن دەربارەی ئافرەت بەناوی (گۆشەی ئافرەت) تەرخان کراوە، دوو بابەت لەوبارەیەوە بلاوکراونەتەوە، یەکیان بەناوی (ئافرەت وچەند نەریتێکی بۆگەن) نووسینی تارق جامباز و ئەوی دیکە بەناوی (سەرنجێکی خێرایی دەربارەی ژیانی تێکەڵاوی لە کۆمەڵی کوردەواریدا) نووسینی کاروان (مومتاز حەیدەری) (٣١)، ئەو کرانەوەیەی گۆڤارەکە بەڕووی رەوشی ئافرەتدا، رۆڵی خۆی لە هۆشیارکردنەوەدا بینیوە، کە سەری کێشاوە بۆ ئەوەی ئافرەتیش بێتە مەیدان و لەو بزووتنەوە رۆشنبیری و هۆشیارییەدا نەك هەر گوێگربن، بەڵکو ئەوانیش قسەیان هەبێ و بنووسن، ئەوەتا لە پۆستەی خوێنەرانی دوا ژمارەدا وەڵامی ئەو ئافرەتانە دراوەتەوە کە لە چەندین ناوچەی جیاجیا بابەتیان بۆ گۆڤارەکە بەمەبەستی بلاوکردنەوە ناردووە، لە پۆستەی خوێنەراندا هاتووە : (خوشکان: ئاوات فەرەج-کەرکوك، زولەیخا حوسێن- گەلاڵە، ئامینە کەمال- رواندز، چاوەڕوانی بەرهەمی بەپێزتانین)(٣٢).





## بەرەو ڕووناکی وەك سەرچاوەیەك

ئەگەرچی گۆڤارەکە مۆرکێکی ئەدەبی پێوە دیارە، لەگەڵ ئەوەشدا، دەکرێ لەڕێی هەندێ وتارو چاوپێکەوتنەوە، بۆ هەندێ باسوخواسی دەڤەرەکە، وەك تۆماری چەند ڕووداو و قەوماوێك سەیر بکرێ، ئاشکرایە ئاووهەوای ناوچەی باڵەکایەتی لە زستاندا ساردو باراناویەو بەفرێکی زۆری لێ دەبارێت، لەو ساڵانەشدا کە بەفرێکی زۆر باریوە، لە یادگەی خەڵکەکەدا ماوەتەوە، بەڵام هەر بە گێڕانەوەیەکی سادەو ساکار. کەچی بەرەو ڕووناکی لە وتارێکدا ڕووداوی بزربوون و مردنی پێنج کەس بەهۆی کرێوەو سەرماوسۆڵەوە تۆمار دەکات و ناوی قوربانی و گوند و شوێنی ڕووداوەکە دەهێنێ(٣٣)، هەروەها لە بابەتێکی دیکەدا کەموکوڕیی گەلاڵە وەك ناوەندێکی سیاسی و کارگێڕی و بازرگانی، لە ڕووی کەمی فەرمانبەرو فەرمانگەو پرۆژەی ئاو و کارەباو ئاوەڕۆ– کە کاریگەریی لەسەر بڵاوبوونەوەی نەخۆشی هەبووە– و شوێنی قەسابخانەو هۆیەکانی هاتووچۆ خراوەتەڕوو(٣٤)، لە بابەتێکی دیکەدا باس لە خراپی شوێنی دامودەزگای حکوومی کراوەو، هەوڵ و هیمەتی ئاوەدانکردنەوە، بە تایبەت دوای ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دەخاتەڕوو(٣٥).




هەر کاروانێ
بۆ بڕینی خۆر بڕوانێ
کەم بێ یا زۆر
ئەگاتە خۆر



## زمان لە بەرەو ڕووناکی دا

ڕۆژنامەنووسیی کوردی ڕۆڵی لە بێنرخکردن و بەهەند هەڵگرتنی زماندا هەیە، ڕەنگە حاڵی ئەمڕۆی زمان لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا لە هەموو سەردەمێك زیاتر ڕووبەڕووی بێ نرخکردن بووبێتەوە، کە دەکرێ ئاوڕی لێ بدرێتەوە. ئەوەی لە گۆڤاری بەرەو ڕووناکی تێبینی دەکرێ ئەوەیە، کە هەست ناکرێ لە ناوچەیەکی دەوڵەمەند بە زمانێکی پاراو دەرچووبێت. هەست دەکرێ زمانی نووسینی گۆڤارەکە شێوەزاری سلێمانیی بەسەردا زاڵە، لە کاتێکدا دەستەی بەڕێوەبەری گۆڤارەکە لیژنەیان بۆ کۆکردنەوەی فۆلکلۆری کوردی لە گوندەکانی باڵەکایەتی پێکهێناوە. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە لەو سەردەمدا لە گۆڤارو ڕۆژنامەو کتێبدا، زیاتر ئەو شێوەزارە زاڵ و باو بووە، بۆیە لەو خاڵەدا بەرەو ڕووناکی کورتی هێناوە، دەبوو بۆ ئێستا سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی زمان بوایە، خۆ ئەگەر بۆ نووسین سوود لە زمانی پاراوی ناوچەکە وەرگیرابا، دەبووە بناغەیەك بۆ بەکارهێنانی زۆر وشەو زاراوەی ڕەسەنی کوردی، چونکە کاریگەری

ژینگـــەی دەرەوەی کوردســـتان نەگەیـــشتبووە ناوچـــەکە، ئـــەو سەردەم دەرفەتێکی لەبار بوو بۆ کۆکردنـــەوەو پارێزگـــاری لـــە رەســـەنایەتی زمـــان، ئەگـــەر ئـەوکارە بکرابووایـە بەشـێکی شـانازییەکە بـۆ گـۆڤـاری بـەرەو رووناکی دەگەڕایەوە، ئەگەر گۆڤارەکە بەردەوام بوایە، ڕێی تێدەچوو ئەو کارەی کردبا، لەوانەیە لە تەمەنی ٣ ژمارەدا وەك سەرەتایەك هەر ئەوەندە کرابێت.

**پەراوێزو سەرچاوە:**

١- دلشاد مستەفا ، گۆڤاری بەرەو رووناکی لە سێ سەرچاوەدا، رۆژنامەی هاوکاری، ١٩٨٨ (ژمارەو رۆژەکەم وەبیر نەماوە).

٢- هەر سێ ژمارەی گۆڤاری (بەرەو رووناکی) م لە لایەن بەڕێز مومتاز حەیدەرییەوە بەدەست گەیشت و بە مەبەستی سوود لێ وەرگرتن بۆ ئەم بابەتە بە ئیجازەی بەڕێزیان کۆپی کران، مایەی سوپاس و پێزانینە.

٣- بۆنموونە بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: تێگەیشتنی راستی- شوێنی لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا، بەغـــدا، ١٩٧٨،ل ٢٥٦-٢٥٧. هەروەها نزار جرجیس علی، صحافه اربیل، دار الحریه للگباعه، بغداد، ١٩٨٨، ص ٨٩-٩١.

٤- بۆ دڵنیایی و ساغکردنەوە پرسیارم لە بەڕێز نەژاد عەزیز سورمێ کرد کە یەکێك لە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری گۆڤاری بەرەو رووناکی بووەو ئێستا سەرنووسەری رۆژنامەی خەباتە.

٥- لە دوا لاپەڕەی ژمارە (١) دا، لەبارەی وێنەی بەرگ نووسراوە: (وێنەی بەرگ و رازاندنەوەی بە

بەرەو رووناکی

: گۆڤاری لیژنەی زمان و ئەدەبی

کۆڕی خوێندکاری ئامادەیی گەڵاڵە یە

لەم ژمارەیەدا

ئەوەی شۆڕشگێڕ لەناو جەرگەی شۆڕشدا سەر هەڵئەدا . ؟
حەمەدەمین ئاغای ئوێردان ، ئەو مرۆڤەی ( ١٢٦ ) ساڵ ژیاو
(١٢٢) سەرختیرانی لەدوای خۆی بەجێ هێشت . . فرەنسۆ هەریری
× نووسینی کوردی ( ٤٨ ) ساڵ لەمەو بەر . . . . عومەر شەمەلی
× کە خۆر ئەدوێ . . . . . شیعری نەژاد عەزیز سورمێ
× گۆڕانێکی تر، باخچەی هونەرمان هەڵئەوەری . . دەستەی بەڕێوەبەر
× ئەمن ساغو ئەو ساغ ناساغیش خوا لەناوی بات . . غەفور حسێن
× دڵدارو دوو شیعری کۆمەڵایەتی . . یوسف دەرگەلەیی
× بۆ سروودی دەفتەری سەنگەر . سەردار هەڵۆ
× رافەی وانەکانی پێشوو . . ئازاد جەلیلی
× شاعیری ئینسانیەت پەروەر مەلا خدری دەشتی ئەحمەد دەشتی
× ئافرەت و چەند سەربێتێکی نۆکەر طارق جبار
× فیستیڤاڵی دەبەی لاوان و قوتابیانی هەولێر ابراهیم سعید بەرزنجی
بێجگە لە گۆشەی ( ئافرەت )و گۆشەی ( زانست )و لەگەڵ ( خوێنەوارانا )و شیعرو باسی هەمەجۆری تر . . .

دەست و خامەی هونەرمەندی لاوی ناوچـــەکەمان- ســـولتان شـــێوەزووریە- زۆر سوپاســـی ئەکەین، هەروەها سوپاسی مامۆستا عەزیز سەلیم دوویات دەکەینەوە بە یارمەتی دانمان لە کێشانی وێنەی بەرگ)

٦- لـە ژمـارە (٢) دا تـەنیا پێنجیـان نووسـراون و نـاوی شەشـەم کـە فەوزی جەودەت جەمیلە نەماوە، بۆ ساغکردنەوەی ئەو مەسەلەیە رۆژی ٢١-١-٢٠١١ پەیوەندیم پێوەکردو وتـی: لەبـەر ئـەوەی ئامـادەیی لـە گەڵاڵـە نـەبوو چـووە رواندز، بۆیـە دوای دەرچـوونی ژمـارە(١) لـە دەستەکە نەمام.

٧- رۆژی ٢٣-١-٢٠١١ بـە تەلـەفۆن پەیوەندیم بە بەڕێز غـەفور حسێن گـەلاڵی ئەندامی دەسـتەی بەڕێوەبەری گۆڤاری بەرەو رووناکی کرد، رۆژی ٢٥-١-٢٠١١ لە وەڵامی چەند پرسـیارێکدا دەربـارەی گۆڤـاری بـەرەو رووناکی نامەیەکی بۆناردم.

٨- گفتوگۆیەك لەگەڵ بەڕێز نـەژاد عـەزیز سـورمێ دەربارەی گۆڤاری بەرەو رووناکی، رۆژی ٢٢-١-٢٠١١ ، هەولێر.

٩- نامـەی بـەڕێز غـەفور حـسێن گـەلاڵی ، سەرچـاوەی پێـشوو. هـەروەها لـە هەرسـێ ژمـارەدا سوپاسـی ئـەو کەسـایەتی و لایەنانـە کـراوە کـە هاوکـاری گۆڤارەکـەیان کـردووە، لەوانەش فەرەنسۆ هەریری قایمقامی چۆمان، لیژنەی ناوچەی (باڵەك)ی پارتی و یەکێتی قوتابیانی کوردسـتان و بەڕێوەبەرایـەتی قوتابخانە و هونەرمەند عەزیز سەلیم و کۆگـای هـەژار و ئـەو برایانـەی دەسـت یارمـەتیان بـۆ گۆڤارەکـە درێـژکردووە، بڕوانـە: ژمـارە(١) لاپەرە ٤ و ٤٢ . ژمارە(٢) لاپەرە ٤٨ ، ژمارە (٣) لاپەرە ٤٥ .

١٠- گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز نەژاد عەزیز سورمێ ، سەرچاوەی پێشوو.

١١-هەمان سەرچاوە.



١٢- هەمان سەرچاوە.
١٣- پەیوەندیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ بەڕێز ئیبراهیم سەعید بەرزنجی ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری گۆڤاری بەرەو رووناکی، رۆژی ٢٠-١-٢٠١١.
١٤- پەیوەندیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ بەڕێز فەوزی جەودەت جەمیل کە لە ژمارەی یەکەم ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری گۆڤارەکە بووەو ئاگاداری ئەو کەین و بەینە بووە،(رۆژی ٢١-١-٢٠١١).
١٥ - پەیوەندیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ نووسەرو رۆژنامەنووس مامۆستا مومتاز حەیدەری سەرنووسەری گۆڤاری k21 ، رۆژی ٢٠-١-٢٠١١.
١٦- پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ بەڕێز ئیبراهیم سەعید بەرزنجی، سەرچاوەی پێشوو.
١٧- هەمان سەرچاوە.
١٨- گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز نەژاد عەزیز سورمێ سەرچاوەی پێشوو.
١٩ - پەیوەندیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ نووسەرو رۆژنامەنووس مامۆستا مومتاز حەیدەری،
سەرچاوەی پێشوو.
٢٠- گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز نەژاد عەزیز سورمێ ، سەرچاوەی پێشوو.
٢١ - هەمان سەرچاوە، هەروەها نامەی بەڕێز غەفور حسێن گەلاڵی،سەرچاوەی پێشوو.

بەڕێز
مامۆستا مومتاز حەیدەری سەرنووسەری گۆڤاری k21
سلاوێکی گەرم

لەگەڵ ئەم نامەیەدا بابەتەکەم بەناوی ( گۆڤاری بەرەو رووناکی . دەنگێک لە مەملەکەتی ئازادید ) بۆ ناردن
1- بابەتەکەو چەند وێنەیەک لە cd یەکەدان.
2- بۆ روونکردنەوەی زیاتر لەسەر وێنەکان نووسراوەو ئەو روونکردنەوەیەم لەگەڵ نامەکەدا هاوپێچ کردووە
3- لەبەر ئەوەی ناوی بەڕێزتان چەند جارێک لەم بابەتەدا هاتووە پێم باشە وێنەیەکی جەنابتان لەگەڵ ئەم بابەتەدا بلاوبکرێتەوە
4- ئەگەر پێتان باش بوو هەر وێنەیەکی تر بۆ دەوڵەمەندکردنی بابەتەکە دابنێن.
5- رەنگە دانانی ئەو وێنانە شوێن بگرێت بەلام بە پێویستیان دەزانم کە لەگەڵ بابەتەکەدا دابندرێن
6- بابەتەکەم چەند جارێک هەڵەچن کردووە بەلام هەر خوا هەڵە ناکات

لەگەڵ رێزماندا

دلشاد مستەفا وەسانی
هەولێر 17-3-2011

٢٢- پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ بەڕێز ئیبراهیم سەعید بەرزنجی، سەرچاوەی پێشوو و پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ بەڕێز فەوزی جەودەت جەمیل ، سەرچاوەی پێشوو.
٢٣ - گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز نەژاد عەزیز سورمێ ، سەرچاوەی پێشوو.
٢٤- پەیوەندیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ بەڕێز شێرزاد فەقێ ئیسماعیل کە لە چاپخانەی کوردستان کاری کردووە، رۆژی ١٥-٢-٢٠١١.
٢٥- هەمان سەرچاوە.
٢٦- گۆڤاری بەرەو رووناکی، ژمارە ٢ ، ١٩٧٢، لاپەرە ٢٥-٣٢.
٢٧- هەرسێ ژمارە کۆپیکراوەکەی بەرەو رووناکیم لە لایەن مامۆستا مومتاز حەیدەریەوە بەدەست گەیشت، کە تیایدا لە بەرامبەر ئەو ناوە خوازراوانە بەدەستخەتێک ناوی راستەقینە نووسراوە هەروەها بۆ دڵنیایی پرسیارم لە بەڕێز نەژاد عەزیز سورمێ کردو هەمان رای هەیە.
٢٨- ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری گۆڤاری بەرەو رووناکی بوو. لە هەشتاکانی سەدەی رابردوو، لە رووداوێکی دڵتەزێندا لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە (گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز نەژاد عەزیز سورمێ سەرچاوەی پێشوو).
٢٩- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: گۆڤاری بەرەو رووناکی، لەبارەی هۆنراوەی ئازادەوە ئەم پرسیارەمان لە مامۆستا سەبری بۆتانی کرد، ژمارە ١ ،١٩٧٢، لاپەرە (١٠ و ١١).
٣٠- گۆڤاری بەرەو رووناکی، ئازاد جندیانی، پێشمەرگەیەکی پۆستەچی. ژمارە ٢،١٩٧٢، ل٥٠-٥٢.
٣١- گۆڤاری بەرەو رووناکی، ژمارە ٣ ، ١٩٧٣، ل ٥١-٥٢.
٣٢- هەمان سەرچاوە.
٣٣- فەرەنسۆ هەریری، زیانمان پێنج شەهید بوو، گۆڤاری بەرەو رووناکی. ژمارە ٢ ،١٩٧٢، ل٥ و ٦.
٣٤- بەڕێوەبەری شارەوانی گەلاڵە لە پێویستیەکانی ئەدوێ، گۆڤاری بەرەو رووناکی، ژمارە ٢ ، ١٩٧٢ ، ل ٣٣-٣٥.
٣٥- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ قایمقامی چۆمان، گۆڤاری بەرەو رووناکی، ژمارە ١ ، ١٩٧٢ ، ل ٨ و ٩.

# منداڵێك بیر لەدەركردنی گۆڤارێك دەكاتەوە

ئیسماعیل تەنیا- ئەڵمانیا

منداڵانی كورد بەهۆی ئەو بارودۆخەی كە نەتەوەكەیان تێیكەوتووە، لەقۆناغە جیاجیاكانی مێژووی هاوچەرخماندا، نەیانتوانیووە حەزو ئارەزووەكانی خۆیان، تێر بكەن... لەزۆربەی ئەو پێویستیانەی بێبەش بووینە، كە دەبوو لەقۆناغەكانی تەمەنی منالێتیدا هەیانبووایە...

لەحەفتاكان و سەرەتای هەشتاكانی سەدەی ڕابردوودا، لەكاتێك كە لەعێراقدا، چەندان گۆڤارو هەفتانەی ڕەنگاوڕەنگی منداڵان، بەزمانی عەرەبی چاپ و بڵاو دەكرانەوە، ئا لەو كاتانەدا، منداڵانی كورد لەو دیاری و بەخششە بە زمانی دایكی خۆیان، بێبەش و بێبەهرە بووینە.

پاش ئەوەی كە (ئەستێرە)، وەك پاشكۆیەكی منداڵانی گۆڤاری (ڕۆژی كوردستان)، لەنێوان (١٩٧٢- شوباتی ١٩٧٤)، تەنها سێ ژمارەی لێ بڵاوكرایەوە، بەهۆی بارودۆخی سیاسی ئەو كاتە، چیتر بڵاونەكرایەوە. جارێكی تر بە هەمان ناو (ئەستێرە)، لەهەمان دەزگای (بەڕێوەبەرێتی گشتی ڕۆشنبیری كوردی) لەبەغدا، ژمارە یەك(١)ی لەمایسی ١٩٧٥ دەرچوو. ژمارە (٢)ی لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٧٥ لەچاپخانە دەرچوو، بەڵام ڕژێم نەیهێشت بڵاو بكرێتەوەو، ژمارەكانی هەموو كۆكرانەوە.

ئیتر لەو كاتەوە، منداڵانی كورد بێبەش بوون لەخوێندنەوەی گۆڤارێكی تایبەت بە تەمەن و خولیاو بە زمانی زگماكی خۆیان. بۆیە ئەو منداڵانەی كە شەیدای خوێندنەوە بوون، زۆر بە ناچاری، ئەگەر لە زمانەكەش تێنەگەیشتبووین، هەوڵیانداوە لەزمانی وێنەكانەوە بگەن و بە پیر گۆڤارەكانی (مجلتي) و (مزمار) و (سندیباد)ەوە بچن و بیكڕن و بیخوێننەوە.

لەو سەرو بەندەدا، پاش پێنج ساڵ خامۆشی، لەشاری هەولێری دێرین، منداڵێكی بەهرەمەندی زیتەڵە، بیر لەدەركردنی بڵاوكراوەیەكی تایبەت بە منداڵان،



بە زمانی كوردی دەكاتەوە، ناوی لێدەنێت (نەورۆز).

هەرچەندە لەسەری نووسراوە: (بە هاوكاری چەند منداڵێك بڵاودەكرێتەوە)، بەڵام داینەمۆی سەرەكی (هەڵگورد عەبدولوەهاب) بووە. ناوبراو ئەو كاتە تەمەنی تەنها چواردە ساڵ بووە. لەبەرئەوەی دەستی وێنەكێشانی هەبووە، ساڵێك پێش بڵاوكردنەوەی (نەورۆز)، لەساڵی (١٩٧٩)دا، بە هاریكاری و هاندانی شاعیری شەهید (دڵشاد مەریوانی ١٩٤٧/٣/٢٨-١٩٨٩/٣/١٣)، پێشانگایەكی شێوەكاری لەشاری سلێمانی كردۆتەوە كە ئەو كاتە لەلایەن میدیاكانی عێراق (بە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەوە)،





گرنگــی پێــدراوە، هەواڵەکــەیان بڵاوکردۆتەوە.

لەبەرئــەوەی (نــەورۆز) بەدەســت نووســراوەتەوە، تیراژەکەشــی زۆر کەم بووە (کە لەهەر ژمارەیەکدا، ٢٥-٣٠ دانەی لێ بڵاوکراوەتەوە)، بۆیە بە دیاری بەسەر منداڵانی گــەڕەك و قوتابخانەکــەیان دابەشــکردووە. چــەند دانەیەکیشیان بۆ شاری (ڕەواندز)، نــاردووە. هەرچــەندە تەمــەنی هەڵگوردو هاوکارەکانی زۆر بچووك بووینە، بەڵام توانیوویانە سوود لە ئــەزموون و دیــزاینی گۆڤارەکــانی (مجلــتی و مزمــار) وەربگــرن و لەلاسایی کردنــەوەیان (کــەمێك) ســەرکەوتووبن. لــەڕووی دابەشکردن و دەست نیشانکردنی بەشەکانیشدا، سەرکەتوو بووینە. لەیەکەم ژمارەدا، ڕەچاوی بوونی ئەم بەشانەیان کردووە کە دەبێت لەبڵاوکراوەیەکی منداڵاندا هەبن. نموونەی: (وتەی ژمارە، چیرۆك، هونەر، زانست، مێژوو، شیعری منــداڵان، بــۆ زاخــاوی مێــشك، چیرۆکی فۆلکلۆری).

شــایانی باســە، (نــەورۆز) دوو ژمارەی تریشی بە دەستنووس و بە هــەمان دیزاینــەوە لــێ بڵاوکراوەتەوە. ئەو ژمارەیەی کە لەبەر دەستی مندایە، ژمارە (١)ی کۆپی کراوە و دڵشاد محەمەد ئەمین (دڵــشاد مــەریوانی)، وەك دیارییــەك پێــشکەشی بــە (جــــەمال خەزنــــەدار) کردووە.

دڵــــشاد لەپێــــشکەش کردنەکەدا دەنووسێت: (بۆ کــاك جــەمال خەزنــەدار پێــشکەشە. یادگــارو بەرهــەمی ئــەو منداڵــە کــوردەی گــەر ســلێمانی فریای نەکەوتایە لەهەولێر کەس گرنگی پێ نەدەدا.

ئیمــزا: دڵــشاد محەمــەد ئەمین ١٠/٧/١٩٨٠).




لەهەردەســـــتەیەکدا هەوڵــدەدەین ئــەو گۆڤــارە بــە تایبەتیش ژمارە (١) یەك، شرۆڤەو نمایش بکەین، چونکە بە ڕاستی بۆ ئەو کات و تەمەنی ئەو منداڵانە ئەوەنــدە دەهێنێــت لــە ڕۆژگــاری ئەمرۆمانــدا بە خوێنــەرانی ئاشنا بکــەین، تــا ئێــستاکەشی لەگەڵــدا بێــت، شــتێکی ئــەوتۆی لەســەر نەنووسراوە.

لەسەر بەرگی (لاپەڕەی یەکەم)ی ئــەو گۆڤــارەدا، بــە شــێوەیەکی فەنتازییانــە و بــە دەســت نــاوی گۆڤارەکــە (نــەورۆز) نووســـراوە. لــەدوای (نەورۆز)یش، وا پێناســە کـــراوە: (گۆڤـــاری منداڵانــــە، ژمارە(١)، ئاداری ساڵی ١٩٨٠ز).

هەر لەو لاپەڕەیەدا، وێنەی منداڵێك بە جلی کوردییەوە دەبینرێت کە گۆڤاری (نەورۆز)ی بە دەستەوەیە. لەسەر سەری منداڵەکەش وێنەی (ڕۆژ) و لــەلای ڕاســت و چەپیشی وێنەی باڵنــدەو پەپوولە دەبینــرێن وەك ئاماژەیەك بۆ حەزو ئارەزووی جیهانی منداڵان.

ژمارە (١)، دە لاپەڕەی قەبارە (A4) فۆلــسکابەو بــە زمــانی کــوردی (کرمــانجی خواروو- ڕێنووســی ئــارامی)، بڵاوکراوەتــەوە. بابــەتی هــەموو لاپــەڕەکانی بــە دەســت نووســراونەتەوە و بــە قەڵــەمی دار، وێنەکان ڕەنگ کراون.

لاپــەڕە (٢) کراوەتــە ســێ بــەش. لەبەشــی ســەرەوەدا، لەدەســتە ڕاست، لەناو وێنەیەکدا نووسراوە:

(( گۆڤـاری منداڵانـه ژمـاره(١) ))
لەناوەڕاستیدا (نەورۆز) نووسراوه.
لەدەســـتە چەپیـــشدا وتەیـــەك نووسراوه: (دەبا هەموومان ئاشتی خـوازبین لەبـەر منـاڵان).
بەشی ناوەڕاست کراوەتە سێ بـەش. لـەو بەشـەو لەدەسـتە ڕاسـتدا وتـەی ژماره دەبینرێت که زۆر به کورتی نووسراوه: (ووتـەی ژمـــاره... ئازیزەکـــانم هیوادارین ئەم ژمارەتان به دڵ بێ و هیوادارین گۆڤاری چاپیمان بۆ لەچاپ بدرێ ... نـەورۆز). لەناوەڕاسـتدا ناوونیـــشانی گۆڤارەکـــه نووســـراوه کـــه بـــەم شـێوەیەیه:- (هـەولێر- کۆمەڵـەی هونـەرو وێـژەی کوردی لقی هەولێر).
لـەژێر ئـەم ناوونیشانەشدا ئـەم نووسـینه دەبینرێـت: (پێـنج منـداڵ ئـەم گۆڤـاره دەرئەکەن: هەڵگورد، ئاری، پێـــشکەوت، ســـەرکەوت، زەردەشـــت). لەدەســـتە چـــەپدا نووسـراوه: ١٠ لاپـەڕه بـه دەسـت دەری دەچوێنن.
لەبەشی خوارەوەی ئەم لاپەڕەیەدا (بۆ ئاگـاداری) نووسـراوه، کـه لـەو (بۆ ئاگاداری)یەدا هاتووه: تکا لـەو منداڵانـه ئەکـەین ئـەوەی لەمانـەی خوارەوه بزانن بۆمان بنێرن...
١- شیعری منداڵانه که به خۆیـان بنووسن.
٢- چیرۆك ((دوو بەش)):-



شەهید دڵشاد مەریوانی

أ- چیرۆکی فۆلکلۆری.
ب- چـیرۆکی بـه دەسـتی خۆیـان بنووسن.
٣- شـــتی زانـــستی و مێـــژووی و وەرزش.
٤- هەواڵی هونەری.
٥- شتی تر....

لەلاپەڕه (٣)دا، چیرۆکی فۆلکلۆری کـــوردی (بزنۆکـــەو مەڕۆکـــه) بڵاوکراوەتەوه. وێنەکان (هـەڵگورد جندیانی) کێشاویەتی.
لاپـەڕه چوار که تایبەتـه بـه (مۆســـیقای منـــداڵان)، (پێشکەوت و ئاری جندیانی) ئامادەیـــان کـــردووەو، نووسـیویانه:(تێبینی:- لـەم ژمارەیـەدا باسـی تیپـەکانی منداڵانی کوردستان ئەکـەین بـەڵام هـەر جـارێ باسـی هەنـدێکیان ئەکـەین). لـەو لاپەڕەیـەدا، زۆر بـه کـورتی باسـی تیپـەکانی مۆسـیقای (ڕوانـدزو دهـۆك و هـەولێرو سلێمانی) و سەرپەرشـتیارو ئەندامەکانیان، کراون.
لاپـــەڕه (٥) کراوەتـــه دوو بەش و (ئاری عەبدولوەهاب و هـــەڵگورد جنـــدیانی) ئامادەیـان کـردووه. بەشـی یەکـەم تایبەتـه بـه زانستو، لـــه بەشـــی دووەمیـــشدا پێناسـەی یەکـەمین گۆڤـاری منـداڵان کـه (گروگـاڵی منـداڵانی کـــورد)ه، کـــراوه. (هـــەڵگورد جنـــدیانی) لـــەو پێناســـەیەدا دەنووسـێت: (یەکـەمین گۆڤـاری منداڵان به زمانی کوردی دەرچوو سـاڵی ١٩٤٥ز، نـاوی گروگـاڵی منـــداڵانی کـــورد بـــووه...







لەکوردستانی ئێران دەرچووەو دووەم گۆڤاریش لەکوردستانی عێراق دەرچوو بە ناوی ئەستێرە ساڵی ١٩٧٢ز. ئێستاش هیچ گۆڤارێکمان نی یە).

لەلاپەڕە (٦)دا، بابەتێك لەژێر ناوی: لەمێژووی کوردستان: جەژنی نەوڕۆز، بڵاوکراوەتەوە کە (هەڵگورد جندیانی) ئامادەیکردووە. لەیەك لاپەڕەدا، زۆر بە کورتی باسی مێژووی نەوڕۆزی کردووە. سەرکەوتووانەش کۆتایی بە بابەتەکە هێناوە. ناوبراو دەنووسێت: (بەڵام ئێستا نە کاوە هەیە بەرامبەر دوژمن بوەستێ نە کوتك بەڵکو هەموو چینی چەوساوە ئەبن بە کاوە بەرامبەر دوژمن هەتا لەتەختی دێخن).

لاپەڕە (٧)، تایبەتە بە (شیعری منداڵانە)، کە(ئاری و هەڵگورد و سەرکەوت) ئامادەیان کردووە، سێ پارچە شیعری (بەختیار زێوەرو، بێکەس، لەتیف هەڵمەت)یان تێدا بڵاوکردۆتەوە. هەر لەو لاپەڕەیەدا لە( تێبینی)یەکدا نووسیوویانە: لەژمارەکانی تر شیعری منداڵان کە بە خۆیان بنووسن بڵاو ئەکەینەوە.

لاپەڕە (٨) تایبەتە بە (زاخاوی مێشك)، ئاری جندیانی و زەردەشت بێسشوکی، ئامادەیان کردووە، (هەڵگورد جندیانی)یش، وێنەکانی کێشاون.

لاپەڕە (٩)، بە وێنەو چەند ڕستەیەکی کورت چیرۆکی (هەرەوەزی)، بڵاوکراوەتەوە کە (هەڵگورد جندیانی) وێنەکانی بۆ کێشاون.

لەلاپەڕە (١٠)و کۆتایی دا، شیعری (چەقاوەسوو)ی (فەرەیدون عەلی ئەمین) بڵاوکراوەتەوە.

# بە یادی ڕووناکبیری بە توانا (ئومێد ئاشنا)ی جوانەمەرگ



لە مێژووی ڕووناکبیری نەتەوەکەماندا، زۆر مرۆڤی خەباتکارو جەربەزە هەن خزمەتی بێ ئەندازەیان بە نەتەوەکەیان کردووە، بە دوور لەهەر جۆرێ خۆڕانان و ناز کردن بەسەر ئەوانی دیکە، بەڵکو زۆر بە لەخۆبووردووانە شانیان داوەتە بەر خزمەتکردن بێ ئەوەی چاوەڕوانی پاداشت و خەڵات و دەستخۆشی بێت.

یەکێک لەو ڕۆڵانەی ئەم گەلە، نووسەر و ڕووناکبیری جوانەمەرگ (ئومێد ئاشنا)یە.

-ئەم ڕووناکبیرە بەبڕشتە لەساڵی ١٩٥٥ لە بنەماڵەیەکی ڕووناکبیر و ئاینپەروەر لە سلێمانی لەدایک بووە.

-لەساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩ پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی لە هەولێر تەواو کردووە و لە ناوچەکانی قەرەداغ و دۆکان و دەربەندیخان و سلێمانی مامۆستا بووەو لە ڕێی ئەم پیشە پیرۆزە منداڵانی ئەم دەڤەرانەی پەروەردە کردووە.

-لە ساڵی ١٩٧٨وە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد بووە.

-لەساڵی ١٩٩٤ لەسەر داوای خۆی خانەنشین کراوە، بۆ ئەوەی دەرفەتی تەواوی هەبێت بۆ خزمەتکردن لە بواری ساغکردنەوە و کۆکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی ڕۆشنبیریی نەتەوەکەمان.

-ئاشنا پڕۆژەیەکی ئەدەبی بەدەستەوە بووە بەناوی (پڕۆژەی سەد کتێبی کوردی) کە توانیوە نزیکەی (٧٠) کتێب و نامیلکەی بە تیراژی کەم، لەبەر بێ توانایی ماددی لێ چاپ بکات.

-سامانێکی ئەدەبی زۆری بە دەستنووس بەجێهێشتووە.

-لە ١٦ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٠ لە تەمەنی ٤٥ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان نێژراوە.

-لەدوای خۆی سێ جگەرگۆشەی بەناوی (سیامەند و سایە و شاد) جێهێشتووە.

ئەوەی نەختێ ئاگاداری ڕەوشی باری ڕووناکبیریی نەتەوەکەمان بێت، بەتایبەتی لە حەفتاکان بەدواوە، بەناوی (ئومێد ئاشنا) ئاشنا بووە، ئەویش لەبەر ئەو هەموو بەرهەم و بابەتە جیاجیایانەی کە بەردەوام لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوی دەکردنەوە.

هەر بۆ نموونە لە دوازدە ژمارەی ڕۆژنامەی هاوکاری نێوان ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧٤)، بابەتی هەمەجۆری.

- دەربارەی لیستەی یەکەم و دووەمی زاراوەکانی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ژ٢٣٤، ٢٣٥، ١٩٧٤، ل٣-٥.

-ناودارانی کورد، مەلا ئیبراهیمی



د. ئازاد عوبێد ساڵح

شاعیر، ژ ٢١٠، ١٩٧٤، ل٣-٧.
-بیرەوەری و گەشت و یاد و یادداشت، تەمەنی حەزێکی هەڵچووم، ژ ٢٣٧، ١٩٧٤، ل٥.
-شیعری وەرگیراوە، شێتەکان بۆ سەما ئەکەن، ژ ١٩٨، ١٩٧٣، ل٨.
-لە هۆنراوەی ماوتسی تۆنگەوە، ژ ١٩، ١٩٧٣، ل٣.
-هۆنراوەیەکی قوتابیان، ژ ٢٠١، ١٩٧٤ن ل٨.
-رەخنەی ئەدەبی بۆ ئەوەی لە خونفوسیەت بگەین، ژ ١٨٩، ١٩٧٣، ل٨.
-(فاضل شەورۆ) و هۆنراوەی دەهۆڵ و سینان، ژ ١٦٣، ١٩٧٣، ل٣-٨.
-هۆنراوەی دڵدارەکەم لە ئاوێنەی بیروڕایەکدا، ژ ٢٠٣، ١٩٧٤، ل٣-٧.

لە نێوانی ساڵانی (١٩٧٣-١٩٨٠) ژمارە (سفر-٩٤) گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)دا (١١) بابەتی جۆرا و جۆری رەخنەیی بڵاوکردۆتەوە.

لە گۆڤاری (بەیان)یش لەنێوانی ساڵانی (١٩٧٤-١٩٨٠) (٦) بابەتی رەخنەی ئەدەبی بڵاوکردۆتەوە. ئەمە جگە لەژمارەکانی دواتری ئەم بڵاوکراوانە کە یەکجار زۆرن.

یەکێ: لەکارەکانی ئومێد ئاشنا کۆکردنەوەو ئامادەکردنی هەندێ لە بەرهەمەکانی مام جەلال تاڵەبانی بەناوی (ئامانج)و بەچاپێکی هەزارانەو تیراژی کەم ساڵی ١٩٩٦ بڵاوی کردوونەتەوە لەوانە:

-ژیان و خەباتی قەڵەم و کوردایەتی.
- گەشتێك بەرەو ئاشۆ
- یاداشتەکانم، وەرگێران لەعەرەبییەوە.
- يوميات وجولة في بلغاريا الجديدة.
- الفلاحون وحرايتهم من الثورة الوطنية الديمقراطية.

لە ساغکردنەوەی دیوانی پیرەمێرد دا بەناوی (پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێ بۆ ژیان و بەرهەمەکانی، بەرگی ١، ٢) لەساڵی ٢٠٠١ کە لە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس لە هەولێر دەرچووە، زۆر بە چاکی و بە روونی و وردەکاری و پشووتیژی و سەلیقەی زانستانە و رووناکبیرانەی پێوە دیارە.

لێکدانەوە و ساخکردنەوەی ژیان و شیعرەکانی پیرەمێرد و بەرهەکانی، بەلای ئومێد ئاشناوە کارێکی هێجگار پێویست بووە بۆ مێژووی ئەدەبی کوردی، لەبەر ئەوەی هەروا ئاسانیش نەبووە، ئەوا لەماوەی پێنج ساڵ کارکردنی بەردەوامدا توانیووە ئەم کارە بێنێتە بەرهەم و دوو بەرگی (٤٢٤+٤٤٨-٨٧٢) بەچاپێکی جوان چاپی یەکەمی لەساڵی ٢٠٠١ دەرچووە و لەساڵی ٢٠١٠ش چاپی دووەمی جارێکی تر چاپکراوەتەوە. ئەم کارە گەورە و ناوازەیە بە کۆکردنەوەی شیعر و بەرهەمەکانی و شەن و کەوکردنی رۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە و بەتایبەتیش (ژیان و ژین) لە (١٠١٥)ژمارەوە هەموو لایەنەکانی ژیانی روناکبیری پیرەمێردی شاعیر لێك داوەتەوە.

هەروەك خۆی لە پێشەکیدا ئاماژەی بۆ کردووە، سەبارەت بە چۆنیەتی راپەڕاندنی کارەکەی پشتی بە کەشکۆڵ و دەستنووس و نامەو هەروا یادداشتەکانی پیرەمێرد خۆی بەستووە کە لە ژمارەکانی رۆژنامەکەیدا نووسیوویە.

ئەمە جگە لە ساخکردنەوەی ژیانی ئەدەبی و رۆژنامەنووسی پیرەمێرد، پیرەمێرد و چیرۆك و رۆمان و شیعر و کارە مەزنەکانی پیرەمێرد لە پێشخستنی ئەدەب و فۆلکلۆری کوردیدا و پیرەمێرد و نەورۆز و زیندووکردنەوەی ئەم رۆژەی کورد.

بابەتی گرنگی پیرەمێرد و رۆژنامەوانی، کە هەر لە سەرەتاو لە ئەستەمبوڵ بەدوای بزووتنەوەی دەستوری لە ساڵی ١٩٠٨، لە رۆژنامەی (کورد تەعاوەن تەرەقی)ی کۆمەڵەی تەعاوەن وتەرەقی کورد لە ئەستەمبوڵ دەستی پێ کردووە، ئیمتیازی بەر پیرەمێرد (حاجی تۆفیق) کەوتووە. ئەوەی جێی سەرنجە زۆری خۆ بە ساخکردنەوەی ئەم رۆژنامەیە خەریك کردووە، لە کاتێکدا سەرچاوەی نزیك و خودی رۆژنامەکانیش جارێکی دیکە لەلایەن محەمەد ئەمین بۆز ئەرسەلان، لەسوید چاپ

کراونەتەوە بە کورتی لایەنی ڕۆژنامەوانی پیرەمێردی بەچاکی دەورکردۆتەوە، ئەوەش بە پاڵپشتی زانیارییەکانی پیرەمێرد خۆی کە لە ڕۆژنامەکەیدا بلاووکردوونەتەوە.

سەبارەت بە شیعرەکانیشی، ئەوا پەراوێزی بەجێ و پێویست و زانیاری و ڕوونکردنەوەی چاکی خستۆتە بەر دەستی خوێنەر، هەروەها فەرهەنگی بۆ وشە کەم زانراو و ناوەکان کردووە، ئەمەش کرۆکی لێکۆڵینەوەیە.

بەراستی ئەم کتێبە شاکارێکی گەورەیە و گیانی پیرەمێردی پێ زیندوو بۆتەوە.

ئومێد ئاشنا جگە لەوە بەرهەمی دیکەشی وەك کتێب هەن، لەوانە کتێبێکی بەناوی (ڕەشید نەجیب ١٩٠٦-١٩٦٨)، ژیان و بەرهەمەکانی ئامادە کردووە و بە (١٦٠) لاپەڕە لە دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراسدا لە ساڵی ٢٠٠١ دەرچووە کە ئەویش کارێکی جوان و شایانە.

هەر لە دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، کتێبێکی دیکەی بەناوی (ئەشکی باوان، بەرهەمە بلاونەکراوەکانی کامەران موکری)، ساڵی ٢٠٠١ دەرچووە.

( بارانی سلێمانی) بەرهەمی بلاوکراوەو لەیادکراوی محەمەد ساڵح دیلانە لە٢٠٠١ لەدەزگای ئاراس لەهەولێر چاپ بوو. ساخکردنەوەی دیوانی بێکەس و شێخ ڕەزای تاڵەبانی کەبەهاوکاری شێخی خاڵ لەهەولێر چاپ بووە.

هەروەها کتێبێکی بەناوی (دەربارەی ئەدەب و مێژوو)، کۆمەڵە وتارێکی جیاجیان لەبارەی ئەدەب ومێژوو لەکاتی خۆی لەشۆڕشی جیاجیادا بلاوی کردۆتەوە لەسلێمانی لەساڵی ٢٠٠١ وەك کتێب (٣٥٠)ی بلاوبۆتەوە.

کتێبێکی دیکەی بەناوی (شێوەو ناوەرۆك) کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەن لەئەدەبی کوردی، دەزگای ئاراس لەساڵی ٢٠٠٧ لە(٢٤٧) لاپەڕە چاپی کردووە.

لەبواری فۆلکلۆریشدا ئاشنا، کاری خۆی کردووە و چەندین وتاری لەو بارەوە نووسیوە، لەوانە: نەورۆز لە نێوان ئەفسانە و ڕاستی مێژوودا کە لەکاروان ژمارە ٤٤، مایسی ١٩٨٦، ل٨٩-١٠٠، بلاوکراوەتەوە.

ئاشنا بایەخێکی زۆر باشی بە بورای ڕۆژنامەوانیی کوردی داوە، ئەوە جگە لە ساخکردنەوە و بەدواداچوونی ژیانی ڕۆژنامەوانیی پیرەمێرد، چەندین بابەت و وتاری دیکەی بۆ ئەو بوارە تەرخان کردووە.

هەر بۆ نموونە: لێکۆڵینەوە و ساخکردنەوەی دووەم ڕۆژنامەی کوردی لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردی بۆ ڕۆژنامەی (کورد تەعاوەن و تەرەقی غەرەتەسی) کە لەدوای بزووتنەوەی دەستووری لە تەمموزی ١٩٠٨ لە دەوڵەتی عوسمانی لە ئەستەمبوڵ دەرچووە، (هاوکاری ژ ٩٦٤، ٧/ ٤/١٩٨٨).

هەروا بەناوی (دیارییەك بۆ یادی سەد و یەك ساڵەی ڕۆژنامەگەری کوردی)ش بابەتێکی نووسیوە، وەزارەتی ڕۆشنبیری لە ساڵی ١٩٩٩ لە سلێمانی چاپی کردووە.

هەر لەو بابەتەدا لە بارەی گۆڤاری (بانگ کورد)یش بابەتێکی نووسیوە کەوا لێرەدا دەقەکەی بلاوکراوەتەوە.

بەرهەمێکی دیکەی ئاشنا (ئیسماعیل حەقی شاوەیس ژیان وبەرهەمەکانی)، لە ساڵی ٢٠٠٣ لە دەزگای ئاراس لە هەولێر چاپ کراوە. لە بواری سەخکردنەوەی شیعر و بەرهەمی جیاجیای نووسەرانی کورد هەوڵی زۆری داوە کە بێگومان خزمەتی زۆر گەورەن بۆ بوژاندنەوە و پاراستنی کەلەپووری ئەدەبی و ڕۆشنبیری نەتەوەکەمان. هەوڵێ زۆرمان دا لە ڕێی ئەنتەرنێت لیستی بەرهەمەکانی ئامادەبکەین بەڵام نەسازا.

لەو دەرفەتەدا، خوازیارین دەرفەتێك بڕەخسێت بۆ کۆکردنەوە و لە چاپدانەوەی سەرجەم کارەکانی، وەك وەفایەك بۆ شەونخوونی و ماندووبوونی ئەو ڕووناکیبرە بە توانایەی نەتەوەکەمان لە بیرەوەری ١١ساڵەی کۆچی دواییدا.




یادداشتەکان
نووسینی
مام جەلال
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
ئامانج
١٩٩٦


قضايا نظرية
الفلاحون
و
مراتبهم ومواقفهم من
الثورة الوطنية الديمقراطية
بقلم
الاستاذ - جلال الطالباني


مام جەلال
ژیان
و
خەباتی
قەڵەم و کوردایەتی
ئامادەکردنی
ئامانج
١٩٩٦


لێکۆڵینەوەی سیاسی
گەشتێک
بەرەو ئاسۆ
نووسینی
مام جەلال
ئامادەکردنی
ئامانج
١٩٩٦

# کــــۆواری هەتاو



**هـەواڵ، ڕاپـۆرت و ڕیپۆرتـاژ، وەرگێـڕان، ئـەدەب، هونـەر، وتـار، وێنـە، و چـەند بابـەتێکی دیکـە لـەم باسـەدا دەکەونـە بەرچاو، هەموویشی بەیەکەوە خوێندنەوەیەکە بۆ کۆوارێك، کە تەمەنی لە نیوسەدە تێپەڕی کردووە.**



سەعید عەبدوڵڵا حەمەدەمین

## پێشەکی:

***ژمـارەی (۹)ی گۆڤـاری K21دا بـەڵینی دابـوو کـە لـەم ژمارەیەدا چاوەڕوانی دۆسییەیەك بن لەبارەی گۆڤـاری هـەتاو، دیـارە دوای هەوڵومانـدووبوونێکی زۆرو دوای ئەوەی کە لە لایەن (کوردێکی یەك ڕەنگ)ەوە چاپکراوە تازەکەی گۆڤاری هەتاوم دەست کەوت، ئیتر دەستمکردە ئامادەکردنی ئەم دۆسیەیەو ئەوەش دەستەچیلەی منە لـەبارەی ئـەو گۆڤـارەوە. دیـارە هـەروەك لـە پێڕستـی بابەتەکانی ئەم دۆسییەیەوە دەیخوێنیتەوە، من لە خۆمەوە هیـچم نـەگوتووەو نەنووسـیوە، ئەگـەر بـە پاڵپـشتی، بەڵگـەکانی نـاو خـودی گۆڤارەکـە نـەبێت. دیـارە لێـرەدا دەمەوێت بە ڕوون و ڕەوانی ڕاستییەك بدرکێنم کە ئەویش ئەوەیە مـن لەسـەرەتادا بـەنیازبووم هـەم دۆسیەکە لـەوە بەرفراوانتر بێت، هەمیش بەش و لقی دیکەیشی هەبێت و قسەی هەندێك کەسی پسپۆرو شارەزایشی تێدابێت، بەڵام ئەوەم بۆ نەکرا ئەویش لەبەر چەند هۆکارێك، هەروەها لەم دۆسیەیەدا بیبلۆگرافیای بابەتـەکانی گۆڤاری هـەتاوتان بەرچاو ناکەوێت، چونکە وەك لە خوارەوەش ئاماژەی بۆ دەکەم ئەو گۆڤارە ١٨٨ ژمارەی لیچ دەرچووە، خۆ ئەگـەر ١٨٨ ژمارەکە هەریەکەی ١٠ بابەتی تێدابێت، ڕەنگە وێڕای ئەم لاپەڕانەی کە دۆسییەکە بەبێ بیلۆگرافیا تێیدایە، تەنها بیبلۆگرافیاکـەی نزیکـەی ٦٠ لاپـەڕەی دیکـەی پێویـست بوو، کەواتە ئەوە زۆر گەورەرە دەبوو. ئەوەیشمان لە یاد نەچێت، بابـەتی بیبلۆگرافیـا نـەبوون لـەم دۆسـیەیەیدا کەلێنێکی گەورەی بەتاڵە. وەنەبێت وەها بە ئاسانی بۆمان قبوڵکراوە.***

لێرەوە واز لە قسەکانی خۆم و بۆچوونەکانم دەهێنم و دێمە ناو باسـەکانەوە و یەکـەم بابەتیش لەسـەری ڕاوەستێن کـە لـەبارەی گۆڤـاری هـەتاو دوابێـت دەچـینە سـەر بەرهەمـە



ئاوازەکەی شەهید جەبار جەباری، دیارە لەساڵی ٢٠١٠ مامۆستا عەبدوڵڵا زەنگە، هەڵساوە بە کۆکردنەوەو ئامادەکردن و چاپکردنەوەی سەرجەم بەرهەمە ڕۆژنامەنووسییەکانی شەهید جەبار جەباری و لەوێدا شەهید جەبار جەباری لەبارەی مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردی لە بەشی (پەیدابوونی چاپ لە کوردستان) نووسیویەتی: " هەروەك زانراوە کە ماشێنی چاپ بۆ یەکەمجار لە لایەن گۆتنبێرگی ئەڵمانییەوە دروست کراوە وە بە پێشکەوتنی چەرخی ژیان کەسەکانی لە ڕووی هونەرییەوە لە زیادبوون و پێشکەوتنا بووە.

یەکەم چاپخانەی کوردی کە توانای بۆ گەلی کورد تەرخان کردبێت لەساڵی ١٩١٥ لە شاری حەلەب لە لایەن خولێخۆشبوو حوسێن حوزنی موکریانییەوە دامەزرێنرا، وە لەساڵی ١٩٢٥ ئەم چاپخانەیە گوازرایەوە بۆ ڕەواندز، ئەو چاپخانەیەی حوزنی هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی لەسەر نییە کە لە ساڵی ١٩١٥دا دامەزرابێ، بەڵکو ئەو چاپخانەیە لە ساڵی ١٩٢٥دا دامەزراوە بە بەڵگەی ئەوەی لە گۆڤاری (دیاری کوردستان) نووسراوە، وە لە ساڵی ١٩٤٧ لە پاش کۆچکردنی خاوەنەکەی بە یەکجاری هێنراوەتەوە بۆ شاری هەولێر، وە ئێستاش (واتا تا نووسینی ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٦٧) ئەم چاپخانەیە بە ناوی (کوردستان) "چاپخانەی کوردستان میراتگرەوەی ئەو ئەو چاپخانەیەیە کە لە ساڵی ١٩٣٥ا حوزنی لە موسڵ کڕیبووی و هێنایە هەولێر- ئەوەبوو دوای ساڵێك نەیتوانیوە پێنج دیناری کومپیالە بداتەو کەسێکیش نەبووە بۆی بدات، تەنانەت ئەوسا حوزنی داوای لە شارەوانی هەولێر کردووە ئەوان پێنج دینارەکە بدەن و چاپخانەکە بۆ شارەوانی بێت ئەوەیشیان لەگەڵ نەکردووە، بۆیە ناچار بووە چاپخانەکە بداتەوە خاوەنەکەیی و تا ساڵی ١٩٤٧ ئیشی پێ کردووە، ئەوەبوو ئەوساڵە کە حوزنی کۆچی دوایی دەکات، گیوموکریانی چەند جارێك دەچێتە موسڵ و دواجار (٤٠)دینار دەدات وچاپخانەکە وەردەگرێتەوە و لە هەولێر دایدەنێ، هەرچی چاپخانە کۆنەکەی ڕەواندزە دیارە چەند ساڵێك لەوێ بێ خاوەن ماوەتەوە و زۆر لە پارچەکانیشی دزراوە، وەکو مامۆستا گیو گێراویەتییەوە". لە لایەن مامۆستا گیوموکریانی کارەکەی هەڵئەسوڕێنراوە و چاپەمەنی بەکەڵك و بەسودی کوردی ئەخاتە پێش چاو. وەچاپخانەی زاری کرمانجی (کوردستان) لە ڕۆژی دامەزراندنیەوە هاتاکو ئەمڕۆ گەلێك خزمەتی بەچاپەمەنی کوردی نواندووە و چەند گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی و چەندەها نامیلکەی مێژوویی و وێژەیی و نەتەوایەتی و فەرهەنگی کراوە و ئەکرێت.




هەروەها شەهید جەباری لە هەمان کتێبدا لە بەشی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی عیراق لەپێش شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ لە زنجیرەی ٢١دا باسی گۆڤاری هەتاو دەکات و دەڵێت:

## ٢١- گۆڤاری هەتاو:

گۆڤارێکی وێژەیی هەفتەیی و دە ڕۆژی و پانزە ڕۆژی بوو، خاوەنی ئمتیاز و بەڕێوەبەری گیوموکریانی (عەبدولڕەحمان)ە، وە هەڵسوڕێنەری بەرپرسیار پارێزەر ئیبراهیم عەزیز ئاغای دزەییە، یەکەم ژمارەی ئەم گۆڤارە لە مایسی ١٩٥٤دا دەرچووە، وە ژمارەی هەرە دوایی لە ٣٠ی

تەشرینی یەکەمی ١٩٦٠بە هەمووی ١٨٨ ژمارەی لێ دەرچوو.

لەم دواییە جەلال قادر کرایە سەرنووسەری گۆڤارەکە، ئا بەو شێوەیە ئەم گۆڤارە لە شاری هەولێر توانی لە ماوەی حەوت ساڵدا خزمەتی ڕاستەقینە بە گەل و نیشتمان بگەیەنێت، مامۆستا گیوموکریانیش وەکو ڕۆژنامەگەرە هاوڕێییەکانی بە تاوانی خەبات و تێکۆشان کاربەدەستانی عەبدولکەریم قاسم بۆ خوارووی عیراق دووریان خستەوە گۆڤارەکەش داخرا.

ئەم گۆڤارە دەستێکی باڵای هەیە لە پێگەیاندن و هاندانی ڕۆشنبیرە تازە هەڵکەوتووەکانی گەلی کوردمان، وە هەمیشە بە ئوسلوبێکی دڵبزوێنەر پاڵی بە لاوەکانەوە ئەنا بۆ هۆنینەوەی هەڵبەست و بە زۆری بەرهەمەکانیانیش لەگۆڤارەکە بڵاو ئەکرایەوە.

لە کۆتایی ئەو بڕگەیەی سەرەوە ئامادەکاری کتێبەکە عەبدوڵلا زەنگەنە لە پەراوێزێکدا نووسیویەتی: ((لەم گۆڤارەدا لە سەرەتادا کارەکان ئاوەها دابەشکرابوون: خاوەنی ئیمتیاز و مدیر ئیدارەی نووسین: گیوموکریانی مدیری بەرپرسیار: محامی ئیبراهیم عەزیز ئاغا (١-٣٨) مدیری بەرپرسیار محامی محەمەد شەهاب دەباغ (٣٩-؟) مدیری بەرپرسیار: رئیسی مستەفا عید: جەلال قادر هەردوو ناوونیشانەکەی سەرەوە یەك لە دوای یەك دواترکراوەتە (خاوونی ئیمتیازز هەڵسوڕێنەر- سەرنووسەر)- ع. زەنگەنە)).)

## لەچاپدانەوەی گۆڤاری هەتاو

دیارە هەوڵەکانی بنکەی ژین بۆ دووبارە زیندوکردنەوەی بەڵگەنامەو ڕۆژنامەکان و ڕزگارکردنیان لە فەوتاندن بەردەوامەو هیچ نکۆڵییەکی لێناکرێت، ئێستاکەش وەك ئەوەی بیانەوێت پرۆژەکانیان بەرفراوانتر بکەن، شێوازێك لەکاری هەرەوەزی بە رووخسای پرۆژەکانیانەوە دیاربێت، هەوڵدەدەن پرۆژەی هاوبەش ئەنجام بدەن، وەك ئەوەی کە ساڵێك لەمەوبەر پرۆژەی چاپکردنەوەی گۆڤاری دەنگی گێتی تازە لەگەڵ دەزگای ئاراس و پاشانیش گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەکادیمیای کوردی لەبارەی ئەنجامدانی چەند پرۆژەیەکی هاوبەش و دوای ئەویش بەچاپگەیاندنەوەی ١٨٨ژمارەی گۆڤاری هەتاو لەگەڵ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریان.

**خەرمان بەرەکەتە ئینشائەللا.**

چاپکراوە تازەکە چی تێدایە؟

- چاپکراوەتازەکەی پرۆژەی هاوبەشی نێوان بنکەی ژین و دەزگای موکریان، پێکهاتووە لە ١٣ بەرگ، بەڵام بەرگی یەکەم بەشی یەکەم و دووەم، بەرگی دووەم بەشی یەکەم و دووەم، بەرگی سێیەم بەشی یەکەم و دووەم، بەرگی چوارەم بەشی یەکەم و دووەم، بەرگی پێنجەم بەشی یەکەم و دووەم، بەرگی شەشەم بەشی یەکەم و دووەم، بەرگی حەوتەم.
- دەزگای موکریانی لە بەرگی یەکەمدا یەکەم بابەتی نووسیوە بەناوی (پرۆژەی هاوبەش) و باسی ئەو پرۆژەیەو پرۆژە هاوبەشەکانی دیکە دەکات و بە گرنگ وەسفیان دەکات.
- دوای ئەو بنکەی ژین (وتەیەکی پێویست)ی نووسیوە.
- د. کوردستان موکریانی پێشەکی و لێکۆڵینەوەی بۆ نووسیوە.
- بابەتێکی گیوموکریانی بڵاوکراوەتەوە لەبارەی دەرچوونی گۆڤاری هەتاو کە قۆناغەکانی بریوەو تا گەیشتووە شەشەم قۆناغ، باسی ئەوەیش دەکات کە لە رووی داهاتی داراییەوە رەوشێکی باشی نییە.
- فەرهەنگی ناوەرۆکی گشتی، ژمارەکانی هەتاو.
- ١٨٨ژمارەی گۆڤاری هەتاو لە ١٣ بەرگدا.
- لەسەر بەرگی کتێبەکەدا نووسراوە (ئامادەکردنی سدیق ساڵح - رەفیق ساڵح - عەبدوڵلا زەنگەنە) پێشەکی و لێکۆڵینەوە (د. کوردستان موکریانی)

## پێڕستی بابەتەکان

- زاراوە و شێوە ڕێنووسی کۆواری (هەتاو).
- ئەو ڕۆژنامەنووس و نووسەرانەی جێ دەستیان بە کۆواری (هەتاو)ەوە دیارە.
- هەواڵ لە کۆواری (هەتاو).
- ڕاپۆرت و ڕیپۆرتاژ لە کۆواری (هەتاو).
- پیادا هەڵگوتن لە کۆواری (هەتاو).





- وتار لە گۆواری (هەتاو).
- هونەر لە گۆواری (هەتاو).
- وێنە و لە ژێر نووسینی وێنە لە گۆواری (هەتاو).
- وەرگێڕان لە گۆواری (هەتاو).
- ئەدەب لە گۆواری (هەتاو).
- پۆزش و داوای لێبووردن و ریکلام لە گۆواری (هەتاو).

## زاراوە و شێوە ڕێنووسی گۆواری (هەتاو)

گۆڤاری هەتاو بە زمانی کوردی دەرچووەو بە شێوەزاری کرمانجی خواروو، بەڵام بە زمانی عەرەبیش بابەتی بڵاوکردۆتەوەو بوونی هەیە، بەڵام مەوداکانیان زۆر نینن و بۆ بابەتی زۆر دیاری کراون.

لە هەمانکاتدا زمانێکی وەهای هەیە کە لەمڕۆشدا کەم کەس هەن بتوانن بەو شێوە زارەو بەو جۆرە خۆنزیك ککردنەوەیە لە رووی ڕاگەیاندنەوە کار بکەنە سەر خوێنەران و بۆلای خۆیانیان ڕابکشێن.

لە رووی تیپیشەوە گۆڤاری هەتاو بە ئەلف و بێی کوردی لە عەرەبی داهێنراو نووسراوە

## ژمارەیەك لەو ڕۆژنامەنووس و نووسەرانەی جێ دەستیان بە گۆواری (هەتاو)ەوە دیارە

دیارە گۆڤارێکی وەهاو دەرچوونی بەو شێوازە، ڕەنگە ئاسان نەبێت و پێویستی بە هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆریش هەبێت بۆیە ئەو گۆڤارە وەك لەبابەت و نووسینەکانیشیەوە دیارە، لە لایەن ژمارەیەك لە نووسەرەوە بابەتی بۆ نێردراوەو دەوڵەمەند کراوە، من لێرەدا ژمارەیەکیان دەخەمە روو:

- گیو موکریانی: لەگەڵ ئەوەی خاوەن ئیمتیاز و مودیری ئیدارەو نووسین بووە، بەڵام ژمارەیەکی زۆری وتار تێدا بڵاوکردۆتەوەو وتارەکانیش جۆراوجۆرن و لەیەك شێوازدا خۆیان نابیننەوە.

- جگە لە مام گیو چەندان نووسەرو ڕۆژنامەنووس و ئەدیبی دیکە جێدەستیان بەسەر گۆڤاری هەتاوەوە دیارە لەوانەش: (شاکر فەتاح، عەبدولرەزاق بیمار، ع-قرگەیی. ت-ب- مەریوانی، ابراهیم عومەر، محەمەد شێخ رەشید. د.ا.شەوقی، عومەر ساقی. م.خەسرەو، بیمار، مەنگوڕی. سەعید شێخ عەلی، ح. ڕەشوانی، دزەیی، کامل شێردڵ، خلیل حاجی عەزیز. دڵزار، شارەزا، جەلال کلێپە. دەروێش کۆیی، ع.م .شارەزووری، ن. وەشتی، م. ڕەسول، پیربال مەحموود. رابەر بۆتانی، شیرکۆ بێکەس. لەتیف بەرزنجی، محەمەد ئەمین کاردۆخی، محەمەد فیدا، لاوان، مدحت بێ خەو. غەمبار- کەمال، لەتیف شێخ سادق، مەلا ئەحمەد ناسنگەر، تاهر ئەحمەد عەوێزی، کەریم سەلیم، سەید قادر کەرکووکی، نەسرین سورچی، جەزا محەمەد سالح، هۆشیار.م، حەمە رەحیم سەعید، غەمگین قەڵادزەیی، مەجید عومەری ئەندازیار، ).

گۆڤاری
هەتاو
١٩٥٤-١٩٦٠

## هەواڵ لە گۆواری (هەتاو)

ئەگەر وەك هەواڵ سەیری بکەین ڕەنگە ژمارەی ئەو هەواڵانەی کە لە گۆڤاری هەتاودا بڵاوبوونەتەوە بەقەد ژمارەی تەواوی گۆڤارەکە نەبن، دیارە شێوازی جۆراوجۆری هەواڵی تێدایەوە هەبوونی بازاڕی کتێب و چاپ بوونی کتێب و دانانی ڕێز و سڵاو لەبەرمبەر یادی کۆچکردوویەك، لەو شێوازانە، بەڵام بۆ ئەوەی ئەو بابەتەی

لاسەرەوە بێ نموونە نەبێت ئێمە هاتووین ئەو نموونەیەی لای خوارەوەمان بۆتان ئامادە کردووە.

لە بەرگی بەرگی حەوتەم و لە لاپەڕەی ٥٥٩٥ی کتێبەکەداو لە لاپەڕە یەکی گۆڤاری هەتاودا ژمارە ١٨٤ کە لە ٣١ی ئاب- گەلاوێژی ١٩٦٠ دەرچووە و لەوێدا هەواڵێك هەیەو دەڵێت.

کۆنگرەی دووەمینی مامۆستا و وێژەوانانی کورد

سوپاس بۆ خودای تاك و پێشەوای نازدار، کە ئەمساڵیش بە کوێرایی چاوی دوژمنان کۆنگرەی دووەمینی مامۆستاو وێژەوانانی کورد بۆ بووژاندنەوەی زمانی شیرینی کوردی دامەزرا...............

## ڕاپۆرت و ڕیپۆرتاژ لە کۆواری (هەتاو)

لەناو گۆزاری هەتاودا چەندان بابەت هەن کە هەم لە ڕاپۆرت و هەمیش لە ڕیپۆرتاژ دەچن، بەڵام بەهۆی ئەوەی بەندە هیچ زانیارییەکی ئەکادیمیانەی لەبارەی هەریەك لە ڕاپۆرت و ڕیپۆرتاژ نییە، بۆیەش من ناتوانم ناویان بنێم ڕیپۆرتاژ یان نا، ئەوە لە لایەك لە لایەکی دیکەوە ڕەنگە ئەگەر بڵێن تێیدا نییە، زۆر سەیربێت وچۆن گۆڤارێکی هەفتەیی وەها کە ١٨٨ ژمارەی لێ چاپ و بڵاوکراوەتەوە لە هەموو شاروشارۆچکەکانی کوردستانەوە بابەت و نووسینی بۆ هاتووە، چۆن بێ ڕاپۆرتی ڕۆژنامەوانی دەکرێت، ئەوەیش بۆچوونێکی باشە ئەگەر بڵێن زۆرێك لە بابەتە سیاسییەکانی کە باس لە عەبدولکەریم قاسم و کۆنگرەی پارتی دیموکراتی کوردستان و مۆڵەتپێدانی پارتی دیموکراتی کوردستان و هەڵکوتانە سەر لاوانی کۆڕێ و شەقلاوەو چەندان بابەتی دیکە لە چوار چێوەی ڕاپۆرت و ڕیپۆرتاژدا ببینینەوە.... بەڵام وەك لەسەرەوەش گوتوومە من ئەکادیمی نیم بۆیە ناتوانم نموونەیەك هەڵبگرم و بڵێم ئەوەیان ڕاپۆرتە، هەر لەبەر ئەوەشە ئەم بەشە هیچ نموونەیەکی تێدا نییە...

## پیادا هەڵگووتن لە کۆواری (هەتاو)

وەك ئەوەی بیەوێتۆ مەدح و سەنای کەس بکات، ئەوا لە گۆڤاری هەتاودا لە بابەتی سیاسی و فیکرییکان و نووسینەکانیشدا هیچ شتێکی ئەوتۆ بوونیان نییە، بەڵام ئەوەش مانای ئەوە نییە لە گۆڤاری هەتاودا پێداهەڵگوتن هەربوونی نەبێت، بەپێچەوانەوە پێداهەڵگوتن بوونی هەیە بەڵام لە کوێ؟




لە گۆڤاری هەتاودا بەهۆی ئەوەی کە گۆڤارێکی هەمەو ڕەنگ بووەو هەموو بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە، بۆیەش زۆر بابەتی ئەدەبی تێدا بڵاوکراوەتەوە، ئەوەش بەوپێیەی کە زۆرێك لە شیعرەکان ئەگەر دڵدارین ئەوا بابەتەکانی ئەو شیعرە دڵدارییانە یان ئەوەتا پێدا هەڵگوتنن، یانیش دەربڕینی داخە، لە هەمانکاتدا شیعری نیشتیمانیشی تێدا کە پێداهەڵگوتن بێت. لێرەوە من تەنها یەك نموونە دەخەمە بەرچاوان ئەویش:

لە بەرگی پێنجەمی چاپکراوە تازەکەدا لە بەشی دووەم لە لاپەرەی ٤٢٧٨ی گۆڤارەکەداو لە لاپەڕە ١٢ی ژمارە ١٥١ی گۆڤاری هەتاو کەلە ١٥ی ئازار- ڕەشەمەی ساڵی ١٩٥٩ دەچووە هۆنراوەیەك بەناوی (دیمەنی کوردستان) لە نووسینی عەلی فەتاح دزەیی بڵاوکراوەتەوەو ئێمە تەنها دوو دێرمان وەرگرتووە کە دەڵێت:

چەند حەز ئەکەم لە کوتکەی کێوی بەرزا
چاوبگێرم بە چوار کەناری ئەرزا





تێربنوارمە بە بەفری سپی و دیمەنی کوردستان و جوانی گوڵ و گوڵشەنی تێربنوارمە زنجیرە چیای کوردستان گەلی سەخت دۆڵی پڕ لە دارستان بە پێی سەردەمی خۆی، ژمارەیەکی باشی راپۆرت، راپۆرتە هەواڵی بلاو کردۆتەوە.

## وتار لە کۆواری (هەتاو)

ئەگەر بڵێم یەکەم وشەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری هاتاو وتارێکە رەنگە هیچ زێدەرۆییم نەکردبێ، بۆنموونە لە بەرگی یەکەم، لە بەشی یەکەمی چاپە تازەکەدا لە ژمارەی یەکەمی لە لاپەرەی ٣ی کیتێبەکەداو لە لاپەرە ١ی گۆڤاری هەتاو ژمارە ١، گوڵانی ساڵی ١٩٥٤دا گیوموکریانی وتارێکی لەبارەی امتیازەوە بلاوکردۆتەوە بە ناوونیشانی (نازانم بۆچی تا ایستا امتیازم نەدەدرایە) باسی ئەوە دەکات کە چەندین ساڵ مدیری ادارەی گۆڤاری زاری کرمانجی بووەو لەگەڵ کاکیدا کە مەبەستی حوزنییە خەریکی کارکردن بووە گلەیی دەکات کە امتیازیان پێنەداوە. ئەوانەو چەندان نموونەی دیکەی لەو شێوەیەو وتاری گلەیی کارانە و وتاری سیاسی و رۆشنبیری و ئەدەبی لە گۆڤاری هەتاودا بوونی هەیەو بەشێکی هەرە سەرەکی گۆڤارەکە پێك دەهێنێت.

## هونەر لە کۆواری (هەتاو)

لەبارەی هونەریشەوە، گۆڤاری هەتاو چەندان بابەتی هونەری تێدایە، کە ئایا بابەتەکانی هونەریش یانیش باس لە چالاکییەکی هونەری دەکەن، وەك ئەوەی کە بەرچاوە دەکەوێت ، دەبینین لە زۆرش ژمارەکاندا باسی ئەوە دەکات کە هونەرەجوانەکانی فلانە شوێنە چالاکییەکی کرد، یان لەو بۆنەیەدا بابەتی هونەری لە وشێوازە پێشکەکەش کراوە، هەمووی بەسەر یەکەوە، ئەگەر بەروویەکی دیکە سەیری لایەنە هونەرییەکە بکەین دەڵێن ئەوا گۆڤاری هەتاو تەنها دانانی وێنەیەك لەسەر بەرگەکەیی و بەخشینی جوانییەکی دیکە لە دانانی پێرست و ریزکردنی بابەتەکان و نەخشەسازی ناوەو تیپ چنین بەو شێوازە نووسینەو پرکردنەوەی لاپەرەکانی گۆڤارەکە، خۆی لە خۆیدا ئەوپەڕی کاری هونەرییە و لەوسەرمەدا ئەنجامدراوەو هیچ گومانێك هەڵناگرێت. کە گۆڤاری هەتاو بێبەش نەبووە لە بابەتی جۆراوجۆری هونەری و شێوازە هونەرییەکەی خۆشی.




## وێنە و لە ژێر نووسینی وێنە لەکۆواری (هەتاو)

گۆڤاوی هەتاو بەبەراورد لەگەڵ ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆری لێ دەرلاچووە، ژمارەیەکی زۆر کەم وێنەی تێدایە ئەوەندە نەبێت بە درێژایی هەموو ژمارەکانی هەتاو وێنە لەسەر بەرگی هەموو ژمارەکانی گۆڤارەکان هەبووە، لە نێوان چەند ژمارەیەکیشدا وێنەکە گۆڕاوە. لێرە لەوێ وێنە هەیە بۆنموونە وێنەی مەلا مەسعوود و وێنەی عەبدولکەریم قاسم، بەلام وێنەی دیکەی زۆر کەم تێدایە ئەوەش مانای ئەوەنییە کە لەو کاتەدا وێنە بوونی نەبووە، بەپێچەوانە ئەوکاتە وێنە بوونی هەبووەو رەنگە هەر لەو کات و ساتەشدا بووبێت کە وێنەی فلیمدا دروست بووە، بەلام بەهۆی ئەوەی کە تەکنیکی وێنەیی لە چاپخانەکاندا زۆر بە

هێز نەبووە، یان هەر بوونی نەبووە بۆیە وێنەی زۆر و گوزارشتکار لە بابەتەکان لەناو گۆڤاری هەتاودا بوونی نییە.

## وەرگێڕان لە گۆواری (هەتاو)

گۆڤاری هەتاو بێبەش نییە لە وەرگێڕانی چەندان بابەت و شێوازی بابەت و بڵاوکردنەوەیان، رەنگە ئەگەر نموونە بێنینەوە ئەو دەبینین لەناو گۆڤاری هەتاودا چەندان نموونە هەبن و بە مەزندەی منیش ئەگەر گۆڤاری هەتاو ١٨٨ژمارەی لێدەرچووە ئەوا تەنهال بابەتە وەرگێڕدراوەکانی بەسەر یەکەوە ئەگەر کۆیان بکەینەوە رەنگە زیاتر لە ١٥ بۆ ٢٠ ژمارەیان لێ دەربچێت، زۆریش ئەوانەی کە کاری وەرگێڕانیان کردووە، بەڵام ئەوەی زۆر جێدەستی بە کاری وەرگێڕانەکانەوە دیارە خودی مام (گیو)ە رەنگە لە ژمارەی وەهادا هەبێت دوو تا سێ بابەتی هەبێت و وەریشی گێرابێت.
لە هەمان کاتدا بابەتە وەرگێڕانەکان هەموو لایەنەکانی گرتۆتەوە لە سیاسی و ئەدەبی و نەتەوەیی و پزیشکیشدا.

## ئەدەب لە گۆواری (هەتاو)

دیسانەوە بەو پێیەی کە گۆڤاری شیرینی هەتاو گۆڤارێکی وێژەیی و ئەدیبی بووە بۆیەش زۆرینەی هەرە زۆری بابەتەکانی لەبارەی ئەدەبەوەن، لە گۆڤاری هەتاودا زۆر شیعرو چیرۆک و پەخشان و کورتیلە بابەتی رۆمانیش بەرچاو دەکەون، بەڵام رەنگە ژمارەی شیعر لە هەموویان زیاتر بێت و ئەوانی دیکەیش لەدوای ئەوەوەبێن. لێرەدا ئێمە نموونەی یەک چیرۆکێك دەهێنینەوە کە لە بەرگی سێیەم بەشی یەکەم لە لاپەڕەی ١٥٧٨ی گۆڤارەکەدا و لە لاپەڕە ١٨ی ژمارە ٦٣ی ٣١ی مایسی ساڵی ١٩٦٥دا بڵاوکراوەتەوە.
بڵێتی یانسیب
عومەر ساقی – مودیر مکتبی مەحکەمە– عەنکاوە
مام هەمزە پیاوێکی پیرو هەژار بوو، لە گۆشەیەکی دا بەسرو پێ فرۆشتن ماڵ و منداڵی بەڕێوە ئەبرد. لەناو دوکانێکی تەنگ و بەچەند کورسی و مێزێکی کۆن و لەق و بەیەکدو مەنجەڵ و چەند قاپێکی بچووك قناعتی دەکرد، ئێوارەیەکی لە دوکاندا چاوەڕێی موشتەری دەکرد، پێیاوێکی رووت و پێخاوس خۆی بە ژوری داکرد وتی زۆرم برسییەو فلسێکیشم نییە تەنیا بڵێتی نەخۆشخانەکانم هەیە، ئەم بلیتەت ئەدەمێ بەڵکو (٥٠٠٠)دینارت بۆ دەربچێ، مام هەمزە تۆزێ وەستاو لێی وورد بۆوەو لە پان پێی وت فەرموو سەرووپێت بۆ تێکەم بیخۆ.........

## پۆزش و داوای لێبووردن و ریکلام لە گۆواری (هەتاو)

بەر درێژایی هەر ١٨٨ ژمارەکەی گۆڤاری هەتاو بە پێی روووبەری جیاواز و ژمارەی جیاوازە ریکلام کردن کە لەوێدا ناوی (اعلان)ە بوونی هەیەو لە دادوەرو موتەسریفی ئەوکاتەی لیوای هەولێرو سەرۆکی شارەوانی هەولێرەوە بڵاوکراوەتەوەو بوونی هەیە، هەروەها جۆرێك لە سوپاسیش بوونی هەیە کە تا ئێستاکەش لەناو زۆرێك لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا بوونی هەیە ئەویش ئەوەیە کاتێك کەسێك، کۆچی دوایی دەکات دوای تەواو بوونی پرسەکەی یەکێك بەناوی بنەماڵی کۆچکردوو، سوپاسی ئەوانە دەکات کە سەردانیان کردوون و دڵنەوایی لەداستدانی ئەو کەسەیان کردوون.
لەبەرمبەردا شێوازی پۆزش و داوای لێبووردنی زۆری تێدانییە، بەڵام مژدانەی زۆری تێدایە بەتایبەتیش لە رووی بڵاوکردنەوەی بابەت و کتێبی تازەوە.

## لە کۆتاییدا.......

ئەوا ئەم لەبارە نووسین و ئامادەکردنەش کۆتایی هات وەك پیشەی هەمیشەییم دەبێژم: ئەوا ئەم نووسین و لەبارەی نووسینە لەبارەی گۆڤاری هەتاو کۆتایی هات، ئەوە نە سەرەتایەو نە کۆتاییش دەبێت، ئەوە هەموو لایەنەکانی ئەو گۆڤارە نەبوون، بەڵام منی تازە جوجەڵە هەر ئەوەندەم دەسەڵات بەسەردا شکاو هیچی دیکە، بۆیە ئەگەر جوانە ئێوە شایانی جوانترینن، ئەگەر هەر کەموکورییەکی هەیە، ئەوا بۆ بۆمن بێت و..... ئیتر.

سەرکەوتنتان بە ئاوات دەخوازم





شەمو ١١ ئەیلول ١٩٤٨ — ٨ ذالحجە ١٣٦٧ — سالی ١ — ژمارە ١

خاوەندی امین (رواندزی)
مدیری مسئول
علي ناجی
پەیام —: اربیل (هتاو)
هەرچی بنوسری ونەنوسری نادرێتەوە

# هتاو

امین

وەژنامەیێکی کوردی وادبی وکومەلی یە

دانەی بە ١٠ فلسە

آبونەی سالانە

| | فلس | دینار |
|---|---|---|
| بوناوشار | ٠٠٠ | ١ |
| بودەرەوە | ٢٥٠ | ١ |

اعلانات

بولاپەرەی دوایی گری بەدوسەد فلسە

هەفتەی جارێك دەردەچی

سەرەتا :

ابە کوردین ودلپاك دەست
بەرنە هەر کارێکی گران ومەزن
ئەی پنا بەرینە بەر خودای فریاد
رسی وپەنەری خلعت پوشی (لولاك)
منالە یکی کەگوران بوی نو
بون وبیسارانی ومولوي خستو
یونە یاد صلوات ودرودیکی مو-
کەمال کەوتەوە یاد سرەتای ئەم
کارە خیرە کەابە هەمو هیوایێکی
چاکی بوگەل ونیشتمان لی دەکەین
دەست پی نەکەین
مولوی دیارە وەك اشعاري دلگیرە
شعاری نالەی معنویات وەتیشی
ونابرە بالەپیشەوە بە هەرونیکی
صاف وپاکی کوردیەوە صلواتە
کەی ئەو بدەین فرەویە
روژەکەی رحمت روی سمای کرم
صلاة وسلام کەی کەم ایستا کەم
وبدا وە هەمدا
سر مزرعەی روحی خاتمدا
مزرعەی نور جوشدا-رەوژدر
کوردستان رکا جەطوفانی نور
لمعا بی بنە سر مرام ابە زدی

دەمیکە غزتەییکمان ئەویست دەری
بینین لە وساوە کەئەم دی لەارا
کانی عراق خوشەویستدا بەلای
کەمیەوە یکدو غزتەی تیابە —
کوبرابي بەچاومادەهات بوچ ؟
غزتەیێك لەهەولیردا نەبینم ساە
هرچونی بو تەکانم دایە خوم خوا
مارو پیاوە پیاوەکانمان راست بینی
بار یەیاردا وغزتەییکمان پیکەوەنا
جاری ئەو آواتەمان هاتە دي کەوا
ناومان کەوتە ناو صحافە دارانی
ئەمافەدار دوای ئەوە رانیان کرایە
وە هەر کا شناسی ومصلحت بینیك
ئەتوانی نیك وبد حال واحتیاجاتی
اجتماعی قوم وملەتەکەی خوی
بکەبینیتە شوین خوی وناتواري
وکەم وکوری ولات بەدل ودرو
نیکی پاك وذهن وفکرێکی روناکە
وە نخاتە لاپەرەی غزتەکەوە هەو
کار بەدەستی لی بینی و بوشانی اش
گفتاری وزمامداری خوی جی بە
جی بی بکا هەم عمري لی ممنون ئەبی
هەم ابي چاکی خوی ئەخاتە —
صحیفەي روزگارەوە بەلی هرقومي
جریدەیێکي نەبی زبانی نیە کەبسنە

زمانی بو وهاواری نەکرد دیارە هەر
بەش خوراوە ناني براو ئەبی
وانحوا روای بیسنی غزتەمان
بوبو غزتەکەبشمان تفرقە جو نیە
تفریق بکا لەجامعی جامعەدا صلا
ئەکا چونکو خومان بەچاوی خومان
آل وتکال تورکیەمان دی —
خدمتکار وطن فداری بەیەکیەتی و
یەك آیینی وبرایەتی گەلین کەهەمو
لایێك پێکەوە دلمان خوش ئ
ئەوە لەهەمو جشتی خوشترە ولە
ایستاوە تکا لەاربابي فکرو رقلم و
خیرخواهانی ولات ئەکەین لە آثار
واشعار وافکاری قیمتدار غزتەکە
مان بیبەش نەکەن زورتر ابە
احتیاجمان بەمسائلی اجتماعی و-
اقتصادی هەیە چونکو اگروچی
گوزەرانمان لەرفاهدا نەبی شعرو
ادبیات بەزگی ری ناخوریتەوە
ومشکلیکیمان هەیە ئەمانەوي اولمب
فکر واختصاص ئەوەمان بوحل
بکەن لەهەمو عراقدا تا ایستا دەغل
ودانی لوای هەولیر بەناوبانك بوە
وامساليش فیض وبرکت لەهەمو
سالی زیاتر بو، وبەکمال وذوق و

اطمئنانەوە رازرا کەمانی سەسال لە
لواي هەولیردا دەغل ودان هەیە
کەچی بەهەموومنایێکەوە گرانیە
ئەم معمایەمان بوحل بکەن وچا-
رەی چیە ؟ لەهەمو لایێکەوە بومانی
بنوسن

٠٠٥٠٠

رەوشت وآمانجی غزتەکەمان

لەپیش هەمو چشتیکدا ئراحتي فکر
وقلم لەغرضي شخصی نەدوی وچونکو
اجازەی سیاستمان نیە ولەسیاست
دوانیشمان لەبارانیە ناتوانین مقالا
تی سیاسی بخەینە غزتەکەمانەوە بلام
بوجستجوري چارەی بەریدا روینو
بەربوەچون چاوەری بی مقالە ئەکەین
وکلیلی ئەم گەنجینەی مرادە لەریوە
ولەجیوە خوینەن وبەکارهینانی جو
هری علمە خوزگە یکیکیش منشاه
ومدنی حیات وري وشوین وتو
جەي حالی شاعر وادیبەکا نماني
کونەکردەوە وتا ایستا سالم و
کوردی ونالی وزور شاعری ناو
دارمان نازانین چین وکوێندەوین
وچەند ژیاون .

یادی گەورە پیاوی کورد ئەمین رواندزی هەردەم شکۆدار بێ. K21

## لاپەڕەیێکە تاریخی

ادبی [illegible]

ملامصطفی بێسارانی

پایەی ئەشعر وادیا

شاعری گەورەی ئەبوەئەو منا جات ، ملاعبدالرحیمی مەدوی ، کە زیاتر بە (مولوی) ناوبانگی دەرکر دوە ، دوابی مەلبەستێکی مناجاتی خوی وەها هیناوە :

— هەورامی —

مطرب بو بەداد دلگیر بمەوە
پیری ، ها ، آ، ا وە پیربمەوە

ئەرات وێرانەی دل کەرو آوا
چەنی بەستەی فەرد بیساران ماوا

. . . ئینە گرد جەوەخت نانانیم بیەر
فصلی سەرمەستی وجوانیم بیەن

ایستە ها جەگرد بەشیمانم بەرد
نوبەی پیریەن جوانیم ایرد

وادەی پیریەن ، یاوانم نوبە
نوبەی تو بەمەن ، کرەڵ رتوبە ا

کوردی

مطرب بی بەداد دلگیر بەوە
(پیری) ها ، وا هات باپیربەوە

ئەوات وێرانەی دل بکا آوا
بەسوزی بەستەی (بیساران ماوا)

. . ئەمە گشت کانی نەزانیم روی دا
کانی سەرگەرمی جوانیم ری دا

ایستا والە گشت دڵ بەشیمان بوم
نورەی پیریە ، جوانی لەدەست چوم

وادەی پیریە ، گەیشتمە نوبە
نوبەی توبەمە ، کرمدار توبە ا .

لەجیگایەکی ترابو خالوی کومامی (احمد بەگ ناوی شاعر) ئەنوسی

هەورامیانە

تشریف باوەرە جەر گومان جەم بو
بەلوەی (جەم) خەمی جەلاملن کەم بو

(بیسارانی) بەن نەتوی فەردی من
خەم چەنی خەمان زومەبو ساکن

کوردی

تەشریف بینە با کومەلیان جەمبی
بەلکو بەجەمی ئەم سەنگی کەم بی

(بیسارانی) بە نبوەی بیتی من
خەم لەدڵ خەما زونەبی ساکن

ئەم بیسارانی یە کی بە ، کە ئەوەندە بەرز بوە ، مولوی لەریگای تی هەلزینەوە - تضمین - ئەیکات بەترجمانی سوزی دەرونو جوشی لیکدانەوەی خوی !

هەر بەوەشەوە ناوەستی روانی لەشوینیکی ترا بەرامبەر بەم شاعرە چەزبانیکی ستایش ئەخاتە کار

هەورامیانە

هەی رحمت ئەرفەدر سودای کامل
سەرمەشقی مەینەت بیساران منزل

یا نەویرانی ، هەر بەمەن یاوان
مەنلو گرتەی کەس وێر دامان

کوردی

هەی رحمت لەگور سەوداز کامل
سەرمەشقی مەینەت بیساران منزل

کلو لی تەنیا بەمن فیرە وبەس
لەمن بەولاوە ناوری بەکەس ا .

شاعریک مولوی بەسەرمەشقی مەینەت و سەودای کامل بزانی . هیچ گومان نیە شاعریکی بەرزو نایابە ، بەکەلکی ئەوە دیت بدوز ریتەوە وبناسری ونخریتە بەر چاو بەتایبەتی بونەتەوەی ایستای کورد کەئەلف دوچاو ، چوار چاوی تامە . ارەزو بومیرانی ادبی ی پیشینانی ئەگیری

بەلام دەستوری بەگەل ناسین وبیش چاو خستنی شاعریک وەکو هیچی تر نیە ، لەپیش هەمو شتیکا بلاوکردنەوەی دیوانەکەی بی وەستە

لەبەرئەوە دل ئەخوازی ئەولایە نانەی کەچاپی آثاری پیشینیانیان گرتوتە ئەستو ، بەلە بکەن بەلکو روژی زوتر دیوانی ئەم شاعرە پیشکەش خوینەوەری بی ؛ بەجو ریک کەدیوانی مولوی لەلایەن پیرەمێردەوە پیشکەش کرا .

دیوانی بیسارانی ، وا ئەزانم [illegible] دوزی بلاوبونەوە دروژی لای زور گرتی ناوبانگی [illegible] .

چاندی نا[illegible] سەلماندنی [illegible]
[illegible] هەیە .
[illegible] ولاتیکانی [illegible]
وارانی [illegible] لەباری [illegible]
[illegible]
دیار [illegible]
بیاو :
[illegible]
ئەگرە [illegible]
باکو [illegible]
وی ئە [illegible]
خوراکی گیانی [illegible] اندازەیەک
پیشکەشی [illegible] کردنی
بەوانا [illegible]
[illegible] دان کرد

لەخو [illegible]
[illegible]
[illegible] یار
[illegible]
لاتو [illegible] مولوی
بەچاوی [illegible] رحمت [illegible]
جای [illegible]
(بیت) [illegible]
هی بیسارانی [illegible] شعر
کانی خوی کرد
هەرلە با [illegible]
کانی دو [illegible]
[illegible]
[illegible]







# گۆڤاری چیا

**غازی حەسەن**

## دەستپێك

گۆڤاری چیا ساڵی ۱۹۷۰ لەشاری هەولێر دەرچووەو سەرنووسەرو بەرێوەبەری بەدرخان سندی بووە. ئەم گۆڤارە تەنێ دوو ژمارەی لێدەرچووە. ژمارە یەکی مانگی ۱۱ی ۱۹۷۰بەسەرەوەیە. بەرگی یەکەمی بە دەستخەتێکی جوان و هونەری ناوی گۆڤارەکە (چیا) نووسراوە، لەهەمان شوێن بەلاتینی چیا نووسراوەو لەتەك هێلکاری وێنەی چیایکی سەرکەش، نووسراوە (برێك ئێخستنا- بەدرخان سندی) و سالا ۱۹۷۰ دەبینرێت و لەبەرگی دواوەش هیچ شتێك نەنووسراوە. لە لاپەڕە یەکدا ناونیشانی چیا بە شێوەیەکی جیا لە بەرگەکە دوبارە بۆتەوەو ئینجا نووسراوە ژمارە ئێك سالا(۱). ۱۹۷۰ هەڤلیر، چاپخانەی شارەوانی کەرکووک (۱۰۰۰)۱۱/۱۹۷۰. ۲٤ لاپەڕەی نیو فۆلسکابە. ژمارە ۲ی لە ۱-۲-۱۹۷۱ لە چاپخانەی دهۆك چاپ و بڵاوبۆتەوەو ۷٦ لاپەڕەیە. کاری هونەری سەعید یەحیا کردوویەتی و لە نویسنی خەت و ناونیشان و نەخشی بەرگ، هەروەها ژمارە ۲ لەلایەن رشید فندی لە چاپخانەی دهۆك سەرپەرشتی کراوە. واتە بەهەرتك ژمارە ۱۰۰ لاپەڕەی رێك و رەوانی لێدەرچووە. لەسەر بەرگی ئەم ژمارەیەدا لەتەك وێنەی چیاییێك لە رۆژێکی لەپشتەوە دەرکەوتووە، رێبوارێك بەرەو چیاکە دەڕوات و شێوازی نووسینی (چیا) بەشێوازێکی جیا لە ژمارەی یەك نووسراوە. لە ژێریشدا ئیمزای سعید یحیی هەیە. هەروەها ئەم ژمارەیە لەسەری نووسراوە : سەرنڤێسڤا نورێبەر بەدرخان سندی.






## نووسەرانی گۆڤاری چیا

بەدرخان سندی،ئەنوەر مائی، محەمەد عەلی ئیبراهیم، هاشم تەها ئاکرەیی، فەیسەل مستەفا ئەمانە لەژمارە یەکدا نووسینیان بڵاوکراوەتەوە. پێدەچێت لەژمارەیەدا سەرنڤیسەرخۆی زۆربەی بابەتەکەی ئامادە کردبێت.
بەڵام لە ژمارە ٢دا گۆڕانێکی گەورە رویداوە، چ لە ژمارەی لاپەڕەکان و چ لە ژمارەی نووسەرو ڕۆشنبیرانی بەشدار لە ژمارەکەداو ئەم ژمارە کۆمەلێك بابەتی سۆرانیشی تێدایە، ئەمە ناوی نووسەرکانی ژمارە ٥٢: شاعیری گەورەی کورد گۆران، سادق بەهادین، ناسر یوسف، مەسعود کەتانی، کەریم شارەزا، محەمەد مەولود (مەم)، حەمەکەریم هەورامی، جمیل ئەحمەد مستەفا، جەلال خۆشناو، خەلیل دۆسکی، عەبدولغەنی عەلی یەحیا، خالد حوسێن، محەمەد سەلیم ئامێدی، ڕەشید فندی، مستەفا ئەلحاج، موسی ئەتروشی.

## ڕێبازی گۆڤاری چیا

لەبەشێکی لاپەڕەکاندا بەم شێوەیە پێناسەی گۆڤاری چیا کراوە: بۆ خوێندەوارانی بەریز
چیا گۆڤاری چیا گۆڤارێکی ئەدبی وزانیاری و کومەلایەتی یە لاپەرەکانی ئامادە کردوە بو بلاوکردنەوەی شیعرو نووسینی کەلەگەلێ یا بگونجی، چ بە سورانی بی چ بە بادینانی بی، یا بەهەر شیوەییکی کە کە کوردی بی. هەروەها ئەم گۆڤارە ئامادەیە بۆ بلاوکردنەوەی هەموو پرروپاگەندەیکی بازرگانی. لەم کورتە دێرانەی سەرەوە دەردەکەوێت کە چیا بایەخ بە بواری ئەدەبی و زانیاری گشتی دەدات و بەهەردوو شێوەزاری سۆرانی و بادینانی بابەت بڵاودەکاتەوە. ئەمەش بەجۆرێك لە دەستپێشخەری لە بواری بڵاوکردنەوە دادەنرێت، هەروەها یەکەمین گۆڤاریشە کە کرمانجی سەروو لە هەولێر دەرچووبێت.

## یەکەم بەرهەمی کرمانجی سەروو

لەبەشێکی ئەو وتارەی بەدخان سندی لەم گۆڤارە بڵاوی کردۆتەوە هاتووە: ئەز ڤی بەرهەڤی پیشکیشی وە دکم بدلەکی پر ژ خوشی چونکو ئەم دشین بیژین کو هەتا نوکە مەچ بەرهەڤیت کوردی بزاراڤی کورمانجی نینە، هەروەسا مخابن مە خوێندەواریت کوردی نین کوبشین بکوردی بخوینن و بنڤیسن و هەروەکی ئەم و هین دزانین کو ئەڤە بناسیت گەلەك تشتانە.
ئەمە راستییە، چونکە لەو سەردەمەدا بەرهەمی کوردی بە شێوە زاری کرمانجی سەروو لە ناوچەی بادینان دەگمەن بووە، هەروەسا ئاستی خوێندەواریش بە کوردی بەرتەسك و لەئاستێکی نزم بووە، بۆیە چیا وەکو چراییکی زانیاری و ئەدەبی لە هەولێرەوە دەستی بەردەچوون کردووەو بانگەشەش بۆ گشت لایێك دەکات بێ جیاوازی بە سۆرانی و بادینی بنووسن و بابەت بۆ ئەم گۆڤارە بنێرن.
سەرنووسەر راشکاوانە بانگەشە دەکات و هەروەسا دواواش دەکات: برای کورد... ئەز دبینم فەربی و نوکە فەرترە ئەم بچەکی لخوبزڤرین زلایی رەوشەن بیریی و هوزان ڤانی یڤە دا ئەم بشین دگەل کەروانی ملەتان بچین. ئینجا دەبێژێت: "چێا" گۆڤارا تەیە... تیدا بنڤیسە... نەترسە دی پیچ پیچە تازەتر بنڤیسی، "چیا" گۆڤارا تەیە... بوخینە... دی فیربی نەئەڤرو سوباهی.
دوای هێنانەوەی نمونەیەکی شیعری خانی روو لە نووسەرو رۆشنبیران دەکات و دەبێژێت: ڤیجا برایی خوشتڤی ئەف مرڤە (خانی) بەری ٤٠٠ سالا زانی بی





کو قەلەم ریکا راستە بو میلەتی کوردو گەهشتناوی بو ئارمانجیت خـو دژیانـا دریـژدا. برایـی خوشتڤی... ئەگەر تە بڤیت تو بنڤیسی تو نڤیسینا تە بەلاڤ بیت دڤی گوڤاری دا بنڤیسە تو بومن بهینره لەسەر ڤی ئەدریسی: اربیل: مدیریة التربیة- بدرخان. ئیدی بنڤیسە من ئەوە هین بسەرفەرازی بژین.

لەبیرمان نەچێت ئەم سەروتارە لە ژێـر نـاوی (ریکـا چـیـایی) بلاوڤبۆتەوە.

## بابەتەکانی ژمارە یەك

رێکا چیایی - بەدرخان سندی

گەرهانەك دناڤ ولاتی دا: امێدی - خواکێخۆشبوو انور مائی

گوتنێت مەزنا

فەکولین- دلدار- ژنڤیسینا محمد علی ابراهیم

هوزان ڤانی- مەلایێ جەزیری

لاپەرەیەك ژ مێژیا کوردی- کوتی، جوتی

مێژەوەرو چارەنرەخ- هاشم گە یی ئاکرەیی

لەشکری نەنیاس

سالی مەردی و چروکی وەکو ئیك دچیت- فیصل مصطفی

ئەڤ مروڤە کیە؟

کولێرا

## بابەتەکانی ژمارە ٢

بەریـــەرەك ژ میــژیا (تاریخـــا) کوردی- هەرکاری- چیا

کـونی و تـازە لـە هەلبەسـتا- نوسینی گۆران

ئاسـتەنگیت دریکـا ئیکبوینیـا زمانی کوردی دا- صادق بهاالدین

پەندی پیشینان

گەرهانەك دناڤ وەلاتی دا- زاخو- چیا

لـی کولینـەوەی ئـەدەبی- ناصـر یوسف

گولا ئومیدی- مسعود کتانە

حـاجی قـادری کـویی و شـیعری نەتەوایـەتی - نووسـینی کـەریم سارەزا

میهرەبان خاتوین

هەلویـــست و ... هولویـــست- نوسینی محمد مولود (مەم)

ئەری تو دزانی ...؟!

مەولەوی- ح. هەورامی

کاژ- جمیل احمد مصطفی

هــوی دواکــەوتنی پەخــشانی کوردی- دکتور عزالدین مصطفی رسول

نـازی جـوانی- ئەنـدازیار: جـەلال خوشناو

خوسن

فەقیی تەیرا- خلیل دوسکی

شڤان و دز- سەگڤان عبدالحکیم

شانو توبە... نووسینی:عبدالغنی علی یحیکارو گوتن- خالد حسین

راستە- مەشخەل

گـوهی فروتـی سـەری ڤـەروتی- فیصل مصطفی

چیایت کوردستانی- محمد سلیم ئامیدی

ئەلیاسی ژار- رشید فندی

چیروکەکا کورت بو بجیکا - چاوا صە بونە دوست- مصطفی الحاج

ناڤیـت هـەیڤیت کـوردی بزانـە (سورانی- بەهدینانی)- نڤیسینا: مصطفی موسی الاتروشی

راست کرنا ناڤیت کوردی لدەڤەرا بەهدینا.

## ناونیشان و مانشێت

وەکو لە بەشێکی گۆڤارەکـەدا لـە ژمـارە یەکـدا ئامـاژەی پێکـراوە، سـەعید خـەیات بە خەتە جـوان و سـەلیقە هونەرییەکـەی کاروبـاری گۆڤـاری چـیا بـەرێوەبردووەو زۆر بەجوانیش بایەخی بە ناونیشان و دیزان داوە..بەدرخان سندی لە دوا لاپەرەی ژمارە یەکدا لە ژێر نێوی سـوپاس نووسـیویەتی: ئـەز سوپاسیا کاك سعید یحیی خگاگ دکەم ژبو پیك ئینانو دروست کرنا نەخشووینیت ڤی گوڤاری.

جێی سەرنجراکێشانە سعید یحیی خەتات هەولی داوە بە چەند خەتی جـودا ناونیـشانەکان بنووسـێت، ئەمـەش بۆ ئەوە بووە، سەردێری

بابەتەکان و ناونیشانی بنەڕەتی نووسینەکەو ناوی نووسەرەکان لێکدی جودا بکاتەوە. تەنیا لە ژمارە ١دا لە لاپەرە ١٧و ١٨دا مانشێتی لاوەکی دەرهێناوەو بە خەتێکی رەشی گەورەو دیار لەنێوەراستی لاپەرەکەو لەنێو دوو ستوندا دایناوە. تەنیا لە چاپدا یەك ستوون و دوو ستوونی بەکار هێناوەو لە ژمارە یەك لاپەرە١٦دا شێوەیەکی هەرەمی بە دارشتن و تایپی بابەتەکە داوە، لەسەرەوە بچوك و لەخوارەوەش پان و پڕ بە لاپەرەکە.

بۆ بایەخدان بە هەندێك رونکردنەوەو ئاگاداری لەرێگەی بەکارهێنانی هێلکاری رەش و گەورە بابەتەکەی لەنێو لاپەرەکەدا جیا کردۆتەوە.

بەمە بۆمان دەردەکەوێت کە دەرهێنەرو بەرپرسانی بەشی هونەری کاریان کردووە، لە درهێنان و نەخشەسازی و دیزانی گۆڤاری چیا سود لە لایەنە پێشکەوتووەکانی ئەوان سەردەم بکەن.

### چیا، بەردەوام نابێت

راستە بەهۆی بارودۆخی ئەوکات گۆڤاری چیا تەنیا دوو ژمارەی لێدەرچووە، بەڵام دەکرێت پەیامی ئەوکاتی چیا بۆ ئێستاش




کاریگەری ماوە، چونکە گۆڤاری چیا هەرچەندە سادەو ساکار بووە، بەڵام پەیامێکی رۆشنبیری و ئامانجێکی سیاسی و زمانەوانی دیارو لەباری بۆ بارودۆخی کوردستان هەبووە، بایەخی بەزمانی یەکگرتوو، نووسین و بڵاوکردنەوە بە کرمانجی سەروو، هەروەها سۆرانیش داوە. ئەوەی سەرنجی بدات لەم گۆڤارە تاقانەیەدا بایەخی زۆر بە نووسینی کوردی رەوان و دوور لە زاراوەی بیانی دراوە. سەرباری بایەخدان بە چیرۆك و شیعری کوردی، لێکۆڵینەوەو رەخنەو بابەتی مێژوویی و رۆشنبیری و جوگرافی داوە. دەرکرێت بێژین چیا ئەمرۆ بەشێکی گەشە لە مێژوویی رۆژنامەگەری کوردی، چ لەوەی دەستپێکێکی گرینگی گۆڤارو نڤیسنی کوردییە بە کرمانجی سەروو لەوان سەردەمدا، هەروەها پێنگاڤێکیشە بۆ نووسین بە هەرتك زاراڤی سۆرانی و بادینانی لە یەك گۆڤاردا کە بەردوو ژمارەی تەنێ ١٠٠ لاپەرە بووە. ئەڤەژی جێگەی داخە چیاش وەکو گەلەك گۆڤارو رۆژنامەی دیکەی کوردی زوو ماڵئاویان لێکردین.. بەڵام لە مێژووی هاوچەرخی رۆشنبیری کوردی، وەکو ئەستێرەیەکی گەش دەدرەوشێتەوە.





# پیرۆزە ...

# پیرۆزە ...

# پیرۆزە ...

***ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ٤ی تشرینی دووەمی ٢٠١٠ تاوتوێی ماستەرنامەی قوتابی (بورهان حاتەم عوسمان) لە هۆڵی (فەرهادی) کۆلێژی ئەدەبیات/ زانکۆی سەلاحەدین کرا، کە بە ناونیشانی (ساڵح حەیدەری ١٩٢٢-٢٠٠١ ڕۆڵی سیاسیی و ڕووناکبیریی) بوو، ئەم نامەیە لەژێر سەرپەرشتی بەڕێز د. محەمەد عەبدوڵڵا کاکەسوور بوو، ئەندامانی تاوتوێکردن پێکهاتبوون لە هەر یەك لە بەڕێزان: پ. د. خەلیل عەلی موراد/ سەرۆکی لێژنە، پ.ی.د. ئیسماعیل شوکر ڕەسول/ ئەندام، پ.ی.د. سەلاح محەمەد هەروری/ ئەندام، دوای تاوتوێکردن نامەکە بە پلەی (زۆر باش) وەرگیرا.***

دیارە ساڵح حەیدەری یەکێك بووە لەو کەسایەتییە سیاسییانەی کورد کە هەر لە چلەکانی سەدەی ڕابردووەوە ڕۆڵی سەرەکی لە دامەزراندنی چەندین ڕێکخراوو پارتی مارکسیی و نەتەوەیی دا بینیوە، کە هەر یەکێك لەوانە کاریگەری بەسەر ڕۆژگاری خۆی و دواتریشەوە بەجێهێشتووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ناوبراو بەپێی ئەو ئایدیا سیاسی و هزرییەی کە خۆی باوەڕی پێی هەبووە، کارو چالاکی سیاسی لەگەڵ چەندین



ڕێکخراوی دیکەی مارکسی و نەتەوەیی درێژەپێداوە، کە لە ڕاستیدا هەر یەکێك لەوانە بەشێك لە واقیعی سیاسی و هزری ئەو کاتانەی مێژووی کوردیان پێکهێناوە، هەروەها حەیدەری یەکێك بووە لەو ڕۆژنامەنووسە لێهاتووانەی کە جێ پەنجەی بەسەر زۆرێك لە ڕۆژنامە کوردی و عەرەبیەکانەوە دیارە. بۆیە بەهۆی گرنگی بابەتەکەو نەبوونی توێژینەوەیەکی ئەکادیمی کە سەرلەبەری لایەنەکانی ژیانی (حەیدەری) بخاتە ڕوو، توێژەر

لێکۆڵینەوەکەی تایبەت کردووە بەو کەسایەتیە سیاسیی و ڕووناکبیرە.

نامەکە بە پشت بەستن بە چەندین سەرچاوەی جیاواز نووسراوە، بەر لە هەموویان ئەو دەستنووسانەی کە لەلایەن خودی (حەیدەری)یەوە نوسراون، بەتایبەتیش بەشە چاپکراوەکەی یادداشتەکانی بەناوی (مختارات من مذكرات صالح الحيدري/ هەڵبژاردەیەك لە یادداشتەکانی ساڵح حەیدەری)، ئەم کتێبە هەموو ئەو یادداشتانەی ناوبراو لەخۆدەگرێت کە پێشتر لە چەند ڕۆژنامەو گۆڤارێك دا بڵاوی کردبوونەوە، لە میانەی گێڕانەوەی یادداشتەکانی دا باسی لە زۆربەی لایەنە سیاسی و ڕۆشنبیریەکانی خۆی کردووەو هەڵوێستی خۆی لە هەمبەر ڕووداوو پێشهاتە سیاسیەکان ڕوونکردۆتەوە.

هەروەها سوود لەو دیدارو چاوپێکەوتنانە وەرگیراوە کە توێژەر لەگەڵ کەسانی نزیك لە حەیدەری ئەنجامی داون و بەشێك لە لایەنە نادیارەکانی ژیانی سیاسی و ڕۆشنبیری ئەویان ڕوونکردۆتەوە، گرنگترینیان: (عەزیز محەمەد، کەریم ئەحمەد، مومتاز حەیدەری،...). هاوکات بیرەوەری و یادداشتی چەند کەسایەتییەکی سیاسیی کە ڕاستەوخۆ ڕۆڵ و کاریگەریان لە ڕووداوە سیاسیەکان دا هەبووە، توێژینەوەکەیان دەوڵەمەندتر کردووە، لەوانە: (مذكرات يوسف حنا يوسف "ابو حكمت"/ یادداشتەکانی یوسف حەننا یوسف "ئەبو حیکمەت"، المسيرة/ صفحات من نضال كريم احمد/ ڕێڕەوی تێکۆشان/ چەند لاپەڕەیەك لە تێکۆشانی کەریم ئەحمەد، مذكرات بهاءالدين نوري/ یادداشتەکانی بەهائەدین نوری، نوری شاوەیس: من مذكراتي/ لە یادداشتەکانم، عەبدولسەتار تاهیر شەریف: ململانێ لەگەڵ ژیاندا).

بڵاوکراوەو دەکۆمێنتە حکومی و حزبیەکان سەرچاوەیەکی دیکەی گرنگی توێژینەوەکە پێك دەهێنن، لەوانەش بەتایبەتی: (موسوعة سرية خاصة بالحزب الشيوعي/ ئینسکلۆپیدیای نهێنی تایبەت بە حزبی شیوعی عێراقی) کە ئەم فەرهەنگە لە شەش بەرگ پێکهاتووەو لە ساڵی ١٩٤٩ لە لایەن (مديرية الشرطة العامة- شعبة مديرية التحقيقات الجنائية) ی عێراقی دەربارەی چالاکیەکانی حزبی شیوعی ئامادەکراوە. هەروەها نامیلکەی (رد على مفاهيم برجوازية قومية وتصفوية/ وەڵامدانەوەیەك بۆ چەمکە بۆرژوازییە نەتەوەیی و پاکسازییەکان).

توێژەر پشتی بە دەیان کتێب و کارنامەی ئەکادیمی بڵاوکراوەو بڵاونەکراوە بەستووە، وەك کتێبی (اربيل/ دراسة تأريخية في دورها الفكري والسياسي ١٩٣٩-١٩٥٨/ هەولێر/ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لەبارەی ڕۆڵی هزریی و سیاسیی ١٩٣٩-١٩٥٨) دانراوی (د. ئیسماعیل شوکر) کە لە بنەڕەتدا تێزی دکتۆراکەیەتی، هەروەها کتێبی (مێژووی پارتی دیموکراتی کوردستان- عێراق تا بەستنی کۆنگرەی سێیەمی) لە نووسینی (عەلی عەبدوڵڵا)، هەروەها کتێبی (الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨/ کۆمەڵەو ڕێکخراوو پارتە کوردیەکان لە نیو سەدەدا ١٩٠٨-١٩٥٨) ی (عەبدولسەتار تاهیر شەریف)، کتێبی (پێشهاتە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق ١٩٤٥-١٩٥٨) لە نووسینی (مەهدی محەمەد قادر) کە لە بنەڕەتدا نامەی ماستەرە. هەروەها کتێبی (اتجاهات السياسة الكردية بعد الحرب العالمية الثانية/ ئاراستە سیاسییە کوردیەکانی دوای جەنگی دووەمی جیهانی) لە نووسینی (فەرید ئەسەسەرد)، ئەمە جگە لە کتێب و نووسینەکانی هەر یەك لە (حەننا بەطاطۆ، سەلاح خەرسان، عەبدولفەتاح بۆتانی، مالیك سەیف، جەمال نەبەز، سەروەر عەبدولڕەحمان، سەمیر عەبدولکەریم... هتد).

**ئەم توێژینەوەیە جگە لە پێشەکی لە دەروازەیەك و سێ بەش پێکهاتووە، که بەم شێوەیە دابەش کراوە:**

**دەروازە**: تەرخانکراوە بۆ ژیاننامەو کەسایەتی





ساڵح حەیدەری، ئەمەش لە میانەی دوو باسدا، لە باسی یەکەمدا بەکورتی ئاماژەیەکی مێژوویی بە ڕەچەڵەکی بنەماڵەی حەیدەری کراوەو دواتریش ڕۆڵی زانستی ئەو بنەماڵەیە لە کوردستان و عێراقدا خراوەتە ڕوو، لە باسی دووەمیشدا سەربردەی ژیان و کەسایەتی حەیدەری خراوەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، کە تیایدا باس لە لەدایکبوون و پێگەیشتن و قۆناغەکانی خوێندن و پێکەوەنانی ژیانی هاوسەرێتی و ژیانی فەرمانبەرێتی و کەسایەتی ئەو کراوە.

**بەشی یەکەم**: تایبەتە بە قسەکردن لەبارەی سەرەتاکانی کاری سیاسی حەیدەری و ڕۆڵی لە دامەزراندنی پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکان دا، ئەمەش لە میانەی دوو باسدا، لە باسی یەکەم دا هەوڵ دراوە سەرەتاکانی هۆشیاری نەتەوەیی و کاری سیاسی حەیدەری دیاری بکرێت، تیایدا باس لە سەرەتای سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتی لای حەیدەری کراوە، لەو کاتەی کە قوتابی ئامادەیی بووە لە بەغدا وەکو کاردانەوەیەك لە بەرامبەر ڕەوشی شۆڤینیانەی نێو قوتابخانەکەی هەستی کوردبوون لەلایدا چەکەرەی کردووە، هەروەها لە قۆناغی خوێندنی پەیمانگاشدا هەر لە بەغدا لە ڕێگەی قوتابییەکی هاوڕێیەوە ئاشنایەتی لەگەڵ بیروباوەڕی مارکسیزم دا پەیداکردووەو چەندین ڕۆژنامەو کتێبی مارکسی لێ وەرگرتووەو بەهۆیەوە پەرەی بە لایەنی هزریی خۆی داوە، لە باسی دووەمیشدا ڕۆڵی ناوبراو لە دامەزراندنی ڕێکخراوی (کۆمەڵی میللەت) لە ساڵی ١٩٤٣، ڕێکخراوی (یەکێتی تێکۆشین) لە ساڵی ١٩٤٤، حزبی شیوعی لە کوردستان (شۆڕش) و حزبی ڕزگاری کورد) لە ساڵی ١٩٤٥ دا دەست نیشانکراوە، هاوکات کاروچالاکی هەر یەکێك لەم ڕێکخراوانە خراوەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

**بەشی دووەم**: باس لە چالاکی و کاری سیاسیی ساڵح حەیدەری لە نێوان ساڵانی(١٩٤٦-١٩٨٠) دا دەکات، لایەنەکانی ئەم بەشە لە چوار باس دا خۆی دەنوێنێت، کە لە باسی یەکەمدا ڕۆڵی حەیدەری لە (حزبی شیوعی عێراق)دا لە نێوان ساڵانی (١٩٤٦-١٩٥٠) خراوەتەڕوو، لە باسی دووەمیشدا دامەزراندنی ڕێکخراوی (راية الشغيلة/ ئاڵای کارگەران)ی جیابۆوەی نێو (حزبی شیوعی عێراق)ی باس کراوەو ئاماژە بە ڕۆڵ و چالاکییەکانی حەیدەری لەنێو ئەو ڕێکخراوەدا کراوە، هەرچی باسی سێیەمە ئەوە تایبەتە بە ڕۆڵ و چالاکییە سیاسییەکانی حەیدەری لەنێو (پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان)، لەم باسەدا هۆکارەکانی دەرچوونی حەیدەری لەنێو (حزبی شیوعی عێراق) و پەیوەندی کردنی بە (پارتی)یەوە دەستنیشانکراوە، هەروەها تیشك خراوەتە سەر خەباتی سیاسیی حەیدەری لەنێو پارتی داو دواتریش ڕۆڵی ناوبراو لە ململانێ سیاسیی و ئایدۆلۆجییەکانی نێو ئەو حزبەدا خراوەتە ڕوو، لە باسی کۆتایی ئەم بەشەشدا کە باسی چوارەمە، چالاکییە سیاسییەکانی حەیدەری لەنێوان ساڵانی (١٩٦١-١٩٨٠) دا باسی لێوەکراوە، لەم باسەدا ئاماژە بە کاری سیاسیی حەیدەری لەنێو چەندین پارت و ڕێکخراوی دیکە کراوە، لەوانەش: (حزبی شیوعی عێراق- سەرکردایەتی ناوەندی، حزبی ڕزگاری، پارتی دیموکراتی کوردستان "پارتی سەر بە حکومەت ناسراو بە پارتی کارتۆنی").

**بەشی سێیەم**: تەرخانکراوە بۆ قسەکردن لەبارەی ڕۆڵی ڕووناکبیری حەیدەری، ئەمەش لە میانەی دوو باسدا، لە باسی یەکەمدا دەستنیشانی ڕۆڵی ئەو لە بواری ڕۆژنامەگەریی نهێنی و ئاشکرادا کراوە، تیایدا ئاماژە بە کارکردنیی لەنێو چەندین بڵاوکراوەو گۆڤارو ڕۆژنامەی کوردی و عەرەبی کراوە، کە هەندێك لەوانە خاوەنی پێگەی بەهێز بوونە لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق دا، هەر لە چوارچێوەی ئەم باسەدا ناوەڕۆکی بەشێك لە وتارو بابەتەکانی خراوەتە ڕوو، لە باسی دووەمیش دا تیشك خراوەتە سەر ڕۆڵی حەیدەری لە بواری نووسین و دانان دا، هەروەهادانراوو دەستنووسەکانی خراوەتە ڕوو، لەگەڵ ئاماژەدان بە پوختەی ناوەڕۆکی هەر یەکێك لەو کتێب و دەستنووسانەو تۆمارکردنی چەند تێبینی و سەرنجێك لەسەریان.

# " هیوا " لایەک لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردی

# دەریا پڕ بەهاکەی گۆڤاری هیوا (١)

**خوێندنەوەی : K21**




## پێشەکی :

دیارە کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوی گۆڤاری هیوا وەك یەکێك لە بەرهەمە سەرەکییەکانی د.هیمداد حوسێن، بەرهەمێکی ناوازەیەو لایەکە لە مێژووی ئەم نەتەوە حەسرەت دیدەمان.

ئەگەر هەڵەم نەکردبێ لەساڵی ٢٠١٠ لەمانگی (١١)دا دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس پیشانگەیەکی کتێبی بۆ بەرهەمە چاپکراوەکانی خۆی کردەوە[٢] لەوێدا ژمارەیەکی بەرچاو کتێب نمایشکرابوون، لەکاتی چوونم بۆ ئەوپیشانگەیە وێڕای کڕینی کتێبەکانی (مێژووی ئەدەبی کوردی، مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردی، دیوانە شیعری شەهید بەتەنیا پیاسە دەکاتی قوبادی جەلیل زادە، لە فیمینیزمەوە تا هیمومانیزمەکەی مەهاباد قەرەداغی و گۆڤاری وێران و واتە) بەرهەمە نازدارە، بێناز بەرهەم هاتووەکەی (ڕۆژنامەوانیی کوردی- گۆڤاری هیوا ١٩٥٧- ١٩٦٣) کە لە پێنج بەرگدا چاپکراوەتەوە کڕی و بردمەوە. هەر ئەو کاتە پێم باشبوو شتێکی بۆ گۆڤارەکەی خۆمان لەبارەوە بنووسین.

لەکاتێکیشدا ئەو مانشێتەی سەرەوەم هەڵبژاردووە ڕەنگە چەند هۆکارێکی هەبێت، لەگەڵ ئەوەی بەندە تازە بە تازە فێری ئەلف و بێی ڕۆژنامەوانییەکی خۆڕسکانەدەبم و لە قوتابخانەکەی زەنگەنە[٣] و حەیدەری[٤] ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەردەوام دەبم، بەڵام ڕەنگە ئەم دوو هۆکارەم لەبەرچاو گرتبێ لەکاتی دانانی ئەم مانشێتەی سەری سەرەوە ئەوانیش:

١- گۆڤاری هیوا نزیکەی (٧) ساڵ تەمەنییەتی و ٣٨ ژمارەی لێ دەرچووەو جێ دەستی بە سەر ڕەوتی

ئەدەبی کوردییەوە دیارە، بەهۆی ئەوەی کە گۆڤارێکی ئەدەبییە.

کەواتە ئەگەر لە کۆی ١١٣ ساڵ تەمەنی ڕۆژنامەنووسی کوردی بدوێین، دەبێت حەوت ساڵەی گۆڤاری هیوامان لەبەرچاوبێت، و وەك لایەك لە مێژوو ببینین.

٢- دەگەڕێمەوە بۆ خودی پێشەکییەکەی د. هیمداد حوسێن لەبارەی (هیوا)کە نووسیویەتی: (نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی بەبێ ڕۆڵی ئەدەبی گۆڤاری (هیوا) مێژوویەکی ناکامڵ دەبێت)[٥].

خوێنەری ئازیز من توانای ئەوەم نییە بەم بێهێزییەی خۆمەوە، ملبەملانێ لەگەڵ کێوێك بکەم کە زۆر لە سەفین بەرزترو، یان ڕەنگە نەتوانم بە پێدەشتەکانیدا گوزەربکەم، چونکە زۆر لە دەشتە کاکی بە کاکییەکەی قەراج و کەندێناوە بەرینترە، هەر ناشتوانم بەنێو دارستانە چڕو قەد دارە باڵا بەرزەکانیدا تێپەڕم چونکە ئەو دارستانە زۆر لە دارستانی دارهەنارو گوێزەکانی هەورامان و تەوێڵە چڕترن، بەندە زۆر لەوە نەزانترە کە بتوانێت بەبێ هیچ دەستگرێك و هۆکارێك بچێنە ناو ئەو دەریایەداو لەوێدا مەوانی بکات، چونکە بێگومان تێیدا دەخنکێم، بۆیە ئەوا لە ڕێگەی پەراوێزەکانەوەو ئەوەش بەرهەمە ناوازەکەی گۆڤاری هیوا لێرەو لەوێ بوونی هەیە. بۆیە ڕەنگە نەتوانم هاورێتانبم بۆ ئەوەی بەیەکەوە گشتێك بەنێو لاپەڕەکانی گۆڤاری (هیوا)دا بکەین، تابزانین چی تێدایەو چۆنەو چییەو لەکوێ و بۆ کێیە؟!!، چونکە ئەو ٣٨ ژمارەیەی کە د.هیمداد بڵاوی کردۆتەوە هەموویان لێوانلێون لە بابەتی ئەدەبی و فکری و تەندروستی و زمانەوانی و گفتوگۆی بەنووسراو کراو، کە هەموویان لەلایەن کەڵە نووسەرانی ئەم نەتەوەیەوە نووسراون یان وەریان گێڕاون، بەڵام بەڵێنتان پێدەدەم لە ژمارەی داهاتوودا دۆسییەکی تێرو تەسەلتان لەوبارەیەوە پێشکەش بکەم. بەر لەوەش جێتان بهێڵم کورتە پێناسەیەکی گۆڤاری هیوا لە سەر زاری خۆیەوە دەکەین و دەڵێن:

گۆڤاری هیوا گۆڤارێکی ئەدەبی و زانستی مانگانەبووەو لە بەغدا دەرچووە.

ناوونیشانی هیوا: بەغدا شەقامی زەهاوی یانەی سەرکەوتن، تەلەفۆن ٨٤٥٣٢

خاوەنی ئمتیاز: یانەی سەرکەوتن.

مودیری مەسئول: حافز مستەفا قازی[٦].

زمان: کوردی

زاراوە: کرمانجی خواروو

تیپ چنراوی ئەلف و بێی کوردییە کە لە عەرەبی داهێنراوە.

- ٣٨ ژمارەی لێ دەرچووەو هەریەك لە ژمارەکانی لاپەڕەکانی جیاوازەو بەپێی خشتەیەك کە ئێمەش سەیرمان کردووە (٦) ژمارەی بە (جووت) دەرچووە ئەوانیش (٦-٧) و (٩ -١٠)و (١١- ١٢)[٧].

**ئابونە**

**ئابونەی ساڵانە ١ دینار**

**بۆقوتابی ٧٥٠ فلس**

**دانەی ١٠٠ فلس**

**پارەی ئابونە بەناوی ئیدارەی یانەوە پێشەکی ئەدرێت.**

کارەکەی د. هیمداد حوسێن

وەك لەپێشتریش ئاماژەمان پێیداوە د. هیمداد ئەو (٣٨) ژمارەی بڵاوکردۆتەوە، ئەوەندەی ئێمە زانیاریمان لەسەری هەبێت جارێکی دیکە واتە بەرلەوەی بکرێت بە کتێب لە گۆڤاری ڕۆژنامەنووس بڵاوی کردۆتەوە، بەڵام ئەوە هیچ لە گرانی و نرخی پرۆژەکەی د. هیمداد کەم ناکاتەوە. بە هەرحاڵ کتێبەکەی د. هیمداد بەم شێوەیەیە:

- ڕۆژنامەوانیی کوردی - گۆڤاری هیوا ١٩٥٧ - ١٩٦٣
- ٥ بەرگ
- ساڵی ٢٠١٠ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس چاپیکردووە.
- لێکۆڵینەوە ئامادەکردنی د. هیمداد حوسێن
- بەرگی یەکەم: ژمارە ١- ٥ی ساڵی یەکەم[8].
- بەرگی دووەم: ژمارە ٦-١٢ی ساڵی یەکەم[9].
- بەرگی سێیەم: ژمارە ١- ٧ی ساڵی دووەم[10].
- بەرگی چوارەم: ژمارە ٨- ١٢ی ساڵی دووەم و ژمارە ١-٥ی ساڵی سێیەم[11].
- بەرگی پێنجەم: ژمارە ٣٠- ٣٨ی ساڵەکانی ٤و٥و٦[12].
- هەمووی بەسەریەکەوە کتێبەکە ٦٠٨ لاپەڕەی قەوارە ٢٣,٥ × ١٦,٥سم[13].

## پەراوێزەکان:

(١) ئەو ناوونیشانە لە ناوونیشانی بابەتێکی مامۆستام عەبدوڵلازەنگەنە وەرگیراوە کە لەبارەی گۆڤاری دەنگی گێتی تازە لە K21دا بڵاوی کردۆتەوە بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: گۆڤاری K21، ژمارە ٥-٦، ساڵی ٢٠٠٩،ل١٩٦، گۆڤاری دەنگی گێتی تازە.

(٢) سێ ڕۆژ مابوو کاتی کرانەوەی پیشانگاکە تەواو ببێت، شەوەکەی لەمای مامۆستا عەبدوڵلا زەنگەنەبووم، مامۆستا عەبدوڵلا باسی پیشانگەکەی کرد، بەراستی تەماعم بۆی چوو، بەڵام پارەم نەبوو، بۆیە بەیانییەکەی تەلەفۆنم بۆ مامۆستا مومتاز حەیدەری کردو پێمگوت پێویستم بەپارەهەیە، گوتی وەرە بیبە، چووم ٢٠٠$ دۆلاری پێدام و پاشان خستمانە بری ئەو کارە ڕۆژنامەوانییانەی کە بۆ گۆڤاری لەیلاقاسم لەیلازانام کردبوون. و ئەوبڕەشی قەرزداربووەوە پێیدام.

(٣)مامۆستا عەبدوڵلا زەنگەنە کە هەرگیز لە چاکەی دەرناچم کە هێندە هانم دەدات هەم بخوێنم هەمیش وردترو جوانتر کارەکانم رایی بکەم. لەهەمان کاتدا لە ڕێگەی ئەو زاتەوە گەیشتووم بەزاتەکانی دیکەی وەك د. کەمال مەزهەرو هەموو ئەوانی دیکەیش کە بە قوتابی مامۆستا زەنگەنەم دەناسنەوە. سوپاسی دەکەم و قەرزداریمە.

(٤)لەکاتی بردنی بابەتەکانی ژمارە دووی گۆڤاری لەیلاقاسم لەیلازانا مامۆستا مومتاز حەیدەری ڕەخنەی لێگرتم لەبارەی زمان و تیپ چنینی بابەتەکانەوە، منیش پێمگوت مامۆستا ڕەخنەکانت لە جێی خۆیەتی بەڵام خۆتان دەزانن من هێشتاکە جوجەڵەم، گوتی (ئێ چۆن وایە دەبێت هەموو کاتێك خۆت پێ جوڵەبێ، ئەگینا هەرگیز هەوڵی گەورەبوون نادەی) بەڕاستی زۆر کاری لێمکرد و بەندە ئێستاکە لە هەوڵی ئەوەدام بەچەند بەرهەمێکی زامانەوانیدا بچمەوە بەتایبەتی شوکر مستەفاو هەژارو هێمن و هاوشێوەکانیان.

(٥)د. هیمداد حوسێن ڕۆژنامەوانی کوردی (گۆڤاری هیوا ١٩٥٧ - ١٩٦٣) بەرگی یەکەم ٢٠١٠، ل٧.

(٦) دیارە لە ژمارە یەکدا خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەر بەو شێوەیە بووە بەڵام هەروەك دەردەکەوێت پاشان خاوەنی ئیمتیاز نەگۆڕاوە، بەڵام مودیری مەسئول گۆڕاوە.

(٧) د. هیمداد حوسێن ڕۆژنامەوانی کوردی (گۆڤاری هیوا ١٩٥٧ - ١٩٦٣)،٢٠١٠، بەرگی یەکەم، ل٢٠٤-٢٠٥.

(٨) د. هیمداد حوسێن ڕۆژنامەوانی کوردی (گۆڤاری هیوا ١٩٥٧ - ١٩٦٣)،٢٠١٠، بەرگی یەکەم.

(٩) د. هیمداد حوسێن ڕۆژنامەوانی کوردی (گۆڤاری هیوا ١٩٥٧ - ١٩٦٣)،٢٠١٠، بەرگی دووەم.

(١٠) د. هیمداد حوسێن ڕۆژنامەوانی کوردی (گۆڤاری هیوا ١٩٥٧ - ١٩٦٣)،٢٠١٠، بەرگی سێیەم.

(١١) د. هیمداد حوسێن ڕۆژنامەوانی کوردی (گۆڤاری هیوا ١٩٥٧ - ١٩٦٣)،٢٠١٠، بەرگی چوارەم.

(١٢) د. هیمداد حوسێن ڕۆژنامەوانی کوردی (گۆڤاری هیوا ١٩٥٧ - ١٩٦٣)،٢٠١٠، بەرگی پێنجەم.

(١٣) د. هیمداد حوسێن ڕۆژنامەوانی کوردی (گۆڤاری هیوا ١٩٥٧ - ١٩٦٣)،٢٠١٠، بەرگی پێنجەم.

# هیوا

گوواریکی ئەدەبی و زانستی‌ی مانگانەیە

زمارە ( ٣٢ ) ★ سالی ( ٤ ) ★ نیسانی ١٩٦١

## میژوویەکی کورتی نەوروز ، وە کوردو خزمەت کردنی بە ئەقافەتی عەرەب

علاء الدین سجادی

نەوروز کە بە مانا « روژی تازە » یە ، روژیکی کون و جەژنیکی کونە . لە لایەن داماتی ئەم روژە بە جەژنەوە گەلی قسە و باس هەیە . یەکێك لەوانە ئەلێ « جەمشید » پادشای چوارەمی پیشدادی سەرەتا ناوی « جەم » بووە ، لە زمانی پەهلەوی‌ی کوندا جەم بە مانا پادشای گەورە و بە دەسەلاتە . روژێك لە گەرانەکەیا لە ئازربایجان فەرمان ئەدا تەختیکی مرصع بو دائەنین . خویشی تاجیکی مرصع و رازاوە بە جەواهیراتی لە سەر کردووە و لە کاتی هەتاوکەوتنا لە سەر تەختەکە روو بە رووی روژەکە دائەنیشی . تیشکی هەتاوەکە ، کە ئەدا لە تاج و تەختەکە ئەو ناوە ئەوەندەی رووناك ئەبێتەوە ، خەلکەکە کە چاویان پێ ئەکەوێت وتیان ئەم روژە روژیکی تازەیە . هەر لە زمانی پەهلەوی‌ی کوندا « شید » بە مانا تیشکە ، جنابان « شید » یان دایە پال « جەم » بوو بە « جەمشید » و بە روژەکەشیان وت

— ١ —

## ناوو نیشانی هیوا

بەغدا : شەقامی زەهاوی ، یانەی سەرکەوتنی کوردان

( بغداد ـ شارع الزهاوی ـ نادی الارتقاء الکردی )

تەلەفوون ٢٨٤٠٥

خاوەن ئیمتیاز : یانەی سەرکەوتن

مودیری مەسئول : دوکتور هاشم دوغرامەچی

لە پوستەخانەدا تومار کراوە بە ژمارەی ٤٩

### ـ ئابوونە ـ

| | فلس | دینار |
|---|---|---|
| بو دەرەوەی عیراق لە سالیکا | ٢٥٠ | ١ |
| لە عیراقدا | ٠٠٠ | ١ |
| بو شەش مانگ | ٧٥٠ | ـ |

سالانەی ئابوونە پێشەکی ئەنێریت

وە هەم ناوو نیشانە ئەنێریت :

بغداد ـ وزارة الاصلاح الزراعی

تفتیش العام الاستاذ مکرم الطالبانی

[illegible]

— ٢ —

## گەشتی‌ی خەوو چیترا

[illegible]

K21

زيــــــلان الحيـــــدري : صـــــاحبة الامتيـــاز
ممتـــاز الحيــــــدري : رئيـــس التـــحـــرير
07504481268 07702109855

مجلة ثقافية – علمية – تأريخية – وثائقية – قومية – فصلية حُرَّة

www.kurdistan21.net E-mail: k21.haidary@yahoo.com




بۆ كوردستانى نــوێ، ســڵاو و ڕێز:

پێش باوكـە ڕۆ ڕۆ كردن، دەست پێــشخەريەكى مــەزن: بــۆ نووســـەر و ڕۆماننووســێكى مـــەزن.

* مامۆستا موكرى مايــەى شــانازيى نەتـــــەوەن.

پيــــرۆزە.

م. حەيدەرى
4/4/2011


العنوان : كوردستان - أربيل (هەولێر) - حي العدالة - شارع پيربال محمود

# الفهرس



## هەندێ لەبابەتەکانی ژمارەی داديێ K21

بڕيار وا بوو ئەم بابەتانە لەم ژمارەيەدا بڵاو بكرێتەوە، بەڵام لەبەر زۆری بابەتەكان بۆ ژمارەی دادێ دواخرا، لەگەڵ داوای لێبوردن لەخاوەنەكانيان.

- لقاء خاص مع مناضل كوردستان المعروف عزيز محمد.
- گەورە زانای تورك، دۆستی هەرە دڵسۆزی كورد، پ.د. ئيسماعيل بێشكچی لەبارەی دۆزی كوردەوە دەدوێ.
- الاعلام الاصفر : د. سليمان العسكري.
- بارزان نيوز ... لە نێوان ئەركی نەتەوەيی و ئەدای رۆژنامەگەرييانەدا.
- (ئۆدۆ)كان ، لە كوردستان : بەختيار مام حەميد.
- كوردستان و مەسەلەی كورد : د. پ. بافيچ.
- حاميد گەوهەری بۆ K21 دەدوێت.
- دور الصحافة الكردية في التنشئة القومية و توعيتها، و الحركة التحررية الكردية : كتابة: ممتاز الحيدري – ترجمة: عبدالكريم شيخاني.
- تدهور قطاعي التربية والتعليم في المناطق الكوردية في سوريا: علي صالح ميراني.
- (سيد بابكر بك الكبير) أحد أمراء عشيرة الزنكنة... : فرياد زنكنة.
- الأكراد و القضية الكردية : الأستاذ الدكتور: ميخائيل لازاريف.
- ئەو مردنەی دەنگی دايەوە !!... مشتێك لە خەزێنەی مارف خەزنەدارەوە : ئا/ هێرش مەلا برايم سنجاوی.
- الصحافة في العهد العثماني قبل قانون ١٦تموز ١٩٠٩ : الدكتور ميشال الغريب.
- كۆواری نيشتيمان.
- خوێندنەوەی چاپی نوێی گۆڤاری هەولێر : غازی حەسەن.
- رۆژنامەی هەولێر لە سەردەمە جياوازەكاندا .
- لەبارەی "ئاڵای ئازادی"يەوە.
- گۆڤاری بانگی كورد : نووسينی: ئومێد ئاشنا.

معلومات تاريخية دقيقة :

# حوادث ١٤ مايس ١٩٤١ في أربيل

## من كتابات عاصم الحيدري لم تنشر



لقد إنهزم عبدالاله من بغداد و تشكلت حكومة الدفاع الوطني برئاسة المرحوم رشيد عالي الطيلاني في نيسان١٩٤١ و انقطعت العلاقات الدبلوماسية بين العراق و بريطانيا، و في بداية مايس١٩٤١ فتحت القوات البريطانية حول "سن الذبان" و "الشعيبة" النار على القوات العراقية و أعلنت حالة الحرب بين العراق و بريطانيا.

لقد وقفت جماهير الشعب الكوردي في كوردستان العراق و في جميع أجزاء كوردستان موقف اللامبالاة و التحفظ من حركة مايس١٩٤١ بالرغم من كرههم للانكليز و الاستعمار الانكليزي و بالأخص بعد سماعهم تصريحات بعض قادة حركة مايس الذين كنون عداء سافرا للأكراد منهم قولهم "إننا نحارب حربا ذا حدين حيث نقتل الأعداء بالأعداء" اي نقتل الانكليز بالأكراد و الأكراد بالانكليز و ذلك لأن الفرقة الثانية التي كان جنودها من الأكراد مرابطة في الخطوط الأمامية من ساحة القتال.

و في يوم ١١مايس اشيع بأن معسكر سن الذبان قد سقط بأيدي الجيش العراقي، فجرت مظاهرة طلابية لايتجاور عدد المشاركين فيها سبعون طالبا من طلبة الصفوف السادسة الإبتدائية و طلاب المتوسطة يقودم المعلم الشيخ حسن الشيخ نعمةالله ساعين من مدرسة أربيل الثانية الي ديوان المتصرفية، فوقف المتظاهرون هناك و قد القي قائد المظاهرة الشيخ حسن الشيخ نعمةالله خطابا حماسيا انهاه بالطلب بازالة قاعدة سن الذبان و اشعالها، كي يري الاستعماريون الانكليز دخان الحريق في جزرهم البريطانية و كنس آثار الانكليز من بلادنا كما كنس جدنا صلاح‌الدين الأيوبي الصليبيين من الشرق.

و في اليوم الرابع عشر من مايس وصلت برقية من بغداد الي متصرف أربيل مفادها أن طائرات المانية و ايطالية آتية الي بغداد لمساعدة الحركة في العراق و سوف تمر تلك الطائرات في سماء أربيل، فيرجي حث الجمهور للخروج لمشاهدة الطائرات المارة في سماء أربيل، و قد نادي منادي البلدية نحوي برقية في شوارع أربيل فسمعه الناس بلهفة.

و في عصر ذلك اليوم ظهرت طائرة بريطانية من نوع "ولكنتون" في سماء أربيل و بعد أن جالت في السماء استقرت فوق المطار فقصفت برشاشها الطائرات العراقية الجاثمة علي أرض المطار و القت قنبلة أصابت نعجة من النعاج التي كان يرعاها أحد الرعاة في تلك المنطقة.

و كان لنداء المنادي في الصباح بقدوم الطائرات الالمانية الصديقة و لكن ظهر انها طائرة انكليزية معادية في المساء و قصفها الطائرات العراقية ترك أثر سيئ في نفوس جماهير أربيل و رد فعل قوي تجاه المسؤولين في اللواء "المحافظة" و اتهامهم بالعمالة و الخيانة. و كان المرحوم الملا أفندي رئيس علماء كوردستان العراق و كبير ملاكي الأراضي في اللواء قد استضاف "الملك فيصل الثاني" و"الملكة عالية" في قصره بباداوه. و كان يكره مدير شرطة أربيل عزيز برقي لاساءته الي إحدي نساء اسرته و لايرتاح الي المتصرف المرحوم صالح زكي صاحبقران لسكوته عن الاساءة و عدم تحريكه ساكنا و كان نجله السيد عزالدين الملا قد أوعز الي الشيخ حسن الشيخ نعمةالله بالعمل لاستغلال رد الفعل و الاثارة الموجودة لدي الناس ضد مدير الشرطة عزيز برقي أثناء اجتماعه بالشيخ حسن في اللحظة التي كانت الطائرات الانكليزية تقصف مطار أربيل.

فعاد الشيخ حسن لتوه من باداوة و ذهب لمقابلة مدير الشرطة عزيز برقي و اتهمه بالعمالة و الخيانة و التواطؤ مع المتصرف لقتل الناس بالجملة، فأنكر مدير الشرطة اتهاماته هذه و طلب منه



حضرة العلامة الملا افندي



صالح زكى صاحبقران



أمين رواندزي

مصاحبته لمقابلة المتصرف المرحوم صالح زكي صاحبقران للوقوف علي حقيقة الوضع و بينما كان المتصرف منشغلا في إفهامه بعدم وجود سوء نية في القضية و أطلعه علي البرقية الواردة من السلطات المسؤولة في بغداد و عندما تأخر الشيخ حسن عند المتصرف ظن بعض زملائه من المعلمين أن الشيخ موقوف فدخل ثلاثة منهم علي المتصرف و هم كل من جهاد بكر و بشير مصطفي و مجيد فتاح، فزاد الطين بلة باندفاعهم و تهورهم و الإعتداء علي المتصرف بكلمات نابية فما كان من المتصرف الا الامر بوضعهم تحت النظارة.

كنت انا و جلال شريف و المرحوم رستم عبدالجبار الأسعدي و زميلان آخران من الطلبة لاأتذكر أسماءهم جيدا نتمشي في الشارع المؤدي الي طريق الموصل حيث الثكنة العسكرية و المطار، فشاهدنا بأم أعيننا اقتراب الطائرة الانكليزية من أرض المطار و قصفها الطائرات العراقية و رميها قنبلة، عندئذ بدأنا بالرجوع ثانية الي الوراء نحو المدينة و نحن طلاب عائدون من بغداد حيث صارت لبعضنا مدة سنة واحدة و بعضنا سنتان نعيش في بغداد العاصمة متأثرين بالمحيط الطلابي هناك و نحن علي شيء من الوعي القومي نناقش الموضوع في طريق عودتنا الي مدينتنا أربيل و لانعلم شيئا عن الوضع غير شكله الظاهري.

و عند وصولنا دار المتصرفية فاجأنا الطالب "قاسم سعيد خلة" متحمسا مندفعاقائلا مابكم به المرحوم صالح زكي صاحبقران، يريد قتلنا و تشريدنا لأجل أسياده الانكليز و رغم محاولتنا التخلص من قاسم سعيد و الذهاب الي بيوتنا لم

نستطع لإندفاع زميلنا رستم عبدالجبار الأسعدي و حماسته و اصراره علي الدخول الي ديوان المتصرفية و مقابلة المتصرف لإطلاق سراح الشيخ حسن و زملائه، فدخل الي السراي و لكن منعه شرطي من التقدم اكثر من باب غرفة الحرس فطلب مفوض الخفر و حينئذ جاء المفوض و قال إن مدير الشرطة أمر بمنع دخول أي شخص، فطلب مقابلة مدير الشرطة و لما جاءه جري بينه و بين المدير جدال كلامي انتهي بالإعتداء من قبل بعض أفراد الشرطة علي رستم عبدالجبار الأسعدي بأمر من المدير فاصيب رستم بكسر في رأسه فأرسل الي المستشفي للمعالجة و عندئذ توجه كل من قاسم سعيد و عبدالوهاب الصائغ و ناظم سعيد آغا الذين كانوا أمام دار المتصرفية الي سوق أربيل لتحريض الجماهير بغلق محلاتهم و التوجه الي السراي لتصفية الحساب مع الخونة و العملاء، فتوجهت جماهير أربيل الي ساحة السراي و تجمهرت متدفقة كرها للاستعمار و الانكليز أنفسهم و حقدها عليهم.



قاسم سعيد خلة

البريد، و المفوض شهاب سليم، و هو وطني ايضا، كان مفوض خفر في ذلك اليوم اقناع رستم عبدالجبار بعدم الاتصال ببغداد و عند إصرار رستم منعاه من ذلك و اتصل الملازم جلال قادر بالمقدم أمين رواندوزي آمر حامية اربيل وقتئذ، فتوجه علي رأس سرية من الجيش الي المدينة فاستقبلته الجماهير بالتصفيق و الهتاف بحياته و وقف أمام السراي و القي كلمة هدأ فيها الناس و وعدهم باطلاق سراح الموقوفين فتفرق الناس من أمام السراي الي بيوتهم و من الجدير بالذكر و التأكيد ان موقف المتصرف المرحوم صالح زكي صاحبقران كان انسانيا أذ لولاه لكانت الدماء تسيل كما سالت عام ١٩٣٠ امام سراي السليمانية.

ثم عاد رستم من المستشفي ملفوف الراس بلفاف ابيض فوقف أمام دار المتصرفية، فتكلم متهما الادارة و المسؤولين بالخيانة و أنه سوف يتصل برئيس الحكومة لوضع حد لهذا الوضع المزري. و بينما كان رستم يتكلم و الجماهير الغاضبة متجمهرة أمام السراي استغل بعض المتهورين و حثالات المجتمع غضبة الجماهير، فأخرجوا سيارة المتصرف و صبوا عليها النفط و أشعلوا فيها النيران.

و كانت البنت المسترجلة "الماسة" تراست هذه الفئة المتهورة و عندما حاول رستم عبدالجبار الاتصال ببغداد، أراد كل من الملازم جلال قادر، و هو ضابط وطني و كان رقيبا علي



فائق نادر



روستم جبار الاسعدى

و بعد تفرق الجماهير اتصل المتصرف بالمسؤولين في بغداد فأخبرهم بما حدثت في اربيل، فتوجه الي اربيل المقدم الركن امين خاكي ضابط ركن الفرقة الثانية فاعتقل الشيخ و زملاءه المعلمين و رستم عبدالجبار الأسعدي و غيره و قد أصبح عدد المعتقلين حوالي أربعين شخصا من وجوه أربيل متهمين بالتخريب و التجسس لحساب الانكليز!! و سفروا الي سجن الموصل بأمر من قاسم مقصود قائد الفرقة الثانية و وكيل متصرف الموصل. و بعد انتهاء الحركات و عودة حكومة عبدالاله و نوري سعيد اتهموا بالنازية و العمالة للألمان و أرسل قسم منهم الي معتقلي الفاو و العمارة و بقي قسم آخر منهم في موقف(سجن) سراي أربيل حتي اطلق سراحهم بعد محاكمة من قبل الحاكم الملا خورشيد بستة اشهر من التوقيف.



# شيء من الذاكرة

## بقلم الحقوقي : عبدالرحمن الشيخ علاء الدين النقشبندي

تأييدا للعقيدة السائدة لدي أوساط واسعة بين مثقفي بغداد العاصمة و التي تؤكد علي كون حزب البعث إنتاج أمريكي و يسير وفق المخططات التي تخدم الدور الغربي في الشرق الأسط و ذلك إعتمادا علي الكثير من الوثائق. و من ذلك علي سبيل المثال ماجاء في مذكرات الرئيس جمال عبدالناصر بأن قيادة البعث ممثلة بشخص مؤسسه ميشيل عفلق قد إختارت صدام حسين دكتاتور العراق في عامي ١٩٦٢-١٩٦٣ للدارسة الخاصة لإعداد قادة المستقبل في العالم العربي في المعهد الخاص بإعداد القادة المدار من قبل الأمريكان في مصر. و هكذا كان ان تسم منصب المسؤل الأول في العراق خلال ٣٥عاما بكل قسوة مع شعبه و مع جيرانه.

هنا نشير الي بعض الخفايا من خدماته الي سادته و منها:

### ١- أسرار الحرب العراقية الإيرانية ١٩٨٠-١٩٨٨

شاء القدر و أثناء تلبيتي لدعوة الصديق السيد برهان الدين حامد بط جاف في بغداد لتناول العشاء في بيته الكائن قرب قاعة الخلد(القريب من قصر الجمهوري) في أواخر صيف عام١٩٨٠ و كان من بين المدعويين بالإضافة الي الصديق السيد عزيز شمزيني مجموعة من الساسة و كبار صباط شاه إيران لغاية يوم الثورة الإيرانية الإسلامية في شباط ١٩٧٩ بقيادة آيةالله الخميني. و من الذين اتذكرهم أثناء التعارف كل من الجنرالات السابقين همزة أويسي، شاكروان، علي شاك، عيسي شذمان...الخ و الأخير من كورد إيران و كان ملحقا عسكريا في سفارة شاه إيران ببغداد؛ قبل عقدين من الزمن و سبق لي أن تعرفت عليه في اكثر من لقاء في دارنا ببغداد بمعية السيد عبدالرحمن الذبيحي أحد ماضلي كوردستان إيران و الفعال في الوسط السياسي الكوردي في خلال فترة وجوده في العراق لاجئا سياسيا ثم إستمالته الأجهزة الأمنية العراقية الي أن ضحي بحياته فيما بعد وراء تلك الهفوة السياسية.

و خلال تلك الجلسة الطويلة في دار السيد برهان الدين و خلال ما دار في المجلس من الكلام(و انا اجيد اللغة الفارسية) تحسست بأن هناك مشروع إتفاق قد يتقرر بين صدام حسين و شاه إيران بعد وصول الإخير خلال أسبوعين الي بغداد. و في الاتفاقية المرتقبة المطروحة للإقرار هناك تعهدات ملزمة للطرفين لمواجهة الحكومة الإسلامية الإيرانية الجديدة و

غيرها من الفعاليات المعادية لهما في الداخل. و بعد أيام جري لقاء مماثل في دار السيد عزيز شمزيني في شارع فلسطين ببغداد و تأكد لنا هنا وصول الشاه محمد رضا من منفاه الي بغداد ضيفا علي الحكومة العراقية و لكن لتفادي الملابسات السلبية اقام في قصر اخته التوام "اشرف ئهلوي" في منطقة الجادرية الراقية في بغداد تمويها و بعيدا عن وسائل الإعلام كما شاع و قيل في حينه.

اثناء ذلك أكدا لي السيد برهان الدين جاف و السيد عزيز شمزيني من خلال علاقاتهما السابقة بالمومي اليهم بأن الاتفاقية السرية بين صدام و شاه ايران قد تم التوقيع عليها و من أهم بنودها كما إستفهمت من الحضور:

ا- ارسال ٣٠-٤٠ رسالة خطية مستعجلة من الشاه محمد رضا الي بعض كبار وزرائه و قادة العسكر المعتمدين الذين ابعدوا عن وظائفهم بعد ثورة ايران و المقمين في دورهم في طهران دون الملاحقة عن طريق أحد معتمدي حكومة صدام لإبلاغهم بقرب عملية هجومية جوية و برية عراقية علي طهران و مؤسسات الإيران الحيوية المدنية و العسكرية. و كان شاه و جنرالاته و كذلك صدام و مجلسه القيادي كانوا علي يقين بأن حكومة آيةالله الخميني بسبب نقص كبير من القادة الأكفاء في مؤسساتها العسكرية قد تلجأ الي القادة السابقين للعودة الي الواجب دفاعا عن الوطن المهدد من العراق. و



حينئذ و مع تنسيق كامل جري و سيجري يقوم هؤلاء بعملية إنقلابية عسكرية تؤدي الي إسقاط حكومة الثورة الإسلامية الجمهورية ثانية كما كانت الحالة عام١٩٥٣ عندما تم إسقاط حكومة الدكتور محمد مصدق بانقلاب قاده الجنرال رزمارا آنذاك و أعاد الشاه الي طهران ثانية.

ب- بعد التأكيد من وصول رسائل الشاه الي اتباعه في طهران، تقوم الحكومة في بغداد بإختلاق مبررات و تجاوزات علي الحدود ثم داخل إيران و أخيرا الحرب الشاملة علي ايران بهدف إيصال انصار الشاه الي سدة الحكم ثم إعادة الشاه الي طهران.

ح- و ازاء هذه العملية هناك نوعين من الإلتزامات علي الطرفين كما في التعهد السري بينهما و فيها:

١- تعهد الشاه يدفع مبلغ عشرة مليارات دولار للعراق بقسطين متساويين: الأول يدفع قبل بدء العملية العسكرية التي حددت بيوم ١٩٨٠/٩/٤ للصرف علي متطلبات الهجوم العسكري تحت إشراف لجنة مشتركة يراسها بارزان تكريتي و عضوية بعض جنرالات الشاه، اما القسط الثاني سيدفع بعد إسقاط النظام الجمهوري الإسلامي الايراني و قبل توديع الشاه في بغداد للعودة الي طهران توديعا رسميا من قبل حكومة صدام.

٢- اما الإلتزام الثاني عدم تدخل إيران بأي شأن تخص العراق أو

يختاره بما فيه فرض إرادته علي بعض دول الخليج العربي و إماراته كما يشاء و الحاق جزيرة روبيان الكويتية الي حكومة بغداد و كذلك إمتدادات المنابع النفطية المشتركة بين العراق و الكويت ثم النظر في مستقبل الجزر الثلاث الطنب الكبري و الطنب الصغري و ابوموسي حسب رغبة حكومة صدام.

و كذلك تعمل حكومة الشاه جاهدة بتلبية اي طلب من بغداد بشأن ثورة الشعب الكوردي و ذلك بإيقاف الدعم بكافة اشكاله و تهجير أعداد كبيرة من الكورد اللاجئين الي جنوب و وسط ايران و تحديد الإقامة القسرية لقادة الثورة في المناطق البعيدة عن حدود العراق مع الرقابة الصارمة عليهم خاصة البارزانيين منهم و علي أن تقوم حكومة بغداد بعد باجراءات صارمة ضد الكورد و ضد الأحزاب المعادية لحكومة الشاه القادمة خاصة اعضاء حزب المجاهدين و الديمقراطي الكوردستاني. و بعد تلك الإتفاقية بدأ العد التنازلي لبدء الحرب كما يلي:

د- أرسلت رسائل الشاه محمد رضا بواسطة المعتمد الأمني العراقي المعروف عبدالرحمن الذبيحي(و هو مناضل في الحركة الوطنية الكوردية التحريرية أثناء تأسيس جمهورية كوردستان في مهاباد عام١٩٤٦ و لتفادي ملاحقة حكومة الشاه الجائر ضد الكورد لجأ الي العراق و بالسنوات الأخيرة دفعه حظه السئ الي احضان السلطة البعثية ثم بعد اداء واجب إيصال رسائل الشاه الي معتمديه



ملا عبدالله اسماعيل

في طهران و حال عودته عن طريق قلعة دزه إقتيد الي الأمن العامة و في نفس الاسبوع قتل من قبل الأمن العامة و بحضور صديقه وزير الدولة الملا عبدالله أحد معتمدي صدام حسين و رئيس حزب الحركة التقدمية الكوردية التابعة للسلطة في بغداد آنذاك اذ روي لنا و نحن جمع في المجمع العلمي الكوردي و في غرفة المرحوم الملا شكور مصطفي و بحضور الدكتور كيكاوس و ملا جميل روذبياني. اذ قال ملا عبدالله قبل سفر الذبيحي نصحته بعدم نقل الرسائل او علي الأقل أن لايعود الي بغداد بل يحاول السفر لأوروبا لاجئا أو التوجه الي مقر قيادة الثارتي و بشرح تورطه و يطلب منهم قبوله لديهم نهائيا لأن في عودته مخاطر جمة علي حياته. و مع الأسف لم يسمع نصيحتي و عاد الي بغداد و زرته في غرفة توقيفه بالإمن العامة و كان متأسفا و نادما لأنه تأكد بأن المكلف بهذا الواجب لابد أن يقتل فيما بعد لإخفاء السر نهائيا. ثم قال الملا عبدالله استدعيت الي الأمن العامة بعد مقتله و كشفنا مع المسؤول الأمني غرفته و لم يكن فيه شئ ذو قيمة أما كتبه فقد أخذتها الأمن العامة لها. ثم ذهبنا سويا الي دارنا و هناك خابر الملا عبدالله الي أخته(كما علمت منه) بخبر مقتله إذ قال انه مات بالسكتة القلبية و لم يترك شيئا ثم و اساهم.

و بالعودة الي موضوع الحرب. الحرب بدات فعلا في ١٩٨٠/٩/٤ و دامت الي ١٩٨٨/٨/٨ و تحملت الدولتان المصاعب و الخسائر المادية بالمليارات. حرب شرسة بين الطرفين المنبوذين أصلا من العالمين الغربي و العربي و غيرهما تقريبا. و بعد ثلاثة أسابيع من الترقب و الإنتظار لنتيجة مرضية

للحليفين صدام و شاه ايران. وصل محمد رضا الي قناعة بأن الإنتصار الحتمي لأي من الدولتين محال و ستطول الحرب لسنوات. عليه ترك بغداد الي المنافي المتعددة في امريكا و أوروبا الي أن استقر في القاهرة(مصر) و مات فيها.

هـ- الجميع من الواعين في الشرائح الاجتماعية يعرفون بان الحرب المدمرة هذه قد اعلنت علي ايران بتحريض الدول الغربية. و من ثم إستجابة للاتفاقية الملزمة للطرفين و لكن قد تكون هناك نيات سوء الايراني و العراقي و كذلك اسباب خفية اخري اما العوامل التي أعلنت عن طريق وسائل الاعلام العراقية كما يلي:

- بعد حادثة رمي قنبلة يدوية أمام جامعة المستنصرية حيث كان طارق عزيز القيادي في حزب البعث و الدولة يلقي محاضرة عن البعث و دوره القيادي للامة العربية و مسؤولياته في حماية المشرق العربي من أعداء العروبة داخل العراق و خارجه. فقال صدام في تعليقة علي رمي القنبلة: "قسما بكل ذرة من تراب الوطن العربي(إذ كان اليوم مغبرا جدا بسبب العاصفة الترابية آنذاك) إننا سننتقم من الفرس المجوس قريبا جدا و أن حادثة القنبلة هي من مخططات و اعمال حكومة طهران المجوسية المعادية للعرب منذ ان اعاد بهم جدهم كوروش بعد إحتلال بابل كافة اليهود الذين سباهم بنوخذ نصر و اتي بهم من فلسطين



عبدالرحمان زَبيحي (ملا علماء)

محجوزين في العراق منذ اكثر من ٢٥قرنا لتتحول احفاد هؤلاء اليهود حاليا الي بناة للكيان الإسرائيلي المزروع في قلب الوطن العربي في فلسطين الجريحة. والله لن ينسي العرب هذه الجريمة النكراء."

ثم أضاف صدام قائلا: "كذلك نحن لاننسي العبارة المشبوهة التي تضمنت إجابة حكام الجائرين الجدد علي برقيتنا للتهنئة بإنقلابهم المشبوه إذ بدلا من الجمهورية الإيرانية الإسلامية. وردت الجمهورية الإسلامية في ايران و هذا إثبات مؤكد و مقنع لكل المطلعين بأن لهم هدف التوسع نحو بلاد العرب بدء من العراق و لكننا بحول الله سنقطع رؤوسهم العفنة و نجعل بلادهم نارا تحرق أجسادهم و أن غد الظالمين الطغاة لقريب و النصر أبدا لقيادتنا الحامية للحدود الشرقية. والله علي ما نقول شهيد." هنا انتهي تهديد صدام حسين.

هكذا كانت بدايات الحرب الإعلامية ثم تحولت الي حرب الساخنة بفعل تلك العقلية الهوجاء الإنتقامية التي تملكت سلوكية الرئيس العراقي صدام خدمة لأسياده و تحقيقا لرغبته في جريان الدماء في بلاده و خارجها.

و- من المعلوم، ثم تبادل المذاكرات التهديدية و الاعتداءات الحدودية و ردود فعل سلبية كلاميا و عمليا الي أن بدا الهجوم في ١٩٨٠/٩/٤ في مناطق "سيف السعد" و "زين القوس". و قيل بأن الأخيرة تحمل إسم "زين الكوسه" و فيها مقام لأحد رجال الدين الكورد إسمه "زين العابدين الكوسه" تحور الإسم الي ما هو معلن في البيان العراقي و في نفس الوقت إكستحت القوات الغازية العراقية مدينة "قصر شيرين" و ضواحيها الإيرانية و لكن فجأة سمعنا إدعاء العراق بأن الحرب

المدمرة قد بدات في ١٩٨٠/٩/٢٢!؟
و لدي السؤال من الجار و صديقنا السيد "سعدي مهدي صالح" بحكم المعارفة القديمة بيننا عن سر هذا التغيير في تأريخ بدء الحرب و هو قيادي و رئيس المجلس الوطني اجاب قائلا: "أن التغيير جاء بعد أن تقرر تسمية الحرب بـ"قادسية صدام" ثم بعد التحري الوقائع التأريخية للفتوحات الإسلامية وجدوا بأن القادسية الأولي زمن الخليفة عمر بن الخطاب(رض) قد صادفت يوم ٩/٢٢ عليه أمر الرئيس صدام وسائل الإعلام بإبراز هذا اليوم بداية لقادسيته الجديدة.
و هذا جزء من عشرات التحريفات الأخري إعلاميا، كما ادركها المحققون.

ز- هنا نشير الي بعض خسائر ايران من ١٩٨٠/٩/٤ و لغاية ١٩٨٧/١/٣١ اي لغاية قبل نهاية الحرب بـ ١٨شهرا. كما نشرتها جريدة القادسية التي تصدرها وزارة الدفاع العراقية ليوم ١٩٨٧/٢/٦:

- خسائر ايران: عدد القتلي الايرانيين ٩٠٤٧٤٦فردا(بين العسكرينن و المدنيين)
- الطائرات المقاتلة ٨٩٣- الطائرات السمتية ٣٤٦ - الدبابات ٤٤٦٩ - المدافع ١٩٧٧ - العجلات ٩٢٤٦ - ناقلات أشخاص غير مدرعة ١١٧٠ - ناقلات أشخاص مدرعة ١٩٨ - قواعد الصواريخ ٣٨٤ - شفلات ١٠٠٦ - القطع البحرية ٧٥٣ - الزوارق المطاطية ٢٤٦١ - التجمعات المعادية ١٤٩١ - القاذفات الأنبوبية ١٨٥ - الرادارات ٢٥ - خزانات نفط ٩٢ - مصافي النفط ٢٧ - محطات الضخ ١٠٠٠- المعسكرات ٢٦ - الكراظانات ٣٤٥ - الجسور ٦٥ - ابراج المراقبة ٣٢ - القواعد الجوية ٢٤ - محطات الإتصال ١٢ - المجمعات البتروكيميايية ٥ - عدا المئات من المصانع و المعامل و شبكات الطرق و الأجهزة المخابراتية و الإتصالات و مصادر المياه و القوة الكهربائية... الخ.
و الخسائر المذكورة هي المنظورة فقط أما غير المنظورة قد تعادلها كمية و اهمية أو اكثر منها بكثير. كل تلك الخسائر الباهظة جدا خلال حرب شرسة لاتزال مستديمة لغاية صدور هذه الجريدة في شباط١٩٨٧.

- و في لوحة شهداء قصبة فاو في البصرة، نشرت الجريدة نفسها مضمون العبارات الواردة علي اللوحة المذكورة لشهداء فاو بتاريخ ١٩٨٩/١٠/٢٥:
"بسم الله الرحمن الرحيم
و لاتحسبن الذين قتلوا في سبيل الله اموانا بل احياء عند ربهم يرزقون صدق الله العظيم.
ايها الزائر لأرض الفاو. تمهل و أمعن النظر و كن رقيقا بأرض الفاو فأنها الأرض التي سالت عليها دماء ٥٢٩٤٨ من العراقيين النشامي مدافعا عنها للفترة من ١٩٨٠/٩/٤ لغاية ١٩٨٨/٤/١٨ ,محررين لها في عمليات رمضان مبارك في غرة شهر رمضان عام ١٤٠٣ للهجرة و من ١٧-١٩٨٨/٤/١٩ الميلادية.
فقد سالت دماء لاتستحق الرحمة لأكثر من ١٢٠الف من الغزاة الايرانيين و لم يتمكنوا من الإحتفاظ بها لأنها جزء من وطن لايقبل التشرذم فعادت فاو الي اهلها.
لقد تحملت ارض الفاو منا و من العدو ٦٨٩٠٦٠٦ قذيفة مدفع مما أمكن إحصاؤه من ١٩٨٠/٩/٤ - ١٩٨٨/٤/١٨ و غير ذلك كثيرا مما ليس بالامكان إحصاؤه من المقذوفات. و لم تتخل الفاو عن جلدها أو تفقد روحها و نزعتها الوطنية و العربية الأصيلة.
و أن كل ما تفرض عليك واجبا اخلاقيا و انسانيا و وطنيا و قوميا طبقا لموقفك من هذه الصفات و بموجب ما تؤمن و تقول ما تحفظه أو تعرفه ما يجعل الشهداء مرضين بزيارتك. الله اكبر و ليخسأ الخاسئون.

يتبع من الذكريات...

# من ذكريات رجل عمل تحت الكواليس بصمت

علي محمود فرج



**سبق أن نشرنا هذه المذكرات -القسم الأول - في العدد التاسع ، ولكن لوقوع أخطاء مطبعية ولغوية فيها، وبعد تصحيحها من قبل صاحب المذكرات والاستاذ محمد ملا عبدالكريم المدرس، نعيد نشرها بالكامل مرة اخرى مع الاعتذار.**

**والجدير بالذكر لقد صححت على الكمبيوتر من قبل مدرس اللغة العربية حيدر عبدالله.**

في عام (١٩٣٢) وعلى وجه التقريب فى ٤/ ٤/ ١٩٣٢/ ولدت من ابوين كرديين في مدينة حلبجة وكنت اخر اولادهما حيث انجبا قبلي ثلاثة اشقاء لى، وشقيقة كانت تتوسطنا.

بعد سبعة اشهر من ميلادى رحل والدي من الدنيا، وحيث ان والدتى بالأصل من اهالى مدينة السليمانية وأن جميع اولادها كانوا قاصرين عزمت على الرجوع الى بيت شقيقها المدعو ميرزا معروف احمد والمعروف بـ(ميرزا مارف) وكان موظفا حكوميا متزوجا وكان له إبنة من زوجة سابقة وولدان من زوجته الثانية وهما فخري وعبدالله.

وقد قام خالنا وبرجولة بإحتضاننا جميعا وقام بإعالتنا بشكل لم يكن يفرق بيننا وبين أولاده من جميع النواحي وقام برعايتنا وادخلنا المدرسة والصرف علينا بأنواع الصرف.

بعد مكوثنا في بيت خالى بحوالى شهرين فارقت والدتي الحياة جراء مرض الديزانتري.

ورغم أن خالنا كان موظفا بسيطا الا إنه كان عالما في الفقه الإسلامي حيث كان

السليمانية
٢٠١٠/٨/٢٤

الاستاذ [illegible] حيدر عبدالله المحترم

تحية اكبار واجلال

أغتنم هذه الفرصة لكي أبدي اعجابي بما تقدمونه من حقل الصحافة والثقافة بقيامكم بالاستمرار على انتاج أرقى مجلة (مجلة كوردستان القرن الواحد والعشرين) وأتمنى لكم دوام الصحة وطول العمر للاستمرار في هذا النهج الرائع لخدمة شعبنا وبلدنا مع التقدير.

أرفعه طياً ما وعدتكم به من انني سوف ارسل اليكم ما اكتبه من مذكراتي والان تجدون هذه المذكرات (تحت عنوان) (من مذكرات رجل عمل وراء الكواليس بصمت) فأرجو ان اردتم نشرها في مجلتكم العزيزة والتي اعادت [illegible] الينابيع الفكر في كلتا الحالتين. ودمتم بسلام وامان.

المخلص
علي محمود فرج
٢٠١٠/٨/٢٤



مجموعة سجناء في نقرة سلمان / اواسط الستينيات

والده ملا يقوم بتدريس الطلاب في المسجد الذي كان يرعاه.

وكان وضعنا غير مستقر لأن خالي بحكم وظيفته كان كثير الترحال بسبب نقله من مدينة الى اخرى وكانت وظيفته (مدير مال) في الأقضية و الالوية التي كان ينقل إليها، نقل وأنا في الثالثة من عمري الى مدينة الموصل، ومكثنا فيها قرابة ثلاثة اشهر تم نقله الى قضاء (جوارتا) ضمن لواء السليمانية ويطلق عليها أيضا (شاربازير) وهناك ادخلنا الى المدرسة بعد عام ونصف حيث بلغت السن الخامسة تقريبا، الا انني وإبن خالي عبدالله الذي اكبره بـ(٢٩) يوما قبلنا في المدرسة بصفة (مستمعين).

ثم نقل خالي بعد مكوثنا في جوارتا حوالي سنتين ونصف الى حلبجة وهي قضاء ضمن لواء السليمانية وواصلنا الدراسة في مدرستها الإبتدائية وبعد أن تخرجنا انا وإبن خالي عبدالله الى الصف الثالث نقل خالي الى قلعة دزه وهناك واصلت الدراسة ثم عدنا الى السليمانية وقبلنا نحن الثلاثة انا وشقيقي فرج و عبدالله في مدرسة الفيصلية وبعد مدة تم نقل خالي الى كركوك بصفة مدير مال لواء كركوك.

في عام ١٩٤٤– في عام ١٩٤٥ تخرج شقيقاي الكبيران في من دارالمعلمين الريفية في بغداد وعيينا معلمين في مدرسة طويلة الإبتدائية ضمن لواء السليمانية وقرب قضاء حلبجة وكنا انا وشقيقي فرج مازلنا في الصف السادس الإبتدائي بسبب الرسوب جراء كثرة الإنتقال من مكان الى مكان وخاصة عندما سافرنا الى كركوك فيها باللغة العربية لم نتمكن من من نيل شهادة البكالوريا للصف السادس الإبتدائي.

وفي نهاية العام الدراسي إمتحنا انا وشقيقي فرج في مدرسة ضمن قضاء حلبجة وإجتزنا بنجاح مرحلة الإبتدائية، وحيث كان شقيقي فرج من ضمن الأوائل في تلك السنة فقد قبل في كلية الملك فيصل في بغداد. ونقل شقيقي الى مدرسة جافران قرب قرداغ ضمن لواء السليمانية وانا قبلت في القسم الداخلي في السليمانية ودخلت الصف الأول في ثانوية السليمانية للبنين.

في عام ١٩٤٧– ١٩٤٨ وقد مللت من وجودي بمفردي في السليمانية قررت العودة الى كركوك لأواصل. مع إبن خالي عبدالله الدراسة في الصف الثاني في مدرسة متوسطة في كركوك. وفي هذا العام وهو عام (وثبة) كانون وبنتيجة للمظاهرات التي عمت كل ارجاء العراق اغلقت كلية الملك فيصل في بغداد واضطر شقيقي فرج الى العودة الى بيت خالي في كركوك ليواصل الدراسة معنا في الصف الثاني.

وفي عام ١٩٤٨ ونتيجة لإنتشار الوعي السياسي في عموم العراق قمنا جميعا انا وشقيقي فرج وإبنا خالي فخري وعبدالله بالإنضمام الى حزب التحرر الوطني الذي كان واجهة من واجهات الحزب (الشيوعي) وكان يعمل علنا حيث أجيز هذا الحزب جراء تنازل السلطات انذاك، وأجازت بعض الأحزاب الوطنية.

وبعد أن استتباب الوضع للسلطة قامت بالغاء إجازات بعض الأحزاب ومنها حزب التحرر الوطني ولهذا السبب تم إرتباط اعضائه ومؤيدية بتنظيمات الحزب الشيوعي ونحن في ضمن هؤلاء.

